ناوی کتێب: **ئینسایکلۆپیدیای جوگرافیای جیهان**

نووسینی: **نبیل تللو**

وەرگێرانی: **سەفین لاوچاك**

تایپ: **وەرگێڕ**

پێداچوونەوە: **دێرین کامیل**

چاپخانە: **چوارچرا**

ژمارەی دانە: **١٠٠٠ دانە**

نۆرەی چاپ: **چاپی یەکەم**

ساڵی چاپ: **٢٠١٥**

**لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارە ( ١٨٦١ ) ساڵی ٢٠١٥ پێدراوە**

## لەم كتێبەدا

زانیارییەكی پوخت و تەواو ی هەموو ئەو وڵاتانەی لەنەتەوە یەكگرتووەكان كورسیان هەیەو ئەندامن،

هەموو زانیاریەكانی ناو ئەم كتێبە بەپێی ئاماری نوێن و پشت بەسەرچاوەی تەواو بەستراوە، نووسەری كتێبەكە ئەرك و ماندوبونێكی زۆری كێشاوە بۆ ئەم بابەتە.

هەر زانیاریەكت بوێت لەسەر هەر یەكێك لەو وڵاتانە سەبارە بە" سەربەخۆیی، جۆری حوكمڕانی، ئاین، نەتەوە، دراو، جەژن و بۆنەكان، چڕی دانیشتوان، ڕێژەی دانیشتوان، داهاتی ساڵانەو، خەرجی ساڵانە، ڕووبەری وڵات، جوگارفیاو ئاووهەوا، شارە گرنەگەكان، پیشەسازی، سامانی ژێر زەوی، تێروانینی گشتی لەسەر هەر یەكێك لەو وڵاتانە.

سادەو ساكار لەبەردەستداو ئەتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت وەكو سەرچاوەیەكی زۆر گرنگ بەتایەبت بۆ قوتابیان و خوێنكاران

## پێرست

## ئەسیوپیا

**ناوی باو :** ئەسیوپیا

**ناوی فەرمی :** كۆماری دیموكراسی یەككگرتووی ئەسیوپیا

**ناوی فەرمی بە زمانی ئینگلیزی :**
Federal Democratic Republic of Ethiopia

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری یەكگرتوو، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پێك دێت لە دوو ئەنجومەن :

ئەنجومەنی یەككگرتوو ( ١١٧ ) ئەندام

ئەنجومەنی پارلەمان ( ٥٤٨ ) ئەندام

**رووبەر :** ٤٢٧,٧٩٤ میل دووجا، ١,١٢٣,٨٨٢ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان :** ٦٠ ملیۆن كەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان دانیشتوان:** ٥٢ كەس / كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە :** ئەمهەرییەكان ٤٠٪، جالا ٣٦٪، تیجیرینا ٩٪، جوراج ٤٪، ئەمیتو ٤٪، سیدامۆ ٤٪، عەفار ٣٪.

**ئاین :** مەسیحی ٤٠٪، موسڵمان ٤٠٪، بیروباوەڕە ناوخۆییەكان، فلاشا ( جۆرێكە لە ئاینی جولەكە ).

**زمان :** ئەمهەری، عەرەبی.

**پایتەخت :** ئەدیس ئەبابا.

**شارە سەرەكییەكان :** دیری دادا، جۆنۆر، نازریت، ئەكسۆم.

**دراو :** بەری.

**ئاووهەوا:** گەرم و ووشكە بەدرێژایی ساڵ لە بیابانی دەناقل (باكوری رۆژهەڵاتی ئەسیوپیا ) و هەرێمی ئۆجادین ( باشوری رۆژهەڵاتی ئەسیوپیا ). لە رۆژئاوای وڵات بەشێوەیەكی زۆر باران دەبارێت، دوو هێندەی ئەو بارانە دەبێت كە لە رۆژهەڵات دەبارێت. هەورە بروسكەیەكی بەردەوام و رۆژانە ئاسمانی ئەو وڵاتە تەماوییەی گرتۆتەوە. پلەكانی گەرما بە درێژایی ساڵ لە نێوانی ١٦ بۆ ١٧ پلەی سەدی دەبێت، بەڵام لە بیابانی دەناقل دەگاتە ٤٩ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەكان دەگاتە ٥١ سم.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان :** قاوە، گەنمە شامی، دانەوێڵەكان بە گشتی، قامیشی شەكر، جگە لە دارستانەكان ، بەخێوكردنی مەڕ و ماڵات.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان :** چیمەنتۆ، خواردنە ئامادەكراوەكان، جلوبەرگ، پێڵاو، چنین.

**سامانە كانزاییەكان:** نەوت، ئاڵتون، پلاتین، مس، ئاسن، پۆتاسیۆم، ئەمیانت، گاز.

**تێڕوانینێكی گشتی :**

ئەسیوپیا، یان هبرتسباویت ( وەك دانیشتوانەكەی بەزمانی ئەمهەریی پێی دەڵێن، بەمانای: كۆماری ئەسیوپیای دیموكراسی دێت ) دەكەوێتە رۆژهەڵاتی ئەفریقیا لەو ناوچەیەی پێی دەڵێن كەڵەشاخی ئەفریقیا. ئەریتیریا دەكەوێتە باكوری، جیبۆتی و سومالْ دەكەونە رۆژهەڵاتی، كینیا دەكەوێتە باشوری و سودانیش دەكەوێتە رۆژئاوای. هیچ بەندەرێكی نییە بۆ سەر دەریاكان. ناوەڕاستی ئەسیوپیاش دەكەوێتە سەر یەكێری هێڵی درێژی ٤٠ بەرەو رۆژهەڵات و هێڵی پانی ٩ بەرەو باكور.

جاران بە ئەسیوپیا دەوترا حەبەشە، عەرەبەكان ئەم ناوەیان لێنابوو كەبەمانای گەلە تێكەڵەكان دێت،هەر یەك لە ئەریتیریا و سۆماڵ و بەشێكی سودانیشی لەخۆ گرتبوو. هەروەها دەڵێن وشەی حەبەشە لە حەبەشاتەوە هاتووە، ئەوانیش بەشێكن لە خێڵەكانی ئەعاجیزی یەمەنییەوە لەمێژەووە ئەم ناوەی بەسەردا دابڕاوە. بەڵام ناوی ئەسیوپیا لە سەدەی نۆزدەیەمەوە هاتە ئاراوە و كاری پێكرا، ئەویش وشەیەكی ئیگریكیە بە رەچەڵەك و بەمانای : ئەو روخسارانەی كە خۆر سوتانویەتی، دێت، مەبەستیشیان لە دانیشتوانی باشوری میسر بوو. بەرزاییەكانی ئەسیوپیا دوو لەسەر سێی رووبەری ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە و بەرزییەكەشی دەگاتە ١٨٠٠ - ٣٠٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە و باشترین زەوییە كشتوكاڵیەكانیشی لەخۆ گرتووە. لەهەموو رووەكانەوە بەرزاییەكانی نزم دەبێتەوە تا دەگاتە سەر زەوییە نزمە زۆر گەرم و بیابانییەكان.

**گرنگترین روبارەكانی :** روباری نیلی شینە و دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێی دەڵێن (ئەببی) و گرنگترین زێیەكانی هەر لە روباری نیلەوە پەیدا دەبێت و سەرچاوەكەشی لە دەریاچەی تاناوەیە ئەویش گرنگترین دەریاچەكانی ئەسیوپیایە.

لەو ناوچەیەدا ئاسەواری مرۆڤی كۆن دۆزراوەتەوە كە دەگەڕێتەوە بۆ نزیكەی یەك ملیۆن ساڵ لەوەو پێش. لەسەدەی پێنجەمی پێش زایین چەندین كۆمەڵەی جیاواز لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، یەكێ لەوانە: كۆشیۆن. لەسەدەی سێیەمدا شانشینی ئەكسۆمی لێ دامەزراوە. و لە ساڵی ٦١٤ ی زاییندا، بەر لە كۆچبەرییەكەی پێغەمبەری ئیسلام ( د.خ ) بۆ شاری مەدینە بە هەشت ساڵێك یاوەرەكانی پێغەمبەر روویان تێكردووە و ئەو كات سەردەمی ( شا ئەسحەمەی كوڕی ئەبجەری ئەجاشی ) بووە ئازادی و دڵنیایی پێ بەخشین و لەوڵاتەكەیدا بۆ ماوەیەك نیشتەجێ بوون. لەو سەردەمەوە ئاینی ئیسلام لەو ناوچەیەدا

پەرەی سەندووە.

پاش ئەوە خێڵەکانی خلای-ڤێنزانی زاقۆی حوکمی ئەوێیان کردوە، لابیبلا کە لە ساڵی ١٢٠٠ دا حوکمی کردووە لە ناودارترین پاشاکانی بووە. لە سەدەی شانزدەیەمدا ئیمپراتۆرییەتی ئیسیوپی دابەش بوو بۆ چەند هەرێمێکەوە تا ساڵی ١٨٨٩ دا و لەسەر دەستی ئیمپراتۆر مینلیکی دووەم دووبارە کرایەوە بەیەك شانشین. توانی بەسەر ئیتاڵیەکاندا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ کە لەوەو پێش بەشێکی زۆری خاکی ئەو وڵاتەیان داگیر کردبوو و ئەدیس ئابابای کردە پایتەختی.

لە ساڵی ١٩٣٠ تافاری بووە ئیمپراتۆری ئەسیوپیا، لەدوای شازادە زودیتۆ، تافاری توانی یەکەم دەستوری نوسراو بۆ ئەو وڵاتە دابنێت و ناوی خۆیشی گۆڕی بۆ : هیلا سیلاسی، کە بە مانای ( هێزی سیانەکییەوە ) دێت.

لە ساڵی ١٩٣٥ دا ئیتاڵیەکان پەلاماری ئەسیوپیایاندا و پاش ساڵێك لەو پەلامارە توانیان ئەدیس ئەبابا داگیر بکەن و ئیمپراتۆریش بەرەو تاراوگە هەڵهات. لە ساڵی ١٩٤١ هێزە ئیسیوپیەکان بە هاوکاری بەریتانییەکان توانیان هێزەکانی ئیتاڵیا دەرکەن و دوبارە هیلا سیلاسی گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی و حوکم و دەسەڵاتی گرتەوە دەست. لە ساڵی ١٩٤٥ دا ئەسیوپیا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە ساڵەکانی ١٩٧٢ - ١٩٧٣ وشکە ساڵیەکی بێ وێنە روویکردە بەشی باکوری رۆژئاوای وڵاتەکە و نەبوونی و نەهامەتییەکی زۆری بەخۆیەوە دروست کرد و گەلی وڵاتیش ئیمپراتۆر هیلا سیلاسیان بەوە تاوانبار کرد کە بایەخێکی ئەوتۆی بەقوربانیانی ئەو نەهامەتی و برسێتییە نەداوە، بۆیە هێزی سەربازی سوپاکان بە سەرکردایەتی منجستۆ هیل ماریام کەپەیڕەوی سیاسەتی کۆمۆنیستی دەکرد کودەتایەکیان بەسەردا ئەنجامدا، بەمەش خۆی لە یەکێتی سۆڤێت و کوبا نزیك کردەوە. لەساڵی ١٩٨٧ دا موقەدەم منجستۆ هیل ماریام بە سەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا. لەهەفتاکانی سەدەی بیستەمدا شەڕێك لە نێوان ئەسیوپیا و سۆماڵ بەرپا بوو بوو لەسەر ناوچەی ئۆجادین و بە واژۆکردنی پەیمانی ئاشتی لە ساڵی ١٩٨٨ لە نێوانیاندا کۆتایی هات.

بۆ جارێکی دیکە، لە ناوەڕاستی هەشتاکانی سەدەی پێشوو بۆ سەرەتای نەوەدەکان بەهۆی بێ بارانی و وشکە ساڵیەوە شەپۆلێکی نەبونی و نەهامەتی رووی کردە وڵاتی ئەسیوپیا بووە هۆی لەناوبردنی بەدەیان هەزار لە خەڵکی ئەو وڵاتە، لەئاکامی ئەو نەبوونی ونەهامەتییە، گەلی ئەسیوپیا لە دژی سوپاکەی منجستۆ راپەڕین و توانیان لە ٢١ / ٥ / ١٩٩١ دا وڵاتی پێ بەجێ بهێڵن وشاربەدەری بکەن و ئەویش وەك پەنابەرێکی سیاسی رووی

کردە وڵاتی زێمبابۆی و بەرەی شۆڕشی دیموکراسی گەلی ئەسیوپیا بە سەرۆکایەتی ملس زیناوی کاروباری وڵاتی گرتە دەست و لەدوایی دا بووە سەرۆك وەزیران و نەجاسۆ جیداداش کرایە سەرۆکی وڵات و بەدوای ئەویشدا چەند سەرۆکێکیش دوای ئەو هاتن دواییان: جێرما ولد جۆرجیس ( ٢٠٠١ ).

لە ساڵی ١٩٥١ دا ئەسیوپیا ناوچەی ئەریتیریای خستە سەر خۆی و ناوی ( هەرێمی چواردەیەمی ئیسیوپی) لێنا، لە ساڵی ١٩٦١ دا گەلی ئەریتیریا داوای سەربەخۆییان لە ئەسیوپیا کرد، بەڵام ئەم داواکاریەیان بە ڕەتکردنەوە لەلایەن حکومەتی ئیسیوپی وەڵام درایەوە ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ئازاد کردنی ئەریتیریا. لە ٣ / ٥ / ١٩٩٣ بە ڕاگەیاندنی سەربەخۆیی ئەریتیریا کۆتایی پێهات لەم شەڕەدا هەر یەك لە گەلی ئیسیوپی و ئیریتیری قوربانییەکی زۆریان دا بە نزیکەی دوو سەت هەزار کوژراو مەزەندە دەکرێ و نزیکەی چل ساڵێکی خایاند، بۆیە بە درێژترین شەڕی ئەفریقیا دادەنرێ.

لە هاوینی ١٩٩٨ دا شەڕ لە نێوان ئەریتیریا و ئەسیوپیا هەڵگیرسایەوە، ئەویش بە هێرش کردنی ئەریتیریا بۆ سەر هەندێ لەو ناوچە کێشە لەسەرەکانی سنووری ئەسیوپیا. شەڕ تا ساڵی ٢٠٠٠ ی خایاند و بەواژۆ کردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتییەکی گشتی لە نێوانیاندا کۆتایی پێهات.

لە بەرواری ٨ / ٧ / ٢٠٠١ شاندی ئاشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پاراستنی ئاشتی نێوان ئەسیوپیا و ئەریتیریا هەستان بە کردنەوەی پردێك لەسەر ڕوباری میریب، بۆ برەو دان بە پرۆسەی ئاشتی نێوان هەردوو وڵات و ئەمەش بە هێمایەك بۆ کۆتایی هاتنی شەڕی نێوان ئەو دوو وڵاتە دراوسێیە دانرا.

پایتەختی وڵاتەکە ( ئەدیس ئابابا ) بە هێڵێکی ئاسنەوە کە درێژیەکەی دەگاتە ٧٨١ کم دەگاتە سەر بەندەری جیبۆتی کە نزیکە سەت ساڵ دەبێ ئەو هێڵە دامەزراوە. لەگەڵ ئەو هەموو کێشە و گرفتانەی لە نێوان جیبۆتی و ئەسیوپیا دا هەیە بەڵام ئەمە کاریگەرییەکی دیاری نەکردۆتە سەر ئەو هێڵە و بەرێوەبردنی نیمچە سەربەخۆییەکی پێوە دیارە. لە مانگی ئایاری ساڵی ١٩٩٥ دا بڕیار لەسەر بەگەڕ خستنی ئەرکەکانی ئەم هێڵە دراوە چونکە بەدرێژایی تەمەنی ئەو هێڵە نەیتوانیوە ئامانجەکانی بە پێی ویست و ئارەزووەکانی ئەو وڵاتە بپێکێ و ئەسیوپیا ببەستێتەوە بە وڵاتانی جیهانی دەرەوە. شایەنی باسە ئەو هێڵە تاکە هێڵی نێوان دوو وڵاتی کەڵە شاخی ئەفریقیایە. بۆیە ئێستا ئەسیوپیا لەهەوڵی ئەوە دایە کە بتوانێ بەندەری شادەماری ئەریتیری بەکرێ بگرێ، و لە ناوەڕاستی ٢٠٠١ بەدواوە هەستا بە گواستنەوەی کەلوپەلەکانی لە بەندەری بورتی سودانەوە لە شاری قەزارقی نزیك

سنووره ئیسیوپیەکان و لەوێوه کەلوپەلەکانی بە ئۆتۆمبێل دەگوێزێتەوه بۆ وڵاتی خۆی.

لە مانگی پێنجی ٢٠٠٢ هەردوو حکومەتی سودانی و ئیسیوپی هەستان بەواژۆ کردنی چەند رێکەوتننامەیەك بۆ دوبارە دیاریکردنەوەی سنوورەکانی نێوانیان. هەردوو وڵات هەستان بە گرێدانەوەی تۆڕی کارەبا لەگەڵ یەکتر و هەروەها ئەسیوپیا دەتوانێ ئێستا بەندەری بۆرتی سودانی بەکاربێنێ بۆ هاتوو و رۆیشتوەکانی و لەنەوتی سودانیش سوودمەند بێت جگە لەوەی هەردوو وڵات توانیان رێگای زەمینی نێوانیان ( دۆکە – قابلات ) بکەنەوە.

گەلی ئەسیوپیا جیاوازن لەگەڵ گەلانی هەموو جیهان، هەر لە زمانەکەیانەوه و لە داب و نەریتەکان و و بۆنە و جەژنە تایبەتی و بگرە جل و بەرگ و تا دەگاتە سەر ساڵنامەکەیشیان. ساڵی ئیسیوپی لە یانزدەی ئەیلولەوه / سێپتەمبەرەوە دەست پێدەکات کە ئەمەش یەکەم رۆژی مانگی ئەوانە کە بە : مسکرم ناسراوه لە بری کانونی دووەم / ینایەر. ساڵنامەی ئیسیوپی نزیکەی ٧ ساڵ و هەشت مانگ لە ساڵنامەی گریگۆری لە دواوەیە، واتا کە ئێستا لای ئێمە ساڵ ٢٠٠٨، لای ئەوان هێشتا بە ٢٠٠٢ ئەژمار دەکرێت، ئەم جیاوازیەش بەهۆی ئەو لەخۆوه ژماردنەی پەیدابوونی گەردوون و لەدایك بوونی حەزرەتی مەسیحەوه بووه ئەمەش بووه هۆی ئەوەی کە ساڵی ئیسیوپی لە ١٣ مانگ پێك بێت و هەموو مانگێکیشیان یەکسانە ولە ٣٠ رۆژ پێك دێت و لەساڵێك دا پێنج رۆژ زیادە دەبێت ئەوان بەمانگی سیانزدەیەمینی دادەنێن.. وەکو دابونەریتێکیان لە شەوی سەری ساڵدا ئیسیوپیەکان تا رادەی کەیل بوون و سەرخۆشی دەخۆنەوه و لافاوی خوێن بەهۆی سەربڕینی نزیکەی یەك ملیۆن کەڵەشێر و مەڕ و ماڵات سەردەبڕن. باشترین سفرەو خوان لەو بۆنەیەدا پێشکەش بە میوانەکانیانی بکەن گۆشتی کاڵە، لەگەڵ ئەوەی کە ئیسیوپیەکان زۆر جار گۆشت بە کاڵی دەخۆن بەڵام لە بۆنەکانیان دا بایەخێکی تایبەتی هەیە، کاتێك میوانەکان چەقۆی خۆیان دەردێنن و زۆر شارەزایانە دەست دەکەن بەخواردنی.

## ئیمپراتۆری حەبەشە هیلا سیلاسی

**٢٣ / ٧ / ١٨٩٢ – ٢٧ / ٨ / ١٩٧٥**

لە بەرواری ٥ / ١١ / ٢٠٠٠، ئەسیوپیا هەستا بە بەخاك سپاردنی تەرمی ئیمپراتۆری کۆچکردوو، واتا پاش بیست و پێنج ساڵ لە کۆچکردنی، خێزانی پادشایی لە تاراوگەوە بۆ بەشداری کردن لە ڕێورەسمی ناشتنیدا بەشداریان کرد جگە لە سەدان کەس لەخێڵی راستفار، کە ئیمپراتۆریان بە خواوەندێکی خۆیان دەزانی.وایان دانابوو کە لە رەچەڵەکی شا سلێمان و شازادەی سەبەئەویە، بە هەزارەها خەڵکی وڵاتەکەش لە ناشتنی ئەو ئیمپراتۆرەی کە نزیکەی ٤٤ ساڵ حوکمی وڵاتەکەیان کرد بەر لەو کودەتایەی بەسەریا سەپێنرا لە ساڵی ١٩٧٤ دا. هیلا سیلاسی پاش یەك ساڵ لەو کودەتایە کۆچی کرد و دەنگ و باس وا باو بوو گوایە بە دیلی گرتوویانە و زۆر بەناشرینی رەفتاری لەگەڵدا کراوە و پاشان کوشتویانە و تەرمەکەیان بە شێوازێکی نا مرۆیی ناشتوە. پاش روخانی رژێمی سەربازی لە ١٩٩٠ لەسەر داوای خۆی تەرمەکەی لەگەڵ تەرمی چەند ئەندامێکی خێزانەکەی گەڕێنرایەوە بۆ ئەدیس ئابابا لە ناوەڕاستی ئەو شارە لەو ئارامگایەی خۆی فەرمانی بە دروست کردنی دابوو لە کاتدرائیەی ترینتی بەخاك سپێردرا.

ئەسیوپیا بەوڵاتێکی تازەپیاکەوتوو دادەنرێ، کشتوکاڵی سەرەکیترین و چالاکترین داهاتیانە. زۆربەی خێزانەکانیان جوتیاری دەکەن بۆ بژێوی ژیانیان. راو و پیشەسازی لە چالاکییە لاوازەکانیانە. حکومەتی ئیسیوپی دەسەڵاتی تەواوی باری ئابوری ئەو وڵاتەی گرتۆتە دەست.

ئەوەی کە هێندەی تریش باری ئابووری ئەو وڵاتەی نالەبار کردووە ئەو شەپۆلە وشکییەیە کە بەیناوبەین روو دەکاتە وڵاتەکە.لە راپۆرتێکی نەتەوە یەکگرتووەکاندا ساڵی ٢٠٠١ دا هاتووە کە ئەسیوپیا بەیەکێك لەو دە وڵاتە دادەنرێ کە باری ژیانیان زۆر لاوازە وهەژارن.

لە بەرواری ٢٢ / ٨ / ٢٠٠٢ دا ئەسیوپیا هەستا بە دروست کردنی حەوزێکی گەورەی ئاو لەسەر روباری تکیزا کە یەکێکە لە زێیەکانی روباری نیلی شین لە هەرێمی تقرای و ئەرکی رێکخستنی چالاکییە کشتوکاڵییەکانی ناوچەکانی هەرێمەکانی باکوری گرتۆتە ئەستۆ بۆ هەوڵدان بە نەهێشتنی کێشەکانی وشکە ساڵی و نەبوونی و برسێتی.

سروودی نیشتمانی ئەسیوپیا :

بۆ پێشەوە ئەسیوپیا

بۆ پێشەوە ئەی دایکی خۆشەویستم

بۆ پێشەوە گەشە بکە

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٦,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٩.

خەرجی ساڵانەی تاك: ١٣٠ دۆلاری ئەمریکیی.

ئەسوپیا بە حەوتەم وڵات دادەنرێ لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی قاوە، و هەشتەمین وڵات لە بەخێوکردنی مانگا، و سیانزدەیەمین لە دار وتەختە، شانزدەیەمین لە بەخێوکردنی مەڕومالات.

## ئازەربێجان

**ناوی باو:** ئازەربێجان

**ناوی فەرمی :** کۆماری ئازەربێجان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی :**

Azerbaijan Republic

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماریی یەککگرتوو، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی پارلەمان ( ١٥٠ ) ئەندام.

**ڕووبەر:** ٣٣,٤٠٠ میل دوجا ٨٦٠٦٠٠ کم٢

**ژمارەی سەرنشینان:** ٧,٦١٧,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان دانیشتوان:** ٨٨ کەس / کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئازەر ٨٣٪، روس، ئەرمەن

**ئاین :** موسڵمان ٩٠٪ ی دانیشتوان.

**زمان :** ئازەری ( تورکی بەرەچەڵەك)

**پایتەخت :** باکۆ

**شارە سەرەکییەکان :** جانکا، سومکاییت، مینکا سیڤەر

**دراو :** مانات.

**ئـاو وهـەوا:** زسـتانی سـاردە نێومـنـدی پلـەی گـەرما دەچێتە ٤ پلـەی سـەدی، لەناوچـە نزمەکاندا بارانێکی مام ناوەند دەبارێت ودەگاتە ١٣ – ٣٨ سم، بەڵام لەناوچە بەرزەکاندا دەگاتە ١٠٠ – ١٤٠ سم. وەرزی هاوینی درێژە دەخایەنێ و پلەکانی گەرم دەگاتە ٢٦ پلەی سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی:** لۆکە، چا، میوە، دانەوێڵە، سەوزە ومیوە، توتن، بەخێو کردنی مەڕومالات، و کرمی ئاوریشم ( بۆ بەرهەمی ئاوریشم).

**بەرهەمـە پیـشەسازییەکانی:** کەرەسـتەی بیناسـازی، پاڵاوگـەی نـەوت، پۆشـاك، بەرهەمـە کیمیاییەکان.

**سامانە کانزاییەکان:** ئەلەمنیۆم، مس، ئاسن، گاز، نەوت، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئازەربێجان وڵاتێکی ئیسلامییە، دەکەوێتە ناوچە شاخاوییەکانی قەوقاز لەسەر کەناری ڕۆژئاوای دەریای قزوێن و لەوپەڕی باشوری ڕۆژئاوای کیشوەری ئەوروپا.روسیا دەکەوێتە

باکوری، دەریای قەزوین دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، ئێران لە باشوری، ئەرمینیا لە رۆژئاوای. ئەو بەشەی باکوری ئازەربێجان کە دەکەوێتە شاخەکانی قەوقاز بە بەشێك لە ئەوروپا دادەنرێت. بەڵام ئەو بەشەی کە دەکەوێتە باشور بەئاسیا دادەنرێت. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۴۷\۳۰ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٠ بەرەو باکور.

بەشێکی خاکی ئازەربێجان دوورە لە خاکی دایکی وڵاتەوە و بە کۆماری ناخیشیفان ناو دەبرێ کە خاوەنی حوکمێکی ئۆتۆنۆمیی سەربەخۆیە و ئەرمینیا لە ئازەربێجانی جیادەکاتەوە و ئەو ناوچەیەش بە درێژی ١٢کم لە گەڵ تورکیادا سنووردارە.

شاخەکانی قەوقاز لە باکوری رۆژئاواوە دەچێتەوە سەر باکوری رۆژهەڵاتی ئازەربێجان و شاخە بچوکەکانی قەوقاز لە باشوری رۆژئاواوە دەچێتەوە سەر باشوری رۆژهەڵاتی ئازەربێجان. بەرزاییە سەختەکانی ئەرمینیاش دەڕوانێتە سەر دۆڵە رۆژئاواکانی ئازەربێجان.

مێژووی ئازەربێجان دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمەکانی پێش مێژوو، چەند جارێك میدییەکان و فارس و ئەسکەندەری مەکدۆنی پەلاماریان داوە و داگیریان کردووە. فارسە ساسانییەکان لەنێوان سەدەی سێیەمەوە بۆ سەدەی حەوتەمی زایینی حوکمیان کردووە. لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوری خەتاب ( ١٣ - ٢٣ ك ) ( ٦٤٣ ز ) ئاینی ئیسلام گەیشتۆتە ئازەربێجان و لەوکاتەوە ئازەربێجان بە ناوچەیەکی ئیسلامی ناودەبرێ و عەرەبەکان پێیان وتووە ئاران. هۆزە تورکەکانیش لە نێوان سەدەکانی یانزدەیەم و سیانزدەیەمی زایینی بەرەو ئەوێ کۆچیان کردوە و لەگەڵ فارسەکاندا تێکەڵاو بوون کە خۆیان خەڵکی رەسەنی ناوچەکەن.

لە کۆتاییەکانی سەدەی شانزدەیەمی زاییندا عوسمانییەکان داگیریان کرد و دەسەڵاتی خۆیان تا سەدەی حەڤدەیەمیش بەسەردا سەپاند. لە ساڵی ١٨٠٣ دا روسیای قەیسەری داگیری کرد، لە ١٨ / ٥ / ١٩١٨ دا ئازەربێنجان لە جانکای پایتەختی ئەوسای ئازەربێجان کۆماری ئازەربێجانی دیموکراسیان راگەیاند،هەموو ساڵێك لەو رۆژەدا ئازەرێکان جەژنی نیشتیمان دەگێرن. لە ساڵی ١٩٢٠ دا روسیای شیوعی داگیری کرد و بە بەشێك لە یەکێتی سۆڤێت دانرا وناوی کۆماری ئازەربێجانی سۆڤێتی سۆسیالیستی لێنرا. لە ساڵی ١٩٨٩ دا ئازەرێکان یاساکانی خۆیانیان لەگەڵ یاساکانی یەکێتی سۆڤیەتدا پەیرەو دەکرد و لەبەرواری ٣٠ / ٨ / ١٩٩١ دا سەربەخۆیی خۆیانیان لە یەکێتی سۆڤیەت راگەیاند پاش پوکانەوەی یەکێتی سۆڤیەت لە ساڵی ١٩٩٠ دا. و لە ٨ / ١٠ / ١٩٩١دا دەستووری سەربەخۆی وڵاتیان راگەیاند و پاش ساڵێك پەیوەندی کردووە بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

لە بەرواری ٧ / ٦ / ١٩٩٢ ( ئەبا ئەلفەزلی شیبی ) بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا، تا لە ٧ /

٦ / ١٩٩٢ دا کودەتایەکی سەربازی بەسەر رژێمەکەیدا ئەنجام درا و ناچار وڵاتەکەی بەجێ هێشت. لەبەرواری ١٨ / ٦ / ١٩٩٣ پەرلەمانتاری ئازەری ( حەیدەر عەلییف ) ی بەسەرۆکی وڵات هەڵبژارد و لە بەرواری ١٠ / ١٠ / ١٩٩٨ لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرایەوە. لە بەرواری ٥ / ١١ / ٢٠٠٠ دا پارتی نوێی ئازەربێجان بەسەرۆکایەتی (سەرۆك حەیدەر عەلییف )لە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.

لە بەرواری ٢٤ / ٨ / ٢٠٠٨ دا گەلی ئازەری، بەزۆرینەی دەنگ، بڕیارێکی سەخت و سەرسوڕهێنەریان ، لەو بڕیارەدا ئاماژەیان بە گرنگی راست کردنەوەی هەندێ لە بڕگەکانی ئەو دەستوورە داواکردبوو کە لە ساڵی ١٩٩٥ دا بۆ یەکەم جار دارێژرابوو، لەوانە رێگەدان بە کوڕی سەرۆك حەیدەر عەلییف، کە ناوی ئیلجام ( یان ئیلهام ) بوو بەوەی کە ببێتە سەرۆکی وڵات لەبری باوکی بەو هۆیەی کە باوکی نەخۆشە و ناتوانێ حوکمی وڵات بکات.

ناوچەی ناغۆرنۆ – کراباخ ( بەمانای دارستانی رەش دێت ) هۆی کێشەی گەورەی نێوان ئازەربێجان و ئەرمینیای دراوسێی بوو، لەبەر ئەوەی زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بە زمانی ئەرمینی قسە دەکەن بۆیە ئەرمینیا باسی لەوە دەکرد کە ئەم ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ خۆی. لەکۆتایی هەشتاکانی سەدەی پێشوو ململانێیەکی بێ وێنە لەنێوانیاندا دروست بوو بۆ کۆنترۆڵ کردنی ئەو ناوچەیە تا بەشەرێك کۆتایی هات قوربانیەکەی لە هەردوو لایەن گەیشتە ٣٥,٠٠٠کەس و دەربەدەر بوونی نزیکەی یەك ملیۆن کەس لەهەردوو وڵات تا مۆرکردنی ئاگربەستێك لە ساڵی ١٩٩٤. لەگەڵ ئەوەی هەموو جیهان دانیان نا بەوەی ئەم ناوچەیە بەشێکە لە ئازەربێجان بەڵام هێشتا ئەرمەنییەکان دەستیان بەسەردا گرتووە. ئێستاش جاربەجارێك بەچاودێری پسپۆرە نێودەوڵەتیەکان دانیشتن و گفتوگۆی لەسەر دەکرێ دوایینیان ئەوەی ساڵ ٢٠٠١ بوو بە ئاگاداری ناوبژیوانی رێکخراوی ئاسایشی نێودەوڵەتی ئەوروپا بەڵام ئەمانیش هەر نەگەیشتنە چارەسەرێك بۆ کێشەکە، بۆیە ئازەربێجان لە ١٨ / ٤ / ٢٠٠١ دا ئامادەیی خۆی دەربڕی کە حوکمی ئۆتۆنۆمی بەناوچەکە ببەخشێ بەو مەرجەی کە لەژێر رکێفی خودی ئازەربێجاندا بمێنێتەوە، بەڵام ئەرمینیا هەرگیز بەمە قایل نابێت، بۆیە ناچار سەرۆك حەیدەر عەلییف لە ٢٦ / ٨ / ٢٠٠١ دا رایگەیاند کە هێزە چەکدارەکانی ئامادەیە پەلاماری ئەرمینیا بدات پاش ئەوەی هەستی بەجموجۆڵی سەربازی ئەرمینی کرد بەرەو ناوچەکە.

لە بەرواری ١١ / ٨ / ٢٠٠٢ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە ناغۆرنۆ – کراباخ دەستی پێکرد و هەمان سەرۆك ( ئەرکادی جۆکاسین ) ( ٤٥ ساڵ ) سەرکەوتنی بەدەست هێنایەوە بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیکە، لەو کاتەدا کە هەردوو سەرۆکی ئازەری حەیدەر عەلییف و

سەرۆکی ئەرمەنی رۆبێر کوتشارین لەگفتوگۆکانیاندا بوون بۆ دیاری کردنی دووا رۆژی ئەو ناوچەیەی کە سەربەخۆیی خۆی لە ئازەربێجان راگەیاند و دووپاتی دەکاتەوە کە هەرگیز بەشێك نەبووە لە ئازەربێجان.

ئازەربێجان پشتی بەو پیشەسازییە بەستووە کە رێژەی نیوەی بەرهەمی ئابووری گرتۆتە ئەستۆ، کشتوکاڵیش یەك لەسەر سێی ئەو بەرهەمەیەتی، هەروەها نەوتیش رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە ئابووری ئەو وڵاتەدا، لە ساڵی ۲۰۰۰ بەدواوە لەرێی هێڵی نەوتبەری بەندەرە تورکەکانەوە بەرەو جیهان دەنێرێت.

دەریای قەزوێن ئێستا تاکە هیوای ئازەربێجانە بۆ بوژانەوەی باری ئابووری، چونکە سەرەکیترین سەرچاوەی نەوتە بتوانێ بیکاتە کوێتێك لەناوەراستی ئاسیادا. رۆژی بیست وپێنجی تشرینی یەکەم بەجەژنی نەوت لەو وڵاتە دادەنرێ، چونکە لەو رۆژەدا لە ساڵی ۱۹۹۷ توانی یەکەم بارە نەوت رەوانەی دەرەوە بکات پاش سەربەخۆ بوونی پاش سێ ساڵ لە گفتوگۆ کردن لەسەر دابەشکردنی داهاتەکانی. لە هاوینی ۲۰۰۱ دا چەند کێشەیەك کەوتە نێوان ئێران و ئەزەربێجانەوە بەو هۆیەی ئەمیان دەیویست بەدوای سەرچاوەی گازی سروشتی و نەوتدا بگەرێ لەو ناوە هەرێمیانەی کە تاران خۆی بەخاوەنی دەزانێ، بۆیە تاران رێی لە دوو کەشتی گەریدەی ئازەری گرت کەبەنیاز بوون هەستن بەم کارە لە ئاوەکانی خۆیدا، لەدواتر توانیان لە رێی گفتوگۆی ئاشتیانە باس لە بابەتی داهاتەکانیان بکەن و تا ئێستاش ئەو گفتوگۆیانە هەر بەردەوامە.

وشەی ئازەربێجان هێمایەکە بۆ دەوڵەمەندی ئەو وڵاتە لە سەرچاوەکانی نەوتەوە، چونکە ئەو ناوە لە پێکهاتەی ئازەر واتا ئاگر و وشەی بیجان یان بیکان بەمانای خانە یان ماڵ دێت، چونکە ئەو ناوچەیە پڕ لە گڕکان بووە و بەردەوام خاکەکەی بۆنی نەوت و ئاگری لێهاتووە. بەیەکەم وڵاتیش دادەنرێ لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا سەرچاوەی نەوتی تیادا دۆزرابێتەوە و لەساڵی ۱۸٤۸ بەدواوە دەست کرا بە بەرهەم هێنانی نەوت و رێژەکەی گەیشتە نیوەی بەرهەمی هەموو جیهان تا هەڵهاتنی سەدەی بیستەمیش.

سروودی نیشتمانی : ئازەربێجان نیشتمانمانە....

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ۳،۷ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱۱۱

رێژەی خەرجی ساڵانەی تاك : ۵۰۰ دۆلاری ئەمریکییە

* * *

**ئازەربێجان زمانی كیرلسی دەگۆڕێت بە لاتینی**

لە ساڵی ۲۰۰۱ دا ئازەربێجان لە رووی پەروەدەییدا هەنگاوێكی نوێ نا. كاتێك هەستا بە گۆڕینی ئەلفوبێی كیرلسی بۆ پیتە لاتینییەكان ئەمەش وەك هەوڵێك لە دووركەوتنەوەی لە رابردووی سۆڤێتی. كاتێ سەرۆك حەیدەر عەلییف فەرمانێكی فەرمی دەركرد بەوەی كە دەبێ تەواوی نووسراوە فەرمی و رۆژنامە و گۆڤار و ریكلام و ئارمەكان لە بەرواری یەكی ئابی ئەو ساڵەوە بەزمانی ئازەری بنووسرێ.

ئەمەش سێهەمین بریار بوو لە ماوەی سەدەیەكدا بۆ گۆڕینی پیتەكانیان.

لە ساڵی ۱۹۲۱ دا سەركردە ئازەرییەكان بریارێكیان دەركردبوو بەوەی لە ئەلفوبێی عەرەبی دوور بكەونەوە و لەبری ئەو ئەلفوبێی ئازەری بێتە ئاراوە، بەڵام پاش هەژدە ساڵ لەم بریارە و پاش ئەوەی ئازەربێجان وەك بەشێك لە یەكێتی سۆڤیەت دانرا بۆیە پیتە كیرلسیەكانیان بەكارهێنا كە زۆرترین لە زمانە سلاڤیەكانیش بەكاری دەهێنن و وا باسی لێوە دەكرێ كە قەشە كیرلس یەكەم دامەزرێنەری ئەم پیتانە بووە.

بەڵام گۆڕانكارییەكانی ئەم دواییە دەربارەی بەكار هێنانی پیتەكان لە پێناوی بنیات نانی وڵاتەكەیان بووە بۆ گەشە كردنی رەوشی رۆشنبیری پاش رمانی یەكێتی سۆڤیەت لە ۱۹۹۱ دا.

لە بەیاننامەكەی سەرۆكدا هاتبوو " لە پێناوی پشتگیری كردن لە سەربەخۆیی ئازەربێجان و رێزگرتن لە مێژووی ئەو وڵاتە و گەشە پێدانی كەلتووری و رۆشنبیریدا پێویستە بایەخ بە زمانی رەسەنی ئازەری بدرێت و بەكارهێنانی پیتە لاتینیەكانی بۆ دیاری بكرێت ".

هەروەها لە بەیاننامەكەدا هاتبوو كە پێویستە هەموو ئەو نوسراو چاپكراوە زانستی و ئەدەبیە گرنگانە هەیە سەر لەنوێ و پیتی لاتینی لەچاپ بدرێتەوە، جگە لەوەی تیایدا هاتبوو كە دەبێ مۆنتاجی فلیمە بیانیەكانیش بكرێت بە زمانی ئازەری.

بەڵام ئەم كودەتا رۆشنبیرییەی لەو وڵاتەدا روویدا رێی لە باووباپیرانی ئەو گەلە گرت لەوەی كە لەگەڵ رۆڵەكانیان بەردەوام بن لە خوێندنەوە و گەشە كردن.

## ئەریتیریا

**ناوی باو:** ئەریتیریا.

**ناوی فەرمی:** وڵاتی ئەریتیریا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی :**

State of Eritrea

**سیستەمی حوكمڕانی:** حكومەتی ئینتیقالی، سەرۆكی وڵات، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەزگای یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥٠ ) ئەندام.

**رووبەر:** ٤٥,٣٠٠ میل دووجا، ١١٧,٤٠٠ كم²

**ژمارەی دانیشوان :** ٣,٥٩٠,٠٠٠كەس (تا ١٩٩٨ )

**كۆمەڵ نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** زۆربەی دانیشتوانی بە رەچەڵەك خەڵكی نیمچە دورگەی عەرەب و هەرێمی سودان و دۆڵی نیلن، واتا عەرەب و حامییەكانن.

**ئاین :** ئیسلام ٨٠٪، مەسیح , بێباوەڕەكان.

**زمان:** تیجرینی، تەجری، عەرەبی( ٢٠ ٪ ی دانیشتوان قسەی پێ دەكەن ).

**پایتەخت :** ئەسمەرا.

**شارە سەرەكییەكان :** عەسەب، موسەوەع، كێرین، ماساوا، نەقفە.

**دراو :** نەقفە.

**ئاو وهەوا:** گەرمییەكی مام ناوەندە ٢٧ پلەی سەدی لەسەر كەنار و ١٦ پلەی سەدی لەسەر بەرزاییەكان. باران لە كەناردا ١٥ -- ٢٥ سم و لە بەرزاییەكاندا ٦١ سم دەبێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** جۆ، نیسك، گەنمە شامی، گەنم، هەرزن، جگە لە بەخێوكردنی مەڕو ماڵات و راوە ماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** كەرەستەی بینا و دروستكراوەكانی پێست و خواردنە ئامادەكراوەكان.

**سامانە كانزاییەكان:** ئاڵتون، زیو، مەڕمەڕ، مس، ئاسن، هەروەها لەم دواییانەدا لە دورگەی دوهلك ی نزیك كەنارەكانی توانیان سەرچاوەیەك نەوت بدۆزنەوە.

### تێڕوانینێكی گشتی :

ئەریتیریا ئەو وڵاتەیە كە دەكەوێتە سەر بەشێكی كەناری باشوری رۆژئاوای دەریای سوورەوە لە باكوری رۆژهەڵاتی ئەفریقیا. سودان دەكەوێتە رۆژئاوا و باكوری، دەریای سوور لە رۆژهەڵاتی، جیبۆتی دەكەوێتە باشوور و ئیسیوبیا دەكەوێتە باشووری رۆژئاوای، نزیكەی ١٢٦ دورگەی لە رێڕەوی باشووری دەریای سوور دێتەوە سەر، گرنگترینیان دورگەكانی دوهلكە كە نزیكەی ٢٥ دورگەی نیشتەجێی هەیە. گرنگترینیشیان لە رووی

ستراتیجیەوە دورگەکانی فاتمە و حالبن کە دەکەونە سەر تەنگەی باب ئەلمەندەب کە هاوڕێ لەگەڵ یەمەندا کۆنترۆڵیان کردووە. ماوەی نێوان ئەو دوو وڵاتە لەو ناوچەیەدا نزیکەی ٥١ کم دەبێت، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٤٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٥ بەرەو باکور.

ئەریتیریا لە دەشتێکی سەر کەنار پێك دێت بە پانی ١٦ – ٦٤ کم، ئەم دەشتاییەی چەند بەرەو رۆژئاوا بڕوا هێندە بەرز دەبێتەوە تا دەگاتە بەرزی ( ٣,٠٠٠ م ) لەسەر چیای سوێرا. دووبارە لێژ دەبێتەوە بەرەو رۆژئاوای ئەو وڵاتە. بیابانی دەناقلی زۆر گەرم و وشك دەکەوێتە باشوری رۆژهەڵاتی ئەریتیریا.

یەکەم دانیشتوانی ئەو وڵاتە ئەو کۆمەڵە بوون کە لە ناو خودی ئەفریقیاوە بەرەو ئەوێ بەڕێ کەوتن لە نزیکەی ساڵی ( ٢٠٠٠ پ.ز ). لە ساڵی ١٠٠ پ. ز کۆمەڵانێکی دیکەش لە نیمچە دورگەی عەرەبەوە روویان تێکرد. ئیسلامەکان لە سەردەمی دەوڵەتی ئەمەوی ( سەدەی حەوتەمی زایینی ) بەرەو ئەوێ رۆیشتن و ئاینی ئیسلامیان تیا راگەیاند. لەسەدەی شانزدەیەمدا دەوڵەتی عوسمانی حوکمی ناوچە ناوخۆییەکانی تیاکردووە. لەسەدەی نۆزدەیەمدا، هەر یەك لە میسر و فەرەنسا و ئیتالیا هەوڵیان داوە داگیری بکەن. ئیتالیا لە ساڵی ١٨٨٢ بەدواوە دەسەڵاتی خۆی بەسەردا سەپاندووە و بۆ ساڵی ١٨٨٩ بەتەواوی کۆنترۆڵی کردووە. لە ماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا هێزە بەریتانییەکان توانیان هێزەکانی ئیتالیا لەناو بەرن و توانیان لە ساڵی ١٩٤١ دا ئیدارەیەکی سەربازی بەریتانی تیادا رابگەیەنن.لە کۆتایی ١٩٥٠ دا کۆمەڵەی گشتی نەتەوەی یەکگرتوەکان بڕیاریدا کە یەکێتیەکی فیدراڵی لە نێوان ئەریتیریا و ئەسیوپیا بەئەنجام بگەیەنێت و لە ١٥ / ٩ / ١٩٥٢ دا ئەم بڕیارەی جێبەجێ کرد، بەڵام ئەمە بووە هۆی هەڵگیرسانی بزوتنەوە ئازادیخوازەکان و لەپاشدا شەڕێکی گەورەی لەنێو وڵاتەکەدا هەڵگیرسان بەدەیان هەزار قوربانی لێکەوتەوە، لەساڵی ١٩٦٢ ئەسیوپیا سیستەمی فیدراڵی لەگەڵ ئەریتیریادا رەت کردەوە و بە هەرێمی چواردەیەمینی ئەسیوپی راگەیاند.

لە مانگی حەوتی ساڵی ١٩٦٠ بەرەی ئازادیخوازی ئەریتیری دامەزرا، میللەت لەڕێی ئەو بەرەیەوە لەرێیەوە داوای سەربەخۆیی بونیان لە ئەسیوپیا دەکرد، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێوانیان لە سەرەتای مانگی نۆی ١٩٦١. لە هەفتاکانی سەدەی بیستەمدا بەرەی ئازادیخوازی ئەریتیری دابەش بوو بۆ چەند رێکخراوێك، لەوانە بەرەی جەماوەری ئازادی ئەریتیریا بەسەرۆکایەتی ئەسیاسی ئەفۆرکی.

باش نزیکەی ٤٠ ساڵ لە شەڕێکی توندی نێوان ئەریتیریا و ئەسیوپیا و قوربانی دان بە نزیکەی دوو سەت هەزار کوژراو و وێران کردنی وڵاتەکەیان گەلی ئەریتیری پاش دەنگدانێکی بەرفراوان سەربەخۆیی خۆیانیان لە ئەسیوپیا لە ٢٤ / ٤ / ١٩٩٣ دا راگەیاند و لە بەرواری ٢٤ / ٥ / ١٩٩٣ وەك وڵاتێکی سەربەخۆ راگەیەنرا بەسەرۆکایەتی ئەسیاسی

ئەفۆریكی و پاش چوار رۆژ لەو بەرواره پەیوەندی كردووە بە نەتەوە یەكگرتووەكانەوە و بووە ٥٢ هەمین وڵاتی ئەفریقی. ساڵانە لە ٢٤ / ٤ ی هەموو ساڵێك گەلی ئەریتیری ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن.

لە ناوەڕاستی كانونی یەكەمی ساڵی ١٩٩٥ دا ئەریتیریا دورگەی حەنیشی گەورەی سەر بە وڵاتی یەمەنی داگیر كرد كە دەكەوێتە سەر دەریای سوور، شایەنی باسە ئەم دورگەیە ٢٦ میل لە كەناری ئەریتیریاوە دووره بەڵام ٢٤ میل لە كەناری یەمەنەوە دووره، بۆیە كێشەی سەر ئەم دورگەیە رەوانەی دادگای نێودەوڵەتی كرا و دادگاش لەلایەن خۆیەوە لە بەرواری ٩ / ١٠ / ١٩٩٨ دا بریاری دا بەفەرمی بیداتەوە دەست دەسەڵاتی یەمەن. ئەریتیریاش ناچار لە ١ / ١١ / ١٩٩٨ لێی كشایەوە. لەبەرواری ٤ / ١١ / ١٩٩٨ دا هەردوو سەرۆكی یەمەن ( عەلی عەبد الله سالح ) و سەرۆكی ئەریتیریا ( ئەسیاسی ئەفۆریكی ) لە عەدەن كۆنگرەیەكیان بەست بە مەبەستی ئاشتبوونەوەی نێوان هەردوو وڵات، ئەمەش بەیەكەمین دانیشتن ئەژمار ئەكرێ لەو كاتەوەی ئەریتیری دورگەكەی داگیر كردبوو.

لە بەرواری ٦ / ٥ / ١٩٩٨ دا ئەریتیریا هێرشێكی توندی كردە سەر ناوچەكانی: بادم، شیراژ و داگیری كردن، ئەو ناوچانەی كە سەردەمێك بوو لە ئەسیوپیا لە ململانێ دا بوون لەسەری. ئەم شەرە زیانێكی گیانی و مادی زۆری بەهەردوولا گەیاند. لەبەرواری ٩ / ١٠ / ١٩٩٨ دا ئەسیوپیا رەزامەندی خۆی لە پلانێكی ئاشتی رایگەیاند كە رێكخراوی یەكێتی ئەفریقیا پێشنیاری كردبوو. لەپلانەكەدا هاتبوو : دەبێ هەردوولا بە چارەسەرێكی ئاشتیانە بۆ كێشەكانیانی نێوانیان قایل بن و سنوورەكانی نێوانیان لە رێگای گفتوگۆوە دیاری بكرێ و چەك لە ناوچە سنووریەكان داماڵرێ. بەڵام ئەریتیریا بەم پلانە قایل نەبوو جگە لەوەی چەند ناوبژیوانییەكی نێودەوڵەتیشی رەتكردەوە، دوایینیان ئەو شاندە حەوتیەی ئەنجومەنی ئاسایش بەسەرۆكایەتی نوێنەری ئەمریكی لە نەتەوە یەكگرتووەكان هۆڵبرۆك بوو، كاتێ لە پاش دوو سەردانی بۆ ئەسمەرا و ئەدیس ئابابا لە ١٢ / ٥ / ٢٠٠٠ وتبووی : " سەركردەكانی هەردوو وڵات خەڵكانێكی گێل و نەفامن. پێشبینی ئەوە دەكەم شەر لەنێوانیاندا هەڵگیرسێ".

هەر واشبوو، ئەسیوپیا بۆ رۆژی دوایی هێرشێكی توندی كردە سەر ئەو ناوچانەی كە ئەریتیریا لە سەرەتای جەنگەكەی نێوانیاندا داگیری كردبوو و كەوتەوە دەستی خۆی و توانیشی خۆی بخزێنێتە نێو قوڵاییەكانی خاكی ئەریتیرییەوە و بۆردومانی شارەكانی نێوان ئەسمەرا و مەسوع كرد و هەردوولا زیانێكی زۆریان بەیەك گەیاند و بەسەدان قوربانی لێكەوتەوە جگە لە زیانە مادییەكان وئاوارە بوونی بەكۆمەڵی دانیشتوانی ئەریتیریا بەرەو سودان لە ترسی دێوەزمەی ئەو جەنگە كوشندەیە، ژمارەی ئاوارەبوانی ئەو جەنگە بە نیوە زیاتر خەڵكی ئەریتیریا مەزەندە دەكرا.

شەر لە نێوانیاندا تا بەرواری ١٨ / ٦ / ٢٠٠٠ ی خایاند، تا ئەو بەروارەی هەردوو وڵاتی

بەشەڕ هاتوو واژۆی ئاگر بەستیان کردو کۆتاییان بە شەڕی نێوانیان هێنا لەسەر ئەو ڕەشنووسەی ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقی لە پایتەختی جەزائیر بە ئامادە بوونی سەرۆکی جەزائیر ( عەبدولعەزیز بوتەفلیقە ) ئامادەی بوو، بەو پێیەی کە سەرۆکی ڕێکخراوەکە بوو، شایەنی باسە بوتەفلیقە لەوە پێشە چەند سەردانێکی بۆ پایتەختی هەردوو وڵات کردبوو لە پێناوی نزیك کردنەوەی پەیوەندییەکانی نێوانیان.

ڕێکەوتننامەکە لەم خاڵانە پێك هاتبوو:

١. ڕاگرتنی بەپەلەی هەموو پرۆسە سەربازییەکان لە تەواوی بەرەکانی جەنگ.

٢. پێکهێنانی ناوچەیەکی دابڕاو بە پانی ٢٥ کم لەنێو خاکی ئەریتریا بە درێژایی ئەو ناوچەیەی کە لەسەری لەگەڵ ئەسیوپیا بەجەنگ هاتوون.

٣. بڵاوکردنەوەی ٢,٠٠٠ سەرباز لە هێزەکانی پاراستنی ئاشتی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ چاودێری ئاگربەست و بڵاوبونەوەی هێزە ئەسیوپییەکان و دڵنیا بوون لە ڕێزگرتنی لەو بەڵێن و پەیمانانەی کە هەردوولا داویانە و چاودێری ناوچە ئاسایشە کاتییەکەی ئەریتریا.

٤. هەردوولا بەڵێن بدەن کە ئازادی بۆ جموجۆڵی نوێنەرانی ئاشتی پارێزی نێودەوڵەتی مسۆگەر بکەن و تاکەکانی بپارێزن.

لە بەرواری ١٩ / ٦ / ٢٠٠٠ بەدواوە هێمنی تەواوی بەرەکانی جەنگی گرتەوەو لەبەرواری ١٢ / ١٢ / ٢٠٠٠ دا هەر یەك لە سەرۆك ئەسیاسی ئەفۆریکی و سەرۆك وەزیرانی ئەسیوپیا ملس زیناوی لە پایتەختی جەزائیر ڕێکەوتننامەیەکی ئاشتیان واژۆ کرد تێیدا دووبارە کێشانەوەی ئەو سنوورانەی کە ناکۆکییەکانی لەسەرە و ڕێگەدان بەبڵاوکردنەوەی ٤٥٠٠ سەرباز لە هێزی پاراستنی ئاسایشی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان بۆ مسۆگەر کردنی بەردەوامی ئاگر بەست.

لە بەرواری ٢٠ / ٦ / ٢٠٠١ دا سەرۆك ئەسیاسی ئەفۆریکی ژمارەی ڕاستی قوربانیانی جەنگی دژی ئەسیوپیا کە گەیشتبووە ١٦ هەزار سەربازی ئەریتری بۆ ئاشکرابوو،بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جەنگێکی چاوەڕوان کراو هێشتا بەڕێوەیە....

لە بەرواری ١٣ / ٤ / ٢٠٠٢ دا لیژنەی نێودەوڵەتی تایبەت بە سنوورەکان لە لاهای بڕیاری کێشانەوەی سنوورکانی هەردوو وڵاتی دەرکرد. هەریەك لەو دوو وڵاتە ئەم بڕیارەیان بەسەرکەوتن بۆ خۆی دەزانی، لەکاتێکدا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیش لە بەرواری ١٤ / ٨ / ٢٠٠٢ بڕیاری بەرفراوان کردنی ئەرکی نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکانی ( بەناوی : مینۆ ) دابوو لە ئەسیوپیا و ئەریتریا بۆ بەشداری کردن لە کارەکانی کێشانەوەی سنوورەکانی نێوان هەردوو وڵات و قەڵاچۆکردنی مین و ئاڵوگۆڕ کردنی دیلەکانی جەنگ لەهەمان کاتدا.

لە بەرواری ١٣ / ٦ / ٢٠٠١ دا گەورە لێپرسراوێکی وەزارەتی دەرەوەی ئەریتری

خۆشحاڵی وڵاتەکەی دەربڕی لەوەی کە ببێتە ئەندامێك لە کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبیەکان، بەو هۆیە کە پەیوەندی نێوان وڵاتەکەی و وڵاتە عەرەبیەکان پەیوەندییەکی ئەزەلییە و باسی لەوە دەکرد کە لەم دواییەش پەیوەندییەکانیان بەوڵاتانی ناوبراو گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە.

ئیتاڵیا لە ١ / ١ / ١٨٩٠ ناوی ئەریتیریا بۆ ئەو ناوچەیە هەڵبژاردووە و چەند رایەکیش لەسەر ئەم ناوە هەیە:

١. هەندێك دەڵێن ئەو ناوە لە ناوی یەکێك لەو گوڵانەوە هاتووە ( میرا ئەریتیریۆم ) کە لە سەر کەنارە گەرمەکانی دەڕوێ، میرا ئەریتیریۆم وشەیەکی لاتینی کۆنە و دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەمی پ. ز، ئیتاڵیا بەم هۆیەوە ئەو ناوەی لێناوە.

٢. هەندێکی کەش دەڵێن : لەو وشانەوە وەرگیراوە یۆنانیەکان بەو دەریایانەیان وتوە کە دەکەوێتە سەر دورگەی عەرەب. تریکۆن سینۆس ئەرتیریۆم، ئەم وشەیەیان بەوە روون کردۆتەوە گوایە بەمانای دەریای سوور دێت، قەوزە و سەوزاییەکی زۆر لەسەر رووی ئەو دەریایەدا رووارە و دەریاوانە یۆنانییەکان بە رەنگی سوور بینیویانە.

٣. کەچی هەندێکی کە دەڵێن : وشەی ئەریتیریا لە لێکدانی دوو وشەی یۆنانییەوە هاتووە، کە : ماری ئەریتیریانە و بەمانای : ئەو خاکەی میللەتە دێرینەکان بەناویدا تێپەڕیون دێت.

٤. بەڵام ئەرت بە زمانی عەرەبی بەمانای ئاگرێکی توندی سوور دێت، دەڵێن یۆنانییەکان وشەی یانەلتی یان بۆ زیاد کردووە کە باو بوو لەنێویاندا ناوەکانیان پێ کۆتایی پێ بێنن. بۆیە وشەکە بە ئەریتیریا کۆتایی پێ هات وەك هێمایەك بۆ ئەو قەوزەو گژ و گیا سوورەی لەسەر کەنارەکانی ئەو ناوچەیە دەبینرێت.

لە ساڵی ١٩٩٧ دا ئەریتیریا دراوی نوێ دەرکرد ( نەقفە ) لە بری بڕی ئەسیوپی. نەقفەش ناوی شارێکی دێرینی ئەریتیریە و ئێستاش هەر ئەو ناوەی هەیە. ئەمەش بووە هۆی پەیدابوونی گرانی و کاریگەری کردە سەر باری ئابووری و جموجۆڵە بازرگانیەکانی.

لە کاتی شەڕی نێوان ئەسیوپیا و ئەریتیریا، ئەریتیریا دووچاری رمانێکی ئابووری گەورە بوو، بۆیە ئێستاش ئەو وڵاتە بەدەست نەداری و نەبوونییەوە هەر دەناڵێنێ و بە پلەی یەك پشتی بە کشتوکاڵی و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات بەستووە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣٩٣ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٦٧.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

## ئەرجەنتین

**ناوی باو:** ئەرجەنتین

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئەرجەنتین.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Argentina Republic

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری یەککگرتوو، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە.

**دەزگای یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٥٧ ئەندام)

ئەنجومەنی پیران ( ٧٢ ئەندام ).

**رووبەر:** ١,٠٧٣,٥١٨ میل دووجا، ٢,٧٨٠,٤٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣٥,٤٠٩,٠٠٠ ( تا ١٩٩٨ )

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەوروپی ( ئیسپان و ئیتاڵی )، میستیزۆ ( تێکەڵەیەکن لە هیندەکانی ئەمریکا و ئەوروپییەکان )، عەرەب.

**زمان :** ئیسپانی

**ئاین :** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك )

**پایتەخت:** بۆینس ئایرس

**شارە سەرەکییەکان:** کوردوبا، رۆزاریۆ، لا بلاتا، میندۆزا.

**دراو:** بیزۆ.

**ئاو وهەوا:** نیمچە خولگەییە لە باکوردا : نێوەندی پلەکانی گەرما لە هاویندا ٢٧ پلەی سەدی، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ١٦ پلەی سەدی. رێژەی باران لە ساڵێکدا ٢٠٠ سم، سارد لە باشوور : نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا سفر پلەی سەدی، و لەهاویندا ١٦ پلەی سەدی و رێژەی بارانی ساڵانە دەگاتە ١٥٦ ملم. لە ناوچەکانی دیکەی وڵاتەکەش : گەرم و شێدارە و نێوەندی بارانەکانی ساڵانە لە دەشتەکانی بامبا ٨٣ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** بەخێوکردنی مەڕومالات، دانەوێڵە، لۆکە، میوە، خوری، شیر، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئۆتۆمبێل، بەرهەمە کیمیاییەکان، ئامێری کارەبایی، خۆراکی ئامادەکراو.

**سامانی کانزایی: نەوت، گاز، ئاسن، زنك، قورقوشم، یۆرانیۆم.**

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەرجەنتین وڵاتێکە زۆربەی هەرە زۆری بەشی ئەمریکای باشوری داگیرکردووە و دەکەوێتە پلەی دووەم لە رووی رووبەر و نیشتەجێوە لەو کیشوەرەدا پاش بەرازیل. لەباکوورەوە بۆ باشوور نزیکەی ۳,۷۰۰ کم دەبێت، بەڵام لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا ۱,۵۷۷ کم دەبێت. ئەرجەنتین لە باکوورەوە لەگەڵ هەر یەك لە بۆلیڤیا و پاراگوای و بەرازیل و ئەروگوای سنووردارە، لەگەڵ زەریای ئەتڵەسی لە رۆژهەڵاتەوە و چیلی لە رۆژئاواوە، لەباشور بە یەکگرتنەوەی هەردوو زەریای ئەتڵەسی و هێمن کۆتایی دێت. ناوەڕاستی ئەرجەنتین دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦٦ بەرەو رۆژئاوا و هێڵی پانی ۳۰ بەرەو باکور.

شاخاکانی ئەندیز بەدرێژایی رۆژئاوای ئەو وڵاتە دەبینرێ، لە باشووریش بانێکی رووتی تێدەکەوێت بەناوی بتاجۆنیا کە رەشەبایەکی زۆری تێدەکەوێت. بەڵام ناوەڕاستی وڵاتەکە بە دەشتی بە پیتی بامبا پڕبۆتەوە و دارستانێکی زۆر و بەرفراوان لە باکووریەوەیەتی لەگەڵ سنوورەکانی بۆلیڤیا و پاراگوای.

هیندەکانی ئەمریکا لە سەدەی شانزدەیەمدا لەو ناوچەیە ژیاون بەر لە هاتنی ئەوروپیەکان. لە ساڵی ١٥١٦ دا بۆ یەکەم جار گەڕیدەی ئەوروپی ئیسپانی ( خوان دیاز دی سۆلیس ) گەیشتۆتە ئەوێ. لە ساڵی ١٥٣٦ بەدواوە ئیسپانەکان دەستیان کرد بە دامەزراندنی داگیرکراوەکانیان لەوێ و دەگەڕان بەدوای ئاڵتون و زیودا بەڵام دواتر بۆیان روون بۆوە کەخاکی بەپیتی دەشتەکان بامبا زۆر بە نرختر بوون لەو کانزا دەگمەنانە و وڵاتەکەیان ناونا ئەرجەنتین.

بە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم ئەرجەنتین بووە یەکێك لەوڵاتە هەرە دەوڵەمەندەکانی هەموو جیهان، ئەم سامانەشی بەهۆی رۆیشتوەکان لە گۆشت و دانەوێڵە بەرەو ئەوروپا دەستگیر دەبوو. بەڵام ئەمڕۆ ئەرجەنتین تەنها بەهۆی سامانە سروشتیەکانییەوە نەبێ دەوڵەمەند نییە بۆیە ناکرێ بوترێ ئەرجەنتین یەکێکە لەو وڵاتانەی کە خاوەنی ئابووریەکی زەبەلاحە چونکە ئابووریەکەی بەچەندین قۆناغی هەڵئاوساندا تێپەڕی ئەمەش بووە هۆی لەناوبردنی بەشێکی زۆری جگە لە گرفتە سیاسیە تەنگەکان.

ئەرجەنتین نزیکە ۳۰۰ ساڵ بە داگیرکراوی بەدەست ئیسپانیەکانەوە مایەوە، تا ئەو کاتەی بۆینس ئایرس حکومەتێکی سەربەخۆی دامەزراند لە بری لا بلاتا لە۲٥ / ٥ / ۱۸۱۰ ( رۆژی نیشتیمانی ئەرجەنتین ). لە ۹ / ٦ / ۱۸۱٦ دا توانی سەربەخۆیی خۆی لە ئیسپانیا بێنێتە بەرهەم. لە ساڵی ۱۸٥۲ دا بووە کۆماری و دەستورێکی یەکگرتووی لەخۆ گرت و

زۆربەی حاكمەكانی كەسانی سەربازی بوون، لە ساڵی ١٩٤٥ دا پەیوەندی كرد بە نەتەوە یەككگرتووەكان.

لە بەرواری ٢ / ٤ / ١٩٨٢ ئەرجەنتین دورگەكانی فۆكلاندی داگیر كرد كە دەكەوێتە باشووری زەریای ئەتڵەسی كە لەوەو پێش لەگەڵ بەریتانیا لەسەری بەگرفت بوون. بەڵام بەریتانیا لە ١٤ / ٦ / ١٩٨٢ توانی پاش شەڕی فۆكلاند بیگرێتەوە دەست. لەبەرواری ٢٨ / ١٠ / ١٩٩٨ سەرۆكی ئەرجەنتین ( كارلۆس مونعیم ) سەردانێكی فەرمی بۆ بەریتانیا ئەنجام دا، لەم سەردانەیدا ئاماژەی دابوو بەوەی كە هەرگیز شەڕخواز نین و ئێستاش گەلی ئەرجەنتین دەیەوێ بە رێگای ئاشتیانە سەر گەورەیی فۆكلاند بگرێتە دەست، بەڵام لەندەن بەردەوام ئەم داواكاریانەی رەت دەكردەوە و پشتیوانیشی بۆ ئەو رەتكردنەوەیە ویستی دانیشتوانی دورگەكەیە.

لە ٢٦ / ١٠ / ١٩٩٩ پاڵێوراوی هاوپەیمانی ئۆپۆزسیۆنی ئەرجەنتین ( فرناندۆ دیلارۆ ) لەهەڵبژاردنەكاندا سەركەوتنی بەدەست هێنا و لە بری كارلۆس مونعیمی ( بە رەچەڵەك سووری ) بووە سەرۆكی ئەرجەنتین، بەمەش كۆتایی بە دەساڵ حوكمی مونعیمی هێنا و لە ١٠ / ١٢ / ١٩٩٩ دا پۆستی سەرۆكی وڵاتی گرتە دەست.

لە راپۆرتێكی وەزارەتی دادی ئەرجەنتینی لە ساڵی ٢٠٠٠ دا هاتبوو : رێژەی تاوانەكانی دزی و كوشتن لە نێو سەنتەرە شارستانیەكاندا تابێ بەرەو زیاد دەڕوات، كەسێك نییە لەنێو هاوڵاتیاندا هەست بە ئاسایش و دڵنیایی بكات بێ گومانە لەوەی كە یان چەقۆیەك یان گوولەیەك دەیكوژێ بەهۆی دزی لێكردنەوەی یان توندرەوی. هەروەها لە راپۆرتەكەدا هاتبوو: بەو هۆیەوە كە ئەگەری دۆزینەوەی كاری نوێ بۆ هاوڵاتیان رووەو كەم دەڕوات بۆیە دوور نییە ئەم ئاژاوانەش بەرەو زیاد بوون بڕوات. ئەرجەنتین لە ساڵی ٢٠٠١ دا دووچاری كارەساتێكی ئابووری گەورە بووەوە بەهۆی بەرزبوونەوەی رێژەی سوودەكان، جگە لەوەی زیانێكی گەورەی بەهۆی هەڵهاتنی بەرهەمهێنەرە بیانی و ناوخۆییەكانەوە لێكەوت كە بە سێ ملیار دۆلار مەزەندە دەكرا. ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی جۆرەها مانگرتن و لەدواییدا بەرەو ئاژاوەیەكی گەورە تەشەنەی كرد تاوای لێهات تەواوی وڵاتەكەی گرتەوە. ئەنجومەنی پیران لە بەرواری ٣٠ / ٧ / ٢٠٠١پەنایان بردە بەر بڕیاری یاسایەك تیایدا داوای دابەزاندنی رێژەی خەرجی دەكرد بە پاساوی ئەوەی كەچیتر وڵاتەكەیان نابێ لەدانەوەی ئەو برە قەرزە ( ١٢٨ ملیار دۆلاری ئەمریكی ) دوا بكەوێت.

لە بەرواری ٢١ / ١٢ / ٢٠٠١ دا سەرۆكی ئەرجەنتین فرناندۆ دیلارۆ لەپاش ئەو رووداوە سەختانەی كە تەواوی شارەكانی گرتەوە و كوژرانی دەیان كەسی لێكەوتەوە و زۆربەی

هەرە زۆری دەزگاکانی وڵاتی لەناو برد دەستی لە پۆستی سەرۆکی وڵات هەڵگرت و سەرۆکی پەرلەمان ( رامون بوێرتا ) بەشێوەیەکی کاتی ئەو ئەرکەی لەخۆ گرت. لە بەرواری ٢٣ / ١٢ / ٢٠٠١ دا پەرلەمانی ئەرجەنتینی حاکمی ویلایەتی سان لویس ( ئەدۆلفۆ رۆدریجز ) ی ( لە پارتی پیرۆنی ) وەك سەرۆکی وڵات هەڵبژارد تا ئەو کاتەی کە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی دەست پێدەکات. سەرۆك لە پاش سوێند خواردنی دەستووری رایگەیاند کە ئەرجەنتین چیتر دانەوەی ئەو قەرزانەی کە گەیشتۆتە ١٣٢ ملیار دۆلار رادەگرێت و و بەهای دراوەکەی خۆی دانابەزێنێت و پشت بەدۆلاری ئەمریکی نابەستێت لە ئابووری وڵاتەکەیدا. بەڵام گرفت و کێشەکانی شەقامی ئەرجەنتینی هەر بەردەوام بوو و ئەمەش وای لەسەرۆکی نوێ کرد دەست لەکار بکێشێتەوە پاش یەك هەفتە لە بەسەرۆك بوونی، سەر لەنوێ سەرۆکی پەرلەمان ئەو پۆستەی گرتەوە دەست.

لە بەرواری ١ / ١ / ٢٠٠٢ دا پەرلەمان ( ئێدوارد دۆهالدی ) وەك سەرۆکی وڵات هەڵبژارد ( کە ئەویش ئەندام پەرلەمانێك بوو لەسەر لیستی پارتی پیرۆنی ) تا ئەو کاتەی ماوەی سەرۆکایەتییەکەی سەرۆکی دەست هەڵگرتوو فرناندۆ دیلارۆ کۆتایی پێدێت. سەرۆکی نوێ لە ئاهەنگی وەرگرتنی پۆستی نوێدا بەڵێنیدا کار بکات بۆ نەهێشتنی نمونەی ئەو ئابوورییەی بەشی هەرە زۆری گەلی ئەرجەنتینی تووشی نەهامەتی و نەداری کردووە لەرێی پێکهێنانی حکومەتێکی یەککرتوو و نیشتمانی بتوانێ چارەسەری ئەو گرفتە ئابووریە بکات کە وڵاتەکەی دووچاری بووە.

لە بەرواری ٦ / ١ / ٢٠٠٢ ئەنجومەنی پیرانی ئەرجەنتینی یاسای فریاکەوتنی خێرای ئابووری راگەیاند. لەم یاسایەدا هاتبوو کە بەهای گۆڕینەوەی بیزۆ بەرامبەر بە دۆلار بەو پێیە بێت کە ساڵی ١٩٩١ دا بۆی دیاری کراوە.

لەگەڵ ئەوەی حکومەت لەچەند رێنماییەکی بۆ نەهێشتنی ئەو ئاژاوەو تەنگانەیە گرتەبەر، بەڵام هێشتا نەهامەتی و نەداری بە زۆری شارو شارۆچکەکانی ئەرجەنتینەوە دیارە.

لە مانگی حەوتی ٢٠٠٢ ئەرجەنتین ئاهەنگێکی بەبۆنەی یادی پەنجا ساڵەی کۆچی پاڵەوانی میللی ئەرجەنتین ( ئیڤیتا پیرۆن ) گێرا. یادەوەری ئەم ئافرەتە بایەخێکی تایبەتی هەیە لەلای گەلی هەژاری ئەرجەنتین تا بووە هێمایەك پاش مردنی.ئاهەنگەکان لە سەر قەبرانی ربکۆلێکتا لە بوینس ئایرس بەرێوە چوو. ئیڤیتا ژنی سەرۆکی پێشووی ئەرجەنتینی ( جوان دومینگۆ بیرونە ) و بەنەخۆشی شێرپەنجە لەتەمەنی سی وسێ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە.

دەشت و باخە بە پیتەکانی ئەرجەنتین گرنگترین و سەرەکیترین رۆڵ دەبینن لە

بوژاندنەوەی باری ئابوری ئەرجەنتیندا، زۆربەی هەرە زۆری کارگەکانی ئەرجەنتین پشتی بە بەرهەمی گۆشت و پێست و خوری بەستوە.

**سروودی نیشتیمانی ئەرجەنتین:**

**هاواری پیرۆزی ئێمە**

ئازادیە و ئازادیە و ئازادی....

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٢٧٥,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی

**ریزبەندی لەنێو وڵاتەکانی جیهاندا:** ١٧

**نێوەندی خەرجی تاك:** ٨,٠٦٠ دۆلاری ئەمریکیە.

ئەرجەنتین بە پلەی سێهەم دێت لەهەموو جیهان لە بەرهەمی هەنگوین لەپاش چین و ویلایەتە یەکگرتوەکان و رێژەی بەرهەمی دەکاتە ٧٠,٠٠٠ تۆن هەنگوین واتا لە ٢٠٪ بەرهەمی هەموو جیهان و ئەرجەنتین لە ٩٠٪ ئەو رێژەیە دەنێرێتە دەرەوەی وڵات، هەروەها بەپلەی پێنجەم دێت لە جیهاندا لە بەرهەمی خوری، بەپلەی شەشەم لە شەراب و گەنمە شامی و مانگا و بەپلەی نۆیەم لە ترشییەکاندا، بە پلەی دەیەمی هەموو جیهان دێت لە بەرهەمی چا و لۆکە و بەنۆزدەیەم لە گازی سروشتی.

## ئەرجەنتین هەوڵ دەدات بگەڕێتەوە بۆ دەوڵەمەندی جارانی

چۆن ئەو وڵاتەی کە شانازی بەوەوە دەکرد خاوەنی دەوڵەمەندترین وبەپیترین زەوییەکانی ئەمریکای لاتینە بارودۆخی گۆڕا بۆ ئەوپەڕی هەژاری؟ ئایا ئەو هۆکارانە چین کە ئەو وڵاتەی گەیاندە ئەو رادەیە و تاجی بەپیتی وڵاتەکەی لێسەندەوە؟ سەردەمی گەشەکردنیانی لێسەندن و شەیدای خەونێکی پەمەیی و گەڕان بەدوای فیردۆسێکی وندا لێکردبوون بە خەیاڵ! کەلێنی نێوان ئەوانەی لەهەژاریدا دەست دەگرنەوە و ئەوانەی لە دەوڵەمەندیدا دەستەکانیان هەڵئاوساوە زۆر گەورەبوو بوو، رێژەی بێکاران بەردەوام لە زیادبووندابوو. بەڵام ئەمڕۆ دەتوانێ ئەو هاوکاریە بەکۆمەڵەی گەلی ئەرجەنتین بەدی بکەیت بۆ قەلاچۆکردنی نەداری و نەبوونی نێو ریزەکانی گەل. سێ ملیۆن ئەرجەنتینییەی لەکۆی ئەو سی وشەش ملیۆنەیان خۆبەخشانە لەپێناوی پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری بۆ گەلەکەیان هەوڵی جدی دەدەن، زۆربەی هەرە زۆریان پەیوەندییان کردووە بە رێکخراوە ناحکومیەکانەوە و ئەوانی دیکەش خۆیانیان خزاندۆتە نێو چەتری کڵێسە کاسۆلیکییەکانەوە بۆیارمەتی دانی هەژارە بێنەواکانی وڵاتە خۆشەویستەکەیان.

جوان کار (تەمەن ٣٧ ساڵ)، پزیشکی ڤێتەنەری بەر لە چوار ساڵ هەستاوە بە

دامەزراندنی ( تۆڕی لەئەستۆ گرتن ) بەهیوای پێشکەشکردنی یارمەتی بۆ نەداران و هەوڵی ئەوە دەدات وێنەیەکی شایستە بۆ رێکخراوەکەی پێشکەش بکات، کار دەڵێت: سەرەتای دامەزراندنی ئەم رێکخراوەمان لە ٩٠٪ خەڵکان داوای یارمەتییان لێ دەکردین لە کاتێکدا کە رێژەی ١٠٪ دەستی یارمەتیدانیان بۆ درێژ دەکردین، بەڵام ئێستا ئەوانە زۆر زیاترن کە دەیانەوێ لە رێی ئێمەوە یارمەتی هەژار و نەدارانی هەموو جیهان بدەن.

هەروەها چەندین رێکخراو لە هاوپەیمانێتی نێوان پزیشك و پارێزگارەکان پەیدا بووە بۆ یارمەتی نەدار و هەژارانی ئەو وڵاتە و رەخساندنی هەلی گونجاو بۆ کار کردن و تەرخان کردنی ماڵ و کەلوپەل بۆ هەژارانی گەلەکەیان. لە لێکۆڵینەوەیەکی سەنتەری لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی لە ئەرجەنتیندا ئاشکرا کراوە کە لانی کەم دوو ملیۆن هاوڵاتی سەرقاڵی کارن لەنێو پەنجا هەزار رێکخراوی مرۆیی ناحکومی و هەروەها ملیۆنێکی دیکەش سەرقاڵی دابەشکردنی ئەو یارمەتییانەن کە کڵێسەی کاسۆلیکی تەرخانی کردووە.

ماریۆ رۆیتەری سەرۆکی سەنتەری لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی لە ئەرجەنتیندا دەڵێ : ئەو هەڵمەتی تەرخان کردنەی کە سەرۆك کارلۆس مونعیم بەر لە دوانزدە ساڵ دەستی پێکردبوو ئاستێکی باشی بۆ پەروەردەکردنی باری کۆمەڵایەتی رەخساندبوو و روانگەی خەڵکیشی گۆڕیبوو بەرامبەر بە ئەرك و لێپرسراویتیە کۆمەڵایەتییەکانیان.

لە راستیدا ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر ئەمریکای لاتینیدا هات تەنها ئەرجەنتینی لەو رووەوە نەگرتەوە کە دەوڵەمەنترین وڵاتی کیشوەری ئەمریکا باشوورە بەڵکو دوچاری ئەو رەوشەی کردووە کە ئێستاش ناتوانێ پێ بەپێ وڵاتە پێشکەوتوەکانی جیهانی یەکەم بەری کەوێت.

## ئەردەن

**ناوی باو:** ئەلئەردەن

**ناوی فەرمی:** شانشینی ئەردەنی هاشمی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Hashemite Kingdom of Jordan

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەزگای یاسادانان:** ئەنجومەنی نەتەوە ئەویش پێك دێت لە :

ئەنجومەنی پیران ( ٤٠ ئەندام )،

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٠٤ ) ئەندام.

**رووبەر:** ٣٤،٣٤٢ میل دووجا، ٨٨،٩٤٦ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥،٢٠٠،٠٠٠ کەس ( ٢٠٠١ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٥ کەس / کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە :** عەرەب ( ٩٨ ٪ )، کورد، شەرکەس، ئەرمەن، چیچان.

**ئاین:** موسڵمان ( ٩٤٪ )، مەسیح.

**زمان :** عەرەبی

**پایتەخت :** عەممان

**شارە سەرەکییەکان:** زەرقا، ئێربد، سەڵەت، عەقەبە، مەفرەق، رەمسا.

**دراو:** دیناری ئەردەنی.

**ئاو وهەوا:** رۆژئاوای عەممان وشکە و رۆژهەڵاتی بیابانی و باران لە بەرزاییەکاندا دەگاتە ٦٠ سم و لە قوڵاییەکاندا ٢٠ سم، ئەم رێژەیەش لە بیابانەکانیدا بەرەو کەم دەڕوات. پلەکانی گەرما لە بەرزاییەکاندا دەچێتە ٧ پلە لە زستان و ٣٠ پلە لە هاویندا، بەڵام لە دۆڵی ئەردەن پلەکانی گەرما لە نێوان ١٤ پلە لە زستان و ٤٠ پلە لەهاویندا دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان :** سەوزە و میوە، گەنم، جۆ، زەیتون.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، پەین، ئاسن و پۆڵا و دروست کراوە کیمیاییەکان.

**سامانە کانزاییەکان :** فۆسفات، پۆتاس.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەردەن وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە سەر کەناری رۆژهەڵاتی روباری ئەردەن و باشوری رۆژئاوای ئاسیا. لە گەڵ سوریادا لە باکوورەوە سنووردارە و عێراق لە رۆژهەڵات و

سعودیە لە باشوور و فەلەستین لە رۆژئاوا و روباری ئەردەن لە فەلەستینی جیادەکاتەوە. رێرەوێکی دەریایی بە درێژایی ٢٦ کم ی هەیە لەسەر کەنداوی عەقبە و بەستراوەتەوە بە دەریای سوورەوە. ناوەڕاستی ئەردەن دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣٦ بەرەو رۆژهەڵات و هێڵی پانی ٣١ بەرەو باکوور.

نزمایییەکانی دۆڵی ئەردەن بە درێژایی ٣٧٠ کم دەچێتەوە سەر دەریاچەی توبریە لە باکور و لە باشووری دەریای مردوو لە رۆژئاوای وڵاتەکە کۆتایی پێدێت، ئەوێش بەناوچەیەکی بەپیتی کشتوکاڵی دادەنرێت. بان و گردەکان لە باکووری ئەردەنەوە درێژ دەبنەوە تا دەگاتە باشووری. بەڵام بانی بیابانی بادیە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی بان و گردەکانی، ئەویش بە باشووری سەر بادیەی شام دادەنرێت و بە بیابانی سعودیەش دەکەوێتە سەر رووی باکوری بیابانەکەی.

مێژووی ئەردەن دەگەڕێتەوە سەر ئەو هۆزانەی کە لێی نیشتەجێ بوون، لەوانە : موئابییەکان، ئیدۆمییەکان، عومونییەکانیش. شلرستانیەتی کەنعانی لە فەلەستین کاریگەرییەکی زۆری کردە سەر ئەم هۆزانەو هەروەها ئارامییەکانیش لە سەرەتاکانی ١٥٠٠ پ.ز کاریگەرییان تێکردن. پاش ئەوان ئەردەن کەوتە ژێر دەسەڵاتی حوکمی یەك بەدوای یەکی ئاشوری و کلدانی و فارسی و رۆمانەکانەوە. رۆمانییەکان ناوی ئەردەنیان لەو ناوچەیە ناو بەمانای دۆڵی قووڵ دێت.هەتا ئێستاش ئاسەواری رۆمانییەکان لە زۆربەی شارەکانی ئەردەن دا بەدی دەکرێ وەك شارەکانی جەرەش و عەممان و زۆر شوێنی دیکەش.بەڵام هاوکات رایەکی جیاوازیش هەیە بۆ ناوەکەی هەندێك دەڵێن ئەو وشەیە بەرەچڵەك کەنعانی یان سریانیە ئەویش بەمانای سەرچاوەی ئاو دێت، وەك هێمایەك بۆ روباری ئەردەن.

عەرەبە ئیسلامەکان لەسەردەمی خەلیفە ئەبو بەکری سدیقەوە هاتنە ئەردەنەوە کاتێ شەرحەبیلی کوڕی حەسنە لە ساڵی ١٠ ك ( ٦٣١ ز ) هاتە ناو ئەو وڵاتەوە، ماوەیەکیش لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا بوو لەو سەردەمەی حوکمی ناوچە عەرەبەکانی گرتبۆوە دەست ئەردەن سەر بەسوریا بوو.

پاش شۆڕشی عەرەبی ساڵی ١٩١٦، میر عبد الله کوڕی ئەلحسێن لە بەرواری ٢٨ / ٣ / ١٩٢١ دا ئیمارەتی رۆژهەڵاتی ئەردەنی لە ژێر سایەی بەریتانیادا دامەزراند. لە ٢٥ / ٥ / ١٩٤٦ دا سەربەخۆیی بەدەست هێنا و میر عبدالله کوڕی ئەلحسێن بە شای ئەردەن هەڵبژێردرا و لەوکاتەوە بەناوی شانشینی ئەردەنی هاشمیەوە ناسرا، شانشینی ئەردەن لە بەرواری ٢٥ / ٥ / ی هەموو ساڵێك ئاهەنگی نیشتمانی دەگێڕێت.

بەشداری یەكەم شەڕی عەرەب – ئیسرائیلی ساڵی ١٩٤٨ ی كردووە و زۆربەی ئەو خاكەی لە پرۆژەی دابەشكردنی فەلەستیندا لەلایەن نەتەوە یەكگرتووەكاندا ساڵی ١٩٤٧ كە بۆ عەرەبی تەرخان كردبوو خستە سەرخۆی، بۆیە بووە خاوەنی دوو كەنار : كەناری رۆژهەڵات و كەناری رۆژئاوای روباری ئەردەن.

لەبەرواری ٢٠ / ٧ / ١٩٥١ شا عبدالله ی كوڕی ئەلحسێن تیرۆر كرا، تەلالی كوڕی بووە شای ئەردەن، بەلام ئەویش لە ١٩٥٢ دا دەستی لەتەختی پاشایی هەڵگرت بۆ حسێنی كوڕی كە لەدایك بووی ١٤ / ١١ / ١٩٣٥ بوو و واتا تەمەنی حەڤدە ساڵ دەبوو بۆیە ئەنجومەنی راسپاردەییان بۆ دامەزراند بۆ بەڕێوەبەردنی كاروباری وڵات تا ئەو كاتەی حسێن بە فەرمی ئەركی بەڕێوبردنی گرتە دەست لە لەبەرواری ١١ / ٨ / ١٩٥٣ ،شا حسێن میر حەسەنی برای كرد بە وەلی عەهد.

لە ساڵی ١٩٥٥ دا ئەردەن بوو بەئەندامی نەتەوە یەكگرتووەكان. لە بەرواری ٥ / ٦ / ١٩٦٧ دا هێزەكانی ئەردەن شان بەشانی میسر و سوریا دژ بە ئیسرائیل شەڕی كرد و لە ئەنجامدا كەناری خۆرئاوای لەدەستدا. لە بەرواری ٣٠ / ١٠ / ١٩٩١ دا بەشداری كۆنگرەی ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی لە مەدرید كرد. پاش چەند دانیشتنێك لە دانوستاندا لەگەڵ ئیسرائیل ئەردەن لەگەڵ ئیسرائیلدا لە باخچەیەكی كۆشكی سپی لە ٢٥ / ٧ / ١٩٩٤ لە ئاهەنگێكی فەرمیدا كە شا حسێن خۆی و سەرۆك وەزیرانی ئەو كاتی ئیسرائیل ( ئیسحاق رابین ) و سەرۆكی ئەمریكا ( بیل كلینتۆن ) لە واشنتۆن رێكەوتننامەی ئاشتی واژۆ كرد. ئەمەش رێخۆشكەرێك بوو بۆ واژۆ كردنی ئەو پەیماننامەیەی كە هەردوو وڵات لە دۆڵی عەرەبە لە ئەردەن واژۆیان كرد لە ٢٦ / ١٠ / ١٩٩٤ دا.

لەناوەڕاستی ١٩٩٨ دا شا حسێن گەشتێكی كرد بۆ ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بە مەبستی چارەسەری لە نەخۆشی شێر پەنجەی گلاندە لیمفییەكان و لە بەرواری ١٩ / ١ / ١٩٩٩ گەڕایەوە بۆ ئەردەن. لە بەرواری ٢٥ /١ / ١٩٩٩ شا حسێن لە نوسراوێكی پادشاییدا میر حەسەنی برای لەكار كێشایەوە و میر عبدالله ی كوڕی خستە شوێن، ناوبراو بۆ رۆژی دوایی سوێندی یاسایی خوارد و بووە جێگری باوكی ( شا حسێن ).لە هەمان رۆژدا ٢٦ / ١ / ١٩٩٩ دووبارە شا حسێن گەڕایەوە بۆ ویلایەتە یەكگرتووەكان بۆ چارەسەر لە هەمان نەخۆشی ناوبراو، بەلام دیارە باری تەندروستی بەرەو خراپتر دەچوو، بۆیە لە بەرواری ٥ / ٢ / ١٩٩٩ گەڕایەوە بۆ ئەردەن تا لەناو خێزان و گەلی خۆیدا ماڵئاوایی یەكجارەكی بكات لە بەرواری ٧ / ٢ / ١٩٩٩ و لە رێورەسمێكی زۆر بەشكۆ و بە ئامادەبوونی زیاتر لە چل سەرۆك و میر و پاشا لە زۆربەی وڵاتانی جیهانەوە لە تەلاری رەغدان لە عەمان بەخاك سپێدرا.

پاش كۆچی شا حسێن بەچەند كاتژمێرێك میر عبدالله ی كوڕی شا حسێن لەبەردەم ئەنجومەنی نوێنەران و لە دانیشتنێكی نائاساییدا سوێندی یاسایی خوارد و بووە شای ئەردەن و بەمەش بووە چوارەم شا پاش دامەزراندنی شانشینی هاشمی ئەردەنی لە ساڵی ۱۹۲۱، لەهەمان ڕۆژدا فەرمانێكی پادشایی بۆ برای شا عبدالله ( میر حەمزە دەركرا كە ببێتە وەلی عەهد).

لە بەرواری ۹ / ٦ / ۱۹۹۹ بەشێوەیەكی فەرمی و لە ئاهەنگێكی شایستەدا شا عبدالله كرا بە شای ئەردەن و ( رانیا ئلعەبدالله ) ی خێزانی كرایە شاژنی ئەردەن و خەڵاتی ئەلحسێنی پێ بەخشرا كە بە بەهاترین خەڵاتی ئەو وڵاتەیە.

لە بەرواری ۲۷ – ۲۸ / ۳ / ۲۰۰۱ دا لە عەمان كۆنگرەی باڵای وڵاتانی عەرەب بەسترا و ناوی ( كۆنگرەی قودسی ) لێنرا و لەو كۆنگرەیەدا پشتیوانی لە ڕاپەڕینی گەلی فەلەستین وەكو گەل و حكومەت لە دژی ( ئیسرائیل ) كرا. لە بەرواری ۱۷ / ۸ / ۲۰۰۲ دا لە فەرمانێكی پادشایی ئەردەنی ژمارەی كورسیەكانی ئەنجومەنی نوێنەران لە ( ۸۰ ) كورسییەوە كرا بە ( ۱۰٤ ) كورسی و تەمەنی پاڵێوراو لە نۆزدە ساڵییەوە گۆڕا بۆ هەژدە ساڵ.

تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی : ٥,۸ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لە نێو وڵاتانی جیهان : ۹٦ هەمین وڵات.

نێوەندی خەرجی تاك: ۱.۳۹۰ دۆلاری ئەمریكی.

**شا عبدالله لە باوكییەوە خووی خۆگۆڕینی لەخەڵك بۆ ماوەتەوە.**

شا عبداللهی دووەم لەو كاتەوەی وەك شای ئەردەن دیاری كراوە چەند جارێك خۆی لە خەڵك گۆڕیوە و چۆتە ناویانەوە بێ ئەوەی كەس دەرك بە كەسایەتی بكات و بیناسێتەوە، ئەمەش لە پێناوی ئاگاداری لە نزیكەوە لەكاروباری میللەت و رای خەڵكی بەرامبەر بە حكومەت و یاساكان ئاگادار بێت. بەساڵاچوان دەڵێن ئەم خووەی لە باوكییەوە بۆ ماوەتەوە و ئەویش چەند جارێك ئەمەی كردووە لە سەرەتایی ۱۹٥۲ بەدواوە. شا حسێن لە تەمەنی ۱۷ ساڵیەوە حوكمی وڵاتی گرتۆتە دەست و لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیەوە كۆچی دوایی كردووە، واتا نزیكە چل و شەش ساڵ پادشا بووە. لە كتێبی یادەوەریەكانی كەخۆی نووسیوەتی ( پیشەكەم وەك پاشایەك ) زۆر بە ڕاشكاوانە باس لەوە دەكات كە چەند جارێك خۆی گۆڕیوەو نەیهێشتووە كەس دەركی پێبكات، جارێك وەك شۆفێری تەكسی بۆ ماوەی دوو شەو بێ ئاگاداری پاسەوانەكانی خۆی گۆڕیوە و دەڵێ : بۆیە خۆم لەخەڵك دەگۆڕی تاكو زۆر لە نزیكەوە گوێم لە ئازار و مەینەتییەكانی گەلەكەم بێت و چی هەبێت بیزانم. لەو

کەسانەی زۆر نزیکی شا عبداللە بوون جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە کەسایەتی شا حسێن کاریگەرییەکی تەواوی کردۆتە سەر شا عبداللهی کوڕی و زۆر دڵکەشی بووە بۆیە هەوڵی ئەوە ئەدات کە لاسایی بکاتەوە چی ئەو کردوویەتی ئەمیش پەیڕەوی بکات، بۆیە ئەمیش ( شا عبداللە ) چەند جارێك خۆی لەخەڵك گۆڕیوە و چۆتە ناویانەوە جارێك بە عەبایەکی سپی و ریشێکی سپی درێژ و جامانەیەکی سووری کردۆتە سەر و چۆتە ناو فەرمانگە حکومیەکان و جارێکی دیکەش وەك شۆفێرێك و جارێك و هاولاتییەکی ئاسایی سواری پاس بووە تاکو بەهەمان پرۆگرامی باوکی چاودێری لە ژیانی ئاسایی خەڵك بکات و گوێ لە خەم و رازەکانیان بگرێت، دەگێڕنەوە دوایین جار کە ئەم کارەی ئاشکرا بووە ئەوە بوو کاتێك بە بەرگێکی ئاسایی ( پاش ئەوەی هەندێ جوانکاری لە ریش و سمێڵی ) کردووە کامێرایەکی فۆتۆی گرتووە بەدەستییەوە وەك پەیامنێرێك رەفتاری کردووە و چۆتە نێو خەڵکەوە و چاوپێکەوتنی لەگەڵدا کردووە و داوای کردوە چی سکالاّ و نارەزاییان هەیە دەری ببڕن، پاش هەندێك لێپرسراوێکی ئاسایش دێتە بەردەمی و داوای مۆڵەتی وێنەگرتنی لێدەکات، ئەمیش چەند هەوڵ دەدات خۆی لێ رزگار بکات ناتوانێ، بۆیە ناچار ریش و سمێڵەکەی لەخۆی دەکاتەوە و خۆی ئاشکرا دەکات و هەموان دەست دەکەن بە چەپڵە لێدان و ستایشی ئەم هەڵوێستەی لێ دەکەن. زۆربەی زۆری رۆژنامە و گۆڤارەکانی ئەردەن ئەم هەواڵە دەبیستن و وێنەکێشی کاریکاتێری ( عیماد حەجام ) لەوێنەیەکی کاریکاتێری لە رۆژنامەی ( ئەلرەئی ) دا وێنەی چەند کەسێکی کێشاوە هەمان ریش و سمێڵی بۆ کردوون و عەبای سپی داوە بەشانیاندا و لەبەردەم یەکێك لە فەرمانبەرەکاندا وەستاون و ئەویش دەست بەجێ کارەکانیان بۆ رادەپەڕێنێ لەترسی ئەوەی نەبادا یەکێکیان شا عبداللە بێت. پسپۆڕان دەڵێن چ شا حسێن یاخود شا عبداللە ئەرکێکی باشیان کێشاوە لەم خووی خۆگۆڕینە چونکە ئەمە وەك ئاگادار کردنەوەیەك وایە بۆ تەواوی فەرمانگە و نەخۆشخانە و شوێنە فەرمییەکان کە هەمیشە لە حاڵەتی ئاگاداری دابن نەبا لەناکاو شا عبداللە خۆی بکات بەژوورا........!

## ئەرمینیا

**ناوی باو :** ئەرمینیا

**ناوی فەرمی :** کۆماری ئەرمینیا

**ناوی فەرمی بەئینگلیزی:**

Republic of Armenia

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجەمەنی وەزیران.

**دەزگای یاسادانان:** ئەنجومەنی نەتەوەیی ئەمەنی ( ۱۹۰ ) ئەندام.

**رووبەر:** ۱۱،۵۰۰ میل دووجا، ۲۹،۸۰۰ کم[۲]

**ژمارەی دانیشتوان:** ۳،۷۷۳،۰۰۰ کەس (تا ۱۹۹۸ )

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەرمەن ( ۹۰ ٪ )، ئازەر، کورد، روس.

**ئاین :** مەسیح ( کڵێسەی ئەرمەنی کە سەر بە کلێسەی ئەرتۆدۆکسی رۆژهەڵاتە ).

**زمان :** ئەرمەن.

**پایتەخت :** یەریڤان

**شارە سەرەکییەکان :** جیۆمری، کیرۆڤاکان، ڤانادزۆر، کامۆ.

**دراو :** درام

**ئاو وهەوا:** بەرزاییەکانی سارد و وشك و بەفر زۆربەی مانگەکانی ساڵ. ناوچە نزمەکانی گەرمییەکی مامناوەندیان هەیە، هەندێ جار لە پایتەختدا لە زستاندا پلەی گەرما دەچێتە ۲۰ پلە ژێر سفر. ساڵانە ۲۰ - ۸۰ سم باران دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی :** میوە، سەوزە، جۆ، بزن، مانگا.

**بەرهەمە پیشەسازییەکانی:** دروستکراوە کیمیاییەکان، کارەبایی، دروستکراوە خۆرییەکان.

**سامانە کانزاییەکان:** مۆلیبدنیۆم، مس، ئاڵتون، قورقوشم.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەرمینیا یان هایستان، لەسەر زمانی ئەرمەنیەکان خۆیان کە ئەویش لەناوی باپیرە گەورە و داستانییان کە بەباوکی ئەمەن : ( هایك ) ەوە هاتووە،وڵاتێکە دەکەوێتە سەر سنوورەکانی نێوان کیشوەری ئەوروپا و ئاسیا لەناوەڕاستی هەرێمی چیاکانی قەوقاز لەسەر تەپی سەختی ئەرمینیای شاخاوی. ئەرمینیا لە باکورەوە لەگەڵ جۆرجیا سنووردارە، لەگەڵ ئازەربیجان لە رۆژهەڵاتەوە و لەگەڵ ئێران لە باشوور و تورکیا لە رۆژئاواوە، و هیچ کەنارێکی لەسەر نییە. ناوەڕاستی ئەرمینیا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٤٦ بەرەو

رۆژهەلات و هێلی پانی ٣٠/٤٠ پلە بەرەو باکوور.

ئەرمینیا ولاتێکی شاخاوییە، لە زنجیرەیەك شاخ پێك دێت لە باشووری رۆژهەلاتەوە بۆ باکوری رۆژئاوا و لەنێوان زنجیرە شاخەکاندا کۆمەلێ بانی بەرز و نزم هەیە بەرزییەکانیان لە ٨٠٠ م بۆ دوو هەزار مەتر لە سەر ئاستی رووی دەریا. چیاکانی ئەرمینیا لە شێوەیەکی دەبێت و زۆربەی لوتکەکانیشی چالگەی گرکانی متە. بەرزترین لوتکەی شاخ لە سنووری ئەرمینیادا لوتکەی ( ئاراکازەر ) ە بەرزییەکشی دەگاتە ٤,٠٩٠ م لەسەر ئاستی دەریاوە.ئەو زەویانەی لە ئەرمینیا بۆ کشتوکالی دەشێن لە نێوانی ١٥ بۆ ٢٠٪ کۆی رووبەری ئەو ولاتە دەبێت، زۆربەیان دەکەونە دۆلی ئاراراتەوە کە بە سەنتەری چالاکی کشتوکالی ئەو ولاتە دادەنرێ.

گرنگترین روبارەکانی ئەرمینیا روباری ( هەرزادان ) ە کە لە دەریاچەی سیڤانەوە هەلدەقولێ و بەسەرچاوەی سەرەکی ئاوی پاکی ئەرمینیا دادەنرێت.لە هەردوو زمانی فارسی و تورکی بە ئەرمینیا دەوترێت ئەرمەنستان ( واتا ولاتی ئەرمەن ) و وشەی ئەرمینیا لەلای زاناکانی ئەنترۆپۆلۆجیا هێمایەکی نەژادی هەیە بۆ ئەو توخمەی پێی دەوترێ ئەرمەنی کە لە هەرێمی قەوقاز و ئاسیای بچوکدا لەدێر زەمانەوە نیشتەجێ بوون.

گەلی ئەمەنی دەچێتەوە سەر گەلە هیندو ئەوروپیەکان کە لەرێی دەشتەکانی روسیاوە ناوەراستی ئاسیایان بەجێ هێشت و لە ئەوروپا نیشتەجێ بوون. لەسەدەی شەشەمی پ.ز بەچوار دەوری شاخی ئاراراتدا نیشتەجێ بوون.لەگەلّ ئەو هەموو تێکەلاوییەی گەلی ئەمینیا لەگەلّ نەتەوە و میلەتانی دیکەی ناوچەکە بەلام هیچ کات رەسەنی خۆیانیان لەدەست نەداوە و زۆر بەخۆیان دەنازن و بەهەموو شێوەیەك پارێزگاری لە زمان و کەلتوور و شارستانیەتی خۆیان دەکەن. نزیکەی سێ ملیۆن ئەرمەنی لەدەرەوەی ولاتی خۆیان دەژین و بەردەوام لەهەولی ئەوەدان گەشە بە ئابووری ولاتەکەی خۆیان بدەن لەرێی ئەو هاتوچۆ و ئالوگۆریە بازرگانییەی کە لەدەرەوە بۆ ولاتی خۆیانی دەکەن.

ئەرمەن لە سەدەی سێهەمی زاینیەوە چۆتە سەر ئاینی مەسیح و ئاینی مەسیحی ئەرتۆدۆکسلە سالی ٣٠١ بەدواوە کرایە ئاینی فەرمی ئەو ولاتە و بەمەش دەکرێ بلێین کە ئەرمینیا یەکەم ولات بووە لە جیهاندا ئاینی فەرمی مەسیح راگەیەنێت. عەرەبە ئیسلامەکان لە نێوان سالەکانی ٦٤٠ ٦٥٣ بەزۆر چوونەتە ئەرمینیا و باجی بەزۆریان بەسەر میللەتەکەدا سەپاندووە، تا لە سالی ٧١٩ بریاری باجیان رەتکردەوە.لەسەرەتای سەدەی یانزدەیەمەوە تا سەدەیە چواردەیەم هەریەك لە هۆزە تورك و سەلجوقی و بیزەنتی و تەتەرەکان پەلاماریان داوە، لەگەلّ سەرەتای چاخی نوێدا ئەرمینیا بووە بەشێك لە

ئیمپراتۆریـــەتی عوسمـــانی، چـــەند جارێـــك ئەرمەنییـــەكان هـــەوڵی ئـــەوەیان داوە لـــە عوسمانییـەكان سـەرخۆ بن و خـاكی وڵاتیـانی لـێ پـاك بكەنـەوە تـا لەسـاڵی ١٩١٥ دا ئـەو جینۆسایدە گەورەیەی لێكەوتەوە كە توركەكان بەرامبەر بە ئەرمەنییەكان كردیان و نزیكـەی ١,٥٠٠,٠٠٠ ئەرمـەنی بوونـە قوربانی و زۆربـەی ئەرمەنییەكان لـەوڵاتی خۆیـان دەركران لـە رۆژئـاوای ئـەرمینیا و ئـەو ناوچـەیە ئێستا بـە توركیـای رۆژهـەڵات نـاودەبرێ ( هەرچـەندە توركەكان ئێستا نكوڵی لەو مێژووە راستەقینە دەكەن و دەڵێن قوربانیەكان تەنها ٣٠٠,٠٠٠ ئەمـەنێك بـووە و هیـچی تـر !! ) و ناچار زۆربـەی ئەرمەنییەكان هـەڵهاتن روویـان كـردە وڵاتـە عەرەبیەكان. لە بەرواری ٢٨ / ٥ / ١٩١٨ دا دامەزراندنی وڵاتی ئەرمینیا راگەیەنرا و لە ساڵی ١٩٢٠ دا كەوتـە ژێـر دەسـەڵاتی روسـیای شـیوعی و لـە سـاڵی ١٩٢٢ بـووە ئەندام لـە یـەكێتی وڵاتانی قەوقاز، لەساڵی ١٩٣٦ دا پاش ئەوەی ئەو یەكێتییە هەڵوەشێنرایەوە ئـەرمینیا بـووە ئەندامێكی سەربەخۆ لە یەكێتی سۆڤێت لە ژێر ناوی كۆماری ئەرمینیای سۆڤێتی.

لـە سـاڵی ١٩٩٠ پارتـە نـا شـیوعیەكان دەسـەلاتی حكومـەتیان بەهەڵبـژاردن بـردەوە و پەرلەمان بڕیاری دا كەچیتر یاساكانی یەكێتی سۆڤێت پـەیرەو نـاكرێ و یاسـای سـەربەخۆی خۆیـان راگەیانـد، لەگـەڵ رمـانی یـەكێتی سۆڤێت، لەهـەمان سـاڵدا، ئەرمینیا سـەربەخۆیی خۆی لە ٢٣ / ٨ / ١٩٩٠ دا راگەیاند و سەربەخۆیی لە دەنگدانی گشتیدا لـە ٢٢ / ٩ / ١٩٩١ دا پەسەند كرا، مـانگێ دوای ئـەو بـەرواره گـەلی ئەرمـەنی ( لیڤۆن تێر پیترۆسیان ) یـان وەك سـەرۆكی وڵات هەڵبـژارد، تـا ١٩٩٦ دووبـارە بەسـەرۆكی وڵات هەڵبژێردرایـەوە. لـە پـاش ئەویش رۆبیر كۆتشارینیان بووە سەرۆكی وڵات.

لە ساڵی ١٩٩٢ دا ئەرمینیا بۆتە ئەندامێكی نەتەوە یەككگرتووەكان.

لە بەرواری ٧ / ١٢ / ١٩٨٨ دا ئەرمینیا دووچار بوومەلەرزەیەك بـوو كـە نزیكـەی ٢٥,٠٠٠ كەسـی لـەناو بـرد و چـەند شـارێكی ئـەو وڵاتـەی وێـران كـرد و دووچـاری زیـانێكی ئـابووری گـەورەی كـردن. لـە سـاڵی ١٩٨٨ دا ئـەرمینیا و ئازەربێجان دووچـاری ململانێیـەكی نـەژادی بـوون لەسـەر هـەرێمی ( نـاجۆرنۆ - كارابـاخ كـە رووبەرەكـەی ٤٤٠٠ كـم$^2$ دەبێـت و بریتیـە لەكەلێنێك ئەرمەنی لەناو خاكی ئازەربێجان و ململانێكە بووە شـەرێكی گـەورە لـە نێوانیـان و قوربانییـەكی زۆری لێكەوتـەوە و بـووە هـۆی ئـاوارە و دەربـەدەر بـوونی بەهـەزارەها خێـزان لەهەردوو وڵات بەرەو وڵاتی یەكتر و ئێستاش كێشە لەسەر ئەو هەرێمە هەر بەردەوامە.

ئـەرمینیا لـە رۆژی ٢٨ / ٥ ی هـەموو سـاڵێك ئاهـەنگی نیـشتمانی دەگێڕێـت، جـەژنی سەربەخۆیی بونیشی لە ٢٢ / ٩ ی هەموو ساڵێك.

سروودی نیشتمانی : خاكی وڵات دایكمانە...

ئابووری ئەرمینیا پشتی بە پیشەسازی و کانزاکانی بەشێوەیەکی سەرەکی بەستووە، جگە لەوەی کشتوکاڵیش بەرێژەی ١٠ ٪ بەشداری لە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی دەکات.

هەروەها چالاکی گەشتوگوزاریش بەشداری لە بەرهەمی نەتەوەیی ئەو وڵاتە دەکات، چونکە ساڵانە نزیکەی ٧٠٠,٠٠٠ گەشتیار رووی تێدەکەن بەهۆی بوونی ئاسەوارێکی زۆر لەو ناوچەیە جگە لە چەندین سەرچاوەی کانزایی کە بۆ مەبەستی چارەسەر رووی تێدەکرێ.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢,٥ ملیار دۆلار

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهان: ١٢٩

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٦٧٠ دۆلاری ئەمریکییە.

## ئۆروگوای

ناوی باو: ئۆروگوای

ناوی فەرمی: کۆماری ئەرۆگوای رۆژهەلاتی

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Oriental Republic of Uruguay

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

دەزگـای یاسـادانان: لـە دوو ئەنجومـەن پێـك دێـت : ئەنجومـەنی پـیران ( ۳۱ ئەنـدام )، ئەنجومەنی نوێنەران ( ۹۹ ئەندام ).

رووبەر: ٦٦.٠٢٧ میل دووجا، ١٧٦.٢١٥ کم$^{2}$

سەرنشین: ٣.١٨٥.٠٠٠ سەرنشین ( ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان : ١٧.٨ کەس / کم$^{2}$

نەتـەوەکان: ئـەوروپی، میـستیزۆ ( تێکەڵەیـەکن لـە ئـەوروپی و هینـدە ئەمریکییـەکان )، ئەفریقییە پێست رەشەکان.

ئاین : مەسیح ( رۆمانی کاسۆلیك ، پرۆتستانت ) جولەکە، بێ ئاین.

زمان : ئیسپانی

پایتەخت : مۆنتیفیدیۆ

شارە سەرەکیەکان: سالتۆ، بایزاندۆ، لاس بیدراس، ریڤیرا.

دراو : بیسوا ئەرۆگوای

ئاووهـەوا: مـام ناوەنـد و شـێدار، ناوەنـدی پلـەکانی گـەرما لـە زسـتاندا دەچێتە ١١ پلـەی سەدی و لە هاویندا دەگاتـە ٢٣ پلـەی گـەرما، بـاران بەدرێـژایی سـاڵ دەبارێـت و رێژەکـەی لـە ساڵیکدا دەگاتە ١٠٢ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی: مانگا، مەڕ، گەنم، گەنمەشامی، ( برنج ) ، قامیشی شەکر.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروستکراوەکانی پێست، چیمەنتۆ، دروستکراوەکانی خـوری، دروست کراوە خۆراکییەکان.

سامانە کانزاییەکان : ئاڵتون، ئاسن، مس، زنك، قورقوشم، مەنگەنیز.

تێڕوانینێکی گشتی :

ئەرۆگوای دەکەوێتە سەر کەناری باشووری رۆژهەلاتی ئەمریکای باشوور. لەگەڵ بەرازیلدا لە باکوورەوە سنووردارە، زەریـای ئەتڵەسـی دەکەوێتـە رۆژهـەلات و باشـووری و ئەرجەنتین دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاسـتی ئۆرۆگـوای دەکەوێتە سەر یـەکبڕی هێڵـی درێـژی ٥٤ بـەرەو

رۆژئاوا و هێڵی پانی ۳۰ بەرەو باشوور.

دەشتەکانی ئەرۆگوای دەکەونە سەر کەناری زەریای ئەتڵەسی و روباری ئەرۆگوای و روباری ریو دی لا بلاتا. ئەو دەشتانەش یەك لەسەر پێنجی رووبەری وڵاتە دەبن بە مەبەستی کشتوکاڵی خراونەتە گەڕ. گەورەترین بەشیشی پێك دێت لەو زەویە ناوخۆییە نزمانەی کە لەهەندێ شوێن تەپە و گردۆلکە بچوکیان لەسەر و تێکرا بە گژوگیای سروشتی داپۆشراوە و بۆ کشتوکاڵی و لەوەڕی ئاژەڵ سوودیان لێ دەبینرێ.

ئەرۆگوای نازناوی ( خاکی ئەرخوانی ) لێنراوە بەهۆی بلاوبونەوەی روەکێك پێی دەوترێت لەوەڕی کۆتر لەوەرزی بەهاردا و ئەم رووەکە چەندین رەنگی هەیە بەلام پێدەچێ رەنگی ئەرخەوانی زۆر زاڵ بێت بەسەریدا.

بەلام ناوی ئەرۆگوای لە روباری ئەرۆگوایەوە وەرگیراوە کە بەسەر سنوورەکانی نێوان ئەرۆگوای و ئەرجەنتیندا تێپەڕ دەبێت. ئەو وشەیەی بە زمانی دانیشتوانی زووی ئەو وڵاتە بەمانای : ئاوێکی زۆر دێت.لەدوای سەربەخۆیی ئەو وڵاتەوە لە ۱۸۲۸ بەدواوە ناونرا : باندا ئۆرێنتاڵ ( واتا کەناری رۆژهەلات ) لەبەر ئەوەی کە دەکەوێتە رۆژهەلاتی ئەو روبارەوە و دانیشتوانی ئەرۆگوایش بە رۆژهەلاتیەکان ناسراون.

هیندە سوورەکانی ئەمریکا یەکەمین دانیشتووی ئەو ناوچەیەی بوون و گەورەترینیشیان هۆزەکانی ( تشاروا ) کە لێهاتووترین هۆزەکان بوون لە هونەری شەرکردندا.لە ساڵی ۱۵۱٦ دا دەریاوانی ئیسپانی خوان دی سۆلیس یەکەم پیاوی سپی پێست بوو پێی بگاتە خاکی ئەرۆگوای بەلام پیاوانی تشاروا گرتیان و لەگەڵ پیاوەکانی کوشتیان.لە ساڵی ۱٦۲٤ ئیسپانییەکان دەستیان کرد بە دامەزراندنی داگیرکراوەکانیان لەو ناوچەیە. لە ساڵی ۱٦۸۰ پورتوگالیەکانیش لەلایەن خۆیانە لە بەرازیلەوە هاتنە ئەرۆگوای و چەند داگیرکراوەیەکیان لێ سازکرد.بەلام هێندەی نەخایان لەنێوان ئیسپان و پۆرتۆگالیەکان شەڕ و پێکدادان دروست بوو و لە سەدەی هەژدەیەمدا ئیسپانەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێنا.بەلام گەلی ئەرۆگوای لەساڵی ۱۸۱۱ دا شۆڕشیان لەدژیان هەڵگیرسان و لە ساڵی ۱۸۱۲ دا توانیان وڵاتەکەیان ئازاد بکەن، بەلام لە ساڵی ۱۸۲۱ دا پورتوگالیەکان توانیان ئەرۆگوای بخەنە سەر بەرازیل. سەر لەنوێ گەلی بەرازیل بەرامبەر بەم بارودۆخە نوێیەش راپەڕین و لە ۲۵ / ۸ / ۱۸۲۵ دا سەربەخۆیی خۆیانیان راگەیاند و لە ساڵی ۱۸۲۸ دا وەك کۆمارێکی سەربەخۆ وەك کۆمارێکی سەربەخۆ دانی پیانراو یەکەم دەستووری لە ساڵی ۱۸۳۰ بۆ دانراو ( خۆزێیە فرۆکتۆسۆ وەك یەکەم سەرۆك وڵاتی بۆ دیاری کرا، ئەمیش یەکێك بوو شۆڕشگێڕە نیشتمان پەروەرەکان. پاش چەند ساڵێك شەڕی ناوخۆی تیا هەڵگیرسا و تا ساڵی ۱۸۵۱

كۆتایی پێهات.

ئەرۆگوای لە جەنگی جیهانی دووەمدا شەڕی لەدژی وڵاتانی میحوەر ڕاگەیاند و لەساڵی ١٩٤٥ دا بووە ئەندامی نەتەوە یەكگرتووەكانەوە.

لە ساڵی ١٩٩٥ دا جۆلیۆ ماریا سانجۆنیتی دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست و لە ساڵی ١٩٩٩ خۆرخی بیتلی بە هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتی توانی سەرۆكایەتی وڵات بگرێتە دەست، بیتلی ئەندامی پارتی كۆلۆرادی دەسەڵاتدار بوو.

ئابووری ئەرۆگوای پشتی تەواوی بە چالاكی كشتوكاڵی بەستووە و بەرهەمە كشتوكاڵی و ئاژەڵیەكانی ئەم ئەركەی گرتۆتە خۆ.

تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی : ١٤,٧ ملیار دۆلاری ئەمریكیە.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٦٨ هەمین وڵاتە.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤,٦٥٠ دۆلاری ئەمریكیە.

ئەرۆگوای بە پلەی حەوتەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی خوریدا و بە پلەی دوانزدەیەمین دێت لە مەڕو ماڵاتدا.

لە ڕۆژی ٢٥ / ٨ / هەموو ساڵێك ئاهەنگی نیشتیمانی دەگێڕن وەك یادێك بۆ ڕۆژی سەربەخۆیی ٢٥ / ٨ / ١٨٢٥.

سروودی نیشتیمانی : ئەی ڕۆژهەڵاتیەكان، یان نیشتمان، یان نەمان.

لە هاوینی ٢٠٠٢ دا ئەرۆگوای دووچاری تەنگەژەیەكی ئابووری گەورە بوو بەهۆی ئەو كێشە ئابووریە بەر لە چوار ساڵ تووشی بوو بوو، ئەمەش بووە هۆی دابەزاندنی بەهای دراوەكەی ( بیسوا ) و جۆرێكی لە بێباوەڕی گشتی لە ئابووریدا دروست كرد و سەرمایەیەكی زۆری لە سنوورەكانەوە لەو وڵاتە دزەی كرد و دابەزاندنی یەدەگی بانكی سەنترالی ئەو وڵاتە و لە ئاكامدا چەندین مانگرتن و ئاژاوەی لەنێو شارەكانی ئەو وڵاتە لە دژی حكومەت و تاڵانی و بلاوبوونەوەی گەندەڵی لەو وڵاتەدا و تا ئەم دواییانەش كێشەكان هەر بەردەوام بوون.

## ئیسپانیا

ناوی باو: ئیسپانیا

ناوی فەرمی : شانشینی ئسپانی

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی: Kingdom of Spain

سیستەمی حوکمڕانی: پادشایی دەستووری، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: پێك دێت لە دوو ئەنجومەن : ئەنجومەنی پیران ( ۲٤۸ ئەندام )، ئەنجومەنی نوێنەران ( ۳٥۰ ئەندام ).

ژمارە سەرنشینان: ٤۱,۰۰۰,۰۰۰ سەرنشین.

چڕی دانیشتوان: ۷۷,۷ کەس / کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئیسپان ( ۷٥ ٪ )، کتالان، گالیسیان، باسك.

ئاین : مەسیح ۹٥ ٪ (ڕۆمانی کاسۆلیك، پرۆتستانت)، موسڵمان.

زمان: ئسپانی قشتالی، سێ زمانی دیکەش لەسێ ناوچە لە باکوری ئیسپانیا پەیڕەو دەکرێ: کتالۆنی، گالیسی، باسکی.

پایتەخت : مەدرید

شارە سەرەکییەکان: بەرشەلۆنە، ڤانسیا، سیڤیل ( ئیشبیلیە )، زاراگۆزا.

دراو : بیزیتا، یۆرۆ لە بەرواری ۱ / ۱ / ۲۰۰۱ دا.

ئاووهەوا: بانی میسیتا : گەرم و خۆرهەتاو بەدرێژایی ساڵ، گەرمی لە هاویندا ۲۷ پلەی سەدی و لە زستاندا ‎-۱‎ پلەی سەدی. دەشتەکانی سەر کەنار و دورگەکانی بلیار : زستانی مام ناوەند و بارانە هاوینی گەرم و وشکە و پلەکانی گەرما لە ٤ بۆ ۲۷ پلە سەدی، باران لەسەر سنوورەکان ساڵانە ٥۰ سم دەبێت. شاخەکانی باکور : باران و بەفرێکی زۆر و بەدرێژایی ساڵ بارانی لێ نابڕێت و دەگاتە ۱٥۰ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: گەنم، ترێ، جۆ، پەتاتە، بەراز، ڕاوە ماسی، مەڕو ماڵات، شیر، زیتون، پرتەقاڵ، تەماتە.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئۆتۆمبێل، ئاسن، پۆلا، دروستکراوە خۆراکییەکان، دروست کراوە پیترۆکیمیاییەکان، ئامێری کارەبایی و ئەلەکترۆنی. دروستکراوەکانی پێست، دروستکراوەکانی خووری.

سامانە کانزاییەکان: جیوە، پۆتاسیۆم، یۆرانیۆم، قورقوشم، ئاسن، لیزیت.

تێڕوانینێکی گشتی :

ئیسپانیا وڵاتێکە پێنج شەشی نیمچە دورگەی ئیبیری، کە دەکەوێتە(لای باشووری

ڕۆژئاوای ئەورووپا ) داگیر كردووە. زەریای ئەتڵەسی دەكەوێتە باشوور و باكوور و ڕۆژئاوای ئیسپانیا، فەڕەنسا لە باكور و دەریای سپی ناوەڕاست لە ڕۆژهەلات و باشوور، تەنگەی چیای تاریق كە پانتاییەكەی ۱۳ كم دەبێت ئیسپانیا و ئەفریقیا لەیەك جیا دەكاتەوە. چەند ناوچەیەكی دیكەشی لەسەرە : ناوچەی لیڤیا كە سەر بە خاكە فەرەنسیەكانە و دورگەكانی بلیار لە دەریای سپی ناوەڕاست و دورگەكانی كەناری كە دەكەوێتە زەریای ئەتڵەسی نزیك كەناری ڕۆژئاوای باشوری مەغریب. ئێستا هەردوو شاری سەبتە و مەلیلە كەدەكەونە ئەوپەڕی باكووری مەغریب و مەغریبیش وای باس لێوە دەكات مەغریبی بن ئەمە و جگە لە چەند دورگەیەكی مەغریبی كە بەردەوام مەغریب داوایان دەكاتەوە.ولاتی ئەندۆرای بچوك دەكەوێتە سەر سنوورەكانی نێوان ئیسپانیا و فەڕەنسا. ناوەڕاستی ئیسپانیا دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٤ بەرەو ڕۆژئاوا و هێڵی پانی ٤٠ بەرەو باكور.

نزیكەی ۷٥ ٪ ی خاكی ئیسپانیا شاخاوییە، لە ناوەڕاستدا بانی میسیتایە و لەباكوریشی زنجیرە چیای بیرنێیە كە بەتەواوەتی لە ئەورووپای جیادەكاتەوە، لەباشووریشەوە زنجیرە چیای سیرا نیڤادا ی تێدەكەوێت، بەلام ناوچە دەشتاییەكان تەنها لەسەر كەنار و حەوزی ڕووبارەكاندایە.

بە ناو خاكی ئیسپانیا چەند ڕوبارێك تێدەپەڕێت، گرنگترینیان: ڕوباری تانگۆ، دۆلی گەورە، ئەوانیش لە بانی میسیتاوە سەرچاوەیان هەڵدەقوڵێ و بەرەو ڕۆژئاوا ڕێچكە دەبڕن تاكو دەڕژێنە زەریای ئەتڵەسی. ڕوباری ئیبرۆ كە لەباكووری ڕۆژئاوای ئەو ولاتە تێدەپەڕێ تاكو دەڕژێتە نێو دەریای سپی ناوەڕاست.

نزیكە ۱۰۰,۰۰۰ ساڵ لەمەو پێشەوە مرۆڤ لە ئیسپانیادا ژیاوە. فینیقی و قرتاجی و ڕۆمان و قوت هۆزەكانی وانداڵ یەك بەدوای یەك داگیریان كردووە.

لە نێوان ساڵەكانی ۷۱۱ – ۱٤۹۲ كەوتە ژێر دەسەلاتی عەرەبەوە، لەم قۆناغەشدا عەرەبەكان چەندین ئاسەواریان لەو ناوچەی جێهێشتووە و چەند جارێك دووچاری شەڕ و پێكدادان بوون لەگەڵ خەڵكی ڕەسەنی ولاتەكە. چەند جارێك هەوڵی یەكخستنەوەی هەرێمە ئیسپانیە مەسیحەكانیان داوە لەپێناوی بۆ دەركردنی عەرەب لەو ولاتە. لە ساڵی ۱٤۷۹ دا هەردوو شانشینی ئاراگۆن و قشتالە یەكیان گرتووە لەئاكامی ئەو یەكگرتنە ولاتی نوێی ئیسپانیا دامەزراوە. لەساڵی ۱٤۹۲ دا ئیسپانەكانیان توانیان غەرناتە لەعەرەبە موسڵمانەكان بسەننەوە و لەهەمان ساڵدا كریستۆفەر كۆلۆمبۆس بەناوی شا و شاژنی ئیسپانیا ( فردیناند و ئیزابێل ) جیهانی نوێی ( ئەمریكای ) دۆزیەوە. ئەم ڕووداوە گرنگەش دەروازەی لەبەردەم ئیسپانەكاندا والا كرد بۆیە توانی هێزێكی داگیركەری نوێ پێك بهێنێ. ئیسپانیا لە

سەردەمی ئیمپراتۆر شارلی پێنجەمدا ١٥١٦ – ١٥٥٦ توانی بگاتە چڵەپۆی سەروەری و دەسەڵات. بەڵام هێندەی نەخایاند دووچار تێکشکان و رمان بووەوە و زۆربەی خاوەندارییەکانی لە ئەوروپا و ئەفریقیا و جیهانی نوێ یەك لەدوای یەك لەدەست دا.

لە ساڵی ١٩٣١ دا کودەتا بەسەر شای ئیسپانیادا کرا و سیستەمی کۆماری تیا راگەیەنرا، لە ئاکامدا شەڕی ناوخۆ ١٩٣٦ – ١٩٣٦ بەرپابوو و جەنەراڵ فرانکۆ توانی کۆمار بڕوخێنێ ودەسەڵاتی وڵات بگرێتە دەست و حوکمێکی دڕندانە و دیکتاتۆری تیا پەیڕەو کرد تا ئەو کاتەی کە کۆچی کرد ٢٠ / ١١ / ١٩٧٥، فرانکۆ نازناوی کۆدیبۆی لەخۆ نابوو، واتا سەرۆکی باڵا.لە قەبرستانێکی گەورە لە یەکێك لە ناوچەکان مەدرید کەخۆی دروستی کردبوو بەخاك سپێردرا.

لە ٢٢ / ١١ / ١٩٧٥ دا ( خوان کارلۆس ٣٧ ساڵ ) کرایە شای ئیسپانیا. خوان کارلۆس زنجیرەیەك چاکسازی بەئەنجام گەیاند، لە ساڵی ١٩٧٨ دا بڕیاری دەستووری دیموکراسی ( ئێستای ئیسپانیا ) درا، بەمەش حوکمی دیکتاتۆریەتی فرانکۆی ژێر گڵ نا کە نزیکەی سی ونۆ ساڵی خایاند. شا خوان کارلۆس سەرۆکی وڵاتە بەڵام رۆڵی سیاسی تەنها هێمایەکە و سەرۆکی حکومەت پەیڕەوی دەسەڵاتی ئیسپانیا دەکات جگە لەوەی پەرلەمان بەهەڵبژاردنێکی گشتی بەشداری لە حوکم دەکات.

ئیسپانیا لە ساڵی ١٩٥٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان.

ئیغریقیەکان ناوی : ئیبیریا یان لێنابوو کە لە سەردەمی شارستانیەتی ئیسلامدا بە ئەلئەندەلوس ناسرابوو. بەڵام ئیسپانییەکان بە وڵاتی خۆیان دەڵێن ئیسپانا، ئەویش لەناوە لاتینیەکەیەوە وەرگیراوە : هیسپانیا، کە لەدوو وشەی بەرەچەڵەك فینیقی پێك دێت بەمانای : کەناری کەروێشکەکان.

ئیسپانیا بەناوی ئەلئەندەلوس ناسرا لەسەردەمی حوکمی عەرەبی ئیسلامدا، ئەم ناوەش لە بنەڕەتدا لەلایەن هۆزەکانی واندالەوە پەیدا بووە کە ناوچەکەیان داگیرکردووە لێی نیشتەجێ بوون پاش ئەوەی لەوڵاتی جالا ( فەرەنسا ) وە هاتبوون. بۆیە ناونرا ئەندەلوسیا تا لە دواییدا رووپۆشێکی عەرەبی کرا و کرایە ئەندەلوس و هۆکاری ئەو ناوەش وەکو لە نوسینەکانی ئیبن و ئەلسیردا هاتووە دەگەڕێتەوە بۆ ئەندەلوس کوڕی سابت کوڕی نوح کە یەکەم کەس بووە لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بووە. پاش والا کردنی ئیسلام بەتەواوەتی ناوی ئیسپانیا ون بوو.

ئیسپانیا تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم یەکێك بوو لە وڵاتە هەرە دواکەوتووەکانی ئەورووپای رۆژئاوادا و زۆربەی دانیشتوانی لە جوتیارە هەژارەکان بوون. بەڵام لە پەنجاکان و

شەستەکانی سەدەی رابردوو گەشە کردنێکی ئابووری خێرای بەخۆوە بینی و بارودۆخی ولاتەکەی گۆڕی و بەرەو ولاتێکی پیشەسازی بەتوانا ناسراو وئێستا یەکێکە لە ولاتە زۆر پێشکەوتوەکانی ئەوروپا لە بواری گەشتوگوزاریدا، سالانە پێشوازی لە شەست ملیۆن گەشتیار دەکەن کە رووی تێدەکەن. گەلی ئیسپانیا ئێستا خاوەنی ئازادییەکن بەدرێژایی مێژووی ئەو ولاتە بەخۆوە نەبینراوە و باوەڕێکی گەورەیان بە پاشەڕۆژی ولاتەکەیان هەیە.

سروودی نیشتیمانی : کاروانی پادشایی.

پشووی نیشتیمانی: ١٨ / ٧ / رۆژی کرێکاری ئیسپانی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٥٢٥,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١٠ ولاتە

نێوەندی خەرجی تاك لە سالێکدا: ١٣.٢٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ئیسپانیا بە پەلەی یەکەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە بەرهەمی زەیتون و بە پلەی سێهەم لە بەرهەمی شەراب و بە پلەی شەشەم لە بەرهەمی جۆ و بە پلەی حەوتەم لە بەخێو بەران، پانزدەیەم لە زنك، و دوانزدەیەم لە بەرهەمی پەتاتە، سیانزدەیەم لە بەخێوکردنی مەڕ پانزدەیەم لە بەرهەمی زیو و لینیت بە پلەی شانزدەیەم لە راوە ماسی و حەڤدەیەم لە بەرهەمی خەلووز.

ناوچەی باسك و رێکخراوی ئیتا:

باسك هۆزێکن لە چیاکانی بیرنێە لەسەر سنوورەکانی نێوان فەرەنسا وئیسپانیا دەژین، ژمارەیان لە فەرەنسا ٧٠٠ هەزار کەس، لە ئیسپانیا سێ ملیۆن کەس دەبن، زمانەکەیان : بسکیرا، یان بەسکارا یە وزمانێکی سەربەخۆیە و هیچ پەیوەندییەکی بەرچاوی لەگەلْ زمانەکانی تردا نییە.

لە سالی ١٩٣٧ دا جەنەرالْ فرانسیسکۆ فرانکۆ مافەکانی باسکی بەتەواوەتی پێشێل کرد تەنانەت پەیڕەو کردنی زمانی خۆشیان قەدەغە کرا. لەسالْ ١٩٥٨ دا رێکخراوی سەربەخۆی باسکی : ئیتا دامەزرا، ئیتا وشەیەکە لە سێ پیتی سەرەتای سێ وشەی باسکی پێك هاتووە:

Euzkadi Ta Azkatasuna

ماناکەشی : باسك نیشتمانی ئازادی.زۆربەی باسکییەکان داوای حکومەتێکی تایبەت و کەلتورێکی سەربەخۆیان کردووە، ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی گرفتی گەورە لەگەلْ حکومەتی ئیسپانی و لەئاکامدا توندڕەوییەکی زۆر لەولاتەکەیاندا بلاو بۆوە و لەچەندین شاری ئیسپانیا کاری تیرۆریستی ئەنجامدراوەو قوربانییەکی زۆری لەنێو خەلکی شارستانی

لێکەوتۆتەوە. حکومەتی ئیسپانی لە ساڵی ١٩٨٠ مافێکی سنووورداری ئۆتۆنۆمی بە گەلی باسك بەخشی و سێ هەرێم لەناو ئیسپانیادا ئۆتۆنۆمیان پێ بەخشرا، بۆیە لەناوچەکەدا هەڵبژاردنەکان دەستیان پێکرد بۆ دامەزراندنی پەرلەمانێکی تایبەت و دەستیان کرد بە کۆنترۆڵ کردنی شێوازەکانی خوێندن و پۆلیس و باج و کاروبارە ناوخۆییەکان. بەلأم هێشتا ئەمانە خواست و ویستی گەلی باسکی بەتەواوەتی پڕنەکردبۆوەوە، چونکە ئەوان دەیانویست بەتەواوەتی لە ئیسپانیا جیاببنەوە. لەبەرواری ١٦ / ٩ / ١٩٩٨ دا ڕێکخراوی ئیتا پابەندی خۆی بە ڕێکەوتنێکی کراوە ڕاگەیەند بەهیوای دۆزینەوەی ڕێگاچارەیەك بۆ چارەسەری کێشەکانیان لەگەڵ حکومەتی ئیسپانیا. پاش ئەوەی گفتوگۆکان هیچ ئەنجامێکی نەبوو لەبەرواری ٢٨ / ١١ / ١٩٩٨ دا ئیتا پرۆسە سەربازییەکانی لەدژی حکومەتی ئیسپانیا ڕاگەیاند و سەرەتا بە تەقاندنەوەی دوو ئۆتۆمبێلی لە ناوەڕاستی شاری مەدرید لە ٢١ / ١ / ٢٠٠٠ دەست پێکرد و ئەمەش بووە هۆی کوژران و بریندار بوونی بەدەیان هاوڵاتی. لە ئاکامدا چەندین خۆپیشاندان لەتەواوی شارەکانی مەدرید دەستی پێکرد و داوای دۆزینەوەی ڕێگا چارەیەکی ئاشتیانەیان بۆ ئەو بارودۆخە ناهەموارە دەکرد. بەلأم توندرەوی لەلایەن باسکەوە هەر بەردەوام بوو، بەردەوام هەواڵەکانی تیرۆکردن و تەقینەوە بەردەوام بوو.

لە بەرواری ٢٥ / ٥ / ٢٠٠١ دا حکومەتی هەرێمی باسك ڕایگەیان کە بەنیازە لەرێی دەنگدانێکەوە سەربەخۆیی باسك لە ئیسپانیا ڕابگەیەنێت لە دوو ساڵی داهاتوودا. بەلأم ئەمە بووە هۆی دەربڕینی ناڕەزاییەکی زۆر لەلایەن سەرۆك وەزیرانی ئیسپانیاوە ( خۆسێە ماریا ئەنزار ) کە پەیرەوی ڕەوتێکی توند دەکات لە دژی ڕێکخراوی ئیتا.

لە هاوینی ٢٠٠٢ دا پەرلەمانی و حکومەتی باسکی بەڵگەنامەیەکی خستەروو تیایدا داوای مافی چارنووسی گەلی باسك دەکات. بەلأم حکومەتی ئیسپانی زۆر بەخێرایی ئەم داواکارییەی ڕەت کردەوە و ئەنجومەنی نوێنەرانی ئیسپانی بڕیارێکیان بە قەدەغە کردنی چالاکی ڕێکخراوی باتاسۆنای باسکی دەرکرد بەو هۆیەوە کە پەیوەندییان بە کۆمەڵەی ئیتای باسکی سەربەخۆیان هەیە.

## ئوستورالیا

**ناوی باو:** ئوستورالیا

**ناوی فەرمی:** کۆمۆنوێلتی ئوستورالی

**ناوی فەرمی بەئینگلیزی :**
Commonwealth of Australia

**سیستەمی حوکمڕانی:** پەرلەمانی یەکگرتوو، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیایە و دادوەرێکی گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران. ئەندامە لە کۆمۆنوێلتی بەریتانی.

**دەستەی یاسادانان:** لە دە ئەنجومەن پێك دێت: ئەنجومەنی پیران ( ٧٦ ئەندام )، ( ئەنجومەنی نوێنەران ١٤٨ ئەندام ).

**رووبەر :** ٢,٩٦٦,٢٠٠ میل دووجا، ٧,٦٦٢,٣٠٠ کم$^{٢}$

**سەرنشینان:** ١٩,٥٠٠,٠٠٠ سەرنشین ( ٢٠٠١ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢,٤ کەس کم$^{٢}$

**نەتەوەکان:** ئەورووپی، ئاسیایی، ئوستورالییە رەسەنەکان.

**ئاین:** مەسیح، موسڵمان، بوودی، جولەکە، هیندۆس.

**زمان :** ئینگلیزی

**پایتەخت :** کانبێرا

**شارە سەرەکییەکان :** سیدنی، ملبۆرن، برزین، بێرس، ئەدیلید.

**دراو :** دۆلاری ئوستورالی

**ئاو وهەوا:** دوو سێی باشووری وڵاتەکە کەشو هەوایەکی مام ناوەند، هاوینی بەشێوەیەکی گشتی گەرم و وشکە وزستانی شێدارە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، میوە و سەوزە، قامیشی شەکر، جۆ، لۆکە، مەڕو ماڵات، خووری، راوە ماسی، دارستانێکی زۆر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوە خۆراکییەکان، دروست کردنی کەلوپەلی ناوماڵ، کاغەز، دروست کرداوە کیمیاییەکان، دروست کراوەکانی خووری، پیلاو، ئامێری ئەلەکترۆنیەکان.

**سامانە کانزاییەکان:** مس، ئاڵتون، قورقوشم، زیو، زنك، ئەڵماس، یۆرانیۆم، ئاسن، خەڵووز، نەوت، گاز، نیکل، لینیت، بۆکسیت.

تێڕوانینێکی گشتی :

ناوی ئوستورالیا لە لێکدانی دوو وشەی لاتینی هاتووە :Terra Australis بەمانای خاکی باشوور، وڵاتێکە دەکەوێتە نیوە باشووری گۆی زەوی و تاکە وڵاتە لە تەواوی جیهاندا کە بەتەنها کیشوەرێکی سەربەخۆش بێت، هاوکات بچوکترین کیشوەرە.لە ڕۆژهەڵاتەوە دەڕوانێتە سەر زەریای هێمن و لە ڕۆژئاواوە دەڕوانێتە سەر زەریای هیندی.نزیکەی ٣٠٠٠ کم ەوە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە دوورە و ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەك بری هێڵی درێژی ١٣٥ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٥ بەرەو باشوور. چەند دورگەیەکی لەخۆ گرتووە و دەکەوێتە نزیك کەنارەکانی، گەورەترینیان دورگەی تەسمانیایەو نزیکەی ٢٠٩ کم لە باشووری ڕۆژهەڵاتیەوە دوورە، جگە لەوەی چەند دورگەیەکی دیکەش لەهەردوو زەریای هیندی و هێمن سەر بە ئوستورالیان، لەوانە: دورگەی نۆرفۆلك، دورگەکانی دەریای کۆراڵ ( لە زەریای هێمن )، دورگەکانی ئاشواژۆ و کارتێر و دورگەی کریسماس و دورگەکانی کۆکۆس و دورگەکانی هێرد و ماکدۆناڵد ( لە زەریای هیندی ).

دەشتەکان نزیکەی لە ٩٠ ٪ ی ئەو وڵاتە دەبێت و زۆربەشیان بیابانن، بەشەکەی دیکەشی پێك دێت لە بەرزاییە ڕۆژهەڵاتیەکان و بانی ڕۆژئاوا.

خەلکی ڕەسەنی ئوستورالیا لە هۆزە ڕاوچیەکان بوون کەلانی کەم ٣٨ هەزار ساڵ لەمەوبەر نیشتەجێ ی بوون و پێیان دەوترێت ئەبۆریجییەکان.تائێستاش هەندێکیان لەسەر ئەو کیشوەر دەژین، سەرباری ئەو هەڵمەتە لەناوبەرە یەك لەدوایەکانەی لەلایەن داگیرکەری ئەوروپییەوە، بەتایبەتی بەریتانیەکان،دووچاریان بووە. هەروەها چینی و ئەندەنوسیەکانیش لێی نیشتەجێبوون.پورتوگالییەکان لە سەدەی شانزدەی زایینی دۆزیویانەتەوە و هۆڵەندی و ئیسپانییەکان لە کەنارە باکوری و ڕۆژئاواییەکانی ئوستورالیا نیشتەجێ بوون لە سەدەی حەڤدەی زایینی.لە ساڵی ١٧٦٨ دەریاوانی بەریتانی کاپتن جیمس کووك گەیشتۆتە ئوستورالیا و بە بەریتانی کردنی ڕاگەیاند.پاش ئەوە لە وڵاتە ئەوروپیەکانەوە خەڵکانێکی زۆر ڕوویان تێکرد بەتایبەتی بەریتانی و ئێرلەندییەکان و ئاڵتونیان تیا دۆزییەوە و بووە هۆی گەشە پێدانێکی خێرای ئابووری ئوستورالیا، ئەمەش لە دواییدا بووە هۆی خوڵقاندنی دیموکراسیەت لە زۆربەی داگیرکراوە ئوستورالیەکان، بە پێکهێنانی یەکێتی فیدالی بۆ داگیرکراوەکان ڕاگەیاندنی سەربەخۆییان لە ١ / ١ / ١٩٠١ دا.

بەڵام سیاسەتی دەرەوەی ئوستورالیا، لەگەڵ ئەوەی بەرواڵەت سەربەخۆیی پێوە دیارە، هەر لەژێر دەسەڵاتی حکومەتی بەریتانیا مایەوە لە لەندەن، کە تەواوی بڕیارە سیاسیەکانی سەبارەت بە ئوستورالیا دەر دەکرد بێ ئەوەی بایەخ بە پەرلەمانی ئوستورالی بدات یاخود

پرسێکی بە حکومەتەکەیان بکات.بەڵام لە رووی بەرگرییەوە ئوستورالیا بە سەربەخۆیی مایەوە بەتایبەت پاش ئەوەی بەریتانیا رووی بەرەو ئەوروپا وەرگێرا. لە ساڵی ۱۹٤۲ دا بریاری ( وێستمنسر ) جێ بەجێ کرا کە تیایدا هاتووە دەبێ مافی ئۆتۆنۆمی بە ئوستورالیا ببەخشرێت چ لە کاروبارە ناوخۆییەکاندا یاخود دەرەکییەکان بێت، تا لە ساڵی ۱۹۸٦ دا بەتەواوەتی خۆتێهەڵقورتانی بەریتانی لەکاروباری ئوستورالیا کۆتایی پێهات. لە ساڵی ۱۹٤٥ دا ئوستورالیا پەیوەندی کردووە بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

بەهۆی ویستی گەلی ئوستورالیا لەوەی کە ئارەزوی ئەوەیان دەکرد سەرۆکێکی فیعلی خۆیان هەستێت بەکردنەوەی خولی یارییە ئۆلۆمپیەکانی هاوینی ۲۰۰۰ لە سیدنی لەبری ئەوەی شاژنی بەریتانیا ئەم کارە ئەنجام بدات، بۆیە لە سەرەتاکانی ۱۹۹۸ دا دەستکرا بە لێکۆڵینەوە لەسەر گۆڕینی سیستەمی حوکمڕانی و پشت بەستن لەهەڵبژاردنی سەرۆکێك بۆ وڵاتی خۆیان لەرێی گەلەوە بێت یاخود لەرێی پەرلەمانی یەکگرتووی ئوستورالیا. لەمەوە وا چاوەڕوان دەکرا کە پەیوەندیەکانی نێوان بەریتانیا و ئوستورالیا بپچڕێ دانیشتوان و سیستەمی نوێ لە کۆتاییەکانی ۱۹۹۹ دا جێ بەجێ بکرێت، واتا پاش تەواو بوونی سەد ساڵ لەو سیستەمەی بەریتانیا. بەڵام ئوستورالیەکان بە رێژەی ٥٤،٧ ٪ دەنگیان بە بەڵێ بۆ شاژنی بەریتانیا دا بەرامبەر بە رێژەی ٤٥ ٪ دەنگیان بە نا بۆ کۆماری دا لە کۆی ئەو دەنگدانەی کە لە ٦ / ۱۱ / ۱۹۹۹ دا لە ئوستورالیا بەرێوە چوو لەو شەش ویلایەتەی کە یەکێتی ئوستورالیان پێك هێناوە و ئەوانەش :

١. نیو ساوس وێڵز.
٢. ڤیکتۆریا
٣. کوینزلاند
٤. ئوستورالیای باشوور.
٥. ئوستورالیای رۆژئاوا.
٦. تەسمانیا

جگە لەهەردوو هەرێمی :

١. هەرێمی باشوور.
٢. هەرێمی پایتەختی ئوستورالیا ( کانبێرا ) کە لە ساڵی ۱۹۸۸ دا حوکمی ئۆتۆنۆمی دەستگیر بوو و بەهێمای ACT دەستنیشان کرابوو کە کورتکراوەی سەرەتای هەر سێ وشەی :Australian Capital Territory دێت.

ئوستورالیا لە بەرواری ۱ / ۱ / ۲۰۰۱ دا ئاهەنگی یادی سەد ساڵەی دامەزراندی یەکێتی

نوستورالیای گێرا، بەردەوام لە رۆژی ١ / ١ / لەهەموو ساڵێك جەژنی نەتەوەیی دەگێڕن، كە تیایدا یادی گەیشتنی یەكەم گەلە كەشتی لە كۆچبەرەكان دەكات بەسەرۆكایەتی فیلیپ و بەرزكردنەوەی ئالای بەریتانی لە كەنداوی سیدنی لە ساڵی ١٨٣٣

بەڵام دادوەری گشتی لە ئوستورالیا تەنها فەرمانبەرێكی رەمزییە و ئەركەكانی وەك ئەركی شاژنی بەریتانیا وایە، دادوەر ئەركی پانگەشەی كۆبوونەوەی پەرلەمانی لەسەرە وهەر ئەویش كۆتایی پێدەهێنێت، سەرۆكی گشتی هێزە چەكدارەكانە و نوێنەری دەسەڵاتی جێبەجێكردنە لە نێو حكومەتی یەكگرتوودا. جگە لەمانەش دادوەری ئوستورالیا دادوەری گشتی سەرۆك وزیران دادەمەزرێنێت و كابینەكانی سەرۆكایەتی لەسەر پێشنیاری پەرلەمان یەكگرتووە.

دادەوری گشتی لەلایەن شاژنی بەریتانیەوە دادەمەزرێنرێت بە پێی بریاری پەرلەمانی یەكگرتوو.

٨٥ ٪ دانیشتوانی ئوستورالیا لە نێو شارەكاندا ژیان بەسەر دەبەن، لە ١٣ ٪ لە گوندەكاندا نیشتەجێ بوون. زۆربەی دانیشتوان لەرێی كۆچكردنەوە هاتوونەتە ئەو وڵاتە و رێژەی ئەو ئوستورالیانەی لەدەرەوەی ئەو وڵاتە لەدایك بوون ٢٠ ٪ دەبێت لەكۆی دانیشتوان، زۆربەیان لە ئەوروپا و نیوزلاند و باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیاوە هاتوون. زمانی چینی دووەم زمانی لە دوای زمانی ئینگلیزی و لەوە پێش زمانی ئیتاڵی ئەو پلەیە گرتبوو.ئوستورالیا خاوەنی ئابووریەكی پێشكەوتووە و پشتی بە كشتوكاڵی پیشەسازی بەستووە جگە لە پشت بەستنی بەو سەرمایانەی كە لە ویلایەتە یەكگرتوەكان و یابان و بەریتانیاوە دەستگیری دەبێت.

تێكرای بەرهەمی نەتەوەیی : ٣٢٠,٧ ملیار دۆلاری ئەمریكییە.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٥ هەمین وڵاتە

نێودندی خەرجی تاكی ئوستورالی لە ساڵێكدا: ١٧,٩٨٠ دۆلاری ئەمریكییە.

ئوستورالیا بە پلەی یەكەمی هەموو جیهان دادەنرێت لە بەرهەمی بۆكسیت و خووری و ئەرو ماڵات قورقوشم و زنك، هەروەها بە پلەی دووەهەم دێت لە بەرهەمی ئاسن. بەپلەی سێهەم لە ئاڵتون، و بەپلەی چوارەم لە زیو ویۆرانیۆم، بە پلەی پێنجەم لە نیكل، پلەی شەشەم لە خەڵوز و مس، پلەی حەوتەم لە تەنەكە، پلەی هەشتەم لە لینیت، و بە پلەی نۆیەم لە لۆكە و گەنم و قامیشی شەكر، بە پلەی دەیەم لە بەخێوكردنی مانگا، پلەی یانزدەیەم لە جۆ و شەراب، پلەی حەڤدەیەم لە بەرهەمی گازی سروشتی.

سروودی نیشتیمانی : بۆ پێشەوە ئەی ئوستورالیای جوان.

## ١٩ ملیۆن سەرنشین لەسەر سێ هێندەی رووبەری هیند

لەگەڵ ئەوەی رووبەری ئوستورالیا سێ هێندەی رووبەری هیند دەبێت بەڵام سەرنشینانی ئوستورالیا رێژەی ٢ ٪ ی رێژەی دانیشتوانی نیمچە كیشوەری هیندی دەبێت كە زیاد لە ملیارێك سەرنشینی هەیە. و لەكاتێكدا هەر ١٠٧ كەسێك لە یەك كم٢ دەژین لە وڵاتێكی وەك ئەندونیسیا كەچی لە ئوستورالیا ٣,٢ كەس لەهەمان رووبەر دەژی.

ژمارەی دانیشتوانی ئوستورالیای ( شەشەم وڵات لەجیهاندا لە رووی رووبەرەوە ) ١٩ ملیۆن كەس دەبێت، ئەمەش بەبیری پسپۆران گەورەترین كێشەی و مەترسی كەمی زۆربوون یاخود فەوتان لێدەبێتەوە لەچاو وڵاتانی دراوسێ. ئەمیراڵ كریس باری سەرۆكی هێزە چەكدارەكانی ئوستورالیا كێشەی بەهێزكردنی سوپاكانی هەیە بەهۆی كەمی بەسەرباز گیراوان لەو وڵاتەدا. لە كۆنگرەیەكی پاراستنی ئاسایشی ناوچەی سیدنی لەم دواییانە وتبوی: " ئەگەر بە وردی بڕوانینە پەنجا ساڵی داهاتوو ئەوا دەتوانین بڕیاری ئەوە بدەین كە یەكێ لەهەر كێشەكانمان كەمی سەرنشینانە " هەروەها وتی : ژمارەمان بەشێوەیەكی بەرچاو كەم دەبێت و ئەمەش بێ گومان باری ئابوریمان لاواز دەكات لەناوچەیەكی وەك ئوستورالیای زەبەلاح".

ئوستورالیا خاوەنی روبەرێكی زۆر بەرفراوانە، هەرێمی باكوور بۆ نمونە پێنج هێندەی رووبەری بەریتانیا دەبێت، بەڵام لە رووی سەرنشینانەوە یەكێك لە گەڕەكەكانی لەندەن ١٩٠ هەزار سەرنشینی تێدایە.

ئوستورالیەكان لەسەر كەنارەكان جێگیر بوون بەتایبەتی لە شارەكانی ملبۆرن و سیدنی لە باشوور و باشووری رۆژهەڵات، چەندین رێگای بێكۆتایان هەیە جگە لە كەنگەر هیچی دیكەی تیا بەدی ناكرێ و هەندێ لەو كێڵگە گەورانەی كەتیایدایە هێندەی وڵاتێكی ئەوروپی دەبێت.

ژمارەی سەرنشینانی ئوسترالیا نەش ونمایەكی بەرچاوی بەخۆوە بینی پاش جەنگی جیهانی دووەم ١٩٤٦ نزیكەی حەوت ملیۆن كەسێك دەبوون. زۆربەی كۆچبەرەكانیش لە بەریتانی یان ئەوروپیەكان بوون وەك پەیڕەو كردنێكی سیاسەتی " ئوستورالیای سپی " كە لە هەفتاكانی سەدەی بیست كۆتایی پێهات.بەڵام لەم دەیەی دواییدا كۆمەڵگای ئوستورالی پێكهاتەیەكی باشی لە ئاسیاییەكان تێكەڵ بوو كە رێژەیان نزیكەی دوو هێندەی ئەوروپیەكان دەبوو.

ساڵانە نزیكەی ١٠٠ هەزار كۆچبەر لە ئوستورالیا پێشوازی لێدەكرێت بۆ پڕكردنەوەی ئەو كەلێنەی كە هەیەتی لە رێژەی لەدایك بوواندا. بەڵام ئامانجی لێرەدا گەشە كردن نییە،

بەڵکو هەوڵدا بۆ پارێزگاری کردن لە رێژەیەکی نەگۆڕی سەرنشینان تا دەیگەیەنێتە نزیکەی ٢٤ ملیۆنێك و دەستگیر بوونی ئەو کرێکارە شارەزایانەی کە کەمتر لەوڵاتی خۆیدا بەدیان دەکات.

لەو کەسایەتیانەی کە بەردەوام جەخت لەسەر هاندانی کۆچبەری بۆ ئوستورالیا دەکات سەرۆکی وەزیرانی پێشوو ( مالکۆلم فریزەر ) ە کە دەیەوێ ژمارەی سەرنشیانی ئوستورالیا بگەیەنێتە ٤٠ ملیۆن لە کۆتایی سەدەی بیست ویەکدا. فریزەر باوەڕی وایە کە ئامانجی ئوستورالیا پاش کۆتایی هاتنی جەنگی سارد بایەخدانێتی بە سەربەخۆ بوونی، ئەویش بەزیاد کردنی هێزی کار لەو وڵاتەدا.

یەکێ لەو پاساوانەی کە دژ بە کۆچ کردن بەرەو ئوستورالیا دەهێنرێتە ئاراوە ئەوەیە کە خاکی ئوستورالیا یەکێکە لە وشکترین خاکەکانی جیهان و ناتوانێ کەس سوودی لێوەرگرێ. جریم کامبێل ( سیاسی رەوتی راست دەڵێ : ژیان لەزۆربەی ناوچەکانی ئوستورالیا دا نییە).

بەڵام ژینگەناسەکان لەم رایەدا بەرپەرچی دەدەنەوە، فرانسیس ماکجوێر لە پارتی ئاشتی سەوزەوە دەڵێ:لەناوبردنی ژینگە پابەندە بەچۆنیەتی بەگەڕ خستنی زەویەکان بەپلەیەکی گەورەتر لە نیشتەجێ بوون. هەروەها دەڵێ : ملیۆنێکی سەر مەڕ دەتوانێ زیانێکی زیاتر بە سیستەمی ئابووری بدات وەك ملیۆنێك مرۆڤ.

لەگەڵ کۆتایی هاتنی پەیڕەوی سیاسەتی ئوستورالیای سپی بەڵام هێشتا هەندێك لە نەتەوەییەکان رۆڵێکی گەورە دەبینن لە رێگەگرتن لە کۆچکردنی ئاسیاییەکان بەرەو ئوستورالیا و دەڵێن کە ئەمە هەڕەشەیەکی گەورە دەکاتە سەر پێناسەی کەلتووری ئوستورالیا.

داب ونەریت و شێوازی ژیانی ئوستورالییە رەسەنەکان ( ئەبۆریجییەکان )

ئوستورالییە رەسەنەکان لە خانووی قووڕ دەژین و دوورن لەچاوی دانیشتوان. لەنێوان ئەو نۆزدە ملیۆنەی کە لە ئوستورالیا دەژی، تەنها کەمتر لە ملیۆنێك خەڵکی رەسەنی ئەو کیشوەرەن، واتا تەنها ٢,٢٪ لەکۆی سەرنشینان، بەکۆمەڵەیەك هۆز دادەنرێن و پێیان دەوترێت (ئەبۆریجییەکان ) و لەچەقی دارستان و دەغڵەکانی ئەستورالیا دەژین و پارێزگارییەکی زۆر لەو دابونەریتانە دەکەن کە مێژووی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەها ساڵ لەمەو بەر لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەیان زۆر کەمە. ئەبۆریجییەکان نزیکەی ٢٥٠ زمانی ناوخۆییان هەیە و دابونەریتەکان بەپێی ناوچەکانیان جیاوازیان پێوە دیارە، لە باکوری ئەو وڵاتەدا

پەیوەندییەکی باش هەیە، هۆزەکانی تیویز ( کە لە ناوچە دەریاییەکانی باکوری ولاتدا دەژین ) پەیوەندییەکی باشیان هەیە لەگەڵ ئەوەی سەردانیان دەکات، بەتایبەتی ئەوانەی لە ئەندونیسیاوە دێنە لایان، بەلام هۆزەکانی " بتجانتجاتجراس" کە لەبیابانەکانی ناوەڕاستی ئوستورالیا دەژین و هۆزەکانی کوریز کە لە باشووری ڕۆژهەلاتی ئەو ولاتەدا دەژین پەیوەندییان لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا پچڕاندووە و ئێستاش لە شێوازە سەرەتاییەکانی ژیانی مرۆڤی زوو دەچن.

دانیشتوانە رەسەنەکانی ئوستورالیا وادەزانن کە مار و ئەژدیها گەورەکان لەژێر زەوییەوە هاتوونەتە دەرەوە و دۆڵ و دەشت و شاخ و ئاوەکانی پێك هێناوە، لەو ناوچانەی کە باپیرانیانی لێ نێژراوە ئاهەنگەکانیان دەگێڕن و باوەڕیان وایە کە دوو ڕۆحیان هەیە بۆیە سەماکانی پێشکەش بە مردوان دەکەن و لە ئاهەنگ و بۆنە خۆشەکاندا ئاگرێك دادەگیرسێنن و لەچواردەوریدا بیست بیست لێی کۆدەبنەوە وروخساریان بەرۆنی سپی چەور دەکەن لەبەر ئەوەی وادەزانن کە شەڕیان لێ دووردەخاتەوە و شیعر وگۆرانی دەڵێن بەو نیازەی کە دڵیان پڕ بێت لە بەختەوەری.

هەموو هۆزەکان حەز ناکەن کەسێك سەردانیان بکات، لەگەڵ ئەوەشدا " تجابیکای " کە لە هەرێمی کوینز لاند دەژی هەستاوە بە سازدانی سەیرانگایەکی کەلتووری وناوی ( سەیرانگای کەلتووری دانیشتوانە رەسەنەکان ) ی لێناوە و تیایدا سەما و گۆرانی دەوترێت و ئەو کەسەی سەردانی دەکات بۆی هەیە لەسەر خوانێکی کراوە بەدڵی خۆی بخوات پاش ئەوەی ٢٣ دۆلاری ئوستورالی پێشکەش دەکات. زۆربەی تابلۆ و وێنەکانیان ئەو مانایە رادەگەیەنێ کە باو وباپیرانی ئەوان توانیان ئەم جیهانەی ئێستا بەهێز وبەدەسەلات بکەن بۆیە وێنەی مار و ئەژدیها بەسەر تەواوی تابلۆکانیاندا زاڵە و وێنەی مرۆڤی زەبەلاحی تیشك دار کەبەچەندین رەنگ دەدرەوشێتەوە.

زۆربەی مۆزەخانەکانی ئوستورالیا کارە هونەرییەکانی ئەبۆریجییەکان نمایش دەکات و لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠١ دا لە کانبێرای پایتەخت مۆزەخانەیەکی تایبەت بە ئەبۆریجییەکان کرایەوە و بە ئینسکلۆپیدیایەکی گەورە دادەنرێت کە مێژووی چل هەزار کەسی رەسەنی ئەو ولاتەی لەخۆ گرتووە.

## ئێستۆنیا

**ناوی باو:** ئێستۆنیا

**ناوی فەرمی:** كۆماری ئێستۆنیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی** Republic of Estonia

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی باڵا ( ١٠١ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٧,٤٦٢ میل دووجا، ٤٥,٢٢٧ كم٢.

**ژمارەی سەرنشینان:** ١,٤٦٣,٠٠٠ كەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان :** ٣٢ كەس/ كم٢

**نەتەوەكان:** ئێستۆنی،ڕوس، ئۆكرانی، ڕوسی سپی، فنلەندی.

**ئاین:** مەسیح ( ڕەوتی لۆسەری، ئەرسۆدێكی، معمەدانی )

**زمان:** ئێستۆنی ( زمانێكی نزیكە لە فنلەندی، ڕوسی ).

**پایتەخت:** تاللین

**شارە سەرەكییەكان:** (تارتۆ، ناراغا، بارنۆ، كۆتلاگارف)

**دراو:** كرۆن

**ئاووهەوا:** زستانی ساردە، نێوەندی پلەكانی گەرما ٧ پلەی سەدی بۆ ٢ پلەی سەدی لەژێر سفردا، هاوینی مام ناوەندە: پلەكانی گەرما دەچێتە ١٨ پلەی سەدی و ڕێژەی باران ساڵانە ٤٨ – ٥٨ سم دەبێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** جۆ، مەڕو ماڵات، پەلەوەر، پەتاتە، دانەوێلە، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** دروستكراوە پیترۆكیمیاییەكان، دروستكراوە خۆراكییەكان، دروست كراوەكانی خووری، ئامێرەكان.

**سامانە كانزاییەكان:** نەوتی قورس.

**تێڕوانینێكی گشتی :**

ئێستۆنیا وڵاتێكە دەكەوێتە باكووری ئەوروپا، لە باكوور و باكووری ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوەوە كەنارێكی لەسەر دەریای بەڵتیق هەیە بەدرێژایی ٧٧٤ كم،لە ڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵ ڕوسیادا سنووردارە و لاتیڤیا لە باشوورەوە. كەنداوی فنلەندا لە فنلەندای جیادەكاتەوە. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٢٥ بەرەو ڕۆژهەڵات و هێڵی پانی ٦٨ بەرەو باكوور.

زۆربەی خاكی ئێستۆنیا لە دەشتی نزم پێك دێت و هەندێكی بە دارستان و زەلكاو

داپۆشراوە و هەندێکیشی بۆ کشتوکاڵی بەکاردەهێنرێ. مرۆڤی کۆن نزیکەی حەوت هەزار ساڵ لەمەوپێش لەوێدا نیشتەجێ بوون. لە سەرەتاکانی سەدەی سیانزدەیەم سوارە تیۆتۆنییەکان گەیشتونەتە بەشی باکووری ئێستۆنیا و دانیمارکییەکان بەشی باشووریان داگیرکردووە. لەسەدەی شانزدەیەمدا ئەڵمانەکان داگیریان کردووە، دوا بەدوای ئەوانیش پۆلەندی و سویدی و روسەکان داگیریان کردووە. لەبەرواری ٢٤ / ٢ / ١٩١٨ دا ئێستۆنای سەربەخۆیی خۆی لە روسیا راگەیاندووە و سیستەمێکی دیموکراسی تیا پێك هێنرا. یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٤٠ دا لەکاتی جەنگی جیهانی دووەم داگیری کردووە، لە پاشان لە ١٩٤١ دا ئەڵمانەکان داگیریان کردووە، تا لە ١٩٤٤ لەکۆتاییەکانی جەنگی جیهانی دووەم یەکێتی داگیری کردەوە.

لە شەستەکانی سەدەی پێشوودا بزوتنەوەیەکی ماف مرۆڤی تیا هەڵگیرسا بەڵام ئەو بزوتنەوەیە لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە سەرکوت کرا. لە هەشتاکانی سەدەی پێشوودا بزوتنەوە نەتەوەییەکانی تیا چالاك بوو. لە ساڵی ١٩٩٠ دا لەگەڵ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت، پەرلەمانی ئێستۆنی رەزامەندی لەسەر سەربەخۆیی بوونی لە یەکێتی سۆڤێت راگەیاند و لە ٢٠ / ٨ / ١٩٩١ دا سەربەخۆیی راگەیاند و یەکێتی سۆڤێت و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دوای مانگێك دانیان بەسەربەخۆیی بوونی ئێستونیا نا. بۆ ساڵی ئاینده پەیوەندی کرد بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە. لە ساڵی ١٩٩٧ دا لینارت میری بووە سەرۆکی ئەو وڵاتە.

ئیستۆنیا لە رەچەڵەکدا ئێستلەندە واتا وڵاتی ئێست. ساڵانە لە رۆژی ٢٤ / ٢ دا ئاهەنگی جەژنی نیشتمانی دەگێڕن.

سروودی نیشتیمانی : نیشتمان خۆشی و شادمانیمە...

ئابووری ئێستۆنیا پشتی تەواوی بە کشتوکاڵی بەستووە و بەپلەی دووەم دێت و ئێستۆنیاش خێراترین سێ وڵاتانی بەڵتیق ( لاتیڤیا، لیتوایا، ئێستۆنیا) کە دەستی لەو ئابووری روەو بازاڕی ئازاد هەڵگرت.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٤،٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٠٣ هەمین وڵات.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢،٨٢٠ دۆلاری ئەمریکیە.

## ئەفریقیای ناوەڕاست

**ناوی باو:** ئەفریقیای ناوەڕاست

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**
Central African Republic

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٨٥ ئەندام ).

**رووبەر:** ٢٤٠،٣٢٤ میل دووجا، ٤٣٦،٦٢٢ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣،٣٤٢،٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥،٤ کەس / کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی رەش کە دەچنەوە سەر کۆمەڵەیەک نەژادی گرنگترینیان: ( بایا، بانتۆ، فەرەنسی )

**ئاین :** مەسیح ( پرۆتستانت، رۆمان، کاسۆلیك )، ئیسلام، چەند بیروباوەڕێکی لاسەیی.

**زمان:** فەرەنسی

**پایتەخت:** بانگی

**شارە سەرەکییەکان:** بیر بیراتی، بوار، بامباری،بۆسانگوا.

**دراو:** فرانك

**ئاووهەوا:** مام ناوەند، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی، باران ٨٠ سم لە باکوور و ١٦٠ سم لە باشوور، لە باشووری رۆژئاوای وڵاتەکەدا بارانێکی زۆر لەو ریژەیەی سەرەوە بەدرێژایی ساڵ دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، قاوە، لۆکە، بەخێوکردنی مەڕومالات، زەیت، خورما، لاستیك، کونجی، دار، فوولی سودانی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوەکانی خووری.

**سامانە کانزاییەکان:** ئاڵتون، ئەڵماس.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەفریقیای ناوەڕاست وڵاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی کیشوەری ئەفریقیا و لەم پێگەیەوە ئەو ناوەی وەرگرتووە، لەگەڵ وڵاتی تشاد دا لە باکوورەوە سنووردارە، سودان دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی و کۆنگۆی دیموکراسی و کۆنگۆ دەکەونە باشووری و کامیرۆنیش دەکەوێتە رۆژئاوای، ئەفریقیای ناوەڕاست هیچ جۆرە کەنارێکی نییە، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٠ بەرەو رۆژهەڵات و هێڵی پانی ٧ بەرەو باکوور.

زۆربەی خاکی ئەفریقیای ناوەڕاست بریتیە لە بانێکی لوول پێچ و لەنێوەندیدا چەندین دۆڵ و روباری تێدایە، گژو گیا زۆربەی خاکی وڵاتەکەی داپۆشیوە، دارستانە چڕەکانیش باشووری رۆژئاوای داپۆشیوە، باکووری رۆژهەڵاتیشی وشکە.

لە ساڵی ١٨٨٩ دا فەرەنسا سەنتەرێکی لەنزیك بانگی لێدامەزراند بۆ چاودێری بازرگانی

نارد کە لەو ناوچەیەدا بلاوبووبوۆوە لە سەدەی نۆزدەیەمدا، لە سالّی ١٨٩٤ دا هەریمی نۆبانجی – شاری لێدامەزراند ولە سالّی ١٩١٠ دا خستیە سەر ئەفریقیای فەرەنسی کە لە هەر یەك لە تشاد و کۆنگۆ و جابوون پێك هاتبوو.لە سالّی ١٩٤٦ دا پەرلەمانێکی ناوخۆی لە نۆبانجی – شاری پێك هێنا و و ئەندامە هەلّبژێردراوەکانی بوونە نوێنەری ولاّتەکە لەنێو پەرلەمانی فەرەنسیدا.

لە سالّی ١٩٥٨ دا ئۆتۆنۆمی سەربەخۆی پێ بەخشرا و بەناوی کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست ناسرا و بووە ئەندامێکی کۆمەڵەی فەرەنسی. لە ١٣ / ٨ / ١٩٦٠ دا بەتەواوەتی سەربەخۆ بوو و لەهەمان سالّدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان و سالاّنە لە ١٣ / ٨ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێرن.

یەکەم سەرۆکی ولاّت پاش سەربەخۆ بوون دیڤید داکۆ بوو کە بە کودەتایەکی سەربازی لەلایەن سەرکردەکانی جان بیدیل بۆکاسا لە سالّی ١٩٦٥ دەستی لەکار پێکێشرایەوە. لەسالّی ١٩٧٧ بۆکاسا خۆی کردە ئیمپراتۆر، بەلاّم هێندەی نەخایان لەلایەن سەرۆکی پێشووی ولاّت داکۆ کودەتای بەسەردا کردەوە و کرایەوە بە سەرۆکی ولاّت لە سالّی ١٩٧٩ دا

لە سالّی ١٩٨١ دا جەنەراڵ ئەندریا کۆلینجا کودەتایەکی سەربازی بەسەر داکۆ دا بەئەنجام گەیاند و کۆلینجا بووە سەرۆکی ولاّت. لە بەرواری ٢٧ / ٩ / ١٩٩٣ لە هەلّبژاردنێکی گشتیدا ئینجی فیلیکس باتاسی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و لە ١٩ / ٩ / ١٩٩٩ دا دووبارە بەسەرۆك هەلّبژێردرایەوە. لە بەرواری ٢٨ / ٥ / ٢٠٠١ دا چەند سەرکردەیەکی سەربازی یاخی شکستیان هێنا لە ئەنجام دانی کودەتایەك دژی باتاسی و چەند هێزێکی دەرەکیش یارمەتی دابوون، دادگای تاوانی ئەو ولاّتە لە بەرواری ٢٦ / ٨ / ٢٠٠٢ دا حوکمی لەسێدارەدانی بەسەر سەرۆکی پێشوو ئەندریا کولینجا و چەند یاوەرێکی سەپاند بەو هۆیە کە دەستیان هەبوو لە هەولّی کودەتای باسکراودا.

سروودی نیشتیمانی: ئەفریقیای ناوەڕاست ئەی سەروەری بانتۆ.

کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست یەکێکە لەولاّتە هەر لاوازەکانی جیهان لە رووی گەشە کردنەوە. زۆربەی دانیشتوانی سەرقالّی کشتوکالّین و پیشەسازییەکی زۆر کەمیان هەیە و هیچ جۆرە هێلّێکی ئاسنی نییە رێگا وبانێکی زۆر نالەباری هەیە بەتایبەتی لە وەرزەکانی باراندا، روبارەکان بە باشترین هێلّەکانی هاتووچۆ دادەنرێن لەبەر ئەوەی کەشتیەکان بە درێژایی سالّ رۆلّێکی گەورە دەبینن لە هاتووچۆدا لە نێوان پایتەختەوە بۆ برازافیلی پایتەختی کۆماری کۆنگۆوە کە دەکەوێتە سەر روباری ئۆبانجی و لەوێوە بەرەو بەندەری بوانت نوار بەرێ دەکەوێ.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی

نێوەندی خەرجی سالاّنەی تاك: ٣٧٠ دۆلاری ئەمریکی

**ریزبەندی لەنێو ولاّتانی جیهاندا: ١٥٥ هەمین ولاّتە لە جیهاندا.**

## ئەفغانستان

**ناوی باو:** ئەفغانستان

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئیسلامی ئەفغانستان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Islamic State of Afghanistan

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی شوری ( ٢٣٤ ئەندام ).

**ژمارەی دانیشتوان:** نزیکەی ٢٤،٠٠٠،٠٠٠ کەس ( ئەو ژمارەیەش بەهۆی نەبوونی سەرژمێری فەرمی سەد لەسەد نییە ).

**چڕی دانیشتوان :** ٣٦،٤ کەس/ کم٢

**نەتەوەکان:**

- بشتون(باشتو یان باسان،یان باتان) ٣٨ ٪
- تاجیك ٢٥ ٪، کە بەزمانی فارسی قسە دەکەن و حەنیفییە سوننەکانن و لەباکووری ڕۆژهەڵاتدا دەژین.
- هەزارا ١٩ ٪ ئەوانیش لەناوچەکانی ناوەڕاستدا دەژین و لە شیعە جافەرییەکانن، هەزارا لە زمانی فارسی بەمانای هەزار دێت و ئەم ناوەیان لەمێژەوە بەو هۆیەوە لێنراون کە گوایە بەرەچەڵەك دەچنەوە سەر جەنگیزخان، کە دەڵێن سوپایەکی زەبەلاحی بووە و هەر کۆمەڵەی لە هەزار کەس پێك هاتووە.
- ئۆزبەك ٦ ٪ و لە باکووری ولاتدا دەژین و لەحەنییفە سوننییەکانن.
- تورکمان، بلوش، کەمایەتییەکی نەژادی دیکەش بە ١٢ ٪ دادەنرێن.

**ئاین :** ئیسلام

**زمان :** ٥٠ ٪ لەکۆی دانیشتوانی دارایی قسە دەکەن ( شێوە زاراوەیەکی فارسییە). ٣٥ بە زمانی باشتۆنی قسە دەکەن، لەگەڵ چەند زاراوەیەکی تورکمانی.

**پایتەخت :** کابوول

**شارە سەرەکییەکان :** قەندەهار، هیرات، مەزاری شەریف، جەلال ئاباد، فایز ئاباد.

**دراو :** ئەفغانی

**ئاووهەوا :** کیشوەری، زستانی سارد و هاوینی گەرم. نێوەندی باران و بەفر ساڵانە ٣٥١ ملم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان :** لۆکە، میوە، جۆ، گەنم،( برنج)، گوێز، گەنمە شامی، سەوزە، پێست، گۆشتی سوور، ئەفیون ( مادەیەکی هۆشبەری قەدەغەیە).

بەرهەمە پیشەسازییەکان: جل وبەرگ، فەرش، چیمەنتۆ، دروستکراوەکانی پێست، دروستکراوە خۆراکییەکان.

سامانە کانزاییەکان: گاز، پیترۆڵ، خەڵووزی بەردین، قورقوشم، ئاسن، ئاڵتون، زیو، مس، لازوەر ( بەردی پیرۆز )، میکە ( بەردێکە ئەلەمنیۆم و سلیکۆن و ئۆکسجینی تێدایە).

تێڕوانینێکی گشتی :

ئەفغانستان ( بەمانای وڵاتی ئەفغان دێت ) و ئەفغانییەکان کۆمەڵە هۆزێك بوون لەمێژەوە لەو ناوچەیەدا ژیاون، ئەفغان یەکێك بووە لە کوڕەزاکانی یەعقوبی پێغەمبەر ( سڵاوی خوای لێبێت ) و وڵاتی خۆی ( میسر )ی لەگەڵ چل کوڕەکەیدا بەجێ هێشتووە و لەم ناوچەیەدا نیشتەجێ بووە کە چەند سەدەیەکە بەناوی ئەوە ناودەبرێت. وڵاتێکی ئیسلامی نیمچە بیابانییە دەکەوێتە نێوان نیمچە کیشوەری هیندی و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە، لەگەڵ تاجیکستان و ئۆزبەکستان و تورکمانستاندا لە باکوورەوە سنووردارە و لەگەڵ وڵاتی چین باکووری ڕۆژهەڵاتەوە و پاکستان لە ڕۆژهەڵات و باشوورەوە و ئێران لە ڕۆژئاواوە. هیچ کەنارێکی نییە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦٦ بەرەو ڕۆژهەڵات و هێڵی پانی ٣٤بەرەو باکوور.

دەشتەکان باکووری وڵات دادەپۆشن و شاخە بەرزەکان کە هەندێکی نزیکەی ٧٥٠٠ م ( لەسەر ئاستی ڕووی دەریا ) بەرز دەبنەوە دەکەونە ناوەڕاستی ئەو وڵاتە، باشووریشی ناوچەیەکی دەشتاییە و بیابانەکانیش دەکەونە ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژئاوای وڵاتەکە.

لە سەردەمی زوودا ئەو بەو وڵاتە وتراوە ئاریانا، لە چاخەکانی ناوەڕاستدا خراسانیان پێ دەوت کە ئێستا یەك لەسەر سێ ی خاکی ئەفغانستانە و تەواوی خاکی تورکمانستانە و بەشێکی خاکی ئێرانیش دەگرێتەوە.

ئەسکەندەری مەکدۆنی لە ساڵی ٣٣٠ پ.ز واڵا کردووە، ئیسلامەکان بە سەرۆکایەتی ئەحنەف کوڕی قەیس لە ( ساڵی ٢٢ ك ) بلە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتاب چۆنەتە ناوی و بووە بەشێك لە جیهانی ئیسلامی.تەیمووری لەنگ لە ساڵی ١٤٠٠ داگیری کردووە و بووە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی مەگۆلی لە ساڵی ١٤٠٥ دا، لە ساڵی ١٧٤٧ دا ئازاد کراوەتەوە. هەر یەك لە بەریتانیا و ڕوسیا لە سەدەی نۆزدەیەمدا هەوڵیان داوە داگیری بکەن، بەڵام لەساڵی ١٨٤٢ دا کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانی. لە بەرواری ١٨ / ٨ / ١٩١٩ دا بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە و لە سەردەمی شا ئەمان الله خاندا لەدەستی بەریتانیا ڕزگاری بووە. ڕۆژی ١٨ / ٨ لەهەموو ساڵێك جەژنی نیشتیمانی ئەو وڵاتەیە. پارێزگاری لە بێلایەنی خۆی کردووە لەهەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم و دووەمدا و لەساڵی ١٩٤٦ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککرتوەکان.

له بەرواری ١٧ / ٧ / ١٩٧٣ دا كودەتایەكی سەربازی بە سەرۆكایەتی میر محەمەد داوود بەسەر شا محەمەد زاهیردا كرا لەكاتی سەردانێكی بۆ بەریتانیا و بەمەش سیستەمی كۆماری تیا راگەیەنرا پاش نزیكەی دوو سەدە بەسەر رژێمی پادشایی.

له بەرواری ٢٧ / ٤ / ١٩٧٨ دا سەرۆك محەمەد داوود و زۆربەی ئەندامانی خێزانەكەی لە كودەتایەكی سەربازیدا كە لەلایەن چەتەكانەوە رێكخرابوو كوژران و ناوی ولات گۆرا بۆ كۆماری دیموكراسی ئەفغانستان و نوور محەمەد تەراقی كرایە سەرۆكی ئەنجومەنی شۆرش. لە سالی ١٩٧٨ دا بزوتنەوەی ئۆپۆزسیۆنی ئیسلامی ( ئەلموجاهیدین ) نارەزایی خۆیانیان لەو سیاسەتە شیوعییەی حكومەت دەربری و لەبەرورای ١٤ / ٩ / ١٩٧٩ لە كودەتایەكی سەربازیدا نوور محەمەد تەراقی كوژرا و لەبری ئەو ( حەفیزالله ئەمین ) چووە جێگای. لەبەرواری ٢٤ / ١٢ / ١٩٧٩ دا هێزە سۆڤێتیەكان پەلاماری ئەفغانستانیان دا، لە بەرورای ٢٧ / ١٢ / ١٩٧٩ حەفیزوالله و زۆربەی یاوەرەكانی لەسێدارە دران و بابراك كارمل كرایە سەرۆكی كۆمار و لەدوای ئەو نەجیب الله خرایە جێی كارمل. تەواوی ئەم رووداوانە ئاوارە بوونی خەلكێكی بۆ ولاتانی دراوسێ بەخۆوە بینی. لە سالی ١٩٨٠ دا نەتەوە یەكگرتوەكان داوای كشانەوەی دەست بەجێ لەهێزە سۆڤێتییەكان كرد لە ئەفغانستان. پاش شەرێكی درندانە لەلایەن موجاهیدەكانەوە لە دژی هێزەكانی سۆڤێت، ناچار سۆڤێتییەكان لە ١٥ / ٥ / ١٩٨٨ دا دەستیان كرد بە كشانەوە و لە بەرواری ٢٢ / ٢ / ١٩٨٩ دا بەتەواوەتی خاكی ئەفغانستانیان بەجێ هێشت. روسیا پاش دە سال لەم بەرواره ئاهەنگێكی گێرا كە زۆربەی روسەكان بەهەلەیەكی سیاسی گەورەی دادەنێن.

لە سالی ١٩٩٢ دا حكومەتی نەجیب الله لە سەر دەستی موجاهیدەكان رووخا و سەبغە الله موجەدەدی كرایە سەرۆك كۆمار، پاش ماوەیەك بورهانە دین رەببانی پۆستی سەرۆكایەتی گرتە دەست.بەلام ئەمەش نەبووە هۆی ئارامی ناوچەكە. چەندین گروپی بەرەنگاری بەردەوام لە ململانێكی خوێناوی دا بوون بووە هۆی لەناو بردنی چەندین گوند و خاپوور بوونی چەند شار و بەتایبەتی كابولی پایتەخت و ئاوارەبوونی بەهەزارەها لە خەلكی ئەو ناوچەیە بەرەو ناوچە ئاسایشەكان. ئەستۆی ئەم تاوانكاریانەش دەچێتە ملی سەركردەكانی ئەفغان، هەرچەندە سوپاكانی سۆڤێتیش زۆربەی زۆری گوندە ئەفغانیەكانی بە مین چاندبوو، پاش وێران كردنی.

لە ٢٤ / ٦ / ١٩٩٤ دا مەلا محەمەد عومەر لە شارۆچكەی مایوانی ئەفغانییەوە بزوتنەوەی تالیبانی راگەیاندو ئالای سپی وەك هێمایەك بۆ بزوتنەوەكەیان بەرز كرایەوە، وشەی تالیبان بەمانای ( خوێندكاری زانستی ئیسلامیەوە) دێت. پاش چەند شەر و پێكدادانێكی زۆر لەنێوان تالیبان و هێزە حكومیەكان و هێزەكانی موجاهیدین تالیبان توانی دەسەلاتی

زۆربەی ناوچە و شارەکانی ئەفغانستانی بگرێتە دەست، لەبەرواری ٢٧ / ٩ / ١٩٩٦ دا هێزەکانیی تالیبان توانی بچێتە ناو کابولی پایتەختەوە و سەرۆکی زووی ئەفغانستان ( نەجیب و الله و شاپووری ئەحمەد زاری برای دەستگیر کران و دەست بەجێ لەسێدارە دران. سەرۆك بورهانەدین رەبانی کرایە دەرەوە و بەمەش بەهەزارەها خەڵکی ئەو ناوچەیە بەرەو باکووری وڵات یان بەرەو پاکستان هەڵهاتن.

پاش ئەوەی هێزەکانی تالیبان چوونە ناو کابولەوە دەستیان کرد بەجێ بەجێ کردنی یاساکانی ئیسلام ( بەپێی بۆچونی خۆیان و توند رەویان لەتەواوی ناوچەکەدا سەپاند و ژن بەزۆر لەسەر کار دەرکرا و لەماڵ نیشتەجێ کردنی و وەرزش و گورانی و سەما بەهەموو شێوەیەك قەدەغە کرا و سزای کوشتن و لەسێدارەدان بۆ هەر ئافرەتێك دەردەچوو ماڵی بەجێ بهێشتایە بەزۆر نوێژکردنی پیاوان رۆژی پێنج جار و درێژ کردنەوەی سەر و ریشیان و قایل نەبوون بەهەر رایەك لەگەڵ راوبۆچوونی خۆیان جیاواز بێت و زۆری لەو کارە نا مرۆڤایەتیانەی کە هێندە قێزەونن شایەنی باس نین.

لە بەرواری ١٧ / ٤ / ١٩٩٨ دا لایەنە شەرکەرەکانی ئەفغانستان ئاگربەستێکی سەربازیان واژۆ کرد. دەستیان کرد بە دانوستان بۆ راگرتنی ئەو شەرەی نزیکەی ١٨ ساڵێك بەردەوام بوو.لەگەڵ ئەوەی شەڕ سەر لەنوێ هەڵگیرسایەوە، بەڵام شاندێکی بزوتنەوەی تالیبان کە حوکمی ئەفغانستان دەکات بە سەرۆکایەتی مەلا محەمەد عومەر و شاندێك کە نوێنەری لایەنی بەرهەڵستکارەکان بوون بە سەرۆکایەتی ئەحمەد شاه مەسعود لە ٢٦ / ٤ / ١٩٩٨ دا لە پایتەختی پاکستان ( ئیسلام ئاباد )، بەچاودێری نەتەوە یەکگرتوەکان و رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی لەیەکەم دانیشتنی راستەوخۆی نێوان هەردوو لایەن بەهیوای گەیشتن بە ئەنجامێك تیایدا ئاگر بەستێکی یەکجارەکی رابگەیەنرێ و دیلەکانی هەردوولا ئاڵوگۆڕ بکرێت کۆبوونەوە و دەست کرا بە گفتوگۆ کردن. گفتوگۆکە بێ هیچ ئەنجامێکی نیجابی پاش چەند رۆژێك کۆتایی پێ هات. بەڵام لایەنە شەرکەرەکان لیژنەیەکیان لە چل کەسیان لە زانایانی ئاینی پێکهێنا بۆ دانوستان لە پێناوی راگرتنی شەڕ لەتەواوی وڵات و بەرقەرار کردنی ئاشتی، بەڵام ئەم جارەش شکستیان هێنا و سەر لەنوێ شەڕ دەستی پێکردەوە و هێزەکانی تالیبان لە هاوینی هەمان ساڵدا توانی دەست بگرێت بەسەر ٨٠ ٪ ی وڵات لەکاتێکدا تەواوی هێزە بەرهەڵستکارەکان تەنها ناوچەی بەدخشانی باکووری رۆژهەڵاتی ئەفغانستانیان بەدەستەوە مابوو.

لە ٢٠ / ٨ / ١٩٩٨ هەر یەك لە ئەفغانستان و سودان دووچاری لێدانێکی مووشەکی ئەمریکی بوون بە هۆی تاوانبارکردنیان بە مۆڵدانی کۆمەڵەیەکی تیرۆریستی بە سەرۆکایەتی ئوسامە بن لادنی سعوودی و ئەم لێدانەی ئەمریکا پاش تەقاندنەوەی هەردوو

باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هات لە کینیا و تەنزانیا لە ٧ / ٨ / ١٩٩٨ دا لەلایەن چەند گروپێکی چەکدارەوە.

لە ساڵی ١٩٩٩ دا نەتەوە یەکگرتوەکان شکستی هێنا لە رێکخستنی لایەنە بەرهەڵستەکانی ئەفغانستان.

لە بەرواری ١٤ / ٣ / ١٩٩٩ دا، بزوتنەوەی تاڵیبان بە سەرۆکایەتی مەلا محەمەد عومەر و هاوپەیمانی بەرهەڵستی ئەفغانی بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ ئەحمەد شاە مەسعود بڕیاریاندا دەست کەنەوە بە دانوستان بۆ بڕیاردان لەسەر مەرجەکانی ئاشتییەکی کاتی لەنێوانیاندا، کە لەوە پێش لە شاری ( عەشق ئابادی پایتەختی تورکمانستان ) گفتوگۆیان لەسەر کردبوو و لەلایەن هەر یەك لە ئێران و پاکستان دراوسێ سەرەکییەکانی ئەفغانستان پێشوازییەکی گەورەی لێکرابوو، لەو کۆبوونەوەیەدا هاتبوو کە حکومەتێکی هاوبەش پێك بهێنرێت و دیلەکانی هەردوو لایەن ئاڵوگۆڕ بکرێ و شەڕ بوەستێنرێت، بەڵام ئەم هەوڵەش شکستی هێنا و شەڕ هەر بەردەوام بوو.

لە بەرواری ١٩ / ٧ / ١٩٩٩ بە ئامادە بوونی هەر شەش وڵاتی سنووری ئەفغانستان : ئێران، پاکستان، چین، تاجیکستان، تورکمانستان، ئۆزبەکستان، هەروەها بە ئامادەبوونی ویلایەتیە یەکگرتوەکانی ئەمریکا و روسیا و نوێنەرانی هەردوو گروپی بەشەڕهاتووی ئەفغانی ( بزوتنەوەی تاڵیبان و بزوتنەوەی جەنەراڵ ئەحمەد شاە مەسعود ) کۆبوونەوەیەکی تایبەت بەسترا سەبارەت بە کێشەکانی نێوان گروپەکانی ئەفغانستان. لەگەڵ ئەوەی لایەنە ئەفغانییەکان گەیشتنە رێکەوتنێك بۆ راگرتنی شەڕی نێوانیان، بەڵام شەڕ نەوەستا.

لە بەرواری ١٤ / ١١ / ١٩٩٩ نەتەوە یەکگرتوەکان گەمارۆی ئاسمانی خستە سەر ئەفغانستان بەهۆی تاوانبار کردنی بە مۆڵدانی ئوسامە بین لادنی گەورە تیرۆریست. پاش ساڵێك لەم بەروارە بەهۆی بەدەستەوە نەدانی ئوسامە بین لادنەوە نەتەوە یەکگرتوەکان چەند سزایەکی توندتری خستە سەر ئەفغانستان لەوانە قەدەغە کردنی کڕینی چەك و داخستنی نوسینگەکانی تاڵیبان لە دەرەوە و قەدەغە کردنی هاتنە دەرەوەی لێپرسراوەکانیان بۆ دەرەوەی ئەفغانستان. بزوتنەوەی تاڵیبانیش لەلایەن خۆیەوە هەستا بەداخستنی نووسینگەی تایبەتی نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان و دابڕانی لە کڕینی کەلوپەلی ئەمریکی و روسی، وەك وەڵامدانەوەیەك بۆ سزاکانی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە بەهاری ٢٠٠٠ دا بە چاودێری رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی لە جەددە لە شانشینی عەرەبی سعودی چەند دانیشتنێك لەنێوان تاڵیبان و بەرهەڵسکارانی ئەفغانستان ئەنجام درا، بەڵام هیچ کام لەو کۆبونەوانە نەگەیشتە ئەنجامێکی داواکراو.

لە مانگی سێ ی ساڵی ٢٠٠١ دا بزوتنەوەی تاڵیبانی دەسەڵاتدار لە ئەفغانستان هەستا بە

لەناوبردنی دوو پەیکەری زەبەلاحی بوودی لەناوچەی بامیانی ناوەڕاستی وڵات، تاڵیبان هیچ کام لەو تکا و جەختە نێودەوڵەتیانەی قبوڵ نەکرد لەپێناوی لەناونەبردنی ئەم دووپەیکەرە و کێشەکەی بە ئاینی لەقەڵەم دا و باسی لەوە دەکرد کە بوونی ئەم پەیکەرانە لەگەڵ یاساکانی شەریعەتی ئیسلامدا نەگونجاوە.

دروست کردنی دوو پەیکەرە زەبەلاحەکەی بوودا دەگەڕێنەوە بۆ ۱۵۰۰ ساڵ لەمەو پێش و درێژی یەکێکیان ۳۸ مەتر و ئەوی دیکەش ۵۲ مەتر دەبوو و بەئاسەوارێکی جیهانی گەورە دادەنرا.

لە مانگی هەشتی ساڵی ۲۰۰۱ دا دەزگا دەسەڵاتدارەکانی ئەفغانستان هەشت پزیشکی بیانی دەستگیر کرد کە لە دەزگایەکی منالپارێزی نێودەوڵەتی دا کاریان دەکرد، بەتۆمەتی مژدە بەخشی ئاینی مەسیحی ( تەبشیری )، بە بڕیارێکی مەلا محەمەد عومەر بڕیاری دەرکردنی لە وڵات بۆ دەرکردن پاش کۆتایی هێنان بە لێکۆلینەوە لەگەڵیاندا، لەدواییدا پاش هێرشەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان ئازاد کران.

لە بەرواری ۹ / ۹ / ۲۰۰۱ دا سەرکردەی بەرهەڵستی ئەفغانی ( کۆمەڵەی ئیسلامی ) ئەحمەد شاە مەسعود لەلایەن چەند نەناسراوێکەوە برینددار کرا و لە ئاکامی خەستی برینەکانی پاش چەند رۆژێك گیانی لەدەستدا. رێ ورەسمێکی بەشکۆی لە گوندی جانجالاکی سەر بەدۆڵی بانشیر لە باکووری وڵات بۆ بەڕێوە چوو. سەرکردەیی ئۆپۆزسیۆنی ئەفغانی شان بەشانی بورهانەدین رەبانی بە جەنەراڵ محەمەد فەهیم سپێردرا، فەهیم لە دواییدا بووە جێگری سەرۆکی حکومەت و وەزیری بەرگری. ئەحمەد شاە مەسعود بەسەرۆکی نەتەوەیی ئەفغانستان دانرا.

لە ساڵی ۲۰۰۰ دا بەهۆی باران نەبارین لەساڵی پێشوو شەپۆلێکی گەرما و وشکە ساڵی رووی کردە ئەفغانستان و نیمچە برسێتییەکی لێکەوتەوە، نەتەوە یەکگرتوەکان داوای کۆکردنەوەی یارمەتی کرد بۆ زەرەر مەندەکان.لە ٤ / ۲ / ۱۹۹۸ و ۳۰ / ٥ / ۱۹۹۸ و ۲٥ / ۳ / ۲۰۰۲ دا باکووری ئەفغانستان دووچاری چەند بوومەلەرزەیەکی بەهێز بوو بەدەیان هەزار قوربانی لێکەوتەوە و چەندین گوندی لەناوبرد و بەهەزارەها خێزان بێ ماڵ وحاڵ مانەوە، نەتەوە یەکگرتوەکان زۆر بەپەلە بەهانای لێقەوماوانەوە چوو.

ئەفغانستان وڵاتێکی کشتوکاڵیە و ئێستاش لە سوورە سەرەتاییەکاندا دەچێ و خەڵکەکەی سەرقاڵی کشتوکاڵی و شوانی و رێژەی ئەوانەش دەچێتە ۸۰ ٪ ی خەڵکی وڵاتەکە.

تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی : ۲,۷ ملیار دۆلاری ئەمریکییە.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ۱۲۷ هەمین وڵاتە.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاکی ئەفغانستان : ٦٩٥ دۆلاری ئەمریکی.

ئەفغانستان بە پلەی یەکەمی هەموو جیهان دادەنرێت لە بەرهەمی بەردی ( لازوەردی ) کە بەردێکی پیرۆزی شین باوە. هەروەها پلەیەکی پێشکەوتووی هەیە لە بەرهەمی ئەفیون دا ( مادەیەکی هۆشبەری قەدەغەیە و مادەی هیرۆیینی بەشێوەیەکی نهێنی لێ دروست دەکرێت) لە ناوچە سنووریەکانی پاکستاندا ئەم رووەکە دەرووێنرێت و نەتەوە یەکگرتوەکان لە بەرواری ٢٨ / ٧ / ٢٠٠٠ دا پشتێنێکی ئاسایشی بەهێزی لەناوچەیە دامەزراندووە بۆ رێگرتن لە دزە کردنی ئەو مادەیە بەرەو پاکستان، لەبەرواری ٢٨ / ٧ / ٢٠٠٠ دا سەرۆکی بزوتنەوەی تالیبان بریارێکی لەژێر ژمارە ١٩ دا دەرکرد تیایدا رواندنی هەر یەك لە خاشخاش و ئەفیونی تیا قەدەغە کردووە.

پاش رووخانی حکومەتی تالیبان لە ئەفغانستان حکومەتێکی کاتی نویٚ دامەزراوە و ئەو حکومەتەش بریاری قەلاچۆکردن و قەدەغە کردنی ئەو مادەیەی راگەیاندووە، بەلام کاربەدەستە نوێکانی ئەفغانستان زۆر بەباشی دەزانن کە ئەو مادەیە دەرووێنرێت و لە سنوورەکانەوە دزەش دەکات بەلام بەوهۆیەی کە ئاگاداری باری هەژاری و نەداری جوتیارەکانە و بازرگانی بەو مادە هۆشبەرانەوە داهاتێکی باشی هەیە بۆیە بێدەنگ بووە، ئەمە جگە لەوەی کە حکومەتی ئێستای ئەفغانستان زۆر لەوە لاوازتر بتوانیٚ روو بەرووی بەرهەم و بازرگانی پێکردنی مادەی ناوبراو بوەستێت، لەکاتێکدا ناتوانیٚ کۆنترۆلی خودی پایتەختی ئەفغانستان( کابول ) بکات.

## بیٚ ژن و بیٚ دەهۆل.. لەناوبەری ئیمپراتۆریەکان ئاهەنگی سەرۆخۆ بوون دەگێرێت..

لە بەروری ١٨ / ٨ / ٢٠٠٠ دا بزوتنەوەی تالیبان یادی هەشتا ویەك هەمین سالی گێرا بەبۆنەی سەربەخۆیی بوونی لە بەریتانیا، لەم ئاهەنگەدا تەنها پیاو بەشداری کرد و نمایشێکی سەربازی بەنێو شەقامەکانی کابولدا گێرا. چەندین تابووری درێژ لە سەرباز و تفەنگەکانیان بەدەستەوە بوو بەنێو شەقامەکاندا بیٚ دەنگی دەهۆل و موزیك بەریٚ دەکەوتن ( چونکە بزوتنەوەی تالیبان لەوەو پێش قەدەغەی کردبوون)، چەند فرۆکەیەکی فیشکەدار لەجۆری روسی ئاسمانی کابولیان گرتبوو لەم بەر و ئەوبەری شەقامەکانیش چەند نوسراوێکیان بەدەستەوە گرتبوو تیادا نوسرابوو: ( لەناوبرەی ئیمپراتۆریەتەکان، هەر لە ئەسکەندەری گەورەوە تا جەنگیز خان تا بەریتانیا و سۆڤێت بەدوایدا، کیٚ دەتوانیٚ دژایەتیمان بکات هەمان چارەنووسی دەبێت ). ئەم نمایشە یەکەم نمایشی سەربازی بوو تالیبان لە کابولدا بەئەنجامی بگەیەنێت پاش چوار سالٚ لە دەسەلات گرتنی بەسەر ئەو شارەدا.

## جەنگی ئەمریکا لە ئەفغانستان

**( یەکەم جەنگی سەدەی بیست ویەك )**

لە بەرواری ١١ / ٩ /٢٠٠١ دا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دووچاری هێرشێکی تیرۆریستی بووەوە، لەلایەن کۆمەڵێك تیرۆریستی سەر بە رێکخراوی ئەلقاعیدە کە ئوسامە بین لادنی سعوودی سەرۆکایەتیان دەکات و لەئەفغانستان دەژی. ئەم کۆمەڵە هەستان بە فڕاندنی چوار فڕۆکەی شارستانی پڕ لە سەرنشین لە فڕۆکەخانەکانی ئەمریکاوە و بەرەو رووی: دوانیان بەرەو سەنتەری بازرگانی جیهانی لەنیۆرك، یەکێکیان بەرەو بینای پەنتاگۆن ( وەزارەتی بەرگری ئەمریکا لە واشنتۆنی پایتەخت، و چوارەم فڕۆکەش لە ویلایەتی پەنسلڤانیا تەقێنرانەوە، ئەمەش بووە هۆی کوژرانی نزیکەی سێ هەزار کەس لە نیۆرك و دووسەت کەس لە واشنتۆن و زیانە مادییەکانیش بە نزیکەی دووسەت ملیار دۆلار خەمڵێندرا. ویلایەتە یەکگرتوەکان ئوسامە بین لادنی سەرۆکی رێکخراوی ئەلقاعیدەی بەم هێرشە تاوانبار کرد، داوای لە بزوتنەوەی تاڵیبان کرد لە ئەفغانستان کە ناوبراویان تەسلیم بکات، بەڵام بزوتنەوەی تاڵیبان ئەم داواکاریەی واشنتۆنی رەت کردەوە و بین لادنی نەدایە دەستیتان بە پاساوی نەبوونی بەڵگەیەکی تەواو لەسەر ئەنجام دەری ئەم هێرشە تیرۆریستانەیە، لە ئاکامدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا جەنگی جیهانی لەدژی تیرۆر راگەیاند و داوای لە تەواوی وڵاتانی جیهان کرد کە پشتیوانی ئەم جەنگەی لێبکەن، بۆیە هەستا بە کۆکردنەوەی هێزێکی گەورەی پیادە و دەریایی و زەمینی لەتەواوی وڵاتە دراوسێکانی ئەفغانستاندا ( جگە لە ئێران ) و لە بەرواری ٧ / ١٠ / ٢٠٠١ دا ویلایەتە یەکگرتوەکان بەهاوکاری بەریتانیا هێرشێکی ئاسمانی گەورەی کردە سەر ئەفغانستان. ئەمەش بووە هۆی لەناوبردنی نزیکەی ٣٨٠٠ کوژراو و ئاوارەبوونی خەڵکێکی زۆر بەرەو وڵاتانی دراوسێ ( بەتایبەتی پاکستان ) هەڵهاتن. پاش چەند رۆژێك لەو هێرشە، هێزەکانی تاڵیبان پەرتوبلاو بوونەوە و زیانێکی زۆریان پێگەیەنرا، لە ئاکامدا هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی باکوور توانیان هێرشێکی گەورە بکەنە سەر تاڵیبان و شار بەشاریان لە بەرورای ١٢ / ١١ / ٢٠٠١ دا لێ سەندنەوە، هەر لەمەزار ئەلشەریفەوە لە باکوور و کابول لە رۆژهەلات و تا دەگاتە قەندەهار ( مەڵبەندی سەرەکی هێزەکانی تاڵیبان ) لە باشووری وڵات. مەلا محەمەد عومەر پاش ئەوەی فەرمانی بەدەستەوەدانی شارەکەی راگەیاند بەرەو شاخەکان هەڵهات و هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن توانیان دەست بگرن بەسەر مەڵبەندی سەرەکی ئوسامە بین لادن لە ناوچەی شاخاوی سەختی تۆرابۆرا لە رۆژهەلاتی ئەفغانستان.

بەم شێوەیە کۆتایی هات بە دەسەلاتی بزوتنەوەی تیرۆریستی تاڵیبان بەسەرۆکایەتی مەلا

محەمەد عومەر کە پێنج ساڵ دەسەڵاتی ئەو وڵاتەی گرتبۆوە دەست پاش کۆتایی هاتن بە حکومەتی بورهانەلدین رەبانی. کۆتایی هات بە رێکخراوی تیرۆریستی ئەلقاعیدە و تا ئێستاش هێزەکانی ئەمریکا بەشوێن حەشارگەکانیان دەگەڕێ و ژیانێکی سروشتی بۆ گەلی ئەفغانستان گەڕایەوە.

لەو ماوەی هێرشە ئاسمانیەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان، توند بوونی هێرشی هێزە هاوپەیمانەکان بۆ سەر حەشارگەکانی تاڵیبان، لە شاری بۆنی ئەڵمانی لە دوایین هەفتەی تشرینی یەکەمی بۆ یەکەمین هەفتەی کانونی یەکەم ٢٠٠١ کۆنگرەیەك سەبارەت بە دواڕۆژی ئەفغانستان بە چاودێری نەتەوە یەکگرتوەکان بەسترا، لەم کۆنگرەیەدا هەر چوار کۆمەڵە نەژادیەکەی ئەفغانستان ئامادە بوون و بە پێکهێنانی حکومەتێکی کاتی بۆ ماوەی شەش مانگ لە ئەفغانستان بە سەرۆکایەتی سەرکردەی بشتۆنی حامید کارزای( ٤٦ ساڵ ) و دانانی ٣٠ وەزیر لە نێوانیاندا کۆمەڵێك ئافرەت لەوانە سیما سەمەر وەك جێگری سەرۆکی حکومەتی ئەفغانی و وەزیری کاروباری ئافرەتی ئەفغانی و دوور خستنەوەی سەرۆکی پێشوو بورهانەلدین رەبانی لە هیچ پۆستێك کۆتایی بەکۆنگرە هات.

لە ٢٢ / ١٢ / ٢٠٠١ دا لە کابوول حکومەتی نوێی ئەفغانستان سوێندی دەستووری خوارد و سەرۆك حامید کارزای وتەیەکی دەربارەی ئاشتی و ئاشتبونەوەی نیشتیمانی پێشکەش کرد و داوای کرد کە پێویستە چیتر خوێنی رۆڵەکانی ئەفغان نەرژێنرێت و لەناوبردنی ئاسەواری سیستەمی تاڵیبان و کۆتایی هێنان بە ٢٣ ساڵ شەڕ و ماڵ وێرانی و داوای کرد کە هەمووان هەستن بە بنیات نانی ئەفغانستان.

لە بەرواری ٢٠ / ١٢ / ٢٠٠٢ ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری رەوانە کردنی هێزێکی فرە نەتەوەیی بەسەرکردایەتی بەریتانیا بەرەو ئەفغانستان رەوانە بکات بە مەبەستی پاراستنی ئاسایش لەوڵاتی ناوبراودا، ویلایەتە یەکگرتوەکانیش لەلایەن خۆیەوە بەڵێنی پێشکەشکردنی یارمەتی ئەو وڵاتەی دا لەکاتی پێویستدا.

لە ٤ / ١ / ٢٠٠٢ دا لە کابوول رێکەوتنامەی پێکهێنانی هێزێکی نێودەوڵەتی لە ئەفغانستان واژۆ کرا بەناوی ئایساف ( ISAF ) لەلایەن یونس قانونی وەزیری ناوخۆی ئەفغانستان و سەرۆکی هێزە بەریتانیەکان جەنەراڵ جۆن ماك کول، لەبەرواری ٢٠ / ٦ / ٢٠٠٢ دا تورکیا سەرۆکایەتی ئەو هێزەی گرتە دەست.

لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠١ و سەرەتاکانی ٢٠٠٢ هێزە نێودەوڵەتیەکان گەیشتنە ئەفغانستان و لە ١٨ وڵاتەوە ونزیکەی پێنج هەزار سەرباز دەبوون. لە بەرواری ١٧ / ١ / ٢٠٠٢ فرۆکەخانەی کابوول سەر لەنوێ کرایەوە و چەند وڵاتێکبالوێزخانەی لەنێو

ئەفغانستاندا كردەوە.

لە بەرواری ۲۲ / ۱ / ۲۰۰۲ دا كۆنگرەی نێودەوڵەتی بۆ بنیاتنانەوەی ئەفغانستان لە تۆكیۆ بڕیار دا بە پێنج ساڵ بڕی ٤,٥ ملیار دۆلاری ئەمریكی بدات بە ئەفغانستان بەمەرجێ ئاشتی و دیموكراسی لەو وڵاتەدا بەرقەرار بێت و هەوڵ بدات تیرۆر و بەرهەمی مادە هۆشبەرەكان رابگرێ، هاوكات دەست كرا بە بنیات نانی سوپای نوێی ئەفغانستان.

لە بەرواری ۲۳ / ۱ / ۲۰۰۲ شەڕ و پێكدادان لە باكووری ئەفغانستاندا بەرپا بوو لەنێوان یاوەرانی سەرۆكی پێشووی ئەفغانستان بورهان ئەلدین رەبانی و هێزەكانی جێگری وەزیری بەرگری ئەفغانی عەبدولرەشید دۆستم، لەكاتێكدا هێزەكانی ئەمریكا و هێزە فرەنەتەوەییەكان سەرقاڵی گەڕان بەدوای سەرانی ئەلقاعیدە بە سەرۆكایەتی ئوسامە بین لادن و هێزەكانی تاڵیبان بە سەرۆكایەتی مەلا محەمەد عومەر دا بوون. لە مانگی سێ ی ۲۰۰۲ دا شەڕەكە شێوازێكی زۆر توندتری لەخۆ گرت كاتێك فرۆكە ئەمریكییەكان چەند هێرشێكی توندیان كردە سەر ئەشكەوت و حەشارگەكانی شاخی ئەناكۆندا لە رۆژهەڵاتی ئەفغانستان و هێزە پیادەكانیش پاكسازی هەمان ناوچەیان دەكرد و لە ئاكامدا هێزەكانی ئەمریكا جگە لە كوژرانی ژمارەیەكی زۆر توانیان دیلێكی زۆر لە سەرانی ئەلقاعیدە و تاڵیبان دەستگیر بكەن و رەوانەی بەندیخانەكانی گوانتەنامۆی ئەمریكی لە كوبا كران.

لە بەرورای ٥ / ۲ / ۲۰۰۲ سەرۆكی حكومەتی ئەفغانی حامید كارزای ئاڵای نوێی ئەفغانستانی لەسەر تەلاری سەرۆكایەتی لە كابوول بەرز كردەوە، شایەنی باسە ئەو ئاڵایە هەمان ئەو ئاڵایەیە كەهێمای ئەو وڵاتە بووە لە ساڵی ۱۹۱۹ دا. ئاڵای كۆن لە سێ لاكێشەی درێژ پێكهاتووە رەنگەكان لە راستەوە سەوز، سوور، رەشە، بەسەر رەنگە سوورەكەدا لە ناوەڕاست دوو گوڵە گەنم كێشراوە و بەدوایدا رستەی لا اله الا الله محمد رسول الله بە رەنگی سپی نووسراوەتەوە. بەڵام ئاڵای بزوتنەوەی تاڵیبان پێك هاتبوو لە ئاڵایەكی سپی، بەڵام جگە لە سعودیە و ئیماراتی عەرەبی و پاكستان، هیچ وڵاتێكی دیكە دانی پیانەنا.

لە بەرواری ۱۸ / ٤ / ۲۰۰۲ دا شای پێشووی ئەفغانستان محەمەد زاهیر لە تاراوگەوە لە ئیتاڵیاوە گەڕایەوە بۆ كابوول تاكو بۆ هەمیشە لەوێ نیشتەجێ بێت و لە پرۆسەی بنیاتنانەوەی وڵاتەكەی بەشداری بكات.

لە بەرواری ۱۱ / ٦ / ۲۰۰۲ ئەنجومەنی لویا جیكا لە كابوول كۆبوونەوە، ئەم ئەنجومەنە لەسەر گەورەی هۆزە ئەفغانیەكان پێك هاتووە و خۆیان بە پیاو ماقوڵ و دەمراست دەزانن، ژمارەی كورسیەكانیان نزیكەی ۱٥۰۰ كورسی دەبێت و حامید كارزای وەك سەرۆكی حكومەتێك لە ۳۰ وەزیر پێك هاتووە هەڵبژێردرا. لە بەرواری ۲٤ / ٦ / ۲۰۰۲ حكومەتی نوێ

سوێندی دەستووری خوارد.

لەگەڵ ئەوەی ئاسایش بەشێکی زۆری وڵاتەکەی گرتۆتەوە بەڵام هێشتا کاری تیرۆریستانە لەهەندێ جێدا ئەنجام ئەدرێ، توندترینیان تیرۆر کردنی جێگری سەرۆکی حکومەتی ئەفغانی وەزیری ئاوەدانکردنەوە حاجی عەبدلقادر بوو لە دەرەوەی نووسینگەی خۆی لە ناوەڕاستی کابوولدا لەلایەن دوو تیرۆریستی نەناسراوەوە و توانیان ٣٦ گوللەی پێوە بنێن و هەڵبێن. لەم دواییانەشدا لەلایەن فرۆکەیەکی ئەمریکیەوە بۆردومانی شاییەك کرا لەنێو گوندێکی ئەفغانی و بووە هۆی کوشتنی ٥٠ کەس وبریندار بوونی ١٥٠ دیکەش، هێزە ئەمریکییەکان رایانگەیاند کە ئەم بۆردومانە بە شێوەیەکی هەڵە کراوە لە کاتی گەڕان بەدوای سەرانی ئەلقاعیدە و تالیبانەدا و داوای لێبوردنیان کرد. ئابووریناسان دەڵێن باری ئابووری ئەفغانستان لە گەشە کردندایە و حکومەتی ئەمریکیش بڕیاری داوە پارێ گاری لە ژیانی حامید کارزای بکات پاش ئەوەی هەوڵی تیرۆکردنی دراوە لە مانگی نۆی ٢٠٠٢ دا.

## ئیکوادۆر

**ناوی باو:** ئێکوادۆر

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئێکوادۆر

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Republic of Ecuador

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نیشتیمانی ( ٨٢ ئەندام ).

**ڕووبەر :** ١٠٥,٠٣٧ میل دووجا، ٢٧٢,٠٤٥ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١١,٩٣٧,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان :** ٤٣.٩ کەس/ کم$^{2}$

**نەتەوەکان:** هیندەکانی ئەمریکا، میسیتزۆ ( تێکەڵ )، ئەوروپی، ئەفەریقی ڕەش.

**ئاین :** مەسیح ( ڕۆمان کاسۆلیك ).

**زمان:** ئیسپانی

**پایتەخت:** کویتۆ

**شارە سەرەکییەکان:** گوایاکیل، کینیا، ماشالا، بۆرتۆفیگۆ.

**دراو:** سۆکریە

**ئاووهەوا:** گەرم لەناوچە کەناریەکان: نێوەندی گەرما ٢٤ - ٢٦ پلەی سەدی، باران ساڵانە دەگاتە ١٠٠ سم، گەرم و باراناوی لە نزماییە ڕۆژهەڵاتیەکان، گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان ٢٦ – ٢٧ پلەی سەدی دەبێت و بارانێکی زۆری هەیە. بەرزاییەکانی ئەندیز: گەرما لە نێوان ١٤ ١٥ پلەی سەدی دەبێت ورێژەی باران ساڵانە دەگاتە ١١٠ سم، شاخا بەرزەکانی ئەندیز بەدرێژایی ساڵ بەفر داپۆشیوە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، مانگا، کاکاو، ڕاوەماسی، قاوە، گەنمەشامی، شیرەمەنی، پەتاتە، برنج ( برنج )، گەنم، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، دەرمان، دروستکراوە خۆراکیەکان، دروستکراوەکانی خووری.

**سامانە کانزاییەکان:** نەوت، مس، ئاسن، قوڕقوشم، خەڵوزی بەردین، گۆگرد.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئیکوادۆر، ئەو وشە ئیسپانییەیە کە بەمانای هێڵی یەکسان دێت و ئەم ناوەی بەوهۆیەوە لێنراوە کەهێڵی کەمەرەیی بەناوەڕاستیدا تێپەڕ دەبێت، وڵاتێکە دەکەوێتە سەر کەناری

رۆژئاوای كیشوەری ئەمریكای باشوور، ئێكوادۆر لەگەڵ كۆلۆمبیا لە باكوورەوە سنووردارە و پیرۆ دەكەوێتە رۆژهەلاتی و زەریای هێمن دەكەوێتە رۆژئاوای و دورگەكانی گلاباگۆس بەدوای دا دێت كە ٩٧٠ كم دوورە لێوەی لەوپەڕی زەریای هێمن. ناوەڕاستی ئێكوادۆر دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٧٨ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٢ بەرەو باشوور.

خاكی ئێكوادۆر لە دەشتێكی تەخت پێك دێت بەدرێژایی كەناری سەر زەریای هێمن و دوو زنجیرەی یەكسان لە شاخەكانی ئەندیز ( كە ٢٥ ٪ ی رووبەری ولاتەكە دەبێت ) بەدرێژایی ئێكوادۆردا لەباشوورەوە بۆ باكوور دەبێت. لە نێوان هەردوو زنجیرە شاخەكانیش چەندین بان و نزمایی پەیدا دەبێت. بەلام رۆژهەلاتی ولاتەكە لەچەند دارستانێكی چڕ و بەدرێژایی بەرزاییەكانی ئەندیز دا دەكشێ و بەشێكی حەوزی ئەمازۆن پێك دەهێنێت.

هیندەكانی ئەمریكا یەكەم دانیشتوانی ناوچەكە بوون. لە ساڵی ١٥٣٤ دا ئیسپانییەكان گەیشتنە ئیكوادۆر و كویتۆ یان كردە پایتەختی و رەش پێستەكانیان هێنایە ئەم ولاتەوە و لەو كێڵگانە كاریان پێكردن كە لە نزماییە كەناریەكاندا دروستیان كردبوو. پاش ئەوەی ئیمپراتۆری فەرەنسا ناپلیۆن بۆناپێرت لە سەرەتای سەدەی نوزدەیەمدا ئیسپانیای داگیر كرد، دەسەلاتدارانی داگیركراوەكانی ئیسپانیا سوودیان لە لاوازی ئیسپانیا وەرگرت وداوای سەربەخۆییان كرد. لەبەرواری ٢٤ / ٥ / ١٨٢٢ دا جەنەراڵ ئەنتۆنیۆ خۆسیە دی سوكری، كە یەكێ بوو لە ئەفسەرانی سوپای سەركردەی شۆڕشگێڕ سیمۆن بۆلیڤار، سەركەوتنی بەدەست هێنا لە شەڕی بتشنتشا نزیك كویتۆ بەسەر سوپای ئیسپانیدا، بەمەش كۆتایی بە دەسەلاتی ئیسپانی هێنرا لەو ولاتە وئێكوادۆر بووە ئەندامێكی یەكێتی كۆلۆمبیای گەورە كە سیمۆن بۆلیڤار سەركردایەتی دەكرد و هەر یەك لە كۆلۆمبیا،پەنەما، ڤەنزویلای لەخۆ گرتبوو. لەساڵی ١٨٣٠ دا یەكێتیەكە گەندەڵ بوو، بۆیە ئیكوادۆر كشایەوە و لە ١٠ / ٨ / ١٨٣٠ سەربەخۆیی خۆی راگەیاند، بەلام ئەمە بووە هۆی پەیدابوونی ململانێیەكی گەورە لەسەر دەسەلات، یەكەم سەرۆكی ئیكوادۆر جەنەراڵ خۆسیە فلۆریز بوو و دەسەلاتیشی تا ساڵی ١٨٤٥ ی خایاند. ئێكوادۆر لە ١٠ / ٨ ی هەموو ساڵێك ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەكێڕێت.

لە ساڵی ١٩٤٥ دا ئێكوادۆر بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككگرتوەكان.

لە مانگی شەشی ساڵی ١٩٩٨ جەمیل موعەوەزی لوبنانی بەرەچەڵەك بەهەڵبژاردن كرایە سەرۆكی ئیكوادۆر، پاش ئەوەی سەرۆك عبد الله ( ئەویش هەر لوبنانی بوو بەڕەچەڵەك )لە بەرواری ٦ / ٢ / ١٩٩٧ دەستی لەكار پێكێشرایەوە.

لە مانگی تشرینی یەكەمی ١٩٩٨ دا هەردوو كۆماری ئێكوادۆر و پیرۆ رێكەوتننامەیەكیان

واژۆ کرد بۆ کۆتایی هێنان بەو کێشە و گرفتانەی لەسەر سنوورەکان دووچاریان بوو بوو و بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕەکانی ساڵانی ١٩٤١ و ١٩٨٥ و ١٩٩٥ ئەم ڕێکەوتننامەیە بە ئامادەبوونی هەر یەك لە ویلایەتە یەکگرتوەکان و ئەرجەنتین و چیلی و بەرازیل بە ئەنجام گەیەنرا.

لە بەرواری ١٤ / ٥ / ١٩٩٩ هەر یەك لە سەرۆك جەمیل موعەوەز و سەرۆکی پیرۆ ئەلبیرتۆ فۆجیموری لە ئاهەنگێکی گەورە لەناوچەیەکی سنووری نێوان هەردوو وڵات دەستیان خستە دەستی یەك و کۆتاییان هێنا بە دوایین کێشەی سنوورەکانیان.

لە بەرواری ٢١ / ١ / ٢٠٠٠ پاش ئەو گرفتە ئابووریە گەورەیەی کە وڵاتەکەی بەرەو خنکان دەبرد، کودەتایەکی سەربازی بەسەر جەمیل موعەوەز بەئەنجام گەیەنرا لەلایەن هێندە سوورەکانەوە ڕێکخرابوو ( دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئێکوادۆر ) و جێگری سەرۆك پارێزگار : گۆستافۆ نۆبوا بووە سەرۆکی وڵات، بەڵام ئەمیش ڕووبەڕووی هەمان گرفتی ئابووری بووەوە: گەندەڵیەکی زۆر، باوەڕ نەمان بەچینی دەسەڵاتدار. پاش سێ ڕۆژ سەرۆکی نوێ سوێندی دەستووری خوارد و بەڵێنی دا بەگەل هێمنی و ئاسایش بێنێتەوە نێو شەقامی ئێکوادۆر و چارەسەری گرفتە ئابووریەکان بکات.

کشتوکاڵی لە ئێکوادۆردا سەرەکی ترین ستوونی ئابووری ئەو وڵاتەیە و زیاترین هێزی کار ئیشی تیادەکات. نەوت و مۆز و کاکاو وقاوە وماسی ورۆبیانیش لە بەرهەمە سەرەکیەکانێتی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٤ ملیار دۆلاری ئەمریکییە.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١،٣١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٠١ هەمین وڵاتە لە جیهاندا.

سروودی نیشتیمانی ئیکوادۆر: سڵاوت لێبێت ئەی ئێکوادۆر، ئەی نیشتیمانی دایك.

ئێکوادۆر بە پلەی هەشتەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی کاکاو، بە پلەی چواردەیەم لە بەرهەمی قاوەدا.

## ئەلبانیا

**ناوی باو:** ئەلبانیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئەلبانیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**
Republic of Albania

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٤٠ ئەندام )

**رووبەر:** ١١,١٠٠ میل دووجا، ٢٨,٧٤٨ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣,٢٩٣,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١١٥ کەس / کم٢

**نەتەوەکان:** ئەلبانیەکان، یۆنانی، مەکەدۆنی

**ئاین :** موسڵمان ( ٨٠ ٪ )، مەسیح ( ئەرتۆدۆکس، رۆمان کاسۆلیك )، بێ باوەڕ.

**زمان:** ئەلبانی

**پایتەخت :** تیرانا

**شارە سەرەکییەکان :** دۆرۆس، ئێلباسان، شکۆدەر، فلۆر

**دراو :** لیك

**ئاووهەوا:** مامناوەند، زستانی باران، هاوینی گەرم و وشکە، رێژەی نێوەندی بارانی ساڵانە ١٠٠ - ١٥٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان :** گەنم، گەنمە شامی، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، گوڵەبەرۆژە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، پەین، دروست کراوەکانی خووری، دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانە کانزاییەکان :** پیترۆڵ، کرۆم، مس، گاز، خەڵووزی بەردین.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەلبانیا، یان شکیبیریا بەزمانی خەڵکی وڵاتەکە واتا رۆڵەکانی هەڵۆ، وڵاتێکی ئیسلامیە دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا، یۆگسلافیا دەکەوێتە باکووری، مەکەدۆنیا و یۆنان دەکەونە رۆژهەڵاتی و دەریای ئەدریاتیکی دەکەوێتە رۆژئاوای، ناوەڕاستی ئەلبانیا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٠ بەرەو رۆژهەڵات و هێڵی پانی ٤١ بەرەو باکوور.

زۆربەی خاکی ئەلبانیا شاخاوییە، شاخی کۆرابیت بەرزترین شاخەکانیەتی ( ٢٧٥١ م ) و دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە. دەشتێکی کەناریی دەکەوێتە سەر دەریای ئەدریاتیکی، دارستانەکان رێژەی ٣٠ ٪ ی خاکی ئەلبانیا دەبن.

جوگرافی ناسی ئەغریقی ( بەتلیمۆس ) ئەم ناوچەیەی ناو ناوە ئەلبانوی کە بەمانای شاخ دێت و هۆزی ئەلبانوی لە ناوەڕاستی باکووری ئەو وڵاتە دەژیا و تا ئێستاش هەر لەوێدان و لەمانەوە ناوی ئەلبانیا هاتووە و کە کۆتایی سەدەی چواردەیەمی زایینی.

ئەو ناوچەیە بەشێك بوو لە هەردوو ئیمپراتۆریەتی رۆمانی و بێزەنتی لە چاخە کۆنەکاندا.

ئیسلامیەکان لەسەردەمی بەرفراوان بوونی عوسمانیەکان لەناوچەی بەلقانەوە هاتوونەتە ناوی لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەیەمی زایینی و عوسمانیەکان لە سالی ٧٨٩ ك ( ١٣٨٧ ز ) هاتوونەتە ناوی و ماوەی چوارسەت سالْ سەر بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بووە. تا ئەو کاتەی سەربەخۆیی راگەیەنرا لە ٢٨ / ١١ / ١٩١٢ دا دیاری کردنی سنوورەکانی لە سالی ١٩١٣. ئیسلام لەسەر دەستی خەلکی ولاتەکە خۆیان بلاوبۆتەوە و کێشە ئاینییەکان هەرگیز رووی نەکردۆتە گەلی ئەلبانیا. ئەلبانیا سالانە لە ٢٨ / ١١ ی هەموو سالێك جەژنی نیشتیمانی دەگێرن.

لە ماوەی جەنگی جیهانیی یەکەمدا هەریەك لە مەجەر و نەمسا وئیتالیا و سربیا و فەرەنسا چەند بەشێکیان داگیر کردووە، سەربەخۆیی خۆی لە ئیتالیا لە ١٩٢٠ دا راگەیاند و لە سالی ١٩٢٨ دا بووە شانشین.ئیتالیا لە سالی ١٩٣٩ دا داگیری کردووە، پاشان یۆنان لە سالی ١٩٤١ و دوای ئەو ئەلمانیا تا سالی ١٩٤٤ دەستی بەسەردا گرت، تا ئەنوەر خواجە هاتە سەر حوکم.

لە سالی ١٩٤٩ دا ئەنوەر خواجە کۆماری ئەلبانیای میللی راگەیاند و جیا لەهەموو جیهان دەژیا تا ٦ / ٨ / ١٩٨٦ کاتێ هێلی ئاسنی بەرەو تۆری ئاسنی ئەوروپا کردەوە، لە سالی ١٩٥٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەبەرواری ١٥ / ٤ / ١٩٩١ دا ناوی فەرمی ئێستای وەرگرت : کۆماری ئەلبانیا.

لە سالی ١٩٨٥ دا ئەنوەر خواجە کۆچی دوایی کرد و رامز عەلیا هاتە شوێنی، رامز بریاری فرە حیزبی لەولاتدا دەرکرد لە بەرواری ١١ / ١٢ / ١٩٩١ پاش هەلوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت و رمانی رەوتی شیوعیەت لە ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلات. لە سالی ١٩٩٤ دا سالح بریشا هاتە سەر حوکم و لەبری رامز عەلیا بووە سەرۆکی ئەلبانیا. لەسەردەمی حوکمی بریشا ئەلبانیا دوچاری گرفتی ئابووری گەورە بووەوە و ئاژاوە و خۆپیشاندان زۆربەی شارەکانی گرتەوە، ناچار سالح دەستی لەکار کێشایەوە. لە بەرواری ٢٤ / ٧ / ١٩٩٧ دا پەرلەمانی ئەلبانی بە هەلبژاردنێکی نهێنی دەنگیان بە ریکسهێب میجدانی ( ٥٣ سالْ ) دا و بووە سەرۆکی کۆماری ئەلبانیا، شایەنی باسە میجدانی تاکە پالێوراو بوو.

لە بەرواری ٢٤ / ٦ / ٢٠٠٢ پەرلەمانی ئەلبانی وەزیری بەرگری پێشوو ئەلفرید مویسیۆ ( ٧٤ سالْ ) هەلبژارد بۆ پۆستی سەرۆکی کۆمار بۆ ماوەی پێنج سالْ.

سروودی نیشتیمانی : با لە پشت ئالامانەوە یەك بین

ئەلبانیا یەکێکە لە ولاتە ئەوروپییە لاوازەکان لە رووی گەشە کردنی ئابووریەوە، ئەلبانیا پشتی تەواوی بە چالاکی کشتوکالی بەستووە کە رێژەی ٦٠ ٪ دانیشتوان کار لەو بوارەدا دەکەن. ولات خاوەنی هەموو کارخانەکان و ویستگەکانی بەرهەمی ووزە و چاودێری بەرهەم وهۆیەکانی گواستنەوە، دوای نەمانی رەوتی کۆمۆنیستی لە ولاتانی ئەوروپای رۆژهەلاتدا ئەلبانیا تا ئاستێك گەشەکردنی بەخۆوە بینی.

تێکرای بەرهەمی نەتەوەیی : ١,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١٤٧ هەمین ولاتە.

**نێوەندی خەرجی سالانەی تاك : ٣٦٠ دۆلاری ئەمریکی.**

## ئیلسلفادۆر

ناوی باو: ئیلسلفادۆر

ناوی فەرمی : کۆماری ئیلسلفادۆر

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی :

Republic of Salvador

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

دەستەی یاسا دانان: کۆمەڵەی یاسادانانە ( ١٨٤ ئەندام ).

رووبەر : ٨,١٢٤ میل دووجا، ٢١,٠٤١ کم$^2$

رێژەی دانیشتوان: ٥,٦٦٢,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان : ٢٦٩,١ کەس / کم$^2$

نەتەوەکان: میستیزۆ ( تێکەڵ )، هیندی ئەمریکی، ئەوروپی.

ئاین : مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك )، واژۆمۆن.

زمان : ئیسپانی

پایتەخت : سان ئیلسلفادۆر

شارە سەرەکییەکان : سۆیا بانگۆ، سانتا ئانا، سان میگل، میگیکانۆس.

دراو : کۆلن

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: پاقلەمەنییەکان، قاوە، جۆ، برنج، قامیشی شەکر.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروستکراوە کیمیاییەکان، دروستکراوە خۆراکییەکان، جگەرە، خواردنەوە، دروستکراوەکانی خووری وپێست.

ئاووهەوا: خوولگەیی، پلەکانی گەرما لەسەر کەنار ٢٧ پلەی سەدی دەبێت و لەسەر شاخەکان بە درێژایی ساڵ ٢٣ پلەی سەدی دەبێت. ناوەندی رێژەی باران دەگاتە ٢١٥ سم لە ساڵێکدا لەسەر کەنار و ١٥٠ سم لە باکووری رۆژئاوا.

ئیلسلفادۆر:

ئیلسلفادۆر وڵاتێکی بچوکە لە ئەمریکای ناوەڕاستدا، هندۆراس دەکەوێتە باکووری ئیلسلفادۆر، نیکاراگوا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی و زەریای هێمن لە باشوور و گواتیمالا دەکەوێتە رۆژئاوای. یەکبڕی هێڵی درێژی ٨٩ بەرەو رۆژئاوا و هێڵی پانی ١٤ بەرەو باکوور دەکەوێتە ناوەڕاستی ئیلسلفادۆر.

ناوچە کەنارییەکانی وڵاتەکە بریتییە لە ناوچەیەکی دەشتی بەپیت بۆ کشتوکاڵی و پیشەسازی بەگەڕ خراوە. ناوەڕاستی وڵاتەکەش لەخاکە گڕکانییە بە پیتەکانە، بەلام باکووری وڵات بە زنجیرەیەك شاخی نزم کە لە پاشەڕۆ و بەرد و خۆڵەمێشی گڕکانەکانەوە

پەیدا بووە.

هیندەکانی ئەمریکا لە مێژەوە لەو ناوچەیەدا ژیاون، ئیسپانیەکان لە سالّی ١٥٢٥ دا بەسەرۆکایەتی بیدرۆ دو ئەلفارادۆ داگیریان کردووە،دیل مۆندۆ شاری سان ئیلسلفادۆری دامەزراندوە و لەسەر ناوی یەکێ لەجەژنە ئاینییەکانی رۆمە کاسۆلیکەکان ناوی ناوە، پاشتر ناوی هەموو ولأت بەناوی ئەو شارەوە نرا، وشەی سان سلڤاردۆر بەمانای ( مەسیحی دڵسۆزەوە ) دێت.لە ١٥ / ٩ / ١٨٢١ دا ئیلسلفادۆر لە ئیسپانیا جیا بووەوە.

لە سالّی ١٨٢٣ ئیلسلفادۆر لەگەلّ ولأتەکانی ئەمریکای ناوەڕاست ( جگە لە پەنەما ) یەکێتی هەرێمە یەکگرتوەکانی ئەمریکای ناوەڕاستیان دامەزراند، دواتر لە ٣٠ / ١ / ١٨٤١ دا سەربەخۆیی خۆی لەو یەکێتیە راگەیاند، سالأنە لە ٣٠ / ١ دا ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەگێڕێت، لە سالّی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

پاش سەربەخۆ بوونی دووچاری چەندین کێشە و گرفتی سیاسی بووە.بەهۆی زۆری پارت و رەوتەکانەوە بەردەوام ململانێی لەسەر دەسەلأت کراوە هەرگیز ئارامی بەخۆوە نەبینیوە، سەربازییەکان ماوەیەك حوکمی ولأتیان گرتۆتە دەست، هەروەها شارستانیەکانیش، چەند جارێك بەزۆرە ملی لەسەر دەسەلأت دەرکراون و زۆریشیان لەسێدارە دراون، دیکتاتۆرەکانی ولأتانی دراوسێی بەهۆی لاوازی سەرکردەکانی ئیلسلفادۆر چەند جارێك دەسەلأتی ولاتەکەیان گرتۆتە دەست. لەهەفتا و هەشتاکانی سەدەی بیستدا ئیلسلفادۆر چەندین هەلّمەتی نارەزایی و خۆپیشاندانی توندی بەخۆوە بینیوە، ئۆپۆزسیۆنەکان داوایان لە حکومەت دەکرد کە زەوی کار بۆ هەژاران بدۆزێتەوە، بۆیە حکومیش چەند چاکسازییەکی لەولأتەکەدا بەئەنجام گەیاندووە لەنێویاندا تەرخان کردنی زەوی بۆ هەژاران، بەلأم ئەم هەولأنەی حکومەت بێ سوود بوون و ئاژاوە و خۆپیشاندانەکان هەر بەردەوام بوون. لە ئاکام دا شەڕی ناوخۆ لەنێوان هێزە چەکدارەکانی حکومەت و هێزە پارتیزانەکانی ئەو ولأتە کە لە کۆمەلّەیەك یاخیبووی رەوتی چەپ پەیدا بوو، ئەمەش بووە هۆی کوژرانی خەلّکێکی زۆر و زیان گەیاندن بەدەزگا حکومیەکان، حکومەت لە هەنگاوێکدا بۆ کۆتایی هێنان بەم رەوشە داوای دانوستانی لەگەلّ یاخی بووانـدا کرد، دانوستان لەنێوان حکومەتی ئیلسلفادۆر بەسەرۆکایەتی سەرۆکی هەلّبژێردراو لە سالّی ١٩٨٩ و شۆڕشگێڕەکان دەستی پێکرد. لە بەرواری ١٣ / ٩ / ١٩٩١ دا بەرەی سەرەکی شۆڕشگێڕانی ئیلسلفادۆر ( فارابۆندۆ مارتی ) بە ئاگاداری نەتەوە یەکگرتوەکان ئاگر بەستیان راگەیاند. لە بەرواری ١٦ / ١ / ١٩٩٢ دا واژۆ لەسەر رێکەوتننامەی ئاشتی ( شابۆلتیبیك ) کرا لەنێوان شۆڕشگێران و حکومەتدا. لە بەرواری ١٥ / ١٢ / ١٩٩٢ بە شێوەیەکی فەرمی کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ هێنرا لە

ئیلسلفادۆر. لە ساڵی ١٩٩٤ دا دەست کرا بەهەڵبژاردنەکانی سەرکردایەتی بە چاودێری نەتەوە یەکگرتوەکان و لە هەڵبژاردنەکاندا ئارماندۆ کالدیرۆن ( ٤٦ ساڵ ) سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لە مانگی سێ ی ١٩٩١ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە ئیلسلفادۆر بەرێوە چوو، ئەمجارەیان مامۆستای فەلسەفە فرانسیسکۆ فلۆریس ( ئەندامی پارتی نەتەوەیی کۆماری )بەزۆرینەی دەنگ سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لەبەرواری ١ / ٦ / ١٩٩٩ دا سوێنی دەستووری خوارد و بووە سی وچوار هەمین سەرۆکی وڵاتی ئیلسلفادۆر و دەست بەجێ بەڵێنیدا رووبەرووی هەردوو کێشە سەرەکی و گەورەکەی وڵات ببێتەوە کە گەشە کردنی ئابووری و نەهێشتنی تاوان بوون.

لە کۆتاییەکانی مانگی دە وسەرەتای مانگی یانزدەی ١٩٩٨، گەردەلوولی زەبەلاحی میتش لە ئەمریکای ناوەڕاستی دا، ئەمەش بووە هۆی گەیاندنی زیانێکی گەورە لە وڵاتانی ئەمریکای ناوەڕاست و پەنجا ساڵ بەرەو دوای برد، هەندێ وڵات قەرزەکانی لەسەر ئەو وڵاتە زیان لێکەوتوانە سڕییەوە جگە لەو یارمەتییە زۆرانەی کە لەوڵاتانی دنیاوە بۆیان چوو.

لە بەرواری ١٣ / ١ / ٢٠٠١ دا بوومەلەرزەیەك بەگوێرەی ٧,٩ پلە بە پێوەری رێختەر لە ئیلسلفادۆریدا و تەواوی دانیشتوانی ئەمریکای ناوەڕاست هەستی پێکرد، بوومەلەرزەکە بەتایبەتی لەناوچەی لاس کۆلیناسی دا کە نزیکەی ١٢ کم لە پایتەختی ئیلسلفادۆرەوە دوورە، کوشتن و ماڵ وێران کردنێکی زۆری خستەوە، بوومەلەرزە لە ساڵەکانی ١٩٠٦، ١٩٥١ , ١٩٦٥، ١٩٨٦ لە ئیلسلفادۆری داوە.

سروودی نیشتیمانی : ئێمە شانازی بەخاکی وڵاتمانەوە دەکەین.

ئابووری لە ئیلسلفادۆردا پشتی تەواوی بە کشتوکاڵی بەستووە لەبەر ئەوەی کە سێ لەسەر چواری ئەو وڵاتە لە زەوییە کشتوکاڵیەکان پێك هاتووە. نیوەی هێزی کاری ئەو وڵاتە لە کشتوکاڵیدا کار دەکەن. حکومەتی ئیلسلفادۆر لەم دواییانەدا هەوڵی هاندانی گەشە کردنی پیشەسازی ئەدا تاکو پشت بەستن بە کشتوکاڵی کەم کاتەوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا پیشەسازی بەرێژەیەکی کەم بەشداری لە داهاتی نەتەوەیی دەکات.

تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی: ٩,٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨١ هەمین وڵات

نێوەندی خەرجی تاك لە ساڵێکدا: ١,٤٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ئیلسلفادۆر بە پلەی دەیەم دێت لەنێوان وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی قاوە، چاندنی قاوە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستهەمدا هاتە نێو ئیلسلفادۆرەوە ئەمەش کاریگەری کردە سەر گەشە کردنی باری ئابووری لەو وڵاتەدا.

## ئەڵمانیا

**ناوی باو:** ئەڵمانیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**
Federal Republic of Germany

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری یەکگرتوو، سەرۆکی فیدراڵ، راوێژکاری فیدراڵ

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت :

پەرلەمانی فیدراڵی ( ٦٨ ئەندام )

ئەنجومەنی ویلایەتەکان ( ٦٧٢ ئەندام )

**رووبەر :** ١٣٧,٧٣٥ میل دووجا، ٣٥٦,٧٣٣ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٨٢,١٤٣,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢٣٠,١ کەس / کم٢

**نەتەوەکان:** ئەڵمان، تورك، یۆگسلاڤی، ئیتاڵی، یۆنانی، پۆلۆنی، نەمسایی، کرواتی، ئیسپان.

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان) کاسۆلیك، پرۆتستانت، موسڵمان، جوولەکە.

**زمان:** ئەڵمانی

**پایتەخت:** بەرلین

**شارە سەرەکییەکان:** شتوتگارت، میونیخ، پۆتسدام، ڤیسبادن، هانۆڤەر، درێسدن، هامبۆرگ، بۆن.

**دراو:** مارك، یۆرۆ لە بەرواری ١ / ١ / ٢٠٠٢ بەدواوە

**ئاووهەوا:** ئەڵمانیا کەوتۆتە ئەو ناوچەیەی کە دەکەوێتە ژێر کاریگەری بای سارد و مامناوەندەکانی رۆژئاوا لە نێوانی زەریای ئەتڵەسی لە رۆژئاوا و ئاو وهەوا کیشوەرییەکانی رۆژهەڵات. بەردەوام پلەکانی گەرما لەگۆڕاندایە و باران لەهەر وەرزی ساڵدا دەبارێت. نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا دەچێتە ١,٥ پلەی سەدی لەناوچە نزمەکان و ٦ لەژێر سفری سەدی لە شاخاکاندا. لەهاویندا ١٨ پلەی سەدی لەناوچە نزمەکان و ٢٠ پلە لە دۆڵەکانی باشووردا.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** شیرەمەنییەکان، گەنم، جۆ، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، میوە وسەوزە، بەخێوکردنی مانگا و بەراز

بەرهەمە پیشە سازییەکان: ئۆتۆمبێل، دروستکراوە کیمیاییەکان، دەرمان، دروست کراوە خۆراکییەکان، ئامێر، دروست کردنی ئامێرەکانی چاپەمەنی، کەلوپەلی کارەبایی، پۆلا، ووزەی ئەوەوی .

سامانی کانزایی: خەلۆوزی بەردین، جیوە، پۆتاس، خوێ، ئاسن، تۆتیا، قورقوشم، مس، لینیت، نەوت

تێڕوانینێکی گشتی :

ئەڵمانیا وڵاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی باکووری ئەورووپا، لەگەڵ دانیمارکدا لەباکوورەوە سنووردارە، پۆڵەندا و تشیکیا و نەمسا لە ڕۆژهەڵاتەوە، نەمسا وسویسرا لە باشوورەوە، فەرەنسا ولۆکسمبۆرگ وبەلجیکا وهۆڵەندا دەکەونە ڕۆژئاوای. لە باکوورەوە دوو کەناری هەیە : یەکێکیان دەڕوانێتە سەر دەریای باکوور و ئەوی دیکەشیان دەکەوێتە سەر دەریای بەلْتیق. کۆماری ئەڵمانیا فیدراڵ لە ١٦ ویلایەت پێك هاتووە. ناوەڕاستی ئەڵمانیا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥١ بەرەو باکوور.

ئەڵمانیا خاوەنی سروشتێکی زۆر جوان و دڵبەرە، شاخە نزم و بەرزەکانی دەڕواننە سەر دەشت و زەوییە لوول پێچەکان و دەریاچەکان.ئەڵمانیا لە باکوورەوە بۆ باشوور دابەش دەبێت بەسەر پێنج ناوچەی سروشتی گەورە، ئەوانیش: دەشتە ئەڵمانییە نزمەکانی باکوور، زنجیرە چیاکانی ناوەڕاست، زنجیرە چیا لوول پێچەکانی باشووری ڕۆژئاوا، ناوچەی پێش شاخاکانی ئەلب لە باشووری ئەڵمانیا، شاخاکانی ئەلبی باڤاریا. ڕووباری ڕاین، گرنگترین میحوەری ئەڵمانیایە بۆ هاتوچۆکانی نێوان باکوور بۆ باشووری ئەڵمانیا، دەکەوێتە دۆڵێکی تەسك لەنێوان بینگن و بۆندا و زنجیرە چیای ڕاین بەسەریا دەڕوانێت، پاش ئەوەی ڕوباری ڕاین لە بۆن دەرئەچێ دەگاتە دەشتە باکوورییەکانی ئەڵمانیا تا دەچێتەوە ڕێژگەی خۆی لە دەریای باکوور.

مرۆڤی سەرەتایی بەر لە ٦٥٠,٠٠٠ ساڵ لەو ناوچەیەدا ژیاوە ومرۆڤی نیاندەرتاڵ بەر لە ١٠٠,٠٠٠ ساڵ لەو ناوچەیە دەرکەوتووە. پێشڕەوانی گەلی ئەڵمانیا لە باکووری ئەورووپاوە گەیشتونەتە ناوچەکە لە نزیکەی ساڵی ١٠٠٠ پ.ز. ڕۆمانەکان لەساڵی نۆیەمدا هەوڵیان داوە داگیری بکەن، بەڵام هۆزە ئەڵمانیەکان ڕووبەڕوویان وەستاون و تێکیان شکاندون.لە سەدەکانی شەشەم وحەوتەمی زایینی فرانکیونیەکان ساکسۆنیایان واڵا کرد. پاش کۆچی شارلمانی ئیمپراتۆری فەرەنجە، ئیمپراتۆریەتەکەی بەسەر سێ کوڕەزاکەی دابەش کرا، ئەو زەویانەی کەوتۆتە ڕۆژئاوای ڕوباری ڕاین ( ئەڵمانیای ئێستا ) بەر لویسی دووەمی کوڕەزای کەوت. پاش ئەوە ئەڵمانیا بووە چەند ویلایەتێکی سەربەخۆ، وویلایەتی بڕۆسیا لەهەمووان

بەهێزتر بوو. پاش جەنگی برۆسی فەرەنسی ( ١٨٧٠ – ١٨٧١ ) بیسمارکی سەرۆك وەزیرانی برۆسیا توانی ئەڵمانیا یەك بخاتەوە لەژێر ئاڵای برۆسیا. ئەڵمانیا هەوڵی بەرفراوان کردنی دەسەڵاتەکانی دا لە ئەورووپا و پشت دەریاکانەوە و ئەمە هەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ١٩١٤ – ١٩١٨ و جەنگی جیهانی دووەمی ١٩٣٩ – ١٩٤٥لێکەوتەوە. ئەڵمانیا لەهەردوو جەنگ بەتێکشکاوی هاتە دەرەوە. پاش جەنگی جیهانی دووەم ئەڵمانی لەنێوان هاوپەیمانەکاندا دابەش کرد بە دوو وڵات : ئەڵمانیای رۆژهەڵات ( کۆماری ئەڵمانیای دیموکراسی ) و لە گەردوونی یەکێتی سۆڤیەتدا دەسوورا، ئەڵمانیا رۆژئاوا ( کۆماری ئەڵمانیای یەکگرتوو ) و لە گەردوونی وڵاتە رۆژئاواکانی ئەورووپا دەسوورا.

پاش بلاوبوونەوەی بزوتنەوە چاکسازییەکان لە وڵاتانی ئەورووپای رۆژهەڵات، هەردوو وڵاتی ئەڵمانی لە بەرواری ٣ / ١٠ / ١٩٩٠ دا یەکیان گرتەوە لە ژێر ناوی کۆماری ئەڵمانیای فیدراڵ و ئەو رۆژە بەرۆژی یەکبوون ناوبرا وگەلی ئەڵمانیا ساڵانە لەم رۆژەدا جەژنی نەتەوەیی دەگێڕن.

لەساڵی ١٩٧٣ دا هەر یەك لە دوو وڵاتەکەی ئەڵمانیا کورسی خۆیانیان هەبوو لەنێو نەتەوە یەکگرتوەکاندا، بەڵام پاش یەکگرتنیان لە ساڵی ١٩٩٠ دا بوونە خاوەنی یەك کورسی.

لە ساڵی ١٩٨٢ دا هیلمۆت کۆڵ وەك راوێژکاری ئەڵمانیا هەڵبژێردرا و بۆ ماوەی شانزدە ساڵ لەم دەسەڵاتەدا مایەوە، تا ئەو کاتەی کە هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی دۆڕاند لە ٢٧ / ٩ / ١٩٩٨ دا لەبەردەم پاڵێوراوی پارتی سۆسیالیستی دیموکراسی گێرهارد شرۆیدەر، شایەنی باسە ئێریك هۆنیکەر دوایین سەرۆکی ئەڵمانیای رۆژهەڵات بوو.

لە ساڵی ١٩٩٤ دا بڕیاری لەناوبردنی بزوتنەوەی نازیست لە ئەڵمانیا درا کە لە دوای یەکبوونی هەردوو بەشی ئەڵمانیا ئەم بزوتنەوەیە چالاك بوو بوو.

لە ٢٣ / ٥ / ١٩٩٩ دا پەرلەمانی ئەڵمانیا یۆهانز راوی ( ٦٨ ساڵ ) وەك سەرۆکی وڵات هەڵبژارد بۆ ماوەی پێنج ساڵ، بەڵام دەسەلاتەکانی ئەم پلەوپایەیە تەنها وەك شانازییەك وایە و دەسەڵاتی فیعلی بەدەست خودی راوێژکاری ئەڵمانییەوەیە.

لە هاوینی ٢٠٠٢ دا ئەڵمانیا و چەند ولاتێکی ناوەڕاستی ئەڵمانیا دووچاری لافاوێکی گەورە بوون بەهۆی بارینی بارانێکی زۆر کە رێژەی ساڵانەی بارانەکان دەرچوو، بووە هۆی گەیاندنی زیانێکی گەورە و وێران بوونی کۆمەڵێك بینای زۆر لەو شارانەی کە دووچاری ئەو لافاوە بوون.

لە ساڵی ١٩٩٨ دا ئەڵمانیا ئاهەنگی یادی سەد ساڵەی کۆچی بیسمارکی ( ١٨١٥ –

١٨٩٨ ) دامەزرێنەری رایشی دووەمی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٨٧١ دا گێرا.

ئەڵمانیا سێ ناوی جیای هەیە:

١. بە زمانی ئینگلیزی بە ئەڵمانیا دەوترێت : جێرمەنی ( Germany ) و ئەو ناوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای مێژووی گەلی ئەڵمانیا لە ساڵی ١٠٠٠ پ.ز. ئەو كاتەی هەندێ لە هۆزە بەشەڕ هاتوەكان بە تایبەتی هۆزی جێرمان دەستیان كرد بەرەو كۆچ كردن بۆ ناوچەی ئەورووپای باكوور ( ئەڵمانیای ئێستا ) و ئەو هۆزە لەوناوچەیە جێگیر بوون و دەستیان كرد بە كشتوكاڵ و راوەماسی، رۆمانەكان بەو ناوچەیە جێرمانییەكان كۆشكیان بۆ كردبوو پێیان دەوت جێرمانیا.

٢. ناویشی بەزمانی خەڵكی وڵاتەكە خۆی ( دۆیتشلاند ) ە ( خاكی دۆیتش ) ئەم ناوەش لەسەر ناوی ئەو مژدەبەخشەوە ( موبەشیر ) هاتووە كە ئاینی مەسیحی هێناوەتە وڵاتی جێرمانەوە و ناوی رەسەنیشی ( تیۆدیسكۆس ) و لەدواییدا ئەم ناوە وەرگێڕاوە بۆ دۆیتش.

٣. عەرەب و كورد و تورك و زۆربەی خەڵكی ئاسیا پێ ی دوڵێن ئەڵمانیا، ئەم ناوەش یان هەر جێرمەنێكەیە و وەرگێڕاوە یان لە لەوشەیەكی لاتینیەوە وەرگیراوە : ئاڵ مێنەر، واتا هەموو خەڵك، لەبەر ئەوەی ئەڵمانەكان لەیەك نەتەوە پێك نەهاتبوون، بەڵكو كۆمەڵێك هۆز ئەو گەلەیان پێك هێنا كە لەو ناوچەكەدا دەژیان.

ئەڵمانیا یەكێكە لەوڵاتە پیشەسازییە گەورەكانی جیهان. شایەنی باسە هۆی ئەم پلە وپایەی كە ئەمرۆ ئەڵمانیای تێدایە ناگەڕێتەوە بۆ یەدەگێكی دارایی گەورە پاش زمانی لە جەنگی جیهانی دووەمدا گەنجینەی كردبێت یاخود بۆ سامانە سروشتیەكانی، بەڵكو دەگەڕێتەوە بۆ كۆشش و هەوڵی هاوڵاتیانی خودی ئەڵمانیا و ئاستی خوێندەواری و بلیمەتی رۆڵەكانی لەتەواوی قۆناغەكاندا. كرێكاری ئەڵمانیا عەشقی كاری خۆیەتی، لێهاتوانە بەردەوامن لە داهێنان و پەرەسەندن، لەگەڵ ئەو بوارە بەرفراوانەی كە سیستەمی ئابووری ئەو وڵاتە رەخسانویەتی لە بازاڕی ئازادەوە تا هاوسەنگی باری كۆمەڵایەتی.

تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی: ٢٠٧٥ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٣ هەمین وڵاتە لە جیهاندا.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٥,٥٨٠ دۆلاری ئەمریكییە.

ئەڵمانیا بە پلەی یەكەمی هەموو جیهان دێت لە بەرهەمی لینیت و پلەی سێهەم لە بەرهەمی جۆ و پلەی سێهەم لە بەرهەمی ئۆتۆمبێل، پلەی چوارەم لە ووزەی كارەبای ئەوەویدا، پێنجەم لە بەرهەمی شەراب و بەراز، حەوتەم لە بەرهەمی پەتاتە و دەیەم لە

بەرهەمی دانەوێڵە، یانزدەیەم لە بەرهەمی گەنم و خەڵووزی بەردین و دوانزدەیەم لەبەرهەمی داروتەختە و حەڵدەیەم لە مانگادا.

لە بەرواری ١٨ / ٤ / ٢٠٠١ دا راپۆرتێك دەربارەی رەوشی نیشتەجێبوون لە ئەڵمانیا دەرچوو. تیایدا هاتووە كە وڵاتەكە بەرەو رووی دابەزاندنێكی زەرەرمەند و توند دەبێت لە رێژەی نیشتەجێبوان و دادەبەزێت بۆ ٪ ٢٠ لەگەڵ هەڵهاتنی ساڵی ٢٠٥٠ ئەگەر بێت و ئەڵمانیا دەرگاكانی بەرەو رووی كۆچبەران نەكاتەوە، یان باوەڕ بە ژنانی ئەڵمانیا بێنێت كە بایەخ بدەن بەمناڵ خستنەوە و هەوڵدان بەهەموو شێوەیەك بۆ بەرزكردنەوەی رێژەی لەدایك بووان.هەروەها لە راپۆرتەكەدا هاتبوو: ژمارەی دانیشتوانی ئەڵمانیا ئێستا لە ( ٢٠٠١ ) دا تەنها ٨٢ملیۆنێكە و ئەم ژمارەیە لە ساڵی ٢٠٥٠ دا دادەبەزێت بۆ ٥٨,٦ ملیۆن كەس ئەگەر بێت و رێنمایی تایبەت نەگرێتە بەر.

بەڵام كردنەوەی دەروازەكانی بەرەو رووی كۆچبەران ناكۆكییەكی زۆر لەنێو ریزەكانی گەلی ئەڵمانیادا دروست دەكات، لەبەر نەیارانی ئەو پێشنیارەو یاوەرانی، هەندێك دەڵێن پێشوازی كردن لە ژمارەیەكی زۆر كۆچبەر كێشەی تێكەڵ بوونیان بەكۆمەڵگای ئەڵمانی دەنێتەوە، جگە لەوەی بەجۆرێك لە سیستەمی ئیمپریالی سەیر دەكرێت ئەگەر بێت و ئەڵمانیا هەستێت بە فریودانی كەسانی بەتوانا لەوڵاتە تازەپێگەیشتوەكانەوە كۆچ بەرەو ئەڵمانیا بكەن، باوەڕیان وایە كە ئەڵمانیا بیر لە زیاد كردنی رێژەی لەدایك بووان بكاتەوە نەك لە بێگانەكان...

## ئیمارەتە عەرەبییە یەکگرتووەکان

ناوی باو: ئیمارات

ناوی فەرمی: ولاَتی ئیمارەتە عەرەبییە یەکگرتووەکان

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

United Arab Emirates

سیستەمی حوکمڕانی: ولاَتێکی یەکگرتووە لەحەوت ئیمارەت پێك دێت، سەرۆکی ولاَت، دادوەرێك بۆ هەر ئیمارەتێك لە ئەنجومەنی بالاَی یەکێتی کۆدەبنەوە، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی نیشتیمانی یەکگرتوو ( ٤٠ ئەندام )

رووبەر : ٣٢,٢٨٠ میل دووجا ، ٨٣,٦٠٠ کم²

ژمارەی دانیشتوان: ٣,٣٩٠,٠٠٠ کەس ( ٢٠٠١ )

چڕی دانیشتوان: ٤٠ کەس/ کم²

نەتەوەکان: عەرەب، ئاسیایی، ئەفەریقی، ئەورووپی

ئاین: ١٠٠٪ ی خەڵکی ولات موسڵمانن، بێگانەکان پاریٚ.گاری لە ئاینی خۆیان دەکەن

زمان: عەرەبی، ئینگلیزیش بەشێوەیەکی بەرفراوان بەکاردێت.

پایتەخت: ئەبو زەبی

شارە سەرەکییەکان: دوببەی، شاریقە، رەئس ئەلخەیمە، عەجمان، فەجیرە، ئەم ئەلقیوین، ئەلعەین.

دراو:

ئاو وهەوا: مامناوەندی لە زستاندا و پلەکانی گەرما دەچێتە ٢٠ پلەی سەدی، لەهاویندا گەرمە و پلەکانی گەرما ٤٠ پلەی سەدی وهەندیٚ جار دەگاتە ٤٦ پلەی سەدی. رێژەی لەگەڵ بەرز بوونەوەی پلەکانی گەرما بەرز دەبێتەوە ئەمەش هەست بەگەرما زیاد دەکات. رێژەی باران ساڵانە دەکاتە ١٢٠ ملم و لە زستاندا دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵییەکان: خورما، مزرەمەنی، سەوزە و میوە، بەخێوکردنی مەڕومالاَت، راوەماسی، شیرمەنی.

بەرهەمە پیشە سازییەکان: دروستکراوە نەوتییەکان، پێترۆکیمیاییەکان، شلکردنەوەی گاز، چیمەنتۆ، دروست کراوە کیمیاییەکان، دەرمان، ئەلەمنیۆم، شووشە، پۆشاك

سامانی کانزایی: پیترۆڵ، گازی سروشتی

**تێڕوانینێكی گشتی :**

ئیمارات وڵاتێكی عەرەبی ئیسلامییە دەكەوێتە باشووری رۆژئاوای ئاسیا. كەنداوی عەرەبی دەكەوێتە باكووری و كەنداوی عەدەن و سەڵتەنەی عەدەن دەكەونە رۆژهەڵاتی و عومان و شانشینی سعودیەش دەكەونە باشووری و قەتەر و سعودیەش دەكەونە رۆژئاوای، ناوەڕاستی ئیمارات كەوتۆتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٥٤ بەرەو رۆژهەڵات وهێڵی پانی ٢٣,٣٠ بەرەو باكوور. نزیكەی ٤٠٠ دورگەی هەیە بەشێوەیەكی بەر بڵاو دەكەونە سەر كەناری كەنداوی عەرەبی، گرنگترینیان: دورگەی ئەبوزەبی پایتەختە، دورگەی سیر بەنی یاس كە چەندین دارستان وداورەدرەختی میوەی لەخۆی گرتووە جگە لەوەی كە مۆڵگەیەكی باشی ئاژەڵی نایاب و باڵندە دادەنرێت، دورگەی نەوتی داس، دورگەی سەعدیات كە ئێستا ئیمارات سەرقاڵی ئەوەیە ئەو دورگەیە بكاتە سەنتەرێكی گەورەی دارایی جیهانی، دورگەكانی ئەبو موسا و تەنەبی گەورە و تەنەبی بچووك.

زۆربەی زۆری خاكی ئیمارات لە دەشتە بیابانیەكان پێك دێت بەتایبەتی ناوچە ناوخۆییەكانی رۆژئاوای. لەنێو ئەو ناوچە بیابانییانەدا چەند مێرگوزارێك بەدی دەكرێت گرنگترینیان عەینە كە ئاوییێكی زۆری هەیە و تۆڕی ئاودێری بەناوی ئەفلاجی لەسەرە. هەروەها كێڵگەكانی لیوا كە نزیكەی ٢٠٠ كم لە ئەلعەینەوە دوورە و بەرەو باشووری ئەو ناوچەیە تەپۆلكە لمەكانی ( ئەلرویع الخالی ) تێدەكەوێت. شاخی ( حەفیت ) یش بەرەو باشووری مێرگوزاری بریمی دەكەوێتە شاری ئەلعەینەوە.

زنجیرە چیای حەجەر لە باكوورەوە بۆ باشوور بە درێژایی ٨٠ كم و پانی ٣٢ كم نیمچە دورگەی مسەندەم كەرت دەكات و عومان دەبڕێ تا دەگاتە لای رۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی عەرەبی. شاری رەئس ئەلخەیمە دەكەوێتە ناوچە باكووریەكانی ئەم زنجیرە چیایە كە بەرزی هەندێكیان دەگاتە ٢٤٣٨ م.

زۆربەی كەنارەكانی ئیمارات بە لم داپۆشراوە جگە لە ناوچەی رەئس ئەلخەیمە نەبێت كە ئاوە سنووریەكانی بە لیتە دەناسرێت، ئەگەرچی ئەمەش بەرێگرێكی سروشتی لەبەردەم چالاكی كەشتیوانی دادەنرێت بەلام ناوچەیەكی دەوڵەمەندە لە بەرهەمی مرواری سروشتی كە سەرچاوەی سەرەكی بازرگانی بووە.

لە كۆتاییەكانی چاخی بەردیندا واتا نزیكەی شەش یان حەوت هەزار ساڵ لەمەوبەر، یەكەم نیشتەجێی مرۆڤی لێبووە و ئاسەوارەكانی لە دورگەكانی دلما و مروح تیا بەدی كراوە. پەیوەندیەكانی نێوان مرۆڤی ئەو خاكە بە دەریا و بازرگانی لە رێی دەریاوە لە ساڵی ( ٤٠٠٠ پ.ز ) واتا شەش هەزار ساڵ لەمەوبەروە دەستی پێكردووە لە سەردەمی

شارستانیەتی " کۆیلەکانەوە ".

لە سەردەمە زووەکانەوە ئیمارات رۆڵێکی گەورەی هەبووە لە بازرگانییە ئیقلیمیەکاندا بە ناردنی مس و مرواری بۆ ئیمپراتۆریەتی میزۆپۆتامیا و هێنانی تەنەکە و دەفری گڵێنە و کەلوپەلی پێویست لە ئەفغانستان و ئێران و دۆڵی سند.

بازرگانی دەریایی و زەمینی رۆڵێکی بەرچاویان هەبووە لە گەشەکردنی ئابووری ناوخۆی وڵاتی ئیماراتدا و و ئاسەوارەکانی ناوچەی ملیحە لە شاریقە دەری دەخات کە بازرگانی هەبووە لەنێوان ئیمارات و یۆناندا لە سەدەی سێهەمی پێش زایینی، هەروەها لەسەردەمی مەسیحێتدا بازرگانی و پەیوەندی لە نێوان ئیمارات و ئیمپراتۆریەتی رۆماندا بە پێی ئاسەوارەکانی ئوم ئەلقیوین لەو کاتەی کە بەندەری دوبای سەر کەنداوی عومان پەیوەندی بازرگانی بە چینەوە هەبووە.

لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا هەندێ لەخەڵکی ئەو ناوچەیە پەیرەوی ئاینی مەسیحیان کردووە وەك ئاسەوارەکانی کڵێسەیەك دەری دەخا لە دورگەی سیر بەنی یاس دا دۆزرایەوە، بەڵام لەگەڵ بلاوبوونەوەی ئاینی نوێی ئیسلامدا هەر لەسەردەمی پێغەمبەری ئیسلام محمد ( د.خ ) خەڵکی ئیمارات چوونەتە سەر ئاینی ئیسلام و رۆڵێکی سەرەکییان بینیوە لە بلاوکردنەوەی ئاینی نوێ بەرەو ئێران و ناوچەکانی دیکەش.

جلفار بەدرێژایی هەزارەها ساڵ بەندەرێکی گرنگ بووە و ئەو بەندەریشە کە دەریاوانی بەناوبانگ گەریدە ئەحمەد بن ماجد لێی لەدایك بووە، مۆزەخانەکانی ئیمارات ئێستاش نمایشی ئاسەوارێکی زۆری ئەو سەردەمە دەخاتە روو.

بەشێکی ولاتی ئیمارات، وەك زۆربەی ناوچەکە، لەسەدەی شانزدەیەمدا کەوتە ژێر دەسەلاتی پرتوگالیەکان، بەڵام دانیشتوانی ناوچە شاخاویەکان و بەشێکی ناوخۆی ئەو وڵاتە توانیان پارێزگاری لە ئازادی وسەروەری خۆیان بکەن و ماوەی دروست کردنی وڵات دەگەرێنرێتەوە بۆ ئەو ماوەیە.

بەکۆتایی سەدەی شانزدەیەم، بەهۆی هاوپەیمانی نێوان هۆزەکانی بەنی یاس بەسەرۆکایەتی خێزانی ئال نهەیان کە ( خاوەن شکۆی ئیمارات ئێخ زاید کوری سوڵتان ئال نهەیان ) ی دەچێتەوە سەر هەمان خێزان توانیان دەسەلاتی خۆیان بەسەر بەشی رۆژئاوای وڵات بسەپێنن و ئیمارەتی ئەبو زەبیان دامەزراند.دوا بەدوای ئەوان قەواسمەکان ( ئەوانیش ئەو خێزانەن کە حاکمەکانی شاریقە و رەئس ئەلخەیمە ) ی دەچێتەوە سەر دەسەلاتی بەشی باکووریشی گرتۆتە دەست. لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا هێزی دەریایی قەواسم رووبەرووی کۆمپانیای رۆژهەلاتی هیندی بەریتانی بووەوە و ئەمەش بووە هۆی بوونی

سیاسی و سەربازی بەریتانی لەناوچەکەدا. دادوەرانی ئیمارات یان ( شێخەکان وەك پێیان دەوترا ) توانیان دەسەلاتی خۆیان بەسەر کاروبارە ناوخۆییەکان بسەپێنن بە پێی ئەو ڕێکەوتنانەی لە گەڵ بەریتانیەکاندا واژۆیان کرد لەساڵی ١٨٢٠ دا، سوودیان لە پارێزگاری بەریتانی بۆ سنوورەکانیان وەرگرت و پیشەسازی مرواری گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی. پیشەی گەڕان بەدوای مرواری کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەگەشە کردنی باری ئابووری ناوخۆی ئیمارات تا سییەکانی سەدەی پێشوو واتا تا ئەو کاتەی مرواری دروستکراو هاتە نێو بازاڕە جیهانییەکانەوە مرواری سروشتی ئەو بەهایەی نەما، تا ماوەیەك دوای جەنگی جیهانی دووەم و دەرهێنانی نەوتی ئیمارات لە ١٩٥٨ دا و بووە هۆی گەشە کردنی ئەو وڵاتە ڕۆژ بەدوای ڕۆژ، تا ئێستاش ئیمارات لە گەشە کردنێکدایە هەرگیز چاوەڕوان نەدەکرا.

پاش ئەوەی بەریتانیا لە ١٩٦٨ دا بڕیاری کشانەوەی دا لە ئیمارات، دەست بەجێ حاکمەکانی ئیمارات بەسەرکردایەتی خاوەن شکۆ ( شێخ زاید کوڕی سوڵتان ئال نەهیان ) دەستیان بە گفتوگۆکانیان کرد لە پێناوی پێك هێنانی یەکێتییەك بۆ ئیمارەتەکانیان. گفتوگۆکانیان بە پێك هێنانی وڵاتی ئیماراتە عەرەبییە یەکگرتوەکان لە ٢/ ١٢ / ١٩٧١ دا و بووە ئەندامێکی تەواو لە کۆمەڵگای نێودەوڵەتیدا.

وڵاتی ئیماراتی عەرەبی یەککگرتوو لە هەر یەك لە: ئەبو زەبی ودوبەی وشاریقە وعەجمان وئەم ئەلقیوین وفەجیرە پێك هات، لە بەرواری ١٠ / ٢ / ١٩٧٢ دا ڕەئس ئەلخەیمەشی چووە سەریان، حاکمی ئەبو زەبی شێخ زایدی کوڕی سوڵتان ئال نەهیان بە سەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا. لە بەرواری ٦ / ١٢ / ١٩٧١ پەیوەندی کرد بە کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەکانەوە و لە بەرواری ٩ / ١٢ / ١٩٧١ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان، لە بەرواری ٢٩ / ٢ / ١٩٧٢ پەیوەندی کرد بە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامییەوە، لە ساڵی ١٩٨٢ دا بەشداری کرد لە پێکهێنانی ئەنجومەنی یارمەتی وڵاتانی کەنداوی عەرەبییەوە.

شێخ زایدی کوڕی سوڵتان ئال نەهیان شەش جار لەسەر یەك بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردراوەتە لەلایەن ئەنجومەنی باڵای یەکێتییەوە و دوایین جاری هەڵبژاردنی ٢ / ١٢ / ٢٠٠١ بوو. هەروەها خاوەن شکۆ شێخ ڕاشدی کوڕی سەعید ئال مەکتومی حاکمی دوبەی لە پۆستی خۆیدا ( جێگری سەرۆکی وڵات ) مایەوە تا لەبەرواری ٧ / ١٠ / ١٩٩٠ دا کۆچی دوایی کرد و خاوەن شکۆ شێخ مەکتومی کوڕی ڕاشید ئال نەهیان کوڕی خرایە شوێن و هەروەها کرایە حاکمی دوبەییش.

پاش ئەوەی بەریتانیا دەستی لە پارێزگاری کردنی ئیمارات هەڵگرت لە ساڵی ١٩٧١ دا،

ئێران هەستا بە داگیر کردنی سێ دوورگەی ئیمارات بەناوی : تەنەبی گەورە، تەنەبی بچوك، ئەبوو موسا، ئیمارات چەند جارێك داوای گەڕانەوەی ئەم دوورگانەی لە ئێران کردووە چ لەڕێی گفتوگۆوە بووبێت یان بە پەنابردن بۆ ناوبژیوانە نێودەوڵەتیەکانەوە، بەلام ئێران تا ئێستا گوێی بەهەوڵەکانی ئیمارات نەداوە لەگەڵ پشتگیری زۆربەی وڵاتانی جیهان بۆ ئەم کێشەیەی ئیمارات.

لە بەرواری ٢٢ / ٦ / ٢٠٠٢ دا وڵاتی ئیمارات و سەڵتەنەی عومان ڕێکەوتننامەیەکیان لەگەڵ یەکتر واژۆ کرد دەربارەی دیاری کردنەوەی سنوورەکانی نێوانیان هەر لە عەقیداتەوە تا دەگاتە داڕە و کەنداوی عەرەبی.

ئابووری ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو بوژاندنەوەیەکی لە ڕادەبەدەری بەخۆوە بینی لە دوای ساڵی ١٩٥٠ وە بەهۆی دەرهێنانی نەوت و دۆزینەوەی دەوڵەمەندی لەناکاوی ئەو وڵاتەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆیە، بە هەڵهاتنی ساڵەکانی حەفتا، خەرجی تاکی ئەو وڵاتە بە بەرز ترین خەرج دادەنرێت لەنێو هەموو وڵاتانی جیهاندا.

وڵاتی ئیمارات هەوڵی داوە کەرتەکانی دیکەشی بەشداری پێ بکات بۆ گەشە پێدانی ئابووری بۆ ئەوەی نەوت نەبێتە تاکە هۆکاری پتەو کردنی ژێرخانی ئابووری، گەشەی ڕێژەی هاوبەشی کەرتە نا نەوتییەکان لە ساڵی ١٩٩٧ دا گەیشتە ٦٥٪، ئەمەش سەرکەوتنی پلانی وڵات دەردەخات لەو ئەرکانەیدا.

کەرتی پیشەسازی گەشە کردێکی ستراتیجی بڵندی بەخۆوە بینی چ لە ڕێی پڕۆژە زەبەلاحەکانەوە بووبێت یاخود لە ڕێی پیشەسازییە قورسە پێشکەوتووەکانەوە بووبێت. هەروەها ئیمارات توانیویەتی ڕووبەرێکی زۆری زەوییەکانی بۆ مەبەستی کشتوکاڵی بخاتە گەڕ و بەمەش ئەگەری هێنانی خۆراکەکانی لە دەرەوەی وڵات کەم دەکاتەوە،بۆ نموونە ژمارەی دار خورما لە ئیمارات تا ساڵی ٢٠٠٠ گەیشتۆتە چل ملیۆن دار.

جگە لەمانەش ئیمارات لە بواری بەرهەم هێنانی ووزە و دامەزراندنی تۆڕی ئاوی خواردنەوەش سەرکەوتنێکی باشی بەدەست هێناوە.

لە بواری گەشت وگوزاردا، ئیمارات ئیمڕۆ خاوەنی پلە و پایەیەکی بەرزە لەنێو وڵاتە گەشتوگوزاریەکاندا، لە بەر ئەوەی کە توانیویەتی تەواوی خزمەت گوزاریەکان بۆ گەشتیاران تەرخان بکات، چ لەڕێی ئاسایشەوە بێت یاخود لە تەرخان کردنی فرۆکەخانەی تایبەت و هۆیەکانی هاتوچۆ و دابین کردنی بەندەری تایبەت، ئەمە جگە لەوەی کە ئیمارات خاوەنی چەندین کەنار و دەریاچەی دروست کراوە جگە لەو پێگە جوگرافییە گرنگەش کە هەیەتی.

سروودی نیشتیمانی: بژی ئەی وڵاتم، بژی یەکێتی ئیمارەتەکانمان.

تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی: ٣٨,٧ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٠ هەمین وڵاتە.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٧,٥٠٠ دۆلاری ئەمریکییە.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢٢ هەمین وڵاتە.

ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو بەپلەی سێهەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە یەدەگی پیترۆڵدا دوای سعودیە و عێراق. بڕی ئەو یەدەگەشی دەگاتە ٩٧,٨ ملیار بەرمیل، واتا رێژەی ٩,٤٪ ی یەدەگی جیهانی و ئامارەکان وای دەردەخەن کە ئیمارات دەتوانێ رۆژانە ٢,٥٠٥ ملیۆن بەرمیل نەوت بۆ ماوەی سەت ساڵ بە بەرهەم بێنێت و ئەم ژمارەیەش یەکسانە بە ٣,٢ ٪ ی بەرهەمی جیهانی، هەروەها ئیمارات بە پلەی چوارەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە یەدەگی گازی سروشتی و بڕەکەشی دەکاتە ٥,٩ تریلیۆن مەتر سێجا، کە دەکاتە ٤٪ ی یەدەگی جیهان.

## ئەمریکا

**ناوی باو:** ئەمریکا

**ناوی فەرمی:** ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

United State of America

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری یەکگرتوو، سەرۆکی کۆمار سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت :

ئەنجومەنی پیران: ( ١٠٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران: ( ٤٣٥ ئەندام )

**رووبەر :** ٣,٦٧٥,٠٣١ میل دووجا، ٩,٥١٨,٣٢٣ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٨٦,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( ٢٠٠٢ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢٨ کەس/ کم٢

**نەتەوەکان:** ئەوروپی، ئاسیایی، ئەفەریقی، هیندەکانی ئەمریکا.

**ئاین:** مەسیح ( پرۆتستانت، رۆمان، کاسۆلیك )، جولەکە، موسڵمان ( ٧ ملیۆن کەس )، بێ ئاین

**زمان:** ئینگلیزی

**پایتەخت:** واشنتۆن

**شارە سەرەکییەکان:** نیویۆرك، لۆس ئەنجەلوس، شیکاگۆ، فیلادلفیا، دنێڤەر، ئەتلانتا، هیۆستن، دیترۆیت، بالتیواڕۆ، سان فرانسیسکۆ.

**دراو:** دۆلاری ئەمریکی

**ئاووهەوا:** کەناری خۆرئاوا بەدرێژایی ساڵ مام ناوەندە، باکووری خۆرئاوا هاوینی مام ناوەندە و زستانی ساردە و بارانێکی زۆری لێدەبارێت، باشووری رۆژئاوا هاوینی مام ناوەند و وشکە و زستان بارانی لێدەبارێت. بەشی باشووری رۆژئاوای ناوخۆی لە ناوچەیەکی بیابانی و نیمچە بیابانی پێك دێت و لەهاویندا زۆر گەرمە. هەروەها بەشی باکووری رۆژئاوای ناوخۆشی لەهاویندا گەرم و لە زستاندا ساردە. بەشە باکووری و ناوەڕاستەکانی رۆژهەڵات بارانێکی مام ناوەند و زستانی سارد و هاوینی گەرمە. بەشی باشووری رۆژهەڵاتیشی زستان سار و هاوین گەرمە و زۆر جار روو بەرووی گەردەلوول دەبێتەوە. ئاو وهەوای ئالاسکا بەشێوەیەکی گشتی ساردە و کەنارەکانی باشووری مام

ناوەندە.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: گۆشت، شیرەمەنی، گەنمەشامی، گەنم، مریشك، هێلکە، لۆکە، میوە و سەوزە، دارودرەخت، بەخێوکردنی مەڕومالآت، راوە ماسی، هەنگوین.

بەرهەمە پیشە سازییەکان: دروست کراوە خۆراکییەکان، دروست کراوەکانی خوری، دروست کراوە کیمیاییەکان، دروست کردنی چەك، ئۆتۆمبێل، فرۆکە، ئامێرەکانی پەیوەندی، چیمەنتۆ و کەرەستەی بینا سازی، کاغەز، ئامێرەکانی چاپەمەنی، دروست کردنی کۆمپیوتەر، دەرمان، فلمی سینەمایی.

سامانی کانزایی: نەوت، گاز، خەڵوزی بەردین، مس، قورقوشم، فۆسفات، یۆرانیۆم، بۆکسیت، ئاڵتون، ئاسن.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەمریکا چوارەم وڵاتە لە جیهاندا لە رووی رووبەرەوە دوای روسیا و کەنەدا و چین و سێهەم وڵاتە لەجیهاندا لە رووی ژمارەی سەرنشینەوە دوای چین و هیند.ئەمریکا دەکەوێتەی نیوە باشووری ئەمریکای باکوور.ئەمریکا لەگەڵ کەنەدا لە باکوورەوە سنووردارە و لەگەڵ مەکسیکدا لە باشوورەوە وجگە لەخاکی دایك ویلایەتی ئالاسکا دەکەوێتە ئەوپەڕی باکووری ئەمریکای باکوور، ویلایەتی دورگەکانی هاوای دەکەوێتە ناوەڕاستی زەریای هێمن.ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٠ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٤٠ بەرەو باکوور.

هەروەها ئەم دورگانەش سەر بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکان:

دورگەی ناڤاسا، دورگەی بۆرتۆ ریکۆ، دورگەکانی ڤێرجینی ئەمریکی ( ئەم دورگانەش تێکڕا دەکەونە دەریای کاریبی). دورگە باکوورییەکانی ماریانا، دورگەکانی بالمێرا، دورگەی ویك، دورگەی ساموا، دورگەکانی بێکەر و هۆڵاند، دورگەی گوام، دورگەی کارڤیس، دورگەکانی جۆنستۆن، دورگەی کینگ مان، دورگەی میدوای ( ئەم دورگانەش تێکڕا دەکەونە سەر زەریای هێمن).

گرنگترین دیاردەکانی سەر تەختی ئەمریکا دەشتە کەنارییەکان و بەرزاییەکانی ئەبلاشە لە رۆژهەلات.، دەشتە بەرزەکان یان دەشتەکانی رۆژئاوای ئەمریکایە لە ناوەڕاستدا کە ئاوەکانی دەچنەوە سەر کەنداوی مەکسیك لەرێی روباری مسیسیپی و زێیەکانیەوە و شاخەکانی رۆکی و سیرا نیڤادا و کەسکید و دەشتە کەنارییەکانی رۆژئاوا.

هیندە سوورەکان یەکەم دانیشتوانی ئەمریکا بوون، ئەسکیمۆ یەکەم دانیشتوانی ئالاسکا بوون و هەردوو نەتەوە لەدێر زەمانەوە لە ئاسیاوە لەرێی تەنگەی بیرنیجەوە گەیشتونەتە

ئەمریكا. بەڵام یەكەم دۆزەرەوەی ئەمریكا ڤایكنجەكان بوون بە سەرۆكایەتی لیڤ ئێریكسۆن لە سەدەی یانزدەیەمدا، بەڵام لێی جێگیر نەبوون. لە ساڵی ١٤٩٢ دا دەریاوانی ئیتاڵی كریستۆڤەر كۆلۆمبۆس دۆزیەوە، كۆلۆمبۆس بۆ بەرژەوەندی شا و شاژنی ئیسپانیا كاری دەكرد. پاش كۆلۆمبۆسیش دەریاوانی ئیتاڵی ئەمیریكۆ فسبۆتش لە ساڵی ١٤٩٧ دا دۆزییەوە.

ململانێ لەنێوان وڵاتە ئەوروپییەكاندا لەسەر داگیركردنی ئەمریكا لە سەدەی شانزدەیەمەوە دروست بوو، بۆیە خەڵكانێكی زۆر لە وڵاتە ئەوروپییەكانەوە لە ڕێی زەریای ئەتڵەسییەوە بەرەو جیهانی نوێ بەرێ كەوتن تاكو لێی نیشتەجێ بن، ململانێكە بەسەركەوتنی ئینگلیزەكان كۆتایی پێهات و توانیان سیانزدە داگیركراوەی لێ دابمەزرێنن. بەلام هێندەی نەخایاند ئەم سیانزدە داگیركراوە ڕاپەڕین و لە ٤ / ٧ / ١٧٧٦ دا سەربەخۆیی خۆیانیان ڕاگەیاند، ئەمەش بە سەرەتایەك بۆ لەدایك بوونی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا دادەنرێت، بۆیە ئەمریكا ساڵانە لە ڕۆژی ٤ / ٧ دا ئاهەنگی جەژنی نەتەوەیی دەگێڕێت. پاش سەربەخۆ بوون هەر یەك لەم سیانزدە داگیركراوە بە ویلایەت بوونی خۆی ڕاگەیاند و پاش چەند ساڵێك چەند ویلایەتێكی دیكەش پەیوەندی كرد بە یەكێتی ئەمریكاوە تا گەیشتە پەنجا ویلایەت، جگە لە ناوچەیەكی دیكەش كە ناوی كۆلۆمبیا بوو كە واشنتۆنی پایتەختی تێدەكەوێت. ویلایەتی هاوای دوایین ویلایەت بوو لە ساڵی ١٩٥٩ پەیوەندی كرد بە ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكاوە. لە ساڵی ١٧٨١ دا وڵات ناوی فەرمی خۆی نا ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا. لە ٣ / ٩ / ١٧٨٣ دا لە پاریس واژۆ لەسەر پەیماننامەیەك كرا بە پێی ئەو پەیماننامەیە بەریتانیا دانی نا بە سەربەخۆیی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا. لە ساڵی ١٧٨٧ دا ویلایەتە یەكگرتوەكان توانی دەستووری تایبەتی خۆی دابڕێژێ.لە نێوان ساڵەكانی ١٧٨٩ – ١٧٩٧ جۆرج واشنتۆنی سەرۆكی شۆڕشی ئەمریكا پلەی یەكەم سەرۆكی ویلایەتە یەكگرتوەكان گرتە دەست..

لە نێوانی ساڵەكانی ١٨٦١ – ١٨٦٥ دا شەڕی ناوخۆ لە ئەمریكادا هەڵگیرسا، بە سەركەوتنی ویلاتەكانی باكوور بەسەر ویلایەتەكان باشووردا كۆتایی پێهات. ئەمریكا لە جەنگی جیهانیی یەكەمدا ١٩١٧چووە پاڵ هاوپەیمانان و بەشدارییەكی كارای هەبوو لە تێكشكاندنی ئەڵمانیا و هاوپەیمانەكان. لە ساڵی ١٩٤١ دا بەشداری لە جەنگی جیهانی دووەمدا كردووە پاش ئەوەی یابانییەكان هێرشیان كردە سەر بەندەری بێرڵ هاربەر لە هاوای، ئەمریكا و وڵاتانی هاوپەیمان سەركەوتنیان بەسەر وڵاتانی میحوەردا هێنا لە ساڵی ١٩٤٥.

لە ساڵی ١٩٤٥ نەتەوە یەکگرتوەکان لە سەر خاکی وڵاتی ئەمریکا دامەزراوە. لە بەرواری ٤ / ٤ / ١٩٤٩ دا لەگەڵ یانزدە وڵاتی رۆژئاوادا هاوپەیمانێتی باکووری ئەتلەسی دامەزراند ( ناتۆ ). لە نێوان ساڵەکانی ١٩٦٥ – ١٩٧٥ دا خۆی بەشەری ڤێتنامەوە گیرۆدە کردو بەتێکشکاوی لەو شەرە هاتە دەرەوە. لە سەردەمی سەرۆکی ئەمریکی جۆرج بوشدا ( ١٩٨٩ -. ١٩٩٢ ) جەنگی کەنداوی دووەمی لە دژی عێراق راگەیاند پاش ئەوەی عێراق هەڵسا بە داگیرکردنی وڵاتی کوێت ١٩٩٠ و شەرەکە بە بەرژەوەندی کوێت لە ٢٦ / ٢ / ١٩٩١ دا کۆتایی پێهات.لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩٣ – ٢٠٠٠ بیل کلینتۆن سەرۆکایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی گرتە دەست و لەسەردەمی کلینتۆندا ئەمریکا بووە جەمسەری هەموو جیهانی و هیچ کێبرکێیەکی نەما پاش رمانی یەکێتی سۆڤێت ساڵی ١٩٩١.

لە ٧ / ١١ / ٢٠٠٠ دا چل و دووهەمین هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لە ئەمریکا بەرێوە چوو. لەم هەڵبژاردنەدا پاڵێوراوی پارتی کۆماری جۆرج دەبلیو بۆش ( ٥٤ ساڵ ) ( کوڕی سەرۆکی پێشووتری ئەمریکا ) سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەسەر پاڵێوراوی پارتی دیموکراسی ئاڵ و گۆر، کە جێگری سەرۆکی ئەمریکی بیل کلینتۆن بوو. راگەیاندنی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان دواکەوت بۆ رۆژی ٢٤ / ١٢ / ٢٠٠٠ بەهۆی دواکەوتنی شێوەی ژماردنی دەنگەکانی ویلایەتی فلۆریدا و دیك چینی ( ٥٩ ساڵ ) بووە جێگری سەرۆك، شایەنی باسە دیك چینی لە سەرۆکایەتی بوشی باوکی پۆستی وەزیری بەرگری پێسپێردرابوو.

ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەم ناوە باوەی خۆی لە ناوی کیشوەرەکەیەوە وەرگرتوە، سەرەتا ئەم ناوە لە کیشوەری ئەمریکای باشوور نراوە و دواتر بە تێکرای نیوە رۆژئاوای گۆی زەوی و لەدواییدا بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا.

بەڵام ناوی ئەمریکا لەناوی دووەم دۆزەرەوەیەوە : ئەمیریکۆ فسبۆتشیەوە هاتووە کە لە ساڵی ١٤٩٧ دا گەیشتۆتە کەنارەکانی ئەو وڵاتە، رایگەیاند کە جیهانێکی نوێی دۆزیوەتەوە، لەکاتێکدا کریسۆڤەر کۆلۆمبۆس کاتێ گەیشتۆتە ئەو کیشوەرە لەساڵی ١٤٩٢ دا وایزانیوە کە هەندێ دورگەی سەر کەنارە دوورەکانی ئاسیای رۆژهەڵات دەبینێ و دەرکی بەوە نەکرد کە جیهانێکی نوێ چاوەڕوانی دەکات تا گەشتی دووەمی بۆ سەر خاکی هەردوو ئەمریکا لە ساڵی ١٤٩٨ دا ئەم راستیەی بۆ روون بوەوە.

ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا نازناوی ( مام سام ) ی لێنراوە، ئەم نازناوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەمۆئێل ویلسۆن ( مام سام ) کە لە شەڕی ١٨١٢ ی نێوان ئەمریکا و بەریتانیادا چاودێر بوو بەسەر ئەو بەرمیلە ئازووقانەوە کە بۆ شەڕ بەرێ دەکرا و مام سام پاش پشکنینی ئەو بەرمیلانە واژۆی لێ دەدان و واژۆکەش لە هەردوو پیتی US پێك

هاتبوو كە كورتكراوەی United State ( ویلایەتە یەكگرتوەكان ) ی پێوە بوو، هاوكات كورتكراوەی ناوەكەی خۆیشی بوو : Uncle Sam ( مام سام ).

ویلایەتە یەككگرتوەكان بە پێشرەوی تەواوی ولاتانی جیهان دادەنرێ لە رووی پێشكەوتن و بەرهەم هێنانەوە، ولاتێكی بێ هاوتا لەو بوارەدا. بەرفراوانی خاك و زەویەكانی هۆكارێك بوون لە بە زەبەلاح بوونی ئابووری ئەو ولاتە جگە لە ئازادی و هاوسەنگی و تەرخان كردن و رەخساندنی جۆرەها هەل بۆ تاكەكانی ئەو ولاتە، بەلام لە سالی ٢٠٠٢ دا دووچاری ئابووت بوونی كۆمەلێك كۆمپانیای زۆر زەبەلاح بووەوە بەهۆی چەند هەلەیەكی گەورە لەلایەن ژمێریارەكانییەوە و لەهەمان سالدا نرخی تیرە جیهانییەكانیشی بەرەو دابەزینێكی بێ وێنە بووەوە.

سروودی نیشتیمانی: ئالای ئەستێرە درەوشاوەكان

تێرای بەرهەمی نەتەوەیی: ٦٧٣٧,٤ ملیار دۆلاری ئەمریكی

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : یەكەم

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢٥,٨٦٠ دۆلاری ئەمریكی.

ویلایەتە یەككگرتوەكانی ئەمریكا بە پلەی یەكەمی هەموو ولاتانی جیهان دادەنرێت لە بەرهەمی هەنگوین و گەنمە شامی و داروتەختە و ووزەی كارەبای ئەتۆمیدا، بە پلەی دووەمی هەموو ولاتانی جیهان دێت لە بەرهەمی لۆكە وگەنم و ئۆتۆمبێل و قورقوشم و ترشەلۆكییەكان و پیترۆل و گاز و زیو و خەلووز و مس و ئالتون و بەراز و دانەوێلە و تووتن، بە پلەی سێهەم لە بەرهەمی بستە و مانگادا و بە پلەی چوارەم لە زنك و شەراب و لینیت و بە پێنجەم لە پەتاتە و شەشەم لە ماسی و یەدەگی گاز و حەوتەم لە بەرهەمی ئاسن و هەشتەم لە جۆ یانزدەیەم لە برنج و یەدەگی پیترۆل و دوانزدەیەم لە قامیشی شەكر.

چەك كڕین لە ئەمریكا لە دەرمان كڕین ئاسانترە

ئەمریكییەكان زۆر بەپەرۆشن هەر كەس چەكی تایبەتی خۆی هەبێت، ئەو كە یارمەتیشیان دەدات بۆ بەدی هێنانی ئەم ویستە یاساكانیانە كە رێ بەم كارە ئەدات، ئەمەش بۆتە هۆی گرفتێكی گەورە بۆ دەزگاكانی ئاسایش و پۆلیسی ئەو ولاتە بەهۆی بەرز بوونەوەی رێژەی تاوان و لەئاكامدا زیاد بوونی رێژەی قوربانیەكانیش.

ئامارەكان وای دەردەخەن كە سالانە ٢٤ هەزار هاولاتی ئەمریكی گیانیان لەدەست دەدەن بەهۆی بەكارهێنانی چەكەوە. هەروەها لە راپۆرتەكاندا هاتووە كە هۆیەكانی مردن و گیان لەدەست دانی لاو و هەرزەكاران بەهۆی چەكەوە لەتەواوی هۆكارەكان زیاترە. لەبەر ئەوەی ئەوەی كە چەك بۆ پاراستن بەكاردێت، بەلام زیاترینی ئەوانەی كە گیانیان لەدەست دەدەن

دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە چەکیان نەکڕیوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەوانەی هێرشیان دەکەنە سەر.

ئامارە تایبەتەکانی ڕووداوی خۆکوشتن و و بەرز بوونەوەی ڕێژەی مردوان بەهۆی بەکارهێنانی چەکەوە لەنێو لاواندا، هانی کۆمەڵە پزیشك و نەشتەرگەرەکان دەدات کە ئەم کارە توندانە بگەڕێنەوە بۆ هۆکارە دەروونی و نەخۆشیە دەرونییەکان و وای دادەنێن کە پەیوەندی بە تەندروستی گشتی یەوە هەیە، لە کاتێکدا چارەسەرکردنی پزیشکی و دەروونی قوربانیانی ئەو ڕووداوانە ساڵانە چوار ملیار دۆلار لەسەر حکومەت دەکەوێت.

لەنێوان نەیارانی یاساکانی چەك هەڵگرتن و یاوەرانیدا، چەند ململانێیەکی توند هەیە و هەردوولا ژمارەی ئامارەکان بەکار دەهێنن بۆ سەرکەوتنی بۆچونەکانیان. ئەو زانیاریانەی کە لەلایەن دەزگا حکومیەکانەوە دەردەچێت، وەك سەنتەری ویلایەتە یەکگرتوەکانی تایبەت بەنەخۆشییەکان و ڕێ لێگرتنیان وەزارەتی داد، باوەڕی زیاتری لەلایەن ڕای گشتییەوە دەستگیر دەبێت بەتایبەتی کاتێ ئامارێك بەژمارەی ئەو کەسانە دەخەنەڕوو کە گوولە باران دەکرێن.

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەی ئەو زانیاریە پێویستانە بۆ گفتوگۆیەکی بەسوود و تایبەت بە کێشەی بەکارهێنانی چەك تەنها لەچەند ژمارەیەکی خەملێندراوەوە دەستگیر دەبێت، بۆ نموونە – ئەوانەی پشتگیری لە یاسای هەڵگرتنی چەك دەکەن دەڵێن: ژمارەی ئەو جارانەی کە چەك بەکار دەهێنرێت بۆ بەرگری کردن لەخۆ دەگاتە ١٠٨ هەزار جار لە ساڵێکدا، بەڵام نەیارانی ئەو یاسایە ( یاسای خەڵگرتنی چەك ) دەڵێن: ژمارەی بەکارهێنانی چەك لەساڵێکدا دەگاتە ٢,٥ جار لە ساڵێکدا.

* * *

## ئەمریکییەکان برسییان دەبێت

ڕەنگە ئەمریکا وڵاتی ئاواتی هەر گەورەی زۆر کەس بێت، بەڵام ڕۆژانە بە ملیۆن خەڵکی ئەمریکا دووچاری برسێتی و نەداری دەبن، ژمارەیەکی زۆری ئەمریکییەکان نەخۆشی بەد خۆراکییان هەیە. لە لێکۆڵینەوەیەکدا سەبارەت بە نەداری وهەژاری لەکیشوەری خەونەکاندا ئاشکرا کراوە کە لەو وڵاتەی بە دەوڵەمەندترین ناوچەی هەموو جیهان دادەنرێت ڕێژەیەکی زۆر لەنێو کەلاوە و تەویلەکاندا دەژین جگە لەوەی کەسانێکیش هەیە لەو وڵاتەدا ئێستا لەنێو کەپر و چادرگادا وێنەی ژیانە سەرەتاییەکانی مرۆڤ دەبەنە سەر.

برسێتی و هەژاری لە ئەمریکای باشوور لە دێر زەمانەوە بەدی دەکرێ، لەماوەی ئەو سێ ساڵەی کە ئیدارەی واشنتۆن هەوڵی تێداوە نەبوونی هەژاری میللەتی ئەو ناوچەیەی تیا

چارەسـەر بکـات جگـە لـە دوو هێنـدە کردنـی کێشەکە هیـچی دیکـەی تیـا بـەدی نـاکرێ.
لێکۆڵینەوەکانی ناوچەکانی کالیفۆرنیا و باکووری رۆژئاوای ئەمریکا، کە وا پیشان دەدرێن
خاکی دوارۆژە، هەمیشە بەرزترین ژمارەکانی نەبوونی لەو ولاتەدا دەخاتە روو.

وەزارەتی کشتوکاڵی ئەمریکا دەڵێ : لانی کـەم ١٠٪ ی ١٨ ویلایـەت، جگـە لـە ویلایـەتی
کولۆمیا کـە واشـنتۆنی پایتـەختی تێدەکـەوێت، لـە برسـی و هـەژارەکانن، یـان لەوانـەن کـە
خۆراکێکی تەندروستیان دەستگیر نابێت. لـە نێویانـدا مەکسیکۆ، برسـی تـرین ویلایەتـە،
١٥,١٪ ی دانیشتوان یان هەژار یان برسین.

بەشـێوەیەکی گـشتی، کێـشەکە زیـاتر رووە و باشـوورە، رێـژەی برسـی و هـەژاران لـە
مسیسیپی و تەکساس و ئەریزۆنا و لویزیانتا و ئەرکنساس دەگاتە نزیکەی ١٢,٦ ٪ .

دان جلیکمـان، سـکرتێری وەزارەتـی کـشتوکاڵی ئـەمریکا، دەڵـێ: " نـای لـە بـێ ئومێـدی
ئەمریکییەکان کاتێ دەزانن کە برسێتی لەتەواوی ویلایەتەکەندا بەربلاو بۆتەوە لەکاتێکدا
تـەواوی ویلایەتـەکان گەشـە کـردن و پێشکەوتنی بـاری ئابووری وەهایـان بەخۆیانـە نـەدیوە
بەدرێژایی دەیەکانی پێشوودا و لە گەڵ ئـەو بـازە ئابووریـەی ئێستا، بەڕاستی ناتوانین ئـەم
کێشەیە پشتگوێ بخەین".

شـایەنی باسـە تێـرو تەسـەترین و دەوڵەمەنـدترین ویلایـەت لـە ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی
ئەمریکادا ویلایەتی داکۆتای باکوورە کە نزیکە تەنها ٤,٦ ٪ ی دانیشتوانی تیا هەژارن.

بە پلـەی دووەمـیش ویلایـەتی ماساشۆسـتس و داکۆتـای باشـوور و دیلاویـر و مینیسـۆتا
دێت، کە رێژەی نەدارانیان تیا دەگاتە ٧٪.

لەسەر ئاستی تـەواوی ویلایەتـە یـەکگرتوەکان، ٩,٧ ٪ ی دانیـشتوان لـەماوەی سـێ ساڵی
کۆتـایی سـەدەی بیـستەمدا ( بـەپێی لێکۆڵینەوەیـەکی سـالانەی وەزارەتـی کـشتوکاڵی
ئـەمریکی) بـێ بەشـن لـەخۆراکی تـەواو و ژیـانێکی پڕاوپـڕی ئـەوتۆیان نییـە. هـەروەها
لەلێکۆڵینەوەکەدا هاتووە کە ئەم ژمارەیە ئەوانە ناگرێتەوە کە لەسەروو ئاستی هەژارین بەلام
لەماوەکانی رابردوودا بەچەند قۆناغێکی هەژاریدا تێپەڕیون.

*   *   *

## هێرشی تیرۆر بۆ سەر ئەمریکا

### ئەو رۆژەی ئەمریکای گۆڕی

لە بەیانی رۆژی سێشەممەی ١١ / ٩ / ٢٠٠١ دا ویلایەتە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا دووژاری
چـەند هێرشـێکی تـیرۆری بـووەوە لەلایـەن کۆمـەڵێك تیرۆریـستی نەناسـراوەوە، کـاتێ ئـەم
تیرۆریـستانەی هەڵـسان بەفڕانـدنی چـەند فڕۆکەیـەك لـە کـاتی ئـەنجام دانـی گەشـتە

ناوخۆییەکانـدا، دوان لـەم فرۆکانـە خۆیـان کێـشا بـە هـەردوو قولـەی سـەنتەری بازرگـانی جیهانی لە نیویۆرکدا و بەتەواوەتی لەناویان برد و بووە هۆی کوشتنی نزیکەی سێ هەزار کەس و فرۆکەی سێهەمیش خۆی کێشا بە بەشێکی بینای ( پەنتاگۆندا )( وەزارەتی بەرگری ئەمریکا ) و بووە هـۆی کوشـتنی دووسـەت کـەس و فرۆکـەی چوارەم کەوتـە کێڵگەیـەك لـە رۆژئاوای ویلایەتی بنسلڤانیا و بووە هۆی کوشتنی تەواوی سەرنشینەکانی سەر فرۆکەکە ( ٤٥ کـەس ). ویلایەتـە یـەکگرتوەکان رێکخـراوی ئەلقاعیـدەی، بەسـەرۆکایەتی گـەورە تیرۆریستی سعوودی ( ئوسامە بن لادنی ) کە ئەفغانستانی بە مەڵبەندی سەرەکی خۆی هەڵبژاردبوو، تاوانبار کرد و چەند بەڵگەیەکی ئەم تاوانبار کردنەی خستە بەردەم کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بۆ ئیدانە کردنی ئوسامە بن لادن، کە بەتاوانبار سەرەکی و رێکخەری ئەم هێرشانەی نابرد. بەڵام ئوسامە بن لادن سەرەتا دانی نەنا بەم تاوانانە و لە شریتێکی دەنگیدا کە کەناڵی ئەلجەزیرەی عەرەبیدا بلاوی کردەوە هاتبوو کە بن لادن هەڵناساوە بەرێکخەری بۆ ئەنجام دانی ئەم کارە تیرۆریە بەڵام پشتیوانی لە ئەنجام دەرانی دەکات. ویلایەتە یەکگرتوەکان جەنگی جیهانی لەدژی تیرۆر و تیرۆریستان راگەیاند و داوای پشتگیری لەتەواوی وڵاتانی جیهان کرد، تەواوی هێزەکانی لەسەر دەریای عەرەب کۆکردەوە و داوای لە سەرانی ئەلقاعیدە و گروپی تیرۆریستی تاڵیبان کرد کە سەربازگەکانیان لە ئەفغانستان داخەن و گەورە تیرۆریست بن لادن و سەرانی گەورەی تاڵیبانیان بدەنە دەست، تاڵیبان ئەم داواکاریەیان رەت کردەوە و جیهادیان لەدژی ئەمریکا راگەیاند.

لە ئێوارەی یەك شەممەی ٧ / ١٠ / ٢٠٠١ دا ویلایەتە یەکگرتوەکان هەڵمەتی سەربازی دەست پێکرد، بۆردومانێکی ئاسمانی توند بۆ سەر مۆڵگەکانی ئەلقاعیدە و تاڵیبان کرد و دوای دوو مانگ لە هێرشەکانی رێکخراو و حکومەتی تاڵیبان لە ئەفغانستاندا رووخا و ئەمەش بووە هۆی لێکپچرانی تۆڕی تیرۆریستی ئەلقاعیدە، ئەفغانستان لە ئاکامی روخانی تاڵیبان حکەمەتێکی کاتی نوێ ی راگەیاند. ویلایەتە یەکگرتوەکان ئەم سەرکەوتنە سەربازییەی بە سەرکەوتنێکی کەم دانا چونکە نەیتوانی ئوسامە بن لادن دەستگیر بکات هەروەها سەرکردەی بزوتنەوەی تاڵیبان مەلا محەمەد عومەری تا ئێستاش بۆ نەدۆزاوەتەوە لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی هۆزەکانی ئەفغانستان پشتگیر هێزە ئەمریکییەکانیان کردوە لە گەران بەدوای هەردوو ناوبراودا.

لەو رۆژەی کە ویلایەتە یەکگرتوەکان هێرشی کردە سەر ئەفغانستان کەناڵی ئەلجەزیرە شریتێکی تۆمار کراوی لەلایەن ئەسامە بن لادنەوە پەخش کرد تیایدا هاتوە کە هۆکاری ئەم هێرشانە دەگەرێنێتەوە بۆ ئەو پشتگیرییە بێ سنوورەی ئەمریکا لە ئیسرائیلی دەکات و

ئازار و کوشت وبڕی گەلی فەلەستین پشت گوێدەخات، هەروەها بین لادن لە شریتەکەیدا هەڕەشە لە گەلی ئەمریکا دەکات و بەڵێنی داوە کە هەرگیز نەهێڵێ هێمنی بەخۆیانەوە ببینن.

لە بەرواری ١٩ / ١٢ / ٢٠٠١ دا جۆرج دەبلیو بۆشی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکان یاسایەکی دەرکرد تیایدا رۆژی ١١ / ٩ ی هەموو ساڵێکی بەرۆژی نیشتمان پەروەران دانا، بۆ یادکردنەوەی ئەو کەسانەی کە گیانیان لەو رۆژە لەدەستدا و لەو رۆژەدا تەواوی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە خولەکێك وەستان و داگرتنی ئاڵای ئەمریکا یاد دەکەنەوە.

ویلایەتە یەککگرتووەکان لەچوار چێوەی ئەو هەڵمەتە جیهانیەی دژی تیرۆر رایگەیاند چەندین پارمەتی پێشکەش بە هێزە فلیپینیەکان کردووە بۆ لەناو بردنی هێزە یاخی بووەکانی باشووری وڵاتەکەیان، هەروەها پشتیوانی لە وڵاتی یەمەن کرد بۆ هەڵمەتەکەی لە دژی ئەو گروپانەی کە ئەگەری ئەوە هەیە سەر بە رێکخراوی ئەلقاعیدە بن، چەند هێزێکی ئاراستەی جۆرجیا کرد تاکو هەوڵی لەناوبردنی ( تیرۆر ) بدەن لە جۆرجیا. هەروەها سێ وڵاتی بە سەنتەری شەڕ ناوبرد : عێراق، ئێران، کۆریای باکوور و باسی ئەوەی لەسەریان کرد کە چەکی کۆمەڵ کوژیان هەیە و پێویستە لەناوبرێن و هەڕەشەی لێدانی کردە سەریان، کوباشی بە دروست کەری چەکی کیمیایی و کۆکوژی تاوانبار کرد.

هەر لەچوار چێوەی جەنگی دژ بە تیرۆر، ویلایەتە یەککگرتووەکان هەڵسا بە پێکهێنانی وەزارەتی ئاسایشی ناوخۆ، رایگەیاند کە لەمەوبەدوا ئەمریکا لە پێناوی شەڕی دژی تیرۆر هەر ناوچەیەك یاخود هەر وڵاتێکی بوێت دەست بەجێ هێزەکانی ئاراستە دەکات بێ ئەوەی پرس بە حکومەتەکەیان بکات. هەروەها ئەمریکا هەڵسا بە پێکهێنانی ویستگەیەکی بەرگری دژە موشەك لە ئالاسکا، لە کاتێکدا ئەمریکا بەردەوام دووچاری هەڕەشە لێکردن و تۆڵە لێسەندنەوە دەبێت ئێرانیەکان سەرۆکی ئەمریکایان بە خوێن رێژ وەسف کرد و کۆرییە باکوورییەکانیش بە نەخۆشی دەروونی.

## ئەنتگوا و باربۆدا

**ناوی باو:** ئەنتگوا و باربۆدا

**ناوی فەرمی:** ئەنتگوا و باربۆدا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Antigua and Barbuda

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات خودی شاژنی بەریتانیایە و دادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت :

ئەنجومەنی پیران، ئەنجومەنی نوێنەران ( هەر یەکەو ١٧ ئەندامی هەیە ).

**ڕووبەر :** ١٧٠ میل دووجا، ٤٤٣ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦٤،٥٠٠ کەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٤٦ کەس / کم$^{٢}$

**نەتەوەکان:** ئەفەریقی ڕەش، بەریتانی، پورتۆگالی، لوبنانی، سووری، هیند و پاکستانی، هیندەکانی ئەمریکا، تێکەڵ.

**ئاین:** مەسیح ( پرۆتستانت – کاسۆلیك )

**زمان:** ئینگلیزی

**پایتەخت:** سانت جۆنز

**شارە سەرەکییەکان:** فریتاون، سیدار گرۆف

**دراو:** دۆلاری ڕۆژهەڵاتی کاریبی

**ئاووهەوا:** خولگەیی، هاوینی وشکە و زستان باران دەبارێت، نێوەندی ڕێژەی باران ساڵانە دەگاتە ١١٥ سم، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** توتن، پەتاتە، گەنم، گەنمە شامی، چەوەنەر، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوەکانی توتن، دروست کراوەکانی خووری، ئامێری کارەبایی.

**سامانی کانزایی:** هیچ.

### تێڕوانینێکی گشتی:

ئەنتگوا و باربۆدا وڵاتێکە لەچەند دورگەیەك پێك هاتووە لەنێو دەریای کاریبی و نزیکەی ٧٠٠ کم لە باکووری ڤەنزویلاوە دوورە. یەکێ لە دورگە رۆژئاواکانی هیند، ئەنتگوا و

ـەربۆدا لە سێ دورگە پێك دێت : گەورەترینیان لە رووی رووبەر و نیشتەجێوە ئەنتگوایە ٢٨٠ کم² دەبێت و نزیکەی ٩٨ ٪ ی خەڵکی وڵاتی تیا دەژی و سانت جۆنزی پایتەختیش ـحکەوێتە ئەو دورگەیە، دوای ئەو دورگەی باربۆدا دێت کە رووبەرەکەی ١٦١ کم² دەبێت، ـورگەی سێهەمیش دورگەی چۆڵی رۆندا دێت کە کەسی تیا ناژی. بە ناوەڕاستی ئەنتگوا و ـربۆدا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦١/٥٠ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٧/٣٠ ـەرەو باکوور.

هەردوو دورگەی ئەنتگوا و باربۆدا لە پاشماوە گڕکانییەکان دروست بوون و بەهۆی باران و رەشەباکانەوە تەخت بوون و کەنارەکانیان بە لم داپۆشراوە، بەڵام دورگەی رۆندا ـورگەیەکی بەردەڵانەو هیچ جۆرە گژوگیایەکی تیا ناڕوێت.

هیندە کاریبییەکان یەکەم دانیشتوانی ئەو وڵاتە بوون، لە ساڵی ١٤٩٣ دا کریستۆفەر کۆلۆمبۆس دۆزیویەتییەوە و یەکەم دورگەی بە ناوی کڵێسەی سانتا ماریا دو لا ئەنتگوای شاری ئیشبیلیەی ئیسپانییەوە ناو ناوە، بەڵام ناوی دورگەی باربۆدا تا ئێستاش دیار نییە و نازانن لەچییەوە ئەو ناوە هاتووە. لە ساڵی ١٦٣٢ بەریتانیەکان یەکەم داگیرکراوەیان لێ پێك هێناوە و ئەفەریقیە رەش پێستەکانیان هێناوەتە ئەو شارە ( کە ئێستا زۆربەی دانیشتوانی وڵات پێك دەهێنن ) و لە کێڵگەکانی قامیشی شەکر کاردەکەن.

لە ١ / ١١ / ١٩٨١ دا ئەنتگوا و باربۆدا سەربەخۆ بووە لەنێوەندی کۆمنۆلتی نەتەوە بەریتانیەکان و لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، لە رۆژی ١ / ١١ ی هەموو ساڵێك جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن.

گەشتوگوزاری سەرەکیترین داهاتی ئەو وڵاتەیە، لە زۆربەی وڵاتانەوە بەتایبەتی ئەمریکا و کەنەدا سەردانی کەنارەکانی دەکەن.

تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی : ٤٥٣ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٦٣ هەمین وڵاتە.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك : ٦,٩٧٠ دۆلاری ئەمریکیی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٤ هەمین وڵات.

## ئەنگۆلا

**ناوی باو:** ئەنگۆلا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئەنگۆلای میللی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Peoples Republic of Angola

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٢٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ٤٨١,٣٥٤ میل دووجا، ١,٢٤٦,٧٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,٦٢٤,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٨,٥ کەس / کم٢

**نەتەوەکان:** ئەفەریقی ڕەش ( کە لە کۆمەڵێك نەتەوەی نەژادی پێك دێن) گرنگترینیان : بانتۆ – بۆشیمان )، بۆرتۆگالی، تێکەڵ.

**ئاین:** مەسیح ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ) چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** پۆرتۆگالی

**پایتەخت:** لواندا

**شارە سەرەکییەکان:** هوامبۆ، بنگیولا، لۆبیتۆ، لۆبانگۆ.

**دراو:** کوانزا

**ئاووهەوا:** خولگەییە و بەرزبوونەوە و ڕەشەبا سارد و وشکەکانی کالاهاری زۆر کاریگەری تێدەکات. پلەکانی گەرما لە کەناردا مام ناوەندە و لەناوچە ناوخۆییەکان بەرز ترە. پلەکانی گەرما لە زستاندا دەچێتە ١٦ پلەی سەدی لە زستان دا و ٢١ پلەی گەرما لە هاویندا و ڕێژەی باران لە ساڵێکدا لە ١٠٠ – ١٥٠ سم دەبارێت بەڵام لە ناوچە بیابانییەکاندا لە ٥ سم زیاتر نابێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، مەنیهۆت، قاوە، گەنمە شامی، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** دروست کراوە کیمیایی و خۆراکییەکان و دروست کراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** ئەڵماس، نەوت.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەنگۆلا وڵاتێکە دەکەوێتە سەر کەناری باشووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئەفریقیا، کۆنگۆی دیموکراسی دەکەوێتە باکوور و باکووری ڕۆژهەڵاتی و زامبیا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، نامیبیا دەکەوێتە باشووری و زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە ڕۆژئاوای. لە گەڵ کۆنگۆدا لە ناوچەی کابیدا سنووریان هەیە، ناوچەی کابیدا بیرە نەوتەکانی تێدەکەوێت. ناوەڕاستی ئەنگۆلا

دەکەوێتە سەر یەکیری هێڵی درێژی ١٨ بەرەو رۆژهەڵات و هێڵی پانی ١٢ بەرەو باشوور.

ئەنگۆلا بەشێك لەو دەشتە بەرزە بەرفراوانەی بەشی باشووری کیشوەری ئەفریقیا پێك دەهێنێت. لە رۆژهەڵاتی ئەنگۆلادا چەند بەرزاییەکی تێدەکەوێت و بەگژوگیا داپۆشراوە، باشووریشی بیابانێکی بەردەڵانی تێدەکەوێت. لە رۆژئاواشدا دەشتێکی تەنگی کەناری تێدەکەوێت، بەڵام باکووری ئەنگۆلا بە گژوگیایەکی زۆر داپۆشراوە.

مێژووی ئەنگۆلا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانێکی زۆر زوو، هۆزەکانی بانتۆ نزیکەی دوو هەزار ساڵ لەوەو پێش تیادا نیشتەجێ بوون. پۆرتۆگالیەکان لە سەدەی شانزدەیەمدا چوونەتە ناوی و دوای ئەوان هۆڵەندییەکان و لە ساڵی ١٦٤٨ دا پۆرتۆگالیەکان دەستیان بەسەردا گرتەوە. کاتێ بەریتانییەکان هەوڵی بەرفراون کردنی دەسەڵاتەکانیان دا لە ئەفریقیا لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا، پۆرتۆگالیەکان لەوە دەترسان دەسکەوتەکانیان لەدەست بدەن، بۆیە خۆیان خزانە نێو قوڵاییەکانی وڵات و لەگەڵ سەرۆك هۆزەکانی ئەو ناوچەیە، بەتایبەتی سەرۆك نگۆلا ( بەمانای سەرۆك دێت و ئەنگۆلاش هەر بەناوی ئەو سەرۆکەوە ناونراوە، کە بەهێزترین و بەناوبانگترین سەرۆك هۆزەکانی ئەو ناوچەیە بوو بەزۆرەملی و هەڕەشە لێکردن چەند رێکەوتنێکیان لەگەڵدا بەستن. لە ساڵی ١٨٩١ دا رێکەوتننامەیەك لەنێوان ئینگلتەرا و پۆرتۆگال واژۆ کرا لەسەر دیاری کردنی سنووری ئەنگۆلای ئێستا.

گەلی ئەنگۆلا لە پەنجاکانی سەدەی پێشووەوە شەڕێکی میللی بەسەرکردایەتی بزوتنەوەی میللی ئازاد کردنی ئەنگۆلا بەرپا کردووە لە پێناوی سەربەخۆ بوونی ئەو وڵاتە تاکو توانی خۆی لەچنگی پۆرتۆگالیەکان رزگار بکات و لە ١١ / ١١ / ١٩٧٥ دا بەتەواوی سەربەخۆ بووە و بۆ ساڵی دوایی پەیوەندی کردوە بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە، ساڵانە لە رۆژی ١١ / ١١ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێردرێت.

بەڵام هێندەی نەخایاند شەڕی ناوخۆ لەنێوانی لایەنە ئەنگۆلیەکان هەڵگیرساوە و چەند لایەنێکی بێگانە بەو وڵاتە خۆیانیان تێهەڵقورتاندووە وەك: ( یەکێتی سۆڤێت، کوبا، باشووری ئەفریقیا )، شەڕەکان بوونە هۆی لەدەست دانی ژمارەیەك زۆر لە گەلی ئەنگۆلی جگە لە زیانە مادییەکان، تاکو توانیان رێکەوتننامەی ئاشتی لەنێوان لایەنە ئەنگۆلیەکان واژۆ بکرێت لە ٣١ / ٥ / ١٩٩١ دا. بەڵام هێندەی نەخایاند دووبارە شەڕ هەڵگیرسایەوە و بۆجاری دووەم لە ٢٠ / ١١ / ١٩٩٤ لە لۆساکا رێکەوتنێکی دیکەیان واژۆ کردەوە. بەڵام بۆ جاری سێهەم و ئەم جارەیان زۆر بەتوندی شەڕ لەنێوان هێزە حکومییەکان و هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی ئازاد کردنی تەواوی ئەنگۆلا ( یونیتا ) دەستی پێکردەوە و ئەمەش بووە هۆی ئاوارە بوونی خەڵکانێکی زۆری ئەو وڵاتە جگە لە بڵاوبوونەوەی نەخۆشییەکی زۆر لەنێوان ریزەکانی گەلدا بەهۆی خواردنی گۆشتی سەگ و پشیلە کە نەبوونی خۆراك گەیاندنییە ئەو رێیە.

لەهەرە کارە نامرۆییەکانی ئەو شەڕی ناوخۆیە ئەو هێرشە بوو کە بزوتنەوەی ( یونیتا )

کردییە سەر شەمەنەفەرێك لە ١٠ / ٨ / ٢٠٠١ و تەواوی سەرنشینەکانی ( ٢٦٠ کەس ) لەناو بردن.

لە بەرواری ٢٢ / ٢ / ٢٠٠٥ سەرۆکی بزوتنەوەی ( یونیتا ) جۆناس سافیمی ( ٦٧ ساڵ ) لەکاتی روو بەڕووبونەوەی لەگەڵ سوپای حکومەتی ئەنگۆلا کوژرا و کوشتنی بووە هۆی کردنەوەی دەرگاییەکی بەرفراوان بۆ کۆتایی هێنان بەو شەڕە ناوخۆییەی کە بووە هۆی لەدەست دانی گیانی زیاتر لە یەك ملیۆن هاوڵاتی و ئاوارە بوون و دەربەدەر بوونی زیاتر لە دەیان هەزاری دیکەش.

لە بەرواری ١٤/ ٣ / ٢٠٠٢ دا حکومەتی ئەنگۆلی فەرمانی پەسوپادا شەڕ لەدژی یاخی بووان راگرێ وهاوکات رایگەیان کە ئامادەیە لێبوردنێکی گشتی بۆ سەرکردە یاخی بووەکان دەرکات. ئەم بڕیارانە لەچوارچێوەی پلانێکدا بوو بۆ ئاشتبوونەوە و کۆتایی هێنان بەتەواوی کێشە و گرفتەکان و دەست هەڵگرتن لە سیاسییەکانی بزوتنەوەی یونیتا بە پێی ئەو رێکەوتننامەیە لە ١٩٩٤ دا واژۆ کرابوو.

لە بەرواری ١٥ / ٣ / ٢٠٠٢ هەردوولا ( حکومەت و یاخی بووانی یونیتا ) بەڵێنی ئاگر بەست و راگرتنی شەڕیان دا لەتەواوی ناوچەکانی وڵات و لە ٣١ / ٣ / ٢٠٠٠ دا رێکەوتننامەیەکی کاتیان واژۆ کرد، لە ٢ / ٤ / ٢٠٠٢ دا پەرلەمانی ئەنگۆلا بڕیارێکی بەکۆمەڵی دا بۆ دەرکردنی بڕیارێك بە لێبوردنێکی گشتی بۆ تەواوی چەکدارەکانی یونیتا و لە ٤ / ٤ / ٢٠٠٢ دا واژۆ لەسەر ئاگر بەستی یەکجارەکی لەنێوان حکومەت و نوێنەرانی یونیتا دەر کرا و خۆشی و ئاهەنگەکان تەواوی وڵاتی گرتەوە و ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتیش لەلایەن خۆیەوە بڕیاری دا لیژنەیەك پێك بهێنی بۆ پاراستنی ئاشتی لەوڵاتدا.

ئەنگولا بەیەکێ لەوڵاتە زۆر هەژارەکانی جیهان دادەنرێ و پشتی تەواوی بە بەرهەمی کشتوکاڵی بەستووە، بەڵام پیشەسازی لەم دواییەدا گەشە کردنێکی زۆر بەرچاوی بەخۆوە بینی بەڵام ئەنگۆلا -- وەك زۆربەی وڵاتانی باشووری ئەفریقیا – دووچاری وشکە ساڵییەکی توند بووەوە بووە هۆی نەداری و برسێتییەکی زۆر لەو وڵاتەدا.

تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی: ٣,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١١٦ وڵات.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك : ٧٢٦ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢٩ وڵات.

ئەنگۆلا بە پلەی شەشەمی هەموو جیهان دێت لە بەرهەمی ئەڵماس دا دێت وریژەی بە ١٥٪ ی بەرهەمی جیهانی دێت.

## ئەندۆرا

**ناوی باو:** ئەندۆرا

**ناوی فەرمی:** ئیمارەتی ئەندۆرا ( میر نشینی ئەندۆرا )

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Principality of Andora

**سیستەمی حوکمڕانی:** میرنشینێکە سەرۆکی کۆماری فەرەنسا و ئەسقەفێکی ئیسپانیا بەهاوبەشی حوکمی دەکەن بە میرانی ئەندۆرا ناودەبرێن و خاوەنی دەسەلاتێکی یەکسانن، هەروەها سەرۆکی حکومتیشیان هەیە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی گشتی ( ٢٨ ئەندام )

**رووبەر :** ١٨١ میل دووجا، ٤٦٨ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧٠,٠٠٠ کەس (تا ساڵی ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٤٠ کەس / کم٢

**نەتەوەکان:** ئیسپانی، گەلی ئەندۆرا، پۆرتۆگالی، فەرەنسی، ئینگلیز، ئەڵمان

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك )

**زمان:** قەتلانی

**پایتەخت:** ئەندۆرا لافیلا

**شارە سەرەکییەکان:** ئیسکالدیز، ئینکامپ

**دراو:** فرانکی فەرەنسی، بیزیتای ئیسپانی ( هیچ دراوێکی تایبەتی نەبوو ( لە ١ / ١ / ٢٠٠٢ بەدواوە بووە بە یۆرۆ )

**ئاو وهەوا:** شاخاوییە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا لەنێوان ٦ – ٩ پلەی سەدی دەبێت و لەهاویندا ٢٥ – ٣٠ پلەی سەدی دەبێت و بە بارینی باران و بەفرێکی زۆر بەناوبانگە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** تووتن، پەتاتە، گەنم، گەنمەشامی، شۆفان، چەوەنەر.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** بەرهەمەکانی تووتن.

**سامانی کانزایی:** هیچ سامانێکی کانزایی نییە.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئەندۆرا وڵاتێکی شاخاویی بچوکە و بەیەکێك لەوڵاتە بچوکەکانی جیهان دادەنرێت، درێژی سنوورەکانی لە ١٣٠,٣ کم تێپەڕ ناکات، دەکەوێتە ناوەڕاستی شاخاکانی بیرینە ( ئەلبرانس )، لە باشووری رۆژئاوای ئەوروپا، فەرەنسا دەکەوێتە باکووری و ئیسپانیا دەکەوێتە باشووری و هیچ کەنارێکی نییە. یەکبڕی هێڵی درێژی ١/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی

پانی ٤٢/٣٠ بەرەو باکوور دەکەوێتە ناوەڕاستی. لوتکەی سەر چیاکانی ئەندۆرا زۆر بەرزن و بەرزی هەندێکیان دەگاتە ٢٩٤٦ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە، زەوییە کشتوکاڵییەکانیش بەدرێژایی دۆڵەکانی تێدەپەڕن، گژوگیایەکی زۆر چوار دەوری شاخەکانیان داپۆشیوە و دارستانەکانیش دەکەونە قەدپاڵی چیاکان، لە شاری ئەندۆرا ی ( پایتەخت ) دا هەردوو روباری ڤالیرای باشوور و ڤالیرای باکوور یەك دەگرنەوە ولەوێوە بەرەو ئیسپانیا رێچکە دەبڕێ. رێگاوبانە سەرەکییەکان بەرەو فەرەنسا بەدرێژایی روباری ڤالیرای باکوور و رێگا سەرەکییەکان بەرەو ئیسپانیا بەدرێژایی روباری ڤالیرای باشوور دێت.

مێژووی ئەندۆرا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی رۆمانەکان، دەڵێن شارلمان دایمەزراندووە و هەر ئەویش ئازادی کردووە. لە سەدەی نۆزدەیەمدا خانەدانێکی ئیسپانیا حوکمی کردووە و پاش ئەو خانەدانێکی فەرەنسی حوکمی کردووە. لە ساڵی ١٢٧٢ دا پاپا مارتینی چوارەم فەرمانێکی دەرکردووە بەوەی کە هەر یەك لە فەرەنسا و ئیسپانیا بە هاوبەشی حوکمی ئەو وڵاتە بکەن. لە ساڵەکانی ١٢٧٢ – ١٢٨٨ دا هەر یەك لە فەرەنسا و ئیسپانیا واژۆیان کردووە لەسەر بەیەکەوە حوکم کردنی ئەو ناوچەیە و دەسەڵاتێکی یەکسانیان هەبێت تێیدا. بەدرێژایی چەند سەدەیەك گەلی ئەندۆرا ژیانێکی گوندنشینییان بردۆتە سەر و لەتەواوی جیهانی دەرەوە دابڕاون، تەنانەت تا ساڵی ١٩٣٢ هیچ رێگایەکیان بەرەو فەرەنسا نەبوو.

لە ١٤ / ٣ / ١٩٩٣ دا دەستووری وڵات دەرکراوە و تیایدا مافی دەسەڵات دانان و جێبەجێکردن و دادگا و حیزبی سەربەخۆی هاتووە. مافی پاڵاوتن و خۆهەڵبژاردنی تەنها بەخەڵکی بەرەچەڵەك ئەندۆری داوە.

لە بەرواری ٢٨ / ٧ / ١٩٩٣ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان و فەرەنسا لە پەیوەندییە دیپلۆماتەکاندا نوێنەرایەتی دەکات.

ئەندۆرا لەداهاتدا پشتی بەگەشت وگوزارە بەستوە و خەڵکانێکی زۆر رووی تێدەکەن بەهۆی جوانی سروشتی ئەو وڵاتە جوانەوە جگە لەهەرزانی نرخی کاڵاکانی چونکە هیچ جۆرە باجێ ناخاتە سەر ئەو کاڵانەی کە دێنە وڵاتەوە.

سروودی نیشتیمانی: شارلمانی گەورە باوکمە

تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی: ٨٩٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریکییە.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٦ وڵات.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك : ٨,٩٥٦ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٣٣ وڵات.

## ئێندونیسیا

**ناوی باو:** ئێندونیسیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئێندونیسیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Indonesia

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە، جێگری سەرۆك.

**دەستەی یاسا دانان:** کۆمەڵەی میللی ڕاوێژکاری ( ۱۰۰۰ ئەندام ) نیوەیان نوێنەرانی گەلن و نیوەکەی تریشیان نوێنەری ناوچەکانن.

**ڕووبەر :** ۷٤۱,۰٥۲ میل دووجا، ۱,۹۱۹,۳۱۷ کم$^{۲}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ۲۱۷,۰۰۰,۰۰۰ کەس.( تا ساڵی ۲۰۰۰ )

**چڕی دانیشتوان:** ۱۰۷ کەس / کم$^{۲}$

**نەتەوەکان:** جاوییەکان ٤٥ ٪، ساندانییەکان ١٤٪، مادۆریسییەکان ٧,٥٪، مالاییەکان ٧,٥ . چینی، یابانی، ئەوروپی، ئەمریکی.

**ئاین:** موسڵمان ۸۸ ٪، مەسیح ( ڕۆمان کاسۆلیك ) ٥٪، کاسۆلیك ۳٪، هیندۆس ۲٪، بودی ۱٪، کۆمەڵی ئاینی ناوخۆ ۱٪.

**زمان:** خەڵکی ئەندۆنیسیا بە ۱۷ زمان قسە دەکەن لەوانە : بەهاسای ئەندۆنیسی زمانی فەرمی، ئینگلیزی، هۆڵەندی، چەند زمانێکی ناوخۆ، بەڵام لەهەموو زمانەکان بەربلاوتر جاوییە.

**پایتەخت:** جاکارتا

**شارە سەرەکییەکان:** باندۆنج، سیمارانج، سورابایا، باندانج، بادانج، مەیدان، بالیمبانغ.

**دراو:** ڕوپیێ

**ئاووهەوا:** گەرم و شێدارن نێوەندی پلەکانی گەرما لەناوچە نزمەکاندا ۲۷ پلەی سەدییە و کەمتر دەبێتەوە بە پێی بەرزبوونەوەی ناوچەکە. ڕێژەی بارانی ساڵانە بەپێی ناوچەکە دەگۆڕێ لە ۹۰ سم بۆ ٦٤۰ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** لاستیك، قاوە، چا، برنج، پەتاتەی شیرین ( سێوی بنعەرز )، کاکاو، گەنمەشامی، فوولی سۆیا، قامیشی شەکر، بیبەری سوور، تووتن، بەخێوکردنی مەڕومالات، داروتەختە، ڕاوەماسی، هێلکە، مێخەك و جۆرەکانی تری بەهارات.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوەکانی خووری، شووشە، چیمەنتۆ، کاغەز،

دروستكردنی فرۆكـه و كەشـتی، چـەك، ئاسـن و پـۆلا، شـەكر، شـەمەنەفەر، ئۆتۆمبێـل، ئامێرەكانی پەیوەندی، بزوێنەرەكان؟

سامانی كانزایی: مەنگەنیز، نەوت، گاز، تەنەكە، بۆكسیت، مس، خەڵووزی بەردین، فافۆن، ئاڵتون، زیو، چیمەنتۆی سروشتی.

تێڕوانینێكی گشتی :

ئەندۆنیسیا گەورەترین وڵاتی ئیسلامییە لە جیهاندا لە رووی ژمارەی سەرنشینانەوە و حـەوزێك دەچـیٚ كۆمـەڵیٚ دورگـەی لـەخۆ گرتبێـت دەگاتـە نزیكـەی ١٧,٠٠٠ دورگـە، لەوانـە ٦٠٠٠ دورگـەیان كەسـی تیا نـاژی و لەیـەكترەوە دوورن و دورگـەكانی دیكـەش هـیچ كامیـان لەچەند كیلۆمەترێكی دووجا گەورەتر نین، تێكڕا بوارێكی دەریـایی دادەپۆشـن رووبەرەكـەی دەگاتـە ٧,٩٠٠,٠٠٠ كم٢، لـە باشـووری رۆژهـەڵاتی ئاسـیاوە لـە بـاكوور بـۆ ئوسـترالیا لـە باشــوور دەبــن و دەكەونــە نێــوان زەریــای هــێمن بــەرەو رۆژهــەڵات و هینــدی لــە رۆژئاوا.ناوەڕاستی دەكەوێتە سەریەكبڕی هێڵی درێـژەی ١١٨ بەرەو رۆژهـەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥ بەرەو باشوور.

گرنگترین دورگـەكانی ئێندۆنیسیا : جـاوا ( ٧٪ رووبـەری وڵات )، ٦٠٪ سەرنـشینەكان و جاكارتای پایتـەختی تێدەكەوێت، سومترا، سۆلاویزی ( یـان سیلیبیس )، لۆمبۆن، مولـوك، تەیمور.

هـەروەها نیوەی دورگـەی غینیـای نـویٚ ( هـەرێمی ئیریـان جایـا ) سـەر بـە ئێندۆنیسایە، نیوەی دیكەشی دەكەوێتە وڵاتـی پاپوا غینیای نوێو سیٚ لەسەر چواری دورگـەی بۆرینـۆ ( هەرێمی كالیمنتان )، چوار یەكەكەی دیكەشی وڵاتی برۆنـای و بەشێكی وڵاتـی مالیزیایە، و ئـەم دوو دورگەیــەش بــە دووەم و ســێیەمی گــەورەترین دورگــەی جیهــان دادەنــرێن دوای دورگەی گرینلانـد. درێـژی تـەواوی كـەناری دورگـە ئێندۆنیـسییەكان نزیكـەی ٥٥ هـەزار كـم دەبێت.

شــاخە گڕكانییــەكان لەناوەڕاســتی دورگــە ئێندونیــسیەكان بــەرز دەبنــەوە و لەوانــەوە روبارەكان بەرەو دەشتە كەناریـەكان بەچوار دەوری شـاخاكاندا بڵاودەبنـەوە. نزیكـەی سـەت گڕكــانی چــالاكی لــەخۆ گرتــووە، وبوومەلــەرزەش بەشــێوەیبەكی پــچڕ پــچڕ لێیــدەدات، دارستانەكانیش رووبەرێكی زۆریان داپۆشیوە.

ئێندۆنیـسیا چـەند نـاوێكی پـیٚ وتـراوە، لەوانـە : دورگـە رۆژهەڵاتیـەكانی هینـد، دورگـە هیندیـە رۆژهەڵاتیـەكانی هۆڵەنـدا، كۆمەڵـە دورگـەی هینـدی ( بـەو پێیـەی لەسـەر زەریـای هیندییـە )، حـەوزی مـالیزی، كۆمەڵـە دورگـەی مـەلایۆ، هـەروەها بـە ئێندۆنیـسیایان وتـوە

نۆتازیا، کـە ئـەویش وشـەیەکی ئەگریکییـە و بـەواتای باشـوور دێـت، یـان پێیـان وتـوە: نیوسەنترا، ئەویش وشەیەکی مالیزییە بەمانای کۆمەڵە دورگە یان زنجیرەیەك دورگەی سەر دوو زەریا، هەروەها وتویانە: ئەنسۆلیند.

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمـەوە نـاوی ئێندۆنیسیا بەسـەر هـەموو ناوەکانی تـردا زاڵ بـووە وئـەو نـاوەش لـە دوو برگـە پێـك هـاتووە : ئێنـدۆ ئـەویش لەوشـەیەکی هیندیـەوە وەرگیراوە، لەگـەڵ نیسیا و ماناکەشـی بـە ئـەغریقی بـەمانای دورگـە دێـت، کەواتـە وشـەی ئێندۆنیسیا بـەمانای دورگـەکانی هینـد دێـت. ئـەم نـاوەش بـووە هێمـای یـەکێتی گـەلی ئێندۆنیسی و ئاواتە نەتەوەییەکانی، بۆیە حکومـەتی هۆڵەندی دانی بەم ناوەی نـەناو هەر ئەو ناوی دورگە هیندییە ڕۆژهەڵاتەکانی هۆڵەندای لێدەنێت کە لە دوای ساڵی ( ١٩٤٦ ) ەوە هۆڵەندا وڵاتەکەی بەجێ هێشت و دەستی لێهەڵگرت.

لـەنێوان سـاڵەکانی ٢٥٠٠ – ٥٠٠ پ.ز دانیـشتوانەکانی ئێندۆنیـسیا لـە زەوییـە ئاسیاییەکانەوە هاتوون و لەو ناوچەیەدا جێ نشین بوون. لە سەدەی حەوتەمەوە بۆ سەدەی سیانزدەیەم شانشینی سریڤیجایای بوودی لـێ دامـەزراوە و بـووە هێزێکـی دەریـایی زۆر مـەزن. لەسـەدەی چـواردەیەمدا شانـشینی ماگابـاهیتی هیندۆسـی دەسـەڵاتی هەنـدێ لـە ناوچەکانی ئێندۆنیسیای گرتۆتە دەست. لەسەدەی هەشتەمی کۆچی ( چواردەیەمی زایینی ) ئـاینی ئیـسلام لەسـەر دەسـتی بازرگانـە ئیـسلامەکان لـەو ناوچـەیەدا بڵاوبۆتـەوە. پۆرتۆگالیـەکان لـە سـەدەی شـانزدەیەمدا داگیریـان کـردووە، بەڵام هـاتنی هۆڵەندییـەکان لـە ساڵی ١٥٩٦ و ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٦٠٠ دا دەسەڵات و هێزی پۆرتۆگالیەکانی لاواز کرد. لەسـاڵی ١٦٢٣ دا کۆمپانیـای هینـدی ڕۆژهـەڵاتی هۆڵەنـدی دەسـەڵاتی ئـەو وڵاتـەی گرتۆتـە دەست. لە ساڵی ١٧٩٩ دا ئەو دەسەڵاتە گوازراوەتـەوە بۆ حکومـەتی هۆڵەندی، لەو ڕۆژەوە ئێندۆنیسیا ناونا دورگە هیندیە ڕۆژهەڵاتیەکانی هۆڵەندا. بەڵام بەهۆی خەباتی نەپساوەی گەلی ئێندۆنیسیا توانیـان لـە ١٧ / ٨ / ١٩٤٥ دا سـەربەخۆیی خۆیـان بەدەست بهێـنن و لە ڕێکەوتننامـەی لاهایـدا هۆڵەنـدا دانیـان نـا بەسـەربەخۆیی ئـەو وڵاتـە لـەژێر نـاوی : ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئێندۆنیـسیا، هـەروەها لـە پەیماننامەکـەدا هـاتووە کـە هـەردولا ( هۆڵەنـدا و ئێندۆنیـسیا ) یەکێتییـەك لەنێوانیانـدا دروسـت بکـەن. لـە مـانگی هەشـتی ١٩٥٠ دا بـووە ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی کۆمـاری ئێندۆنیـسیا. لـە سـاڵی ١٩٥٦ دا ئێدۆنیـسیا کۆتـایی بەیەکێتی نێوان خۆی و هۆڵەندا هێنا و ناوی بووە کۆماری ئێندۆنیسیا.

یەکەم سەرۆکی ئێندۆنیسیا پاش سەربەخۆی بوونی ئەحمەد سۆهارنۆ بوو و لەدەسەڵاتدا تا ساڵی ١٩٦٨ مایـەوە، تـا ئـەو کاتـەی سۆهارتۆ بـووە سـەرۆکی وڵات. لـە سـەرەتای ساڵی

١٩٨٨ دا بۆ جاری حەوتەم سۆهارتۆ لەلایەن كۆمەڵەی میللی ئەنجومەنی راپرسییەوە هەڵبژێردرایەوە.

لە ساڵی ١٩٩٧ دا ئیندۆنیسیا دووچاری گرفتێكی دارایی گەورە بووەوە بووە هۆی بەرز بوونەوەی نرخی كاڵا سەرەكییەكان بەشێوەیەكی نائاسایی و دابەزینی بەهای دراوی ئەو وڵاتە بەرێژەی ٨٠٪ و ئاژاوە و خۆپیشاندان و مانگرتنەكان تەواوی ناوچەكانی وڵاتی گرتەوە، حكومەتی ئیندۆنیسیا ناچار بوو دراوەكەی بگۆڕێ و بەهایەكی بەرزتری بۆدانێت و هەڵسا بەقەرز كردنی بڕی چل ملیار دۆلاری ئەمریكی لە بانكی نێودەوڵەتی بۆ ئەوەی لەو گرفتە ئابووریە گەورەیە رزگاری بێت، بەڵام كێشەكە تا دەهات گەورە دەبوو وئاژاوە و خۆپیشاندانەكان لەدژی سەرۆك سۆهارتۆ بەرەو زیادبوون دەچوو، هاوكات تاڵانی زۆربەی كۆگا و دەزگاكانی ناو جاكارتای پایتەختی گرتەوە و چەندین كوژرا و بریندارى لێبووەوە و ئاژاوە ریزەكانی نێو دەزگا حكومەتییەكانیشی گرتەوە ئەمانە هەمووی سەرۆك سۆهارتۆیان ناچار كرد دەست لەكاركێشانەوەی لە پۆستی سەرۆكایەتی راگەیەنێت لەبەرواری ٢١ / ٥ / ١٩٩٨ دا و لەبری ئەو بشار ئەلدین یوسف حەبیبی جێگری بووە سەرۆكی وڵات.

لە بەرواری ٧ / ٦ / ١٩٩٩ دا زیاتر لە ١١٣ ملیۆن هاوڵاتی ئەندۆنیسی لە یەكەم هەڵبژاردنی دیموكراسی فرە حیزبی (٤٨ پارت ) لە دوای ساڵی ١٩٥٥ بەدواوە بەخۆیەوە ئیندۆنیسیا بینیبێتی بۆ هەڵبژاردنی ٤٦٢ ئەندام پەرلەمان لەكۆی ٥٠٠ ئەندام پەرلەمانیان پێك دەهێنا، بەلام كورسییە بەتاڵەكانیش تەرخان كرابوو بۆ نوێنەرانی سوپا نەك بۆ دەنگدەران. لەهەڵبژاردنەكاندا پارتی خەباتی دیموكراسی ئیندۆنیسی بەسەرۆكایەتی میگاواتی سۆكارنۆ بۆتری سەركەوتنی بەدەست هێنا، میگاواتی كچە گەورەی یەكەم سەرۆكی ئیندۆنیسی : ئەحمەد سۆكارنۆ بوو.

لە بەرواری ٢٠ / ١٠ / ١٩٩٩ دا ئەنجومەنی میللی راوێژكاری سەركردەی ئیسلامی عەبدول رەحمان عەبدول واحیدی وەك سەرۆك ئیندۆنیسیا هەڵبژارد، عەبدول رەحمان سەرۆكی كۆمەڵەی راپەرینی زانایان بوو كە گەورەترین رێكخراوە ئیسلامیەكانە لە ئیندۆنیسیا. لەهەمان رۆژدا سوێندی یاسایی خوارد و پۆستی سەرۆكایەتی گرتە دەست، وەك چوارەم سەرۆكی ولات و یەكەم سەرۆكی هەڵبژاردەی وڵات. بۆ رۆژی دواییش میگاواتی كێبركێكەری لەلایەن ئەنجومەنی میللی راوێژكارییەوە بەجێگری سەرۆك هەڵبژێردرا.

لە بەرواری ٩ / ٨ / ٢٠٠٠دا عەبدول رەحمان دەستی لە هەندێ لە دەسەڵاتەكانی كێشایەوە بۆ میگاواتی جێگری، ئەویش دوای ئەوەی لەلایەن ئەنجومەنی میللی راوێژكارییەوە چەندین رەخنەی ئاراستە دەكرا سەبارەت بە بەڕێوەبردنی كاروباری وڵات،

لەبەرواری ٢٦ / ٨ / ٢٠٠٠ دا جێگری سەرۆك ( میگاواتی ) سوێندی دەستووری خوارد بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەت. لە بڕیاری سەرۆکایەتیدا هاتبوو کە مێگاواتی گونجاوترینە بۆ بەڕێوەبردنی ئەرك و کاروبارە حکومیەکانی ئێندۆنیسیا.

پاش ٢١ مانگە لە دەسەڵاتەکانی عەبدول ڕەحمان وڵات بەماوەیەکی سەخت و دژواردا تێپەڕی و سەر لەنوێ ئاژاوە و خۆپیشاندانەکان تەواوی وڵاتی گرتەوە، بۆیە عەبدول ڕەحمان دەستی کرد هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و ڕەوشی نائاسایی ڕاگەیاند ولە ٢٢ / ٧ / ٢٠٠١ دا داوای لە سوپا و پۆلیس کرد ڕێ لەدانیشتنی داهاتووی پەرلەمان بگرن بۆ ئەوەی بەرپرسیارێتی ئەو بارودۆخە بخاتە ملی پەرلەمان و بەگەندەڵی ئەندامەکانی تاوانبار بکات. بەلام سوپا فەرمانەکانی سەرۆکی ڕەتکردەوە و ڕایگەیاند کە بڕیارەکانی هیچ شەریعەتێکی نییە جگە لەوەی دادگای باڵاش پوچەڵی فەرمانەکانی سەرۆکیان ڕاگەیاند.

لە بەرواری ٢٢ / ٧ / ٢٠٠١ دا کۆمەڵەی میللی ڕاوێژکاری سەرۆك عەبدول ڕەحمانیان لە پۆستی سەرۆکایەتی دەرکرد و لەبری ئەو میگاواتی سۆکارنۆ بۆتری جێگری عەبدول ڕەحمانیان بەسەرۆك دەست نیشان کرد، میگاواتی پێنجەم سەرۆکە و یەکەم ژنە ببێتە سەرۆکی ئێندۆنیسیا، مێگاواتی سوێندی دەستووری خوارد و داوای لە ریزەکانی گەل کرد دەست لەدەست بکەن لە پێناوی بنیات نانەوەی وڵاتەکەیان.

لە ٢٦ / ٧ / ٢٠٠١ دا کۆمەڵەی میللی ڕاوێژکاری هەمزە هازی سەرۆکی پارتی یەکگرتووی گەشەپێدانی ئیسلامی بەجێگری سەرۆك هەڵبژارد.

لە ساڵی ١٩٧٦ دا لە هەرێمی ئێتشێ، کە دەکەوێتە باکووری دورگەی سۆمترە ( پایتەختەکەی شاری باندا ئێتشێ یە ) بزوتنەوەی ئێتشێ مەردیکە، بەواتای : ئێتشێی ئازاد ) سەری هەڵدا و داوای سەربەخۆیی ئەو هەرێمەی دەکرد. شایەنی باسە هەرێمی ناوبراو هەرێمێکی دەوڵەمەندەو خاوەنی چەندین جۆر کانزای بەبەهایە. پاش ئەوەی سەرۆك عەبدول ڕەحمان بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا دانیشتوانی ئەو هەرێمە داوای جیابوونەوە و سەربەخۆییان دەکرد، بەلام وەڵامی خۆپیشاندان و داواکاریەکانیان لەلایەن حکومەتەوە زۆر بەتوندی وەڵام درایەوە. لە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٩ و سەرەتای ٢٠٠٠ دا حوکمێکی نیمچە بەرفراوانیان پێبەخشرا و ڕێ بەدانیشتوانی ئەو هەرێمە درا کە پارێزگاری لەداهاتێکی زیاتری هەرێمی ناوبراو بکەن، بەڵام خۆپیشاندانەکان هەر بەردەوام بوو، چونکە بزوتنەوەکان دەستیان لە داواکارییەکانی خۆیان هەڵنەدەگرت ( جیابوونەوە و سەربەخۆیی تەواو ).

لە ساڵی ١٩٩٩ دا دورگەکانی مولوکی ڕۆژهەڵاتی ئێندۆنیسیا، بەتایبەتی لە شاری

ئەمبۆن، چەند كارێكی توندی لەنێوان موسڵمان و مەسیحەكانەوە بەخۆوە بینی.بووە هۆی كوشتن و بریندار بوونی ژمارەیەك قوربانی لەهەردوو گروپ وتا كۆتاییەكانی ٢٠٠٠ ی خایاند، ناچار حكومەت حاڵەتی نائاسایی ڕاگەیاند بۆ هێمن كردنەوەی بارودۆخەكە. بەڵام ئێستاش بەیناو بەین كێشە لەنێوان گروپە جیاجیاكانی ئەو شارە سەرهەڵدەدات.

لە بەرواری ١٢ / ١٢ / ٢٠٠٢ دا نوێنەرانی ئیسلام و مەسیحەكان لە دورگەكانی مولوك ڕێكەوتنامەیەكیان واژۆ كرد بۆ كۆتایی هێنان بەكێشە و گرفتەكانی نێوانیان، شایەنی باسە لە دورگەكانی سۆلاو یرای یشدا هەمان لەو كێشە و ململانێیانەی بەخۆوە بینی بەڵام لەگەڵ واژۆ كردنی ڕێكەوتننامەكە كۆتایی پێهات.

لە بەرورای ٤ / ٦ / ٢٠٠٠ دا نزیكەی ٣٠٠٠ ئەندامی چالاك لەبزوتنەوەی سەربەخۆیی هەرێمی پاپوای ڕۆژئاوا ناسراو بەهەرێمی ( ئیریان جایا ) سەربەخۆیی خۆیان لە ئێندۆنیسیا ڕاگەیاند و داوایان لەكۆمەڵگای نێودەوڵەتی كرد پشتیوانیان لێ بكەن و دان بە سەربەخۆییان بنێن. بەڵام سەرۆك عەبدول ڕەحمان داوای لەوڵاتانی جیهان كرد دان بەسەربەخۆیی ئەو هەرێمە نەنێن كە دانیشتوانی لە دوو ملیۆن تێناپەڕێ و دووپاتی كردەوە كە كار دەكات لەپێناوی پاراستنی یەكێتی خاكی وڵاتەكەی. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠١ دا حوكمی ئۆتۆنۆمی بەرفراوانی بە هەرێمی ناوبراو بەخشراو داهاتی زیاتری كانزا سروشتییەكانی بۆ ئیریان جایا تەرخان كرا.

لە ساڵی ٢٠٠٠ دا حكومەتی ئێندۆنیسیا ڕایگەیاند كە دورگە چۆڵەكانی ( ئەوانەی نیشتەجێ نیین ) دەدات بەكرێ بەو وڵاتانەی ئامادەیی خۆیان دەردەبڕن. زۆربەی وڵاتان بانگهێشتەكەی حكومەتیان بەبەرچاو كرد لەهەوڵی ئەوەدان بەمەبەستی گەشت وگوزار سوود لەو دورگانە وەربگیرێ و ئەمەش ئەگەری ئەوەی هەیە باری ئابووری ئێندۆنیسیا بەرەو پێشتر بەرێ.

لە بەرواری ١٦ / ٨ / ٢٠٠١ دا میگاواتی ( سەرۆكی نوێ ) داوای لێبوردنی لەهەردوو هەرێمی ئیریان جایا و ئێتشێ كرد بۆ ئەو كارە توندانەی كە لە ئەنجامی خۆپیشاندانەكاندا لەلایەن حوكمەتەوە بەرامبەریان كراوە و ئاگاداری كردنەوە كە بەهیچ شێوەیەك بیر لە سەربەخۆیی و جیابوونەوە لەوڵاتی دایك ( ئێندۆنیسیا ) نەكەنەوە.

* * *

## تەیموری رۆژهەلات

هەرێمی تەیموری رۆژهەلات بەشی رۆژهەلاتی هەرێمی تەیمورە و رووبەرەکەی ١٤.٨٧٤ کم٢ دەبێت. دانیشتوانی نزیکەی ملیۆنێك کەس دەبن و زۆربەیان لەئاینی مەسیحن، پایتەختی ئەو هەرێمە دیلی یە. لە سالی ١٧٠٢ دا هەرێمی تەیمور بووە داگیرکراوەیەکی پۆرتوگالی. لەبەرواری ٢٥ / ٤ / ١٩٧٤ دا کودەتایەکی سەربازی لە لیشبوونە روویدا، بووە هۆی کۆتایی هێنانی داگیرکارییەکانی پۆرتۆگال لەهەرێمی تەیمور. لەبەرواری ٢٨ / ١١ / ١٩٧٥ دا پارتی فریتلینی مارکسی رایگەیاند کە تەیمور بۆتە کۆماری میللی سەربەخۆ. لە بەرواری ٧ / ١٢ / ١٩٧٥ سوپای ئیندۆنیسی چووە ناو تەیمور و خستییە سەر ولاتی خۆی، بەلام ئەمە بووە هۆی هەلگیرسانی شەر لەنێوان دانیشتوانی هەرێمی تەیمور و سوپای ئیندۆنیسی و کوژرانی زیاتر لە ٢٠٠,٠٠٠ کەس بەلایەنی کەمەوە لە تەیموری رۆژهەلات و نزیکەی چارەکە سەدەیەکی خایاند. بۆیە حکومەتی ئیندۆنیسیا لە یەکەم مانگی ١٩٩٩ دا بۆ یەکەم جار رایگەیاند کە ئامادەیە سەربەخۆیی بە تەیموری رۆژهەلات ببەخشێت و ئەم راگەیاندنەش بووە هۆی هەلگیرسانی شەرێکی گەورەتر لەنێوان یاوەرانی سەربەخۆ بوونی تەیموری رۆژهەلات و نەیارانی سەربەخۆیی.

لە بەرواری ٣٠ / ٨ / ١٩٩٩ نزیکەی ٤٥٠ هەزار تەیموری بەرەو رووی سندوقەکانی دەنگدان بەرێ کەوتن بۆ ئەنجام دانی دەنگدانێکی مێژووی بۆ دیاری کردنی چارەنووسیان بەچاودێری نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەنجامی دەنگدانەکان بەرێژەی ٧٨,٥ ٪ دەنگیان لەدژی حوکمی ئۆتۆنۆمی دا ئەمەش مانای سەربەخۆیی رادەگەیەنێ. سەرلەنوێ خۆپیشاندانە توندو خوێناوییەکان هەلگیرسایەوە و بووە هۆی ئاوارە بوونی ژمارەیەکی زۆر لەخەلکی ئەو هەرێمە بەرەو بەندەری داروینی باکووری ئۆستورالیا. ئیندۆنیسیا پاش ئەوەی هەرەشەی بە هێنانی هێزەکانی نەتەوە یەکگرتوەکانی دەکرد بەرەو تەیموری رۆژهەلات لە بەرواری ٢٠ / ٩ ١٩٩٩ دا هێزە نێودەولەتییەکان ( ئەنتەرفیت ) هاتنە ناو تەیموری رۆژهەلات و هێزە حکومییە ئیندۆنیسییەکان دەستیان بەکشانەوە کرد. لەبەرواری ١٨ / ١٠ / ١٩٩٩ پەرلەمانی ئیندۆنیسی سەربەخۆیی تەیموری رۆژهەلاتیان ( بەتێکرای دەنگ ) پەسەند کرد بەو مەرجەی کەلە دوو تا سێ سالْ لەژێر چاودێری نەتەوە یەکگرتوەکاندا بمێنێتەوە و دوای ئەوە وەك ولاتێکی سەربەخۆ رابگەیەنرێت.

لە بەرواری ٢٣ / ٢ / ٢٠٠٠ دا هێزەکانی ئاشتی پارێز ( کلاو شینەکان ) لەبری هێزە نێودەولەتیەکان ( ئەنتەرفیت ) هاتنە ناو تەیموری رۆژهەلات و ئیدارەی کاتی خستە دەستی هێزە ئاشتی پارێزەکانەوە، شایەنی باسە زۆربەی هێزەکانی ئاشتی پارێز هەر لەخودی هێزە نێودەولەتیەکان ( ئەنتەرفیت ) پێك هاتوون.

لە بەرواری ٢٩ / ٢ / ٢٠٠٠ سەرۆکی ئیندۆنیسی ( عەبدول رەحمان ) سەردانێکی

تـەیموری رۆژهـەڵاتی کـرد بەمەبـستی ئاشـتبوونەوە، لەسـەردانەکەیدا داوای لێبـوردنی لەخەڵکی ئەو هەرێمە کرد لەو کارە توندانەی میلیشیاکانی سەر بە هێزە ئیندۆنیسیەکان بەرامبەریان ئەنجامیان داوە، لە وتارەکەیدا وتی: " داوای لێبوردن لەقوربانیانی هەردولا ئەکەم، ئەوانە قوربانییەکانی ئەو بارودۆخە بوون کە ئەمان دەویست دووچاری بین ".
هەروەها سەرۆکی تەیموری خۆرهەڵات ( کسانانا جسماو ) زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکرد و بەبەرچاوی زیاتر لە دوانزدە هەزار کەسەوە وەڵامی دایەوە : " ئێوەش بنەمای ئاشتی جیهانینن، ئێوە هێمای دیموکراسین، ئێوە ئاواتی داهاتووی تەیموری خۆرهەڵاتن".

لە بەرواری ٢٨ / ٣ / ٢٠٠١ دا سەرکردەی سەربەخۆیی تەیموری رۆژهەڵات ( کسنانا جسماو ) دەستی لە سەرۆکایەتی کاتی ئەنجومەنی یاسادانان کێشایەوە، لە بەرواری ١٠ / ٤ / ٢٠٠١ دا مانۆئێل کاراسکالاو بەسەرۆکی ئەنجومەنی ناوبراو هەڵبژێردرا. لەبەرواری ٣٠ / ٨ / ٢٠٠١ دا هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکان بەڕێوەچوو.

لە سەرەتای ٢٠٠٢ دا، نوێنەری تایبەتی نەتەوە یەکگرتوەکان لە تەیموری رۆژهەڵات رایگەیاند لە رۆژی ٢٠ / ٥ / ٢٠٠٢ دا تەیموری رۆژهەڵات بەتەواوەتی سەربەخۆیی دەستگیر دەبێت و هەڵبژاردنەکانیش لە رۆژی ١٤ / ٤ / ٢٠٠٢ دا بەڕێوە دەچێ. هاوکات هەردولا (ئیندۆنیسیا و تەیموری رۆژهەڵات ) چەند رێکەوتنێکیان لەسەر دیاری کردنی سنوور و ئاڵوگۆڕی بازرگانی دەریایی و پۆستە و گەیاندن واژۆ کرد.

لە بەرواری ٢٢ / ٣ / ٢٠٠٢ دا دەستووری نوێی وڵات دەرکرا و لە ( ١٧٠ ) بەند پێك هاتبوو، پاش ئەوەی نزیکەی شاش مانگێك سەرقاڵی ئامادە کردنی بوون.

لە بەرواری ١٤ / ٤ / ٢٠٠٢ دا تەیمورییە رۆژهەڵاتیەکان کسنانا جسماویان وەك یەکەم سەرۆکی تەیموری رۆژهەڵاتیان هەڵبژارد.

لە رۆژی یەکشەممەی ١٩ / ٥ / ٢٠٠٢ دا وڵاتی تەیموری رۆژهەڵات پێك هێنرا و بەیەکەم وڵاتی سەدەی بیست ویەك دانرا و بووە ئەندامی ژمارە ١٩١ ی نەتەوە یەکگرتوەکان. لە ئاهەنگی بەوڵات کردنی ئەو هەرێمە نزیکەی ٢٠٠ کەسایەتی جیهانی ئامادە بوون، لەوانە: سەرۆکی پێشوی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بیل کلینتۆن و سەرۆکی ئیندۆنیسیا خاتوو: میگاواتی، ئاهەنگەکە لە باخچەیەك لەدەرەوەی دیلی پایتەخت بەڕێوەچوو و نوێژی سوپاسیان پێشکەش کرد و. سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان ( ئەوکات ) کۆفی ئەنان ئیدارەی نوێ وڵاتی پێشکەشی حکومەتی نوێی وڵات کرد و سەرۆك کسنانا جسماو سوێندی دەستووری خوارد ئاڵای نوێ تەیموری رۆژهەڵات کە لە رەنگی سوور و رەش و ئاڵتونی و ئەستێرەیەك لەناوەڕاستدا هەڵکرا.

چین یەکەم وڵات بوو پەیوەندیی دیپلۆماتی لەگەڵدا دروست بکات و دوای ئەو یابان و پاشان ئیسرائیل. یەکەم رێکەوتنی ئابووری لەگەڵ ئوستورالیادا واژۆ کرا لەسەر دابەش کردنی سامانەکانی دەریای تەیمور وەك پیترۆل و گاز، ئەمەش داهاتێکی گونجاوی بۆ

تەیموری رۆژهەلات لەخۆ گرتووە و یارمەتی گەشە كردنی ئابووری ئەو ولاتە ساوایە دەدات. تەواوی ئەمانە بۆ رۆژی دوای ئاهەنگەكە جێ بەجێ كران. شایەنی باسە ئەم ولاتە تازە پێگەیشتووە بەیەكێ لەولاتە هەژارەكانی ئاسیا دادەنرێت و رێژەی نەخوێندەواری دەگاتە ٥٠٪ ی دانیشتوان و نەبوونی ژێرخانێكی ئابووری پتەو یان پیشەسازییەكی ئەتۆ سێ سەرچواری خێزانەكانی بەتەواوی هەژار كردووە.

لە دەستووری ولاتدا هاتووە كە زمانی پۆرتۆگالی و زمانی تیتۆمی ناوخۆ دوو زمانی فەرمی تەیموری رۆژهەلاتن. تیتۆم یەكێكەی لە ٢٠ زمانی بلاو لە تەیموری رۆژهەلات و رێژەی ئەوانی قسەی پێدەكەن دەگاتە ٨٢٪ كۆی دانیشتوان كە ٧٥٠,٠٠٠ كەس دەبن. شایەنی باسە سەرۆكی تەیموری رۆژهەلات كسانانا جسماو ( ٥٦ سالْ ) خێزانی پێك هێناوە و خێزانەكەشی كریستی سوارد جسماو ( ٣٦ سالْ ) لە سەرەتای نەوەتەكانەوە یەكیان بینیوە ئەو كاتەی كە كاسانانا لە بەندیخانە بوو بەهۆی داواكردنی ماق سەربەخۆیی بۆ ولاتەكەی كریستی لە رێكخراوێكی مرۆیی ئۆستورالی كاری دەكرد و خاوەنی دوو منالْن، بەلام كسانانا خێزانێكی پێشووی كور و كچێكی دیكەی هەیە.

* * *

سروودی نیشتیمانی ئێندۆنیسیا : ئێندۆنیسیای مەزن

جەژنی نیشتمانی: رۆژی سەربەخۆیی ١٧ / ٨ ی هەموو سالێك.

ئێندۆنیسیا یەكێكە لەولاتانەی كە خاوەنی سەرچاوەیەكی سروشتی دەولەمەندە، زەویەكانی زۆر بەپیتن و بارانە زۆرەكان و ئاو وهەواكەی یارمەتی دەرێكی باشی كشتوكالی ئەو ولاتەیە. جگە لەوەی داروردەختێكی زۆر رووبەرێكی ئەو ولاتەیان داپۆشیوە و خەلكەكەشی خۆیان سەرقالی راوە ماسی كردوە.

تێكرای داهاتی نەتەوەیی: ١٦٧,٧ ملیار دۆلاری ئەمریكییە.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٢٣ ولات.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٨٨٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٢٠ هەمین ولات.

ئێندۆنیسیا بەیەكەم ولاتی جیهان دادەنرێت لە بەرهەمی لاستیك و دووەم لە تەنەكە و سێهەم لە قاوە و برنج و چوارەم لە كاكاو، پێنجەم لە نیكل و چا و بستە، حەوتەم لەداروتەختە، و هەشتەم لە گاز و راوەماسی و قامیشی شەكر و ئالتون، دەیەم لە بەرهەمی مس، دوانزدەیەم لە بۆكسیت و گەنمە شامی و چواردەیەم لە پیترۆلْ و خەلووزدا.

* * *

**ئاینەکەیان ئۆتۆمبێل و دەرمانی ددان حەرام دەکات**

**خێڵێکی ئێندۆنیسی لە مافی دەنگ نەداندا سەرکەوتنی هێنا**

خێڵی بادۆی لەنێو دڵی دەغڵەکانی بەرزاییەکانی جاوای رۆژئاوادا دەژی، ئەم خێڵە زۆر گۆشەگیرن و هەوڵێکی زۆریان داوە تاکو سەرکەوتنیان بەدەست هێنا لەوەی کە لە هەڵبژاردنە گشتیەکاندا مافی دەنگدانیان نەبێت، چونکە ئاینی ئەو خێڵە سیاسەت و ئۆتۆمبێل و دەرمانی ددانی و کارەبای حەرام و قەدەغە کردووە.

لە سەردەمی دەسەڵاتی سۆهارتۆی دیکتاتۆردا ( کە نزیکەی ٣٢ ساڵی خایاند ) ئەم خێڵە بەزۆر ناچار کران لەهەڵبژاردنەکاندا بەشداری بکەن.

لەمانگی نیسانی ١٩٩٩ دا کۆمەڵێ لەگەورە پیاوانی ئەو گوندە گەیشتنە پایتەخت و لەوێ داوای لێخۆش بوونیان کرد لەوەی کە بەزۆر بەشداری لەهەڵبژارنە دیموکراسیەکاندا بکەن، کە نزیکەی چوار دەیەیە بەڕێوە دەچێت، چونکە ئاینەکەیان رێگە بە درۆ و بەشداری کردن لە سیاسەت حەرام دەکات و قەدەغە کراوە.

کەس نازانێ ئەم خێڵە لەکوێوە هاتوون، خۆیان وای باس لێوە دەکەن کە لەدێر زەمانەوە لەو ناوچەیەدا ژیاون. زاناکانی ئەنترۆپۆلۆجی وای بۆ دەچن کە ئەم خێڵە لە نەوەکانی باجاجارانی هیندۆسی بن کە بەرەو دەغڵەکان هەڵهاتوون کاتێ ئیسلامەکان گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە لە ساڵی ١٥٧٨ دا. لەو کاتەوە هیچ گۆڕانکاریەك بەسەر داب ونەریتەکانیاندا نەهاتووە.

لەنێو جەرگەی جیهانی بادوی دا سێ گوند هەیە و لەوێدا خەڵکەکە ئاینی خۆیانیان زۆر بەتوندی گرتوەو رێ بەهیچ بێگانەیەك نادەن نەسەردانیان بکەن و نە تێکەڵیان بن. مەگەر جار بەجار هەندێ لەخەڵکی ئێندۆنیسیا بتوانن بەرەو ناوچەکەیان دزە بکەن تاکو هەر نەبێ هەندێ لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکرێ.

بادوی چاودێری تەندورستی رەت دەکەنەوە جگە لەوەی خوێندن و خوێندەواری و قوتابخانە هەر بوونی نییە وژمارەشیان نزیکەی هەشت هەزار کەس دەبێت هەمویان نەخوێندەوارن. هەروەها یاساکانیان نەك هەر رێگا بە بەکارهێنانی ئامێری کشتوکاڵ نادات بەڵکو جۆرەکانی پەینیش قەدەغەیە، بەڵام دیارە ئەمە زیانێکی زۆری بەدانیشتوانی ئەو سێ گوندە گەیاندووە بەتایبەت منداڵان بەهۆی بەد خۆراکی و بەرێ نەکردنیان لەگەڵ کاروانی نوێ ئێستای جیهان.

بەڵام وەك زیانە قازانجیشە، چونکە ئەو خێڵە توانیویانە خۆیان بەدوور لە ئاژاوە و ململانێ سیاسیەکان و ئەو هەموو کێشەیە بەدوور بگرن. " ئیمینی " سەرۆکی ئەو گوندانە دەڵێت : ئێمە هیچ جۆرە گرفتێکمان نییە و دڵنیاشین شتەکان لای خۆمان ئاسانتر و بەهای هەرزانترە وەك لەوەی شارەکان".

## ئۆزبەکستان

**ناوی باو:** ئۆزبەکستان

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئۆزبەکستان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Uzbekstan

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری / سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی باڵا ( ٢٥٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ١٧٢,٧٠٠ میل دووجا، ٤٤٧,٤٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٤,٠٠٠,٠٠٠ کەس (تا ساڵی ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥٧ کەس / کم٢

**نەتەوەکان:** ئۆزبەك، کازاخ، قیرغیز، تەتەر، ئۆکرانی، تورکومان، تاجیك، عەرەب. شایەنی باسە ئۆزبەکی سێهەم گەورەترین نەتەوەی نەژادی بوون لە یەکێتی سۆڤێتدا دوای ڕوس و ئۆکرانی و بەڕەچەڵەك دەچنەوە سەر نەتەوەی تورك.

**ئاین:** ٨٨٪ موسڵمان، مەسیح ( ئەرتۆدۆکسی ڕوسیا ).

**زمان:** ئۆزبەکی ( بەڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر زمانی تورکی )، ڕوسی.

**پایتەخت:** تەشقەند

**شارە سەرەکییەکان:** سەمەر قەند، نامانجان، ئەندیجۆن، بوخاری.

**دراو:** سووم

**ئاووهەوا:** کیشوەری، زستانێکی سارد و سەخت هەندێ جار دەچێتە ٣٧ پلەی ژێر سفری سەدی، ساڵانە بارانێکی زۆری تیا دەبارێ، هاوینی درێژ و وشکە و پلەی گەرما دەگاتە ٤٥ پلەی سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** لۆکە، هێلکە، ترێ، مەڕوماڵات، شیر، پەتاتە، برنج.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** ئامێری کشتوکاڵی

**سامانی کانزایی:** دروست کراوە کیمیاییەکان، دروستکراوەکانی خۆراك. دروستکراوەکانی خوری، کاغەز.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئۆزبەکستان بەمانای وڵاتی ئۆزبەك دێت، وڵاتێکی ئیسلامییە و دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسیا، لەنێوان هەردوو ڕوباری سیرادایا ( یان : سیحۆن ) و ئەواژۆدارایا ( یان : جیحۆن ).

لەگەڵ کازاخستانەوە لە باکوور و رۆژئاواوە سنووردارە، لەگەڵ کیرجستان و تاجیکستان لە رۆژهەڵاتەوە و لەگەڵ ئەفغانستان و تورکمانستان لە باشوورەوە. دەریای ئارال دەکەوێتە نێوانی و نێوان کازاخستان و ناوەڕاستی ئۆزبەکستان دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦٥ بەرەو رۆژهەڵات و هێڵی پانی ٤١ بەرەو باکوور.

زۆربەی خاکی ئۆزبەکستان لە دەشتی بیابانی پێك دێت، بیابانی ( قزلکم ) کە هیچ جۆرە نیشتەجێیەکی تیانییە، دەکەوێتە ناوەڕاستی وڵات. لۆکە لەو دەشتانە دەچێنرێت کە دەکەوێتە رۆژهەڵات و باشووری بیابانەکە. بەڵام چڕی دانیشتوان نیشتەجێ بووان دەکەوێتە دۆڵی فرغانەی رۆژهەڵاتی وڵات، و ئاویشیان لە شاخاکانی دەوروبەریەوە دەستگیر دەبێت.

هەزاران ساڵ لەمەوبەرەوە مرۆڤ لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بووە. ئەسکەندەری مەگدۆنی لە سەدەی چوارەمی پێش زایینیی داگیری کردووە. لەسەدەی شەشەمی زایینی هەندێ لەهۆزە تورکەکان چوونەتە ناو ئۆزبەکستانەوە، عەرەبە ئیسلامەکان بە سەرۆکایەتی قوتەیبەی کوڕی موسلیم لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا لەسەردەمی خەلیفەی ئەمەوی وەلیدی کوڕی عەبدولمەلیك ( ٨٦ ك، ٧٠٥ ز ) چوونەتە ناوی و ئاینی ئیسلامیان تیا راگەیاندووە.

لە سەردەمی وڵاتی عەباسیدا چەند وڵاتێکی ئیسلامی لەو ناوچەیەدا پێکهێنراوە و چەند زانایەکی ناوداری لە زۆربەی زانستەکاندا تیا هەڵکەوتووە. مەغۆلەکان بەسەرکردایەتی جەنگیز خان داگیریان کرد و لەسەدەی سیانزدەیەمی زایینیدا سەرکردەی مەغۆلی شاری سەمەرقەندی دامەزراند و کردییە پایتەختی گەورەترین ئیمپراتۆریەت لە ئاسیادا، ئیمرۆ شاری سەمەرقەند بەگەورەترین دووەم شاری ئۆزبەکستان دادەنرێ.

لە سەدەی شانزدەیەمی زانینی کۆمەڵێ هۆزی تورك بەناوی یوزباك ئەو ناوچەیەیان داگیر کرد و لە شارەکانی بوخاری و خوارزم و خۆقەند چەند حکومەتێکیان بەناوی ( خانە گەورە ) دامەزراند. لەسەدەی نۆزدەیەمدا روسەکان هەر سێ خانەکەیان تێکشکاند و خستیانە سەر ئیمپراتۆریەتی روسی.

پاش هەڵگیرسانی شۆڕشی پیشەسازی لە روسیا ( مانگی ١١ / ١٩١٧ ) بەچوار مانگ، واتا ١٩١٨ کۆماری تورکستانی سۆسیالیستی روسی دامەزراو ئۆزبەکستانیشی لەخۆ گرتبوو. لە کۆتاییەکانی ١٩٢٤ دا کۆماری تورکستان لەسەر بناغەگەری نەتەوەیی دابەشکرایەوە، لەبری کۆماری تورکستان هەردوو کۆماری تورکومانیا و کۆماری ئۆزبەکستان دامەزران، ئۆزبەکستان بووە کۆمارێکی سۆسیالیستی سۆڤێتی لە چوارچێوەی کۆمارە سۆسیالیستەکانی سۆڤێتدا.

لە بەرورای ٢٠ / ٦ / ١٩٩٠ ( دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت ) حکومەتی ئۆزبەکی

ـحسەڵاتی سەربەخۆی خۆی ڕاگەیاند و یاساكانی لە یاساكانی یەكێتی سۆڤێت جیاكردەوە.

لە بەرواری ٣١ / ٨ / ١٩٩١ دا، ئەنجومەنی باڵای سۆڤێتی سەر بە كۆماری ئۆزبەكستان سەربەخۆیی وڵاتەی ئۆزبەكستانی بەتەواوەتی لە یەكێتی سۆڤێت ڕاگەیاند و ڕۆژی ١ / ٩ / ١٩٩١ بەڕۆژی سەربەخۆیی كۆماری ئۆزبەكستان دانرا. لە بەرورای ١٧ / ٩ / ١٩٩١ دا بڕیارێكی كۆماری دەرچوو تیایدا تەواوی دەسەڵاتەكانی حیزبی شیوعی بەسەر دەزگاكانی حكومەتدا ڕەتكرایەوە و لە بەرواری ٢ / ٣ / ١٩٩٢ دا بوٚتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

لە بەرواری ٣٠ / ١٢ / ١٩٩١ دا ( ئیسلام كریمۆف ) لەبەدەست هێنانی پۆستی سەرۆكی كۆماری سەربەخۆی ئۆزبەكستان سەركەوتنی بەدەست هێنا، لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ دا سەر لەنوێ بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیكە لە پۆستی سەرۆكایەتی هەڵبژێردرایەوە. سەرۆك ئیسلام كریمۆف هەوڵی هاندانی ئاینی ئیسلام دەدات و كار بۆ پەیڕەو كردنی دەكات لەنێو نەوەكانی داهاتووشدا.

ئیسلام كریمۆف لەكاتێكدا دەسەڵاتی گرتە دەست باری كۆمەڵایەتی سیاسی وڵات لەوپەڕی ئاڵۆزیدا بوو و بەچەند تاقیكردنەوەیەكی سیاسی توندا تێدەپەڕی بەهۆی دیموكراسی لە فرە حیزبی و پتەو كردنی بنەما نەتەوەییەكان و هەوڵ دان بۆ زیندووكردنەوەی.

ئۆزبەكستان بەچەند قۆناغێكی خوێناوی دا تێپەڕبوو بەهۆی ئەو گرفتە نەتەوەیانەی لەلایەن چەند ڕەوتێكی سیاسییەوە دەهێنرایە ئاراوە. بەڵام ئێستا ئۆزبەكستان لەهەوڵی گەشە كردنی ئابووری و بایەخ دان بەبەرهەم هێنەرە بیابانەكان لەنێو وڵاتەكەیدایە و ناساندنی ناسنامەی ئۆزبەكی بە كەلتوورە جیا جیاكانی وڵاتی جیهان.

تێكڕای بەرهەمی نەتەوەیی: ٢١,١ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٦١ هەمین وڵات.

ئۆزبەكستان بە پلەی پێنجەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی لۆكە، پشتێكی زۆری بە ناردنی ئەو بەرهەمە بۆ دەرەوەی وڵات بەستووە. هەروەها بە پلەی هەشتەم دێت لە بەرهەمی ئاڵتون و پلەی نۆیەم لە گازدا.

## ئۆگەندا

**ناوی باو:** ئۆگەندا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئۆگەندا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**
Republic of Uganda

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٧٦ ئەندام )

**رووبەر :** ٩٣,٠٧٠ میل دووجا، ٢٤١,٤٠٠ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٠,٦٠٥,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٤,٥ کەس کم$^{2}$

**نەتەوەکان:** ئەفەریقی رەش، سەر بەچەند کۆمەڵە نەژادین گرنگترینیان : گاندا و تیسۆ.

**ئاین:** مەسیح ٥٠٪ ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ) موسڵمان ٤٠ ٪.

**زمان:** ئینگلیزی، سەواحیلی، بانتوویی.

**پایتەخت:** کەمپالا

**شارە سەرەکییەکان:** جینجا، مبالا، عەنتیبی

**دراو:** شلنی ئۆگەندی

**ئاووهەوا:** مام ناوەند، نێوەندی پلەکانی گەرما ١٦ پلە بۆ ٢٩ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی باران لە ساڵێکدا دەگاتە ١٠٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، قاوە، گەنمەشامی، سێوی بن ئەرز ( پەتاتەی شیرین )، چا، لۆکە، قامیشی شەکر، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** مس، ئاڵتون، کۆبالت، فۆسفات

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئۆگەندا وڵاتێکی ئیسلامییە و دەکەوێتە ناوەڕاستی رۆژهەڵاتی ئەفریقیا. لەگەڵ سوداندا لە باکوورەوە سنووردارە، لەگەڵ کینیا لە رۆژهەڵاتەوە، دەریاچەی ڤیکتۆریا دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی و رواندا دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای، کۆنگۆی دیموکراسی دەکەوێتە رۆژئاوای و دەریاچەی ئەلبێرت لە باکووری رۆژئاوای ئۆگەندا بەشێك لە سنوورەکانی نێوانی و نێوان کۆنگۆی دیموکراسی پێك دەهێنێت. هیچ کەنارێکی لەسەر دەریاکان نییە،

ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۳۳ بەرەو ڕۆژهەڵات و هێڵی پانی ۱ بەرەو باکوور.

زۆربەی خاکی ئۆگەندا لە تەپەیەکی بەرز پێك دێت کە بەرزیکە دەگاتە ۹۰۰ – ۱۸۰۰ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە. کۆمەڵێ دارستان دەکەونە باشووری ئەم تەپەیە و باکووریشی بە گژوگیای ساڤانا داپۆشراوە. باکووری رۆژهەڵاتی ئۆگەندا نیمچە بیابانیی و وشکە. هەندێ لە زنجیرە چیاکان دەکەوێتە سنووری رۆژهەڵاتی و رۆژئاواکانی، لەوانە زنجیرە چیای ڕونزوری لە باشووری رۆژئاوا. لە رۆژهەڵاتی بەرزاییەکانی رۆژئاوای ئۆگەندا ئەو بۆشاییە گەورەیەی رۆژهەڵاتی ئەفریقیایە کە کۆمەڵێك دەریاچەی تێدەکەوێت، لەوانە : دەریاچەی جۆرج، دەریاچەی ئێدوارد، دەریاچەی ئێلبێرت، دەریاچەی کیوجا. دەریاچەی ڤیکتۆریا ( کە رووباری نیلی لێوە هەڵدەقوڵێت ) دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئۆگەندا.

خەڵکی لە مێژەوە لەو ناوچەیە ژیاون و چەند شانشینێکیان لیێ دامەزراندووە لەوانە : شانشینی بۆگەندا کە ئەلگاندا دایمەزران، شانشینی ئۆنیۆر ولە دواییدا ناوی ولآتی ئۆگەندا لە یەکگرتنەوەی ئەو دوو شانشینەوە هاتە ئاراوە. بازرگانە عەرەبەکان لە ساڵی ۱۸۵۰ دا گەیشتوونەتە ئۆگەندا. لە ساڵی ۱۸٦۲ دا دۆزەرەوەکان لە بەریتانیاوە گەیشتنە ئەو وڵاتە. لە ساڵی ۱۸۹٤ دا بۆگەندا بووە پارێزراوەیەکی بەریتانیو لە ساڵی ۱۸۹٦ بۆگەندا لەگەڵ سێ شانشینی دیکەدا یەکیان گرتەوە و یەك پارێزراوەی بەریتانیان دامەزراند، بەریتانییەکان ناوی مرواری ئەفریقیایان لێنا، بەهۆی جوانی سروشتی ئەو ناوچەیە. لەساڵی ۱۹۲٦ دا سنوورەکانی بۆ دیاری کرا کە ئۆگەندای ئێستایە.

لە پەنجاکانی سەدەی بیستدا چەند بزوتنەوەیەك لە ئۆگەندا پەیدا بوو بە سەربەخۆ بوونی ئەو وڵاتە و لە ۹ / ۱۰ / ۱۹٦۲ دا کۆتایی هات و لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە ساڵی ۱۹٦۷ دا دەستوورێکی نوێ لە ئۆگەندا راگەیەنرا و بەپێی ئەو دەستوورە ئۆگەندا بوو کۆمار و شانشینیەکان رەت کرانەوە و لەوانە شانشینی بۆگەندا. لەراستیدا ئێستاش ئەو شانشینیانە ماون بەڵام رۆڵێکی ئەوتۆیان نییە و چالاکییەکانیان تەنها لە سەر ئاستی کەلتووری و خێڵەکییە و هیچ دەسەڵاتێکی یاسایی وەك پەرلەمان و دادگایان نەما وەك لەوەو پێش تا ساڵی ۱۹٦۷ ئەو مافانەیان هەبوو. لەو شانشینانە شانشینی بۆگەندا کە شاکەیان ( رۆناڵد موتیبی ) لەهاوینی ۱۹۹۹ دا فەرمانبەرێکی بەریتانی خواست و ئاهەنگێکی زۆر شایستەی بۆ گێردرا بەهەزارەها کەس بەشداری تیاکرد و ئاهەنگەکە لە کادترائیەی ئەنگلیکانی لە کەمبالا بەڕێوەچوو. هەروەها شانشینی تۆرۆ کە دەکەوێتە

رۆژئاوای وڵات و نزیکەی ٣٢٠ کم لە کەمبالای پایتەختەوە دوورە، ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی ملیۆنێك سەرنشین دەبێت زۆربەیان مەسیحن، ئەو شانشینە لە ٣٠ شار زیاتر وچەند گوندێك پێکدێت، شانشینی تۆرۆ لەسەر دەستی شا کابۆیا ی یەکەمەوە لە سەرەتاکانی سەدەی هەژدەهەمەوە دامەزراوە پاش شەڕێکی توند لەنێوانیان و لەنێوان شانشینەکانی دراوسێیدا بەتایبەتی شانشینی باگەندای گەورە شانشینە ئۆگەندییەکان.

شای ئێستایان : شا ئۆیۆی چوارەم یان ئەمۆکاما ئۆیۆ بەپێ زمانی گەلی تۆرۆ. شا ئۆیۆی چوارەم لە ساڵی ١٩٩٢ دا لەدایك بووە و لەساڵی ١٩٩٤ دا شا کابۆیای باوکی کۆچی دوایی کردووە و لەساڵی ١٩٩٦ دا کرایە شا. لە ١٧ / ٧ / ٢٠٠١ دا سەرۆکی لیبی موعەمەر ئەلقەزافی سەردانی کرد بۆ بەشداری کردنی لەئاهەنگی یادی بە پاشا بوونی و لەسەردانەکەیدا بەڵێنی پێدا کە هەوڵەکانی بخاتە گەڕ بۆ گەشە پێدانی شانشینەکەی و بیانتانەوەی تەلاری پادشایی، هەروەها قەزافی داوای لەسەرۆکی ئۆگەندی یوری مۆسیفینی کرد کە پشتیوانی تەواوی شانشینی تۆرۆ بکات.

پاش سەربەخۆ بوون، ئۆگەندا دووچاری چەند گرفتێکی سیاسی بووەوە لەسەر دەسەڵات، پۆستی سەرۆکایەتی چەند جارێك ئاڵوگۆڕ کرا تا ساڵی ١٩٨٦ درایە دەست یوری مۆسیفینی پاش ئەوەی سەرۆکایەتی بزوتنەوەیەکی ئۆپۆزسیۆنی دەکرد.

ئۆگەندا لەگەڵ تەنزانیای دراوسێیدا دووچاری شەڕێك بوون لەسەر کێشە سنووریەکان بە تێکشکاندنی سوپای ئۆگەندی و روخانی حکومەتی سەرۆك عیدی ئەمین کە لە ساڵی ١٩٧١ بوو بوو بەسەرۆك کۆتایی هات.

لە بەرورای ١٧ / ٣ / ٢٠٠٠ دا نزیکەی ١٠٠٠ کەس لە یەکێ لە تایەفە مەسیحیەکان خۆکوژییەکی بەکۆمەڵیان بەئەنجام گەیاند بە پێی ئامۆژگاری سەرۆکی ئەو تایەفەیە. ئەم رووداوە ترسناکە لە شارۆچکەی کانۆنگۆ رووی دا، تانۆنگۆ سەنتەرێکی بازرگانیە و نزیکەی ٣٢٠ کم لە باشووری رۆژئاوای کامبالای پایتەختەوە دوورە. سەرۆکی وڵات بەتوندی دژ بەم کارە وەستاو، وتی : وڵاتەکەمان رێز لە مافی بیروباوەڕ دەگرێت، بەڵام هەرگیز رێگە بە جۆرە رووداوانە نادات.

سروودی نیشتیمانی ئۆگەندا: ئۆگەندا، خوایە پشتیوانی لێبکە..

ئۆگەندا بەیەکێ لەوڵاتە هەژارەکان دادەنرێ، کشتوکاڵی سەرەکیترین داهاتێتی و پیشەسازی لەو وڵاتەدا تەنها لەسەر دروست کراوە خۆراکییەکان ماوەتەوە. جگە لەوەی سەرچاوەکانی ووزە لەو وڵاتەدا نییە، بەڵام وێستەگانی کارەبا لە تاڤگەکانی ئۆوینەوە ئەم ئەرکەی لەخۆ گرتووە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣،٧ ملیار دۆلاری ئەمریکیە.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١١٢ هەمین وڵاتە

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك : ٢٠٠ دۆلاری ئەمریکیە.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨٠ هەمین وڵات.

ئۆگەندا بە پلەی هەشتەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی قاوە و داهاتێکی باشیشی لێوە دەستگیر دەبێت.

لەم ساڵانەی دواییدا، بزوتنەوەیەك لە باکووری ئۆگەندا بەناوی : سوپای خواوەند بۆ بەرگری پەیدا بوو بەسەرۆکایەتی قەشە جۆزێف کونی، ئاخی بوانی ئەم بزوتنەوەیە لە مەڵبەندەکانیان لە باکوور و لە باشووری سودانەوە چەند هێرشێکیان کردۆتە سەر سوپای حکومەتی ئۆگەندا ولە ئاکامی ئەو هێرشانە زیانێکی گیانی و بریندارێکی زۆر لەهەردوو لا کەوتۆتەوە. ئەمەش کێشەیەکی گەورەی لەنێوان-سودان و حکومەتی ئۆگەندا دروست کرد، هەردوولا یەکتر بەوە تۆمەتبار دەکەن کە پشتیوانی لە ئۆپۆزسیۆنەکانی دی دەکەن. لە ساڵی ٢٠٠١ پاش رێکەوتنێك لە نێوان حکومەتی سودان و ئۆگەندا رێکەوتن لەسەر ئەوەی سوپای ئۆگەندا بۆی هەبێت هێرش بکاتە سەر یاخیبوان لە باشووری سودانەوە، هەردوولا یارمەتی پێشکەشی ئۆپۆزسیۆنینەکانی یەکتر نەدەن.

ئەم بزوتنەوەیە هەوڵی خستنی حکومەتی ئۆگەندا دەدات و حکومەتێك لە ١٠ راسپاردەکەی ئینجیل پێك بهێنێ. لە بەرورای ٢٥ / ٨ / ٢٠٠٢ دا بزوتنەوەی ناوبراو ئاگر بەستی راگەیاند بەمەرجێ لەگەڵ حکومەتدا بکەونە دانوستان و گفتوگۆکردن.

## ئۆکرانیا

**ناوی باو:** ئۆکرانیا

**ناوی فەرمی:** ئۆکرانیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Ukraine

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی باڵا ( ٤٥٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ٢٣٣,١٠٠ میل دووجا، ٦٠٣,٧٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥٤,٠٠٠,٠٠٠ ( تا ساڵی ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٨٥ کەس/ کم٢

**نەتەوەکان:** ئۆکرانی، ڕوس، ڕوسی سپی، مۆلداڤ، تەتەرز

**ئاین:** مەسیح ( ئەرتۆدۆکسی ئۆکرانیا، کاسۆلیك ئۆکرانیا )، جولەکە، موسڵمان ( نزیکەی دوو ملیۆن کەس )

**زمان:** ئۆکرانی

**پایتەخت:** کییف

**شارە سەرەکییەکان:** خارکۆف، دنێبروبترۆفیسك، دونیتسك، ئۆدیسا، زاپارۆجیا.

**دراو:** هریفنیا

**ئاووهەوا:** زستانی ساردە، ناوەندی پلەکانی گەرما ٥ پلەی سەدی لەژێر سفر، هاوین مامناوەند و پلەی گەرما دەگاتە ٢١ پلەی سەدی، ڕێژەی بارینی بەفر و باران لە باکووردا دەگاتە ٧٥ سم و لە باشووردا ٢٥ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، جۆ، گەنمەشامی، تووتن، مەڕوماڵات، بەراز، پەتاتە.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** ئامێرِ کشتوکاڵی، پەین، دروستکراوە خۆراکییەکان، دروستکراوە کیمیاییەکان، دروست کردنی کەشتی، ووزەی ئاتۆمی.

**سامانی کانزایی:** خەڵوزی بەردی، گازی سروشتی، ئاسن، مەنگەنیز، جیوە، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئۆکرانیا وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، بەدووهەم وڵات دادەنرێ لەگەورەیی ڕووبەردا دوای ڕوسیا، لەگەڵ ڕوسیای سپی لە باکوورەوە سنووردارە و لەگەڵ ڕوسیا لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا، دەریای ئازۆف دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی و دەریای ڕەش دەکەوێتە باشووری، مۆلدۆڤا و ڕۆمانیا دەکەونە باشووری ڕۆژئاوای و هەنگاریا و سلۆڤاکیا پۆڵەندا دەکەونە ڕۆژئاوای، بەناوەڕاستیدا یەکێری هێڵی درێژی ٣٠ بەرەو ڕۆژهەلات و هێڵی پانی ٤٩ بەرەو باکوور. زۆربەی زەوییەکانی ئۆکرانیا لە دەشتی تەخت

پێك دێت، زەویەکەشی لە خۆڵێکی رەشی بەپیت پێك هاتووە کە لەبارە بۆ کشتوکاڵی و چاندنی دانەوێڵە، زنجیرە چیای کاربات دەکەوێتە رۆژئاوای ئۆکرانیا.

میلەتە سلاڤیەکان بەر لە دووهەزارساڵ لەمەوبەر لە ئۆکرانیادا ژیاون و مێژووی پایتەختی کییف دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەشتەمی زایینی، واتا بەر لە دامەزراندنی مۆسکۆ بە چوارسەت ساڵ، شاری کییڤیش بەیەکێ لە کۆنترین و گەورەتری شارە سلاڤییەکان دادەنرێت، جگە لەوەی بەشاری دایك دادەنرێ لە ئۆکرانیا و ئیمپراتۆرییەتی روسی. ئاینی مەسیح لە شاری کییڤەوە تەشەنەی کردوە بۆ ئیمپراتۆریەتی روسیا، کاتێ میر فلادیمێر بەهۆی هەڵمەتە تەبشیریەکانی بیزەنتینیەکانەوە لە کۆستەنتەنیەوە بەرەو ئەوێ بەرێ کەوت لە ساڵی ٩٨٨ ی زایینیدا. بەهۆی دەوڵەمەندی شاری کییڤەوە بەردەوام لەلایەن نەتەوەکانی کەوە چاوی تێبڕاوە، مەغۆلیەکان لە ساڵی ١٢٤٠ داگیریان کردووە، ئەمەش مۆسکۆی کردوە سەنتەری قورسایی لە جیهانی سلاڤیدا.

پاش ئەوەی مەغۆلیەکان بەرەو رۆژهەلات کشانەوە، لیتوانیەکان لە ساڵی ١٣٩٢ دا ئۆکرانیایان داگیرکرد، کاتێ لیتوانی و پۆڵەندییەکان یەکیان گرت لە ساڵی ١٥٦٩، پۆڵەندیەکان ئۆکرانیایان داگیر کرد و نەتەوەکەیان کردە کۆیلەی خۆیان. بەلام ئۆکرانیەکان لەلایەن خۆیانەوە لێیان هەڵسان و یەکیان گرت و لەوەدوا بەناوی قۆزاقیەکانەوە ناسران و لەناوچە سنووریەکاندا ژیانێکی سەختیان بردە سەر، تەنها بەناو دانیان بەپاشای پۆلۆنیادا دەنا و لەناخی خۆیاندا هیچ بایەخێکی بۆ دانەنابوو. لەساڵی ١٦٠٠ دا یەسوعییە پۆڵۆنیەکان ئاینی کاسۆلیکیان بەزۆر بەسەر پۆڵۆنیەکاندا سەپاند، تا ئەو کاتەی قۆزاقیەکان توانیان پۆڵۆنیەکان لەو بەشەی وڵاتەکەیان دەرکەن لە ساڵی ١٦٤٨ دا ( ئەم رووداوانە رق وکینەیەکی تایبەتیان لەلای روس و ئۆکرانیەکان دژی یەسوعیەکان دروست کرد ).

لەبەر ئەوەی قۆزاقیەکان لاواز بوون لەوەی کەبتوانن خۆیان حوکمی خۆیان بکەن، بۆیە لە ساڵی ١٦٥٤ دا داوای راسپاردەیی روسیان لە مۆسکۆ کرد، بەلام دیارە لەم باوەڕ پێکردنە هەڵە بوون، چونکە مۆسکۆ لەو کاتەوە دەستی کرد بەگەر خستنی ئۆکرانیەکان و ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی رق کینەی ئۆکرانیەکان لەخودی روسەکانی هاورێشیانە لەو سەردەمەوە تا ئێستاش.

بەهەڵهاتنی ساڵی ١٧٩٥ تەواوی خاکە ئۆکرانیەکان کەوتە بەردەستی روسەکان و ئەم بارودۆخە تا ساڵی ١٩١٧ ی خایاند، واتا تا ئەو کاتەی شۆڕشی شیوعیەکان هەڵگیرسا. دەسەلاتی شیوعی بەسەر ئۆکرانیادا باڵی کێشا و لە بەرواری ٣٠ / ١٢ / ١٩٢٢ بەدواوە ئۆکرانیا بووە کۆمارێکی فیدالی لە چوارچێوەی یەکێتی سۆڤێتدا، یەکێ بوو لەو چوار کۆمارە سەرەکییەی یەکێتی سۆڤێتیان دامەزراند بەناوی : کۆماری ئۆکرانیای سۆسیالیستی

سۆڤێتی.

لە ساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

پاش کارەساتە ئۆتۆمیەکەی تشرنۆبلْ و خستنەوەی ئەو هەموو کارەساتە لە نزیك شاری کییڤ لە ٢٦ / ٤ / ١٩٨٦ حوکمی سۆڤێتی دووچاری فشارێکی زۆر بووەوە لە ئەنجامدا پەرلەمانی ئۆکرانی بڕیاری دا لە ١٦ / ٧ / ١٩٩٠ کە یاساکانی چیتر لەگەلْ یاساکانی یەکێتی سۆڤێتدا پەیڕەو ناکرێ و لەدوای ڕمانی یەکێتی سۆڤێت لە ساڵی ١٩٩١، ئۆکرانیا سەربەخۆیی خۆی لە ٢٤ / ٨ / ١٩٩١ لە سۆڤێت ڕاگەیاند و لە هەمان ساڵدا پەیوەندی کرد بە کۆمنۆلتی نەتەوە سەربەخۆکان.

ﭺ قەیسەڕی بن یاخود سۆڤێت و بەو پێیەی ڕوسەکان ئۆکرانیا بە بەشێکی خاکی خۆیان دەزانن ژمارەیەکی زۆر لە ڕوسەکان ئێستاش دان بە ئۆکرانیا نانێن.

پاش سەربەخۆیی ئۆکرانیا لیۆنید کرافتشۆك یەکەم سەرۆکی وڵات بوو، پاش ئەو لیۆنید کۆتشیما لە ساڵی ١٩٩٤ و لە ساڵی ١٩٩٩ دا سەرلەنوێ هەڵبژێردرایەوە بووەوە بەسەرۆکی وڵات.

ئۆکرانیا بەناوی ڕوسیای بچوك ناسرابوو، پاشان ناوی ئۆکرانیایان لێنا بەواتای سنوور یان دەروازە، بەوپێیەی کە دەروازەی ڕوسیای گەورەیە.

ئۆکرانیا وڵاتێکی پیشەسازی و کشتوکاڵی دەوڵەمەند و گەورەیە، بەڵام ڕەت کردنەوەی بۆ سیاسەت و مل کەچ نەکردنی بۆ وڵاتە دراوسێ گەورەکەی : ڕوسیا کە ژێرخانی ئابووری زۆر لە ژێرخانی ئابووری ئۆکرانیا دەچێ.دووچاری کێشەی زۆر گەورەی کرد.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٨٠,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٣٤ هەمین وڵات

ناوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٥٧٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩٣

ئۆکرانیا بە پلەی سێهەمی هەموو جیهان دێت لەبەرهەمی ئاسن و بەپلەی چوارەم لە بەرهەمی پەتاتە و پێنجەم لەبەرهەمی جۆ و حەوتەم لە بەرهەمی گەنم و هەشتەم لەبەرهەمی خەڵووز و پلەی نۆیەم لە بەخێوکردن و بەرهەمی بەراز، پلەی دەیەم لە مانگا و پلەی بیستەم لە گازدا.

سروودی نیشتیمانی: ئۆکرانیا هێشتا بەپێوەیە

جەژنی نیشتیمانی: ٢٤ / ٨ ی هەموو ساڵێ، ڕۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٩١، لەم بۆنەیەدا نمایشێکی سەربازی بە بەشداری یەکە سەربازیە چەکدارەکان بەهەموو کەرتەکانییەوە.

## ئێران

ناوی باو: ئێران

ناوی فەرمی: کۆماری ئیسلامی ئێران

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Islamic Republic of Iran

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار سەرۆکی حکومەتە.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی ئیسلامی ( ٢٩٠ ئەندام )

ڕووبەر : ٦٣٢,٤٥٧ میل دووجا، ١,٦٣٨,٠٥٧ کم²

ژمارەی دانیشتوان: ٧٠,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠١ )

چڕی دانیشتوان: ٤٠ کەس / کم²

نەتەوەکان: فارس، ئازەر، کورد، بلوچ، تورکمان، عەرەب، ئەرمەن، ئاشووری.

ئاین: موسڵمان ( ٩٦ ٪ )، بەهائی، مەسیح، جولەکە، زەردەشتی.

زمان: فارسی

پایتەخت: تاران

شارە سەرەکییەکان: مەشهەد، ئەسفەهان، تەبرێز، شیراز، ئەهواز، قوم.

دراو: تمەن

ئاووهەوا: زۆر سارد لە زستاندا، لەهاویندا مامناوەند لە ناوچە شاخاویەکانی باکووری ڕۆژهەڵات، گەرم و شێدارە لە دەشتەکانی خوزستان ( ٣٥ پلەی سەدی )، بانی ناوخۆ زستانی وشك و ساردە هاوینی گەرمە. کەناری قەزوین مام ناوەندە و ساڵانە ١٠٠ سم بارانی لێدەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: گەنم، چەوەندەری شەکر، برنج، جۆ، بستە، ڕاوەماسی، بەخێوکردنی مەڕومالات، چا، خاویار.

بەرهەمە پیشە سازییەکان: دروستکراوە نەوتییەکان، دروست کراوەکانی خووری، ئۆتۆمبێل و ئامێر، فەرشی دەستکرد، دروستکراوەکانی خۆراك، کەلوپەلی بیناسازی.

سامانی کانزایی: نەوت، زنك، ئاسن، خەڵوزی بەردین، قورقوشم، مس، تۆتیا، گاز، گۆگرد، مەنگەنیز.

تێڕوانینێکی گشتی :

ئێران وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا، هەر یەك لە ئەرمینیا و

ئازەربێجـان و دەریـای قـەزوین و تورکمانـستان دەکەونـە بـاکووری، ئەفغانـستان و پاکـستان دەکەونە رۆژهەڵاتی، دەریای عەرەب و کەنداوی عـەرەب دەکەونـە باشـووری، عیراق و تورکیـا دەکەونە رۆژئاوای. ناوەراستی ئێران دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژ ٥٥ بەرەو رۆژهـەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٣ بەرەو باکوور.

نیوەی رووبـەری ئێران بە تەپەیەکی نـاوخۆدا داپۆشـراوە و هـەر یـەك لـە بیابـانی لـووت و بیابـانی خوێیـاوی گـەورەی زۆر وشـك دەکەونـە ئـەو ناوچـەیە. چیاکانی ئـەلبرز دەکەونـە سنووورە باکووریـەکانی و چیاکانی زاگرۆسـیش دەکەونـە سـەر سنوورەکانی نێـوان ئێـران و عێـراق و تورکیـا، هـەروەها زنجیرەیـەك چـیای نـزمیش دەکەونـە سـەر سـنوورەکانی ئێـران بەدرێـژایی کەنـداوی عومـان. زۆربـەی زەوییـە کشتوکاڵیەکانیـشی دەکەونـە سـەر کـەناری دەریـای قـەزوین، دەشـتی خۆزسـتان کـە بەناوچـەیەکی بـەپیت و گـرنگ دادەنـرێ دەکەوێتـە باکووری رۆژئاوای ئێران، جگە لەوەی ئەوناوچەیە بە سەرچاوەیەکی گرنگی نەوت دادەنرێ.

ئێران وڵاتێکی کۆنە و مێژووی دەگەرێتەوە بۆ شەش هەزار ساڵ لەمەوبەر شانشینی عیلام لە ساڵی ٤٠٠٠ پ. ز دا لەو ناوچەیە بووە. لەهەزاری دووەمـی پێش زایینی فارسـەکان ( کە بەرچەڵەك لە نەتەوە ئاریەکانن ) لەبەشی باشووری رۆژئاوای ئێراندا نیشتەجێ بوون. بـەڵام میدییـەکان ( ئـەوانیش هـەر لـە نەتـەوە ئارییـەکانن ) لـە هـەزاری پێش زایـینی دا لـە بەشـی بـاکووری رۆژئـاوادا نیـشتەجێ بـوون، لەناوەراسـتی سـەدەی شەشـەمی پ.ز رووبـەرووی ئاشـورییەکان بونەتـەوە، فارسـەکان بەسـەر میدییـەکان سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـاوە و ئیمپراتۆریـەتێکی بەرفراوانیان پێك هێنـاوە تاکـەوتنی لـە سـاڵی ٣٣١ پ. ز لەسـەر دەسـتی ئەسـکەندەری مەگـەدۆنی کۆتـایی هـاتووە. لـە سـاڵی ٢٢٦ دا ئیمپراتۆریـەتی ساسـانی دەسەڵاتی گرتۆتـە دەسـت، کـە عەرەبـەکان پێیـان دەوت وڵاتـی ئەکاسـیرە و بەهـەر پاشـایەکی ئەو وڵاتەیان دەوت کیسرا. عەرەبە ئیسلامەکان لـە سـەردەمی عومـەری کـوڕی خـەتاب سـاڵی ١٣ ك- ٦٣٣ ز واڵیـان کـردووە و لەسـاڵی ١٩ ك-٦٣٩ لەسـەردەمی خەلیفـەی ئیـسلام عوسمانی کوڕی عەفان، لەشەڕی نەهاوەنددا وڵاتی ساسانییان لەناو برد، ئاینی ئیسلام لـەو ناوچـەیەدا بەتـەواوەتی پـەرەی سـەندووە و لـە سـەردەمی ئەمـەویی و عەباسـیەکاندا گەشـە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە. جەنگیز خان لەساڵی ١٢٢٠ دا هێرشی کردۆتە سەر و داگیری کـردووە، سـەفەوییەکان لـە ١٥٠١ – ١٧٣٦ حوکمیـان کـردووە، خێزانـی قاجـار لـە ١٧٩٤ – ١٩٢٥ دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست و لەپاش ئەوان خێزانی پەهلەوی ١٩٢٥ – ١٩٧٩ حوکمیـان کـردووە و یەکـەم حـاکمیش رەزا شـای پەهلـەوی بـووە ١٩٢٥ – ١٩٤١، دوای ئـەو محەمەد رەزا پەهلەوی دەسەلاتی گرتۆتـە دەست ١٩٤١ – ١٩٧٩، ئێران لـە ساڵ ١٩٤٥ بۆتـە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە بەرواری ١٨ / ١ / ١٩٧٩ شای ئێران پاش ئەو شۆڕشەی ئایەت و الله خومەینیی سەرکردەی شۆڕشی ئیسلامی لە تاراوگەوە لە فەرەنسا لەئێراندا هەڵیگرسان، ئێرانی بەجێ هێشت و لە ٢٦ / ٧ / ١٩٩٠ لە قاهیرەی پایتەختی میسر کۆچی دوایی کرد.

لە ١ / ٢ / ١٩٧٩ خومەینی لە فەرەنساوە گەڕایەوە ئێران و لە بەرواری ٣١ / ٣ / ١٩٧٩ پاش دەنگدانێکی جەماوەری لە ئێراندا بەزۆرینەی دەنگ لە ١ / ٤ / ١٩٧٩ ئێران کرایە کۆماری ئیسلامی.

لە ٢٨ / ١ / ١٩٨٠ ( ئەبا ئەلحەسەن بەنی سەدر ) بەیەکەم سەرۆك کۆماری ئێران هەڵبژێردرا، لە بەرواری ٢٤ / ٧ / ١٩٨١ دا ( محەمەد عەلی رەجائی ) کرایە سەرۆکی ئێران، لە بەرورای ٢ / ١٠ / ١٩٨١ عەلی خامەنەئی کرایە سەرۆکی کۆمار، لە بەرواری ٢٨ / ٧ / ١٩٨٨ عەلی ئەکبەر هاشمی رەفسەنجانی کرایە سەرۆکی کۆمار، لە بەرواری ٢٣ / ٥ / ١٩٩٧ محەمەد خاتەمی کرایە سەرۆکی کۆمار بۆ ماوەی چوار ساڵ، لەو ماوەیەدا خاتەمی کۆمەڵێ چاکسازی لە ئێراندا بە ئەنجام گەیاند ئەمەش دووچاری رەخنەیەکی زۆری کردەوە لە لایەن پارێزگارەکانەوە، لە ٨ / ٦ /٢٠٠١ دا بۆ چوار ساڵی دیکە خاتەمی هەڵبژێردرایەوە پاش ئەوەی لەهەڵبژاردنە گشتیەکاندا بەکۆی ٧٧٪ ی سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا و ئەمەش سەرکەوتنێکی گەورە بۆ چاکسازی خوازەکانی ئێرانی تۆمار کرد.

لە ٨ / ٨ / ٢٠٠١ دا سەرۆك خاتەمی سوێندی دەستووری خوارد و بەڵێنی گەشە کردنێکی بەرفراوانی بە ئێرانیەکان دا و داوای لە نەیارە پارێزگارەکان کرد کە چیتر پەیڕەوی توندرەوی لە ئاین دا نەکەن و ئەوەشی بۆ روون کردنەوە کە توندرەوی لەئاین دا بە عەلمانێت کۆتایی دێت.

لە ٣ / ٦ / ١٩٨٩ رێبەری کۆماری ئیسلامی ئێران ئایەت والله خومەنی کۆچی دوایی کرد، گەورە کاربەدەستانی ئاینی ئێران عەلی خامەنەئیان بە رێبەری روحی باڵای کۆماری ئیسلامی ئێران هەڵبژارد.

جەنگی کەنداو لە نێوان ئێران و عێراقدا لە ساڵی ١٩٨٠ – ١٩٨٨ بەهۆی دەسەڵات گرتن بەسەر کەنداوی عەرەب بەرپا بوو، لە جەنگی دووەمی کەنداوی عەرەب ١٩٩٠ – ١٩٩١ ئێران بێلایەنی بۆ خۆی هەڵبژارد کاتێ عێراق هێرشی کردە سەر کوێت و داگیری کرد.

لە بەرواری ٣٠ / ١١ / ١٩٧١ دا، بەر لەیەك رۆژ لەکۆتایی هاتنی پارێزگاری بەریتانی لە ئیماراتی عەرەبی ( ١ / ١٢ / ١٩٧١ ) و پێش دوو رۆژ لە دامەزراندنی یەکێتی ئیماراتی یەکگرتووی عەرەبی، ئێران سێ دورگەی ئیماراتی لە کەنداوی عەرەب داگیر کرد : تەنەبی گەورە، تەنەبی بچوك، ئەبوو موسا. ئیمارات داوای کۆتایی هێنانێکی ئاشتیانە دەکات لە داگیر کردنی ئەو سێ دورگەیە، ئەویش بەدانیشتن لەسەر مێزگەردی دانوستان و

گفتوگۆکردن لەسەر ئەو کێشەیە، ئەگەر نا ئەوا ئیمارات ناچار دەبێ کێشەکەی رەوانەی دادگای نێودەوڵەتی بکات، بەلام ئێران هەرگیز وەڵامی ئەوەی نەداوەتەوە.

لە ساڵی ١٩٠٨ دا نەوت لە ئێران دۆزراوەتەوە و کۆمپانیای نەوتی ئینگلیزی فارسی هەستاوە بە پاڵاوتن و دەرهێنانی، دواتر ئەو کۆمپانیایە بووە بە کۆمپانیای نەوتی بەریتانی، لە ساڵی ١٩٥٥ دا ئێران توانیویەتی سەربەخۆیی لە دەرهێنانی نەوت بەدەست بهێنێ. بەوهۆیەوە توانیویەتی باری ئابووری خۆی پێش بخات و بەرهەمی نیشتیمانی چەند جارێك دوو هێندە بووە، ئیمڕۆ ئێران بە یەکێك لەولاتە سەرەکییەکانی بەرهەمی نەوت دادەنرێت. لە کۆتاییەکانی ١٩٩٩ دا ئێران رایگەیاند کە سەرچاوەیەکی زەبەلاحی نوێی نەوتی لە هەرێمی خۆزستان دۆزیوەتەوە، رایگەیاند کە ئەو سەرچاوەیە ئامادەیی لە بەرهەمهێنانی ٤٠٠ هەزار بەرمیل نەوتی هەیە لە رۆژێکدا، رووبەری ئەو کێڵگە نەوتییە ٥٢٠ کم دووجا دەبێت و ئەمە بە گەورەترین کێلگە دادەنرێت لە ئێراندا بەدرێژایی ٣٥ ساڵ دۆزیبێتیەوە. ئێران ناوی ئازادیجان ( واتا : ئازادان )ی لەو کێڵگەیە ناوە، وەك ئاماژە پێدانێك بۆ ئەو دیلە ئێرانیاینەی کە گەڕانەوە بۆ ئێران پاش جەنگی ئێران – عێراق ( ١٩٨٠ – ١٩٨٨ ).

لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ئێران دووچاری وشکە ساڵیەك بووەوە زیانێکی زۆری بە زەوییە کشتوکاڵیەکان گەیاند. هەروەها لە هاوینی ٢٠٠١ دا ناوچەکانی باکووری رۆژهەلات دووچاری لافاوێکی توند بوو بەسەدان کوژراو بریندارى لێکەوتەوە. لە بەرواری ٢٢ / ٦ / ٢٠٠٢ دا بوومەلەرزەیەك بەگوڕی ٦ پلە بەپێوەری رێختەر لە ناوچە باکووریەکانی رۆژئاوای ئێرانی دا و نزیکەی ٢٥٠٠ کوژرا و بریندار قوربانی لێکەوتەوە و چەند گوندێکی بە تەواوی وێران کرد، بوومەلەرزەکە هێندە بەهێز بوو تەواوی دانیشتوانی تاران هەستیان پێکرد، شایەنی باسە ئەو بوومەلەرزەیە یادی ئەو دوانزە ساڵەی بەر لەو بەرواری خستەوە یاد ئێرانیەکان کە لەرێك لەهەمان رۆژی ٢٢ / ٦ / ١٩٩٠ لە ئێرانی دا و نزیکەی چل هەزاری قوربانی لێکەوتەوە.

ئەو هۆزانەی بەرەو بەرزاییەکانی ئێران بەرێ کەوتن لە نزیکەی ٦٠٠٠ ساڵ لەوەو پێش بەخۆیانیان دەوت : ( ئاییری ) واتە ئازا و نەبەرد، بۆیە بەو ولاتەیان دەوت ئاییرین و لەوەشەوە وشەی ئێران لە ساڵی ١٠٠٠ پ. ز ەوە هاتووە، ساسانییەکانیش بەولاتەکەیان دەوت ئێرانشەهر.

بەلام وشەی فارس یان ولاتی فارس لە ناوی یەکێ لەو هۆزە ئارییە ئێرانیانەوە هاتووە کە نزیکەی ٩٠٠ ساڵ پ. ز هاتوونەتە ئێران، ئەو هۆزە بە سەرکردایەتی کۆرشی گەورە توانیویانە ولاتی میدییەکان لەناو بەرن و لە ساڵی ٥٥٠ پ. ز ولاتی فارسی دامەزرێنن.

بەڵام ئەوانەی بە ئێرانیان دەوت وڵاتی فارس یۆنانییەکان بوون، پاشان ئەورووپییەکان و پاش ئەوان عەرەبەکان.

عەرەبەکان بە ئێرانیـان وتـووە وڵاتـی عەجـەم، بـە دانیشتوانەکانیان دەوت عەجەمی، واتـا نهێن پۆشەکان، دیارە ئێرانیەکان ئەم ناوەیـان پێـناخۆش نـەبووە چونکە خۆشیان بەکاریان هێناوە.

لە ساڵی ١٩٣٥ دا ئێران داوای لـە تـەواوی وڵاتـانی جیهان کرد بـە ئێـران نـاوی ببـەن تـاکو تەواوی ناوەکان لەو ناوەدا یەکبگرنەوە.

ئێران بە وڵاتی کشتوکاڵی پلە یەك دادەنرێ لەگەڵ ئەوەی کە ٤٥٪ ی هێزی کار لەو بوارەدا کار دەکەن. هۆی دواکەوتنی کەرتی کشتوکاڵی لەو وڵاتەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ جـۆری خاکـەکەی و کـەمی ئـەو زەویانـەی کـەبۆ کـشتوکاڵی لـەبارن ( ١٠٪ ی رووبـەری ئێـران ) دەبێـت. هـەر ئەمەشە زیان بەکشتوکاڵی دەگەیەنێ لەکاتی لافاو یـاخود کـەمی رێـژەی باران لـەنێوان چـەند ساڵ جارێکدا.

بەڵام پیشەسازی بایەخێکی زۆری پێدراوە و پلانی گەشـە کـردن و بـرەو دانێکـی باشـی بـۆ تەرخان کرا و پشتیان لـەم بـوارەدا بـە سـەرچاوە کانزاییـە گرنگـەکان بەسـت جگـە لـە داهاتـە نەوتیەکان و کڕینی ئامێر وکەلوپەلی پێویست لە دەرەوەی وڵاتەوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٢٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٢٩ هەمین وڵات.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,٠٦٨ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٨١ هەمین وڵات.

ئێـران بـە پلـەی دووەم دێـت لـەنێو وڵاتـانی جیهانـدا لـە یـەدەگی گـازی سروشـتی ( دوای روسـیا )، برەکەشـی دەگاتـە ٢٦ ترلیـۆن مـەتر دووجـا و بـە پلـەی پێنجـەم دێـت لـە یـەدەگی پیترۆڵ و برەکەی ٨٧,٧ ملیار بەرمیل دەبێت واتا رێژەی ٨,٤٪ لە یـەدەگی هـەموو جیهـان و بەپلەی پێنجەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەخێوکردنی مـەڕومالات و بە پلـەی پاندەیەم دێت لە بەرهەمی چا و پلەی دوانزدەیەم دێت لە بەرهەمی گاز و جۆ و پلەی چواردەیەم دێت لە بەرهەمی گەنم و پلەی حەڤدەیەم دێت لە بەرهەمی مس دا.

ئێران بەگـەورەترین وڵاتـانی جیهان دادەنرێـت لـە بەرهـەمی خاویـار و نـاردنی بـۆ دەرەوەی وڵات، خاویار ( یان کاڤیار ) بریتییە لە هێلکەی ماسی نقە، بەڵام بەرهەمی لە ساڵی ١٩٨٩ دا گەڕایـەوە دواوە بە بڕی ٣٠ تـۆن، پێشتر ١٦٠ تـۆن بـوو بـەڵام دواتـر بـووە ١٣٠ تـۆن بـەهۆی راوی ناوەخت و پیس بوونی دەریای قەزوین.

* * *

## جەژنی یەلدا

ئێرانیەکان لە ٢١ / ١٢ ی هەموو ساڵێك ئاهەنگی جەژن دەگێڕن و بەو جەژنەش دەڵێن : یەلدا، ئەویش جەژنێکی ئاینی زەردەشتییە و دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەها ساڵ لەوەو پێش. وشەی یەلدا بەمانای درێژترین شەوی ساڵ دێت، هەروەها کۆتایی پایز وسەرەتای زستان رادەگەیەنێ.

*　　　　*　　　　*

**ئێران زمانی عەرەبی دەخوێنن**

پاش دروست بوونی کۆماری ئیسلامی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ دا، زمانی عەرەبی بایەخێکی تایبەتی پێدرا، ئەم بایەخەش لەبەندی شانزدەیەمی دەستووری ئێرانییەوە هاتووە بەم شێوەیە: بەو پێیەی کە زمانی عەرەبی زمانی قورئانی پیرۆزە و زانستە ئیسلامیەکانە، بەو پێیەی کە وێژەی فارسی پەیوەندییەکی تەواوی بە وێژەی عەرەبەوە هەیە بۆیە بریار درا زمانی عەرەبی لە نێو قوتابخانەکانی ئێراند لەسەرەتای قۆناغی ناوەندییەوە بخوێنرێت لەهەموو بوارەکانی خوێندندا.

ئێرانییەکان دوای ئەوەی ئاینی ئیسلامیان پەیرەو کرد رۆڵێکی بەرچاویان هەبوو لە گەشە پێدانی شارستانیەتی ئیسلامی و کەسایەتی کەلتووری خۆیانیان لە ئاینی نوێدا بینیەوە. لەگەڵ ئەوەی دوای لاواز بوونی بازووی خیلافەتی ئیسلامی ئێران نیمچە سەربەخۆییەکی سیاسی پێوە دیار بوو ( لەدوای سەدەی چوارەمی کۆچی، دەیەمی زایینی ) بەلام پلە وپایەی زمانی عەرەبی هیچ لاوازییەکی بەخۆوە نەبینی لەو ولاتەدا، بەتایبەتی لەنێو شاعیران و زانایاندا، چونکە وەك پسپۆران دەڵێن نزیکەی ٤٠- ٦٠ ٪ ی زمانی فارسی لە وشەی عەرەبی پێك دێت.

زانکۆی ئیمام سادق بۆ خوێندنی زمانی عەرەبی باشترین بەڵگەی ئەو بایەخەی کە ئەو زمانە لەو ولاتەدا بەدەستی هێناوە.

## ئێرلەندا

**ناوی باو:** ئێرلەندا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئێرلەندا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Ireland

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٨٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٦٦ ئەندام )

**رووبەر :** ٢٧,١٣٧ میل دووجا، ٧٠,٢٦٥ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣,٦٤٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥١,٨ کەس / کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئێرلەندی، بەریتانی، ویلزیەکان.

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك، ئەنگلیکان )

**زمان:** گیلی ئێرلەندی، ئینگلیزی

**پایتەخت:** دبلن

**شارە سەرەکییەکان:** کورك، لیمیریك، کالوای، ووتەر فۆرد، کیلکنی، دندلك.

**دراو:** جنەیهی ئێرلەندی، یۆرۆ لەدوای ١ / ١ / ٢٠٠٢.

**ئاووهەوا:** مام ناوەند و شێدار، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ٤ پلەی سەدی و لەهاویندا دەگاتە ١٦ پلەی سەدی و ڕێژەی ساڵانەی باران دەگاتە ٢٠٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** بەخێوکردنی مەڕو مانگا، بەراز، گۆشت، شیرەمەنی، خووری، چەوەندەر، پەتاتە.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** دروست کراوە خۆراکییەکان، ئامێری ئەلەکترۆنی، دروستکراوەکانی شیرەمەنی، دروستکراوەکانی خووری، دروست کراوە کیمیاییەکان.

**سامانی کانزایی:** قورقوشم، زنك، خەڵوزی بەردین، رخام، نەوت، گاز.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئێرلەندا، هەندێ جار بە ئایرلەنداش دەوترێ، یان ئایری بەزمانی غیلییە ئێرلەندییەکان، نازناوی دورگەی مرواریە، بەهۆی جوانی ئەو زەویی و خاکە سەوزە قەرسیلەییە، دورگە

ولاتێكە ٨٥٪ ی رووبەری دورگەی ئێرلەندای گرتۆتەوە، بەلام ئێرلەندای باكووری كە دەكەوێتە باكووری رۆژهەلاتی ( سەر بە شانشینی یەككرتووە ) دەكەوێتە بەشەكەی تری، دەكەوێتە باكووری رۆژئاوای ئەوروپا، سەر بە كۆمەڵە دورگەكانی بەریتانیایە، كەناڵی باكوور و دەریای ئێرلەندی و كەناڵ سانت جۆرج لە رۆژئاوای بەریتانیای جیا دەكاتەوە. لەلاكانی كەشیەوە زەریای ئەتڵەسی چوار دەوری گرتووە. یەكێتی هێڵی درێژی ٨ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٥٣ بەرەو باكوور بەناوەراستیدا تێدەپەرێ.

زەوییە دەشتەكانی زۆربەی ناوەراستی دورگەكە دادەپۆشێ و كێڵگەی بەخێو كردنی مەرو مالاتێكی زۆری لەخۆ گرتووە. دارستان و دەریاچەكانیش لە ناوەراستیدا بلاو دەبنەوە و چیاكان چوار دەوری ئەو دەشتانەیان گرتووە، هەردوو بەندەری سەرەكی : ووتەر فۆرد و كورك دەكەونە سەر كەنارەكانی رۆژهەلاتی ئەو ولاتە.

لە ٦٠٠٠ پ.ز ینەوە چەند جارێك بەرەو ئەو دورگەیە كۆچ كراوە، لە سەدەی هەشتەمدا ئەسكەندەنافیەكان هێرشیان كردۆتە سەری، لە سەدەی حەڤدەیەمدا بەریتانیەكان زۆربەی خاكەكانی داگیر كردووە و خستونیەتە ژێر دەسەلاتی خۆی، مافە ئاینی ( كاسۆلیك ) و شارستانی و كەلتوریەكانی دانیشتوانەكەی زەوت كردووە و بێ بەشی كردوون. لەپەنجا و شەستەكانی سەدەی هەژدەیەمدا ( سەردەمی داگیر كەری بەریتانی ) چەند بزوتنەوەیەكی نیشتیمانی ئێرلەندی سەری هەلداوە، لە ساڵی ١٧٩١ دا بزوتنەوەی ئێرلەندای یەككرتوو بانگەوازی سەربەخۆیی تەواوی لە بەریتانیا راگەیاندووە، بەلام دەسەلاتدارە پرۆتستانتەكان ئەم بزوتنەوەیەیان سەركوت كردووە و ئەمەش بووە هۆی دابەش بوونی دورگەی ئێرلەندی بەدوو گروپەوە، لەنێوان یاوەرانی داگیر كەری بەریتانی و نەیارانی و سەنتەری سەرەكی بەرگری خوازان شاری بەلفاست ( ئێرلەندای باكووری ئێستا ) بووە.

لە سەرەتاكانی سەدەی نۆزدەیەمدا بەریتانیا ئێرلەندای خستە سەر خۆی و بە بەریتانی بوونی راگەیاند، بەلام ئەم راگەیاندنە رووبەرووی چەندین نارەزایی بووەوە لەلایەن كاسۆلیكە ئێرلەندییەكانەوە بەسەرۆكایەتی بزوتنەوەی كیژۆڵەی ئێرلەندی، كە پەنای بردە بەر خەباتی چەكداری لەپێناوی سەربەخۆ بوونی یەكجارەكی لە بەریتانیا، بەلام زۆر بەتوندی سەركوتكرا ولەناویان برد.

لە نێوان ساڵەكانی ١٨٤٥ – ١٨٤٦ ئێرلەندا دووچاری برسێتی و نەبوونییەك بوەوە بووە هۆی كوشتنی یەك ملیۆن كەسی ئەو ولاتە بەهۆی بلاوبوونەوەی نەخۆشی لە پەتاتەدا ( خواردنی سەرەكی دانیشتوان ).

لە نێوان ساڵەكانی ١٨٦٩ – ١٩١٤ چەند جارێك بزوتنەوە ئازادیخوازەكان لە ئێرلەندا سەری هەلدا، بەلام تەواوی ئەم بزوتنەوانە لەلایەن پرۆتستانتەكانەوە سەركوت دەكران و تەواوی هەوڵەكانی ئازادی ئەو ولاتەی شكست پێدەهێنا.

لە ساڵی ١٩١٩ دا بزوتنەوەی شین فین ( Sinn Fein ) و بەزمانی غیلی ئێرلەندی بەمانای

( تەنها ئێمە ) دێت کۆماری سەربەخۆی ئێرلەندای راگەیاند و لەئاکامی ئەو راگەیاندنە جەنگی ئێرلەندی – ئینگلیزی هەڵگیرسا بە ئەنجام دانی یەکەم دانوستان لەنێوان ئێرلەندا و بەریتانیا کۆتایی پێهات، ئەنجامەکەشی بە دامەزراندنی وڵاتی ئێرلەندای ئازاد لە ٦ / ١٢ / ١٩٢١ کۆتایی هات. ئێرلەندا هەموو ساڵێك لەو رۆژەدا ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەگێرێت. ئەو وڵاتە تەواوی خاکی وڵاتەکەی لەخۆ گرتبوو، جگە لە بەشێکی بچوکی باکووری رۆژهەڵات نەبێت کە بە ئێرلەندای باکوور دەناسرێت، خرایە سەر شانشینی یەکگرتوو و زۆربەی دانیشتوانەکەی لە پرۆتستانتەکانی یاوەری شانشینی بەریتانین. لە بەرواری ٢٤ / ١٠ / ١٩٢٢ دا پەرلەمان دەستووری تایبەتی خۆی راگەیاند کە پشتیوانی لە دامەزراندنی وڵاتی ئێرلەندای ئازاد دەکات. لە ساڵی ١٩٤٩ دا حکومەتی بەریتانی – ناچار – بە شێوەیەکی فەرمی دانی نا بە کۆمکاری ئێرلەندا و لە بەرواری ١٩٥٥ دا پەیوەندی کرد بە نەتەوەی یەکگرتووەکانەوە.

لە بەرواری ٢ / ١١ / ١٩٩٧ دا خاتوو ماری مکالیس، مامۆستای یاسا و پاڵێوراوی پارتی فیانا فیل ( سەربازانی دوارۆژ ) سەرکەوتنی لە هەڵبژاردنە ئێرلەندیەکاندا بەرێژەی ٥٩٪ دەنگەکانی بە دەست هێنا و بووە سەرۆکی وڵات. شایەنی باسە ئەرکەکانی سەرۆکی وڵات زۆر فراوان نییە، ئەرکی بانگهێشت کردنی پەرلەمان و دیاری کردنی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران هەندێ لەسەرکردایەتییەکانەو هیچی تر، سەرۆك لە ئێرلەندا دەبێت لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردرێت و بۆ ماوەی تەنها حەوت ساڵە و بۆی هەیە تەنها یەك جاری دیکەش خۆی هەڵبژێرێتەوە.

ئابووری لە ئێرلەندا پشتی تەواوی بە پیشەسازی خزمەتگوزاری و پیشەسازی بەستوە، ئێرلەندییەکان بۆ ماوەی سەت ساڵ زیاتر پشتی تەوایان بە کشتوکاڵی بەستبوو، بەڵام دوای بیستەکانی سەدەی پێشوو زیاترین بایەخ بە پیشەسازی درا بەتایبەتی پیشەسازییە ئەلکترۆنییەکان.

سروودی نیشتیمانی ئێرلەندا: سروودی سەرباز

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٤٨,٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٤

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١٣,٦٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٢٧.

ئێرلەندا بە پلەی هەشتەمی هەموو جیهان دێت لە بەرهەمی زنك و پلەی دوانزدەیەم لە قورقوشم.

* * *

## ئێرلەندای باکوور

ئێرلەندای باکوور بچوکترین وڵاتە لەو چوار وڵاتەی شانشینی یەکگرتویان پێکهێناوە و دەکەوێتە بەشی باکووری رۆژهەڵاتی دورگەی ئێرلەندا، رووبەرەکەی ١٤,١٢١ کم٢ دەبێت، ئەو رووبەرەش یەك لەسەر شەشی رووبەری دورگەی بەریتانیا دەبێت، بەلفاست پایتەختێتی و گەورەترین شارێتی.

زۆربەی خەڵکی ئێرلەندای باکوور بەرەچەڵەك ئینگلیز و سکۆتلەندین و ژمارەیان ( ١,٦٢٥,٠٠٠ کەس تا ١٩٩٨ ) و زۆربەیان رەوتی پرۆتستانتیان لەخۆ گرتووە و داب نەریتەکانیشیان زۆر بە ئینگلیزەکانەوە پەیوەستە، ئەوانی دیکەش سەر بە رەوتی کاسۆلیکن و بەرەچەڵەك ئێرلەندین. هەردوو گروپ لە رووی سیاسییەوە جیاوازیەکی زۆریان هەیە. پرۆتستانتەکان لە یاوەرانی یەك بوونن لەگەڵ ئینگلتەرا، بەڵام کاسۆلیکەکان خەبات لە پێناوی یەکێتی دورگەی ئێرلەندی دەکەن لەژێر سایەی ئاڵای کۆماری ئێرلەندا.

لە ساڵی ١٩١٦ دا سوپای کۆماری ئێرلەندی و باڵی سیاسی شین فین ( Sinn Fein ) سەری هەڵدا و لە پێناوی سەربەخۆیی ئێرلەندا، پاش سەربەخۆ بوونی لە ساڵی ١٩٢١ دا دەست کرا بە پرۆسە سەربازییەکان لە پێناوی یەکخستنەوەی هەردوو بەشی ئێرلەندا و ئەو بەش کردنەی بەریتانیای رەت دەکردەوە. شەڕ و پێکدادانەکان نزیکەی ٧٥ ساڵی خایاند و بەسەدان کەس لەم پێناوەدا گیانیان لەدەست دا.

پاش گفتوگۆ و دانوستانەکان و هەوڵە چڕەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەم پێناوەدا بەتایبەت ساڵی ١٩٩٦ – ١٩٩٧ هەردوو حکومەتی ئێرلەندی وبەریتانی بۆ دووەم جار ( جاری یەکەم ١٩٢١ بوو ) دانیشتن لە رۆژی هەینی ١٢ / ٤ / ١٩٩٨، هەر یەك لە سەرۆك وەزیرانی بەریتانی تۆنی بلێر و سەرۆك وەزیرانی ئێرلەندیبیرتی ئەهێرن واژۆی رێکەوتننامەی ئاشتیان کرد لە ئێرلەندای باکوور بە ئامادەبوونی سیناتۆری ئەمریکی جۆرج میتشل، لەگەڵ ئەوەی ئەم واژۆ کردنە چەندین رەخنە و نارەزایی بەرەو رووی بووەوە بەڵام هەر ئەنجام درا و نازناوی ( هەینی مەزنیان ) لەم رۆژە نا. بەپێ ی ئەو رێکەوتنە چارەنووسی ئێرلەندای باکوور بەپێی زۆرینەی رای دانیشتوان دیاری دەکرێت کە لەرێی هەڵبژاردن و دەنگدانێکەوە دەردەکەوێت. هەتا ئەو کاتەش گەلی ئێرلەندای باکوور ئەم کارە ئەنجام دەدات، هەردوو حکومەتی ئێرلەندا و بەریتانیا بەڵێن دەدەن کە دەستوورەکانیان راست بکەنەوە: لەندەن لەلایەن خۆیەوە دەبێ دەست هەڵگرێ لەو یاسایەی ساڵی ١٩٢١ کە سەروەری خۆی بەسەر ئێرلەندای باکوور دا تیا سەپاندووە، دبلنیش دەست هەڵدەگرێ لە داواکارییەکانی کە خاکی باکوور بخاتە سەر خۆی. و ئەنجومەنێکی بەریتانی – ئێرلەندی

پێك دەهێنرێت بۆ چاکردنەوەی ئەو یاسایانەی شانشینی یەکگرتوو سەبارەت بە ئێرلەندای باکوور دەریکردوە.

لە بەرواری ٢٢ / ٥ / ١٩٩٨ ( بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئەو وڵاتە) دا نزیکەی ٢.٩ ملیۆن کەس لە دورگەی ئێرلەندی دەنگیان دا بەوەی کە دەسەلاتەکان لەنێوان پرۆتستانت و کاسۆلیکەکان دابەش بکرێت لە ئێرلەندای باکوور. ئەنجامە فەرمییەکانی ئەو دەنگدانە کە لەهەردوو بەشی ئێرلەندا ئەنجام درا رەزامەندی سەد لەسەدی رێکەوتننامەکەی ١٢ / ٤ / ١٩٩٨ ی پەسەند کرد.

لەگەڵ ئەوەشدا توندوتیژی لەو ناوچەیە نەبرا، لە ١٥ / ٨ / ١٩٩٨ دا لەناوەراستی شارۆچکەی ئۆماغ کە نزیکەی ٨٠ کم لە رۆژئاوای بەلفاستەوە دووره ئۆتۆمبیلێکی بەمین چێنراو تەقیەوە و بووە هۆی کوشتنی بەدەیان کەس و وێران کردنی بیناکانی دەوروبەری. ئەم رووداوە بەیەکەم رووداو دادەنرێت دوای رێکەوتنی ئاشتیانەی نێوان کاسۆلیك و پرۆتستانت و پسپۆران وای بۆ دەچن کە ئەنجام دەرانی ئەم کارە تیرۆریستییە لەلایەن نەیارانی ئاشتییەوە بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکانی سەقامگیر کردنی ئاشتی نەبراو لە کۆتاییەکانی ١٩٩٩ دا حکومەتێکی ناوخۆیی و پەرلەمانێك لە نوێنەرانی هەردوولا پێك هات و بەپێی ئەو رێکەوتننانەی ١٩٩٨ کاری پێکرا. لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ دا دەست کرا بەداماڵینی چەکی سوپای کۆماری ئێرلەندی، بەڵام ئەم کارەش دووچاری چەند گرفت و ئاستەنگیەك بووەوە بەو هۆیەی کە سوپا ئامادەیی خۆی لە چەك کردنی دەرنەبری، زۆربەی لایەنەکان رووبەرووی ململانێ بوونەوە و بووە هۆی ئیفلیج کردنی کاروباری حکومەتی ناوخۆ، لە ئاکامدا حکومەتی بەریتانی لە ١١ / ٢ / ٢٠٠٠ دا رایگەیاند کە دووبارە دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئێرلەندای باکوور رادەگەیەنێ و لەمانگی پێنجی ساڵی ٢٠٠٠ دا هەستا بە پێکهێنانی حکومەتێکی نوێ و تایبەت بەو هەرێمە و زۆربەی لایەنەکانی لەخۆ گرتبوو.

بەڵام ئەم رەفتارەی بەریتانیاش نەیتوانی چارەسەری تەواوی کێشەکان بکات و شەپۆلی توند رەویەکان هێمن کاتەوە و کۆبوونەوەکان بەردەوام بوون لە پێناوی کۆتایی هێنان بە کێشەکانی ئێرلەندای باکوور، بەڵام ئەوەی بەردەوام هەوڵەکان پووچەڵ دەکاتەوە ئەمانەن : کێشەکانی داماڵینی چەکە لە نیمچە سوپای ئێرلەندا و ئەنجام دانی ئەو چاکسازیانەی بەریتانیا مەبەستێتی بەسەر پۆلیسی ئێرلەندادا بیسەپێنێ، جگە لەوەی کە ئێرلەندیەکانیش داوا لە بەریتانیا دەکەن هێزەکانی لە ئێرلەندای باکوور کەم کاتەوە، لەسەروو هەموو ئەمانەشەوە رەزامەندی هەردولا لایەنی سەرەکی ( پرۆتستانت و کاسۆلیك ) لەو چارەسەرانەی بۆیان دەدۆزرێتەوە.

له ١٦ / ٤ / ٢٠٠٢ دا سوپای کۆماری ئێرلەندا داوای لێبوردنێکی ئاشکرای کرد لەتەواوی ئەو کوشت و بڕیەی لەئەنجامی پرۆسەکانی پەیدا بووە بە درێژایی ٣٠ ساڵی رابردوو، داوای لەگروپە بەشەڕ هاتووەکان کرد کە دان بەتاوانەکانی خۆیان دا بنێن و کۆتایی بە خوێن رێژی یەکتر بێنن.

ئەم داوای لێبوردنە بەیەکەم داواکاری لەو جۆرە دادەنرێ و لەیادی سیهەمین ساڵی رۆژی شوومی یەکشەمەی بەلفاست راگەیەنرا، کاتێ زیاتر لە بیست نارنجۆک لەماوەی یەک کاتژمێردا لە بەلفاستدا تەقێنرایەوە و بووە هۆی لەدەست دانی گیانی شەش کەس و بریندار بوونی سەتی دیکەش.

## ئایسلەندا

ناوی باو: ئایسلەندا

ناوی فەرمی: کۆماری ئایسلەندا

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Iceland

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: پەرلەمان ( ٦٣ ئەندام )

ڕووبەر : ٣٩,٦٩٩ میل دووجا، ١٠٢,٨١٩ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ٢٧١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ١١,٤ کەس/کم$^{٢}$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئایسلەندی، دانیمارکی، ئەمریکی، سویدی، ئەڵمان

ئاین: مەسیح ( پرۆتستانت، ڕۆمان کاسۆلیک )، بێ ئاین

زمان: ئایسلەندی

پایتەخت: ریکیافیک

شارە سەرەکییەکان: کوبافۆجۆر، ئاکۆریری

دراو: کرونی ئایسلەندی

ئاووهەوا: ساردە، پلەکانی گەرمای پایتەخت لە زستاندا دەچێتە -١ پلەی سەدی و لەهاویندا ١١ پلەی سەدی، نێوەندی ڕێژەی سالانەی باران دەگاتە ٤٥٧ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: کەلانە، پەتاتە، تەماتە، مەڕ، ئەسپ، ڕاوە ماسی.

بەرهەمە پیشە سازییەکان: دروست کراوەکانی خووری، پێلاو، چیمەنتۆ، دروست کراوە خۆراکییەکان، زەیت و ڕۆن.

سامانی کانزایی: دیاتۆمیت

تێڕوانینێکی گشتی :

ئایسلەندا بەمانایی ( خاکی سەهۆڵ، یان وڵاتی بەستەڵەك ) دێت دورگە وڵاتێکی سەر بە ئەورووپایە، دەکەوێتە باشووری بازنەی جەمسەری باکووری گۆی زەوی لە زەریای ئەتڵەسی، نزیکەی ٣٢٠ کم دورە لە ڕۆژهەڵاتی دورگەی گرینلاندو نزیکەی ١٠٥٠ کم لە ڕۆژئاوای نەرویج، یەکێ هێڵی درێژی ١٩ بەرەو ڕۆژئاوا و هێڵی پانی ٦٥ بەرەو باکوور بە ناوەراستیدا تێدەپەڕێ.

له ١٦ / ٤ / ٢٠٠٢ دا سوپای کۆماری ئێرلەندا داوای لێبوردنێکی ئاشکرای کرد لەتەواوی ئەو کوشت و بڕینەی لەئەنجامی پرۆسەکانی پەیدا بووە بە درێژایی ٣٠ سالّی رابردوو. داوای لەگروپە بەشەڕ هاتووەکان کرد کە دان بەتاوانەکانی خۆیان دا بنێن و کۆتایی بە خوێن رێژی یەکتر بێنن.

ئەم داوای لێبوردنە بەیەکەم داواکاری لەو جۆرە دادەنرێ و لەیادی سێهەمین سالّی رۆژی شوومی یەکشەمەی بەلفاست راگەیەنرا، کاتێ زیاتر لە بیست نارنجۆك لەماوەی یەك کاتژمێردا لە بەلفاستدا تەقێنرایەوە و بووە هۆی لەدەست دانی گیانی شەش کەس و بریندار بوونی سەتی دیکەش.

## ئایسلەندا

**ناوی باو:** ئایسلەندا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئایسلەندا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Iceland

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ٦٣ ئەندام )

**رووبەر :** ٣٩,٦٩٩ میل دووجا، ١٠٢,٨١٩ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٧١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١١,٤ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئایسلەندی، دانیمارکی، ئەمریکی، سویدی، ئەڵمان

**ئاین:** مەسیح ( پرۆتستانت، رۆمان کاسۆلیك )، بێ ئاین

**زمان:** ئایسلەندی

**پایتەخت:** ریکیافیك

**شارە سەرەکییەکان:** کوبافۆجۆر، ئاکۆریری

**دراو:** کرونی ئایسلەندی

**ئاووهەوا:** ساردە، پلەکانی گەرمای پایتەخت لە زستاندا دەچێتە -١ پلەی سەدی و لەهاویندا ١١ پلەی سەدی، نێوەندی رێژەی سالانەی باران دەگاتە ٤٥٧ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** کەلانە، پەتاتە، تەماتە، مەڕ، ئەسپ، راوە ماسی.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** دروست کراوەکانی خووری، پێڵاو، چیمەنتۆ، دروست کراوە خۆراکییەکان، زەیت و رۆن.

**سامانی کانزایی:** دیاتۆمیت

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ئایسلەندا بەمانایی ( خاکی سەهۆڵ، یان وڵاتی بەستەڵەك ) دێت دورگە وڵاتێکی سەر بە ئەوروپایە، دەکەوێتە باشووری بازنەی جەمسەری باکووری گۆی زەوی لە زەریای ئەتڵەسی، نزیکەی ٣٢٠ کم دورە لە رۆژهەڵاتی دورگەی گرینلاندو نزیکەی ١٠٥٠ کم لە رۆژئاوای نەرویج، یەکێڕی هێڵی درێژی ١٩ بەرەو رۆژئاوا و هێڵی پانی ٦٥ بەرەو باکوور بە ناوەڕاستیدا تێدەپەڕێ.

هەروەها پێ دەوترێ خاکی گڕ و سەهۆڵ، لەگەڵ ئەوەی روباری بەستەڵەکی تیایە سەرچاوە و کانیاوی ئاوە گەرم و هەڵم و گۆگردەکانیشی لەخۆ گرتووە. جگە لەوەی نزیکەی ٢٠٠ گڕکانی چالاکیشی تێدەکەوێت. هەروەها پێیدەوترێ خاکی خۆری نیوە شەو، لەبەر ئەوەی کە لەسەرەتای هاوینەوە ٢٤ کاتژمێر خۆرە و وا دەزانی هەر رۆژە، لە زستانیشدا بە پێچەوانەوە تاریکی باڵی بەسەر هەر ٢٤ کاتژمێرەکەدا کێشاوە چونکە نزیکی بازنەی جەمسەری باکوورە.

ئایسلەندا بانێکی چڕ و رووتە، نزیکەی ٧٦٢ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزە، سەهۆڵ بەردەوام دایپۆشیوە، دەشتێکی زۆری کەوتۆتە سەر کەنارەکان و گژوگیایەکی زۆر دایپۆشیوە و دانیشتوان مەڕو ماڵاتی تای بەخێو دەکەن، چونکە هەندێ لەبەندەرەکانی بەستن و سەهۆڵبەندان نایگرێتەوە لە زستاندا.

گەلی نەرویج لە سەرەتای ساڵی ٨٧٤ بەدواوە لە ئاسلەندا نیشتەجێ بوون، لە ساڵی ١٠٠٠ دا ئاینی مەسیحیان وەرگرتوە، لە ساڵی ١٢٦٢ دا لەگەڵ نەرویج یەکیان گرتووە و لە ساڵی ١٣٨٠ دا لەگەڵ دانیمارك کاتێ نەرویج و دانیمارك بوون بەیەك وڵات.

لە ساڵی ١٩١٨ دا لەگەڵ دانیمارکدا بووە وڵاتێکی شانشینی سەربەخۆ.بەریتانی و ئەمریکییەکان لە جەنگی جیهانی دووەمدا داگیریان کردووە.

ئایسلەندییەکان داوای ئازادییەکی بەرفراوانیان کرد لە بەڕێوەبەردنی وڵات و لە ساڵی ١٩٤٤ دا نزیکە ٩٧٪ ی دانیشتوانی ئەو وڵاتە دەنگیان بە پچڕاندنی تەواوی گرێبەستە سیاسییەکان لەگەڵ دانیمارکدا، لە ١٧ / ٦ / ١٩٤٤ دا بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە و هیچ پەیوەندییەکی بە دانیمارکەوە نەما، لەساڵی ١٩٤٦ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان ولەساڵی ١٩٤٩ بۆتە ئەندامی هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسی.

لە ساڵەکانی ١٩٥٨ – ١٩٧٥ دا، ئایسلەندا هەستاوە بە دیاریکردنەوەی سنوورە دەرياييەکانی و رێی لەهەر وڵاتێك گرتوە راو لە ئاوەکانیدا بکات، بەڵام بەریتانیا رێی ئەمەی نەدا و بەتوندی بەرەو رووی بووەوە، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی ململانێیەکی توند لەنێوانیاندا بە شەڕی ماسی ناسرا، کێشەکەیان رەوانەی دادگای نێودەوڵەتی لاهای کرا، لەوێ بەریتانیا – ناچار – بەڵێنی دا کە بەهیچ شێوەیەك ماف بەسەر سنوورە ئایسلەندییەکانەوە نەبێت کە ٢٠٠ میل ( ٣٧٠ کم ) دەبێت ئەمە لە ساڵی ١٩٧٧ دا.

لە ساڵی ١٩٨٠ گەلی ئایسلەندی خاتوو فیجیدیس فینبۆجادوتیر یان بەسەرۆکی وڵات هەڵبژارد، بەیەکەم خانم دادەنرێت لەجیهاندا کە پۆستی سەرۆکی کۆماری پێ سپێردرابێت و دوای ئەویش لەساڵی ١٩٩٦ دا ئۆلا فۆر گریمۆن کرایە سەرۆکی وڵات. شایەنی باسە

دەسـەڵاتەکانی سـەرۆکی وڵات لـە ئایـسلەندا زۆر دیـاری کـراوە، چـونکە وەزارەت خـۆی هەڵدەستێ بە بەڕێوەبردنی کاروباری وڵات.

ئابووری ئایسلەندا پشتی تەواوی بە راوە ماسی بەستووە، چونکە ئەو رووبەرە زەوییەی بۆ کشتوکاڵی لەبار بێت لە رێژەی ١٪ ی رووبەری ئەو وڵاتە تێناپەڕێ.

لە بەرواری ١٧ / ٦ / ٢٠٠٠ دا بوومەلەرزەیەکی توند لە ئایسلەندای دا بە گوڕی ٦,٦ پلـە بـە پێـوەری رێختـەر و زیـانێکی مـادی زۆری بـەو ناوچـەیە گەیانـد کـە نزیکـەی ٩٠ کـم لـە رۆژهەڵاتی ریکافیکی پایتەختەوە دوور بوو، ئەوەیش بە بەهێز ترین بوومەلـەرزە دادەنرێ لەو وڵاتەی دابێ.

لـە بـەرواری ٢٦ / ٢ / ٢٠٠٠ دا گڕکـانی هیلکـا ( گـەورەترین گڕکانـەکانی ئایـسلەندا بەرزییەکـەی دەگاتــە ١,٤٩١ مــەتر لــە ســەر رووی زەوی ئــەو دورگەیــەوە) تەقیــەوە و ناوەخنەکـەی بـۆ دووری دە کیلۆمـەتر فـڕێ دەدایە دەرەوە، بۆیـە دەزگـا پەیوەنـدی دارەکان ناچـار رێگاکـانی هاتوچـۆی ئاسمـانی رابگـرن. گڕکـانی هیلکـا مێژوویـەکی بەرچـاوی هەیـە لەتەقینەوەکانیدا / هەر دیارەکانی ئەوانی ساڵەکانی ١٩٧٠، ١٩٨٠، ١٩٩١.

سروودی نیشتیمانی : خوایە وەتەن بپارێزی.

جەژنی نیشتیمانی : رۆژی سەربەخۆیی : ١٧ / ٦ / ی هەموو ساڵێك.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٦,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٩٢.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢٤,٥٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠.

ئایسلەندا بە پلەی پێنجەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە راوە ماسی.

## ئیتاڵیا

**ناوی باو:** ئیتاڵیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئیتاڵیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Italian Republic

**ئەجومەنی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت :

ئەنجومەنی پیران ( ٣٢٥ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٣٠ ئەندام )

**رووبەر :** ١١٦,٣٢٤ میل دووجا، ٣٠١,١٧٧ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥٧,٥١٠,٠٠٠ ( تا ١٩٩٨ )

**چری دانیشتوان:** ١٩٠کەس/ کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئیتاڵی، ئەڵمان، فەرەنسی، سلۆڤان

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك )

**زمان:** ئیتاڵی

**پایتەخت:** رۆما

**شارە سەرەکییەکان:** میلانۆ، ناپۆلی، تۆرینتۆ، بالیرمۆ، فلۆرەنسا، ڤینیسیا ( بوندوقیە ).

**دراو:** لیرەی ئیتاڵی، یۆرۆ لە ١ / ١ / ٢٠٠٢ بەدواوە.

**ئاو وهەوا:** لەناوەڕاست و باشووری وڵات : زستانی مام ناوەند و پلەکانی گەرما لە رۆژدا ١٢ پلەی سەدی، هاوینی گەرمە و پلەکانی گەرما دەگاتە ٣٠ پلەی سەدی. باکووری وڵات زستانی سارده و نێوەندی پلەکانی گەرما دەچێتە ٥ پلەی سەدی، رێژەی شێ گونجاوە بەدرێژایی ساڵ. باشووری ئیتاڵیا : زستان باران دەبارێت و هاوینی وشکە و بەفر لەسەر شاخەکان بەرێژەیەکی زۆر دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، گەنمەشامی، ترشەڵۆکییەکان، مێو، زەیتون، تووتن، بەخێوکردنی گوێرەکە، راوە ماسی.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** دروست کردنی ئاسن و پۆڵا، دروست کراوەکانی خووری، پۆشاك، پێڵاو، کەلوپەلی ناوماڵ، مەی، ئۆتۆمبێل، دروست کراوە کیمیاییەکان.

**سامانی کانزایی:** زنك، ئاسنی خاو، مەنگەنیز، قورقوشم، گوگرد، بۆکسیت، نەوت، خەڵووزی بەردین، بۆرەك و گەچ، بۆرۆن، لیگنیت.

**تێڕوانینێكی گشتی :**

ئیتاڵیا كه وشه‌یه‌كه ڕۆمانه كۆنه‌كان ئه‌م ناوه‌یان لێناوه و ماناكه‌شی به : ڕانه‌وڵاخ دێت، وڵاتێكه ده‌كه‌وێته باشووری ئه‌وروپا، نه‌خشه‌كه‌ی له‌شێوه‌ی پێڵاوێك به‌درێژایی ۸۰۰كم له‌ناو ده‌ریای سپی ناوه‌ڕاستدا.

هه‌ر یه‌ك له فه‌ره‌نسا و سویسرا و نه‌مسا و سلۆڤینیا ده‌كه‌ونه باكووری، ده‌ریای ئه‌دریاتیكی ده‌كه‌وێته ڕۆژهه‌ڵاتی، ده‌ریای سپی ناوه‌ڕاست له باشووری. ده‌ریای تیرانی ده‌كه‌وێته ڕۆژئاوای و دوای ئه‌و هه‌ردوو دورگه‌ی سقلیه و سردینیای له‌سه‌ر ده‌ریای سپی ناوه‌ڕاست و ده‌ریای تیرانی. یه‌كبڕی هێڵی درێژی ۱۳ به‌ره‌و ڕۆژهه‌ڵات له‌گه‌ڵ هێڵی پانی ٤۳ به‌ره‌و باكوور به‌ناوه‌ڕاستیدا تێده‌په‌ڕێ.

چیاكانی ئه‌لب سنووری باكووری و باكووری ڕۆژئاوای ئیتاڵیایان پێك هێناوه. ئه‌و شاخانه‌ش به‌ره‌و ده‌شتی بۆ لێژ ده‌بنه‌وه، ده‌شتی بۆ ده‌شتی سه‌ره‌كی ئه‌و وڵاته‌یه، زنجیره چیای ئه‌بناین ناوه‌ڕاستی نیمچه دورگه‌ی ئیتاڵیایان پێك هێناوه و ده‌شته‌كانیش ده‌كه‌ونه درێژایی كه‌ناره‌كان.ته‌ختی دورگه‌كانی سقلیه و سردینیا بریتییه له كۆمه‌ڵه شاخێك و ده‌شته‌كانیش چوارده‌وریان گرتووه و به‌ناوچه‌ی بوومه‌له‌رزه و گڕكانی داده‌نرێت ( گڕكانی ئێتنا و گڕكانی ڤیزۆڤ له‌و ناوچه‌یه‌دا چالاكن ).

له سه‌رده‌می ئیمپراتۆریه‌تی ڕۆمانیدا ئیتاڵیا گه‌یشته چڵه بۆی گه‌شه كردنی و پێشكه‌وتن و به‌شێكی زۆری له‌چوارده‌وری ده‌ریای سپی ناوه‌ڕاستدا گرتبوو و شارستانێتێكی مه‌زنی له‌و ناوچانه به‌ئه‌نجام گه‌یاند ئێستاش ئاسه‌وارێكی زۆری له‌و ناوچانه‌دا ماون. ئاینی مه‌سیحی زۆر به‌خێرایی له‌و ناوچه‌یه‌دا بڵاو بۆوه و هێنده نه‌خایاند ڕۆما بووه پایته‌ختی پاپایی. له‌سه‌ده‌ی نۆیه‌مدا عه‌ره‌به‌كان ئاینی ئیسلامیان گه‌یانده سقلیه و به‌شه‌كانی باشووری ئیتاڵیا. له‌سه‌رده‌می ڕاپه‌ڕیندا له‌سه‌رده‌مه‌كانی ناوه‌ڕاستدا، زانست و هونه‌ر و وێژه له‌زۆربه‌ی شاره‌كانی ئیتاڵیادا گه‌شه‌كردنێكی به‌رچاوی به‌خۆوه بینی. له ساڵی ۱۷۹٦ دا ناپلیۆن پۆناپێرت باكووری ئیتاڵیای داگیركرد و له ساڵی ۱۸۰٤ دا خۆی به شای ئیتاڵیا ڕاگه‌یاند.

پاش ئه‌وه‌ی ئیتاڵیا بووه چه‌ند ئیماره‌ت و دۆقییه‌ك و چه‌ند شارێكی لێك جیا، ڤیكتۆر ئه‌مانۆئێلی دووه‌م له‌ساڵی ۱۸۷۱ دا ته‌واویانی كرده‌وه به‌یه‌ك و بووه شای وڵات. پاش ده ساڵ له‌و به‌رواره ڕۆما بووه پایته‌خت ئیتاڵیای یه‌ككگرتوو.

ئیتاڵیا له جه‌نگی جیهانیی یه‌كه‌مدا چووه پاڵ وڵاتانی هاوپه‌یمان و دوایی كه‌وته ژێر ده‌سه‌لاتی فاشیستی به‌سه‌رۆكایه‌تی مۆسۆلینی له ساڵی ۱۹۲۲. جه‌نگی جیهانی دووه‌م

چووه پاڵ ئەڵمانیای نازی و لەدژی هاوپەیمانان شەڕی راگەیاند بەڵام بەتێکشکاوی دەرکرایە دەرەوە.

لە بەرواری ٢ / ٦ / ١٩٤٦ دا لەهەڵبژاردنێکی گشتی ئیتاڵیەکان دەنگیان بە کۆماری کردنی ئیتاڵیادا و ساڵانە لەو رۆژەدا جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن.

لە بەرواری ١٣ / ٦ / ١٩٤٦ دا بە فەرمی کۆماری ئیتاڵیا دامەزرا و لە بەرواری ٢٧ / ١٢ / ١٩٤٧ دا دەستووری نوێی کۆمار راگەیەنرا. ئەمە دوای ئەوەی خێزانی پادشایی کە زیاد لە ٢١ ساڵ پەیڕەوی سیاسەتی فاشیستی بینیتۆ مۆسۆلینی دەکرد لە وڵات دەرکران. لە ساڵی ١٩٤٩ دا ئیتاڵیا پەیوەندی کرد بە هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسی و لە ساڵی ١٩٥٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەم ساڵانەی دواییدا چەند بزوتنەوەیەك سەریان هەڵدا و یەکگرتووی باکووری لێمباردی سەرۆکایەتیان دەکات و داوای جیابوونەوەی باشووری ئیتاڵی لەباکووری دەکەن. بەڵام دەسەڵاتدارە فەرمیەکانی ئیتاڵیا بەوە وەڵامیان دەداتەوە کە هەرێم خاوەنی دەسەڵاتێکە ئیدارەی ئۆتۆنۆمی بۆ مسۆگەر کراوە. بەڵام لە سنوورێکی دیاری کراودا، ئەمە جگە لەوەی کە دەزگا دەسەڵاتدارەکانی ئیتاڵیا هەمیشە باسی پارێزگاری لە یەکێتی خاکی وڵات دەهێنەوە ئارا.

لە ١٣ / ٥ / ١٩٩٩ وەزیری دارایی ئیتاڵی کارلۆ ئێزیلۆ تشامبی ( ٧٩ ساڵ ) لەوەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بووە دەیەمین سەرۆکی ئیتاڵی دوای ئەوەی ئیتاڵیا بە کۆماری ئیتاڵیا راگەیەنرا لە ١٩٤٧ دا و رزگار بوونی لە چنگی رژێمی فاشیستی. تشامبی سەرۆکی دوای ئۆسکار لویجی سکالفارۆ یە کە ماوەی سەرۆکایەتییەکەی لە ١٥ / ٥ / ١٩٩٩ دا کۆتایی پێهات.

شایەنی باسە سەرۆکی ئیتاڵیا ماف و دەسەلاتی جێ بەجێ کردنی هیچ یاسایەکی نییە، ئەوە نەبێ لەدوای تەواو بوونی ماوەی پۆستی سەرۆکایەتی دەبێتە خاوەنی کورسییەکی هەتا هەتایی لەنێو ئەنجومەنی پیرانی ئیتاڵی، دەسەڵاتی فیعلی بەدەست خودی سەرۆك وەزیرانە.

ئابووری ئیتاڵیا پشتی تەواوی بە پیشەسازی بەستووە، چونکە ئێستا تەنها ١٠٪ ی ژمارەی دانیشتوان سەرقاڵی کشتوکاڵین بەڵام کێشەی سەرەکی ئیتاڵیا لەدابەش کردنی سامانەکانیەتی لەنێوان باکووری دەوڵەمەند و باشووری هەژاردا، لە لێکۆڵینەوەیەکی پەیمانگای سەنتەری ئاماری ئیتاڵیا ئاشکرا بووە کە نزیکەی هەشت ملیۆن ئیتاڵی واتا ١٤٪ ی کۆی دانیشتوان لە ژێر هێڵی هەژاریدا دەژین و ئەمانەش لە خەڵکەکانی باشووری ئەو وڵاتەن. هەروەها لە ئامارێکی دیکەشدا ئاشکرا کراوە کە رێژەی ژمارەی دانیشتوانی ئیتاڵیا

بەرەو کەم بوون دەڕوات لەبەر نەویستی منداڵ خستنەوە و خێزان پێکەوەنان. ئیتاڵیا پشتێکی زۆری بە بیگانەکان بەستووە بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنەی لە هێزی کاردا هەیەتی.

سروودی نیشتیمانی ئیتاڵیا: برایەتی ئیتالی

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ۱۱۰۱ ملیلر دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : پێنجەم.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۱۹,۲۷۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ۱۷.

پاش نیو سەدە لەژیانی تاراوگە لە سویسرا، خێزانی پادشایی خۆی بۆ گەڕانەوە بۆ ئیتاڵیا ئامادە دەکەن. ئەمە پاش ئەو هەنگاوانەی حکومەتی ئیتالی نای لە ۲۰۰۱ دا بۆ پاشگەز بوونەوە لەو بەندە دەستوورییەی کە رێ لەگەڕانەوەی ئەندامانی خێزانی : هاوس ئۆف سافۆی ( یان نێرینەکانی خێزانی سافۆی ) بۆ خاکی نیشتیمان، گەڕانەوەیان مەرجی داواکردنەوەی خاوەندارییەکانیان و خۆ هەڵنەقورتاندنیان لە کاروباری سیاسی ئەو وڵاتەی لەخۆگرتبوو.

لە ساڵی ۲۰۰۱ دا حکومەتی ئیتالی راگەیاند کە سێ ساڵی دیکە دەست دەکات بەسازدانی پردێکی گەورە لەنێوان دورگەی سقلیە و باشووری ئیتاڵیا لەرێی تەنگەی میسیناوە.

لە ۷ / ۱۰ / ۲۰۰۱ دا لە ئیتاڵیا هەڵبژاردنێکی گەورە بەڕێوە چوو بۆ راست کردنەوەی بەندەکانی دەستوور لە پێناوی بەخشینی ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوان بەو بیست ناوچەیەی ئیتاڵیا و تەرخان کردنی داراییەکی گەورەتر لەوەی بۆی تەرخان کرابوو. ئەمەش یەکەم هەڵبژاردن بوو لە ئیتاڵیادا بەڕێوە بچێ لەپێناوی گۆڕینی دەستوور.

## پاپوا گینیای نوێ

ناوی باو: پاپوا گینیای نوێ

ناوی فەرمی: وڵاتی پاپوا گینیای نوێی سەربەخۆ

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Independent State of Papua New Guinea

سیستەمی حوکمڕانی: پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات خودی شای بەریتانییە و دادوەرێکی گشتی نوێنەرایەتی دەکات.

دەستەی یاسادانان: پەرلەمانی نیشتیمانی ( ١٠٩ ئەندام )

رووبەر : ١٧٨,٧٠٤ میل دووجا، ٤٦٢,٨٤٠ کم²

ژمارەی دانیشتوان: ٤,٤٩٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٩,٧ کەس/ کم²

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: گەلی پاپوا گینیای نوێ، میلانیزییەکان.

ئاین: مەسیح ( رۆمان کاسۆلیک، پرۆتستانت، ئەنگلیکان )، چەند ئاینێکی ناوخۆ.

زمان: ئینگلیزی، مۆتۆ، بیدجین، چەند زمانێکی ناوخۆ، میلانیزی.

پایتەخت: بۆرت وارۆسبای

شارە سەرەکییەکان: لاک، مادانغ، ویواک، کۆرۆکا، راباوول.

دراو: ئەلکینا

ئاووهەوا: گەرم و شێدارە، رێژەی پلەکانی گەرما لەنێوان ٢١ – ٣٢ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی بارانی ساڵانە دەگاتە ٢٠٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: کاکاو، گوێزی هیندی، قاوە، لاستیک، چا، داروتەختە، راوەماسی، بەخێوکردنی مەڕوماڵات.

بەرهەمە پیشە سازییەکان: دروستکراوە خۆراکییەکان، دروست کراوەکانی داروتەختە.

سامانی کانزایی: ئاڵتون، ئاسن، نیکل، مەنگەنیز، نەوت، مس، گاز.

تێڕوانینێکی گشتی :

پاپوا گینیای نوێ کۆمەڵە دورگە وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای زەریای هیندی، نزیکە ١٦٠ کم لە باکووری ئۆستورالیاوە دوورە،نیوەی رۆژهەڵاتی دەکەوێتە دورگەی گینیای نوێ ( دووەم گەورەترین دورگە لە جیهاندا )، بەڵام نیوە رۆژئاواکەیشی دەکەوێتە ناوچەی ئێریان جایای ئێندۆنیسی، جگە لەکۆمەڵێ دورگەی دوور و نزیک لە کەنارە رۆژهەڵاتی و باکووریەکانی. یەکێ‌ی هێڵی درێژی ١٤٥ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٦ بەرەو باشوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.

تەختی ناوخۆی وڵاتەکە شاخاوییە و بەدرێژی دورگە تێپەڕ دەبێت، هەرە بەرزایشی حکەوێتە لوتکەی فیلهلم ( ٤٦٩٧ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریاوە). ناوچە باکووری و باشووریەکانیشی نزمن و دارستانە چرە بێ بەرەکان دایان پۆشیوە، روبار زەلکاوێکی زۆری تیایە، بەتایبەتی ناوچە باشوورییە رۆژئاواییەکان.

پسپۆڕان باوەڕیان وایە کە نزیکەی ٢٧٠٠٠ ساڵ لەمەوبەر مرۆڤ لەو ناوچەیە نیشتەجێ بووە و راوەماسی و کشتوکاڵی زانیوە. ئەوروپیەکان لە ساڵی ١٥٢٦ دا گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە و لە ساڵی ١٨٧٠ داتیایدا نیشتەجێ بوون لە ساڵی ١٨٨٤ دا ئینگلیزەکان دەسەڵاتی ناوچە باشووریە رۆژهەڵاتیەکانیان گرتۆتە دەست و ئەڵمانەکان دەسەڵاتداری ناوچە باشووری رۆژئاواییەکانن. ئاینی مەسیحی لەدوای ساڵی ١٩٠٠ هاتۆتە ئەو وڵاتە.لەساڵی ١٩٠٤ ئوسترالیا دەسەڵاتی کەرتە بەریتانییەکانی ئەو دورگەیەی گرتە دەست و لەساڵی ١٩٠٦ دا ناوی پاپوا، بەزمانی مەلایۆی بەمانای کابرای قژ لوول دێت، لەوەو پێش گەریدەی پۆرتۆگالی مینیسیس لە ساڵی ١٥٢٦ دا ئەو ناوەی لێنابوو، بەڵام دوزەرەوە هۆڵەندییەکان ناوی گینیای نوێیان لێنا، لەبەر ئەوەی بیری گینیای ئەفریقیای دەخستنەوە. ە ساڵی ١٩١٤ دا ئوسترالیا دەستی گرت بەسەر کەرتە ئەڵمانیەکاندا و لە ساڵی ١٩٢١ دا کەوتە ژێر راسپاردەیی ئوسترالیا. یابان لەجەنگی جیهانی دووەمدا داگیری کردووە و پاشان لەسەر راسپاردەی ئوسترالیا خرایە ژێر دەسەڵاتی خودی نەتەوە یەکگرتوەکان. ئوسترالیا هەستا بەگەشە پێدانی بەرنامەکانی خوێندن و رۆشنبیری و بایەخێکی زۆری بە خزمەتگوزارییە تەندروستی و کشتوکاڵیەکانی ئەو ناوچەیەی دا. لەساڵی ١٩٧١ دا ناوی بوو بە پاپوا گینیای نوێ، لە ١٦ / ٩ / ١٩٧٥ دا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بوو و هەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. جەژنی نیشتیمانی ئەو وڵاتە لە ١٦ / ٩ ی هەموو ساڵێکە.

دانیشتوانی پاپوا گینیای نوێ شێوە لاساییەکانیان گرتۆتە بەر لە پیشەسازیدا پشتی تەواویان بەخۆیان بەستووە لە بەرهەمەکانیاندا و بێگانەکان کۆنترۆڵی زۆربەی چالاکییە ئابووریەکانیان کردووە. حکومەت هەوڵی ئەوە دەدات سوود لەجوانی سروشتی وڵاتەکەی وەرگرێ بۆ مەبەستی گەشتوگوزار، چونکە خاوەنی چەند کەنارێکی سەرسوڕهێنەر و بێ وێنەیە.

پاپوا گینیای نوێ یەکێکە لەو وڵاتانەی کە زیاترین ژمارە زمانی هەیە، خاوەنی زیاتر لە ( ٧٥٠ ) زمانی ناوخۆی قسە پێکراوە. دادوەری گشتی خاوەنی دەسەڵاتێکی دیاری کراوە و دەسەڵاتی فیعلی لەدەست سەرۆکی وەزیرانە. لە مانگی شەشی ١٩٩٧ دا بیل سکیت سەرکەوتنی لە سەرۆکایەتی حکومەتدا هێنا.

**تێكرای داهاتی نەتەوەیی : ٤,٩ ملیار دۆلاری ئەمریكی**

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠١**

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,١٦٠ دۆلاری ئەمریكی**

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٧**

**پاپوا گینیای نوێ بەحەوتەمین وڵات دادەنرێ لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی ئاڵتون و بەپلەی دوانزدەیەم دێت لەبەرهەمی كاكاو و بەپلەی سیانزدەیەم لە بەرهەمی مس.**

**سرودی نیشتیمانی: راپەڕن.**

*　　　*　　　*

**بوومەلەرزەیەكی بەهێز چی لەبەردەمدایە رایدەماڵێ**

**شەپۆلەكان زۆر بەهێمنی خۆیان دەكێشن بە رووی زەریای هێمندا، رەنگە بەژێر كەشتییەكدا تێپەڕێ بێ ئەوەی هیچ كاریگەرییەكی تێكات، بەڵام كاتێ دەگاتە وشكانییەكان هێندە بەهێز دەبێت چی لەبەردەمیدابێت رایدەماڵێ.**

**ئەو شەپۆلە توندانەی دەتوت شاخن دەرمێن بەسەر كەنارەكانی پاپوا گینیای نوێ لە ١٧ / ٧ / ١٩٩٨ دەتوت بوومەلەرزەیەكن لە قوڵاییەكانی زەریادا یان داڕمانی شاخێكی بەردینن یان شۆڕشێكی گڕكانن.**

**ویستگەی سەنتەرە جیولۆجیەكان لە هاوای و ئۆستورالیا لە ئێوارەی هەینی١٧ / ٧ / ١٩٩٨ رایانگەیاند كە بوومەلەرزەیەك بە گوڕی ٧ پلە بەپێوەری رێكختەر لە دەریای بسمارك لەسەر كەنارەكانی پاپوا گینیای نوێ دا. مال سمرفیلی سەرۆكی ئەو وێستگەیە وتی : بەڕاستی بوومەلەرزەیەكی زۆر بەهێز بوو و بووە هۆی هەڵسانی شەپۆلەكان بەشێوەیەكی نائاسایی، هەروەها گوندنشینەكانی نزیك كەناری ناوبراو وەسفی توندی ئەو شەپۆلانەیان كرد، وتیان : لەدوای دە خولەك لەبومەلەرزەكە دەنگی دەهات شەپۆلەكان دەتووت لوورەی فرۆكە جەنگیەكانە.كەپر و خانووی گوندە نزیكەكانی نوقمی ئاو كرد و بەتۆن داروتەختەی لەژێر لمی كەنارەكەدا شاردەوە.**

**توندترینی ئەو شەپۆلانەی تا ئێستا لەو كەنارانەیان داوە، ئەوەی ٢٧ / ٨ / ١٨٨٣ بوو پاش ئەوەی گڕكانی كاركاتۆ نێوان هەردوو دورگەی جاوە و سومترەی ئێندۆنیسا هەڵگیرسا وەستی بەهاویشتنی ناوخنەكانی كرد بووە هۆی چالاك بوونی شەپۆلەكان و بەرزی هەندێكیان دەگەیشتە ٣٠ مەتر و بەخێرایی ٥٦٠ – ٧٢٠ كم لە كاتژمێرێكدا و بووە هۆی كوشتنی زیاتر لە ٣٦ هەزار كەس.**

## باراگوای

**ناوی باو:** باراگوای

**ناوی فەرمی:** کۆماری باراگوای

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Paraguay

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێن:

ئەنجومەنی پیران ( ٤٥ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٨٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ١٥٧,٠٤٨ میل دووجا / ٤٠٦,٧٥٢ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥,٠٨٩,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٢,٥ کەس/ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** میستیزۆ ( تێکەڵەیەکن لە ئیسپان و گوارانییەکان )، ئەڵمان، هیندە ئەمریکییەکان.

**ئاین:** مەسیح ( ڕۆمان کاسۆلیك )

**زمان:** ئیسپانی، گوارانی

**پایتەخت:** ئەسنسیۆن

**شارە سەرەکییەکان:** سیۆ داد دیل ئێست، سان لۆرەنزۆ، لامباری، فرناندۆدو لامورا، لوك

**دراو:** گوارانی

**ئاووهەوا:** گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە پایتەختی ئەو وڵاتە لەزستاندا دەچێتە ١٩ پلەی سەدی و لەهاویندا دەگاتە ٢٩ پلەی سەدی. نێوەندی ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە لەنێوان ١٢٥ – ١٦٥ سم دەبێت و لەڕۆژئاوادا لەنێوان ٢٠ – ١٠٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** لۆکە، پاقلە، خووری، داروتەختە، قامیشی شەکر، منیهۆت، گەنمە شامی، تووتن، برنج، بەخێوکردنی مەڕومالات.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** خۆراك، داروتەختە، خووری، چیمەنتۆ، دروستکراوەکانی پێست.

**سامانی کانزایی:** ئاسن، مەنگەنیز

**تێڕوانینێکی گشتی :**

باراگوای وڵاتێکە دەکەوێتە نزیك بەشی ناوەڕاستی ئەمریکای باشوور و باشووری هێڵی یەکسان، لەگەڵ بۆلیڤیا لە باکوورەوە سنووردارە و لەگەڵ بەرازیل لە ڕۆژهەڵاتەوە، ئەرجەنتین دەکەوێتە باشوور و ڕۆژئاوای، هیچ کەنارێکی نییە، یەکێتی هێڵی درێژی ٥٨ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٢٣ بەرەو باشوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێ.

ڕووباری باراگوای لەباشوورەوە بۆ باکوور باراگوای کردووە بە دوکەرتەوە و هەر لەو ڕووبارەشەوە ئەو وڵاتە ناوی باراگوای وەرگرتوە، بە زمانی گوارانی باراگوای بەمانای وڵاتی ڕووباری مەزن دێت. بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەو وڵاتە بە باراگوایی ڕۆژهەڵاتی ناودەبرێت، کە نزیکەی ٤٠٪ ی ڕووبەری وڵات دەبێت و لەسنووری ڕۆژهەڵاتیەکانیدا ڕووباری بارانا ڕێچکە دەبڕێ، تەختی ئەو بەشەش لە بانێکی لوولپێچ و زەوییەکی بەپیت و دارستانێکی چڕ پێك دێت. بەڵام بەشی ڕۆژئاوای بەناوی هەرێمی دەشتی تشاکۆ دەناسرێت. ڕێژەی دانیشتوان لەو بەشەدا کەمترە و زەوییەکانیشی خوێیاوین داروردرەختەکانیشی زۆر بەردار و بەرز ئین.

هیندە سوورەکان کە پێیان دەوترێ گوارانییەکان یەکەم دانیشتوانی ئەو ناوچەیە بوون.لە ساڵی ١٥٣٦ دا ئیسپان وپرتوگالیەکان گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە. لە ساڵی ١٥٨٨ دا کۆمەڵانی ئاینی مەسیحی گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە و مەبەستی سەرەکیشیان ئەوە بوو بتوانن گوارانییەکان کە زۆربەی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە دەبوون بکەن بەمەسیحی تایەفەی ڕۆمان کاسۆلیك. بۆیە دەستیان کرد بە سازدانی چەند مۆڵگەیەکی گەورە و ناوی دەزگا چاکسازییەکانیان لێنابوو و هیندە سوورەکان کاریان تیادەکرد. بەڵام ئیسپانەکان لە ١٧٦٧ دا ڕێیان لێگرتن و دەزگاکانیان پێداخستن و هێندەی نەخایاند مەسیحەکانیان لەو ناوچەیە کردە دەرەوە.

لە سەدەکانی حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا گەلی باراگوای هەستی بەستەم و زۆرداری ئیسپانییەکان کرد و بەدەست باج وەرگرتنەوە تەواو بێزار بووبوون، ئەوەی زیاتریش بێزاری کردن بەزۆر لکاندنیان بەداگیرکراوەیەکی گەورەتر لەخۆیان ناوی نوێنەری شا لە بلاتا و مەڵبەندیشی لە بۆینس ئایرس بوو، ئەمانە بووە هۆی ڕاپەڕینیان لە دەسەڵاتی ئیسپانی و لەڕۆژی ١٤ / ٥ / ١٨١١ توانیان ئیسپانییەکان لەوڵاتەکەیان بکەنە دەرەوە، ساڵانە لەو ڕۆژەدا ئاهەنگی جەژنی نیشتیمان دەگێڕن.

بەڵام باراگوای دوای ئەوە چەند مەینەتی و نەهامەتییەکی گەورەی بەدەست جەنگەوە چەشت، چونکە پاش ئەوەی چەند بەشێکی لە وڵاتی بۆلیڤیا دەستگیر بوو دووچاری تێکشکاندنێکی گەورە بووەوە بۆە هۆی ئەو جەنگەی لەگەڵ هاوپەیمانێتی هەر یەك لە بەرازیل و ئەرجەنتین و ئۆرۆگوای دووچاری بوو نزیکەی ١٤٢,٤٥٠ کم$^2$ و نزیکەی یەك ملیۆن هاوڵاتی لەدەست چوو. هەروەها لەنێوان ئۆرۆگوای و بۆلیڤیاش جەنگێکی گەورە

بەرپابوو لە نێوان ساڵەکانی ١٩٢٨ – ١٩٣٥ دا لەسەر خاوەنداریێتی هەرێمی تشاکۆ، لە دواییدا بەشێکی هەرێمی ناوبراوی دەستگیر بوو لە رێکەوتنامەیەکی نێوان هەردوو وڵاتی ناوبراودا.

باراگوای لەجەنگی جیهانی دووەمدا جەنگی لەدژی وڵاتانی میحوەر راگەیاند، لەساڵی ١٩٤٥ دا پەیوەندی کردووە بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە.

لە ساڵی ١٨١٤ دا خۆزێ گاسبار رۆد ریگویز دی فرانسیسا وەك یەکەم سەرۆکی وڵات دەسەڵاتی گرتە دەست. دوای ئەو کارلۆس ئەنتۆنیۆ لۆبیز لە ساڵی ١٨٤٠ دا بووە سەرۆکی وڵات، پاش ئەویش لە ساڵی ١٨٦٢ کوڕی لۆبیز سۆلانا لۆبیز بووە سەرۆك (لە کۆتاییەکانی جەنگی باراگوای کوژرا). بەهۆی ئەو کێبڕکێ سیاسیانەی لەسەر دەسەڵات لە باراگوایدا رووی دا لەنێوان ساڵەکانی ١٨٧٠ – ١٩٥٤ نزیکەی سی سەرۆك وڵاتی بەخۆوە بینی.

لە ساڵی ١٩٥٤ دا جەنەراڵ ئەلفریدۆ سترۆینسەر وەك سەرۆکی کۆمار هەڵبژێردا، لەنێوان ساڵەکانی ١٩٥٨ – ١٩٨٨ حەوت جار هەڵبژێردرایەوە، تا لە ساڵی ١٩٨٩ لەکودەتایەکی سەربازی بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ ئەندرێ رۆدریجەرز لەسەر حوکم وەلانرا و خودی ئەندرێ بووە سەرۆکی کۆمار. لەساڵی ١٩٩٣ دا ئەندازیار خوان کارلۆس واسمسۆی بۆ ماوەی پێنج ساڵ وەك سەرۆك کۆمار هەڵبژێردرا، دوای ئەو لە ساڵی ١٩٩٨ دا لویس جونزالیس ماتشی بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا.

لە بەرواری ١٩ / ٥ / ٢٠٠٠ دا جەنەراڵی پێشوو لینۆ ئۆڤیدۆ بزوتنەوەیەکی سەربازی یاخی لەوڵاتدا هەڵگیرسان بەمەبەستی ئەنجام دانی کودەتایەك، پاش چوار کاتژمێر کۆتایی کودەتاکە شکستی هێنا و ماتشی خۆی کۆتایی هاتنی یاخی بوونەکەی راگەیاند و بەڵێنی دا کە سزای یاخیبوان بدرێت.

سروودی نیشتیمانی: ئەی باراگواییەکان یان کۆمار یان مردن.

باراگوای وڵاتێکی هەژارە، هێشتا لەقۆناغە سەرەتاییەکانی گەشە کردندایە و باری ئابووری ئەو وڵاتە پشتی بە پلەی یەکەم بەکشتوکاڵی و بەخێوکردنی مەڕوماڵات بەستووە.

لە هاوینی ٢٠٠٢ دا باراگوای چەندین مانگرتن و خۆپیشاندان و ئاژاوەی گەورە بەخۆ بینی لەئاکامی سیاسیەتە چەوتەکانی حکومەت بەرامبەر هاوڵاتیان و شکست هێنانی حکومەت لە باشتر کردنی باری ئابووری دانیشتوان، لەئاکامدا حوکمەت بۆ ماوەی دوو رۆژ حاڵەتی نائاسایی راگەیاند تا بارودۆخەکەی هێمن کردەوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٧.٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٨٥.

تێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٥٧٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٩٤.

## باربادۆس

**ناوی باو:** باربادۆس

**ناوی فەرمی:** باربادۆس

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Barbados

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیایە و دادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك هاتووە:

ئەنجومەنی پیران : ( ٢١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران : ( ٢٨ ئەندام )

**رووبەر :** ١٦٦ میل دووجا، ٤٣٠ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٦٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٦١٦ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی رەش پێست، ئەورووپی، هێندە سوورەکان، تێکەڵ.

**ئاین:** مەسیح

**زمان:** ئینگلیزی

**پایتەخت:** بریدج تاون

**شارە سەرەکییەکان:** سپرینگ هۆڵ، کرین، لۆنگ بی.

**دراو:** دۆلاری باربادۆس

**ئاووهەوا:** مام ناوەند، پلەکانی گەرما لەنێوان ٢١ – ٣١ پلەی سەدی دەبێت، ساڵانە ٢٠٠ سم باران دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** سەوزە ومیوە، گەنمە شامی، شیر، گۆشتی بەراز، قامیشی شەکر، پەتاتە، یام.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوە کیمیاییەکان، دروست کراوەکانی خووری، ئامێری ئەلەکترۆنی، شەکر.

**سامانی کانزایی:** نەوت.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

باربادۆس، بە ئینگلتەرای بچوك دەناسرێت، دورگە وڵاتێکە و یەکێکە لە دورگە هیندییە

ڕۆژئاواکانی ئەو پەڕی ڕۆژهەڵاتی دەریای کاریبی. نزیکەی ٤٣٠ کم لە باکووری ڕۆژهەڵاتی قەنزەویلاوە دوورە. باربادۆس لەیەك دورگە پێك دێت و درێژی کەنارەکانی ٩٠ کم دەبێت. زۆربەی زەویەکانی تەختن و لەهەندێ شوێندا بەرزاییەکی کەمی پێوە دیارە، لوتکە چیای میلانی ( ٣٤٠ م ) بەرزترین خاڵی ئەو دورگەیەیە، یەکێری هێڵی درێژی ٥٩/٣٠ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٣ بەرەو باکوور بە ناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.

هیندە ئەراواکییەکان یەکەم دانیشتوانی باربادۆس بوون و پاشان هیندە کاریبییەکان. پورتوگالیەکان لە سەرەتاکانی سەدەی شانزدەیەمدا دۆزیویانەتەوە و ناویان ناوە لۆس بارباد‌ۆس ( لەسەر ناوی ئەو هەنجیرە دڕکاوییانەی کەلەوێدا بەدیان کردوە). ئینگلیزەکان لە ساڵی ١٦٢٥ دا داگیریان کردووە و لەساڵی ١٦٢٧ دەستیان کردووە بەجێنشینی ئەو دورگەیە، لەسەدەکانی هەژدە و نوزدەیەمدا لێی جێگیر بوون، توانی سەربەخۆیی خۆی لە بەریتانیا دەستگیر بێت بەپێی کۆمنۆلتی بەریتانی لە بەرورای ٣٠ / ١١ / ١٩٦٦ و سەرۆکی نیشتیمان پەروەر ئێرۆڵ بارو ولاتی سەربەخۆ کرد.، ساڵانە لەهەمان ڕۆژدا جەژنی نیشتیمانی دەگێرن، لە هەمان ساڵدا پەیوەندی کردووە بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، لەساڵی ١٩٦٧ دا پەیوەندی کردوەبە ڕێکخراوی وڵاتە ئەمریکییەکانەوە و لەساڵی ١٩٦٨ دا پەیوەندی کردووە بە یەکێتی بازرگانی ئازادی کاریبی. لەگەڵ ئەو بارودۆخە لەبارەی خەڵکی ئەو ولاتە بەلام هێشتا ئارەزووی بەکۆمار بوونی وڵاتەکەیان دەکەن بەتایبەتی دانیشتوانە ڕەسەنەکانی باربادۆس کە باجانییەکانیان پێ دەڵێن و خاوەنی زمانێکی پاراوی ناوخۆ و داب ونەریتێکی جوانن.

باربادۆس یەکێکە لەوڵاتە زۆر چڕەکانی جیهان لەرووی ڕێژەی نیشتەجێ بوونەوە. لە نزیکەی ٣٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە چاندنی قامیشی شەکر و پیشەسازی شەکر باشترین چالاکیە ئابووریەکانی باربادۆسە. کەش وهەوای لەبار و جوانی دیمەنی کەنارە لمییەکانی کە بە کەنارە پیرۆزەییەکان ناسراون ساڵانە نزیکە یەك ملیۆن گەشتیار ڕاکێش دەکات، زۆربەیان لەدانیشتوانی بەریتانیان، بۆیە گەشتوگوزار باشترین داهاتی ئەو وڵاتەی مسۆگەر کردووە.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ١,٧ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣٦.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٦,٥٣٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٥.

## پاکستان

**ناوی باو:** پاکستان

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئیسلامی پاکستان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Islamic Republic of Pakistan

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری یەکگرتوو، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٨٧ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢١٧ ئەندام )

**رووبەر :** ٣٠٧,٣٧٤ میل دووجا، ٧٩٦,٠٩٥ کم$^2$.

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٤١,٠٠٠,٠٠٠ ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٧١/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** بەنجابییەکان، باشتو، سندیەکان، سایراکی، ئۆردو

**ئاین:** ئیسلام ( ٩٧ ٪ )

**زمان:** ئۆردۆ

**پایتەخت:** ئیسلام ئاباد

**شارە سەرەکییەکان:** کەراتشی، حەیدەر ئاباد، پیشاوەر، لاهوور، فەیسەڵ ئاباد، راولبیندی، کۆیتۆ.

**دراو:** روپێی پاکستانی

**ئاووهەوا:** وشکە، زستانی سارد و هاوینی گەرم، پلەکانی گەرما لە زستاندا ٤ پلەی سەدی و لەهاویندا ٣٠ پلەی سەدی، رێژەی ساڵانەی باران دەگاتە ٢٥ سم و زۆربەی بارانەکانیش لەهاویندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، لۆکە، برنج، قامیشی شەکر، ترشەڵۆکییەکان، خورما، سەوزە ومیوە، بەخێوکردنی مەڕوماڵات، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوەکانی خووری، دروست کراوە خۆراکییەکان، پەین، پۆلا، چیمەنتۆ، ووزەی ئەتۆمی.

**سامانی کانزایی:** ئاسن، کرۆمیت، نەوت، گاز، خەڵووزی بەردین.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

پاكستان ولآتێكی ئیسلامیه دەكەوێتە باشووری ئاسیا، تاجیكستان دەكەوێتە باكووری، چین دەكەوێتە باكووری رۆژهەلآتی، هیند دەكەوێتە باشووری رۆژهەلآتی و دەریای عەرەب دەكەوێتە باشووری، ئێران دەكەوێتە باشووری رۆژئاوای و ئەفغانستان دەكەوێتە رۆژئاوای، یەكبڕی هێلی درێژی ٧٠ بەرەو رۆژهەلآت لەگەلْ هێلی پانی ٣٠ بەرەو باكوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.

چیا زۆر بەرزەكان دەكەونە باكوور و رۆژئاوای پاكستان و لوتكەی K٢ دووەم بەرزترین لوتكە لەجیهاندا دوای ئێڤرێست دەكەوێتە ئەو چیایانە و بەرزییەكەی ٨٦١١ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە. دەشتەكانی بەنجاب و سەند دەكەونە رۆژهەلآتی ولآت، بەشێوەیەكی زۆر باش بۆ كشتوكالّی بەگەڕ خراوە و ئاوەڕۆشی لە روباری سندەوە پێگەیەنراوە. بەلآم دەشتی بلوخستان دەكەوێتە رۆژئاوای پاكستان و بەناوچەیەكی وشك و نالەبار ناسراوە و زەویەكەشی بەردەلآنە و هیچ چالاكییەكی كشتوكالّی تیا ئەنجام نادرێت.

لە نزیكەی سالّی ٢٥٠٠ پ. ز ناوچەی شارستانێتی دۆلّی سند گەشە كردنێكی بەرچاوی بەخۆوە بینییوە، بەلآم لە ١٧٠٠ پ. ز لەناو چوو. لەدوای ئەو ماوەیە خەلّكی باشووری رۆژئاوا و ناوەڕاستی ئاسیاوە روویان تێكردووە. لەسەدەی شەشەمی پ. ز كەوتە ژێر دەسەلآتی فارسەوە و لەسالّی ٣٢٦ پ. ز كەوتە ژێر دەسەلآتی ئەسكەندەری مەگدۆنی. لەسەردەمی خەلیفەی ئەمەوی وەلیدی كوڕی عەبدول مەلیك بەسەرۆكایەتی محەمەدی كوڕی قاسمی سەقەفی سالّی ٩٨ ك / ٧١٤ زایینی ئیسلامەكان گەیشتونەتە پاكستان و ئاینی ئیسلامیان بلاوكردۆتەوە. لەسالْ ١٠٠٠ ز توركە ئیسلامەكان گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە و مەحمود گەزنەوی شانشینی ئیسلامی لەو ناوچەیەدا دامەزراندووە، لە سالّی ١٢٠٦ تا ١٥٢٦ سەر بە سەلْتەنەتەی دەلهی بووە ( ئەو كاتەی كەوتە ژێر دەسەلاتی مەغۆلەكان ). لەسەدەكانی هەژدەیەم و نۆزدەیەمدا كێبڕكێ نێوان بازرگانە ئەوروپییەكان دەستی پێكرد، پاكستان كەوتە ژێر دەسەلآتی كۆمپانیای هیندی رۆژهەلآتی. لە سالّی ١٨٥٨ دا حكومەتی بەریتانی دەستی گرت بەسەر كۆمپانیای هیندی رۆژهەلآتی و لەدواییدا حكومەتی بەریتانیا دەستی بەسەر تەواوی ئەو زەویانەكانی كۆمپانیای ناوبراودا گرت كە كەوتبۆوە ژێر دەسەلاتی حكومەتی بەریتانیا و ئیمڕۆ بە : هیند و پاكستان دەناسرێن.

لە بەرواری ٢٣ / ٣ / ١٩٤٠ سەركردەی ئیسلامی محەمەد عەلی جەناح، سەرۆكی پارتی یەكگرتووی ئیسلامی تەواوی هیند و دامەزرێنەری ولاتی پاكستان و یەكەم سەرۆكی ئەو ولآتە پاش سەربەخۆ بوون، لەشاری لاهوور بانگهێشتی دامەزراندنی ولآتێكی سەربەخۆی ئیسلامی كرد تەواوی ئەو ناوچانەی گرتبێتەوە كە ئیسلامیان تێدایە و ناوی پاكستان لەو

ناوچەیە درا کە بڕیار بوو ولاتەکەی لیّ دابمەزرێنێت. ئەمەش چاندنی یەکەم تۆوی دامەزراندنی وڵاتی پاکستان بوو.

لە ١٩٤٧ دا بڕیارێك دەرچوو بە دابەشکردنی هیند بۆ دوو وڵاتی سەربەخۆ. لە ١٤ / ٨ / ١٩٤٧ دا پاکستان بووە وڵاتێکی سەربەخۆ سەر بە کۆمنۆلەتی بەریتانی و لەهەمان ساڵدا پەیوەندی کرد بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە. بۆ رۆژی دوایی هیند بووە وڵاتێکی سەربەخۆ و پاکستانیش رێژەی ٢٣٪ ی خاکی هیند و ١٩ ٪ ژمارەی دانیشتوانی بەرکەوت. بەڵام شەڕو پێکدادانێکی توند لەنێوان ئیسلام و هیندۆسەکاندا بەرپا بوو و بەهەزاران کەس گیانیان لەدەست دا لەکاتی پەڕینەوەی سنوورەکانی نێوان هیند و پاکستان و نزیکەی دە ملیۆن کەس ئاوارە بوون وهەڵهاتن بۆ سەر سنووری وڵاتە دراوسێکان، هیندۆس و سیخەکان بەرەو هیند هەڵهاتن و ئیسلامەکانیش بەرەو پاکستان.

وڵاتی پاکستان لە دوو بەشی دووردا دامەزرا لە نیمچە کیشوەری هیندی و نزیکەی ١٦٠٠ کم لەخاکە هیندییەکان دەکەوێتە نێوانیان و زۆربەی دانیشتوانەکانیشی ئیسلامن:

بەشی یەکەم: بەشی باکووری رۆژهەڵاتی هیندییەو بە پاکستانی رۆژهەڵات دەناسرێت، کە زێی بادما، لقی رۆژهەڵاتی روباری گەنج و زێی میگنا بەشی سەرەکی روباری براهما بۆترا یان تێدەکەوێت.

بەشی دووەم : بە بەشی باکووری رۆژئاوای هیندە و بەپاکستانی رۆژئاوا دەناسرێت و زێ ی سندی تێدەکەوێت.

لە ساڵی ١٩٤٨ دا محەمەد عەلی جوناح ( یەکەم سەرۆکی وڵات ) لە ساڵی ١٩٤٨ دا کۆچی دوایی کردو یاقووت عەلی خان سەرۆکایەتی وڵاتی گرتە دەست و لەساڵی ١٩٥١ دا کوژرا، کوشتی عەلی خان وڵاتی بەرەو ئاژاوە و گرفت وململانێ سیاسیەکانی بەرێوە برد تا ساڵی ١٩٥٨.

لە ٢٣ / ٣ / ١٩٥٦ دا بەپێی دەستووری وڵات پاکستان بوو بە کۆماری ئیسلامی پاکستان، لیوا ئەسکەندەر میرزا بەیەکەم سەرۆکی کۆمار راگەیەنرا، دەسەلاتەکانی زۆر دیاری کراو بوو و تەنها ئەرکی بەرێوەبردنی ئاهەنگە فەرمیەکان بوو، بەڵام دەسەڵاتی فیعلی بەدەست سەرۆك وەزیران بوو. پاکستان ساڵانە لە رۆژی ٢٣ / ٣ دا ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەگێڕێت، ئەو رۆژەی کە کۆماری تیا راگەیەنرا ١٩٥٦ و هەمان ئەو رۆژەی کە دامەزراندنی وڵاتی پاکستان ١٩٤٠.

لە ساڵی ١٩٧١، لە ئەنجامی ئەو جیاوازییە گەورەیە لەرووی ئابوورییەوە لەنێوان پاکستانی رۆژهەڵات و پاکستانی رۆژئاوا هەبوو، شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا و لەئەنجامدا

پاکستانی رۆژهەڵات لە ١٦ / ١٢ / ١٩٧١ بەهۆی سەرکەوتنی و پشتگیری کردنی هیند و پێکهێنانی حکومەتی بەنگلادیش لە پاکستان جیابۆوە، کۆماری پاکستان مایەوە سەر پاکستانی رۆژئاوا.

لە ساڵی ١٩٥٨ دا جەنەراڵ ئەسکەندەر میرزا توانی حکومەتێك لەناوبەرێت کە لەرێی هەڵبژاردنەوە دامەزرابوو، بەڵام پاش چەند رۆژێ سەرۆکی سوپا محەمەد ئەیوب خان توانی حکومەتی ئەسکەندەر بروخێنێ.

لە ساڵی ١٩٦٠ دا ئەیوب خۆی بەسەرۆکی پاکستان راگەیاند، بەڵام لە ١٩٦٩ دا پاش خۆپیشاندان و مانگرتنەکانی بەشی رۆژهەڵاتی پاکستان دەستی لەکار کێشایەوە.

ئەیوب بەر لەوەی دەست لەکار بکێشێتەوە دەسەڵاتی بە جەنەراڵ ئاغا محەمەد یحیا سپارد و ئەمیش لەلایەن خۆیەوە حوکمە عورفییەکانی راگەیاند.

لە ٢٠ / ١٢ / ١٩٧٠، پاش ئەوەی بەنگلادیش سەربەخۆیی خۆی لە پاکستان راگەیاند ئاغا محەمەد یحیا دەستی لەکار کێشایەوە و زولفیقار عەلی بۆتۆ چووە جێی.

لە ٥ / ٧ / ١٩٧٧ دا محەمەد زیائولحەق کودەتایەکی سەربازی رێکدەخات و حکومەتی سەرۆك وەزیران زولفیقار دەروخێنێ و پاش ئەوەی زولفیقار دەستگیر دەکات بەتۆمەتی کوشتن و لەناوبردنی سیاسیەکانی وڵاتەکەی دادگایی دەکات لە ٤ / ٤ / ١٩٧٩ لە سێدارە درا، لەکاتێکدا ئەم حوکمەی جێبەجێ کرد لەتەواوی وڵاتانی جیهان نارەزایی و خۆپیشاندانەکان لەدژی ئەم کردەوەیە راگەیەنرا.

لە ١٧ / ٨ / ١٩٨٨ سەرۆك وەزیران زیائولحەق لە رووداوێکی فرۆکەی گەشتێکی ناوخۆدا دەکوژرێ.

لە ٢ / ١٢ / ١٩٨٨ خاتوو بۆنازیر بۆتۆ، کچی زولفیقار عەلی بۆتۆ پاش ئەوەی بەزۆرینەی دەنگ لەهەڵبژاردنە گشتیەکاندا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت دەبێتە یەکەم ئافرەت لەپاکستاندا پۆستی سەرۆك وەزیران بگرێتە دەست.

لە ٦ / ٨ / ١٩٩٠ سەرۆکی پاکستان ئیسحاق خان دەست بە بۆنازیر بۆتۆی سەرۆك وەزیران لەکار دەکێشێتەوە بەتۆمەتی گەندەڵی و خراپ بەکارهێنانی دەسەڵات.

لە تشرینی یەکەمی ١٩٩٠ دا نەواز شەریفی سەرۆکی پارتی یەکگرتووی ئیسلامی دەبێتە سەرۆك وەزیران پاش سەرکەوتنی لەهەڵبژاردنە گشتیەکاندا.

لە ١٧ / ٤ / ١٩٩٣ سەرۆکی پاکستان ئیسحاق خان بەهۆی خراپی کارگێری نەواز شەریف لە سەرۆکایەتی وەزیران دەکاتە دەرەوە.

لە ١٩ / ١٠ / ١٩٩٣، سەر لەنوێ بۆنازیر بۆتۆ لەهەڵبژاردنە گشتیەکاندا سەرکەوتن

بەدەست دەهێنێت و دەبێتەوە بە سەرۆك وەزیران.

لە ١٥ / ١١ / ١٩٩٦ دا سەرۆکی پاکستان فاروق لیجاری بەتۆمەتۆ گەندەڵی ئیداری دەستی بۆنازیر بۆتۆ لەکار دەکێشێتەوە.

لە ٣ / ٢ / ١٩٩٧ نەواز شەریف پاش سەرکەوتنی لەهەڵبژاردنە گشتیەکاندا دەبێتەوە بە سەرۆك وەزیران ( بۆ جاری دووەم ).

لە بەرواری ١٢ / ١٠ / ١٩٩٨ کودەتایەکی سەربازی بەسەرۆکایەتی پەرویز موشەرەف حکومەتی نەواز شەریف دەڕوخێنێ و وەك دادوەرێکی جێبەجێکەر پەرویز دەسەلات دەگرێتە دەست.

لە ٦ / ٤ / ٢٠٠٠ دادگای لەناوبردنی تیرۆر لە کەراتشی حوکمی هەتا هەتایی زیندانی بەسەر نەواز شەریفدا سەپاند و تەواوی موڵکەکانی گەڕێنرانەوە بۆ حکومەت، ( ئەمە پاش ئەوەی بە تاوانی تیرۆریستی و چەتەیی فرۆکەوانی تاوانبار کرا چونکە هەوڵی خستنە خوارەوەی فرۆکەکەی پەروێزی دابوو ). لە ١٠ / ١٢ / ٢٠٠٠ دا سەرۆکی پاکستان محەمەد رەفیق تارەر بەپێ راسپاردەیەکی تایبەتی دادوەری سەربازی پەروێز موشەرەف لێبوردنێکی گشتی بۆ نەواز شەریف دەرکرا و لە زیندان هێنرایە دەرەوە، ناچار نەواز پاکستانی بەرەو تاراوگە بەجێ هێشت و لە شانشینی سعودی عەرەبی نیشتەجێ بوو.

لە ٢٠ / ٦ / ٢٠٠١ پەروێز موشەرەف کودەتایەکی سپی رێکدەخات بەسەر سەرۆکی وڵات محەمەد رەفیق تارەر، پەرویز خۆی بەسەرۆکی وڵات رادەگەیەنێ جگە لەوەی کەخۆی سەرۆکی وەزیرانیشە. پەروێز هەڵسا بەهەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی کۆمەڵە هەرێمییەکان و سیستەمی دەستووری وڵاتی راستکردەوە و بەڵێنیدا لەماوەی تەنها ساڵێکدا دیموکراسیەت بگەڕێنێتەوە بۆ وڵات و سوێندی دەستووری خوار. موشەرەف پاساوی ئەم کارانە دەگەڕاندەوە بۆ هۆکارە سیاسی و ئابووری ودەستوورییەکان، گوایە بەرژەوەندی باڵای پاکستان وای پێ باشترە و هێندەی نەخایاند رایگەیاند کە هەڵبژاردنێکی گشتی لە ١ - ١١ / ١٠ / ٢٠٠٢ بەڕێوە دەچێت.

لە ٢١ / ٨ / ٢٠٠١ دا پەروێز موشەرەف دەستووری راست کردەوە و مافی هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمانی بەخۆی بەخشی. هەروەها پێکهێنانی ئەنجومەنێکی ئاسایش و نیشتیمانی لە چوار ئەفسەر و هەشت کەسی شارستانی و خۆی سەرۆکی ئەم ئەنجومەنە بێت راگەیاند.

لە ٢٤ / ٨ / ٢٠٠٢ دا پاکستان هەڵسا بەدروست کردنی یەکەم کەشتی ژێر ئاو، شایەنی باسە ئەمە دووەم کەشتی لەم جۆرەیە پاکستان شانازی پێوە بکات و یەکەمیان لەفەرەنسا

بۆی دروست کراوه. کەشتیەکە لە تۆری موشەك هاویشتن و سیستەمی هێرش بردن دروست کراوە و ناوی : سەعەد عەلی شەرەف پاڵەوانی پاکستانەوە ناو نراوە.

لە ٢٨ / ٥ / ١٩٨٨ لە پاکستان پێنج تاقیکردنەوەی ئەتۆمی بەرێوە چوو لەناوچەی شاجای رۆژئاوای وڵات. ئەمە وەك وەڵام دانەوەیەکی ئەو تاقیکرنەوانەی هیند کە لەبەرواری ١١ / ٥ / ١٩٨٨ دا ئەنجامی دابوو. هەروەها دەستی کرد بە هاویشتنی موشەکە دوور هاوێژەکان، زۆربەی وڵاتانی جیهان لەم رەفتارەی نارەزاییان دەربڕی و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سزا ئابوورییەکانی خستە سەر.

لە ٢٠٠٠ دا لەهەردوو هەرێمی بلوخستان و سند وشکی و بێ ئاوییەکی زۆر پەیدا بوو بەهۆی نەبارینی باران وەرزییەکانی ئەو دوو هەرێمە و لەئاکامدا هێندەی نەمابوو برسێتیەکی زۆر بەخۆیەوە بڵاوبکاتەوە، حکومەت بەپەلە بەرەو ئەو کێشەیە بەرێوە چوو و شەمەنەفەرێکی تایبەتی بە ئاو بردن بۆ هەردوو هەرێمی ناوبراو تەرخان کرد جگە لەوەی رێکخراوە مرۆییەکانیش لەلایەن خۆیانەوە بە پەلە بەپیریانەوە چوون.

پاکستان لەرووی مێژووەوە بە وڵاتی سند دناسرا بەهۆی تێپەڕ بوونی رووباری سند بەناو خاکەکەیدا، لەدوای ساڵی ١٩٣٣ دەست کرا بەبەکارهێنانی ناوی پاکستان کە لە لێك دانی دوو وشە پێك هاتووە، پاك : لە زمانی ئۆردییدا بەمانای پاك یان شەریف دێت ستان بەمانای وڵاتی دێت، کەواتە پاکستان بەمانای وڵاتی پاکان دێت.

ئەمە جگە لەوەی هەندێ لەپسپۆران دەڵێن وشەی پاکستان لە پیتە سەرەتاکانی هەرێمەکانی پاکستانەوە هاتووە : ( پنجاب، ئەفغانیا، کشمیر، سەند ) لەگەڵ دوو پیتی کۆتای هەرێمی بلوخستان.

سروودی نیشتیمانی: خوایە خاکی پاکمان بپارێزە

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٥٥,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٢

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤٤٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٤٩.

پاکستان بەپلەی سێیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی مانگۆ دوای هیند ومەکسیك، نزیکەی یەك ملیۆن تۆن لەو میوەیە لە رووبەری ١٠٠ هەزار هێکتار زەویدا بە بەرهەم دێنێت، هەروەها بە پلەی پێنجەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی لۆکە و خورما ( ساڵانە نزیکەی ٥٨٣ هەزار تۆن خورما بەبەرهەم دێنێت ). بەپلەی حەوتەم دێت لە قامیشی شەکر و پلەی دەیەم لەبەرهەمی گەنم و ترشەڵۆکییەکان و پلەی یانزدەیەم دێت

لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەخێو کردنی مەڕوماڵات و بە پلەی سیانزدەیەم دێت لە برنج و پلەی پانزدەیەم دێت لە بەخێو کردنی مانگادا.

لە ١٠ / ٧ / ٢٠٠١ دا سەرۆك پەروێز موشەرەف گەلی لە زیاد بوونی رێژەی لەدایك بووان ئاگادار کردەوە و رایگەیاند کە چەندە رێژەی دانیشتوان بەرەو زیاد بڕوات هێندە کێشە ئابووریەکان دەخوڵقێن.

ناوچەی کشمیر کە دەکەوێتە ئەوپەڕی باکووری رۆژئاوای نیمچە کیشوەری هیندی، بەردەوام کێشەی گەورەی نێوان هیند و پاکستان بووە، لە سەردەمی دروست بوونی پاکستانەوە ١٩٤٧. هیند و پاکستان هەریەك لەلایەن خۆیەوە باس لەمافی رەوای خیان لەکشمیر یان چەند بەشێکی دەکەن. ئەمەش بۆتە هۆی هەڵگیرسانی پێنج شەڕ لەنێوانیاندا لە: ١٩٤٨، ١٩٥٩، ١٩٦٥، ١٩٧١، ١٩٩٩. بۆنازیر بۆتۆی سەرۆك وەزیرانی پێشووی پاکستان دەربارەی کێشەی کشمیر ئەم راپۆرتەی نووسیوە:

## کێشەی کشمیر پێویستی بەسەرۆکایەتییەکی جیهانییە

پاش شەش هەفتە لەو شەڕە خوێناویەیە لە کشمیردا لە بەرواری ٢٦ / ٥ / ١٩٩٩ هەڵگیرسا، کۆمەڵگای نێودەوڵەتی دەرکی کرد بەوەی کە کێشە و شەڕی سەر ئەو ناوچەیە ئەگەرەکانی دروست بوونی شەڕێکی ئۆتۆمی بەرفراوان زیاد دەکات.

بۆچونەکانی ئەم دواییەی کۆمەڵەی هەشت وڵاتەکە جگە لە رای تایبەتی سەرۆك کلینتۆن و سەرۆك وەزیرانی بەریتانیا تۆنی بلێر ئاماژەیان بەوە داوە کە هەر یەك لەهیند و پاکستان پێویستە شەڕ لەنێوانیاندا راگرن و پێشوازیەکی دوولایەنانە لە گفتوگۆ و دانوستانەکان بکەن. چونکە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بەهەمان ئەو رێگایانەی کێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکووری ئێرلەندای چارەسەر کرد، چاوێك بەکێشەی کشمیریش بخشێنێت.

کێشەکانی ئەم دواییانەی کۆسوۆڤۆ ململانێکانی کشمیری لەبیر بردونەتەوە، ئاشتی و هێمنی تەنها بە دەربڕینی نارەزاییەکان کۆتایی پێ نایەت بەڵکو بەکردەوە.

لە ٢٦ / ٥ / ١٩٩٩ بەدواوە هەر یەك لەهیند و پاکستان بەهەزاران گولە تفەنگ و ئار بی جی بەیەکەوە دەنێن و بەسەر هێڵی چاودێرییەوە و بەدوای خۆیاندا کوژران وبریندا بوونی زیاتر لە ١٠٠,٠٠٠ کەسیان بەجێ هێشتووە.

هەرگیز نابێ ئاکامە چاوەڕوان کراوەکانی ئەم کێشەیە لەبیر خۆمان بەرینەوە،ساڵی پێشوو هەموو جیهان سەریان سووڕما کاتێك هیند و پاکستان سەرکەوتنیان لە چالاکییە ئەتۆمییەکانیان راگەیاند و بەوپەڕی شانازییەوە باسیان لەتوانای بەکارهێنانی دەکرد. بەر لە سەد رۆژ پێش ئێستا سەرکردەکانی هەشت وڵاتەکە توانیان کێشەی لاهور بەوپەڕی

هێمنی وئارامی چارەسەر بکەن و هەر یەك لە هیند و پاکستان پێشوازیان لە رێگاکانی چارەسەر کرد، بەڵام دیارە چارەسەر کردنی کێشەی لاهور تەنها بەرواڵەت و ناوەخنەکەشی لاوازییەکی زۆری پێوە دیار بوو.

لەراستیدا تەواوی ئەو وتار و قسانەی بەر لەدوو ساڵ پێش ئێستا لەسەر ئاشتی دەکرا هەر قسە بوون، چونکە هەر یەك لەهیند وپاکستان بەرەو رێگا مەترسیدارەکانی شەڕ ئەچوون. هەردوو وڵات تا ئێستا بەهەردوکیان ) یانزدە تاقیکردنەوەی ئەتۆمیان ئەنجام داوە، ئەمە جگە لە تاقیکردنەوەی هەڵدانی ئەو مووشەکە دوور هاوێژانەی کە سەری ئەتۆمیان پێوەیەو دەتوانن بگەنە قولایەکانی هەر یەك لەو دوو وڵاتە.

ئەو گفتوگۆیانەی نێوان هیند و پاکستان کەلەلایەن زۆربەی وڵاتانەوە پێشوازی لێکرا، جۆرێك لەبێباوەری خوڵقاند و دانیشتنەکەی ١٢ / ٦ / ١٩٩٩ پاش یەك کاتژمێر لەدەست پێکردنی کۆتایی پێهێنرا لەلایەن وەزیرانی دەرەوەی هەردوو وڵات و جۆرێکی نویٚ ی رق و کینەی هەر یەك بەرامبەر ئەوی دی خوڵقاند.

روانگە سیاسیەکان دەربارەی ئەو کێشەیە زۆر دوورن لەیەکەوە، هیند دەیەوێت پاکستان موجاهیدەکانی کشمیر بکشێنێتەوە بۆ ئەو دیو هێڵی چاودێری نێوانیان، پاکستانیش باس لەوە دەکات کە راستە سۆز و بەزەییەکی لەگەڵ هێزی بەرگری ئیسلامیدا هەیە بەڵام هیچ دەسەڵاتێکی فیعلی بەسەریاندا نییە. میلیشیا موسڵمانەکانیش لەلایەن خۆیانەوە رایانگەیاندووە کە گفتوگۆکانی نێوان هیند و پاکستان لە " پیلان " دەچێت و یەکێك لەقسەکەرانی ئەو کۆمەڵە رایگەیاندووە و دەڵیٚ : پاکستان کێیە تا قسە لەسەر چارەنووسی ئێمە بکات.

منیش وەك سەرۆکی ئۆپۆزسیۆنی پاکستان ( لە زمانی بۆتۆوە ) لەلایەن خۆمە زنجیرەیەك هەنگاوی یەکسانم ناو، لەوانە، پێشنیار ئەکەم ئەو پێنج وڵاتە ئەندامە هەمیشەییەی ئەنجومەنی ئاسایش هەستن بە پێك هێنانی لیژنەیەك بۆ ناوبژیوانی ئاگر بەست و پاراستنی پرۆسەی ئاشتی و ئەمیش بە ئامادەبوونی هەر یەك لە هیند وپاکستان و نوێنەرانی گەلی کشمیر.

هەوڵە دیپلۆماتەکان سەرۆك کلینتۆن بانگهێشت دەکات لەگەڵ پەروێز موشەرەفدا دانیشیٚ بۆ بیر کردنەوە لە چارەسەری ئەو کێشەیە . بەڵام تەواوی ئەم هەوڵانە سەرنجی بۆ خاڵێکی گرنگ رانەکێشا ئەویش ئەوەیە کە کشمیر لەساڵی ١٩٤٨ تا ئێستا بە کێشەیەکی گەورە جیهانی ناسراوە، لەو کاتەوەی دەست کرا بەدابەش کردنە نێودەوڵەتیەکانی داگیرکراوەکانی پێشووی بەریتانیا.

رێگای راستەقینەی ئاشتی بۆ کشمیر لەوێوە دەست پێدەکات ویلایەتە یەکگرتوەکان و

چین پێکەوە بانگهێشتی پرۆسەی ئاشتی کشمیر بکەن، چونکە ئەم دوو هێزە گەورەیە پێکەوە دەتوانن نمونەیەکی سەرکەوتووی وەك کامپ دیڤید و ئێرلەندای باکوور لەکشمیردا بخولقێنن.

ویلایەتە یەکگرتووەکان لایەنی هیند دەگرێت لەوەی کە هیند سوورە لەسەر ئەوەی نەهێڵی ئەویان واتا( ویلایەتە یەکگرتووەکان ) رۆڵی ناوبژیوان ببینێ لەنێوانیاندا، چینیش لەلایەن خۆیەوە باش لەهەڵوێستی پاکستان تێگەیشتووە، بۆیە هاوبەشی ئەو دوو زلهێزە پێویستە لەچارەسەری ئەو کێشە گەورەیەدا بۆ هاوسەنگی و خێرا لێك نزیکردنەوەی هەر یەك لە هیند و پاکستان.

چارەسەرکردنی هەر یەك لە کێشەکانی میسر - ئیسرائیل ( لە کامپ دیڤید ) و ئێرلەندای باکوور لە " گود فرایدەی " دا سەلماندیان کە چەندە کێشەکان گەورە بن لەرێی گفتوگۆ و ناوبژیوانی کۆمەڵگای نێودەوڵەتی چارەسەریان زۆر ئاسان دەکات.

بۆیە لێرەدا ئەمەوێ بڵێم (لە زمانی بۆتۆوە ) کە کاتی ئەوە هاتووە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی، بەتایبەتی چین و ویلایەتە یەکگرتووەکان، دەرکیان بەوە کردبێ کە هەوڵە دیپلۆماتیکە دوولایەنەکانی هیند و پاکستان بەتەنها ناتوانێ ئاشتی بۆ کشمیر بەرقەرا بکات.

## واژۆ
## بۆنازیر بۆتۆ

لەبەرواری ۲۸ / ۱۲ / ۲۰۰۷ بۆنازیر بۆتۆ لەلایەن رێکخراوی تیرۆریستی ئەلقاعیدەوە تیرۆ کرا.

لە بەرواری ١٤ - ١٦ / ۷ / ۲۰۰۱ دا سەرۆکی پاکستان پەروێز موشەرەف سەردانی ولاتی هیندی کرد و لەوێ لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی ولاتی ناوبراو ئاتال بیهاری فاجبایدا لەشاری ئەجرای هیندی کۆبوونەوە و باس وگفتوگۆیان لەسەر دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ کێشەی کشمیر وپەوەندییەکانی نێوان هەردوو ولات کرد. بەلام گفتوگۆکان بێ دۆزینەوەی هیچ رێگا چارەیەك کۆتایی پێ هات. ( بۆ زانیاری زیاتر بچۆرە سەر باسی ولاتی هیند).

لە ۲۱ / ۹ / ۲۰۰۱ دا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بریاری دا بەلابردنی سزاکانی سەر هەر یەك لەهیند کە لەدوای تاقیکردنەوە ئەتۆمیەکانی ساڵ ۱۹۹۸ خستبوویە سەریان، لەبەر ئەوەی کە هەریەك لەو دوو ولاتە پشتگیری وپشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانیان کرد لەشەری دژە تیرۆردا کە لەدوای هێرشە تیرۆرییەکانی ۱۱ / ۹ / ۲۰۰۱ ئەمریکا رایگەیاند. شایەنی باسە پاکستان ئاو و ئاسمان وزەوییەکانی لەبەردەم هێزە ئەمریکییەکاندا کردەوە لەسەرەتای مانگی ۱۰ / ۲۰۰۱ دا لەکاتی هێرشەکانی ئەمریکا بۆ سەر ئەفغانستان.

# پالاو

**ناوی باو: پالاو**

**ناوی فەرمی: کۆماری پالاو**

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Palau

**سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.**

**دەستەی یاسادانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:**

**ئەنجومەنی پیران ( ١٤ ئەندام )**

**ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٨ ئەندام )**

**رووبەر : ١٨٨ میل دووجا، ٤٨٨کم$^2$**

**ژمارەی دانیشتوان: ١٧,٢٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )**

**چڕی دانیشتوان: ٣٥ کەس/کم$^2$**

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: گەلی پالاو، فلیپینی، میکرۆنیزی، چینی، ئەوروپی**

**ئاین: مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.**

**زمان: پالاوی، ئینگلیزی**

**پایتەخت: کۆرۆ**

**شارە سەرەکییەکان: کۆنری، میلیکیۆك**

**دراو: دۆلاری ئەمریکی**

**ئاووهەوا: گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدییە، بارانێکی زۆر لەماوین وزستاندا دەبارێت.**

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: گوێزی هیندی، میوە، سەوزە، راوە ماسی، دارستان.**

**بەرهەمە پیشە سازییەکان: دروست کراوە خۆراکییەکان.**

**سامانی کانزایی: بۆکسیت، فۆسفات،ئاڵتون.**

**تێڕوانینێکی گشتی :**

**پالاو، یان پیلۆ وەك هەندێ جار دەڵێن، وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای زەریای هێمن، بەشێکە لەکۆمەڵە دورگەکانی کارۆلین لەناوچەی میکرۆنیزیا، نزیکەی ٨٠٠ کم لە رۆژهەلاتی دورگەی مەندناوەوە دوورە ( یەکێ لە دورگەکانی فلیپین ). پالاو لە نزیکەی ٢٠٠ دورگەی گڕکانی پێك دێت، خاکی هەندێکیان زۆر بەپیتە و هەندێکیان هێندە سەختە بۆ هیچ جۆرێك لەژیان ناگونجێ، تەنها لە هەشتیاندا خەڵك دەژی و گەورەترینیان دورگەی بابلتیابە کە نزیکە ٨٠٪ ی رووبەری دورگەکانی پالاو دەبێت و**

بەندەرێکی سروشتی تێدایە. بەڵام کۆرۆی پایتەخت دەکەوێتە دورگەی کۆرۆ. یەکێکی هێڵی درێژی ١٣٤ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٨ بەرەو باکوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێ.

دورگەکانی پالاو بەیەکەم دورگە دادەنرێ لە کۆمەڵە دورگەکانی میکرۆنیزیا کە مرۆڤ بەر لەهەزاران ساڵ لێی نیشتەجێ بووبێ. ئیسپانیا لە ساڵی ١٨٨٦ دا دەسەلاتی بەسەردا گرتووە، پێش جەنگی جیهانیی یەکەم کەوتە ژێر دەسەلاتی ئەڵمانیا، دوای جەنگی جیهانیی یەکەم یابان دەستی بەسەردا گرتووە. بوو بە سەنتەری سەرەکی تەواوی ناوچەی میکرۆنیزیا. یابانییەکان رێگا و شوێنستە دەرياييەکان و بەندەری نوێیان لێ سازداوە و هاولاتیانی یابانیان لێ نیشتەجێ کردووە. لەماوەی جەنگی جیهانی دووەمدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەستی بەسەردا گرتووە و لەدواییدا لەسەر راسپاردەی نەتەوە یەکگرتوەکان دەسەلاتی تەواوی گرتۆتە دەست.

لە هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا پالاو چەند پلانێکی بەخۆوە بینیوە بۆ ئەوەی سەربەخۆیی دەستگیر بێت، لە ٦ / ٦ / ١٩٨٦ دا ئەنجومەنی راسپاردەیی ئەمریکا کۆتایی بە بەڕێوەبردنی دورگەی پالاو هێنا. بۆیە ئۆتۆنۆمییەکی گرێدراوی بە ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە پێبەخشرا. لە ١ / ١٠ / ١٩٩٤ دا بەتەواوەتی سەربەخۆ بوو، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، بەڵام هەتا ئێستاش پشتی تەواوی بە یارمەتییەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان بەستووە.

پالاو خاوەنی چەند ناوچەیەکی گەشتوگوزاری هێجگار نمونەییە، بەتایبەتی کەنارە بەلم داپۆشراوەکان و دیمەنە سروشتییە جوانەکان و ژیانە دەریاییەکانی، نزیکەی ٦٠٠ گیانلەبەری دەریایی لە دورگەکانی پالاودا دەژی کەلە هیچ ناوچەیەکی دیکەی جیهاندا نییە بۆیە بە دورگەی سامانەکان دەناسرێت. لە ساڵی ١٩٩٧ دا زیاتر لە ٤٥ هەزار گەشتیار روویان تێکردووە، واتا سێ هێندەی دانیشتوانی وپسپۆران وا پێشبینی دەکەن کە ئەم ژمارەیە دەچێتە ٤٠٠ هەزار گەشتیار لەماوەی چارکە سەدەی داهاتوودا. شایەنی باسە ئەم کۆمەڵە دورگەیە لە پەنجا ساڵی داهاتوودا هەڕەشەی نوقم بوونی لەسەرە ( وەك زۆربەی دورگەکانی زەریای هێمن ) بەهۆی ئەو قەتیسییە گەرمییەی لەم دواییانەدا گۆی زەوی گرتۆتەوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٨١,٨ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٨٧

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٥,٠٠٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٧

## بەحرەین

**ناوی باو:** بەحرەین

**ناوی فەرمی:** شانشینی بەحرەین

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kigdom of Bahrain

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی شوورا ( ٤٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ٢٦٨ میل دووجا، ٦٩٧ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦٥٠,٦٠٤ کەس ( تا ٢٠٠١ )

**چڕی دانیشتوان:** ٨٩٣,١ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، ئێرانی، هیند، پاکستانی، ئەورووپی

**ئاین:** موسڵمانان ( ١٠٠٪ ) دانیشتوانە ڕەسەنەکان وبێگانەکانیش مافی پەیڕەوی ئاینی خۆیانیان هەیە.

**زمان:** عەرەبی

**پایتەخت:** مەنامە

**شارە سەرەکییەکان:** شاری عیسی، ئەلمەحرەق، جەو، ئەلرفاع، ئەلعەسکەر

**دراو:** دیناری بەحرەینی

**ئاووهەوا:** وەرزی زستان مام ناوەندە پلەکانی گەرما لەنێوان ١٠ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت، وەرزی هاوین گەرم وشێدارە و پلەکانی گەرما لە ٣٨ پلەی سەدی بۆ سەروو تر دەبێت. ساڵانە ٨ سم باران دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** میوە، خورما، سەوزە، ڕاوەماسی، پەلەوەر

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** سووتەمەنی، گازی پیترۆلی شل، ئەلەمنیۆم، کاغەز، دروست کراوە پلاستیکییەکان.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گاز

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بەحرەین وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامییە لەکەنداوی عەرەبیدا ولەرۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی عەرەبیدایە لە باشووری رۆژئاوای کیشوەری ئاسیایە. بەحرەین لە ٣٥ دورگە پێك دێت و دەکەوێتە سەر کەنداوی سەلوا، گەورەترین وگرنگترینیان دورگەی بەحرەینە کە مەنامەی

پایتەختیشی تێدەکەوێت و نزیکەی ٨٥٪ ی رووبەری تێکرای دورگەکانی ولات دەبێت و درێژییەکەی ٤٨ کم وپانیەکەی ١٦ کم دەبێت، لەرێی پردی شا فەهدەوە کە لەسالی ١٩٨٦ دا دروست کراوە بە شانشینی عەرەبی سعودییەوە دەبەسرێت و زۆر لە مەنامەوە نزیکە ( نزیکەی ٢٤ کم دوورە لێوەی). هەروەها نزیکترین ماوەی نێوان بەحرەین وقەتەر نزیکەی ٢٠ کم دەبێت. دورگەکانی دیکەشی : مەحرەق، ئوم نەعسان، سترە، بەهۆی پردەوە هەموویان بەیەکەوە بەستراونەتەوە، یەکبری هێلی درێژی ٣٠/٥٠ بەرەو رۆژهەلات لەگەل هێلی پانی ٢٦ بەرەو باکوور بەناوەراستیدا تێدەپەرێت.

زۆربەی خاکی بەحرەین نزمە ولە ٦٠ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزتر نییە، شاخی دوخان کە بەرزییەکەی دەگاتە ١٢٢ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا بەبەرزترین خالی ئەو ولاتە دادەنرێ، بەدرێژایی کەناری باکووری دورگەی بەحرەین تا دەگاتە دلی ناوچەی مەنامە شریتێکی تەسك لەخاکە بەپیتەکان رەت دەبێت بەپانی ٥ – ٦ کم دەبێت.زۆربەی ئەو زەوییانەش بە دارستانەکانی دار خورما و چاندنی سەوزە ومیوە چێنراوە. زەوییەکانی بەحرەین بە ئاوە ژێر زەوییەکان ئاسراوە و بۆ کشتوکالی سوودێکی زۆری لێوەردەگیرێ.

ناوی دێرینی بەحرەین: دەلموون پابەندە بە داستانی بەهەشتی عەدەنەوە و هەندێ جار نازناوی مرواری کەنداویشیان لێناوە، یان وتوویانە خاکی ژیان، یان هەمیشە لاوێتی، بەلام ناوی بەحرەین بە زمانی عەرەبی بەمانای دوو دەریا دێت مەبەستیش لەو دوو دەریایە دەریای چوار دەوری دوورگەکانە لەگەل ئەو ئاوە ژێر زەوییانەی خاکی دورگەکانە.

ژمارەی دانیشتوانی شاری سەرەکی قەلای بەحرەین گەیشتە حەوت هەزار کەس لە شارستانێتی دەلموون کە لەنێوانی سالەکانی ٢٢٥٠ بۆ ١٨٠٠ پ.ز بوو. ئاسەوارێکی زۆر لەنێو ئەو گۆرانەدا دۆزراوەتە کە لەماوەی ٥٠٠ سالدا نێژراون و زۆربەیان وای دەردەخەن کە پەیوەندییەکی توند هەبووە لەنێوان دەلموون و قەتیف و زەهران لە شانشینی عەرەبی سعودیەی ئێستادا وفیلکە لەکوێت، ئەم ئەلنار لە ولاتی ئیماراتە عەرەبییە یەکگرتوەکان.

سۆمەرییەکان لە نوسراوێکدا کە دەگەرێتەوە بۆ ٢٣٠٠ سال پ.ز دەربارەی دورگەی بەحرەین نوسیویانە و دەلێن : " کەشتییەکانی دەلموون و مەیلوحە و واکان لە بەندەری ئەکادی یەك ریز دەوەستان"، ئەمەش پەیوەندییە بازرگانیەکانی نێوان ولاتانی ئەو ناوچەیە دەردەخات. هەروەها بەحرەین لەلای ئەغریقیە کۆنەکان بە تایلۆس ناسراوە و هەندێ لەکەرتەکانی ئەسکەندەری گەورە لە سالەکانی ٣٢٤ پ.ز دا سەردانیان کردووە، بلینی مێژووناس لە سال ١٠٠ی ز دا تایلۆس ( بەحرەین ) بەناوچەیەکی پر لە مرواری و بەردە پیرۆزەکان دەناسێنێ. هەروەها نەخشەکەی بەتلیمۆس کە دەگەرێتەوە بۆ سالی ٢٠٠ ی ز

تایلۆس بە بەحرەینی ئێستا دەناسێنێ. لە سەدەی سێهەمی پ.ز هۆزە عەرەبەکان گەیشتونەتە بەحرەین و لەو مێژووەوە لێی نیشتەجێ بوون، ئەوکات بەحرەین بە ( ئەوال ) ناسرا لەسەر ناوی بتی ( ئەوال ) کە هۆزەکانی وائیل کوڕی رەبیعە دەیانپەرست کە حوکمی بەحرەینیان گرتبووە دەست لەو ماوەیەدا. لەساڵی ٦٣٠ ی ز بەدواوە بەحرەین ئاینی ئیسلامی پەیڕەو کردووە، سەر بەئیسلام مایەوە تا دوای سەردەمی خیلافەتی راشدیە وئەمەوی و عەباسیەکانیش.

بەهۆی ئەو ناوچە ستراتیژیەی بەحرەینەوە پۆرتۆگالیەکان چاویان تێبڕیبوو، لەساڵی ١٥٢١ دا داگیریان کردووە و تا ساڵی ١٦٢٢ لەو ناوچەیەدا ماونەتەوە تا ئەو کاتەی هێزێکی هاوبەش بەحرەینی و بەیارمەتی فارسەکان بە سەرکردایەتی ( شا عەباسی گەورە ) پۆرتۆگالیەکانیان کردە دەرەوەی وڵاتەکەیان. فارسەکان بەهۆی ئەو هەڵوێستەیانەوە دەسەڵاتی بەحرەینیان گرتە دەست، بەڵام دەسەلاتەکانیان هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ پۆرتۆگالیەکان نەبوو، باجەکانیان تا دەهات لەسەر زیاد دەکردن وبارودۆخێکی نائارام ناوچەکەی گرتبۆوە ئەمەش بووە هۆی سەرهەڵدانی بزوتنەوەی شێخانی سەربەخۆی بەحرەین و چنگی فارسەکانی کەمێك لاواز کرد، بەڵام لە ساڵی ١٧٢١ دا دیسان فارسەکان دەسەڵاتی ناوچەکەیان بەتوند گرتەوە دۆست و دەستی حاکمی عەرەبییان لەو ناوچەیە لەکار کێشایەوە. سوڵتان عومان سوودی لەنائارامی ناوچەکە بینی و توانیان بەحرەین داگیر بکات و بیخاتە سەر وڵاتی خۆی لەساڵی ١٧٣٨ دا. بەڵام فارسەکان هێرشیان کردەوە سەر و لەدەست سوڵتانی عومانیان دەرهێنایەوە هەستان بەدامەزراندنی حاکمێکی عەرەب لەوناوچەیە پاش ئەوەی زانیان کەناتوانن حاکمی فارس بەڕێوەبەرایەتییان بکات. بەحرەین لەساڵی ١٧٨٣ لەدەست فارسەکان رزگاری بوو. چونکە لەو ساڵەدا فارسەکان پەلاماری ناوچەی زەبارەیان دا کە شێخ ئەحمەد کوڕی محەمەد ئابل خەلیفە حوکمی دەکرد بەڵام شکستیان هێناو و شێخ محەمەد تەنها بەوە نەوەستا کە فارسەکان لەناوچەکەی خۆیدا تێکبشکێنێ، بەڵکو توانی بەحرەینیش رزگار بکات ناوی " ئەلفاتیح " (والأکەر) یان لێناو لەمەوە سەردەمی سەربەخۆیی و گەشە کردنی بەحرەین لەسەر دەستی خێزانی ئال خەلیفە دەستی پێکرد.

میرەکانی ئال خەلیفە لەدوای ساڵی ١٧٨٣ یەك بەدوای یەك حوکمی بەحرەینیان کردووە، تا ئێستاش.پاش کۆچی دوایی شێخ ئەحمەد ئەلفاتیح لە ساڵی ١٧٩٦ شێخ سەلمانی کوڕی ئەحمەد ئال خەلیفە دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، ئەمیش ماوەیەك لە زەبارە نیشتەجێ بووە و لەدواییدا گەڕاوەتەوە بۆ بەحرەین و لەوێ شان بەشانی شێخ عەبدالله ی برای واژۆی

ڕێکەوتنی گشتیان لەگەڵ کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵات کردووە. شێخ سەلمان لەساڵی ١٨٢٥ کۆچی دوایی کردووە و لەدوای ئەو شێخ خەلیفەی کوڕی سەلمان لەگەڵ شێخ عبداللهی مامی بەهاوبەشی حوکمی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. لەپاشدا شێخ محەمەد کوڕی خەلیفەی کوڕی سەلمان حوکمی گرتۆتە دەست، لەپاشدا براکەی شێخ عەلی کوڕی خەلیفە، لەدوای ئەو شێخ محەمەد کوڕی عبدالله ی ئامۆزایان، پاشان شێخ عیسا کوڕی عەلی ئال خەلیفە کە زیاتر لە شەست ساڵ حوکمی بەحرەینی کردووە ١٨٦٩ – ١٩٣٢ و لەپاش ئەویش شێخ محەمەد کوڕی عیسا کوڕی عەلی ئال خەلیفە دەسەڵاتی گرتۆتە دەست.

لە ساڵی ١٨٦١ دا بەحرەین کەوتە ژێر پارێزگاری هێزە بەریتانییەکانەوە، بەریتانیا بەڕێوەبردنی کاروباری وڵاتی گرتە دەست.

لەسەردەمی شێخ عیسای کوڕی عەلی ئال خەلیفە بەحرەین گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، دەست کرا بەدامەزراندنی شارەوانیەکان و دەسەلاتی جێبەجێکردنی یاسا و گومرگ خوێندەواری..هتد. هەروەها لەسەردەمی شێخ حەمەدی کوڕی عیسای کوڕی عەلی ئال خەلیفەدا نەوت لەبەحرەیندا دۆزراوەتەوە ( ١٩٣٢ – ١٩٤٢ ) کە بەیەکەمین ناوچە دادەنرێت لە نیمچە دورگەی عەرەبدا نەوتی تیا دۆزرابێتەوە. لەوەوە سەردەمێکی نوێ لەبەحرەیندا دەستی پێکرد وخزمەتگوزارییە گشتیەکان ( ئاو، کارەبا، تەندروستی...هتد ) هاتە ئاراوە، هەروەها هەستان بە دامەزراندنی پردی شێخ حەمەد کە شاری مەحرەق بە شاری مەنامەوە دەبەستێتەوە. دوای ئەو شێخ سەلمان کوڕی حەمەد ئال خەلیفە لە ( ١٩٤٢ – ١٩٦١ ) دەسەڵاتی گرتە دەست. دوای ئەو لە ١٦ / ١٢ / ١٩٦١ دا شێخ عیسا کوڕی سەلمان ئال خەلیفە دەسەڵاتی گرتە دەست، لەسەر دەستی ئەمیش وڵات گەشەکردنێکی زۆر خێرای لەبوارە سیاسی و کۆمەڵایەتی و کەلتورییەکانی بەخۆوە بینی جگە لەبوارەکانی ئاوەدان کردنەوە.

لە ٦ / ٣ / ١٩٩٩ دا میری وڵاتی بەحرەین شێخ عیسا کوڕی سەلمان ئال خەلیفە کۆچی دوایی کرد ( ٦٦ ساڵ ) و شێخ حەمەدی کوڕی دەسەڵاتی گرتە دەست.

لە ٩ / ٣ / ١٩٩٩ دا شێخ حەمەد کوڕی عیسا فەرمانێکی میری دەرکرد بە دامەزراندنی شێخ سەلمانی کوڕە گەورەکەی بە وەلی عەهدی بەحرەین.

لە بەرواری ١٤ / ٨ / ١٩٧١ دا بەحرەین سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند و لە ١٦ / ١٢ / ١٩٧١ دا هێزە بەریتانیەکان لەوڵاتەکە هاتنە دەرەوە، ساڵانە لە ١٦ / ١٢ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێڕدرێت. لە ساڵی ١٩٧١ دا پەیوەندی کردووە بەنەتەوە یەکگرتوەکان و کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبیەکانەوە.

لە سالی ١٩٧٥ دا زانكۆی كەنداوی دامەزراندووە، لە سالی ١٩٨١ دا لەگەل ولاتانی كەنداوی عەرەبی ئەنجومەنی هاوكاری ولاتانی كەنداوی عەرەبی دامەزراندووە.

لە ١٦ / ٣ / ٢٠٠١ دا دادگای نێودەولەتی لاهای بڕیاری لەسەر ئەو كێشانەی نێوان بەحرەین وقەتەر بەم شێوەیە دا :

بەحرەین دەسەلاتی دورگەكانی : حەوار، جەرادە، دەگرێتە دەست.

قەتەریش دەسەلاتی دورگەكانی: زەبارە، جینان، فشت ئەلدیبەل، دەگرێتە دەست. هەروەها لاهای مافی ئەوەی بەقەتەر بەخشی كەمافی هاتوچۆی هەبێت بەناو ئاوە هەرێمییەكانی ولاتی بەحرەیندا، ئەوانیش ئەو ئاوانەن كە دورگەكانی حەوار لە تێكڕای دورگەكانی بەحرەین جیا دەكاتەوە.

پاش ئاسایی بوونی پەیوەندییەكانی نێوان بەحرەین وقەتەر، لەهاوینی ٢٠٠١ دا بڕیاردرا كە هەستن بەدروست كردنی پردێكی بەحرەین وقەتەر بەیەكەوە دەبەستێتەوە بەدرێژی ٤٨ كم و ئەم پردەش بەدرێژترین پرد دادەنرێت لەجیهاندا.

لە بەرواری ١٤ / ٢ / ٢٠٠٢ دا شێخ حەمەد ئال خەلیفە بڕیارێكی پادشایی دەردەكات بەگۆڕینی سیستەمی حوكمڕانی لەبەحرەیندا بۆ شێوازی شانشینی، بەپێی ئەو بڕیارە نازناوی فەرمی گۆڕا بۆ : خاوەن شكۆی مەزن پادشای بەحرەین. لە بەرواری ٩ / ٥ / ٢٠٠٢ دا هەلبژاردنەكانی ئەنجومەنی شارەوانییەكان بەڕێوە چوو.

ئابووری بەحرەین پشتی بە نەوت و گازی سروشتی بەستووە.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی : ٤,١ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١٠٥

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٧٥٠٠ دۆلاری ئەمریكی

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٤٠

## بەرازیل

ناوی باو: بەرازیل

ناوی فەرمی: کۆماری یەکگرتووی بەرازیل

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Federative Republic of Barazil

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری یەکگرتوو، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

دەستەی یاسا دانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت :

ئەنجومەنی پیران ( ٨١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥١٣ ئەندام )

رووبەر : ٣,٣٠٠,١٧١ میل دووجا، ٨,٥٤٧,٤٠٤ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ١٥٩,٦٩١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ١٨,٧ کەس /کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەوروپی، ئەفەریقی رەش، هیندی ئەمریکا، تێکەڵ

ئـاین: مەسـیح ( رۆمـان کاسـۆلیك، پرۆتـستانت )، هـەروەها نزیکـەی ٦٠٠ هـەزار کـەس ئیسلامن.

زمان: پۆرتۆگالی

پایتەخت: بەرازیلیا

شارە سەرەکییەکان: ریۆ دی جانیرۆ، ساو باولۆ، سلڤادۆر، فۆرتالیزا، ساو لویس.

دراو: ریل

ئاووهەوا: بەدرێژایی ساڵ ئاو وهەوای وڵاتەکە گەرمە، لە شاخ وگردەکاندا بارانێکی زۆر دەبارێت، بەڵام ناوچەکانی باکووری رۆژهەڵات کێشەی وشکی هەیە.

بەرهەمـە کـشتوکاڵیەکان: مۆز، کاکاو، قاوە، گەنمەشامی، قامیشی شـەکر، داروتەختـە، راوەماسی، ترشەڵۆکییەکان، مانگا، بەراز، لۆکە، برنج.

بەرهەمـە پیـشەسازییەکان: ئۆتۆمبێـل، چیمەنتۆ، دروسـت کـراوە خۆراکییـەکان، ئـامێر، کاغەز، لاستیك، پۆڵا، دروست کراوەکانی خووری، ئۆتۆمبێلی بار.

سامانی کانزایی: بۆکسیت، بریلیۆم، کرۆم، ئەلماس، ئاڵتون، ئاسن، کاربۆنەکانی تیتانیۆم، مەگنسیۆم، میکا، نەوت، کریستاڵەکانی کوارتز، تەنەکە، نیکل، زنك.

**تێڕوانینێكی گشتی :**

بەرازیل گەورەترین ولاتانی ئەمریكای باشوورە لەرووی رووبەرو دانیشتوانەوە، هەروەها پێنجەم ولاتی هەموو جیهانە لەرووی رووبەر و دانیشتوانەوە. جگە لە چیلی و ئیكوادۆر لەگەڵ تەواوی ولاتانی ئەمریكای باشوور سنووردارە. لەرووی رۆژهەلاتەوە دەڕوانێتە سەر زەریای ئەتڵەسی. یەكبڕی هێڵی درێژی ٥٥ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٠ بەرەو باشوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێ. لە ٢٦ ویلایەت و یەك ناوچە پێك دێت كە ئەویش ناوچەی پایتەختی یەكگرتوو : بەرازیلیایە.

ناوچەی ئەمازۆن كە روباری ئەمازۆن و زێیە زۆرەكانی دەكەوێتە سەر زۆربەی ناوچەكانی باكووری بەرازیل، كە ئەویش لە زەوییە نزمەكان پێك دێت و بەدارستانێكی زۆر داپۆشراوە جگە لە دوو ناوچەی بەرز نەبێت : بەرزاییەكانی گیانا لەوپەڕی باكوور و بەرزاییە بەرازیلیەكانی باشووری ناوچەكە. دەشتە بە پیتەكانی كە بەمەبەستی كشتوكاڵی بەكاردەهێنرێت دەكەوێتە سەر كەناری زەریای ئەتڵەسی، بەلام باشوور و ناوەڕاستی ولات لەكۆمەڵێك بانی بەرز پێك هاتووە كە بەپیت ترین زەویەكانی ناوچەكە دادەنرێت و زۆربەشی سوودی كشتوكاڵی و لەوەڕی لێوەرگیراوە.

بەر لە گەیشتنی ئەورووپییەكان، هێندە سوورەكان لەو ناچەیەدا ژیاون. دەریاوانی پۆرتوگالی بیدرۆ ئەلفاریس كابرال لە ٢٢ / ٤ / ١٥٠٠ دۆزیویەتییەوە و پۆرتوگال خۆی بەخاوەنی زانیوە.

پۆرتوگالیەكانی ناوی بەرازیلیان بەدار و هەندێ لە درەختەكانی ئەو ناوچەیە هێناوە، چونكە رەنگێكی پشكۆی داگیرساویان هەبووە، بەرازیلیش لە زمانی پۆرتوگالی بەمانای پشكۆی داگیرساو دێت، دیارە ناوی ولاتیش لەو نازناوەوە هاتووە.

لە سەدەكانی شانزدەیەم و حەڤدەیەمدا هەر یەك لە ئیسپان و هۆڵەندی و فەرەنسیەكان لەسەر چەند ناوچەیەكی دووچاری ململانێ بوون. لە ساڵی ١٧٥٠ دا هەر یەك لە پۆرتوگال و ئیسپانیا رێكەوتننامەی مەدریدیان واژۆ كردووە، بەپێ ئەو رێكەوتننامەیە دان بە داواكاریەكانی پۆرتوگال نراوە لەو ناوچەیە. لە كاتی هێرشەكانی ناپلیۆن پۆناپێرت بەسەر پۆرتوگال وداگیركردنی لەساڵی ١٨٠٧ دا، خێزانی پادشایی پۆرتوگال بەرەو بەرازیل هەڵهاتن و لەوێ شانشینی پۆرتوگال بەرازیلی یەكگرتویان دامەزراند و ناوی ئیمپراتۆریەتی پۆرتوگالیەكانیان لێنا ( ١٨١٥ – ١٨٢١ ) و شاری ریۆ دی جانیرۆ یان بەپایتەخت بۆ دیاری كرد.

لە بەرواری ٧ / ٩ / ١٨٢٢ دا ئیمپراتۆر بیدرۆی یەكەم سەربەخۆیی بەرازیلی راگەیاند و

لەساڵ ١٨٢٤ دەستووری تایبەتی بۆ دارشت، ساڵانە لە رۆژی ٧ / ٩ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێردرێت.

ئیمپراتۆرێتی بەرازیلی ئارامی بەخۆوە نەبینی تا هاتنی ئیمپراتۆر بیدرۆی دووەم کەبەو پەڕی نموونەیی و دڵسۆزییەوە حوکم ودەسەڵاتی پەیرەو دەکرد ( ١٨٤٠ – ١٨٨٩ )، ئیمپراتۆر بیدرۆی دووەم دوایین ئیمپراتۆریەکانی بەرازیل بوو، چونکە لە ١٥ / ١١ / ١٨٨٩ دا بەرازیل بوو بەکۆمار و دەستووری نویّ لە ١٨٩١ دا دەرچوو.

حکومەت وکودەتاکان بەدوای یەکدا تا هەشتاکانی سەدەی پێشوو بەدوای یەکدا هاتن. سەرۆکی پێشوو فێرناندۆ کۆلۆر یەکەم سەرۆك بوو بەهەڵبژارنەکانی ١٩٩٠ دا پۆستی سەرۆکایەتی بگرێتە دەست. دوای ئەو ١٩٩٥ سەرۆکی ئێستا ئەنریکی کیاردۆسۆ سەرۆکایەتی گرتە دەست، لە ساڵی ١٩٩٨ دا سەرلەنویّ هەڵبژێردرایەوە.

لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا بەرازیل شەڕی لەدژی ئەڵمانیا راگەیاند، هەروەها لەجەنگی جیهانی دووەمیشدا جەنگی شەڕی لەدژی ئەڵمانیا وئیتاڵیا راگەیاند. لە ساڵی ١٩٤٥ دا پەیوەندی کردووە بەنەتەوەی یەککگرتوەکانەوە.

لە ساڵی٠ ١٩٦ دا پایتەختی کۆنی ( ریۆ دی جانیرۆ ) گۆڕی بۆ بەرازیلیا کە دەکەوێتە ناوەراستی وڵات.

تەواوی وڵاتانی ئەمریکای باشوور زمانی فەرمییان ئیسپانییە جگە لە بەرازیل نەبێت زمانی فەرمی پۆرتۆگالییە، لەگەڵ ئەوەی هەندێ لە دانیشتوانەکانی زمانی ئیسپانی یان ئیتاڵی قسە دەکەن و لەگەڵ چەند زمانێکی هیندی ئەمریکی، جگە لە شلری سۆرینام کە بەزمانی هۆڵەندی قسە دەکەن.

بەرازیل دووچاری کێشەیەکی قورس بۆتەوە لە گۆڕینی لەوڵاتێکی تازە پێگەیشتوەوە بۆ وڵاتێکی گەشەکردوو، لەگەڵ ئەوەی کە بە پلەی نۆیەم دێت لە تێکرای داهاتی نەتەوەیی بەڵام بە پلە یەکەمەکانی وڵاتان دادەنرێت لەجیاوازی بارودۆخی ئابووری کۆمەڵایەتییدا.

بەرازیل پاش سی ساڵ لە لێکۆڵینەوە خۆی ئامادە دەکات بۆ چوونە ناو یانەی داخراوی وڵاتانی بەرهەمهێنەری ووزەی ئەتۆمی، پیتاندنی یۆرانیۆم کە بە ئاڵۆزترین قۆناغی بەرهەمی وزەی ئەتۆمی دادەنرێت، شایەنی باسە بەرازیل نرخێکی زۆری پێشکەش کردووە لەپێناوی بەرهەم هێنانی ئەو وزەیە.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٥٣٦,٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٩

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣,٢٧٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٥٩.

بەرازیل بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی قاوە و قامیشی شەکر و ئاسن و ترشەڵۆکییەکان و مۆز. هەروەها بە پلەی دووهەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی کاکاو و مانگا و بەپلەی سێهەم دێت لەبەرهەمی گەنمە شامی و تەنەکە، بەپلەی چوارەم دێت لەبەراز و بۆکسیت و بەپلەی پێنجەم دێت لە دار وتەختە، بەپلەی شەشەم لە بەرهەمی لۆکە وبەپلەی حەوتەم دێت لەبەرهەمی ئاڵتون، بەپلەی هەشتەم دێت لە برنج، بەپلەی دەیەم لە نیکل و بەپلەی شانزەهەم دێت لە شەراب و شانزدەیەم لەبەرهەمی زنك، بەپلەی حەڤدەیەم لە مەڕوماڵات و پلەی نۆزدەیەم لە سووتەمەنی.

* * *

## ئاهەنگی یادی ٥٠٠ ساڵەی دۆزینەوەی بەرازیل

لە بەرواری ٢٢ / ٤ / ٢٠٠٠ دا بەرازیل ئاهەنگی یادی دۆزینەوەی بەرازیلی لەلایەن پۆرتۆگالیەکانەوە گێڕا، هەردوو سەرۆك : فردیناند ئەنریکی ( سەرۆکی بەرازیل )، جۆرج سمبایۆ ( سەرۆکی پۆرتۆگال) هەستان بەچاندنی درەختی بەرازیل ( ئەو درەختەی کەناوی وڵاتی لێوەی هاتووە) لە بۆرتۆ سیگۆی باشووری ویلایەتی باهیا،باهیا شارێکی سەر کەنارە ونزیکەی ١٠٠ کم لە باکووری ریۆ دی جانیرۆوە دوورە، ئەو شارەیە کە دەریاوانی پۆرتۆگالی ئەلفاریس کابرال لە ٢٢ / ٤ / ١٥٠٠ دا لێی دابەزیوە.

بەرازیل لەسەر تەختی پادشایی تۆپی پێی جیهانە

لە بەرواری ٣٠ / ٦ / ٢٠٠٢ دا بەرازیل لە حەڤدەیەمین پاڵەوانێتی بۆ جامی جیهانی تۆپی پێدا کە لە نێوان ٣١ / ٥ – ٣٠ / ٦ / ٢٠٠٢ ی خایاند لە هەر یەك لەکۆریا باشوور و یابان سەرکەوتنی بەدەست هێنا. یاری کۆتایی لەنێوان ئەڵمانیا و بەرازیل بوو لە یاریگای نێودەوڵەتی یۆکۆهامای یابانی،لەو یارییەدا بەرازیل توانی دوو گۆڵی پاگ لە ئەڵمانیا بکات و بەمەش بۆ جاری پێنجەم بووە پاڵەوانی جیهان.

ساڵەکانی سەرکەوتنی بەرازیل لە جامی جیهانیدا:

١٩٥٨، ١٩٦٢، ١٩٧٠، ١٩٧٤، ٢٠٠٢.

## پۆرتۆگال

**ناوی باو:** پۆرتۆگال

**ناوی فەرمی:** کۆماری پۆرتۆگال

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Portuguese Republic

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی کۆمار ( ۲۳۰ ئەندام )

**رووبەر:** ۳٥,٤٥٦ میل دووجا، ۹۱,۸۳۱ کم$^{۲}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ۹,۹٤۳,۰۰۰ ( تا ۱۹۹۸ )

**چڕی دانیشتوان:** ۱۰۸,۳ کەس/ کم$^{۲}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** پۆرتۆگالی، گەلی دورگەکانی سەر سەوز، بەرازیلی، ئیسپانی، بەریتانی، ئەمریکی.

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، جوولەکە، ئیسلام، بێ باوەڕ.

**زمان:** پۆرتۆگالی

**پایتەخت:** لەشبوونە

**شارە سەرەکییەکان:** بۆرتۆ، فیلا نۆڤا دو کاسیا، ئەمادۆرا، کویمبرا، براگا

**دراو:** ئێسکۆدۆ، ( یۆرۆ لە بەرواری ۱ / ۱ / ۲۰۰۱ ) بەدواوە.

**ئاووهەوا:** زەریایی مام ناوەند، لەهاویندا پلەکانی گەرما دەگاتە ۲۱ پلەی سەدی و لەزستاندا دەچێتە ۱۰ پلەی سەدی و رێژەی ساڵانەی بارانەکانی ٥۰۰ ملم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** تری، تەماتە، پەتاتە، پەلەوەر، شیرەمەنی، گەنمە شامی، راوە ماسی، بەران، مانگا.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** دروست کراوە خۆراکییەکان، دروست کراوەکانی خووری، کاغەز، ئامێری کارەبایی، بەرهەمی تەپەدۆر، پیلاو، چیمەنتۆ، پەین.

**سامانی کانزایی:** مس، خەڵووز، یۆرانیۆم، تەنەکە.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

پۆرتۆگال وڵاتێکە کەوتۆتە ئەوپەڕی رۆژئاوای ئەوروپا، یەك لەسەر شەشی دورگەی ئیبیرای داگیر کردووە، بەڵام ئیسپانیا کە دەکەوێتە باکوور و رۆژهەڵاتی پۆرتۆگال بەشەکانی دیکەی دورگەکەی گرتۆتەوە، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە باشوور و رۆژئاوای پۆرتۆگال، هەروەها دورگەکانی مادێرا و ئازۆری زەریای ئەتڵەسیش دەچنەوە سەر پۆرتۆگال. یەکبڕی هێڵی درێژی ۸ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٤۰ بەرەو باکوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت. پۆرتۆگال لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا لە دەشتێکی کەناری پێك دەێت، هەندێ جار تەنگ

ئەبێتەوە و هەندێ جار بەرفراوان دەبێت. بەڵام بەرزاییەکانی باکووری و زنجیرە چیاکانی ناوەڕاست بەشی دیکە وڵات پێك دەهێنن.

بازرگانە فینیکییەکان لەسەدەی نۆیەمی پ. ز بەناوچەکە هاتوچۆیان کردووە. لەسەدەکان پێنجەم وشەشەم پ. ز یۆنانیەکان داگیرکاوەکانیان لەوێدا پێك هێناوە. لەنێوان سەدەکانی دووەمی پ.ز و پێنجەمی زایینی کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی رۆمانەکان. قووتە رۆژئاواییەکان لە سەدەی پێنجەمدا داگیریان کردووە.

عەرەبە ئیسلامەکان لە ئەندەلوس لەساڵەکانی ٩٥ك / ٧١٤ ز / بەسەرکردایەتی عەبدول عەزیزی کوڕی مەسا کوڕی نەسیر چوونەتە پۆرتۆگال، شایەنی باسە پۆرتۆگالیەکانی هیچ دەسەلاتێکی سیاسی ئەوتۆیان نەبووە بۆیە عەرەبەکان ناوی رۆژئاوا واتا رۆژئاوای ئەندەلوسیان لێناوە، عەرەبەکان لە لەشبۆنەدا مانەتەوە تا ئەو کاتەی یەکەم شای پۆرتۆگالی دۆق ئەلفۆنسۆ هێنریك ) لەژێر چنگی دەرهێناون و هەر لەوێ شانشینی پۆرتۆگالی پێك هێناوە، بەڵام عەرەبەکان لەباشووری وڵات ماونەتەوە تا ساڵی ١٢٥٠.

لەماوەی سەدەکانی پانزدەیەم و شانزدەیەمدا، لەسەر دەستی گەڕیدە دۆزەرەوە سەرچڵە پۆرتۆگالیەکان سەردەمی دۆزینەوەی جیهانی نوێ دەستی پێکرد. دەریاوان فاسکۆ دیگاما یەکەم رێگای دەریایی بەرەو ئاسای دۆزییەوە لە ١٤٩٧ دا، گەیشتە هیند لەساڵی ١٤٩٨. لە ٢٠ / ٩ / ١٥١٩ دا دەریاوانی پۆرتۆگالی فێردیناند ماجەلان گەشتە دەریاییە بەناوبانگەکەی بەچوار دەورەی گۆی زەویدا دەست پێکرد و ئەمەش بەیەکەم گەشتی لەم جۆرە دادەنرێ لە جیهاندا، لەدواییدا بوو بە بەناوبانگترین گەشتەکانی جیهان. ئەم گەشتانە بوونە هۆی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی پۆرتوگال و هێندە بەرفراوان بوو زۆربەی ناوچەکانی ئاسیا وئەفریقیا و ئەمریکای باشووری لەخۆ گرتبوو. بەڵام هێندەی نەخایاند ئیمپراتۆریەتی پۆرتۆگالیەکان بەرەو رمان دەچوو و زۆربەی ناوچەکانیان کەوتە دەست ئیسپانییەکان لە ١٥٨٠ دا، پۆرتۆگالیەکانیش لەلایەن خۆیانەوە لێیان هەستان و شەڕی ئازادی ١٦٤٠ – ١٦٦٨ هەڵگیرسا لەنێوانیاندا. لە ساڵی ١٧٠٣ پۆرتۆگال پەیوەندی کردووە بەهاوپەیمانێتی شۆڕشی فەرەنساوە. بەڵام هێندەی پێنەچوو فەرەنسا پەلاماری داو لە ساڵی ١٨٠٧ داگیری کرد، لەئاکامدا خێزانی پادشایی پۆرتۆگال بەرەو بەرازیل هەڵهاتن( بچۆرە سەر وڵاتی بەرازیل )، پاش ئەوەی هێزە بەریتانیەکان پەلاماریان دا هێزە فەرەنسیەکان لە ساڵی ١٨١٠ لێی کشانەوە. لە ١٨٢٠ شۆڕشێکی ناوخۆ لە پۆرتۆگال هەڵگیرسا و لەئاکامی ئەو شۆڕشە لە ١٨٢٢ دا دەستووری نوێ راگەیەنرا، هەمان ساڵی سەربەخۆیی بەرازیل.

لە ٥ / ١٠ / ١٩١٠ سیستەمی پادشایی رەتکرایەوە و رژێمی کۆماری دامەزرا. یەکەم سەرۆکی کۆمار تیۆفیلۆ براگا بوو کە بەڵێنی چاکردنی دەستووریدا. لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا چووە پاڵ هاوپەیمانان و شەڕی لەدژی ئەڵمانیا راگەیاند. بەڵام لەجەنگی جیهانی دووەمدا بێ لایەنی بۆخۆی هەڵبژارد. لەساڵی ١٩٥٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە شەست و حەفتاکانی سەدەی پێشوو تەواوی داگیرکراوەکان سەربەخۆ بوون جگە لە دورگەکانی ئازۆر و مادێرای باکووری زەریای ئەتڵەسی.

لە کۆتاییەکانی ١٩٩٩ دا داگیرکراوەی ماکاوی سەر بەکەناری باشووری رۆژهەلاتی چینی گەڕاندەوە بۆ ولاتی دایک چین.

. لە ساڵی ١٩٧٦ یەکەم هەڵبژاردن لە پۆرتۆگالدا پاش پەنجا ساڵ ئەنجام درا، لەو هەڵبژاردنەدا پەرلەمان وسەرۆك هەڵبژێردرا، ئەنتۆنیۆ ئیناس بەسەرۆکی ولات هەڵبژێردرا و دوای ئەو لە ١٩٨٦ دا جۆرج ماریۆ سواریز بەسەرۆك دیاری کرا، لە ساڵی ١٩٩٦ جۆرج سمبایۆ پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست، لە ١٥ / ١ / ٢٠٠١ بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیکە بەسەرۆك هەڵبژێردرایەوە. سەرۆکی پۆرتۆگالی سەرۆکی هێزە چەکدارەکانە، بەلام رۆڵی سیاسی تەنها لە ناوبژیوانی و قورساییەکاندا خۆی دەبینێتەوە، دەسەلاتی جێبەجێ کردن لەدەستی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە.

ناوی پۆرتۆگال یەکەم جار لە ساڵی ١١٠٠ بەدواوە بەکار هاتووە، ئەو ناوەش لە شاری پۆرت یان پۆرتۆوە وەرگیراوە کە دەکەوێتە سەر رێژگەی روباری دۆرۆ لە زەریای ئەتڵەسی، لەوەو پێش پێی وتراوە پۆرۆتۆگالیە، واتا دەروازەی گالیە، گالیەش ناوچەیەکە لە پۆرتۆگال، و بەلێکدانی هەردوو وشە ناوی پۆرتۆگال هاتۆتە ئاراوە، ئەمە لە سەردەمی شا ئەلفۆنسۆی شەشەم بوو.

پۆرتۆگال یەکێکە لەولاتە هەرە هەژارەکانی کیشوەری ئەوروپا، بەلام لەدوای شەستەکانی سەدەی پێشوو باری ئابووری ئەو ولاتە گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی و بایەخێکی گەورە درا بەچالاکی پیشەسازی و ئێستا پیشەسازی بەیەکێك لەستوونە هەرە بەهێزەکانی ئابووری ئەو ولاتە دادەنرێ.

ئەمە جگە لەوەی چالاکی گەشتوگوزاریش رۆڵێکی بەرچاویان هەیە لەگەشە کردنی ئابووری و داهاتی نەتەوەیی ئەو ولاتە چونکە ساڵانە زیاد لە دە ملیۆن گەشتیار رووی تێدەکەن.

سروودی نیشتیمانی : پۆرتۆگالیەکان

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٩٢،١ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٢٣

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٩،٢٧٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٣٢

پۆرتۆگال بە پلەی پێنجەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە بەرهەمی شەراب و زەیتون و تەنەکە و بەپلەی پانزدەیەم دێت لە بەرهەمی مس دا.

## برۆنای

**ناوی باو:** برۆنای

**ناوی فەرمی:** سەڵتەنەتی برۆنای دەروازەی ئاشتی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

State of Brunei Adobe of Peace

**سیستەمی حوکمرانی:** سەڵتەنەتێکە، سوڵتان بۆ هەتا هەتایە حوکمی دەکات، هەر خودی خۆیشی سەرۆکی حکومەت و وەزیری دارایی و وەزیری ناوخۆیە.

**دەستەی یاسا دانان:** لەئەنجومەنێکی راوێژکاری هەڵنەبژێردراو پێك دێت.

**رووبەر :/** ٢,٢٢٦ میل دووجا / ٥,٧٦٥ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:/** ٣٠٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:/** ٥٣کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** مەلایوییەکان، چینی

**ئاین:** ئیسلام ٨٠٪، بوودی، مەسیح

**زمان:** مالاوی، ئینگلیزی

**پایتەخت:** بەندەری سیری بێجاوان

**شارە سەرەکییەکان:** سیرا، کوالا بیلیت، تۆتۆنگ

**دراو:** دۆلاری برۆنای

**ئاووهەوا:** گەرم و وشکە وبەدرێژایی ساڵ باران دەبارێت، پلەی گەرما بەدرێژایی ساڵ ٢٧ پلە سەدییە، نێوەندی رێژەی ساڵانەی باران لەناوچە کەنارییەکاندا ٢٥٠ سم و لەناوچە ناوخۆکاندا ٣٢٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** بەرهەمێکی کشتوکاڵی هێندە لاوازە شایەنی باس نییە لە برنج و مۆز و راوەماسی، دارستان.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** دروستکراوەکانی نەوت وگاز.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گازی سروشتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

برۆنای، یان وەك ئەوسا بەناوی بۆنی یان بۆلی ناودەبرا، وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە سەر کەناری باکووری دورگەی بۆرینۆ لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا. دەریای چینی باشوور دەکەوێتە باکووری و لە رووەکانی دیکەشەوە لەگەڵ بەشی مالیزییەکەی دورگەی بۆرینۆدا سنووردارە. یەکێری هێڵی درێژی ١١٥ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤/٣٠ بەرەو باکوور بەناوەراستیدا تێدەپەرێت.

زۆربەی زەوییەکانی برۆنای یەکسانە، ناوچە ناوخۆییەکانی بەدارستان داپۆشراوە، دەشتە تەنگەکانیش بەدرێژایی کەنارەکانی تێدەپەرێت. روباری برۆنای بە پایتەختەکەیدا تێدەپەرێت و دەڕژێتە نێو دەریای چینی باشوورەوە.

لە سەدەی حەوتەمی زایینیدا برۆنای سەنتەرێکی بازرگانی زۆر گرنگ بوو، ناویشی لەکتێبە مێژوویەکانی چینیدا هاتووە. لە سەدەی سیانزدەیەمدا یەکەم سولتان لەسەر تەختی پادشایی دانیشتووە. ئاینی ئیسلام لەسەدەی چواردەیەمی زایینی گەیشتۆتە ئەو ناوچەیە. کەشتییە بازرگانیەکانی برۆنای هەرەشەی بەردەوامیان دەکردە سەر کەشتیە ئەوروپییەکان لە باشووری رۆژهەلاتی ئاسیادا. بۆیە لە ١٩٨٨ بەریتانیا پارێزگاری خۆی بەسەردا سەپاندووە. لە ١ / ١ / ١٩٨٤ سەربەخۆیی دەستگیر بووەو لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە ساڵی ١٩٢٩ دا نەوت لە چەند کێڵگەیەکی دوور لەکەنارەکانی دۆزراوەتەوە و ئەمەش برۆنای کردە وڵاتێکی دەوڵەمەند. نەوت وگاز بەیەکەم وتاکە سەرچاوەی داهاتی ئەو وڵاتە دادەنرێن بۆیە پێویستی بەچەند چالاکییەکی جیاوازی ئابووری هەبوو بۆ گەشە پێدانی بارودۆخی وڵاتەکەی.

لە ماوەی شەش سەدەوە تا ئێستا خێزانی سولتانی ئێستایان حوکم ودەسەڵاتی وڵاتی گرتۆتە دەست. لە ساڵی ١٩٦٨ دا حەسەن بەلقیە موعیز ئەلدین وادۆلا بۆتە ٢٩ هەمین سولتان پاش باوکی. سولتان لە بەرواری ١٥ / ٧ / ١٩٤٦ دا لەدایك بووە بۆیە رۆژی ١٥ / ٧ ی هەموو ساڵێك بەجەژنی نیشتیمانی ئەو وڵاتە دادەنرێت. سولتان دوو ژنی هێناوە: ( راجا ستیری ئەناك سەلیحە ) و ( بەنجریان ستیری حاجی مەریەم ) و چوار کوڕ و شەش کچی لێیان بووە. لە بەرواری ١٠ / ٨ / ١٩٨٨ موهتەدی باللە ی کوڕی ( ٢٤ ساڵ ) بەوەلی عەهد هەڵبژێردرا. لەگەڵ ئەوەی کە موهتەدی خاوەنی دوو خوشکی لەخۆی گەورەترە بەلام بەپێی یاسای وڵاتەکەیان کچ بۆی نییە ببێتە خاوەنی ئەو پلە وپایەیە.

تەلاری سولتان کە ناوی ( ئاستانەی نور ولئیمان ) ی لێنراوە لەساڵی ١٩٨٤ دا دروست کراوە وبە گەورەترین تەلار لەهەموو جیهاندا دادەنرێت، تەلارەکە لە ١٧٨٨ ژوور پێکهاتووە. سولتان خاوەنی ٢٠٠٠ ئۆتۆمبێلە و بەمەش ژمارەی ئۆتۆمبێلەکانی خێزانی پادشایی دەگاتە ٥٠٠٠ دانە. سولتان بەو سامانە زۆرەوە کەبە ٣٧ ملیار دۆلار مەزەنە دەکرێ لە ساڵی ١٩٩٥ بە دەوڵەمەنترین کەسی سەر رووی زەوی دانرا، بەلام لە ساڵی ٢٠٠٠ دا ئەو سامانە بەشێوەیەك دابەزی کە تەنها بڕی سێ ملیار دۆلاری ئەمریکی مایەوە بەهۆی خەرجی نارەوا و خراپی کارگێڕی جەعفەری برای سولتان و ئەمەش سولتانی ناچار کرد زۆربەی کەلوپەلە تایبەت ونایابەکانی بفرۆشێت بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە ئابوورییەی کە دووچاری بوو لە ٢٠٠١ دا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٧.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١٤,٢٤٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢٥

## بەریتانیا

**ناوی باو:** بەریتانیا

**ناوی فەرمی:** شانشینی یەکگرتووی بەریتانیا مەزن وباکووری ئێرلەندا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

United Kingdom of Great Britain and Northern Ireland

**سیستەمی حوکمرانی:** پادشایی دەستووری، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان و پێك دێت لە :

ئەنجومەنی لۆردەکان: ( ١١٩٤ ئەندام )

ئەنجومەنی گشتی ( ٦٥١ ئەندام )

**رووبەر :** ٩٤,٢٥١ میل دووجا، ٢٤٤,١١٠ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥٨,٩١٩,٠٠٠ کەس.

**چڕی دانیشتوان:** ٢٤١,٤/ کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** بەریتانی، ئێرلەندی، گەلی سکۆتلەندا، گەلی ویڵز، چەند کەمایەتییەکی دیکەش.

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك، ئەنگلیکان )، سیخ، هیندۆس، جوولەکە، لەگەڵ ٢ ملیۆن موسڵمانیش.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** لەندەن

**شارە سەرەکییەکان:** پرمەنگەهام، گلاسکۆ، لیدز، شفیلد، لیڤەربول، برادفۆرد، مانشستەر.

**دراو:** جونەیهی ئێستەرلینی ( پاوەن ).

**ئاووهەوا:** مام ناوەند، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا ٥ پلەی سەدی، لەهاویندا ٢٢ پلەی سەدی لە باشوور و ١٨ پلەی سەدی لە ئێرلەندای باکوور. لەوپەڕی باکووریشدا پلەکانی گەرما دەچێتە ژێر سفری سەدی. رێژەی ساڵانەی باران بارین تایبەتی لە رۆژئاوادا دەگاتە ٥٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گۆشت، شیر، پەلەوەر، هێلەکە، بەراز، بەخێوکردنی مەڕوماڵات، جۆ، پەتاتە، چەوەندەر، گەنم، راوەماسی، داروتەختە، سەوزە و میوە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوە خۆراکییەکان، دروست کراوە کیمیاییەکان، دەرمان، کەلوپەلی کارەبایی و ئەلیکترۆنی، ئاسن وپۆڵا، بەرهەمە کانزاییەکان، دروست

كردنی فڕۆكه و كەشتیه ئاسمانییەكان، شووشه.

سامانی كانزایی: نەوت، گازی سروشتی، خەڵوزی بەردین، تەنەكە.

تێڕوانینێكی گشتی :

بەریتانیا یان ئینگلتەرا یان دورگە بەریتانییەكان، وڵاتی كۆمەڵە دورگەیەكە ولەچوار وڵاتی یەكگرتوو لەژێر دەسەلاتی یەك حكومەتدا پێك هاتووە، ئەوانیش: ئینگلتەرا، ئێرلەندای باكوور، سكۆتلەندا، ویلز، شانشینی یەكگرتوو كۆیكردونەتەوە، دەكەوێتە باكووری رۆژئاوای ئەوروپا. دورگەی بەریتانی لە تەواوی دورگەی بەریتانیەكان و دورگەی ئێرلەندا وهەندێ لە دورگە بچوكەكانی دراوسێی پێك هاتووە.دەریای باكوور ئەم دورگانەی لە ئەوروپا جیا كردۆتەوە لە رووی رۆژهەلاتەوە وكەناڵی ئینگلیزی لە باشوورەوە، زەریای ئەتڵەسی كەوتۆتە رۆژئاوا. یەكبڕی هێڵی درێژی ١ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٥٤ بەرەو باكوور بەناوەڕاستی تێدەپەڕێت.

ئەم دورگانەش سەر بە بەریتانیان:

یەكەم: دورگەكانی دەریای كاریبی: تۆركس، كیكۆس، ئەنگویلا، فیرجینی بەریتانی، كایمان، لەگەڵ دورگەی مۆنتسیرات.

دووەم: دورگەكانی زەریای ئەتڵەسی: برمۆدا، فۆكلاند، ساوس جۆرجیا، ساندویش، ساوس شیتلاند، ساوس ئۆركنی،سانت هیلانە، تریستان داكونها، ئەسێنشن.

سێهەم: دورگەكانی تشاجۆس لە زەریای هیندی.

چوارەم: دورگەكانی بیتكێرن لە زەریای هێمنی باشوور.

پێنجەم: دورگەی مان لە دەریای ئێرلەندی.

شەشەم: دورگەكانی كەناڵ و دورگەی ماین لە كەناڵی ئینگلیزی.

زۆربەی زەوییەكانی وڵات بریتییە لە دەشتەكان یان زەوییە لوولپێچەكان، بەڵام بەشە شاخاوییەكان دەكەوێتە باكووری سكۆتلەندا، كە ئەمانەن: بەرزترین لوتكەی بەریتانیای كە لوتكەی بین نیڤیزە و بەرزییەكەشی دەگاتە ١٣٤٣ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا، هەروەها بەرزاییەكانی بەناین بەدرێژایی سنووره باشوورییەكانی سكۆتلەندا درێژ دەبنەوە وبەناوەڕاستی ئینگلتەرا تێدەپەڕێت، لەگەڵ چیاكانی كامبریا لە ویلز.

بەر لەنیو ملیۆن ساڵ خەڵكان لەوناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، سیللیتییەكان لە سەدەی حەوتەمی پ.ز داگیریان كردووە، دوای ئەوان رۆمانەكان لە ساڵی ٤٣ پ.ز پەلامایان داوە وبنكە سەربازییە چەكدارەكانیان لێ دامەزراندووە بەمەش بۆتە ناوچەیەكی رۆمانی. بەڵام لە ساڵی ٤١٠ دا لاوازی بەریتانیای رۆمانی گرتەوە و دەسەلاتی مەركەزی لەدەست رۆمانیەكان

ئەما کەوتە دەست کۆمەڵێ دادوەری جیاجیا. بارودۆخەکە بەم شێوەیە مایەوە تا لەسەدەی شەشەمی زایینی دا ساکسۆنییەکان پەلاماریاندا.لەساڵی ١٠٦٦ دا ولیەم سەرکردایەتی هەڵمەتی نۆرمەندی کرد وبەریتانیای والآ کرد ولەناوەراستی سەدەی دوانزدەیەمدا نۆرمەنییەکان چەند بەشێکی دیکەی ئێرلەندای باکووریان والآ کرد، لەسەرەتای سەدەی سیانزدەیەمدا سوڵتانی ئینگلیز توانی وێلزیش بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی. لەساڵی ١٧٠٧ دا یەکێتی نێوان ئینگلتەرا وسکۆتلەندا ئەنجام درا. هەروەها لەساڵی ١٨٠٠ دا ئینگلتەرا یەکێتی لەگەڵ ئێرلەنداش راگەیاند. لەگەڵ ئەوەی ئینگلتەرا لەساڵی ١٧٨٣ دا کۆمەڵێ داگیرکراوەی زۆری لەدەستدا لە ئەمریکای باکوور، بەلآم پێشکەوتنە دەریاییەکانی توانی بیگەیەنێتە رادەیەك لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا ببوە زلهێزترین ولآتی جیهان وزیاترین داگیرکراوەی هەبوو هیچ هێزێ نەبوو لەتەواوی جیهاندا بەرەو رووی بوەستێت.هەر لەو ماوەیەدا شۆرشی پیشەسازی کردییە بەتوانا ترین ولآتی پیشەسازی لە جیهاندا.لەدەیەکانی سەدەی بیستەمدا یەکگرتووی کۆمنۆلتی بەریتانی جێگای ئیمپراتۆریەتی بەریتانی گرتەوە. لەساڵی ١٩٢١ دا ئێرلەندای باکوور بووە بەشێکی شانشینی یەکگرتوو، ئێرلەندای باشوور بووە ئێرلەندای ئازاد و لە ١٩٤٩ دا بووە کۆماری ئێرلەندا. بەریتانیا بەشداری لەهەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ودووەمدا کردووە و لەهەردوو جەنگەکەدا سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.لەساڵی ١٩٤٥ دا پەیوەندی کرووە بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە، لە ساڵی ١٩٤٩ دا پەیوەندی کردووە بە هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسی.

جاریەجارێ لە بەریتانیا لەرێی هۆیەکانی راگەیاندنەوە قسە وگفتوگۆ لەسەر دوارۆژی خێزانی پادشایی بەریتانی دەکرێت وبیر لە کۆمار کردنی بەریتانیا دەکرێتەوە.

لە ٦ / ٥ / ١٩٩٩ دا هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکان هەڵبژاردنی کۆمەڵەی گشتی لە سکۆتلەندا لە هەرێمی ویڵز بەرێوەچوو، پارتی کرێکاران لەهەردوو هەرێمی بەریتانیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، لە سکۆتلەندا سەرکەوتنی بەسەر پارتی نەتەوەیی سکۆتلەندیدا هێنا کە بەردەوام باس لەماف جیابوونەوە لە شانشینی یەکگرتوو دەکات. وێلز توانی ببێتە خاوەنی ئەنجومەنی نیشتیمانی و ئەمەش بەیەکەم پەرلەمانی وێلز دادەنرێت.

بەپێی ئەو هەڵبژاردنانە، پەرلەمانی سکۆتلەندی ماف ئەوەی هەیە دارایی ساڵانەی خۆی بگرێتە دەست و کاروباری هەرێم لە ئەرکە ناوخۆییەکانی وەك خوێندن و تەندروستی و یاسا ماف باج بەرێوەبەرێت. بەلآم کاروبارەکانی دەرەوەی وەك بەرگری و ئابووری و گواستنەوە و ووزە لەژێر دەسەلآتی پەرلەمانی لەندەندا دەمێنێتەوە.

بەلام کۆمەڵەی گشتی لەویڵز دەسەلاتەکانی لەوەی پەرلەمانی سکۆتلەندی کەمتر دەبێت.

ئەم هەڵبژاردنە مێژووییانە ئاشکرایان کرد هەر یەك لە گەلی ویڵز وسکۆتلەندا ماف سەربەخۆییەکی زیاتریان دەوێت لە حکومەتی مەرکەزی لەندەن وچاویان نەبڕیوەتە سەربەخۆییەکی یەکجارەکی لە بەریتانیا، ئەمەش بۆتە هۆی پتەو بوونی شانشینی یەکگرتوو، بەپێچەوانەی ئێرلەندای باکوور کە بۆتە ململانێی چەند ڕەوت ولایەنێکی جیاواز لەنێوان سەربەخۆیی و پەیوەست بوون بە بەریتانیاوە ( بگەڕێوە بۆ باسی ئێرلەندای باکوور).

بەریتانیا ولاتێکی دەستووری پادشاییە. هەندێ لەبەندەکانی دەستووری بەریتانی نووسراوەیە وهەندێکی نەنووسراوەیە وپشتی بەدابونەریتە باوەکان بەستووە، شا یان شاژن سەری گەورەی ولاتە، خاوەنە وحوکم ناکات. بەلام دەسەلاتی فیعلی بەدەست سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە کەهەر خۆی سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی بەریتانییە. دەسەلاتەکانی ئەنجومەنی گشتی بەریتانی بەرفراوانترە لەوەی ئەنجومەنی لۆردەکان، هەڵبژاردنی ئەندامەکانی هەر پێنج ساڵ جارێك ئەنجام ئەدرێت، بەڵام سەرۆکی وەزیران ماف ئەوەی هەیە داوا لە پاشا بکات ئەنجومەنی گشتی هەڵوەشێنێتەوە هەڵبژاردنی نوێ ئەنجام بدرێت. بەڵام ئەنجومەنی لۆردەکان ئەنجومەنێکی بۆماوەییە، لەم ساڵانەی دواییشدا چەند هەوڵێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی بەمیراتی ئەنجومەنی لۆردەکان دراوە.

لە ساڵی ١٩٧٩ خاتوو مارگرێت تاتشەری سەرۆکی پارتی پارێزگاران دەسەڵاتی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی گرتە دەست، دوای ئەو لەساڵی ١٩٩٠ دا جۆن مێجۆری سەرۆکی هەمان پارت دەسەڵاتی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی گرتە دەست، دوای ئەو لەساڵی ١٩٩٧ تۆنی بلێری سەرۆکی پارتی کرێکارانی بەریتانی پاش ئەوەی لەهەڵبژاردنەکانی هاوینی ٢٠٠١ دا سەرکەوتنێکی بێ وێنەی هێنا پۆستی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی گرتە دەست.

خێزانی پادشایی تا ئێستا لەبەریتانی ڕێز وخۆشەویستییەکی تایبەتیان هەیە لەلایەن گەلی بەریتانییەوە، ئەوان لەساڵی ١٠٦٦ بەدواوە دەسەلاتی پادشاییان گرتۆتە دەست، ئەوانیش:

ئەلیزابێس باوزلیۆن: شاژنی دایك، دایکی شاژنی بەریتانیایە، لە ٤ / ٨ / ١٩٠٠ لەدایك بووە ولە ٤ / ٨ / ٢٠٠١ دا یادی جەژنی لەدایك بوونی ١٠١ هەمین ساڵی گێڕا وبەنیاز بوو ببێتە راگری بەتەمەنەکانی بەریتانیا، بەڵام لە ٣٠ / ٣ / ٢٠٠٢ دا کۆچی دوایی کرد.

ئەلیزابیسی دووەم: ناوی تەواوی : ئەلیزابێس ئەلێکساندرا ماری یە، شاژنی شانشینی

يەكگرتووە، لە ١٩٢٦ دا لە لەندەن لەدايك بووە، لە ٦ / ٢ / ١٩٥٢ دا حوكمى گرتۆتە دەست، لە ٢٠٠٢ دا گەلى بەريتانيا ئاھەنگى يادى ٥٠ ساڵەى دەسەڵاتى شاژنيان گێڕا و يۆبيلى زێڕينيان پێ بەخشى، لەنێو باخچەكانى بێگنهام، كە مەڵبەندى جێنشينى خێزانى پادشاييە لە لەندەن، ئاھەنگەكە بەڕێوە چوو، بەريتانييەكان زۆر بەخۆش حاڵيەوە پێشوازييان لەم ئاھەنگە كرد بەدەم گۆرانى وسەماكردنەوە پێشوازيان لەشاژن كرد لەكاتى گەشتەكەيدا بەنێو شارە بەريتانيەكاندا.

مير تشارلز ئارسەر جۆرج: وەلى عەھدى تاجى بەريتانييە، كوڕى شاژنى بەريتانيا ئەليزابێسى دووەمە و لەدايك بووى ١٩٤٧.

ناوى وڵات بەريتانيا، ئينگلتەرا، لەناوى ئەو هۆزانەوە هاتووە كە لەو ناوچەيەدا نيشتەجێ بوون.

سروودى نيشتيمانى: خوايە شاژن بپارێزە

شانشينى يەكگرتوو ساڵانە لە رۆژى ٢١ / ٤ ئاھەنگى نيشتيمانى دەگێڕن، رۆژى لەدايك بوونى ئەليزابێسى دووھەمە ١٩٢٦.

لە دواى ساڵى ١٩٦٥، لەھاوينى ھەموو ساڵێك لەناوچەى نتنگ ھێلى رۆژئاواى لەندەن، دووھەم گەورەترين فيستيڤال لەجيھاندا ويەكەم گەورەترين فيستيڤال لە ئەورووپادا بەوشێوە دەچێتە پێش، بەسەدان ھەزار كەس لەوانەى بەرەچەڵك كاريبيين بە بەرگى جوان ورەنمەسيحەنگەوە وبەدەم مۆسيقا وگۆرانى ووتنەوە بەشدارى ئەم فيستيڤاڵە دەكەن، زياتر لە مليۆنێكى كەس لەتەواوى ناوچەكانى جيھانەوە بۆ سەير كردنى ئەم فيستيڤاڵە ئامادە دەبن.

شانشينى يەكگرتوو ئەمرۆ يەكێكە لەولاتە ھەرە پێشكەوتوەكانى جيھان لەرووى پيشەسازى وكشتوكاڵى وبازرگانييەوە، لەگەڵ ئەوەى خاوەنى سەرچاوەيەكى سروشتى زۆر كەمە،بەڵام بە يەكێك لەوڵاتە گرنگەكانى جيھان دادەنرێت، چونكە شۆرشى پيشەسازى لەوێوە ھەڵگيرسا وبەريتانييەكان توانيان گەورەترين ئيمپراتۆريەت دابمەزرێنن بەدرێژايى مێژوو ( ئەو ئيمپراتۆريەتەى خۆرى لێ وون نابێت )، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ توانا ولێھاتويى زانا وسەركردە بليمەتەكانى.

تێكڕاى داھاتى نەتەوەيى: ١٠٦٩ مليار دۆلارى ئەمريكى

ريزبەندى لەنێو وڵاتانى جيھاندا : ٦.

نێوەندى خەرجى ساڵانەى تاك: ١٨,٤١٠ دۆلارى ئەمريكى

ريزبەندى لەنێو وڵاتانى جيھاندا: ٢٠.

## بەلجیکا

ناوی باو: بەلجیکا

ناوی فەرمی: شانشینی بەلجیکا

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Kingdao of Belgique

سیستەمی حوکمڕانی: پادشایی دەستووری یەکگرتوو، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٧١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥٠ ئەندام )

رووبەر : ١١,٧٨٣ میل دووجا، ٣٠,٥١٨ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ١٠,١٨٩,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٣٣٢,٨کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: بەلجیکی ( فلامەند، والۆن )، ئیتاڵی، مەغریبی، فەرەنسی، تورك، هۆڵەندی.

ئاین: مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك )، نزیکەی ٢٥٠ هەزار موسڵمانیش.

زمان: هۆڵەندی، فەرەنسی، ئەڵمانی

پایتەخت: برۆکسل

شارە سەرەکییەکان: ئەنتوێرب، غێنت، شالیروا، لیج

دراو: فرانکی بەلجیکی ( لە ١ / ١ / ٢٠٠٢ بەدواوە یۆرۆ )

ئاووهەوا: مام ناوەند وباراناوییە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەهاویندا ١٨ پلەی سەدی و لەزستاندا ٢ پلەی سەدی، رێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ١٠٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: جۆ، کەتان، پەتاتە، قامیشی شەکر، گەنم، بەخێوکردنی مەڕوماڵات، شیر

بەرهەمە پیشە سازییەکان: چیمەنتۆ، دروست کراوە کیمیاییەکان، شووشە، بەرهەمەکانی پێست، کاغەز، دروست کدرنی ئامێری ئەلەکترۆنی.

سامانی کانزایی: بەردی کلسی، بەردە لمییەکان، رخام، ووزەی کارەبا بەهۆی وێستگەی ئەتۆمییەوە.

تێڕوانینێکی گشتی :

بەلجیكا وڵاتێكە دەكەوێتە باكووری رۆژئاوای ئەوروپا، هۆڵەندا دەكەوێتە باكووری وئەڵمانیا ولوكسمبۆرگ دەكەونە رۆژهەڵاتی وفەرەنسا دەكەوێتە رۆژئاوای ولەرووی باكووری رۆژئاواوە دەریای باكوور لە بەریتانیای جیای دەكاتەوە.

یەكێ هێڵی درێژی ٤/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥١ بەرەو باكوور بەناوەراستیدا تێدەپەرێت.

زۆربەی خاكی وڵاتی بەلجیكا تەختاییەو شاخی زۆر بەرز و رێگری سروشتی تیا نییە رێ لە گواستنەوە و هاتوچۆكان بگرێت، چەند روبارێكی گەورە بەناو بەلجیكادل تێدەپەرێت بۆ گواستنەوە وهاتوچۆ سوودی لێوەرگیراوە.

لە سەدەی دووەمی پێش زاییندا هۆزێك بەناوی بەلجی لەم ناوچەیەدا ژیاون وناوی وڵات لەوانە هاتووە. یۆلیۆس قەیسەر لە ساڵی ٥٠ پ.ز دا پەلاماری وڵاتی بەلجیكای داوە، دوای روخانی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بەلجیكا لە سەدەی پێنجەمی زایینی كەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی فەرەنجییەكان.

دوای شارلمان بەلجیكا لە دۆخێكەوە بۆ یەكێكی تر گوازراوەتەوە، تا لەگەڵ هۆڵەندادا كەوتنە ژێر دەسەڵاتی ئیسپانیا بەهۆی ژن وژن خواز ومیراتی. لەو سەردەمەدا تەواوی ئەو ناوچەیە بەهۆڵەندای ئیسپانی دەناسرا. بەڵام هۆڵەندیە پرۆتستانەكان حوكم ودەسەڵاتی پادشایەكی كاسۆلیكی ئیسپانییان رەتكردەوە و بەیارمەتی پرۆتستانتە بەریتانیەكان توانیان خۆیان رزگار بكەن وكۆمارێكی تایبەت بەخۆیان دروست بكەن.

بەلجیكای كاسۆلیك هێشتا شۆرشی رانەگەیاندبووە، بەڵام هەستی بە گرفتێكی گەورە دەكرد چونكە كەوتبووە نێوان دوو وڵاتی دوژمنی یەك، هۆڵەندا لەلایەكەوە و فەرەنساش لەلاكەی ترییەوە، پاش جەنگی ئیسپانی دەسەلات كەوتە دەستی نەمسا وپاشان فەرەنسا لەسەردەمی ناپلیۆندا، كاتی دیاری كردنەوەی سنوورەكانی وڵاتانی ئەوروپا لە ئەنجومەنی ڤیننا ساڵی ١٨١٥ دەستی پێكرد، دەسەڵاتی بەلجیكا درایە دەست هۆڵەندا، بەڵام بەهۆی یارمەتی بەریتانی و فەرەنسییەكانەوە بەلجیكییەكان لە ١٨٣٠ دا توانیان سەربەخۆیی خۆیان بەدەست بهێنن و لەو مێژووەوە شانشینی سەربەخۆی بەلجیكی راگەیەنراوە.

لە ساڵی ١٨٨٥ بەلجیكا كۆنگۆی داگیر كرد و بەداگیركراوەیەكی بەلجیكی رایگەیاند، لە دوای ساڵی ١٩٦٠ سەربەخۆیی بە ئەنگۆلا بەخشییەوە. لەهەردوو جەنگی جیهانیی یەكەم ودووهەمدا بەشداری كردووە وئەڵمانیا لەهەردوو جەنگدا داگیری كردووە.لە ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان و لە ساڵی ١٩٤٩ دا بەشداری لە دامەزراندنی هاوپەیمانی باكووری ئەتڵەسی ( ناتۆ ) كردووە، لە ساڵی ١٩٧٥ هاوبەشی كردووە لە دامەزراندنی

کۆمەڵـەی ئـابووری ئـەورووپی. بـەلجیکا بەیـەکێ لەوڵاتـە چـڕەکان دادەنـرێ لـەرووی دانیشتوانەوە، دوای جەنگی جیهانی دووەم بۆتە سەنتەرێکی گەورەی چالاکییە ئابووری وسیاسـیەکان، زۆربەی رێکخـراوە جیهانییـەکان ولاتـی بـەلجیکایان وەك مەڵبەنـدی خۆیـان هەڵبژاردووە وەك رێکخراوی ناتۆ و کۆمەڵەی ئەورووپی.

دەسـەڵاتی فیعلـی بەدەسـت سـەرۆکی ئەنجومـەنی وەزیرانـە وتـا پەرلـەمان دەنـگ بـدەن لەدەسـەلاتدا دەمێنێتـەوە وپادشـا رۆڵێکـی هێمـایی دەبـینی، پادشـای ئێـستا : ئـەلبێرتی دووەمە کە لەدوای شا بدوێنی یەکەمی برای هاتۆتە سەر حوکم پاش ئەوەی شا بدوێن لە ٣١ / ٧ / ١٩٩٣ کۆچی دوایی کردووە.

جەژنی نیشتیمانی: رۆژی سەربەخۆییە ٢١ / ٧

سروودی نیشتیمانی: سەردەمی کۆیلایەتی بەسەرچوو

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢٣١ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٩

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢٢,٩٢٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٤

## بولگاریا

**ناوی باو:** بولگاریا

**ناوی فەرمی:** کۆماری بولگاریا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Bulgaria

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ٢٤٠ ئەندام )

**رووبەر :** ٤٢,٨٥٥ میل دووجا / ١١٠,٩٩٤ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٨,٣٢٩,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٧٥کەس/ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** بولگاری، تورك، قەرەج.

**ئاین:** مەسیح ئەرسودۆکی ( ٨٠٪ )، ئیسلام ( ٩ ٪ )، جوولەکە.

**زمان:** بولگاری

**پایتەخت:** سۆفیا.

**شارە سەرەکییەکان:** بلۆڤدیڤ، ڤارنا، بۆرگاس، بیلڤن، کازانلۆك، کۆبریف شتیتا.

**دراو:** لیڤ

**ئاو وهەوا:** کیشوەری، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا لەناوچەی نزیك دەریای رەش ١٨ پلە لەژێر سفری سەدیدا، لەهاویندا لە زۆربەی ناوچەکانی وڵات ٢٤ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٦٠ سم دەبێت و لەسەر چیاکان دەگاتە ١٠٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، گەنمەشامی، چەوەندەری شەکر، تریێ، تووتن، شیر، گوڵ.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئامێر، خواردنی ئامادەکراو، رۆن گوڵ، دروست کراوە کانزاییەکان، خواردنەوەکان، دروست کراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** خوێ، گۆگرد، قورقوشم، مس، لینیت، کاولین.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بولگاریا وڵاتێکە دەکەوێتە نێو نیمچە دورگەی بەلقان لە باشووری رۆژهەڵاتی ئەورووپا. رۆمانیا دەکەوێتە باکووری و دەریای رەش دەکەوێتە رۆژهەڵاتی و تورکیا ویۆنان دەکەونە باشووری. مەگدۆنیا ویۆگۆسلاڤیا دەکەونە رۆژئاوای. یەکێری هێڵی درێژی ٢٥ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٢/٣٠ بەرەو باکوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.

زۆربەی زەوییەکانی بولگاریا شاخاوییە ودۆڵ ودەشتەکان بەنێوانیاندا تێدەپەڕێت، بانی دانووب کەوتۆتە باکووری وڵات، زنجیرە چیای ستارا بلانیتا لەناوەڕاستی بولگاریاوە بۆ رۆژهەڵاتی درێژ دەبێتەوە وپاشان هەندێ لەنزمایییەکانی تێدەکەوێت بەر لەگەیشتن بە چیاکانی رۆدۆب لەو پەڕی باشووری وڵات.

تەراقییەکان بەر لە سێ هەزار ساڵ لەمەوبەر یەکەم شارستانێتیان لەو ناوچەیەدا بنیات ناوە، هۆزەکانی بولگار لەوێدا نیشتەجێ بوون، ناوی وڵات لەوانەوە هاتووە وناویان لەسەرچاوەکانی پێش سەدەی پێنجەم هاتووە. لەسەرەتاکانی سەدەی یەکەمی زایینی ناوچەکە بۆتە بەشێك لە ئیمپراتۆرێتی رۆمانی، پاشان بۆتە بەشێك لە ئیمپراتۆرێتی بیزەنتی ( ١٠١٨ – ١١٨٥ ). پاش ئەوەی شانشینێکی نیشتیمانی لێ دامەزرێنراوە لە نێوان ( ١١٨٥ – ١٣٩٦ )، تورکە عوسمانییەکان لە نێوان ( ١٣٩٦ – ١٩٠٨ ) خستوویانەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. لەو ماوە دوور ودرێژەدا بولگارییەکان چەند شۆڕشێکیان لەدژی تورکەکان هەڵگیرساندووە بەتایبەتی شۆڕشی ساڵی ١٨٧٦ بەڵام عوسمانییەکان توانیویانە هەموو هەوڵ وشۆڕشەکانیان لەناو بەرن. دوای شەڕی روسی – تورکی ( ١٨٧٧ – ١٨٧٨ )، بولگاریا بووە ئیمارەتێکی سەربەخۆ لە ٣ / ٣ / ١٨٧٨ وبووە خاوەنی ئۆتۆنۆمییەکی تایبەتی خۆی بەپێی پەیماننامەی سان ستیڤانۆ، بەلام تا ٥ / ١٠ / ١٩٠٥ بەتەواوەتی سەربەخۆیی بەخۆیەوە نەدی، تا ئەو کاتەی فێرناندۆی یەکەم سەربەخۆیی بولگاریای لە ئیمپراتۆرێتی عوسمانی راگەیاند و نازناوی قەیسەری بولگاریای بەخۆی بەخشی. بولگاریا ساڵانە لە رۆژی ٣ / ٣ ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەگێڕێت.

لە ساڵەکانی ١٩١٢ – ١٩١٣ دووچاری جەنگی بەلقانی یەکەم ودووەم بووە، ولەئاکامی ئەو جەنگە بۆتە هاوپەیمانی وڵاتانی ناوەڕاست لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا. لەجەنگی جیهانی دووەمەمدا بۆتە هاوپەیمانی وڵاتانی میحوەر، لەهەردوو جەنگی ناوبراودا بەتێکشکاوی هاتۆتە دەرەوە. لە ٨ / ٩ / ١٩٤٤ دا هێزە سۆڤێتییەکان هێرشاین کردۆتە سەری و بۆ رۆژی دوایی یەکێ لەکۆکەڵە سیاسییەکان بەسەرکردایەتی شیوعییەکان توانیان دەسەڵاتی بولگاریا بگرنە دەست وسیستەمی شیوعێتیان راگەیاند وخێزانی پادشاییان لەناوبرد. لە ساڵی ١٩٥٥ دا پەیوەندی کردووە بە نەتەوە یەککرتوەکانەوە.

لەکۆتایی هەشتاکاندا و پاش ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر یەکێتی سۆڤێت هات، چەندین خۆپیشاندان لەدژی حکومەتی بولگاری ئەنجام درا، لەئاکامدا دەست کرا بەدەرکردنی یاسایەکی نوێ بۆ گۆڕینی سیستەمی شیوعی و دەست هەڵگرتنی ئەو سیستەمە لەحکومەت ودەسەڵات. لە کۆتایەکانی ١٩٩٠ دا هەڵبژاردنە گشتییەکان لەبولگاریا دەستی پێکرد

وچەندین پارت ولایەن بەشداریان تیاکرد، پارتی سۆسیالیتی سەرکەوتنی بەسەر زۆربەی لایەنەکاندا هێنا.

لە ١٠ / ١١ / ١٩٨٩ پاش ئەو خۆپیشاندان ومانگرتانەی ئاژاوەی لەتەواوی ولاتدا دروست کرد، حکومەتی سەرۆك تیۆدۆر چیفکۆف روخا ولەبری ئەو پیتەر ملادینۆف دەسەلاتی تا مانگی هەشتی ١٩٩٠ گرتە دەست، واتا تا ئەو کاتەی دەسەلاتەکان بە جیلیو جیلیف سپێردرا و تا مانگی ١١ / ١٩٩٦ ی خایاند، دوای ئەو بیتار ستۆیانۆف دەسەلاتی گرتە دەست.

لە سالی ١٩٣٧ دا میر سیمیۆن لە خێزانی ساکس – کۆبرجی پادشایی لەسۆفیا لەدایك بوو. سیمۆن کوری گەورەی شا بۆریسی سێهەم بوو، شا بۆریس لە سالی ١٩٤٣ دا کۆچی دوایی کرد و سیمیۆنی دووەم لەتەمەنی شەش سالیدا کرا بە شای بولگاریا. دوای کۆتایی جەنگی جیهانی دووەم ١٩٤٥، خێزانی پادشایی لە بولگاریا کرانە دەرەوە و لەسالی ١٩٥١ پاش ئەوەی ئیسپانیا ماق پەنابەری پی بەخشین لەوی جێگیر بوون. خەونی هەمیشەیی سیمیۆن گەرانەوە بوو بۆ بولگاریا تاکو کورەکانی ولاتی خۆیان ببینن. لە سالی ١٩٩٦ دا سیمیۆن گەرایەوە بۆ بولگاریا وپێشوازییەکی شایستەی لێکرا. لەبەرواری ١٧ / ٦ / ٢٠٠١ هەلبژاردنە گشتییەکان بەئەنجام گەیەنرا، پارتەکەی سیمیۆن ( پارتی نیشتیمانی ) سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێنا، سیمیۆن توانی باوەری دەنگدەران بەدەست بهێنی و بەلێنی پێدان کە گەندەلی بنەبر بکات و ئابووری ولات بەرەو پێش بەرێت وپارێزگاری لە بنەماکانی کۆمار بکات هەرگیز نەگەرێتەوە بۆ پادشایی. لە ١٥ / ٧ / ٢٠٠١ دا سەرۆکی کۆمار داوای پێکهێنانی وەزارەتی لێکرد، لە بەرواری ٢٤ / ٧ / ٢٠٠١ دا سوێندی دەستووری خوارد لەبەردەمی پەرلەمان، بەمەش سیمۆنی دووەم دەبێتە یەکەم شای پێشوو بگەرێتەوە بۆ دەسەلاتی سیاسی لە ئەوروپای رۆژهەلات پاش بەسەرچوونی سەردەمی شیوعێت.

لە بەرواری ١١ / ١١ / ٢٠٠١ دا بولگاریەکان بەرەو سندووقەکانی هەلبژاردن بەرێکەوتن بۆ هەلبژاردنە گشتییەکان، لەو هەلبژاردنەدا سەرۆکی پارتی سۆسیالیتستی ( شیوعی پێشوو ) جیۆرجی بارفانۆف سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەسەر سەرۆکی لیبرالی ی پێشوو بیتار ستۆیانۆف کە بەنیاز بوو بۆ ماوەیەکی دیکەش لە پۆستی سەرۆکایەتیدا بمێنێتەوە .

سروودی نیشتیمانی: نیشتیمانی خۆشەویستم، گەورەی چیاکان بەلقان.

لەگەل بەرەوپێش چوونی پیشە سازی لە بولگاریا و بەرهەمە کانزاییەکانیان، بەلام هێشتا کشتوکالی بەیەکەم ستوونی ئابووری لەو ولاتەدا دادەنری.

بولگاریەکان نیشتیمانی خۆیانیان زۆر خۆش دەوێت وشانازییەکی زۆری پێوە دەکەن، ئەمەش لەو ئاهەنگەدا دەردەکەوێت کە هاولاتیان لەکاتی بەڕێ کردنی لاوەکانیان بەرەو سەربازی دەیگێڕن و هەڵدەستن بەئامادە کردنی خوانێکی گەورە و تیپە مۆزیکەکان ئاهەنگەکە دەگێڕن وسەماو گۆرانییەکی زۆر دەوترێ.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٠,٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٧٨

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١,١٦٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٦

بولگاریا بەپلەی دوانزدەیەمی جیهان دێت لەبەرهەمی لینیت و بەپلەی حەوتەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە بەرهەمی شەراب.

بۆلگاریا بەیەکێك لەوڵاتە سەرەکییەکانی جیهان دادەنرێت لەبەرهەمی رۆنی گوڵ، کە ئەویش باشترین سەرچاوەی دروست کردنی بۆن وعەترە گران بەهاکانی جیهانە، بڕی ئەو بەرهەمە دەگاتە ١٢٠٠ کغم، واتا رێژەی ٥٠٪ ی بڕی تەواوی هەموو بازاڕەکانی جیهانە، نزیکەی ٦٠٪ ی ئەو بەرهەمەی بولگاریا بەرەو وڵاتانی ئەوروپا دەنێردرێت و ٣٥٪ یشی بەروە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەنێردرێت. تورکیا بە دووهەم وڵات دوای بولگاریا دادەنرێت لە بەرهەمی رۆنی گوڵدا، نرخی یەك کیلۆ لەو بەرهەمە ٣٦٠٠ دۆلاری ئەمریکییە.

دۆڵی گوڵ، کە بەدرێژی ١٠٠کم بەنێو ناوەڕاستی بولگاریا درێژ دەبێتەوە بەسەنتەری چاندنی ئەو جۆرە گوڵانە دادەنرێ کە بەرهەمی ئەو رۆنەی لێوەردەگیرێ. شایەنی باسە ئەم گوڵە لە ناوەڕاستی ئایاردا پێدەگات وتەمەنیشی ٢٥ رۆژە،لە سەرلەبەیانی زوودا بەدەست گوڵەکان لێدەکرێنەوە، لەکاتێکدا کە لەهەرەتی بۆن وبەرامیان دان و بەرەو کارگەکانی دڵۆپاندن دەبرێن.

## بەنگلادیش

**ناوی باو:** بەنگلادیش

**ناوی فەرمی:** کۆماری میللی بەنگلادیش

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Peoples Republic of Bangladesh

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ٣٣٠ ئەندام )

**رووبەر :** ٥٧,٢٩٥ میل دووجا، ١٤٨,٣٩٣ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٣٠,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٨٧٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** بەنگالی، تشاکما، مارما، مارۆ، تبرا.

**ئاین:** ئیسلام ( ٩٥٪ )، هیندۆس، بوودی، مەسیح

**زمان:** بەنگالی

**پایتەخت:** دەکا

**شارە سەرەکییەکان:** شیتاگۆنگ، کۆلنا، راجشاهی، مایمیسینغ، باریسال

**ئاووهەوا:** گەرم وشێدارە بەدرێژایی ساڵ، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٨ – ٢٨ پلەی سەدی دەبێت. رێژە ساڵانەی باران ٦٣٥ سم و زۆربەی لەهاویندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** وێنجە، برنج، قامیشی شەکر، چا، تووتن، گەنم، راوە ماسی، بەخێوکردنی مانگا.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوەکانی ئالیک، پێست، کاغەز وبەرهەمەکانی، دروستکراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** گازی سروشتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بەنگلادیش وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە باشووری ناوەڕاستی ئاسیا، یەکێکە لەوڵاتە چڕەکانی جیهان لەرووی دانیشتوانەوە،لەگەڵ ناوچەی باکووری هیند لە باکوور ورۆژهەڵات و رۆژئاواوە سنووردارە، میانمار دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی، و کەنداوی بەنگال دەکەوێتە باشووری، یەکێی هێڵی درێژی ٩٠ پلە لەگەڵ هێڵی پانی ٢٣ بەرەو باکوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.

تەختی وڵاتی بەنگلادیش لە زەوییە نزمەکان پێك هاتووە و هەندێ بانی بەرزی لەباکوور و ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژهەڵات تێدەکەوێت. سێ ڕووباری سەرەکی بەنێو بەنگلادیشدا تێدەپەڕێت کە لە شاخەکانی هیمالایاوە سەرچاوەیان هەڵقڵاوە : براهما بۆترا، گانج، میگتا.

ناوی بەنگلادیش لە دوو بەش پێك هاتووە:

بەنگلا : لەزمانی سەنسکریتیدا بەمانای : میللەتێکی کۆنی نا ئارای دێت.

دیش : لەزمانی سەنسکریتیدا بەمانای وڵات دێت.

کەواتە بەنگلادیش بەمانای وڵاتی بەنگالییەکان یان خاکی بەنگالییەکان دێت.

لەهەزاران ساڵ پێش ئێستاوە مرۆڤ لەناوچەیەدا ژیاون، بوودی وهیندۆسەکان دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. ئاینی ئیسلام لەسەر دەستی محەمەد بەختیار خەلجی سەرکردەی سوپاکانی سوڵتان موعیزولدین محەمەد ئەلغوری لەساڵی ٦٠٢ ی ك گەیشتۆتە بەنگلادیش. پاشان ئیمپراتۆری مەغۆلی سوڵتان ئەکبەر خستویەتیە سەر ئیمپرتاتۆریەتی خۆی لە ساڵی ٩٨٤ ك / ١٥٧٦ ز. هەر یەك لە بەریتانی وهۆڵەند وفەرەنسی وپۆرتۆگالیەکان ململانێیان لەسەر کردوە. کۆمپانیای هیندی ڕۆژهەڵاتی لەسەدەی شانزدەیەمدا داگیری کردووە، لە ساڵی ١٨٥٨ دا بۆتە هەرێمێکی سەر بە هیندی بەریتانی لەژێر دەسەڵاتی بەریتان.

لە ساڵی ١٩٤٧ دا دەست کرا بەدابەش کردنی نیمچە کیشوەری هیند بۆ دوو وڵات: هیند و پاکستان، لە ١٤ / ٨ / ١٩٤٧ دا پاکستان سەربەخۆیی خۆی دەستگیر کردووە و لەدوو بەش پێك هات:

١. پاکستانی ڕۆژئاوا ( کۆماری ئیسلامی پاکستانی ئێستا ).
٢. پاکستانی ڕۆژهەڵات ( و بە بەنگلادیشی ڕۆژهەڵات ناودەبرا ) بەنگلادیشی ئێستا.

ماوەی نێوان هەردوو بەش ١٦٠٠ کم لەزەوییەکانی باکووری هیندە. لەبەرواری ٢٣ / ٣ / ١٩٥٦ سەربەخۆیی پاکستان – بەهەردوو بەشەکەیەوە - ڕاگەیەنرا. زۆربەی دانیشتوانی هەردوو بەشی پاکستان ئاینی ئیسلامیان پەیڕەو دەکرد، چەند زمانێکی جیاواز ودابونەریت وکەلتورێکی جیاوازیان هەبوو. پاکستانییە ڕۆژهەڵاتیەکان نیوەی دانیشتوانی پاکستان دەبوون، بەڵام پاکستانییە ڕۆژئاواییەکان دەسەڵاتیان بەسەر حکومەت وئابووری و هێزە چەکدارەکانیان گرتبۆوە دەست. ئەمە بووە هۆی ڕاگەیاندنی پاکستانی ڕۆژهەڵات بەوڵاتێکی سەربەخۆ لەژێر ناوی بەنگلادیش لە بەرواری ٢٦ / ٣ / ١٩٧١ دا، لەئاکامدا شەڕی ناوخۆ لەنێوان هەردوولا هەڵگیرسا وبەشی ڕۆژهەڵات هیچ دەسەڵاتێکی بەسەر شەڕەکەدا نەبوو، بۆیە وڵاتی هیند خۆی هەڵقورتان وشەڕی لەدژی پاکستانی ڕۆژئاوا ڕاگەیاند لە ساڵی

۱۹۷۱. هێزە هیندییەکان توانیان پاکستانی رۆژهەلات داگیر بکەن و هێزە پاکستانییە رۆژئاواییەکانیان کردە دەرەوەی ولات، ئەمەش بەلەدایك بوونی ولاتی بەنگلادیش دادەنرێ لە ۱٦ / ۱۲ / ۱۹۷۱. لە ۱۷ / ۹ / ۱۹۷٤ بەنگلادیش پەیوەندی کرد بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

یەکەم سەرۆکی بەنگلادیش دوای سەربەخۆ بوونی شێخ موجیبولرەحمان بوو کە لە ۱٥ / ۸ / ۱۹۷٥ دا کوژرا لەسەر دەستی چەند ئەفسەرێکی یاخی نێو سوپا کە بەخۆیەوە ئەندامانی خێزانی موجیبولرەحمانیشیان کوشت کە لەژنەکەی و سێ کورەکەی پێك هاتبوون، هەروەها نازناوی بانجا بندەهو ( باوکی نەتەوە ) شیان لێ دامالی. بەنگلادیش هەموو سالێك لەو رۆژەدا یادی کوشتنی شێخ موجیبولرەحمانی دامەزرێنەری ولاتی بەنگلادیش دەکاتەوە. دوای ئەو زیائولرەحمان دەسەلاتی گرتە دەست، کە ئەویش لە ۳۰ / ٥ / ۱۹۸۱ لەسەر دەستی چەند ئەفسەرێکی یاخی ناو سوپا کوژرا. عەبدولسەتار دوای ئەو دەسەلاتی گرتە دەست. لە سالی ۱۹۸۲ دا محەمەد ئیرشاد تا کۆتاییەکانی ۱۹۹۰ پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست.، پاشان شەهابەلدین ئەحمەد، دوای ئەویش لەکۆتاییەکانی ۲۰۰۱ دا دکتۆر ئەبولقاسم محەمەد بەندەر دوجا شودەهری دەسەلاتی گرتە دەست.

لەمانگی دووی ۱۹۹۱ هەلبژاردنە گشتییەکان لە بەنگلادیش بەرێوە چوو، پارتی نیشتیمانی بەنگلادیش سەرکەوتنی بەدەست هێناو دەسەلاتی یاسادانان وپەرلەمانی گرتە دەست، لە ۱۹۹۳ دا خاتوو شێخ بیجوم ( خالیدە زیا ) ( خێزانی سەرۆکی پێشوو زیائولرەحمان ) پۆستی سەرۆکی وەزارەتی پێ سپێردرا، شایەنی باسە سەرۆکی وەزیران دادەوەری فیعلییە لەبەنگلادیش. لە سالی ۱۹۹٦ هەلبژاردنەکان دەستیان پێکردەوە، پارتی یەکگرتووی عەوامی سەرکەوتنی بەدەست هێنا و خاتوو شێخ حسێنە واجیدی سەرۆکی پارتی ناوبراو ( کچی گەورەی مەجیبولرەحمان ) سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیرانی گرتە دەست و یەکەم کار پێ ی هەلسا نازناوی باوکی نەتەوەی بەباوکی کوژراوی بەخشیەوە. خاتوو شێخ حسێنە واجد لە ۱٥ / ۷ / ۲۰۰۱ دا دەستی لەکار کێشایەوە وئەمیش بەیەکەم سەرۆك وەزیران دادەنرێ کە پاش تەواو بوونی ماوەی دەستووری سەرۆکایەتی تەواو بکات.

لەنیسانی / ۲۰۰۱ دا دادگای ولات بریاری لەسێدارەدانی ۱۲ ئەفسەری نێو سوپای دا بەتۆمەتی تیرۆر کردنی موجیبولرەحمان، شایەنی باسە ئەم حوکمە تا کۆتاییەکانی ( ۲۰۰۲) جێ بەجێنەکرابوو لەگەل ئەوەی زۆربەی لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن داوای جێ بەجێ کردنی دەکەن. لە ۱ / ۱۰ / ۲۰۰۱ هەلبژاردنەکان بەرێوە چوو، پارتی نیشتیمانی بەنگلادیش سەرکەوتنی بەدەست هێناو خاتوو شێخ خالیدە زیا بۆ جاری دووەم پۆستی سەرۆك

وەزیرانی بەدەست هێنایەوە، لە ٩ / ١٠ / ٢٠٠١ سوێندی دەستووری خوارد.

سروودی نیشتیمانی: وڵاتی زێرێنم بەنگلادیش، خۆشم دەوێیت.

جەژنە نیشتیمانیەکان : ٢١ / ٢ جەژنی شەهیدانی زمان

٢٦ / ٣ جەژنی سەربەخۆیی

١٦ / ١٢ جەژنی سەرکەوتن

بەنگالییەکان داوا لە نەتەوە یەکگرتوەکان دەکەن کە زمانی بەنگالی بخرێتە نێو لیستی ئەو زمانانەوە کە دانی پێنراوە، بەو پێیەی کە بە زمانێکی زۆر نایابی ئەو ناوچەیەیە ( باشووری ئاسیا ) و زیاتر لە ٢٠٠ ملیۆن کەس قسەی پێدەکەن.

بەنگلادیش یەکێکە لەوڵاتە هەژارەکانی جیهان، باری ئابووری زۆر پاشکەوتووە، پشتی تەواوی بەکشتوکاڵی بەستووە، سەرچاوە سروشتیەکان زۆر کەمن وهێزی کاریش بەهۆی نەبوونی کەسانی زۆر لێهاتوەوە زۆر لاوازە. جەنگی سەربەخۆیی ١٩٧١ بووە هۆی رمانێکی بەرچاوی باری ئابووری ئەو وڵاتە وچالاکییە کشتوکاڵیەکانیش پشت گوێ خران بەهۆی ئاوارە بوونی بەملیۆن کەس لەو وڵاتەوە بۆ وڵاتە دراوسێکان ولەناوچوونی ماڵ وخانوو کارگە وکۆگاکانیان، جگە لە شێواندنی رێگاکانی هاتوچۆ.

ئەمە جگە لەوەی وڵات بەدەست بەدخۆراکییەوە بەردەوام دەناڵێنێت وئەمەیش بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکی زۆر لەنێو ریزەکانی کۆمەڵدا بەتایبەت منداڵان. سەرباری هەموو ئەم مەینەتیانەی ئەو لافاو گەردەلوولانەی کە نزیک لەهاوینی هەموو ساڵێك دووچاری ناوچەکانی ئەو وڵاتە دەبێت و دەبێتە هۆی ئاوارە بوونی بەهەزاران خێزان.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٢٦,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٥٩.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٣٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٧٤.

بەنگلادیش بەپلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی وێنجە و بەپلەی چوارەم دێت لە بەرهەمی برنج وبەپلەی نۆیەم دێت لەبەرهەمی چا، بەپلەی پانزدەیەم لەبەخێو کردنی مانگا.

## پەنەما

ناوی باو: پەنەما

ناوی فەرمی: کۆماری پەنەما

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Panama

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە و جێگری سەرۆك یارمەتی دەدات.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی یاسادانان ( ٧٢ ئەندام )

ڕووبەر: ٢٩,١٥٧ میل دووجا ، ٧٥,٥١٧ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٢,٧١٩,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٣٦کەس / کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: میستیزۆ یان مۆلدۆن ( تێکەڵێك لە ئەورووپی و هیندەکانی ئەمریکا)، ئەفەریقی ڕەش، ئەورووپی، هیندەکانی ئەمریکا، ئەمریکی، چینی.

ئاین: مەسیح ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، ئیسلام نزیکەی ٦٥٠٠ کە واتا ٠,٣٪ ڕێژەی دانیشتوان، جوولەکە.

زمان: ئیسپانی

پایتەخت: پەنەما سیتی ( شاری پەنەما )

شارە سەرەکییەکان: سان میجیلتۆ، دایڤید، کۆلۆن، بارو، کریسۆبال

دراو: بالبوا

ئاووهەوا: گەرم ووشکە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە ٢٥ -- ٣٥ پلەی سەدی دەبێت، باران لەهاویندا دەبارێت و ساڵانە دەگاتە ٣٨٠ سم لەو ناوچانەی دەڕوانێتە سەر زەریای ئەتڵەسی و ١٧٥ سم لەو ناوچانەی دەڕوانێتە سەر زەریای هێمن.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز، برنج، قامیشی شەکر، گەنمە شامی، فاسۆلیا، پەلەوەر، هێلکە، بەخێوکردنی مانگا، شیر، قاوە.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: چیمەنتۆ، دروست کراوە نەوتییەکان، دروست کراوە خۆراکییەکان.

سامانی کانزایی: مس، لم، قیر

تێڕوانینێکی گشتی :

پەنەما وڵاتێکە دەکەوێتە ئەوپەڕی باشووری ئەمریکا ناوەڕاست، دەریای کاریبی دەکەوێتە باکووری وکۆلۆمبیا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی و زەریای هێمن دەکەوێتە باشووری، کۆستەریکا دەکەوێتە ڕۆژئاوای. نزیکەی ٨٠٠ دورگەی بەربڵاو سەر بە پەنەمان و بەدرێژایی کەنارەکانی بڵاو بونەتەوە. گەورەترینی ئەو دورگانەش دورگەی کوبیا ودورگەی رای، کە دەکەونە سەر کەناری زەریای هێمن. یەکێری هێڵی درێژی ٨٠٢ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٨/٣٠ بەرەو باکوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.

گرنگی وڵاتی پەنەما لە تەنگەی پەنەمادا خۆی دەبینێتەوە کە کەناڵی پەنەمای بەنێویدا تێدەپەڕێت و هەردوو زەریای ئەتڵەسی و هێمنی بەیەك گەیاندووە و بەشی ناوەڕاستی وڵاتی بڕیوە.

چیا بەرزەکان لە ڕۆژئاوای پەنەما بۆ ڕۆژهەڵاتی درێژ دەبنەوە،بەرەو کەناڵی پەنەما بەرزییەکانیان کەم دەبێتەوە. دۆڵەکان دەکەونە نێوان چیاکان و چالاکییە کشتوکاڵیەکانیان تیا ئەنجام دەدرێت.هەروەها لەسەر کەناری دەریای کاریبی وزەریای هێمن دەشتە تەنگەکان بۆ چالاکی کشتوکاڵی سوودیان لێوەرگیراوە.

وشەی پەنەما لەزمانی هینده سوورەکان بەمانای ماسییەکی زۆر دێت، هەروەها بەگوندێکی هیندیشیان دەوت پەنەما بەهۆی ناوبانگی لە ڕاوە ماسیدا.

هینده سوورەکان دانیشتووی پەنەما بوون کاتێ ئیسپانەکان لەسەدەی شانزدەیەمدا گەیشتنە ئەو ناوچەیە. لەساڵی ١٥٠١ دا گەڕیدەی ئیسپانی ڕۆدریجۆ دی باستیداس یەکەم پیاوی سپی بوو بگاتە ئەو ناوچەیە. لەساڵی ١٥٠٢ دا دەریاوانی ئیتاڵی کریستۆفەر کۆلۆمبۆس کە بۆ بەرژەوەندی ئیسپانییەکان ئیشی دەکرد لە گەشتی چوارەمیدا گەیشتۆتە ئەو ناوچەیە و ناوی جیهانی نوێی لێناو وداوای کرد کە ببەخشرێت بە ئیسپانیا. لە ٢٨ / ١١ / ١٨٢١ دا پەنەما لە ئیسپانیا جیابۆتەوە وبۆتە ناوچەیەکی سەر بە وڵاتی کۆلۆمبیای مەزن کە ئەویش لە ١٨١٩ دا لە ئیسپانیا جیابۆتەوە. لە بەرواری ٣ / ١١ / ١٩٠٣ دا پەنەما یاخی بوونی خۆی لە کۆلۆمبیا ڕاگەیاند و بووە وڵاتێکی سەربەخۆ، ئەمەش بەیارمەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەئەنجام گەیەنرا چونکە بەنیاز بوو کەناڵی پەنەما دابمەزرێنێت و هێندەی نەخایاند دەست کرا بە هەڵکەندنی و لە ١٥ / ٨ / ١٩١٤ بە فەرمی لەبەردەم دەریاوانییدا کەناڵی ناوبراو کرایەوە. ویلایەتە یەکگرتووەکان دەستی بەسەر ئەو کەناڵە وپشتێنی زەویەکانی چوار دەوری گرت بەرامبەر بە نرخێکی دیاری کراو پێشکەش بە پەنەمای دەکرد.

له مانگی حەوتی ١٩٧٧ پاش چەندین دانیشتن ودانوستان بۆ ماوەی چەند ساڵێك لەنێوان پەنەما و ویلایەتە یەکگرتوەکان واژۆ لەسەر رێکەوتننامەیەك کرا، بەپێی ئەو رێکەوتننامەیە ویلایەتـە یـەکگرتوەکان تـوانی پـشتێنی چـوار دەوری کـەناڵی نـاوبراو بگرێتـە دەسـت، دەگیرکردنی کەناڵیش لـە کۆتـایی ١٩٩٩ دوایـی پـێ بێنێـت، رێکەوتننامەکە نـاوی هـەردوو سەرۆکی ئەو دوو وڵاتەی لێنرا : عومەر تۆریجۆس هیریرا – جیمی کارتەر.

له بەرواری ١ / ١٠ / ١٩٧٩ پەنەما ئاڵای وڵاتی بەسەر کەناڵی خۆیدا بەرز کردەوە پاش نزیکـەی ٧٥ سـاڵ لـە کـارگێڕی ئـەمریکی بـۆ ئـەو ناوچـەیە.لـە ٣٠ / ٧ / ١٩٩٩ دا هێـزە ئەمریکییەکانی پەنەما دەستیان کرد بە کشانەوە لە مەڵبەندەکانی هەردوو کەناری کەناڵی ئەو وڵاتە پاش نزیکەی سەدەیەك لە بوونی سەربازییان لەناوچەی ناوبراودا. لە بەرواری ١٤ / ١٢ / ١٩٩٩ سەرۆکی پەنەما خاتوو میریا مۆسکۆسۆ وسەرۆکی ئەمریکای پێشوو جیمی کارتەر واژۆی بەدەستەوەدانی کەناڵیان بە پەنەماییەکان کرد لە شاری پەنەما سیتی.

لـە سـاڵی ١٩٦٨ سـەرۆکی سـوپا عومـەر تۆریجـۆی هیریـرا پـاش کودەتایـەکی سـەربازی دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست. پاش ئەوەی لەرووداوێکی فرۆکەدا کەوتە کوژرا دەسـەڵات درایـە دەسـت شارسـتانییەکان، بـەڵام دەسـەڵاتی فیعلـی بەدەسـت سـەرۆکی سـوپا جەنـەراڵ مانۆئیل ئەنتۆنیۆ نۆرییغا بوو، ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا نۆرییغایـان بـە قاچاغچێتی مـاددە هۆشـبەرەکان تاوانبـار کـرد و واباسـی لێـوە دەکـرد کەلـەو جـۆرە ماددانـە رەوانـەی ویلایەتـەکانی دەکـات، بۆیـە لـە ٢٠ / ١٢ / ١٩٨٩ دەسـتی کـرد بەهێرش کردنـە سـەر پەنـەما ودەسـتگیری کـرد وبەدیلی بەرەو کالیفۆرنیا قۆڵ بەسـتی کـرد تـاکو لـەوێ دادگـایی بکـات، ئەمریکییەکان ئەم پرۆسەیەیان ناونا: ئامانجی رەوا و سەرۆك جۆیرمۆ ئێندارایان لەبری ئەو کردە سـەرۆکی وڵات پـاش ئـەوەی لـە هەڵبژاردنـەکانی مـانگی پێنجـی ١٩٨٩ دا سـەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لـە بـەرواری ٢ / ٥ / ١٩٩٩ دا هەڵبژاردنـەکانی پەنـەما بـۆ دیـاری کردنـی سـەرۆکی وڵات دەستی پێکرد. پاڵێوراوی هاوپەیمانی ئۆپۆزسیۆن : یەکێتی لەپێناوی پەنـەما خـاتوو میریـا مۆسکۆسـۆ ( ٥٣ سـاڵ ) بـە جیـاوازی ٦,٣٪ ی دەنگـەکان سـەرکەوتنی هێنـا بەسـەر مـارتن تۆریسی پاڵێوراوی یەکێتی هاوپەیمانی فەرمی : نەتەوەی نوێ.

لـە ١ / ٩ / ١٩٩٩ دا مۆسکۆسـۆ سـوێندی دەسـتووری خـوارد تـاکو ببێتـە یەکـەم ئـافرەت دەسەڵاتی پەنەما بگرێتە دەست، بەر لە چوار مانگ لەوەی دەسەڵاتی تەواوی بەسـەر کەناڵدا سەپاند.

لەیـەکێك لـەو وتانـەی کـە لـە ئاهـەنگی وەرگـرتنی پۆسـتی سـەرۆکایەتیدا پێشکەشی کرد،

مۆسکۆسـۆ وتـی: لـەنێوەڕۆی ۳۱ / ۱۲ / ۱۹۹۹ دا دەتـوانین بڵـێین کـەبۆ یـەکجارەکی سەربەخۆیی راستەقینەمان بۆ هەتا هەتایە هێنایە دی.

شایەنی باسە سەرۆکی پێشووی پەنەما عومەر تۆریجۆس لە ساڵی ۱۹٦۸ دا خاتوو مۆسکۆسۆ لەگەڵ مێردەکەیدا ئەرتۆگلۆ ئەریاسی کۆچ کردوو دوورخستبۆوە بۆ دەرەوەی پەنەما، ئەریاسی لەوەو پێش سێ جار لەسەر یەك بۆ سەرۆکایەتی هەڵبژێردرابوو.

سروودی نیشتیمانی: هەر توانیمان سەرکەوین

جەژنە نیشتیمانیەکان:

۲۸ / ۱۱ رۆژی سەربەخۆیی لە ئیسپانیا ۱۸۲۱

۳ / ۱۱ رۆژی سەربەخۆیی لە کۆلۆمبیای مەزن ساڵی ۱۹۰۳.

ئابووری لە پەنەمادا لە گەشەکردنێکی بەردەوامدایە، بەڵام لەگەڵ ئابووری ولاتەکانی دیکەی ئەمریکای ناوەڕاستدا جیاوازییەکی ئەوتۆی نییە، لەبەر ئەوەی دوو لەسەر سێی دانیشتوان کار لە چالاکییە کشتوکاڵیەکان دەکەن، دانیشتوانەکانی دیکەش کە دەکەونە نزیك کەناڵی پەنەما لەبازرگانیدا یان لە پیشەسازی یاخود لە گواستنەوەدا کار دەکەن.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٦,۹ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ۹۰

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ۲,٦۷۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٦۷.

دانیشتوانی پەنەما بەلەسەر کردنی کڵاوە پووشەکان بەناوبانگن کە بەهێمایەکی نیشتیمانی دادەنێن و ئەم خووەش دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی نۆزدەیەم کاتێ ئەندازیاری فەرەنسی فردیناند دی لیسبیس – هەمان ئەو ئەندازیار گە کەناڵی سوێسی هەڵکەند – دەستی کرد بە هەڵکەندنی کەناڵی پەنەما ئەو کڵاوەی لەسەر دەکرد. بۆ خۆپاراستن لەتیشکی خۆر چونکە بەهەزاران کرێکاری لەوانی لەگەڵیدا بوون گیانیان لەدەست بەهۆی لێدانی خۆر ومەلاریا وگرانەتا لە ساڵی ۱۸۸۹ن بۆیە پەنەماییەکانیش ئەو خووەیان کردە دابونەریتێك وئەو کڵاوە لەسەر دەکەن.

قاوەی پەنەما تایبەتمەندییەکی نایابی هەیە لەچاو ئەو قاوەیەی کە لەوڵاتانی دیکەدا دەڕوێنرێت تەنانەت جوتیارە پەنەماییەکان کە کار لەو کێڵگانە دەکەن قاوەی تیادەڕوێنرێت پێشەکی پارەی بەرهەمەکانیان وەردەگرن.

## بەنین

ناوی باو: بەنین

ناوی فەرمی: کۆماری بەنین

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Benin

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار سەرۆکایەتی حکومەتیش دەکات.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی نوێنەران ( ٨٢ ئەندام )

رووبەر : ٤٣,٥٠٠ میل دووجا ، ١١٢,٦٨٠ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ٥,٩٠٢,٠٠٠ ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٥٢,٤ کەس/کم$^{٢}$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفەریقی رەش کە دەچنەوە سەر نزیکەی ٦٠ کۆمەڵەی نەژادی و گرنگترینیان ئەمانەن : فۆن، یۆربا، جۆن، باریبا.

ئاین: ئیسلام ٦٠٪، مەسیح، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

زمان: فەرەنسی.

پایتەخت: بۆرتۆ نۆفۆ

شارە سەرەکییەکان: کۆتۆنۆ، دجۆجۆ، ئابوومی، باراکۆ.

دراو: فرانك

ئاو وهەوا: گەرم و شێدارە، رێژەی ساڵانەی باران لەهاویندا ٥٠ سم لە باشوور، ١٢٠ سم لەناوەڕاست، ٩٠ سم لە باکوور.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: کاکاو، کاسافا، قاوە، لۆکە، گەنمەشامی، رۆنی دارخورما، بستە، پاقلەمەنییەکان، پەتاتەی شیرین ( سێوی بن ئەرز )، بەخێوکردنی مەڕومالات.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: پالاوتنی رۆنی دارخورما، رستنی لۆکە.

سامانی کانزایی: نەوت، بردەکانی جیر

تێڕوانینێکی گشتی :

بەنین وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە سەر کەناری رۆژئاوای کیشوەری ئەفریقی، بورکینا فاسۆ ونێجەر دەکەونە باکووری، نێجیریا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی و تۆگۆ دەکەوێتە رۆژئاوای، کەناری بەنین لەباشوور ١٢٤ کم درێژە ودەکەوێتە سەر کەنداوی گینیا. یەکبڕی هێڵی درێژی ٢/١٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٩ بەرەو باکوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.

کەناری بەنین تەختە ولم داپۆشیوە وهیچ بەندەرێکی سروشتی نییە. لەناوەوەی وڵاتدا دارستانێکی زۆر هەیە. شاخەکانی ئۆتاکۆرا کە بەرزییەکەی ٦١٠ م دەبێت کەوتۆتە باکووری رۆژئاوا. درێژترین روباری بەنین روباری ئۆیمی یە ودرێژییەکەی ٤٥٠ کم دەبێت ودەرژێتە

كەنداوی گینیا ( لە زەریای ئەتڵەسی ).

لەسەدەكانی دوانزدەیەم وسیانزدەیەمدا چەند شانشینێك لە بەنیندا دامەزراوە، لەوانە شانشینی بەنین كە لەدواییدا ناوی وڵاتەكەی لەسەر نراوە. لەسەدەی حەڤدەیەمدا شانشینی داهۆمی دەسەڵاتی ئەوێی گرتۆتە دەست. هەر لەو ماوەیەدا ئیسلامەكان بەهۆی بازرگانە ئیسلامەكانەوە گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە وفۆلانی و ماندییەكانی سەركردایەتی ئیسلامیان لەوناوچەیەدا كردووە ودواتر لەسەر دەستی عوسمان دان فۆدی فۆلانی ( ١٧٥٤ ١٨١٧ ) ئاینی ئیسلام لەو ناوچەیەدا بڵاوبوونەوەیەكی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە وتوانیویەتی ئاینی ئیسلام بگەیەنێتە ئەفریقیای رۆژئاوا وسودان.

لەساڵی ١٨٥١ دا فەرەنسا رێكەوتننامەی بازرگانی لەگەڵ شانشینی داهۆمیدا واژۆ كردووە، لەساڵی ١٩٠٤ دا فەرەنسا كردییە ناوچەیەكی سەر بە زەوییەكانی رۆژئاوای ئەفریقیای فەرەنسی. لە ساڵی ١٩٤٦ دا بەپێی دەستووری فەرەنسی ناوچەكە بووە خاكێكی بێگانەی سەر بە حكومەتی فەرەنسی.

لە ساڵی ١٩٥٨ دا فەرەنسا ئۆتۆنۆمی پێ بەخشی، لە ١ / ٨ / ١٩٦٠ دا سەربەخۆیی تەواوی پێبەخشی و لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككگرتوەكان، لە ٢٦ / ١٠ / ١٩٧٥ حكومەت ناوی وڵاتی لە داهۆمییەوە گۆری بۆ بەنین، داهۆمی جگە لەوەی ناوی شانشینێكی دێرین بوو ناوی چەند هۆزێكی زۆر درندەی ئەو ناوچەیە بوون.

بەلام بۆ ساڵەكانی دوایی بەنین چەندین گۆڕاكارییەكی حكومی یەك بەدوای یەك وچەندین كێشە وململانێی سیاسی بەخۆوە بینی تا بەكودەتایەكی سەربازی ماسیۆ كیریكۆ لەساڵی ١٩٧٢ دا هاتە سەر حوكم. كیریكۆ رەوتی سۆسیالیستی لە وڵاتدا گرتە بەر، بەڵام باری ئابووری وڵات تادەهات بەرەو خراپتر دەچوو وبەدەست هەڵگرتن لەو رەوتە لەساڵی ١٩٨٩ كۆتایی پێهات. لەساڵی ١٩٩١ دا چەند هەڵبژاردنێك بەرێوە چوو بەیەكەم هەڵبژاردنی دیموكراسی دادەنرێ لە ئەفریقیا و نیسیفۆر سۆگلۆ سەركەوتنی تیا بەدەست هێنا. بەڵام لەساڵی ١٩٩٦ دا كریكۆر بەهەڵبژاردنە سەرۆكایەتییەكان هاتەوە سەر حوكم ودەسەڵاتی گرتەوە دەست.

سروودی نیشتیمانی: خۆرهەڵاتی نوێ

جەژنی نیشتیمانی: رۆژی سەربەخۆیی ١ / ٨

بەنین بە وڵاتێكی كشتوكاڵی دادەنرێت، درەختە رۆنییەكانی دارخورما لە باشوور دا زیاترین بەشی سامانەكەیەتی.

تێكرای داهاتی نەتەوەیی : ٢ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٣٤

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٧٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٥٤

## بۆتان

**ناوی باو:** بۆتان

**ناوی فەرمی:** شانشینی بۆتان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Bhutan

**سیستەمی حوکمرانی:** پادشایی بۆماوەیی، شا خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥٢ ئەندام )

**رووبەر :** ١٨,١٥٠ میل دووجا / ٤٧,٠٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( ژمارەکە خەمڵێندراوە لەبەر نەبوونی ئامارێکی فەرمی )

**چڕی دانیشتوان:** ١٩ کەس / کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** بۆتانییەکان ( بەرەچەڵەك لە تیبتییەکانن )، نیپالی، شارکۆبس.

**ئاین:** بوودی، هیندۆس، ئیسلام

**زمان:** دجۆنبخا، چەند زمانێکی ناوخۆ.

**پایتەخت:** سیمفۆ

**شارە سەرەکییەکان:** بەنجا ( پایتەختی زستانەیە )، فیونشۆبۆلنج، هالیسار، بۆناکا، بارو.

**دراو:** نگلترم.

**ئاووهەوا:** خولگەییە، گەرمە لەناوچەکانی پاڵ چیا باشوورییەکانی هیمالایا، مام ناوەندە لە لەناوەڕاستی چیاکانی هیمالایای رۆژهەڵات، ساردە لە چیا بەرزەکانی هیمالایا لەباکووری وڵات، بارانەکانی وەرزییە ولەهاویندا بەرێژەیەکی زۆر دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، میوە، سەوزە، گەنم، برنج.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوەکانی خووری، چنینی دەست، دروست کردنی گۆزە و قاپ، میوەی ئامادەکراو.

**سامانی کانزایی:** تالك، گەچ، خەڵووز، بەردی قسڵ، ئەردواز، دۆلۆمیت.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بۆتان وڵاتێکی بچوکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسیا لەنێوان باکووری چین وباشووری هیند، سەر بەچیا رۆژهەلاتیەکانی هیمالایا، هیچ جۆرە کەنارێکی نییە، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر

یەکبڕی هێڵی درێژی ٩١ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٧/٣٠ بەرەو باکوور.

بەدرێژایی سنوورەکانی بۆتان لەگەڵ هیندا دەشت وڕووبار ودۆڵەکان درێژ دەبنەوە و ئەو ناوچەیەش بەناوچەیەکی سەرەکی کشتوکاڵی دادەنرێت. بەرەو باکووری ئەو ناوچەیە دارستانەکان دەکەونە سەر قەدپاڵی شاخەکانی هیمالایای باشوور وڕێژەی ٧٠٪ ی ڕووبەری وڵاتەکە دەبن، لەوپەڕی باکووری بۆتانیش بەفر بەدرێژایی ساڵ چیاکانی هیمالایای داپۆشیوە.

دانیشتوانی وڵات بەوڵاتەکەیان دەڵێن : دروٚك یول، بەمانای خاکی ئەژدیهای بروسکەدار. بەڵام ناوی باوی : بۆتان لەوشەی بۆتانتاوە هاتووە، بەمانای لای ئەوپەڕی تیبت.

لەساڵی ١٩٢٣ جیمس هیلتۆنی نووسەر بۆتانی ناوناوە "ئاسۆی ون" لە ڕۆمانێکدا کەباسی بۆتانی بەکۆمارێکی بەختەوەر ( یۆتۆ بیا ) کردووە لە چیاکانی هیمالایا.

تا ئێستاش مێژووی کۆنی بۆتان وونە، بەڵام ئەوەی کە زانراوە ئەوەیە کە داگیرکرەکانی تیبت لەسەدەی نۆیەمدا دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ( بۆتیا تیفۆ ) ئەو ناوچەیەیان لەناو بردووە وخۆیان لێی نیشتەجێ بوون. لەسەدەی حەڤدەیەمدا بۆتان بۆتە وڵاتێکی سەربەخۆ.لەسەدەکانی حەڤدەیەم وهەژدەیەمدا بۆتانییەکان پەلاماری ناوچەی سیکیمی تەنیشت ناوچەکەی خۆیان و بەشێکی ئەو زەویانەی بە هیندی ڕۆژهەڵاتی ناسرابوو، بۆیە بەریتانیا پەلاماری دایەوە ولەساڵی ١٨٦٥ دا خستییە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە.

لەساڵی ١٩٠٧ دا یۆگین وانگشك کە نازناوی بنلوبی لێنرابوو ( واتا حاکمی هەرێم ) بەسەرۆکی حکومەت هەڵبژێردرا، بەلام هێندەی نەخایاند خۆی بەیەکەم شای بۆتان ڕاگەیاند وحکومەتێکی مەرکەزی بەهێزی دامەزراند. لەساڵی ١٩١٠ حکومەتی بەریتانی هیندی بەتەواوی کۆنترۆڵی پەیوەندیەکانی دەرەوەی بۆتانی کرد، بەڵام بەهیچ شێوەیەك خۆی هەڵنەقورتانە کاروباری ناوخۆ.

لە ١٩٤٩ دا بۆتان ڕێکەوتننامەیەکی لەگەڵ هیندا بەست بەو پێیە تەواوی کاروبارەکانی دەرەوەی بۆتان لەبەریتانیاوە خرایە دەست حکومەتی هیند جگە لەیارمەتی دانی بۆ گەشەپێدانی باری ئابووری وبەرگری لێکردنی. لەساڵی ١٩٧١ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند ولەهەمان ساڵدا پەیوەندی کرد بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە.

لە ٢٤ / ٧ / ١٩٧٢ میهراجا ( شا ) جقمی سنجی ئەنجوك ( ١٧ ساڵ ) تەختی پادشایی بۆتانی پێسپێردرا دوای کۆچی دوایی شا جقمی دۆرجی وانگشکی باوکی، شایەنی باسە جقمی سنجی چوارەم شای خێزانی پادشایی بوو. وەك دابونەریتێکی بۆتان هەرکەس دەبێ بە شای وڵات نازناوی شای ئەژدیهای پێدەسپێردرێ.

بۆتان ولاتێكی هێنده دابڕاوه له جیهانی دهرهوه مهگهر چۆنها رێگا بهسهردانی بێگانهكان بدا، تهلهفزیۆن تا سالی ١٩٩٧ نهچووبۆوه ناو ولاتهوه.تهنها یهك گۆڤاری ههفتانه دهردهچێت بهناوی : كوینسل. بهناوی یهكێتی نیشتیمانییهوه ههموو تاكهكانی بۆتان – لهكۆمهڵهیهكی نهژادی بێت – بهزۆره ملێ دهبێ فێری زمانی نیشتمانی : دجۆنبخا ببێت و ههموانیش دهبێ جلی تایبهتی لاسایی ولات بپۆشن. بوودیش ئاینی فهرمی ولاته وپیاوانی ئاینی ئیش وكارهكانیان لهفهرمانگهكاندا بههیچ شێوهیهك راناگیرێت جگه لهوهی كورسی تایبهت وگیراویان لهنێو پهرلهماندا بۆ ئامادهكراوه.بۆتانییهكان لهرۆژانی پشوو وكۆتایی ههفتهدا بهرو روبار ودارستانهكان دهچن تاكو یارییهكانی رمبازی و تیرهاوێژی بكهن.

بۆتان ولاتێكی تازه پیاكهوتووه، ٥٨٪ ی دانیشتوانهكانی سهرقالی كشتوكالێن وبهشی خۆیان ( تا ئاستێ ) بهبهرههم دێنن. بههۆی خراپی رێگاكانی هاتوچۆوه ومهترسی لهرمانی بهفر كه بارانه وهرزییهكان دهینێتهوه بازرگانی زۆر لاوازه. یارمهتییهكانی دهرهوهی ولات پشتیوانی له ئابووری دهكات.

تێكرای داهاتی نهتهوهیی : ٢٧٢ ملیۆن دۆلاری ئهمریكی.

ریزبهندی لهنێو ولاتانی جیهاندا : ١٧٢.

نێوهندی خهرجی سالانهی تاك: ٤٠٠ دۆلاری ئهمریكی.

ریزبهندی لهنێو ولاتانی جیهاندا : ١٥٣.

## بۆتسوانا

**ناوی باو:** بۆتسوانا

**ناوی فەرمی:** کۆماری بۆتسوانا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Botswana

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٤٦ ئەندام )

**رووبەر :** ٢٢٤,٦٠٧ میل دووجا، ٥٨١,٧٣٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١,٥٠١,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢,٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی رەش ( تسوانا – بشمەن )، ئەورووپی.

**ئاین:** مەسیح، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** ئینگلیزی، ستسوانا

**پایتەخت:** جابۆرۆنی

**شارە سەرەکییەکان:** فرانسیس تاون، سیلیبی بیکوی، مۆلیبۆ لۆلی، کانی.

**دراو:** بۆلا

**ئاووهەوا:** نیمچە خولگەیی وشکە، زستان مام ناوەندە وهاوین گەرمە ( ٣٨ پلەی سەدی )، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٦ ملم لە رۆژهەڵات و ٣٠ ملم لە رۆژئاوای وڵات لەگەڵ بەردەوامی لە باران نەبارین و وشکە ساڵی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گۆشت، پێست، گەنمەشامی، شیر، هەرزن، پیاز، پاقلە، گەنم.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چەند چالاکییەکی کەم.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، کۆبالت، مس، ئەڵماس، نیکل، یۆرانیۆم.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

بۆتسوانا وڵاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی باشووری کیشوەری ئەفریقیا، نامیبیا دەکەوێتە رۆژئاوا وباکوری، زامبیا دەکەوێتە باکووری ( بەشریتێکی تەسکەوە بەیەکەوە بەستراونەتەوە )، زیمبابۆییش دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، باشووری ئەفریقیاش دەکەوێتە باشووری. هیچ کەنارێکی نییە. ناوەڕاستی کەوتۆتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٥ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٢ بەرەو باشوور.

زۆربەی خاکی بۆتسوانا بریتییە لە بانێکی زەبەلاح نێوەندی بەرزییەکەی دەگاتە هەزار مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا، بەپیت ترین زەوییەکانی کەوتۆتە رۆژهەلاتی ولات، بەلام دارستانەکان کەوتونەتە ناوچە باکوورییەکانی. بیابانەکانی کەلهاری ناوچەکانی ناوەراست وباشووری رۆژئاوای ولات.

بەشمەنەکان یەکەم دانیشتوانی ناوچەکە بوون لەنزیکەی ۳۰ هەزار سالْ لەوەو پێش. دوای ئەوان تسواناکان لە ماوەی پێش زایینی و هەزاری زایینیدا لەزەوییە بەپیتەکانی رۆژهەلاتدا ژیاون وبەشمەنییەکانیان بەرەو ناوچەی بیابانی کەلهاری دەرکردۆتە دەرەوە، تسوانا خۆیان ناوی ولاتیان ناوە.

لەماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا تسوانییەکان لەگەلْ کۆمەلانی ئەفریقی ناوچەکان، بەتایبەت ئەفریقییە سپیەکان کە لە باشووری ئەفریقیاوە هاتبوون و بە بوێر ناسرابوون، بەشەر هاتوون. هاوکات گروپە مژدە بەخشەکانی ئاینی مەسیحی بەرەو ناوچەکە کەوتونەتە ریْ وئاینی مەسیحیان تیا بلاوکردۆتەوە.

لە سالی ۱۸۹۵ بەریتانیا بۆتسواناى خستۆتە ژێر پارێزگاری خۆیەوەو ناوی ناوە پارێزراوەی بتشوانا لاندی بەریتانی.

دوای پەیدابوونی ئارەزووی سەربەخۆ بوون لای ئەفریقییەکان، لە بەرواری ۳۰ / ۹ / ۱۹٦٦ سەربەخۆیی دەستگیر بوو ولەهەمان سالدا پەیوەندی کرد بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە و ناوی بووە کۆماری بۆتسوانا. سالانە لە رۆژی ۳۰ / ۹ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێرن.

یەکەم سەرۆکی ولات دوای سەربەخۆیی سیرتز خاما بوو کە ئەنجومەنی نوێنەران لە سالەکانی ۱۹٦۹، ۱۹۷٤، ۱۹۷۹ لەسەر یەك هەلیان بژاردەوە. بەلام لەهەلبژاردنەکانی ۱۹۹٤ دا ئۆپۆزسیۆن چەند کورسییەکی زیادەیان بەدەست هێنا ئەمەش رێی بۆ سەرۆکی نویْ فستۆس مۆجای خۆش کرد ببێتە سەرۆکی ولات.

لە مانگی ۱۰ ی سالی ۱۹۹۹ دەست کرا بەبەرهەمی ئەلماس لەگەورەترین کانی ئەو بەردە پیرۆزەدا لەتەواوی جیهاندا: کانی ئۆبارا کە لە سالی ۱۹۷٤ بەدواوە دەست کراوە بەهەلکەندنی ونزیکەی ۲٤۰ کم دوورە لەرۆژئاوای فرانسیس تاونی باکووری بۆتسوانا. تێکرای بەرهەمی سالانەی بەردی ئەلماس لەو کانەدا دەگاتە ۱۲ ملیۆن قیرات، ئەمەش بەرهەمی سالانەی ئەلماسی لە بۆتسوانا بەرێژەی ۳۰٪ بەرز کردەوە. سەرۆکی ولات لەئاهەنگی کردنەوەی ئەو کانەدا لەمانگی پێنجی ۲۰۰۰ دا بەلێنیدا کە داهاتی ئەم بەرهەمە لەپێناوی باشکردنی باری ئابووری ولات وبوژاندنەوەی نەتەوەکەی خەرج بکرێت نەك وەك هەندیْ لەوانەی بۆ ویست وئارەزووەکانی گەیشتن بەدەسەلاتەکان ئەم بەرهەمەیان بەگەڕ

خستووه ( دیاره لێرەدا مەبەستی لەولاَتانی ئەنگۆلا وسیرالیۆن ) بووە.

بەلاَم لەراستیدا ئەو باخچە نیشتیمانی وکێلگە پارێزراوانەدا کەلەزۆربەی ناوچەکانی ولاَتدا بەربلاَون وئاژەلێکی کێوی زۆری لەخۆ گرتووە وەك فیل وزەرافە وکەرکەدەن وزۆربەی ئەو ئاژەلاَنەش کە هەرەشەی لەوناچونیان لەسەر ئەلَماسی راستەقینەی ولاَتن چونکە گەشتیارێکی لە رادەبەدەر رووی تێدەکەن کە دەگاتە نزیکە ٧٥٠ هەزار کەس لەسالَێکدا.

بۆتسوانا بەیەکێك لەولاَتە زۆر کەم چرەکان دادەنرێ لە ئەفریقا. باری ئابووری لەو ولاَتەدا پشتی بە بەرهەم هێنانی ئەلَماس وگەشتوگوزار وبەخێوکردنی مانگا بەستووە.دۆزینەوەی سێ گرانترین کانی ئەلَماس لەجیهاندا لەم دواییانەدا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لە گەشەپێدانی باری ئابووری ولاَت وبایەخ دانی بە بوارەکانی خوێندن وتەندروستی وخزمەتگوزارییەکان. بۆیە ئێستا حکومەت لەهەولَی هەمەجۆر کردنی سەرچاوەکانی داهاتە چونکە وەك باوە کانی ئەلَماس لە پەنجا سالَ زیاتر نامێنێ.

لەگەلَ بەرزی نێوەندی خەرجی سالاَنەی تاکی بۆتسوانا لەچاو ولاَتانی دیکەی ئەفریقیا، بەلاَم دیارە سامانەکانی بەیەکسانی بەش ناکرێت لەنێو ریزەکانی گەلدا وئێستاش ولاَت دووچاری بێکارییەکی زۆر بووە.

لە بۆتسوانا بەرزترین رێژەی تووشبوانی نەخۆشی ئایدزی کوشندە لەچاو ولاَتانی ئەفریقیادا بەدی دەکرێت، نزیکەی ١٧٪ ی دانیشتوان دووچاری ئەم نەخۆشییە کوشندەیە بوون.

سروودی نیشتیمانی: خاکی ئێمە خاکێکی پیرۆزە.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاَتانی جیهاندا : ١٠٦.

نێوەندی خەرجی سالاَنەی تاك: ٢,٨٠٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو ولاَتانی جیهاندا: ٦٥.

بۆتسوانا بەپلەی یەکەم دێت لەنێو ولاَتانی جیهاندا لەبەرهەمی ئەلَماسی خاو، پاش ئەوەی بری فرۆشتنەکانی ئەم بەرهەمەی گەیشتە ٢,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی لە سالَی ٢٠٠١ دا، بەمەش بەسەر هەریەك لە روسیا و باشووری ئەفریقیادا پێشدەکەوێت. ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ دۆزینەوەی چەند کانێکی نوێ لە بۆتسوانا، ئەمە جگە لەوەی کە باشترین جۆری ئامێر بەکاردەهێنرێ بۆ گەران بەدوای چەندین جۆر کانزای بە بەهای دیکەش. وا چاوەروان دەکرێت بۆ چەند سالَێکی ئایندەش لەپلەی یەکەمدا بمێنێتەوە لەبەرهەمی ئەلَماسدا. هەروەها بەپلەی یانزدەیەم دێت لەنێو ولاَتانی جیهاندا لە بەرهەمی نیکلدا.

## بورکینا فاسۆ

**ناوی باو:** بورکینا فاسۆ

**ناوی فەرمی:** بورکینا فاسۆ

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Burkina Faso

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی نوێنەران ( ئەنجومەنێکی راوێژکارییە لە ١٧٨ ئەندام پێك دێت ).
- ئەنجومەنی گەل ( ١٠٧ ئەندام ).

**رووبەر :** ١٠٥,٩٤٦ میل دووجا، ٢٧٤,٤٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,٨٩١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٣٩,٧ کەس/کم٢

**ئاین:** موسڵمان ٦٥٪ ، مەسیح، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** فەڕەنسی

**پایتەخت:** ئواجادۆجۆ

**شارە سەرەکییەکان:** بۆبۆ دیۆلاسۆ، کۆدۆجۆ، ئواهیجۆیا

**درلو:** فرانك.

**ئاووهەوا:** بەشێوەیەکی گشتی گەرم و وشکە، نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ ٢٠ تۆ ٣٥ پلەی سەدییە، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٧٥ – ١٢٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** لۆکە، برنج، بەخێوکردنی مانگا، گەنمەشامی، هەرزن، پاقلە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** رستنی لۆکە، دروستکراوەکانی خۆراك، دروست کراوە کیمیاییەکان.

**سامانی کانزایی:** ( بەرێژەیەکی زۆر کەم ) مەنگەنیز، ئاڵتون، ئەڵماس.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بورکینا فاسۆ وڵاتێکی ئیسلامییە کەوتۆتە رۆژئاوای کیشوەری ئەفریقیا، نێجەر کەوتۆتە باکووری رۆژهەڵاتی، بەنین و تۆگۆ و گانا و کەناری عاج دەکەونە باشووری، مالیش دەکەوێتە باکووری رۆژئاوا. هیچ کەنارێکی نییە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٢ بەرەو باکوور.

تەختی بۆرکینا فارسۆ بریتییە لەبانێك بەرزییەکەی لەنێوان ٢٠٠م– ٧٠٠م لەسەر ئاستی رووی دەریا، زەوییە بەگژوگیا داپۆشراوەکان زۆربەی ناوچەکانی وڵاتیان گرتۆتەوە، بەڵام ناوچەی زەلکاوەکان دەکەونە باشووری رۆژهەڵاتی ودارستانەکانیش دەکەونە رۆژئاوای.

گەلی مۆسای شانشینێکی بەهێز ورێکخراویان لەو ناوچەیە دامەزراند لە سەدەکانی چواردەیەم وپانزدەیەمدا، هەر لەو ماوەیەدا ئیسلامەکان گەیشتنە ئەو ناوچەیە.

لەدواییەکانی سەدەی پانزدەیەمدا گەلی سنغی کەلە وڵاتی ئێستای مالی نیشتەجێ بوون داگیریان کردووە، ئەمەش بووە هۆی لاوازی شانشینی موسای. لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا هێزە سەربازییە فەرەنسیەکان چەند هەڵمەتێکیان بۆ کردووە. لە ساڵی ١٨٩٦ دا بۆتە پارێزراوەیەکی فەرەنسی و لەساڵی ١٩١٩ دا بۆتە داگیرکراوەیەکی فەرەنسی. لەساڵی ١٩٢٣ دا دابەش کراوە بەسەر نێجەر و سودانی فەرەنسی و کەناری عاج، بەڵام لە ١٩٤٧ دا بۆتەوە بەیەك وڵات. لەساڵی ١٩٥٨ دا لەژێر سایەی فەرەنسادا ئۆتۆنۆمی پێبەخشراوە. لە ٥ / ٨ / ١٩٦٠ ڤۆلتای باڵا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بووە وساڵانە لەرۆژی ٥ / ٨ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێرن.

یەکەم سەرۆکی پاش سەربەخۆیی : یامیۆجۆ بوو کە لەدەسەڵاتدا تا ساڵی ١٩٦٦ دا مایەوە، بەکودەتایەکی سەربازی دەستی لەدەسەڵات پێهەڵگیرا، دوای ئەو پێنج جار لەسەر یەك کودەتای سەربازی بەسەر حکومەتدا ئەنجام دراوە، دواییینیان کوشتنی سەرۆکی وڵات سانکارا بوو کەلە مانگی دەی ١٩٨٧ دا کوژرا، دوای ئەو بلیز کۆمباوری دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست.

کێشە سنوورییەکانی نێوان بورکینا فاسۆ ومالی کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٥٨ سەریهەڵدایەوە وبووە هۆی رووبەڕوو بونەوەیەکی چەکداری لە ١٩٧٤ و ١٩٨٥ و بەپێی ئەو ژمارانەی کە مالی یان بورکینا فاسۆ باسیان لێوە دەکرد نزیکە ١٥٠ کوژراوێکی لەهەردوولا خستەوە. کێشەکە لەسەر ناوچەی سنووری ئەغاشیرە کە پانیەکەی ١٥٠ کم و نزیکەی ١١٥٠ کم بەدرێژایی سنوورەکانی نێوان هەردوو وڵات درێژ دەبێتەوە. شایەنی باسە ئەو ناوچەیە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی مەنگەنیز و تیتان و نۆرانیۆم وگازی سروشتییە، کێشەکەیان رەوانەی دادگای نێودەوڵەتی کردووە، ئەویش لەلایەن خۆیەوە لە کانونی یەکەمی ١٩٨٦ دا حوکمی داوە بەدابەش کردنی ئەو ناوچەیە لەنێوانی هەردوو وڵاتدا.

لەبەرواری ٤ / ٨ / ١٩٨٤ حکومەت هەڵساوە بەگۆڕینی ناوی وڵات لە ڤۆڵتای باڵاوە، کە لەناوی روباری ڤۆڵتاوە ئەو ناوی وەرگرتووە، بۆ ناوی بورکینا فاسۆ کە بەزمانی خەڵکی وڵات بەمانای : وڵاتی پیاوانی راست، خاکی باپیرانمان.

بورکینا فاسۆ وڵاتێکی زۆر هەژارە ونەشونماشی زۆر لاوازە، ناوچە سروشتییە وشکەکانی تەنها بۆ چەند مانگێك سەوز دەبێت. گەلی ئەو وڵاتە ژیانێکی گوولەمەرگی دەبەنە سەر خاکی وڵاتیان زۆر بێ پیتەو هیچ جۆرە کانزایەکی سروشتی ئەوتۆی لەخۆ نەگرتووە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٢٢.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٠٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٦٦

## بورۆندی

**ناوی باو:** بورۆندی

**ناوی فەرمی:** کۆماری بورۆندی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Burundi

**سیستەمی حوکمڕانی:** حوکمی سەربازی، سەرۆکی کۆمار سەرۆکی حکومەتە، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران یارمەتی دەدات.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٨١ ئەندام )

**رووبەر :** ١٠,٧٤٠ میل دووجا، ٢٧,٨١٦ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦,٠٥٣,٠٠٠ کەس تا ١٩٩٨.

**چڕی دانیشتوان:** ٢٣٣,٣ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش زۆربەیان سەر بە خێڵەکانی هۆتۆن وکەمایەتییەکانیش سەر بە خێڵەکانی تۆتسین،کەمترین کۆمەڵیش سەر بەخێڵی توابیجمین.

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، ئیسلام، روحانی، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** رۆندی، فەرەنسی.

**پایتەخت:** بوجومبورا

**شارە سەرەکییەکان:** جیتیکا، بورورى، نجۆزی، سیبیتۆکی.

**دراو:** فرانکی بورۆندی

**ئاووهەوا:** بەدرێژایی ساڵ نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ١٧ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لەنێوان ١٠٠ سم بۆ ١٨٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، فاسۆلیا، قاوە، لۆکە، گەنمە شامی، پاتاتە، چا، راوەماسی، بەخێوکردنی مانگا.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** نیکل

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بورۆندی وڵاتێکی ئەفریقی زۆر بچوکە لەرووی رووبەرەوە وگەورەیە لەرووی دانیشتوانەوە، دەکەوێتە ناوەراستی ئەفریقیا، رواندا دەکەوێتە باکووری و تەنزانیا

دەکەوێتە رۆژهەلاتی وکۆنگۆی دیموکراسی دەکەوێتە رۆژئاوای. لە باشووری رۆژئاوا کەنارێکی هەیە بەدرێژایی ١٥٠ کم لەسەر دەریاچەی تەنجانیکا. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکێری هێلی درێژی ٣٠ بەرەو رۆژهەلات لەگەلٚ هێلی پانی ٣ بەرەو باشوور.

رۆژهەلات وناوەراستی بوروندی بریتین لە چەند بانێکی بەرز وزۆر بەلێژی بەرەو زەلکاوەکان کۆتاییان دێت، هەروەها لەباشووری ولاتیش بەرزاییەکان درێژ دەبنەوە. ناوچەی رۆژئاوای ولات بەدرێژایی دەشتە مەزنەکانی ئەفریقایە وکە بریتیە لە باکووری دەریاچەی تەنجانیکا وروباری روسیزی. بەرزایەکانی باکووری رۆژئاوای بوروندی لەبەرزترین خالیدا دەگاتە ٢٦٨٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریا.

یەکەم دانیشتوانی ئەو ناوچەیە گەلی توا بوون لەسەردەمەکانی پێش مێژوو، دوای ئەوان هۆتۆکان لێی نیشتەجێ بوون. لەسەدەی پانزدەیەمدا تۆتسۆکان کە لە ئەسیوپیاوە هاتبوون داگیریان کرد ودەسەلاتی تەواوی ناوچەکەیان گرتە دەست وشانشینی بوروندیان لێدامەزراند. لەنیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا یەکێك لەشاکانی بوروندی چەند بەشێکی لە باشووری رواندای ئێستا وچەند بەشێکی رۆژئاوای لەتەنزانیای ئێستای داگیر کرد، بەلام هێندەی نەخایاند شانشینی ناوبراو گەندەلٚ بوو ولەناوچوو. لە سالی ١٨٩٧ دا ئەلمانەکان ئەو ناوچەیەی کە ئێستا بە بوروندی ورواندا ناسراوە داگیریان کرد. بەلجیکییەکان لەسالی ١٩١٦ دا لەجەنگی جیهانیی یەکەم داگیریان کردووە. لەسالی ١٩٢٣ دا رواندا –وبروندی بووە هەرێمێك لەژێر دەسەلاتی بەلجیکا.لەسالی ١٩٤٦ دا ئۆرۆندییەکان دەنگیان بەسەربەخۆیی شانشینی بوروندی دا و رواندییەکانیش دەنگیان بە سەربەخۆیی و کۆماری بوونی رواندا دا. لە ١ / ٧ / ١٩٦٢ دا هەر یەك لەوان بووە ولاتێکی سەربەخۆ و پەیوەندییان کرد بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە.

لە ٢٨ / ١١ / ١٩٦٦ دا سەرۆکی سوپا مایکل مایکا پیرۆ کودەتایەکی سەربازی بەسەر شای ولات نتاری پێنجەم بەئەنجام گەیاند وسیستەمی کۆماری لەولاتدا راگەیاند وخۆی کردە سەرۆکی ولات.

لە سالەکانی دوای سەربەخۆیی دا گومان لەنێوان هۆتۆ وتوتسیدا بووە هۆی ململانێیەکی بەردەوام ولەئاکامدا شەڕی ناوخۆ هەلگیرسا وقوربانیانی هەردوو لای بەهەزاران لێکەوتەوە. لەسالی ١٩٧٢ شکستی شۆرشێك هۆتۆکان دەیانویست بەسەر تۆتسییەکاندا هەلیگیرسێنن بووە هۆی کوشتنی نزیکەی سەت هەزار کە لەهۆتۆکان و رووداوەکان بەم شێوەیە بەدوای یەکدا هاتن:

- ١٩٧٦: کودەتایەکی سەربازی بەسەر سەرۆکی ولات مایکل مایکۆپیرۆ ئەنجام دەدرێت

و جەنەراڵ جان باتیست دەسەلات دەگرێتە دەست، شایەنی باسە مایکل مایکۆپیرۆ لەدوای کودەتا ناچار ولات بەجێ دێلێت ولەساڵی ۱۹۹۳ لەدەرەوەی ولات کۆچی دوایی دەکات.

- دەستووری نوێ ولات دیاریکردنی سەرۆکی ولاتی بەهەڵبژاردن پەسەند کرد.

- ۳۱ / ۸ / ۱۹۸٤ جان باتیست باجازا دەبێتە یەکەم سەرۆکی هەڵبژاردەی ولات. ( باجازا ئەنجامدەری کودەتاکەی ۱۹۷٦ بوو ).

- ۳ / ۹ / ۱۹۸۷ کودەتایەکی سەربازی بەسەر باجازای هەڵبژێردراو ئەنجام دەدەرێت و بییر بیویا ( ۳۸ ساڵ ) دەسەلاتی ولات دەگرێتە دەست.

- ۱۹۸۸ : سەربڕین خانەیەکی ترسناك لەباکووری ولات لەنێوان هۆتۆ وتوتسی ئەنجام دەدرێت، بەهەزاران قوربانی لەهۆتۆکان کەوتەوە وبەهەزارانی دیکەش بەرەو ولاتانی دراوسێ هەڵهاتن..

- ۱۹۹۱ : دووبارەبوونەوەی کوشتوبڕی نێوان هۆتۆ وتوتسی.

- ۱۹۹۲ : دەستووری نوێ ولات رادەگەیەنرێ.

۱ / ٦ / ۱۹۹۳ : ملکیۆر نددادای دەبێتە سەرۆکی ولات پاش ئەوەی لەهەڵبژاردنە گشتییەکاندا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێ، شایەنی باسە ندادای لە هۆتۆکانە.

- ۲۲ / ۱۰ / ۱۹۹۳ کودەتایەکی سەربازی دەبێتە هۆی کوشتنی ملکیۆر ندادای و سەرۆکی حکومەت وژمارەیەك لەوەزیرەکانیشی، کودەتاکە بەسەرۆکایەتی سەرۆکی پێشوو جان باتیس باجازا، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان هۆتۆ وتوتسی و بەهەزاران قوربانی دیکەی لێکەوتەوە.

- مانگی یەکی: ۱۹۹٤ : پەرلەمان بەکۆی دەنگ سفریان تمیامیرا یان بەسەرۆکی ولات هەڵبژارد، بەلام دوای دوو مانگ شەڕوکوشتار لەنێوان هۆتۆ وتوتسی هەڵگیرسایەوە.

- ٦ / ٤ / ۱۹۹٤ کوشتنی سەرۆکی بورۆندی سفریان تمیامیرا و سەرۆکی رواندا جۆڤینال هابیاریمانا لە رووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەیەکدا ( وا باسی لێوەدەکرا کە بۆیان رێکخرابێ ). بووە هۆی هەڵگیرسانەوەی سەربڕینخانە ترسناکەکانی نێوان هۆتۆ وتوتسی وبەهەزاران قوربانی لێدەکەوێتەوە. سیلڤستەر تیبنفانیا دەسەلات دەگرێتە دەست و کۆمەڵگای نێودەوڵەتی هەوڵ دامرکاندنەوەی بارودۆخەکە دەدات بەلام بێ ئەنجام بوو.

- مانگی حەوتی ۱۹۹٦ : سەرۆکی پێشوو بییر بیویا کودەتایەکی سەربازی بەسەر سیلڤستر تیبیغانیا دەکات وخۆی دەسەلات دەگرێتە دەست، بەردەوام بوونی هەوڵەکان بۆ هێمن کردنەوەی ولات.

- ۲۸ / ۸ / ۲۰۰۰ : سەرۆکی بورۆندی بییر بیویا و ۱٤ شاندی بورۆندیا بەئامادەبوونی

ناوبژیوانی باشووری ئەفریقیا نیلسۆن ماندیلا و سەرۆكی پێشووی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا بیل كلینتۆن رێكەوتن نامەی ئاشتی ولات لە ئروشا واژۆ دەكەن. لەرێكەوتننامەكەدا لەناوبردن وشەڕی نەژادی نێوان هۆتۆ وتوتسی بەهەموو شێوەیەك قەدەغە كراوە، تەرخان كردنی دەسەلات لەسەرتاسەری ولاتدا. بەلام تۆوەكانی شەڕ ورق وكینە لەنێوان هۆتۆ وتوتسیدا هەر بەردەوامە.

- ١٨ / ٤ / ٢٠٠١ شكست هێنان بەكودەتایەك لەلایەن چەند ئەفسەرێكی بچوكەوە ئامادەكرابوو.

- ٢٨ / ١٠ /٢٠٠١ هێزە ئاشتی پارێزەكانی باشووری ئەفریقیا دەچنە نێو ولاتەوە بۆ پاراستنی حكومەتی كاتی.

- ٢ / ١١ / ٢٠٠١ : سەرۆكی بورۆندی بییر بیویا (لە تۆتسییەكانە) لەگەڵ جێگرەكەی دۆمیتیان نودایزیی ( لە هۆتۆكانە ) سوێندی دەستووری دەخۆن بۆ ماوەی سێ ساڵ لەگرتنە دەستی دەسەلاتەكانیان، ١٨ مانگ بۆ هەریەكیان، ماوەی یەكەم بۆ سەرۆك وماوەی دووەمیش بۆ جێگرەكەی.

بەلام هێشتا رەوشەكان ئارام نەبوونەتەوە وبەینا وبەین پێكدادان لەنێوانیاندا هەڵدەگیرسێتەوە.

بورۆندی ولاتێكی هەژارە هەندێ لەكانزاكان نەبێ هیچ شتێك نییە باری ئابووری پێ بەهێز بكەن، بەهۆی لافاو وكارەساتە سروشتییەكانیشەوە بەرهەمە كشتوكاڵیەكان تەنها دەتوانن پێداویستی هاولاتیان جێ بەجێ بكەن.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی : ٩٠٤ ملیۆن دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١٥٤.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١٥٠

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١٨٤

## بۆسنه وهەرسك

ناوی باو: بۆسنه وهەرسك

ناوی فەرمی: کۆماری بۆسنه وهەرسك

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Bosnia and Herzogovina

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری یەککرتوو، ئەنجومەنی سەرۆکایەتی لە حەوت ئەندام پێك هاتووە: دوان لەکرواتییەکانن، دوانیشیان لە سربەکانن، دوانیش لەبۆسنیە ئیسلامەکان، لەگەڵ ئەندامی حەوتەم کەنابێ لەهیچ کام لەم گروپە نەژادیانە بێت.

دەستەی یاسا دانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی نیشتیمانی ( ١٣٠ ئەندام )

ئەنجومەنی شارەوانی ( ١١٠ ئەندام )

رووبەر : ١٩,٧٤١ میل دووجا، ٥١,١٢٩ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٤ ملیۆن کەس ( ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٦٤ کەس/ کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: بۆسنی، ئیسلام، سرب، کروات.

ئاین: موسڵمان ٧٥٪ ، مەسیح ( ئەرتۆدۆکس، کاسۆلیك )

زمان: بۆسنی ( سربی کرواتی )

پایتەخت: سەراییڤۆ

شارە سەرەکییەکان: بانیالوکا، موستار، ترافینك، سریبرنیتشا، تۆزلا.

دراو: مارکی بۆسنی.

ئاووهەوا: زستانی زۆر ساردە وبەفرێکی زۆری لێدەبارێ وپلەکانی گەرما دەچێتە یەك پلەی سەدی، لەهاوینیشدا دەگاتە ٢٠ پلەی سەدی.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: میوە وسەوزە، گەنمەشامی، پەتاتە، پاقلە، تووتن، بەخێوکردنی مەڕوماڵات.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئامێری کارەبایی، دروست کراوەکانی خووری.

سامانی کانزایی: ئاسن، خەڵووزی بەردین، زیو، قورقوشم.

تێڕوانینێکی گشتی :

بۆسنە وهەرسك وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا. لەگەڵ کرواتیا لە رۆژئاوا وباکوورەوە سنووردارە، لەگەڵ یوگۆسلافیا لەرۆژهەڵات وباشوورەوە، کەنارێکی هەیە دەکەوێتە سەر دەریای ئەدریاتیکی بەپانی ١٠ کم لە باشووری رۆژئاوا.

ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٨ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٤ بەرەو باکوور.

باکووری ولات بریتییە لەخاکە چیاییەکان وبەدارستانێکی زۆر داپۆشراوە و پێ دەوترێ بۆسنە.

باشووری ولاتیش لە چیا بەردەلانەکان وزەوییە بەپیتەکان پێك هاتووە وپێی دەڵێن هەرسك.

نزیکەی سێ هەزار ساڵ لەمەو پێشەوە گەلی ئیلیری لەو ناوچەیەدا ژیاون، پاش ئەوە بۆتە بەشێکی ئیمپراتۆرێتی ڕۆمانی. لەسەدەکانی شەشەم وحەوتەم زاییندا گەلی سلاڤی تیادا ژیاوە، شاکانی مەجەڕ دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، لەپاشدا عوسمانییەکان، پاشان ئیمپراتۆرێتی نەمسا – مەجەڕ کە لەساڵی ١٩٠٨ دا خستییە سەر خۆی. لە ٢٨ / ٦ / ١٩١٤ دا ئەرشیدۆق فرانسیس فێردیناندی نەمسایی لە سەراییڤۆ کوژرا وئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم ( ١٩١٤ – ١٩١٨ ). پاش کۆتایی جەنگ بۆسنە وهەرسك کەوتە ژێر دەسەڵاتی شانشینی سرب وکروات و سلۆڤینیا، ناوی بوو بە یۆگۆسلافیا لە ١٩٢٩ دا.

لە ٣١ / ١ / ١٩٤٦ دا یۆگۆسلافیا بوو بە : یۆگۆسلافیای یەکگرتووی سۆسیالیستی، بۆسنە وهەرسکیش بوو بەیەکێك لە شەش کۆمارە یەکگرتوەکەی یۆگۆسلافیا.

لە ساڵی ١٩٩٠ دا سەرۆکایەتی بۆسنە لەلایەن سێ پارتی نەتەوەیی بەڕێوە دەبرا کە هەر یەك لە ئیسلام وسرب وکرواتەکانی کۆکردبۆوە.

لە ساڵی ١٩٩١ یەکێتی یۆگۆسلافیا بەهۆی جیاوازی ڕەوشی ئابووری نێوان هەر شەش کۆمارەکە هەڵوەشایەوە، شایەنی باسە هاوکات یەکێتی سۆڤێتیش بەرەو هەمان چارەنووس دەچوو، ڕووداوەکان بەم جۆرە بوون:

- ٢٦ / ٦ / ١٩٩١ : هەر یەك لە کرواتیا وسلۆڤینیا سەربەخۆیی خۆیانیان لەیەکێتی یۆگۆسلافیا ڕاگەیاند.
- ٩ / ١ / ١٩٩٢ سربەکانی بۆسنە دامەزراندنی کۆماری گەلی سرب لەبۆسنە وهەرسك ( ریپبوبلیکا سربسکا ) ڕادەگەیەنن.
- ٢٩ / ٢–١ / ١٩٩٢ سەرۆکایەتی کۆمەڵی بۆسنی کە سەرۆك عیزەت بیجۆفیتش سەرۆکایەتی دەکردن، دەنگدانێك ڕێکدەخەن سەبارەت بە سەربەخۆ بوون زۆربەی سربەکان لێی دابڕان، ئەنجامی دەنگەکان لەلایەن کروات و موسڵمانەکانەوە بە ٦٠ ٪ بەبەڵی بۆ سەربەخۆیی بوو.
- ١ / ٣ / ١٩٩٢ بۆسنە وهەرسك سەربەخۆیی ڕادەگەیەنێ، لەگەڵ ڕەخنە گرتنێکی زۆر

لەلایەن سربەكانی بۆسنەوە، رۆژی ١ / ٣ بەرۆژی سەربەخۆیی دادەنرێت.

- ٥ / ٤ / ١٩٩٢ سربەكانی بۆسنە بەهاوكاری سوپای نەتەوەیی یۆگۆسلاڤ شەڕێكی ناوخۆی توند لەدژی هەر كەسێ سربی نەبێت رادەگەیەنن، ئەمەش بەسیاسەتی لەپاسكاری نەژادی ناودەبرێت، ئەمەش ئەورووپای ناچار كرد بۆ رۆژی دوایی دانبنێت بە بۆسنە وهەرسك وپاش نزیكەی مانگێك نەتەوە یەكگرتوەكانیش دانی پێیاندا، هێزەكانی ئاشتی پارێزیشی بۆ مانگی داهاتوو رەوانەی بۆسنە وهەرسك كرد، جگە لە قەدەغە كردنی گەیاندنی چەك بەهەر یەك لەلایەنە بەشەڕ هاتوزەكان : سرب، بۆسنی، موسڵمان، كرواتە بۆسنییەكان. ئەو شەڕە ناوخۆیەی نزیكەی سێ ساڵ ونیوی خایاند بووە هۆی كوشتنی زیاتر لە دوو هەزار كەس وئاوارەكردنی ڤیاتر لەملیۆن ونیوێك هاوڵاتی، ئەمە جگە لە لەناوبردنی چەندین شار وشارۆچكە وگوندەكانی ئەو وڵاتە ولەناوبردنی ژێر خانی ئابووری.
- ٣٠ / ٨ – ١٥ / ٩ / ١٩٩٥ هێزە هاوپەیمانەكانی باكووری ئەتڵەسی ( ناتۆ ) ناوچە سەربازییەكانی سربەكانی بۆسنە بۆردومان دەكات تاكو ناچاریان بكەن بەمەرجەكانی دانوستان قایل بن و رێكەوتننامەی ئاشتی واژۆ بكەن.
- ٢١ / ١١ / ١٩٩٥ پاش چەند دانیشتن ودانوستانێكی زۆر خایەن بەسەرپەرشتی ئەمریكییەكان لە بنكەی ئاسمانی ئەمریكی لەشاری دایتۆن لە ویلایەتی ئۆهایۆی ئەمریكی و بەئامادەبوونی سەرۆك وڵاتانی هەر یەك لە ئەمریكا وفەرەنسا و روسیا وسەرۆك وەزیرانی بەریتانیا، نوێنەرانی بۆسنە وسرب وكرواتییەكان لەسەر پلانێكی ئاشتی هەر یەك لە سەرۆكی لایەنە پەیوەندیدارەكان:
  - عەلی عیزەت بیجۆڤیتش بۆ بۆسنە وهەرسك.
  - سلۆبۆدان میلۆسۆڤیتش لایەنی سربەكان
  - فرانیۆ دۆتیمان لایەنی كرواتیەكان.

رێكەوتننامەكە بەناوی رێكەوتننامەی دایتۆن ناسرا وتیایدا هێشتنەوەی بۆسنە وهەرسكی وەك یەك وڵات ولەسەر هێشتنەوەی سنوورەكانی ئێستای پەسەند كرد ولەدوو دەسەڵات پێك هاتبێت :

- كۆماری سربەكانی بۆسنە، ٤٩٪ ی خاكی وڵاتی لەخۆ گرتبێت.
- یەكێتی كرواتی – بۆسنی ئیسلام ٥١ ٪ خاكی وڵاتی لەخۆ گرتبێت.

هەردوو دەسەڵاتیش چەند دەزگایەكی مەركەزی هاوبەشی دەسەڵات سنووورداری بەیەكەوە بیان بەستێتەوە، بەلام هەر یەكەو مافی حكومەتی تایبەتی خۆی هەبێت جگە لە پۆلیسی تایبەت و سوپای سەربەخۆ. هەروەها هەر یەك لەم دوو دەسەلاتە پرۆگرامی تەلەفزیۆنی تایبەتی خۆی و كۆمپانیای تەلەفۆنی جیاواز وتەنانەت لە وەرزشەكانیشدا ئازاد وتیپە

هەڵبژاردەکانیان جیاواز بێت.

- ١٤ / ١٢ / ١٩٩٥ ئاهەنگێکی گەورە لەتەلاری ئەلیزێی پاریس بەبۆنەی رێکەوتننامەی ئاشتی لەبۆسنە، بۆ کۆتایی هێنان بەتوندترین جەنگ لە ئەوروپادا دوای جەنگی جیهانی دووەم. رێکەوتننامەکە لەلایەن هەر سێ سەرۆکی ناوبراوەوە واژۆ کرا وسەرۆکی ئەمریکا بیل کلینتۆن و سەرۆکی فەرەنسا جاك شیراك و سەرۆك وەزیرانی بەریتانی جۆن مێجۆر سەرۆکی ئیسپانیا فیلیپ جۆنزالیس و راوێژکاری ئەڵمانیا هیلمۆت کۆل و سەرۆك وەزیرانی روسیا ڤیکتۆر تشێرنۆمیدین وەك شایەت ئامادەبوون، واژۆیان لەسەر رێکەوتننامەکە کرد.
- ٢٠ / ١٢ / ١٩٩٥ هێزەکانی ئاسایشی نێودەوڵەتی، کە بەهێزەکانی ( سفۆر ) ناسراون و زۆربەیان لە وڵاتانی ئەتڵەسین و کڵاوی سەوزیان لەسەردایە، لەنێو بۆسنادا بڵاو بوونەوە وئەرکەکانیان لەبری هێزە کڵاوشینەکانی نەتەوە یەکگرتوەکان دەگرنە دەست.
- ١٤ / ٩ / ١٩٩٦ یەکەم دەنگدان لەبۆسنەدا لەساڵی ١٩٩٠ بەدواوە بەرێوە چوو، پارتی کاری دیموکراسی بەسەرۆکایەتی عەلی عیزەت بیجۆفیتشەوە سەرکەوتنی بەدەست هێنا و بووە سەرۆکی سەرۆکایەتی هەر سێ گروپ لەگەڵ دوو ئەندامی سربی وکرواتی.
- ١٢ / ٩ / ٢٠٠٠ عەلی عیزەت بیجۆفیتش بۆ هۆی خراپی باری تەندروستییەوە دەست لەکار دەکێشێتەوە و جۆزۆ کریزانۆفیتش دەچێتە جێی.

ئێستاش پاش نزیکەی دوانزدە ساڵ لەکۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆ ( ١٩٩٢ – ١٩٩٥ ) زۆربەی خەڵکی ئەو وڵاتە خاکی وڵات بەنیشتیمانی خۆیان نازانن و زۆربەی توندڕەوەکانیش خەون بەپەیوەندی کردن بە کرواتیا یان سربیاوە دەبینن.

لە بەرورای ٢٢ / ٥ / ١٩٩٢ بۆسنە وهەرسك پەیوەندی کرد بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە. لەبەرورای ٢٢ / ١٢ / ١٩٩٨ دا لە ئۆراسیی باکووری رۆژهەڵاتی بۆسنە وهەرسك بەردی بناغەی یەکەم پرد دانرا لەنێوانی کرواتیا و یەکێتی ئیسلام وکرواتییەکان. شایەنی باسە ئەم پردە لەپردی ئەو پردە وچەندینی دیکەش بنیات دەنرێ کە لە شەڕی ناوخۆدا ( ١٩٩٢ – ١٩٩٥ ) روخێنراون.

لە ١١ / ٧ / ٢٠٠١ دا موسڵمانەکانی بۆسنە وهەرسك یادی هاورێ و کەسوکارە کوژراوەکانیان گێرا کە لەسەر دەستی هێزە سربیەکان لەساڵی ١٩٩٥ دا گیانیان لەدەستدا. شایەنی باسە یادەکەیان بەئامادەبوون وچاودێری چەند رێنماییەکی ئاسایشی توند بەرێوەی برد وەك خۆپاراستنێك لەئەگەری هەر هێرشێکی کتوپڕی سربەکان بۆ سەریان لەترسی ئەوەی کە سربەکان تاوانی سەربڕینخانەکان بخەنە ئەستۆی ئەمان. هێزە ئاشتی پارێزەکانی ئەمریکا لەناوچەکەدا لە نزیك کارگەیەکی پێشوو پاتری بڵاوبوونەوە، لەهەمان ئەو شوێنەی کە چەند ساڵێك لەمەوبەر خەڵکان بە بەرچاوی هێزە بێ دەسەڵاتە

هۆڵەندییەکانەوە کشتوبڕی بەکۆمەڵی یەکتریان دەکرد و بەتوندترین ونامرۆیی ترین پرۆسە ناسرا لەئەوروپادا دوای جەنگی جیهانی دووەم. ئەم هەڵوێستە بێ دەسەڵاتییەی هێزەکانی هۆڵەندا حکومەتە ئەرخەوانییەکەی تیم کۆکی هۆڵەندای ناچارکرد دەست لەکار بکێشێتەوە، ئەمە دوای ئەو راپۆرتەی کە لەلایەن پەیمانگای لێکۆڵینەوە سەربازییەکانی هۆڵەندا لە مانگی چواری ٢٠٠٢ دا ئامادەی کردبوو و بووە هۆی دەست لەکار کێشانەوەی سەرۆکی سوپای هۆڵەنداش جەنەراڵ ئەی دی فان باڵ.

لە بەرورای ١٥ / ٧ / ٢٠٠٢ دا لە سەرایێڤۆی پایتەختی بۆسنە دانیشتنێك هەر یەك لە سەرۆك : شتبتی میسیتش ( کرواتیا )، فویسلاف کۆستۆنیتشا ( یۆگۆسلافیا )، ئەندامانی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بۆسنی : بریز بلکیتش ( موسڵمان )، زیفکۆ رادیسیتش ( سرب )، جۆزۆ کریزانۆفیتش ( کرواتی ) کۆکردەوە. ئەم دانیشتنە بەیەکەم دانیشتنی لەو جۆرە دادەنرێ لەدوای شەڕی ناوخۆوە و دانیشتوان بەیانێکی هاوبەشیان بەسەرکەوتنی کۆبوونەوەکە دەرکرد وواژۆیان لەسەر رووداوێکی مێژوویی بەلقانی کرد، لەو رێکەوتنەدا پلانێکی گرنگیان سەبارەت بە هاریکاری یەکتر وساڕێژکردنی برینەکانی جەنگ و کۆتایی هێنانێکی یەکجارەکی بەکێشەکانی نێوانیاندا کردبوو. هەروەها ئامارەیان دابوو بە پێشکەوتنی وڵاتەکانیان لەپێناوی باشترکردنی رەوشی دانیشتوان وپابەند بوون بە بنەما ئەوروپیەکانەوە وبنیاتنانی پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوانیاندا وپارێزگاری لەدراوسێیەتیان. هەروەها بەیانە هاوبەشەکەیان جەختی کردەوە لەسەر ئاڵوگۆڕی بازرگانی ودارایی لەنێوانیاندا وگەڕانەوەی ئاوارە وهەڵهاتوان بۆ وڵاتی خۆیان لەنزیك ترین کاتدا جگە لەدەرکردنی یاسا تایبەتەکانی بەماق کەمایەتییەکانی وڵاتەکانیان.

ناوی هەرسك لەناوی هرتسۆگی ئەڵمانیاوە هاتووە کە بەمانای دۆق دێت و بۆسنەش لەناوی روباری بۆسنەوە کە یەکێکە لە روبارە سەرەکییەکانی وڵات.

بۆسنە وهەرسك سامانێکی کانزایی دەوڵەمەندی تێدایە وەك خەڵووزی بەردین ئاسن و ووزەی کارۆئاوی جگە لەوەی کە بەناوچەیەکی گرنگی گەشتوگوزار دادەنرێ بەهۆی دارستانە زۆرەکانیەوە کەئەمیش بەسەرچاوەیەکی گرنگی دار دادەنرێت.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٨

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١،١٤٣ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١١١.

سروودی نیشتیمانی: تەنها مۆزیکە وهۆنراوەی نییە

## پۆڵەندا

ناوی باو:پۆڵەندا

ناوی فەرمی: کۆماری پۆڵەندا

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Poland

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ١٠٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٤٦٠ ئەندام )

رووبەر : ١٢٠,٧٢٨ میل دووجا، ٣١٢,٦٨٥ کم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ٤٠,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠٠ )

چڕی دانیشتوان: ١٢٥ کەس/ کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: بۆڵەندی، ئۆکرانی، ئەڵمان.

ئاین: مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك، ئەرتۆدۆکس )، لەگەڵ نزیکەی ٢٥ هەزار موسڵمان.

زمان: بۆڵەندی

پایتەخت: وارشۆ

شارە سەرەکییەکان: لۆدز، کەڕەکاو، لوج، بیتا، ئۆبۆلی، بیالیستۆك، گدانسك، کراکۆڤ.

دراو: زلۆوتی.

ئاووهەوا: کیشوەری، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا ٣ پلە لەژێر سفری سەدی و ١٨ پلەی سەدی لەهاویندا. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠٠ ملم لە دەشتەکان و ٨٠٠ ملم لە چیاکاندا دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: گەنم، جۆ، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، بەخێوکردنی بەراز.

بەرهەمە پیشە سازییەکان: دروستکراوە کیمیاییەکان، دروست کراوەکانی خۆراك، ئاسن وپۆڵا، ئامێر، دروستکردنی کەشتی، دروست کراوەکانی خووری.

سامانی کانزایی: خەڵووز، مس، زیو، گۆگرد، گازی سروشتی، قورقوشم، زنك، لینیت.

تێڕوانینێکی گشتی :

پۆڵەندا، یان پۆڵەندا وەك هەندێ جار پێی دەوترێ بەپێی زمانی فەرەنسی، وڵاتێکی دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەوروپا، دەریای بەلتیك دەکەوێتە باکووری، روسیا ولیتوانیا دەکەونە باکووری رۆژهەڵاتی، روسیای سپی وئۆکرانیا دەکەونە رۆژهەڵاتی، سلۆڤاکیا و چیك دەکەونە باشووری وئەڵمانیاش دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٩ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥٢ بەرەو باکوور.

پۆڵەندا بریتییە لە دەشتێکی بەرز نزیکەی ٥٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزە و نزیکەی ٩٧٪ ی خاکی وڵات دادەپۆشێ، بەشەکەی تریشی لە چیا رۆژئاواکانی کاربات پێك هاتووە کە دەکەوێتە ئەو پەڕی باشووری وڵات و دارستانێکی چڕ وزۆری لەخۆ گرتووە.

بەر لەچوار هەزار ساڵ لەوەو پێشەوە سلاڤییەکان لە پۆڵەندا دا ژیاون. لەسەدەی نۆیەمدا ژمارەیەك خێڵی زۆر گەیشتنە ئەو ناوچەیە وبە پۆلان دەناسران، کە بەزمانی خۆیان بەمانای خاکی گەلی جوتیاران دێت و ناوی وڵاتیشی لێوە هاتووە.

لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئیمپراتۆریەتی کاسۆلیکی بەهێزی لێ دامەزرێندراوە، سنوورەکانی لە دەریای بەلتیکەوە بۆ دەریای رەش دەبوو. بەلام روسیا وبروسیا و نەمسا لەساڵی ١٧٧٢ دا زۆربەی خاکی ئیمپراتۆریەتی ناوبراویان لەناو خۆیاندا دابەش کرد. نیوەی ئەو زەویانەی لە دابەشکردنی یەکەمدا رزگاریان بوو لە ١٧٩٣ دا لەنێوان روسیا وبروسیا دابەش کرا. پاشان لە ١٧٩٥ دا چی زەوی مابوو لەلایەن روسیا وبروسیا ونەمسا بەتەواوەتی دابەشکرا. بەمەش پۆڵەندا بەتەواوەتی لەسەر نەخشەی سیاسی بەتەواوەتی سڕایەوە. چەند جارێك پۆڵەندییەکان لەدژی داگیرکەران راپەڕیون وچەند شۆڕشێکیان لەدژیان هەڵگیرساندووە. بەتایبەتی لەساڵەکانی ١٨٣١ و ١٨٤٨ و ١٨٦٣ بەلام تەواوی شۆڕشەکانی بەشێوەیەکی زۆر دڕندانە لەناو براوە.

لە پاش جەنگی جیهانیی یەکەم، لە ٦ / ١٠ / ١٩١٨ سەربەخۆیی خۆی راگەیاندووە. ئەڵمانیا لە ١١ / ١٩٣٩ دا داگیری کردووە ونەمەش یەکێك بوو لەهۆکارەکانی هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم، لەنێوان ئەڵمانیا و روسیا دابەشکراوە، دوای جەنگی جیهانی دووەم ١٩٤٥ سەربەخۆ بۆتەوە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە دوای کۆتایی جەنگ وسەربەخۆیی پۆڵەندا شیوعییەکان دەسەلاتی وڵاتیان گرتە دەست وچی بەرەنگاری لەدژیان پەیدا دەبوو دەستبەجێ لەناویان دەبرد، تەنانەت دەستیان خستە نێو هەڵبژاردنە ئازادەکانی ساڵی ١٩٤٧ یش وبۆ ساڵێکی تەواو هەموو دەزگا حکومییەکانیان قۆرغ کرد. چەندین بزوتنەوە و راپەڕین لەدژی شیوعییەکان و سیاسەتی حکومەت کە کەوتبۆوە ژێر دەسەلاتی سیاسەتەکانی یەکێتی سۆڤێت بەئەنجام گەیەنرا.

لە ساڵی ١٩٨٠ وساڵەکانی دوایی پۆڵەندا مانگرتن وخۆپیشاندانێکی گەورەی بەخۆوە بینی لەلایەن کرێکارانەوە بووە هۆی دامەزراندنی یەکەم سەندیکای سەربەخۆ لەئەورووپای رۆژهەلات وناوی سەندیکای هاوکاری لێنرا وحکومەتیش دانی پیانا، شایەنی باسە لیخ ڤالیسا کە لە ٥ / ١٠ / ١٩٨٣ دا خەلاتی نۆبڵی ئاشتی پێبەخشرا سەرۆکایەتی سەندیکاکەی دەکرد.

لەساڵی ١٩٨٩ دا حکومەت لەگەڵ سەندیکای هاوکاری گەیشتە رێکەوتنێك بەپێی ئەو رێکەوتنە هەل بۆ پارتە ناشیوعیەکان رەخسا بەشداری لەهەڵبژاردنەکانی پەرلەمان بکەن، بەهۆی یارمەتییەکانی سەندیکای هاوکاری پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان ژمارەیەك کورسی

بەرچاویان بەدەست هێنا.

لە ١٩ / ٨ / ١٩٨٩ دا پەرلەمانی پۆڵەندی جەنەراڵ یارۆزلسکی بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژارد، تادۆز مازۆفسکی حکومەتێکی ناشیوعی پێك هێنا، مازۆفسکی یەکەم سەرۆکی وەزیران بوو لە ئەوروپای رۆژهەڵات شیوعی نەبێت لەساڵی ١٩٤٥ دا. حکومەتی نوێ کۆتایی هێنا بەدەسەڵاتی شیوعییەت لەپۆڵەندا ودەستی کرد بەچاکسازییە ئابوورییەکان پتەو کردنی ئابووری بازارەکانی. بۆ ساڵی داهاتوو حیزبی شیوعی خۆی لەخۆیدا هەڵوەشایەوە ورێکخراویان نەما لەوڵاتدا. لە هەڵبژاردنەکانی ٩ / ١٢ / ١٩٩٠ دا لیخ ڤالیسای سەرۆکی سەندیکای هاوکاری بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا.

لە ٢٠ / ١١ / ١٩٩٥ دا ئەلیکساندەر کواشینفسکی لەهەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنایەوە دەسەڵاتی وڵاتی خستەوە دەست شیوعیەکانی پێشوو گەڕاندەوە. لەهەڵبژاردنەکانی ٨ / ١٠ / ٢٠٠٠ دا بۆ جاری دووەم کواشینفسکی سەرکەوتنی بەدەست هێنایەوە.

لە ساڵی ١٩٩٩ دا پۆڵەندا پەیوەندی کرد بە هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسی ( ناتۆ ) لەهەمان ئەو کاتەی کە هەنگاریا و چیکیش پەیوەندییان پێوە کرد.

ئابووری پۆڵەندا پێش جەنگی جیهانی دووەم پشتی بەچالاکی کشتوکاڵی بەستبوو، لەپاشدا بەرەو چالاکی پیشەسازی گەشەی کرد وڕێژەی ٣٤٪ ی هێزی کار لەو چالاکییەدا بەشدارن لەکاتێکدا تەنها ٢٩٪ هێزی کار سەرقاڵی چالاکییە کشتوکاڵیەکانن. بەهۆی ئەو پێگە ستراتیژییەی پۆڵەندا کە دەکەوێتە نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوای ئەوروپا واچاوەڕوان دەکرێ رۆڵێکی زۆر بەرچاوی هەبێت لە سیاسەتەکانی دوارۆژی ئەوروپا.

سروودی نیشتیمانی : پۆڵەندا هێشتا بەپێوەیە

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٩٤,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٣٢.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,٤٧٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧١

پۆڵەندا بەپلەی سێهەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی پەتاتە و بەپلەی شەشەم دێت لە لینیت وبەراز، بەپلەی حەوتەم دێت لە بەرهەمی خەڵووز وبەپلەی هەشتەم دێت لەبەرهەمی مس وزیو وبەپلەی یانزدەیەم دێت لەبەرهەمی قورقوشم و پلەی دوانزدەیەم لەبەرهەمی زنك وبەپلەی چواردەیەم دێت لەبەرهەمی جۆ وبەپلەی حەڤدەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی گەنم.

## بۆلیڤیا

**ناوی باو:** بۆلیڤیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری بۆلیڤیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Bolivia

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار سەرۆکایەتی حکومەتیش دەکات.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٢٧ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٣٠ ئەندام )

**رووبەر :** ٤٢٤,١٦٤ میل دووجا، ١,٠٩٨,٥٨١ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧,٧٦٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٧,١ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** هیندە سوورەکان، میستیزۆ ( مۆلدۆن )، ئەورووپی.

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك )، چەند بیروباوەڕێکی هیندی.

**زمان:** ئیسپانی، کۆتشوا، ئیمارا.

**پایتەخت:** دوو پایەتەختی هەیە: پایتەختی کارگێڕی لا باز وپایتەختی دەستووری : سۆکرێ.

**شارە سەرەکییەکان:** کۆشابامبا، سانتا کرۆز، ئەشاکاشی، باتالاس، بۆتۆزی، ئۆرۆرۆ، ئیلئاتۆ.

**دراو:** بیزۆی بۆلیڤی

**ئاووهەوا:** ئاو وهەوای چیاکانی ئەندیز: سارده وبەفر داپۆشیوە، ئاووهەوای هەرێمی یۆنگاس: گەرم وشێدارە، ئاو وهەوای هەرێمی نۆرێنتی: گەرم وشێدارە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** کاکاو، گەنمەشامی، برنج، گەنم، قاوە، لۆکە، دارو تەختە، لاستیك، کۆکایین ( ماددەیەکی قەدەغە کراوی هۆشبەرە).

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** تەنەکەی خاو، خواردنە ئامادەکراوەکان، دروستکراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** تەنەکە، گازی سروشتی، نەوت، زنك، قورقوشم، ئەنتیمۆن، تەنگستن، مس، زیو، ئاڵتون.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بۆلیڤیا وڵاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەمریکای باشوور، بەرازیل دەکەوێتە باشوور و ڕۆژهەڵاتی، باراگوای دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی وئەرجەنتین دەکەوێتە باشووری، چیلی دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای، پیرۆش دەکەوێتە ڕۆژئاوا. هیچ کەنارێکی نییە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦٤ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٦ بەرەو باشوور. بەرزاییەکانی ئەندیز زۆربەی ڕۆژئاوای بۆلیڤیا دادەپۆشێ، ناوچەی یونگاس دەکەونە باکووری ڕۆژهەڵاتی بەرزاییەکانی ئەندیز وکۆمەڵێ چیای سەخت و زۆر لێژی و ڕاڕەوی تەسکی تێدەکەوێت. ناوچەی گالیزیش دەکەوێتە ناوەڕاستی بۆلیڤیا کە بەرهەمە کشتوکاڵییە سەرەکییەکانی لێ بەرهەم دەهێنرێت. دەشتی ئۆرێنتی کە دارستانێکی زۆری لەخۆ گرتووە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵات و چەندین ڕووبارێکی پان بەو ناوچەیەدا تێدەپەڕێت و بەشێك لەتۆڕی ڕووباری ئەمازۆن پێك دەهێنێت.

دەریاچەی تیتیکاکا کە پاك ترین ولەبارترین دەریاچەیە بۆ دەریاوانی لەجیهاندا دەکەوێتە سنوورەکانی نێوان بۆلیڤیا و پیرۆ وبەرزییەکشی نزیکەی ٣,٨١٢ م لەسەر ئاستی ڕووی دەریا دەبێت.

هیندە سوورەکانی ئەمریکا بەر لە دەهەزار ساڵ لەمەو پێش لەو ناوچەیەدا ژیاون. لەساڵی ١٥٣٨ بەدواوە ئیسپانییەکان دەستیان کردووە بەنیشتەجێبوون لەو وڵاتەدا وداگیرکراوەیەکیان لێ پێك هێناوە. لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، جەنەراڵی فەنزەویلی بۆلیڤاری تێکۆشەر سوپایەکی گەورەی پێك هێناوە بۆ ئازادکردنی داگیر کراوە ئیسپانییەکان لە ئەمریکای باشوور ولەساڵی ١٨٢٤ دا یەکێ لەجەنەراڵەکانی کەناوی ئەنتۆنیۆ خۆزێ دی سۆکرێی بەرەو ئازاد کردنی بۆلیڤیا ڕەوانە کردووە وجەنەراڵی ناوبراو پاش ساڵێك توانیویەتی ناوچەکە ئازاد بکات و لە ٦ / ٨ / ١٨٢٥ دا بۆلیڤیا سەربەخۆ بووە ( جەژنی نیشتیمانیش هەمان ڕۆژی ٦ / ٨ / ی هەموو ساڵێکە ). ناوی بۆلیڤیای ئێستاشی لەناوی ئەو تێکۆشەرەوە "بۆلیڤا"وە لێنراوە. بۆ ساڵی دوایی سۆکرێ بۆتە یەکەم سەرۆکی وڵات و تا ساڵی ١٨٢٨ حوکمی کردووە. بەڵام دوای ئەو ماوەیە وڵات چەندین ململانێ سیاسییەکان وئاژاوەی گەورەی بەخۆوە بینیوە لەسەر دەسەلات گرتنە دەست، لەماوەی ١٧٥ ساڵی سەربەخۆییدا نزیکەی ١٩٥ کودەتای سەربازی لەبۆلیڤیا ڕووی داوە و زیاتر لە ٩٠ سەرۆك کۆماری گۆڕیوە.

چەندین شەڕ وپێکدادان لەنێوان هەر یەك لە بۆلیڤیا وچیلی لە ( ١٨٧٩ – ١٨٨٣ ) و بەرازیل وبۆلیڤیا ( ١٩٠٣ ) و بۆلیڤیا وباراگوای ( ١٩٣٢ – ١٩٣٥ ) بەرپا بووە و بۆتە هۆی

لەدەست دانی ژمارەیەك هەرێمی دەوڵەمەندی بۆلیڤیا.

لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەمانگی هەشتی ١٩٩٧ دا جەنەراڵ هۆگۆ بازیر سواریز یەکەم حاکمی سەربازی بووە لە نێوان ئەو سەرۆکانەی کە حوکمی وڵاتانی ئەمریکای لاتینی لەحەفتاکانی سەدەی بیستەمدا بەهەڵبژاردنێکی دیموکراسی دەسەڵات بگرێتە دەست، لەلایەن ١٥٧ ئەندامی هەردوو ئۆفیسی پەرلەمانی بۆلیڤییەوە سەرکەوتنی بەدەست هێناو لەبری سەرۆك گوانزالۆ سانشیز دو لۆزادا بووە سەرۆکی وڵات.

لەمانگی چواری ساڵی ٢٠٠٠ بۆلیڤیا چەندین مانگرتن وکێشە وکاری توندی بەخۆوە بینی، لەکاتێکدا سوپا و هێندە سوورە جوتیارەکانی ئەو وڵاتە رووبەرووی یەك بوونەوە و بووە هۆی کوشتنی وبریندار بوونی بەدەیان هاوڵاتی. ئەم خۆپیشاندانە رەنگ دانەوەی باری ئابووری ناهەمواری هاوڵاتیان بەگشتی وجوتیاران بەتایبەتی بەهۆی گران بوونی نرخی ئاو وبلاوبوونەوەی بێکاری لەنێو ریزەکانیاندا. بەڵام لەراستیدا قەڵاچۆکردن وقەدەغەکردنی چاندنی ماددە هۆشبەرەکانی وەکو کۆکایین کێشەی سەرەکی نێوان حکومەت وجوتیاران بوو، چونکە بەهەزارەها جوتیاری ئەو وڵاتەی لەکارخست.

سەرۆکی وڵات ماوەی ٩٠ رۆژی رەوشی نائاسایی وڵات راگەیاند.

لەبەرواری ٦ / ٨ / ٢٠٠١ دا سەرۆکی بۆلیڤی ( ٧٥ ساڵ ) دەستی لەکار کێشایەوە بەهۆی تووش بوونی بەنەخۆشی شێرپەنجەی سییەکانی. بەپێی دەستووری وڵات ئەندازیار خۆرخۆ کوێروجا ( ٤١ ساڵ ) ی جێگری پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست و لە ٨ / ٨ / ٢٠٠١ دا سوێندی دەستووری خوارد وبەڵێنی دا پەیرەوی پرۆگرامی سەرۆکی پێشوو بکات وڕێ لەچاندنی کۆکایین بگرێت.

لەبەرواری ٥ / ٨ / ٢٠٠٢ دا کۆنگرێسی بۆلیڤی گوانزالۆ سانشیز دو لوازادا ( ٧٢ ساڵ ) یان بەسەرۆکی بۆلیڤیا بۆ ماوەی پێنج ساڵ هەڵبژارد، شایەنی باسە گوانزالۆ لەوەو پێش لە نێوانی ( ١٩٩٣ – ١٩٩٧ ) یش هەر سەرۆکی وڵات بووە. لە ئەنجامی هەڵبژاردنە جەماوەرییەکانی ٣٠ / ٦ / ٢٠٠٢ دا گوانزالۆ نەیتوانیبوو دەنگی تەواو بەدەست بهێنێ شایەنی سەرکەوتنی بێت، بەڵام کۆنگرێس ناچار بوو لەنێوان دوو کەسدا یەکێکیان دیاری بکرێت بۆیە ئەمیان هەڵبژارد.

بۆلیڤیا وڵاتێکی پاشکەوتووە، بەڵام هەندێ سەرچاوەی سروشتی تێدایە تا ئێستا بەتەواوەتی بەگەڕ نەخراوە وسوودێکی ئەوتۆی لێوەرنەگیراوە. شایەنی باسە بۆلیڤیا بەیەکێك لەوڵاتە بەرهەمهێنەرەکانی ماددەی کۆکایینی هۆشبەر دادەنرێت.

سروودی نیشتیمانی : ئەی بۆلیڤییەکان ئۆمێدەکانتان سەرکەوتنی هانی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٥,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٩٧

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٧٧٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٢٧.

بۆلیڤیا بەپلەی حەوتەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی تەنەکە وبەپلەی دەیەم دێت لەبەرهەمی زیو، بەپەلەی سیانزدەیەم لەبەرهەمی زنك.

* * *

**ئیمارییەکان جەژنی سەری سالی ٥٠٠٨ یان گێڕا**

هیندە ئیمارییەکان لەبۆلیڤیا بەپێی سالنامەی تایبەتی خۆیان جەژنی سالی تازەیان گێڕا و بەپێی سالنامەکەیان سالی ٢٠٠٠ ی زایینی بوو بە سالی ٥٠٠٨ و لەگەل بەرەبەیانی ئەو رۆژەدا ئیمارییەکان دەستیان کرد بەگێڕانی نوێژە تایبەتییەکانیان و بەچوار دەوری ئاگرێکدا کۆبوونەوە لەناوچەی ئاسەوارە دێرینەکانی تیهوانکۆ گێڕا. شایەنی باسە ئاسەوارەکانی ئەو ناوچەیە ئەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی چواردە وپانزەهەم ولەبەردەم دەروازەیەکدا کەبە دەروازەی خۆر ناسراوە وەستان ولەهەردوو خواوەندی خۆر و خواوەندی زەوی "باتشماما" دەپاڕانەوە.

لەگەل دەرکەوتنی تیشکی خۆر لە دەروازەی خۆر کە دەروازەیەکی بەردینە ونزیکەی ٣ مەتر بەرزە پیاوانی ئاینی قەشەی تیهوانکۆ سالی نوێ راگەیاند کەبەزمانی ئیمارییەکان "ماتشاج مرا" ی پێ دەلێن.

## پیرۆ

**ناوی باو:** پیرۆ

**ناوی فەرمی:** کۆماری پیرۆ

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Pero

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار سەرۆکی حکومەتە

**دەستەی یاسا دانان:** کۆنگرێسی نیشتیمانی ( ١٢٠ ئەندام )

**رووبەر :** ٤٩٦,٢٢٥ میل دووجا، ١,٢٨٥,٢١٦ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٧,٠١٢,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢١ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** هیندە ئەمریکییەکان ( ٣٢٪ )، میستیزۆ ( تێکەڵەیەکن لە هیندکانی ئەمریکا وئیسپانەکان)، ئەوروپی، ئەفریقی رەش، ئاسیایی.

**ئاین:** مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )

**زمان:** ئیسپانی، کۆتشوا، ئیمارا

**پایتەخت:** لیما

**شارە سەرەکییەکان:** ئەریکۆبیا، کالاو، شیکلایۆ، ترۆجیلۆ، هوانکایۆ، کۆزکۆ، شیمبۆتی، بییوارا، ئایکیتۆس.

**دراو:** سوولی نوێ.

**ئاو وهەوا:** لەگەڵ ئەوەی کە پیرۆ کەوتۆتە ناوچەی کەمەرییەوە، بەڵام شەپۆلە ساردەکانی پیرۆ ناوچەی سەر کەنارەکانی کردۆتە ناوچەیەکی مام ناوەند وسروشتی لەچاو کەش وهەوای ئاسایی ئەو ناوچەیە. نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ١٦ پلەی سەدی ولەهاویندا ٢٣ پلەی سەدییە، لەبەرزاییەکان ساردترە، بەڵام لەناوچەی دارستانەکان بەرزتر دەبێت وهەندێ جار دەگاتە ٢٧ پلەی سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، قاوە، لۆکە، پەتاتە، قامیشی شەکر، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ماسی قتوو، دروستکراوەکانی خۆراك، دروست کراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** مس، ئاسن، قورقوشم، نەوت، ئاڵتون، تەنەکە.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

وڵاتی پیرۆ دەکەوێتە رۆژئاوای ئەمریکای باشوور، بەرازیل دەکەوێتە رۆژهەڵاتی و بۆلیڤیا و چیلی دەکەونە باشووری رۆژهەڵاتی، زەریای هێمن دەکەوێتە رۆژئاوای و ئێکوادۆر دەکەوێتە باکووری رۆژئاوا. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧٤ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٢ بەرەو باشوور.

دەشتاییەکی زۆر دەکەوێتە سەر کەناری پیرۆ لەسەر زەریای هێمن و بەناوچەیەکی وشك ناسراوە وئاوی لەروبارەکانەوە بۆ راکێشراوە، چیاکانی ئەندیزیش دەڕواننە سەر ئەو دەشتانە وبەرزییەکانی لەهەندێ لوتکەدا دەگاتە ٢٠٠ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا. دەریاچەی تیتیکاکاش دەکەوێتە نێوان بۆلیڤیا وپیرۆ. دارستانێکی زۆر دەکەونە ژێر بەرزاییەکان وروباری ئەمازۆنیش لەو ناوچەیەوە بەرێدەکەوێ.

هیند ئەمەریکییەکان نزیکەی ١٢,٠٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە لەناوچەکەدا نیشتەجێ بوون وشارستانێتی تشافینیان لێ دامەزراندووە. هەروەها هیندکانی ئەمریکا لە نزیکەی ساڵی ١٢٠٠ دا شارستانێتێکی مەزنیان لەوناوچەیە دامەزراندووە بە ئێنکا ناسراوە و ئەو شارستانێتە لەهەر یەك لە کۆلۆمبیا وئێکوادۆر وبۆلیڤیا چیلی وئەرجەنتین بڵاوبۆتەوە. وشەی پیرۆ بەرەچەڵەك وشەیەکی هیندییەوبەمانای ژیانێکی خۆش وتێرو تەسەل دێت چونکە ناوچەکە تا چەند سەدەیەکیش لەو ئاستەدا بووە.

لەساڵی ١٥٢٤ ئیسپانییەکان گەیشتونەتە ناوچەکە بەسەرۆکایەتی فرانسیسکۆ بیزارۆی دەریاوان کاتێ لەپەنەما ناوبانگی ئەو شانشینی پیرۆی بەپیتەیان بیست، ئیسپانیەکان تا ساڵی ١٥٣٢ توانیان زۆربەی خاکەکانی پیرۆیان داگیرکرد. نزیکەی ٣٠٠ ساڵ حوکمی ناوچەکەیان کردووە. دوای ئەو جەنگەی هەر یەك لە خۆزێ دی سان مارتین لە ئەرجەنتینەوە و سیمۆن بۆلیڤار لەڤەنزەویلاوە لەپێناوی کۆتایی هێنان بەدەسەڵاتی ئەوروپی لەئەمریکای باشووردا بەرپایان کرد سەربەخۆ بووە. مارتین لە ١٨٢٠ دا بەسوپایەکی ئەرجەنتینی و چیلییەوە هەستاوە بە ئازاد کردنی پیرۆ ولە ٢٨ / ٧ / ١٨٢١ دا سەربەخۆیی پیرۆی راگەیاندووە، پیرۆ ساڵانە لە ٢٨ / ٧ جەژنی نیشتیمانی دەگێرێت. بۆلیڤاریش بەسەرکردایەتی سوپایەك لە ڤەنزەویلی وکۆلۆمبییەکان ئامادەی کردبوو لەساڵی ١٨٢٣ دا چۆتە پیرۆ و تەواوی هێزە ئیسپانیەکانی تێك شکاند کەلە باشووری ناوەڕاستی پیرۆ بوون، شایەنی باسە دوایین هێزەکانی ئیسپانیا لەو ناوچەیەدا لەساڵی ١٨٢٦ دا خۆیان داوە بەدەستەوە، بەڵام ئیسپانیا تا ساڵی ١٨٧٩ دانی بەسەربەخۆیی پیرۆ نەناوە.

لەنێوان ساڵەکانی ١٨٧٩ – ١٨٨٣ پیرۆ ناوچەی باشووری بەپیت ودەوڵەمەندی لەکانزا سروشتیەکان لەدەست داوە، کاتێ چیلی لەشەری زەریای هێمندا داگیری کردووە. لە ٢٠ /

١٠ / ١٨٨٣ دا بەپێی ڕێکەوتننامەی ئەنکۆر پیرۆ دەستی لەهەندێ لەزەوییەکانی هەڵگرت بۆ چیلی لەپێناوی ڕێکەوتن لەگەڵی. لەساڵی ١٩٤٥ دا پیرۆ پەیوەندی کرد بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە.

لەمانگی ١٠ / ١٩٩٨ دا پیرۆ وئیکوادۆر ڕێکەوتننامەی ئاشتیان واژۆ کرد بۆ کۆتایی هێنان بەو کێشانەی لەسەر سنوورەکانیان بووە هۆی بەرپا بوونی چەند شەڕێك لەنێوانیاندا لەساڵەکانی ١٩٤١ و ١٩٨٥ و ١٩٩٥. ڕێکەوتننامەکە بەناوبژیوانی ویلایەتە یەکگرتوەکان وئەرجەنتین وبەرازیل وچیلی بەئەنجام گەیەنرا.

لەبەرواری ١٤ / ٥ / ١٩٩٥ دا سەرۆکی ئیکوادۆر جەمیل موعەوەز لەگەڵ سەرۆکی پیرۆ ئەلبیرتۆ فۆجمۆریی لەئاهەنگێکدا لەیەکێك لەناوچە سنوورییەکانی نێوان هەردوو وڵات دەستیان خستە دەستی یەك وبەمەش کۆتایی بە دوایین کێشەی سنووری هات لەئەمریکای لاتینی، هەردوو سەرۆك دوایین خاڵی سنووری نێوانیان لەسەر یەکگرتنەوەی هەردوو ڕووباری سەر سنوورەکانیان دیاری کرد.

لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٧ و سەرەتاکانی ١٩٩٨ کارەساتی نینۆ ( کارەساتی کەشی نالەبار ) لە پیرۆیدا و بووە هۆی کوشتنی بەسەدان کەس وزیانێکی ماددی زۆری پێ گەیاند.

یەکەم سەرۆکی وڵات لەدوای سەربەخۆیی ساڵی ١٨٢٧ جەنەراڵ خۆزێ دی سان مارتین بوو، دوای ئەویش زنجیرەیەك لە ئەفسەرە سەربازەکان زۆربەیان لەسەدەکانی نۆزدەیەم وبیستەم دەسەلاتیان گرتۆتە دەست وبەهۆی کودەتای سەربازییەوە هاتونەتە سەر حوکم.

لە ١٠ / ٦ / ١٩٩٠ دا ئەلبیرتۆ فۆجمۆریی پاڵێوراوی سەربەخۆ بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا، شایەنی باسە فۆجمۆریی دوای ئالن گارسیا بیریس بووە سەرۆکی کۆمار کە ئەمیان لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٨٥ دا پۆستی سەرۆکایەتی پێ سپێردرابوو. فۆجمۆریی لە ١٩٩٥ دا بۆ جارێکی دیکە هەڵبژێررایەوە. لە بەرواری ٢٨ / ٥ / ٢٠٠٠ دا بۆ پێنج ساڵی دیکەش فۆجمۆریی هەڵبژێردرایەوە و لە ٢٨ / ٧ / ٢٠٠٠ دا سوێندی دەستووری خوارد، ئەمەش بووە هۆی دەربڕینی نارەزاییەکی زۆر لەلایەنە ئۆپۆزسیۆنەکان کە داوای ڕەتکردنەوەی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانیان دەکرد وبەپێویستیان دەزانی کەسەر لەنوێ هەڵبژاردنێکی نوێ بەئەنجام بگەیەنرێ و لەئاکامی ئەو خۆپیشاندانە شەڕ وپێکدادان لەنێوان هێزەکانی پۆلیس وخۆپیشاندەراندا بەرپا بوو وکوشتار وبریندارێکی زۆری لێکەوتەوە.

لە ١٦ / ٩ / ٢٠٠٠ دا سەرۆك فۆجمۆریی ڕایگەیاند کە بەنیازە دەست لە کار بکێشێتەوە وهەڵبژاردنێکی نوێ بۆ هەڵبژاردنی سەرۆکی وڵات بەڕێوە دەچێ وخۆشی هەڵنابژێرێ،

شایەنی باسە ئەم بڕیارەی دوای ئاشکرابوونی ئابڕووچوونی فۆجمۆریی بە بەرتیل دان لەلایەن بەرەی سەربەخۆ بۆ باشتر کردنی ڕەوشتەوە ڕاگەیەنرا کەگەورەترین پارتە ئۆپۆزسیۆنە ڕاست ڕەوەکانە.

لە بەرواری ٢٠ / ١١ / ٢٠٠٠ دا سەرۆك فۆجمۆریی لەوڵاتی یابانەوە، کە بەسەردانێکی تایبەت بۆ ئەو وڵاتی چوو بوو و وڵاتی ڕەسەنی خۆیشێتی، ڕایگەیاند کەدەست لەکار دەکێشێتەوە وپاساوی بەزۆر لێکردنی دەست لەکار کێشانەوە وتاوانبار کردنی بەگەندەڵی بۆ هەڵسانی بەم کارە دەهێنایەوە. پیرۆ لەدواییدا داوای لەیابان کرد فۆجمۆریی بداتەوە دەست تاکو بەتاوانی گەندەڵی دادگایی بکات، بەڵام یابان ئەم داواکارییەی ڕەتکردەوە.

لە ٢٢ / ١١ / ٢٠٠٠ دا پەرلەمانی پیرۆ ڤالەنتین بانیاگۆی وەك سەرۆکێکی کاتی بۆ وڵات هەڵبژارد. شایەنی باسە ڤالەنتین لەلایەن خۆیەوە سکرتێری پێشووی گشتی نەتەوە یەککگرتوەکان خافێر بێریس دیکۆیاری بەرەچەڵەك پیرۆیی هەڵبژارد بەسەرۆکی حکومەتێکی یەکێتی نیشتیمانی.

لە ٣ / ٦ / ٢٠٠١ ئەلیخاندرۆ تۆلیدۆ ( ٥٥ ساڵ ) لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا سەرکەوتنی بەسەر سەرۆکی پێشوو ئالان گارسیادا هێنا، سەرۆکی نوێ بەڵێنیدا باری ئابووری وڵات بەرەو باشتر بەرێت وبایەخی تەواو بە بەرهەم بدات وهانی بەرهەمهێنەرە بیانییەکان بدات لەوڵاتەکەیدا کار بکەن وتەواوی ئەرکەکانی بەوپەڕی دڵسۆزی جێبەجێ بکات وهەوڵی کەم کردنەوەی قەرزەکانی دەرەوە بدات، کە بە ٢١ ملیار دۆلاری ئەمریکی مەزەنە دەکرێت ولە ٢٨ / ٧ / ٢٠٠١ دا سوێندی دەستووری خوارد.

سەرۆك تۆلیدۆ بەهەژاری گەورە بووە وخوێندنی ئابووری لە ویلایەتە یەکگرتوەکان تەواو کردووە، بەرەچەڵەك بەهیندی دادەنرێت پۆستی سەرۆکایەتی پیرۆ بگرێتە دەست. شایەنی باسە زووتر چەند سەرۆکێکی بەرەچەڵەك هیندی پۆستی سەرۆکایەتییان گرتۆتە دەست، بەڵام هیچ کامیان بەهەڵبژاردن نەهاتوونەتە ئەو پلەوپایەیە بەڵکو بەهۆی کودەتا سەربازییەکانەوە.

لە ٣٠ / ٧ / ٢٠٠١ دا سەرۆکی نوێ، کەنازناوی باتشاکویك ی پێبەخشرا لەسەر شەرەڤ ناوی سەرکردەی ئینکا کەلەسەدەی پانزدەیەمدا ژیاوە ولەناوچەی ماتشۆ مەلازادا ژیاوە، سەردانی شوێنی لەدایك بوونی خۆی کرد لە چیاکانی ئەندیز بۆ بەشداری کردن لە ئاهەنگێکی تایبەت بە کەلتووری دێرینی ئینکا لەچوارچێوەی ئاهەنگی سەرکەوتنی لەپۆستی سەرۆکایەتیدا، لەئاهەنگەکەدا سوپاسی گەلی ئینکای کرد کەلەهەڵبژاردنەکاندا دەنگیان بۆداوە وهاندەری سەرکەوتنی بوون.

زۆربەی گەلی پیرۆ هەژارن وزۆربەیان بەبەرهەمە کشتوکاڵیەکان دەژین، زۆربەی تریشیان لەناو پایتەختدا کۆبونەتەوە وبەنرخێکی زۆر کەم لەکارگەکاندا کار دەکەن، ئەمەش چڕی دانیشتوانەکەی زۆر کردووە لەناو پایتەختدا ودیمەنی هەژاری ونەدارییەکی زۆری پێوە دیارە.

سروودی نیشتیمانی: ئێمە ئازادین.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٤٤،١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٧.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١،٨٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٥

پیرۆ بەپلەی سێهەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی زیو وزنك و بەپلەی چوارەم دێت لەبەرهەمی قورقوشم، بەپلەی پێنجەم دێت لەبەرهەمی تەنەکە وبەپلەی پانزدەیەم دێت لەبەرهەمی ئاڵتون، پلەی حەڤدەیەم دێت لەبەرهەمی قامیشی شەکر وپلەی هەژدەیەم لەبەرهەمی قاوە.

*　　　　*　　　　*

سەمای مارینێرا ریزەکانی پیرۆ یەك دەخات

لەکاتێکدا هەژاری ونەداری وەختە یەکێتی نێو ریزەکانی گەلی پیرۆ کەرت وپەرت دەکات، سەمای مارینێرا توانیویەتی لەکاتی ئاوازە بەجۆشەکان هەستی دڵی تەواوی گەلی ئەو ولاتە بێنێتە جۆش وهەست بەبوونی خۆیان بکەن.

بەهەزارەها کەس لەستادێکی تۆپی سەبەتە کۆدەبنەوە وئالایان بەدەستەوە وپاوانە لەپێی سەماکەراندا لەگەڵ پیاوە هاوبەشەکانیان لەسەماکەدا کەئەوانیش کلاوی سپیان بەسەرەوەیە هەستیان دەبزوێنێ. مارینێرا زیاترین سەما بەربلاوەکانی هەرێمی جیاکانی ئەندیزە لە ئەمریکای باشوور ومێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ ١٠٠ ساڵ لەمەوبەر، بەلام ئێستا بەوێنەیەکی مۆدێرنەوە خۆی دەنوێنێ وبەشداری لەفیستیڤاڵی بەهارانی شاری ترۆجیلۆی باکووری پیرۆ دەکا.

**مارسێلا جانوزای پسپۆری سەما کە رێکخەری فیستیڤاڵی بەهارانەیە دەڵێت: ئەم سەمایە کەلتوورێکی زیندووە وریزەکانی گەلەکەمان یەك دەخات .**

## بیلیز

**ناوی باو:** بیلیز

**ناوی فەرمی:** بیلیز

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Belize

**سیستەمی حوکمرانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیایە ودادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران( ٨١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران( ٢٩ ئەندام )

**رووبەر :** ٨,٨٦٧ میل دووجا، ٢٢,٩٦٥ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٢٨,٠٠٠ ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٩,٩ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی رەش، هیندی سوور، میسیتزۆ ( تێکەڵەیەکن لە ئەورووپی وهیند )، ئەورووپی.

**ئاین:** مەسیح ( کاسۆلیك، پرۆتستانت)

**زمان:** ئینگلیزی، تاکە وڵاتە لەئەمریکای ناوەڕاست کە بەزمانی ئینگلیزی قسە بکەن.

**پایتەخت:** بیلمۆبان.

**شارە سەرەکییەکان:** بیلیز سیتی، ئۆرانج دۆك، سانتا ئیلینا.

**دراو:** دۆلاری بیلیز

**ئاووهەوا:** گەرم وشێدار، پلەکانی گەرما لە ١٥ بۆ ٣٢ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی باران ٣٨٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** قامیشی شەکر

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** شەکر، چیمەنتۆ، پۆشاك.

**سامانی کانزایی:** نییەتی

**تێڕوانینێکی گشتی :**

بیلیز وڵاتێکی بچوکە لە ئەمریکای ناوەڕاست، دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی کەناری

نیمچە دورگـەی یۆکاتـان، مەکـسیك دەکەوێتـە بـاکووری و دەریـای کـاریبی دەکەوێتـە رۆژهەڵاتی، لەگەڵ گواتیمالا لە باشوور ورۆژئاواوە سنووردارە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۸۸/۵۰ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ۱۷ بەرەو باکوور.

زەوییە کەنارییەکانی بیلیز بریتیە لە زەوییە نزمەکان وزەلکاوێکی زۆر دایان پۆشیوە، چەند دورگەیەکی بچوکیش لە بیلیزدا بلاوبۆتەوە، دەشتەکان بەرەو چیاکان بەرز دەبنەوە تادەگاتە چیای مایا. تەنها روبار بەو ولاتە بچوکەدا تێدەپەڕێت روباری بیلیزە، دارستانەکانیش روبەرێکی زۆری ولاتیان داپۆشیوە.

شارستانێتی مایا لەو ناوچەیەدا لەنێوان ساڵەکانی ۱۵۰۰ ی پ.ز بۆ ۳۰۰ ز بلاوبۆتەوە. ئیسپانییەکان لە سەرەتای سەدەی شانزدەیەمدا داگیریان کردووە ولەپاش ئەوان لە ۱۸٦۲ دا بەریتانیا داگیری کردووە وناوی ناوە داگیر کراوەی هندۆراسی بەریتانی. لەساڵی ۱۹٦٤ دا مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشیوە. لە ۱ / ٦ / ۱۹۷۳ دا ناوی ولات گۆڕاوە بۆ بیلیز. لە ۲۱ / ۹ / ۱۹۸۱ داسەربەخۆیی تەواوی لەژێر سایەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی پێبەخشراوە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

بیلیز بەولاتێکی پاشکەوتوو دادەنرێت وباری ئابووری ولات پشتی بەچالاکییە کشتوکاڵیەکان بەستووە ویارمەتی دارایی لەولاتانی دیکەوە دەستگیر دەبێت. حکومەت هانی بەرهەمهێنەرە بیانیەکان دەدات لەولاتەکەیدا تاکو هەلی کار بۆ تاکەکانی برەخسێنێت. جگە لەوەی کە حکومەت لەهەوڵی بەردەوامدایە بۆ بایەخ دان بەگەشتوگوزار لەولاتدا بەهۆی جوانی سروشتی کەناری ئەو ولاتە بچوکە.

لەبەرواری ۱۱ / ۱۰ / ۲۰۰۱ بوومەلەرزەی توندی ئیریس لەو ولاتەی داوە وبووە هۆی کوشتن وبریندار بوونی ژمارەیەکی زۆری هاولاتیان، زۆربەیان لەگەشتیارە بیانییەکان بوون و بەسەر کەشیەکانیانەوە لەکاتی روودانی ئەو کارەساتە سروشتییە بەهۆی گەردەلوولێکی بەهێزەوە بووە هۆی بوومەلەرزەی ناوبراو.

جەژنی نیشتیمانی: ۲۱ / ۹ ی هەموو ساڵێك رۆژی سەربەخۆیی ۱۹۸۱.

سروودی نیشتیمانی: خاکی ئازادیخوازان

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ۵۳۵ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ۱٦۰

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۲،۵۵۰ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاند: ۷۰.

## تایلاند

ناوی باو:تایلاند

ناوی فەرمی: شانشینی تایلاند

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Kingdom of Thailand

سیستەمی حوکمرانی: پادشایی دەستووری، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٢٦٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٦١ ئەندام )

رووبەر : ١٩٦,١١٥ میل دووجا، ٥١٣,١١٥ کم$^{2}$

ژمارەی دانیشتوان: ٦٠,٦٠٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ١١٨,١ کەس/ کم$^{2}$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: تایلاندی، چینی، هیندی، بۆرمی، کەمبوودی، مالیزی، ڤێتنامی، ئەورووپی، یابانی.

ئاین: بوودی، مەسیح، موسڵمان ( بە نزیکەی سێ ملیۆن و٢٥٠ هەزار کەس واتا ٢,٥ ٪ ریژەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە دەخەملێنرێن و زیاتر لە باشووری وڵاتدا جێنشینن، ٣,١٩٢ مزگەوتی لەخۆ گرتووە. لەنێو رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامیدا وەك چاودێرێك بەشدارە.

زمانی فەرمی: تایلاندی.

پایتەخت: بانکوك

شارە سەرەکییەکان: نۆنتابوری، شیانج کای، هات یای، ئۆبۆن راتشاتانی، ناکۆن راتشاسیما.

دراو: بات

ئاووهەوا: خولگەیی گەرم، نێوەندی پلەکانی گەرما لە پایتەختدا لەزستان ١٧ پلەی سەدیە ولەهاویندا ٣٧ پلەی سەدی، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٤٠ سم و زیاتر لەوەرزی هاویندا دەبارێت. بەڵام لەچیاکانی باکوور پلەکانی گەرما سفر پلەی سەدیە لە زستاندا و٣٢ پلەی سەدی لەهاویندا.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: برنج، کاسۆڤا، لۆکە، گەنمەشامی، لاستیك، قامیشی شەکر، تووتن، راوەماسی، داروتەختە.

بەرهەمـــە پیـــشەسازییەکان: ئۆتۆمبێـــل، چـــیمەنتۆ، دەرمـــان، ئـــامێری ئـــەلکترۆنی، دروستکراوەکانی خۆراك، کاغەز، چنین، ئیتانۆل ( ماددەیەکە لە خۆشاوی شەکر بەبەرهەم دەهێنرێت بۆ ووزە بەکار دەهێنرێت)

ســامانی کــانزایی: تەنەکـە، بۆکسید، ئاسـن، قورقوشـم، مەنگـەنیز، گـاز، بـەردی دەگمـەن، تەنگستن، لینیت.

تێڕوانینێکی گشتی :

تایلاند، یان موانگ تای بەزمانی دانیشتوانەکەی کە بەمانای خاکی ئازادیخوازان دێت یـان براتیت تای بەمانای شانشینی تایلاند و تای گەورەترین کۆمەڵەی نەژادین لەوڵاتدا (نزیکەی ٩٤ ٪ کۆی دانیشتوان دەبن ) وبەرەچەڵك چینین، وڵاتێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، لاوس دەکەوێتە باکوور وڕۆژهەڵاتی وکەمبۆدیا دەکەوێتە باشووری ڕۆژهـەڵاتی، کەنداوی تایلاند وماليزياش دەکەونە باشووری، دەریای ئەندامان و میانمار دەکەونە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕشی هێڵی درێژی ١٠٢ بەرەو ڕۆژهـەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٦ بەرەو باکوور.

چیاکان بـاکووری ڕۆژئاوا و ڕۆژئـاوای تایلانـد دادەپۆشـن و بـەرزترین لوتکـەش لوتکـەی چیای ئەنتانۆنە کە ٢٥٩٥ م دەبێت. چەند ڕوبارێکیش بەنێو چیاکاندا تێدەپـەڕێت ودەڕژێنـە کەنداوی تایلاندەوە. بەڵام بانی کورات دەکەوێتە باکووری ڕۆژهـەڵاتی وڵات ونزیکـەی ٣٠٪ ی ڕووبـەری وڵات دادەپۆشـێ وچـیاکانیش چـواردەوری ئـەو بانـەی باشـوور و ڕۆژئـاواوە گرتووە، ڕوباری میکۆنگیش دەکەوێتە ڕۆژهەڵات وباکووری ئەو بانە. دەشـتی ناوەڕاسـتیش دەکەوێتە لەقەدپاڵی چیا باکووریەکانەوە تا کەنداوی تایلاند درێژدەبێتەوە بە تـەواوی بۆ کشتوکاڵی بەگەڕخراوە بەتایبەتی بەرهەمی برنج.

بـەر لـە پێـنج هـەزار سـاڵ لەمەوبـەرەوە مـرۆڤ لـەو ناوچـەیەدا ژیـاوە و چـالاکییە کشتوکاڵیەکانیان تیا ئەنجام داوە بەتایبەتی چاندنی برنج. بەڵام باوباپیرانی تایلاندییـەکانی ئێستا لەنێوان سەدەکانی دووەم ودەیەمدا لەچینەوە بەرەو ناوچەکە هاتوون ولەساڵی ١٣٥٠ دا ئـەو ناوچـەیەیان پێـك هێنـاوە کـە ئێـستا پێـی دەڵـێن تایلانـد. لەسـەرەتاکانی سـەدەی شـانزدەیەمدا بازرگانـە پۆرتوگالیـەکان گەیـشتونەتە ئایۆتـای پایتـەختی ئەوسـای تایلانـد. لەسـەدەی حەڤدەیەمـدا هەنـدێ لەوڵاتـە ئەوروپیـەکان ویابان چالاکی بازرگانیـان تیـا ئـەنجام داوە.

لەساڵی ١٧٨٢ دا جەنەراڵ شاو فرایا شاکری دەسەڵاتی گرتۆتە دەست ونازناوی بوو بە رامای یەکەم، خێزانـی شـاکری دامەزراند کەتائێستاش هـەر حوکم دەکەن، لەهـەمان ساڵدا

ناوی وڵات بوو بەسیام وبانکوکیش بوو بەپایتەختی. وشەی سیام لە وشەی شانەوە هاتووە شانیش ناوی یەکێکە لەکۆمەڵە نەژادییە هەرە گرنگەکانی ئەو وڵاتە.

لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا سیام یارمەتی هەر یەك لە فەرەنسا وبەریتانیای داوە ودژی ئەڵمانیا ومەجەر ونەمسا وەستاوە. لەساڵی ١٩٣٢ سیستەمی حوکمڕانی لەپادشایی رەهاوە گۆڕاوە بۆ پادشایی دەستووری لەسەردەمی شا رامای حەوتەمدا، لەو سەردەمەوە شا دەسەڵاتدارێکی بێ دەسەڵاتە، بەڵام بەها ورێزی لای هەمووان هەیە.

لەبەرواری ٢٤ / ٦ / ١٩٣٩ ناوی وڵات بەشێوەیەکی فەرمی بوو بە تایلاند. لەجەنگی جیهانی دووەمدا تایلاند یارمەتی یابانی داوە ولەدژی ئەمریکا وبەریتانیا بەجەنگ هاتووە. لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٥ و ١٩٤٦ ناوی سیامی دێرینی بەکارهێناوە ولەساڵی ١٩٤٦ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەساڵی ١٩٦٧ هەر یەك لە سەنگافورا وتایلاند ومالیزیا وفلیپین وئەندەنوسیا، لەدواییدا برۆنای، یەکێتی ولاتانی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیایان پێك هێناوە، بەهیوای گەشە پێدانی باری ئابووری وڵاتانی ناوبراو وناوچەکە بکەنە ناوچەیەکی ئاسایش وئارام.

لەبەرواری پەیرەوکردنی دیموکراسی لەتایلاندا ( ١٩٣٢ ) ١٧ کودەتای سەربازی تیائەنجام دراوە. لەدوای ٢٣ / ١ / ١٩٩١ بەدواوە لیژنەیەکی سەربازی بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ سانتۆرن کونگسمبۆنگ سەرۆکایەتی وڵات دەکەن و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانیش بەسەرۆکی دەستەی جێبەجێ کردن دادەنرێ.

خێزانی پادشایی کە شای تایلاندی بوهمبول ئەدۆلیج، نازناوی رامای نۆیەمە، دەچێتەوە سەر خێزانی شاکری. رامای نۆیەم لەساڵی ١٩٤٦ بۆتە شای تایلاند لەدوای کۆچی دوایی ئەناندای برای و تا ئێستاش بە دێرینترین شای جیهان دادەنرێت. رامای چوارەم لە ٥ / ١٢ / ١٩٢٧ دا لەدایك بووە بۆیە رۆژی ٥ / ١٢ بەرۆژی نیشتیمانی دادەنرێت، شایەنی باسە شا هیچ دەسەلاتێکی دەستووری یان سیاسی نییە، هەروەها رۆژی لەدایك بوونی سیریکیتی شاژنی تایلاند کەدەکاتە رۆژی ١٥ / ٨ بەجەژنی دایکی ئەو وڵاتە دادەنرێت.

سێ پشووی فەرمی لەتایلاند هەیە پەیوەندیان بە ژیانی بووداوە هەیە وپەیوەندییەکی سەرەکییان هەیە بەرووداوەکانی ژیانی ئەو پیاوە. لەرووی تیۆرییەوە پێویستە لەسەر هەموو پیاوێکی بوودی لەتایلاندا، لەهەر ماوەیەك لەماوەکانی ژیانیدا بێت، بۆماوەی پانزدە رۆژ لەخەڵوەتدا بێت لەیەکێ لەپەرستگا بوودییەکان. بەدرێژایی ئەو پانزدە رۆژەدا دەبێ پابەند بێت بە ٢٢٧ خووی رەوشتییەوە ولەهیچ کامیان لانەدات، گرنگ ترینیان دەبێ زۆر لێبوردە بێت وژیانی ئاسایی وسادە بێت وژیانی لەسەر ئەو داهاتە بێت کە خەڵکی پێی

دەبەخشن لەشارو شارۆچکەکان لەکاتی گەڕیدەیی دا لەگەڵ هاوڕێکانی بۆ ئەم مەبەستە لەبەرەبەیانی هەموو رۆژێکدا.

فیل بەهێمایەکی گرنگ لەهێماکانی تایلاند دادەنرێت ونەمەش لەزۆری ئاسەوار ونوسراوە بەرجەستەکاندا دەردەکەوێت. خواردنی گۆشتی سەگ وپشیلە لەو وڵاتە زۆر ئاساییە، بەڵام حکومەت لەساڵی ٢٠٠٠ دا بڕیارێکی دەرکرد تیایدا ئەو ئاژەڵانەی بەماڵی دانا وپێویستە بەسۆز وبەزەییەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، شایەنی باسە ئەو بڕیارەی حکومەت دوای هەڕەشەی هەندێ لەوڵاتە بیانییەکان هات بە دابڕان لە بازرگانی کردن لەگەڵ تایلاند ئەگەر بێت ودەست لەخواردنی ئەم جۆرە ئاژەڵانە رانەگرێت.

تایلاند بەیەکێ لەوڵاتە پاشکەوتوەکان دادەنرێت کە پشتی بە کشوکاڵی وپیشەسازی بەستووە، لەداهاتی نەتەواییەتیدا بەرهەمە پیشەسازییەکان وبەرهەمە کشتوکاڵیەکاندا یەکسانن. لەگەڵ ئەوەی کەتایلاند رووبەڕووی کێشەی گەورە دەبێتەوە لەرووی ئابوورییەوە بەڵام بە پێشکەوتووترین وڵاتی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا دادەنرێت وگەشەکردنیشی لەهەموویان خێراترە. تایلاندیش وەك زۆربەی وڵاتانی ئاسیا رووبەرووی کارەساتی دارایی گەورە بۆتەوە لە دوای نەوەتەکانی سەدەی بیستەم، بەڵام دوای ئەو پلانەی سەرۆکی وەزیران توانی رەوڕەوەی بوژانەوەی ئابووری بەرەو پێشتر بەرێت. سەرۆك وەزیران پێشنیاری کرد کاتی وڵاتەکەی یەك کاتژمێر پێش بخات تاکو لەگەڵ هەر یەك لە سەنگافورە وهۆنگ کۆنگی دراوسێی هاوکات بن، شایەنی باسە سەنگافورە وهۆنگ کۆنگ گەورەترین سەنتەری ئابووری ئەو ناوچەیەن.

تایلاند بەپلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی لاستیك، دوای ئەندەنوسیا، بەپلەی چوارەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی قامیشی شەکر وبەپلەی شەشەم دێت لەبەرهەمی برنج، بەپلەی نۆیەم دێت لەبەرهەمی تەنەکە وراوەماسیوپلەی چواردەیەم دێت لەبەرهەمی لینیت، پلەی شانزدەیەم دێت لەبەرهەمی تەختە.

سروودی نیشتیمانی: بلنج شارت : کە بەمانای سروودی نیشتیمانی دێت.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٢٩,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٢٦

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,٢١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٧.

## تایوان

**ناوی باو:** تایوان

**ناوی فەرمی:** کۆماری چین

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of China

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٣٤ ئەندام )

ئەنجومەنی یاسادانان ( ١٦٤ ئەندام )

**رووبەر :** ١٣,٩٦٩ میل دووجا، ٣٥,١٧٩ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢١,٦١٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥٩٧,٥ کەس/ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تایوانی، چینی، ئەبۆرگی، هاکا.

**ئاین:** تاویی ( ٩٣ ٪ )، بوودی، کۆنفۆشیۆسی، مەسیحی، موسڵمان.

**زمان:** چینی ماندارینی.

**پایتەخت:** تایبی.

**شارە سەرەکییەکان:** کاوهسیۆنگ، تایشۆنگ، تاینان، بانشیاو، شیلۆنگ.

**دراو:** دۆلاری تایوانی نوێ.

**ئاووهەوا:** نیمچە خوولگەیی، هاوینی گەرم وباراناوی: نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی، رێژەی ساڵانەی باران ٢٥٠ سم، زستانی مام ناوەندەو پلەکانی گەرما ١٨پلەی سەدیە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، پەلەوەری مریشك وقاز ومراوی،، سەوزە ومیوە، قارچك، برنج، قامیشی شەکر، راوەماسی، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئامێری ئەلیکترۆنی، دروست کراوەکانی خووری، ئاسن وپۆڵا، کاغەز، پلاستیك، ئامێری کارەبایی، ئامێری ناومالْ.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، مس، نەوت، زیو، گۆگرد، خوێ

**تێڕوانینێکی گشتی :**

تایوان دورگەیەکە دەکەوێتە دەریای چینی رۆژئاواوە،لە رۆژهەلاتی کیشوەری ئاسیا

وروژئاوای زەریای هێمن، نزیکەی ١٤٠ کم دووره لە رۆژهەڵاتی کەناری چینی باشووری رۆژهەڵاتەوە، تەنگەی تایوان کە پانتاییەکەی ١٦٠ کم ودرێژییەکەی ٣٧٧ کم دەبێت لە زەوییە چینییەکانی جیادەکاتەوە، چەند دورگەیەکیشی لەخۆ گرتووە گرنگترینیان: ماتسۆ، کینمان. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٢١ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٤ بەرەو باکوور.

چیاکان نزیکەی ٧٥٪ ی رووبەری ولاتەکەیان گرتووە، بەرزترینیان چیای واژۆیسۆن ( ٣٩٩٧ م ). چیاکان زیاتر بەرەو کەناری رۆژهەڵات لێژ دەبنەوە و زۆر بەکەمیش بەرەو کەناری رۆژئاوا، چەند روبارێك بەنێو رێڕەوی تەسکی چیاکان بەخێرایی تێدەپەڕن.

کۆچکردنی چینییەکان لەولاتی خۆیانەوە بەرەو تایوان لە سالی ٥٠٠ پ.ز دەستی پێکردووە وئەوانیش بەدانیشتووانە سەرەتاییەکانی تایوان دادەنرێن. چینییەکان لەسەدەی شەشەمەوە تا سەرەتای سەدەی حەڤدەمەوە لێی نیشتەجێ بوون. پۆرتۆگالیەکان لەسالی ١٥٩٠ دا سەردانیان کردووە ناویان ناوە فۆرمۆزا، بەمانای دورگەی جوان دێت، لەسالی ١٦٢٤ دا هۆڵەندییەکان چونەتە ناوی وکردویانەتە بنکەیەکی چالاکییە بازرگانییەکانیان ودەسەلاتی ئەو ناوچەیەیان تا سالی ١٦٦١ بەدەستەوە بووە.لەسالی ١٦٦٤ دا خێزانی مینجی پادشایی چین بەرەو تایوان هەڵهاتوون دوای ئەوەی ولاتەکەیان کەوتۆتە ژێر دەستی داگیرکەرە مەنشوورییەکان. لەسالی ١٦٨٣ دا مەنشوورییەکان تایوانیشیان خستۆتە ژێر دەسەلاتی خۆیان، پاش سێ ساڵ تایوان بۆتە ناوچەیەکی چینی و کۆچکردنی چینییەکان بەرەو ئەوێ هەربەردەوام بووە تا نەتەوەی چینی توانی زاڵ بێت بەسەر نەتەوەی ئەبۆرجینی ( دانیشتوانە رەسەنەکانی تایوان ). دەسەلاتی مەنشووری لە تایوان نزیکەی ٢١٢ سالی خایاندووە، دوای جەنگی نێوان یابان – چینی سالی ١٨٩٤ – ١٨٩٥ بەپێی رێکەوتننامەی شیمۆنۆسیکی لەسالی ١٨٨٥ دا کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی داگیرکەری یابانییەوە. لەماوەی پەنجا ساڵ لەحوکمی یابانییەکان تایوان لەرووی کشتوکاڵیەوە پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، تۆڕێکی هاتووچۆی بەرفراوانی پێك هێناوە. دوای تێك شکاندنی یابان لەجەنگی جیهانی دووەم ١٩٤٥، تایوان گەڕاوەتەوە بۆ باوەشی چین.

لەسالی ١٩٢٥ دا جەنگی ناوخۆ لەچین لەنێوان یاوەرانی سەرکردەی شیوعی ماو تسی تۆنغ و یاوەرانی دامەزرێنەری کۆماری چین سن یات سین هەڵگیرساوە، شەڕەکە بەتێکشکاندن و بەهەڵهاتنی یاوەرانی سن یات سن بەرەو تایوان کۆتایی پێهاتووە. لە٨ / ١٢ / ١٩٤٩ هەڵهاتوان لەتایوان حکومەتیان پێك هیناوە بەسەرۆکایەتی شیانگ کای شیك و باسیان لەوە دەکرد کە شەرعێتی ئەمان لەحکومەتی چین زیاترە، تا ئەمرۆش ئەم باسەیان

بەردەوامە. ئەو کورسیەی چین لەنەتەوە یەکگرتوەکاندا گرتبووی تایوانیشی لەخۆ گرتبوو، تا لە ٢٥ / ١٠ / ١٩٧١ دا نەتەوە یەکگرتوەکان دانی نا بە کۆماری میللی چین لەبری کۆماری چین و تایوانی لێدەرکرا. لەساڵی ١٩٩١ دا تایوان کۆتایی هێنا بەداواکاری سەربەخۆیی لەچین، بەلام تا ئێستاش چین داوای گەڕانەوەی تایوان دەکات، لەکاتێکدا تایوان تا ئێستاش خاوەنی کورسیەکی سەربەخۆ نییە لەنەتەوە یەکگرتوەکان لەگەڵ داواکارییەکانیش بۆ ئەو مەبەستە.

لەبەرواری ١ / ٣/ ١٩٥١ دا شیانگ یان شیك بەسەرۆکی تایوان هەڵبژێردرا ( چینی نیشتیمانی ). دوای کۆچی دواییشی لەبەرواری ٥ / ٤ / ١٩٧٥ دا شیانگ تشیگ کوی کوڕی بەسەرۆك هەڵبژێردرا، شایەنی باسە لەسەردەمی ئەمیاندا وڵات گەشە کردنێکی ئابووری بەرچاوی بەخۆوە بینی و لەساڵی ١٩٨٧ دا کۆتایی هێنا بەحوکمە عورفیەکان. لەبەرواری ١٣ / ١ / ١٩٨٨ دا شیانگ تشینگ کو کۆچی دوایی کرد لی تینگ هوی سەرۆکایەتی وڵاتی گرتە دەست. لە١٩٨٩ دا تەواوی پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان شەرعێتیان پێدرا وماف بەشداری کردنی هەڵبژاردنە پەرلەمانیەکانیان پێ بەخشرا. لەبەرواری ١٨ / ٣ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بەڕێوە چوو بەبەشداری کردنی تەواوی پارتە سیاسییەکان، لە ئەنجامدا شین شوی بیان سەرکەوتنی بەدەست هێنا کە سکرتێری پارتی دیموکراسی پێشکەوتنخواز بوو وپرۆگرامی سەربەخۆیی تایوانی وگۆڕینی ناوی فەرمی وڵاتی پەیڕەو دەکرد، بەڵام حکومەتی بکین هەرگیز بەمە قایل نابێت.

لە ٢٠ / ٥ / ٢٠٠٠ دا سەرۆکی هەڵبژێردراو سوێندی دەستووری خوارد و لەوتارەکەیدا باسی لەپێکهێنانی چینی سەربەخۆ کرد بەمەرجێ گفتوگۆ لەگەڵ وڵاتی چینی دایکدا بکرێت وکێشەکانیان بە گفتوگۆ کۆتایی پێ بێنن، هەروەها بەڵێنیدا کە هەرگیز سەربەخۆیی یەك لایەنانەی تاسوان ڕانەگەیەنێت مەگەر چین پەنا بەرێت بۆ چارەسەرییە سەربازییەکان لەم پێناوەدا، ئەمەش بەنیاز پاکییەکی حکومەتی نوێ تایوان لەلایەن زۆربەی وڵاتانەوە ڕاگەیەنرا.

لە ٢١ / ٣ / ٢٠٠٠ دا پەرلەمانی تایوان کۆتایی هێنا بە پێنج ساڵ ئابلوقەی ئاڵوگۆڕکردنی بازرگانی نێوان دورگەی تایوان وبکین. ئەم ڕێگرتنەبەرش بە نیاز پاکییەکی تایوان دانرا بەرامبەر چین.

لە سەرەتای ٢٠٠١ دا سێ کەشتی تایوانی لەسێ کاتی جیاوازدا گەیشتنە چین لەیەکەم گەشتی یاسایی ڕاستەوخۆ لەماوەی زیاتر ٥٠ ساڵی ڕابردووەوە، ئەم گەشتانە بەهێور کردنەوەیەکی ئەم مەرجانە دادەنرێ لەنێوان هاتووچۆی هەردوو وڵاتدا. شایەنی باسە لە

ساڵی ١٩٩٨ دا وڵاتی چین بیری له بنیات نانی تونێلێك كردەوه لەنێوانی ولەنێوان تایوان و ئەمەش بەدرێژترین تونێل دادەنرێ لەجیهاندا لەژێر دەریادا بەئەنجام بگەیەنرێ، نزیكەی سێ هێندەی ئەو تونێلەی نێوان فەرەنسا و ئینگلتەرایە كەلەژێر دەریای مانشدا دروستكراوە.

له ٦ / ٨ / ٢٠٠٢ دا تایوان رایگەیاند بەنیازە دەنگدانێك ئەنجام بدات بۆ جیابوونەوە لە وڵاتی چین وسەربەخۆیی لەو وڵاتە، بەڵام هێندەی نەخایاند لەو بڕیارەی پاشگەز بۆوە پاش ئەوەی چین هەڕەشیەی سەربازی لێكرد.

له بەرواری ٢١ / ٩ / ١٩٩٩ دا بوومەلەرزەیەك بەگوێری ٧,١ پله بەپێوەری رێختەر لەتایوانی دا نزیكەی ٢٢٠٠ كوژرا ٥٠٠٠٠ بریندار و وێران كردنی زیاتر لە ١٣ هەزار بینای لێكەوتەوە.

هەروەها له ٣٠ / ٧ / ٢٠٠١ دا گەردەلوولی تۆراجی لێیدا وزیانێكی زۆری گیانی ودارایی گەیاند وئەمەش بەبەهێزترین گەردەلوول دادەنرێ بەدرێژایی سەت ساڵ لەو وڵاتەی دابێت.

دورگەی تایوان بە ( باو داو ) دەناسرا، بەمانای دورگەی دوورەكان، ناوی تایوانیش بەمانای كەنداوی لوولپێچ یان: كەنداوی زەوییە دیارەكان دێت.

ئابووری تایوان پشتی تەواوی بە پیشەسازی وبازرگانییە دەرەكییەكان بەستووە.چالاكییە كشتوكاڵیەكانیش لاوەكین، چونكە تەنها چارەكی رووبەری وڵاتەكە بۆ كشتوكاڵی لەبارە.

تایوان ئێستا لەو هەوڵەدایە سەرچاوەكانی داهاتی نەتەوەیی هەمەجۆر بكات، لەو كەرتانەش كە هەوڵی بایەخ پێدانێتی گەشتوگوزارە، چونكە ئێستا تایوان سەرقاڵی پێكهێنانی فیستیڤاڵێكی زۆرە كەتەواوی كەلتووری ودابونەریتەكانی پێ زیندوكاتەوە وەك هەوڵێك بۆ راكێش كردنی گەشتیاران بۆ ئەو وڵاتە.

لە ١٣ / ١١ / ٢٠٠١ دا تایوان ئەندامی ژمارە ١٤٤ ی لە رێكخراوی بازرگانی جیهانی پێبەخشرا، لە كۆنگرەی چوارەمی رێكخراوی ناوبراو كە لە دەوحەی قەتەر.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢١٨,١ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٢٠.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١٠,٤٧٩ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٣١.

## تورکمانستان

**ناوی باو:** تورکمانستان

**ناوی فەرمی:** کۆماری تورکمانستان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Repulic of Turkmenistan

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ٥٠ ئەندام )

**رووبەر :** ١٨٨,٥٠٠ میل دووجا، ٤٨٨,١٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤,٦٩٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٩,٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تورکمان، روس، ئۆزبەکی، کازاخ، تەتەر، ئۆکرانی، ئەرمەن.

**ئاین:** موسڵمان ٨٦ ٪، مەسیح ( ئەرتۆدۆکسی روسیا ).

**زمان:** تورکمانی ( ئەچێتەوە سەر زمانی تورکی).

**پایتەخت:** عەشق ئاباد

**شارە سەرەکییەکان:** شارجۆ، داشۆفۆز، ماری، نیبیداج.

**دراو:** مانات

**ئاووهەوا:** زستانی ساردە وپلەکانی گەرما سفر پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی باران ٨ – ٣٠ سم دەبارێت، هاوینی درێژ وگەرمە نێوەندی پلەکانی گەرما ٣٥ بۆ ٥٠ پلەی سەدی دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** لۆکە، گەنم، ترێ، پەتاتە، مەڕوماڵات، ئەسپ، کاڵەك

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، دروستکراوە کیمیاییەکان، دروستکراوەکانی خووری، شووشە.

**سامانی کانزایی:** برۆم، مس، ئاڵتون، یۆد، قورقوشم، جیوە، نەوت، گازی سروشتی، زنك، سەلفاتی سۆدیۆم، خوێ.

### تێڕوانینێکی گشتی :

تورکمانستان ( بەمانای وڵاتی تورکمانەکان ) دێت وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسیا، کازاخستان و ئۆزبەکستان دەکەونە باکووری و ئەفغانستان دەکەوێتە

ڕۆژهەڵاتی، ئێرانیش دەکەوێتە باشووری، دەریای قەزوینیش دەکەوێتە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦٠ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٩ بەرەو باکوور.

بیابانی قەرەقوم ( بەمانای لمی رەش دێت ) نزیکەی ٨٠٪ ی ڕووبەری وڵات دادەپۆشێ وزۆربەشی نیشتەجێ نەکراوە، بەلام زنجیرە چیای کۆبت – داغ لە باشووری ولاتەوە بۆ باشووری ڕۆژهەڵات درێژ دەبێتەوە.

ناوچەکە هەزاران ساڵ لەمەو پێش نیشتەجێ بووە. خەڵکەکەی بەدرێژایی ڕێچکەی ڕووبارەکان لێی ژیاون. فارسەکانی ئیمپراتۆرێتی ئەخمینی دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست ودوای ئەوان ئەسکەندەری مەکەدۆنی، پاشان شانشینی بارسی، دوای ئەوانیش فارسە ساسانییەکان دەسەلاتی ئەو ناوچەیەیان گرتۆتە دەست. عەرەبە ئیسلامەکان لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمی زاییندا چونەتە ناوچەکە وداگیریان کردووە.

خێڵە تورکەکان لەسەدەی شەشەمی زایینەوە بەرەو ناوچەکانی ناوەڕاستی ئاسیا کۆچیان کردووە، لەسەدەی دەیەمدا هەندێکیان لەوناوچەی تورکمانستاندا نیشتەجێ بوون وزاراوەی تورکمانیا لەو سەردەمەوە بەکارهاتووە. جەنگیزخان لەسەرەتای سەدەی سیانزدەیەمدا پەلاماری داوە. لەسەدەی چواردەیەمدا ئاینی ئیسلام لەناوچەکەدا بەتەواوی بلاو بۆتەوە. تەیموری لەنگ لەکۆتایەکانی سەدەی چواردەیەمدا داگیری کردووە. پاشان سەفەوییەکان لەنێوان سەدەکانی پانزدەیەم وحەڤدەیەمدا داگیریان کردووە.

لەساڵی ١٨٨٨ ڕوسەکان داگیریان کردووە ولەساڵی ١٩٢٤ دا تورکمانستان بۆتە کۆمارێك لەکۆمارەکانی یەکێتی سۆڤێت لەژێر ناوی کۆماری تورکمانستانی سۆسیالیستی سۆڤێتی.

لە ٢٣ / ٨ / ١٩٩٠ تورکمانستان سەربەخۆیی خۆی لە یەکێتی سۆڤێت ڕاگەیاند، لە ٢٦ / ١٠ / ١٩٩١ دا زۆربەی دانیشتوان بێدەنگ بوون بەمانای ڕەزامەندیان بەو بڕیارەی حکومەت، ساڵانە لە ٢٧/ ١٠ جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن. دوای دوو مانگ پەیوەندی کرد بە یەکێتی ولاتە سەربەخۆکانەوە، بۆساڵی دوایی پەیوەندی کرد بەنەتەوە یەککگرتوەکانەوە.

لەساڵی ١٩٨٥ دا سابیر موراد نیازۆف کرا بەسەرۆکی وڵات. لە ٢٢ / ٦ / ١٩٩٠ هەڵبژێردرایەوە، لەساڵی ١٩٩٤ سەر لەنوێ نیازۆف هەڵبژێردرایەوە، لە ٢٨ / ١٢ / ١٩٩٩ دا پەرلەمانی تورکمانستان نیازۆفیان بۆ سەرۆکی هەمیشەیی هەڵبژارد ( تا لەژیاندا مابێت ).

نیازۆف نازناوی : تورکمان باتیری پێبەخشراوە ( بە مانای باوکی تورکمان دێت )، هەروەها نازناوی تورکمان باشی ( سەرکردەی تورکمانەکان)، جگە لەوەی نازناوی وەلی الله و دوری تورکمانستان، چونکە نیازۆف بایەخێکی سەیری بەکەسایەتی خۆی داوە وزۆر

لەخۆباییشە. هەروەها گرنگترین شەقامی عەشق ئابادی لەسەر ناوی خۆی ناوە پاش ئەوەی ناوی شەقامی لینین بوو، ئەمە سەرباری ئەوەی ناوی فڕۆکەخانە وچەندین شار ونەخۆشخانەشی لەسەر ناوی خۆی ناو ناوە.

بەبۆنەی ئاهەنگی یادی دە ساڵەی سەربەخۆیی وڵات، لە ساڵی ٢٠٠١ دا وەك رێزلێنانێکی سەرۆکی وڵات کۆمپانیای چنینی فەرشی هەستا بە چنینی گەورەترین فەرشی دەستی لەجیهاندا، ئەم فەرشە کێشی زیاتر لەتۆنێك دەبێت وڕووبەرەکەی ٣٠٠ مەتر دووجایە، نیگارکێشی بەچەند هێمایەکی کۆمار ووتارەکانی کتێبی مەزن ( روحنامە، کە تورکمان باشی نوسیویەتی خوێندنەوەشی بەسەر هەموو کەسێك سەپێنراوە) لەخۆ گرتووە.

بەمەبەستی پەرە پێدانی کەلتووری نیشتیمانی تورکمانستانی، سەرۆکی وڵات سابیر موراد نیازۆف لەهاوینی ٢٠٠١ دا ئەم فەرمانانەی دەرکرد:

١. ناونانی مانگی کانونی دووەم بەناوی تورکمان باشیەوە ( ناوی خۆی ).

٢. ناونانی مانگی نیسان بەناوی مانگی دایکەوە، لەمەشدا هۆکارێکی روون ئاشکرا دیارە کە مەبەستی ناوی دایکی خۆیەتی کە لەمنداڵی نیازۆفدا کۆچی دوایی کردووە وچەندین پەیکەری لەنێو گۆڕەپانەکانی پایتەختدا بۆ سازداوە. ئەگەرچی لەژمارەی پەیکەرەکانی خۆی کەمترە.

٣. ناونانی مانگی ئایار بەناوی دایکییەوە : قوربان سوڵتان.

٤. هەروەها ناوی چەند مانگێکی کەشی بەناوی : ئاڵا وسەربەخۆیی وروحنامەوە ناوە.

٥. ئامادەکردنەوەی قۆناغەکانی تەمەنی مرۆڤ بەم شێوەیە: تەمەنی منداڵی تا ١٢ ساڵی، هەرزەکاری تا تەمەنی: ٢٥ ساڵی، لاوێتی تا ٣٧، پێگەیشتن تا تەمەنی ٤٩ ساڵی، تەمەنی پێغەمبەرایەتی: ٦٢ ساڵی، ئیلهام تا ٧٣ ساڵی، پیری تا تەمەنی: ٨٥ ساڵی، تەمەنی گەورە تا ٩٧ ساڵی، ئۆجۆزخان ( کە ناوی یەکێك لەحاکمە تورکەکانی تورکمانستانە) تا تەمەنی ١٠٩ ساڵی.

٦. سەپاندنی خوێندنی زمانی تورکمانی بەسەر تەواوی دانیشتواندا، بێ رەچاوکردنی کەمایەتییە نەژادییەکان کە بەزمانی دایك قسە دەکەن، وەك روسەکان بۆ نمونە کە زمانی روسی بەکار دەهێنن، زمانی تورکمانیش وەك مەرجێکی لێهاتووە لەکار کردن لەنێو فەرمانگەکاندا.

لەدوای ساڵی ١٩٩٤، تورکمانستان هاوینی هەموو ساڵێك بە بڕیاری سابیر موراد نیازۆف ئاهەنگی کاڵەك دەگێڕدرێت، وەك رێزلێنانێك بۆ ئەو ناوبانگەی ئەم جۆرە کاڵەکە هەیەتی

هەروەها بۆ بایەخ دانێك بەم جۆرەی لە تورکمانستاندا هەیە.

کشتوکاڵی لەتورکمانستاندا نیوەی بەرهەمی ئابووری ئەو وڵاتەی لەخۆ گرتووە. بەڵام پیشەسازی یەك لەسەر پێنجی بەرهەمی ئابوورییە.گازی سروشتیش رۆڵێکی بەرچاوی هەیە لەپتەو کردنی باری ئابووری ئەو وڵاتە، شایەنی باسە تورکمانستان ساڵانە بڕی ٦٠ ملیار سێجای لێ بەرهەم دێنێت.داوای بەشی خۆیشی لە نەوت وگازی دەریای قەزوین دەکات.

تورکمانستان بەپلەی شەشەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی گازی سروشتی و بەپلەی سیانزدەیەم دێت لە رێژەی یەدەگی ئەو بەرهەمە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٦،٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٩٣.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١،٦٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩٠.

## تورکیا

**ناوی باو:** تورکیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری تورکیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Turkey

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نیشتیمانی باڵا ( ٥٥٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ٣٠٠,٩٤٨ میل دووجا، ٧٧٩,٤٥٢ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦٣,٥٢٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٨١,٥ کەس/ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تورك، کورد، عەرەب.

**ئاین:** موسڵمان ( ٩٨٪ )

**زمان:** تورکی، کوردی، عەرەبی.

**پایتەخت:** ئەنقەرە.

**شارە سەرەکییەکان:** ئەستەنبوول، ئەزمیر، ئەدەنە، بۆرسا، ئەرزرووم.

**دراو:** لیرەی تورکی.

**ئاووهەوا:** کەناری دەریای ڕەش: زستانی مام ناوەندە ٧ پلەی سەدی، هاوینی فێنکە ٢٢ پلەی سەدیە، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٥٠ سم. ئەنادۆڵ: زستانی ساردە وباراناوی، ڕێژەی ساڵانەی باران ٤٠ سم، هاوینی گەرم ووشکە( ٢٧ پلەی سەدی)، باکووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا: زستانی زۆر سارد وبەستەڵەکە -٤٠ ( چل پلەی ژێر سفری سەدی)، باران ١٠٠سم، هاوینی فێنکە. باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا: زستانی زۆر ساردە وهاوینی وشکە. کەنارەکانی دەریای ئیجە و دەریای سپی ناوەڕاست: زستانی باراناوی ٥٠ سم -- ٧٥ سم، هاوینی گەرمە ٣٢ پلەی سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، گەنمە شامی، لۆکە، میوە وسەوزە، پەتاتە، قامیشی شەکر، گەنم، ڕاوەماسی، بەخێوکردنی مەڕومالات، چا، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئاسن وپۆڵا، ئامێر، ئۆتۆمبێل، دروستکراوەکانی خۆراك، دروست کراوەکانی خووری، کاغەز، پەین.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، کرۆمیت، نەوت، بۆکسیت، بۆرۆن، مس، ئاسن، لینیت،

مەرشووم.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

تورکیا وڵاتێکی ئیسلامییە لەوڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دوو باڵی هەیە : یەکێکیان لەنێو کیشوەری ئاسیا وئەوی دیکەیان لەنێو کیشوەری ئەوروپا. باڵی ئەوروپای نزیکەی ٣٠ ٪ ی ڕووبەری وڵات دەبێت پێی دەوترێت تراقیا. تەنگەی دەردەنیل وبۆسفۆر و دەریای مەڕمەڕەوە لەباڵی ئاسیای جیادەکاتەوە و پێ ی دەوترێ ئاسیای بچوك یان ئەنادۆڵ. دەریای ڕەش دەکەوێتە باکووری، جۆرجیا دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی، وعێراق وسوریا ودەریای سپی ناوەڕاست دەکەونە باشووری، ئەرمینیا وئازەربێجان وئێران دەکەونە ڕۆژهەڵاتی، دەریای ئیجە ویۆنان دەکەونە ڕۆژئاوای، بولگاریاش دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣٥ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٩ بەرەو باکوور.

زۆربەی تەختی تراقیا بریتییە لە نزمایی ودەشتە سەوزەکان، بەڵام ئەنادۆڵ بریتییە لەبانە بەرز وبەرفراوانەکان وزنجیرە چیاکانی بۆنت ڕووی باکووری گرتووە، هەردوو ڕوباری دیجلە وفورات سەرچاوەیان لەتورکیاوە هەڵدەقوڵێ وبەرەو باشوور بۆ عێراق وسوریا ڕێچکە دەبڕن. بەڵام باکوور وڕۆژئاوا و باشووری ئەنادۆڵ، بریتییە لە دەشتە بەرفراوانە بەپیتەکان.

مێژووی تورکیا دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی چوار هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە، پاش ئەوەی لەسەردەمی حەسییەکاندا لە ساڵی ٢٠٠٠ پ.ز گەشەی کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی، ئەغریقیەکان لە هەزارەی یەکەمی پ.ز داگیریان کردووە. ئەسکەندەری مەگدۆنی لەساڵی ٣٣٣ پ.ز پەلاماری داوە، دوای ئەوە بۆتە بەشێکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، ولەپاشدا بۆتە بەشێکی ئیمپراتۆرێتی بیزەنتی.

عەرەبە ئیسلامەکان لە سەرەتای سەدەی حەوتەمی زایینیدا چونەتە ناوی، لەنزیکەی سەدەی دەیەمی زاییندا چەند خێڵێکی گەریدە بەناوی تۆرکسەوە لە ناوەڕاستی ئاسیاوە لەرۆژهەڵاتی دەریای قەزوین و باشووری ئاسیا بەسەرۆکایەتی سەلجوکی سەرکردەیان گەیشتونەتە ئاسیای بچوك، هەر لەمانەوە تورکیا ئێستا ئەو ناوەی لێنراوە، خێڵەکان ئاینی ئیسلامیان پەیڕەو کردووە. ئیمپراتۆرێتی تورکە سەلجوکییەکان تا ساڵی ١٢٤٣ ی خایاندووە، لەپاشدا مەغۆلەکان هێرشیان کردۆتە سەریان. لەسەدەی چواردەیەمدا چەند کۆمەڵەیەك تورك کەخۆیان بە عوسمانی ناودەبرد دەستیان کرد بەپێکهێنانی ئیمپراتۆرێتی عوسمانی لە سەرەتای ١٣٢٦، سەرەتا دەستیان گرت بەسەر شاری بۆرسا لەناوچەی ئەنادۆڵ کەلەدواییدا کردیانە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی، لەبەرفراوان بوون وداگیرکاری

بەردەوام بوون تا لەساڵی ١٤٥٣ دا گەیشتنە قوستەنتەنیە وكردیانە پایتەختی وڵاتەكەیان.

دەوڵەتی عوسمانی لەجیهانی ئیسلامیدا پلەیە یەكەمی هێنا لەنێو وڵاتەكانی ئیسلامدا لەبەرفراوانیدا، دەسەڵاتەكانیان زۆربەی ناوچەكانی رۆژهەلاتی ناوەراست وباشووری رۆژهەلاتی ئەوروپا وباكوری ئەفریقیای گرتەوە. بەڵام لەدوایین رۆژەكانیدا لەسەرەتاكانی سەدەی بیستەم لاوازییەكی زۆر رووی تێكرد. جەنگی جیهانیی یەكەمی لەپاڵ ئەڵمانیا لەدژی هاوپەیمانان بەرپاكرد، تێكشكا. لە ١ / ١١ / ١٩٩٩ دەوڵەتی عوسمانی رووخا.

لە ٢٩ / ١٠ / ١٩٢٣ كەمال ئەتاتۆرك ( ئەتاتورك نازناویەتی و بەمانای باوكی توركەكان دێت ) كۆماری توركیای دامەزراند ودەستوور ویاسای نوێ بەرێوەبردنی وڵاتی دارشت. لەجەنگی جیهانی دووەمدا توركیا هەڵوێستی بێ لایەنی بۆخۆی هەڵبژارد. لە ساڵی ١٩٤٥ دا پەیوەندی كرد بەنەتەوە یەككرتوەكانەوە، ولەساڵی ١٩٥١ دا پەیوەندی كردووە بە هاوپەیمانی باكووری ئەتڵەسی ( ناتۆ )، ئێستا لەهەوڵی ئەوەدایە پەیوەندی بكات بە یەكێتی ئەوروپاوە، یەكێتی ئەوروپا لەكۆتاییەكانی ١٩٩٩ نیمچە رەزامەندییەكیان دەربریوە بەڵام هێشتا نەچۆتە قۆناغی جێبەجێكردنەوە.

مستەفا كەمال ئەتاتورك لە ١٠ / ١١ / ١٩٣٨ دا كۆچی دوایی كردووە دوای ئەوەی نزیكەی ١٦ ساڵ حوكمی توركیای كردووە، لەو ماوەیەدا توانیویەتی تەواوی روالەتەكانی خیلافەتی عوسمانی لەناو بەرێت ووڵاتی بەرەو رەوتێكی عەلمانی بەرێ كردووە. عیسمەت ئینۆنۆ بەسەرۆكی وڵات هەڵبژێردرا. لەسەردەمی ئەمدا توركیا بەرێكەوتن لەگەڵ فەرەنسادا لیوای ئەسكەندەرۆنەی لەساڵی ١٩٣٩ دا خستۆتە سەر خۆی، شایەنی باسە بەپێی ئەو رێكەوتنەی نێوان فەرەنسا وتوركیا لەساڵی ١٩٢١ دا ئەسكەندەرۆنە بەناوچەیەكی سوری دانرابوو. لە ساڵی ١٩٥٠ دا جەلال بایار بەسەرۆكی وڵات هەڵبژێردرا. بەكودەتایەكی سەربازی بەسەرۆكایەتی جەمال كۆرسل لەساڵی ١٩٦٠ بەئەنجام گەیەنرا وبەیار لەدەسەڵات دوورخرایەوە. لەساڵی ١٩٦١ دا جەمال كۆرسل كرایە سەرۆكی وڵات وتا كۆچی دوایی كردنی لە ساڵی ١٩٦٦ لەدەسەڵاتدا مایەوە. لەدوای ئەو جەودەت سۆفای كرا بەسەرۆكی وڵات وتا ساڵی ١٩٧٣ لەدەسەڵاتدا مایەوە. دوای ئەو دەسەڵاتی سەرۆكایەتی وڵات خرایە دەست سەرۆكی دەزگای سوپا كور تورك، لەسەردەمی ئەمدا هێزە سەربازییەكانی توركیا لەساڵی ١٩٧٤ دا پەلاماری وڵاتی قوبروسیاندا. لەساڵی ١٩٨٠ سەر لەنوێ سوپا دەسەڵاتی سەرۆكایەتی وڵاتی گرتەوە دەست. لەساڵی ١٩٨٩ توركۆت ئۆزاڵ كرایە سەرۆكی كۆمار. لەساڵی ١٩٩٣ دا سلێمان دیمێریل دوای كۆچی دوایی ئۆزاڵ لە ١٧ / ٤ / ١٩٩٣ پۆستی سەرۆكایەتی وڵاتی گرتە دەست.

لەبەرواری ٥ / ٦ /٢٠٠٠ پەرلەمان تورکی سەرۆکی دادگای دەستووری ئەحمەد نەجدەت سیزەر ( ٥٩ ساڵ ) ی بۆ ماوەی حەوت ساڵ بەسەرۆکی تورکیا هەڵبژارد. لە ١٦ / ٥ / ٢٠٠٠ دا لەبەردەمی پەرلەمانی تورکیادا سوێندی دەستووری خوارد. سیزەر پشتگیری لەئەنجامدانی چەند چاکسازییەك لەدەستووری وڵات دەكات وەك هەوڵێکی لەجێ بەجێ کردنی پەیوەندی تورکیا بەیەکێتی ئەوروپاوە. لە بەرواری ٣ / ٨ / ٢٠٠٠ دا پەرلەمان تورکیا رەزامەندی لەسەر رەتکردنەوەی سزای لەسێدارەدان و پەیرەو کردنی زمانی کوردی و ئێستگەی کورد دەربڕی.

لە کاتژمێری سێ ودوو خولەکی بەرەبەیانی سێشەممەی ١٧ / ٨ / ١٩٩٩ بوومەلەرزەیەکی بەهێز بۆماوەی ٤٥ چرکە وبەگوڕی ٧,٨ بەپێوەری رێختەر لە ناوچەکانی باکووری رۆژئاوای تورکیا و زۆربەی شارەکانی کەناری دەریای مەرمەڕە و بەشی ئەوروپای شاری ئەستابولیدا. سەنتەری بوومەلەرزەکە شاری ئێزمیتی پیشەسازیی بوو کە زیاترین زیانیشی پێکەوتبوو ونزیکەی ٩٠ کم لەرۆژهەڵاتی شاری ئەستانبولەوە دوورە.

بوومەلەرزەکە بەگەورەترین کارەساتە سروشتییەکان دادەنرێت لەمێژووی مرۆییدا چونکە بووە هۆی کوشتنی نزیکە پەنجا هەزار کەس وبریندار بوون وشوێن بزربوونی ژمارەیەکی زۆری دانیشتوانی ئەو ناوچانە، ئەمەو جگە لە وێران بوونی بەسەدان ئەپارتمان و لەناوبردنی ژێرخانی ئابووری ئەو وڵاتە، ئەمەش بووە هۆی ئاوارە بوونی زیاتر لە ٦٠٠ هەزار کەس. زیانە مادییەکانیش بەبڕی چل ملیار دۆلاری ئەمریکی خەمڵێنرا. لە بەرواری ١٢ / ١١ / ١٩٩٩ بوومەلەرزەیەکی دیکەش بەگوڕی ٧,٤ بەپێوەری رێکختەر لە نزیك شارۆچکەی دۆزسی دا کە دەکەوێتە نزیکەی ١٥٠ کم لەباکووری رۆژهەڵاتی ئەنقەرەی پایتەختیدا، بوومەلەرزەکە بووە هۆی کوشتنی ٨٩٤ کەس وبریندار بوونی زیاتر لە ٥٠٠٠ کەس. زانایان پێشبینی ئەوە دەکەن لەدوارۆژدا بوومەلەرزەی زۆر توندتر لەو ناوچانە بداتەوە.

تورکیا خاوەنی ئابوورییەکی بەهێز نییە، هێزی کار زیاتر سەرقاڵی چالاکییە کشتوکاڵیەکانن. لەگەڵ ئەوەی کە لەم دواییانەدا هەوڵی بەرەو پێش بردنی باری ئابووری دەدات لەرێی پەرە پێدانی پیشەسازی وڵات. گەشتوگوزاریش رۆڵێکی گەورە دەبینێ لە بەهێز کردنی داهاتی نەتەوەیی وڵات، ساڵانە پێشوازی لە زیاتر لە ١٣ ملیۆن گەشتیار دەکات.

لە ٢٠٠١ دا باری ئابووری ئەو وڵاتە دووچاری گرفتێکی خنکێنەر بوو، بووە هۆی دابەزاندنی بەهای لیرەی تورکی وبەرز بوونەوەی ئاستی هەڵئاوسانی ئابووری. بەسەدان

کۆمپانیا نابووت بوون ونزیکەی یەك ملیۆن کەسیش بێکار بوون وئەمەش بووە هۆی کشانەوەی داهاتی تاك بەرێژەی ١٠٪.

تورکیا بەپلەی چوارەم دێت لەنێو ولاَتانی جیهانی لە بەرهەمی زەیتون وبەپلەی حەوتەم دێت لەبەرهەمی لۆکە وبەخێو کردنی مەڕوماڵات، بەپلەی هەشتەم دێت لەبەرهەمی گەنم وبەپلەی نۆیەم دێت لەبەرهەمی جۆ ولینیت وبەپلەی سیانزدەیەم دێت لەنێو ولاَتانی جیهاندا لەبەرهەمی پەتاتە.

سروودی نیشتیمانی: کاروانی سەربەخۆیی

جەژنی نیشتیمانی : ٢٩ / ١٠ ی هەموو ساڵێك، هەروەها لە ٣٠ / ٨ ی هەموو ساڵێکیش ئاهەنگی سەرکەوتن دەگێڕن.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٤٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاَتانی جیهاندا : ٢٤.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢,٤٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاَتانی جیهاندا: ٧٢.

## ترینداد وتۆباگۆ

**ناوی باو:** ترینداد وتۆباگۆ

**ناوی فەرمی:** کۆماری ترینداد وتۆباگۆ

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Trinidad and Tobago

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٣١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٦ ئەندام )

**ڕووبەر :** ١,٩٨٠ میل دووجا، ٥,١٢٨ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١,٢٧٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢٤٨,٨ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی ڕەش، هیندی ئاسیا، تێکەڵ، ئەورووپی، چینی.

**ئاین:** مەسیحی، موسڵمان، هیندۆس.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** بۆرت ئۆف سبین.

**شارە سەرەکییەکان:** سلن فێرناندۆ، ئاریما، بوینت فۆرتین، سکار بۆردج، شواکاناس.

**دراو:** دۆلاری ترینداد وتۆباگۆ

**ئاووهەوا:** گەرم وشێدارە، پەلەکانی گەرما لەنێوان ١٨ بۆ ٣٢ پلەی سەدی دەبێت، نێوەندی بارانەکان لەباشووری ڕۆژئاوای ترینداد ١٢٥ سم و زیاتر لە ٢٥٠ سم لەبەرزاییەکان تۆباگۆ.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** قامیشی شەکر، گوێزی هیندی، کاکاو، قاوە، مۆز، ترشەلۆکییەکان.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە پیترۆکیمیاییەکان، چیمەنتۆ.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گازی سروشتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ترینداد وتۆباگۆ وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە دەریای کاریبی سەر بەکۆمەڵ دورگەکانی هیندی ڕۆژئاوا، نزیك کەناری باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەمریکای باشوور، نزیکەی ٢٨ کم لە کەناری ڤەنزەویلاوە دوورە، پێك دێت لە:

١. دورگەی ترینداد: ئەویش گەورەترین دورگەکانێتی وزیاترین ژمارەی دانیشتوانیشی لەخۆ گرتووە، نزیکەی ٩٥ ٪ ی ڕووبەری وڵات دەبێت وپایتەختیشی تێدەکەوێت، نزیکەی ١١ کم لەڤەنزەویلاوە دوورە. لەناوچەی باکوور ئەو دورگەیە لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا زنجیرە

چیاکانی تێدەکەوێت و ناوچەکانی تریشی بەدەشت و دارستانەکان داپۆشراون.

٢. دورگـەی تۆبـاگۆ: نزیکـەی ٢٢ کـم لەدورگـەی ترینـدادەوە دووره وزنجیرەیـەك گـرد وکەنارە بەلم داپۆشراو وسروشتێکی جوانی هەیە.

٣. نزیکەی ٢١ دورگـەی بـچوکیش بەچواردەوری دوو دورگەکـەی پێشودا بڵاوبونەتـەوە، لەوانە: دورگەی تۆباگۆی بچوك، مۆنۆس، شاکاشاکار، گاسباری، هیۆفۆس.

ناوەراستی ترینداد وتۆباگۆ دەکەوێتە سەر یەکبری هێڵی درێژی ٦١ بەرەو رۆژئاوا ولەگەڵ هێڵی پانی ١٠/٣٠ بەرەو باکوور.

دانیـشتوانە رەسـەنەکانی ئـەو ناوچـەیە هینـدە ئـۆراکی وکاریبییـەکانن. کریـستۆف کۆلۆمبـۆس لەسـاڵی ١٤٩٨ دا لەگەشـتی سـێهەمیدا بـەرەو جیهـانی نـوێ دۆزیویەتییـەوە، پشتیوانی لەداواکردنی ئیسپانیا کرد بۆ ئەو دورگەیە، ناوی ترینداد ( بەمانای سـێ دێت ) لێنـاوە بەهۆی بوونی سێ بانی دیار لەبەشی باشووری رۆژهـەڵاتی ئەو دورگەیـە. لەسـاڵی ١٥٩٢ دا ئیـسپانییەکان لێـی نیـشتەجێ بـوون. لەسـاڵی ١٧٩٧ دا ئینگلیزەکـان داگیریـان کـردووە. لەسـاڵی ١٨١٤ بـەریتانیا هـەردوو دورگـەی تریندـاد وتۆبـاگۆی خـستۆتە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـەوە. لەساڵی ١٩٥٨ دا بـەریتانیا مـافی ئۆتۆنـۆمی بەدانیـشتوانی ئـەو ناوچـە داگیکراوەدا بەخـشیوە. لـە ٣١ / ٨ / ١٩٦٢ سـەربەخۆیی تـەواوی لـەژێر سایەی کۆمۆنـۆلتی بەریتانی، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککرتوەکان.

دورگـەی تۆبـاگۆ پەرلـەمانی تایبـەتی خـۆی هەیـە و مـافی ئۆتۆنـۆمی سەربەخۆشـی پێبەخـشراوە، جگـە لـەوەی شـاری سـكار بـۆردجیش بـە پایتـەختی خـۆی دەزانـێ ولـەو هەوڵەدایە لەدورگەی دایك جیابێتـەوە، باری ئابووری ئەو دورگەیە پشتی بەچالاکییەکانی گەشتوگوزار بەستووە دوای پاشکەوتنی بەرهەمی قامیشی شەکر.

لەبـەرواری ١٦ / ٣ / ١٩٨٧ دا نـور حەسـەن عـەلی بەسـەرۆکی وڵات هەڵبـژێردرا. جـەژنی نەتەوەی لە ٣١ / ٨ ی هەموو ساڵێکە.

بـاری ئـابووری ترینـداد وتۆبـاکۆ پـشتی تـەواوی بـە بەرهـەمی نـەوت وپـاڵاوتنی بەسـتووە، چـونکە سـاڵانە نزیکـەی ٦٠ ملیـۆن بـەرمیل نـەوتی خـاو بەبەرهـەم دێنێـت. بەرهـەمی نـەوت ولێوەرگیراوەکانی نزیکەی ٨٠ ٪ ی بەرهەمەکانیەتی.

سروودی نیشتیمان:پەروەردە وگۆشکراوی خۆشەویستی ئازادین.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٤,٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٢.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣,٧٤٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٤.

## تشاد

ناوی باو: تشاد- چاد

ناوی فەرمی: کۆماری تشاد- چاد

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Chad

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی باڵا ( ٥٧ ئەندام ).

ڕووبەر : ٤٩٥,٧٥٥ میل دووجا، ١,٢٨٤,٠٠٠ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٧,١٦٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٥,٦ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: سودانییە ڕۆژئاواییەکان، خێڵە سودانییەکان، نیلییەکان، خێڵە بیابانییەکان.

ئاین: موسڵمان ٨٥ ٪، مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، بێباوەڕ.

زمان: عەرەبی، فەڕەنسی، چەند زمانێکی ناوخۆ.

پایتەخت: نجامینا.

شارە سەرەکییەکان: مۆندۆ، ئابیشی، بۆنجۆر، دۆبا، سارا.

دراو: فرانك.

ئاووهەوا: پلەکانی گەرما لەباکووری وڵاتدا دەگاتە ٤٩ پلەی سەدی ونێوەندی بارانەکانیش ١٣ سم دەبێت، پلەکانی گەرما لەناوەڕاست وباشووری وڵات ٢٨ پلەی سەدیەو نێوەندی بارانەکان ٦٤ سم دەبێت وتا بەرەو باشوور بچێت زیاتر دەبارێت تا لەوپەڕی باشووردا دەگاتە ١٠٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: بەخێوکردنی مانگا، لۆکە، هەرزن، توتن، پاقلە، برنج.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروستکراوەکانی خوری، جگەرە.

سامانی کانزایی: یۆرانیۆم، بۆکسیت، ئاڵتون، پیترۆل، سۆدیۆم.

تێڕوانینێکی گشتی :

تشاد وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە ناوەڕاستی باکووری ئەفریقیا. لیبیا دەکەوێتە باکووری، سودان دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، ئەفریقیای ناوەڕاست دەکەوێتە باشووری

وکامیرۆنیش دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای، دەریاچەی تشادیش دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای. هیچ کەنارێکی نییە بۆسەر دەریاکان. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٩ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٥ بەرەو باکوور.

زۆربەی زەوییەکانی تشاد بیابانی و وشك وبانی بەردەڵانن. لەناوەڕاستی تشادا رووبەرێکی زۆری بەگژوگیای ساڤانا داپۆشراوە بیابانەکانی باکوور لەناوچە زۆر بەپیتی باشوور کەناوچەیەکی لەبارن بۆ کشتوکاڵی جیادەکاتەوە. هەردوو رووباری شاری و لۆجۆن کە لەبەنجامینا بەیەك دەگەن ودەڕژێنە نێو دەریاچەی تشادەوە بەنێو خاکی تشاددا تێدەپەڕن.

مێژووی ئەو ناوچەیە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی ٥٠٠ ساڵ پ.ز، بەپێی ئەو ئاسەوارە دێرینانەی کە نەخشو نیگاری راوەماسی وراوی لەسەر بەردەکانی هەڵکەنراوە. هەروەها لەباکووری رۆژهەڵاتیش ئاسەواری شانشینی کانم دۆزراوەتە کەلەساڵەکانی ٧٠٠ بۆ ١٧٠٠ لەو ناوچەیەدا بووە. ئاینی ئیسلام لە ساڵی ١١٠٠ لەرۆژهەڵات ورۆژئاوا هاتۆتە نێو وڵاتەوە. لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەیەمدا زۆربەی وڵاتە ئەوروپیەکان هەوڵی داگیرکردنیان داوە.لەکۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا – دوای زنجیرەریەك لەپەیماننامەکان – فەرەنسا توانیویەتی دەسەڵاتی خۆی بەسەر باکوور و رۆژهەڵاتی دەریاچەی تشاد بسەپێنێ. هەروەها ناوچە باشووریە رۆژهەڵاتەکانیشی – کەلەژێر دەسەڵاتی ئەڵمانەکاندا بووە – کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسا. لەدوای جەنگی جیهانیی یەکەم، لە ١٩١٩ دا تشاد بۆتە پارێزراوەیەکی فەرەنسی سەر بە ناوچەی کەمەرەیی فەرەنسی. لەساڵی ١٩٤٦ دا بۆتە هەرێمی پشت دەریاکان. لە ١١ / ٨ / ١٩٦٠ دا تشاد بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە و لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان.

یەکەم سەرۆکی تشاد دوای سەربەخۆیی: فرانسوا تۆمبالبای، دوای ئەو: فیلیکس مالوم بەهۆی ئەو کودەتا سەربازییەی لە ١٣ / ٤ / ١٩٧٥ دا ئەنجامی دا دەسەڵاتی گرتە دەست. بەڵام شەری ناوخۆ لەنێوان مالوم وسەرۆکی وەزیران حەسەن حبری هەڵگیرساو نزیکەی ٢٠ ساڵی خایاند. لەبەرواری ٢٠ / ٥ / ٢٠٠١ دا سەرۆك ئیدریس دیبی لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا بەکۆی ٦٧,٣٥٪ ی دەنگەکان سەرکەوتنی بەدەست هێناو بۆ ماوەی پێنج ساڵ پۆستی سەرۆکایەتی درایە دەست.

لەساڵی ١٩٩٤ دا لیبیا شریتی ئۆزۆی بیابانی کە رووبەرەکەی ١١٤ هەزار کم دووجا دەبێت گەڕانەوە بۆ وڵاتی تشاد دوای زیاتر لە ٢١ ساڵ داگیرکردن.

لیبیا شریتی ئۆزۆی لەساڵی ١٩٧٢ دا گرتبوّوە خۆی بەپێی ئەو پەیماننامەیەی نێوان

فەرەنسا وئیتاڵیا، ئەو دوو هێزەی هەر یەك لەتشاد ولیبیایان داگیر کردبوو. لەسییەکانی سەدەی بیستەمدا. لەپەیماننامەکەدا ئیتاڵیا بەو پێیەی لیبیای داگیرکردبوو رەزامەندی لەوەرگرتنی ناوچەی ئۆزۆ بەرامبەر چۆڵ کردنی ولاتی تونسی پارێزراوەی ئەو کاتی فەرەنسا.

لە ٨ / ١ / ٢٠٠٢ دا حکومەتی تشاد رایگەیاند کەلەسەر ئاگر بەستێکی دەستبەجێ رێکەوتووە لەگەڵ بزوتنەوەی دیموکراسی وداد کە دیار ترین بزوتنەووەی یاخی بووە لەولاتدا. ئەمەش بەهەنگاوێکی بەرچاوی ئامادەبوونی لیبیا دادەنرێ لەرێکەوتنامەیەکی ئاشیانەی نێوان تشاد ونۆپۆزسیۆنەکانی. بەڵام هێندەی نەخایاند شەڕ وپێکدادان لەنێوان تشاد وبزوتنەوەی ناوبراو هەڵگیرسایەوە.

لەهاوینی ٢٠٠٢ دا کێشە سنوورییەکان لەنێوان تشاد وئەفریقیای ناوەڕاستی دراوسێی لەسەر سنوورەکان سەری هەڵدا، سەربارە تشادییەکان چەند ناوچەیەکی باکووری ئەفریقیایان داگیرکرد، ناوبژیوانان دەستیان کرد بەچارەسەرکردنی کێشەکانی نێوانیان.

تشاد ولاتێکی هەژارە، بەیەکێك لەهەرە ولاتە پاشکەوتوەکانی جیهان دادەنرێت، سەرچاوە سروشتییەکانی زۆر کەمن، زۆربەی زەوییەکانیشی بۆ کشتوکاڵی شیاو نین، سەرباری ئەو هەموو نەهامەتیەش لاوازی هۆیەکانی هاتوچۆیە، چونکە هیچ هێڵێکی ئاسنی نییە وزۆربەی رێگا سەرەکییەکانیشی قیرتاو نەکراون. تشاد پشتی بەیارمەتییەکانی هەر یەك لەفەرەنسا وئەمریکا ورێکخراوە مرۆییەکان بەستووە. هیواکانیشی بەردەوامە لەسەر بەرهەم هێنانی نەوت ورەوانە کردنی بۆ دەرەوەی ولات لەرێی هێڵی کامیرۆنەوە بۆ کەناری زەریای ئەتڵەسی کە درێژییەکەی دەگاتە ١٠٠٠کم، لەکاتێکدا لێکۆڵینەوەکان وای دەردەخەن کە بڕی گەنجینەی یەدەگی نەوتی ئەو ولاتە هێندەی داهاتی دامەزراندنی پالاوتەیەك نییە بۆ بەرهەمهێنانی.

وشەی تشاد لە شەتەوە هاتووە کە بەزمانی عەرەبی بەمانای کەنار دێت وئەو ناوەشی بەهۆی نزیکییەوە لە دەریاچەی تشادەوە هاتووە.

جەژنی نیشتیمانی: ١١ / ٨ ی هەموو ساڵێك، جەژنی سەربەخۆیی

سروودی نیشتیمانی: تشادییەکان

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٥٠.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٨٣.

## چیك

**ناوی باو:** چیك

**ناوی فەرمی:** كۆماری چیك

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Czech Republic

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری ، سەرۆكی كۆمار ، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٨١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٠٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ٣٠,٤٥٠ میل دووجا ، ٧٨,٨٦٤ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,٣٠٧,٠٠٠ كەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٣٠,٧ كەس/كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** چیك ، مۆراڤ ، سلۆڤاك ، قەرەج ، مەجەڕی ، پۆڵەندی

**ئاین:** مەسیح ( ڕۆمان كاسۆلیك ، پرۆتستانت ) ، لەگەڵ ٢٠,٠٠٠ موسڵمان.

**زمان:** چیكی .

**پایتەخت:** پراغ

**شارە سەرەكییەكان:** برنەو ، ئۆستراڤا ، بلزن ، ئۆلۆموك

**دراو:** كرۆن

**ئاووهەوا:** مام ناوەندە لەهاوین وساردە لە زستان، نێوەندی پلەكانی گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان -٥ پلەی ژێر سفری سەدی بۆ ٢٥ پلەی سەدی دەبێت. ساڵانە بڕی ٤٥ – ١٣٥ سم بەفر وباران دەبارێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵییەكان:** جۆ ، گەنمە شامی ، گەنم ، چەوەندەر ، چەوەندەری شەكر ، كەلەرم ، پەتاتە ، پەلەوەر ، بەخێوكردنی مانگا.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** پێڵاو ، شووشە ، ئاسن وپۆڵا ، دروستكراوەكانی خووری.

**سامانی كانزایی:** خەڵووزی بەردین ، یۆرانیۆم ، لینیت .

**تێڕوانینێكی گشتی :**

چیك ، یان چیكیا ، وڵاتێكە دەكەوێتە ناوەڕاستی ئەوروپا، پۆڵەندا دەكەوێتە باكووری ، سلۆڤاكیا دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی ، نەمسا باشووری ، ئەڵمانیاش دەكەوێتە ڕۆژئاوا وباكووری

رۆژئاوای . ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٦ بەرەو رۆژهەلات لەگەلّ هێڵی پانتایی ٥٠ بەرەو باکوور.

چیاکانی بۆهیمیا دەکەونە رۆژئاوای ولات و چیاکانی سۆدیت دەکەونە سەر سنووورە باکووریەکانی ولات. حەوزی بۆهیمیاش کە بریتییە لە دەشت وبانە بەپیتەکان دەکەوێتە بەشی باکووری ناوەڕاستی چیك وبراغی پایتەختیشی تێدەکەوێت، بەلام بەرزاییەکانی بۆهیمیا و مۆرافیا لایەکی زۆری بەشی ناوەڕاستی ولات دادەپۆشن، لەچەند دەشت وبان وگردێك پێك هاتوون بە تێکرایی هەرێمێکی کشتوکالّی بەرفراوانیان پێك هێناوە. نزماییەکانی مۆرافیاش دەکەونە باشووری رۆژهەلاتی چیك وبەناوچەیەکی پیشەسازی دادەنرێت.

لەسەدەی پێنجەمی پ.ز کۆمەلّە هۆزە سلاڤییەکان لەو ناوچەیەدا ژیاون لەدواییدا ناوچەکەیان بەکۆماری چیکۆسلۆڤاکیا ناسرا. ئەم هۆزانە لەدوو گروپی سەرەکی پێك دێن: گروپی چیك ( کەلەوانەوە ناوی ولات هاتووە ) لەبەشی رۆژئاوای ولاتدا ژیاون و گروپی سلۆڤاك لەبەشی رۆژهەلاتدا جێگیر بوون. مەجەڕییەکان تەواوی ناوچەکانی هۆزە سلۆڤاکییەکانیان داگیر کرد و ئیمپراتۆرییەتی مۆرافیایان لێدامەزراند. کەچی لەرۆژئاوادا شاری براغ گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی و بووە گرنگترین سەنتەری کەلتووری وسیاسی ئیمپراتۆرییەتی رۆمانی پیرۆز. لەسەدەی پانزدەیەمدا براغ بووە مۆلّگەی چاکسازی ئاینی پرۆتستانت.

تا ئەمرۆش چیکییەکان بەچاوی پالەوانێکی نەتەوەیی دەڕواننە جۆن هێسی چاکسازی ئاینی کە بە سزای سوتاندن گیانی لەدەستدا لە سالّی ١٤١٥ ، لەسالّی ١٦٢٠ دا چیکییەکان بەرەو رووی نەمساییەکان بوونەوە لەشەڕی چیای سپی بەرەنگاریەکی توندیان لێکردن، لەئاکامدا هۆزەکانی چیك وسلۆڤاك کەوتنە ژێر دەسەلاتی خێزانی هابسبێرگی نەمسایی تا سەدەی بیستەم.

لەگەلّ ئەوەی کە چیکۆسلۆڤاکیا کەوتە ژێر دەسەلاتی ئیمپراتۆریەتی نەمسا، بەلام توانیان پارێزگاری لەپێناسە وسەربەخۆیی خۆیان بکەن. لەماوەی داگیرکەری نەمسایی ناوچەکانی بۆهیمیا ومۆرافیا لەرۆژئاوادا بوونە چەند هەرێمێکی پیشەسازی پێشکەوتوو. بەلام هۆزە سلاڤییەکانی رۆژهەلات کەوتە ژێر دەسەلاتی مەجەڕییەکانەوە وسەرقالّی کشتوکالّی بوون وکەمتر لەتشیکییەکان روالّەتەکانی شارستانێتیان پێوە دیار بوو.

پاش تێکشکاندنی ئیمپراتۆرییەتی نەمسا – مەجەڕ لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا، ئیمپراتۆریەت هەلّوەشا ودابەش بوو بۆ چەند ولاتۆچکەیەکی بچوکەوە. هۆزە چیکی

وسلاڤیەکانیش توانیان لە ٢٨ / ١٠ / ١٩١٨ ولاتێکی هاوبەش بەناوی ولاتی چیکۆسلۆڤاکیا پێك بهێنن، رۆژی ٢٨ / ١٠ بەرۆژی نیشتیمانی دادەنرێت. زۆر بەخێرایی چیکەکان توانیان دەسەلاتی ولات بگرنە دەست چونکە لە سلۆڤاکییەکان خوێندەوارتر ورۆشنبیرتر بوون، سلۆڤاکییەکان خۆیانیان لەدەرەوەی بازنەی دەسەلاتدا دەبینییەوە، بوونی کەمایەتییە بچوکانیش لەسنووری چیکۆسلۆڤاکیا بەتایبەتی ئەلمانەکانی سوریتیدلاند هۆیەك بوو پەیدابوونی دابەشیەکی زیاتر لەنێو ولاتدا، بەلام چیکۆسلۆڤاکیا پەیرەوی دیموکراسیەتی دەکرد لەحوکمەکانیدا تا ئەو کاتەی نازیەکان لە ساڵەکانی ١٩٣٨ و ١٩٣٩ داگیریان کرد.

لە ساڵی ١٩٤٥ دا چیکۆسلۆڤاکیا لەدەست نازییەکان رزگار کرا وچووە نێو بازنەی گەردوونی یەکێتی سۆڤێتەوە. لەگەڵ ئەو هەموو توندی وتۆڵیانەی لەولاتدا پەیرەو دەکران، بەلام گرفت وململانێکانی بە بەردەوامی دووچاری دەبووەوە بەتایبەتی لەساڵەکانی ١٩٦٨ و ١٩٧٧ دا. پاش کۆتایی هاتنی داگیرکاری سۆڤیەت لەساڵی ١٩٦٨ و واژۆ کردنی رێکەوتننامەی " براغ " چیك وسلۆڤاکییەکان دوژمنکارییەکی بەردەوامی هەموو شتێکی یەکێتی سۆڤێتیان دەکرد تەنانەت زمانی رووسیش کە بەزۆر ملیَ لەقەتابخانەکاندا دەخوێندرا.

پاش ئەو زنجیرە تێکشکاندنانەی بەرەو رووی یەکێتی سۆڤێت بووەوە وبووە هۆی هەڵوەشاندنەوەی لە ساڵی ١٩٨٩ دا ، چیکۆسلۆڤاکیا لە ١٧ / ١١ / ١٩٨٩ دا توانی حکومەتێکی میللی نا شیوعی بۆخۆی هەڵبژێرێ و بووە کۆمارێکی پەرلەمانی تا ساڵی ١٩٩٢، چیکییەکان لە رۆژی ١٧ / ١١ دا ئاهەنگی جەژنی کۆتایی هێنان بە شیوعێت دەگێرِن.

لە ١ / ٣ / ١٩٩٣ چیکۆسلۆڤاکیا بووە دوو ولاتی سەربەخۆ : کۆماری چیك و کۆماری سلۆڤاکیا و هەردوو ولات لەهەمان ساڵدا پەیوەندییان کرد بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە. یەکەم سەرۆکی چیك ڤاتسلاڤ هاڤل بوو کە لە ٢٩ / ١٢ / ١٩٨٩ دا دەسەلاتی گرتبووە دەست وتا ئەو کاتەش هەر سەرۆك کۆمار بوو. لەمانگی سێی ساڵی ١٩٩٩ دا چیك پەیوەندی کرد بە هاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسی ( ناتۆ ) ، لەهەمان ئەو کاتەی هەر یەك لە هەنگاریا وپۆلەنداش پەیوەندییان پێوە کرد.

لە هاوینی ٢٠٠٢ دا چیك وەك زۆربەی ولاتانی ئەورووپای ناوەراست دووچاری لافاوە بەهێزەکان بووەوە، ئەمەش بووە هۆی لەدەست دانی ژمارەیەکی زۆر لەزەوی وزاری کشتوکاڵی ونیمچە نوقم کردنی چەندین گوند وشار وشارۆچکە وبراغی پایتەخت دووچاری توندترین کارەساتی سروشتی بووەوە وزیانێکی زۆری بە مۆزەخانەکان و ئەپارتمانە

مێژوویەکان گەیاند.

پاش جیابوونەوەی سلۆڤاکیا ، چیک هەوڵی گەشەکردنێکی بەرفراوان وبەچاوێکی بەئومێدەوە دەڕوانێتە دوارۆژی ئابووری لەوڵاتەکەیدا و بایەخێکی زۆری بە بازرگانی و گەشتوگوزار وهەوڵی تێکەڵ بوون بە بازارەکانی دەرەوە دەدا.

سروودی نیشتیمانی: کوا نیشتیمانم.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی .

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٥٢ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٣,٢١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٦٠.

چیك بەپلەی پێنجەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی لینیت وبەپلەی شانزدەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی جۆ وخەڵووز.

## چیلی

**ناوی باو:** چیلی

**ناوی فەرمی:** کۆماری چیلی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Chile

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری ، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت :

ئەنجومەنی پیران ( ٤٧ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٠ ئەندام )

**رووبەر :** ٢٩٢,١٣٥ میل دووجا ، ٧٥٦,٦٢٦ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٤,٥٨٣,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٩,٣ کەس / کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** میستیزۆ ( تێکەڵەیەك لەهیند و ئەوروپیەکان ) ، ئەوروپی ، هیند.

**ئاین:** کاور ( رۆمان کاسۆلی ، پرۆتستانت ) ، بێ باوەڕ

**زمان:** ئیسپانی ، کیتشوا .

**پایتەخت:** سانتیاگۆ

**شارە سەرەکییەکان:** فینا دیل مار ، فالباراسیۆ ، کۆنسیبسیۆن .

**دراو:** بیزۆ

**ئاووهەوا:** پلەکانی گەرما لەباکووری وڵات کە بیابانی ئەتاکامای تێدەکەوێت لەنێوان ١٤ بۆ ٢٠ پلەی سەدی دەبێت و پلەکانی گەرما لە دۆڵی ناوەڕاست لەنێوان ٩ بۆ ٢٠ پلەی سەدی دەبێت.پلەکانی گەرما لە ناوچەی دورگەکانی باشووری وڵات لەنێوان ٨ بۆ ١٥ پلەی سەدی دەبێت .نێوەندی ساڵانەی بارانەکان ٢١٨ سم .

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** دانەوێڵە ، برنج ، شۆفان ، پاقلەمەنییەکان ، پەتاتە ، چەوەندەری شەکر ، ترێ ، بەخێوکردنی مەڕومالات ، راوە ماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان ، دراوتەختە ، چیمەنتۆ ، دروست کراوە کیمیاییەکان ، کاغەز .

**سامانی کانزایی:** مس ، مۆلیبدینۆم ، نەتراتی سۆدیۆم ، نەوت ، مەنگەنیز ، ئاڵتون ، زیو ، قورقوشم ، ئاسن ، خەڵووزی بەردین ، لیتیۆم .

**تێڕوانینێکی گشتی :**

چیلی وڵاتێکە بەدرێژایی ٤٢٦٥ کم درێژ دەبێتەوە لەسەر کەناری رۆژئاوای ئەمەریکای باشوور لەبیرۆوە تا دەگاتە سەری باشووری کیشوەری ئەمەریکای باشوور. بیرۆ دەکەوێتە باکووری ، بۆلیڤیا دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی ، ئەجەنتینیش دەکەوێتە رۆژهەڵاتی و زەریای هێمن لە باشوور ورۆژئاوادا لەگەڵی سنووردارە. چیا بەرزەکانی ئەندیز دەکەوێتە سەر سنوورەکانی نێوان چیلی و نێوان بۆلیڤیا و ئەرجەنتین. یەکێری هێڵی درێژی ٧١ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانتایی ٣٠ بەرەو باشوور بەناوەراستیدا تێدەپەڕێت.

بیابانی ئەتاکاما، کە یەکێکە لەناوچە زۆر وشکەکان لەجیهاندا دەکەوێتە باکووری چیلی ودۆڵی ناوەراستیش کەوتۆتە ناوەڕاستی وڵات و زۆربەی ئەو زەوییە کشتوکاڵی ودەزگا پیشەسازییەکانی تێدەکەوێت، چەند روبارێکیشی پیا تێپەڕدەبێت. دورگەگانیش دەکەونە دۆڵی ناوەڕاست و تا سەرووی باشووری ئەمەریکای باشوور درێژ دەبنەوە و بە : سەری هۆرن ناودەبرێت.

کۆمەڵێ دورگەش لە زەریای هێمندا کەسەر بە چیلین، لەوانە: دورگەی ئیستەر و دورگەکانی خوان فێرناندیز.

هیندەکانی ئەمەریکا زۆر پێش گەیشتنی ئەوروپیەکان لەسەدەی پانزدەیەمی زاییندا لەو ناوچەیە ژیاون. لە ساڵی ١٥٢٠ دا دەریاوانی پۆرتۆگالی فردیناند ماجەلان گەیشتۆتە ناوچەکە وبەیەکەم ئەوروپی دادەنرێت خاکی چیلی ببینێت لەکاتی پەڕینەوەی ئەو تەنگەیەی بەناوی خۆیەوە ( تەنگەی ماجەلان ) ناودەبەرێت ودەکەوێتە ئەوپەری باشووری کیشوەری ئەمەریکای باشوور.

پاش روخانی ئیمپراتۆرێتی ئینکای هیندی، ئیسپانیەکان لەساڵی ١٥٣٣ بۆ گەڕان بەدوای ئاڵتون وزیودا گەیشتوونەتە ئەو ناوچەیە. بەڵام لەبری کانزاکان ، خاکێکی زۆر بەپیتیان دۆزییەوە و هێندەی نەخایاند چیلیان کردە بەشێك لە ئیمپراتۆرێتی ئیسپانی و پیرۆ حوکمی دەکرد.

بەڵام کۆچبەری ئیسپانی بەرەو ئەو دورگەیە زۆر دیاری کراو بوو، بەهۆی توندی بەرگری هیندە ئۆرکانییەکان بەرامبەر کۆچبەران لەو ناوچەیە.

لە ١٨ / ٩ / ١٨١٠ دا کۆمەڵێك لە کریۆلییەکان ( ئەو ئیسپانییانەن کە لە ئەمەریکا لەدایك بوون بەهۆی ژن وژنخوازەوە لەگەڵ هیندە سوورەکان) کە زۆربەیان خاوەنی زەوی وزارەکان بوون هەڵسان بەپێکهێنانی ئەنجومەنێکی سیاسی و رایانگەیاند کە دەبنە حکومەتێکی سەربەخۆ، چیلی ساڵانە لەو رۆژەدا جەژنی نیشتیمانی دەگێرێت. بۆ ساڵی دوایی هۆزێ میگیل کاریرا، کە یەکێك بوو لە چیلییە ئۆرۆستۆکراتییەکان، بووە سەرۆکی ئەو حکومەت .

لە ۱۲ / ۲ / ۱۸۱۸ دا چیلی سەربەخۆیی خۆی بەفەرمی راگەیاند و یەكەم سەرۆكیشی بێرناردۆ ئۆهیجنز بۆ دیاری كرا.

لە ماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا زەوییەكانی چیلی بەرفرانییەكی بەرچاویان بەخۆوە بینی و بەهۆی رێكەوتننامەی ئەرجەنتینەوە توانی كەناری ماجەلانی سەر زەریای ئەتڵەسیش بخاتە سەر زەوییەكانی خۆی، لەگەڵ ئەوەی كە ناوچەی پاتاگۆنیا خرایە سەر ئەرجەنتین. دوای ئەوەی چیلی لەشەڕی زەریای هێمندا سەركەوتنی بەسەر هەر یەك لە بۆلیڤیا وپیرۆ لە ساڵی ۱۸۸۳ ناوچەكانی باكووری بەرفراوانییەكی زۆری بەخۆوە بینی و زەوییەكی چاكی پڕ لەسەرچاوەی سروشتی خرایە سەر. بەڵام پەیوەندییەكانی لەگەڵ بۆلیڤیا بەرەو ئاستەنگی دەچوو ، تا ئێستاش ، چونكە بۆلیڤیا نەیتوانی قەرەبووی ئەو كەنارە بكاتەوە كە چیلی خستویێتییە سەر خۆی.

لە ساڵی ۱۹۳۲ دا پارتێكی بەهێز بەناوی پارتی رادیكالییەكان دامەزرا و زۆربەی تاكەكانی چینی ناوەڕاستی لەخۆ گرتبوو، تا ساڵی ۱۹٦٥ حكومەتی گرتە دەست و لەو ماوەیەدا وڵات گەشە كردنێكی باشی بەخۆوە بینی جگە لە پێشكەوتنی دەزگا كۆمەڵایەتی ومەدەنییەكان.

لە ساڵی ۱۹٦٤ دا دیموكراسی خوازی مەسیحی ئێدوارد فرای مۆنتالفا بەسەرۆكی كۆمار هەڵبـژێردرا، دوای ئەو لە ساڵی ۱۹٦۹ دكتۆر سلڤادۆر ئەلیندی بووە سەرۆكی كۆمار و كۆمەڵێ سەركردەی سەربازی كودەتایان بەسەردا كرد، كەس نەیزانی سلڤادۆر خۆی كوشت یان كوژرا و دەسەڵات كەوتە دەست جەنەراڵ ئۆگستۆ بینۆشێ ئۆگارتی. بەهەزارەها هاوڵاتی چیلی گیانیان لەدەستدا لەنێوان لایەنگری جەنەراڵی نوێ ونەیارانی دەسەڵاتی سەربازی ، ئۆگستۆ زۆربەی نەیارەكانی دەستگیر كرد وبەرەو بەندینخانەكانی بەرێی دەكردن وبەسەدانیشی بەرەو تاراوگەكان كردە دەرەوەی وڵات. بینۆشی تا ساڵی ۱۹۸۹ لەدەسەلاتدا مایەوە، لەهەڵبژاردنەكاندا دەسەڵاتی لەدەستدا بەڵام هەر بەسەركردەی سوپا مایەوە وپاتریشیۆ ئیلوین دەسەلاتی گرتە دەست. لە مانگی ۱۲ / ۱۹۹۳ دا بەهۆی هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتی ئێدوارد فری رۆز تاجلی سەركەوتنی بەدەست هێناو پۆستی سەرۆكایەتی گرتە دەست. لە ۱٦ / ۱ / ۲۰۰۰ دا سەرۆكی پارتی سۆسیالیست ریكاردۆ لاگۆس لەهەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتیدا سەركەوتنی بەدەست هێنا ولەبەرواری ۱۱ / ۳ / ۲۰۰۰ دا سوێندی دەستووری خوارد و دەسەلاتی گرتە دەست.

لە ساڵی ۱۹۹۸ دا بینۆشێ بە كوشتن وئازار وئەشكەنجە وزیندە بەچاڵ كردنی چەندین هاوڵاتی تاوانبار كرا و دادگایەكی ئیسپانیش بەدیار نەمانی چەند هاوڵاتییەكی ئیسپانی تاوانباری كرد.

له ١٧ / ١٠ / ١٩٩٨ ، لەکاتێکدا بینۆشێ ( ٤٨ ساڵ ) لەیەکێ لەنەخۆشخانەکانی لەندەن چارەسەری ئازارەکانی پشتی دەکرد، دەسەڵاتدارانی بەریتانیا دەستگیریان کرد پاش دەرچوونی یاداشتننامەیەك بەتاوانبار کردنی . له مانگی ٣ / ٢٠٠٠ دا بەریتانیا بینۆشێ ی ئازاد کرد ونەیدایە دەست ئیسپانیا ، له ٣ / ٣/ ٢٠٠٠ دا گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی ( چیلی ) . لە ٤ / ٦ / ٢٠٠٠ دا دادگای چیلی بڕیاری دا ماف ئەندام پەرلەمانی لێ پسەنێتەوە، شایەنی باسە بەپێی دەستووری چیلی هەر کەس سەرۆکی وڵات بووبێ ماف ئەوەی هەیە هەتا هەتایە ئەندامێکی هەمیشەیی پەرلەمان بێت، پاش لێسەندنەوەی ئەو مافە حکومەتی چیلی لەبەردەم دادگادا ئامادەی کرد و ڕووبەڕووی ١٢٤ سکالا بۆوە کە هاوڵاتیان بەتاوانی کوشتن وفڕاندن وپێشێل کردنی ماف مرۆڤ تاوانباریان کردبوو لە ماوەی حوکمی وڵاتدا ١٩٧٣ بۆ ١٩٨٩ .

له بەرواری ٢٠ / ١٢ / ٢٠٠٠ دا دادگای باڵای چیلی تەواوی ئەو تاوانەی خرابوونە پاڵ ئۆگستۆ بینۆشێ ی پووچەڵ کردەوە و نیشتەجێ بوونی زۆرە ملێی لەسەر لابرد بەپاساوی خراپی باری تەندروستی ناوبراوەوە، له ١ / ٧ / ٢٠٠٢ دا حکومەتی چیلی دانی نا بە بێ تاوانی بینۆشی لەتەواوی ئەو تاوانانەی خرابوونە پاڵی.

وشەی چیلی بە مانای کۆتایی زەوی یان ئەو پەڕی زەوی دێت ، بە زمانی هیندەکان کە دانیشتوانی ڕەسەنی وڵاتەکەن. هەندێکی کەش دەڵێن چیلی جۆرێکە لەو چۆلەکانەی لەناوچەکانی ناوەڕاستی ئەو وڵاتە دەژین ولەسەر ناوی ئەوانەوە وڵات ناونراوە.

زۆربەی دانیشتوانی چیلی لەناوچەی دۆڵی ناوەڕاستدا دەژین، دانیشتوانی گوند ولادێکانیش له کۆتایەکانی سەدەی بیستەمدا بەرەو ناوەڕاست گوند ودێکانی خۆیان بەجێ هێشتووە بۆ گەڕان بەدوای ژیانێکی باشتر. ئەمەش بۆتە هۆی ئانەوەی کێشەی چڕی دانیشتوان لەو ناوچەیەدا وبڵاوبوونەوەی بێکاری.

سروودی نیشتیمانی چیلی: وڵاتی جوانمان قوربانییەکانمان لێ قبوڵ کە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٥٠,١ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٣

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣,٥٦٠ دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٥٥ .

چیلی بە پلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی مس و بە پلەی سێهەم دێت له ڕاوە ماسی ،بەپلەی پێنجەم دێت لەبەرهەمی زیو و پلەی دوانزدەیەم دێت لە بەرهەمی ئاڵتون و پلەی چواردەیەم لەدروستکردنی مەی.

## تەنزانیا

**ناوی باو:** تەنزانیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری تەنزانیای یەکگرتوو

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

United Republic of Tanzania

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری ، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٣٢ ئەندام )

**ڕووبەر :** ٣٦٤,٠١٧ میل دووجا ، ٩٤٢,٧٩٩ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣٠,٥٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٣٢ کەس / کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش کە دەچەنەوە چەند کۆمەڵەیەکی نەژادی گرنگترینیان ئەمانەن : نیامۆزی ، سۆکۆما ، هایا.

**ئاین:** موسڵمان ٥٥٪ ، مەسیحی ٢٥٪ ، بێ باوەڕ ٢٠٪

**زمان:** سەواحیلی ، ئینگلیزی ، چەند زمانێکی ناوخۆ گرنگترینیان : بانتۆ .

**پایتەخت:** دۆدۆما.

**شارە سەرەکییەکان:** دارولسەلام ( خانەی ئاشتی ) ، موانزا ، تانگا ، ممباسا.

**دراو:**شلنی تەنزانی .

**ئاووهەوا:** لە کەنار ودورگەکاندا : گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٩ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٨٠ – ١٤٠ سم . بانە ناوخۆییەکان گەرم ووشکە . نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٩ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی باران کەمتر لە ٥٠ سم. زنجیری چیاکان گەرم وشێدارن ، نێوەندی پلەکانی گەرماش ٢٤ پلەی سەدی دەبێت. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز ، گۆشت ، مێخەك ، گوێزی هیندی، قاوە ، لۆکە، گەنمە شامی، تووتن، گەنم ، سەوزە ومیوە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوە خۆراکییەکان ، دروستکراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** ئەڵماس ، ئاڵتون، خەڵووزی بەردین .

**تێڕوانینێکی گشتی :**

تەنزانیا دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا، دەریاچەی ڤیکتۆریا وکینیا دەکەونە باکووری،

زەریای هیندی دەکەوێتە رۆژهەلاتی ، مۆزامبیق وزامبیا دەکەونە باشووری، بۆرۆندی وروانددا دەکەونە باکووری رۆژئاوای. دەریاچەی تەنجانیقا سنوورەکانی نێوانی و نێوان کۆنگۆی دیموکراسی پێك دەهێنێت. هەروەها دەریاچەی مەلاوی ( یان : نیاسا ) بەشێك لەسنوورەکانی نێوانی ونێوان مەلاوی پێك دەهێنێت. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ۳۵ بەرەو رۆژهەلات لەگەلْ هێلی پانتایی ٥ بەرەو باشوور.

چەند دورگەیەکی سەر کەنارەکانی زەریای هیندی سەر بەتەنزانیان، گەورەترینیان دورگەی زنجبار ، دوای ئەو دورگەی بمبا.

بەدرێژایی ۸۰۰ کم کەنارەکانی تەنزانیا کە دەکەونە سەر زەریای هیندی لەدەشتەکان پێك هاتووە، ئەو دەشتانەش بەرەو قوڵاییەکانی ولات بە ۱٥ کم بۆ ٦٥ کم درێژ دەبنەوە و بەرەو ناوەڕاستیش لەو ماوەیە زیاتر. دوای دەشتەکان بانەکان بەرز دەبنەوە ئەوانیش کۆمەڵە دەشتی ماسای یان گرتۆتە خۆ کە دەکەوێتە باکووری رۆژهەلات وهەرێمی بانی ناوەڕاست بەرەو رۆژئاوا. بەدرێژایی سنووره رۆژئاواکانی ولات زنجیرە چیاکان درێژ دەبێتەوە وبەرزترینیان چیای کلیمەنگارۆ یە کەبەبەرزترین چیای ئەفریقیا دادەنرێت و بەرزییەکەی دەگاتە ٥٨٩٥ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا.

خەڵکی بەر لەهەزارەها سالْ لەتەنزانیادا ژیاوە، چەند ئاسەوارێکی مرۆیی لەو ناوچەیەدا دۆزراوەتەوە کە مێژووکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی دوو ملیۆن سالْ.

عەرەبەکان بەهۆی ئیسلامەوە گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە و چەند ئیمارەتێکیان لێ پێکهێناوە. پۆرتۆگالییەکان لەسەرەتاکانی سەدەی شانزدەیەمەوە گەیشتوونەتە ئەو ناوچەیە و هاوکات ئەو هۆزانەش گەیشتوون کە بە زمانی بانتۆ قسەیان کردووە.

لە سەدەی هەژدەیەمدا عەرەبەکانی مەسقەت و عومان ( ئال بوسەعید ) چەند بەشێکیان داگیر کردووە وچەند سەنتەرێکی بازرگانیان بەدرێژایی کەنارەکان لێ دامەزراندووە، هاوکات گەڕیدە ئەوروپی و تیمە مژدەبەخشەکان ( تەبشیری ) گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە، لەکۆتایی ئەو سەدەی هەژدەیەمدا ئەڵمانیا توانی کۆنترۆڵی بکات.

لە ساڵی ۱۸۹۰ دا بەریتانیا هەر یەك لە دورگەکانی زنجبار و بمبای کردۆتە دوو پارێزراوەی خۆی وهێندەی نەخایاند خاوەندارێکانی سەڵتەنەتی زنجباری داگیر کرد.

پاش تێکشکاندنی ئەڵمانیا لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا ( ۱۹۱٤ – ۱۹۱۸ ) بەریتانیا دەستی گرت بەسەر زەوییە ناوخۆکانی تەنزانیای ئێستا و ناوی نا : تەنجانیقا.

لە ساڵی ۱۹٤٦ تەنجانیقا بووە ولاتێکی یەکگرتوو لەژێر دەسەلاتی نەتەوە یەکگرتووەکاندا، بەریتانیای بە لێپرسراو دانا لە ئامادەکردنی سەربەخۆیی ئەو ولاتە. بۆ ساڵەکانی دوایی

دانیشتوان داوای سەربەخۆییان دەکرد. تەنجانیقا لە ١ / ١٢ / ١٩٦١ سەربەخۆیی دەستگیر بوو و لەهەمان ساڵدا پەیوەندی کردووە بە نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، زنجباریش لە ١٠ / ١٢ / ١٩٦٣ سەربەخۆیی دەستگیر بووە.

لە بەرواری ٢٦ / ٤ / ١٩٦٤ هەردوو وڵات : تەنجانیقا و زنجبار بوون بەیەك وڵات لەژێر ناوی : كۆماری تەنجانیقا وزنجباری یەكگرتوو وجۆلیۆس نیریری بەسەرۆكی كۆمار هەڵبژێردرا. بۆ ساڵی دوایی ناوی كۆمار گۆڕا بە ناوی : كۆماری تەنزانیای یەكگرتوو. ناوەكەش لەلێك دانی هەر سێ ناوەكەوە هاتووە : تەنجەنیقا ، زنجبار ، بمبا هاتووە ، ساڵانە لەرۆژی ٢٦ / ٤ / جەژنی نیشتمانی دەگێڕدرێت.

جۆلیۆس نیریری تا دەست لەكاركێشانەوەی لەساڵی ١٩٨٥ دا لەدەسەڵاتدا مایەوە ، یەكێكە لەو سەركردە ئەفریقییە كەمانەی خۆبەخشانە دەست لەپۆستی سەرۆكایەتی بكێشێتەوە. لە بەرورای ١٤ / ١٠ / ١٩٩٩ دا لە تەمەنی ( ٧٧ ساڵیدا ) جۆلیۆس نیریری كۆچی دوایی كرد.

لەدوای دەست لەكار كێشانەوەی جۆلیۆس، عەلی حەسەن موینی بەهەڵبژاردن بوو بە سەرۆكی كۆمار. دوای ئەو لە ساڵی ١٩٩٥ بەنجامین ولیەم مەكابا، دوای ئەوەی لەهەڵبژاردنەكاندا سەركەوتنی بەدەست هێنا بوو بەسەرۆكی كۆمار، لە ساڵی ٢٠٠٠ بۆ پێنج ساڵی دیكەش لەهەڵبژاردندا سەركەوتنی بەدەست هێنایەوە.

جۆلیۆس نیریری نازناوی : موالیمۆی پێبەخشرابوو، كە بەزمانی سەواحیلی بەمانای مامۆستا دێت ، بەباوكی ئایدیای سۆسیالیستی لەسەر شێوازی ئەفریقی دادەنرێت.

لە بەرواری ٧ / ٨ / ١٩٩٨ هەریەك لە بالوێزخانەكانی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا لە دارولسەلام لەتەنزانیا ولەنیرۆبی پایتەختی كینیا تەقێنرانەوە ، بووە هۆی كوشتنی بەسەدان كەس. ویلایەتە یەكگرتووەكان كۆمەڵێ تیرۆریستی بەئەنجامدانی تەقینەوەكان تاوانبار كرد، بۆیە لە ٢٠ / ٨ / ١٩٩٨ دا مووشەك بارانی كارگەیەكی دەرمان دروستكردنی لە خەرتووم كرد و باسی لەوە دەكرد كە ئەو كارخانەیە ماددە كیمیاییەكان بەبەرهەم دێنێت، جگە لە بۆردومان كردنی سەربازگەكانی ئەفغانستان كە مەشق وراهێنانەكانی تیرۆریستانی تیا ئەنجام دەدرێت.

تەنزانیا بەوڵاتێكی كشتوكاڵی دادەنرێت، بۆیە كشتوكاڵی بەستوونی سەرەكی ئابووری ئەو وڵاتە دادەنرێت، وڵات پەیڕەوی سیستەمی سۆسیالیستی دەكات لە پەرەپێدانی ئابووری. كۆنترۆڵی تەواوی دەزگا پیشەسازییەكان و كێڵگە گەورەكانی كردووە. لەگەڵ ئەوەی كە حكومەت هەوڵی گەشە پێدانی پیشەسازی دەدات بەڵام زۆر كارگە

ـەرھەمھێنـەرەكان بچوكن و پێداویستییەكانیٚ ولاٚت ١٠٠٪ پـڕ ناكاتـەوە.بۆیـە دەكریٚ بلـێین تەنزانیا یەكێكە لەولاٚتە هەرە هەژارەكانی جیهان. گەشتوگوزار لەم دواییانەدا بەهۆی بوونی جیاكانی كلیمانجارۆ ودەشتە بەرفراوانەكانی كە برێكی زۆری ئاژەڵی كێوی لەخۆی گرتووە پشتیوانی تا ئاستێك لە باری ئابووری ئەو ولاٚتەدا دەكات.

سرودی نیشتیمانی : خوایە ئەفریقیا بپارێزە.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢,٥ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاٚتانی جیهاندا : ١٣٠ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٩٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاٚتانی جیهاندا : ١٩٠ .

تـەنزانیا بەپلـەی چـواردەیەم دێـت لـەنێو ولاٚتـانی جیهانـدا لـە بەرھـەمی چـا و بەپلـەی مەژدەیەم دێت لەبەرهەمی داروتەختە و پلەی بیستەم لە بەخێو كردنی مانگا.

لەم سالاٚنەی دواییدا تەنزانیا بوو بەیەكێك لەولاٚتە هـەرە گـەورەكانی ئـەفریقیا لـە بەرھـەمی ئاڵتوندا و بووە پلەی سێهەم لەنێو ولاٚتانی ئەفریقیادا لە بەرهـەمی ئاڵتوندا دوای باشووری ئەفریقیا و گانا. چاودێران واپێشبینی دەكەن كە ساڵی ٢٠٠٥ تـوانیبێتی بـایی یـەك ملیار دۆلار ئالتونی بازارەكانی دەرەوە فرۆشتبێت.

## تۆگۆ

**ناوی باو:** تۆگۆ

**ناوی فەرمی:** کۆماری تۆگۆ

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Togo

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری ، سەرۆکی کۆمار ، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٨١ ئەندام )

**رووبەر :** ٢١,٩٢٥ میل دووجا ، ٥٦,٧٨٥ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤,٧٣٦,٠٠٠ کەس ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٨٣,٤ کەس/ کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش کەبەرەچەڵەک دەچنەوە سەر چەند کۆمەڵەیەکی نەژادی گرنگترینیان: ئیوی ئەدجا ، تیم کابری .

**ئاین:** چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆیی، مەسیح ( رۆمان کاسۆلیك ، پرۆتستانت ) ، موسڵمان.

**زمان:** فەرەنسی ، ئیوی ( زمانێکی ناوخۆیە )

**پایتەخت:** لومی.

**شارە سەرەکییەکان:** سۆکۆدی ، بالیمی کارا ، ئەتامبی . تشبا .

**دراو:** فرانك .

**ئاووهەوا:** گەرم وشێدارە ، نێوەندی ساڵانەی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی ، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەباکووری وڵات ١٠٠ سم  ولەهاویندا دەبارێت ، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لە باشووردا ١٨٠ سم ولەدوو وەرزدا دەبارێت .

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** کاکاو ، منیهۆت ، قاوە ، لۆکە . گەنمە شامی ، لاستیك ، هەرزن ، ناوکی زەیتی دارخورما ، راوەماسی .

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ ، پاڵاوتنی نەوت . دروست کراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** فۆسفات .

**تێڕوانینێکی گشتی :**

تۆگۆ وڵاتێکە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەفریقیا، بۆرکینا فاسۆ دەکەوێتە باکووری ، بەنین دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ، کەنداوی گینیا دەکەوێتە باشووری ، گانا دەکەوێتە رۆژئاوای ،

ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانتایی ٩ بەرەو باکوور.

زنجیرە چیای تۆگۆ لەباشووری ڕۆژئاوای ولاتەوە تا باکووری ڕۆژهەلاتی درێژ دەبنەوە وزۆربەی ڕۆژئاوای ولاتیش دادەپۆشێ، لوتکەی بلومان بەرزترین لوتکەی چیای ناوبراوە و بەرزییەکەشی ٩٨٦ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزە. بەرەو ڕۆژهەلات وباشووری چیاکانی تۆگۆ بانێکی بەرەو کەنارێکی نزمی تێدەکەوێت وخەڵکێکی زۆر لێی نیشتەجێ بوون و چەند دارستان و کانی وزەلکاوێکیشی تیا بەدی دەکرێت. بەلام زەوییەکانی باکووری چیاکان بەگژوگیایەکی زۆر داپۆشراوە وبەرەو بۆرکینا فاسۆ لێژ دەبنەوە خەڵکێکی کەم نیشتەجێی بوون.

بازرگانە پۆرتۆگالیەکان لە کۆتاییەکانی سەدەی پانزدەیەمدا گەیشتونەتە کەناری ئەو ناوچەیە. لەسەدەکانی حەڤدەیەم وهەژدەیەمدا بازرگانە ئەورووپیەکانی چەندین هێرشیان کردۆتە سەر ئەو ناوچەیە ودواتر تۆگۆ بە کەناری کۆیلەکان ناسراوە. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا ئەڵمان و تیمە مژدەبەخشەکان گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە، لەساڵی ١٨٨٤ دا ئەڵمانیا هەڵساوە بە بنیات نانی پارێزراوەیەکی بچوك لەسەر کەنارەکەی، لەساڵی ١٨٨٩ خستویەتییە سەر داگیرکراوەکانی. دوای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانیی یەکەم ١٩١٤ بەریتانیا و فەرەنسا تۆگۆی ئەڵمانیان داگیر کردووە.لەساڵی ١٩١٩ دا بەریتانیا دەسەلاتی خۆی کێشا بەسەر سێ بەشی ڕۆژئاوای تۆگۆی ئەڵمانی و فەرەنساش بەسەر ناوچەکانی دیکەدا. لەساڵی ١٩٢٢ هەرێمی تۆگۆی بەریتانی چۆتە سەر ولاتی گانای سەربەخۆ. لە ساڵی ١٩٥٦ فەرەنسا هەڵسا بە دامەزراندنی کۆماری تۆگۆی فەرەنسی لەچوارچێوە یەکێتی فەرەنسیدا وئۆتۆنۆمییەکی ناوخۆشی پێبەخشی.لە ٢٧ / ٤ / ١٩٦٠ دا هەرێمی تۆگۆی فەرەنسی سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بوو وناوی کۆماری تۆگۆی لێنرا و لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. ولات سالانە لە ڕۆژی ٢٧ / ٤ جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن.

یەکەم سەرۆکی ولات دوای سەربەخۆیی سیلڤانۆس ئۆلیمبیۆ بوو کە لەساڵی ١٩٦٣ دا کوژرا لەکاتی کودەتایەکی سەربازیدا و جرنتزکی دەسەلاتی گرتە دەست تا لەساڵی ١٩٦٧ دا کودەتایەکی سەربازی بەسەر ئەویشدا لەلایەن جناسینجەر ئیادیما بەئەنجام گەیەنرا وجیناسینجەر دەسەلاتی گرتە دەست. لەگەڵ ئەوەی کە ئیادیما جیناسینجەر لەدەسەلاتدا بەهۆی چەندین هەڵبژاردنەوە مایەوە، بەلام چەند جارێك هەولی کودەتا و ململانێی سیاسی ناوچەکەی گرتۆتەوە وبەخۆیەوە چەندین برینندار وکوژراوی لێ بۆتەوە جگە لەزیان

وزەرەزێکی زۆر بەدەزگا حکومییەکان وچەند وڵاتێك بۆ چارەسەر کردنی کێشە وململانێکانی ئەو وڵاتە بەشدارییان کردووە، ئەمەش پاڵی ناوە بە یەکێتی ئەوروپییەوە کە دەستی یارمەتییەکانی بۆ تۆگۆ راگرێ لە دوای ۱۹۹۳ بەدواوە وتاوانبار کردنی حکومەت بە ساختە کردن لە هەڵبژاردنەکاندا. لە ١٤ / ٢ / ٢٠٠٢ دا تۆگۆ ئاهەنگی یادی ۲٥ ساڵەی سەرۆکایەتی ئیادیما یان گێڕا، شایەنی باسە ماوەی سەرۆکایەتی ئیادیما بە زیاترین ماوەی سەرۆکایەتی دادەنرێ لەنێو وڵاتانی ئەفریقیا ( جگە لە سەرۆکی جابوونیش) .

دەڵێن ناوی وڵات لەناوی یەکێ لە گوندەکانیەوە تۆگۆ فیل هاتووە کە ناوی دەگەڕێتەوە بۆ ناوی یەکێ لە راوچییەکانی ئەو گوندە. هەروەها دەڵێن ناوی تۆگۆ بەزمانی ئیوی، کە بەبلاوترین زمانە ناوخۆکانی ئەو وڵاتەیە، بەمانای وڵاتی پشت دەریا دێت بەو پێیەی کە وڵات لەدەریاوە دوورە.

ئابووری تۆگۆ کشتوکاڵیە، بەڵام کەمی زەوییە بەپیتەکان داهاتی جوتیارەکانی لە ئاستێکی نزمدا راگرتووە.

سروودی نیشتیمانی : خاکی باوباپیران.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١,٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٤٦

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢٢٠ دۆلاری ئەمریکی .

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٦٤ .

## توڤالو

ناوی باو: توڤالو

ناوی فەرمی: توڤالو

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی: Tuvalu

سیستەمی حوکمڕانی: پادشایی دەستووری ، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیایە، ـادوەرێکی گشتی نوێنەرایەتی دەکات ، سەرۆکی ئەنجومەنی گشتی.

دەستەی یاسا دانان: پەرلەمان ( ١٢ ئەندام )

رووبەر : ٩,٤ میل دووجا ، ٢٤,٤ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ١٠,٣٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٤٠١,٩ کەس / کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: توڤالی کە بەرەچەڵەك لە بولینیزییەکانن ، تێکەڵ ، ئەورووپی.

ئاین: مەسیحی.

زمان: ئینگلیزی ، بولینیزی

پایتەخت: فونافوتی

شارە سەرەکییەکان: فونکافالی

دراو: دۆلاری ئۆستورالی

ئاوو هەوا: خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدییە، ڕێژەی ساڵانەی باران لە ـورگە باشوورییەکان ٣٥٠ سم ، بەڵام لەدورگەکانی باکوور بارانیان کەمترە.

بەرهەمە کشتوکاڵییەکان: گوێزی هیندی، مۆز ، ڕاوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: نییەتی

سامانی کانزایی: نییەتی

تێڕوانینێکی گشتی :

توڤالو کۆمەڵە دورگە وڵاتێکە، دەکەوێتە باشووری زەریای هێمن ونزیکەی ٢٥٠٠ کم لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئۆستورالیاوە دوورە. توڤالو لەنۆ دورگە پێك دێت بواری دەریاییەکەیان نزیکەی ٥٠٠,٠٠٠ کم٢ دەبێت وزۆربەیان شێوەی بازنەییان هەیە و چوار دەوری چەند ـەریاچەیەکیان گرتووە. تەنها هەشت دورگەیان نیشتەجێن، وشەی توڤالو بەزمانی خەڵکی وڵات بەمانای هەشت پێکەوە دێت، لەگەڵ ئەوەی کە دورگەی نۆیەمیان ( نیولاکیتا ) لە سێ سەدە لەمەو بەرەوە نیشتەجێ کراوە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٧٨ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانتایی ٨ بەرەو باشوور.

توڤــالو زوو زوو دووچــاری مەترســییە سروشــتییەکان دەبێتــەوە وەك گەردەلوولــە کەمەرییەکان دەبێت و ڕێـژەی ئـاوی دەریاکـانی بەرز دەبێتـەوە بەهۆی توانـەوەی سـەهۆڵی هـەردوو جەمسـەرەکانی گـۆی زەوی بـەهۆی بەرزبوونـەوەی پلـەکانی گـەرما لـەم دواییانـەدا، ئەمەش ڕێژەی ئاوی زەریا ودەریاکان بەرز دەکاتەوە.

دانیشتوانی توڤـالو لـە دورگـەکانی تونگـا وسـاموا بـەرەو ئـەم دورگانـە بـەڕێ کـەوتوون، دۆزەرەوەی ئیسپانی ئەلفاردۆ مەندانۆ لەساڵی ١٥٦٨ دا بەیەکەم ئەوروپی دادەنرێت هەندێ لـەو دورگانــەی بــەدی کردبێــت. لــە ســاڵی ١٧٦٤ دا دەریــاوانی بــەریتانی جــۆن بــایرۆن دۆزیویەتییەوە. تـا سـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەیـەم دورگـەکان نەناسـراوبوون بەتـەواوەتی، ئەوروپیـەکان پێیـان دەوت دورگـەکانی ئـەلیس. لەسـاڵی ١٨٩٢ بـەریتانیا داگـیری کـردووە وخستویەتییە سەر خاوەنداریەکانی خۆی. لە ساڵی ١٩١٦ دا بەریتانیا لەگەڵ دورگەکانی جبلیرتـی بـاکوری توڤـالو کرنـی بەیـەك نـاوی داگیرکـراوەی کۆمەڵـەی دورگـەی جـبلیرت و ئەلیسی لێنـان. لـە سـاڵی ١٩٧٥ هـەردوو کۆمەڵـە دورگەکـە لەیـەك جیاکرانـەوە و نـاوی دورگـەکانی ئـەلیس کرایـەوە بـە توڤـالو . لـە ١ / ١٠ / ١٩٧٨ دا سـەربەخۆیی بـە توڤـالو لەچوارچێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی. لە ساڵی ٢٠٠٠ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان و بووە ١٨٩ هەمین ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

توڤالو خاوەنی ئابوورییەکی لاوازە. ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی زەوییەکی زۆری بەپیت، جگـە لـە نـەبوونی سەرچـاوە سروشـتییەکان وپیـشە سـازیش، وڵات پـشتی بەیارمەتییـە دەرەکییەکان بەستووە بەتایبەتی نیوزیلاند ونوستورالیا وبەریتانیا. زۆربەی لاوانی وڵات کار لە سەر پشتی کەشتیەکاندا دەکەن لەبەر بەربڵاوی بێکاریی لەوڵاتەکەیاندا.

سروودی نیشتیمانی : توڤالو لەپێناوی خوادا .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣ ملیۆن دۆلار.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٩١ .

تێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣٢٦ دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٦٢ .

دادوەری گشتی لە ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە : توالیبی لاوتی و دوای ئەویش : تۆماس بوابیا بووە.

سـەرۆکی وەزیـران لەسـاڵی ١٩٩٣ : کاموتـا لاتاسـی و دوای ئـەو ئیوناتانـا کـە لـەناکاو لەبەرواری ٨ / ١٢ / ٢٠٠٠ دا کۆچی دوایی کرد.

## تۆنگا

**ناوی باو:** تۆنگا

**ناوی فەرمی:** شانشینی تۆنگا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Tonga

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، پاشا خۆی سەرۆکی حکومەتە وئەنجومەنی ڕاوێژکاری یارمەتی دەدەن.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی یاسا دانان ( ٣١ ئەندام )

**ڕووبەر:** ٢٨٩,٥ میل دووجا ، ٧٤٩,٩ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠١,٣٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٤٠,٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تۆنگی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك ، پرۆتستانت )

**زمان:** ئینگلیزی ، تۆنگی.

**پایتەخت:** نۆکوالوفا

**شارە سەرەکییەکان:** موا ، نیافۆ ، هافیلۆلۆتۆ

**دراو:** باناجا

**ئاوو هەوا:** مام ناوەند وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان ٢١ بۆ ٢٣ پلەی سەدی دەبێت ، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٥٠ – ٢٥٠ سم دەبێت .

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گوێزی هیندی، گەنمەشامی، مۆز ، ترشەڵۆکییەکان، سێوی بن ئەرز، بەراز ، پەلەوەر .

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** نییەتی.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

تۆنگا کۆمەڵە دورگە وڵاتێکە دەکەوێتەباشووری زەریای هێمن، یەکێکە لە کۆمەڵە دورگەکانی پۆلینیزیا، ونزیکەی ٣٠٠٠ کم لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سیدنی ئۆستورالیاوە دوورە، فیجی دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوا و نیوزیلاند دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوا.تۆنگا لە نزیکەی ١٥٠ دورگە پێك هاتووە، هەندێکی گڕکانییە. دورگەی تۆنگا گەورەترین دورگەیەتی

و زیاتر لەنیوەی دانیشتوانی ئەو وڵاتەی تیا دەژی و پایتەختیشی تێدەكەوێت. ناوەڕاستی دورگەكاندا دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ۱۷۵ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانتایی ۲۰ بەرەو باشوور.

بۆلینیزییەكان یەكەم دانیشتوانی تۆنگا بوون، دەریاوانە هۆڵەندییەكان لەساڵی ۱٦۱٦ سەردانیان كردووە، هەروەها لەساڵی ۱٦٤۳ دەریاوانی هۆڵەندی ئیبل تاسمان سەردانی هەر یەك لەدورگەكانی تۆنگا و دورگە باشوورییەكانی كردووە. لەساڵی ۱۷۷۳ دا گەریدەی بەریتانی جیمس كوك سەردانی كردووە و ناوی دورگەی هاوڕێ لێناوە. لەساڵی ۱۷۸۹ دەریاوانی بەریتانی ولیەم بلای لەگەڵ ۱۸ دەریاوانی تیمی كەشتی باونتی لەكەنارەكانی دابەزیوە پاش ئەوەی چەتەكانی دەریا هێرشیان كردۆتە سەریان. لەساڵی ۱۸٦۲ شانشینێكی دەستووری لێ دامەزرێنراوە وبەسەركردایەتی شا جۆرج تۆبۆی یەكەم. لەساڵی ۱۹۰۰ دا بەریتانییەكان خستویانەتە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، لەبەرواری ٤ / ٦ / ۱۹۷۰ تۆنگا سەربەخۆیی خۆی دەستگیر بووە لەچوارچێوەی كۆمۆنوڵتی بەریتانی. لە ۲ / ۸ / ۱۹۹۹ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

لەدوای سەربەخۆییەوە تۆنگا بەهۆی یارمەتییەكانی بەریتانیاوە هەوڵی گەشەپێدانی باری ئابووری داوە لەرێی كشتوكاڵی وبنیات نانی فرۆكەخانە وهاندانی بەرهەمهێنەرە بیانییەكان، بۆیە حكومەت لەهەوڵی بەردەمدایە بۆ دابین كردنی هەلی كار بۆ تاكەكانی.

تێكرای داهاتی نەتەوەیی: ۱٦۰ ملیۆن دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ۱۸۵

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۱,٦٤۰ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۹۱ .

## تونس

**ناوی باو:** تونس

**ناوی فەرمی:** کۆماری تونس

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Tunisia

**سیستەمی حوکمڕانی:** سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٦٣ ئەندام ) ، ئەنجومەنی راوێژکاران.

**رووبەر:** ٦٣,٢٧٨ میل دووجا، ١٦٤,١٥٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٩,٢١٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥٦,٢ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، بەربەر، فەرەنسی ، ئیتاڵی.

**ئاین:** موسڵمان ( ٩٦٪ ) ، مەسیح، جوولەکە.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** تونس

**شارە سەرەکییەکان:** سەفاقس، سووسە، قەیرەوان، بنزیرت، قابس، حەمامات.

**دراو:** دیناری تونسی.

**ئاووهەوا:** باکووری وڵات مام ناوەندە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ١١ پلەی سەدییە ولەهاویندا ٣٠ پلەی سەدییە وبڕی ساڵانەی باران ٤٠ – ١٥٣ سم دەبێت. باشووری وڵات نیمچە بیابانییە ونێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ٢ پلەی سەدی ولەهاویندا ٤٠ پلەی سەدییە وبڕی ساڵانەی باران ٣٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** ترشەڵۆکییەکان، خورما، زەیتون، گەنم، جۆ ، راوەماسی، بەخێوکردنی مەڕوماڵات.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** فۆسفات، ترشی فۆسفۆر، ئامێری کارەبایی، پۆشاك، فەرش، بەرهەمەکانی مس وخووری، چیمەنتۆ، ماسی قتوو.

**سامانی کانزایی:** فۆسفات، نەوت، گاز، قورقوشم. زنك

**تێڕوانینێکی گشتی :**

تونس وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە باکووری ئەفریقیا، یەکێکە لە پێنج وڵاتە گەورەکەی رۆژئاوای عەرەبی. دەریای سپی ناوەڕاست دەکەوێتە باکوور ورۆژهەڵاتی، لیبیا دەکەوێتە

باشووری رۆژهەڵاتی وجەزائیریش دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۱۰ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ۳٤ بەرەو رۆژهەڵات.

چیا باکوورییەکانی تونس دەکەونە باکووری ئەو وڵاتە ولەباشووری رۆژئاواوە تا باکووری رۆژهەڵات درێژدەبنەوە، بەرزترین لوتکەشی لەسەر چیای شەعانبیەو بەرزییەکەی دەگاتە ۱٥٤٤ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا وچیاکانیش بەدەشتە بەرفراوانەکانی سەر کەنارەکان کۆتاییان دێت. ناوەڕاستی وڵاتیش بریتیە لە دەشتێك بەرەو کەناری ناوخۆی وڵات بەرز دەبێتەوە وکۆتایی دێت. باشووری وڵاتیش بریتییە لەبانێکی بیابانی و بەرەو رۆژئاوا کۆتایی دێت.

لەسەدەی دەیەمی پ.ز دا فینیکییەکان گەیشتونەتە ئەو ناوچەیە وشارستانێتێکیان بەناوی قەرتاجەوە پێك هێناوە، شارستانێتی قەرتاجە چەندین شەڕ وپێکدادانی لەگەڵ رۆمانەکاندا دووچار بووە کە بەشەڕە بوونییەکان ناسراوە. ئەو شەڕانە تا سەدەی سێیەمی پ. ز ی خایاند وتەواوی هێزەکانی قرتاجی لە ۱٤٦ پ.ز لەناوچوو، ناوچەکە دوای تێك شکاندنی قەرتاج بووە سەنتەرێکی گرنگی رۆمانییەکان وئاینی مەسیحی. ئیسلامەکان لەساڵی ٦٤٧ ز / ۲۷ ك بەسەرۆکایەتی عەبدوالله کوڕی سەرح لەسەردەمی خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەفان چوونەتە ناوی وئاینی ئیسلامیان تیا راگەیاندووە. زنجیرەیەك سەرۆکی موسڵمانی بەخۆوە بینیوە تا لەساڵی ۱۷٥۲ ز دا کەوتۆتە دەست تورکە عوسمانییەکانەوە. لە ۲٤ / ٤ / ۱۸۸۱ دا فەرەنسا داگیری کردووە وعوسمانیەکانی کردۆتە دەرەوەی وڵات، شایەنی باسە لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسادا ماوەتەوە تا لە ۲۰ / ۳ / ۱۹٥٦ دا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بووە، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. جەژنی نیشتیمانیەکانیش ساڵانە لە رۆژی ۲۰ / ۳ لەهەموو ساڵێکدا لە تونس دەگێڕدرێت.

لە بەرورای ۲٥ / ۷ / ۱۹٥۷ سیستەمی پادشایی رەتکرایەوە و کۆماری راگەیەنرا، حەبیب بورقیبە سەرۆکایەتی کۆماری گرتە دەست. بورقیبە لەدەسەڵات مایەوە تا بەرواری ۷ / ۱۱ / ۱۹۸۷ زین ئەلعابدین کوڕی عەلی پۆستی سەرۆکایەتی وڵاتی گرتە دەست دوای ئەوەی دەستەی پزیشکانی تونس رایانگەیاند کە بورقیبە ناتوانی لە پۆستی سەرۆکایەتیدا بمێنێتەوە بەهۆی بەساڵا چوونی، شایەنی باسە لەوەو پێش بورقیبە وەك سەرۆکی هەتا هەتایی تونس دیاری کرابوو و لە ٦ / ٤ / ۲۰۰۰ دا کۆچی دوایی کرد لەتەمەنی ۹۷ ساڵیدا.

لە بەرواری ۲٤ / ۱۰ / ۱۹۹۹ لەتونسدا یەکەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی بەڕێوەچوو، زین ئەلعابدین بەزۆرینەی دەنگ سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبۆ ماوەی پێنج ساڵ وەك سەرۆکی کۆمار دیاری کرایەوە. لە ۱۲ / ۲ / ۲۰۰۲ دا حکومەتی تونس رایگەیاند کە کە بەم زووانە

دەنگدانێك ئەنجام دەدرێت بۆ راستکردنەوەی دەستوور تاکو رێگا بە زێن ئەلعابدین بدرێت بۆ ماوەیەکی نویٚ پۆستی سەرۆکایەتی بگرێتە دەست.

لە ٢٦ / ٥ / ٢٠٠٢ دا تونسییەکان دەنگیاندا بۆ راست کردنەوەی بەندەکانی دەستوور لەولاتەکەیاندا، ئەمەش بەرای ئەوان ئازادی تاك زیاتر سەقاگیر دەکات وکار دەکات بۆ پتەو کردنی بنەماکانی کۆمار لەدوارۆژدا. هەروەها بریاریان دا کە سەرۆك بۆی هەبێت بۆ دوو جار خۆی هەلبژێرێتەوە ، ئەمە جگە لەوەی کە تەمەنی پالێوراویان بۆ پۆستی سەرۆکایەتی لە ٧٥ سالیەوە کرد بە ٤٠ سال.

رۆمانەکان ناوچەکەیان ناو نابوو ئەفریقیا، هەروەها دەلێن تونسی ئێستا شاری ترشیس بووە کە لەکتێبی پیرۆزدا ناوی هاتووە، یان شاری تینسە کە ئێستا یەکێکە لەشارۆچکە بچوکەکانی دەریاچەی تونس.

تونس لەسەرەتای سەربەخۆییەوە هەولی گەشەدان وپەرەسەندنی ئابووری داوە لەرێی بایەخ دانی بە پیشەسازییە سەرەکییەکان و رەخساندنی هەلی کار بۆ تاکەکانی، جگە لەوەی کە چالاکی گەشتوگوزار رۆلێکی بەرچاویان هەیە لە پتەوکردنی داهاتی نەتەوەیی ئەو ولاتە چونکە سالانە نزیکەی پێنج ملیۆن گەشتیار رووی تێدەکەن.

لەسالی ١٩٩٩ دا کێلگەیەکی نەوت لەتونس دۆزرایەوە وناوی ( کێلگەی ٧ نۆڤەمبەری ) لینراوە، کێلگەکە دەکەوێتە سەر کەناری تونس لەسەر سنوورەکانی لیبیا و واچاوەروان دەکریٚ کە بەرهەمی ئەو کێلگەیە زیاتر بێت لەگەورەترین کێلگەکانی تونس کە کێلگەی برمەیە، بەرهەمی نەوتی تونس لە١٩٩٨ لە کێلگەی برمە نزیکەی ٦,٥ ملیۆن تۆن دەبوو.

سروودی نیشتیمانی : ئەمران

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ١٥,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٦٦ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١,٨٠٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٨٧ .

تونس بەپلەی پێنجەم دێت لەناو هەموو ولاتانی جیهاندا لە بەرهەمی زەیتون. هەروەها بەپلەی پێنجەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی فۆسفات کە ئەمیش ئەو ماددەیەیە کە بەپلەی یەکەم دێت لەبەرهەمە ناوخۆییەکانی تونس. تونس ئێستا دە کانی فۆسفاتی بەدەستەوەیە هەر دەیان لەنێو باشووری ولاتدان ولەوە پێش بەشێوەکی خاو دەیناردنە دەرەوەی ولات بەلام لەدوای هەشتاکانەوە تونس هەستاوە بەبنیات نانی زنجیرەیەك کارگە بۆ پاکردنەوەی فۆسفات وسوود لە لێوەرگیراوەکانی. مێژووی دۆزینەوەی فۆسفات لەتونسدا

دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٨٥، بۆیە دەست کرا بە سازدانی هێڵێکی ئاسن بۆ بەندەری شاری سەفاقس کە سەرچاوەی ئەو ماددەیەیە.

لە بەرورای ٢ – ١٥ / ٩ / ٢٠٠١ خولی چواردەیەمی یارییەکانی دەریای سپی ناوەڕاست ونزیکەی ٣٥٠٠ وەرزشەوان لە ٣٣ دەوڵەتەوە بەشداریان تیاکردووە.

*　　　*　　　*

لە ٢٠٠٠ بەدواوە زمانی عەرەبی

بەزمانی فەرمی تونس دادەنرێت

لە ١ / ١ / ٢٠٠٠ دا بڕیار درا کەزمانی عەرەبی تاکە زمانی ڕێپێدراو بێت لەنێو دەزگا و فەرمانگە حکومیەکانی تونس دوای ئەوەی بڕیارێکی حکومی بە پەیڕەونەکردنی زمانی فەرەنسی لەوڵاتدا دەرچووە.

سەرۆك وەزیران لەیاداشتنامەیەکدا کە لەتەواوی گۆڤار ورۆژنامەکاندا بڵاو کرایەوە لە ٣٠ / ١٠ / ١٩٩٩ داوای لەتەواوی فەرمانگە ودەزگا حکومەییەکانی تونس کردبوو کە چیتر پێویستە زمانی فەرەنسی بەکارنەهێنن و زمانی عەرەبی بەفەرمی رابگەیەنن.

شایەنی باسە پرۆژەی ئەم بڕیارە دەگەڕێتەوە بۆ دەرکراوێکی کۆماری ساڵی ١٩٩٣ بەڵام ئەوکات بڕیارەکە لەبیر برایەوە وکاری پێنەکرا.

## گابۆن

ناوی باو: گابۆن

ناوی فەرمی: کۆماری گابۆن

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Gabonese Republic

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری ، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران .

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٠ ئەندام ) .

رووبەر : ١٠٣,٣٤٧ میل دووجا ، ٢٦٧,٦٦٧ کم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ١,١٧٣,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٤,٥ کەس/کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفەریقی رەش کە دەچنەوە سەر چەند کۆمەڵەیەکی نەژادی گرنگترینیان : فانج ، مۆنجی

ئاین: مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك ، پرۆتستانت ) ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، موسڵمان.

زمان: فەڕەنسی ، چەند زمانێکی ناوخۆ.

پایتەخت: لیبەرفیل

شارە سەرەکییەکان: بۆرت جنتیل، ماسۆکۆ، مواندا.

دراو: فرانك.

ئاوو هەوا: بەدرێژایی ساڵ گەرم وشێدارە، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٥٠ سم دەبێت، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٦ پلەی سەدییە.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز ، کاکاو ، منیهۆت، قاوە، دارستان، راوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروست کراوەکانی خۆراك، چیمەنتۆ، رۆن.

سامانی کانزایی: ئاڵتون ، ئاسن، مەنگەنیز، نەوت، یۆرانیۆم.

تێڕوانینێکی گشتی :

گابۆن وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە سەر کەناری رۆژئاوای کیشوەری ئەفریقیا. کامیرۆن دەکەوێتە باکووری ، کۆنگۆ دەکەوێتە رۆژهەڵات وباشووری ، زەریای ئەتڵەسیش دەکەوێتە رۆژئاوای،گینیاش دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٢ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١ بەرەو پاشوور.

دارستانەکان زۆربەی خاکی گابۆن دادەپۆشیْ لەبەر ئەوە دەکەوێتە سەر هێڵی کەمەرەیی، بەدرێژایی ٨٠٠ کم زەلکاوەکانیش لەسەر شریتی کەنارەکانی بڵاو دەبنەوە، بانێکی زۆریش لە باکوور ورۆژهەڵاتی وڵات ولەباشووردا لەشێوەی زنجیرە چیایەك بڵاوبونەتەوە، تۆڕی

روباری ئۆگۆی زۆربەی خاكی گابۆنی بڕیوە.

دەریاوانە پۆرتۆگالیەكان یەكەم ئەوروپی بوون بگەنە گابۆن و لەحەفتاكانی سەدەی پانزەیەمی زاینیی لەسەر كەنارەكانی دابەزیون وبازرگانی كۆیلەكانیان كردووە. لەسالی ١٨٣٩ دا فەرەنسییەكان بنكەیەكی بازرگانی دەریایی نزیك لەناوچەكانی ئێستا لیبرفیلی پایتەختی ئێستا پێك هێناوە. لەسالی ١٨٨٣ دا لیبرفیل بۆتە پایتەختی داگیركراوەی گابۆنی فەرەنسی. لەسالی ١٩١٠ گابۆن بۆتە ناوچەیەكی ژێر دەسەلاتی یەكێتی ناوچە كەمەرییەكانی فەرەنسا.

دوای جەنگی جیهانیی دووەم بزوتنەوە ئازادی خوازەكان لەگابۆن لەپێناوی سەربەخۆیی ولاتەكەیان سەریان هەلداوە ، تا لەسالی ١٩٥٧ دا ماق ئۆتۆنۆمی ناوخۆی پیٚ بەخشراوە. لە ١٧ / ٨ / ١٩٦٠ دا گابۆن سەربەخۆیی تەواوی پیٚ بەخشراوە ولەهەمان سالدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان، سالانە لە ١٧ / ٨ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن.

یەكەم سەرۆكی ولات دوای سەربەخۆیی : لیۆن مبا بوو كە تا بەرواری ٢٨ / ١١ / ١٩٦٧ كۆچی دوایی كرد لەدەسەلاتدا مایەوە، دوای ئەو برنارد ئەلبرت بۆنگۆی جێگری بووە سەرۆك وناوی خۆی گۆڕی بە عومەر بۆنگۆ وبوو بە ئیسلام ، لە هەر یەك لەم سالانە بەسەرۆكی ولات هەلبژێردراوەتەوە: ١٩٧٣ و ١٩٧٩ و ١٩٨٦ و ١٩٩٠ و ١٩٩٨ بەمەش بەیەكێك لە سەرۆكە ئەفەریقییەكان دادەنرێت كە زیاترین ماوە لەدەسەلاتدا مابێتە ( وەك سەرۆكی تۆگۆ ) .

گابۆن بەهۆی سەرچاوە سروشتیەكانیەوە بەولاتێكی دەولەمەند دادەنرێت، لەبەرهەمی باشترین جۆری تەختە ودارا بەناوبانگە و سامانی داروتەختە بەسەرچاوەی سەرەكی ئەو ولاتە دادەنرێت، جگە لەوەی كە بەرهەمی زۆری ئاسن و مەنگەنیزیشی هەیە.

ناوی گابۆن لەوشەیەكی پۆرتۆگالییەوە هاتووە : جاباو، كە بەمانای پالتۆیەكی درێژ دێت، ئەویش ئەو ناوەیە كە دەریاوانە پۆرتۆگالیەكان بە ڕێڕگەی روباری كۆمۆ ناویان ناوە چونكە شێوەی لە پالتۆ دەچێت.

سروودی نیشتیمانی: ئاشتی

تێكرای داهاتی نەتەوەیی : ٣,٧ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١١٢ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٣,٥٥٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٥٤ .

## جامایکا

ناوی باو: جامایکا

ناوی فەرمی: جامایکا

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی: Jamaica

سیستەمی حوکمڕانی: پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێتی دووەمە ودادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٢١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٠ ئەندام )

ڕووبەر : ٤,٢٤٤ میل دووجا، ١٠,٩٩١ کم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ٢,٥٣٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٢٣٠,٧ کەس/کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی ڕەش، تێکەڵ، هیندی ڕۆژهەڵات.

ئاین: مەسیحی ( پرۆتستانت ، ڕۆمان کاسۆلیك ) ، بێباوەڕ .

زمان: ئینگلیزی.

پایتەخت: کینگستۆن.

شارە سەرەکییەکان: سپانیش تاون، پۆرت مۆرانت، پۆرت ئەنتۆنیۆ، مای پێن، مۆنتیگۆ -ی

دراو: دۆلاری جامایکا

ئاووهەوا: خولگەییە شەماڵی دەریا فێنکی دەکاتەوە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ – ٣٠ پلەی سەدیی، باران بەدرێژایی ساڵ دەبارێت وبڕی ٧٥ سم دەبێت لەناوچە کەنارییەکان و ٥٠٠ سم لە چیاکاندا دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵییەکان: مۆز، کاکاو، ترشەڵۆکییەکان، گوێزی هیندی، قاوە ، قامیشی شەکر.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئەلەمنیۆم، چیمەنتۆ، دروست کراوە کیمیاییەکان، پۆشاك، ئامێر، لەنەوت وەرگیراوەکان، شەکر.

سامانی کانزایی: بۆکسیت، گەچ، سیلیکات.

تێڕوانینێکی گشتی :

جامایکا وڵاتە دورگەیەکە ویەکێکە لەدورگە ڕۆژئاواییەکانی هیند لەدەریای کاریبی. بەپلەی سێیەم دێت لەرووی رووبەرەوە دوای کوبا کە نزیکەی ١٥٠ کم لە باکوورییەوە دوورە و هیسپانیۆلا کە نزیکەی ١٦٠ کم لە لای ڕۆژهەڵاتیەوە دوورە کە لەگەڵ هەر یەك لە دۆمنیکان وهایتیدا سنووردراە ونزیکەی ٧٧٠ کم لەباشووری فلۆریدای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاوە دوورە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧٧

بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٨/١٠ بەرەو باکوور.

٥/٤ ی دورگەی جامایکا بەچیاکان داپۆشراوە ودەشتەکانیش بەدرێژایی کەنارەکان درێژ دەبنەوە.

هیندە ئۆراکییەکان لەجامایکادا دەژیان کاتێ کریسوڤەر کۆلۆمبۆس گەیشتۆتە ئەوێ لە ١٤٩٤ دا وئیسپانیای کردۆتە خاوەنی دورگەکە وئیسپانییەکان هیندە ئۆراکییەکانیان بەکۆیلە گرت،دواتر ئەفەریقییە رەشەکانیان هێنایە دورگەکە، بەلآم نەخۆشی وماندووی زۆربەی هیندە ئۆراکییەکانیان لەناو برد. ئیسپانییەکان دورگەکەیان کردە بنکەیەکی ئازوقە هێنان وبردن وهیچ گەشەکردنێکیان پێنەیا ولێشی نیشتەجێ نەبوون. لەساڵی ١٦٥٥ دا بەریتانیەکان داگیریان کردوو کردیانە سەنتەرێکی بازرگانی کردن بەکۆیلەکانەوە، دورگەکەیان کردە کێڵگەیەکی گەورەی قامیشی شەکر تاکو پێی دەوڵەمەند بن وسامانەکانیانی پێ زیاد بکەن. تا ئاست گەیشتە ئەوەی کەسێك لەبەریتانییەکان دەوڵەمەند بوایە پێیان دەوت هێندەی کێڵگەکانی دورگەی هیندی رۆژئاوا دەوڵەمەندە. لەساڵی ١٨٦٦ دا بووە داگیرکراوەیەك لەداگیرکراوەکانی تاجی بەریتانی. لە ٦ / ٨ / ١٩٦٢ لەچوارچێوەی کۆمۆنۆلتی بەریتانی سەربەخۆیی پێبەخشراوە ولەهەمان ساڵدا پەیوەند کردووە بەنەتەوە یەککرتوەکانەوە، جەژنی نیشتیمانی لەرۆژی ٦ / ٨ ی هەموو ساڵێك لەولآتدا دەگێردرێت.

دادوەری گشتی : هوارد فیلکس کوك. جامایکا ناوی رەسەنی ولآتەکەیە، یامایکا وشەیەکی هیندییە بەمانای خاکی دارستان وئاوەکان دێت وبەدرێژایی رۆژگار ئاوەکە بۆتە جامایکا.

جامایکا ئەمرۆ رووبەرووی چەندین کێشەی بێکاری وهەژاری وهەڵئاوسانی نیشتەجێ بوون بۆتەوە، زۆربەی جامایکاییەکان ناڕەزایی لەم رەوشە دەردەبڕن، ئەمەش بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی دیاردەکانی دزی وکوشتن. نزیکەی چارەکی دانیشتوان سەرقاڵی چالاکییە کشتوکاڵیەکانن لەگەڵ ئەوەی بەرهەمەکانیان هێندەی پێداویستی دانیشتوانی ولآتەکەیان نییە بۆیە زۆربەی پێداویستییەکانی لەولآتانی دراوسێوە دەهێنێ.

جامایکا بە مۆزیکێکی میللی کە پێی دەوترێ ریجا وراجا زۆر بەناوبانگە وئەمەش بۆتە هۆی راکێش کردنی ژمارەیەکی زۆری گەشتیاران کە جگە لەگوێ گرتنی ئاوازە خۆشەکان بۆ جوانی سروشتی ئەو ولآتە دێن.

سروودی نیشتیمانی: جامایکا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا: ١١٤ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١,٤٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا : ٩٦ .

## گامبیا

**ناوی باو: گامبیا**

**ناوی فەرمی: کۆماری گامبیا**

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of The Gambia

**سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.**

**دەستەی یاسادانان: پەرلەمان ( ١٥٠ ئەندام )**

**رووبەر : ٤,١٢٧ میل دووجا، ١٠,٦٨٩ کم٢**

**ژمارەی دانیشتوان: ١,٢٤٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )**

**چڕی دانیشتوان: ١٤٤,٩ کەس/کم٢**

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفەریقی رەش کەبەرەچەڵەك دەچنەوە سەر چەند کۆمەڵەیەکی نەژادی گرنگترینیان : مالینك و فولانی .**

**ئاین: موسڵمان ٩٥٪ ، مەسیحی ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.**

**زمان: ئەنگلیزی.**

**پایتەخت: بانگول**

**شارە سەرەکییەکان: سیریکۆندا، بریکاما.**

**دراو: دلاسی**

**ئاوو هەوا: هاوینی گەرم ووشکە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٤٣ پلەی سەدی لەهاویندا، زستانی مام ناوەند وپلەکانی گەرما دەچنە ١٦ پلەی سەدی . رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٠ سم لەکەنارەکان وبڕێکی کەمتر لە ناوخۆی وڵاتدا دەبارێت.**

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز، منیهۆت، گەنمەشامی، پێستەی ئاژەڵان، مەڕو ماڵات، مانگۆ، ترشەلۆکییەکان، خورما، پاقلە، سەوزە، برنج.**

**بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروستکراوە خۆراکییەکان.**

**سامانی کانزایی: نییەتی.**

**تێڕوانینێکی گشتی :**

**گامبیا وڵاتێکی ئیسلامیە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەفریقیا لەسەر زەریای ئەتڵەسی.، لەسەر شێوەی شریتێکی تەسك لەسەر ئەمبەراوبەری روباری جامایکا، کەلە سەنگالەوە هەڵدەقوڵێ وناوی وڵاتەکەشی لێوە هاتووە، چوار دەوری وڵاتەکەی گرتووە جگە لەو بەشەی ئەبێت کە دەکەوێتە سەر زەریای ئەتڵەسی. یەکێری هێڵی درێژی ١٦ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٣/١٠ بەرەو باکوور بەناوەڕاستیدا تێدەپەڕێت.**

**لەسەدەی سیانزدەیەمەوە تا سەدەی پانزدەیەم گامبیا بەشێك بووە لەئیمپراتۆریەتی کۆنی**

مالی.لەسەدەی پانزدەیەمدا پۆرتۆگالیەکان چەند سەنتەرێکی بازرگانیان بەدرێژایی کەنارەکان پێك هێناوە. لەسەدەی شانزدەیەمدا ناوچەکە بۆتە سەنتەرێکی بازرگانی کردن بەکۆیلەکانەوە لەلایەن بەریتانی وپۆرتۆگالیەکانەوە لە ساڵی ١٦٦١ دا بەریتانیا داگیرکراوەیەکی لەدورگەی جیمس پێك هێناوە کە دەکەوێتە روباری گامبیا وهێندەی نەخایاند جەنگ لەنێوان فەرەنسا وبەریتانیا لەسەر داگیر کردنی روبارەکە هەڵگیرساوە.

لەساڵی ١٧٦٥ دا بەریتانیەکان داگیرکراوەیەکیان پێك هێناوە ناوی سنیگا مبیا یان لێناوە وهەر یەك لە گامبیا وسەنگالی لەخۆگرتووە. لەساڵی ١٧٨٣ دا بەریتانیەکان سەنگالیان خستە دەستی فەرەنساوە. لەساڵی ١٨٨٨ دا داگیرکراوەی گامبیا دامەزرێنراوە ولەساڵی ١٩٠٢ بەتەواوەتی کەوتۆتە دەست بەریتانیاوە.

لەساڵی ١٩٦٣ دا ماف ئۆتۆنۆمی ناوخۆ بە گامبیا بەخشرا، لە ١٨ / ٢ / ١٩٦٥ دا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بوو ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.لەبەرواری ٢٤ / ٤ / ١٩٧٠ دا گامبیا لەچوارچێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی بۆتە کۆمار، ساڵانە لە ١٨ / ٢ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن.

یەکەم سەرۆك دوای سەربەخۆیی : داوود ك. گاوارا بوو و تا ساڵی ١٩٩٤ بەکودەتایەکی سەربازی دەسەڵاتی لەدەست کێشرایەوە. دوای کودەتا حوکمی وڵات لەلایەن ئەنجومەنێکی سەربازییەوە بەڕێوە چوو تا هەڵبژاردنی جەنەراڵ یەحیا جامیع لەمانگی نۆی ١٩٩٦ دا.

لەساڵی ١٩٨٢ داهەر یەك لە گامبیا وسەنگال یەکێتییەکیان بەناوی : سینگامبیا پێك هێنا، شایەنی باسە ئەم یەکێتیە ئاڵوگۆڕی بازرگانی وپتەوکردنی باری ئابووری هەردوو دەوڵەتی بەخۆوە بینی جگە لە یەك بوونی هێزە چەکدارەکانی هەردوو دەوڵەت. بەڵام لەساڵی ١٩٨٨ دا ئەو یەکێتیە هەڵوەشێنرایەوە.

گامبیا وڵاتێکی هەژارە زەوییەکی کشتوکاڵی زۆر کەمی لەخۆ گرتووە وخاوەنی هیچ سامانێکی کانزایی بەبەها نییە. بەروبوومەی کشتوکاڵیەکان لەچوار دەوری روباری گامبیادان وزۆربەی جوتیارەکانی لەوێدا نیشتەجێ بوون.

سرووودی نیشتیمانی: لەپێناوی گامبیای نیشتیمان.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣٨٤ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٦٨

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٦ .

## گرینادا

**ناوی باو:** گرینادا

**ناوی فەرمی:** گرینادا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Grenada

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێتی دووەمە ودادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ١٣ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥ ئەندام )

**رووبەر :** ١٣٣ میل دووجا ، ٣٤٢ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٩٨,٤٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢٨٦ کەس /کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی رەش، تێکەڵە، هیندی ئاسیا، پاکستانی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك ، پرۆتستانت )

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** سانت جۆرجز.

**شارە سەرەکییەکان:** گرینفیل، گۆیاف، ڤیکتۆریا.

**دراو:** دۆلاری رۆژهەڵاتی کاریبی.

**ئاوو هەوا:** خولگەیی، پلەکانی گەرما لەهاویندا ٣٢ پلەی سەدی ولەزستاندا ٢١ پلەی سەدی. بارانەکان لەناوچە کەنارییەکان ١٥٠ سم ولەناوچە چیاییەکان ٣٠٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** گوێز، مۆز، کاکاو، گوێزی هیندی، لۆکە، لیمۆ، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوەکانی خۆراك.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

گرینادا، یان دورگەی بەهاراتەکان وەك هەندێ جار پێی دەڵێن، کۆمەڵە دورگە وڵاتێکە دەکەوێتە ئەوپەڕی دورگەکانی هیندی رۆژئاوا، لەباشووری رۆژهەڵاتی دەریای کاریبی، نزیکەی ١٥١ کم لەباکووری ڤەنزەویلاوە دوورە، هەروەها نزیکەی ١٤٠ کم لە باکووری دورگەی ترینیدادەوە دوورە. لەدورگەیەکی سەرەکی پێك دێت ئەویش دورگەی گرینادایە

ولەکۆمەڵی دورگەی بچوکی بەچوار دەوری کۆبوونەتەوە لەوانە: دورگەی کاریاکۆ کە نزیکەی ٢٧ کم لە باکووری ڕۆژهەڵاتییەوە دووره ودورگەی مارتینیکی بچوك. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦١/٥٠ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٢/٥ بەرەو باکوور.

دورگەی گریـنادا بەرەچەڵەك گڕكانییەو دارستانە چڕەكان دایدەپۆشن وچەند دۆڵێكی تەسكی لەخۆ گرتووە چەند تاڤگەیەكی تێدەرژێت.

یەكەم دانیشتوانی گرینادا هیندە ئۆراكییەكان بوون ودوای ئەوان هیندەكانی كاریبی كە لە باشووری ئەمەریكاوە هاتبوون لێی نیشتەجێ بوون. لەبەرواری ١٥ / ٨ / ١٤٩٨ كریستۆڤ كۆلۆمبـۆس لەگەشـتی چـوارەمیدا بـەرەو جیهـانی نـوێ دۆزیویەتییـەوە ونـاوی نـاوە: كۆنسبسۆن، واتا دەركپێكردن، بەڵام ئەوروپیەكان دوای ئەو ناویان ناوە گرینادا وتائێستا هـۆی هەڵبـژاردنی ئـەو نـاوە ونـە. لەسـاڵی ١٦٥٠ هینـدەكان گریناداییـان فرۆشـتووە بـە فەرەنسییەكان، بەلام لەساڵی ١٧٦٢ دا كەوتۆتە ژێـر دەسـەڵاتی بەریتانیاوە. لەساڵی ١٧٨٣ بەریتانییەكان ئەفەریقییە ڕەشەكانیان هێناوە بۆ گرینادا تاكو كاری كشتوكاڵیان پێبكەن. لەناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا بەریتانیا ماڤ ئۆتۆنۆمی ناوخۆی بە گرینادا بەخشیوە و لـە ٧ / ٢ / ١٩٧٤ دا لەچوارچـێوەی كۆمۆنـوێلتی بەریتانیـدا بەتـەواوەتی سـەربەخۆیی پـێ بەخشیوە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككگرتوەكان، بۆتە شانشینێكی دەستووری و سێر ئیریـك جیری سـەرۆكایەتی ئەنجومـەنی وەزیرانـی گرتۆتـە دەسـت وبۆتـە دادوەری گشتی.

دوای سەربەخۆیی وڵات دووچاری چەندین ململانێی سیاسی بۆتەوە، لە ساڵی ١٩٧٩ دا كودەتایـەكی سـەربازی بەسـەر حكومەتەكـەی ئیریـك جیریـدا كـرا لەلایـەن شۆڕشـگێڕە چەپەكانەوە بەسەرۆكایەتی مـۆریس بیشوب و لەپاشـدا خـۆی بـووە سـەرۆكی حكومـەت و پەیوەندییەكی باشی لەگەڵ كوبادا بەست. بەڵام هەندێ لەوڵاتانی دەریای كاریبی مەترسی ئـەوەیان لێنیـشت گرینـادا ببێتـە بنكەیـەكی كوبـا ویـەكێتی سـۆڤیەت ، بۆیـە ویلایەتـە یـەككگرتوەكانی ئەمـەریكا لـە ٢٥ / ١٠ / ١٩٨٣ بـەخۆی وهێـزە دەریـایی وئاسمانییەكانیـەوە وبەپـشتیوانی نزیكـەی ٣,٠٠٠ سـەرباز و ١٥ كەشـتی فرۆكـە هـەڵگر نزیكـەی ٩٠ فرۆكـەی لەسـەر پشتوو، جگە لـە پشتیوانی شـەش وڵاتی كاریبی هەڵیكوتایە سەر گرینـادا، لەوێدا ڕووبەڕووی بەرەنگارییەك بوونەوە لەلایەن سوپای گریناند كەتـەنها لـە ٨٠٠ سـەربازێك پێك هـاتبوو لەگـەڵ ٢٠٠٠ كەسێك لەمیلیـشیاكان هـەرگیز پێـشبینیان نـەدەكرد جگـە لـەوەی كرێكارە كوبییەكانیش كەلەو وڵاتە كاریان دەكرد پشتیوانیان لە گریناداییەكان دەكرد، هـەر یـەك لـە ویلایەتـە یـەككگرتوەكان وكوبـا وگرینـادا ڕایانگەیانـد كـەزیانێكی زۆر لـەنێو

ریزەکانیاندایە، واشنتۆنیش لەلایەن خۆیەوە رایگەیاند کە دەستی گرتوە بەسەر ۳۰ هاولاتی سۆڤیێتی کە لەو ولاتە کاریان دەکرد. هەر یەك لە لیبیا و نیکاراگوا داوای دانیشتنێکی بەپەلەی ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەولەتیان کرد. چەند کاتژمێرێکی بەسەر هێرشەکاندا نەخایاند هێزە پەلاماردەرەکان توانیان دورگەکە بکەن بەدوو بەشەوە وتوانیان فرۆکەخانە وهەندێ دەزگاکان داگیر بکەن. هێزە ئەمریکییەکان تا سالی ۱۹۸۵ لەدورگەکەدا مانەوە، تا رایەگەیاندنی حکومەتێکی دیموکراسی لە گرینادا بەسەرۆکایەتی سێر بول گۆدیۆن سکون. لەسالی ۱۹۹۰ دا نیکۆلاس بریت وەیت بەسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و دادوەری گشتی هەلبژێردرا. دوای ئەویش لیت میتشێل لەسالی ۱۹۹۵ هەلبژێردرا.

ئابووری گرینادا پشتی تەواوی بە گەشتوگوزار وبەرهەمی گوێز بەستووە لەبەر ئەوەی بەدووەم ولات دادەنرێ لەجیهاندا لەبەرهەمی گوێز.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ۲٤۱ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ۱۷٤ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ۲,٦۲۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٦۹ .

## جەزائیر

**ناوی باو:** جەزائیر

**ناوی فەرمی:** کۆماری دیموکراسی میللی جەزائیر

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Democratic and Popular Republic of Algeria

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نیشتیمانی میللی ( ٢٠٠ ئەندام )

**رووبەر :** ٩١٩,٥٩٥ میل دووجا، ٢,٣٨١,٧٤١ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣٠,٢٠,٠٠٠ کەس.

**چڕی دانیشتوان:** ١٤ کەس/ کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، بەربەر.

**ئاین:** ئیسلام.

**زمان:** عەرەبی، ئەمازیغی، فەرەنسی بەشێوەیەکی بەرفراوان پەیڕەو دەکرێ.

**پایتەخت:** جەزائیر

**شارە سەرەکییەکان:** عەنابە، کۆسەنتینە، وەهران، سەتیف، تیزی ئۆزۆ، تلمسان.

**دراو:** دیناری جەزائیری.

**ئاووهەوا:** لەباکوور: سارد باراناوی لەزستاندا، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لە ٨٠سم بۆ ١٠٠ سم دەبێت، گەرم ووشکە لەهاویندا. بیابانییە لەگەورەترین بەشی وڵات : گەرم بەرۆژ وساردە بەشەو ، وشکە ، ساڵانە بارانەکان لە ١٠ سم زیاتر نابارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** دانەوێڵە، خورما، سەوزە، بەخێوکردنی مەڕومالات، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** پاڵاوتنی نەوت، چیمەنتۆ، پەین ، دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گاز، ئاسن، فۆسفات، قورقوشم، زنك، زیو ، مس.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

جەزائیر وڵاتێکی ئیسلامیە دەکەوێتە باکووری ئەفریقیا لە ناوەڕاستی باڵی رۆژئاوای نیشتیمانی عەرەبی وبەدووهەم وڵات دادەنرێت لەنێو وڵاتە عەرەبی وئەفریقییەکاندا، دوای سودان، لەرووی رووبەرەوە. دەریای سپی ناوەڕاست دەکەوێتە باکووری، تونس ولیبیا دەکەونە رۆژهەڵاتی،و نیجەر ومالی دەکەونە باشووری، شانشینی مەغریبیش دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی وڵات دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٩ بەرەو باکوور.

باکووری وڵات بریتیە لە دەشتەکانی سەرکەنار وچالاکییە کشتوکاڵیەکانی تیا ئەنجام دەدرێت، بەرەو باشوور گردە ناوخۆییەکان ولەپاشدا بانە بەرزەکان ولەدوایاندا بەرزاییە

ئەتڵەسیەکان کە بەجیاکەرەوەیەکی سروشتی نێوان باشوور وباکوور دادەنرێت. لەدواییدا بیابانیش گەورەترین بەشی رووبەری وڵاتی داگیرکردووە.

بەر لە ۱۵۰۰ ساڵ پێش زایینەوە مرۆڤ لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بووە. لە ساڵی ۲۰۰۳ پ.ز دا لەسەردەمی شانشینی نۆمیدی وڵاتێکی بەهێزی پێك هێناوە ولەگەڵ هەریەك لە رۆما وقرتاج پەیوەندییەکی بەهێز وگرنگی هەبووە، لەدواییدا بۆتە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی، دوای ئەویش بۆتە بەشێك لەئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، تا سەردەمی والا کردنی لەلایەن ئیسلامەکانەوە خیلافەتی عوسمانی کوڕی عەفان لەساڵی ۲۱ ك / ٦٤٦ ز . بەدرێژایی دەوڵەتی ئەمەویی وعەباسییەکان جەزائیر بەدەست عەرەبەکانەوە بووە، تا لەساڵی ۱۵۱۷ دا کەوتۆتە دەست دەوڵەتی عوسمانی ولەدوای ساڵی ۱۸۲۰ کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی فەرەنساوە. فەرەنسییەکان زۆریان هەوڵداوە جەزائیر بکەنە ناوچەیەکی فەرەنسی بەڵام جەزائیرییەکان زۆر بەتوندی بەرەوڕوویان بونەتەوە وچەندین بزوتنەوەیان لەدژ راگەیاندون گرنگترینیان شۆڕشەکەی عەبدولقادری جەزائیری بووە. دوای جەنگی جیهانیی دووەم ۱۹٤٥ بەرەی ئازادی نیشتیمانی دامەزراوە ولە ۱ / ۱۱ / ۱۹٥٤ دا خەباتی چەکداری لەدژی فەرەنسییەکان راگەیاندووە وبەردەوام لەگەڵ فەرەنسیەکاندا لەشەڕدا بووە تالە ٥ / ۷ / ۱۹٦۲ بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە ونزیکەی ملیۆن ونیوێك شەهیدی لەم پێناوەدا داوە، لەهەمان ساڵدا پەیوەندی کردووە بەنەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

جەژنی نیشتیمانی لە ٥ / ۷ و ۱ / ۱۱ ی هەموو ساڵێك لە جەزائیردا دەگێردرێت. هەروەها لە ۲۰ / ۸ ی هەموو ساڵێك ئاهەنگی رۆژی موجاهید دەگێرێت ، شایەنی باسە ۲۰ / ۸ هاوکاتە لەگەڵ هەر یەك لەرۆژی هێرشی باکووری کۆسەنتینی لە ۲۰ / ۸ / ۱۹٥٥ بەمەبەستی تێك دانی ئەو ئابلۆقە ئابوورییەی سەر ناوچەی ئۆراس وهاوبەش کردنی میللەت لەخەباتی چەکداری لەپێناوی سەربەخۆیی و رۆژی ۲۰ / ۸ /۱۹٥٦ ی کۆنگرەی سۆماڵ کە تیایدا دان نرا بەپشتیوانی کردن لەشۆڕشی جەزائیری.

دوای سەربەخۆیی جەزائیر هەر یەك لەمانەی خوارەوە سەرۆکایەتی وڵاتی گرتۆتە دەست:

١. ئەحمەد بن بێلا ۱۹٦۲ — ۱۹٦٥ .
٢. محەمەد بروخرۆبە ( هەواری بۆمەدین ) ۱۹٦٥ — ۱۹۷۸ .
٣. شازلی بن جەدید ۱۹۷۸ — ۱۹۹۲ .
٤. محەمەد بوزیاف ( تیرۆر کرا ) .
٥. عەلی کافی ۱۹۹۲ — ۱۹۹٤ .
٦. ئەلیامین زروال ۱۹۹٤ — ۱۹۹۹ .

لە ۱٥ / ٤ / ۱۹۹۹ دا جەزائیریەکان بەرەو سندوقەکانی دەنگدان بەڕێ کەوتن بۆ هەڵبژاردنی حەوتەم سەرۆکی وڵات لەنێو حەوت پاڵێوراودا، عەبدول عەزیزی بووتەفلیقە بەکۆی ۷۳,۷۹ ٪ ی دەنگەکان سەرکەوتنی بەدەست هێنا. لە ۲۷ / ٤ / ۱۹۹۹ عەبدول عەزیز

بوو تەفلیقە سوێندی دەستووری خوارد وپۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست.

لە ٥ / ١٠ / ١٩٨٨ دا لەچەندین شارو شارۆچکەی جەزائیر خۆپیشاندانی قوتابیان دەستی پێکرد وداوای چاکسازی ئابووری وکۆمەلایەتی دەکرد لەولاتدا، خۆپیشاندانەکان چەندین پرۆسەی توندرەوی بەخۆوە بینی ، ناچار سەرۆکی ئەوکات شازلی بین جەدید حالەتی نائاسایی لەولاتدا راگەیاند. پسپۆران ئەو رۆژەیان بەسەرەتای قۆناغی توندرەوی لەولاتدا دادەنێن بەتایبەتی دوای رەتکردنەوەی هەلبژاردنەکانی ١٩٩١ ئاژاوە وتوندرەوی هێندەی دیکە پەرەی سەند وتائەو کاتەی سەرۆك بوو تەفلیقە پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست ولات هێمنی بەخۆوە نەبینی. بووتەفلیقە لەلایەن خۆیەوە لێبوردنێکی گشتی بۆ تەواوی تاوانبارانی خۆپیشاندان وزیندانە سیاسییەکان دەرکرد، بەلام لێبوردنەکەی ئەوانەی نەگرتەوە کەبەکاری تیرۆریستی چەکدارانەوە و کوشتنی ئەنقەست و ئابرووبردنەوە تێوەگلاون.

لە بەرورای ١٦ / ٩ / ١٩٩٩ نزیکەی ١٤,٥ ملیۆن جەزائیری بەرەو سندوقەکانی دەنگدان چوون بۆ دەنگدان لەسەر یاسای ئاشتی نیشتیمانی، بەکۆی ٩٨,٦٣ ٪ ی دەنگەکان گەلی جەزائیر رەزامەندیان لەسەر جێبەجێ کردنی ئەم یاسادا. پرۆژەکە رێگا دانی میللەت بەبووتەفلیقە بۆ هەنگاونان بەرەو گۆرانکاری بنەرەتییەکان بۆ چارەسەری کێشەکانی ئاسایش وباشتر کردنی باری کۆمەلایەتی وئابووری لەجەزائیردا.

لەگەل ئەو هەنگاوانەی حکومەتی جەزائیر ناوێتی بۆ کۆتایی هێنان بەکێشە سیاسی وئاسایشییەکان وکۆتایی هێنان بەتوندرەوی لەولاتدا کە بۆتە هۆی کوشتنی زیاتر لە ١٠٠ هەزار هاولاتی و زیاتر لە ٢٠ ملیار دۆلاری ئەمریکی بەو ولاتە، بەلام هێشتا چەندین لایەنی نابەر پرسیار بێ ئەوەی پەیوەندییان بەهیچ لایەن وگروپێکی سیاسییەوە هەبێت پەیرەوی کاری تیرۆریستی وتاوانبارانە دەکەن جگە لەتیرۆر کردنی هاولاتیانی بیانی و ئابرووبردنیان ودزی لێکرد وچەتەیی بەتایبەتی لەناوچە چۆلەکاندا.

لە بەرواری ٢١ / ٥ / ١٩٩٩ دا سەرۆك بووتەفلیقە لە وتەیەکیدا بەرامبەر بەداواکارانی پتەو کردنی نەتەوەی ئەمازیغی بەربەری لەجەزائیر ودیاری کردنی پێناسەی تایبەتیان، وتی: ئێمە هەمووان موسلمانین و زمانی فەرمیمان عەرەبییە، بەرەچەلەکیش ئەمازیغین ( بەربەرین) ، چیتر با ململانێ وشەر نەکەین. هەروەها وتی: جەزائیر کێشەی ئالۆزی زۆر لەوە گەورەتری هەیە خۆمانی پێوە سەرقال بکەین، با هەول بدەین چارەسەری لەکەرتەکانی خوێندەورای وئابووری وتەندروستی وپۆستە وگەیاندن وپیشەسازی چارەسەر بکەین.

لەگەل ئەوەشدا، لە ١٤ / ٦ / ٢٠٠١ دا جەزائیری پایتەخت چەندین خۆپیشاندانی گەورەی بەخۆوە بینی لەلایەن ئەمازیغییەکانەوە، ئەمازیغی بەزمانی بەربەرییەکان بەمانی ئازادیخوازان دێت، خۆپیشاندانەکان بەرەو رووبەروو بوونەوەی لەگەل پیاوانی ئاسایش وپۆلیسدا گەشەی کرد وبووە هۆی تالان کردنی پێشانگا وکۆگاکانی هاولاتیان جگە لە

کوشتن وبریندار بوونی چەند کەسێك، شایەنی باسە ئەم خۆپیشاندانە دوای زنجیرەیەك خۆپیشاندان دێت کە لەناوچەی چیاکان کە بەرەبەرکان لێی نیشتەجێن بەرپابوو وهەمان ئاژاوە وکوشت وبڕی لێکەوتبووە، خۆپیشاندەران داوایان دەکرد کەدان بنرێت بەزمان وکەلتوور ئەمازیغییەکان و هەندێکیان داوای مافی ئۆتۆنۆمیشیان دەکرد.

لە ١٢ / ٣ / ٢٠٠٢ دا سەرۆکی جەزائیر عەبدول عەزیز بووتەفلیقە رایگەیاند کە زمانی ئەمازیغی ( زمانی بەربەرەکان) بەم زمانە دەبێتە زمانێکی نیشتیمانی لەولاتدا وهەلدەستێت بە چاکردنی چەند بەندێکی دەستوور بۆ ئەم مەبەستە، بووتەفلیقە وتی کە ئامانجم لەم راگەیاندنە تەنها چاکردنی باری ولات وبەرژەوەندی نیشتیمانیە. لە ٨ / ٤ / ٢٠٠٢ دا پەرلەمان رەزامەندی خۆی لە پێشنیار وبڕیارەکانی بووتەفلیقە دەبڕی.

لەکۆتاییەکانی ٢٠٠١ دا ولات بارانێکی بەخۆوە بینی کە زیاتر ناوچەی پایتەختی گرتەوە نزیکەی سەت کاتژمێری خایاند، پسپۆران دەلێن ئەو رێژە بارانەی لەماوەی ئەو سەت کاتژمێرە باریوە هێندەی بارانی پانزە سال بووە. ئەو بارانانە بووە هۆی تێکدانی رێگاو بانەکان ورۆچوونی زەوییەکی زۆر وکوشتنی و ون بووونی ژمارەیەك هاولاتی، بۆیە ئەو کارەساتە بە کارەساتێکی نیشتیمانی دانرا وهیچی لەکارەساتی بوومەلەرزەکانی ١٩٨٠ و ١٩٨٨ کەمتر نەبوو.

لە ١٥ / ١ ی هەموو سالێك ئەمازیغییەکان ئاهەنگی سەری سالی تازە دەگێڕن، کە بەپێی سالنامەی خۆیان تا سالی ٢٠٠٠ لای ئەوان سالی ٢٩٥٠ بوو لە مێژووی ئەمازیغی بەربەری.

ناوی جەزائیر بەزمانی عەرەبی بەمانای دورگەکان دێت وئەو ناوەش کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەیەمی زایینی بەهۆی بینینی چەند دورگەیەکی بەردەلان لەناوچەی نزیك جەزائیری پایتەختی ئێستا، دواتر ناوەکە بەسەر تەواوی ولاتدا دابرا.

ئابووری جەزائیر ئابوورییەکی پێشکەوتووە وبەپلەی یەکەم پشتی بە سەرچاوە سروشتیەکان بەستووە ونەوت وگازیش گرنگترینیانن.

سروودی نیشتیمانی: سوێند بێ بەخوێنی شەهیدان.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٤٦,١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٤٦ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١,٦٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٨٨.

## دورگەکانی بەهاما

ناوی باو: دورگەکانی بەهاما

ناوی فەرمی: کۆمۆنۆلتی بەهاما

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Commonowealth of the Bahamas

سیستەمی حوکمرانی: پادشایی دەستووری، سەرۆکی ولات شاژنی بەریتانیایە ودادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ١٦ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٤٩ ئەندام )

رووبەر : ٥,٣٨٢ میل دووجا، ١٣,٩٣٩ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ٢٨٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٢٨,٥ کەس/کم$^{٢}$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو ولاتە: ئەفەریقی رەش، ئەورووپی، میۆلاتۆز ( مۆلدییەکان ) تێکەڵەیەکن لە رەش وسپی.

ئاین: مەسیحی (پرۆتستانت ، ئەنگلیکان، کاسۆلیك ) .

زمان: ئینگلیزی.

پایتەخت: ناساو ( دەکەوێتە دورگەی نیو پرۆفیدنس )

شارە سەرەکییەکان: فری بۆرت، مارش هاربۆ.

دراو: دۆلاری بەهامی.

ئاوو هەوا: مام ناوەندە، پلەکانی گەرما لە زستاندا ٢٢ پلەی سەدی ولەهاویندا ٢٩ پلەی سەدییە، رێژەی سالانەی باران ١١٤ سم دەبێت .

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز، سەوزە ومیوە، راوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: چیمەنتۆ، لەنەوت وەرگیراوەکان، دروستکراوە خۆراکییەکان، رم ( خواردنەوەیەکی ئەلکحوولیە ) .

سامانی کانزایی: نییەتی.

تێڕوانینێکی گشتی :

بەهاما یان بەهاماس، کۆمەڵە دورگە ولاتێکە دەکەوێتە دەریای کاریبی سەر بە دورگە

هیندییە ڕۆژئاواکانە لە ڕۆژئاوای زەریای ئەتڵەسی. لە نزیکەی ٧٠٠ دورگەی گەورە و نزیکەی ٢٣٠٠ دورگەی بچوك وبەردەڵان پێك دێت. بە نزیکەی ٩٧٠ کم درێژیەوە دەست پێدەکات لە دووری نزیکەی ٨٠ کم لە کەناری ڕۆژهەڵاتی فلۆریدای ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکاوە تا دەگاتە لای باکووری ڕۆژهەڵاتی کوبا. تەنها ٤٠ دورگەیەکیان لەکۆی ئەو دورگانە نیشتەجێ کراون ونزیکەی سێ لەسەر چواری کۆی دانیشتوانی لەهەر یەك لە دورگەکانی ناسا ودورگەی نیو پرۆفیدس ودورگەی گراند بەهاما نیشتەجێبوون. ناوەڕاستی دورگەکان دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧٦ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٢٥ بەرەو باکوور .

یەکەم دانیشتوانی دورگەکانی بەهاما هیندە لوقانییەکان بوون. کریستۆف کۆلۆمبۆس لە ١٢ / ١٠ / ١٤٩٢ گەیشتنە یەکەم دورگەی وناوی ناوە سان سلڤادۆر و بەئیسپانی بوونی دورگەکەی ڕاگەیاندووە. دوای ئەو بەریتانیەکان لێی نیشتەجێ بوون وئەفریقیە ڕەشەکانیان بۆ هێناوە. لەساڵی ١٧١٧ بۆتە داگیرکراوەیەکی بەریتانی. لە ١٩٦٤ دا بەریتانیا مافی ئۆتۆنۆمی ناوخۆی پێبەخشیوە ، ولە ١٠ / ٧ / ١٩٧٣ لەژێر سایەی کۆمۆنوێلتی نەتەوە بەریتانیەکان سەربەخۆیی تەواوی پێ بەخشراوە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامێکی نەتەوە یەکگرتوەکان، یەکەم دادوەریشی لیدن بیندلند بووە ودوای ئەو هۆبرت ئینگراهام بۆتە دادوەر دوای سەرکەوتنی لەهەڵبژاردنەکانی ساڵی ١٩٩٢ .

ساڵانە لەڕۆژی ١٠ / ٧ ( ڕۆژی سەربەخۆیی ) جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن.

باری ئابووری بەهاما پشتی تەواوی بە چالاکی گەشتوگوزار بەستووە، ساڵانە نزیکە ١,٥ ملیۆن گەشتیار ڕووی تێدەکەن.

ناوی بەهاما لەلێکدانی هەردوو وشەی باجا و مار هاتووە کە بەزمانی ئسپانی بەمانای زەریای نزم دێت، بەر لەم ناوەش پێی وتراوە : لۆکایس.

سروودی نیشتیمانی: بۆ پێشەوە بەهاما

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١١٨.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١١,٧٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢٩ .

## دورگەکانی سەری سەوز

**ناوی باو:** دورگەکانی سەری سەوز

**ناوی فەرمی:** کۆماری دورگەکانی سەری سەوز

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Cap Verde

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری ، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نیشتیمانی ( ٧٢ ئەندام )

**رووبەر :** ١,٥٥٧ میل دووجا، ٤,٠٣٣ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣٩٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٩٧,٨ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی رەش، ئەورووپی، تێکەڵ.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ) .

**زمان:** پۆرتۆگالی.

**پایتەخت:** برایا.

**شارە سەرەکییەکان:** مینیلۆ، ساو فیلیپ

**دراو:** ئیسکیدۆ.

**ئاوو هەوا:** پلەکانی گەرما مام ناوەندن و لەنێوان ٢٢ پلە بۆ ٢٨ پلەی سەدی دەبێت ، بارانەکان کەمن.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمە شامی، منیهۆت، پەتاتە، قامیشی شەکر، مۆز، راوەماسی، قاوە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان، بیرە، پاڵاوتنی ئاوی دەریا.

**سامانی کانزایی:** گەچ، خوێ

**تێڕوانینێکی گشتی :**

دورگەکانی سەری سەوز یان کیپ ڤێرد کۆمەڵە دورگەی وڵاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی زەریای ئەتڵەسی. نزیکەی ٦٢٠ کم لەکەناری رۆژئاوای ئەفریقیاوە دوورە بەرەو رووی سەنگال ومۆریتانیا، لە ١٥ دورگە پێك دێت تەنها ٩ دورگەیان نیشتەجێن. دورگەکان بەسەر دوو کۆمەڵەی سەرەکی دابەش دەبن: کۆمەڵێکیان رووەو رەشەبان وکەوتوونەتە باشوورەوە، کۆمەڵە دووەمیش بەرەو رووی رەشەبان وکەوتونەتە باکوورەوە. دورگەکان زۆربەیان

بەرەچەڵەك گڕکانین بۆیە تەختیان شاخاویی ولوول پێچە. ناوەڕاستی دورگەکان دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٤ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٦ بەرەو باکوور.

هیچکام لەدورگەکان نیشتەجێ نەکرابوون کاتێ لەلایەن دوو دەریاوانی پۆرتۆگالیەوە ؛ دیگۆ گۆم و ئەنتۆنیۆ دانۆلاوە لە ١٤٥٦ دا دۆزراونەتەوە. بۆیە پۆرتۆگالیەکان لە ١٤٦٢ بەدواوە لێی نیشتەجێ بوون و کردیانە داگیرکراوەیەکی پۆرتۆگالی لەگەڵ پەیدابوونی بازرگانی کردن بەکۆیلەکانەوە لەسەدەی پانزدەیەمدا دورگەکان نەشنمایەکی بەرچاویان بەخۆوە بینییەوە. چەتەکانی دەریا لە ١٥٤١ دا هێرشیان کردۆتە سەر، ئینگلیزەکانیش لەساڵەکانی ١٥٨٥ و ١٥٩٢ هێرشیان کردۆتە سەر، فەرەنسییەکانیش لەلایەن خۆیانەوە لە ١٧١٢ دا هێرشیان کردۆتە سەری. دوای نەمانی بازرگانی کردن بەکۆیلەکانەوە لە ١٨٧٦ دا دورگەکان هیچ گەشە کردنێکیان نەما. لەکۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا لەگەڵ پەیدابوونی بازرگانی نێوان ئەورووپا وئەمەریکای باشوور وئەفریقیای باشوور دورگە ناوبراوەکان گەشەکردنێکی بەرچاویان بەخۆوە بینی، سەرلەنوێ گەشەکردنی نەما لە سەردەمی جەنگی جیهانیی یەکەمەوە تا کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم.

لەساڵی ١٩٥١ دا رەوشی داگیرکراوە پۆرتۆگالیەکە گۆڕا تاکو بووە هەرێمی پشت دەریاکانەوە. لەساڵی ١٩٦١ دا تەواوی دانیشتوانی دورگەکە بوونە هاولاتی پۆرتۆگالی. بەڵام ئەمەش نەیتوانی رێ لە سەرهەڵدانی بزوتنەوەی سەربەخۆیی بگرێت بەسەرۆکایەتی پارتی ئەفریقی بۆ سەربەخۆیی گینیا بیسا و دورگەکانی سەری سەوز. لە ٥ / ٧ / ١٩٧٥ دا دورگەکانی سەری سەوز بوونە کۆمارێکی سەربەخۆو ولەلایەن ئەنجومەنی نیشتیمانی میللیەوە پەسەند کرا ودەستووری تایبەت بەولات دارێژرا.

یەکەم سەرۆکی دورگەکانی سەری سەوز دوایی سەربەخۆ بوونی: ئێریستید بیریرا بوو وتا ساڵی ١٩٩١ لەدەسەلاتدا مایەوە و دەسەلاتی دایە دەست ئەنتۆنیۆ ماسکارینهاس مۆنتیرۆ پاش ئەوەی ئەمیان لەهەڵبژاردنەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا. دوای ئەویش دەسەلات کەوتە دەست بیدرۆ بیریس.کەمی رێژەی ئاوی خواردنەوە یەکێکە لەکێشە سەرەکییەکانی ئەو دورگانە وداهاتی ئەو کۆچبەرانەی لەئەورووپا وئەمەریکا کار دەکەن پشتیوانی لەباری ئابووری ئەو ولاتە دەکات جگە لە چالاکییەکانی گەشتوگوزار.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣٤٦ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١٧٠ .

ناوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٩١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ١١٨ .

## دورگەکانی سولە یمان

**ناوی باو:** دورگەکانی سولەیمان

**ناوی فەرمی:** دورگەکانی سولەیمان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Salamon Islands

**سیستەمی حوکمرانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی ولات شاژنی بەریتانیایە ودادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمانی نیشتیمانی ( ٤٧ ئەندام )

**رووبەر :** ١٠,٩٥٤ میل دووجا ، ٢٨,٣٧٠ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤١١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٥,٥ کەس/ کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو ولاتە:** میلانیزی، بۆلینیزی، ئاسیایی، ئەوروپی.

**ئاین:** مەسیح ( پرۆتستانت ، رۆمان کاسۆلیك ) ، بەهایی، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** هۆنیارا.

**شارە سەرەکییەکان:** جیزۆ، ئۆکەی، کیراکیرا، بوالا.

**دراو:** دۆلاری دورگەکانی سولەیمان.

**ئاوو هەوا:** گەرم وشێدارە، پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵی ٢٧ پلەی سەدییە، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٣٠٠ – ٣٥٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** پەتاتە، گوێز، زەیتی دارخورما، قاوە، کاکاو، برنج، مۆز، راوەماسی، دارستان.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت، ئاسن، فۆسفات، ئاڵتون، مس.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

دورگەکانی سولەیمان کومەڵە دورگە ولاتێکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای زەریای هێمن بەرەو رۆژهەڵاتی بابوا گینیای نوێ. نزیکەی ١٦٠٠ کم لەباکووری رۆژهەڵاتی ئۆستورالیاوە دووره. لە ٤٠ دورگەی گەورە و چەند دورگەیەکی بچوك پێك دێت تەنها شەش دورگەیان لە دورگە گەورەکان نیشتەجێ کراوە، بواری دەریایی تێکڕایان ٦٤٥,٠٠٠ کم دەبێت.

ناوەراستی دورگەكان دەكەونە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ١٥٨ بەرەو رۆژهەلات لەگەل هێڵی پانی ٨ بەرەو باشوور.

دورگەكانی سولەیمان بەرەچەلەك گڕكانی یان مەرجانی سەختن، دارستانەكان نزیكەی ٩٣٪ ی روبەرەكەی دادەپۆشێ لەكاتێكدا تەنها ١٪ ی ئەو رووبەرەوە سوودی كشتوكالی لێوەرگیراوە.

نزیكەی ١٠٠٠ سال پ.ز لەمەوبەر لە دورگەكان نیشتەجێ بوون. دەریاوانی ئیسپانی ئاڤاردۆ دو میندانا لەسالی ١٥٦٨ دا دۆزیویەتییەوە ولەبەر جوانی ئەو دورگانە ناوی لەسەر ناوی سولەیمانی پێغەمبەری خودا لێناوە تاكو هانی كۆچبەران بدات بەرەو دورگەكان بڕۆن ولێی بژین. ئەوروپی وشاندە مژدەبەخشەكان ( تەبشیرییەكان)ی ئەوروپا لەسەدەكانی شانزدەهەم و حەڤدەیەمدا لێی نیشتەجێ بوون. لەسالی ١٨٨٥ دا كۆمپانیای غینیای نوێی ئەلمانی دەسەلاتی گرتووە بەسەر دورگە رۆژهەلاتیەكانی سولەیمان، بەلام دورگە باشوورییەكانی لەسالی ١٨٩٣ دا كەوتە ژێر دەسەلات و پارێزگاری بەریتانیاوە ولەسالی ١٨٩٨ دا دورگە باكوورییەكانیشی خستە ژێر دەسەلات وپارێزگاری خۆیەوە.

لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا، دورگەكان شانۆی شەڕە زۆر توندەكانی نێوان هێزەكانی هاوپەیمانان و یابانیەكان لەسالی ١٩٤٢ تا ١٩٤٤ و هێزە ئەمریكییەكلن توانیان ئازادی بكەن ویابانیەكانیان كردە دەرەوە.

لە ٧ / ٧ / ١٩٧٨ دا لەچوارچێوەی كۆمۆنولتی بەریتانی سەربەخۆیی پێبەخشراوە ولەهەمان سالدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان، یەكەم دادوەری گشتی پیتر كینیلۆریا بووە ودوای ئەو سولەیمان مامالۆنی لەسالی ١٩٨١ دا دەسەلاتی گرتۆتە دەست وتا سالی ١٩٨٨ دا لە دەسەلات ماوەتەوە دوای ئەوەی سێر جۆرج لبنینج لەهەلبژاردنە گشتییەكاندا سەركەوتنی بەدەست هێنا وبووە دادوەری گشتی.

دورگەكان سولەیمان لەسالەكانی دواییدا چەند ململانێیەكی نەژادی توندی بەخۆوە بینی بووە هۆی كوشتنی چەند كەسێك وئیفلیج كردنی باری ئابووری ئەو دورگانە، كێشەكان لەسەر ئەو سكالایانەیە كە دانیشتوانە سەرەكییەكانی دورگەی: كەنالی گوادە كە گوایە دانیشتوانی دورگەی مالیاتای دراوسێ زەویەكانیان زیاتر بەگەڕ خستووە وسوودی زیاتری لێ دەبینن بۆیە هەلی كار بۆ ئەوان لەبارترە. لەبەرواری ٥ / ٦ / ٢٠٠٠ ئەندرۆ سەوری سەرۆكی میلیشیاكانی هەلۆكانی مالیتا ( ئیگل فۆرس ) هەستا بەئەنجامدانی كودەتایەكی سەربازی بۆ ئەوەی دەسەلات بگرێتە دەست وكۆتایی بەململانێ نەژادییەكان بێنێ، بەلام چەند رووبەروو بونەوەیەك لەنێوان یاخیبوان و بەرەی ئاساتابۆی شۆڕشگێر كە سەرۆك

وەزیـران بـەڕێوەی دەبـات ڕوویـدا بـووە هـۆی دەسـت لـەکار کێـشانەوەی سـەرۆك وەزیـران، شـایەنی باسـە ڕووبەڕووبونـەوەکان چـەندین کـوژراو وبریـنـداری لێکـەوتـەوە جگـە لـە ئـاوارە بوونی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە.

لـە بـەرواری ۳۰ / ٦ / ۲۰۰۰ دا پـەرلـەمانی دورگـەکانی سـولەیمان سـەرۆکی ئۆپۆزسـیۆن ماناسـێ سـوجافارییان بەسـەرۆکی وەزیـران هەڵبـژارد کەلەلایـەن سـەرۆکی کودەتاشـەوە پشتگیری لەهەڵبـژاردنی کرابوو، ئەمـەش هیـوا وئومێـدەکانی ئاشـتی وئـارامی گەڕانـدەوە بـۆ دورگەکان بۆ کۆتایی هێنان بەکێشەو گرفتە نەژادی توندەکان.

لـە بـەرواری ۱٥ / ۱۰ / ۲۰۰۰ دا لەشـاری تـوویـسڤیلی بـاکووری ئوسـتورالیا ڕێکـەوتنامـەی نێـوان تـەواوی لایەنـەکانی دورگـەکانی سـولەیمان واژۆ کـرا بـۆ کۆتـایی هێنـانێکی بەپەلـەی کێشەکانی نێوانیان وگەڕانەوە بۆ ژیانی سروشتی خۆیان.

ئابووری دورگـەکانی سـولەیمان پـشتی تـەواوی بـە بەرهەمـە سروشـتیەکانی کانـە کانزاییـە خاوەکـانی ونـاردنی بـۆ دەرەوەی وڵات بەسـتووە لەگـەڵ یارمەتییـە دەرکییـەکان جگـە لـەوەی چالاکییە گەشتوگوزاریەکانیش ڕۆڵێکی بەرچاو دەبینن لە پتەو کردنی ژێرخانی ئابووری وڵات.

دورگەکانی سولەیمان ساڵانە لە ڕۆژی ۷ / ۷ دا ئاهەنگی نیشتیمانی دەگێڕن.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ۲۹۱ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ۱۷۱

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۸۰۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ۱۲٥ .

## دورگەکانی سیشل

**ناوی باو:** دورگەکانی سیشل

**ناوی فەرمی:** کۆماری سیشل

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of The Seychelles

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٣ ئەندام )

**رووبەر :** ١٧٦ میل دووجا، ٤٥٥ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧٧,٣٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٦٩,٩ کەس / کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** کریۆل ( تێکەڵەیەك لە ئەفریقی وئەوروپی و ئاسیایی ) ، هیندی ئاسیا، مالاگاسی، چینی، ئینگلیز.

**ئاین:** مەسیحی ( کاسۆلیك ) ، موسڵمانیش وەك کەمایەتییەك.

**زمان:** فەرەنسی، ئینگلیزی، کریۆلی فەرەنسی ( تێکەڵ )

**پایتەخت:** ڤیکتۆریا.

**شارە سەرەکییەکان:** کاسکاد، بیل ئۆمبری، تاکاماکا.

**دراو:** روپیی سیشل.

**ئاوو هەوا:** گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان ٢٤ بۆ ٣ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لە ١٣٢ سم بۆ ٢٣٤ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گوێزی هیندی، راوەماسی، کۆکۆ دی میر ( گوێز هیندێکی گەورەیە کێشی یەك دانە نزیکە ٢٣ کغم دەبێت وتەنها لەو دورگەیە دەڕوێت) .

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوەکانی خۆراك، کەرەستەی بیناسازی.

**سامانی کانزایی:** فۆسفات، گاز، گرانێت، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

سیشل کۆمەڵە دورگە وڵاتێکی ئەفریقییە، دەکەوێتە رۆژئاوای زەریای هیندی، نزیکەی ١٦٠٠ کم لەرۆژهەڵاتی ئەفریقیاوە دوورە بەرەو رووی کینیا و تەنزانیا، نزیکەی ١١٢٠ کم لەباکووری رۆژهەڵاتی مدغەشقەرەوە دوورە، رووبەری بواری دەریایی ١,٠٣٥,٩٩٥ کم٢ دەبێت، دورگەی ماهی گەورەترین دورگەیەتی ونزیکەی ٨٥٪ دانیشتوانی تیا کۆبۆتەوە و ڤیکتۆریای پایتەختیشی تێدەکەوێت. دانیشتوانەکانی تریشی لەدورگەکانی براسیلین ولادیگۆ دەژین. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٥٥ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥ بەرەو باشوور.

دورگەکانی سیشل هەندێکیان مەرجانیە وهەندێکیان گرانێتییە. دورگە گرتانێتییەکان کۆمەڵێ رووبار چا وکەناری بەلمی سپی داپۆشراویان تێدەکەوێت وبەناوچەیەکی بەپیتن بەڵام

پڕ بوونی لە بەردەڵان بۆتە ڕێگرێك بۆ چالاکییە کشتوکاڵیەکان، دورگە مەرجانیەکانیشی بەردەڵانە ولەشێوەی بازنەییدایە چەند پێیەك لە سەروو ئاستی دەریاوەیە ولەبار نییە بۆ کشتوکاڵی.

وا پێشبینی دەکرێت کە دەریاوانە عەرەبەکان لەسەدەی دوانزدەیەمی زایینی یەکەم دۆزەرەوەی دورگەکان بوون. لەساڵی ١٥٠٥ دا پۆرتۆگالییەکان دۆزیویانەتەوە فاسکۆدا گاما ئاماژەی پێداوە لەکاتی گەشتەکانی لەمۆزامبیقەوە بەرەو هیند. فەرەنسییەکان لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا لێی نیشتەجێ بوون. لەناوی حاکمی فەرەنسی ئەو دورگانەوە جەنەراڵ جان مۆردۆ دو سیشل لەساڵی ١٧٥٦ دا ناوی دورگەکان هاتووە، هەندێکی کەش دەڵێن ناوی سیشل لەناوی یەکێك لەجۆرە سەدەفەکانی ئەو ناوچەیەوە هاتووە. لە سەدەی نۆزدەیەمدا جەنگێك لەنێوان فەرەنسا و چەند وڵاتێکی ئەوروپی بەرپا بووە لەسەر داگیرکردنی ئەو دورگانە وبەپێ ڕێکەوتننامەی ساڵی ١٨١٤ لەپاریس دورگەکان خراوەتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاوە. بەڵام بەریتانیا هیچ بایەخێکی بەگەشە پێدانی دورگەکان نەدا، تەنانەت تا ساڵی ١٩٤٤ یش قوتابخانەی تیانەکرابووە.

لەسەرەتای هەفتاکانی سەدەی بیستەمدا دانیشتوانی دورگەکان داوای کۆتایی هێنانیان بەدەسەڵاتی بەریتانی دەرکرد، بۆیە لەچوارچێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی لە ٢٩ / ٦ / ١٩٧٦ دا سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە ساڵی ١٩٧٧ دا کودەتایەك بەسەر سەرۆکی وڵات سێر جیمس مانشام لەلایەن کۆمەڵێ یاخییەوە و ئەلبرت فرانس رێنێیان بەسەرۆکی نوێ دیاری کرد، رێنێ لەهەڵبژاردنە گشتیەکانی سەرۆکایەتیدا لە ٢ / ٩ / ٢٠٠١ بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیکەش سەرکەوتنی بەدەست هێنایەوە هێشتا سەرۆکی وڵاتە.

جەژنی نیشتیمانی لە ٢٩ / ٦ ی هەموو ساڵێك ، ڕۆژی سەربەخۆیی.

ئابووری سیشل پشتی تەواوی بەگەشتوگوزار بەستووە بەهۆی کەنارە جوان وناوچە سروشتیەکانیەوە خەڵکانێکی زۆر رووی تێدەکەن، شایەنی باسە شاجوانی جیهان ساڵی ١٩٩٧ لەوڵاتە هەڵبژێردراوە.

دورگەی برالا دووەم دورگەی سیشلە لەرووی رووبەرەوە دوای دورگەی ماهی ، رووبەری برالا ٣٧ کم$^2$ دەبێت و دار گوێز هیندێکی تایبەتی تیایە بەناوی کۆکۆ دی میر بەناوبانگە و بەر ودرەختەکەشی هاوتایان نییە لەتەواوی جیهاندا، بۆیە ڕێکخراوی یۆنسکۆ ئەو درەختەی لەلیستی پارێزراوە جیهانییەکاندا داناوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣٤٦ ملیۆن دۆلار.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٧٠

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٦,٢١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٤٦ .

## دورگەکانی کۆمۆر

ناوی باو: دورگەکانی کۆمۆر

ناوی فەرمی: یەکێتی دورگەکانی کۆمۆر.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Union of The Comors

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری ئیسلامی یەکگرتوو، سەرۆکی یەکێتی، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی یەکگرتوو ( ٤٢ ئەندام )

رووبەر : ٧١٩ میل دووجا ، ١,٨٦٢ کم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ٥١٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٢٧٦ کەس/ کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: عەرەب، ئەفریقی، مالاویی.

ئاین: ئیسلام، کەمایەتییەکی مەسیحی ( رۆمان، کاسۆلیك) .

زمان: کۆمۆری، عەرەبی، فەرەنسی.

پایتەخت: مۆرۆنی.

شارە سەرەکییەکان: مۆتسامۆدۆ، دۆمۆنی، فۆمبۆنی، میتسامیۆلی، ستاهۆل.

دراو: فرەنکی کۆمۆری.

ئاووهەوا: خولگەیی، پلەکانی گەرما: ٢٣ پلەی سەدی وەك نزمترین ئاست، ٢٧ پلەی سەدی وەك بەرزترین ئاست. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٥٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: رووەکی ڤانێلا، گوێزی هیندی، رووەکە بۆندارەکان، میوە وسەوزە، برنج، مۆز، راوە ماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: عەتر .

سامانی کانزایی: نییەتی.

تێڕوانینێکی گشتی :

دورگەکانی کۆمۆر ( بەعەرەبی بەهەڵە پێی دەڵێن قەمەر کە خۆشیان باس لەوە دەکەن دەبێ بە قۆمۆر ناوببرێ تا قەمەر و بەنزمانی ئینگلیزیش هەر کۆمۆرە ) وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکی ئیسلامییە دەکەوێتە رۆژئاوای زەریای هیندی، لەباکووری کەناڵی مۆزامبیق لەنێوان باکووری رۆژئاوای دورگەی مەدغەشقەر و رۆژهەڵاتی تەنزانیا ومۆزامبیق، لەدووری

نزیکەی ۳۰۰ کم لە کەناری رۆژهەلاتی ئەفریقیاوە. لەچەند دورگەیەکی بچوك و چوار دورگەی سەرەکی پێك دێت:

۱. دورگەی کۆمۆری گەورە، هەروەها پێی دەوترێ ئینجاریا، پایتەختی ولاتی تێدەکەوێت.

۲. دورگەی موهیلی وهەشت دورگەی بچوکیشی لەتەنیشتەوەیە.

۳. دورگەی مایۆت، هەروەها پێشی دەوترێ : ماهۆری.

٤. دورگەی هەنزوان، ئەوروپیەکانیش پێی دەڵێن ئەنجوان.

ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکێری هێڵی درێژی ٤٤ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ۱۲ بەرەو باشوور.

دورگەکان بەرەچەڵەك گرکانین، لانی کەم گرکانێکیان هێشتا چالاکە ودەکەوێتە چیای کارتالا لەدورگەی کۆمۆری گەورە.چواردەوری هەندێ لەدورگەکان رێگرە مەرجانییەکان بلاو دەبنەوە.

زۆر لەکۆچبەرە عەرەب و ئەفریقی وئەندەنوسی ومەدغەشقەرییەکان بەدوای یەکدا لەدورگەکاندا جێنشین بوون. عەرەبەکان وەکو باسی لێوە دەکەن ناوی دورگەکانیش بەو ناوەی ئێستایەوە دەگەرێتەوە بۆ سەدەی هەشتەم، گوایە دەریاوانە عەرەبەکان لە مەسقەت وحەزرەمەوتەوە گەیشتونەتە دورگەکان لەکاتی مانگە شەودا بووە بۆیە پێی دەڵێن ( دورگەکانی قەمەر)، بەلام ئەوروپیەکان دەڵێن زووتر ئەو ناوچەیەیان دۆزیوەتەوە بۆیە پێی دەڵێن کۆمۆر، واتاکەشی دیار نییە. ئیسلامەکانیش لەسەدەی هەڤدەیەم وهەژدەیەمدا گەیشتونەتە ناوچەکە وئاینی ئیسلامیان تیا راگەیاندووە.

لە ساڵی ١٨٤٤ دا فەرەنسا باوەری بە دادوەری دورگەی مایۆت هێناوە کە دەسەلاتی دورگەی کۆمۆری گەورە بگرێتە دەست، بەلام لە ١٨٦٦ بۆ ١٩٠٩ توانیویەتی کۆنترۆڵی تەواوی دورگەکان بکات. لەجەنگی جیهانیی دووەمدا بەریتانیا تەواوی دورگەکانی داگیرکردووە و لەساڵی ١٩٤٦ دا بەخشیویەتی بەفەرەنسا.

دوای ئەو ماوەیە دەست کرا بەداواکاریەکانی سەربەخۆیی لەفەرەنسا. لە ۲۲ / ۱۲ / ۱۹۷٤ دا دەنگدانێك بەئەنجام گەیەنرا تەواوی دانیشتوان رەزامەندیان لە سەربەخۆیی دەربری. لە ۷ / ۷ / ۱۹۷٥ دا سەربەخۆیی دورگەکانی کۆمۆر راگەیەنرا ، جگە لەدورگەی مایۆت کە مانەوەی لەژێر دەسەلاتی فەرەنسادا هەڵبژارد.

لەبەروارای ۱۲ / ۱۱ / ۱۹۷٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان ولەبەرواری ۲۰ / ۹ / ۱۹۹۳ پەیوەندی کردووە بەکۆمەڵەی ولاتە عەرەبییەکانەوە.

یەکەم سەرۆکی دورگەکانی کۆمۆر دوای سەربەخۆیی : ئەحمەد عەبدواللە بووە. بەڵام بارودۆخە سیاسییەکانی ئەو وڵاتە لەدوای سەربەخۆییەوە ئارامی بەخۆوە نەبینیوە وچەندین ململانێی سیاسی روویداوە بۆتە هۆی ئەنجام دانی زیاتر لە بیست کودەتای سەربازی تا ساڵی ۲۰۰۲ .

زنجیرەی رووداوە گرنگەکان لەپەیدابوونی بزوتنەوە جیاخوازییەکان لەدورگەی هەنزوان لەدوای ساڵی ۱۹۹۷ بەم شێوەیە بووە:

- لە ۳ / ۸ / ۱۹۹۷ : جیاخوازییەکان بزوتنەوەی لەپێناوی سەربەخۆیی هەنزواندا داوای جیابوونەوە لە دورگەکانی کۆمۆر دەکەن ودەیانەوێ بچەنەوە ژێر دەسەڵاتی فەرەنسا، دەڵێن سەربەخۆیی لەساڵی ۱۹۷۵ نەداری ونەهامەتی نەبێت هیچی دیکەی لێ نەبۆتەوە.
- ۲۵ / ۲ / ۱۹۹۸ لەدەنگدانێکدا لە دورگەی هەنزوان ۹۹٪ ی دانیشتوان پشتگیری لەجیابوونەوە لە دورگەکانی کۆمۆر دەکەن وداوای پێك هێنانی وڵاتێکی سەربەخۆ دەکەن بەهۆی وەڵام نەدانەوەی حکومەتی دورگەکانی کۆمۆر بۆ داواکارییە ئابوورییەکانیان.
- ٦ / ۱۱ / ۱۹۹۸ : کۆچی دوایی سەرۆکی دورگەکانی کۆمۆر محەمەد تەقی عەبدولکەریم و تاجەلدین کوڕی سەعید دەسەڵات دەگرێتە دەست بەو پێیەی کە سەرۆکی ئەنجومەنی یەککگرتووە.
- ۲۳ / ٤ / ۱۹۹۹ نوێنەرانی هەردوو دورگەی کۆمۆری گەورە و مۆهیلی لە ئەنتانا ریفۆ ( پایتەختی مەدغەشقەر ) واژۆی پێکهێنانی یەکێتی دورگەکانی کۆمۆر دەکەن و مافی ئۆتۆنۆمی بە هەر دورگەیەك دەبەخشن بۆ دانانی چارەسەرێك بۆ کێشەی جیابوونەوەی دورگەی هەنزوان کە نوێنەرەکانی واژۆی رێکەوتنامەکەیان نەکرد بەپاساوی چاوەڕوانی دەنگدانێك رای دانیشتوانی دورگەکەیان بێت.
- ۲۹ / ٤ / ۱۹۹۹ : سەرۆکی ئەرکانی سوپا عەقید عوسمان غەزالی ( ٤٠ ساڵ ) کودەتایەکی سەربازی بەسەر حکومەت وسەرۆکی وڵات بەوەکالەت تاجەلدین کوڕی سەعید ماسوندی بەڕێوە دەبا.
- ٦ / ٥ / ۱۹۹۹ : عەقید عوسمان غەزالی سوێندی دەستووری دەخوات، بەپێی ئەو دەستوورەی خۆی داڕشتووە، بەڵێن دەدات لەگەڵ سوپا وڵات بەڕێوە بەرێت تاکۆتایی هاتنی ماوەی سەرۆکایەتی.
- ۲۳ / ۱ / ۲۰۰۰ : دانیشتوانی دورگەی هەنزوان لەرێی دەنگدانێکەوە پێکهێنانی یەکێتی دورگەکانی کۆمۆر رەت دەکەنەوە، ئەمەش مانای جیابوونەوەیە لە دورگەکانی کۆمۆر.

■ ١ / ٢ / ٢٠٠٠ : ڕێکخراوی یەکێتی ئەفریقی ئابلۆقەی ئابووری دەخاتە سەر دورگەی هەنزوان، ئەگەر بێت وملکەچی ڕێکەوتنی یەکێتی دورگەکانی کۆمۆر نەبێت. ئابلۆقەکان دەستبەسەر گرتنی پارەکانی دورگەی هەنزوانە لە بانکە ئەفریقییەکانی گرتۆتە خۆ.

■ ٢٦ / ٨ / ٢٠٠٠ : سەرۆکی وڵات عوسمان غەزالی و سەرۆکە جیاخوازییەکانی دورگەی هەنزوان : موقەدەم سەعید عوبەید عەبدول ڕەحمان ڕێکەوتنێك واژۆ دەکەن بۆ کۆتایی هێنان بەداواکاری جیابونەوەی دورگەی هەنزوان. ڕێکەوتنەکە ماف ئۆتۆنۆمی بەهەر دورگەیەك بەخشیووە لەژێر سایەی کۆماری دورگەکانی کۆمۆر.

■ ١٥ / ٢ / ٢٠٠١ : واژۆ کردنی ڕێکەوتننامەی ئاشتبونەوەی نیشتیمانی لەنێوان دورگەکانی کۆمۆر: دورگەی کۆمۆری گەورە، دورگەی هەنزان، دورگەی موهیلی. واچاوەڕوان دەکرێ ئەو ڕێکەوتننامەیە یەکێتی دورگەکانی کۆمۆر لەخۆی بگرێ.

■ ٩ / ٨ / ٢٠٠١ : سەلیم عەلی عەبدول، ناسراو بە باغلام، کودەتایەکی سەربازی بەسەر سەرۆکی دەسەڵاتی دورگەی هەنزوان موقەدەم سەعید ڕێکدەخات و لیژنەیەکی سیاسی – سەربازی پێکدەهێنێ بۆ بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی دورگەی ناوبراو تا کۆتایی هاتنی پرۆسەی ئاشتبونەوەی گشتی لەنێوان دورگەکانی کۆمۆر. شایەنی باسە سەرکردەکانی کودەتاکە خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی لەگەڕانەوەی دورگەی هەنزوان بۆ کۆماری دورگەکانی کۆمۆر.

■ ٢ / ١١ / ٢٠٠١ : موقەدەم سەعید عەبدول ڕەحمان شکست دەهێنێ لەئەنجام دانی کودەتایەکی سەربازی لەدورگەی هەنزوان و بەرەو دەرەوەی دورگەکە هەڵدێت.

■ ١٩ / ١٢ / ٢٠٠١ هەوڵی کودەتایەکی سەربازی لەدورگەی موهیلی شکست دەهێنێ.

■ ٢٤ / ١٢ / ٢٠٠١ : دانیشتوانی دورگەکانی کۆمۆر– لەڕێی دەنگدانێکەوە – ڕەزامەندی خۆیان دەردەبڕن لە دارشتنی دەستوورێکی نوێ بۆ وڵاتەکەیان بتوانن لەڕێیەوە کۆتایی بەکێشەکانی نێوان تەواوی دورگەکان بهێنێ. لە دەستووری نوێدا هاتووە گۆڕینی کۆماری ئیسلامی یەکگرتووی دورگەکانی کۆمۆر بۆ یەکێتی دورگەکانی کۆمۆر. هەر دورگەیەك سەرۆك ودەستوور وئۆتۆنۆمی سەربەخۆی هەبێت، جگە لەوەی هەر یەك لەو سێ دورگەیە چوار ساڵ جارێك سەرۆکایەتی یەکێتی ناوبراو لەخۆی بگرێت، لەکاتێکدا یەکێتی دورگەکان دەسەڵاتی کاروبارە دەرەکییەکان وبەرگری وکاروباری ئاینی لەژێر دەسەڵاتی خۆیدا بهێڵێتەوە، جگە لە ئەرکی ڕێکخستنی هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی وپەرلەمانیەکانش

لەخۆی بگرێت.

- ٢١ / ١ / ٢٠٠٢ : سەرۆكی دورگەكانی كۆمۆر : عەقید عوسمان غەزالی دەست لەكار دەكێشێتەوە، خۆی بۆ پرۆسەی هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتی تەرخان دەكات كە بڕیارە لە ١٤ / ٤ / ٢٠٠٢ دا بەئەنجام بگەیەنرێ.
- ١٠ / ٣ / ٢٠٠٢ زنجیرە هەڵبژاردنەكان دەست پێدەكات، ئامانجی هەڵبژاردنەكان پێكهێنانی چەند دەزگایەكە كۆتایی بەكێشەكانی نێوان تەواوی دورگەكان بهێنێ. لە خولی یەكەمدا سێ پاڵێوراو هەڵدەبژێردرێ .
- ١٤ / ٤ / ٢٠٠٢ : دەنگدەرانی دورگەكانی كۆمۆر ، لە خولی دووەمی هەڵبژاردنەكان عەقید عوسمان غەزالی هەڵدەبژێرن بۆ سەرۆكی یەكێتی دورگەكانی كۆمۆر.
- ٢٦ / ٥ / ٢٠٠٢ عەقید عوسمان غەزالی لە تەلاری دارولسەلام لە مۆرۆنی پایتەخت سوێندی دەستووری دەخوات ودەبێتە سەرۆكی یەكێتی دورگەكانی كۆمۆر.
- ٥ / ٦ / ٢٠٠٢ پێكهێنانی یەكەم حكومەتی یەكێتی دورگەكانی كۆمۆر بەسەرۆكایەتی عەقید ئەزالی ئۆسۆمانی، حكومەتەكە پێنج وەزارەتی لەخۆی گرتبوو، دوانیان لەدورگەی كۆمۆر گەورە و دوانیان لەدورگەی هەنزوان و یەكێكیش لەدورگەی موهیلی، سەرۆكی یەكێتیش دەستی كرد بەگواستنەوەی دەسەڵاتەكان بۆ هەر یەك لەو دورگانە.
- ٧ / ٧ / ٢٠٠٢ ئاهەنگی ٢٧ هەمین ساڵی سەربەخۆیی وڵات دەگێڕدرێت، ئەمەش یەكەم ئاهەنگ بوو دوای دامەزراندنی یەكێتی دورگەكانی كۆمۆر. بەڵام هەندێ لەبەرپرس وسەرۆكە ناوخۆییەكان ئامادەی ئاهەنگەكە نەبوون بەهۆی كێشەكانی نێوانیان لەسەر چۆنیەتی دابەشكردنی دەسەڵاتەكانی نێوانیان.

میللەتی دورگەكانی كۆمۆر بەیەكێك لە میللەتە هەرە هەژارەكانی جیهان دادەنرێت، هیچ پیشەسازییەكی گرنگیان نییە. دورگەكانیشیان هیچ سامانێكی سروشتی ئەوتۆی لەخۆی نەگرتووە. باری ئابووری ئەو وڵاتە پشتی بەچالاكییە كشتوكاڵییەكان بەستووە. گوڵ ورووەكە بۆندارەكان سەرەكیترین سەرچاوەی داهاتەكانیەتی، بۆیە بە دورگەكانی عەتر ناودەبرێت.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢٤٩ ملیۆن دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٧٣ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٥١٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٤٤ .

## دورگەكانی مارشاڵ

**ناوی باو:** دورگەكانی مارشاڵ.

**ناوی فەرمی:** كۆماری دورگەكانی مارشاڵ.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Marshall Islands

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار خۆی سەرۆكی حكومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

پەرلەمان ( ٣٣ ئەندام )

ئەنجومەنی سەرۆكەكان ( ١٢ ئەندام )

**رووبەر :** ٧٠,٠٧ میل دووجا، ١٨١,٤٨ كم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦٠,٣٠٠كەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٣٣٢,١ كەس/ كم$^{٢}$

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** گەلی دورگەكانی مارشاڵ، گەلی دورگەكانی زەریای هێمن، فلیپینی، ئەمریكی.

**ئاین:** مەسیحی ( پرۆتستانت ، رۆمان كاسۆلیك ) .

**زمان:** مارشاڵی، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** دالاب ئۆلیجا داریت.

**شارە سەرەكییەكان:** ئیبی.

**دراو:** دۆلاری ئەمریكی.

**ئاوو هەوا:** خولگەیی گەرم وشێدارە، گۆڕانكاری بەسەر پلەكانی گەرما بەكەمی روودەدات، نێوەندی پلەكانی گەرما ٣٠ پلەی سەدی.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** گوێزی هیندی، مۆز، راوەماسی، دارو درەخت.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** ناوكی وشك كراوەی گوێزی هیندی.

**سامانی كانزایی:** فۆسفات.

**تێڕوانینێكی گشتی :**

مارشال وڵاتی كۆمەڵە دورگەیەكە دەكەوێتە ناوەڕاستی زەریای هێمن، بەرەو رۆژهەڵاتی دورگــەكانی كــارۆلین وبــاكووری رۆژئــاوای دورگــەكانی جیلبــەرت، نزیكــەی ٣٥٠٠ كــم لەباشووری رۆژئاوای دورگەكان هاوای یەوە دوورە، سەر بەناوچەیەكی زەریای هێمنە پێی

دەوترێ میکرۆنیزیا ( واتا دورگە بچوکەکان ) . ناوەڕاستی دورگەکان دەکەوێتە سەر یەکێری هێڵی درێژی ١٧٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٠ بەرەو باکوور.

دورگەکانی مارشاڵ لە ٣٤ دورگە پێك هاتووە، هەندێکیان مەرجانین وهەندێکیان ئاساین، تەختی تەواوی دورگەکان نزمە و بواری دەریاییشیان بەرووبەری ١,٤٠٠,٠٠٠ کم دەبێت، بەسەر دوو زنجیرەی یەکساندا بڵاو دەبنەوە ماوەی نێوانیان ٢٠٠ کم دەبێت، هەر وزنجیرەیەکیش بەدرێژی ١٠٠٠ کم درێژ دەبێتەوە لەشێوەی کەوانێك لە باکووری رۆژئاواوە دەست پێدەکات و لەباشووری رۆژهەڵاتەوە کۆتایی پێدێت.

دوو زنجیرە دورگەکەش ئەمانەن:

١. زنجیرەی رۆژهەڵات، پێشی دەوترێت: راتاك، بەمانای رۆژهەڵات.
٢. زنجیرەی رۆژئاوا، پێشی دەوترێت : رالیك، بەمانای رۆژئاوا.

یەکەم کەس گەیشتۆتە دورگەکان دەریاوانی ئیسپانی ئەلفارۆ دی ساندرا بووە لەساڵی ١٥٢٩، دوای ئەو کاپتنی دەریاوانی بەریتانی جۆن مارشاڵ لەساڵی ١٧٨٨ دا دۆزیویەتییەوە وبەناوی خۆیەوە ناوی لێناون ( دورگەکانی مارشاڵ ) . خاوەنداریێتی دورگەکان لەساڵی ١٨٨٥ دا کەوتۆتە دەست ئەڵمانەکانەوە. لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا یابان دورگەکانی داگیر کردووە. دوای جەنگ ( ١٩١٨ ) کۆمەڵەی نەتەوەکان ( عوسبەت الامم ) دەسەڵاتی دورگەکانی بەیابان سپێردراوە. لەساڵی ١٩٣٢ دا یابان لە یەکێتی نەتەوەکان جیابۆتەوە وخاوەنداریێتی خۆیانیان لەدورگەکان راگەیاندووە ورێیان لە ئەوروپییەکان گرتوە بێنە ناو دورگەکانەوە وچەند بنکەیەکی دەریاییان لێ سازداوە. لەجەنگی جیهانیی دووەمدا ئەمەریکا دورگەکانی داگیر کردووە. لەساڵی ١٩٤٧ دورگەکانی مارشاڵ بۆتە بەشێك لەو ناوچەیەی زەریای هێمن کە دەکەونە ژێر راسپاردەیی نەتەوە یەکگرتوەکان، ئەویش لەلایەن خۆیەوە ئەرکی بەڕێوەبردنی خستە دەستی ویلایەتەی یەکگرتوەکان.

لە ساڵی ١٩٧٩ دورگەکانی مارشاڵ ئۆتۆنۆمی پێبەخشرا، جگە لە بەرگری نەبێت.

لە ساڵی ١٩٨٢ دا حکومەتی دورگەکانی مارشاڵ لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکاندا رێکەوتنی یەکێتی ئازادیان واژۆ کرد.

لە ساڵی ١٩٨٣ دا گەلی دورگەکانی مارشاڵ وکۆنگرێسی ئەمریکی رێکەوتنەکانیان پەسەند کرد. بەپێ رێکەوتننامەکە گەلی دورگەکانی مارشاڵ خۆی کاروباری ناوخۆ ودەرەوەی ولاتەکەی بەڕێوە دەبات وویلایەتە یەکگرتوەکانیش ئەرکی بەرگری کردنی دورگەکەی لەخۆی دەگرێت ( لەکاتی پێویستدا ).

لە ٢٢ / ١٢ / ١٩٩٠ دا ئەنجومەنی ئاسایشی کۆتایی دێنێت بەراسپاردەیی ویلایەتە

یەکگرتوەکان بۆ سەر دورگەکانی مارشاڵ.

لە ١٧ / ٩ / ١٩٩١ دا پەیوەندی دەکات بە نەتەوە یەکگرتوەکانەوە.

چالاکییە کشتوکاڵیەکان هیچ بایەخێکی ئابووری ئەوتۆی پێنەدراوە، باری ئابووری دورگەکانی مارشاڵ پشتی بەکانەکان بەستوە لەبەرهەمی فۆسفاتدا. ساڵانە نزیکەی ٦٠٠٠ گەشتیار لە یابان و ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە سەردانی دەکەن.

بنکەی موشەکەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکان کە لەو دورگەیەدان ٢٥٪ ی داهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتەی مسۆگەر کردووە. ناوچەکە بەتاقیکردنەوە ئەتۆمی وهایدرۆجینییەکان بەناوبانگە، ویلایەتە یەکگرتوەکان لە بەرواری ١ / ١١ / ١٩٥٢ بۆمبێکی هایدرۆجینی لەدورگەی ئینیۆتیۆك، کە یەکێکە لە دورگەکانی مارشاڵ، تەقاندۆتەوە وبۆتە هۆی تێکدانی ژینگەی ئەو دورگەیە، تا ئاستێ دانیشتوانی دورگەی ناوبراو داوای قەرەبووکردنەوە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان دەکەن. شایەنی باسە وڵاتی دورگەکانی مارشاڵ خۆی بەهاوپەیمانی ئەمەریکا وئیسرائیل و میکرۆنیوزیا دەزانێ وپشتیوانیان لێدەکات لەنەتەوەی یەکگرتوەکان لەکاتی دەرکردنی هەر بریارێك سەبارەت بەو وڵاتانە.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٨٨ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٨٦ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١,٦٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٩ .

## دورگەکانی مالدیڤ

ناوی باو: دورگەکانی مالدیڤ .

ناوی فەرمی: کۆماری دورگەکانی مالدیڤ

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Maldives

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی هاولاتیان ( ٤٨ ئەندام )

رووبەر : ١١٥ میل دووجا، ٢٩٨ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ٢٦٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٨٩٦ کەس / کم$^{٢}$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو ولاتە: سەنهالی، عەرەب، ئەفریقی.

ئاین: موسڵمان.

زمان: دیڤی.

پایتەخت: مالە

شارە سەرەکییەکان: نییەتی.

دراو: رۆڤیا .

ئاوو هەوا: گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی، رێژەی سالانەی بارانەکان ٢٥٠ سم لەدورگە باکوورییەکان و ٣٥٠ سم لەدورگە باشوورییەکان.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: بیبەری سوور، گوێزی هیندی، هەرزن، پەتاتە، راوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروست کراوەکانی خووری ( چنینی دەست ) .

سامانی کانزایی: میکە ( ماددەیەکە بۆ دروستکراوە ئەلیکترۆنییەکان بەکار دێت) .

تێڕوانینێکی گشتی :

مالدیڤ ولاتێکی ئیسلامی کۆمەڵە دورگەیەکە، یەکێکە لە ولاتە بچوکەکانی جیهان، دەکەوێتە ناوەڕاستی زەریای هیندی بەرەو باشووری رۆژئاوای هیند وسیریلانکا، نزیکەی لە دوو هەزار دورگەی بچوک پێك دێت، لەوانە ٢١٠ دورگەیان نیشتەجێ کراون، لەشێوەی زنجیرەیەکی لێك نەپچڕاو بەدرێژایی ٧٦٤ کم وپانتایی ١٢٩ کم پێك هاتوون. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧٣ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٥ بەرەو باکور.

دورگەکانی مالدیڤ بەرەچەڵەك مەرجانین ولە ١٢ گروپ پێك هاتووە، زنجیرەیەك بەردەلانی

زۆر چوار دەوری دورگەکانی گرتووە ولەئاوی دەریا دەیانپارێزێت.رووبەری هیچ کام لەو دورگانە لە ١٣ کم تێناپەڕێت، رووبەری زۆریشیان زۆر لەوە کەمترە وزۆربەشیان لەشوێنە دەچن کە دوو مەتر لە لەسەر ئاستی دەریاوە بەرز بوونەتەوە، بۆیە دورگەکانی مالدیڤ بەنزم ترین ناوچەکانی جیهان دادەنرێن. بەرزترین دورگەکانی: دورگەی ویلینگلیە وبەرزییەکەی ٢٤ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا دەبێت. زانایان واپێشبینی دەکەن لەسی سالی داهاتوودا زۆربەی دورگەکانی ئەو ولاتە نوقمی ئاوی دەریا دەبن وديار نامێنن، بەهۆی بەرزبوونەوەی ئاوی دەریاکان دوای پەیدا بوونی دیاردەی گیرخواردنی گەرمی کەدووچاری گۆی زەوی بووە لەم دوایانەدا، تەختی دورگەکان چەند دەریاچەیەکی بچوکی لەخۆ گرتووە وزەوییەکانیشی بەگژوگیا وکەنارەکانیشی بەلمێکی سپی داپۆشراون جگە لە داری گوێز هیندییەکان.

لە سالەکانی ٥٠٠ ی زایین خەلکی لە سیریلانکای دراوسێوە ( سیلان ) بەرەو ئەو ولاتە کۆچیان کردووە وبەئاین بوودی بوون. لەسالی ١٢٠٠ ی زایینی ئاینی ئیسلام لە مالیبارەوە ( کەناری هیندی باشووری رۆژئاوا ) گەیشتۆتە ئەو ناوچەیە. گەڕیدەی عەرەبی مەغریبی کوڕی بەتووتە سەردانی ئەو ناوچەیەی کردووە ولەوێشدا لەسالی ١٣٤٣ بۆتە قازی. پۆرتۆگالییەکان لە سالەکانی ١٥٥٨ – ١٥٧٣ داگیریان کردووە. ئەلمانەکان لەنێوان سالەکانی ١٦٥٦ – ١٧٩٦ دەسەلاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. لەسالی ١٨٨٧ دا بۆتە پارێزراوەیەکی بەریتانی وماف ئۆتۆنۆمی پێ بەخشراوە وبەریتانیا چاودێری کاروبارەکانی دەرەوەی کردووە.

لەبەرواری ٢٦ / ٧ / ١٩٦٥ سەربەخۆ بووە لەبەریتانیا. لەهەمان سالدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەمانگی دەی ١٩٦٨ بۆتە کۆمار. لەسالی ١٩٨٢ دا پەیوەندی کردووە بە کۆمۆنۆلتی بەریتانی.

لە سالی ١٩٦٨ دا ئیبراهیم ناسیر دەسەلاتی گرتۆتە دەست و لەدوای ئەو لەسالی ١٩٧٨ دا مەئموون عەبدولقەیوم بۆتە سەرۆکی ولات، هەولەکانی سێ کودەتا بەسەر عەبدولقەیوم شکستی هێناوە ، دواییەیان لەسالی ١٩٨٨ دا هەندێ لەبەکرێگیراوە سیریلانکییەکان ویستیان بەئەنجامی بگەیەنن کاتێ هێرشیان کردە سەر مالدیڤ، بەلام بەیارمەتی هێزی پەرەشووتەکانی هیند توانیان کۆنترۆلی بارودۆخەکە بکەن وهێمنی بگەڕێنەوە بۆ ولات.

وشەی مالدیڤ بەڕەچەلەك زاراوەیەکی سەنسکریتییە وبەمانای زنجیرە دورگە دێت. بەلام چەند رایەکی جیاواز بۆ لێکدانەوەی مانای مالدیڤ هاتووە، لەوانە:

١. مال : بەمانای مال یان جێ دێت.

٢. دیڤا : بەواتای دورگە دێت.

بەلێکدانی هەردوو وشەکە دەبێتە مالدیڤ.

راوە ماسی سەرەکیترین چالاکییەکانی ئەو وڵاتەیە وباری ئابووری پشتی تەواوی پێبەستووە ویەك لەسەر پێنجی تێکرای داهاتی نەتەوەیی مسۆگەر کردووە. جگە لەوەی گەشتوگوزاریش رۆڵێکی گەورە دەبینێت لەو داهاتە، بەهۆی جوانی سروشتی کەنارەکانی ئەو کۆمەڵە دورگەیە ساڵانە زیاد لە ٣٦٥ هەزار گەشتیار سەردانی دەکات.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٢٢١ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٧٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٩٠٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١١٩ .

## باشووری ئەفریقیا

**ناوی باو:** باشووری ئەفریقیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری باشووری ئەفریقیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of South Africa

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٩٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٤٠٠ ئەندام )

**رووبەر :** ٤٧٠,٦٩٣ میل دووجا، ١,٢٩٠,٠٩٠ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤٢,٤٤٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٣٤,٨ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش ( لەچەند خێڵێك پێك هاتوون، گرنگترینیان: زۆلۆ، هۆسا ٧٤ ٪ ی کۆی دانیشتوانی وڵات ) ، ئەوروپی، تێکەڵە، ئاسیایی.

**ئـاین:** مەسـیحی ( کڵێـسای سـەربەخۆی ئـەفریقی ، رۆمـان کاسـۆلیك، ئـەنگلیکان ) ، هیندۆس، موسڵمان، جوولەکە، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** ئەفریقانی ( لەزمانی هۆڵەندییەوە وەرگیراوە )، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** سێ پایتەختی هەیە :

- کیپ تاون : پایتەختی یاسادانان
- بریتۆریا : پایتەختی بەڕێوەبردن
- بلومفۆنتین: پایتەختی دادگایی.

**شارە سەرەکییەکان:** یۆهانسبێرگ، دۆربان، بۆرت ئەلیزابێس، ئیست لەندەن.

**دراو:** راند.

**ئـاوو هـەوا:** مـام ناوەنـد وفێنکـە بەشـێوەیەکی گـشتی، بـەڵام بـەپێی ناوچـەکان چـەند گۆڕانکارییەکیان بەسەردا دێت:

-چیاکانی کاب: فێنك ووشکە لەهاویندا، ساردە وبارانی لێدەبارێت لەزستاندا.

-بانە رۆژهەڵاتیەکان: هاوین بەرۆژ گەرم وشەوان فێنکە. زستان بـەرۆژ فێنکە وبەشـەو ساردە.

-ناوچە کەنارییەکان: هاوین گەرم وشێدارە وزستان خۆرهەتاو و وشکە.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: گەنم، جۆ، گەنمە شامی، قامیشی شەکر، میوە وسەوزە، راوەماسی، بەخێوکردنی مەڕو ماڵات.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئاسن وپۆڵا، ئۆتۆمبێل، دروستکراوەکانی خووری، دروستکراوە خۆراکییەکان، دروستکراوە کیمیاییەکان، ئامێر.

سامانی کانزایی: ئاڵتون، مس، زیو، ئەڵماس، قورقوشم، ئاسن، زنك، خەڵووزی بەردین، مەنگەنیز، ئەزبێس، نیکل، کرۆمیت، مۆناویت.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

باشووری ئەفریقیا، یان ئەنزانیا بەزمانی دانیشتوانەکەی، وڵاتێکە دەکەوێتە لای باشووری کیشوەری ئەفریقیا. نامیبیا وبتسوانا وزمبابۆی و مۆزامبیق دەکەونە باکووری، سوازیلاند دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی وزەریای هیندی دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە رۆژئاوای. وڵاتی لیسۆتۆ دەکەوێتە لای بەشی رۆژهەڵاتی باشووری ئەفریقیا و هەر چوار دەوریشی بەخاکی باشووری ئەفریقیا گیراوە. تا ساڵی ١٩٩٤ باشووری ئەفریقیا لەچوار بەش پێك هاتبوو:

١. کاب.
٢. ترانسڤاڵ.
٣. ئۆرانجی ئازاد.
٤. ناتاڵ.

بەپێ ئەو دەستوورەی لە ٢٧ / ٤ / ١٩٩٤ دا دارێژراوە، سەرلەنوێ وڵات دابەشکرایەوە بۆ نۆ هەرێم. رۆژی ٢٧ / ٤ ی هەموو ساڵێکیش بەجەژنی نیشتیمانی دادەنرێت. ناوەڕاستی باشووری ئەفریقیا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٥ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٩ بەرەو باشوور.

بانەکان بەشی ناوخۆی وڵاتەکە دادەپۆشن، چیاکانیش لەهەموو روویەکەوە چوار دەوریان گرتووە. ناوچە کەنارییەکانیش لەمۆزامبیقەوە تا چیاکانی کاب درێژ دەبێتەوە و نزیکەی ٦٠٠ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا بەرز دەبێتەوە. چیاکانی کاب بەدرێژایی کەنارەکانی سەر زەریای ئەتڵەسی تادەگاتە نامیبیا درێژ دەبێتەوە. لەکۆتاییدا بیابانی کەلهاری ناوەڕاستی باکووری وڵات تا دەگاتە بتسوانا دادەپۆشێ.

مێژووی نیشتەجێ بوونی باشووری ئەفریقیا دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەها ساڵ لەمەوبەر. لەسەدەی دووەمی زایینی جوتیارە باتۆییەکان لەباکوورەوە گەیشتوونەتە رۆژهەڵاتی وڵات،

ئەوانیش بەخەڵکی ڕەسەنی ناوچەکە دادەنرێن.

مێژووی نوێشی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٦٥٢ کاتێ هۆڵەندییەکان گەیشتونەتە ناوچەی شاری کیپ تاونی ئێستا. لەساڵی ١٨١٤ دا بەریتانیا بەتەواوەتی کابی داگیر کرد. لەساڵی ١٨٣٦ دا بوێرییەکان داگیرکراوەی کابیان چۆڵکرد وبەرەو ناتال و ویلایەتی ئۆرانجی ئازاد و ترانسڤال بەڕێکەوتن، بوێر بەمانای هۆڵەندی بەمانای جوتیار دێت ولەدواییدا بووە زاراوەیەك بە ئەورووپییەکان دەوترا. لەساڵی ١٨٥٢ دا ترانسڤال بووە کۆماری بوێرییەکان، هەروەها ویلایەتی ئۆرانجی ئازادیش لەساڵی ١٨٥٤ دا بووە کۆماری بوێرییەکان. لەساڵی ١٨٧٧ دا بەریتانیا ترانسڤالی خستە سەر داگیرکراوەکانی خۆی، شانشینی زۆلۆی لە ١٨٧٩ دا تێکشکاند. لەساڵەکانی ١٨٨٠ – ١٨٨١ دا بوێرییەکانی ترانسڤال بەریتانیەکانیان لە شەڕی یەکەمی بوێر – ئینگلیزی تێکشکاند. بەڵام هێندەی نەخایاند لەشەڕی دووەمی بوێر – ئینگلیز لە ساڵەکانی ١٨٩٩ – ١٩٠٢ ، بوێرییەکانیان تێکشکان وئینگلیزەکان توانیان ترانسڤال و ویلایەتی ئۆرانجی ئازاد بخاتەوە سەر داگیرکراوەکانی.لەبەرواری ٣١ / ٥ / ١٩١٠ هەر یەك لە ترانسڤال وئۆرانجی ئازاد وهەرێمی کاب وناتال یەکیان گرت ویەکێتی باشووری ئەفریقیایان پێك هێنا. لەساڵی ١٩١٢ پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی ئەفریقی دامەزراو وبانگەشەی بۆ یەکسانی نێوان پێست ڕەش وسپییەکان دەکرد. لەساڵی ١٩٣٢ دا بەریتانیا سەربەخۆیی تەواوی بە باشووری ئەفریقیا بەخشی ولە ساڵی ١٩٣٤ دا بووە ئەندامی کۆمۆنوێلتی نەتەوەکان. یەکێتی باشووری ئەفریقیا لەهەردوو جەنگی یەکەم ودووەمدا چۆتە پاڵ هاوپەیمانان ، لە ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

سیاسەتی نەژادی کە یەکێتی باشووری ئەفریقیا پەیڕەوی دەکرد بەرامبەر بەدانیشتوانە ڕەش پێستەکان ( ئەپارتید ) بووە هۆی پەیدا بوونی بەرەنگارییەکی زۆر لەلایەن وڵاتانی کۆمۆنوێلتی بەریتانی و وڵاتە ئەفەریقییەکان، بۆیە لە کۆمۆنوێلتی بەریتانی کشایەوە و لە ٣١ / ٥ / ١٩٦١ دا بۆتە کۆماری باشووری ئەفریقیا.

لە ساڵی ١٩٨٤ دا ڕەش پێستەکان ناڕەزایی وبەرەنگارییەکی بەرفراوانیان دەربڕی بەرامبەر بەشداری نەکردنیان لەدەسەڵات وبەڕێوەبردنی کاروباری وڵات، بووە هۆی ئازاد کردنی سەرکردەی ڕەش پێستەکان نێلسۆن ماندێلا لە بەرواری ١١ / ٢ / ١٩٩٠ دوای ئەوەی نزیکەی ٢٨ ساڵ لەزینداندا بوو، ماندێلا پاش ساڵێك لەئازادکردنی سیاسەتی نەژادی ڕەتکردەوە.

لە ١٥ / ٨ / ١٩٨٩ فریدریك دی کلێرك بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژێردرا ودایین سەرۆکی سپی

پێست لەباشووری ئەفریقیا. لە بەرواری ٩ / ٥ / ١٩٩٤ دا هەڵبژاردنێکی ئازاد بەئەنجام گەیەنرا، لەم هەڵبژاردنەدا نێلسۆن ماندێلا بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا، ماندێلا یەکەم سەرۆکی رەش پێست بوو لە باشووری ئەفریقیادا.

لەساڵی ١٩٩٣ دا هەر یەك لە نێلسۆن ماندێلای سەرۆکی کۆنگرەی نیشتیمانی ئەفریقی وفریدریك دی کلێرك خەڵاتی نۆبڵی ئاشتیان وەرگرت وەك پاداشتێك لەو هەوڵانەیان لەپێناوی سەقامگیرکردنی ئاشتی لەسەرانسەری باشووری ئەفریقیا.

لە بەرواری ٢ / ٦ / ١٩٩٩ بەملیۆنەها هاوڵاتی باشووری ئەفریقیا لە تەواوی کۆمەڵە نەژادییەکانەوە بەرەو سنوقەکانی هەڵبژاردن بەرێکەوتن لە دووهەم هەڵبژاردنی لەم جۆرە کەتەواوی چین ونەتەوە ونەژادییەکان بەشداری تیا بکەن. دەنگدەران خەڵاتی ماڵئاواییان بە نێلسۆن ماندێلا بەخشی وەك یەکەم سەرۆکی هەڵبژێردراوی وڵاتەکەیان پاش ئەوەی پارتی ماندێلا پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی ئەفریقی رێژەی ٦٦,٤ ٪ ی کۆی دەنگەکانی بەدەست هێنا.

لە ١٤ /٦/ ١٩٩٩ پەرلەمانی باشووری ئەفریقیا سەرکردەی پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی ئەفریقی : تابۆ مبیکی ( ٥٦ ساڵ ) بەسەرۆکی وڵات هەڵبژارد، شایەنی باسە مبیکی جێگری سەرۆکی پێشوو ماندێلا بوو جگە لەوەی کە لەساڵی ١٩٩٧ بەدواوە سەرۆکی پارتی ناوبراویش بوو.

لەبەرواری ١٦ / ٦ / ١٩٩٩ دا سەرۆك تابۆ مبیکی سوێندی دەستووری لە بریتۆریا بەچوار زمان خوارد لەکۆی یانزدە زمانی فەرمی ئەو وڵاتە: سۆتۆ، ئەکسهۆسا، ئینگلیزی، ئفریقانی، وەك هێمایەك لەیەکێتی وڵاتەکەی.

ئاهەنگی رێورەسمی سوێند خواردنەکە نوێنەری زیاتر لە ١٢٠ وڵاتی لەخۆ گرتبوو، لەوانە ٣٠ سەرۆکی وڵات.

باشووری ئەفریقیا بەدەوڵەمەندترین وڵاتی باشووری ئەفریقیا دادەنرێت. بەڵام داهاتی ئەو وڵاتە بەیەکسانی بەسەر تاکەکاندا دابەش ناکرێ. سپی پێستەکان کە بەکەمایەتی ئەو وڵاتە دادەنرێن لەچاو دانیشتوانە رەش پێستە سەرەکییەکان، ژیانێکی زۆر بەبەها ودەوڵەمەند دەبەنە سەر لەچاو رەش پێستەکاندا.

ئەوەی کە گەشەی داوە بەباری ئابووری ئەو وڵاتە هاندانی بەرهەمهێنەرەکان وپێدانی قەرزە زۆرەکانە بە هاوڵاتیان بۆ پەرەپێدانی پیشەسازی لەو وڵاتەدا. ئەمە جگە لە دەوڵەمەندی ئەو وڵاتە لە سامانە سروشتییەکان وهەرزانی نرخی دەستی کار لە ئەفریقیا، تەواوی ئەم هۆکارانە توانیان باشووری ئەفریقیا بکەنە پێشرەوی وڵاتە پێشکەوتووەکان

لەرووی پیشەسازییەوە.

گەشتوگوزاریش بەشدارییەکی بێ وێنەی کردووە لەپتەوکردنی ئابووری ئەو ولاتە بەهۆی هەمە جۆری ناوچە گەشتوگوزارییەکان، باشووری ئەفریقیا بەوە وەسف کراوە کە جیهانێکی تەواوە لەنێو یەك ولاتدا کۆبۆتەوە.

لە بەرواری ٢ / ٩ / ١٩٩٨ لەشاری دوربانی سەر زەریای هیندی بە بەشداری زیاتر لە ٧٠ سەرۆك ولات و سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان کۆفی ئەنان، کۆنگرەی دوانزدەیەمینی ولاتانی بێلایەن بەڕێوە چوو.

باشووری ئەفریقیا بە پلەی یەکەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی ئاڵتون بەپلەی دووەم دێت لەبەرهەمی ئەڵماس وبەپلەی پێنجەم دێت لەبەرهەمی خەڵوز، بەپلەی حەوتەم دێت لەبەرهەمی نیکل وبەپلەی هەشتەم دێت لە بەرهەمی قورقوشم وگەنمەشامی وبەپلەی نۆیەم دێت لەبەرهەمی مەڕ وئاسن، بەپلەی چواردەیەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی زیو ومس و بەپلەی پانزدەیەم دێت لەبەرهەمی قامیشی شەکر وبەپلەی حەڤدەیەم دێت لەبەرهەمی زنك، پلەی نۆزدەیەم دێت لە مانگا.

سروودی نیشتیمان: هاواری باشووری ئەفریقیا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٢٥,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٢٨.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢,٠١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٦٢.

## گواتیمالا

**ناوی باو:** گواتیمالا

**ناوی فەرمی:** کۆماری گواتیمالا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Guatemala

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** کۆنگرێسی نیشتیمانی ( ٨٠ ئەندام ).

**رووبەر :** ٤٢,٠٤٢ میل دووجا، ١٠٨,٨٨٩ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١١,٩٢٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٣,٢ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** هیندی ئەمریکی، لادینۆس ( تێکەڵەیەکن لە ئیسپانی وهیندی ).

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیک، پرۆتستانت )

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** گواتیمالا سیتی.

**شارە سەرەکییەکان:** ئیسکۆنتلا، بویرتۆ، باریۆس، ئەنتیگوا، سان هۆزێ.

**دراو:** کویتزال.

**ئاووهەوا:** خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما لەناوچە نزمەکاندا ٢٧ پلەی سەدی، لەناوچە بەرزەکاندا لەنێوان ١٦ بۆ ٢١ پلەی سەدی دەبێت. لەناوچە زۆر بەرزەکانیش پلەکانی گەرما دادەبەزن بۆ ٤ پلەی سەدی. بارانەکانیش بەپێی ناوچەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت، لەنێوان ٥٠ سم بۆ ٣٨٠ سم دەبێت ولەزۆربەی رۆژەکانی ساڵ دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، فاسۆلیا، مانگا، قاوە، جۆ، لۆکە، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوەکانی خووری، پۆشاك، دروستکراوە خۆراکییەکان، خواردنەوەکان.

**سامانی کانزایی:** نەوت، قورقوشم، نیکل، زنك.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

گواتیمالا، بەزمانی خەڵکی رەسەنی وڵاتەکە بەمانای : ئەو باڵندانەی مار دەخۆن دێت، وڵاتێکە لەئەمەریکای ناوەڕاست، مەکسیك دەکەوێتە رۆژئاوا وباکووری، بیلیز وهندۆراسیش

دەکەونە رۆژهەلاتی، سلڤادۆریش دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی. دوو کەناری هەیە یەکێکیان دەکەوێتە سەر دەریای کاریبی لەرۆژهەلاتەوە، ئەوی کەشیان دەکەوێتە زەریای هێندی لە باشوورەوە. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۹۰ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ۱۵ بەرەو باکوور.

باکووری گواتیمالا بریتییە لە دەشتێك بەدارستان وگژو گیایەکی زۆر داپۆشراوە ودەکەوێتە سەر کەناری زەریای هێمن وزۆربەی ناوچە کشتوکاڵییەکانی تیدەکەوێت.زنجیریەیەك چیا لەرۆژهەلاتی ولاتەوە بۆ رۆژئاوای درێژ دەبێتەوە وبەرزترین لوتکەشی لەسەر چیای فولکانە وبەرزییەکەی دەگاتە ٤٢٢٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریا، بە بەرزترین چیای ئەمەریکای ناوەراست دادەنرێ وپایتەختی ولاتیش دەکەوێتە ئەو ناوچەیە.

مێژووی ناوچەکە دەگەرێتەوە بۆ سەدەی پانزدەیەمی پێش زایین. کاتێ هیندە سوورەکان چالاکییە کشتوکاڵیەکانیان لەو ناوچەیە ئەنجام داوە وقوڵینە وگۆزەی قوڕ وراخەریان لەوێدا دروست کردووە. لەنێوان سەدەکانی سێهەم ونۆیەمی زایینی ناوچەکە گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە وشارستانێتی مایای لێدەمەزراوە. لەساڵی ١٥٢٣ ئیسپانییەکان لە مەکسیکەوە هێرشیان کردۆتە سەر وداگیریان کردووە وبەبەشێکی مەکسیکیان داناوە. لەبەرواری ١٥ / ٩ / ١٨٢١ سەربەخۆیی خۆی راگەیاندووە وبۆتە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی مەکسیکی. لە ١٨٢٣ دا لەمەکسیك جیابۆتەوە ولەگەڵ چەند ولاتێکی ئەمەریکای ناوەراست یەکێتی هەرێمەکانی ئەمەریکای ناوەراستیان پێك هێناوە، لەساڵی ١٨٣٩ لەیەکێتی ناوبراو جیابۆتەوە وکۆمارێکی سەربەخۆی راگەیاندوە ویەکەم سەرۆکی کۆمار جەنەراڵ رەفائیل کاردێرا بوو کە حوکمێکی دیکتاتۆری پەیرەو دەکرد وتا ساڵی ١٨٦٥ لەدەسەلاتدا ماوەتەوە.

لەهەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ودووەم گواتیمالا جەنگی لەدژی ئەڵمانیا راگەیاندووە. لەساڵی ١٩٣٣ دا کۆتایی هێناوە بەکێشەیەکی سنووری لەگەڵ هیندۆراسی دراوسێیدا کە نزیکەی ١٠٠ ساڵی خایاندووە. لە ساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەدوای شەستەکانی سەدەی پێشووەوە گواتیمالا چەندین ململانێی سیاسی بەخۆوە بینیوە وچەند کودەتایەکی سەربازی لەو ولاتەدا ئەنجام دراوە، سەربازییەکان چەند جارێك حوکم ودەسەلاتیان گرتۆتە دەست و دەستووریش چەند جارێك گۆرانکاری بەخۆوە بینیوە، جەنگێکی ناوخۆی گەورە وتوندی لێ هەڵگیرساوە نزیکەی ١٠٠,٠٠٠ قوربانی لێکەوتۆتەوە لەنێوانیاندا سەرکردە سیاسییەکانی ولات، جەنگی ناوخۆ تاساڵی ١٩٩٦ ی خایاندووە، تا ئەو کاتەی سەرۆك ئەلڤارۆ ئۆرزۆ ئیریجۆن دەسەلاتی گرتۆتە دەست وکۆتایی بەشەری ناوخۆ

هێناوه.

له بەرواری ٧ / ١١ / ١٩٩٩ دا خولی یەکەم هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لەگواتیمالا بەڕێوه چوو لەدوای کۆتایی هاتنی شەڕی ناوخۆوه، لەبەرواری ٢٦ / ١٢ / ١٩٩٩ خولی دووەمی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بەڕێوه چوو، لەهەڵبژاردنەکاندا ئەلفۆنسۆ بۆرتیلۆی ( ٤٨ ساڵ ) سەرکەوتنی بەدەست هێناوه، سەر بە پارتی ئۆپۆزسیۆنی کۆماری گواتیمالای ڕاسترەوه. لەبەرواری ١٤ / ١ / ٢٠٠٠ ئەلفۆنسۆ سوێندی دەستووری خوارد ودەسەڵاتی گرتە دەست وبەڵێنیدا کۆمەڵگایەکی نوێ ومەدەنی لەوڵاتەکەدا پێك بهێنێ وڕێز لەمافەکانی مرۆڤ بگرێ وسوپاسی میللەتەکەشی کرد بۆ ئەو باوەڕەی پێیان بەخشیوه.

له ٤ / ٢ / ١٩٧٦ دا زۆربەی ناوچەکانی گواتیمالا دووچاری بوومەلەرزەیەك بۆوه بەگوڕی ٧.٥ بەپێوەری ڕێختەر وبووه هۆی کوشتنی زیاتر له ٢٦,٠٠٠ کەس وزیانێکی ماددی زۆری بەو ناوچانه گەیاند.

گواتیمالا وڵاتێکی تازه پێگەیشتووه، گرنگ ترین سەرچاوه سروشتیەکانی زەوییە بەپیتەکان ودارستانەکانێتی، بۆیە چالاکییە کشتوکاڵیەکان بەگرنگترین سەرچاوەی داهاتی ئەو وڵاته دادەنرێن.

گواتیمالا بەپلەی پێنجەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی قاوه وبەپلەی شانزدەیەم دێت لەبەرهەمی قامیشی شەکر،

سروودی نیشتیمانی: گواتیمالای بەختەوەر.

جەژنی نیشتیمانی: ١٥ / ٩ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ساڵی ١٨٢١.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٢,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٧٣.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,١٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٥.

## جۆرجیا

**ناوی باو:** جۆرجیا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری جۆرجیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Georgia

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ۲۳۵ ئەندام ).

**رووبەر :** ۲٦,۹۰۰ میل دووجا، ٦۹,۷۰۰ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ۵,۲۷۷,۰۰۰ کەس ( تا ۱۹۹۸ )

**چڕی دانیشتوان:** ۷۷,٤ کەس/ کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** جۆرجی، ئەرمەن، روس، ئازەری، ئۆستیان، یۆنانی، ئەبخازی.

**ئاین:** مەسیحی ( ئەرۆتۆکس )، موسڵمان، جوولەکە.

**زمان:** جۆرجی.

**پایتەخت:** تەبلیسی.

**شارە سەرەکییەکان:** کۆتیسی، رۆستانی، باتۆمی، سوکۆمی، گۆری، بۆتی.

**دراو:** لاری.

**ئاووهەوا:** فێنك وشێدارە لەناوچەکانی سەر دەریای رەش، گەرم وشێدارە لەناوچە دوورەکانی دەریای رەش، بەرزاییەکان بەردەم بەبەفر داپۆشراون.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** ترشەڵۆکییەکان، چا، زەیتی تانگ، گەنم، ترێ، گەنمە شامی، سەوزە ومیوە، ئاوریشم، مەڕومالآت.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوەکانی خۆراك، شەمەندەفەر، فرۆکە، ئامێری کشتوکاڵی، ئامێری ئەلەکترۆنی.

**سامانی کانزایی:** باریت، خەڵووزی بەردین، مس، مەنگەنیز، تۆتیا، تەنگستن.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

جۆرجیا، یان ساکارتفیلۆس وەك دانیشتوانی وڵات پێی دەڵێن، ناوی لە کتێبە مێژوویەکاندا بە گورجستان ( وڵاتی گورجەکان ) هاتووە، هەروەها بەناوی ئیبیریاش دەناسرا بەهۆی شارستانێتی ئیبیرییەوە کە پێش زایین لەو ناوچەیەدا بووە، وڵاتێکە زۆربەی خاکەکەی دەکەوێتە رۆژئاوای کیشوەری ئاسیاوە، بەڵام بەشی باکووری دەکەوێتە

باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا. روسیا دەكەوێتە باكووری وئازەربێجانیش دەكەوێتە باشووری رۆژهـەلات، ئـەرمینیا وتوركیـاش دەكەونـە باشـووری، دەریـای رەش دەكەوێتـە رۆژئـاوای. ناوەڕاستی جۆرجیا دەكەوێتـە سـەر یـەكبڕی هێڵی درێـژی ٤٣ بەرەو رۆژهـەلات لەگـەڵ هێڵی پانی ٤٢/٣٠ بەرەو باكوور.

٨٠ ٪ ی خاكی جۆرجیا شـاخاوییە، بەشی باكووری چیاكانی قـەوقاز دایدەپۆشـن ، چیا بچوكەكانی قەوقازیش زۆربەی باشووری ولاتیان داپۆشیوە. زەوییە نزمەكانیشی زۆربەی ناوچـەكانی سـەر دەریـای رەشـیان گرتۆتـەوە. بـەرزترین لوتكـە لەسـەر چـیای شـخارایە وبەرزییەكەی دەگاتە ٥٠٦٨ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا.

لە هەزاران ساڵ لەمەو بەرەوە خەڵكی لەوناچەیەدا ژیاون. لەسەدەی شەشەمی پ.ز یەكەم حكومـەتی جۆرجی دامـەزراوە، لەسـەدەی سێیەمی پێش زایـین جۆرجیـا بۆتـە شانشـینێكی یـەكگرتوو. لە سـەدەی یەكـەمی پێش زایینـەوە تـا سـەدەی یانزدەیـەمی زایینی هـەر یـەك لە رۆمـان وفـارس وبیـزەنتی وعـەرەب وتـورك وسـەلجۆقی ومەغۆلـەكان بـەدوای یەكـدا داگیریـان كردووە. لەنێوان سـەدەكانی شـانزدەیەم وهەژدەیـەمدا جۆرجیـا شـانۆی ململانێكانی نێـوان عوسمان وئێرانییەكان بووە.

لەكۆتاییـەكانی سـەدەی هەژدەیـەمـدا روسـیا بەشـداری كـردووە لـەحوكمی جۆرجیـای رۆژهەڵاتدا. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا تەواوی جۆرجیا بۆتە بەشێك لە ئیمپراتۆریـەتی روسـیا. دوای جـەنگی جیهـانیی یەكـەم جۆرجیـا بۆتـە كۆمـاری سۆسیالیـستی. هێـزە شیوعیەكانی روسیا لە ١٩٢١ دا داگیریان كردووە وبەكۆمارێكی شیوعێت رایان گەیانـدووە. لەسـاڵی ١٩٢٢ دا بۆتـە بەشـێك لەیـەكێتی سـۆڤیەت و نـاوی بۆتـە كۆمـاری جۆرجیـای سۆسیالیستی سۆڤێتی، بـەم شێوەیە ماوەتـەوە تـا روخـانی یـەكێتی سـۆڤێت لـە سـەرەتای نەوەدەكانی سەدەی پێشوو.

لە كۆتایی هەشتاكاندا چەند بزوتنەوەیـەكی سـەربەخۆیی لێ پەیدا بووە، پارتی شیوعی جـۆرجی ئـەو كـات دەسـەلاتی حكومـەتی گرتبـووە دەسـت تـا سـاڵی ١٩٩٠ .لـەمانگی دە و یـانزەی ١٩٩٠ دا هەڵبژاردنـە پەرلەمانییـەكانی تیـا ئـەنجام دراوە وپـاڵێوراوە ناشـیوعیەكان زۆربەی كورسییەكانیان بەدەست هێناوە. لە ٩ / ٤ / ١٩٩١ پەرلەمانی جۆرجی جیابوونەوەی خـۆی لـە یـەكێتی سـۆڤیەت راگەیانـد. لـە ٢٦ / ٥ / ١٩٩١ دا ( جـەژنی نیشتیمانی ) زڤیـاد جامسا خۆردیـا بەهەڵبـژاردنی گـشتی كراوەتـە سـەرۆكی ولات ولـە ٢ / ٣ / ١٩٩٢ دا بۆتـە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

چـەند ململانێیـەكی سیاسـی بۆتـە هـۆی كۆتـایی هێنـانی مـاوەی سـەرۆكایەتی خۆردیـا

وئێدوارد شیڤەرنادزە لە ٧ / ١١ / ١٩٩٢ بۆتە سەرۆکی ولآت. لەبەرواری ١٠ / ٤ / ٢٠٠٠ دا شیڤەرنادزە بۆ ماوەی پێنج سالی دیکە پۆستی سەرۆکایەتی گرتۆتە دەست لەرێی سەرکەوتنی لەهەلبژاردنەکاندا.

لە سالی ١٩٩٢ ناوچەی ئەبخازیا کە ئەبخازییەکانی لەخۆ گرتووە وسەر بە جۆرجیایە پاش شەرێکی ناوخۆ کە نزیکەی ١٠,٠٠٠ قوربانی لێکەوتەوە لەجۆرجیا جیابۆتەوە. لەمانگی دەی ١٩٩٨ سەر لەنوێ شەری ناوخۆ هەلگیرساوەتەوە، حکومەتی جۆرجی وشەروانانی ئەبخازیا گەیشتونەتە رێکەوتنێك بۆ ئاگر بەستی ئەو ناوچەیە کە هێزەکانی ئاشتی پارێزی سەر بە روسی چاودێری دەکات.

لە بەرواری ١٥ / ١١ / ٢٠٠٠ دا رێکخراوی خۆراکی جیهانی FAW لەجنێفەوە رایگەیاند کە زیاتر لە ٧٠٠ هەزار کەس لەکۆماری جۆرجیا دووچاری برسێتی وبەد خۆراکی بونەتەوە بەهۆی ئەو وشکە سالییە رووی کردۆتە ئەو ولآتە وبۆتە هۆی لەدەست دانی زیاتر لەنیوەی بەرهەمی کشتوکالییەکانی جۆرجیا لەسالی ٢٠٠٠ دا لەچاو سالی ١٩٩٩ دا، بۆیە داوای لەزۆربەی ولآتانی جیهان کرد بەهانای ئەو خەلکەی جۆرجیاوە بچن، تا ئێستاش ئابووری ئەو ولآتە لاوازییەکی بێ وێنەی پێوە دیارە لەگەل ئەو هەولانەی کە حکومەت لەپێناوی باشتر کردنی باری ئابووری دەیدات.

کشتوکالی بەسەرەکیترین چالاکیە ئابووریەکانی جۆرجیا دادەنرێت، گرنگترین پیشەسازیشی دروستکراوە خۆراکییەکانە وزیاترین داهاتیشی گرتۆتە ئەستۆ.

جۆرجیا بەپلەی هەشتەم دادەنرێت لەنێو ولآتانی جیهاندا لەبەرهەمی چا.

سروودی نیشتیمانی: سەروەری.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا : ١٢٤ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٧٢٥ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا : ١٣٠.

## گۆیانا

**ناوی باو:** گۆیانا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری گۆیانای هەرەوەزی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Co- operative Republic of Guyana

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٥ ئەندام ).

**ڕووبەر :** ٨٣,٠٤٤ میل دووجا، ٢١٥,٠٦٣ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧٧٣,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٣,٩ کەس/کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** هیندە ڕۆژهەڵاتییەکان، ئەفریقی ڕەش، چینی، تێکەڵ، هیندی ئەمریکی، پۆرتۆگالی.

**ئاین:** مەسیحی ( پرۆتستانت، ڕۆمان کاسۆلیك)، هیندۆس. موسڵمان ٩٪ .

**زمان:** ئینگلیزی، تاکە وڵاتیشە لە ئەمەریکای باشوور بەزمانی ئینگلیزی قسە بکەن.

**پایتەخت:** جۆرج تاون.

**شارە سەرەکییەکان:** نیو ئەمستەردام، لیندین.

**دراو:** دۆلاری گۆیانا.

**ئاوو هەوا:** کەمەرەیی، گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ٣٠ بۆ ٣٢ پلەی سەدی دەبێت. بارانێکی زۆری لێ دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** برنج، قامیشی شەکر، ڕاوەماسی، مەڕو ماڵات، گوێزی هیندی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت، ئاڵتون، مەنگەنیز، ئەڵماس.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

گۆیانا وڵاتێکە دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکای باشوور. زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە باکووری، سۆرینام دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، بەرازیلیش دەکەوێتە باشوور ورۆژئاوای، ڤەنزەویلاش دەکەوێتە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٥٩ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٥ بەرەو باکوور.

دەشتێکی بەرفراوان دەکەوێتە سەر کەنارەکانی زەریای ئەتڵەسی لەباکووری گۆیانا، چەند بانێکی بەرزیش لەڕۆژهەڵاتیەوە بۆ باشووری درێژ دەبێتەوە. ڕوباری کۆرانتین لە وڵاتی سۆرینامی دراوسێی جیادەکاتەوە. سێ ڕوباری گەورە بەنێو گۆیانادا تێدەپەڕێت: ئیسیکۆیبۆ، دیمیرارا، بیربیك، زیاتر لە ٢٠٠ تاڤگەی لەخۆ گرتوە. زۆربەی خاکی ئەو وڵاتە بەدارستانە زۆر چڕەکان داپۆشراوە، ڕەنگە هەندێکیان تا ئێستا پێی مرۆڤی بەخۆوە نەدیبێ.

بە گۆیانا دەوترێت خاکی شەش میللەت، لەبەر ئەوەی دانیشتوانە سەرەکییەکانی لەم میللەتانەن: هیندە رۆژهەلاتیەکان، ئەفریقی، چینی، ئەورووپی، هیندی ئەمەریکا، پۆرتۆگالی.

یەکەم دانیشتوانی ناوچەکەش هیندە ئۆراکییەکان وکاریبی ووارۆ بوون، کە لەزمانی ئەمانەوە ناوی گۆیانا هاتووە وبەمانای خاکی ئاوەکان دێت.

هۆڵەندییەکان یەکەم ئەورووپی بوون لەو ناوچەیەدا ژیابن لەسەدەی هەژدەیەمدا. لەساڵی ١٨١٤ بەپێی کۆنگرەی ڤیێنا ، هۆڵەندییەکان دەستیان لە داگیرکراوەکانیان هەڵگرت بۆ بەریتانییەکان. لەساڵی ١٨٣١ دا داگیرکراوەکان لەژێر ناوی گۆیانای بەریتانی یەکیان گرتەوە.لەساڵی ١٩١٦ مافی ئۆتۆنۆمی پێ بەخشراوە. لەبەرواری ٢٦ / ٥ / ١٩٦٦ دا لەچوارچێوەی کۆمۆنوڵتی بەریتانی بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. فۆربس بیرنهام بۆتە سەرۆکی وڵات ولەدەسەلاتدا ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردنی لە ١٩٨٥ دا، دوای ئەو هیۆ دیزمۆند هۆیتی دەسەلاتی گرتۆتە دەست. لەگەڵ ئەوەی لەسەردەمی ئەمدا وڵات چەندین جیاوازی نەژادی بەخۆوە بینیوە بەلام بوژانەوەیەکی ئابووری بەهێزی بەخۆوە بینی وهاوکاری ئابووری لەگەڵ وڵاتانی سەر دەریای کاریبی پەیدا کردووە.

لەحەفتاکانی سەدەی پێشوودا حکومەتی گۆیانا سیاسەتی ئابووری سۆسیالیستی پەیرەو کردووە وزۆربەی کانە بۆکسیتەکانی گرتۆتە خۆی وکۆنترۆڵی کۆمپانیا بیانی وناوخۆییەکانی کردووە.

لەساڵی ١٩٩٢ دا شیدی جاجان بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا، لەدەسەلاتدا تاکۆچی دوایی کردنی لە ٣ / ١٩٩٧ دا ماوەتەوە. دوای ئەو خێزانەکەی جانێت جاجان لەمانگی ١٢ / ی هەمان ساڵدا بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردراوە. لە ٨ / ٨ / ١٩٩٩ دەستی لەکار کێشاوەتەوە بەهۆی خراپی باری تەندروستیەوە ونەتوانینی لەبەڕێوەبەردنی ئەرکەکانی بەشێوەیەکی پێویست ووەزیری دارایی خاتوو سەهارات جادیۆ ( ٣٥ ساڵ ) ی کردۆتە سەرۆکی وڵات.

هۆڵەندا ژمارەیەکی زۆری لە ئەندەنوسییە ئیسلامەکانی هێناوەتە گۆیانە بۆ جوتیاری لەنێو کێڵگەکاندا، شایەنی باسە ئەم جوتیارانە لە گۆیانا ماونەتەوە وبەهۆی ژن وژنخوازەوە ژمارەیان لەچاو هیندۆس وگاوەرەکان زیادی کردووە ، بەو پێیەش کە ئیسلامن بۆیە گۆیانا بەئەندامی رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی قبوڵ کراوە.

داهاتی گۆیانا پشتی تەواوی بەچالاکییە کشتوکاڵیەکان بەستووە بەتایبەتی ئەو بەرهەمانەی کەرەوانەی دەرەوەی وڵات دەکرێن.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٣ / ٢ ی هەموو ساڵێك، رۆژی کۆماری.

سروودی نیشتیمانی: گۆیانا خاکی شیرینم.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٤٣٤ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٦٦.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٥٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٤١.

## جیبۆتی

**ناوی باو:** جیبۆتی.

**ناوی فەرمی:** کۆماری جیبۆتی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Djibouti

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٥ ئەندام ).

**رووبەر :** ٨,٩٥٠ میل دووجا، ٢٣,٢٠ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦٢٢,٦٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢٦,٦ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عیسایی، عەفار ( ئەمانیش زۆربەی دانیشتوانی وڵاتیان پێك هێناوە) ، عەرەب، ئەوروپی.

**ئاین:** موسڵمان ٩٦ ٪ ، مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت، ئەرتۆدۆکس).

**زمان:** عەرەبی، فەرەنسی، سۆماڵی ( زمانی عیسایی )، عەفاری.

**پایتەخت:** جیبۆتی.

**شارە سەرەکییەکان:** عەلی سبێح، تاگۆرا، دیخیل، ئۆبۆك.

**دراو:** فرانکی جیبۆتی.

**ئاووهەوا:** گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ ٢٩ پلەی سەدییە ولەهاویندا لەهەندێ ناوچە دەگاتە ٤٢ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٣ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** سەوزە، قاوە، مەڕوماڵات، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** کەلوپەلی ناوماڵ، پیستە، دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

جیبۆتی وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامیی بچوکە دەکەوێتە سەر کەناری رۆژئاوای کەنداوی عەدەن لەرۆژهەڵاتی کیشوەری ئەفریقیا. ئەریتیریا دەکەوێتە باکووری، سۆماڵ دەکەوێتە باشووری، ئیسیوپیا دەکەوێتە رۆژئاوای دەریای سووریش دەکەوێتە رۆژهەڵاتی. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکێری هێڵی درێژی ٤٢/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١١/٣٠ بەرەو باکوور.

زۆربەی خاکی وڵات بیابانییەکی زۆر چۆڵ وبێ پیتە. کەنارەکەی بریتییە لەدەشتێکی بەرەو ناوخۆی وڵات بەرز دەبێتەوە تا بەچیاکان کۆتاییان دێت هەندێکیان بەرزیان دەگاتە ١٥٠٠ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا، بانێکی سەختیش دەکەوێتە پشت چیاکانییەوە.

لەسەردەمەكانی پێش مێژوو خەڵك لەو ناوچەیەدا ژیاون، لەسەدەی نۆیەمدا ئیسلامەكان لە دورگەی عەرەبەوە نوێنەرەكانیان رەوانەی عەفارییەكان كردووە تاكو پەیڕەوی ئاینی ئیسلام بكەن. چەند ویلایەتێكی ئیسلامییان لێ پێك هێناوە. لەسەدەی سیانزدەیەمەوە تا سەرەتاكانی سەدەی حەڤدە چەند جارێك لەگەڵ حەبەشە بەجەنگ هاتووە. لەسەدەی نۆزدەیەمدا عیسایییەكان زۆربەی زەوییە عەفارییەكانیان داگیر كردووە. لەو كاتەوە دوژمنایەتی لەنێوانی ئەو دوو خێڵە پەیدا بووە.

لەساڵی ١٨٦٢ دا فەرەنسا بەندەری ئۆبۆكی لە عەفارییەكان كڕیوە وچەند رێكەوتننامەیەكی لەگەڵ سوڵتانە ئۆبۆكییەكانی عەفار واژۆ كردووە. هەروەها چەند رێكەوتننامەیەكی دیكەشی لەگەڵ سوڵتانە تاجۆراییەكانیش واژۆ كردووە، تا لەدواییدا تەواوی ئەو ناوچانەی ئێستا بەجیبۆتی ناسراوە داگیری كردووە. لەساڵی ١٨٩٦ دا فەرەنسا تەواوی داگیركراوە بچوكەكانی ئەو ناوچەیەی كردووە بەیەك وناوی ناون سۆماڵی فەرەنسی وئەو ناوەش تا بەرواری ٣ / ٧ / ١٩٦٧ بەكار هاتووە، لەدوای ئەو بەروارە ناوی لێناوە هەرێمی فەرەنسی عەفاری وعیسایی.

لەحەفتاكانی سەدەی بیستەمدا دانیشتوانی وڵات داوای سەربەخۆییان لەفەرەنسا دەكرد، لەبەرواری ٢٧ / ٦ / ١٩٧٧ جیبۆتی سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا پەیوەندی كرد بەنەتەوە یەكگرتوەكانەوە. لەساڵی ١٩٩١ دا پەیوەندی كردووە بە كۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەكانەوە. بنكەیەكی سەربازی فەرەنسی لە جیبۆتیدا ماوەتەوە وبەگەورەترین بنكەی سەربازی فەرەنسی دادەنرێت لەدەرەوەی وڵاتەكەیدا هەیبێت.

لەكۆتایی ساڵی ١٩٩١ دا عەفارییەكان یاخی بوون وبزوتنەوەی ( بەرەی یەكێتی ودیموكراسیان ) پێك هێنا وداوای مافی یەكسانیان دەكرد لەگەڵ عیسایییەكان لە بریار دان ودەسەڵاتەكاندا. بۆساڵی ئاینده فەرەنسا لەپێناوی چارەسەركردنی كێشەكانیان هەڵی دایە، بەڵام هەوڵەكانی شكستی هێناو شەڕی ناوخۆ لە جیبۆتی هەڵگیرسا ونزیكەی دە ساڵی خایاند. لەبەرواری ١٢ / ٥ / ٢٠٠١ دا رێكەوتننامەی ئاشتی وئاشتبونەوەی نیشتیمانی لەنێوان لایەنە بەشەڕ هاتووەكان واژۆ كرا تەواوی هێزە چەكدارەكانی هەردوولا بەمەرجەكانی رێكەوتن قایل بوون وهەردوولا بڕیاریان دا رێز لەمافەكانی یەكتر بگرن وپارێزگاری لەخاكی نیشتمان بكەن وبەو بۆنەیەشەوە هاوكات لەگەڵ یادی جەژنی نیشتیمانی لە ٢٧ / ٦ / ٢٠٠١ دا ئاهەنگێكی گەورەیان گێڕا.

بەڵام محەمەد كەدعەمی سەرۆكی بەرەی یەكێتی ودیموكراسی لەهاوینی ٢٠٠٢ دا رایگەیاند كەهێزە چەكدارەكانی ئامادەن دەست بكەنەوە بەشەڕ لەبەر ئەوەی حكومەت بڕیارەكانی ئاشتی ومەرجەكانی رێكەوتنی جێبەجێ نەكردووە.

لەبەرورای ٧ / ٩ / ٢٠٠٠ دا جەنەراڵ یاسین یابە كەسەرۆكایەتی پۆلیسی گرتبۆوە دەست لەهەوڵی جێبەجێ كردنی كودەتایەكدا شكستی هێنا.

یەکەم سەرۆکی جیبوتی دوای سەربەخۆ بوون: حەسەن جۆلید بوو. لەبەرواری ٩ / ٤ / ١٩٩٩ دانیشتوانی جیبوتی لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا دەنگیان بە ئیسماعیل عومەر جیلی دا کەلەلایەن هەردوو خێڵی عەفار وعیساییەوە پشتیوانی لێدەکرێت وکەسایەتییەکی بەبایەخە لەناویاندا.

وشەی جیبوتی بەزمانی عەفاری بەمانای : مەنجەڵ یان قاپ دێت . دەڵێن دوای ئەوەی فەرەنسییەکان چونەتە ناو ئەو وڵاتەوە یەکێك لەفەرەنسییەکان لە هاوڵاتییەکی عەفاری پرسیوە ناوی ئەو مەنجەڵەی پێ بڵێت کە چێشتی تیا لێدەنرێت، لەوەڵامدا وتوویەتی: جیبوتی. ئیتر لەو رۆژە بەدواوە ئەو ناوە بەسەر ئەو وڵاتەدا دابڕاوە.

جیبوتی وڵاتێکی زۆر هەژارە وهیچ سەرچاوەیەکی سروشتی گرنگ وهیچ پیشەسازییەکی ئەوتۆی نییە باری ئابووری وڵاتەکەی پێ بەرز بێتەوە. تەنها چالاکی ئابووریان بەخێو کردنی مەڕومالاَت وسوود وەرگرتن لە گۆشت وبەرهەمی ئاژەڵەکانیانە. حکومەتیش ناتوانێ هاوسەنگی لەنێوان خەرجی وداهاتی تاکەکانی بکات.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٧ / ٦ ی هەموو ساڵێك

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٤٤٨ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٦٤.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٩٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١١٥ .

* * *

ئالوودە بوونی قات لەجیبوتی

لەگەڵ بەتین بوونی گەرما لەماوەی دوای نیوەڕۆدا، ئەندێشە وخەیاڵەکانی پیاوە هەژارەکانی جیبوتی بەرەو ئاسمانەکانیان هەڵدەفڕیوێنێ وپرۆژە زەبەلاحەکانیان بەخەیاڵ بەئەنجام دەگەیەنن. بەڵێ... سەرباری ئەو هەموو نەهامەتی ونەدارییەش پیاوانی جیبوتی ئالوودەی ماددەیەکی هۆشبەر بوون پێیدەوترێ قات. چاوەکانیان دادەگیرسێ ورەنگیان شین دەبێتەوە کاتێ تفی پاشماوەی ئەو گیا هۆشبەرە دەکەنەوە.

ژنان دەڵێن پیاوەکان لەئاسمان قەڵا بۆ پرۆژەکانیان دادەمەزرێنن وبەڵێنی سبەینێیەکی دەوڵەمەندیمان پێدەدەن کاتێ سڕ وبێهۆش دەبن.

پیاوانیش دەڵێن ئەمیش رۆژێکی دیکەیە بۆ سەر رۆژەکانمان دەمانەێت مەست بین ئەگەر ئەمە بەفیڕۆدانی کاتیش بێت، لەم بەندەرە هەژارەی زۆر کەس پێی دەڵێن "سەنگافورەی ئەفریقیا" زۆر کەم شت هەیە بەئەنجام بگەیەنرێ. دەتوانن جیبوتی بکەنە ناوچەیەکی پیشە سازی لەبری بەفیڕۆدانی کات وپارە بەکڕینی قات.

## دانیمارك

**ناوی باو:** دانیمارك

**ناوی فەرمی:** شانشینی دانیمارك

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Denmark

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، شا ( یان شاژن ) ، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ١٧٩ ئەندام ).

**ڕووبەر :** ١٦,٦٣٩ میل دووجا، ٤٣,٠٩٤ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥,٢٨٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٢٢,٦ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** دانیمارکی، تورك، ئەسکەندەناڤ، بەریتانی، ئەڵمان.

**ئاین:** مەسیحی ( ئەنگیلی لۆتەری ) .

**زمان:** دانیمارکی.

**پایتەخت:** کۆبنهاگن.

**شارە سەرەکییەکان:** ئارهۆس، ئۆدنس، ئەلبۆرگ، ڕاندەرس.

**دراو:** کرۆنی دانیمارکی.

**ئاووهەوا:** مام ناوەند وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا دەچێتە سفری سەدی ولەهاویندا دەگاتە ١٧ پلەی سەدی. ڕێژەی بارانی ساڵانە ٦١ سم دەبێت وبەفرێکی زۆریش دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** جۆ، بەخێوکردنی مەڕومالآت، پەتاتە، پەلەوەر، چەوەندەری شەکر، گەنم، ڕاوە ماسی، بەراز.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** بزوێنەرەکانی دیزڵ، دروست کردنی کەشتی، ئامێری کارەبایی وئەلکترۆنی، کەلوپەلی ناوماڵ، ئامێر، شیرەمەنی.

**سامانی کانزایی:** گاز ونەوت.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

دانیمارك وڵاتێکە دەکەوێتە نیمچە دوورگەی جۆتلاند لە باکووری ئەورووپا. دەریای بەڵتیق دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، دەریای باکوور دەکەوێتە ڕۆژئاوای، لەگەڵ ئەڵمانیادا سنووری

هاوبەشیان هەیە بەدرێژایی ٦٨ کم. نزیکەی ٤٨٢ دورگەی بەربلاوی بەچوار دەوری نیمچە دورگەی جۆلاتلاندی لەخۆ گرتووە، گەورەترینیان دورگەی زیلاندە کەزیاترین بەشی دانیشتوانی ئەو ولاتەی گرتۆتە خۆ وکۆبنهاگنی پایتەختیشی تێدەکەوێت، هەروەها دورگەکانی: ئامانجەر، بۆرنهۆلم، ڤالستەر، فین، لۆلاندیش لەدورگە گرنگەکانی دانیمارکن. ناوەڕاستی دانیمارك دەکەوێتە سەر یەکێی هێڵی درێژی ٩ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٥٦ بەرەو باکوور.

دورگەی گرینلاند ( گەورەترین دورگە لەجیهاندا ) سەر بەدانیمارکە ودەکەوێتە نزیك کەناری باکووری رۆژهەلاتی کەنەدا ونزیکەی ٢٠٩٠ کم لەدانیمارکەوە ( نیشتیمانی دایك ) ەوە دوورە. هەروەها دورگەکانی فارۆی سەر زەریای ئەتڵەسی لەباکووری دورگە بەریتانیەکان سەر بەدانیمارکن، شایەنی باسە هەریەك لەو دورگانە مافی ئۆتۆنۆمی پێ بەخشراوە.

دانیمارك یەکێکە لە ولاتە ئەسکەندەنافیەکان کە نەرویج وسوید وفنلەنداشی لەخۆ گرتووە.

زۆربەی زەوییەکانی دانیمارك یان تەخت یان بەرێژەیەکی زۆر کەم لوولپێچە و نزیکەی ٣٥ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزە، بەمەش دەکرێ بڵێن کە یەکێکە لە ولاتە زۆر تەختەکانی ئەوروپا ، شایەنی باسە تەواوی زەوییەکانی بەگەڕ خراوە وسوودێکی تەواوی لێوەردەگیرێ.

خەڵکی نزیکەی سەت هەزار ساڵ لەمەو پێشەوە لەو ناوچەیەدا ژیاون وکشتوکاڵی لە ساڵی ٣٠٠٠ پ.ز لەو ناوچەیەدا گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینییوە. لەسەدەی شەشەمی زایینیدا دانیی وفایکنجەکان نیشتەجێی بوون، کە ئەوانیش لقێکی ئەسکەندەنافیە تیوتۆنەکانن وبەباپیرانی دانیمارکییەکانی ئێستا دادەنرێن وناوی ولاتیش لەوانەوە وەرگیراوە. دانیمارکییەکان لەو ماوەیەدا لەشێوەی کۆمەلانی بچوك ژیاون وسەرۆکی ناوخۆی خۆیان حوکمی کردوون، تاکو شا هارالد بلوتوس توانی لەساڵی ٩٥٠ دا بیان کات بەیەك.لەماوەی سەدەکانی هەشتەم ونۆیەم ودەیەمی زایینی، دانییە فایکنجەکان روویان کردە رۆژئاوا وباشوور وهەڕەشەیان کردە سەر کەنارەکانی ئیمپراتۆرێتی کارۆلنجی لەئەڵمانیا وفەڕەنسا، گەیشتنە ئینگلتەرا و لەساڵەکانی ١٠١٣ – ١٠٤٢ حوکمیان کردووە. لەنزیکەی ساڵی ١٠٠٠ دا دۆزەرەوەی دانیمارکی لیڤ ئەریکسۆن گەیشتۆتە لیفلاند کە واپێشنیار دەکرێ ئەو ناوچەیە نیوفاونلاندی ئێستای کەنەدا بێت، بەمەش بەیەکەم دۆزەرەوەی ئەمەریکا دادەنرێت. لەساڵی ١٣٨٠ دا هەریەك لە دانیمارك ونەرویج یەکیان

گرت ولەساڵی ١٣٩٧ دا سویدیش چووە پاڵیان وتێکڕا یەکێتی کالماریان پێك هێنا وکەوتنە ژێر دەسەڵاتی شاژن مارگرێت. بەڵام لەساڵی ١٥٢٣ دا سوید خۆی لەدەست دەسەڵاتی دانیمارك رزگار کردووە ولێی جیابۆتەوە، یەکێتی نێوان دانیمارك ونەرویج تا ساڵی ١٨١٤ ی خایاندووە، تاکو کۆنگرەی ڤیێننا سزای داوە ونەرویجی لێسەندۆتەوە بەهۆی پشتیوانی کردنی دانیمارك لە ناپلیۆن.

لەساڵی ١٤٤٨ کریستیانی یەکەم بۆتە شای دانیمارك، کریستیان یەکەم دەسەڵاتداری دانیمارك بووە کە لەنەوەی خێزانی پادشایی ئۆلانبێرگ بووە کە ئێستاش حوکمی دانیمارك دەکەن، بەڵام سیستەمی پادشایی تا ساڵی ١٨٤٩ نەبووە پادشایی دەستووری.

لەو ماوەیەدا دانیمارك لەگەڵ دراوسێکانیدا چەند جارێك بەشەڕ هاتووە، لەوانە:

١. جەنگی سی ساڵەی لەگەڵ سویددا کە بەسەرکەوتنی سوید کۆتایی هاتووە، سوید توانی باکووری دانیمارك لە ١٦٦٠ دا داگیر بکات.

٢. لەماوەی جەنگەکانی ناپلیۆن دوو جار دانیمارك هێرشی کردۆتە سەر ئینگلتەرا ( ١٨١٥ ).

٣. لەنێوان ساڵەکانی ١٨٤٨ – ١٨٤٩ لەگەڵ بروسیادا بەجەنگ هاتووە.

٤. جارێکی دیکە لەگەڵ بروسیا ونەمسادا بەجەنگ هاتووە ساڵی ١٨٦٤.

لەتەواوی ئەو جەنگانە بەتێکشکاوی ودۆڕاوی هاتۆتە دەرەوە، ئەمەش بۆتە هۆی لەدەست دانی شکۆ وبایەخی لەنێو وڵاتاندا، بۆیە لەو کاتەوە تا ئاستێ توانیویەتی بێلایەن بێت وخۆی تەرخان بکات بۆ چالاکییە کشتوکاڵییەکان ونەمەش بۆتە هۆی گەشە کردنێکی بەرچاوی باری ئابووری ئەو وڵاتە لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، میللەتەکەش لەمیللەتێکی جوتیاری هەژارەوە بونەتە دەوڵەمەنترین میللەتەکانی ئەوروپا،بەهۆی بەرهەمهێنانی شیرەمەنی تا ئەمڕۆش بەیەکێ لەوڵاتە هەرە بەرهەمهێنەرەکانی شیرەمەنی دادەنرێت.

دانیمارك لەهەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ودووەمدا بێ لایەنی بۆخۆی هەڵبژارد، لەگەڵ ئەوەی یاداشتنامەی هێرش نەکردنە سەر ئەڵمانیا واژۆ کرد بۆ ماوەی دە ساڵ، بەڵام هێزە نازییە ئەڵمانییەکان لە ١٩٤٠ دا دانیمارکیان داگیر کرد، تا لەساڵی ١٩٤٥ دا سوپا بەریتانیەکان ئازادیان کرد.

لەساڵی ١٩٤٥ دا دانیمارك بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان ولەساڵی ١٩٤٩ پەیوەندی کردووە بەهاوپەیمانێتی باکووری ئەتڵەسی، لەساڵی ١٩٧٣ پەیوەندی کردووە بەکۆمەڵەی ئەوروپییەوە.

لەساڵی ١٩٧٩ شای دانیمارك فریدریکی نۆیەم کۆچی دوایی کردووە وکچە گەورەکەی مارگریتی دووەم بۆتە شاژنی دانیمارك. ئەمە بەهۆی سوود وەرگرتن لەو یاسایەی کە لە ١٩٥٣ دانیمارکییەکان دەنگیان دابوو بەوەی کوڕ وکچ بۆیان هەبێت ببنە شای وڵات.

شاژنی دانیمارك، مارگریتی دووەم، لە ١٦ / ٤ / ١٩٤٠ لەدایك بووە ورۆژی لەدایك بوونی، ١٦ / ٤ ، بەرۆژی نیشتیمانی ئەو وڵاتە دادەنرێت، شایەنی باسە دەسەڵاتی فیعلی لەدەستی ئەنجومەنی وەزیراندایە کەسەرۆکەکەی لەلایەن پەرلەمانی دانیمارکییەوە ( ڤۆلکتنغ ) ەوە هەڵدەبژێرێ کە ١٧٩ ئەندامی لەخۆی گرتووە، لەوانە ٢ ئەندامیان لەدورگەی گرنلانده و ٢ ئەندامی دیکەشی لە دورگەکانی ڤارۆیە، شاژن هیچ رۆڵێکی سیاسی ئەوتۆی نییە.

لەمانگی شەشی ٢٠٠٠ دا پردی ئۆریسۆند کرایەوە، کەدرێژییەکەی ١٦ کم ولەسەر تەنگەی نێوان کۆپنهاگنی پایتەخت وشاری مالمۆی سویدی ( گەورەترین سێهەم شاری سوید) وپێی دەوترێ دەربەنی ئۆریسۆند، شایەنی باسە ئەو پردە بری ٢،٧٥ ملیار دۆلاری تێچووە وباشووری سوید وباکووری دانیمارکی بەیەکەوە بەستۆتەوە .

دانیمارك ئەمڕۆ بەیەکێك لەوڵاتە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان دادەنرێت و ئاستی ژیانی تاکەکانی بەپێنجەم دادەنرێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا. لەگەڵ ئەوەی کە سەرچاوە سروشتییەکانی زۆر کەمن بەڵام خاوەنی ئابوورییەکی زۆر بەهێزە، لەبەرهەمە کشتوکاڵی وچالاکییە پیشەسازەکانیدا زۆر بەناوبانگە. بەڵام ئێستا دووچاری کێشەی پیس بوونی ژینگە بۆتەوە جگە لەبڵاوبوونەوەی بێکاری وگرانی خزمەتگوزارییەکانی.

سروودی نیشتیمانی: زەوییەکی شیرین لەوێدایە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٤٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٢٥.

تێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٨،١١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٥ .

## دۆمینیکا

ناوی باو: دۆمینیکا

ناوی فەرمی: کۆمۆنۆلتی دۆمینیکی.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Commonwealth of Dominica

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٢ ئەندام ).

رووبەر : ٢٨٥,٣ میل دووجا، ٧٣٩ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ٧٤,٤٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٩٩,٢ کەس/کم$^{٢}$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی رەش، بەریتانی، فەڕەنسی، هیندی ئەمریکی.

ئاین: مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ) ، بێ ئاین.

زمان: ئینگلیزی.

پایتەخت: رۆزۆ.

شارە سەرەکییەکان: بۆرت سمۆت، ماریگۆت، ماهۆت.

دراو: دۆلاری رۆژهەڵاتی کاریبی.

ئاووهەوا: نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان ١٨ بۆ ٣٢ پلەی سەدی دەبێت. بڕی ئەو بارانانەی کە لە پایتەختدا دەبارێت ساڵانە ٢٠٠ سم دەبێت. لەچیاکان دەگاتە ١٠٠٠ سم لەساڵێکدا.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز، گوێزی هیندی، ترشەلۆکییەکان، دارستان، راوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروست کراوەکانی خۆراك، دروست کراوە کیمیاییەکان.

سامانی کانزایی: بەردی خەفاف ( جۆرێکە لەشوشەی سپی خاو وکونۆچکە بچوکی تیایە بەهایەکی زۆری هەیە بۆپاککردنەوە بەکاردەهێنرێ ولەپاشماوە گڕکانییەکانەوە دروست بووە).

### تێڕوانینێکی گشتی :

دۆمینیکا دورگە وڵاتێکە لەنێو دەریای کاریبی ویەکێکە لەدورگەی رۆژئاواکانی هیند، نزیکەی ٥١٥ کم لەباکووری ڤەنزەویلاوە دوورە، دورگەکە بەرەچەڵەك گڕکانییە، چیاکانی بەدارو درەختێکی زۆر داپۆشراون، هەندێ لەچیاکان نزیکەی ١٢٠٠ م لەسەر ئاستی رووی

دەریا بەرزدەبنەوە، کەنارەکەشی لەدەشتێکی تەخت پێك دێت. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦١/٢٠ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٥/٢٠ بەرەو باکوور.

هیندە ئۆراکییەکان نزیکەی هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە لەو دورگەیەدا ژیاون، پاش ئەوان هیندە کاریبییەکان نیشتەجێی بوون. کریستۆڤ کۆلۆمبۆس لە ڕۆژی یەك شەممەی ٣ / ١١ / ١٤٩٠ دۆزیویەتییەوە وناوی ناوە دۆمینیکا، بەزمانی لاتینی دۆمینیکا بەمانای یەك شەممە دێت.

فەڕەنسییەکان لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا چەند سەنتەرێکیان لەسەر کەنارەکەی پێك هێناوە. لەساڵی ١٧٥٩ دا ئینگلتەرا داگیری کردووە. فەڕەنسا لە نێوان ساڵەکانی ١٨٠٢ – ١٨١٤ داگیری کردۆتەوە وجارێکی کە کەوتۆتەوە دەست ئینگلتەرا. دورگەکە خراوەتە سەر داگیرکراوەکانی بەریتانیا لەئەنتیل لەساڵی ١٨٧١. ئینگلیزەکان کۆیلە ئەفەریقییەکانیان هێناوەتە ئەو دورگەیە تاکو جوتیاریان پێ بکات. دۆمینیکا لە ١٩٦٧ دا مافی ئۆتۆنۆمی پێ بەخشرا لەچوارچێوەی یەکگرتووی ئەنتیل. لە ٣ / ١١ / ١٩٧٨ سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بووە لەچوار چێوەی کۆمۆنۆلتی بەریتانی، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

ئابووری دۆمینیکا پشتی تەواوی بەکشتوکاڵی بەستووە وڕێژەی ٦٠ ٪ ی دانیشتوان کار لە چالاکییە کشتوکاڵیەکاندا دەکەن، جگە لەوەی گەشتوگوزاریش ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت لە ئابووری ئەو وڵاتە.

جەژنی نیشتیمانی: ٣ / ١١ ی هەموو ساڵێك، ڕۆژی سەربەخۆیی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢٠١ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٧٩ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,٨٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٦٣.

## دۆمینیکان

**ناوی باو:** دۆمینیکان.

**ناوی فەرمی:** کۆماری دۆمینیکان.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Dominican Republic

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٣٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ١٨,٧٩٢ میل دووجا، ٤٨,٦٧١ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧,٨٠٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٦٠,٢ کەس/ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تێکەڵ، ئەوروپی، ئەفریقی ڕەش.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك).

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** سانتۆ دۆمینگۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** سانتیاگۆ، کابیرتۆ بلاتا، لافیگا، سان فرانسیسکۆ دو مارکیۆس.

**دراو:** بیزۆی دۆمینیکان.

**ئاوو هەوا:** مام ناوەند بەدرێژایی ساڵ، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٦ بۆ ٣٢ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی باران ١٥٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** ئەڤۆگادۆ، مۆز، کاکاو، قاوە، مانگۆ، برنج، قامیشی شەکر، تووتن.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** شەکر، کاغەز، شووشە، چیمەنتۆ، دروست کراوەکانی خووری.

**سامانی کانزایی:** ئاڵتون ، نیکل.

### تێڕوانینێکی گشتی :

دۆمینیکان وڵاتێکی شاخاوییە، ئەو وڵاتەیە کە دوو لەسەر سێی ڕۆژهەڵاتی دوورگەی هیسبانیۆلای داگیر کردووە، کە یەکێکە لەدوورگەکانی هیندی ڕۆژئاوا لەدەریای کاریبی، یەك

لەسەر سێیەکەی دیکەشی هاییتی گرتوویەتی. دۆمینیکان نزیکەی ٩٠٠ کم لەباشووری رۆژهەلاتی ویلایەتی فلۆریدای ئەمەریکیەوە دوورە. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی ٣٠ /٧٠ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێلی پانی ١٩ بەرەو باکوور.

چیاکانی کۆردیر لە باکووری رۆژئاواوە تا باشووری رۆژهەلات ناوەراستی دۆمینیکان دەبڕێت، لوتکەی دیوارت کە بەرزییەکەی ٣١٧٥ م دەبێت لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزترین لوتکەیە لە دورگەکانی هیندی رۆژئاوا. بەرەو باکووری ئەو زنجیرە چیایە چیاکانی کیباویش دەکەوێتە باکوور وتەواوی بە دار سنەوبەرەکان داپۆشراوە. هەروەها دەشتی فیجاریاڵ دەکەوێتە دۆمینیکان کە بەسەرەکیترین ناوچە کشتوکاڵیەکانی ئەو وڵاتە دادەنرێت. لەو پەری باکووریش زنجیرە چیاکانی کۆردیرا سبیتزیۆنال درێژ دەبێتەوە وباشووری رۆژهەلاتیش نیمچە بەرزییەکی پێوە دیارە.

کریسۆف کۆلۆمبۆس لە ٦ / ١٢ / ١٤٩٢ گەیشتۆتە دورگەی هیسبانیۆلا وئیسپانییەکان دوای چەند ساڵێك داگیریان کردووە وچەند داگیرکراوەیەکیان لە کەناری باکوور پێك هێناوە، ئەو داگیرکراوانەش بە کۆنترین داگیرکراوەکانی جیهانی نوێ دادەنرێت.لەساڵی ١٦٩٨ دا ئیسپانیا یەك لەسەر سێی دورگەکە ( هایتی ئێستا ) ی بەخشیوە بەفەرەنسا. جگە لە فەرەنسا وئیسپانیا چەند دیکتاتۆرێك حوکمی دۆمینیکانیان کردووە. دوای شۆرشی گەلی دۆمینیکان لەدژی ئیسپانییەکان و دەرکردنیان لەوڵاتەکەیان لە ٣٠ / ١١ / ١٨٢١ سەربەخۆ بووە، بەلام هایتی توانیوەتی بۆ ماوەیەك دەسەلاتی دۆمینیکان بگرێتە دەست تا لەدژی ئەوانیش دۆنیکییەکان شۆرشیان هەلگیرساندووە ولەساڵی ١٨٤٤ لەوڵاتەکەیان کردیانە دەرەوە، لە ٢٧ / ٢ / ١٨٤٤ کۆماری دۆمینیکانیان راگەیاند. بە پێی ئارەزووەکانی گەلی دۆمینیکان وبۆ پاراستنیان لە هایتییەکان ئیسپانیا لەنێوان ساڵەکانی ١٨٦١ بۆ ١٨٦٥ حوکمی دۆمینیکانیان کردووە.

دۆمینیکان لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان.

لەساڵی ١٩٦٥ یاخی بووان هەوڵیان داوە دەسەلاتی وڵات بگرنە دەست، بۆیە ویلایەتە یەککگرتوەکان هاورێ لەگەڵ هێزەکانی ئەندامانی رێکخراوی وڵاتە ئەمریکییەکان بەپاساوی پاراستنی ئەمەریکییەکانی دۆمینیکان ورێگە گرتن لەشیوعییەکان لە مانگی چواری هەمان ساڵ پەلاماری دۆمینیکانیان داوە. بۆ مانگی نۆی ١٩٦٦ دوایین هێزە بیانییەکان دۆمینیکانیان بەجێ هێشتووە.

لەساڵی ١٩٦٦ ، لەکاتی خۆتێهەلقورتانی هێزە بێگانەکان، جواکین بلاجیر بەسەرۆکی دۆمینیکان هەلبژێردرا، دوای ئەو چەند سەرکردەیەك پۆستی سەرۆکایەتیان گرتۆتە دەست،

تـا دکتـۆر لیۆنیـل فێرنانـدیز رینـا لەسـاڵی ١٩٩٦ ،پـاش ئـەویش دۆمیجیـۆز مێگـا بۆتـە سەرۆکی وڵات.

لە ١٩٧٩ دا گەردەلوولێکی بەهێز لە دۆمینیکانی داوە و نزیکەی دوو هەزار کەسی کوشت وبەهەزارەها هـاوڵاتی ئاوارە ودەربەدەر کردووە، جگە لەوێران کردنی بینایـەکی زۆری ئـەو وڵاتە.

ئابووری دۆمینیکان پشتی بە کشتوکاڵی بەستووە وریژەی نیوە زیاتری دانیشتوانی ئـەو وڵاتـە سـەرقاڵی چـالاکییە کـشتوکاڵیەکانن، پیـشەسازیش ماوەتـەوە سـەر دروسـت کـراوە خۆراکییەکان.

دۆمینیکـان لـەنێو وڵاتـانی جیهانـدا بەپلـەی سێهەم دێت لەبەرهەمی نیکل، بەپلـەی دەیـەم دێت لەبەرهەمی کاکاو وبەپلەی هەژدەیەم دێت لەقامیشی شەکر.

سروودی نیشتیمانی: گەلی دۆمینیکان، با گۆرانیەکانمان بەسۆزەوە بڵێینەوە.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٧ / ٢ ی هەموو ساڵێك.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ١٠,١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٧٩ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١,٣٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٠ .

## رواندا

ناوی باو:رواندا

ناوی فەرمی: کۆماری رواندا

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Rwanda

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە وسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانیش یارمەتی دەدات. هەروەها جێگری سەرۆکیش، کە زۆرجار وەزیری بەرگری دەبێتە جێگری سەرۆك، یارمەتی دەدات.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نیشتیمانی ( ٧٠ ئەندام ).

رووبەر : ١٠,١٦٩ میل دووجا، ٢٦,٣٣٨ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٧,٧٣٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٢٩٣,٢ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی رەش: هۆتۆ ( زۆرینەن ) ، تۆتسی ( کەمایەتین ) ، کورتەباڵا، توا .

ئاین: مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك) ، موسڵمان، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

زمان: کینیا رواندا، فەرەنسی.

پایتەخت: کیجالی.

شارە سەرەکییەکان: رۆهینجیری، بۆتاری، جیسینی.

دراو: فرانکی رواندی.

ئاووهەوا: کەمەرەیی مام ناوەندە بەهۆی بەرزبوونی لە رووی دەریاوە. نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٣ پلەی سەدییە لە ناوچەی ئاساییەکان و ١٧ پلەی سەدی لەبەرزاییەکانی رۆژئاوای وڵات و ٢٠ پلەی سەدی لە بانەکان. رێژەی ساڵانەی بارانەکان بەپێی ناوچەکانی سەرەوە بەم شێوەیەن: ٧٥ سم، ١٤٧ سم، ١٢٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز، فاسۆلیا، منیهۆت، حەشیشەی تا، گەنمە شامی، پەتاتەی شیرین، قاوە، چا، مانگا.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: چیمەنتۆ، سابون، شەکر، بیرە.

سامانی کانزایی: تەنەکە، ئاڵتون، ولگرام، تەنگستن.

تێڕوانینێکی گشتی :

رواندا ولاتێكە دەكەوێتە رۆژهەلاتی ناوەڕاستی ئەفریقیا كەمێك بەرەو باشووری هێڵی یەكسان. ئۆگەندا دەكەوێتە باكووری، تەنزانیا دەكەوێتە رۆژهەلاتی، بۆرۆندی دەكەوێتە باشووری، كۆنگۆی دیموكراسی دەكەوێتە رۆژئاوای. كەنارێكی هەیە لەسەر دەریاچەی كیڤۆ كە بەشێك لە سنووره رۆژئاواكانی پێك دەهێنێ. هیچ كەنارێكی دیكەی نییە لەسەر دەریاكان. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٣٠ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٢ بەرەو باشوور.

بەرزایی وچیاكان زۆربەی ناوچەكانی رواندا دادەپۆشن، بەرزاییە سەختە گڕكانییەكانیش دەكەونە بەشە رۆژئاواییەكان وباكوورییە رۆژئاواكانی. بەلام بەشە رۆژهەلاتیەكانی بە زنجیرەیەك بان داپۆشراون، لەوانیشەوە ناوی ولات هاتووە: ولاتی هەزار بان. ئەم بانانە بەرەو رۆژهەلات لێژ دەبنەوە زەلكاوەكانیش بەشەكانی خوارەوەی بانەكانیان داپۆشیوە.

خێڵەكانی هۆتۆ و كورتەبالاكان یەكەم دانیشتوانی رەسەنی ئەو ناوچەیەن. بەر لە ٦٠٠ ساڵ ولاتەكە دووچاری هێرشی تۆتسییەكان بۆتەوە لە باكوورەوە و توانیویانە بەسەر هۆتۆكاندا سەركەوتن بەدەست بهێنن.

لە ساڵی ١٨٩٧ دا ئەڵمانیا ئەو ناوچەیەی داگیر كردووە كە ئێستا هەر یەك لە رواندا وبۆرۆندییان پێك هێناوە وخستینە سەر ئەو ناوچەیەی پێی دەوت رۆژهەلاتی ئەفریقیای ئەڵمانی. لەساڵی ١٩١٦ دا بەلجیكا توانیویەتی دەست بگرێت بەسەر ناوچەكەدا. دوای جەنگی جیهانیی یەكەم ( ١٩١٨ ) ئەڵمانیا تەواوی خاوەنداریەكانی لەو ناوچەیە لەدەست داوە. لە ساڵی ١٩٢٣ دا یەكێتی نەتەوەكان بەلجیكای راسپارد هەرێمەكە بەرێت بەڕێوە.

لەساڵی ١٩٥٩، دوای كوشتنی شا موامی مۆتاری سێهەم ولات دووچاری چەند ململانێیەكی سیاسی بۆتەوە بۆتە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ لەنێوان هەردوو خێڵی تۆتسی وهۆتۆ نزیكەی ١٥٠,٠٠٠ كوشتاری لێكەوتەوە لەهەردوو خێڵی ناوبراو وهەڵهاتنی ژمارەیەك هاولاتی بەرەو ولاتە دراوسێكان.

لەساڵی ١٩٦١ دا دانیشتوان دەنگیان دا بەسیستەمی كۆماری و رواندا لە بۆرۆندی جیابۆوە و لە ١ / ٧ / ١٩٦٢ هەر یەك لەو دوو ولاتە بۆتە ولاتێكی سەربەخۆ. لەهەمان ساڵدا پەیوەندیان كردووە بەنەتەوە یەكگرتوەكانەوە.

یەكەم سەرۆكی رواندا، بەپێی هەڵبژاردنەكان، گریگۆری كیباندا بوو وتا ساڵی ١٩٧٣ لەدەسەلاتدا مایەوە تا بەكودەتایەكی سەربازی لەدەسەلات دوورخراوەتەوە كە لیوا جۆڤینال هابیاریمانا بەڕێوەی برد وخۆی بۆتە سەرۆكی ولات.

لە ٦ / ٤ / ١٩٩٤ دا هەر یەك لەسەرۆكی رواندا هابیاریمانا و سەرۆكی بۆرۆندی

لەڕووداوی کەوتنە خوارەوەی فڕۆکەکەیان گیانیان لەدەست دا. ئەمە بووە هۆی هەژاندنی ولات وهەلگیرسانی شەڕی ناوخۆ لەنێوان هۆتو وتوتسی. نزیکەی نیو ملیۆن کەس لەم شەڕەدا گیانیان لەدەستدا وبووە هۆی هەلهاتنی ژمارەیەکی زۆری هاولاتیان بەرەو ولاتانی دراوسێ لەترسی ئەو سەربڕینخانە دڕندانەیەی کە نزیکەی دوو مانگی خایاند.

لە ٢٤ / ٤ / ١٩٩٨ پاش دادگایی کردنی تێوەگلاوان بەم شەڕەوە ٢٣ کەس لەنێوانیاندا نافرەتێك لەسێدارە دران.

لەسالی ١٩٩٨ دا هێزەکانی ڕواندا پەلاماری ولاتی کۆنگۆی دیموکراسیان دا بۆ ئەوەی حکومەتەکەیان بڕوخێنن. ئەمە لەچوارچێوەی ئەو پەلامارانەی حەوت ولاتی ئەفریقی گرتەوە لەکۆنگۆی دیموکراسی. لە مانگی ٨ / ١٩٩٩ ڕێکەوتننامەی ئاشتی لەنێوان هەردوو دەولەتدا واژۆ کرا، بەلام هەردوولا پێشێلی بەندەکانی ڕێکەوتنەکانیانی نێوانیان کرد.

دوای ئەوە بەهۆی چەند ناوبژیوانێکی نێودەولەتی وئەفریقییەوە هەردوو ولات چەندین دانیشتن و گفتوگۆیان کرد، بە واژۆکردنی ڕێکەوتننامەی ٣٠ / ٧ / ٢٠٠٢ لە بریتۆریای پایتەختی ئەفریقیای باشوور لەلایەن سەرۆکی هەردوو ولات وبەئامادە بوونی چەند سەرۆکێکی ولاتانی ئەفریقیا کۆتاییان بەکێشەکانی نێوانیان هێنا. لەڕێکەوتننامەکەدا هاتبوو: کۆنگۆی دیموکراسی بەلێن بەداماڵینی چەکەکانی ئەندامانی ( ئەنتراهەمواى ) ڕواندی بدات کە هۆتۆکانن ویارمەتی ڕواندا بدات لەدەستگیر کردنیان. شایەنی باسە سەربڕینخانەکانی ١٩٩٤ ی ڕواندا خرابوۆوە ئەستۆی میلیشیاکانی ئەنتەرهەموای کەلە ڕۆژهەلاتی کۆنگۆی دیموکراسی چەند بنکەیەکی سەرەکییان پێك هێنا بوو. لەبەرامبەردا ڕوانداش بەلێن دەدات بەکشانەوەی هێزەکانی لە کۆنگۆی دیموکراسی ، هەردوو لا بەلێنیان دا هاوکاری یاخی بووانی یەکدی نەکەن.

لە ١٤ / ٨ / ٢٠٠٢ دا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەولەتی بڕیاری بەرفراوان کردنی دادگای تاوانەکانی شەڕی ڕواندا دا، کە لەم دواییەدا تەنزانیایان بە بنکەیەکی سەرەکی خۆیان هەلبژاردووە، دادگاکەی ئەنجومەنی ناوبراو لە ١٦ دادوەرەوە کرا بە ٣٤ دادوەر تاکو بتوانن ئەو ژمارە زۆرە سکالایە سەبارەت بەسەربڕینخانەکانی ١٩٩٤ ی ڕواندا بڕوانن.

لە ٧ / ١٩٩٤ دا بەرەی نیشتیمانی ڕواندی باستۆر بیزیمۆنگۆی بەسەرۆکی ولات هەلبژارد ( لە هۆتۆ ئاشتی خوازەکانە)، لەبەرواری ٢٤ / ٥ / ٢٠٠٠ سەرۆکی ناوبراو دەستی لەکار کێشایەوە و بەشێوەیەکی کاتی بۆل کاجامی جێگری دەسەلاتی گرتە دەست.

ڕواندا بەیەکێك لەولاتە هەژارەکانی ئەفریقیا دادەنرێت، چونکە چالاکییە پیشەسازییەکانی زۆر دیار کراون. هەروەها ژمارەیەکی دانیشتوانی زۆری لەخۆی گرتووە لە تواناکانی ولات

دەردەچێ. رێژەی چڕی دانیشتوان دانیشتوانی ئەو وڵاتە سێ هێندەی رێژەی چڕی دانیشتوانی کیشوەری ئەفریقیا دەبێت بەشێوەیەکی گشتی. بەڵام حکومەت لەو هەوڵەدایە نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك لە ٢٥٠ دۆلاری ئەمریکییەوە بۆ ١٥٠٠ دۆلاری ئەمریکی بەرز بکاتەوە تا ساڵی ٢٠٢٠ لەرێی رێگەدان بە بەرهەمهێنەرە بیانییەکان لەوڵاتەکەیدا کاربکەن.

لەکۆتاییەکانی ٢٠٠١ دا حکومەتی رواندا رایگەیاند کە هێما نوێکانی وڵات پێك دێت لە: ئاڵا وسروودی نیشتیمانی ومۆر و هێما ودروشم، کە ئەنجومەنی نیشتیمانی لەخۆی گرتبوو، لەبری ئەو هێمایانەی یەکەم سەرۆکی وڵات لە ١ / ٧ / ١٩٦٢ لەکاتی سەربەخۆیی لە بەلجیکا رایگەیاندبوو.

رەنگەکانی ئاڵای نوێش: سەوز، شین، رەنگی سووری لێدوورخرایەوە چونکە هەندێ بەرەنگی خوێنی کوژراوانی هۆتۆ وتۆتسییان لەقەڵەم دا. سروودی نوێی نیشتیمانیش هیچ کام لەپێکهاتە نەژادیەکانی وەك هۆتۆ وتۆتسی لەخۆی نەگرتوو، وەك جێبەجێ کردنێکی سیاسەتی نوێ حکومەت کە دانی یاسایی نەناوە بەهیچ پێکهاتەیەکی نەژادی ئەو وڵاتە. دروشمی نوێی کۆماریش هیمایەکە بۆ یەکێتی و کار ونیشتمانی ووێنەی تەوری لێ دوورخراوەتەوە چونکە لە سەربڕینخانەکانی ١٩٩٤ دا ئەو چەکە سپییەیان بەکار هێناوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٤١.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢١٣ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٧٨.

## روسیا

**ناوی باو:** روسیا

**ناوی فەرمی:** روسیای یەکگرتوو.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Russian Federation

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری یەککگرتوو، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی یەکگرتوو، پێك دێت لە دوو ئەنجومەن:

ئەنجومەنی یەکگرتوو ( ١٧٨ ئەندام ).

ئەنجومەنی نوێنەران ( دۆما پێك دێت لە ٤٥٠ ئەندام )

**ڕووبەر :** ٦,٥٩٢,٨٠٠ میل دووجا، ١٧,٠٧٥,٤٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٤٥,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠١ ) .

**چڕی دانیشتوان:** ٨,٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** روسەکان نزیکەی ٨٠٪ ی کۆی دانیشتوان پێك دەهێنن، ڕێژەکەی دیکەش لە نزیکەی ١٥٠ کۆمەڵەی نەژادی پێك دێنن، گرنگترینیان: تەتەر، ئۆکرانی، بشکیر، روسی سپی، چیچیان، ئەڵمان، کازاخ، مۆلدۆڤی.

**ئاین:** مەسیحی ( ئەرتۆدۆکس، کاسۆلیك، پرۆتستانت)، موسڵمان، جوولەکە.

**زمان:** روسی.

**پایتەخت:** مۆسکۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** سانت پیترۆسبێرگ، ڤۆلگۆگراد، نایزنی نۆڤگۆرۆد، ساراتۆف، ئیکاتیرنبۆرگ، سامارا، سیمبیرسك، نۆڤۆسیبیرسك، کالینیگراد.

**دراو:** رۆبڵ.

**ئاووهەوا:** کیشوەری، گۆڕانکاری گەورە لەنێوان زستان وهاویندا هەیە. ماوەی بەهار وپایز لەو وڵاتەدا زۆر کەمە. باکووری وڵات بە سارد ترین ناوچە دادەنرێت لەجیهاندا ( لەدەرەوەی کیشوەری جەمسەری باشوور ) وپێی دەوترێ ( فیرخۆیانسك) ونێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا دەچێتە ٤٦ پلەی ژێر سفری سەدی وهەندێ جار دەگاتە ٧٦ پلەی ژێر سفری سەدی. لەهاویندا پلەکانی گەرما دەگاتە ١٦ پلەی سەدی.

بارانەکان زیاتر لەدەشتی ئەوروپا وهەندێ لەبەرزاییەکانی سیبیریای ڕۆژهەڵات دەبارێت، بەڵام بەشە ناوخۆییەکان کەمتر بارانەکان دەیانگرێتەوە.

کۆتایی هەشتاکانی سەدەی پێشوو، هاوڵاتیانی یەکێتی سۆڤیەت داوای ئازادی زیاتریان لەحکومەتی مەرکەزی دەکرد، بۆیە لە ١٢ / ٦ / ١٩٩٠ دا کۆماری روسیای رایگەیاند کە ئەو یاسایانەی ئەنجومەنی یاسادانان دەریان دەکات بایەخێکی زیاتریان هەیە لەو یاسایانەی حکومەتی مەرکەزی. بۆیە لەسەرەتای ١٩٩٠ دا تەواوی کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت کاریان بەیاسا سەربەخۆکانی خۆیان کرد.

لەبەرواری ١٣ / ٦ / ١٩٩١ نیکۆلافیتس بۆریس یەڵتسین بەسەرۆکی کۆماری روسیای یەککگرتوو هەڵبژێردرا. لە بەرواری ١٩ / ٨ / ١٩٩١ دا هەندێ لەسەرکردەکانی حیزبی شیوعی پارێزگاران کودەتایان بەسەر حکومەتەکەی میخائیل گورباتشۆفدا کرد وخۆیان ئەرکی دەسەڵاتی وڵاتیان گرتە دەست، لەئاکامدا بۆریس یەڵتسین راپەرینێکی جەماوەری بەسەر کۆمەڵانی کودەتاکەیا کرد ولە ٢١ / ٨ / ١٩٩١ دا وروخاندنی. گۆرباتشۆف وەك سەرۆکی یەکێتی دەسەڵاتی گرتەوە دەست بەڵام لە پلەی سکرتێری حیزبی شیوعی دەستی هەڵگرت. لەبەرورای ٢٩ / ٨ / ١٩٩١ کۆتایی بەحوکمی شیوعییەکان هات وروسیا سەربەخۆیی خۆی راگەیاند. لە ٨ / ١٢ / ١٩٩١ دا پێکهێنانی کۆمۆنۆلتی وڵاتە سەربەخۆکان دامەزرا. لە ٢٥ / ١٢ / ١٩٩١ یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشایەوە ودوایین سەرۆکی میخائیل گۆرباتشۆف دەستی لەکار کێشایەوە وئاڵای یەکێتی سۆڤیەت لەتەلاری کرێملن لە مۆسکۆ دابەزێنرا وئاڵای نوێی روسیا هەڵکرا.

لەبەرواری ٣١ / ٣ / ١٩٩٢ دا نزیکەی ٨٦ کیانی سیاسی:

- ١٨ کۆمار کە لەسەردەمی یەکێتی سۆڤیەتدا ماف ئۆتۆنۆمیان پێبەخشرابوو.
- ٦ هەرێم.
- ٤٩ ناوچە.
- ١١ کیانی ئۆتۆنۆمی.
- هەردوو شاری مۆسکۆ، سانت پۆترۆسبێرگ.

واژۆی رێکەوتننامەی یەکێتی روسیا کرد، کە بناغەی نەتەوەی روسیای نوێی دارشتبوو، بەڵام هەر یەك لە کۆماری: تەتار وچیچان – ئەنگۆشیان رەزامەندیان لە واژۆ کردنی رێکەوتننامەکە رەتکردەوە، رایاگەیاند کە ماف سەربەخۆییەکی گەورەتریان ئەوێت.

لەبەرواری ٣١ / ١٢ / ١٩٩٩ سەرۆك بۆریس یەڵتسن دەستی لەکار کێشایەوە ودەسەڵاتی کاتی بە فلادیمێری بوتینی سەرۆکی وەزیران سپارد تائەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لەدوای سێ مانگ لەو بەرواره.

لە ٢٦ / ٣ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە روسیادا بەڕێوەچوو. پۆستی سەرۆکایەتی بە سەرۆکی وەزیرانی پێشوو فلادیمێر بوتین ( ٤٧ ساڵ ) سپێردرا پاش ئەوەی رێژەی ٥٢,٥٢ ٪ ی کۆی دەنگەکانی بەدەست هێنا.

لەبەرواری ٧ / ٥ / ٢٠٠٠ دا فلادیمێر بوتین سوێندی دەستووری لە کرێملن خوارد، بەمەش بووە دووەم سەرۆکی روسیا دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت. بوتین لەکاتی سوێند خواردندا دەستی خستە سەر دەستووری وڵاتی و بەڵێنی دا بەرگری لە دەستوور مافەکانی هاوڵاتیان وخزمەتی وڵاتەکەی وپارێزگاری لەیەکێتی خاك وئاسایشی بکات.

لە ٨ / ٧ / ٢٠٠٠ دا یەکەم وتاری لەبەردەم ئەنجومەنی نوێنەراندا ( دۆما ) و ئەنجومەنی یەکێتی ( ئەنجومەنی باڵا ) پێشکەش کرد، لەوتارەکەیدا وتی: "تاکە رێگا لەبەردەم روسیادا ئەوەیە باوەڕ بەخۆی بێنێ کە وڵاتێکی بەهێزە، من دان دەنێم بەوەی کە ئابووری روسیا زۆر لاوازەو گەشە کردنیشی تا ئێستا وەك پەراوێزێك لەبەردەمماندایە: هەروەها ئاماژەی دا بە کەم کردنەوەی دەستێوەردانی حکومەت لەپرۆژە ئابوورییەکان، هەروەها باسی لەوە کرد کە رێژەی لەدایك بووان لەم ساڵانەی دواییدا بەرەو ٧٥٠ هەزار کەس کەم بۆتەوە چونکە زۆربەی تاکەکانی روسیا بڕیارایان داوە لەم قۆناغەدا منداڵ نەخەنەوە چونکە باری ئابووریان لاوازە وگەر وابڕوات لەماوەی ١٥ ساڵی داهاتوودا ژمارەی دانیشتوانی روسیا ٢٢ ملیۆن کەس کەم دەکاتەوە لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەی دانیشتوانی ئێستایان ١٤٥,٠٠٠,٠٠٠ ملیۆن کەسێك دەبێت. هەروەها وتی: "مەترسی ئەوەمان لەسەرە کە نەتەوەکەمان بەرەو نەتەوەیەکی پیروپەکتە بەرێ بکەوێ".

لە ١ / ٨ / ٢٠٠٠ دا بۆمبێکی لەژێر تونێلێکی وێستگەی میترۆی بۆشکیندا تەقییەوە و بووە هۆی کوژران وبریندار بوونی بەدەیان هاوڵاتی، شایەنی باسە حکومەتە چەکدارەکانی چیچانی بەئەنجامدانی ئەم کارە تیرۆریستانەیە تاوانبار کرد.

لە ١٢ / ٨ / ٢٠٠٠ دا، کەشتی ژێر ئاوی ئەتۆمی: کۆرسك، لەدەریای بانتسدا نزیك شاری مۆرمانسك نوقمی ئاو دەبێت و ١١٨ کەس ودەریاوانەکەی گیان لەدەست دەدەن. کرملێن رۆژی ماتەمینی نیشتیمانی راگەیاند و دەسەڵاتدارە حکومییەکان رایانگەیاند کە هەرگیز ناتوانن تەرمی دەریاوانەکان لەنێو کەشیەکەدا بهێنە دەرەوە چونکە بەقوڵایی سەت مەتر زیاتر لەنێو دەریای بانتسدا نوقم بووە. بەڵام مەترسییەکانی لێچوونی تشکە ئەتۆمییەکان لەکەشتی نوقم بوو پەیدا بوو. دوای دووساڵ لەنوقم بوونی کەشتی ژێر ئاوەکە بەهۆی یارمەتییە نێودەوڵەتییەکانەوە کەشتی کۆرسك هێنایە دەرەوە ولەمۆسکۆی پایتەختدا مۆنۆمێنتێکی بۆ کراوە. دەزگا دەسەڵاتدارەکانی مۆسکۆ رایانگەیان کە نوقم بوونی

کەشتیەکە بەهۆی تەقینەوەی یەکێك لە تۆربیدەکان بووە بێ ئەوەی ئەرکی بەرپرسیارێتی بخاتە ئەستۆی هیچ لایەن وکەسێك.

لە ٢٧ / ٨ / ٢٠٠٠ دا بورجی ئۆستنکینۆی پەیوەندییەکان لەناوەڕاستی مۆسکۆ ( کە بەرزترین دووەم بورجە لەجیهاندا دوای بورجی تۆرێنتۆ لەکەنەدا ) ئاگرێکی گەورەی لێکەوتەوە بووە هۆی بریندار بوونی وسوتاندنی هەندێ لەکارمەندانی بورجی ناوبراو، ئەمەش بووە هۆی راگرتنی پەخشی تەلەفزیۆنی، سەرۆك بوتین رایگەیاند کەهۆکاری ئەم کارەساتە نوێیە دەگەڕێتەوە بۆ باری ناهەمواری ولاتەکەی.

لەبەرواری ١٦ / ٢ / ٢٠٠١ حکومەتی روسی ئاگادارییەکی مەترسیداری بلاو کردەوە، کە لەوەو پێش سەرۆك بوتینیش هەمان ئاگاداری راگەیاندبوو، لەوەی کەژمارەی سەرنشینانی روسیا بەرەو دابەزین دەڕوات بەهۆی دابەزینی رێژەی لەدایك بوونەوە، ئەمەش مەترسییەکی گەورەی هەیە بۆ سەر ئاسایشی نەتەوەیی روسیا. ژمارەی دانیشتوان لە ١٩٨٧ دا نزیکەی ١٤٧ ملیۆن کەس دەبوو، بەلام لە ٢٠٠١ دا ئەو ژمارەیە بەرەو ١٤٥ ملیۆن هاتووە، بۆیە واپێشبینی دەکەن کە لەسالی ٢٠٥٠ دا ژمارەی سەرنشینانی ئەو ولاتە دابەزێتە سەر ٨٥ ملیۆن کەس. بۆیە حکومەت دەستی کردووە بەهاندانی کۆچبەران بەرەو ولاتەکەی – وەك چارەسەرێك بۆ ئەو کێشەیەی کە لێی دەترسن– لەو ولاتەکانی دیکەوە، بەشێوەیەك کە ژمارەی کۆچبەران بەرەو روسیا سالانە لەیەك ملیۆن کەس کەمتر نەبێت.

لەبەرواری ٢ / ٤ / ٢٠٠١ دا دەستکردن بەبنیات نانی پردێکی زەبەلاح لەنێوان هەردوو کۆماری روسیا و ئۆکرانیا لە رێی تەنگەی کێرشەوە ( کە هەردوو دەریای ئازۆف و دەریای رەشەوە پێك دەبەستێتەوە ) راگەیەنرا وبڕی ئەو پارەیەی بۆی تەرخانکرا بە یەك ملیار ونیو دۆلاری ئەمریکی دیاریکرا.

لەگەڵ تێپەڕبوونی چەند سالێك بەسەر هەلوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت ونەمانی شیوعێت لەو ولاتەدا، روسەکان سەرقالی دارشتنی سروودێکی نیشتیمانین بوون بۆ ولاتەکەیان، گفتوگۆکان لەنێوان زۆربەی چینەکان ودەزگا دەسەلاتدارەکانی حکومەت لەسەر سروودەکە هاتبۆوە ئاراوە. تا ڤلادیمێر بوتین لەکۆتاییەکانی ٢٠٠٠ دا بڕیارێکی دەرکرد بۆ ئەو سروودەی کە ئێستا هەیانە، شایەنی باسە سروودەکە لەلایەن سێرجی میخالۆفەوە نووسراوەتەوە، ئەویش هەمان ئەو شاعیرەیە کە سروودی نیشتیمانی سۆڤیەتی نوسیبۆوە وتایبەت بوو بە سەرکردەی سۆڤیەت جۆزێف ستالین لە ١٩٤٣ دا. سروودەکە هەمان ئاوازی سروودی پێشووی هەبوو لەگەڵ گۆڕینی هۆنراوەکەی، ئەمەش بووە هۆی دەربڕینی نارەزایی هەندێ لەلایەنەکان بە پاساوی ئەوەی کە گوایە ئەو سرووده بیری ئەو

رابووردوەیان دەخاتەوە کە هەرگیز ناگەڕێتەوە.

لەسایەی حکومەتی سۆڤیەتدا، روسیا لەوڵاتێکی کشتوکاڵیەوە بووە یەکێك لەوڵاتە پیشە سازییە گەورەکانی جیهان، و\روسیا پیشەسازی سۆڤیەتی بەسەرکەوتن وشکستەکانییەوە بۆ مایەوە، بۆیە ئێستا حکومەت لەهەوڵی ئەوەدایە کارگە وکێڵگەکانی بخاتە سەر موڵکێتی تایبەت. بەڵام لەگەڵ خراپی باری ئابووری ئەو وڵاتە بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام داواکردنی گەڕانەوەی پلانە ئابوورییەکان بۆ سەردەمی سۆڤیەت ئێستا جێگەی باس ولێکۆڵینەوەیە، لەوانە گەڕانەوەی موڵکێتی گشتی پرۆژەکان وسیستەمی کۆنترۆڵکردنی نرخەکانی شتومەك وکاڵاکـان. حکومـەت لەهـەوڵی بەردەوامدایـە بـۆ پڕکردنـەوەی ئـەو کەلێنـە ئابووریـەی کەدووچاری روسیا بووە وجێگیرکردنی بەهای رۆبڵ لەبازاڕە جیهانییەکاندا. رمانی ئابووری روسیا پاشکەوتنی رۆڵـی سیاسی ئەو وڵاتەشی گرتەوە، بەڵام سەرکردایەتی نوێ هـەوڵی چـالاککردنەوەی سیاسـەتی روسـیای جیهـانی دەدات وبایـەخی لێهاتووەکـانی بخرێتـەوە بەرچاو. ئەمە لەداواکارییە بەردەوامەکانی روسیادا خۆی دەبینێتەوە کەبەردەوام گرنگی بە بنیات نانی جیهانێکی فرە جەمسەر وبەرهەڵستی توندی روسیا لە بەرنامە تایبەتییەکانی ئەمریکا لەدژە مووشەکەکانی. بەڵام بەرامبەر پرۆگرامی ناوبراو بەقەڵغانی ئاسمانی یان جەنگی ئەستێرەکان، روسیا رایگەیاند کەپەیڕەوی سیستەمێکی سەربازی تایبەت دەکات، ئەویش ئەوەیەی کە روسیا بۆی هەیە چەکی ئەتۆمی بەکار بهێنێت ئەگەر دووچاری هێرشێك بووەوە لەلایەن هەر وڵاتێکی بێگانەوە گەر بێتو نەتوانێ بەشێوە لاساییەکان پارێزگاری لەخۆی وهاوپەیمانەکانی بکات، هەروەها جەخت لەسەر بوونی سەربازیی رووسی لەناوچە گرنگە و ستراتیژییەکان دەکات لەهەر جێیەکی جیهاندا بێت، ئەمەو جگە لەوەی بەرهەڵستییەکی زۆری لە هەڵوێستی ئەمریکا کرد بەرامبەر بەعێراق لە ٢٠٠١ ، جگە لە بەرهەڵستی لەهێرشی ئەم دواییەی ئەمریکا وهاوپەیمانەکانی بۆ سەر عێراق. لەبەرواری ١٥ / ٥ / ٢٠٠٢ دا هەر یەك لەهاوپەیمانی باکووری ئەتلەسی و روسیا رایانگەیاند کەرێکەوتوون لەسەر پێکهێنانی ئەنجومەنێکی هاوبەش بۆ دیاریکردنی جۆری پەیوەندییەکانی نێوانیان لەدوارۆژدا.لە ٢٨ / ٥ / ٢٠٠٢ دا واژۆیان لەسەر بەیاننامەی رۆما کرد، لەوکۆنگرەیەی کە لەبنکەی ئاسمانی ( براتیتا دی ماری ) ی نزیك شاری رۆمای پایتەختی ئیتاڵیا. بەپێی ئەو رێکەوتننامەیە روسیا دەبێتە هاوبەشێکی پەسەند کراو لەبریار وپرۆسەکانی ناتۆ ناوبراو لەزۆربەی بوارەکاندا، وەك قەڵاچۆکردنی تیرۆر ، بڵاوبوونەوەی چەکە کۆکوژەکان وبەڕێوەبردنی کێشە وگرفتەکان، بێ ئەوەی ماف بەکارهێنانی ڤیتۆی هەبێت لەسەر بریارەکانی ناتۆ.

لەبەرواری ١٢ / ٦ / ٢٠٠٢ دا روسیا ئاهەنگی دوانزەهەمین جەژنی سەربەخۆیی لەیەکێتی سۆڤیەت گێرا، بەر لە دوانزدە ساڵ لەو بەرواره، لەکاتێکدا زۆربەی دانیشتوانی روسیا خۆشحاڵی و پەرۆشی خۆیان لەم بۆنەیە دەرنەبڕی چونکە وەك لێکۆڵینەوەیەکی تایبەت روون وئاشکرای کردووە باری ئابووری وئاستی ژیانیان هێندە لاوازە هەستێکی نیشتیمانی ئەوتۆیان نەماوە بەتایبەتی دوای ئەوەی وڵاتەکەیان وەك یەکێك لەوڵاتە زەبەلاحەکانی جیهاندا ئەو بایەخەی نەماوە.

لەسەردەمی سەرۆك بوتیندا، یەکێك لەو بەرهەمانەی کە لەپێناوی باشتر کردنی باری کۆمەلآیەتی وئابووری گەلی روسیادا ئەنجام دراوە بوونی روسیا بەئەندامێك لەو کۆمەڵەیەی کەهەشت وڵاتی گەورەی پیشەسازی پێکیان هێناوە، ئەوانیش: ئەمریکا، کەنەدا، بەریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئیتالیا، یابان. بەپێی ئەو بریارەی هەر یەك لەو هەشت وڵاتە رەزامەندییان لەسەر دەربڕیوە لەکۆنگرەی کاناناسکیس لە کەنەدا لە ٢٧ / ٦ / ٢٠٠٢ دا.

روسیا بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی جۆ وپەتاتە وگاز ویەدەگی گاز، بەپلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی داروتەختە وبەپلەی سێیەم دێت لە بەخێوکردنی بەراز و لەبەرهەمی خەڵوز وپیترۆل وبەپلەی چوارەم دێت لەبەرهەمی گەنم ومەڕوماڵات ومس وئەڵماس وخووری، بەپلەی پێنجەم دێت لەبەخێو کردنی مانگا وبەرهەمی ئاڵتون ورارە ماسی، بەپلەی نۆیەم دێت لەبەرهەمی زیو وبەپلەی دەیەم دێت لەبەرهەمی زنك وتەنەکە.

گەنجینە کردنی نەوت لە روسیا بەپلەی یەکەمی هەموو وڵاتە ئەورووپیە رۆژهەلآتیەکان دێت لەچیاکانی ئۆرال، چونکە گەورەترین گەنجینەی سروشتی نەوت لەو ناوچەیەدایە، بەبەرهەمێك کە رۆژانە دەگاتە حەوت ملیۆن بەرمیل، روسیاش بەمە دەتوانێ رکەبەرایەتی شانشینی عەرەبی سعودیە بکات کەبەرهەمی رۆژانەی نەوتی دەگاتە هەمان ژمارە.

جەژنی نیشتیمانی: ١٢ / ٦ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢٩٢,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١١ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢,٦٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٦٨ .

## روسیای سپی

**ناوی باو:** روسیای سپی، یان بیلاروسیا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری روسیای سپی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Belarus

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ٣٦٠ ئەندام ).

**رووبەر :** ٨٠,٢٠٠ میل دووجا، ٢٠٧,٦٠٠ کم٢ .

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,٣٦٠,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٨٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٤٩,٤ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** روسی سپی ( کە بەرەچەڵەك لە سلاڤییەکانن )، روس، ئۆکرانی، پۆڵۆنی.

**ئاین:** مەسیحی ( کڵێسەی ئەرتۆدۆکسی بیلەروسی، کاسۆلیك، پرۆتستانت ) ، جوولەکە ، بێ ئاین.

**زمان:** بیلەروسی، زمانێکی سلاڤی کۆنە ولەهەردوو زمانی ئۆکرانی وروسیەوە زۆر نزیکە، هەروەها زمانی روسیش بەزمانێکی فەرمی دادەنرێت بەپێی ئەو دەنگدانەی لە ١٥ / ٥ / ١٩٩٥ بۆ ئەم مەبەستە بەئەنجام گەیەنراوە.

**پایتەخت:** مینسك .

**شارە سەرەکییەکان:** جۆمیل، میگیلیف، گرۆندۆ، بۆبرۆیسك، بریست، بارانۆفیشی، ئۆرشا.

**دراو:** رۆبلی بیلاروسی.

**ئاووهەوا:** زستانی سارده ونێوەندی پلەکانی گەرما دەچێتە ٦ پلەی ژێر سفری سەدی، هاوینی مام ناوەندە وپلەکانی گەرما ١٨ پلەی سەدی دەبێت ، رێژەی ساڵانەی باران وبەفرەکان لە ٥٠ سم بۆ ٦٥ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، مانگا، کەتان، بەخێوکردنی بەراز، پەتاتە، چەوەندەر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ماتۆڕ وپاسکیل، ئامێری ئەلەکترۆنی، ئامێری ئەندازیاری، کەلوپەلی ناوماڵ، تەختە، کاغەز، پەین، ئامێری کارەبایی، تراکتۆری کشتوکاڵی.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، پیترۆڵ، پۆتاس، خوێ، خات ( جۆرە روەکێکە لەبری

سوتەمەنی بەكار دەهێنرێت ).

**تێڕوانینێكی گشتی :**

روسیای سپی، یان بلاروسیا، وڵاتێكە دەكەوێتە رۆژهەڵاتی ئەوروپا. لیتوانیا ولاتفیا دەكەونە باكووری، روسیا دەكەوێتە رۆژهەڵاتی، ئۆكرانیا دەكەوێتە باشووری، بۆڵۆنیا دەكەوێتە رۆژئاوای، كەناری نییە. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٢٧ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥٣ بەرەو باكوور.

زۆربەی زەویەكانی روسیای سپی تەخت ونزمە، بەرزترین خاڵی ئەو وڵاتە بریتییە لەگردەكانی كە پێیان دەوترێت: دزیرزهنسكایا گۆرا كە نزیكەی ٣٤٦ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزن. هەندێ لەزەوییەكانی لە ناوەڕاستی وڵات لە باكووری رۆژهەڵاتەوە بەرەو باشووری رۆژئاوا بەرزدەبنەوە. لەهەندێ ناوچەی دیكەش زەلكاوەكان بڵاودەبنەوە.

روسیای سپی مێژوویەكی سەربەخۆی نییە، جونكە جۆگرافیای خاكەكەی پارێزگارییەكی سروشتی بۆ مسۆگەر نەكردووە، ئەمەش وای كردووە بەدرێژایی حەوت سەدەی پێشوو دووچاری چەند جۆری داگیركەر ببێتەوە. لەسەدەی نۆیەمی زاییندا سلاڤییە رۆژهەڵاتیەكان وڵاتی كیڤان روسیان دامەزراندووە. لەسەدەی چواردەیەمدا بۆتە بەشێك لەلیتوانیا. لەسەدەی شانزدەیەمدا بۆتە بەشێك لە پۆڵۆنیا. لەكۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەیەمدا روسیا داگیری كردووە. دوای هەڵگیرسانی شۆڕشی شیوعیەكان لە روسیا لە ١٩١٧ دا گەلی روسیای سپی وڵاتێكی سەربەخۆی ناشیوعییان دامەزراندووە و لە١٩١٨ وڵاتیان بەناوی كۆماری نەتەوەیی روسیای سپی ناوناوە. لەكۆتایی هەمان ساڵدا روسە شیوعییەكان پەلاماریان داوە، لەمانگی یەكی ١٩١٩ دا حكومەتێكی شیوعییان پێك هێناوە وڵاتەكەیان ناو ناوە : كۆماری روسیای سپی شیوعی سۆسیالیست. لەساڵی ١٩٢٢ دا بۆتە بەشێك لەیەكێتی سۆڤیەت. ئەڵمانەكان لەساڵی ١٩٤١ لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم داگیریان كردووە، وەك هەر دەوڵەتێكی داگیركراو، دووچاری وێرانی بۆتەوە، لەكۆتایی جەنگ روسە سۆڤێتییەكان گرتویانەتەوە دەست ، لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككگرتوەكان.

لەگەڵ هەڵوەشانەوەی یەكێتی سۆڤیەت، روسیای سپی لەبەرواری ٢٧ / ٧ / ١٩٩٠ دا سەرگەورەیی خۆی لەسەر بڕیارەكانی راگەیاندووە. لە بەرواری ٢٥ / ٨ / ١٩٩١ سەربەخۆیی خۆی راگەیاندووە، لەگەڵ دە كۆماری پێشووی یەكێتی سۆڤیەتدا یەكێتی وڵاتە سەربەخۆكانیان پێك هیناوە و مینسكیان بەپایتەختی ئیداری یەكێتییەكەیان هەڵبژاردووە.

لەبەرواری ٢٣ / ٦ / ١٩٩٤ ئەلكساندەر لۆكاشینكۆ بەسەرۆكی وڵات هەڵبژێردراوە، لە ٩ / ٩ / ٢٠٠١ دووبارە هەڵبژێردراوەتەوە.

لە بەرواری ١٩ / ٩ / ١٩٩١ دا ناوی ولات لە: بایلۆروس گۆڕا بۆ لەروسیا، بەواتای روسیای سپی دێت، یان روسیای رۆژئاوا دێت، لەبەر ئەوەی رەنگی سپی لای گەلە سلاڤییەکان هێمای رۆژئاوایە.

لەبەرواری ٢٥ / ١٢ / ١٩٩٨ هەر یەك لە روسیا وروسیای سپی رایانگەیاند کەدەبنە ولاتێکی یەکگرتوو لەساڵی ١٩٩٩ دا، لەگەڵ ئەوەی کە پرۆژەی یەك بوونی هەردوو ولات بخرێتە بەر دەنگدان ورا وەرگرتنی گەلی هەردوو ولات، بەمەرجێ هەریەك لەم دوو ولاتە سەروەری سەرکردایەتی لەدەست نەدەن. زۆربەی دانیشتوانی روسیا وروسیای سپی پشتیوانی لەم بڕیارەی حکومەتەکانیان دەکەن، بەلام نەتەوەییەکانی روسیای سپی بەرهەڵستیان لەم بڕیارە کرد وباسیان لەوە دەکرد کەئەم پرۆژەیە سەربەخۆیی ولاتەکەیان لەدەست دەدات، تا ئێستاش گفتوگۆکان لەسەر جێ بەجێ کردنی ئەم پرۆژەیە هەر بەردەوامە.

روسیای سپی خاوەنی ئابوورییەکی باش وگەشەکردووە، بەلام هێشتا پێویستی بە بوژانەوە هەیە. ئێستا حکومەت لەو هەوڵەدایە سیستەمی بازاڕی ئازاد پەیڕەو بکات.

روسیای پسی بەپلەی دووەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە بەرهەمی پەتاتە،\ وبەپلەی پێنجەم دێت لەبەرهەمی جۆ.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٧ / ٧ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٩٠ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢١,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٦٠.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢,١٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٧٨ .

## رۆمانیا

**ناوی باو:** رۆمانیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری رۆمانیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Romania

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ١٤٣ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٤١ ئەندام )

**رووبەر :** ٩٢,٤٣ میل دووجا، ٢٣٨,٣٩١ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٢,٥٧٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ) .

**چڕی دانیشتوان:** ٩٥ کەس/ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** رۆمانی، هەنگاری، قەرەج، ئەڵمان، ئۆکرانی.

**ئاین:** مەسیحی ( ئەرتۆدۆکسی رۆمان، رۆمان کاسۆلیك، ئەرتۆدۆکسی یۆنان )، نزیکەی ٨٠ هەزار موسڵمان.

**زمان:** رۆمانی.

**پایتەخت:** بۆخارست.

**شارە سەرەکییەکان:** کۆنستانتا، ئایاسی، تیمیشوارا، گالاتی، کلۆج – نابوکا، براسۆف.

**دراو:**لیو.

**ئاوو هەوا:** کیشوەری، زستانی سارد وهاوینی گەرمە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ١ پلەی ژێر سفری سەدی، لەهاویندا ٢١ پلەی سەدی. دەشتەکان گەرمترن لە چیاکان. بارانەکانی مام ناوەندە زیاترینیان لەوەرزی بەهار وسەرەتای هاویندا دەبارێت، ئەمەش زیان بە بەرهەمە کشتوکاڵیەکان دەگەیەنێت. بەفر بارین لەزستاندا دەبێتە هۆی پەیدا بوونی سەرمایەکی زۆر.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمە شامی، پەتاتە، گەنم، شیر، شەکر، چەوەندەر، ترێ، خووری، بەخێوکردنی بەراز.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، ئاسن، مادە پیترۆلیەکان، دروست کراوەکانی خۆراك، پۆشاك وپێڵاو، کەلوپەلی ناوماڵ.

**سامانی کانزایی:** پیترۆل، گازی سروشتی، خەڵووزی بەردین، ئاسن، لینیت، زنك، قورقوشم، بۆکسیت، مس.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

رۆمانیا وڵاتێکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ئەوروپا، ئۆکرانیا دەکەوێتە باکوور ورۆژهەڵاتی، مۆلدۆڤا دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی، دەریای رەش دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، بولگاریا دەکەوێتە باشووری، سربیا ( یۆگۆسلافیا ) دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی٢٤ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٦ بەرەو باکوور.

یەك لەسەر سێی خاکی رومانیا پێك دێت لەزنجیرە چیاکانی کارباتی رۆژهەڵات وزنجیرە چیاکانی ئەلبی ترانسیلڤانی، کە لەناوەڕاستی وڵاتدا بەیەك دەگەن وبانی ترانسیلڤانیا چوار دەوری گرتوون. دەشتی مۆلداڤیا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی وڵات، لە باشوور ورۆژهەڵاتی باشووریش بەپیت ترین دەشتەکانی رۆمانیای و چڕ ترینی لەدانیشتوان تێدەکەوێت، بۆخارستی رۆمانیاش لەو ناوچەیە دایە. چەند روبارێك بەناو رۆمانیا تێدەپەڕێت، گرنگترینیان روباری دانوبە کە بەدرێژی ١,٤٠٠ کم بەناو رۆمانیادا تێدەپەڕێت تا دەڕژێتە دەریای رەش.

لەسەدەی چوارەمی پ.ز خەڵکی لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، لەساڵی ١٠٦ ز دا کەوتۆتە دەست رۆمانەکانەوە ولەوانەوە ناوی وڵات هاتووە، چونکە پێش ئەوان رۆمانیا ناوی داسیا یان داکیا بووە. لەکۆتایی سەدەی سێهەمدا رۆمانەکان لەسەر دەستی خێڵە بەربەرییەکان لەو ناوچەیە کشاونەتەوە. تورکە عوسمانییە ئیسلامەکان لە ساڵی ١٤٧٦ بەدواوە بۆ ماوەی ٣٠٠ ساڵ حوکمیان کردووە. روسیا لە ١٨٢٩ دا داگیری کردووە، لەساڵی ١٨٦١ دا خەڵکی وڵات یەکیان گرتەوە و وڵاتی رۆمانیایان پێك هێنا. لە ١٣ / ٧ / ١٨٧٨ دا وڵاتە ئەوروپییە گەورەکان دانیان ناوە بەوڵاتی رۆمانیای نوێ. لە جەنگی جیهانیی یەکەمدا لەپاڵ هاوپەیمانان‌دا بەجەنگ هاتووە. یەکێتی سۆڤیەت لەجەنگی جیهانیی دووەمدا داگیری کردووە، تا پەنجاکانی سەدەی پێشوو لە رۆمانیادا ماوەتەوە، تا حیزبی شیوعی رۆمانیا دەسەڵاتی گرتۆتە دەست و شای رۆمانیا شا میخائیلیان ناچار کرد لە ٣٠ / ١٢ / ١٩٤٧ دا رۆمانیا بەجێ بهێڵێ. لەگەڵ ئەوەی کە سەربەخۆیی رۆمانیا راگەیەنرا بەڵام لەراستیدا رۆمانیا لەگەردوونی یەکێتی سۆڤیەتدا دەخولایەوە. لەساڵی ١٩٥٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەساڵی ١٩٦٥ دا نیکۆلای شاوشیسکۆ دەسەڵاتی وڵات وسەرۆکایەتی حیزبی شیوعی گرتە دەست.

لەکۆتایی هەشتاکانی سەدەی بیستەمدا، گەلی رۆمانیا داوای ئازادی وباشکردنی ئاستی ژیانیان لەحکومەت دەکرد، بۆیە شەڕی ناوخۆ لەنێوان هێزە حکومییەکان کە شاوشیسکۆ سەرۆکایەتی دەکرد و بەرەی رزگاری خوازی نیشتیمانی هەڵگیرسا وبەهەزاران رۆڵەکانی ئەو وڵاتە کوژران. لە ٢٢ / ١٢ / ١٩٨٩ دا شاوشیسکۆ وخێزانەکەی هەوڵیان دا رۆمانیا بەجێ

بهێڵن وهەڵبێن، بەڵام لەلایەن رێکخراوە جەماوەرییە شۆڕشگێڕەکانەوە هەردووکیان دەستگیر کـران ولـە ٢٥ / ١٢ / ١٩٨٩ دوای دادگاییـەکی خێـرا نیکـۆلای شاوسـیکۆ وخێزانەکـەی لەسێدارە دران. دەسەڵات کەوتە دەست بەرەی رزگاری خوازی نیشتیمانی بەسەرۆکایەتی ئایۆن ئیلیسکۆ.

لە ساڵی ١٩٩٦ دا ئیمیل کۆنستانتیسکۆ بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا، لەبەرواری ١٠ / ١٢ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنـەکانی سـەرۆکایەتی بـەرێوە چـوو سـەرۆکی چـەپی شـیوعی ئـایۆن ئیلیسکۆ ( ٧٠ ساڵ ) پاش مسۆگەر کردنی کۆی ٧٠ ٪ ی دەنگەکان سەرکەوتنی بەدەست هێنا، هەمان ئەو سەرۆکەی لە ١٩٨٩ – ١٩٩٦ حوکمی وڵاتی کردووە. لەبەروارای ٢٠ / ١٢ / ٢٠٠٠ دا لەبـەردەم پەرلـەمانی رۆمانیـا سـوێندی دەسـتووری خـوارد وبەڵێنیـدا کـە چـی تواناکانییەتی لەپێناوی باش کردنی باری ژیانی گەلەکەی بیخاتە گەڕ وهەژاری وڵاتەکەی لەناوبـەرێت، هـەروەها بەڵێنیـدا کـەکار بکـات بـۆ ئـەوەی لـە ٢٠٠٢ دا پەیوەنـدی بکـات بـە هاوپـەیمانی باکووری ئەتڵەسی، لەبـەرواری ٢٠٠٧ دا پەیوەنـدی بکات بەیـەکێتی ئـەورووپا، دەنگـدەرانیش لەلایـەن خۆیانـەوە داوایـان لێکـرد گەنـدەڵی لەوڵاتـدا نـەهێڵی وهـەوڵی بـاش کردنی ئابووری بدات.

لەشەستەکانی سەدەی پێشوودا ئابووری رۆمانیا پشتی بەکشتوکاڵی بەستبوو، لەدواییدا بەرەو پیشەسازی هەڵگەڕایەوە تاکو بەهای بەرهەمە پیشەسازییەکان لەگەڵ کشتوکاڵیەکاندا یەکسان بوونەوە. دوای نەمانی حوکمی شیوعی، وڵات بەرەو بازاڕی ئازاد بەڕێکەوت وئێستا خـاوەنی دیموکراسـیەتێکی دیـاریکراوە. بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بەهـەژار تـرینی ئـەو وڵاتانـە دادەنرێ کەهەوڵی چوونە ناو یەکێتی ئەورووپا وهاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی دەدات.

رۆمانیا بەپلەی نۆیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەدروست کردنی شەراب، بەپلەی دەیەم لەبەرهـەمی گەنمەشـامی، پلـەی پانزدەیـەم لـە بەرهـەمهێنانی لینیـت وپلـەی شـانزدەیەم لەبەرهەمی پەتاتە وپلەی حەڤدەیەم لەبەخێوکردنی بەراز، بەپلەی هەژدەیەم دێت لەبەرهەمی گەنم وگازی سروشتی.

سروودی نیشتیمان: بەئاگابن ئەی گەلی رۆمانیا.

جەژنی نیشتیمانی: ١٣ / ٧ رۆژی سەربەخۆیی ١٨٧٨.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢٧,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٥٨.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٢٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٠٣.

## زامبیا

**ناوی باو:** زامبیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری زامبیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Zambia

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥٠ ئەندام )

**ڕووبەر:** ٢٩٠,٥٨٦ میل دووجا، ٧٥٢,٦١٤ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٩,٣٥٠,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٢,٤ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفەریقی ڕەش ( زیاتر لە ٧٠ کۆمەڵەی نەژادی پێك دێن گرنگترینیان : بیمبا، مارانی).

**ئاین:** مەسیحی ( پرۆتستانت، ڕۆمان کاسۆلیك، مەسیحی ئەفریقی)، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، موسڵمان.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** لۆساکا.

**شارە سەرەکییەکان:** ندۆلا، کیتۆی، کابۆی، لوانشیا.

**دراو:** کاوشا

**ئاووهەوا:** مام ناوەندە لە زستاندا، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٦ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت، لەهاویندا گەرمە وپلەکانی گەرما لەنێوان ٢٧ بۆ ٣٨ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ١٣٠ سم لە باکووری وڵات و٥٠ سم لەباشوور.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مەنیهوت، گەنمەشامی، هەرزن، فستقی عەبید، قامیشی شەکر، دار.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، دروستکراوەکانی مس، دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** مس، کۆباڵت، قوڕقوشم، زنك، خەڵووزی بەردین.

### ڕوانگەیەکی گشتی:

زامبیا وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ناوەڕاستی ئەفریقیا، کۆنگۆی دیموکراسی وتەنزانیا

دەکەونە باکووری ومەلاوی ومۆزامبیق دەکەونە رۆژهەلاتی، زمبابۆی دەکەوێتە باشووری وئەنگۆلا دەکەوێتە رۆژئاوای. هیچ کەنارێکی نییە. سنوورەکانی لەگەڵ بتسوانا ماوەتەوە سەر دەربەندێکی تەسك وکورت. چونکە کەرتی کابریگی کە دەگەڕێتەوە بۆ نامیبیا لەگەڵ بتسوانا لەیەکیان جیادەکاتەوە. ناوەڕاستی زامبیا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٩ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ١٥ بەرەو باشوور.

زۆربەی خاکی زامبیا بریتییە لەبانێکی تەخت ونێوەندی بەرزاییەکەشی دەکاتە ١٢٠٠ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا وبەناوچەیەکی لەبار بۆ چالاکییە کشتوکاڵیەکان دادەنرێت ودرەخت ودارێکی زۆر دایان پۆشیوە، چیاکانی مۆشانجا دەکەوێتە باکووری رۆژهەلات و بەرزییەکەی دەکاتە ٢١٠٠ مەتر لەسەر ئاستی رووی دەریا، بەدرێژایی دۆڵی روباری زامبیزی ( کەناوی ولاتیشی لێوە هاتووە) بەرەو باشووری ولات زەوییەکان نزم دەبنەوە.

پۆرتۆگالییەکان لەساڵی ١٥١٤ دا ناوچەکەیان دۆزیوەتەوە. لەساڵی ١٨٥١ دا گەڕیدەی سکۆتلەندی دیڤید لیڤینگستۆن لێی پەڕیوەتەوە، تاڤگەکانی ڤیکتۆریاشی لەساڵی ١٨٥٥ دا دۆزیوەتەوە. لەساڵی ١٩١١ کۆمپانیای رۆدسی بەریتانی ناوی رۆدیسیای باکووری لەناوچەکە ناوە. لەساڵی ١٩٢٤ دا بەریتانیا دەستی بەسەردا گرتووە.

لەساڵی ١٩٥٣ دا بەریتانییەکان یەکێتی فیدرالیان بۆ هەریەك لە رۆدیسیا ونیاسالاند دامەزراندووە، کە پێك هاتبوو لە:

١. رۆدیسیای باشوور: رۆدیسیا و زیمبابۆی لەدواییدا.
٢. رۆدیسیای باکوور: زامبیا لەدواییدا.
٣. نیاسلاند: مەلاوی لەدواییدا.

بەلام بەریتانی لە ١٩٦٣ یەکێتییەکەی هەڵوەشاندەوە.

لەبەرواری ٢٤ / ١٠ / ١٩٤٦ دا رۆدیسیای باکوور بووە ولاتی زامبیای سەربەخۆ، لەهەمان ساڵدا پەیوەندی کرد بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە. لەساڵی ١٩٩١ دا زامبیا پێشکەوتنێکی بێ وێنەی بەخۆیەوە بینی کاتێ لەسیستەمی یەك حیزبییەوە فرەیی ودیموکراسی راگەیاند وفریدریك شیلۆبا بەسەرۆکی ولات هەڵبژێردرا، کاوندا دەستی لەدەسەلات کێشایەوە.

لەبەرواری ٢٧ / ١٢ / ٢٠٠١ دا هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکان بەڕێوە چوو، لەبەرواری ٢ / ١ / ٢٠٠١ دا ئەنجامی هەڵبژاردنەکان راگەیەنرا و لیڤی پاتریك مواناواسا ( ٥٣ ساڵ ) پەستی سەرۆکایەتی گرتە دەست، بەمەش بووە سێهەم سەرۆکی ولاتی زامبیا.

زامبیا بەشێوەیەکی گشتی ولاتێکی هەژارە. لەچەند راپۆرتێکی رێکخراوە نێودەوڵەتییەکاندا سەبارەت بە ئاستی ژیانی زامبییەکاندا هاتووە: زیاتر لە دوو لەسەر

سێی دانیشتوانی زامبیا رۆژی یەك جار یان ئەو پەڕی دوو جار نان دەخۆن، رێكخراوەكان ـلوایان لە حكومەتی زامبیا كردووە كەچاوێك بخشێنێتەوە بە جۆری جێبەجێ كردنی پلانە ئابووریەكانی وڵاتەكەی. ئەوەی نەهامەتی وڵاتەكەی هێندەی تر خراپ كرد ئەو شەپۆلە وشكییەی لە ناوچەكانی باشووری ئەفریقیادا و بووە هۆی لەدەستدانی بەشێكی زۆری بەروبومە كشتوكاڵیەكان.

بەرهەمی مس زیاتر لە ٨٠٪ ی داهاتی وڵاتی لەخۆ گرتووە، بەڵام لەسەرەتای هەشتاكانی سەدەی پێشووەوە دابەزینی نرخی مس لەبازاڕە جیهانییەكاندا ئابووری زامبیای بەرەو پاشبرد.

زامبیا بەپلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی كۆبالت وبەپلەی پێنجەم دێت لەبەرهەمی مسدا.

سروودی نیشتیمانی: هەستە وگۆرانی: زامبیای ئازاد بڵێ

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی : ٣,٢ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١١٩ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣٥٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٥٩ .

## زمبابۆی

**ناوی باو:** زمبابۆی

**ناوی فەرمی:** کۆماری زمبابۆی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Zimbabwe

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥٠ ئەندام )

**رووبەر :** ١٥٠,٨٧٢ میل دووجا، ٣٩٠,٧٥٧ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١١,٤٢٣,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢٩,٢ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش کەلەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن، گرنگترینیان: شۆنا، بانتۆ، جگە لە ئەورووپی و ئاسیایی.

**ئاین:** مەسیحی، بێ باوەڕ.

**زمان:** ئینگلیزی، کیشۆنا، سیندیبیل.

**پایتەخت:** هەراری.

**شارە سەرەکییەکان:** بۆلاوایۆ، مۆتاری، گویرۆ.

**دراو:** دۆلاری زیمبابۆی.

**ئاو وهەوا:** زستانی مام ناوەندە وهاوینی گەرم وشێدارە وپلەکانی گەرما لەنێوان ١٢ بۆ ٢٩ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٣٨ سم لە رۆژئاوا و١٣٠ سم لە رۆژهەڵات دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** بەخێوکردنی مانگا، قاوە، بەخێوکردنی باڵندەی نەعامە، گەنمەشامی، شەکر، چا، تووتن، لۆکە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوە کیمیاییەکان، پۆشاك وپێڵاو، ئاسن وپۆڵا، دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** ئەسبستۆس، کرۆمیت، خەڵووز، مس، ئاڵتون، نیکل، ئاسن، تەنەکە.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

زمبابۆی، کەجاران پێی وتراوە رۆدیسیا، وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ئەفریقیا، مۆزامبیق

دەکەوێتــە بــاکووری رۆژهــەلات و رۆژهــەلاتی، ولاتــی باشــووری ئــەفریقیاش دەکەوێتــە باشــووری، بتــسواناش دەکەوێتــە باشــووری رۆژئــاوای، زامبیــاش دەکەوێتــە بــاکووری رۆژئاوای. هیچ کەنارێکی نییە. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ٣٠بەرەو رۆژهەلات لەگەلْ هێلی پانی ١٩ بەرەو باشوور.

زۆربەی خاکی زمبابۆی لەشێوەی بانێکی لوولپێچ وبەرزە، بەرزییەکەی دەگاتە ١٠٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریا، بەرزترین چیاشی چیای ئینانجانی ( ٢٥٩٥ م ).

دۆلی زمبابۆی سنوورەکانی لەگەلْ زامبیا پێك هێناوە، هەروەها دۆلی لیمبۆبۆ لەباشووری ولات سنوورەکانی زمبابۆی وباشووری ئەفریقیای پێك هێناوە.

لەچاخی بەردینەوە خەلْکی لەو ناوچەیەدا ژیاون. لەسەدەی پانزدەیەمدا شاری زمبابۆی دامەزراوە( زمبـابۆی بـە مانـای خانـەی بـەرد یـان قـەلا دێـت بـەزمانی نـاوخۆی دانیشتوانی ولاتەکە) . لەسەدەی شانزدەیەمدا پۆرتۆگالیەکان ئاینی مەسیحییان هێناوەتە ناو ولاتەوە. لەپەنجاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا دۆزینـەوەکانی گەرێدەی سکۆتلەندی دیڤید لیڤینگستۆن بۆ ئەو ناوچەیە ئەورووپیەکانی هاندا بایەخێکی تایبەتی پێبدەن. لە سالْی ١٨٨٨ دا سیسیل رۆدسی بەریتانی چەند پرۆژەیەکی بۆ دەرهێنانی کانزاکانی ئەو ناوچەیە دەستگیر بوو. بۆ سـالْی دوایـی کۆمپانیـای باشـووری ئـەفریقی کـە سیـسیل رۆدس بـەرێوەی دەبـات مـافی کـارکردنی لـەو ولاتـە پێبەخـشرا بـۆ گەشـەپێدانی ناوچـەکە، هێنـدەی نەخایانـد تـەواوی ناوچەکانی یەکیان گرتـەوە ولەژێر نـاوی رۆدیسیای باشـوور. لەسـالْی ١٩٢٣ دا رۆدیـسیای باشوور بووە داگیرکراوەیەکی بەریتانی ومافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشرا.

لەسالْی ١٩٥٣ دا بەریتانییـەکان یـەکێتی فیدرالیان بـۆ هەریـەك لـە رۆدیسیا ونیاسالاند دامەزراندووە، کە پێك هاتبوو لە:

١. رۆدیسیای باشوور: رۆدیسیا و زێمبابۆی لەدواییدا.
٢. رۆدیسیای باکوور: زامبیا لەدواییدا.
٣. نیاسلاند: مەلاوی لەدواییدا.

لەبـەرواری ٦ / ٧ / ١٩٦٤ دا نیاسـالاند سـەربەخۆیی دەسـتگیر بـوو ونـاوی بـووە مـالاوی. لەبـەرواری ٢٤ / ١٠ / ١٩٦٤ دا رۆدیـسیای بـاکووریش سـەربەخۆ بـوو ونـاوی بـووە زامبیـا، بەلام رۆدیسیای باشوور ناونرا رۆدیسیا.

لەهەمان سالْدا ( ١٩٦٤ ) رۆدیسیا داوای سەربەخۆیی کرد، بەلام بەریتانیا ئەو مەرجەی لەسەر دانا کە ئەفریقییەکان رۆلێکی زیاتریان هـەبێت لەکاروباری بەرێوەبردنی ولاتـدا، بۆیـە سـەرۆکی وەزیـران ئیـان سمیـت لەبـەرواری ١١ / ١١ / ١٩٦٥ دا یـەك لایەنانـە رۆدیـسای

بەولاتێکی سەربەخۆ راگەیاند بەحوکمی کەمایەتییە سپی پێستەکان. لەو کاتەوە رەش پێستەکان ناهەموارترین رەفتاری مرۆییان لەگەڵدا کراوە، لەئاکامدا بزوتنەوەی نیشتیمانی لەنێوانیاندا پەیدا بوو بۆ روخانی رژێمی دەسەڵاتدار وبەخشینی رەش پێستەکانی ئەو وڵاتە و تەواوی مافە رەواکانیان. لەبەرواری ١٨ / ٤ / ١٩٨٠ دا دوای خەبات وتێکۆشانێکی زۆر کە بەسەدان هاوڵاتی بوونە قوربانی ناوی رۆدیسیا بەشێوەیەکی فەرمی گۆڕدرا بۆ زمبابۆی و لەهەمان ساڵدا پەیوەندی کرد بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە، رۆبرت موجابی ( ٦٣ ساڵ ) دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست. لەهەڵبژاردنەکانی ٢٤ / ٦ / ٢٠٠٠ دا پارتی دەسەڵاتدار: پارتی نیشتیمانی ئەفریقی زیمبابۆی / بەرەی میللی / کە موجابی خۆی سەرکردایەتی دەکات سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەجیاوازییەکی زۆر کەم، ٦٢ کورسی بەرامبەر بە ٥٧ کورسی بۆ پارتی ئۆپۆزسیۆنی بزوتنەوەی گۆڕینی دیموکراسی کە لەکۆتایی ١٩٩٩ دا دامەزراوە.

لەبەرواری ٩ / ٣ / ٢٠٠٢ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە زمبابۆی بەڕێوە چوو، سەرلەنوێ، بۆجاری سێهەم، رۆبرت موجابی سەرکەوتنی بەدەست هێنایەوە بەکۆی ٥٦,٢ ٪ ی دەنگەکان بەرامبەر بە ٤١,٩ ٪ ی مۆرجان تشانجیرای سەرۆکی پارتی گۆڕینی دیموکراسی ( ئۆپۆزسیۆن ). شایەنی باسە ئۆپۆزسیۆن بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان قایل نەبوو وباسی لەوە دەکرد کەساختە گەراییەکی چڕ لە ئەنجامەکاندا کراوە لەلایەن لایەنگرانی موجابییەوە، کەچەند چاودێرێکی ناوخۆ وئەورووپی دەرکیان پێکردووە. ئەگەرچی وڵاتە ئەفریقییەکان هیچ بەرهەڵستییەکیان لە هەڵبژاردنەوەی موجابی دەرنەبڕی، بەڵام وڵاتە رۆژئاواکان، بەتایبەتی لەندەن و واشنتۆن بەتوندی ئەنجامەکانیان رەتکردەوە وهەڕەشەی ئابلۆقەی توندیشیان لێکرد.

لەبەرواری ١٨ / ٣ /٢٠٠٢ دا موجابی سوێندی دەستووری خوارد وداوای لەگەڵی وڵاتەکەی کرد کە پارێزگاری لەیەکێتی نیشتیمانی بکەن وبەڵێنیدا پەلە بکات لە چاکردنەوەی زەوییە کشتوکاڵییەکان کەسەردەمێك بوو جێگای باسێکی زۆری ئەو وڵاتە بوو.

زمبابۆی بەپلەی سیانزدەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی توتن وبەپلەی چواردەیەم دێت لەبەرهەمی نیکل، بەپلەی شانزدەیەم دێت لەبەرهەمی ئاڵتوون و هەروەها بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی ئەفریقیادا لە بەرهەمی گۆشتی نەعامە.

زمبابۆی پلەیەکی ئابووری بەرزی هەیە لەچاو زۆربەی وڵاتانی ئەفریقیا، راستەوخۆ دوای باشووری ئەفریقیا دێت. کارگەیەکی ئاسنی تیایە کەسوودی لەئاسنی خاو وەرگرتووە لەبەرهەمەکانیدا، ئەمە جگە لەوەی کە یەکێك لە گەورەترین وێستگەکانی کارەبا لەجیهاندا

لەخۆ گرتووە لەسەر تەنگەی کاریبا لە روباری زامبیری. بەلام ئەو وشکە سالیەی لە١٩٩٢ دا رووی کردە ئەو ناوچەیە ولاتی بەرەو پاش بردوو زیانێکی زۆری پێگەیاند. بەلام سەرلەنوێ هەولی چاکردنەوە وباشتکردنی باری ئابووری ولات درایەوە، شایەنی باسە زەمبابۆی باشووری ئەفریقا بە ولاتی لێوە دەرچوونی بەرەو دەریاکان دەزانێ.

جەژنی نیشتیمانی: ١٨ / ٤ ی هەموو سالێك.

سروودی نیشتیمان: خوایە ئەفریقیا بپارێزی

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٥,٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٩٨ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٤٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٤٧ .

## کەناری عاج

**ناوی باو:** کەناری عاج

**ناوی فەرمی:** کۆماری کەناری عاج

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Cote d.Ivoire ( Ivory Coast )

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٧٥ ئەندام )

**ڕووبەر :** ١٢٥,٠٠٠ میل دووجا، ٣٢٠,٧٦٣ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٤,٩٨٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٤٦,٧ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك هاتوون گرنگترینیان: ئاکان، فۆلتیك.

**ئاین:** موسڵمان ٦٥ ٪ ، مەسیحی ( کاسۆلیك )، بێباوەڕ

**زمان:** فەرەنسی.

**پایتەخت:** یامۆسۆکرا

**شارە سەرەکییەکان:** ئبیدجان، بواکی، دالوا، کۆرهۆجۆ.

**دراو:** فرانك.

**ئاووهەوا:** ناوچە کەنارییەکان گەرمە وزۆر شێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ٢٤ بۆ ٢٨ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٠٠سم – ٣٢٥ سم دەبارێت. ناوچەی دارستانەکان: نێوەندی پلەکانی گەرما ١٥ بۆ ٣٩ پلەی سەدی دەبێت وڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٥٠ سم – ٢٥٠ سم دەبارێت. بەڵام ناوچەی گژوگیاکانی ساڤانا لەباکووری وڵات گەرمە وپلەکانی گەرما دەگاتە ٤٩ پلەی سەدی وڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٥٠ سم – ٢٠٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** قاوە، کاکاو، زەیت بە دارخورما، مۆز، ئەنەناس، لاستیك، منیهۆت، گەنمەشامی، برنج، پەتاتەی شیرین.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** پاڵاوتنی نەوت، دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** ئەڵماس، مەنگەنیز.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

کەناری عاج، یان کۆت دیڤوار، وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە سەر کەنداوی غینیا لەرۆژئاوای ئەفریقیا، بۆرکینا فاسۆ ومالی دەکەونە باکووری، غانا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ، کەنداوی غینیا ( زەریای ئەتڵەسی ) دەکەوێتە باشووری، غینیا ولیبیریا دەکەونە رۆژئاوای.

ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٥ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٨ بەرەو باکوور.

زەوییەکانی کەناری عاج وورده وورده بەرز دەبنەوە تا لەباکووری رۆژئاوای وڵات دەگاتە ٣٦٥ م. بەشی رۆژئاوای شریتی کەنارەکەی چەند شکانەوەیەکی بەردەڵانی بچوکی لێ روودەدات. بەڵام بەشی رۆژهەڵاتی تەختە وبەلم داپۆشراوە. دارستانەکانیش دەکەونە پشت شریتی کەناری عاجەوە وتا بەرەو باکوور برۆیت دارستانەکان بەرەو دار ودرەختی دووراو دوور بڵاو دەبنەوە تا بەناوچەی ( سافانا کۆتایی دێت ).

بەدرێژایی مێژوو چەند کۆمەڵەیەك نیشتەجێی ناوچەکە بوون وچەند وڵاتۆچکەیەکیان پێك هێناوە. ئاینی ئیسلام لەرێی بازرگانەکانەوە لەکۆتاییەکانی سەدەی سیانزدەیەمی زایینەوە گەیشتۆتە ناوچەکە. لەساڵی ١٤٨٣ دا دەریاوانە فەرەنسییەکان لەگەڵ بازرگانە ئەفریقییەکاندا بازرگانی عاجیان ( ئێسکی فیل ) ( یان راست تر وایە بڵێین کەڵبەی فیل ) لەو ناوچەیەدا دەست پێکردووە وناوی وڵاتیش لەوەوە هاتووە. لەساڵی ١٦٣٧ دا هەڵمەتی تەبشریە فەرەنسیەکان گەیشتۆتە ناوچەکە.

لەساڵی ١٨٩٥ داناوچەکە بۆتە داگیرکراوەیەکی فەرەنسی وبۆتە بەشێکی داگیرکراوەی رۆژئاوای ئەفریقی فەرەنسی. لەساڵی ١٩٣٢ دا داگیرکراوەی ڤۆڵتای بەرزی فەرەنسی بۆتە بەشێکی کەناری عاج، لەساڵی ١٩٤٧ دا بوون بە دوو داگیرکراوەی جیاواز. لە ١٩٤٦ دا فەرەنسیەکان ناوچەی کەناری عاجیان کردە ناوچەیەکی ناوخۆی یەکێتی فەرەنسی. لەساڵی ١٩٥٨ دا کەناری عاج بۆتە کۆمارێکی ئۆتۆنۆمی. لەبەرواری ٧ / ٨ / ١٩٦٠ دا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بووە لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

یەکەم سەرۆك دوای سەربەخۆیی وڵات: فیلیکس هۆڤیت بویگینی بووە کە لەدەسەڵاتدا ماوەتەوە تا لەتەمەنی ٨٢ ساڵیدا لە ٧ / ١٢ / ١٩٩٣ کۆچی دوایی کردووە، بەمەش بەو سەرۆکە ئەفریقییە دادەنرێت کە بۆ زیاترین ماوە حوکمی کردووە، دوای ئەو هێنری کونان بیدیێ پۆستی سەرۆکایەتی گرتۆتە دەست.

لە ٢٤ / ١٢ / ١٩٩٩ دا جەنەراڵ رۆبرت غی کودەتاییەکی سەربازی لە کەناری عاجدا بەئەنجام گەیاند وخۆی کردە سەرۆکی وڵات، بەرەی رزگاری خوازی نیشتیمانی بەسەرۆکایەتی خۆی پێك هێناوە.

لەبەرواری ٢٢ / ١٠ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنە سەرۆکایەتیەکان بەڕێوە چووە ولۆران جباجبۆ رێژەی ٥٩،٣٦ ٪ ی دەنگەکانی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی وڵات، لەبەرواری ٢٦ / ١٠ / ٢٠٠٠ دا سوێندی دەستووری خوارد، لەکاتێکدا یاوەرانی سەرۆکی پێشوو رۆبرت غی سەرقاڵی خۆپیشاندان بوون وناڕەزاییان لەئەنجامی هەڵبژاردنەکان دەردەبڕی، بەڵام هێزەکانی ئاسایش توانیان بارودۆخەکە کۆنترۆڵ بکەن.

لە بەرواری ٨ / ١ / ٢٠٠١ هەوڵی ئەنجام دانی کودەتایەکی سەربازی شکستی هێنا. لە ٢٩

/ ٦ / ٢٠٠١ دا کەناری عاج بووە پەنجاو حەوتەمین ولاتی ریکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی.

لە هاوینی ٢٠٠٢ دا سەرۆکی ولات نهێنی راستی مووچەکەی ئاشکرا کرد کە دەگاتە ١٥ هەزار دۆلار، شایەنی باسە هیچ کام لەسەرۆکەکانی کەناری عاج ئەم باسەیان نەدرکاندووە وباسیان لەمووچەکانیان نەکردووە. بەرای زۆربەی دانیشتوان ئەم مووچەیە زۆرە لەچاو بارودۆخی ناهەمواری هاولاتیان.

ئامارە فەرمییەکانی کەناری عاج واروونی دەکەنەوە کە نزیکەی یەك ملیۆن کەسی ئەو ولاتە دووچاری نەخۆشی ئایدز بوون، واتا ١٠ ٪ ی دانیشتوان ودەزگا تەندروستیەکان باس لەلاوازی تواناکانی چارەسەرکردنی نەخۆشەکانی ئەو دەردە دەکەن.

بازرگانەکانی کەڵبەی فیل کەنارەکەیان بەم ناوەوە ناو ناوە، بەلام دەسەلاتە فەرمییەکانی ئەو ولاتە لە ١٩٨٦ دا رایانگەیاند کەناوی فەرمی ولات بۆتە: کۆت دیڤار، کەهەمان مانای کەناری عاجی هەیە.

لە ساڵی ١٩٨٣ دا پایتەختی ولات: ئەبیدجان کەدەکەوێتە سەر دەریا، گواسترایەوە بۆ پایتەختی نوێ: یامۆسۆکرا کە دەکەوێتە ناوەراستی ولاتەوە. بەلام بەهۆی لاوازی داراییەکانی ولاتەوە زۆربەی دەزگا حکومییەکان لەپایتەختی کۆندا ماوەتەوە، کە ئێستاش بە پایتەختی ئابووری ولات دادەنرێ.

نزیکەی ٧٠ ٪ ی دانیشتوانی ولات سەرقاڵی چالاکییە کشتوکاڵیەکانن، بۆیە باری ئابووری کەناری عاج پشتی بە تەواوی بە بەرهەمەکانی قاوە وکاکاو بەستووە.

کەناری عاج بەپلەی یەکەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە بەرهەمی کاکاو، رێژەی لەو بەرهەمە دەگاتە ٤٠ ٪ ی تێکرِی بەرهەمی جیهانی، بەلام بەهۆی دابەزینی نرخی کاکاو لەجیهاندا ئابووری کەناری عاج دووچاری لاوازی وسستییەکی بێوێنە بووەوە، بۆیە حکومەت لە ٢٠٠٠ دا هاستا بە تێکدانی بەشێکی ئەو بەرهەمە بۆ راگرتنی نرخی جیهانی کاکاو، ئەمە جگە لەوەی هەر یەك لە نیجیریا وکامیرۆنیش هەمان ئەو کارەیان ئەنجام دا.

جەژنی نیشتیمانی: ٧ / ٨ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ولات.

سروودی نیشتیمانی: سلاو لەخاکی هیوا.

تێکرِای داهاتی نەتەوەیی : ٧,١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا : ٨٨ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٦٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٢٧ .

## ساموا

**ناوی باو:** ساموا.

**ناوی فەرمی:** وڵاتی سەربەخۆی ساموا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Independent State of Samoa

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ( ٤٩ ئەندام )

**رووبەر :** ١,٠٩٣ میل دووجا، ٢,٨٣١ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٦٩,١٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٦٠ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** گەلی ساموا ( بەرەچەڵەك بۆلیزین ) ، ئاسیایی، ئەوروپی.

**ئاین:** مەسیحی.

**زمان:** سامویی، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** ئابیا.

**شارە سەرەکییەکان:** سالیموا، ماتۆتۆ، تاگا.

**دراو:** تالا.

**ئاو وهەوا:** کەمەرەیی شێدار، با بازرگانییەکانی باشووری رۆژهەڵات مام ناوەندی کردووە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ٢٤ بۆ ٢٩ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٨٠ سم لە باکوور و ٣٨٠ سم لە باشووری رۆژهەڵات.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، کاکاو، گوێزی هیندی، راوەماسی، بەخێوکردنی بەراز، پەلەوەر، قەلقاس ( جۆرێکە لەپاقلەمەنیەکان).

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ساموا، تا ساڵی ١٩٩٧ پێی وتراوە ساموای رۆژئاوا، یان: ( مالو ساولۆتۆ تۆتۆئاتسی ئوو ساموا) وەك بەزمانی ساموایيەکان خۆیان، وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای زەریای هێمن لەناوەڕاستی ئەو ماوەیەی نێوان هۆنۆلۆلۆ و سیدنی. نزیکەی ٢٧٤٠ کم لەباکووری رۆژهەڵاتی نیوزیلانداوە دوورە. لە نۆ دورگە پێك دێت، تەنها چواریان نیشتەجێ کراون، گەورەترینیان دورگەی سافایە، پایتەختی وڵاتیش دەکەوێتە دورگەی ئۆبۆلۆ، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٧٢ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٣/٣٠ بەرەو باشوور.

دورگەکان بەرەچەڵەك گڕکانین، تا ئێستاش یەکێك لەگڕکانەکانی چالاکن ودەکەوێتە دورگەی سافای، دوایین هەڵچوونی لەنێوان ساڵەکانی ١٩٠٥ – ١٩٩١ بوو، ئەمەش بووە

هۆی داپۆشینی بەشێکی زۆری زەوییەکان ئەو دورگەیە بە پاشماوە گڕکانییەکان.

نزیکەی دوو هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە خەڵکی لەدورگە دراوسێکانەوە بەرەو ئەو دورگەیە هاتوون ولێی نیشتەجێ بوون. لەساڵی ۱۷۲۲ دەریاوانی هۆڵەندی جاکوب رۆجیفین دۆزیویەتییەوە. لەساڵی ۱۸۹۹ دا هەریەك لە ئەڵمانیا و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دورگەکانیان لەنێوان خۆیاندا دابەشکردووە وبەریتانیایان لێ دوورخراوەتەوە بەرامبەر بە پاراستنی مافەکانی لە دورگەکانی تۆنگا ودورگەکانی سولەیمان. لەساڵی ۱۹۰۰ دا، ئەڵمانیا دەسەڵاتی خۆی بەسەر دورگەکانی ساموای رۆژئاوا سەپاندووە، ویلایەتە یەکگرتوەکانیش دەسەڵاتی بەسەر دورگەکانی ساموای رۆژهەڵاتدا سەپاندووە و ناونرا ساموای ئەمریکیی وتا ئێستاش هەر سەر بە ویلایەتە یەکگرتوەکانە.

لەساڵی ۱۹۱٤ دا هێزێکی سەربازی نیوزیلاندی دورگەکانی ساموای ئەڵمانیان داگیر کردووە، دوای جەنگی جیهانی یەکەم کۆمەڵەی نەتەوەکان ( عوسبەت الامم ) حوکم ودەسەڵاتی ساموای رۆژئاوای ( ساموای ئەڵمانی ) بە نیوزیلاندا بەخشیوە، بەڵام هێندەی نەخایاند دانیشتوانی ناوچەکە داوای سەربەخۆییان لە نیوزیلاندا دەکرد، بۆیە دەسەڵاتدارانی نیوزیلانداش هەندێ لەمافەکانیان پێ بەخشین. دوای جەنگی جیهانیی دووەم نەتەوە یەکگرتوەکان ساموای رۆژئاوای کردۆتە هەرێمێك وداوای لە نیوزیلاندا کرد خۆی بۆ سەربەخۆیی کردنی ساموا ئامادە بکات. لە ۱ / ۱ / ۱۹٦۲ دا ساموا بۆتە وڵاتێکی سەربەخۆ ولە ۱۹۷۰ دا بۆتە ئەندامێکی کۆمۆنوێلتی نەتەوە بەریتانییەکان ولەساڵی ۱۹۷٦ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە ساڵی ۱۹۹۷ دا ئەنجومەنی یاسادانان بڕیاریدا وشەی رۆژئاوا لەناوی وڵات لابرێت ولە ساموای رۆژئاواوە بووە ساموا.

شای ئێستا: مالیتوا تانیۆ مانیلی دووەمە، وابڕیارە تا لەژیاندا مابێت حوکمی وڵات بکات وکاتێ کۆچی دوایی کرد ئەنجومەنی یاسادانان هەڵدەستێت بە هەڵبژاردنی سەرۆکێك بۆ وڵاتەکەیان.

ئابووری ساموا پشتی بەکشتوکاڵ بەستووە چونکە نزیکە ۷۰ ٪ دانیشتوان کار لەچالاکییە کشتوکاڵییەکان دەکەن. لەچاو پێوانە نێودەوڵەتییەکان رێژەی خەرجی ساڵانەی تاك زۆر بەکەم دادەنرێت، بۆیە پشتیان بەیارمەتییەکانی یابان و ئوسترالیا و هەندێ لە وڵاتە ئەوروپییەکان بەستووە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ۱٦۳ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ۱۸٤ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۹۷۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱۱٤.

## سانت ڤینسینت وگرینادینیز

ناوی باو: سانت ڤینسینت وگرینادینیز.

ناوی فەرمی: سانت ڤینسینت وگرینادینیز.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Saint Vincent and the Grenadines

سیستەمی حوکمڕانی: پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیایە وادادوەرێکی گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥ ئەندام )

رووبەر : ١٥٠,٣ میل دووجا، ٣٨٣,٣ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ١١٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

چڕی دانیشتوان: ٢٨٧,٧ کەس/کم$^{٢}$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی رەش، تێکەڵ، هیندی ئاسیا، ئەوروپی، هیندی ئەمریکا.

ئاین: مەسیحی ( پرۆتستانت، ئەنگلیکان، رۆمان کاسۆلیك)، بێ باوەڕ.

زمان: ئینگلیزی.

پایتەخت: کینگستاون.

شارە سەرەکییەکان:ئارفۆس فیلێ، بەندەری ئەلیزابێت.

دراو: دۆلاری رۆژهەڵاتی کاریبی.

ئاووهەوا: خولگەیی گەرم، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٨ بۆ ٣٢ پلەی سەدی، رێژەی ساڵانەی باران لەنێوان ١٥– سم بۆ ٣٨١سم دەبێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز، گوێزی هیندی، پەتاتەی شیرین، کاکاو، قاوە، ئارۆرۆت ( روەکێکە لە رەگەکانی ماددەی نیشاستە بەرهەم دێنێت )، قامیشی شەکر.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

سامانی کانزایی: نییەتی.

تێڕوانینێکی گشتی :

سانت ڤینسینت وگرینادینیز وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە نێو دەریای کاریبی سەر بە دورگەکانی هیندی رۆژئاوا، ڤەنزەویلا دەکەوێتە باکووری، لەدورگەی ڤینسینت ونزیکەی ١٠٠ دورگەی بچوك پێك دێت کە سەر بە زنجیرە دورگەکانی گرینادینین. ناوەڕاستی

دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦١/١٠ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٢ بەرەو باکوور.

دورگەکانی سانت ڤینسینت وگرینادینیز بەرەچەڵەك گڕکانین و گژوگیا زۆربەی ناوچەکانی داپۆشیوە. بەرزترین چیا دەکەوێتە رووی باکووری دورگەی ڤینسینت کە بەرزییەکەی ١٢٤٥ م دەبێت و پێی دەوترێت گڕکانی سۆفریار کە لەساڵی ١٩٧٩ دا ورووژاوە وزیانێکی ماددی زۆری پێ گەیاندووە.

یەکەم دانیشتوانی دورگەکان هیندە ئۆراکییەکان بوون، هیندە کاریبییەکانی ئەمریکای باشوور لەساڵی ١٣٠٠ دا هێرشیان کردۆتە سەریان. کریستۆف کۆلۆمبۆس لە ٢٢ / ١ / ١٤٩٨ دا دۆزیویەتییەوە. هیندە کاریبییەکان وبەریتانی وفەرەنسییەکان رکەبەرایەتی یەکیان کردووە، دوای ناکۆکییەکی زۆر سانت ڤینسینت بەناوچەیەکی بێلایەن راگەیەنراوە. بەڵام لەساڵی ١٧٦٣ فەرەنسییەکان دەستیان لێ هەڵگرتووە بۆ ئینگلیزەکان، بەڵام لەساڵی ١٧٧٩ سەرلەنوێ فەرەنسییەکان داگیریان کردۆتەوە وبۆماوەی چوار ساڵ دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، بۆیە لە ١٧٨٣ دا ئینگلیزەکان داگیریان کردۆتەوە. لەساڵی ١٩٦٩ دا سیستەمی ئۆتۆنۆمی لێ راگەیەنراوە لەچوارچێوەی یەکێتی دورگەکانی ئەنتیل. لە بەرواری ٢٧ / ١٠ / ١٩٧٩ دا لەچوارچێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە ، لە ١٦ / ٩ / ١٩٨٠ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

یەکەم دادوەری گشتی دوای سەربەخۆیی: ف. میلتۆن کاتۆ بووە و دوای ئەو لەساڵی ١٩٨٤ دا: جیمس ف. میتشێل بۆتە دادوەری گشتی.

ئابووری .سانت ڤینسینت وگرینادینیز پشتی بە چالاکییە کشتوکاڵییەکان بەستووە، هەروەها گەشت وگوزاریش بەشداری لەداهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتەدا کردووە.

دورگەی سانت ڤینسینت بە گەورەترین بەرهەمهێنەری ئارۆرۆت لەجیهاندا دادەنرێت.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٢٣٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٧٦ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,١٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٩.

## سانت كریستۆفەر ونیڤیس

ناوی باو: سانت كریستۆفەر ونیڤیس

ناوی فەرمی: یەكێتی سانت كریستۆفەر ونیڤیس

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

The Federation of Saint Christopher and Nevis.

سیستەمی حوكمڕانی: پادشایی دەستووری، سەرۆكی وڵات شاژنی بەریتانیایەو دادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەكات، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی نوێنەران ( ١١ ئەندام )

رووبەر : ١٠٤ میل دووجا، ٢٦٩,٤ كم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٤١,٨٠٠ كەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ١٥٥,٢ كەس/كم٢

كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی رەش، تێكەڵێك لە ئەوروپی وهیندی ئاسیا وپاكستانی.

ئاین: مەسیحی ( پرۆتستانت، ئەنگلیكان، میتۆدیست، رۆمان كاسۆلیك ).

زمان: ئینگلیزی.

پایتەخت: باستیری.

شارە سەرەكییەكان: شارلس تاون.

دراو: دۆلاری رۆژهەڵاتی كاریبی.

ئاووهەوا: نیمچە كەمەرەیی، شنە دەریای بەردەوام مام ناوەندی كردووە، گۆرانكارییەكان بەسەر پلەكانی گەرما لەوەرزەكاندا زۆر دیاریكراوە، نێوەندی پلەكانی گەرما ٢٥ پلەی سەدی. بارانەكان لەوەرزی هاویندا دەبارێت.

بەرهەمە كشتوكاڵیەكان: قامیشی شەكر، سەوزە ومیوە، راوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەكان: دروستكراوە ئەلكترۆنییەكان، چنین.

سامانی كانزایی: نییەتی.

تێڕوانینێكی گشتی :

سانت كریستۆفەر ونیڤیس، بەكورتكراوەیی بە سانت كیتس ونیڤیس ناسراوە، وڵاتی كۆمەڵە دورگەیەكە دەكەوێتە دەریای كاریبی سەر بە دورگەكانی هیندی رۆژئاوا. نزیكەی ٣١٠ كم لە رۆژهەڵاتی بۆرتۆ ریكۆوە دوورە. لە دوو دورگەی سەرەكی پێكدێت:

١. دورگەی سانت كریستۆفەر، كە گەورەترە ورووبەرەكەی ١٧٦,٢ كم٢ دەبێت.

٢. دورگەی نیڤیس، و رووبەرەكەی ٩٣,٢ كم٢ دەبێت.

ماوەی نێوان هەردوو دورگەكە ٣,٢ كم دەبێت وناوەڕاستیان دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٦٣/٤ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٧٣/١٠ بەرەو باكوور.

هەردوو دورگەكە بریتین لە لوتكەی دوو چیای گڕكانی. ئەو چیایەی كە سانت كیتسی

پێك هێناوە ناوی چیای: ماونت میسیرییە، کە بەرزییەکەی ١٥٦ م لەسەر ئاستی رووی دەریا دەبێت، بەلاّم لوتکەی نیڤیس ٩٨٥ م بەرزە لەسەر ئاستی رووی دەریا. بەدرێژایی کەناری هەردوو دورگەی ناوبراو شریتێك لەدەشتە بەپیتەکان درێژ دەبێتەوە و هەندێکیان بەلمی رەشی پاشماوەی گڕکانەکان داپۆشراوە.

هیندە ئۆراکی وهیندە کاریبییەکان لەمێژەوە لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوون. کریستۆف کۆلۆمبۆس لەگەشتی دووەمی بەرەو جیهانی نوێ لە ١٤٩٣ دا دۆزیویەتییەو دورگەی یەکەمی ناو ناوە سانت کریستۆفەر لەسەر ناوی قدیسەکەی، دوایی ناوەکە کورتکراوەتەوە بۆ سانت کیتس لەلایەن ئینگلیز وفەرەنسییەکانەوە کەلە ١٦٢٣ نیشتەجێی دورگەکە بوون ویەکەم داگیرکراوەی ئینگلیزیان لەدورگەکانی هیندی رۆژئاوا دامەزراند.دورگەی دووەمیشی ناو ناوە نیڤیس کەبەزمانی ئیسپانی بەمانای بەفر دێت، وەك یادێکی ئەو بەفرەی کەچیاکانی ئیسپانیا دادەپۆشێ. لە سالّی ١٦٢٨ دا ئینگلیزەکان گەیشتونەتە دورگەی دووەمیش.

ئەوروپیەکان کۆیلە ئەفریقییەکانیان هێناوەتە دورگەی سانت کیتس تاکو کشتوکالّی قامیشی شەکریان پێبکەن. لەسالّی ١٧١٣ دا ئینگلتەرا دەسەلاّتی دورگەی سانت کیتس و دورگەی نیڤیسی گرتۆتە دەست، جگە لە دورگەی ئەنگویلای نزیك ئەو دوو دورگەیە. لەسالّی ١٨٨٢ دا بەریتانیا هەرسێ دورگەکەی کردۆتە یەك داگیرکراوە. لەسالّی ١٩٦٧ دا مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشیوە. لەسالّی ١٩٨٠ دا دورگەی ئەنگویلا لەداگیرکراوەکە جیابۆتەوە، بەشێوەیەکی فەرمی بۆتە کەرتێکی بەریتانی، بەلاّم دورگەی سانت کریستۆفەر سەربەخۆییەکی ناوخۆیی پێبەخشراوە، تا لە ١٩ / ٩ / ١٩٨٠ لەچوارچێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە، لەهەمان سالّدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. یەکەم سەرۆکی حکومەت دوای سەربەخۆیی دکتۆر کینیدی سیمۆندس بووە ودوای ئەویش دینزل دۆگلاس لە ١٩٩٥ دا بۆتە سەرۆکی حکومەت.

کەرتی گەشتوگوزار لە دورگەکەدا زۆر گەشەکردووە، چونکە کەنارە بەلم داپۆشراو ودیمەنە جوانەکانی وکەش وهەوای لەباری ئەو دورگەیە گەشتیارێکی زۆر راکێش دەکات لەتەواوی ولاّتانی جیهانەوە، بەتایبەتی لە ویلایەتە یەکگرتوەکان وکەنەداوە، چالاکییە گەشتوگزارییەکان نزیکەی نیوەی داهاتی نەتەوەیی ئەو ولاّتەیان دابین کردووە. کەچی ژمارەیەکی زۆری لاوانی ئەو ولاّتە نیشتمانەکەیان بەرەو ولاّتانی دیکە بەجێ دەهێلّن بەهۆی بەرزی رێژەی بێکارییەوە.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ١٩٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاّتانی جیهاندا : ١٨٠

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٤,٧٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاّتانی جیهاندا: ٤٩.

پێك هێناوە ناوی چیای: ماونت میسیرییە، كە بەرزییەكەی ١٥٦ م لەسەر ئاستی رووی دەریا دەبێت، بەڵام لوتكەی نیڤیس ٩٨٥ م بەرزە لەسەر ئاستی رووی دەریا. بەدرێژایی كەناری هەردوو دورگەی ناوبراو شریتێك لەدەشتە بەپیتەكان درێژ دەبێتەوە و هەندێكیان بەلمی رەشی پاشماوەی گڕكانەكان داپۆشراوە.

هیندە ئۆراكی وهیندە كاریبییەكان لەمێژەوە لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوون. كریستۆف كۆلۆمبۆس لەگەشتی دووەمی بەرەو جیهانی نوێ لە ١٤٩٣ دا دۆزیویەتییەو دورگەی یەكەمی ناو ناوە سانت كریستۆفەر لەسەر ناوی قدیسەكەی، دوایی ناوەكە كورتكراوەتەوە بۆ سانت كیتس لەلایەن ئینگلیز وفەرەنسییەكانەوە كەلە ١٦٢٣ نیشتەجێی دورگەكە بوون ویەكەم داگیركراوەی ئینگلیزیان لەدورگەكانی هیندی رۆژئاوا دامەزراند.دورگەی دووەمیشی ناو ناوە نیڤیس كەبەزمانی ئیسپانی بەمانای بەفر دێت، وەك یادێكی ئەو بەفرەی كەچیاكانی ئیسپانیا دادەپۆشێ. لە ساڵی ١٦٢٨ دا ئینگلیزەكان گەیشتونەتە دورگەی دووەمیش.

ئەوروپییەكان كۆیلە ئەفریقییەكانیان هێناوەتە دورگەی سانت كیتس تاكو كشتوكاڵی قامیشی شەكریان پێبكەن. لەساڵی ١٧١٣ دا ئینگلتەرا دەسەڵاتی دورگەی سانت كیتس و دورگەی نیڤیسی گرتۆتە دەست، جگە لە دورگەی ئەنگویلای نزیك ئەو دوو دورگەیە. لەساڵی ١٨٨٢ دا بەریتانیا هەرسێ دورگەكەی كردۆتە یەك داگیركراوە. لەساڵی ١٩٦٧ دا مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشیوە. لەساڵی ١٩٨٠ دا دورگەی ئەنگویلا لەداگیركراوەكە جیابۆتەوە، بەشێوەیەكی فەرمی بۆتە كەرتێكی بەریتانی، بەڵام دورگەی سانت كریستۆفەر سەربەخۆییەكی ناوخۆیی پێبەخشراوە، تا لە ١٩ / ٩ / ١٩٨٠ لەچوارچێوەی كۆمۆنوێلتی بەریتانی بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان. یەكەم سەرۆكی حكومەت دوای سەربەخۆیی دكتۆر كینیدی سیمۆندس بووە ودوای ئەویش دینزل دۆگلاس لە ١٩٩٥ دا بۆتە سەرۆكی حكومەت.

كەرتی گەشتوگوزار لە دورگەكەدا زۆر گەشەكردووە، چونكە كەنارە بەلم داپۆشراو ودیمەنە جوانەكانی وكەش وهەوای لەباری ئەو دورگەیە گەشتیارێكی زۆر راكێش دەكات لەتەواوی وڵاتانی جیهانەوە، بەتایبەتی لە ویلایەتە یەكگرتوەكان وكەنەداوە، چالاكییە گەشتوگزارییەكان نزیكەی نیوەی داهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتەیان دابین كردووە. كەچی ژمارەیەكی زۆری لاوانی ئەو وڵاتە نیشتمانەكەیان بەرەو وڵاتانی دیكە بەجێ دەهێڵن بەهۆی بەرزی رێژەی بێكارییەوە.

تێكرای داهاتی نەتەوەیی : ١٩٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٨٠

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤,٧٦٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٤٩.

## سانت لوسیا

**ناوی باو:** سانت لوسیا

**ناوی فەرمی:** سانت لوسیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Sant Lucia

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیایە ودادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمانە ولەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ١١ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٨ ئەندام )

**رووبەر :** ٢٣٨ میل دووجا، ٦١٢ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٤٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢٣٣,٩ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش، تێکەڵ، هیندی ئاسیا، ئەورووپی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ).

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** کاستریز.

**شارە سەرەکییەکان:** مرکیز، نیزی.

**دراو:** دۆلاری رۆژهەڵاتی کاریبی.

**ئاو وهەوا:** کەمەریی مام ناوەند، پلەکانی گەرما لەنێوان ٢١ بۆ ٣٥ پلەی سەدی دەبێت. رێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ٢٥٤ سم ولەوەرزی هاویندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، گوێزی هیندی، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** پۆشاك، ئامێری کارەبایی، بەرهەمەکانی پەڕاوگە، چنین.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

سانت لوسیا وڵاتە دورگەیەکە دەکەوێتە دەریای کاریبی، سەر بە دورگەکانی هیندی رۆژئاوا،لەیەك دورگە پێك دێت، نزیکەی ٣٨٦ کم لە ڤەنزەویلاوە دوورە. ناوەڕاستی کەوتۆتە سەر یەکێری هێڵی درێژی ٦١ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٤ بەرەو باکوور.

دورگەی سانت لوسیا دورگەیەکی شاخاوییە،بەداستانێکی زۆر داپۆشراون، بەرزترین خاڵی بریتییە لە چیای جیمی کە بەرزییەکەی دەگاتە ٩٥٩ م لەسەر ئاستی رووی دەریا. دورگەکە بەدوو لوتکەی دوانەکی بەناوبانگە: گرۆس بیتۆن و بیتیت بیتۆن کە دەکەونە باشووری رۆژئاوای.

هیندە ئۆراکییەکان یەکەم دانیشتوانی دورگەکە بوون. هیندە کاریبییەکانی ئەمریکای باشوور لە ساڵی ١٣٠٠ دا هێرشیان کردونەتە سەر ودورگەکەیان داگیر کردووە. کریستۆف کۆلۆمبۆس لەساڵی ١٥٠٢ دا دۆزیویەتییەوە. لەسەرەتای سەدەی حەڤدەیەمدا هیندە کاریبییەکان لەگەڵ فەرەنسی وبەریتانییەکاندا بەشەڕ هاتوون بۆ ڕێگرتن لە نیشتەجێ بوونیان لەو دورگەیە. لەناوەڕاستی سەدەی هەژدەیەمدا فەرەنسا توانیویەتی داگیرکراوەیەکی فەرەنسی لەناوچەکەدا دابمەزرێنێت، لەدواییدا فەرەنسی بەریتانی لێدامەزراوە. فەرەنسی وبەریتانییەکان لەسەر دەسەلات گرتنە دەستی دورگەکە لەگەڵ یەکدا بەشەڕ هاتوون. تا لەساڵی ١٨٠٣ دا کەوتۆتە دەست بەریتانیاوە ولەسەرەتای ئەو ساڵەوە بۆتە داگیرکراوەیەکی بەریتانی وبەپێی ڕێکەوتننامەی پاریس ( ١٨١٤ ) داگیر کردنی پەسەند کراوە.

لەساڵی ١٩٦٧ دا سانت لوسیا بۆتە ئەندامێکی ئەو وڵاتانەی مافی ئۆتۆنۆمیان پێبەخشراوە لەچوارچێوەی یەکێتی دورگەکانی ئەنتیل. لە ٢٢ / ٢ / ١٩٧٩ دا سەربەخۆیی تەواوی پێبەخشراوە لەچوار چێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. دوای سەربەخۆیی وڵات چەند سەرۆکێکی پۆستی سەرۆکایەتی حکومەتیان گرتۆتە دەست، دوایینیان کیتی ئانتۆنی بووە ( ١٩٩٧ ).

ئابووری سانت لوسیا بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بەچالاکییە کشتوکاڵیەکان بەستووە، دانیشتوانی دورگەکە نیوەی بەرهەمەکانیان بەکاردەهێنن، گوێزی هیندی یەکێکە لەو بەرهەمە سەرەکییانەی رەوانەی دەرەوەی وڵات دەکرێت. هەروەها گەشتوگوزاریش رۆڵێکی سەرەکی دەبینێت لە تێکڕای بەرهەمی نەتەوەیی ئەو وڵاتەدا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ٥٠١ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٦١ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣,٤٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٨ .

## سان مارینۆ

**ناوی باو:** سان مارینۆ

**ناوی فەرمی:** کۆماری سان مارینۆ

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Most Serene Republic of San Marino

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی گشتی باڵا ( ٦٠ ئەندام ).

**رووبەر :** ٢٣,٦ میل دووجا، ٦١,٢ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٥,٦٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٤١٨,٤ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** گەلی سان مارینۆ، ئیتالی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك )، بێ ئاین

**زمان:** ئیتالی.

**پایتەخت:** سان مارینۆ

**شارە سەرەکییەکان:** مۆرگۆ ماجیۆرین سیرافالی.

**دراو:** لیرەی ئیتالی.

**ئاووهەوا:** مام ناوەندە، پلەکانی گەرما لەزستاندا سفر پلەی سەدی ولەهاویندا دەگاتە ٢٤ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی باران ٨٩ سم .

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، کەستانە، گەنم، سەوزە ومیوە، بەخێوکردنی مەڕومالآت.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** سیرامیك، دروستکراوەکانی پێست، چنین.

**سامانی کانزایی:** بەردە کریستاڵەکان.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

سان مارینۆ وڵاتێکی ئەوروپییە، یەکێکە لە بچوکترین وڵاتەکانی جیهان. ئیتاڵیا لەهەرچوار لاوە لەگەڵیا سنووردارە، هیچ کەنارێکی نییە. دەکەوێتە سەر چیاکانی ئەبناینی باکووری ڕۆژهەڵاتی ئیتاڵیا. نزیکەی ١٥٠ کم لەباشووری شاری ڤینیسیاوە دوورە، هەروەها نزیکەی ٢٠ کم لە دەریای ئەدریاتیکییەوە دوورە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٢/٥٠ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٣/٥٥ بەرەو باکوور.

تەختی سان مارینۆ شاخاوی وسەختە، بەرزترین چیای ئەو وڵاتە چیای تیتانۆیە کە

بەرزییەکەی دەگاتە ٧٥٥ م لەسەر ئاستی رووی دەریا، سێ لوتکەی گرتۆتە خۆ لەسەر هەر یەکێك لەو لوتکانە قوولەیەکی دێرینی لە چاخەکانی ناوەڕاستدا لێ دروست کراوە، سان مارینۆی پایتەختیش دەکەوێتە نزیك یەکێك لەو لوتکانە. ڕێگایەکی زەمینی وهێڵێکی ئاسن سان مارینۆ دەگەیەنێت بەنزیکترین شاری ئیتاڵیاوە کە شاری ریمینییە ونزیکەی ٢٠ کم دوورە لێوەی. لە وەرزی هاویندا فڕۆکە هەلیکۆپتەرەکان گەشتیاران دەگەیەنێتە ریمینی.

سانت مارینۆ لە ساڵی ٣٠١ دا لەسەر دەستی قدیس مارینۆ دامەزرێنراوە. دوای دامەزراندنی سان مارینۆ هەڵهاتووە بۆ چیای تیتانۆ لەترسی دەسەلاتی ستەمکاری رۆمانی، لەناوی ئەو قەدیسەوە ناوی وڵات هاتووە، شایەنی باسە مارینۆ کاری بەرد بڕینی دەکرد. لەساڵی ٨٨٥ دا کۆمەڵەیەکی ئاین ناسی سەربەخۆ لەو ناوچەیەدا سەریان هەڵداوە. لە سەدەی چواردەیەمدا کەوتونەتە ژێر دەسەلاتی دۆقە ئیتاڵیەکانی ئەو سەردەمە. لەساڵی ١٤٦٢ دا بۆتە کۆمارێکی سەربەخۆ، بەمەش بەکۆنترین کۆمار لەجیهاندا دادەنرێت. لەسەدەکانی پانزدەیەم وشانزدەیەمدا دانیشتوانی کۆمار داکۆکیان لەوڵاتی خۆیان کردووە لە هێرش و پیلانی وڵاتە دراوسێکانیان. لەساڵی ١٦٣١ دا پاپا کە ئەو کات دەسەلاتی زۆربەی ناوچەکانی دراوسێی سان مارینۆی گرتبۆوە دەست دانی بەسەربەخۆیی سان مارینۆ ناوە، پاپاکانی دوای ئەویش بەرهەڵستی توندیان کردووە لە هەوڵەکانی هەندێ لەکەرەلییەکانی ئیتاڵیا بۆ داگیرکردنی سان مارینۆ. لەساڵی ١٨٦١ دا گەلی سان مارینۆ نامەیەکیان ئاراستەی سەرۆکی ئەو کاتی ویلایەتە یەککگرتوەکان – ئبراهام لنکۆلن – کردووە تیایدا خەم وپەژارەی خۆیانیان بەرامبەر بە بارودۆخی گەلی ویلایەتە یەککگرتوەکان دەربڕی، لنکۆلن بە رستەیەك وەڵامی دانەوە کە گەلی سان مارینۆ هەرگیز لەیادیان ناچێ، وتبووی:" راستە ئێوە خاوەنی وڵاتێکی بچوکن، بەڵام ئێوە مەزن ترین وبەبایەخترین وڵاتانی جیهانن".

لەساڵی ١٨٦١ دا تەواوی ئەو زەوییانەی چوار دەوری سان مارینۆیان گرتووە بووە بەشێك لە شانشینی ئیتاڵیا. بۆ ساڵی دوایی سان مارینۆ یاداشتنامەی هاوڕێیەتی لەگەڵ ئیتاڵیادا واژۆ کردووە. دوای کۆتایی هێنان بە پرۆژەی یەکێتی خاکی ئیتاڵیا یاداشتانەمەکەی نێوان سان مارینۆ وئیتاڵیا لەساڵەکانی ١٨٧٢ ، ١٨٩٧ ، ١٩٣٩ ، ١٩٥٣ ، پەسەند کراوە. سان مارینۆ لەجەنگی جیهانیی دووەمدا هەڵوێستی بێلایەنی نواند، بەڵام بەریتانیا بۆمبارانی کرد چونکە فاشییەکان کۆنترۆڵی حکومەتی سان مارینۆیان کردبوو. لەبەرواری ٢ / ٣ / ١٩٩٢ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان.

سان مارینۆ ملکەچی ئەو دەستوورەیە کەلەساڵی ١٦٠٠ دا دارێژراوە. لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە پارێزگاری لە دەزگاکانی خۆی کردووە. ئەنجومەنی گشتی باڵا دووان

لەئەندامەكانی هەڵدەبژێریٚ بۆ سەرۆكایەتی حكومەت، هەر یەكەیان شەش مانگ دەسەلأت دەگرێتە دەست ونابیٚ لەماوەی سیٚ سالٚ زیاتر هەڵبژێردرێنەوە. ئەو دوو سەرۆكە ناودەبرێن بە راسپێردراوەكانی حوكم، ئەوانیش لەلایەن خۆیانەوە دە وەزیر دیاری دەكەن. ئەنجومەنی ولأت ( حكومەت ) لەهەردوو راسپێردراوی حوكم ودە وەزیر پێك دێت. بەپێی دابونەریتەكانیان، پیاوە ماقولأنی خێزانەكانی سان مارینۆ هەردوو سالٚ جارێك كۆدەبنەوە بۆ گفتوگۆ كردن لەسەر بابەتە گشتیەكان.

پەیوەندییەكانی نێوان خێزانەكانی سان مارینۆ زۆر پتەوە و وەك یەك خێزانی گەورە پێكەوە دەژین، بۆیە پیاوانی پۆلیس ودادوەرەكان هیچ گرفتێكی ئەوتۆ نایەتە رێگایان لەجێبەجیٚ كردنی یاساكان یان سزادانی تاوانباران، چونكە خەڵكی شار وەك هاوریٚ ودۆستی یەكتر وان وخۆیان كێشە وگرفتەكانی نێوانیان چارەسەر دەكەن بیٚ ئەوەی پۆلیس وپیاوانی حكومەت سەرقالٚ بكەن.

گەشتوگوزار سەرەكیترین سەرچاوەی داهاتی نەتەوەیی ولأتەكەیە، هەروەها حكومەتی ئیتاڵیاش هەندیٚ لە یارمەتییەكانیان پێشكەش دەكات بەرامبەر بەو تایبەتمەندیانەی سان مارینۆ بە ئیتاڵیای بەخشیوە.

تێكرای داهاتی نەتەوەیی : ١٨٨ ملیۆن دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولأتانی جیهاندا : ١٨٢ .

نێوەندی خەرجی سالأنەی تاك: ٨,٥٤٥ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولأتانی جیهاندا: ٣٥ .

## ساو تۆمی و پرێنسیپ

**ناوی باو:** ساو تۆمی وپرێنسیپ.

**ناوی فەرمی:** کۆماری ساو تۆمی وپرێنسیپی دیموکراسی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Democratic Republic of Sao Tome And Principe.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥٥ ئەندام ).

**ڕووبەر :** ٣٨٦ میل دووجا، ١,٠٠١ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٤٥,٠٠٠ کەس ( تاساڵی ٢٠٠٠ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٣٧ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تێکەڵ، ئەفریقی ڕەش، ئەورووپی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ).

**زمان:** پۆرتۆگالی.

**پایتەخت:** ساو تۆمی.

**شارە سەرەکییەکان:** تریندادە، سانتانا، نیڤیس، سانتۆ ئامارۆ، بۆرتۆ ئەلجیری.

**دراو:** دۆبرا.

**ئاو وهەوا:** گەرم وشێدارە، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٨ پلەی سەدی لەناوچە بەرزەکان و٢٥ پلەی سەدی لەناوچە نزمەکان دەبێت. ڕێژەی ساڵانەی باران ٥٠٠ سم لە باشوور و ١٠٠ سم لەباکوور دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، کاکاو، قاوە، گوێزی هیندی، بەخێوکردنی مەڕومالات، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** بیرە، پۆشاك.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

ساو تۆمی وپرێنسیپ وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە، دەکەوێتە کەنداوی غینیا ( زەریای ئەتڵەسی ) لە ڕۆژئاوای ئەفریقیا، لەباکووری هێڵی کەمەرەیی، نزیکەی ٢٩٠ کم لەڕۆژئاوای لیبرەفیلی پایتەختی گابۆنەوە دوورە. پێك دێت لەم دورگانە:

١. دورگەی ساو تۆمی کەنزیکەی ٨٥ ٪ ی ڕووبەری وڵات دەبێت و نزیکەی ٩٥ ٪ ی کۆی دانیشتوانی لەخۆی گرتووە.

٢. دورگەی پرێنسیپ.

٣. هەندێ دورگەی بچوك وبەربڵاو لەهەردوو دورگەی ناوبراو.

ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ١ بەرەو باکوور.

دورگەکانی ساو تۆمی وپرنسیپ بەرەچەڵەك گڕکانین وبەشی رۆژئاوای بەشێوەیەکی بەرچاوەوە لە رووی دەریا بەرزترە، دارستانەکان دەکەونە نزیك کەنارەکانیەوە و لەناوچە ناوخۆییەکانیش هەندێ ناوچەی بەرز دەبنەوە وبەردە بازلتیەکانیان پێکهێناوە.

بەر لەدۆزینەوەی ئەوروپیەکان بۆ ئەم دورگانە هیچ کامیان نیشتەجێ نەکرابوون. لەبەرواری ٢١ / ١٢ / ١٤٧٠ دا هەردوو دەریاوانی پۆرتۆگالی پیترۆ ئیسکۆبار و خوان گۆمس دورگەی ساو تۆمیان دۆزیوەتەوە، ئەو رۆژەش جەژنی قدیس تۆما بوو، بۆیە دورگەکە بەناوی ئەوەوە ناونراوە. بۆ سالی دوایش دورگەی پرێنسیپیان دۆزیوەتەوە ( دورگەی میر ) و وەك رێزلێنانی میر ئەلفۆنس کەلەدواییدا بۆتە شای پۆرتۆگال ( ئەلفۆنسی پێنجەم ) ناوی ئەویان لێناوە. نیشتەجێ بوون لەدورگەکاندا لەدوای سالی ١٤٨٥ دەستی پێکردووە، پۆرتۆگالییەکان و ئەفریقییە رەشەکانیان لە مۆزامبیق و ئەنگۆلاوە هێناوەتە دورگەکان تاکو لەکێڵگەکانی قامیشی شەکر کاریان پێبکەن، بۆیە ولات بۆتە گەورەترین کێڵگەی قامیشی شەکر لەو کاتەدا. لەدواییدا دەستکراوە بە کشتوکالی قاوە وکاکاو دوای ئەوەی کە پۆرتۆگالیەکان کشتوکالی قامیشی شەکریان گواستۆتەوە بۆ بەرازیل.

لەگەڵ بلاوبوونەوەی بازرگانی کردن بەکۆیلەکانەوە وبەرز بوونەوەی قازانج وداهاتی ئەو بازرگانییە لەسەر ئاستی هەموو جیهان لەسەدەی شانزدەیەمدا، پۆرتۆگالیەکانی دورگەی ساو تۆمیان کردۆتە گەورەترین سەنتەری کۆکردنەوەی کۆیلەکان کە لەگابۆن ومۆزامبیق وئەنگلا وغینیاوە دەیانهێنان ولەناو تەویلە گەروەکانی ساو تۆمیدا کۆیان دەکردنەوە وبازرگانانی کۆیلەکان لەتەواوی جیهانەوە دەهاتن بۆ کڕین وفرۆشتنەوەیان، ساو تۆمی بەردەوام رۆڵێکی گەورەی هەبووە لە قەدەغەکردنی بازرگانی کردنی بەکۆیلەوە تا کار گەیشتە ئەوەی لەناوەڕاستی سەدەی نۆزەهەمدا ئەم جۆرە بازرگانی کردنە بەشێوەیەکی نێودەوڵەتی قەدەغە کرا. پۆرتۆگالیەکان هەوڵیان داوە فێڵ لەیاسا نوێکانی قەدەغەکردنی بازرگانی کردن بەکۆیلەکانەوە بکەن، بازرگانیان کردووە بە خەڵکەوە بێ ئەوەی جگە لەخواردن وشوێنی خەوتن هیچ کرێیەکیان بدەنێ، یان ئەوەتا دەبێ دورگەکە بەجێ بهێڵن، ئەمەش پالنەرێك بوو تەواوی ولاتانی جیهان رژێمی ساو تۆمی بەرژێمێکی دیکتاتۆر بزانن چونکە بازرگانی کردنی بەکۆیلەکانەوە رانەگرتووە، ئینگلتەرا هەڵمەتێکی گەورەی بەڕێوەبرد بۆ دابڕاندن لەکڕینی کالاکانی ساو تۆمی لەسالی ١٩٠٥ دا، بۆیە زۆربەی چاودێران دەڵێن کە ئەمە یەکەم دابڕانی بازرگانی بووە ئەفریقیا بەخۆیەوە دیبێتی.

دەسەلاتی پۆرتۆگالییەکان بەسەر دورگەکەدا هێشتا بەردەوام بوو، بەڵکو ئەو رژێمە سەربازییە دەسەلاتی بولگاریای گرتبۆوە دەست تا ناوەڕاستی حەفتاکانی سەدەی بیستەم ساو تۆمی بە بەشێکی ولاتی خۆی دەزانی، بەو پێیە کە کاتێ پۆرتۆگالییەکان لەسەدەی

پانزدەیەمدا دورگەکەیان دۆزیوەتەوە نیشتەجێ نەبووە وئەمان ئاوەدانیان کردۆتەوە وئەفریقییەکان بۆ جوتیاری هێنراونەتە ساو تۆمی بۆیە مافی ئەوەیان نییە داوای سەربەخۆیی بکەن. بەڵام لەگەڵ رووخانی رژێمی سەربازی لە پۆرتۆگالدا دەروازەکانی ئازادی لەبەردەم دانیشتوانی دورگەکەدا کرایەوە. لە ١٩٦١ دا بزوتنەوەی ئازادی ساو تۆمی وپرینسیپ هەڵگیرسا، بۆیە لە ٢١ / ٧ / ١٩٧٥ داسەربەخۆیی تەواوی لەپۆرتۆگال دەستگیر بوو، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندییەکانی نێوان ساو تۆمی وپۆرتۆگالییەکان زۆر بەهێزە وچەند پرۆژەی هاوبەشیان پێکەوە ئەنجام ئەداوە.

دوای سەربەخۆیی وڵات، حکومەت چەند هاوپەیمانی سیاسی لەگەڵ ئەنگۆلا ومۆزامبیق گرێداوە، ئەمانیش لەلایەن خۆیانەوە ساو تۆمیان هێنایە نێو سەربازگەی رۆژهەڵاتەوە و بووە بنکەیەکی سەربازی هاوپەیمانی وارسۆ تا روخانی یەکێتی سۆڤیەت، چونە نێو سیاسەتی رۆژئاوا وراگەیاندنی دیموکرات وفرەحیزبی لە وڵاتدا.

یەکەم سەرۆکی وڵات دوای سەربەخۆ بوون: مانۆئێل بینتۆ داکۆستا بوو، دوای ئەویش میگوێل دۆس ئەنجۆس لە ١٩٩١ دا دوای هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکان پۆستی سەرۆکی وڵاتی گرتۆتە دەست.

لەساڵی ١٩٩٥ داهەندێ لە مافە سەربەخۆییەکان بە دورگەی پرنسیپ بەخشراوە.

ئابووری وڵات پشتی لەسەر بەرهەمەکانی قاوە و کاکاو بەستبوو تا چوونە دەرەوەی پۆرتۆگالییەکان لە وڵاتدا. بەڵام دوای دابەزینی نرخی بەرهەمەکانی قاوە وکاکاو لەبازارە جیهانییەکاندا، بایەخێکی زیاتر درا بە راوە ماسی و گەشتوگوزار. ئێستا ساو تۆمی بەکامپێکی گەورەی گەشتوگوزار دادەنرێ، ساڵانە بەهەزارەها لە رەش پێستە ئەمریکییەکان سەردانی دەکەن و وادەزانن کە باوباپیرانیان بەرەچەڵەك خەڵکی ئەو ناوچەیەن.

رۆژی نیشتیمانی: ٢١ / ٧ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٧٥ .

تێکرای داهاتی نەتەوەیی : ٣١ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ١٩٠.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٧١.

## سریلانكا

**ناوی باو:** سریلانكا

**ناوی فەرمی:** كۆماری دیموكراسی سۆسیالیستی سریلانكا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Democratic Socialist Republic of Srilanka

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ٢٢٥ ئەندام ).

**رووبەر :** ٢٥,٣٣٢ میل دووجا، ٦٥,٦١٠ كم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٨,٦٦٣,٠٠٠ كەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٢٨٤,٥ كەس/كم$^{٢}$

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** سەنهالی ( كەزۆرینەی وڵاتن )، تامیل ( كەمایەتین )، موور ( بە باوباپیرانی عەرەب دادەنرێن ).

**ئاین:** بوودی، هیندۆس، موسڵمان ( نزیكەی ١٠ ٪ )، مەسیحی.

**زمان:** سەنهالی، تامیلی، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** كۆلۆمبۆ.

**شارە سەرەكییەكان:** دیهیوالا ماونت لافینیا، جافنا، كاندی، راتنابورا، نوارا ئیلیا.

**ئاووهەوا:** خولگەیی مام ناوەند، نێوەندی پلەكانی گەرما لەناوچەی كەنارە نزمەكان ٢٧ پلەی سەدییە، لەناوچە شاخاوییەكان دەگاتە ١٦ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەكان ١٣٠ سم – ٥١٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** لاستیك، برنج، چا، گوێزی هیندی، پەتاتە، بەخێوكردنی مانگا، راوەماسی، قاوە.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** دروستكراوە خۆراكییەكان، بەرهەمەكانی لاستیك، چنین.

**سامانی كانزایی:** بەردی پیرۆز، گرافیت، بەردی كریستاڵ، ئاسن، كوارتز.

**تێڕوانینێكی گشتی :**

سریلانكا ( ئەوسا پێی وتراوە سیلان )، وڵاتە دورگەیەكە دەكەوێتە زەریای هیندی، نزیكەی ٣٢ كم لەكەناری باشووری رۆژهەڵاتی هیندەوە دوورە، تەنگەی بالك بەپانتایی ١٣٧ كم لە هیندی جیادەكاتەوە. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكێری هێڵی درێژی ٨١ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٧/٣٠ بەرەو باكوور.

بەشی ناوەڕاستی سریلانکا ناوچەیەکی شاخاوییە ودەشتەکان چوار دەوریان گرتووە، بەڵام بەشی باکووری بریتییە لە دەشتێکی پان وبەرین.

لەسەدەی پێنجەمی پ.ز دا، سەنهالییەکان لەباشووری هیندەوە بەرەو دورگەکە کۆچیان کردووە، بەمەش بەگەورەترین ودێرین ترین گەلی سریلانکا دادەنرێن. لەسەدەی چوارەمی پ.ز ئاینی بوودی لەهیندەوە گەیشتۆتە سریلانکا ولەسەدەی سێهەمی پ.ز سریلانکا بۆتە سەنتەرێکی شارستانێتی ئاینی بوودی. عەرەبەکان لەسەدەی دووەمی کۆچی دۆزیویانەتەوە، لەسەدەی دووەمی زایینی ئاینی ئیسلام گەیشتۆتە ناوچەکە وهێندەی نەخایاند عەرەبەکان دەستیان گرتووە بەسەر بازرگانی ئەو ناوچەیە، بەڵام پاش گەیشتنی پۆرتۆگالییەکان لەساڵی ١٥٠٥ دا ئاینی کاتۆلیک گەیشتۆتە سریلانکا. دوای ئەوانیش هۆڵەندییەکان لە سەدەی حەڤدەیەمدا گەیشتونەتە ناوچەکە ودەستیان بەسەر بازرگانی سریلانکا گرتووە ودوای ئەوەی لەچەند شەڕێکدا پۆرتۆگالیەکانیان تێکشکاندووە توانیویانە دەسەڵاتی ناوچەکە بگرنە دەست. لەنێوان ساڵەکانی ١٧٩٥ - ١٧٩٦ ئینگلیزەکان توانیویانە تەواوی داگیرکراوە هۆڵەندییەکان بگرنە دەست وداگیری بکەن، بۆیە لەساڵی ١٨١٥دا بەریتانیا رایگەیاند کە سریلانکای بۆتە داگیرکراوەیەکی بەریتانی. لە بەشی باشووری ئەو دورگەیە کشتوکاڵیەکانی چا وگوێزی هیندی وقاوە لەو ماوەیەدا گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە وکرێکار وجوتیارەکانی تامیل نادۆی هیندیان بۆ ئەم مەبەستە هێناوە.

لەبەرواری ٤ / ٢ / ١٩٤٨ دا ( جەژنی نیشتیمانی ) سریلانکا لەچوارچێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی سەربەخۆیی خۆی دەستگیر بووە وناوی بۆتە وڵاتی سیلانی سەربەخۆ ولە ساڵی ١٩٥٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

بەلام ماوەیەك دوای سەربەخۆیی وڵات تووشی چەندین گرفتی ئابووری توند بووەوە، گرفتە وکێشە٠کان خۆیان لە بەرزبوونەوەی نرخی بەرهەمە کشتوکاڵیە ناوخۆییە سەرەکییەکانی وەك چا ولاستیك دەبینییەوە، جگە لە گرفت وململانێ سیاسییەکان.

دۆلی سیناناییکا یەکەم سەرۆکی وەزیرانی سیلانی سەربەخۆ بوو، دوای ئەو لە ١٩٥٦ دا سۆلۆن دیاز باندرانیکا بۆتە سەرۆك لەسەر دەستی یەکێك لەتوندرەوە سەنهالییەکان لە ١٩٥٩ دا تیرۆر کراوە. بۆ ساڵی دوایی خێزانی باندرانیکا: سیریمافۆ باندرانیکا بۆتە سەرۆکی وەزیران، بەمەش بەیەکەم ژن دادەنرێت لەجیهاندا پۆستی سەرۆك وەزیران بگرێتە دەست، شایەنی باسە خاتوو باندرانیکا سێ جار لەسەر یەك پۆستی سەرۆك وەزیرانی گرتۆتەوە دەست: ١٩٦٠ - ١٩٦٥ ، ١٩٧٠ - ١٩٨٧ ، ١٩٩٤ تا لەبەرواری ١٠ / ٨ / ٢٠٠٠

دا دەستی لەکار کێشایەوە بەهۆی خراپی باری تەندروستییەوە. لەبەرواری ١٠ / ١٠ / ٢٠٠٠ دا لەتەمەنی ٨٤ ساڵیدا خاتوو باندرانیکا کۆچی دوایی کرد. لەبەرواری ١٣ / ١٠ / ٢٠٠٠ دا راتناسیری ویکرامانایاکی ( ٦٧ ساڵ ) پۆستی سەرۆکایەتی حکومەتی گرتۆتە دەست وسوێندی دەستووری خوارد.

لە بەرواری ٩ / ١٢ / ٢٠٠١ دا سەرۆك وەزیرانی نوێی سریلانکا رانیل فیکراسینجا سوێندی دەستووری خوارد، دوای سەرکەوتنی پارتەکەی : بەرەی نیشتیمانی یەکگرتوو لەهەڵبژاردنە گشتییەکانی ٥ / ١٢ / ٢٠٠١ بەسەر پارتی هاوپەیمانی گەل، شایەنی باسە هەڵبژاردنەکان بەشێوەیەکی نائاسایی بەڕێوە چووە ودەنگدەران خۆپیشاندان و ناڕەزاییان لەئەنجامەکانی دەربڕی و بەدەیان قوربانی لێکەوتەوە.

شایەنی باسە پۆستی سەرۆك وەزیران پۆستێکی رەمزییە. دەسەڵاتی فیعلی بەدەست خودی سەرۆکی کۆمارە، لەبەرواری ١٠ / ١١ / ١٩٩٤ بەدواوە خاتوو تشاندریکا باندرانیکا کۆماراتۆنگای کچی سەرۆك وەزیرانی کۆچکردوو سیریمافۆ باندرانیکایە. خاتوو باندرانیکا دوای سەرۆکی کۆماری پێشوو سینگ بریماداسایە کە لەبەرواری ١ / ٥ / ١٩٩٩ دا تیرۆر کراوە. لەبەرواری ١٨ / ١٢ / ١٩٩٩ هەوڵی تیرۆر کردنی سەرۆکی وڵات خاتوو باندرانیکا شکستی هێنا. کاربەدەستانی وڵات بزوتنەوەی پڵنگەکانی تامیلیان تاوان بار کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا خاتوو باندرانیکا لەهەڵبژاردنەکانی ٢١ / ١٢ / ١٩٩٩ دا بۆماوەی شەش ساڵی دیکەش لە پۆستی سەرۆکی کۆماردا سەرکەوتنی بەسەر تەواوی نەیارەکانی هێنایەوە. شایەنی باسە هەڵبژاردنەکان لەبارودۆخێکی زۆر ناهەمواردا بەڕێوە چوو، بەدەست بزوتنەوەی پڵنگەکانی تامیلەوە.

وڵات لەماوەکانی رابردوودا چەندین شەڕی ناوخۆی بەخۆوە بینیوە بەسەدان هاوڵاتی بوونەتە قوربانی وچەندین گەورە لێپرسراوان تیرۆر کراون. هۆکاری سەرەکی کێشەکانیش پەیوەندییەکانی نێوان سەنهالی و تامیلییەکانە، تامیلییەکان سەنهالییەکانیان بەوە تاوانبار کردووە کە تەواوی دەزگا ودەسەڵاتەکانیان بۆخۆیان قۆرغ کردووە ورێگا بە تامیلییەکان نادەن بەشداری گۆڕەپانی سیاسی بکەن. لەساڵی ١٩٩١ دا سەرۆکی بزوتنەوەی پڵنگەکانی تامیل باراباخ هاران فەرمانی دا بەتیرۆکردنی سەرۆك وەزیرانی هیند راجیف غاندی دا، هەروەها لەساڵی ١٩٩٣ دا فەرمانیدا بەتیرۆر کردنی سەرۆك کۆماری سریلانکا، هەروەها فەرمانی داوە بە تەقاندنەوەی بانکی کۆلۆمبۆ ولەئاکامی تەقینەوەکە زیاتر لە ٨٤ کەس گیانیان لەدەستداوە، ئەمە جگە لە فەرمانی بەلەناو بردنی شەمەنەفەرێك بەتەواوی سەرنشینەکانییەوە، شەڕی لەگەڵ سوپای سریلانکایدا کردووە وتوانیویەتی کەرتی

جافنایان پیّ چۆڵ بکات کە بەسەرچاوەیەکی گرنگی بەرهەمی چا و بەردە پیرۆز وگران بەهاکانی سفیر و یاقووتی شینە. شایەنی باسە دوای ئەوەی شاری جافنا داگیر کرا، بزوتنەوەی پڵنگەکانی تامیل بە پایتەختی کۆماری تامیل رایانگەیاند. تامیلییەکان نزیکەی سێ لەسەر یەکی کۆی دانیشتوانی سریلانکا دەبن. پڵنگەکانی تامیل لەشاری جافناوە هێرش دەکەنە سەر سوپای فەرمی سریلانکا وشارەکەیان کردۆتە دۆزەخێك سەردەمێکە هیچ گەشتیارێك رووی تێناکات.

سوپای سریلانکا هەرچییەك بکات ناتوانیّ پڵنگەکانی تامیل لەناو بەرێت، تامیلییەکان گەیشتونەتە ئاستێك هەر کاربەدەستێکی حکومیان بوێت تیرۆری دەکەن، هەر ئامانجێکیان هەبێت دەیپێکن، تامیلییەکانی هیند یارمەتییەکی زۆری پڵنگەکانی تامیلی سریلانکا دەدەن، ئەمە جگە لەوەی ملیۆنەها تامیلی لە ولاتانی رۆژئاواوە پارە ومالّیاتێکی زۆریان بۆ رەوانە دەکەن وچەندین نووسینگەیان لەپایتەختی ولاتە رۆژئاواکان هەیە ولەرێیەوە گرێبەستەکانیان لەگەڵ باندەکانی قاچاخچێتی چەك واژۆ دەکەن ورەوانەی پڵنگەکانی تامیلی دەکەن. لەتەواوی ئەم تایبەتمەندییانە گرنگتر دڵسۆزی وباوەڕی کوێرانەی شەڕەوانانی پڵنگەکانی تامیل بۆ سەرکردەکەیان. باراخ هارانی سەرۆکی بزوتنەوە لەنێو حەشارگە ودەغڵە چڕەکاندا مەڵاس داوە وکەسێك نییە بیگاتیّ، لەکاتێکدا شەڕەوانان ئەرکی تیرۆر وشەڕ وڕووبەروو بونەوەیان گرتۆتە ئەستۆ، هەرکاتێکیش یەکێك لە پیاوەکانی نزیك لەدەستگیر بوون یان خۆ بەدەستەوە دان بیێتەوە دەست بەجیّ لەناو دەبریّ وچی زانیاری هەیە لەگەڵ خۆیدا سەرونگوم دەبێت. ئەمە ئەوە راناگەیەنیّ کە ئەوسیّ ملیۆن تامیلییەی سریلانکا پەیرەوی سیاسەتی بزوتنەوەی پڵنگەکانی تامیل بکەن بەلاّم لەهەمان کاتدا ناتوانن رووبەرووی بوەستنەوە وبەرەنگاری لێبکەن، تەنانەت ئەندامانی پەرلەمانی تامیلیش ناتوانن رەخنە لەهیچ بۆچونێکی سەرکردەکەیان بگرن، ئەو کەسایەتییەکە جگە لە فەرمانی کوشتن هیچ قسەیەکی لەگەڵ ناکریّ.

سەرۆکی سریلانکا پەنای بردە بەر ئەنجام دانی چەند چاکسازییەك لەنێو دەستووری ولاتدا بەمەبەستی کۆتایی هێنان بەو شەڕەی لە دوای سالّی ١٩٨٣ بەدواوە لەنێوان هێزە حکومییەکانی سریلانکا وهێزەکانی بزوتنەوەی تامیلدا هەڵگیرساوە، ئەمەش بە گواستنەوەی دەسەلاّتەکان بۆ هەرێمەکان وپێك هێنانی ئەنجومەنێکی کاتی بەرێوەبردنی دەسەلاتەکان بۆ کاتێکی دیاری کراو، بەو هەرێمانەوە کە هێزەکانی تامیل داگیریان کردووە لەباکوور ورۆژهەلاّتی ولاّتدا، ئەمەش مانای بەخشینی مافە سیاسییەکانە بە بەرەی ئازادیخوازی پڵنگەکانی تامیل. بەلاّم پەرلەمانی سریلانکای لەدانیشتنە ئاناساییەکەی رۆژی

٩ / ٨ / ٢٠٠٠ ئەم پێشنیارانەی ڕەتکردەوە وپرۆژەکەی سەرۆکی وڵاتی پەسەند نەکرد، پیاوانی ئاینی بوودی ورێکخراوە سەنهالییەکان هەڵمەتێکیان لەدژی پرۆژەی دەستووری نوێ بەڕێوەبرد وباسیان لەوە دەکرد کە مەبەستی ئەم دەستوورە ئەبێتە هۆی دابەش بوونی وڵات ولەناوچوونی یەکێتی خاکەکانیان. ئەمە جگە لەوەی بەرەی ئازادیخوازی پڵنگەکانی تامیلیش لەلایەن خۆیەوە دەستووری نوێیان ڕەتکردەوە وباسیان لەوە دەکرد کە پرۆژەی دەستووری نوێ نیازەکانی تامیل جێبەجێ ناکات ومەبەستە سیاسییەکانیان ناپێکێ، ئەمەش بووە دوو هێندە بوونی توند ڕەوییەکانی سریلانکا.

لەبەرواری ٢٤ / ٧ / ٢٠٠١ دا پڵنگەکانی تامیل هێرشی توندیان کردە سەر فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی کۆلۆمبۆ وبنکەیەکی ئاسمانی نزیك فڕۆکەخانەکە وزیاتر لە ١٣ فڕۆکەی مەدەنی وسەربازییان تەقاندەوە و زیاتر لە ٢٢ کەس گیانیان لەدەستدا، سوپاکانی سریلانکاش تەرمی سێ سەربازی تامیلیان دۆزیەوە کە دوانیان بەهۆی خۆ تەقاندنەوە گیانیان لەدەست داو ئەوی کەشیان بەگوولە کوژراوە، زیانە مادییەکانیش بە سەدان ملیۆن دۆلار خەمڵێندرا. هێزە حکومییەکان بەچەند هێرشێکی ئاسمانی بۆ سەر بنکە سەرەکییەکانی پڵنگەکانی تامیل وەڵامی هێرشکەی دانەوە.

وەکو باسی لێوە دەکرێ شەڕەوانانی تامیل زیاتر لە ١٥,٠٠٠ چەکداری لەخۆ گرتووە. لەساڵی ١٩٧٢ دا بەناوی بزوتنەوەی پڵنگەکانی تامیلەوە دامەزراوە، لەدوای ساڵی ١٩٧٦ ناوی بووە بە بزوتنەوەی جیاخوازی پڵنگەکانی تامیل. بزوتنەوەکە وێنەی شێرێکی لەناوەڕاستی ئاڵای سریلانکا وەك هێمایەك بۆخۆی هەڵبژاردوە. بارباخ هارانی سەرۆك لە ساڵی دامەزراندنی بزوتنەوەی پڵنگەکانی تامیل تەمەنی ١٨ ساڵ بووە.

لەبەرواری ٢١ / ١٢ / ٢٠٠١ دا حکومەتی سریلانکای سەرەتای ئاگربەستێکی بۆ ماوەی شەش مانگ لەگەڵ یاخی بوانی تامیل ڕاگەیاند، وەك وەڵام دانەوەیەك لەو ئاگربەستەی یاخی بووان ڕایانگەیاندبوو. لەبەرواری ٢٢ / ٢ / ٢٠٠٢ دا هەردوولا لەسەر ئاگربەستێك ڕێکەوتن بەچاودێری وڵاتی نەرویج، لەگەڵ ئەوەی سەرۆکی کۆمار بەرهەڵستییەکی زۆری لەو ئاگربەستە دەربڕی چونکە باسی لەوە دەکرد کە پێشێلی سەروەری خاکی وڵاتەکەی دەکات. تەواوی وڵاتانی جیهان خۆشحاڵی خۆیان لەم ئاگر بەستە دەربڕی بە سەرەتای قۆناغی ئاشتییەکی یەکجارەکی لەقەڵەمیان دا چونکە هەردوولا ڕەزامەندی خۆیانیان لەگفتوگۆ ودانوستانەکان دەربڕی.

لە ١٩ / ٧ / ٢٠٠٢ دا گەلی سریلانکا گەورەترین فیستیڤاڵی ئاینیان گێڕا، شایەنی باسە ئاهەنگەکە لە کەشو هەوایەکی ئاشتیدا بەڕێوەچوو دوای بیست ساڵ لەشەڕی ناوخۆی ئەو

ولاّته. ئاهەنگەکە ناوی ( ئاهەنگی بیراهیرایە ) و لەشاری کانوی بەڕێوە چوو، لەئاهەنگەکەدا ( ددانێك ) پیرۆز دەکرێت کەوازانراوە ئەو ددانە دەگەڕێتەوە بۆ فەیلەسووف بوودا ولەنێو قژی شازادەیەکی هیندی رەوانەی سریلانکا کراوە.

سریلانکا بەناوی دورگەی سرندیبەوە ناو دەبرا، لەدواییدا ناوی بۆتە دورگەی سیلان کە بەزمانی سەنهالی بەمانای دورگەی شێران دێت، ناوی ئێستاشی سریلانکایە، بەزمانی سەنهالی بەمانای خاکی درەوشاوە یان دورگەی درەوشاوە دێت. ناوی سریلانکا لەدوای ٢٢ / ٥ / ١٩٧٢ بەکارهاتووە.

سریلانکا ولاّتێکی تازە پێگەیشتووە، ولاّت رۆڵی رێکخەر دەبینێت، کەرتی تایبەتیش رۆڵێکی گرنگ دەبینێت. کشتوکاڵی شادەماری ئابووری سریلانکایە. زیاتر لەنیوەی دانیشتوانی ولاّتیش سەرقاڵی جوتیارین، گەشتوگوزاریش تا ئاستێ بەشداری لەداهاتی نەتەوەیی ئەو ولاّتەدا کردووە، چونکە هەرزانی نرخەکان ژمارەیەك گەشتیاری لە ولاّتە ئەورووپیەکانەوە بەرەو ولاّت راکێش کردووە.

سریلانکا بەپلەی سێهەم دێت لەنێو ولاّتانی جیهاندا لە بەرهەمی چا، لەدوای چین وهیند. بەپلەی هەشتەم دێت لەبەرهەمی لاستیك.

سروودی نیشتیمانی: دایکی پێشکەوتووم، سریلانکا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١١,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاّتانی جیهاندا : ٧٦.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٦٤٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاّتانی جیهاندا: ١٣٦ .

## سعودیه

**ناوی باو:** سعودیه.

**ناوی فەرمی:** شانشینی عەرەبی سعودیە.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Saudi Arabia

**سیستەمی حوکمرانی:** پادشایی، شا ، ئەنجومەنی وەزیران بە دەسەلاتی جێبەجیٚ کردن دادەنرێن.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی شوورا ( ٦٠ ئەندام ).

**رووبەر :** ٨٦٤،٠٠٠ میل دووجا، ٢،٢٤٨،٠٠٠كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٢،٠٠٠،٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٨,٥ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، ئاسیایی، ئەورووپی.

**ئاین:** ئیسلام.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** ریاز.

**شارە سەرەکییەکان:** مەککەی پیرۆز، مەدینە، تائیف، دەمام، ئەبها، جازان، بریدە، حائیل، تەبوك، باحە، نەجران، عەرعەر، سکاکا.

**دراو:** ریالی سعودی.

**ئاو وهەوا:** بیابانی وشکە وبارانی کەم لێدەبارێت، نێوەندی پلەکانی گەرما ١٨ پلەی سەدییە، بەلام ئەو رێژەیەکی سەقامگیر نییە وگۆڕانکاری زۆری بەسەردا دێت، لەزستاندا پلەکانی گەرما دابەزینێکی بەرچاو بەخۆیانەوە دەبینن ولەهاویندا بەرز دەبنەوە وهەندیٚ جار دەگەنە ٤٥ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەنێوان ١٥ — ٢٠٠ ملم دەبارێت، بەلام لەوەرزی هاویندا لەبەرزاییە رۆژئاوا باشوورییەکانی وڵات نێوەندی بارانەکان لەنێوان ٢٠٠ — ٥٠٠ ملم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، خورما، سەوزە ومیوە، بەخێوکردنی مەڕومالات، پەلەوەر، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، پەین، پیترۆکیمیاییەکان، پاکژکردنەوەی ئاوی دەریا بۆ ئاوی خواردنەوە، کەلوپەلی ناوماڵ.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گاز، بەردی کریستاڵ، گەچ، لم، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی :**

سعودیە ولاتێکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای ئاسیا، گەورەترین بەشی نیمچە دورگەی عەرەبی داگیرکردووە. ئەردەن وعێراق دەکەونە باکووری، کوێت دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەلاتی، کەنداوی عەرەبی وبەحرەین وقەتەڕ وئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو دەکەونە ڕۆژهەلاتی، سەڵتەنەتی عەمان ویەمەن دەکەونە باشووری، دەریای سووریش دەکەوێتە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٤٥ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٥ بەرەو باکوور.

شانشینی عەرەبی سعودیە چەند تایبەتمەندییەکی بەنرخی لەخۆ گرتووە. لەمەککەی پیرۆزدا پێغەمبەری ئیسلام موحەمەدی ( د.خ ) لە ٥٧١ ز لەدایك بووە، لە ئەشکەوتی حەرا وەحی بۆ دابەزیوە و کەعبەی قیبلەی ئیسلامەکان لەمەککەی پیرۆزدایە کە بەملیۆنەها ئیسلام لەنوێژەکانیاندا ڕووی تێدەکەن. هەروەها لەشاری مەدینەی مونەوەرە یەکەم دەوڵەتی ئیسلام لەجیهاندا دامەزراوە وهەر لەوێشدا پێغەمبەری ئیسلام ( د.خ ) کۆچی دوایی کردووە، دوای ئەوەی پەیامی ئیسلامی گەیاندۆتە تەواوی پاشا و شارەکانی جیهان وعەرەبی لە خێڵە دواکەوتوەکانەوە کردۆتە نەتەوەیەك شانازییەکی بێ وێنە بەخۆیانەوە بکەن.

لەهەموو ساڵێکدا نزیکەی دوو ملیۆن موسڵمان لەتەواوی جیهانەوە ڕوو دەکەنە شانشینی سعودیە بۆ شارەکانی مەککەی پیرۆز بۆ بەجێ هێنانی فەرزی حەج کە یەکێکە لە فەرزەکانی ئیسلام و شاری مەدینە بۆ سەردانی گڵکۆی پێغەمبەری ئیسلام ( د.خ ).

شانشینی عەرەبی سعودی لەسەر دەستی عەبدول عەزیز کوڕی عەبدول ڕەحمان ئال سعود دامەزراوە کاتێ بەخۆی و شەست پیاو ڕوویان کردە شاری ڕیاز و ولاتیان کرد لە ١٥ / ١ / ١٩٠٢، لە ساڵی ١٩٢٦ دا بەناوی شانشینی حیجاز ونەجد ڕاگەیەنراوە ، لە ٢٣ / ٩ / ١٩٣٢ ناوی بۆتە شانشینی عەرەبی سعودیە، دەستووری ولات قورئانی پیرۆزە وسوننەتەکانی پێغەمبەری ئیسلامە ( د.خ ). ڕۆژی ٢٣ / ٩ ی هەموو ساڵێك بەجەژنی نیشتیمانی ئەو شانشینە دادەنرێت.

پاش ئەوەی زیاتر لەنیو سەدە دەسەلاتی گرتە دەست، لە بەرواری ٩ / ١١ / ١٩٥٣ دامەزرێنەری ولاتی شانشینی عەرەبی سعودیە عەبدول عەزیز کوڕی عەبدول ڕەحمان ئال سعود کۆچی دوایی کرد، لەماوەی دەسەلاتیدا گەشەی بەزۆربەی بوارەکانی ولاتەکەی داوە. دوای ئەو شا سعود لەنێوان ساڵەکانی ( ١٩٥٣ – ١٩٦٤ ) دەسەلاتی گرتۆتە دەست. لەپاش

ئەو شا فەیسەڵ لەنێوان ( ١٩٦٤ – ١٩٧٥ ) دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. دوای ئەویش شا خالید لە ( ١٩٧٥ – ١٩٨٢ ) . دوای ئەو خێزانی پادشایی لە ١٣ / ٦ / ١٩٨٢ وەلی عەهد فەهەدی كوڕی عەبدول عەزیزی ( ٥٨ ساڵ ) بە شای وڵات هەڵبژارد و میر عەبداللە ی كوڕی عەبدول عەزیز ئال سعودیان بە وەلی عەهد هەڵبژارد. لەهەمان ڕۆژدا فەرمانێكی پادشایی دەرچوو بە دامەزراندنی میر عەبداللە ی وەلی عەهد بە جێگری سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران و سەرۆكی پاسەوانانی نیشتیمانی ومیر سوڵتانی كوڕی عەبدول عەزیز بە وەزیری بەرگری وچاودێری گشتی وجێگری دووەمی سەرۆكی وەزیران دامەزرێنرا.

شا فەهەد نازناوی خزمەتكاری هەردوو حەرەمی پیرۆزی لەخۆی ناو تەواوی نازناوەكانی: خاوەن شكۆو گەوەی وڵات، وشەی گەورەمی رەتكردەوە.

شانشینی عەرەبی سعودیە لەساڵی ١٩٤٥ دا بەشداری كردووە لە دامەزراندنی كۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەكان. هەروەها بەشداری كردووە لەدامەزراندنی دەزگای نەتەوە یەكگرتوەكان لەهەمان ساڵدا. لە بەرواری ٢٥ / ٥ / ١٩٨١ دا لەگەڵ وڵاتە دراوسێكانی بەشداری كردووە لە دامەزراندنی ئەنجومەنی هاوكاری وڵاتانی كەنداوی عەرەبی.

لەسییەكانی سەدەی بیستەمدا نەوت لە سعودیە دۆزراوەتەوە. ئەم دۆزینەوەیەش كاریگەرییەكی بێ وێنەی هەبوو لەگەشە كردنی وڵات وبەرزكردنەوەی ئاستی ژیانی تاكەكانی ئەو وڵاتە لەهەموو بوارەكاندا. داهاتەكانی نەوت بۆ بنیات نانی ژێرخانێكی پتەوی ئابووری ئەو وڵاتە، ئەمەش بووە هۆی پێشخستنی ولات بۆ ئاستی وڵاتە پێشكەوتوەكان.

لە ١٢ / ٦ / ٢٠٠٠ دا لەجەدەی شانشینی عەرەبی سعودیە واژۆ لەسەر رێكەوتننامەی نێودەوڵەتی كۆتایی هێنان بەكێشە سنوورییەكانی نێوان یەمەن وسعودیە كرا.

لەبەرواری ٢ / ٧ / ٢٠٠٠ دا رێكەوتننامەی كۆتایی لەنێوان كوێت وسعودیە واژۆ كرا بۆ دیاری كردنی سنووره دەریاییەكانی نێوانیان، شایەنی باسە ئەو سنووره دەریاییەی نێوان كوێت وسعودیە ناوچەیەكی دەوڵەمەندە لەسەرچاوەكانی نەوت وگازی سروشتی لەباكووری كەنداوی عەرەبی.

لەساڵی ٢٠٠٠ دا شانشینی عەرەبی سعودی بڕیاریدا كە دەروازەكانی لەبەردەم گەشتیارە بیانییەكاندا والا بكات ورێگە بە نائیسلامەكان بدرێت بێنە ناو وڵاتەكەیەوە بەو مەرجەی رەچاوی رێنماییە ئیسلامییەكان بكەن، لەوانە نەخواردنەوەی مەی وخواردنەوە ئەلكحولییەكان وڕێزگرتن لە جلوبەرگ وپۆشاكەكانیان.

لە ساڵی ٢٠٠١ دا وەزیری گەیاندنی شانشینی سعودیە رایگەیاند كە وڵاتەكەی بەنیازە هێڵێكی ئاسن بەئەنجام بگەیەنێ لەنێوان دەمام وكەناری كەنداوی عەرەبی وبەریازی

پایتەختدا تێپەڕێت تا دەگاتە جەددەی سەر کەناری دەریای سوور.

شانشینی سعودیە بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا بە پاکژکردنەوەی ئاوی دەریا، هەستاوە بە سازدانی ٢٩ وێستگەی پاکژکردنەوەی ئاوی دەریا بە بڕی ٨٠٠ ملیۆن گالۆن لەرۆژێکدا، واتە رێژەی ٢٠ ٪ ی هەموو جیهان. هەروەها بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا بە گەنجینەی یەدەگی پیترۆل کە دەکاتە ٢٦٣,٥ ملیار بەرمیل. واتا ٢٥,٥ ٪ ی هەموو جیهان. هەروەها بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی پیترۆل و بەپلەی چوارەم دێت لەیەدەگی گاز ( ٦,١٥٤ ملیار م$^{3}$ ) دوای هەریەك لە روسیا وئێران وقەتەر، بەرهەمی گازیشی دەگاتە ٥٠,١٢٣ ملیۆن م$^{3}$ وبەمەش بەپلەی دەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا. هەروەها ئامارەکانی ئەنجومەنی ئاڵتونی جیهانی ئاشکرایان کردووە کە دانیشتوانی شانشینی سعودیە بەرزترین رێژەی کڕینی ئاڵتونیان داگیر کردووە لەجیهاندا، ساڵانە زیاتر لە ٤٤,٥ ملیۆن پارچە ئاڵتون دەکڕن.

سروودی نیشتیمان: بەرەو پێشکەوتن وسەربەرزی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی : ١٢٦,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا : ٢٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٧,٢٤٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٤٢ .

## سلۆڤاکیا

**ناوی باو:** سلۆڤاکیا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری سلۆڤاکیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Slovak Republic

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ١٨,٩٢٣ میل دووجا، ٤٩,٠٣٦ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥,٤٠٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١١٠,٢ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** سلۆڤاك، مەجەڕی، ئۆکرانی، چیکی، ئەڵمان، قەرەج، پۆڵۆنی، رووس.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، کاسۆلیکی یۆنان، ئەرتۆدۆکسی رۆژهەڵاتی)، بێ باوەڕ.

**زمان:** سلۆڤاکی.

**پایتەخت:** براتیسلاڤا.

**شارە سەرەکییەکان:** کۆسیسی، بریسۆف، نیترا، زیلینا.

**دراو:** کرۆنی سلۆڤاکی.

**ئاو وهەوا:** کیشوەری، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٠ پلەی سەدی لەزستاندا بۆ ٢٠ پلەی سەدی لەهاویندا دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٠ سم بەبەفرەکانەوە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، مەڕوماڵات،گەنمەشامی، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، گەنم.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** سیرامیك، درووست کراوە کیمیاییەکان، ئامێر، بەرهەمەکانی نەوت، ئاسن، پۆڵا، چەك وتەقەمەنی.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردی، گاز، پیترۆڵ، مس، ئاسن، زنك، جیوە، ئەنتیمۆن.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

سلۆڤاکیا وڵاتیکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەورووپا، پۆڵەندا دەکەوێتە باکووری وئۆکرانیا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، هەنگاریا ( مەجەڕ ) دەکەوێتە باشووری، نەمسا وچیك دەکەونە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٩/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٨/٣٠ بەرەو باکوور.

بەشێکی چیا رۆژئاواکانی بارتان زۆربەی خاکی سلۆڤاکیا دادەپۆشێ، بەلام چیاکانی بارتانی بچوك وبارتانی سپی بەشی رۆژئاوا وباکووری رۆژئاوای سلۆڤاکیا یان گرتۆتەوە، چیاکانی تاتراسیش لەبەشی سنووره باکووریەکانی سلۆڤاکیا درێژ دەبێتەوە. دەشتەکانیش دەکەونە کەناری خۆرئاوای روباری دانوب.

لە ماوەی سەدەی پێنجەمی پ.ز کۆمەڵە هۆزە سلاڤیەکان لەو ناوچانەدا ژیاون کە دواتر پێی دەوترا چیکۆسلۆڤاکیا، ئەم خێڵانەش لەدوو کۆمەڵەی سەرەکی پێك هاتبوون: کۆمەڵەی چیکی، لەبەشی رۆژئاوای ناوچەکەدا نیشتەجێبوون، کۆمەڵەی سلۆڤاکی، لەبەشی رۆژهەلاتدا نیشتەجێبوون. ولاتیش لەمانەوە ناونراوە.

لەسەدەی نۆیەمدا سلۆڤاکیا بۆتە بەشێکی ئیمپراتۆرێتی مۆراڤیا، کە هەر یەك لەناوچەکانی مۆراڤیا وبۆهیمیای لەخۆ گرتبوو، ئەوانیش ئەو دووناوچە سەرەکیەن کە ئیمرۆ بە چیکیا ناودەبرێن. لەسەرەتاکانی سەدەی دەیەمدا مەجەرییەکان ئیمپراتۆریەتی مۆراڤیایان داگیر کرد ونزیکەی هەزار ساڵ حوکمی سلۆڤاکیایان کردووە، دەسەلاتەکانیان تادامەزراندنی ئیمپراتۆریەتی خێزانی هابسبێرگی نەمسا– مەجەر لەساڵی ١٨٦٧ ی خایاندووە.

دوای تێکشکاندنی ئیمپراتۆریەتی نەمسا – مەجەر لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا، ئیمپراتۆریەتی ناوبرا بوو بەچەند بەشێکە و لەچەند ولاتۆچکەیەکی بچوك پێك هات، لەوانە ولاتی چیکۆسلۆڤاکیا لەلایەن هەردوو هۆزی سلۆڤاك وچیکییەکانەوە لە ٢٨ / ١٠ / ١٩١٨ دامەزرێنرا. بەلام چیکییەکان توانیان دەسەلات وحوکمی ولات بگرنە دەست چونکە زۆر لەسلۆڤاکییەکان خوێندەوارتر وکارامەتر بوون وسلۆڤاکییەکان خۆیانیان لەدەرەوەی بازنەی دەسەلاتدا بەدیکرد. بەهۆی بوونی چەند کەمایەتییەکی دیکەش لەنێو ولاتدا بەتایبەتی ئەڵمانەکانی سۆریتیدلاند، ولات هێندەی کەش دووچاری ململانێی سیاسی بوو بوو، بەلام چیکۆسلۆڤاکیا زۆر بەدیموکراسیانە حوکمی دەکردن تا ئەو کاتەی نازیەکان لەساڵەکانی ١٩٣٨ و ١٩٣٩ داگیریان کرد.

لەساڵی ١٩٤٥ دا بەهۆی سوپای سوورەوە چیکۆسلۆڤاکیا ئازاد کرا تاکو ببێتە یەکێك لەو ولاتانەی لە گەردوونی یەکێتی سۆڤیەتدان. دوای داگیر کردنی چیکۆسلۆڤاکیا لەلایەن یەکێتی سۆڤیەتەوە ساڵی ١٩٦٧ و واژۆ کردنی رێکەوتننامەی" براغ" ، چیك وسلاڤییەکان لەدوژمنایەتییەکی بەردەوامی هەموو شتێکی رووسەکاندا بوون، تەنانەت زمانەکەشیان کە لە خوێندنگاکاندا بە زۆرە ملێ دەخوێندرا.

دوا ئەو زنجیرە تێکشکاندنانەی بەسەر ئەو دەوڵەتە شیوعییەکاندا هات، کە لەساڵی ١٩٨٩

دەستی پێکرد، چیکۆسلۆڤاکیا توانی حکومەتێکی میللی نا شیوعی پێك بهێنێت، توانی ببێتە کۆمارێکی پەرلەمانی تا لەساڵی ١٩٩٢ دا چەند گۆڕانکارییەکی سیاسی وکۆمەڵایەتی چیکۆسلۆڤاکیای کردە وڵاتێکی دیموکراسی وفرە حیزبی، و لەپاشدا هەردوو ویلایەت بوونە دوو وڵاتی سەربەخۆ: کۆماری چیك ، کۆماری سلۆڤاکیا.

لە ١ / ١ / ١٩٩٣ دا کۆماری سلۆڤاکی دامەزرا، پەرلەمانی سلۆڤاکی میشال کۆڤاکی بەسەرۆکی نوێی وڵات هەڵبژارد. دوای ئەو رۆدلف شۆستەر ( ٦٥ ساڵ ) پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست، بەڵام لە ١ / ٧ / ٢٠٠٠ دا بەهۆی خراپی باری تەندرووستییەوە دەستی لەکار کێشایەوە و سەرۆکی پەرلەمانی سلۆڤاکیا جۆزیف میگاس بەشێوەیەکی کاتی دەسەڵاتی گرتە دەست. لە بەرواری ١٩ / ١ / ١٩٩٣ دا سلۆڤاکیا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککرتوەکان.

سلۆڤاکیا بەدرێژایی مێژوو وڵاتێکی کشتوکاڵی بووە، بەڵام لەسەردەمی شیوعیدا پیشە سازی رووی کردۆتە ئەو وڵاتە. دوای ئەوە وڵات پەیڕەوی ئابووری ئازادی کردووە چەندین دەزگای تایبەتی پیشەسازی لێ دامەزراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا وڵات دووچاری چەندین کێشەی ئابووری وبێکاری بۆتەوە.

سلۆڤاکیا بەو بینا وقەڵا دێرینانەوە بەناوبانگە کە باس لە چۆنێتی ژیانی ئەو سەردەمە زوانەی ئەورووپا دەکات وزۆربەی ئەو جێیانەش ئێستا کراونەتە مۆزەخانە. بەڵام بەهۆی لاوازی ژێرخانی گەشتوگوزارەوە چالاکییە گەشتوگوزارییەکان پەرەسەندنێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینیوە.

سلۆڤاکیا بە چارەسەرگە سروشتییەکان بەناوبانگە، وەك چارەسەرگەی بیشتنی کە دەکەوێتە باشووری وڵات، بەیەکێك لەناوچە بەپیتەکانی جیهان دادەنرێت لە کانە کانزاییەکانی قوڕ وگۆگرد.

لەهاوینی ساڵی ٢٠٠٢ دا سلۆڤاکیا دووچاری چەند لافاوێکی بەهێز بۆوە بەهۆی بارانە زۆرەکانی ناوەڕاستی ئەورووپا، چەندین کوژراو وبریندار بەدوای خۆیدا بەجێ هێشت جگە لەوێرانکاریەکی زۆر بەدامودەزگاکانی ئەو وڵاتە.

سروودی نیشتیمان: گەردەلوول بەسەر تاتراوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١١,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٥.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,٢٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٦.

## سلۆڤینیا

**ناوی باو:** سلۆڤینیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری سلۆڤینیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Slovenia

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی وڵات ( ٤٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٩٠ ئەندام )

**ڕووبەر:** ٧,٨٢٠ میل دووجا، ٢٠,٢٥٥ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٠٥١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٩ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٩٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** سلۆڤینی، سرپی کرواتی، بۆسنی، مەجەڕی.

**ئایین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، کڵێسەی سلۆڤانی دێرین، کڵێسەی ڕۆژهەڵاتی ئەرتۆدۆکس).

**پایتەخت:** لۆبلیانا.

**شارە سەرەکییەکان:** ماریبۆر، سیلجی، کرانج، کۆبیر.

**دراو:** تولار.

**ئاو وهەوا:** کیشوەری لەناو وڵاتدا، هاوینی گەرمە وزستانی ساردە، مام ناوەندە لەناوچە گەشتوگوزارییەکان.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** سێو، مانگا، گێلاس، گەنمە شامی، مەڕومالات، چەوەندەری شەکر، گەنم.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئۆتۆمبێل، درووست کراوە کیمیاییەکان، چنین، کەلوپەلی ناومال.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، قوڕقوشم، جیوە، زیو، زنك.

### تێڕوانینێکی گشتی:

سلۆڤینیا وڵاتێکی شاخاوی بچوکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەورووپا، ئەمسا دەکەوێتە

باکووری، هەنگاریا ( مەجەڕ ) دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی وکرواتیا دەکەوێتە باشووری. دەریای ئەدریاتیکی وئیتالیا دەکەونە ڕۆژئاوای. کەنارێکی کورتی لەسەر دەریای ئەدریاتیکییە و شارۆچکە وبەندەری کوبیری تێدەکەوێت کە نزیکەی ٢١ کم لەباشووری بەندەری تریستای ئیتالیەوە دوورە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٥ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی ٤٦ بەرەو باکوور.

زۆربەی تەختی سلۆڤینیا شاخاوییە ودارستانەکانیش نیوە ڕووبەری ولات دادەپۆشێ. لەگۆشەی باکووری ڕۆژئاوای سلۆڤینیا زنجیرە چیاکانی ئەلبی بۆلیانی درێژ دەبێتەوە، بەلام دەشتەکان کەهەندێ گردی لەخۆ گرتووە دەکەوێتە ناوەڕاست ورۆژهەلاتی ولاتەوە.

لەناوەڕاستی ولاتدا ناوچەیەکی بەردەلانی کلسی ( کارستی ) تێدەکەوێت بەرەو ئەشکەوتەکانی نێو زەوییەکان قوولْ دەبێتەوە، درێژترینیان زیاتر لە ٢٣ کم دەبێت و بەدرێژترین ئەشکەوتەکانی جیهان دادەنرێت. ئەشکەوتەکان پڕ لە بەرزایی ونزمایییەکانە ( ستکمەلایت و ستاکتەلایت ) وهەندێکی ڕووەکی زۆر دەگمەنی لێ ڕواوە، جگە لەوەی چەند دەریاچەیەکی لە ئاوی بارانەکانی نێو ئەشکەوتەکان پێك هێناوە، ئەمەش بەناوچەیەکی گرنگی گەشتوگوزاری دادەنرێت.

گەلی لۆمبارد لەسەدەی شەشەمدا لەو ناوچەیەدا ژیاون، لەکۆتاییەکانی هەمان سەدەدا سلاڤییەکانی باشوور هاتونەتە ناوچەکە وتیایدا نیشتەجێ بوون وناوی ولاتەکەش لەوانەوە هاتووە. دوای ئەوان میللەتێك بەناوی ئەفارییەکان حوکمی ناوچەکەیان کردووە، تا لەساڵی ٦٢٣ دا کەسێك بەناوی ساموا ئافارییەکانی کردۆتە دەرەوە وولاتی سلۆڤینیای سەربەخۆی دامەزراندووە. لەساڵی ٧٤٨ دا سلاڤییەکان کەوتونەتە ژێر دەسەلاتی باڤارییەکان. لەساڵی ١٢٧٨ دا خێزانی هابسبێرگی نەمسا – سلۆڤینی حوکمی ناوچەکەیان کردووە، ولاتەکە لەژێر دەسەلاتی نەمساییەکاندا تا لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا ماتەوە، جگە لەماوەیەکی زۆر کەم نەبێ فەرەنسیەکان دەسەلاتی سلۆڤینیایان گرتۆتە دەست.

لەبەرواری ٢٩ / ١٠ / ١٩١٨ دا هەر یەك لەهەرێمەکانی سلۆڤینیا وکرواتیا وسربیا لەئیمپراتۆریەتی نەمسا – مەجەڕ سەربەخۆ بوون، دوای تێکشکاندنی ئیمپراتۆریەتی ناوبراو لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا، شانشینی سلۆڤینیا و سربیا و کرواتیان لە ١ / ١٢ / ١٩١٨ پێك هێنا، کە لەساڵی ١٩٢٩ دا ناوی بووە یۆگۆسلاڤیا. لەدوای جەنگی جیهانیی دووەم یۆگۆسلاڤیا بووە ولاتیکی یەکگرتوو ولەشەش کۆمار پێك هاتبوو سلۆڤینیا یەکێك بوو لەو کۆمارانە، شیوعێکان دەسەلاتیان گرتبۆوە دەست.

سلۆڤینییەکان چەند جارێك هەوڵی جیابوونەوەیان لە یۆگۆسلافیا داوە، بەلام ئەم

هەولانەیان تا روخانی یەکێتی سۆڤیەت لە ئەوروپادا لەساڵی ۱۹۹۰ و هەڵوەشانەوەی یەکێتی یۆگۆسلاڤیا نەهاتۆتە دی.

لەبەرواری ۲۵ / ٦ / ۱۹۹۱ دا سلۆڤینیا سەربەخۆیی خۆی لە یۆگۆسلافیا راگەیاند (هەموو ساڵێك لە ۲۵ / ٦ دا جەژنی نیشتیمانی دەگێردرێت)، بەلام حکومەتی یۆگۆسلاڤیا زۆر بەتوندی دژی ئەم راگەیاندنە وەستایەوە، چەند شەڕێك لەنێوانی میلیشیا سلۆڤینییەکان وسوپای یۆگۆسلاڤیا هەڵگیرسا، لە ۱۰ / ۷ / ۱۹۹۱ دا پەرلەمانی سلۆڤینیا سەربەخۆیی لەیۆگۆسلاڤیا پەسەند کرد. لە ۲۲ / ٥ / ۱۹۹۲ دا پەیوەندی کرددو بەنەتەوە یەککرتوەکانەوە.

دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی یۆگۆسلاڤیا لەساڵی ۱۹۹۱ و دامەزراندنی هەردوو ولاتی سلۆڤینیا وکرواتیا، کێشە سنوورییەکانی نێوان هەردوو ولاتی ناوبراو لەسەر ناوچەی دەریای ئەدریاتیکی دەستی پێکرد، کێشەکانی نێوانیان چارەسەر نەکرا، هەر یەك لەو دوو ولاتە یەکتر بەوە تاوانبار دەکەن دەستدرێژی کردبێتە سەر ئاوە هەرێمییەکانی یەکتر، بۆیە هەردوولا بەپێویستی دەزانن کێشەکەیان رەوانەی دادگای نێودەوڵەتی بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو ویەکلایی کەر.

ئابووری سلۆڤینیان لەئابووری هەر شەش ولاتەکەی یۆگۆسلاڤیا بەهێزتر بوو، هەروەها دانیشتوانەکەشی لەدانیشتوانی پێنج ولاتەکەی تر دەوڵەمەندتر بوون، جگە لەوەی ولاتەکەیان لەوانی دی پێشکەوتووتربوو. دوای جیابوونەوە ئارامی وئاشتییەکی بێ وێنەی بەخۆوە بینی لەچاو ئەواندا، لەکاتێکدا باری ئابووری ئەوان بەرەو رمان وتێکشکان بەرێ دەکەوت، سلۆڤینیا بەهێمنی بەرەو ئابووری بازارە ئازادەکان دەچوو. زۆربەی دانیشتوانی ولاتی سلۆڤینیا جگە لەزمانی سلۆڤینی هەردوو زمانی کرواتی وسرپیش دەزانن جگە لەوەی هەندێ لەدانیشتوانەکان زمانی ئەڵمانیش دەزانن کەلەلایەن سلۆڤینییەکانەوە بەزمانی رۆشنبیری وخوێندەواران لەقەڵەم دەدرێت.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٤,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ۷۱ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ۷,۱٤۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٤۳ .

## سەنگافورە

**ناوی باو:** سەنگافورە

**ناوی فەرمی:** كۆماری سەنگافورە

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Singapore

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پارلەمان ( ٨٧ ئەندام )

**ڕووبەر:** ٢٤٩,٥ میل دووجا، ٦٤٦,١ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣,٥٠٠,٠٠٠ كەس ( تا ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٤,٩٠٠ كەس/كم٢ ( یەكێكە لەوڵاتە زۆر چڕەكانی جیهان لەرووی دانیشتوانەوە).

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** چینی ٧٧ ٪ ، مالیزی ١٤ ٪ ، هیندی ئاسیا ٧ ٪ ، ئەندەنوسی ، ئەوروپی.

**ئاین:** بوودی، تاویی، موسڵمان ١٨ ٪ ی دانیشتوان، مەسیحی، هیندۆس، بێ ئاین.

**زمان:** چینی، مالیزی، تامیلی، ئینگلیزی، هیندی.

**پایتەخت:** سەنگافورە.

**شارە سەرەكییەكان:** —

**دراو:** دۆلاری سەنگافورە

**ئاو وهەوا:** سەنگافورە نزیكەی ١٣٩ كم لەباكووری هێڵی یەكسانەوە دوورە، بۆیە ئاو وهەوای گەرم وشێدارە بەدرێژایی ساڵ، ڕێژەی شێ لەنێوان ٦٤ – ٦٦ ٪ دەبێت، پلەكانی گەرما ٢٤ بۆ ٣٥ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی باران ٢٤٠ سم.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** بەخێوكردنی بەراز، پەلەوەر، سەوزە ومیوە، ئەركید.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** ئامێری كارەبایی، ئامێری ئەلكترۆنی وەك كۆمپیوتەر...هتد، ئامێرەكانی پەیوەندی، دروست كردنی كەشتی وچاككردنەوەی، بەرهەمەكانی پیترۆڵ، پۆشاك، لاستیك، داروتەختە.

**سامانی كانزایی:** گرانێت.

**تێڕوانینێكی گشتی:**

سەنگافورە وڵاتێكە لەباشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا ورووبەرێكی بچوكی هەیە، دەكەوێتە ئەو پەڕی باشووری نیمچە دورگەی مەلایۆ، لەشوێنی بەیەك گەیشتنی دەریای چینی باشوور لەگەڵ زەریای هیندی. بەشی ڕۆژئاوای مالیزیا دەكەوێتە باكووری و تەنگەی جەوهەر كە

پانتایەكەی ٧٠٠ مەتر دەبێت لەیەكیان جیادەكاتەوە وبەهێڵێكی ئاسن ورێگایەكی زەمینی بەیەكەوە بەستراونەتەوە. دورگەی سومترەی ئەندەنوسی دەكەوێتە رۆژئاوای تەنگەی مەلقا لەیەكیان جیادەكاتەوە.

سەنگافورە لەیەك دورگەی گەورە پێك هاتووە ئەویش دورگەی سەنگافورەیە، رووبەرەكەی ٥٧٣ كم$^{2}$ دەبێت و درێژیەكەی ٤٠ كم وپانیەكەی ٢٠ كم دەبێت، سەنگافورەی پایتەختیش دەكەوێتە هەمان دورگە، هەروەها ٥٨ دورگەی بچوكیشی لەخۆی گرتووە تێكڕای رووبەریان ٧٣ كم$^{2}$ دەبێت، نیوەیان زیاتر نیشتەجێ نەكراون، درێژی تەواوی كەنارە دەریاییەكانی ١٥٠ كم زیاتر نابێت، ناوەڕاستی سەنگافورە دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ١٠٣/٥١ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ١/١٧ بەرەو باكوور.

زۆربەی زەوییەكانی سەنگافورە دەكەوێتە سەر ئاستی رووی دەریا ولوتكەی تیماهیل كە بەرزییەكەی دەگاتە ١٧٧ مەتر بەبەرزترین خاڵی ئەو ولاتە دادەنرێت ورێك دەكەوێتە ناوەڕاستی دورگەی سەنگافورە. چالاكیە مرۆییەكان سروشتی زەوییەكانی دورگەكەیان گۆڕیوە، نزیكەی ٥٠ ٪ بۆ بیناسازی تەرخان كراوە، ٤٠ ٪ ی بۆ ناوچە كراوەكان، جوتیارەكانیش تەنها رێژەی ٢ ٪ بۆ چالاكییە كشتوكاڵیەكان تەرخان كراوە، شایەنی باسە چالاكییە كشتوكاڵیەكانی ئەو ناوچەیە بە تەكنیكێكی زۆر لێهاتوانە بەگەڕ خراوە، جوتیاران لەپێناوی زیاد كردنی بەرهەمەكانیان لە دەفری شووشەدا كشتوكاڵی دەكەن.

سەنگافورە دوایین ناوی ئەو دورگەیەیە، دورگەكە چەند ناوێكی لەوەو پێش بەخۆوە بینیوە، لەوانە: تیماسیك، كە ناوێكی مالیزییە وبەمانای شاری دەریا دێت، هەروەها ناوی تان ماهی، تان ماسیك، مالی، پۆر، بۆلۆ شنگ، شیان لێناوە. بەلام ناوی سەنگافورە لە دوای سەدەی نۆزدەیەمەوە بەكارهات، لەزمانی سنسكریتی دێرینەوە هاتووە وبەمانای شاری شێر دێت.

لەسەدەی سیانزدەیەم وچواردەیەمدا سەنگافورە سەنتەرێكی بازرگانی زۆر گرنگ بووە. لەساڵی ١٨١٩ دا سوڵتانی ناوچەی جۆهار بەرێكەوتن لەگەڵ سوڵتانی مالیزیا دەستیان لەو ناوچەیە هەڵگرتووە بۆ سێر ستامفۆرد رافیلس، كە نوێنەری كۆمپانیای هیندی رۆژهەلاتی بەریتانی بووە. لەساڵی ١٨٢٤ دا بووە موڵكێكی تایبەتی كۆمپانیای ناوبراو. لەساڵی ١٨٥٨ دا بەشێوەیەكی راستەوخۆ كەوتۆتە ژێر دەستی بەریتانیاوە، لەساڵی ١٨٦٧ دا بۆتە داگیركراوەیەكی بەریتانی. لەو ماوەیەدا دانیشتوانەكانی سەنگافورە زۆربەیان لەو ئیسلامانە بوون كە بەرەچەڵەك مالیزی بوون ورێژەی ٨٥ ٪ ی دانیشتوان دەبوون، دوای ئەوە بەریتانیا دەروازەكانی ولاتی لەبەردەم بەرهەمهێنەرە بیانییەكاندا كردەوە ولەوەوە سەنگافورە بووە دەربەندێكی كراوە وناوچەكە ئابوورییەكی ئازادی هەبووە. بۆیە بەهەزارەها پیاوانی كار

لەهیند وچینەوە ئەندەنوسیاوە بەرەو سەنگافورە رۆیشتن وبوونە دانیشتوانە سەرەکییەکانی ولأت وتوانیان بەسەر دانیشتوانە سەرەکییەکان ( مەلایۆ ) زاڵ بن وئەو پێکهاتەیەش تا ئێستا وەك خۆیەتی، لەساڵی ١٩٥٨ دا دەستوورێکی نوێ بەشێوەیەك دارێژراوە کەلەگەڵ ئەو پێکهاتەیەدا بگونجێ.

لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا لەنێوان ساڵەکانی ١٩٤٢ – ١٩٤٥ یابانیەکان ناوچەکەیان داگیرکردووە ناویان ناوە سیۆنان، بەواتای خۆری باشوور، یان رووناکی باشوور دێت. لەساڵی ١٩٤٦ دا بۆتە داگیرکراوەیەکی سەربەخۆی سەر بەتاجی بەریتانی. لەبەرواری ٣ / ٦ / ١٩٥٩ سەنگافورە مافی ئۆتۆنۆمی پێ بەخشراوە بەلأم کاروباری دەرەوە وبەرگری بەدەست بەریتانیاوە ماوەتەوە. لە ١٦ / ٩ / ١٩٦٣ سەنگافورە پەیوەندی کردوە بەیەکێتی مالیزیاوە، بەلأم ئەو یەکێتیە شکستی هێنا وبەیەکگرتنێکی تێکشکاو ناوبرا، چونکە هیچ کام لەو تایبەتمەندییە ئابووریانەی بەدەست نەهێنا کەچاوەڕوانی لێوە دەکرا بۆیە لە ٩ / ٨ / ١٩٦٥ لەیەکێتی مالیزیا کشایەوە وبۆ رۆژی دوایی سەربەخۆیی تەواوی خۆی راگەیاند. ئەو رۆژەش بووە رۆژی نیشتیمانی ولأت لەچوارچێوەی کۆمۆنۆلتی بەریتانی، لە ٢١ / ٩ / ١٩٦٥داپەیوەندی کردووە بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە. لەساڵی ١٩٧١ دا دوایین هێزە بەریتانییەکان لەسەنگافورە کشاونەتەوە، لەکاتێکدا سەنگافورە پەیوەندی کردووە بە هاوپەیمانێتی بەرگرییەکی نوێ هەر یەك لە ئۆستورالیا ومالیزیا ونیوزیلاند وبەریتانیای لەخۆی گرتبوو.

لەبەرواری ٢٩ / ٨ /١٩٩٣، دەستکرا بەهەڵبژاردنی یەکەم سەرۆکی ولأت: تنگ جۆنگ ئۆنگ. دوای ئەو لە ١٥ / ٧ / ١٩٩٩ دا پەرلەمانی سەنگافورە سیلایان راما ناتان بۆ ماوە شەش ساڵ بەسەرۆکی ولأت هەڵبژێردرا. شایەنی باسە ناتان ( ٧٥ ساڵ ) بە تەزکیە هەڵبژێردرا نەك بە دەنگدان، چونکە تەنها ئەم بوو هەموو مەرجەکانی سەرۆکایەتی لەخۆ گرتبوو وەك کارگێری وئەزمونی بەڕێوەبردن، ناتان خۆی بە پیاوی گەل وەسف کرد. شایەنی باسە دەسەلأتەکانی سەرۆکی ولأت زۆر سنووردارە، دەسەلأتی فیعلی بەدەست سەرۆکی وەزیرانە. سەرۆکی وەزیران لەکاتی سەربەخۆیی سەنگافورە: لی کوان یو، سەرکردەی مێژوویی سەنگافورە، یان باوکی سەنگافورە نوێ کە سەنگافورەی لەولأتانی جیهانی سێهەمەوە گواستەوە بۆ ولأتانی جیهانی یەکەم، لی کوان یو روانگەی وا بوو کەبەگەڕ خستنی توانای داهێنانی هاولأتی بەشێوەیەکی راست وتەندروستی دەتوانێ جێگەی سامانە سروشتییەکان بگرێتەوە وبەبنەمایەکی پتەوی دادەنا کەولأتیکی نموونەیی بخولقێنێ. لی کوان یو لەخاڵی سفرەوە دەستی کرد بەبنیات نانی سەنگافورە کەلەهەڕەتی کێشە وململانێ سیاسی وئاینییەکاندا بوو. لەساڵی ١٩٩٠ دا دەسەلأتی سەرۆك وەزیران بە:

گۆ تشۆك تونگ سپێردرا.

لەراستیدا سەنگافورە بەر لەسەربەخۆیی جگە لەوڵاتیکی بازرگانی هیچی کەنەبوو، بەڵام لەشەستەکانی سەدەی بیستەمەوە گەشەکردنێکی ئابووری وسەنتەرێکی پیشەسازی ودارایی بەرچاوی بەخۆوە بینی، ئەمە لەگەڵ ئەوەی سامانە سروشتییەکان لەو وڵاتەدا زۆر کەمە وپیشەسازی پشتی تەواوی بەو ماددانە بەستووە کەلەدەرەوەی وڵاتەوە دەیانهێنێتە ناو وڵاتەکەی. ئەمە جگە لەوەی حکومەت هەوڵی هاندانی چالاکییە گەشتوگوزاریەکانیشی داوە کەئەمەش سەرچاوەیەکی داهاتی باشی بۆ سەنگافورە مسۆگەر کردووە.

دروشمی بەردەوامی سەنگافورە سەرکەوتنە بۆ پلەی یەکەم وپارێزگاری لێکردنێتی. بۆگەیشتنیشی بەم پلەیە چەند رێگایەکی گرتۆتە بەر، لەوانە کۆتایی هێنان بە پەخشی تەلەفزیۆن پێش نیوەی شەو، چونکە لەروانگەی حکومەتدا شەو بۆ خەوتن وحەوانەوەیە نەك بۆ ئێشکگرتن وشەونخوونی، دەبێ خەڵکی بەیانیان زۆر زوو لەخەو هەڵستن، ئەمەش توانیویەتی خەرجی ساڵانەی تاکی سەنگافورە بگەیەنێتە ٢٤ هەزار دۆلاری ئەمریکی لەساڵێکدا. هەروەها حکومەت خوێندی زمانی ئینگلیزی لەتەواوی قۆناغەکانی خوێندندا بەزۆرە ملی کردووە وبەیەکێك لەچوار زمانە فەرمییەکەی وڵاتی داناوە ( چینی ، مالیزی، تامیلی، هیندی ) بەمەش توانیویەتی تەوای گەل یەك زمان بکات لەگەڵ ئەوەی بەچەند زمانێك قسە دەکەن. هەرچەندە لەم دواییەدا چەند گفتوگۆیەك لەسەر شێوازی خوێندن وچڕی دانیشتوان بابەتەکانی قوتابیان کراوە، بۆیە حکومەت هەستاوە بە کەم کردنەوەی بابەتی ماددەکانیان بەرێژەی ٣٠ ٪ .

کەمی ئاوی خواردنەوە لە سەنگافورە کێشەیەکی گەورەی دروست کردووە، سەنگافورە لە مالیزیای دراوسێیەوە لەرێی بۆریەکانەوە دەهێنێتە ناو وڵاتەکەیەوە. بۆ کەم کردنەوەی ئەو کێشەیەش حکومەت لەهەوڵی دروستکردنی چەند پاڵاوتەیەکی گەورە وپێك هێنانی سەنتەرێکی تەندرووستی یە تاکو ئاوی دەریای پێ پاکژ بکاتەوە بەمەش پشت بەستنی بەمالیزیا بۆ ئەم مەبەستە کەم دەکاتەوە.

بایەخ دانیش بەهونەر لەسەنگافورە پێگەی خۆی هەیە، حکومەت کاری کردووە بۆ بیناکردنی گەلەرێك هیچی لە گەلەری ئۆپرای سیدنی لەئوستورالیا کەمتر نییە.

سروودی نیشتیمان: بۆ پێشەوە ئەی گەلی سەنگافورە.

تێکرای دلهاتی نەتەوەیی: ٦٥,٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٣٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٣,٣٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣ .

## سەنگال

**ناوی باو:** سەنگال

**ناوی فەرمی:** کۆماری سەنگال

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Senegal

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٠ ئەندام )

**ڕووبەر:** ٧٥,٩٥١ میل دووجا، ١٩٦,٧١٢ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٩,٤٠٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٤٧,٨ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش: کە لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن، گرنگترینیان: ولۆف ، سیریر.

**ئاین:** موسڵمان ٩٢ ٪ ، مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك ) ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** فەرەنسی، عەرەبی.

**پایتەخت:** داکار.

**شارە سەرەکییەکان:** سان لویس، تییس، زیجینشور، کوالاك، تۆبا.

**دراو:** فرانکی سەنگالی.

**ئــاو وهــەوا:** خولگــەیی، نێوەنــدی پلــەکانی گــەرما لەکــەنار ٢٢ پلــەی ســەدی ولەناوچــە ناوخۆییەکاندا بۆ ٢٩ پلەی سەدی بەرز دەبێتەوە. بارانەکان لەهاویندا دەبارێت ولەباشووردا لە ١٥٠ سم بۆ ١٨٠ سم لەساڵێکدا، کەمتر بەرەو باکوور دەبارێت تا دەگاتە کەمتر لە ٥٠ سم لە نزیك ڕوباری سەنگال.

**بەرهەمــە کــشتوکاڵیەکان:** بستەی عەبیــد، هــەرزن، منیهۆت، لۆکە، پەلەوەر، برنج، سەوزە ومیوە، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** لەنەوت وەرگیراوەکان، دروستکراوەکانی خۆراك.

**سامانی کانزایی:** فۆسفات، بۆکسیت، خوێ، گاز، ئاسن، مس.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

سەنگال وڵاتیکی ئیسلامیە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەفەریقیا، مۆریتانیا دەکەوێتە باکووری،

مالی دەکەوێتە رۆژهەلاتی، گینیا وگینیابیساو دەکەنە باشووری، زەریای ئەتلەسی دەکەوێتە رۆژئاوای، ولاتی گامبیا بەناوەراستیدا تێپەڕ دەبێت. ناوەراستی سەنگال دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ١٤ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێلی پانی ١٤ بەرەو باکوور.

کەناری سەنگال لەسەر زەریای ئەتلەسی بەماوەی ٥٠٠ کم درێژ دەبێتەوە وزۆربەشی بەلم داپۆشراوە، لەو کەنارەشەوە دەشتە لوولپیچەکان بەرەو بەشە ناوخۆییەکانی ولات درێژ دەبنەوە. زنجیرە چیاکانی فوتاگالون دەکەونە باشووری رۆژهەلاتی سەنگال بەدرێژایی سنوورەکانی لەگەڵ گینیادا. سەنگال لە مۆریتانیای دراوسێی بەهۆی روباری سەنگالەوە جیابۆتەوە.

سەنگال نیشتیمانی رەسەنی ئەفەریقییەکانە لەماوەی پێش مێژووەوە. لەنێوان سەدەکانی چواردەیەم وشانزدەیەمی زاییندا ئیمپراتۆریەتە ئەفریقییەکانی پێشوو: ئیمپراتۆریەتی گانا وشانشینی مالی ودەولەتی سنغی ناوچە رۆژهەلاتیەکانی سەنگالیان داگیر کردووە. لەسەدەی پانزدەیەمی زاییندا لەسەر دەستی بازرگانی ناوچە دراوسێکان ئاینی ئیسلام گەیشتۆتە ناوچەکە، بەتایبەتی بازرگانە مەغریبییەکان.

پۆرتۆگالیەکان لەکۆتایی سەدەی پانزدەیەمدا گەیشتونەتە کەنارەکانی، لەماوەی سەدەی حەڤدەیەمدا فەرەنسییەکان چەند ویستگەیەکی بازرگانیان لێ سازداوە، لەپاشان هەر یەك لە ئینگلتەرا وفەرەنسا وهۆلەندا لەسەر داگیرکردنی ویستگەکان بەشەڕ هاتوون. دەسەلاتی فەرەنسی لەناوچەکەدا بایی ئەوەندە زیادی کردووە، لە ١٨٩٥ دا بۆتە بەشێك لەیەکێتی فیدرالی فەرەنسی ناوبراو بە یەکێتی رۆژئاوای ئەفریقی فەرەنسی، دواجار بۆتە پایتەختی ئەو یەکێتییە. سەنگالییەکان داوای سەربەخۆییان لە فەرەنسا دەکرد، تا لە ١٩٥٦ دا دەسەلاتە سیاسییەکانیان گرتۆتەوە دەست. لەهەمان سالدا هەر یەك لەسەنگال وسودانی فەرەنسی ( مالی ئێستا ) یەکیان گرت و یەکێتی مالیان پێك هێنا. بەلام دوای دوو سال یەکێتییەکە هەلوەشایەوە بەهۆی راگەیاندنی مالی لەسەربەخۆیی خۆی ، لەپاشدا سەنگالیش سەربەخۆیی خۆی لەفەرەنسا لە ٢٠ / ٨ / ١٩٦٠ دا راگەیاند ولەیەکێتی ناوبراو کشایەوە وکۆماری سەربەخۆی سەنگال راگەیەنرا ولەهەمان سالدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. ولات ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی لە ٢٠ / ٨ / ی هەموو سالێك دەگێڕێ.

یەکەم سەرۆکی ولات دوای سەربەخۆیی: لیۆبۆلد سیدار سەنگور، دوای ئەو لەسالی ١٩٨١ عەبدە زیووف. لەبەرواری ١٩ / ٣ / ٢٠٠٠ دا هەلبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بەڕێوە چوو و عەبدوالله واد ( ٧٤ سال ) سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سێهەمین سەرۆکی ولات دوای سەربەخۆیی.

لەساڵی ١٩٨٢ دا گامبیا وسەنگال یەکێتیەکی فیدرالیان بەناوی سەنگامبیا پێك هێنا بۆ پتەو کردنی باری ئابووری هەردوو وڵاتی دراوسێ، جگە لەیەکخستنی هێزە چەکدارەکانیان. بەڵام یەکێتی ناوبراو لەساڵی ١٩٨٨ دا هەڵوەشایەوە.

لەکۆتاییەکانی ١٩٩٩ دا حکومەتی سەنگالی لەگەڵ یاخی بووانی بزوتنەوەی دیموکراسی سەنگالی رێکەوتننامەیەکیان واژۆ کرد بۆ راگرتنی دەست بەجێی شەڕی نێوانیان کە لە ٢٦ / ١٢ / ١٩٨٢ بەدواوە رۆژانە شەڕ وپێکدادان لەنێوان بزوتنەوەی ناوبراو وهێزە حکومیەکان بەردەوام بوو، مەڵبەندی سەرەکی بزوتنەوەکە لە کازامنسی باشووری وڵات بوو.

سەنگال ناوی وڵاتی لە روباری سەنگالەوە وەرگرتووە وبەکارهێنانی ئەو ناوە لە سەدەی نۆزدەیەمەوە دەستی پێکردووە. وشەی سەنگال لە وشەی: زیناگا یان سینهادا وە وەرگیراوە کە بەربەرە بیابیانییەکان دەوترێ. هەندێکی کەش دەڵێن وشەی سەنگال لە وشەی سۆنۆگالەوە وەرگیراوە کە بەزمانی خێلەکانی ولۆفەوە بەمانای: کەشتیەکانمان دێت.

سەنگال بەوڵاتیکی هەژار دادەنرێت، بەڵام لەم دواییانەدا باری ئابووری وڵات لەدوای ١٩٦٠ بەهۆی هێشتنەوەی پەیوەندیەکان بە وڵاتی فەرەنساوە گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی ولەسیاسیەتەکانیدا پەیرەوی سیاسەتی رۆژئاوا دەکات، فەرەنسا یارمەتییەکی دارایی زۆری سەنگال دەدات، جگە لە ناردنی پسپۆرە سەربازییە فەرەنسیەکان بۆ سەنگال.

سەنگال بەپلەی شەشەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی بستەی عەبید دا.

لەبەرواری ٢٢ / ١٢ / ٢٠٠٢ دا دامەزرێنەری وڵاتی سەنگالی نوێ، لیۆبۆلد سیدار سەنگوری سەرۆکی پێشووی وڵات وشاعیر وفەیلەسوف کۆچی دوایی کرد، حکومەتی سەنگالی بۆ ماوەی پانزە رۆژ ماتەمینی نیشتیمانی لەوڵاتدا راگەیاند.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٤،٠٩٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٠٠ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٦١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣٩ .

## سوازیلاند

**ناوی باو:** سوازیلاند

**ناوی فەرمی:** شانشینی سوازیلاند

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Swaziland

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی، شا خۆی سەرۆکی حکومەتە وسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران یارمەتی دەدات.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٣٠ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٥ ئەندام )

**ڕووبەر:** ٦,٧٠٤ میل دووجا، ١٧,٣٦٤ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١,٠٣٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥٩,٣ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش کە لە چەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن، گرنگترینیان ( سوازی، زۆلۆ، تسۆنگا ) ، هیند، پاکستانی، پۆرتۆگالی.

**ئاین:** مەسیحی ( پرۆتستانت، ڕۆمان کاسۆلیك )، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** سوازی، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** دوو پایتەختی هەیە:

- پایتەختی کارگێڕی: ئیمبابان.
- پایتەختی پادشایی: لۆبامبا.

**شارە سەرەکییەکان:** مانزینی، ئەهلا نگاو، بیجز بیك، سیتیلی.

**دراو:** لیلانجی.

**ئاو وهەوا:** چیا ڕۆژئاواییەکان: نێوەندی پلەکانی گەرما ١٦ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی باران ١١٤ سم – ١١٩ سم. بەرزاییە ناوخۆییەکان: نێوەندی پلەکانی گەرما ١٩ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی باران ٧٦ سم – ١١٤ سم. دەشتە ڕۆژهەڵاتیەکان: نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٢ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمە شامی، قامیشی شەکر، لۆکە، برنج، تووتن، چەرەس، پێستە.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان: چیمەنتۆ، پەین، درووستكراوەكانی خۆراك، داروتەختە.**

**سامانی كانزایی: ئەسپستۆس، ئاسن.**

**تێڕوانینێكی گشتی:**

سوازیلاند، جاران پێی وتراوە شانشینی نگوانی، لەپاشدا ئەم ناوەی ئێستای لێنراوە كە بەمانای وڵاتی سوازییەكان دێت، وڵاتیكە دەكەوێتە رۆژهەڵاتی ئەفەریقیا. مۆزامبیق دەكەوێتە رۆژهەڵاتی، باشووری ئەفەریقیا هەر سێلاكەی تری گرتووە، هیچ كەنارێكی نییە. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٣٠ / ٣١ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٠ / ٢٦ بەرەو باشوور.

تەختی وڵاتەكە بریتییە لە زنجیرە چیایەك بەدرێژایی سنووری رۆژئاواكان درێژ دەبنەوە وبەدار سنەوبەرەكان داپۆشراون، ناوەڕاستیشی بریتییە لەبەرزاییە لوولپیچەكان كە گژوگیاییەكی زۆر دایان پۆشیوە. بەڵام رۆژهەڵاتی وڵات بریتییە لەنزماییەكان وگژوگیا دایان پۆشیوە. چیا بەرزەكانی لمبۆبۆ دەكەوێتە سەر سنووری رۆژهەڵاتییەكانی. چوار روبار بەسوازیلاندا تێپەڕ دەبێت ولەبەرەو پیری رۆژهەڵات دەرژێنە نێو زەریای هیندییەوە.

سوازییەكان لەمێژەوە لەناوچەكەدا ژیاون. لەسەدەی هەژدەیەمدا نگوانی دووەم توانی زۆربەی ئەو گەلە ئەفریقییانەی كەلەیەك ناوچەدا ژیاون بكاتەوە بەیەك. لەسییەكانی سەدەی نۆزدەیەمدا بازرگانە بەریتانیەكان و بوێرییەكان لەباشووری ئەفریقیاوە گەیشتونەتە سوازیلاند. لە هەشتاكانی هەمان سەدە ئاڵتون دۆزراوەتەوە، بۆیە بەسەدان گەڕیدە گەیشتونەتە ناوچەكە. لەساڵی ١٨٩٤ دا بەریتانی وبوێرییەكان رێكەوتن لەسەر ئەوەی كۆماری بوێری باشووری ئەفەریقیا دەسەڵاتی سوازیلاند بگرێتە دەست. لەساڵی ١٩٠٢ بەریتانیا دەستی بەسەردا گرتووە. لەساڵی ١٩٦٧ دا سوازیلاند بەڕێوبردنی كاروباری ناوخۆی وڵاتەكەی گرتۆتە دەست. لە ٦/ ٩ / ١٩٦٨ دا سەربەخۆیی تەواوی گرتۆتە دەست ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككرتوەكان.

لەساڵی ١٩٢١ دا سۆبۆزای دووەم كراوەتە شای وڵات، لە ساڵی ١٩٨٢ لەتەمەنی ٨٣ ساڵیدا كۆچی دوایی كردووە، دوای ئەوەی ماوەی ٦٠ ساڵ حوكمی وڵاتی كردووە بەمەش بەخاوەنی درێژترین ماوەی حوكم دادەنرێت لەجیهاندا. ماكۆ سیتیفی كوڕی ( ١٥ ساڵ ) تەختی پادشایی بۆ مایەوە و لەساڵی ١٩٨٦ دا بووە شای وڵات وناونرا شا مسواتی سێهەم. شایەنی باسە ماوەی نێوان ( ١٩٨٢ – ١٩٨٦ ) دایكی ماكۆ شاژن ئەنتۆمبی دەسەڵاتی گرتبۆوە دەست تاكوڕەكەی بوو بە ( ١٨ ساڵ ). بەپێی دابونەریتی وڵاتەكەیان كەرێ بە شا دراوە هەر ساڵی جارێك ژنێك بخوازێ، گەر ئارەزوو بكات، بۆیە شا سۆبۆزای دووەم خاوەنی

٣٦ ژن، هەروەها شا مسواتی کوریشی تا ( ٢٠٠٢ ) خاوەنی دە ژن بوو. بەپێی کۆنترین دابونەریتەکانی ئەو وڵاتە بەسەدان کیژۆڵە بەسنگی رووتەوە لەبەردەمی شا دا سەما دەکەن تاکو دڵی بەیەکێکیاندا بچێت ومارەی بکات.شایەنی باسە لەم دواییانەدا سەندیکاکانی ماف ژنان زۆر بەتوندی نارەزاییان لەم هەڵوێستە وەرگرتووە، بەڵام بەرامبەر بەدابونەریتەکان هیچیان پێناکرێ.

سامانە کانزایی وکشتوکاڵیەکانی ئەو وڵاتە کردویانەتە خاوەنی ئابوورییەکی بەهێز. بەو پێیەی کەخاوەنی جوانترین سروشتی کیشوەری ئەفریقیایە بۆیە پێی دەڵێن سویسرای ئەفریقیا. ئەمەش وایکردووە ساڵانە کۆمەڵێك گەشتیار رووی تێکەن ئەمەش کاریگەرییەکی باشی هەیە بۆ سەر ئابووری ئەو وڵاتە. شایەنی باسە سوازیلاند یەکێکە لەو وڵاتانەی کەئاستی ژیانی ( لەچاو وڵاتە ئەفریقییەکاندا بەرزە) منالان قۆناغەکانی خوێندنی سەرەتایی تەواو دەکەن وبەرەو قۆناغەکانی ناوەندیش بەرێ دەکەون، کەواتە لەزۆر لە وڵاتە ئەفریقییەکان باشترە کە رێژەی بەرزی نەخوێندەواری تیا بەدی دەکرێ.

بەڵام کێشەی سەرەکی ئەو وڵاتە لەو رێژە بەرزەی تووشبوانی نەخۆشی ئایدزە، وەك زۆربەی وڵاتە ئەفریقییەکان، ئەمەش بۆتە هۆی بەرەڵا بوونی ژمارەیەکی زۆری مندالان وبێ لانە بوونیان بەهۆی کۆچی دوایی باوك ودایکیانەوە بەهۆی ئایدزەوە.

جەژنی نیشتیمانی: ٦ / ٩ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٦٨.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٣ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١،١٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٠٦ .

## سودان

**ناوی باو:** سودان

**ناوی فەرمی:** کۆماری سودان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Sudan

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٩٦ ئەندام )

**رووبەر:** ٩٦٦,٧٥٧ میل دووجا، ٢,٥٠٣,٨٩٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣١,٣١٩,٠٠٠ ( تا ساڵی ٢٠٠١ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٤ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، خێڵەکانی دۆڵی نیل.

**ئاین:** موسڵمان ٧٥ ٪ ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ ١٧ ٪ ، مەسیحی ٨ ٪.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** خەرتووم.

**شارە سەرەکییەکان:** ئوم دەرمان، بۆرت سودان، کەسلا، ود مەدەنی، دەنقلا، ملکال، جوبا، ئەلئەبیەز.

**دراو:** دیناری سودانی.

**ئاو وهەوا:** گەرمە بەدرێژایی ساڵ، بارانە وەرزییەکانیش لەهاویندا دەبارێن جگە لەکەناری دەریای سوور نەبێت کە لەوەرزی زستاندا بارانی لێ دەبارێت. باشووری وڵات شێدارە وڕێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ١٥٠ ملم وبەدرێژایی دە مانگ دەبارێت. باکووری وڵاتیش بیابانییە وشکە وبارانەکانی لەساڵێکدا لە ٥ ملم تێناپەڕێت. نێوەندی بارانەکانیش لەناوەڕاستی وڵاتدا ساڵانە دەگاتە ٢٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** لۆکە، برنج، بستەی سودانی، کەنجی، هەرزن، قامیشی شەکر، کەتیرەی عەرەبی ( جۆرێکە لەکەتیرەکان لەدارێك دەردەچێ )، بەخێوکردنی مەڕومالات وحوشتر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین، چیمەنتۆ، پەین، پلاستیك.

**سامانی کانزایی:** پیترۆل، مسن مەنگەنیز، کرۆمیت، ئاڵتون، ئاسن

**تێڕوانینێکی گشتی:**

سودان وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامیە، گەورەترین وڵاتی عەرەبی وئەفریقییە لەرووی رووبەرەوە. میسر دەکەوێتە باکووری، دەریای سوور وئەریتریا وئیسیوپیا دەکەونە

رۆژهـەلاتی، کینیـا وئوگەنـدا و کۆنگـۆی دیموکراسـی دەکەونـە باشـووری، ئـەفریقیای ناوەڕاسـت وچـاد دەکەونـە رۆژئـاوای، لیبیـا دەکەوێتـە بـاکووری رۆژئـاوای. ناوەڕاسـتی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣٠ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ١٢ بەرەو باکوور.

تـەختی سـودانی لـەرۆژئاوا بریتییـە لـەبیابانی لیبیـا، بیابـانی نۆبـە لـە رۆژهـەلات ودۆڵـی تەسـکی نیـل کەوتۆتـە نێوانیانـەوە. ناوەڕاسـتی ولاتـیش لەدەشـتە بەپیتـەکان کـە کێڵگـە وناوچـەی لـەوەڕ ودارستانەکان پێك هـاتووە چیاکانی نۆبـەی باشـوور و چیاکانی کردفـانی ناوەڕاست وچیاکانی دارفۆر لە رۆژئاوا و چیاکانی ئەماتۆنج لەرۆژهەلات وچیاکانی دەریـای سوور رووبەرێکی دیاریکراویان لە سودان داگیر کردووە.

زۆر لەمێژەوە خەڵکی لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون، چونکە سودان بەرێڕەوی باکووری رۆژهـەلاتی کیـشوەری ئەفـەریقیا بـەرەو بەشـە ناوخۆییـەکانی ئـەو کیـشوەرە دادەنرێـت و توانیویەتی – تا ئێستاش – کیشوەرەکە بەتەواوی شارستانیەتە دێرینەکان ببەستێتەوە.

باکووری سودان ولاتی نۆبەی پێك هێنـابوو کە فیرعەونـەکانی میسر داگیریـان کردبوو و ناویان نابوو: کووش. ئاینی مەسیحی لەسەدەی شەشەمی زایینی گەیشتۆتە سودان، بەلام لەسـەردەمی خەلیفـەی ئیسلام عوسمـانی کـوڕی عـەفان لەسـاڵی ٦٤٦ ز م ٢٥ ك گەیـشتۆتە ناوچەکە ولەو سەردەمەوە ئاینی ئیسلام پەیڕەو کراوە.

بەلام لەچاخی نوێدا، محەمەد عەلی پاشا توانیویـەتی لەساڵی ١٨٢٠ – ١٨٢٢ سـودان والا بکات وخستویەتییە سـەر ولاتـی میسر تـا سـاڵی ١٨٨٢. بـەلام لەسـاڵی ١٨٨٣ دا ئەلمەهـدی شۆڕشی لەدژی حکومەتی سودانی میسری راگەیاندووە لەساڵی ١٨٨٥ دا خـەرتوومی داگیر کردووە، بەلام هێزێکی میسری بـەریتانی بەسـەرۆکایەتی کیتشنەر توانی سودان بگرێتـەوە ولەساڵەکانی ١٨٩٩ – ١٩٥٣ کەوتـەوە دەسـت دەسـەلاتی هاوبەشی نێـوان میسرو بـەریتانیا ولـەو سـەردەمەدا سـودان بە نـاوی: سـودانی میـسری بـەریتانی ناسـراوە. لەسـاڵی ١٩٥٣ دا سـودان مـافی ئۆتۆنـۆمی پێبەخـشراوە. لـە ١ / ١ / ١٩٥٦ دا بەتـەواوەتی سـەربەخۆ بـووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککرتوەکان.

سودان لەسەردەمی سـەربەخۆییەوە پـەیڕەوی سیستـەمی دیموکراسـی کردووە، تا فـەریق ئیبراهیم عبـوود کودەتایـەکی سـەربازی بەئـەنجام گەیانـدووە ودەسـەلاتی سـەربازی پـەیڕەو کردووە. دوای ئەو حکومـەتی میللی لەساڵی ١٩٦٤ دا حوکمی ولاتی کردووە. لە ٢٥ / ٥ / ١٩٦٨ دا کودەتایەکی سەربازی بەسەرۆکایەتی عەقید جەعفەر محەمەد ئەلنـەمیری بەئەنجام گەیـەنراوە ونزیکـەی شـانزدە سـاڵ حـوکمی ولاتـی کـردووە. لـەمانگی چـواری ١٩٨٥ راپـەڕینێکی گـەورەی میللـی بـەخۆوە بـینی لـەدژی حکومـەتی ئەلنـەمیری وحکومـەتێکی ئینتیقال بەسەرۆکایەتی موشیر عەبدول رەحمان ( بازنی ئاڵتوون ) لە ( ١٩٨٥ – ١٩٨٦ )

حوكمی ولاتـی گرتۆتـه دەسـت. لەهەڵبژاردنـە گشتییەكاندا سـادق ئەلمەهـدی بەپۆسـتی سـەرۆكی حكومـەت سـەركەوتنی بەدەست هێنـاوە وئەحمـەد ئەلمـەرغینی پۆسـتی سـەرۆكی ولاتـی گرتۆتـە دەسـت. ١٩٨٦ – ١٩٨٩ . لەپاشـدا كودەتایـەكی سـەربازی بەسـەرۆكایەتی فەریق عومـەر حەسـەن ئەلبەشیر ( ٤٥ ساڵ ) بەسـەر حكومـەتی سادق ئەلمەهجی بەئەنجام گەیـەنراو وئەلبەشیر دەسـەڵاتی گرتـە دەسـت. لەكۆتاییـەكانی سـاڵی ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنـە سـەرۆكایەتییەكان بـەڕێوە چـوو، عومـەر حەسـەن ئەلبەشیر بـەكۆی ٨٦,٥ ٪ ی دەنگـەكان سەركەوتنی بەدەست هێنا وبەسەرۆكی ولات هەڵبژێردرا.

لـەدوای كودەتاكـەی سـاڵی ١٩٨٩، سـودان ململانێیـەكی گـەورەی لەسـەر دەسـەڵاتەكان بەخۆوە بینیـوە لـەنێوان پارتـەكانی ولاتـدا، بۆتـە هـۆی ئـەو بارودۆخـە ناهـەموارەی ئێستاش ولات گیری خـواردووە بەدەسـتیەوە، لـەئاكامی ململانێكـان هـەردوو جەمـسەری هاوپـەیمانی لەنێوان سەرۆكی ولات عومـەر حەسـەن ئەلەبەشیر وسـەرۆكی ئەنجومـەنی نیشتیمانی دكتـۆر حەسـەن ئـەلتورابی لێـك جیابوونـەوە. ئـەلتورابی بـەزۆرە ملـیَ نیـشتەجیَ كـراو وتـاوانی پەیوەندی كردنـی لەگەڵ جۆن قەرنـەقی سـەرۆكی ئۆپۆزسیۆنی جیاخوازییـەكانی باشووری سـودانی خرایـە پـاڵ. هەوڵـە نێودەوڵەتییـەكان لـەپێناوی كۆتـایی هێنـان بەكێـشە هەمەلایەنـەكانی سـودان بەردەوامـە بـۆ دۆزینـەوەی چارەسـەرێكی گونجـاو ئاشـتبوونەوەی گشتی لەو ولاتەدا.

* * *

### كێشەی باشووری سودان

كێشەی باشـووری سـودان دەگەڕێتـەوە بـۆ سیاسـەتی چەوتی بـەریتانیا لەدابـەش كردنـی باكوور وباشووری سودان لەسەردەمی داگیركاری بەریتانی بۆ ئەو ولاتە، رەخسـاندنی هـەلی خوێنـدەواری بـۆ رۆڵـەكانی بـاكوور وبـیَ بەشـكردنی باشـوورییەكان لەخزمەتگوزارییـە كۆمەڵایەتییە جیاجیاكـان، ئەنانـەت رێگـە نـەدان بەباشـوورییەكان بەرۆیـشتن بـەرەو بـاكوور ونیـشتەجیَ بـوون لـەو بەشـەی ولاتـی خۆیـان. چانـدنی تـۆوی ركەبەرایـەتی لەنێوانیانـدا، باشوورییە مەسیحییەكان وادەزانن باكوورییە ئیسلامییەكان دەیانـەویَ ناوچەكەیان داگیر بكـەن. یەكـەم برووسـكەی كێـشەكانی نێوانیـان لەسـاڵی ١٩٥٥ دا هەڵگیرسـا، واتـا بـەر لەسەربەخۆیی ولاتی سودان، كاتیَ كەرتێكی سەربازی باشوور یـاخی بـوونی خـۆی راگەیانـد وداوایان لەكۆمەڵی گشتی سودانی كرد كە ناوچەكەیان سـەربەخۆ بكـات لـەكاتی راگەیانـدنی سەربەخۆیی ولاتی سودان لە ١ / ١ ١٩٥٦. كەرتە باشـوورییەكان لـەیاخی بوونیـان بـەردەوام بوون، كار گەیشتە پرۆسە سەربازییەكان وشەڕی پارتیزانی لەنێوان سـەربازییە یاخیـەكانی باشـوور وهێـزە حكومیـەكانی بـاكوور تـا رێكەوتننامـەی ئـەدیس ئابابـای ١٩٧٢. كـاتیَ

حکومەتی سودان بەسەرۆکایەتی سەرۆکی پێشوو جەعفەر محمەد ئەلنەمیری لەگەڵ کەرت وخێڵەکانی باشووری ولاتدا کۆبوونەوە وئاگر بەستیان راگەیاند وماف ئۆتۆنۆمیان بە باشووری سودان بەخشی.

لەساڵی ۱۹۸۲ دا حکومەتی سودانی باشووری ولاتی دابەشی سێ کەرت کرد. ئەمەش خۆی لەخۆیدا کێشەیەکی دیکەی خوڵقاند، دانیشتوانی کەرتێکیان لەدوانەکەی دیکە یاخی بوون وباسیان لەوە دەکرد کە حکومەت بایەخێکی ئەوتۆی بەمان نەداوە لەچاو کەرتەکانی تر. هێندەی نەخایاند ئەوانیشی چوونەوە پاڵ و تێکرا داوای جیابوونەوەیان لەولاتی سودان دەکرد وپێکهێنانی حکومەتێکی مەسیحی سەرەکیترین داواکارییەکانیان بوو. شایەنی باسە ولاتە دراوسێکانی باشوور وەك ئۆگەندا وکینیا وئیسیۆپیا یارمەتی و چەکیان بۆ سەرۆکی بزوتنەوەی یاخیانی باشوور عەقید جۆن قرنەق دابین کردووە.

تا ئێستاش هەوڵە نێو دەوڵەتییەکان بۆ دۆزینەوەی رێگا چارەیەك بۆ سودان ویەك خستنەوەی بزوتنەوەی باشوور ( بەرەی میللی ئازاد کردنی سودان )، هێزە حکومییەکان هەر بەدەوامە.

لەهاوینی ۲۰۰۱ دا بارانە زۆرەکانی ئەو وەرزە زیانێکی گەورەیان بە زەوییە کشتوکاڵیەکانی سودان گەیاند وزۆربەی ناوچەکانی ژێر ئاوکرد.

گەنجینەی یەدەگی نەوتی سودان بە دوو ملیار بەرمیل نەوت دەخەملێنرێ، زیاترینی ئەو بڕەش دەکەوێتە باشووری ولات، بۆیە هێزە جیاخوازییەکانی باشوور هەوڵی دەست بەسەراگرتنی ئەو ناوچانەیان هەیە. لەساڵی ۲۰۰۱ بڕی داهاتی فرۆشتنی نەوتی سودانی گەیشتە یەك ملیار دۆلاری ئەمریکی.

سودان بەیەکێك لە ولاتە هەژارەکانی جیهان دادەنرێت، لەگەڵ ئەو هەموو سەرچاوە سروشتی وسامانە کشتوکاڵیە گەورەیە. بەلام کێشەی سەرەکی ئابووری ئەو ولاتە لەنەبوونی سەرمایەی بەرهەمهێنەر وکێشە وگرفتە سیاسییەکاندا خۆی دەبینێتەوە.

سودان بەپلەی یەکەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی کەتیرەی عەرەبی ، بەپلەی سیانزدەیەم دێت لەبەخێوکردنی مانگا وبەپلەی پانزدەیەم دێت لەبەخێوکردنی مەڕومالات.

رۆژی نیشتیمانی: ۱ / ۱ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ۱۹۵٦ .

سروودی نیشتیمان: سلاوت لێبێت ئەی کۆماری سودان.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٦,٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ۹٤ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ۲٦۹ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ۱٦۹ .

## سوریا

**ناوی باو:** سوریا

**ناوی فەرمی:** كۆماری عەرەبی سوری.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Syrian Arab Republic

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیرانە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی گەل ( ٢٥٠ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٧١,٤٩٨ میل دووجا، ١٨٥,١٨٠ كم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٨,٨٦٦,٠٢٥ كەس ( تا ساڵی ٢٠٠٢ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٨٧ كەس/كم²

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، كورد، ئەرمەن، شەركەس، توركمان.

**ئاین:** موسڵمان ( ٨٨ ٪ ) ، مەسیحی .

**زمان:** عەرەبی، كوردی.

**پایتەخت:** دیمەشق.

**شارە سەرەكییەكان:** حومس، حەمات، حەڵەب، ئیدلەب، لازقیە، تەرتووس، ڕوقە، دێر ئەلزوور، حەسەكە، درعا، سوێدا.

**دراو:** لیرەی سوری.

**ئاو وهەوا:** كیشوەری ووشكە لەبەشە ناوخۆییەكان، مام ناوەند وشێدارە لە كەنارەكان، نێوەندی پلەكانی گەرما لە زستاندا ١٠ پلەی سەدی ، لەهاویندا ٤٠ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی بارانەكان دەگاتە ٢١٨ ملم.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** گەنم، جۆ، گەنمەشامی، سەوزە ومیوە، زەیتون، لۆكە، قامیشی شەكر، ترشەڵۆكییەكان.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** چنین، درووستكراوە خۆراكییەكان، چیمەنتۆ، پاڵاوتنی پیترۆل، پۆشاك، پەین.

**سامانی كانزایی:** پیترۆل، گاز، فۆسفات، خوێ.

**تێڕوانینێكی گشتی:**

سوریا وڵاتیكی عەرەبی ئیسلامییە دەكەوێتە ڕۆژئاوای ئاسیا لەسەر كەناری دەریای سپی ناوەڕاست. توركیا دەكەوێتە باكووری، عێراق دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی، ئەردەن دەكەوێتە

باشووری وفەلەستین دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای، لوبنان ودەریای سپی ناوەڕاستیش دەکەونە رۆژئاوای. تەنها یەك دورگەش سەر بە ولاتی سوریایە ئەویش دورگەی ئەرواده کە نزیکەی ٣ کم لە شاری تەرتوسەوە دوورە، شایەنی باسە ئەرواد یەکێکە لەو دورگە کەمانەی دەکەوێتە سەر کەناری رۆژهەلاتی دەریای سپی ناوەڕاست. ناوەڕاستی سوریا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ٣٨/٣٠ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێلی پانی ٣٥ بەرەو باکوور.

بەدرێژایی کەناری سوریا لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست دەشتێکی بەپیتی تێدەکەوێت کە پانییەکەی چەند کیلۆمەتر ودرێژێکەشی نزیکەی کیلۆمەترێك دەبێت. بەدرێژایی ئەو دەشتانە بەرەو رۆژهەلات زنجیرە چیایەکان دەست پێدەکات کە زۆربەیان دارو درەختی میوەی لێ رواوە.بەرەو رۆژهەلاتی ئەو چیایانەش چەند چیایەکی نزمتر دەست پێدەکات کە رەز وباخێکی زۆری لێ بەدی دەکرێت. پێی دەوترێ جەبەل ئەلئەکراد ( واتا چیای کوردەکان ) وچیای زاویە وچیای لوبنانی رۆژهەلات و دەکەونە رۆژئاوای شاری حەڵەب. بەرەو رۆژهەلاتی ئەو زنجیرە چیایەش دەشتێکی بەپیت بەدی دەکرێ وروباری عاسیش لە باشوورەوە بۆ باکوور بەو ناوچەیەدا تێپەڕ دەبێت. لەباشووری رۆژئاوای سوریا چیای شێخ یان چیای حەرمونی تێدەکەوێتە کە بەرزییەکەی دەگاتە ٢٨١٤ م و بەمەش بە بەرزترین خاڵی ئەو ولاتە دادەنرێت. لەرۆژهەلاتی سوریاش روباری فورات وخاپوور تێپەڕ دەبن.

سوریا بەدرێژایی مێژوویەکی دوور ودرێژ لەژێر دەسەلاتی سۆمەری وئەکەدیەکان و حەیسی وبابلی و فیرعەون وحۆرییەکان ومیتانیی وکلدانی وئاشووری وفارس و یۆنانی و ئەنباتییەکان و رۆمان و بیزەنتییەکاندا بووە، ئەمە لەسەرەتای ساڵی ٢٣٠٠ پ.ز تا هاتنی ئاینی ئیسلام لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەکری سدیق لە ساڵی ١٣ ك / ٦٣٣ ز، ئیتر لەو کاتەوە دیمەشق بۆتە پایتەختی خیلافەتی ئیسلامی لەسەردەمی دەوڵەتی ئەمەوییدا، دوای ئەوە کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی عەباسی.

دوای ئەوەی سەلجیبی ومەگۆلییەکان داگیریان کرد، تورکەکان لەسەردەمی دەوڵەتی عوسمانی لەساڵی ١٥١٦ دا داگیریان کردۆتەوە. حوکمی عوسمانییەکان تا کۆتای جەنگی جیهانیی یەکەمی خایاندووە ١٩١٨ ، دوای ئەوەی شا فەیسەڵی یەك کراوەتە شای سوریا، ئەمە دوای شۆرشی عەرەب بەسەرۆکایەتی شەریف حسێن لە ١٩١٦ دا ( شۆرشی شەریفی مەککە ).

سوریا لە تەمموزی ١٩٢٠ دا کەوتە ژێر دەسەلاتی فەرەنسیەکانەوە و دوای چەند شۆرشێك لەدژی داگیرکاری فەرەنسی لە ٢٧ / ٩ / ١٩٤١ دا سەربەخۆیی راگەیەنراوە. لە ١٧ / ٤ / ١٩٤٦ هێزە فەرەنسییەکان سوریایان چۆڵکرد . ( جەژنی نیشتمانی سوریا ) .

سوریا بەشداری دامەزراندنی کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەکان و کۆمەڵەی نەتەوە یەکگرتوەکانی کردووە لە ١٩٤٥ دا.

دوای سەربەخۆیی چەند کودەتایەکی سەربازی روویداوە، تا لەگەڵ میسردا لە ٢٢ / ٢ م ١٩٥٨ دا یەکیان گرت. لەبەرواری ٨ / ٣ / ١٩٦٣ دا لێی جیابۆتەوە وشۆڕشی سۆسیالیستی هەڵگیرساوە. لە بەرواری ٥ /٦ / ١٩٦٧ دا شەڕی نێوان ئیسرائیل لەلایەك وسوریا وئەردەن ومیسر لەلایەکی کەوە هەڵگیرساوە، لەشەڕەکەدا سوریا بانی جۆلارنی لەدەست داوە.

لە ١٦ / ١١ / ١٩٧٠ بزوتنەوەی چاکسازی بە سەرۆکایەتی فەریق حافیز ئەسەد هەڵگیرساوە و لە ١٢ / ٣ / ١٩٧١دا بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژێردراوە، لەساڵەکانی: ١٩٧٨ ، ١٩٨٥ ، ١٩٩١ ، ١٩٩٩ بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژێردراوەتەوە.

لە ٦ / ١٠ / ١٩٧٣ دا شان بەشانی میسر لەدژی ئیسرائیل شەڕیان کردووە، بەمەبەستی گرتنەوەی ئەو زەویانەی لە شەڕی ١٩٦٧ ئیسرائیل داگیری کردبوو.

لە ٣٠ / ١٠ / ١٩٩١ دا لەگەڵ وڵاتە عەرەبییەکاندا بەشداری کردووە لەکۆنگرەی مەدرید بۆ ئاشتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. بەڵام دوای کۆنگرەکەش چەند دانیشتنێکی لەگەڵ ئیسرائیلدا بەمەبەستی دانوستان شکستیان هێنا. بەڵام گفتوگۆکان لە ١٩٩٦ دا بێ ئەوەی هیچ ئەنجامێکی هەبێت راگیرایەوە. لە ١٥ / ١٢ / ١٩٩٩ دا سەرلەنوێ دانیشتنەکان دەستیان پێکردەوە، دوای دوو خول لەدانوستانەکان لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٠ دا دانیشتنەکان راگیرایەوە. سوریا هیچ ئەنجامێکی چاوەڕوان کراو لە دانیشتن لەگەڵ ئیسرائیلدا بەدی ناکات تا ئیسرائیل لەو خاکە نەکشێتەوە کە لەدوای شەڕی ١٩٦٧ دا داگیری کردووە، بەرامبەر بە ئاشتی نێوان هەردوو وڵات.

لە بەرواری ١٠ / ٦ / ٢٠٠٠ دا حافیز ئەسەدی سەرۆکی سوریا کۆچی دوایی کرد، بەپێی دەستووری وڵات جێگری یەکەمی سەرۆك عەبدولحەلیم خەدام، تا دیاری کردنی سەرۆکی نوێ، بۆ ماوەی ٩٠ رۆژ دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست.

لەئێوارەی هەمان رۆژدا ئەنجومەنی گەلی سوریا لەدانیشتنێکی نائاسایی کۆبوونەوە و بڕیاریان دا ماددەی ٨٣ لەدەستووری وڵات راستبکەنەوە بەشێوەیەك رێگا بە سەرۆکی کۆمار بدات لەتەمەنی ٣٤ ساڵیدا بتوانێ ئەو پۆستە بگرێتە دەست لە بری تەمەن ٤٠ ساڵ، شایەنی باسە ئەم گۆڕانکارییە لەپێناوی بەشاری کوڕی حافیز ئەسەد بەئەنجام دراوە تاکو بتوانێ ببێتە سەرۆکی وڵات.

لە رۆژی ١١ / ٦ / ٢٠٠٠ دا پارتی بەعسی عەرەبی سۆسیالیست - حیزبی دەسەڵاتداری سوریا - عەقیدی دکتۆر بەشار حافیز ئەسەدیان بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژارد.

لەهەمان رۆژدا سەرۆك ولات بەوەکالەت ئەم سێ بڕیارەی دەرکرد:

١. گۆڕینی پلەی عەقید بەشا بۆ پلەی فەریق.

٢. دامەزراندنی بەسەرۆکی گشتی سوپا وهێزە چەکدارەکان.

٣. راستکردنەوەی ماددەی ٨٣ ی دەستووری سوریا بەشێوەیەك رێگا بەتەمەن ٣٤ ساڵ بدات پۆستی سەرۆکایەتی ولات بگرێتە دەست لە بری تەمەنی ٤٠ ساڵ.

لە رۆژی ١٣ / ٦ / ٢٠٠٠ دا حافیز ئەسەدی سەرۆکی کۆچکردوو لە شاری قرداحەی نزیك لازقیەی سوریا لەتەنیشت گڵکۆی باسلی کوڕی کە لە ٢١ / ١ / ١٩٩٤ بەڕووداوی ئۆتۆمبیل گیانی لەدەست دابوو بەخاك سپێردرا.

سوریا بەپلەی شەشەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی زەیتون، ژمارەی دارەکانی زەیتون لەسوریا دەگاتە ٧٠ ملیۆن دار کە نزیکەی ٨٠٠ هەزار تۆن زەیتون بە بەرهەم دێنن. هەروەها بەپلەی دەیەم دێت لەبەرهەمی لۆکە.

ئامارە نوێکان ئاشکرایان کردووە کە بەشی گەنجینەی یەدەگی سوریا لە نەوت دەگاتە ٢٣ ملیار بەرمیل، نزیکەی ٣ ملیاری لێ بەرهەم هاتووە، ئەمەش مانای وایە تا ساڵی ٢٠٢٠ سوریا دەتوانێ سوود لە بەرهەمی نەوت وەرگرێ، بەلام ئەم ژمارەیە ئەگەری زیاد بوون یان کەم بوونەوەی هەیە بەهۆی پێشکەوتنی بابەتەکانی دۆزینەوە لە جیهاندا.

سوریا رۆژانە نزیکەی ٥٥٠ هەزار بەرمیل نەوت بەبەرهەم دێنێت ونزیکەی ٣٠٠ – ٣٥٠ هەزار بەرمیلیان کاردەکات، ئەوی دیکەی رەوانەی دەرەوەی ولات دەکرێ، هەروەها ساڵانە نزیکەی ٥,٨ ملیار م$^{3}$ گاز بەبەرهەم دێنێت. لەبەرواری ٢١ / ٨ / ٢٠٠٢ دا دۆزینەوەی بیرێکی گازی نوێ راگەیەنرا کەواچاوەڕوان دەکرێت رۆژانە نزیکەی ٢٠٠ هەزار م$^{3}$ گاز بەبەرهەم بێنێت.

سرووودی نیشتیمانی: پارێزگارانی ولات سلاوتان لێبێت.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ١٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٦٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٢١٨ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٠٤ .

## سورینام

**ناوی باو:** سورینام

**ناوی فەرمی:** کۆماری سورینام

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Surinam

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری ، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥١ ئەندام ).

**رووبەر:** ٦٣,٢٥١ میل دووجا، ١٦٣,٨٢٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤٢٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢,٢ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** کریۆل سورینام ( تێکەڵەیەکن لە ئەوروپی وئەفریقی )، ئاسیایی، ئەفریقی رەش، هیندی ئەمریکی، ئەوروپی.

**ئاین:** هیندۆس، مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیک )، موسڵمان.

**زمان:** هۆڵەندی، سورینام تاکە وڵاتە بەزمانی هۆڵەندی قسە بکات جگە لەهۆڵەندا خۆی، شایەنی باسە ئەم دورگانەش بەزمانی هۆڵەندی قسە دەکەن: دورگەی ئاروبا، دورگەکانی ئەنتلی هۆڵەندی کە لەدورگەکانی دەریای کاریبین و سەر بە وڵاتی هۆڵەندان.

**پایتەخت:** باراماریبۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** نۆف نیکیری، میزۆرج، مارینبۆرگ.

**دراو:** گیلدەری سۆرینام.

**ئاو وهەوا:** گەرمە، نێوەندی ساڵانەی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەرۆژئاوای وڵات دەگاتە ١٩٣ سم، لەپایتەختی وڵات نزیکەی ٢٤٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** برنج، قامیشی شەکر، مۆز، گوێزی هیندی، زەیتی دارخورما، لیمۆ، قاوە، بەخێوکردنی مەڕومالآت، راوەماسی، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئەلۆمین ( یەکەم قۆناغی گۆڕینی بۆکسیتە بۆ ئەلەمنیۆم ).

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

سورینام وڵاتێکە دەکەوێتە سەر کەناری باکووری رۆژهەڵاتی ئەمریکای باشوور. زەریای

ئەتڵەسی دەكەوێتە باكووری، ژیانای فەرەنسی دەكەوێتە رۆژهەلاتی، بەرازیل دەكەوێتە باشووری، گۆیاناش دەكەوێتە رۆژئاوای. ناوەراستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ۳۰ / ٥٥ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٤ بەرەو باكوور.

تەختی سورینام بریتییە لە كەنارێكی تەسك لە زەلكاوەكان پێكهاتووە. پاشان بەهۆی كشتوكاڵیەوە وشك كراوەتەوە، ناوچەكە بەدرێژایی ۸۰ كم بەرەو ناوخۆی ولات درێژ دەبێتەوە و بەدەشتێك كۆتایی دێت بەلم داپۆشراوە ونزیكەی ٤٥ مەتر بەرز دەبێتەوە. بەلام بەشی ناوخۆی ولاتەكە بریتییە لە گردەكان ونزیكەی ۲۰۰۰ جۆر درەخت دایان پۆشیوە، لە ۸۰ ٪ ی رووبەری ولاتیان پێك هێناوە، هەندێ لەو درەختانە زۆر دەگمەنن وبۆ مەبەستی چارەسەری بەكاردەهێنرێن. بەدرێژایی سنوورە باشوورییە رۆژئاواكانی ولات دەشتەكان درێژ دەبنەوە بەگژوگیای ساڤانا داپۆشراوە، رووبارەكانی ولات بەرەو باكوور رێچكە دەبرن تاكو دەرژێنە زەریای ئەتڵەسی.

كریستۆف كۆلۆمبۆس بۆ یەكەم جار ناوچەكەی لەساڵی ١٤٩٨ دا بەدی كردووە، ئیسپان وپۆرتۆگالییەكان لەسەرەتای سەدەی شانزدەیەمدا ناوچەكەیان دۆزیوەتەوە. لەساڵی ١٦٥١ دا ئینگلیزەكان لێی نیشتەجێ بوون، لەساڵی ١٦٦٨ دا هۆڵەندییەكان داگیریان كردووە، هۆڵەندییەكان بەرامبەر بەشاری نیونەدەرلاند ( نیویۆركی ئێستا ) دەستیان لێهەڵگرتووە بۆ بەریتانییەكان. لەسەرەتاكانی سەدەی هەژدەیەمدا چەند جارێك مولكێتی دورگەكە لەنێوان بەریتانیا وهۆڵەندا ئاڵوگۆری پێكراوە، تا لەساڵی ١٨١٥ كەوتۆتە دەست هۆڵەندییەكان، ناوی بۆتە گۆیانای هۆڵەندی. لەساڵی ١٩٥٤ دا سورینام مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشراوە، لە ٢٥ / ١١ / ١٩٧٥ دا بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە ( ٢٥ / ١١ جەژنی نیشتیمانی ) ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككگرتوەكان.

یەكەم سەرۆكی سورینام دوای سەربەخۆیی: هینك ئارۆن بووە كە بەكودەتایەكی سەربازی بەسەرۆكایەتی كۆلۆنێل دیسی بوتریس لەساڵی ١٩٨٠ لەدەسەلات دوورخراوەتەوە،خۆی كردۆتە سەرۆكی ولات. لەساڵی ١٩٩٠ دوای فشارێكی میللی زۆر رامسیواك شانكری كردە سەرۆكی ولات وخۆی بۆ سەرۆكایەتی سوپا تەرخان كرد. بۆ ساڵی دوایی هەڵبژاردنە گشتییەكان ئەنجامدرا و رۆناڵد فینینتیان بووە سەرۆكی ولات. لەساڵی ١٩٩٦ دا جۆلیۆس ویدیبۆس بەسەرۆكی ولات هەڵبژێردرا، لە بەرواری ٢٥ / ٥ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنە گشتییەكان لەسورینام بەرێوە چوو، پارتی بەرەی نوێی هاوپەیمانی گەشە پێدان ودیموكراسی بەسەرۆكایەتی سەرۆكی پێشوو رۆناڵد فینینتیان سەركەوتنی بەدەست هێنایەوە، لەئاهەنگی بەرێوەچوونی وەرگرتنی پۆستی سەرۆكایەتی بەڵێنیدا گەندەڵی

نەهێلی وگەشەکردنێکی خێرا بە باری ئابووری وڵات بدات وچارەسەرێك بدۆزێتەوە بۆ قەرزەکانی دەرەوە کە گەیشتبۆوە ئاستێکی بەرز وچاودێری بەرێوەچوونی داراییەکانی وڵات بخشێنێتەوە.

هۆڵەندا ژمارەیەکی زۆری لە ئەندەنوسییەکانی هێناوەتە سورینام تاکو کشتوکاڵیان پێ بکات، بێ گومان ئەمانەش پەیرەوی ئاینی ئیسلامیان دەکرد، بەتێپەڕ بوونی رۆژگارەکانیش ئەندەنوسیەکان ژمارەیان زیادی کردووە لە سورینام وئەمەش بۆتە هۆی زیادبوونی ژمارەی ئیسلامەکان لەچاو هیندۆسەکاندا، بۆیە سورینام وەك ئەندامێك لە رێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی وەرگیراوە.

ناوی سورینام لە روباری سورینامەوە هاتووە کەلەخاکی ئەو وڵاتەوە هەڵدەقوڵێ ودەرژێتە نێو زەریای ئەتڵەسی لە نزیك باراماریبۆی پایتەختی وڵاتەوە. ناوی روبارەکەش لە بنەڕەتدا لە وشەی سورینینەوە، کەناوی یەکەمی ئەو هێزە هیندیانەیە کەلە ناوچەکەدا ژیاون، لەدواییدا لەلایەن کۆمەڵە هیندییە ئەمریکییەکانەوە لەسەدەی شانزدەیەمدا کراونەتە دەرەوە.

ئابووری سورینام پشتی تەواوی بە بۆکسیت بەستووە، ئەو ماددە خامەی کە ئەلەمنیۆمی لێ دروست دەکرێت، بەپلەی حەوتەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە دەرهێنانی ئەو ماددەیە ودەیگۆڕێ بۆ ئەلۆمین کە بەیەکەم قۆناغی گۆڕینی ماددەی بۆکسیتە بۆ ئەلەمنیۆم. ئەمە جگە لەوەی کشتوکاڵیش بەشدارییەکی بەرچاوی کردووە لەداهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتە.

ئەو یارمەتیانەی کە لەهۆڵەنداوە پێشکەشی ئەو وڵاتە دەکرێ تا ئاستێ بەشداری لە باشکردنی ئابووری ئەو وڵاتە کردووە، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا رێژەی ئەو یارمەتیانە کەم کرایەوە، بۆیە لە ١٩٩٤ دا سورینام دووچاری ئابوتی ئابووری بووەوە، گەیشتە ئاستێك حکومەت بیری لەفرۆشتنی ٤٠ ٪ ی دارستانەکان بەکۆمپانیا بیانییەکان دەکردەوە، بەڵام بەهۆی فشارەکانی کۆمەڵەی ژینگە پارێزەوە لەم بریارەی پاشگەز بۆوە، بۆیە هەوڵیدا بایەخێکی گەورە بە چالاکییە گەشتوگوزاریەکان بدات.

سروودی نیشتیمان: ئەی گەل راپەڕن.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣٦٤ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٦٩ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٨٧٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢١

## سوید

**ناوی باو:** سوید.

**ناوی فەرمی:** شانشینی سوید.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Sweden

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، شا ، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** پەرلەمان ( ٣٤٩ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٧٣,٧٣٢ میل دووجا، ٤٤٩,٩٦٤ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٨,٨٦٣,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢١,٧ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** سویدی، فینلەندی، لابیی.

**ئاین:** مەسیحی ( لۆتەری ).

**زمان:** سویدی، زمانی ئینگلیزی بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکاردەهێنرێت.

**پایتەخت:** ستۆکهۆڵم.

**شارە سەرەکییەکان:** یۆتۆبۆری ( گۆتنبێرگ )، مالمۆ، ئۆپسالان کالمارن لۆند.

**دراو:** کرۆنی سویدی.

**ئاو وهەوا:** باکووری وڵات ساردە لەزستاندا پلەکانی گەرما دەگەنە ١٠ لەژێر سفری سەدی، لەهاویندا زۆر فێنکە وپلەکانی گەرما لەنێوان ١٢ – ١٤ پلەی سەدی دەبێت. باشووری وڵات لەزستاندا مام ناوەندە ولەهاویندا فێنکە ( ١٥ – ١٧ ) پلەی سەدی دەبێت. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ٣٨٥ ملم، بەفریش لەزستاندا زۆر دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، بەخێوکردنی مانگا وبەراز، شیرەمەنی، شۆفان، پەتاتە، گەنم، چەوەندەری شەکر، ڕاوەماسی، دارستان.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئامێری کشتوکاڵی، فڕۆکە، ئۆتۆمبێل، ئامێری کارەبایی وئەلەکترۆنی، دروستکردنی تەقەمەنی، شووشە، کریستاڵ، گۆگرد، کاغەز، پلاستیك، خانووی ئامادە ( کەرەڤان )، کەشتی ، پۆڵا.

**سامانی کانزایی:** ئاڵتون، ئاسن، قورقوشم، زنك، زیو، مس.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

سوید، وڵاتیکە دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی ئەسکەندەناڤ لەباکووری

ئەوروپا. فینلەندا دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی، دەریای بەلْتیك دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ونەرویج دەکەوێتە ڕۆژئاوا وباکووری ڕۆژئاوای. نزیکەی ٢٤ هەزار دورگەی بەربلاّو سەر بەو وڵاتەن وبەچوار دەوری کەنارەکانی بلاو بونەتەوە، گەورەترینیان: جۆتلاند و ئۆلاندن. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٥ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی درێژی ٦٤ بەرەو باکوور.

یەك لەسەر حەوتی ڕووبەری سوید کەوتۆتە سەر خاکی خۆری نیوە شەو، لەهاویندا خۆر بەردەوام دەبێت ولەزستاندا شەو باڵی بەسەردا دەکێشێ، لەبەر ئەوەی دەکەوێتە پشت بازنەی جەمسەری باکوور.

زنجیرە چیای کۆلن دەکەوێتە سەر سنوورەکانی سوید ونەرویج، بانێکیش دەکەوێتە ناوچەی باکووری ناوخۆی وڵات وڕێژەیەکی کەمی دانیشتوان لێی نیشتەجێ بوون وزۆربەشی بەدرەختەکانی سنەوبەر دپۆشراون وبەرهەمی دارو تەختەیان لێ وەردەگیرێ، ئەمە جگە لەوەی چەند ڕوبارێك زۆر بەخێرایی بەو ناوچەیە تێپەڕ دەبن ووزەی کارەبا بەبەرهەم دێنن. دەشتەکانی ناوەڕاست وباشووریش، لە خاکە بەپیتەکان پێك دێن کە بەمەبەستی کشتوکاڵی بەگەڕخراون، جگە لەوەی چەند دەریاچەیەك ودارستانێکی زۆریشی لەخۆی گرتووە. بانی جۆتلاندیش دەکەوێتە باشووری وڵات و بریتییە لە بەرزاییە بەردەڵانەکان ونزیکەی ٣٥٠ مەتر لە ئاستی ڕووی دەریا بەرز دەبێتەوە، چەند دەریاچەیەك ودارستان وزەلکاوێکی تێدەکەوێت، گەورەترین دەریاچەی ئەو ناوچەیەش دەریاچەی ڤانرنە کە گەورەترین دەریاچەکانی ئەوروپایە، دوای ئەویش دەریاچەی ڤاترن.

زۆربەی گەلی سوید لەو هۆزانەن کە لەنیمچە دورگەی ئەسکەندەنافیادا ژیاون لەسەردەمی نیۆلیتییەکان. بەڵام دانیشتوانی باکوور بەڕەچەڵەك لە لابیری و فینییەکانن کە لە سیبیریاوە بۆ گەڕان بەدوای خۆراکدا بەر لە ١٢ هەزار ساڵ گەیشتونەتە ناوچەکە. هۆزەکانی سیڤیریش کەناوی وڵاتەکەیان لێوە هاتووە لەماوەی پ.ز گەیشتونەتە ناوچەکە. یەکەم مێژوو لەسەر ناوچەکە تۆمار کرابێت لە ساڵی ٩٨ ی زایین بووە. هۆزە سیڤیرییەکان بەدانیشتوانە سەرەتاییەکانی وڵات تێکەڵ بوون و بەهۆی ژن وژنخوازەوە بوونەتە یەك نەتەوە وبەناوی ڤایکنجەوە ناسراون وهەروەها بە نۆرسمنیش ناسراون، بەمانای پیاوانی باکوور دێت. ڤایکنجەکان تەواوی ناوچەکانی باکووری ئەوروپایان داگیرکرد، لەدواییدا ڤایکنجەکان هەریەك لەگەلانی نەرویج ودانیمارك وسویدیان پێك هێنا.

لەساڵی ١٣٩٧ دا هەریەك لەسوید ونەرویج ودانیمارك یەکێتی کالماریان پێك هێنا. بەڵام لەساڵی ١٥٢٣ دا سوید لەیەکێتیەکە جیابۆتەوە. گۆستافس ڤاسای بەیەکەم شای وڵات

هەڵبـژارد ونـاونرا گۆسـتاڤ یەکـەم، بەدامەزرێنـەری خێزانـی فاسـا دادەنرێـت کـە حـوکمی سـویدیان کـردووە لـە ١٥٢٣ بـۆ ١٧٥١ ، مێـژووی شانـشینی سـوید دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو سـەردەمە، بـەڵام نـەرویج لـەژێر دەسـەڵاتی دانیمارکدا مایـەوە. بۆ مـاوەی دوای دامەزراندنی شانـشینی سـوید، سـویدییەکان زۆربـەی ناوچـە ڕۆژهەڵاتـەکان بـەرێ کـەوتن وزۆربـەی زەوییەکانی بەڵتیکیان داگیرکرد، بەڵام ئەوەی هێزەکانیان لە ساڵی ١٧٠٠ دا کۆتایی پێهات کاتێ هاوپەیمانی دانیمـارك وپۆڵەندا وڕووسیا زۆریـان لێکرد دەست لـەو ناوچانە هـەڵگرێ کەداگیری کـردووە. لەسـەرەتاکانی سـەدەی نۆزدەیەمـدا سـوید لـەدژی ئیمپراتـۆری فەڕەنسا ناپلیۆن پۆناپێرت ١٨١٣ – ١٨١٤ بەشـەڕ هـاتووە، بۆیـە کۆنگرەی ڤێینـا نـەرویجی لەشێوی یەکێتییـەك پـێ بەخـشیوە، ئەمـە دوای ئـەوەی نـەرویجی لـەدانیمارك سـەندۆتەوە لەسـزای پشتگیری کردنـی لـە ناپلیۆن. بـەڵام خۆشـبەختی نەرویجییـەکان لـەوەدا بـوو کەناوچەکانیان شاخاوییە وسویدییەکان زۆر بایـەخی پێنـادەن لەچاو دەشتە بەپیت و سـەوزەکانی خۆیـان، بۆیە لەساڵی ١٩٠٥ دا سەربەخۆیی پێ بەخشیوە، دوای سەدەیەك لە یەکێتی نێوانیان.

لەدوای ١٨١٥ سوید لەتـەواوی ئـەو جەنگانـەی لەجیهانـدا هەڵگیرسـاوە بـێ لایـەن بـووە، تـا ئـەمڕۆ. ئەمـەش بـووە هـۆی گەشـەکردنی پیـشەسازی ئـەو وڵاتـە لەسـەدەی نۆزدەیەمـەوە، بەپشت بەستنی بەهـەر سێ سەرچاوە سروشتییە گرنگەکە: دار وتەختـە، ئاسـن، ئـاو، بۆیـە توانیویەتی لەسەر ئاستێکی زۆر بەرز لەجیهانـدا بمێنێتـەوە، سـوید ئـەمڕۆ بەیـەکێك لەوڵاتـە زۆر پێشکەوتووەکان دادەنرێـت لـەڕووی ژمـارەی ئۆتۆمبێـل وتەلـەفون وئـامێرە کارەباییـەکان لەچاو ژمارەی دانیشتوانی. ئەمە جگـە لـە پێوەرێکی دیکـەش بۆ بەرزی ژیـانی دانیـشتوانی سـوید، دانیـشتوانەکان جگـە لـەوەی خـاوەنی خـانوو مـاڵی خۆیـانن لەشـارەکاندا، خـاوەنی خانوو ولانەی زۆر جوانن لەنێو گوندەکاندا بۆ کات بەسەر بردن لەکۆتایی هەفتەدا.

گەلی سوید بەردەوام لەهەوڵ وکۆشش دان بـۆ گەشـە پێدانی تـەواوی بوارەکـانی ژیانیـان، ڕەنگە یەکێك لەو سەیرو سەمەرانەی بواری ئەندازیاری مرۆیی ئەنجام دانی ئەو کەناڵە بێت ( کەناڵی گۆتا ) کە شاری ستۆکهۆڵمی پایتـەخت بەشاری گۆتنبێرگی ڕۆژئاوای وڵاتی بەیـەك گەیانـد لـەرێی ڕوبـار ودەریاچـەکانەوە، لـەبڕینی ئـەو کەناڵـە زیـاتر لـە ٥٨ هـەزار کرێکـار وئەندازیار بەماوەی ٢٢ مانگ کاریان لێکردووە.

هەروەها سوید لەگەڵ دانیمارکدا لە ناوەڕاستی ٢٠٠٠ دا توانیـان پـردی ئۆریـسۆند لەسـەر تەنگەی ئۆریسۆند درووست بکەن، کە درێژییەکەی ١٦ کم دەبێت و شاری مالمۆی سویدی بە کۆپنهاگنی پایتەختی دانیمارك بەیەك گەیاندۆتەوە.

سوید لەساڵی ١٩٤٥ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

شـای نێـستای سـوید: کـارل گۆسـتاڤ شـانزدەیەمە، کـە لەبـەرواری ١٥ / ٩ / ١٩٧٣ دوای کۆچـی دوایـی باپیری ئـەدۆلفی شەشـەم بۆتـە شـای وڵات. شـایەنی باسـە بـاوکی کـارل: میر گۆسـتاف لـە ٢٦ / ١ / ١٩٤٧ لـەڕووداوی کەوتنـە خـوارەوەی فڕۆکەکەیـدا گیـانی لەدەسـتدا، بۆیە کارل گۆستاف بۆتـە شـای وڵات. کـارل گۆسـتاف لـە ٣ / ٤ / ١٩٤٧ دوای کۆچی دوایی باوکی لەدایك بووە. شایەنی باسە کوڕ وباوك وباپیری لەخێزانی برنادۆتن کە لـەدوای سـاڵی ١٨١٨ حـوکمی وڵاتیـان کـردووە. بـەپێی دەسـتووری ١٩٧٥ شـای وڵات خـاوەنی هـیچ دەسـەڵاتیکی فیعلـی نییـە ودەسـەڵات بەدەسـت سـەرۆکی وەزیرانـە. لەسـاڵی ١٩٨٠ دا دەستووری وڵات گۆڕا تاکو یەکەم منـاڵی شـا چ کـوڕ بـێ یـان کـچ بـۆی هـەبێ دوای کۆچـی دوایی باوکی ببێتە شای وڵات.

سوید بەپلەی حەوتەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەدەرهێنانی قوڕقوشم، بەپلەی نۆیەم دێت لەبەرهەمی دار وزنك وبەپلەی یانزدەیەم دێت لەبەرهەمی زیو وئاسن، بەپلەی حەڤدەیەم دێت لەبەرهەمی مس.

سروودی نیشتیمان: تۆ ئەی ئازاد، ئەی باکووری چیا بەرز.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢٠٦,٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢١ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٣,٦٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١١ .

## سویسرا

**ناوی باو:** سویسرا.

**ناوی فەرمی:** یەکێتی سویسرا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Swiss Confederation

**سیستەمی حوکمڕانی:** وڵاتێکی یەکگرتووە، سەرۆکی وڵات خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

– ئەنجومەنی ویلایەتەکان ( پیران ) ( ٤٦ ئەندام ).

– ئەنجومەنی نیشتیمانی ( نوێنەران ) ( ٢٠٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ١٥,٩٤٠ میل دووجا، ٤١,٢٨٥ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧,١١٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٧٢,٤ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەڵمان، فەرەنسی، ئیتالی، ئیسپانی، پۆرتوگالی، رۆمان.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت، ئەرتۆدۆکس) ، موسڵمان، جوولەکە.

**زمان:** ٦٤ ٪ دانیشتوان بەزمانی ئەڵمانی قسە دەکەن، ١٩ ٪ دانیشتوان بە زمانی فەرەنسی قسە دەکەن، ٨ ٪ دانیشتوان بەزمانی ئیتالی قسە دەکەن، هەروەها زمانی رۆمانیش بەزمانێکی فەرمی دادەنرێت و ١ ٪ دانیشتوان قسەی پێ دەکەن.

**پایتەخت:** بێرن.

**شارە سەرەکییەکان:** زیوریخ، جنێڤ، لۆزان، بازل، لۆسێرن.

**دراو:** فرانکی سویسری.

**ئاو وهەوا:** زستانی ساردە وپلەکانی گەرما لەنێوان سفر بۆ ١ پلەی سەدی دەبێت، هاوینی فێنکە وپلەکانی گەرما لەنێوان ١٨ بۆ ٢١ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٠ سم بۆ ١١٤ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** شیرەمەنی، میوە وسەوزە، پەتاتە، گەنم، چەوەندەری شەکر، بەخێوکردنی مانگا ومەڕوماڵات وبەراز.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ماددە کیمیاییەکان، دەرمان، ئامێری کارەبایی وئەلەکترۆنی، سەعات، درووستکراوە خۆراکییەکان، چنین، شۆکلاتە.

**سامانی کانزایی:** یۆرانیۆم، ئاسن، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

سویسرا، شڤیتز بەئەڵمانی، سویس بەفەڕەنسی، سڤیزرا بەئیتالی، وڵاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەوروپا، ئەڵمانیا دەکەوێتە باکووری، نەمسا و لختنشتاین دەکەونە ڕۆژهەڵاتی، ئیتالیا دەکەوێتە باشووری وفەڕەنسا دەکەوێتە ڕۆژئاوای. هیچ کەنارێکی بۆ سەر دەریاکان نییە، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٨ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٧ بەرەو باکوور.

چیاکان دوو لەسەر سێی خاکی سویسرایان پێك هێناوە، چیاکانی گۆرا دەکەوێتە سەر درێژایی سنوورە ڕۆژئاواکانی، کە ئەو ناوچەیەش بەهۆی بەپیتی زەوییەکانی ناوچەیەکی باشی لەوەڕ و دارستانەکانیشی سوودێکی گەورەی بەهۆی دارو تەختەوە لێ وەردەگیرێ، ئەمە جگە لەوەی دروست کردنی کاتژمێرە بەنرخەکانی سویسرا کەوتۆتە ئەو ناوچەیە. بانی سویسراش دەکەوێتە ناوەڕاستی وڵات وکۆمەڵێ گردو دەشتاییەکی بەپیتی زۆری لەخۆی گرتووە، ئەمە جگە لەوەی چەند دەریاچەیەکی تێدەکەوێت. چیاکانی ئەلبی سویسریش بەبەشێك لەچیاکانی ئەلبی ئەوروپی دادەنرێت وبەدارستان وچیا وبەفر داپۆشراون وچەندین ڕوباری بەستەڵەك وتافگەییەکی زۆری لەخۆ گرتووە وئەمەش وایکردووە بەیەکێك لەناوچە هەرە جوانەکانی جیهان دابنرێت وساڵانە گەشتیارێکی زۆر رووی تێدەکەن، سویسرییەکان توانیویانە چەندین تونێل لەنێو چیاکاندا هەڵدڕن بۆ ئاسانکاری هاتوچۆ ورێگاو بانەکانیان، بەناوبانگترین تونێلەکانیشی سانت جۆتاردە کە درێژییەکەی ١٦,٩ کم دەبێت وبەمەش بەدووەم درێژترین تونێل دادەنرێت لەجیهاندا، دوای تونێلی لیدرالی نەرویجی کە درێژییەکەی دەگاتە ٢٤,٥ کم.

ڕۆمانییەکان لەسەدەی یەکەمی پ.ز دا سویسرایان واڵا کردووە. ئاینی مەسیحی لەنێوان سەدەی حەوتەم وهەشتەمدا لەو وڵاتە بڵاو بۆتەوە. لەساڵی ١٠٣٢ دا بۆتە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی پیرۆزی ڕۆمانی، کە لەساڵی ١٦٤٨ دان بەسەربەخۆییدا نراوە. لەسەدەی سیانزدەیەمدا خێزانی هابسبێرگ بەشێکی زۆری لەو زەویانە داگیر کردووە کە ئەمڕۆ بە سویسرا دەناسرێن. لە ساڵی ١٢٩١ دا هەر سێ ناوچەی: شڤاتین، ئوری، ئەنتەرڤالدن، بڕیاریان دا ڕووبەڕووی هێرشی بەرفراوانی نەمسا ببنەوە، ڕێکەوتننامەیەکی بەرگرییان لەنێوان واژۆ کراوە بەناوی بەڵێنی هەمیشەیی، لەرێکەوتننامەکەدا هەر سێ ناوچە بەڵێنیان داوە بەرگری لەیەکتر بکەن لەئەگەری هەر هێرشێکی بیانی. ساڵی ١٢٩١ بەسەرەتای پێکهێنانی یەکێتی سویسری دادەنرێت، کەناوچەی شڤاتیز سەرۆکایەتی دەکرد ودەکەوێتە ناوەڕاستی وڵاتەوە ودانیشتوانەکانی بەزمانی ئەڵمانی قسە دەکەن وزۆربەیان لەمەسیحە کاسۆلیکەکانن، دواتر تەواوی ناوچەکە بەم ناوەوە ناونرا. دواتر زۆربەی ناوچەکانی کەش پەیوەندییان بەیەکێتییەکەوە کرد. لەساڵی ١٧٩٨ دا هێزە فەڕەنسییەکان سویسرایان داگیر

کرد وکۆماری هلفستیان پێك هێنا وخستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. لەکۆنگرەی ١٨١٥ ی ڤیێنا وڵاتە ئەوروپییە مەزنەکان بەڵێنی دانپیانانی بێلایەنی هەمیشەییان بەسویسرادا. لەساڵی ١٨٤٨ دا سویسرا دەستوورێکی دارشت تێیدا ٢٢ کانتۆنی ( هەرێم یان ناوچە یان ویلایەت) ی کردە یەك لەژێر دەسەڵاتیکی فیدراڵی یەکگرتوو. بەڵام ئێستا لە ٢٦ کانتۆن پێك دێت وهەر کانتۆنێك خاوەنی ماف نەتەوەیی وکلتور وزمانی خۆی پەیرەو دەکات.

سویسرا هەوڵوێستی بێلایەنی لەخۆ گرتبوو – تا ئێستاش – لەهەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ودووەم، وەکو ئامارەدانێك بەو بێلایەنییەی نەبووە ئەندام لەنەتەوە یەکگرتووەکان، ئەمە لەگەڵ ئەوەی جنێف زیاتر لە بیست رێکخراو یان دەزگای سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکانی لەئامێز گرتووە، ئەمە جگە لەوەی بەدووەم سەنتەری رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکان دادەنرێت دوای نیویۆرك. شایەنی باسە بێلایەنی سویسرا کردویەتییە بینەرێکی شانۆی تەواوی رووداوە جیهانییەکان لەکاتێکدا پیاوانی کاری سویسریش لەسەر تەختی ئابووری تەواوی جیهان .

وەزارەتی دەرەوەی سویسرا لەبەرواری ٣٠ / ٦ / ٢٠٠٠ دا رایگەیاند کەحکومەتی سویسرا بەنیازە گفتوگۆیەکی ناوخۆ وفەرمی لەنێوان لێپرسراوەکانیدا ئەنجام بدات لەسەر بابەتی پەیوەندی کردنی وڵاتەکەیان وەك ئەندامێکی هەمیشەیی رێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، چونکە تا ئەو کاتیش سویسرا رۆڵی چاودێری دەبینی لەرێکخراوی ناوبراودا، وەك ڤاتیکان. ئامانجی پەیوەندی کردنی ئەو وڵاتە بەنەتەوە یەکگرتووەکانەوە بەشداری کردنی بوو لە گۆرەپانی سیاسی جیهاندا. لە ساڵی ١٩٨٦ دا بەمەبەستی وەرگرتنی رای گشتی، حکومەتی سویسرا دەنگدانێکی میللی بۆ ئەم مەبەستە بەئەنجام گەیاند، تیایدا زیاتر لە ٧٥ ٪ ی سویسرییەکان پەیوەندی کردنی وڵاتەکەیان بەرێکخراوی ناوبراوەوە رەتکردەوە.

لە بەرواری ٢٠ / ٩ / ٢٠٠١ دا ئەنجومەنی نوێنەرانی سویسرا بەزۆرینەی دەنگ رەزامەندییان لەبەئەندام بوونی وڵاتەکەیان لەنەتەوە یەکگرتووەکانەوە دەربری. لە بەرواری ٤ / ٣ / ٢٠٠٢ دا دەنگدەرە سویسرییەکانیش لەلایەن خۆیانەوە بەرێژەی ٥٤,٦ ٪ دەنگیان بەهەمان مەبەستدا.

لەبەرواری ٢٤ / ٧ / ٢٠٠٢ دا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی رەزامەندی خۆی دەربری لە بەئەندام بوونی سویسرا لەنەتەوە یەکگرتووەکان وبووە ١٩٠ هەمین ئەندامی ئەو رێکخراوە.

وەزیرە سویسرییەکان بەنۆبە سەرۆکایەتی وڵات دەگرنە دەست، شایەنی باسە پۆستی سەرۆکی وڵات رەمزییە، لە کۆتایی دوایین مانگی ساڵدا پەرلەمانی سویسرا سەرۆکێك لەنێوان وەزیراندا هەڵدەبژێرێ. ئەویش لەلایەن خۆیەوە لە یەکی مانگی یەکی ساڵی نوێ پۆستی سەرۆکی وڵات دەگرێتە دەست ودەبێتە سەرۆکی ئەو حکومەتە کە لەحەوت وەزیر

پێك هاتووه.

سویسرا وڵاتێکی دەوڵەمەندە، میللەتیش خاوەنی بەرزترین ئاستی ژیانە لەجیهاندا، دوای ئەمریکا، پیشەسازییەکانی بەیەکێك لەپیشەسازییە پێشکەوتوەکانی جیهان دادەنرێت بەهەموو جۆرەکانییەوە بۆیە قازانجێکی لەرادە بەدەر بەئابووری وڵات دەگەیەنێ، سویسرا سوودی لەبێ لایەنی خۆی وەرگرتووە، ئەمە زیاتر لە خزمەتگوزارییە بانکییەکاندا خۆی دەبینێتەوە بۆ وڵاتی خۆی وبۆ ئەو وڵاتانەش کەبایی هێندەی ئاسایش لەوڵاتەکەیاندا نییە بتوانن خزمەتگوزارییە بانکییەکان تەرخان بکات، ئەمە جگە لە پاراستنی نهێنی زانیارییەکانی ژمارەو کۆی داهاتی ئەندامەکانی. بەڵام لەم دواییانەدا یەکێتی ئەوروپا جەختی لەسەر ئاشکرا کردنی سیستەمی زانیارییەکانی لەبانکەکانی سویسرا دەکرد بەشێوەیەك بتوانن لەرێی تۆڕی ئینتەرنێتەوە گەندەڵی باج نەهێڵن جگە لە چارەسەری کێشەکانی شتنەوەی پارە سەرچاوە نادیارەکان. بەڵام سویسرا پاراستنی ئەو نهێنیانە بەنهێنی سەرکەوتنەکانی خۆی دەزانێت و وای باس لێوە دەکات بەهۆی پەیڕەو کردنی ئەو جۆرە سیستەمانەوە توانیویەتی رێژەی هەژاری لەوڵاتەکەیدا بگەیەنێتە کەمترین ئاست. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە هەژار لەو وڵاتەدا نەبێ، چونکە لەم دواییانەدا ئامارە فەرمییەکانی ئەو وڵاتە ئاشکرایان کردووە کە زیاتر لە ١٢٠ هەزار منداڵی سویسری لەژێر هێڵی هەژاریدا ژیان بەسەر دەبەن، بەهۆی کەمی داهاتی خێزانەکانیان.

کشتوکاڵی زیاتر لە سێ لەسەر پێنجی پێویستییەکانی دانیشتوانی وڵاتی دابینکردووە. چالاکیە گەشتوگوزارییەکانیش بەشدارییەکی بەرچاویان هەیە لە تێکڕای داهاتی ئەو وڵاتە.

لەسەر روویەکی دراوی ئاسنی سویسرا و لەسەر پولەکانی ولەسەر تابلۆی ئۆتۆمبێلەکانی ناوی هلڤستیا نووسراوە، ئەم ناوەش ئاماژە بەناوی دانیشتوانە رەسەنەکانی سویسرا دەدات، هلڤاسییەکان، کە بەرەچەڵەك لە خێڵە سلتییەکانن.

جەژنی نیشتیمانی: ١ / ٨ ی هەموو ساڵێك.

سروودی نیشتیمانی: بەسەر چیاکانەوە، کاتێ خۆر مژدەی رۆژێکی نوێ دەدات.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢٦٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣٧,١٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢ .

## سیرالیۆن

**ناوی باو:** سیرالیۆن.

**ناوی فەرمی:** کۆماری سیرالیۆن.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Sierra Leone.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٨ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٢٧،٦٩٩ میل دووجا، ٧١،٧٤٠ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤،٤٢٤،٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٦١،٧ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، کەلەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن گرنگترینیان: میندی، تیمنی.

**ئاین:** موسڵمان ٦٥ ٪ ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، مەسیحی.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** فریتاون

**شارە سەرەکییەکان:** بو، ماکینی، کیناما، لنجی، کوادۆ.

**دراو:** لیۆن.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی بارانێکی زۆری لێ دەبارێت. نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٥ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠٠ سم ( یەکێکە لەو ناوچانەی کەبارانێکی زۆری لێدەبارێت لەچاو ڕۆژئاوای ئەفریقیا) وزیاتر لەوەرزی زستاندا دەبارێت. باکووری ڕۆژهەلاتی وڵات بارانی کەمتر لێ دەبارێت ( ١٩٠ سم – ٢٥٠ سم )، بەلام ناوچەیەکی گەرمترە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** کاکاو، مەنیهۆت، قاوە، زەنجەفیل، پرتەقاڵ، زەیتی دارخورما، بستەی عەبید، برنج، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** بەرهەمەکانی دارو تەختە، چنین، درووستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** کرۆم، ئەڵماس، ئاسن، بۆکسیت، دووەم ئۆکسیدی تیتانیۆم.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

سیرالیۆن وڵاتیکی ئیسلامییە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەفەریقیا. غینیا دەکەوێتە باکوور و ڕۆژهەلاتی ولیبیریا دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەلاتی، زەریای ئەتڵەسیش دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوا و ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکچڕی هێڵی درێژی ١٢ بەرەو ڕۆژئاوا

لەگەڵ هێڵی پانی ٨/٣٠ بەرەو باكوور.

زەلكاوەكان زۆربەی شریتی كەنارەكانی دادەپۆشی، بەدرێژی ٣٢ كم بەرەو بەشە ناوخۆییەكانی وڵات درێژ دەبێتەوە. دوای ئەو دەشتە كەنارییەكان بەدرێژایی ١٦٠ كم لەناوخۆی وڵاتەوە تادەگاتە باكووری رۆژهەڵاتی وڵات ولەگەڵ بانە بەرزەكاندا یەك دەگرنەوە وزیاتر لەنیوەی رووبەری وڵاتیان داگیركردووە. چیای كۆمامانسا بەبەرزترین لوتكەی سیرالیۆن دادەنرێت وبەرزییەكەشی دەگاتە ١،٩٤٨ م لەسەر ئاستی رووی دەریا.

پۆرتۆگالیەكان لەساڵی ١٤٦٠ دا گەیشتونەتە ناوچەكە، لەسەرەتای سەدەی شانزدەیەمەوە كەشتییە بازرگانیە ئەوروپیەكان ئەو ناوچەیەیان كردۆتە سەنتەرێك بۆ گواستنەوەی بەسەدان كۆیلەی ئەفریقی بەرەو ئەمریكا. لەدوای ساڵی ١٧٢٥ خێڵە فولانییەكان كە لەرۆژهەڵاتی سیرالیۆنەدا ژیاون ئاینی ئیسلامیان بەدانیشتوانی ئەو ناوچەیە ناساندووە وتوانیویانە لەژێر ئاڵای ئیسلامدا كۆیان بكاتەوە. لەگەڵ ئەوەی ئاینی مەسیحی لەنێو دانیشتواندا بەربڵاو بوو، بەڵام زیاترینی بێ باوەڕەكان دەستیان كرد بەپەیڕەو كردنی ئاینی ئیسلام.

لەساڵی ١٧٨٧ دا یەكێك لەو كۆمەڵە بەریتانیانەی كە بەرهەڵستییەكی توندی لە بەكۆیلە كردنی ئەفریقییەكان دەكرد، شاری فریتاونی دامەزراند وزیاترینی ئەو كۆیلانەی لەخۆ گرتبوو كەلە ئەمریكا وئینگلتەراوە ئازاد بوو بوون وگەڕابوونەوە، لەساڵی ١٨٠٨ دا فریتاون بووە داگیركراوەیەكی بەریتانی ولەساڵی ١٨٩٦ دا ناوچەكانی دراوسێی فریتاونیش بوونە پارێزراوەیەكی بەریتانی. لەو ساڵەوە تا ١٩٦١ ، سیرالیۆنییەكان داوای سەربەخۆیی وڵاتیان دەكرد تا لەبەرواری ٢٧ / ٤ / ١٩٦١ لەچوارچێوەی كۆمۆنوێلتی بەریتانی سەربەخۆ بوو، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی رێكخراوی نەتەوە یەكگرتوەكان.

یەكەم سەرۆك وەزیرانی وڵات دوای سەربەخۆیی میلتۆن مارجای بوو، بەڵام ململانێكان لەسەر دەسەڵات گرتنە دەست دوای كۆچی دوایی میلتۆن لە ١٩٦٤ لەنێوان لایەنەكاندا دەستی پێكرد. چەند جارێك كەسایەتییە سەربازی ومەدەنییەكان دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، تا كاپتن ڤالنتین ستراسر كودەتایەكی كردە سەر حكومەتەكەی جۆزێف مۆموە لەساڵی ١٩٩٢ ، لەئاكامدا وڵات خزایە نێو شەڕێكی ناوخۆوە لەنێوان هێزە حكومییەكان وهێزە یاخیبوەكان بەسەرۆكایەتی بەرەی شۆڕشگێڕی یەكگرتوو كە فودای سەنكوح سەرۆكایەتی دەكرد ودەستی بەسەر كانگاكانی ئەڵماسی ئەو وڵاتە گرتبوو. نزیكەی ٥٠،٠٠٠ كەس لەدانیشتوانی سیرالیۆن بوونە قوربانی ئەو شەڕە ولەناوبردنی موڵك وماڵێكی زۆری ئەو وڵاتە. شەڕی ناوخۆ لە سیرالیۆندا تا بەرواری هەڵبژاردنی ئەحمەد تیجان كەباح لە ١٧ / ٣ / ١٩٩٦ ی خایاند، لەهەمان ساڵدا، دوای هەڵبژاردنی ناوبراو

ڕێکەوتننامەیەکی ئاشتی لەنێوان لایەنە بەشەڕ هاتووەکاندا واژۆ کرا. بەڵام هێندەی نەخایاند شەڕ شێوازی توندتری لەخۆ گرتەوە وهەڵگیرسایەوە، دڕندەیی ئەو شەڕە ناوخۆیە گەیشتە ئاستێك یاخیبووان دەست وقاچی دیلەکانیان بەتەور دەقرتان، زۆربەی وڵاتانی جیهان وتەواوی وڵاتانی ئەفریقیا وەك ناوبژیوان ڕۆڵێکی بەرچاویان بینی بۆ کۆتایی هێنان بەو شەڕە ناوخۆیە، لە بەرواری ٢٤ / ٥ / ١٩٩٩ دا گەیشتنە ئەنجامدانی ئاگربەست ولێپرسراوانی وڵاتانی ڕۆژئاوای ئەفەریقیا گەیشتنە وڵاتی تۆگۆی دراوسێ بۆ گفتوگۆ لەگەڵ لایەنە پەیوەندیدارەکان بۆ گەیشتن بە ئەنجامێك بۆ کۆتایی هێنان بەو شەڕە لەناوبەرەی کە نزیکەی هەشت ساڵی خایاند، تەواوی لایەنە یاخی بووەکان ڕەزامەندیان لە بەردەوام بوونی ئاگر بەست ڕاگەیاند.

لەبەرواری ٧ /٧ / ١٩٩٩، لە لومی پایتەختی تۆگۆ، هەریەك لە سەرۆکی سیرالیۆن ئەحمەد تیجان کەباح و سەرکردەی یاخیبوان فودای سەنکوح ڕێکەوتننامەی ئاشتیان مۆر کرد، لە ڕێکەوتننامەکەدا هاتبوو کە دەسەڵاتەکان لەنێوانیاندا بەش بکەن. بەپێی ڕێکەوتننامەکە بەرەی شۆڕشگێڕی یەکگرتوو بەچوار وەزیر وچوار جێگری وەزیر بەشداری لەحکومەتی نوێدا دەکەن، هەروەها فودای سەنکوحیش کرایە سەرۆکی لیژنەیەك چاودێری لەکەرتی کانگا دەوڵەمەندەکان دەکات، هەروەها لەڕێکەوتننامەکەدا ئاوەدانکردنەوەی وڵاتیش باسیکی بەرچاوی هەبوو. ڕێکەوتننامەکە لەلایەن چوار سەرۆکی وڵاتە ئەفریقییەکان و نوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان وباڵوێزی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وبەریتانیا لە فریتاون وەك ناوبژیوان وشایەتحاڵ واژۆکرا.

بەڵام ڕێکەوتننامەکە چەند بڕگەیەکی گرتبوەوە خۆ لەلایەن ڕێکخراوە مرۆییەکان ونەتەوە یەکگرتوەکانەوە ڕەتکرایەوە، ئەویش لێبوردن بوو لەو تاوانبارانەی کەجینۆسایدیان لەکاتی شەڕی ناوخۆدا پەیڕەو کردووە.

لەبەرواری ٢٢ / ١٠ / ١٩٩٩ دا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بەکۆی دەنگ ڕەزامەندی خۆی دەربڕی لەبڵاوکردنەوەی هێزەکانی ئاشتی پارێزی نێودەوڵەتی لە سیرالیۆن کە لەشەش هەزار سەرباز پێك هاتبوو.

بەڵام لەگەڵ تەواوی ئەو هەوڵانە شەڕ وپێکدادانەکان لەنێوان هێزە حکومیەکان وهێزە یاخیبوەکانەوە بەردەوامی بەخۆوە بینی، تا لە مانگی پێنجی ٢٠٠٠ دا سەرکردەی یاخیبوان فودای سەنکوح لەلایەن هێزە حکومیەکانەوە دەستگیر کراو مامەڵەی دیلی جەنگی لەگەڵدا کرا، سەرۆکی وڵاتیش ئەحمەد تیجان کەباح لەلایەن خۆیەوە داوای کرد زۆر بەپەلە سەنکوح بدرێتە دادگا.

لە ١٢ / ١١ / ٢٠٠٠ دا لە ئەبوجای پایتەختی نیجیریا، لەلایەن ئەحمەد تیجان وەك

سەرۆکی وڵات وبەرەی شۆڕشگێڕی یەکگرتوو ڕێکەوتننامەیەکی سەرتاسەری ئاشتی واژۆ کرا، شایەنی باسە سەرۆکی پازدە وڵاتی ئەفریقی ونوێنەرانی نەتەوە یەکگرتوەکان وهێزەکانی ئاشتی پارێزی سیرالیۆن لەرێکەوتننامەکەدا بەشدار بوون. هەروەها لە ٨ / ٨ / ٢٠٠١ دا تەواوی هێزە چەکدارەکان چەکەکانیان دامالی وئاگربەستی یەکجارەکییان ڕاگەیاند.

لە ١٨ / ١ / ٢٠٠٢ دا سیرالیۆنییەکان بەفەرمی کۆتاییان بەشەڕی ناوخۆ هێنا وهەستان بەسوتاندنی جبەخانەیەکی گەورەی چەکەکان نزیک فرۆکەخانەی لۆنجی لەدەرەوەی پایتەخت وسەرۆکی وڵاتی ئەحمەد تیجان کەباح لەوتەیەکیدا بەم بۆنەیەوە ڕایگەیاند کە شەڕی ناوخۆ کۆتایی پێهات.

لەبەرواری ١٩ / ٥ / ٢٠٠٢ دا سەرلەنوێ ئەحمەد تیجان کەباح بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرایەوە.

ناوی وڵات، سیرالیۆن لەلێکدانی دوو وشەی پۆرتۆگالییەوە هاتووە سیرا: بەمانای لوتکە یان چڵەپۆ دێت، لیۆن: بەمانای شێر یان لانەی شێر دێت، بەمەش سیرالیۆن بەمانای لوتکەی شێران دێت. ئەم ناوەشی لەلایەن دۆزەرەوەی پۆرتۆگالی بیدرۆ سانترا لێنراوە لەساڵی ١٤٦٢ بۆ نزیک کردنەوەیەك لەنێوان دەنگی هەورە گرمەی سەر لوتکەی چیاکان ونەڕەی شێرەکانی، بەڵام لەلایەن خەڵکی وڵاتەوە سیرالیۆن بە ڕۆمارۆنج ناودەبرێت بەمانای چیاکان.

سیرالیۆن ڕواڵەتێکی کشتوکاڵی پێوە دیارە، بەڵام نالەباری زەوییەکان وکەمی بابەتەکانی جوتیاری ئاستی ئەو وڵاتەی لەو بوارەدا زۆر دابەزاندووە.

سیرالیۆن بەپلەی دەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی ئەڵماسدا، ئەمەش هۆکاری سەرەکیی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی ئەو وڵاتە بووە وبەیەکێك لەوڵاتە هەژارەکان دادەنرێت، ڕێژەی فرۆشتنی سیرالیۆن لەم بەرهەمە دەگاتە ٥٠٪ ی کۆی داهاتی نەتەوەیی، هەروەها بەپلەی سیانزدەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەدەرهێنانی بۆکسیت.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٧ / ٤ ی هەموو ساڵێك ( ڕۆژی سەربەخۆیی ).

سروودی نیشتیمانی: خەونی ئازادی

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٦٩٨ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٩ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨٥ .

## سۆماڵ

**ناوی باو:** سۆماڵ.

**ناوی فەرمی:** کۆماری سۆماڵی دیموکراسی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Somali Democratic Republic.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٣ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٢٤٦ میل دووجا، ٦٣٧,٠٠٠ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١١ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** سۆماڵی، عەرەب، بانتۆ.

**ئاین:** موسڵمان ١٠٠ ٪ .

**زمان:** سۆماڵی، عەرەبی، هەروەها زمانی ئیتالیش بەزمانێکی فەرمی دادەنرێت.

**پایتەخت:** مەکادیشۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** هرجسیا، کیسمایۆ، بەربەرە، مارکا، گورۆی، گالکەعبۆ، بۆساسۆ.

**دراو:** شلنی سۆماڵی.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی، گەرم ووشکە، گۆرانکارییەکان لەپلەکانی گەرما لە وەرزەکانی ساڵدا زۆر لاوازە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە باکوور لەنێوان ٣٠ بۆ ٤٠ پلەی سەدی دەبێت، لەباشوور لەنێوان ١٨ بۆ ٤٠ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لەنێوان ٤ سم بۆ ٤١ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** دانەوێڵە، مۆز، قامیشی شەکر، لۆکە، پاقلە، بستەی عەبید، ڕاوەماسی، بەخێوکردنی مەڕو ماڵات.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** درووستکراوە خۆراکییەکان، چیمەنتۆ، پاڵاوتنی نەوت، چنین، دروستکراوەکانی پێست.

**سامانی کانزایی:** یۆرانیۆم، تەنەکە، کوارتز، ئاسن، مس، پیترۆل، فۆسفات.

### تێڕوانینێکی گشتی:

سۆماڵ وڵاتیکی عەرەبی ئیسلامییە، دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئەفەریقیا لەو ناوچەیەی کە بەکەڵەشاخی ئەفریقی دەناسرێت. کەنداوی عەدەن دەکەوێتە باکووری، زەریای هیندی دەکەوێتە ڕۆژهەڵات وباشووری و کینیا دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای، ئیسیوپیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، هەروەها جیبۆتیش دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای.

ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبری هێڵی درێژی ٤٨ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٨ بەرەو باکوور.

بەشێوەیەکی گشتی تەختی سۆماڵ شێوەی بانێکی بەرزی لەخۆگرتووە، چیاکانی لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوای بەدرێژایی کەنداوی عەدەن تێپەڕ دەبن، دەشتی غۆبان چیاکان لە کەنارەکان لێك جیادەکاتەوە و وشەی غۆبانیش بەزمانی وڵاتەکە بەمانای زەوییەکی وشك وسوتاو دێت بەهۆی کەمی ڕێژەی بارانەکانی ئەو ناوچەیە وبەرزی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ.پانتایی دەشتی غۆبان لە ٣ کم بۆ ٦٠ کم دەبێت. ڕوبارەکانی جوبا و شبیلیش بەباشووری وڵاتدا تێدەپەڕن وهەردوکیان لە بانی ئیسیوپیاوە هەڵدەقوڵێن. ڕوباری جوبا دەرژێتە نێو زەریای هیندی لەنزیك بەندەری کسمایۆ، بەڵام ڕوباری شبیلی بەهۆی بەرزاییە بەلم داپۆشراوەکان ناگاتە زەریا، ئەمەش لەساڵی ١٩٩٧ دا بووە هۆی لافاوێك زەرەر وزیانێکی گیانی زۆری گەیاند جگە لەناوبردنی مەڕو ماڵاتێکی زۆری دانیشتوانی ئەو ناوچەیە.

سۆماڵ خاوەنی مێژوویەکی دوور ودرێژە، پسپۆران چەند جۆرە چەکێکیان دۆزیوەتە مێژووی دروستکردنی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردین، هەروەها هەندێك لەمێژوو ناسان دەڵێن کە سەرەتای بازرگانیکردنی بخوور لەوڵاتی بۆنتەوە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٨٠٠ پ.ز بەدواییدا گەشتە بازرگانیەکان دەستی پێکردووە.

عەرەبە ئیسلامەکان لەسەدەی دەیەمدا گەیشتونەتە کەنارەکانی سۆماڵ، ئیتر لەو سەردەمەوە تەواوی دانیشتوانی ئەو ناوچەیە پەیڕەوی ئاینی ئیسلامیان کردووە. لەنێوان سەدەکانی سیانزدەیەم وشانزدەیەمدا چەند شەڕێك لەنێوان سۆماڵە ئیسلامەکان ومەسیحە حەبەشییەکاندا هەڵگیرساوە، بەهۆی سەرکەوتنی ئیسلامەکانەوە حەبەشییەکان لەساڵی ١٥١٥ دا پەنایان بردۆتە بەر پۆرتۆگالییەکان. لەنیوەی سەدەی نۆزدەیەمدا میسرییەکان گەیشتونەتە کەنارە سۆماڵیەکان، بەڵام دیارە ئەمە بەریتانییەکانی بێزار کردووە ومیسرییەکان ناچار کراون بکشێنەوە. لەنێوان ساڵەکانی ١٨٨٤ – ١٨٨٧ بەریتانییەکان توانیان ناوچەکانی کۆماری خاکی سۆماڵ داگیر بکەن ( بەشی باکووری سۆماڵ ) وکردویانەتە سۆماڵی لاند، یان سۆماڵی بەریتانی. لەساڵی ١٨٨٤ دا فەڕەنساش بەشێکی دیکەی ئەو وڵاتەی داگیر کردووە وناوی ناوە سۆماڵی فەڕەنسی، واتا ئەو ناوچەیەی کە لەدواییدا لەفەڕەنسا سەربەخۆ بووە وناوی لێنراوە جیبۆتی. لەساڵی ١٨٨٥ دا حەبەشە ( ئیسیوپیا لە دواییدا ) هەرێمی ئۆجادینی داگیری کردووە وبەپێی ڕێکەوتننامە سنوورییەکانی نێوان حەبەشە وبەریتانیا حەبەشە توانیویەتی دەسەڵاتی ناوچەکە بگرێتە دەست. لەساڵی ١٨٨٩دا ئیتالیا توانیویەتی بەشی باشووری سۆماڵ داگیر بکات وناوی ناوەی سۆماڵی ئیتالی.

لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا ئیتالیا توانیویەتی سۆماڵی بەریتانی داگیر بکات

لەساڵی ١٩٤٠ دا. بەڵام بەریتانیا توانی ئیتالیەکان لە ١٩٤١ دا تێکبشکێنێ وجگە لەبەشەکەی خۆی سۆماڵی ئیتالیشی داگیر کردەوە وتا نزیکەی ١٩٤٩ دەسەڵاتی بەسەردا گرتووە. لەسەرەتای ساڵی ١٩٥٠ کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان سۆماڵی خستۆتە ژێر راسپاردەیی ئیتالیا بۆ ماوەی ١٠ ساڵ.

لە بەرواری ٢٦ / ٦ / ١٩٦٠ کۆماری خاکی سۆماڵ ( سۆماڵی بەریتانی ) سەربەخۆیی دەستگیر بووە و لە ١ / ٧ / ١٩٦٠ دا بەشی باشووری سۆماڵ ( سۆماڵی ئیتالی ) ش سەربەخۆ بووە، دوای ئەوە هەردوو بەشی باکوور وباشوور یەکیان گرتەوە ولەژێر ناوی کۆماری سۆماڵی دیموکراسی راگەیەنراوە و ئادەم عبدالله عوسمان بۆتە سەۆکی کۆمار. لە ٢٠ / ٩ / ١٩٦٠ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، هەروەها لە ١٤ / ٢ / ١٩٧٣ دا پەیوەندی کردووە بە کۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەکانەوە.

لە ساڵی ١٩٦٧ دا دکتۆر عەبدولرەشید عەلی شێرمارکی بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژێردراوە، دوای کۆتایی هاتنی ماوەی سەرۆکایەتی ئادەم عبدالله عوسمان، بەڵام لە ١٥ / ١٠ / ١٩٦٩ دا دکتۆر عەبدولرەشید تیرۆر کرا. دوای ئەو بەروارە بەشەش رۆژ، محەمەد سەییاد بەڕێ کودەتایەکی بەئەنجام گەیاندووە وخۆی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، ئەمەش یەکەم هەنگاوەکانی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی ئەو وڵاتە بووە. بەڕێ تا ئەنجام دانی کودەتایەکی سەربازی لەلایەن لایەنە ئۆپۆزسیۆنەکانەوە لەدەسەڵاتدا ماوەتەوە، واتا تا بەرواری ٢٧ / ١ / ١٩٩١ ن و عەلی مەهدی محەمەد بۆتە سەرۆکی وڵات.

بەڵام دەسەڵاتی خێڵەکی وعەشایەری توانی حکومەت بکات بەدوو گروپەوە، گروپێکیان بەسەرۆکایەتی محەمەد فەرەح عیدید و ئەوی دیکەیان بەسەرۆکایەتی عەلی مەهدی محەمەد. شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسا قوربانییەکی زۆری لێکەوتەوە زیانێکی ماددی زۆریشی بە ئابووری سۆماڵ گەیاند، نەخۆشی وهەژاری ونەداری ریزەکانی گەلی ئەو وڵاتەی هەژاند، نەتەوە یەکگرتوەکان لە ساڵی ١٩٩٢ رایگەیاند کە بەپێویستی دەزانێت هێزە نێودەوڵەتییەکان ( لەنێوانیاندا هێزە ئەمریکییەکان ) بگاتە خاکی سۆماڵ وئاستێك بۆ ئەم شەڕە دڕندانەیە دانێت وبتوانێ هێمنی وئاسایش بگەڕێنێتەوە بۆ ئەو وڵاتە. بەڵام لەساڵی ١٩٩٤ دا هێزە نێودەوڵەتیەکان لەسۆماڵدا کشانەوە چونکە نەیانتوانی ئەرکەکانیان بەجێ بهێنن ئاشتی وئارامی سەقامگیر بکەن.

شەڕی ناوخۆ تادەهات توندتر دەبوو، تاکو تەواوی لایەنە بەشەڕ هاتووەکان لە کۆتاییەکانی ١٩٩٧ دا لەقاهیرەی میسر واژۆیان لەسەر رێکەوتننامەی ئاشتی کرد، بەڵام دەست بەجێ شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسایەوە.

لە ٢٧ / ١٢ / ١٩٩٨ دا حسێن عیدید، یەکێ لەسەرکردەی لایەنە بەشەڕ هاتووەکان، رایگەیاند کە تەواوی لایەنەکان ئاشتبونەوەیەکی نیشتیمانیان بەجێهێناوە وبەم زوانە حکومەتێکی راستەقینەی دیموکراسی پێك دەهێنرێت. شایەنی باسە ئەم راگەیاندنە دوای

هەوڵەکانی سەرۆکی لیبیا موعەممەر ئەلقەزافی بۆ کۆتایی هێنان بەکێشەکانی ئەو وڵاتە راگەیەنرا.

سۆماڵ بەچەند ناوێك ناسراوە، میسرییەکان پێیان وتووە: خاکی بۆنت، رۆمانەکان پێیان وتووە خاکی بۆنە خۆشەکان، بەڵام ناوی سۆماڵ بەزمانی سۆماڵیەکان خۆیان بەم مانەیە دێت: برۆ مەڕەکە بدۆشە وشیرەکەی بدە میوانەکان، هەروەها مانایەکی دیکەش دەبەخشێت: میللەتێك خاوەنی مەڕو ماڵاتێکی زۆر بێت.

ئابووری سۆماڵ بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بەسامانە ئاژەڵییەکان بەستووە، ئەو زەویانەی بۆ لەوەڕ سوودیان لێ وەردەگیرێت نیوە رووبەری وڵاتیان داگیر کردووە. رێژەی ئەو کەسانەی سەرقاڵی شوانین لەسۆماڵدا بە ٦٠ ٪ ی دانیشتوان دادەنرێت. سامانی ئاژەڵداری سۆماڵ بە ٤٠ ملیۆن سەر مەڕ و٢٠ ملیۆن سەر مانگا و ٨ ملیۆن سەر حوشتر دەخەملێنرێت.

لەساڵی ٢٠٠٢ دا هەواڵەکان لەو وڵاتەوە ئاشکرایان کرد کە کارەساتێکی ئابووری گەورە بەرێوەیە بەهۆی ئەو وشکە ساڵیەی کە پێشبینی دەکرێت روویان تێدەکات، بەهۆی نەبوونی ئاسایش و نالەباری بارودۆخەکان تەواوی یارمەتییە نێودەوڵەتیەکان راگیران کڕینی مەڕو ماڵات لە سۆماڵ راگیرا بەهۆی بڵاوبونەوەی نەخۆشی لەنێوانیاندا.

ئەوەی زیاتر قوڕەکەی خەستکردەوە ئەوە بوو کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ٧ / ١ / ٢٠٠١ دا دەزگای بەرەکەتی سۆماڵ ( دەزگایەکە بۆ حەواڵەکردنی ئەو پارانەی لەدەرەوەی وڵاتەوە سۆماڵیەکان پارەی لێوە دەنێرنەوە وڵاتەکەیان ) لە ریزبەندی دەزگا تیرۆریستەکانەوە داناوە، ئەمەش تاکە سەرچاوەی ناردنی پارەی لەدەرەوەی وڵاتەوە راگرت. نەخۆشی ونەداری وهەژاری ومەینەتی دانیشتوانی ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە، ئەمانە هەمووی بەهۆی گێلی ونەفامی سەرکردەکانی ئەو وڵاتە لەخراپی مامەڵەکردنیان لەگەڵ کێشە سیاسیەکاندا.

جەژنی نیشتیمانی: ١ / ٧ ی هەموو ساڵێك ( راگەیاندنی کۆماری سۆماڵی دیموکراسی ).

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٨٣٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٠٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨٩ .

## چین

ناوی باو: چین

· ناوی فەرمی: کۆماری گەلی چین

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Peoples Republic of China.

سیستەمی حوکمرانی: کۆماری میللی خاوەن یەک حیزب ئەویش حیزبی شیوعییە، سەرۆکی ولات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە.

دەستەی یاسا دانان: ئەنجومەنی گەلی نیشتیمانی ( ٢٩٣٨ ئەندام ).

رووبەر: ٣,٧ ملیۆن میل دووجا، ٩,٦ ملیۆن کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ١,٢٧٦,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا سالی ٢٠٠١ ) ، لەگەل رەچاوکردنی دابەزینی ئەو ژمارەیە بەهۆی سیاسەتی دیاریکردنی خستنەوەی منالەوە کە رێگا بەخێزانی چینی دەدات تەنها یەک منال بخەنەوە، جگە لەکەمایەتی وبیانییەکان کەبۆیان هەیە منالێک زیاتر بخەنەوە.

چڕی دانیشتوان: ١٣٢ کەس/کم٢

کۆمەلە نەژادییەکانی ئەو ولاتە: هان ٩٢ ٪ ، جگە لەچەند کەمایەتییەکی دیکە، لەوانە: تیبتی، مانشۆیی، مەنگۆلی، کۆرین . ژمارەی نەتەوەکانیشی زیاتر لە ٥٦ نەتەوەن.

ئاین: کۆنفۆشی، تاویی، بوودی، هەروەها ئیسلام ومەسیحیش.

زمان: ماندرین، هەروەها بەچەند ناوێکی دیکەش دەناسرێت، لەوانە: چینی، ئەلهان، بۆتۆنگوا.

پایتەخت:پەکین.

شارە سەرەکییەکان: شەنگهای، کانتۆن، تینتس، تیانجین، شنیانگ، ووهان، شنگتۆ، شین یانگ، نانکین.

دراو: یوان.

ئاو وهەوا: بەهۆی بەرفراوانی رووبەری چینەوە چەند ناوچەیەکی جیاوازی ئاو وهەوای لەخۆ گرتووە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزۆربەی ناوچەکانی ولاتدا ٢٧ پلەی سەدی دەبێت ورێژەی سالانەی بارانەکان ١٠٠ سم دەبارێت. لەباکووری ولاتدا نەبێت ( ئەویش بەشێوەیەکی کەم ) بەفر لەو ولاتە نابارێت. ئاو وهەوای ناوچە بیابانییەکانی: جوبی، تاکلمان وشکە.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: برنج، گەنم، گەنمەشامی، جۆ، هەرزن، چا، لۆکە، بستەی عەبید، پاقلە، لاستیك، پەتاتە، پەتاتەی شیرین، سەوزە ومیوە، پەلەوەر، بەخێوکردنی مانگا وبەراز ومەڕو ماڵات، راوەماسی، قامیشی شەکر.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئاسن، پۆلا، دروستکردنی ئامێری ئەلەکترۆنی- کارەبایی- ئامێرەکان، چنین، پۆشاك، دروستکراوە خۆراکییەکان، دروستکراوە کیمیاییەکان، چیمەنتۆ، یاری منداڵان.

سامانی کانزایی: خەڵووزی بەردین، نەوت، ئاسن، تەنەکە، قوڕقوشم، گاز، مس، ئاڵتون، تەنگستن، ئەنتیمۆن، زنك، بۆکسیت، لینیت.

تێڕوانینێکی گشتی:

چین، وڵاتیکە دەکەوێتە رۆژهەڵاتی ئاسیا، رووسیا ومەنگۆلیا دەکەونە باکووری، کۆریای باکوور دەکەوێتە باکووری رۆژهەڵاتی، دەریای زەرد ودەریای چین دەکەونە رۆژهەڵاتی، ڤێتنام ولاوس ومیانمار وهیند وبۆتان ونیپال دەکەونە باشووری، پاکستان وئەفغانستان وتاجیکستان وکیرجستان وکازاخستان دەکەونە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٥ بەرەو باکوور.

چین بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەرووی ژمارەی دانیشتوانەوە، هەروەها بەپلەی سێهەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە رووی رووبەرەوە، دوای رووسیا وکەنەدا.

بەرزایەکانی تیبت دەکەوێتە رۆژئاوای چینەوە، هەروەها بەرزاییەکانی زنجیانج – تیبت دەکەوێتە ناوچە بیابانییەکانی باکووری رۆژئاوای ئەو وڵاتە ، بەرزاییەکانی رۆژهەڵاتیش دەکەونە سەر سنوورەکانی لەگەڵ رووسیادا، هەروەها لەنێوان سنوورەکانی چین ومەنگۆلیا وبەرزاییە رۆژهەڵاتیەکان بەرزاییەکانی سنوورەکانی مەنگۆلیا وزەوییە نزمەکانی رۆژهەڵاتی تێدەکەوێت، لەنێوان ئەو زەویانە وبەرزاییەکانی تیبت بەرزاییەکانی ناوەڕاستی تێدەکەوێت کە حەوزی ستشوانی لەخۆ گرتووە کە بەپیت ترین زەوییەکانی چینی لەخۆ گرتووە وباشترین چالاکییە کشتوکاڵیەکانی تیا ئەنجام دەدرێت. لەدواییدا بەرزاییە باشوورییەکانی چینیش ناوچەکانی باشووری رۆژهەڵاتی چین دادەپۆشێ. زۆربەی روبارەکانی چین ( کەزیاتر لە ١٥٠٠ روبار دەبن ) لە رۆژئاواوە بۆ رۆژهەڵات تێدەپەڕن، لەوانە روباری یانگستی ( ٦،٣٠٠ کم درێژە وبەسێهەم روبار دادەنرێت لەجیهاندا لە رووی درێژییەوە دوای روبارەکانی نیل وئەمازۆن) ، روباری زەرد ( ٥،٤٦٤ کم ، دووەم درێژترین روباری چین وشەشەم درێژترین روبار لەجیهاندا).

چین دابەش کراوە بە ٢٣ ناوچەوە، ٥ لەوانە خاوەنی ماف ئۆتۆنۆمین، ٤ شارەوانی

مەرکەزی، دوو ناوچەی ئیداری تایبەت: هۆنگ کۆنگ- ماکاو.

چین خاوەنی شارستانێتێکی دێرینە دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی چوار هەزار ساڵ لەمەو بەرەوە. پایتەختەکەی پەکینە وسەنتەری سیاسی وکەلتووری وڵاتە لە ٨٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە. چینییەکان شانازییەکی زۆر بەشارستانێتی خۆیانەوە دەکەن، ئەوان خۆیان داهێنەری قیبلەنما وداهێنەری کاغەز ودرووستکراوەکانی شووشە وسیرامیک ( کە لەزۆربەی ناوچەکانی جیهان بە چینی ناودەبرێت ) و داهێنەری پۆشاکەکانیش.

چەندین خێزانی بەهێز بەدرێژایی هەزاران ساڵ دەسەڵاتی چینیان گرتۆتە دەست. یەکەم خێزان خێزانی هسیا بوون کە لەنێوان ساڵەکانی١٧٦٦ بۆ ٢٢٠٠ ی پ.ز حوکمی چینیان کردووە، دوایین خێزانیش خێزانی کینگی مەنشووری بوون کە لەنێوان ساڵەکانی ( ١٦٤٤ بۆ ١٩١٢ ) دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست.

لەساڵی ١٩١١ شۆرشێك لەچیندا هەڵگیرسا بووە هۆی روخانی دوایین میری خێزانی کینگ و لە بەرواری ٢٦ / ١٠ / ١٩١١ کۆماری چین بەسەرۆکایەتی سن یات سین راگەیەنرا، لە ١٩١٣ دا سن یات سین دەستی بۆ یوان شی کای لەدەسەلات هەڵگرت وئەمیش تا ١٩١٦ دەسەڵاتی گرتە دەست، شایەنی باسە ئەو سێ ساڵە بەماوەیەکی گەندەڵ وپڕ ئاژاوە لەقەڵەم دەدرێت.

لەساڵی ١٩٢٥ دا شەڕی ناوخۆ لەنێوان یاوەرانی رەوتی شیوعی بەسەرۆکایەتی ماو تسی تۆنگ ویاوەرانی سن یات سین کە لەهەمان ساڵدا کۆچی دوایی کرد هەڵگیرسا. لەساڵی ١٩٢٨ تشیانگ کای شیك توانی دەسەڵاتی وڵات بگرێتە دەست، بەڵام هێندەی نەخایاند شەڕ لەنێوان شیوعییەکان وتشیانگ کای شیك هەڵگیرسا. لەساڵی ١٩٣١ دا یابانییەکان مەنشوریای ( باکووری رۆژهەڵاتی چین ) یان داگیر کرد وشەڕی یابان – چین ( ١٩٣١ – ١٩٤٥ ) هەڵگیرسا. جەنگی نێوان یابان وچین ئاستێکی بۆ شەڕی نێوان شیوعییەکان بەسەرۆکایەتی ماو تسی تۆنگ ونیشتیمانییەکان بەسەرۆکایەتی تشیانگ کای شیك دانا.

دوای جەنگی جیهانیی دووەم، شەڕ لەنێوان شیوعییەکان ونیشتیمانییەکاندا بەجۆرێکی نوێ هەڵگیرسایەوە، ماو تسی تۆنگ لەبەرواری ١ / ١٠ / ١٩٤٩ دا دامەزراندنی کۆماری میللی چینی راگەیاند و نیشتیمانییەکان بەرەو دورگەی تایوان ( فۆرمۆزا ) هەڵهاتن و لەوێدا لە ٨ / ١٢ / ١٩٤٩ حکومەتی چینیان بەسەرۆکایەتی تشیانگ کای شیك راگەیاند وباسیان لەشەرعێتی حکومەتەکەیان دەکرد کە گوایە حکومەتی هەر یەك لەچین وتایوانە. لەبەرواری ٢٥ / ١٠ / ١٩٧١ دا نەتەوە یەکگرتوەکان دانی نا بە کۆماری میللی چین لەبری کۆماری چین، تا ئێستاش حکومەتی چین داوای گەڕانەوەی تایوان دەکات.

یەکەم سەرۆکی کۆماری میللی چین ماو تسی تۆنگ بوو، ماو لە ٢٦ / ١٢ / ١٨٩٣ لەدایك بووە و لەدوای بەرواری ١ / ١٠ / ١٩٤٩ دەسەلاتی چینی گرتۆتە دەست ولەبەرواری ٩ / ٩ / ١٩٧٦ دا کۆچی دوایی کردووە. دوای ئەو دینگ هسیاو بینگ لەنێوان ١٩٧٦ – ١٩٩٢ دەسەلاتی گرتۆتە دەست، دینگ بینگ لە ٢٢ / ٨ / ١٩٠٤ لەدایك بووە ولە ١٩ / ٢ / ١٩٩٧ دا کۆچی دوایی کرد. دوای ئەو جیانگ زیمین ( لەدایك بووی ١٩٢٧ دەسەلاتی گرتۆتە دەست).

لە ساڵی ١٩٥٩ دا هێزە چینییەکان گەیشتونەتە تیبت وناوچەکەیان خستۆتە سەر وڵاتی خۆیان.

لەبەرواری ١٩ / ١٠ / ١٩٦٢ شەڕ لەنێوان چین وهیند دا هەڵگیرساوە لەسەر کێشە سنوورییەکانی سەر چیاکانی هیمالایا.

لەساڵی ١٩٨٩ دا خۆپیشاندان لەنێو شارەکانی چیندا هەڵگیرسا، خۆپیشاندەران داوای دیموکراسی ومافی زیاتریان دەکرد، هێزە حکومیەکان بەگوولەباران وەڵامی داواکارییەکانیان دایەوە وئەوەی نەکوژرا بریندار بوو.

چین لەرووی ئابوورییەوە وڵاتیکی بەبەرهەمهێنەری زۆر بەتوانایە، یەکێکە لە گەورەترین ١٠ وڵاتی بەرهەمێنەر لەجیهاندا، بەم تێکڕای بەرهەمەکانی بە بەراورد لەگەڵ ژمارەی سەرنشینەکانی دەیکاتە وڵاتیکی پاشکەوتوو، زیاتر لەنیوەی وڵاتانی جیهان لە رووی خەرجی ساڵانەی تاکەوە لەو وڵاتە باشترن. حکومەت کۆنترۆڵی تەواوی دەزگا بەرهەمهێنەرەکانی وڵاتی کردووە، بەڵام لەم دواییانەدا چین توانی راپەڕینێکی بەرچاو بەدەست بهێنێ لەرووی بازاڕی ئازاد وکاڵاکانی تەواوی وڵاتانی جیهان بگرێتەوە بەهۆی هەرزانی هێزی کار لەو وڵاتە وئەمەش خۆی لەخۆیدا هەرزانی کاڵاکانی بەخۆیەوە دەبینێتەوە.

لەبەرواری ١ / ١٠ / ١٩٩٩دا چین ئاهەنگی یادی پەنجا ساڵەی دامەزراندنی کۆماری میللی چین گێڕا، شایەنی باسە لە ئاهەنگەکەدا نمایشێکی سەربازی زۆر زەبەلاح ئەنجام درا، سەرباز وئەفسەرانی سوپای نوێی چین بەنوێترین جۆرەکانی چەکەوە بەنێو لێپرساراواندا تێپەڕ بوون. هەر بەو بۆنەوەیەوە سەرۆکی چین جیانگ زیمین لە گۆڕەپانی تیانمین لەپەکین وتارێکی خوێندەوە، لەهەمان ئەو گۆڕەپانەی ماوتسی تۆنگ کۆماری میللی چینی راگەیاند.

لەساڵی ١٥١٣ دا یەکەم کەشتی پۆرتۆگالی گەیشتە ماکاوی سەر کەناری باشووری رۆژهەڵاتی چین، لەساڵی ١٥٧٧ دا ئیمپراتۆریەتی چین دەستی لە ماکاو هەڵگرت بۆ پۆرتۆگالیەکان. لەساڵی ١٩٨٧هەر یەك لە چین وپۆرتۆگال گەیشتنە رێکەوتنێك بەگەڕانەوەی

ماکـاو بـۆ ئـامێزی چـین لەکۆتاییـەکانی ١٩٩٩. بۆیـە لەبـەرواری ٢٠ / ١٢ / ١٩٩٩ ماکـاو خرایەوە سەر چین.

هۆنگ کۆنگی سەر کەناری باشووری رۆژهەڵاتی چین لەسەرەتای ساڵی ١٨٤٢ کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاوە. لەبەرواری ١٩٨٤ هەر یەك لەچین وبەریتانیا گەیشتنە رێکەوتنێك بۆ گەڕانەوەی هۆنگ کۆنگ بۆ چین. لەبەرواری ١ / ٧ / ١٩٩٧ هۆنگ کۆنگ خرایەوە سەر چین.

چینییەکان بـەوڵاتی خۆیـان دەڵـێن: تـسوانگوا، کـە بـەزمانی چـینی بـەمانای وڵاتـی ناوەڕاست، یان: هـەر شتێك لـەژێر خۆردا بێت، دێت. ئـەم ناوەش دەگەڕێتـەوە بۆ ئـەوەی خـەڵکی ئـەو ناوچـەیە زوو وایـان زانیـوە کەوڵاتەکـەیان دەکەوێتـە ناوەڕاسـتی وڵاتـانی جیهانەوە، ئەوان تاکە میللەتن کەخاوەنی شارستانیەت بن.

لەبەرواری ٩ / ١١ / ٢٠٠١ دا چین بە ئەندامی ژمارە ١٤٣ لەرێکخراوی بازرگانی جیهانی وەرگیراوە.

لەساڵی ٢٠٠٢ دا چین دەستی کرد بەڕاکێشانی هێڵێکی بۆری گاز بەدرێژی ٤٢٠٠ کم و بری تێچوونی ١٨ ملیار دۆلار، هێڵەکە لەناوچەی شنگیانگەوە، کەناوچەیەکی دەوڵەمەندی گازە لەباکووری وڵات دەگەیەنرێتە ناوچەی شەنگهای و بەناوچەی بیابانی تاکلماندا تێپەڕ دەبێت، شایەنی باسە ئەمە بەیەکێك لەکارە هەرە زەبەلاحەکانی جیهان دادەنرێت.

چین بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی لۆکە وگەنم وتووتن وئاوریشم وبرنج وبەخێوکردنی بەراز وراوەماسی ودەرهێنانی خەڵووز وتەنەکە وسیر، هەروەها بەپلەی دووەم دێـت لـەنێو وڵاتـانی جیهانـدا لەبەرهـەمی هـەنگوین وچـا وپەتاتـە وگەنمەشـامی وبـەخێوکردنی مـەڕ وزنـك، هـەروەها بەپلـەی سـێهەم دێـت لـە بەرهـەمی ئۆتۆمبێـل ومیـوە وخووری وداروتەختە ولینیت وقوڕقوشم، بەپلەی چوارەم دێت لەبەرهەمی قامیشی شەکر وئاسن وبەخێوکردنی مانگا، بەپلەی پێنجەم دێت لەبەرهەمی بۆکسیت ولاستیك، بەپلەی شەشەم دێت لەبەرهەمی پیترۆل وئاڵتون، بەپلەی نۆیەم دێت لە مس وبەپلەی دەیەم دێت لە جۆ.

سروودی نیشتیمانی: رایەڕن ئەی ئەوانەی نەبوونە کۆیلە، بەخوێن وگیانمان شوورایەکی نوێ درووست دەکەین.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٦٣٠ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٥٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٤٢ .

## تاجیکستان

**ناوی باو:** تاجیکستان.

**ناوی فەرمی:** کۆماری تاجیکستان.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Tajikstan.

**سیستەمی حوکمرانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی باڵا ( ١٨١ ئەندام ).

**رووبەر:** ٥٥,٣٠٠ میل دووجا، ١٤٣,١٠٠ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦,٠٥٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٤٢,٠ کەس/ کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تاجیک ٦٣٪ ، ئۆزبەك، رووس، تەتەر، کیرگیز، ئۆکرانی، ئەڵمان.

**ئاین:** موسڵمان.

**زمان:** تاجیکی.

**پایتەخت:** دۆسانبی.

**شارە سەرەکییەکان:** کۆجاندۆ، کۆلۆب، کۆرجۆنیتا.

**دراو:** سۆمۆنی.

**ئاوو هەوا:** نێوەندی پلەکانی گەرما لەناوچە نزمەکاندا لەزستاندا ٢ پلەی سەدی ولەهاویندا ٣٠ پلەی سەدی، بەڵام لەبەرزاییەکان ٢٠ پلەی ژێر سفری سەدی لەزستان و ٢٢ پلەی سەدی لەهاویندا. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** لۆکە، میوە وسەوزە، گەنم، بەخێوکردنی مەڕو ماڵات.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** درووستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** ئەنتیمۆن، خەڵووزی بەردین، مۆلیبدنۆم، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

تاجیکستان، بەمانای وڵاتی تاجیك دێت، وڵاتێکی ئیسلامییە سروشتێکی شاخاویی هەیە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسیا. کیرجستان دەکەوێتە باکووری، چین دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، ئەفغانستان دەکەوێتە باشووری، ئۆزبەکستان دەکەوێتە رۆژئاوا و باکووری رۆژئاوای. هیچ کەنارێکی نییە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧١ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٨ بەرەو باکوور.

زیاتر لە ٩٠٪ ی خاکی تاجیکستان شاخاوییە، نیوەی ئەو رێژەیە زیاتر نزیکەی ٣٠٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزە. چیاکانی بامێر دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ورووباری

بەستەڵەكی، فدشنكۆ كە بەدرێژترین روبارە بەستەڵەكەكانی جیهان دادەنرێت ونزیكەی ٧٧ كم درێـژە بـەو ناوچـەیەدا تێپـەڕ دەبێـت.هـەروەها زنجـیرە چـیاكانی ئـای وتیـان شـان بەناوەڕاستی تاجیكستاندا درێژ دەبنەوە.

كۆمـاری تاجیكـستان لـەرووی ئیدارییـەوە دابـەش دەبێـت بەسـێ ویلایەتـەوە: ویلایـەتی بدخشان كەماڤ ئۆتۆنۆمی پێبەخشراوە، ویلایـەتی خـەتلان، ویلایـەتی لینین ئاباد. زیاتر لـە ٥١ ناوچە سەر بەم سێ ویلایەتەن.

خـەڵكی هـەزاران سـاڵ لەمەوبـەرەوە لەوناوچـەیەدا ژیـاون، هـەر یـەك لەفارسـەكان وئەسكەندەری مەگدۆنی وسلوقییەكان و دەوڵەتی بەختیاری و خێڵە دەشتەكییە چینییەكان و كۆشـان وساسـانییەكان و هۆنـە سـپیەكان و خێڵـە توركـەكان لەسـەدەی شـانزدەیەمی پ.ز بـەدواوە ئـەو ناوچـەیەیان داگـیر كـردووە. لەناوەڕاسـتی سـەدەی حەوتـەمی زایینـەوە سـوپا ئیـسلامییەكان گەیـشتونەتە ناوچـەكە. لەسـەرەتای سـەدەی دەیەمـەوە توركـەكان حـوكمی ناوچەكەیان كردووە، تا مەغۆلەكان بەسەركردایەتی جەنگیز خان لەسـەدەی سـیانزدەیەمەوە داگیریـان كـردووە وتوركـەكانیان كردۆتـە دەرەوە. دوای ئـەوانیش ئۆزبەكییـەكان لەسـەدەی شانزدەیەمەوە تا سەدەی نۆزدەیەم حوكمیان كردووە.

دوای ئەوەی شیوعییەكان لەساڵی ١٩١٧ دا دەسەڵاتی رووسیایان گرتۆتە دەست، لەساڵی ١٩٢١ دا تاجیكستانیان داگـیر كـردووە. دوای پێـك هێنـانی یـەكێتی سـۆڤیەت لـە ١٩٢٢ دا كۆمـاری تاجیكـستانی خـاوەنی ئۆتۆنـۆمی سـۆڤێتی سۆسیالیـستی دامـەزراوە كەسـەر بـە كۆمـاری ئۆزبەكستانی سـۆڤیەتی سۆسیالیتیە. لەساڵی ١٩٢٩ دا چەند ناوچـەیەكی كـەش خراوەتە سەر تاجیكستان، بۆیە بووە بەكۆماری تاجیكستانی سۆڤیەتی سۆسیالیستی.

لەكۆتایی هەشتاكانی سەدەی بیستەمدا، چەند كۆمەڵەیەكی ئۆپۆزسیۆن دەستیان كردووە بە خۆپیشاندانی ئاشكرا لـەدژی دەسـەڵاتی شیوعی لەوڵاتەكـەدا، داوای مـاف وئازادییـەكی زیاترین دەكرد لەبەڕێوەبردنی كاروباری ناوخۆی وڵاتەكەیان. لەگەڵ هەڵوەشانەوەی یـەكێتی سـۆڤیەت، لـە ١٩٩٠ دا، تاجیكییـەكان رایانگەیانـد كەیاسـای سـەربەخۆی خۆیـان پـەیڕەو دەكـەن لـەبری یاسا سۆڤیەتییەكان. لـە ٩ / ٩ / ١٩٩١ دا تاجیكستان سـەربەخۆیی خـۆی لـە یـەكێتی سـۆڤیەت راگەیانـد وحیزبـی شـیوعی هەڵوەشـایەوە. لـە ٢٤ / ١١ / ١٩٩١ دا گـەلی تاجیكـستان پـاڵێوراوی شـیوعی رەحمـون نبییفـی بەسـەرۆكی وڵات هەڵبـژارد لەیەكـەم هەڵبژاردنی سەرۆكایەتیدا لەو وڵاتە، دوای ئەوەی كە كاخار مخاكۆف بەهۆی فشارێكی زۆر گەلـەوە دەسـتی لـەكار كێشایەوە. لەكۆتایی هـەمان ساڵدا، تاجیكستان پەیوەنـدی كـرد بـە یەكێتی وڵاتە سەربەخۆكانەوە.

بـەڵام لـە ساڵی ١٩٩٢ هەڵگیرسـانی شـەڕی نـاوخۆ لـەو وڵاتـەدا زۆر نزیـك بـوو بـۆوە، بۆیـە پەرلـەمان لـە ٢٠ / ١ / ١٩٩٢ دا هەڵوەشـانەوەی حیزبـی شـیوعی رەتكـردەوە ورێگـەی بەگەڕانەوەی دا بۆ گۆڕەپانی سیاسی. بەڵام هێندەی نەخایاند شەڕێكی زۆر گەورە هەڵگیرسا

لەنێوان، هێزەکانی یەکێتی ولاتە سەربەخۆکان لەلایەکەوە، هێزە ئۆپۆزسیۆنەکانی تاجیکستان لەلایەکی کەوە ونزیکەی ٥٠,٠٠٠ قوربانی لێکەوتەوە، جگە لە ئاوارە بوونی زیاتر لە نیو ملیۆن هاولاتی تاجیکی لەناو ولاتەکەدا وئاوارە بوونی زیاتر لە ٧٠٠,٠٠٠ کەس بۆ دەرەوەی ولات. شەڕەکە بووە هۆی وێران بوونی ژێرخانی ئابووری ئەو ولاتە، سەرۆکی تاجیکستان رەحمون نابییفی ناچار کرد لە ٧ / ٩ / ١٩٩٢ دەست لەکار بکێشێتەوە وبۆ سالی دواییش کۆچی دوایی کرد، ئەسکەندەرۆف بەشێوەیەکی کاتی دەسەلاتی گرتە دەست. لە ١٩٩٣ دا ئیمام عەلی رەحمانۆف دەسەلاتی ولاتی گرتەوە دەست، لە ٦ / ١١ / ١٩٩٩ سەرلەنوێ بەسەرۆکی ولات هەلبژێردرایەوە.

شەڕ لەنێوان لایەنە بەجەنگ هاتوەکاندا تا ٢٧ / ٦ / ١٩٩٧ ی خایاند، تا لەمۆسکۆ واژۆ لەسەر رێکەوتننامەیەك لەنێوان سەرۆکی تاجیکی ئیمام عەلی رەحمانۆف و سەرۆکی ئۆپۆزسیۆنی یەکگرتوو سەعید عبدالله نوری کرا، بەئامادەبوونی ژمارەیەك لەنوێنەرانی ولاتانی دراوسێ ونوێنەری تایبەتی نەتەوە یەکگرتوەکان وکۆنگرەی ئیسلامی. لەرێکەوتننامەکەدا هاتبوو کەکۆتایی بەبەرەی سەربازی بهێنرێ ودیلەکانی هەردولا ئالوگۆڕ بکرێن یەکخستنەوەی هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن وهێزە حکومییەکان وپێکهێنانی لیژنەیەك بۆ چاودێری و بەدواداچونی جێبەجێکردنی بەندەکانی رێکەوتننامەکە.

کشتوکالی نزیکەی یەك لەسەر پێنجی داهاتی نەتەوەیی تاجیکستانی گرتۆتە خۆی، لەکاتێکدا پیشەسازی یەك لەسەر سێی ئەو داهاتەی لەسەرە. بەلام رەوشی سیاسی ونائارامی ئەو ولاتە لەدوای سەربەخۆییەوە لەیەکێتی سۆڤیەت بارودۆخی ولاتی بەجۆرێك سەرەوخون کردووە کار گەیشتە ئەوەی کە واپێشنیار بکرێت میللەتی تاجیکی هەرگیز لەدەست جەنگی ناوخۆ رزگاری نەبێت، سەرباری ئەو هەموو مەینەتیانەش کە رووبەڕووی ولات بۆوە ئەو شەپۆلە وشکە سالی وگەرمییەی لەهاوینی ٢٠٠٠ دا لەولاتی دا، بووە هۆی لەدەستدانێکی زۆری بەرهەمە کشوکالیەکان.

لەبەرواری ٣٠ / ١٠ / ٢٠٠٠ دا دراوی سۆمۆنی جێگەی رۆبلی تاجیکی ( بەهەمان بەها ) گرتەوە، ئەمە لەچوارچێوەی ئەو چاکسازیانەی حکومەتی تاجیکی لەپێناوی باش کردنی ژێرخانی ئابووری ولات دەستی داوەتێ.

تاجیکستان بەپلەی سیانزدەیەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی لۆکە.

جەژنی نیشتیمانی: ٩ / ٩ ی هەموو سالێك ( رۆژی سەربەخۆیی ).

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٢,١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٣٢.

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٣٥٠

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٥٨.

## عیراق

ناوی باو:عیراق

ناوی فەرمی: کۆماری فیدرالی عیراق

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of iraq.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نوێنەران

رووبەر: ١٦٩،٢٣٤ کیلۆمەتری چوارگۆشە ٦٥،٣٤٢ مایلی چوارگۆشە

ژمارەی دانیشتوان: ٣٦٥٠٠٠٠٠ بەسەر ژمیری ٢٠٠٩

چڕی دانیشتوان: ١٧١کەس لە کیلۆمەتری چوارگۆشە

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: عەرەب- کورد-تورکمان- ئاشووری

ئاین: زۆربەی موسڵمان- مەسیحی، یەزیدی.

زمان: عەربی- کوردی

پایتەخت: بەغداد

شارە سەرەکییەکان: موصڵ- سلێمانی- هەولێر-دهۆك- بەصرە- کەرکوك- میسان- زیقار- ئەنبار- بابل- نەجەف- کەربەلا-دیالە-واست

دراو: دینار

ئاوو هەوا: لەزۆربەی ناوچەکانی خواروی عێراق گەرمە لەوەرزی هاویندا پلەی گەرما زۆر بەرز دەبێتەوەو بارانی کەمە، بەڵام لەکوردستانی عێراق هەوایەکی خۆش و بارانێکی باش لەوەرزی زستان دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: خورما، گەنمو جۆ، مەڕو ماڵات

بەرهەمە پیشەسازییەکان: زانیاری تەواو لەبەردەستدا نییە

سامانی کانزایی: نەوت-گۆگرد

تێڕوانینێکی گشتی: بەگشتی عێراق وڵاتێکی داڕوخاوە هیچ زانیارییەکی تەواو لەبەردەستدا نیە چونکە گۆڕانکاریەکان بەردەوامن، ڕەنگە نەخشە سیاسی بگۆڕێ.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: روون نیە لەساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دیکە دەگۆڕێ

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٤

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ئەوەش روون نییە.

## عومان

**ناوی باو:** عومان

**ناوی فەرمی:** سەڵتەنەتی عومان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Sultanate of Oman

**سیستەمی حوکمڕانی:** سوڵتانی بۆماوەیی، سوڵتان خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی شورا ( ٨٣ ئەندام )

**رووبەر:** ١١٨,١٥٠ میل دووجا، ٣٠٦,٠٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٢٦٥,٣٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٧,٣ کەس/ کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، ئاسیایی.

**ئاین:** موسڵمان.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** مەسقەت

**شارە سەرەکییەکان:** نەزوا، سەلالە، خەسب، بریمی، سوور.

**دراو:** ریالی عومانی.

**ئاوو هەوا:** گەرم و وشکە لەزۆربەی رۆژەکانی ساڵدا جگە لەناوچە بەرزەکان ودورگەکان. پلەکانی گەرما لەزستاندا ٢٠ پلەی سەدی ولەهاویندا دەگاتە ٤٥ پلەی سەدی. رێژەی شێ تا ئاستێ بەرزە. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٠ سم بۆ ١٥٠ سم دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** میوە وسەوزە، خورما، لیمۆی عومانی، مۆز، گوێزی هیندی، مانگۆ، بابای، بەخێو کردنی مەڕو ماڵات وحوشتر وئەسپ، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین، دەرمان، پێویستی ناوماڵ، پێویستییەکانی پەڕاوگە.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گاز، مس، کرۆم، خەڵووز.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

عومان، ناویشی عومان ومەسقەت بوو، بەڵام لەساڵی ١٩٧٠ دا ناوی بووە عومان ومەسقەتیش بووە پایتەختی، وڵاتیکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە ئەوپەڕی باشووری رۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی عەرەبی. لەباشووری رۆژئاوای ئاسیا، وڵاتی ئیماراتی عەرەبی

یـەکگرتوو و تەنگـەی هـورمز و کەنـداوی عـەرەبی دەکەوێتـە بـاکووری و دەریـای عـەرەب دەکەوێتە باشوور ورۆژهەڵات، یەمەن دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای وسعودیەش دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٥٨ بەرەو رۆژهـەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٢ بەرەو باکوور. چەند دورگەیەکیش سەر بە عومانن بەدرێژایی ١٧٠٠ کم لەسەر کەنارەکانی، گرنگترینیان: دورگەی مەسیرە، دورگەکانی کوریا موریا ( ئەلحەلانیات ).

تایبەتمەندی ئەسترۆنۆمی عومان لەوەدایە زنجیرەیەك چیای بەردەڵانی لەخۆ گرتـووە کە لەشێوەی کـەوانێك لەناوچـەی ( رونـوس ئەلجیبالـەوە تـا ئـەو پـەڕی دورگـەی عـەرەبی لـە باشووری رۆژهەڵاتی عومانەوە درێژ دەبێتەوە. بەرزی چیاکان لەپارێزگای موسەندەم دەگاتە بەرزی ١٨٠٠ م لەسـەر ئاسـتی رووی دەریـا. ئەو ناوچـەیەش کـە دەکەوێتـە سەر کەنـداوی عومـان پێـی دەوتـرێ باتینـە، کـە لەکـەنارێك پێـك هـاتووە نزمبوونـەوەی چـیاکان بـۆ سـەر دۆڵەکان بەپانتایی ٥ – ٨٠ کم و درێژییەکەی ٣٠٠ کم دەبێت. ئەو ناوچانەیش کە دەکەونە رۆژئـاوای بەرزاییـەکان پێیـان دەوتـرێ زاهـیرە ئـەویش دەشـتاییەکە قـوڕ ولیتـەی دۆڵـەکان پێکیـان هێنـاوە. ناوچـەی چـیاکانی زەفـاریش لـە رۆژهـەڵاتی عومانـەوە تـا دەگاتـە رۆژئـاوا بەماوەی ٤٠٠ کم درێژ دەبێتەوە.

عومان بەدرێژایی مێژوو چەند ناوێکی بەخۆوە بینییوە، گرنگترینیـان: مـەجان، مـەزوون، عومان. بەڵام وەکو باسی لێوە دەکرێ ناوی عومان لەناوی عومانی کوڕی ئیبراهیمـی خـەلیلی پێغەمبەرەوە ( سڵاوی خوای لێبێت ) هاتووە، هـەروەها دەڵێن نـاوی عومـان کـوڕی سـەبەئی کوڕی یەغسانی کوڕی ئیبراهیمەوە هاتووە.

عومان لەمێژەوە نیشتیمانی خێڵە عەرەبەکان بووە کە بۆ راو وکشتوکاڵی روویـان کردۆتـە ناوچەکە، هەندێکی کەشیان لەناوچە ناوخۆییەکان و ناوچە بیابانییەکان سەرقاڵی شوانی و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات بوون.

عومان یەکەم وڵات بووە لەسەردەمی پێغەمبەری ئیسلام ( د.خ ) لەخۆوە چۆنەتە ناو ئاینی ئیسلامەوە، دوای ئەوەی پێغەمبەری ئیسلام عومەری کوڕی عاسی رەوانەی ناوچەی جیفر و عەبد کردووە بۆ سەردانی کوڕانی جەلەندی کوڕی موستەکبیر هەردوو شای عومان وداوایان لێبکـات پـەیڕەوی ئـاینی ئیسلام بکـەن، بۆیـە کـوڕانی جەلەنـدی وەڵامیـان دایـەوە ولـەو مێژووەوە پەیڕەوی ئاینی ئیسلامیان کردووە و وڵاتەکەیان بۆتە قەڵایەکی توندی ئیسلام کە رۆڵێکی گەورەی هەبووە لەبڵاوکردنەوەی ئاینی ئیسلام لەناوچەکانی رۆژهەڵات وناوەڕاستی ئەفریقیا.

لەساڵی ١٥٠٧ دا پۆرتۆگالیەکان چەند شارێکی عومانیان داگیر کردووە، لەوانە: قەلحات،

قریات، مەسقەت وسەحار، بەڵام نەیان توانی لەکەنارەکانی عومان دەرچن بۆ فراوان کردنی دەسەڵاتەکانیان بەرەو ناوخۆی وڵاتەکە بەهۆی بەرەنگاری توندی عومانییەکان.

دەسەڵات گرتنەی دەستی ئیمام ناسر کوڕی مورشید لەساڵی ١٦٢٤ ز بەسەرتای دامەزراندنی دەوڵەتی یەعاروبە دادەنرێت، ئیمام ناسر توانی وڵات بکاتەوە بەیەك وبیانخاتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی بۆ یەکەم جار، دوای ئەو ئیمام سوڵتان کوڕی سەیفی یەعروبی لەخەباتدا بەردەوام بێت لەدژی پۆرتۆگالییەکان. عومانییەکان بەوەوە نەوەستان پۆرتوگالییەکان لەکەنارەکانی عومان بکەنە دەرەوە، بەڵکو لە زەریای هیندیش چەند هێرشێکیان کردە سەریان. لەگەڵ ئەو سەرکەوتنانەی ئیمام سوڵتان کوڕی سەیف تۆمتاری کرد بەسەر پۆرتۆگالیەکاندا، بەڵام تێکشکاندنی پۆرتۆگالیەکان بەشێوەیەکی یەکجارەکی تا سەردەمی ئیمام سەیفی کوڕی ئیمام سوڵتانی کوڕی سەیف نەهاتە دی، ئیمام سەیف بنەما دەریاییەکانی بەشێوەیەك دارشتبوو لەماوەیەکی کەمدا توانی دەسەڵاتی کەناری ئەفریقی رۆژهەڵاتی بەتەواوەتی بگرێتە دەست.

هەڵبژاردنی ئیمام ئەحمەدی کوڕی سەعید کە والی سەحار وناوچەکانی دەوروپشتی بوو لەساڵی ١٧٤٤ ز بەسەرەتای قۆناغێکی نوێی مێژووی عومان دادەنرێت کە نزیکەی ٢٥٤ ساڵێکی خایاند. چونکە ئیمام ئەحمەد توانی دەوڵەتی سەعیدی دابمەزرێنێت وخاکی وڵات بکاتەوە بەیەك وئاژاوە وکێشە ناوخۆییەکان نەهێڵێ، ئەمە جگە لە دامەزراندنی هێزێکی دەریایی گەورە لەپاڵ ئەو کەشتی گەلە بازرگانییەی کە عومان هەیبوو، ئەمیش بووە هۆی بوژانەوەی چالاکییە بازرگانییە دەرياییەکانی عومان. هەروەها لەسەردەمی کوڕەزای ئیمام ئەحمەد ( ١٧٨٤ – ١٧٩٢ ) ز، ئیمام حەمەد، پایتەختی عومان لە شاری رووستاقەوە گوازرایەوە بۆ شاری مەسقەت.

لەساڵی ١٧٩٨ دا عومانییەکان چەند رێکەوتننامەیەکیان لەگەڵ بەریتانییەکاندا واژۆ کرد بۆ دیاری کردنی جۆری پەیوەندیەکانی نێوانیان. ئامانجی یەکەمی ئینگلیز لەم رێکەوتننامانە مسۆگەر کردنی دەسەڵاتەکانیان بوو بەسەر دەریاوانی زەریای هیندیدا، سەلامەتی هێڵی دەریایی بازرگانیان کە ئینگلتەرای بەهیندەوە بەستبۆوە، جگە لە ئاسانکاری لەبەرێوە چوونی کاروباری کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵات. دەسەڵاتی بەریتانی لەناوچەکەدا تا سەرەتای حەفتاکانی سەدەی بیستەمی خایاند.

لەساڵی ١٩٦٧ دا نەوت لە عوماندا دۆزراوەتەوە.

لە رۆژی ٢٣ / ٧ / ١٩٧٠ سوڵتان قابووسی کوڕی سەعید دەسەڵاتی عومانی گرتە دەست، لەو رۆژەوە، تا ئێستاش قۆناغی گەشەکردن وئابووری ئەو وڵاتە بەرەو پێش دەچێ، رواڵەتی

ژیانێکی کۆن وبێ بەها بەرەو ژیانێکی مۆدێرن و شارستانی تۆمار کرد، دەست کرا بە دامەزراندنی دەزگاکانی خوێندەواری و پزیشکی و بازرگانی، تەنانەت باری سیاسی و کۆمەیەلاتی وئابووریش بەردەوام لەگەشەکردندایە.

لەبەرواری ۲۹ / ۹ / ۱۹۷۱ عومان پەیوەندی کردووە بە کۆمەڵەی ولاتە عەرەبییەکانەوە، لە بەرواری ۷ / ۱۰ / ۱۹۷۱ دا پەیوەندی کرد بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە. لەسالی ۱۹۸۱ دا عومان یەکێك بوو لەدامەزرێنەری ئەنجومەنی هاوکاری ولاتانی کەنداوی عەرەبی بوو.

لەسالی ۱۹۹٤ دا عومان یادی ۲۵۰ ساڵەی گرتە دەستی

دەسەلاتی خێزانی ئەلبوسەعیدیان لە سەڵتەنەتی عوماندا گێرا، بەمەش دەکرێ بڵێن کە خێزانی ئەلبوسەعید کۆنترین خێزانن لەناوچەی عەرەبی کە لەدەسەلاتدا بەردەوام بن.

لە ۱٤ / ۹ / ۲۰۰۰ دا دەنگدەران بەرەو سندوقەکانی هەڵبژاردن بەرێکەوتن بۆ هەڵبژاردنی ۸۳ نوێنەر بۆ خولی چوارەمی ئەنجومەنی شورای عومانی.

لەگەڵ ئەوەی کە رۆژی ۲۳ / ۷ بەخاڵی گۆڕینی گەورەی سەڵتەنەتی عومانی نوێ دادەنرێت وبەرۆژی گۆڕینی رواڵەتەکانی ژیانی ئەو ولاتە دادەنرێت. بەلام رۆژی نیشتیمانی سەڵتەنەتی عومان بەرۆژی ۱۸ / ۱۱ دادەنرێت، کە رۆژی لەدایك بوونی سوڵتان قابووسی کوری سەعیدە لە ۱۹٤۰ .

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ۱۰,۸ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ۷۷ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ۵,۲۰۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٤۷ .

گەنجینەی یەدەگی نەوت: ۵,٦ ملیار بەرمیل.

بەرهەمی رۆژانە: ۹۲۰ هەزار بەرمیل نەوت.

## غانا

**ناوی باو:** غانا

**ناوی فەرمی:** کۆماری غانا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Ghana

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان ( ٣٠٠ ئەندام )

**رووبەر:** ٩٢,٠٩٨ میل دووجا، ٢٣٨,٥٣٣ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٨,١٠١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٧٥,٩ کەس/ کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش، کەلەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن گرنگترینیان: ئاکان، مووسی، ئەشانتی.

**ئاین:** موسڵمان ٥٥ ٪ ، مەسیحی ( پرۆتستانت، رۆمان کاسۆلیك )، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** ئەکرا.

**شارە سەرەکییەکان:** کۆماسی، تامالی، تیما، سیکۆندی، تاکورادی.

**دراو:** سیدی.

**ئاوو هەوا:** کەمەرەیی، پلەکانی گەرما لەپایتەختدا ٢٧ پلەی سەدی، لەو پلەیە زیاتر لە ناوچە باکوورییەکان. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٠ سم – ١٥٠ سم، لەباشووری رۆژئاوای وڵاتیش دەگاتە ٢٠٠سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** کاکاو، مەنیهۆت، رونی دارخورما، لاستیك، پەتاتەی شیرین، یام، دارو تەختە، بەخێوکردنی مەڕوماڵات، لۆکە، تووتن، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چنین، سیرامیك، درووستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت، ئەڵماس، ئاڵتون، مەگنیسیۆم، نەوت، گاز.

### تێڕوانینێکی گشتی:

غانا وڵاتیکە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەفریقیا لەسەر کەنداوی غینیا ( زەریای ئەتڵەسی ).

بۆركینا فاسۆ دەكەوێتە باكووری رۆژئاوا وباكووری و تۆگۆ دەكەوێتە رۆژهەڵاتی، زەریای ئەتڵەسی ( كەنداوی غینیا ) دەكەوێتە باشووری، كەناری عاج دەكەوێتە رۆژئاوای. ناوەراستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی یەك بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٨ بەرەو باكوور.

دەشتی غانا دەكەوێتە سەر كەناری غینیا، بانەكانیش لەباكووری رۆژئاواوە تا باشووری رۆژهەڵات بەناوەراستی وڵاتدا تێپەڕ دەبێت و روباری ڤۆلتای سپی لە رۆباری ڤۆلتای رەش كە لە دەریاچەی ڤۆلتای دەستكرد بەیەك دەگەن لەرۆژهەڵاتی وڵاتدا لەیەك جیا دەكاتەوە. تا بەرەو باكووری وڵات بڕۆی دەشتەكان بە گژو گیایەكی زۆر داپۆشراون دارو درەختێكی زۆریشی لێ بڵاوبۆتەوە.

لەسەدەی یەكەمەوە خەڵكی لەو ناوچەیەدا ژیاون.دەوڵەتی غانا لە ( ٤٦٩ – ٦٠٠ ك ) ( ١٠٧٦ – ١٢٠٣ ز ) گەشەكردنێكی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، ناوی وڵاتیش لەو دەوڵەتەوە هاتووە. لەساڵی ١٤٧١ دا پۆرتۆگالییەكان گەیشتونەتە ناوچەكە وكەنارەكەیان ناو ناوە كەناری ئاڵتون، چونكە ئاڵتونێكی زۆری لێبووە. لەساڵی ١٦٤٢ دا هۆڵەندییەكان داگیریان كردووە. لەسەدەی حەڤدەیەمدا بازرگانی كۆیلەكان لەو ناوچەیەدا زۆر چالاك بووە، هۆڵەندی وبەریتانییەكان ركەبەرایەتییان لەسەر كردووە. لەساڵی ١٨٧٢ دا ئینگلیزەكان داگیریان كردووە وداگیركراوەی كەناری ئاڵتونیان لێ دامەزراندووە. لەساڵی ١٩٠١ دا بەریتانیا كردویەتییە پارێزراوەیەكی خۆی. لەسەرەتای پەنجاكانی سەدەی بیستەم، مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشراوە. لە ٦ / ٣ / ١٩٥٧ دا سەربەخۆیی تەواوی لە بەریتانیا دەستگیر بووە وناوچەی تۆگۆی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیاش بۆتە ناوچەیەكی سەر بە غانا وناوی بۆتە غانا. شایەنی باسە غانا یەكەم ئەندامی كۆمۆنوێلتی بەریتانی بووە كە رەش پێستەكان حوكمی بكەن، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان لەساڵی ١٩٦٠ دا هاوڵاتیان دەنگیان داوە بەكۆماری كردنی وڵاتەكەیان.

یەكەم سەرۆكی وڵات دوای سەربەخۆیی كوامی نكرۆما بووە وبەكودەتایەكی سەربازی لە ١٩٦٦ دا لەدەسەڵات دوورخراوەتەوە. دوای ئەو چەند پیاوێكی سوپا حوكمی وڵاتیان كردووە، تا لە ٣١ / ١٢ / ١٩٨١ دا مولازمی یەكەم جیری رۆلنجز بەهۆی كودەتایەكی سەربازییەوە حوكمی وڵاتی گرتۆتە دەست. لەهەڵبژاردنێكی دیموكراسیدا بۆ ماوەی دووجار، ١٩٩٢، ١٩٩٦ ، پۆستی سەرۆكایەتی بەدەست هێناوە. لە ٢٨ / ١٢ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتی بەرێوە چووە و پاڵێوراوی پارتی نیشتیمانی نوێ جۆن كۆفوار ( ٦٢ ساڵ ) سەركەوتنی بەدەست هێنا. لە ٧ / ١ / ٢٠٠١ دا سوێندی دەستووری خواردووە

وبــەڵێنی داوە بەرامبــەر بەوڵاتەکــەی وەفــادار وبەئەمــەك بێــت وریــز لەدەســتوور بگرێــت ولەوتارەکەیدا وتبووی: بەڵێن ئەدەم خۆم بۆ خزمەت وخۆشگوزەرانی گەلی غانا تەرخان بکەم.

لەبەرواری ١٦ / ٨ / ٢٠٠٢ دا ئۆتۆمفیو ئۆسای تۆتۆی دووەم شای خێڵەکانی ئەشانتی نازناوی شای بە کۆفی ئەنانی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان( بەرەچەڵەك غانایی ) بەخشی. شایەنی باسە رێورەسمێکی شکۆداریان بۆ کۆفی ئەنان کرد لەکاتی بەخشینی نازناوی پادشا لەتەلاری مانهیا کە لەساڵی ١٩٢٤ دا دروستکراوە وبەهەزارەها کەس بەشداریان لە ئاهەنگەکەدا کردووە.

دوای ئاهانگەکە شا تۆتۆی دووەم باوەشێنێکی بەدیاری بەخشی بەکۆفی ئەنان کە لەپەڕ درووست کرابوو لەگەڵ ملوانکەیەکی گەورەی ئاڵتوون کەهێمایەکە بۆ رێز لێگرتن لەناو خێڵەکەیاندا.

غانا وڵاتیکی کشتوکاڵیە وبەرهەمی کاکاو گرنگترین بەرهەمەکانیەتی کە رەوانەی دەرەوەی وڵات دەکرێت. سامانە کانزاییەکانی غانا زۆر گرنگن، بەلام کێشەی بێکاری وکەمی ئاوی خواردەنەوە گرفتێکی گەورەی بۆ ئەو وڵاتەی دروستکردووە.

غانا بەپلەی سێهەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی کاکاو و بەپلەی حەوتەم دێت لە بەرهەمی ئەڵماس، بەپلەی حەڤدەیەم دێت لەبەرهەمی ئاڵتوون.

سروودی نیشتیمانی: سلاو لە ناوی غانا بکەن.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٧,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٧.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٠ .

## غینیا

**ناوی باو:** غینیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری غینیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Guinea.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان ( ١١٤ ئەندام ).

**رووبەر:** ٩٤,٩٢٦ میل دووجا، ٢٤٥,٨٥٧ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧,٤٠٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣٠,١کەس/ کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، کەلەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن گرنگترینیان: فۆلانی، مالینك.

**ئاین:** موسڵمان ٩٥٪ ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، مەسیحی.

**زمان:** فەرەنسی.

**پایتەخت:** کوناکری.

**شارە سەرەکییەکان:** کان کان، کیندیا، کیسیدۆجۆ، فارانا.

**دراو:** فرانکی غینی.

**ئاوو هەوا:** کەمەرەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما لەناوچە کەنارییەکان لەنێوان ٢٣ بۆ ٢٩ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی باران ٢٨٠ سم دەبێت. پلەکانی گەرما ونێوەندی بارانەکان کەم دەبنەوە تا بەرەو ناوخۆی وڵات بڕۆی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، مەنیهۆت، قاوە، گەنمەشامی، دارخورما، فستقی عەبید، برنج، پەتاتەی شیرین.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت، ئاڵتون، ئەڵماس، ئاسن.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

غینیا وڵاتیکی ئیسلامییە دەکەوێتە رۆژئاوای ئەفریقیا. سەنگال دەکەوێتە باکووری و مالی دەکەوێتە باکوور ورۆژهەلاتی، سیرالیۆن ولیبیریا دەکەونە باشووری، غینیا بیساو دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای، کەناری عاجیش دەکەوێتە رۆژهەلاتی، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١١ بەرەو باکوور.

زەلکاوەکان دەکەونە سەر کەنارەکان، کەمە کەمە زەوییەکان بەرز دەبنەوە تا بە بانێکی

سەخت لەناوەڕاستی وڵاتدا کۆتاییان دێت. باکووری وڵاتیش بریتییە لە دەشتێکی سەوز وبەگژوگیای ساڤانا داپۆشراوە، بەڵام گردەکان دەکەونە باشووری ڕۆژهەڵات وبەدارستانێکی زۆر داپۆشراون.

لەساڵەکانی ۲۰۰۰ ی پ.ز خەڵك لەو ناوچەیەدا ژیاون وسەرقاڵی ڕاو بوون. چەند ئیمپراتۆریەتێك لە نێوان سەدەکانی پانزدەیەم و نیوەی پانزدەیەمی زایینەوە داگیریان کردووە. لەنیوەی دووەمی سەدەی پانزدەیەمەوە پۆرتۆگالییەکان گەیشتونەتە ناوچەکە وبازرگانی کۆیلەکانیان لەو ناوچەیەدا کردووە. لەماوەی سەدەی حەڤدەیەم وهەژدەیەمدا بەرژەوەندییە بازرگانییە ئەورووپییەکان ڕکەبەرایەتیان لەسەر کردووە. لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا فەرەنسا دەستی کردووە بەداگیر کردنی، تا لەساڵی ۱۸۹۱ دا توانی بەتەواوەتی داگیری بکات وبۆتە داگیرکراوەی غینیای فەرەنسی لەچوارچێوەی هەرێمی ئەفریقیای ڕۆژئاوای فەرەنسی. لە ۲۸ / ۹ / ۱۹۵۸ دا گەلی غینیا دەنگیان داوە بە سەربەخۆیی لەفەرەنسا.

لە ۲ / ۱۰ / ۱۹۵۸ غینیا توانی سەربەخۆیی خۆی لەفەرەنسا دەستگیر بکات ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، یەکەم سەرۆکی دوای سەربەخۆیی سیکۆتۆری بووە. دوای کۆچی دوایی سیکۆتۆری لە ۲٦ / ۳ / ۱۹۸٤ دا سەربازییەکان حوکمی وڵاتیان کردووە وعەقید لانسانا کۆنتێ بۆتە سەرۆکی وڵات.

غینیا وشەیەکی بەربەرییە وبەمانای: خاکی ڕەشەکان دێت.

غینیا وڵاتیکی هەژارە، بەڵام بەهۆی سامانە سروشتییەکانیەوە ئەگەری باشکردنی باری ئابووری هەیە. باری ئابووری ئەو وڵاتە پشتی بە کشتوکاڵی وکانزاکانی بەستووە، گەنجینەیەکی یەدەگی بۆکسیتی زۆری لەخۆ گرتووە ( نزیکەی بە یەك لەسەر سێی جیهان دادەنرێت ).

غینیا بە پلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە دەرهێنانی بۆکسیت ( دوای ئوستورالیا ) و بەپلەی نۆیەم دێت لە ئەڵماسدا.

سروودی نیشتیمانی: ئازادی

جەژنی نیشتیمانی: ۲ / ۱۰ ی هەموو ساڵێك، ڕۆژی سەربەخۆیی لە ۱۹۵۸ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ۳۰۲ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱۱۷ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۵۱۰ دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱٤۵

## غینیای کەمەرەیی

**ناوی باو:** غینیای کەمەرەیی
**ناوی فەرمی:** کۆماری غینیای کەمەرەیی.
**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**
Republic of Equatorial Guinea.
**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.
**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەرانی گەل ( ۸۰ ئەندام ).
**رووبەر:** ۱۰,۸۳۱ میل دووجا، ۲۸,۰۵۱ کم$^{۲}$
**ژمارەی دانیشتوان:** ٤٤٣,۰۰۰ کەس ( تا ۱۹۹۸ ).
**چڕی دانیشتوان:** ۱۵,۸ کەس/ کم$^{۲}$
**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، کەلەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن. گرنگترینیان: فانج، بۆبی، بانتۆ.
**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك ) ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، موسڵمان، بێباوەڕ.
**زمان:** ئیسپانی.
**پایتەخت:** مالابۆ.
**شارە سەرەکییەکان:** باتا، ئیلانجیما، کۆمبۆیۆندی، لۆس ئەنجلیس.
**دراو:** فرانك.
**ئاوو هەوا:** گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما ۲۷ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی باران لەنێوان ۱۹۳ سم بۆ ۱۰۹۰ سك دەبارێت.
**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، کاکاو، مەنیهۆت، قاوە، پەتاتەی شیرین، راوەماسی، دانەوێڵە، زەیتی دارخورما.
**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** داروتەختە.
**سامانی کانزایی:** نەوت.
**تێڕوانینێکی گشتی:**
غینیای کەمەرەیی وڵاتیکی بچوکە دەکەوێتە رۆژئاوای ناوەڕاستی کیشوەری ئەفریقیا، لەدوو بەشی سەرەکی پێکدێت:

۱. بەشێك دەکەوێتە سەر خاکی ئەفریقیا و ڕێژەی ۹۳ ٪ ی رووبەری وڵات پێکدەهێنێت، کامیرۆن دەکەوێتە باکووری، گابۆن دەکەوێتە رۆژهەلات و باشووری، زەریای ئەتڵەسیش دەکەوێتە رۆژئاوای و ئەو بەشە بە: ریۆ مۆنی ناودەبرێت وزۆربەی دانیشتوانیش لەو بەشە نیشتەجێ بوون.

۲. بەشی دووەمیش پێك دێت لە پێنج دورگە، دەکەونە کەنداوی غینیا، گەورەترینیان

دورگەی بیۆکۆیە کە نزیکەی ١٦٠ کم لە باکووری رۆژئاوای ریۆ مۆنییەوە دوورە، پایتەختی وڵات ( مالابۆ ) ی تێدەکەوێت. ئەوسا بە مالابۆ وتراوە سانتا ئیزابێل.

بەنێوان هەردوو بەشی وڵاتدا یەکێری هێڵی درێژی ٩٠/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢ بەرەو باکوور تێپەڕ دەبێت. دارستانە کەمەرەییە چڕەکان زۆربەی ناوچەکانی وڵاتی داپۆشیوە. بەڵام دورگەی بیۆکۆ دوو چیای گڕکانی لەخۆ گرتووە ودۆڵێکیش کەوتۆتە نێوانیانەوە.

کورتەباڵاکان لەدێر زەمانەوە لەو ناوچەیەدا ژیاون، هەروەها چەند کۆمەڵەیەکی نەژادیش لەسەدەی هەژدەیەمدا لەو ناوچەیە نیشتەجێ بوون، لەوانە بۆبییەکان لە دورگەی بیۆکۆدا. لەساڵی ١٤٧١ دا پۆرتۆگالیەکان گەیشتونەتە ناوچەکە. لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا ئیسپانیا داگیری کردووە ولەساڵی ١٩٥٩ دا کردۆیەتییە داگیرکراوەیەکی خۆی. لەساڵی ١٩٦٣ دا ئۆتۆنۆمی پێ بەخشیوە. لەبەرواری ٢ / ١٠ / ١٩٦٨ دا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

یەکەم سەرۆکی وڵات دوای سەربەخۆیی: فرانسیسکۆ ماسیاس نگۆیما بووە، کەخۆی بە موعجیزەی غینیای کەمەرەیی راگەیاندووە، حوکمێکی دکتاتۆری ئەو وڵاتەی کردووە، لەماوەی پانزدە ساڵی حوکمی ئەو دیکتاتۆرە نزیکەی نیوەی دانیشتوانی وڵاتە بچوکەکەی یان لەسێدارە دراوە یان دەربەدەری کردوون، تا لە ئابی / ١٩٧٩ دا بەهۆی کودەتایەکی سەربازییەوە لەلایەن عەقید تیۆدۆر ئۆبیانج نگۆیما مباساجۆوە لەدەسەڵات لابراوە وپاش سەرکەوتنی کودەتاکە دیکتاتۆری پێشوو لەسێدارە درا.

ئابووری غینیای کەمەرەیی پشتی بەکشتوکاڵی بەستووە، پیشەی راوەماسیش لەدەوروپشتی دورگەکاندا زۆر بەربڵاوە، هەروەها دارستانەکانیش بەهۆی دارو تەختەوە رۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە ئابووری وڵاتدا. بەڵام تێکڕای بەرهەمی ئەو وڵاتە لە ساڵی ١٩٩٦ بەرێژەی ٤٠٪ دا بەرز بۆوە ولەساڵی ١٩٩٧ دا بەرێژەی ٥٠ ٪ بەرزبوونەوەی بەخۆوە بینی، بەهۆی دۆزینەوەی نەوت ورەوانە کردنی زیاتر لە ٨٠ هەزار بەرمیل نەوت رۆژانە بۆ دەرەوەی وڵات، واش چاوەڕوان دەکرێ کە ئەو رێژەیە زۆر بەرەو زیاتر بڕوات. بەڵام بەهۆی نەبوونی هاوسەنگی لە دابەشکردنی خزمەتگوزارییەکان لەنێوان رێزەکانی گەلدا چەند جارێك کێشەی نەژادی لەنێوانیاندا سەری هەڵداوە.

جەژنی نیشتیمانی: ٢ / ١٠ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ١٩٦٨ .

سروودی نیشتیمانی: با بەپیر بەختەوەریمانەوە بچین.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٦٧ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨٣ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥١

## غینیا بیساو

ناوی باو: غینیا بیساو

ناوی فەرمی: کۆماری غینیا بیساو

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Guinea Bissau

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی گەلی نیشتیمانی ( ١٠٠ ئەندام )

ڕووبەر: ١٣,٩٤٨ میل دووجا، ٣٦,١٢٥ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ١,١٧٩,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ٤١,٩ کەس/ کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی ڕەش، کەلەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن گرنگترینیان: بالانتی، فولانی.

ئاین: موسڵمان ٧٠ ٪ ، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، مەسیحی.

زمان: پورتوگالی.

پایتەخت: بیساو.

شارە سەرەکییەکان: بافاتا، گابۆ، مانسوا، کاتیۆ، جیبا.

دراو: بیزۆ غینیا – بیساو

ئاوو هەوا: خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما بەگشتی لەنێوان ٢٣ بۆ ٢٨ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکانیش دەگاتە ٢٤٠ سم لەناوچە کەنارییەکان و ١٤٠ سم لەناوچە ناوخۆییەکان.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: زەیتی دارخورما، فستقی عەبید، برنج، فاسۆلیا، گوێزی هیندی، گەنمەشامی، بەخێوکردنی مەڕو ماڵات، دارو تەختە.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: درووستکراوە خۆراکییەکان.

سامانی کانزایی: پیترۆل، بۆکسیت، فۆسفات.

تێڕوانینێکی گشتی:

غینیا بیساو وڵاتیکی ئیسلامییە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەفریقیا، سەنگال دەکەوێتە باکووری، غینیای دەکەوێتە ڕۆژهەڵات وباشووری، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە ڕۆژئاوای، هەردوو کۆمەڵە دورگەی: بیساجۆر وئۆرانجۆش سەر بە غینیا بیساون کە دەکەونە سەر

کەنارەکانی لە زەریای ئەتڵەسی وژمارەیان ٤٠ دورگە دەبێت، تەنها نیوەی نیشتەجێ کراوە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٥ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٢ بەرەو باکوور.

تەختی وڵات بریتییە لە دەشتێکی سەر کەنار وکە بەدارستانە کەمەرەیی وزەلکاوەکان داپۆشراوە، بەرەو ناوخۆ وڵات بەرز دەبێتەوە وگژوگیای ساڤانا داپۆشراوە.

بەر لەوەی پۆرتۆگالیەکان لە ١٤٤٦ دا ئەو ناوچەیە بدۆزنەوە، ئەفریقییە رەشەکان لەناوچەکەدا ژیاون. لەنێوان سەدەکانی شانزدەیەم ونۆزدەیەمدا پۆرتۆگالیەکان ئەو هەرێمەی وەك بنکەیەکی بازرگانی بەکارهێناوە، بەتایبەتی بازرگانی کۆیلەکان. لەساڵی ١٨٧٩ بۆتە داگیرکراوەیەکی پۆرتۆگالی لەژێر ناوی: غینیای پۆرتۆگالی. بەریتانی و فەرەنسییەکان ململانێی پۆرتۆگالیان دەکرد لەسەر ناوچەکە، تا بەریتانیا لەساڵی ١٨٧٠ دا دەستی لێهەڵگرت و لەساڵی ١٨٨٦ دا دوای چەند دانیشتن وگفتوگۆیەك کێشە سنووریەکانی فەرەنسای ئەفریقی چارەسەر کراوە. لەساڵی ١٩٠٥ دا سنوورەکانی غینیا بێساو بەشێوەیەکی یەکجارەکی دیاری کراوە. لەساڵی ١٩٥١ دا غینیای پۆرتۆگالی بۆتە یەکێك لەکەرتە پۆرتۆگالییەکانی پشت دەریاکان.

لەساڵی ١٩٦٣ دا شۆڕشی غینیا لەدژی پۆرتۆگالیەکان هەڵگیرساوە وشەڕەوانانی غینیا دەستیان کردووە بە خەباتی چەکداری لەدژی داگیرکەران وداوای سەربەخۆیی تەواویان بۆ هەر یەك لە غینیا بێساو و دورگەکانی سەری سەوز دەکرد. لەبەرواری ٢٤ / ٩ / ١٩٧٣ شۆڕشگێران یەك لایەنانە سەربەخۆیی وڵاتیان راگەیاند و لویس دو ئەلمیدا کابرالیان وەك سەرۆکی وڵات دیاری کرد، بۆیە پۆرتۆگال بەناچاری لە ١٠ / ٩ / ١٩٧٤ دا دانی بەسەربەخۆیی غینیا و بێساو ناوە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. بۆ ساڵی دوایش دورگەکانی سەری سەوز سەربەخۆ بووە وچەندین هەوڵ دراوە بۆ یەك خستنەوەی هەردوو وڵاتی ناوبراو بەڵام هەوڵەکان شکستیان هێناوە.

لەساڵی ١٩٨٠ کودەتایەکی سەربازی لە غینیا بێساودا روویداکە حکومەتی مەدەنی روخاند وسەربازییەکان دەسەڵاتی وڵاتیان بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ بیرناردۆ ڤیرا گرتۆتە دەست.

لەمانگی پێنجی ١٩٩٨ بزوتنەوەیەکی یاخی بەسەرۆکایەتی جەنەراڵ ئەنسۆمانی مانی هەڵگیرساوە وشەڕ وپێکدادان لەنێوان هێزە حکومییەکان وهێزەکانی مانی هەڵگیرساوە وبەسەدان قوربانی لێکەوتۆتەوە. بەهەزاران هاوڵاتی لە پایتەختی وڵاتەوە بەرەو شارۆچکە سنووریەکان هەڵهاتوون و وڵاتە دراوسێکان رۆڵی ناوبژیوانیان بینیوە بۆ کۆتایی هێنانی

شەڕی ناوخۆ، هێندەی نەخایاندووە مالان بکای سنها دەسەلاتی بەوەکالەت گرتۆتە دەست. لە ٧ / ١٢ / ٢٠٠١ دا هەوڵی ئەنجام دانی کودەتایەکی سەربازی بە سەرۆکایەتی سەرۆك وەزیران ڤاوستینۆ ئەمبالی شکستی هێناوە. لەهەڵبژاردنە گشتییەکانی ساڵی ٢٠٠٠ دا پاڵێوراوی پارتی چارەسەری کۆمەلایەتی ( نۆیۆزسیۆن ): کامبا یالا بەپۆستی سەرۆکایەتی وڵات سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

لە هاوینی ٢٠٠١ دا حکومەت هەستاوە بەزیاد کردنی مووچەی فەرمانبەرە سەربازیی ومەدەنیەکانی، دوای چەند داواکارییەك. شایەنی باسە جگە لە زیاد کردنی مووچەی مانگانە، حکومەت هەستاوە بەدابەشکردنی گوێنییەکی ٥٠ کغم لەبرنج بۆ هەر یەك لە مووچە خۆرەکان، چونکە نەیتوانی تەواوی داواکارییەکانیان بەپارە چارەسەر بکات بۆیە پەنای بردە بەر ئەم هەڵوێستە، ئەمە جگە لەوەی کە حکومەت بەرهەمی برنجی لەرێژەی خۆی زیاتر بەرهەم هێناوە.

تا ئێستاش سەرچاوە کشتوکاڵی وکانزاییەکان غینیا بێساو بەتەواوەتی بەگەڕ نەخراوە، ٥٠ ٪ ی دانیشتوان سەرقاڵی جوتیارین بۆیە ئابووری ئەو وڵاتە پشتی تەواوی بە چالاکییە کشتوکاڵیەکان بەستووە، وا چاوەڕوان دەکرێت لە داوڕۆژێکی نزیکدا غینیا بێساو سوود لە دەرهێنانی نەوت وفۆسفات وبۆکسیت وەربگرێ.

غینیا وشەیەکی بەربەرییە وبەمانای خاکی رەشەکان دێت.

جەژنی نیشتیمانی: ١٠ / ٩ / هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی وڵات لە ١٩٤٧ دا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢٣٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٧٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٤٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٧٣ .

## ڤاتیکان

**ناوی باو:** ڤاتیکان

**ناوی فەرمی:** وڵاتی شاری ڤاتیکان

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

State of the Vatican City

**سیستەمی حوکمڕانی:** پاپا خۆی حاکمی ڕەهای ڤاتیکانە وسەرۆکی دەزگا کارگێڕییەکانی وڵاتە، بەڵام چەند نوێنەرێکی لەبری خۆی بەم ئەرکانە راسپاردووە وتەواوی کاتی خۆی تەرخان کردووە بۆ کاروباری کڵێسە.

**دەستەی یاسا دانان:** نییەتی.

**ڕووبەر:** ٠,١٧ میل دووجا، ٠,٤٤ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئیتالی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك).

**زمان:** ئیتالی ، لاتینی.

**پایتەخت:** نییەتی.

**شارە سەرەکییەکان:** نییەتی.

**دراو:** لیرەی ئیتالی ، یۆرۆ لەدوای ١ / ١ / ٢٠٠١ .

**ئاوو هەوا:** مام ناوەندە، زستانی ساردە وباران دەبارێت، هاوینی فێنك ووشكە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** نییەتی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** پۆلی پۆستە وگەیاندن، وێنە وتابلۆ.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

ڤاتیکان، بەزمانی لاتینی بەمانای بەرزایی پێشبینییەکان دێت، بچوکترین وڵاتە لەجیهاندا لەرووی رووبەر وژمارەی دانیشتوانەوە، بەپیرۆزترین ناوچەی مەسیحە کاسۆلیکەکان( ٩٠٠ ملیۆن کاسۆلیکی ) دادەنرێت چونکە مەڵبەندی سەرەکی پۆترووسە، واتا پاپا، کە لای مەسیحە کاسۆلیکەکان بەجێگری مەسیح دادەنرێت. کەخۆی پسپۆری مرۆڤایەتی وئیرادەی پیرۆزی ئەو کەسانەیە کە باوەڕی پێدەهێنن.

ڤاتیکان دەکەوێتە سەر گردی ڤاتیکان لەباکووری رۆژئاوای رۆمای پایتەختی ئیتالیا. نزیك کەناری رۆژئاوای روباری تیبەر کە بەناو رۆما تێپەڕ دەبێت. چواردەوری بە قەڵایەکی بەرز گیراوە، لەناویا چەندین بینا و قوتابخانەو تەلاری جیاوازی لەخۆی گرتووە. کڵێسەی قەدیس پۆترۆس بەمنارە بەرزەکەیەوە دەڕوانێتە سەر هەردوو شاری رۆما وڤاتیکان، کە

بەگەورەترین کڵێسەی مەسیحی لەجیهاندا دادەنرێت.

گردی ڤاتیکان بەخۆشترین ناوچەی گەشتوگوزاری بوو لای ئیمپراتۆری رۆمانی نیرۆن، کە فەرمانی دا بەسەربڕینی ئەوانەی پەیڕەوی ئاینی مەسیحییان دەکرد لەبەر تیشکی مەشخەڵەکاندا، بەپێی ئەو بەڵگانەی لەزووەوە هاتوون، پۆترۆسیش کاتێ گەیشتۆتە رۆما بۆ دامەزراندنی کڵێسەیەك لەناو دڵی ئیمپراتۆریەتی رۆمانی، هەمان چارەنووسی هەبووە، ئەمە لەساڵی ٦٧ دا، بۆیە ڤاتیکان لەو ناوچەیەی ئێستایدا درووستکراوە.

لەسەدەی چوارەمی زاییندا ئیمپراتۆری رۆمانی، قۆستەنتین بازیلیك فەرمانی داوە کاتدرائێیەك لەو جێیەدا درووست بکرێت کەپۆترۆسی لێ نێژراوە، لەدواییدا بەچواردەوری ئەو شوێنە تەلاری ڤاتیکان درووست کراوە. مەڵبەندی سەرەکی پاپاکان لە چاخەکانی ناوەڕاستدا تەلاری لاتیران بووە لە رۆما ونەك لە ڤاتیکان. بەڵام لەکاتێکدا کە لەشاری ئیڤینیۆن لەفەرەنسا نیشتەجێ بوون لەنێوان ساڵەکانی ١٣٠٩ - ١٣٩٩ و گەڕانەوە بۆ رۆما، بینیان کە تەلاری لاتیران سووتێنراوە بۆیە گواستیانەوە بۆ ڤاتیکان و لەوێ کڵێسەی قەدیس پۆترۆسیان لەسەرەتای سەدەی شانزدەیەمدا درووستی کرد.

بۆ ساڵەکانی دوایی، پاپاکان توانیان کۆنترۆڵی رووبەرێکی ناوەڕاستی رۆما بکەن و ناویان نا دەوڵەتی پاپایی. بەڵام پاپا بیۆسی نۆیەم لەبەرواری ٢٠ / ١٠ / ١٨٧٠ دا ئەم دەسەڵاتەی لەدەستدا ( لەکاتی هەوڵێکیدا بۆ یەك خستنی ئیتالیا)، بۆیە خۆی وپاپاکانی لەڤاتیکاندا مانەوە وهیچ جۆرە مامەڵەیەکیان لەگەڵ حکومەتی ئیتالیدا نەکرد.

لەبەرواری ١١ / ٢ / ١٩٢٩ داهەر یەك لە پاپا بیۆسی یانزدەیەم وسەرکردەی ئیتالیا مۆسۆلینی رێکەوتننامەی لاتیرانیان واژۆ کرد. بەپێ ئەو رێکەوتننامەیە، پاپا دەستی لەداواکارییەکانی بە دامەزراندنی دەوڵەتی پاپایی هەڵگرت، لەکاتێکدا حکومەتی ئیتالی رەزامەندی خۆی لە دامەزراندنی وڵاتی سەربەخۆی ڤاتیکان دەربڕی. رێکەوتننامەکە بەوە کۆتایی هات کە کورسی پەیامبەری لەئیتالیا بڕێ پارە وەربگرێ وەك قەرەبوویەك لە لەدەستدانی دەوڵەتی پاپایی وموڵکەکانی کڵێسە.

کاروباری ناوخۆی ڤاتیکان لەلایەن پارێزگارەوە بەڕێوە دەبرێ، کاردینالیش بەپلەی سکرتێر کاروباری دەرەوە وسیاسیەت وکڵێسە بەڕێوە دەبات. هەروەها لەڤاتیکاندا چەند دادگایەکیش هەیە جگە لەدادگای رۆمانی پیرۆز کە سەرقاڵی کاروباری ئاینییە. کاروباری دیپلۆماتیش لەلایەن سەرۆکی خانەی پاپایی بەڕێوە دەچێت جگە لەوەی چەند کارگێڕێکی تایبەت سەرپەرشتی لەکاروبارە گشتییەکان دەکەن.

پاسەوانی پاپا لەلایەن پاسەوانانی سویسرییەوە بەڕێوە دەچێت کەلە ٨٠ ئەندام پێك هاتوون، شایەنی باسە مەشقێکی زۆر تایبەتیان پێکراوە و مووچەیەکی بەرزیشیان پێ دەدرێت، دەبێ سەرۆکی پاسەوانانیش لە خێزانێکی ئۆرۆستۆکراتی وخانەدان بێت.

پاڵوێزەکانی پاپا پێیان دەوترێ پەیامبەرییەکان، ئەو وڵاتانەی کە پەیوەندی دیپلۆماتی

نییە لەگەڵ کورسی پاپاییدا نوێنەری پاپایان هەیە لەنێو کڵێسە ناوخۆییەکاندا. لەساڵی ١٩٩٤ کورسی پاپایی خاوەنی ١٤٥ سەنتەری پەیامبەریی بوو لەجیهاندا.

لەڤاتیکاندا هیچ جۆرە سیستەمێکی باج نییە و چالاکییە ئابووری ودارایییەکانی بڵاو ناکرێتەوە. لە ٣١ / ٥ / ١٩٨٢ پاپا یوحەنا پۆڵسی دووەم ئەنجومەنێکی پێکهێنا لە ١٥ کاردینالْ پێك هاتبوو بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر بابەتە ئابووری و کێشە داراییەکانی کورسی پاپایی، ئەم کاردینالانە لە نێوان زۆربەی کڵێسە جیاوازەکانی جیهانەوە هەڵبژێردرا. شایەنی باسە ئەنجومەنی ناوبراو ساڵی دوو جار کۆدەبێتەوە بۆ لێکۆڵینەوە لەسەر چالاکی دەزگا ئاینییەکان کە مەڵبەندی سەرەکییان ڤاتیکانە وتەرخان کراوە بۆ کاروباری بڵاوکردنەوەی ئاینی مەسیحی.

لە ١٢ / ٢ / ١٩٣١ دا، بەئامادە بوونی زانای فیزیایی مارکۆنی، پاپا بیۆسی یانزدەیەم پەخشی رادیۆی ڤاتیکانیان راگەیاند، کە هەواڵ ونامە پاپاییەکان بە زیاتر لە ٤٥ زمانی جیهانی لەنێوانیاندا زمانی لاتینی بڵاو کردەوە. لەبەرواری ٢٢ / ١٠ / ١٩٨٣ پاپا یوحەنا پۆڵسی دووەم پەخشی تەلەفزیۆنی ڤاتیکانی راگەیاند. ئەمە جگە لە دابین کردنی چاپخانەیەك بۆ چاپکردنی رۆژنامە وبەڵگەنامە پاپاییەکان بەزیاتر لە ٩٤ زمان.

یوحەنا پۆڵسی دووەم – کارۆل ووتیلا – لە ١٨ / ٥ / ١٩٢٠ دا لە کراکۆڤی پۆڵونیا لەدایك بووە و بەپاپای ٢٦٤ هەمین دادەنرێ کە لە ١٦ / ١٠ / ١٩٧٦ لەدوای پاپا یوحەنا پۆڵسی یەکەم هەڵبژێردرا. شایەنی باسە سەردەمی پاپا پۆڵسی دووەم بەدرێژترین سەردەم دادەنرێت لەمێژووی کڵێسەی کاسۆلیك. پاپا یوحەنا هیچ جۆرە مووچەیەکی وەرنەگرتووە، دەزگا پەیوەندیدارەکان ئەرکی دابین کردنی پێداویستییەکانی پاپا وکڵێسەیان گرتۆتە ئەستۆ. تەواوی ئەو داهاتانەی بە پاپا دەبەخشرێت، رەوانەی کڵێسەکان دەکرێت بۆ یارمەتی ئەوانەی پێویستیان پێیەتی.

* * *

## کتێبخانەی ڤاتیکان

کتێبخانەی ڤاتیکان چەندین کتێبی زۆر بەنرخی لەخۆ گرتووە کە چەند جارێك پاپا جەختی لەسەر پاراستنی ئەو کتێبخانەیە کردووە، لەنێوانیاندا ئەو کتێبەی کە قەبارەکەی لە ٤ سم تێناپەرێت وبەزمانی عیبرانی نووسراوەتەوە، جگە لەو کتێبەی بە زمانی ئارامی نووسراوەتەوە وکێشەکەی ٦٣ کغم دەبێت و جگە لەچەند دەستنوسێکی لیۆناردۆ داڤینشی و ڤۆلتێر و ئیراسم و ناپلیۆن. کتێبەکان بە رووبەری زیاتر لە ١٥ هەزار مەتر دابەش کراون لەچەند خانەیەکی رێکوپێك وزیاتر لە ٨٤ کەس ئەرکی پاراستنیان گرتۆتە ئەستۆ، ژمارەشیان زیاترە لە ١٥٠ هەزار نووسراو و ملیۆنێك و ٣٠٠ هەزار چاپکراوە کە مێژوویان دەگەرێتەوە بۆ سەدەی هەژدەیەم و زیاتر لە هەشت هەزار چاپکراوە کە مێژوویان

دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پانزدەیەم.

بەڕێوەبەری بەشی چاپکراوەکان قەشەی فەرەنسی لوی – دۆڤال ئەرنۆ ئێن دەڵێ: " پاپاکان بەردەوام کتێبەکانیان پاراستووە، مێژووشیان دەگەڕێتەوە بۆ مێژووی دامەزراندنی پاپایی بەهەموو قۆناغەکانییەوە، بەڵام هەندێکیان لەکاتی گواستنەوەی مەڵبەندی پاپایی بۆ ئەفینون ( ۱۳۰۹ – ۱۳۷۷ ) دووچاری دڕان وتیاچوون بونەتەوە. چونکە لەوکاتەدا کە پاپا بنوای سیانزدەیەم بەرەو بنیسکۆلا لە کاتۆلینا هەڵهاتووە ژمارەیەك کتێبی زۆر ودەستنوسێکی ئەو سەردەمەی لەگەڵ خۆیدا بردووە بەمەبەستی پاراستنی بەڵام دیار نەماوە و فەوتاوە. لەسەدەی حەڤدەیەمدا سیاسەتمەداری فەرەنسی جان – باتیست کۆلبیر چی کتێب ونووسراو مابوو کڕییەوە و خستییە سەر پارێزراوە نیشتیمانییەکان.

بەڵام بەشی دووەمی کتێبخانەی پاپیی کاتێ گەڕێنرایەوە بۆ ڕۆما، پاپا پۆڵسی پێنجەم بەخشی بە سیبیۆن بۆرگیسی برازای ولەچوارچێوەی خاوەندارێتییەکانی خێزانەکەیاندا مایەوە تا سەدەی نۆزدەیەم، واتا تائەو کاتەی لەلایەن پاپ لیۆنی سیانزدەیەمەوە کڕایەوە.

* * *

## پاسەوانەکانی سویسرییەکانی پاپا

بەرامبەر بە بڕی ۱۰٤۹ یۆرۆ لەمانگێکدا ئەندامانی پاسەوانەکانی پاپا ئەرکی پاراستنی ژیانی پاپایان لەئەستۆ گرتووە، شایەنی باسە پاسەوانەکان مەشقێکی باشیان پێ کراوە بۆ ئەوەی لەکاتی پێویستدا بەرگری لە پاپا بکەن بە بەکارهێنانی چەکی سپی ( چەقۆ ، شمشێر ) یان بەهۆی گولله بیبەرە تیژەکانەوە یاخود گەر پێویستی کرد تفەنگی ڕاستی بەکار بهێنن.

سەرۆکی پاسەوانەکانی پاپا وڤاتیکان کۆلۆنێلی سوپای سویسری بایۆس سیگمۆی دەڵێ:" من پێتان نالێم تفەنگ ودەمانچەکان لەکوێدا شاراونەتەوە، بەڵام لەکاتی پێویستدا بەباشی دەتوانین بەکاری بهێنین".

لەساڵی ۱۹۸۱ دا پاپا دووچاری هێرشێك بووەوە ودوو گوللەی بەرکەوت. ژمارەی ئەو پاسەوانانەی کە ئەرکی پاراستنی ژیانی پاپایان گرتۆتە ئەستۆ ژمارەیان دەگاتە ۹۳ کەس .

هەروەها کۆلۆنێل جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە مووچەی سەرەکی ئەو پاسەوانانە ۱۰٤۹ یۆرۆیە لەمانگێکدا، جگە لەتەرخان کردنی شوێنی نیشتەجێ بوون وخۆراك وپۆشاك وپێداویستییەکانی دیکەش، هەروەها ئاماژەی بەوەشدا کە هیچ باجێك لەو مووچەیە نادرێ وپاسەوانەکان لە باج دان بەخشراون، بەشێوەیەك کە نەبێ ۷٥ ٪ ی مووچەکەیان بۆ دەمێنێتەوە.

## ڤانواتو

**ناوی باو:** ڤانواتو

**ناوی فەرمی:** کۆماری ڤانواتو

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Vanuatu

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان ( ٤٦ ئەندام ).

**رووبەر:** ٤,٧٠٧ میل دووجا، ١٢,١٩٠کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٧٦,٣٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٤,٥ کەس/ کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** نی ڤانواتو، ئەوروپی، لەگەڵ چەند کەمایەتییەکی دورگە دراوسێکانیش.

**ئاین:** مەسیحی، بێباوەڕ.

**زمان:** بیسلاما، ئینگلیزی، فەرەنسی.

**پایتەخت:** ڤیلا.

**شارە سەرەکییەکان:** لۆگان فیل، بۆرت ئۆلری، ئیزانگیل، تیۆما.

**دراو:** ڤانتۆ.

**ئاووهەوا:** خولگەیی، گەرم وشێدار نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ١٩ بۆ ٣١ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٣٠ سم بۆ ٣٠٥ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گوێزی هیندی، قاوە، کاکاو، داروتەختە، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** درووستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** مەنگەنیز.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

ڤانواتو وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای زەریای هێمن، نزیکەی ١٩٢٠ کم لە باکووری رۆژهەڵاتی ئۆستورالیاوە دوورە. دورگەی نیو کالیدونیای سەر بە فەرەنسا دەکەوێتە رووی باشووری رۆژئاوای. ڤانواتوتو لە نزیکەی ٨٠ دورگە پێك دێت وبەماوەی ٨٠٠ کم لە باکوورەوە بۆ باشوور درێژ دەبێتەوە. گەورەترین دورگەیە لە رووی رووبەرەوە دورگەی ئێسپیریتۆ سانتۆیە کە لەساڵی ١٩٨٠ دا هەوڵی جیابوونەوەی دا ڤانواتو، بەڵام هەوڵەکەی شکستی هێنا. ڤیلای پایتەختیش دەکەوێتە دورگەی ئیڤیتەوە، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵیی درێژی ١٦٨ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٧ بەرەو باشوور.

زۆربەی تەختی دورگەکە لە دەشتە کەناریە تەسکەکان وچەند ناوچەیەکی شاخاوی لەبەشە ناوخۆییەکانی ولات، ئەمە جگە لەچەند چیایەکی چالاکی گڕکانی.

میلانیزییەکان نزیکەی سێ هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە لە دورگەکاندا ژیاون. لەساڵی ١٦٠٦ دا دۆزەرەوەی ئیسپانی بیدرۆ فیرناندیز دی کویرۆز گەیشتۆتە دورگەکانی. لەساڵی ١٧٧٤ دا دۆزەرەوەی بەریتانی جیمس کوك نەخشەی ناوچەکەی کێشاوە، ناوی دورگەکانی بە نیو هبریدز ناوبردووە، لەسەر ناوی دورگە سکۆتلەندییەکانی هبریدز. لەساڵی ١٨٠٢ دا بازرگان وتەبشیرییە فەرەنسی و ئینگلیزەکان گەیشتونەتە ناوچەکە، ئیتر لەو سەردەمەوە کەوتۆتە ژێر دەسەلاتی هاوبەشی بەریتانیا – فەرەنسا. لە جەنگی جیهانیی دووەمدا کراوەتە بنکەیەکی سەربازی گرنگ. لەشەستەکانی سەدەی بیستەمدا بزوتنەوەیەك لەناوچەکەدا پەیدا بوو بۆداواکارییەکانی سەربەخۆیی دورگەکە. لە ٣٠ / ٧ / ١٩٨٠ دا سەربەخۆیی خۆی دەستگیر بووە، گەڕاوەتە سەر ناوە دێرینەکەی خۆی: ڤانواتو وبۆ ساڵی دوایی بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەساڵی ١٩٨٦ دا ڤانواتو یەکەم ولاتی باشووری زەریای هێمن بووە پەیوەندی دیپلۆماتی لەگەڵ لیبیادا پەیدا بکات.

لە مانگی ١١ ی ساڵی ١٩٩٩ دا یەکێك لە دورگەکانی: بانتیکۆست دووچاری بوومەلەرزەیەکی توند وبەهێز بۆتەوە وبووە هۆی ئاوارە بوونی ژمارەیەکی زۆری هاولاتیان وزەرەر وزیانێکی زۆری گەیاند. هەروەها لە ٣ / ٢ / ٢٠٠٢ دا بوومەلەرزەیەك بەگووڕی ٧,٣ پلە بەپێوەری ڕێکختەر لە هەمان دورگەی داوەتەوە وزیانێکی گیانی ومادی زۆری گەیاندووە.

ڤانواتو بەزمانی دانیشتوانەکە بەمانای: ئەو دورگەیەی لەئاستی رووی دەریا بەرزترە دێت، یان زەوییەکانمان، یان ولاتەکەمان.

ئابووری ڤانواتو پشتی تەواوی بەچالاکییە کشتوکاڵیەکان بەستووە، جوتیارەکانی بەشی دانیشتوانی ولاتەکە بەتەواوەتی بە بەرهەم دێنن، چاندنی گوێزی هیندیش تاکە بەرهەمی کشتوکاڵییە رەوانەی دەرەوەی ولات بکرێت.

لەبەرواری ٩ / ١١ / ٢٠٠١ دا ڤانواتو بەئەندامی ژمارە ١٤٥ هەمین ئەندام لە ڕێکخراوی بازرگانی جیهانی وەرگیراوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٨٩ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٨١ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٠٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٠٩ .

## فەڕەنسا

**ناوی باو:** فەڕەنسا

**ناوی فەرمی:** كۆماری فەڕەنسا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

French Republic.

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٣٢١ ئەندام ).

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥٧٧ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٢١٠,٠٢٦ میل دووجا، ٥٤٣,٩٦٥ كم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦١,٠٠٠,٠٠٠ كەس ( تا ٢٠٠٢ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٧,٨ كەس/ كم$^2$

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** فەڕەنسی، كۆچبەری عەرەب وكورد وتورك وهیند وچینی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان كاسۆلیك، پرۆتستانت ). موسڵمان ( نزیكەی ٦ ملیۆن ) ، جوولەكە.

**زمان:** فەڕەنسی.

**پایتەخت:** پاریس.

**شارە سەرەكییەكان:** مارسیلیا، لیۆن، تۆلۆز، نیس، ستراسبۆرگ، بۆردۆ، مۆنبیلی.

**دراو:** فرانك، یۆرۆ لەدوای ١ م ١ / ٢٠٠٢ .

**ئاوو هەوا:** بارانێكی زۆر لە ڕۆژئاوای وڵات دەبارێت، زستانی ساردە وهاوینی فێنكە، لەناوچەی ناوەڕاستی وڵات بەدرێژایی ساڵ بارانێكی مام ناوەند دەبارێت وهاوینی گەرم وزستانی ساردە. باران وبەفرێكی زۆر لەبەرزاییەكان دەبارێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵییەكان:** بەخێوكردنی مانگا ومەڕو ماڵات وبەراز، پەلەوەر، میوە وسەوزە، گەنم، ترێ، چەوەندەری شەكر، پەتاتە، جۆ، داروتەختە، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** ئاسن وپۆلا، دروستكراوە كیمیاییەكان، ئۆتۆمبێل، ئامێری كارەبایی وئەلیكترۆنی، پۆشاك، چنین، دروستكراوە خۆراكییەكان، خواردنەوە، دروستكردنی بۆن.

**سامانی كانزایی:** ئاسن، یۆرانیۆم، گاز، خەڵووزی بەردین، وزەی كارەبا وئەتۆمی.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

فەرەنسا گەورەترین وڵاتی ئەورووپای ڕۆژئاوایە، هەر یەك لەم وڵاتانە لەڕۆژهەڵاتەوە لەگەڵیدا سنووردارە: بەلجیکا، لۆکسمبۆرگ، ئەڵمانیا، سویسرا، ئیتالیا، مۆناکۆ. دەریای سپی ناوەڕاستیش دەکەوێتە باشووری، ئیسپانیا وئەندۆراش دەکەونە باشووری ڕۆژئاوای. زەریای ئەتڵەسیش دەکەوێتە ڕۆژئاوای. کەناڵی ئینگلیزی ( دەریای مانش ) دەکەوێتە باکووری. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٧ بەرەو باکوور.

هەر یەك لەم ناوچانەش سەر بە فەرەنسان:

دورگەکانی سانت بیر ومیکیلۆن ( لە زەریای ئەتڵەسی باکوور)، دورگەی مارتینیك، دورگەی گوادیلۆب، دورگەی مایۆت، دورگەی ڕیۆنیۆن ( لە زەریای هیندی)، دورگەی بۆلینیزیای فەرەنسی، دورگەی نیو کالیدۆنیا ( لە زەریای هێمن )، غیانای فەرەنسی لە باکووری کیشوەری ئەمریکای باشوور، دورگەی کۆرسیکا ( لەدەریای سپی ناوەڕاست).

زیاتر لەنیوەی ڕووبەری فەرەنسا بریتییە لە دەشتێکی پان لەباکوورەوە بۆ ڕۆژئاوا. ئاوەکانیشی لە زەریای ئەتڵەسییەوە لەڕێی ڕووبارەکانی سین ولوار وگارۆنەوە دەگاتێ. بەڵام ناوەڕاستی فەرەنسا بریتییە لەچەند بانێك کە بەرزاییەکانیان زۆر کەمە، چیاکانی ئەلبی فەرەنسیش دەکەونە ڕۆژهەڵاتی وڵات، لوتکەی مون بلانی تێدەکەوێت کە بەرزترین لوتکەی ئەورووپای ڕۆژئاوایە وبەرزییەکەشی دەگاتە ٤٧٣١ م لەسەر ئاستی ڕووی دەریا. هەروەها زنجیرە چیاکانی گۆرا وفۆج دەکەونە ڕۆژهەلاتی فەرەنسا وبەدارستانەکان داپۆشراون. چیاکانی برانسیش دەکەونە سەر سنوورەکانی نێوان ئیسپانیا لە باشووری ڕۆژئاوای. زەوییە کشتوکاڵییە بەپیتەکانیش دەکەونە سەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست.

مێژووی فەرەنسا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی گالە سیلتییەکان کە یۆلیۆس قەیسەر خستونییەتیە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە لەساڵی ٥٠ ی پ.ز . دوای ٥٠٠ ساڵ لەو بەرواره پاشای فرەنجییەکان ( فرانکاییەکان ) توانیان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر بەشێکی زۆری کیشوەری ئەورووپا بسەپێنن. دوای کۆچی دوایی شا شارلمان لە ٨١٤ ی زاییندا، فەرەنسا بووە یەکێك لەبەهێزترین شانشینەکانی ئەورووپا. بەپێچەوانەی ئەڵمانیا وئیتالیاو فەرەنسا بووە یەك شانشینی بەهێز ویەکگرتوو.

لە ١٤ / ٧ / ١٧٨٩ شۆڕشی فەرەنسا هەڵگیرسا، شایەنی باسە شۆڕشی فەرەنسا بەناوبانگترین شۆڕش بوو لەمێژوودا وتا بەرواری ٢١ / ٩ / ١٧٩٢ ی خایاند وتوانی ڕژێمی پاشایی فەرەنسی بڕوخێنێ ویەکەم کۆماری فەرەنسای ڕاگەیاند. ناپلیۆن بۆناپێرت بووە

یەکەم حاکمی ئیمپراتۆریەتی فەرەنسا بوو لەنێوان ١٨٠٤ بۆ ١٨١٥. دوای ئەو چەندین حکومەت لە فەرەنسا دامەزراوە تا دامەزراندنی پێنجەم کۆماری فەرەنسی لە ١٩٥٨ تا ئێستاش.

لە ماوەی هەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ودووەم فەرەنسا گۆڕەپانێکی خوێناوی ئەو شانۆیە بووە، لەوێدا هێزەکانی هاوپەیمانان شەڕیان لەدژی هێزە ئەڵمانیەکاندا ئەنجام داوە کە فەرەنسای داگیر کردبوو، بەڵام فەرەنسا لەهەردوو جەنگی ناوبراودا سەرکەوتوو بووە. لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

فەرەنسا ئەمڕۆ خاوەنی سەنتەرێکی سیاسی زۆر گرنگە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆششی شارل دیگۆل کە لە ١٩٥٨ تا دەست لەکارکێشانەوەی لەساڵی ١٩٦٩ دەسەڵاتی کۆماری فەرەنسای گرتۆتە دەست، دیگۆل توانیویەتی فەرەنسا بکاتە هێزێکی جیهانی، سیاسەتێکی سەربەخۆی پەیڕەو کرد، دیگۆل نەچۆتە ناو کابینەی یەکێتی سۆڤیەت وپەیڕەوی سیاسەتی ویلایەتە یەککرتوەکانی ئەمریکاشی نەکردووە.

لە مانگی شەشی ١٩٦٩ دا جۆرج بۆمبیدۆ پۆستی سەرۆك کۆماری گرتۆتە دەست، دوای کۆچی دوایی بۆمبیدۆ لە ١٩٧٤ دا ڤالیری جیسکار دیستان دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. دوای هەڵبژاردنە گشتییەکانی ١٩٨١ فرانسۆ میترانی سکرتێری پارتی سۆسیالیستی سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی کۆمار. لە مانگی شەشی ١٩٩٥ کوێخای پاریس، جاك شیراك لەسەرکەوتنە گشتییەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا، شایەنی باسە سەرکەوتنی جاك شیراك کۆتایی هێنا بە نزیکەی ١٤ ساڵ حوکمی سۆسیالیستی فەرەنسا.

لەمانگی ٥ / ٢٠٠٢ دا بۆ ماوەی پێنج ساڵی دیکە جاکی شیراك بەسەرۆکی فەرەنسا هەڵبژێردرایەوە. لە مانگی ٧ ی ٢٠٠٧ سەرەکۆزی بەهەڵبژاردنە گشتییەکانی فەرەنسا سەرکەوتنی بەدەست هێنا و پۆستی سەرۆکی وڵاتی گرتە دەست. شایەنی باسە سەرەکۆزی دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکایەتی سەردانی ویلایەتە یەککرتوەکانی ئەمریکای کردوو وبەنیازە پەیڕەوی سیاسەتێکی نوێ لەوڵاتەکەیدا بکات.

فەرەنسا لە ڕۆژی ١٤ / ٧ ی هەموو ساڵێك ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەگێڕن، بەو ڕۆژە دەوترێ ڕۆژی باستیل. لەو ڕۆژەدا لەساڵی ١٧٨٩ گەلی ڕاپەڕیوی فەرەنسا توانیان زیندانی باستیل داگیر بکەن وهاوڕێکانیان ئازاد بکەن وبیروخێنن وشۆڕشی فەرەنسا هەڵگیرسێ. بۆیە ئەو ڕۆژە بۆتە ڕۆژێکی مێژوویی لەو وڵاتە. هەروەها لە ٨ / ٥ ی هەموو ساڵێك یادی جەژنی سەرکەوتن بەسەر ئەڵمانەکاندا دەگێڕن.

ڕۆمانەکان بە فەرەنسایان دەوت گالیا، یان وڵاتی گال. دوای ڕوخانی ڕۆما، فرانکییەکان

هێرشیان کردە سەر وناوی لەوشەی فرانکا ( فرەنجا ) هاتووە وبۆتە فەرەنسا.

فەرەنسا یەکێکە لەولاتە دەوڵەمەندەکان، میللەتەکەشی ژیانێکی باش دەگوزەرێنن. ئەمە دوای ئـەو گۆڕانکارییـە ئابوورییـە سـەرکەوتوانەی لـەدوای چـلەکانی سـەدەی پێـشووەوە بەئەنجام گەیەنراوە.

فەرەنسا بەپلەی یەکەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی مەین وبەپلەی دووەم دێت لـە ووزەی کارەبـا وئـەتۆمین وبەپلـەی چـوارەم دێـت لـە چاندنی جـۆ ، بەپلـەی پێنجـەم دێت لەبەرهـەمی گـەنم وگەنمەشـامی ویۆرانیـۆم وبەپلـەی یانزدەیـەم دێـت لەبەرهـەمی پەتاتـە وداروتەختە، بەپلـەی دوانزدەیـەم دێت لەبەخێو کردنی بـەراز وبەپلەی چواردەیەم دێت لـە بـەخێوکردنی مانگـا. هـەروەها رێژەیـەکی باشـی گەشـتوگوزاریش سـالانە رووی تێدەکـەن، نزیکەی بە ٧٥ ملیۆن گەشتیار دەخەمڵێنرێ.

سـروودی نیـشتیمانی: مارسـیلیز، بەسـروودێکی نیشتیمانی تۆمـار کـراوە لـە دەسـتووری ١٩٥٨ دا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٣٥٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٤ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٢٣,٤٧٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٢ .

**فیلیپین**

ناوی باو: فیلیپین

ناوی فەرمی: كۆماری فیلیپین.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of the Philippines

سیستەمی حوكمڕانی: كۆماری، سەرۆكی كۆمار خۆی سەرۆكی حكومەتە.

دەستەی یاسادانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٢٤ ئەندام ).

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٠٤ ئەندام).

ڕووبەر: ١١٥,٨٨٠ میل دووجا، ٣٠٠,٠٧٦ كم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ٧٥,٣٠٠,٠٠٠ كەس ( تا ٢٠٠٠ )

چڕی دانیشتوان: ٢٤٠ كەس/كم$^2$

كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە: فیلیپینی بەرەچەڵەك میلایی، چینی، ئیسپان، ئەمریكی.

ئاین: مەسیحی ( ڕۆمان كاسۆلیك، پرۆتستانت، كڵێسەی فیلیپینی سەربەخۆ)، موسڵمان ٢٥ ٪ ، بوودی.

زمان: فیلیپینی، ئینگلیزی.

پایتەخت: مانێلا.

شارە سەرەكییەكان: كیوزۆن، دافاو، سیبۆ، كالۆكان، زامبوانگا.

دراو: بیزۆی فیلیپینی.

ئاو وهەوا: خولگەیی، گەرم وشێدارە بەدرێژایی ساڵ، لەناوچە بەرزەكانیش ئاو وهەوا ساردە. بەشێوەیەكی گشتی نێوەندی پلەكانی گەرما لەنێوان ٢١ بۆ ٢٨ پلەی سەدی دەبێت، لەپایتەخت لەنێوان ٢٤ بۆ ٢٨ پلەی سەدی دەبێت. ڕێژەی ساڵانەی بارانەكان ٢٥٠ سم، لەهەندێ ناوچەدا دەگاتە ٤٦٠ سم ، لەپایتەختیش نزیكەی ٢٠٨ سم دەبارێت.

بەرهەمە كشتوكاڵیەكان: برنج، گەنمەشامی، قامیشی شەكر، گوێزی هیندی، ڕاوەماسی، داروتەختە، مۆز، ئەناناس، منیهۆت، بەخێوكردنی بەراز، پەلەوەر، لاستیك، قاوە.

بەرهەمە پیشەسازییەكان: دروستكراوەكانی خۆراك، ئامێری كارەبایی وئەلیكترۆنی، ماددەی كیمیایی، دەرمان، چنین، بەرهەمە نەوتییەكان.

سامانی كانزایی: مس، ئاڵتون، نیكل، خەڵووزی بەردین، نەوت.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

فیلیپین وڵاتیکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای زەریای هێمن، نزیکەی ١٠٠ کم لەکەناری باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە دوورە ودەریای چینی باشوور لێکیان جیادەکاتەوە، فیلیپین دەڕوانێتە سەر هەر یەك لە ڤێتنام وتایوان وچین. نزیکەی لە ٧١٠٠ دورگەی بچوك پێك دێت، هەندێکیان هێندە بچوکن هیچ ناوێکیان لەخۆنەگرتووە. گەورەترین سێ دورگەشی: لۆزۆن لەباکوور، مینداناو لەباشوور، سەمار لە ڕۆژهەڵات. ئەم سێ دورگەیەش نزیکەی دوو لەسەر سێی ڕووبەری وڵاتیان پێك هێناوە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ١٢٢ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێلی پانی ١٢ بەرەو باکوور.

زۆربەی زەوییەکانی فیلیپین شاخاوییە، دەشتە تەسك وبەرفراوانەکانی دەکەوێتە سەر کەناری دورگەکان، بەڵام هەندێ لەدەشتەکان لەناوخۆی وڵاتدا بەرفراوان دەبنەوە. ئەتوانین بڵێن لەتەواوی دورگەکاندا چیای گڕکانی لەخۆ گرتووە وهەندێکیان هێشتا چالاکن. چیای ئابۆ لە دورگەی میندانۆی باشووری وڵات بەرزییەکەی دەگاتە ٢٩٥٤ م وبەرەچەڵەك چیایەکی گڕکانە وخامۆش بووە.

دورگەکانی فیلیپین لەو دورگە کەمانە دادەنرێت کە زۆر لەمێژەوە مرۆڤی لێ نیشتەجێ بووبێ. ئەمڕۆش تەواوی جۆرەکانی شارستانێتی لەئامێز گرتووە کەمرۆڤ بەدرێژایی مێژوو ناسیبێتی. لە کیشوەری ئاسیاوە( بەتایبەتی لەمالیزیا ولە ئیندەنوسیاوە ) لەنزیکەی ساڵی ٣٠٠٠ پ.ز خەڵکی بەرەو ئەو ناوچانە کۆچیان کردووە.لەدوای سەدەی دەیەمی زایینەوە هەمەجۆری کەلتوورەکان لەفیلیپیندا لەگەڵ گەیشتنی کەشتییە بازرگانییەکانی یابان وچین دەستی پێکردووە. ئینجا چینییەکان وورده وورده لەناوچەکەدا نیشتەجێ بوون، کەچی ئێستا نەتەوەی چینی لە فلیپیندا تەنها ٣ –٥ ی کۆی دانیشتوانی ئەو وڵاتە دەبێت, بەڵام زیاتری لە ٥٠٪ ی کاروبارە بازرگانییەکانی وڵاتیان بەدەستەوەیە، ئەمەش دوژمنکارییەکی بەردەوامی لەنێوان چینی وفیلیپینییەکاندا خوڵقاندووە.

لەسەدەکانی چواردە وپانزدەی زاییندا ئاینی ئیسلام لەگەڵ کاروانی بازرگانە عەرەبەکان گەیشتۆتە فیلیپین، بۆیە ناویان ناوە پاکیزەی مالیزیا چونکە زۆربەی دانیشتوانی بەرەچەڵەك مالیزین. زیاترینی ئیسلامەکانیش لەو دورگانە کۆبوونەتەوە کە دەکەوێتە بەشی باشووری فیلیپین، ڕێژەی ئیسلامەکانی دورگەکانی میندناو و سۆلۆ ٨٥ ٪ ی کۆی دانیشتوانی ئەو دورگانە دەبێت.

لەساڵی ١٥٢١ دا دەریاوانی پۆرتۆگالی فردیناند ماجەلان بەسەرکردایەتی کەشتی گەلێکی ئیسپانی گەیشتۆتە ناوچەکە. ماجەلان ناوی ئەو وڵاتەی ناوە وناوەکەی لە شای ئیسپانی فیلیپی دووەم وەرگرتووە. ماجەلان بەهۆی کێشەی دانیشتوانی ناوچەکە لەبەرواری ٢٧ / ٤ / ١٥٢١ لە فیلیپیندا کوژراوە. ئیسپانییەکان نزیکەی ٣٥٠ ساڵ حوکمی ناوچەکەیان

کردووه، لەو ماوەیەدا ئاینی مەسیحی ودابونەریتیە لاتینییەکانیان لەوێدا بلاوکردۆتەوە کەتا ئێستاش ئەو دابونەریتانەیان پێوە دیارە.

دوای جەنگی ئیسپانی ئەمریکی، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەرکی بەڕێوەبردنی فیلیپینیان لەساڵی ۱۸۹۹ دا گرتۆتە دەست. بەلام هێندەی نەخایاند گەلی فیلیپین بزوتنەوەی یاخیبوونیان لەدژی ئەمریکییەکان هەڵگیرسان وبەسەدان هەزار رۆڵەی ئەو وڵاتە بوونە قوربانی سەربەخۆیی وڵاتەکەیان. بۆیە ناچار ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لە ۱۹۳۵ دا مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشین، هەوڵی گەشە پێدانی ژێرخانی ئابووری وئاستی خوێندەواری وڵاتەکەی داوە، زمانی ئینگلیزیشی کردە زمانی خوێندەواری. لەساڵی ۱۹٤۲ یابان داگیری کردووە، بەلام لە سەرەتای ۱۹ / ۱۰ / ۱۹٤٤ دا دووبارە هێزە ئەمریکییەکان دەستیان کردۆتەوە بەدابەزین لە فیلیپیندا. بۆ ساڵی دوایی بەیارمەتی هێزە فیلیپینییەکان بەتەواوەتی ئازادی کردووە. لەبەرواری ۱۲ / ٦ / ۱۹٤٦ دا سەربەخۆیی وڵات راگەیەنراوە، لەبەرواری ٤ / ۷ / ۱۹٤٦ دا سەربەخۆیی گشتی دەستگیر بووە.

لەپێناوی بنیات نانی وڵاتەکەیان دوای سەربەخۆیی، سەرکردەکانی فیلیپین روویان کردە ویلایەتە یەکگرتوەکان بەرامبەر بەرێگەدان بەسازدانی چەند بنکەیەکی سەربازی ئەمریکی لە وڵاتەکەدا داوای یارمەتیان لێکردن.فردیناند مارکۆس لەساڵی ۱۹٦۹ دا دەسەلاتی وڵاتی گرتە دەست وبایەخی بە چاکسازی کارگێڕی وڵاتەکەی داوە. بەلام کێشە ئابوورییەکان وڵاتەکەی بەرەو ئاژاوە دەبرد وبووە هۆی نائارامی لەوڵاتەکە. لەساڵی ۱۹۸٦ دا سەرکردەی ئۆپۆزسیۆنی فیلیپین خاتوو کۆرازۆن ئەکینۆ سەرکەوتنی بەدەست هێنا. بەلام مارکۆس بەدەست هەڵگرتنی لەدەسەلات وئەنجامەکانی هەڵبژاردنی رەتکردەوە، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی نارەزایی وشەڕی ناوخۆ، لەئەنجامدا مارکۆس لەدەسەلات دوور خرایەوە. خاتوو ئەکینۆ لە ۲۵ / ۲ / ۱۹۸٦ دا پۆستی سەرۆکایەتی گرتە دەست، بەمەش بەیەکەم ژن دانرا پۆستی سەرۆکایەتی فیلیپین بگرێتە دەست. دوای ئەکینۆ لەساڵی ۱۹۹۲ فیدیل راموس بۆتە سەرۆکی کۆمار. لەهەڵبژاردنەکانی مانگی پێنجی ۱۹۹۸ جۆزیف ئیگیرسیتۆ ئەسترادا بۆ پۆستی سەرۆکایەتی سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

لەبەرواری ۲۰ / ۱ / ۲۰۰۱ دا دادگای بالای فیلیپین دەستی بەسەرۆک جۆزیف ئەسترادا کێشایەوە بەتۆمەتی تێوەگلان بەچەند بابەتێکی گەندەڵییەوە. دوای ئەوەی بۆ ماوەیەک ئەم بڕیارەی دادگای رەتکردەوە – ناچار دەستی لەکار کێشایەوە ودوای فشارێکی زۆری جەماوەر وسوپای ئەو وڵاتە تەلاری مالاکانجی سەرۆکایەتی بەهۆی بەلەمێکەوە بەجێ هێشت بەروبارێکی پشت تەلارەکەوە بەرەو ماڵی تایبەتی خۆی بەڕێ کەوت، بەهیچ شێوەیەک قایل نەدەبوو وڵاتەکە بەجێ بهێڵێت. خاتوو گلۆریا مکاباجالی جێگری سەرۆک ئەرۆیۆ لەبەردەم دادگای بالا سوێندی دەستووری خوارد وبووە چواردەیەمین سەرۆکی وڵات، دووەم سەرۆکی ژنی فلیپین، لەهەمان ئەو جێیەی بەئامادەبوونی سەدان لێپسراو

ڕێوڕەسمی سەرۆکایەتی پێسپێردرا.

لەبەرواری ٢٥ / ٤ / ٢٠٠١ دا سەرۆکی پێشووی فیلیپین جۆزیف ئەسترادا دوای ئەوەی بڕیاری دەستگیر کردنی دەرچوو بوو لەلایەن دادگای بالاوە، دەستگیر کرا وبەتۆمەتی تێوەگلانی بەگەندەڵی کارگێڕی دادگایی کرا. لەبەرواری ٢٣ / ٨ / ٢٠٠٢ دا دادگای بالای فیلیپین بڕی ٧٦ ملیۆن دۆلاری سەرۆکی پێشووی فیلیپینی سڕ کرد ولەلایەن حکومەتەوە دەستی بەسەردا گیرا، شایەنی باسە جۆزیف ئەسترادا ئەو پارەیەی بە بەرتیل ولەرێی ناڕەواوە پەیدا کردبوو لەماوەی حوکم ودەسەلاتەکانیدا.

لە ساڵی ٢٠٠١ دا فیلیپین جەختی لەسەر گرنگی کۆنترۆڵ کردنی ڕێژەی زیابوونی لەدایک بووانی کردەوە، هەروەها باسی لەوە دەکرد کە چڕی دانیشتوان و ژمارەی دانیشتوان کاریگەرییەکی سلبی دەکاتە سەر باری ئابووری ولات وژیان وگوزەرانی هاولاتیان خراپتر دەکات. بەپێی راپۆرتێکی حکومی ژمارەی دانیشتوان لەماوەی ٣٥ ساڵی داهاتوودا بەرەو ١٥٠ ملیۆن زیاد دەکات ئەگەر بێتو پلانێکی گونجاو بۆ خێزانی فیلیپینی دانەڕێژرێ.

لەسەردەمی سەربەخۆیی فیلیپینەوە، هەوڵی گەشەپێدانی سەرچاوە سروشتی وکشتوکاڵی ودارستانەکانی دەدات، بەلام بوژانەوەی ئابووری لەو ولاتەدا بەرەو دوا دەچێت، چونکە زۆربەی کانزاکانی بەشێوەیەکی خاو دەردەهێنرێت، دارستانەکانیش بەردەوام لە بڕینەوەدان، ئەمەش ئەگەر تیاچوون وفەوتانی لێ دەبێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی ئابووری فیلیپین بەپلەی یەکەم پشتی بە کشتوکاڵی بەستووە، دانیشتوانەکانیشی لەنێوان گوند وشارەکاندا بەیەکسانی دابەش بوون.

فیلیپین بە پلەی شەشەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی لاستیک وبەپلەی دەیەم دێت لەبەرهەمی برنج، بەپلەی یانزدەیەم دێت لەبەرهەمی قامیشی شەکر، بەپلەی دوانزدەیەم دێت لە راوەماسی وبەپلەی سیانزدەیەم دێت لە نیکل وقاوە وبەپلەی چواردەیەم دێت لەبەرهەمی ئاڵتون وگەنمە شامی وبەپلەی پانزدەیەم دێت لەبەرهەمی داروتەختە، بەپلەی شانزدەیەم دێت لەبەرهەمی مس.

سروودی نیشتیمانی: خاکی خۆشەویستمان، خاکی خۆرهەلات.

جەژنی نیشتیمانی: ٤ / ٧ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ١٩٤٦، لەگەڵ رەچاو کردنی رۆژی سەربەخۆیی ئەمریکا کە هەمان رۆژ دەکات.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٦٣,٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٣٩ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٩٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١١٦ .

## ڤەنزویلا

ناوی باو: ڤەنزویلا.

ناوی فەرمی: کۆماری ڤەنزویلا.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Venezuela.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری یەکگرتوو، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

دەستەی یاسادانان: لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٥٢ ئەندام ).

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٩٩ ئەندام ).

رووبەر: ٣٥٢,١٤٤ میل دووجا، ٩١٢,٠٥٠ کم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ٢٢,٧٧٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ٢٥ کەس/کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: میستیزۆ ( تێکەڵەیەکن لە ئەورووپی وهیندەکانی ئەمریکا )، ئەورووپی، ئەفریقی رەش، هیندی ئەمریکا.

ئاین: مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك ).

زمان: ئیسپانی.

پایتەخت: کاراکاس.

شارە سەرەکییەکان: ماراکیبۆ، ڤالنسیا، بارکیسیمتۆ، سیوداد غایانا.

دراو: بۆلیڤار.

ئاو وهەوا: خولگەیی، نزماییەکان بەدرێژایی ساڵ گەرمە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٨ پلەی سەدی لە دەشتەکانی لانۆس وبەشی باکووری کەوزی ماراکیبۆ، بەلأم بەرزاییەکان فێنکە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە بەرزاییەکانی ئەندین ١٩ پلەی سەدی دەبێت. رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەچیاکانی بیریها وبەرزاییەکانی گۆیانای باشوور دەگاتە ٢٥٠ سم، لەکەناری کاریبی ٤٠ سم ولەدەشتە رۆژهەڵاتییەکانی لانۆس ١٠٠ سم دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مۆز، بەخێوکردنی مانگا ومەڕومالآت، پەلەوەر، قاوە، قامیشی شەکر، برنج، گوێزی هیندی، میوە وسەوزە، راوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: پالآوتنی نەوت، دروستکراوە کیمیاییەکان، ئەلەمنیۆم، پۆڵا، دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گازی سروشتی، بۆکسیت، ئاسن، ئاڵتون.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

ڤەنزەوێلا وڵاتیکە دەکەوێتە سەر کەناری باکووری ئەمریکای باشوور. دەریای کاریبی وزەریای ئەتڵەسی دەکەونە باکووری، گۆیانا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، بەرازیل دەکەوێتە باشووری، کۆلۆمبیا دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦٨ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٩ بەرەو باکوور.

تەختی وڵات پێک دێت لە: نزماییەکانی ماراکیبۆ لەباکووری رۆژئاوا کە دەریاچەی ماراکیبۆ وبیرە نەوتەکان وپایتەختی تێدەکەوێت، بەڵام بەرزاییەکانی ئەندین لەباشووری رۆژئاوای حەوزی ماراکیبۆوە تا باکووری ڤەنزویلا درێژ دەبێتەوە وزۆربەی دانیشتوانی لەخۆگرتووە. دەشتەکانی لانۆسیش دەکەوێتە نێوان بەرزاییەکانی ئەندین وبەرزاییەکانی گۆیانا وروباری ئۆرکینۆی پیادا تێپەڕ دەبێت کە درێژترین روباری وڵاتە، شایەنی باسە دەشتەکانی لانۆس ناوچەیەکی بەپیتی کشتوکاڵی ولەوەڕی ئاژەڵانە. بەرەو باشووری دەشتەکانی لانۆس بەرزاییەکانی گۆیانا دەست پێدەکات ونزیکەی نیودی رووبەری وڵاتی داگیر کردووە.

ڤەنزویلا لەبنەڕەتدا نیشتیمانی ژمارەیەکی زۆری هیندە سوورەکان بووە، لەوانە: کارکاس، ئەراداکس، کۆمانا فاتۆس. دوای ئەوەی کریستۆف کۆلۆمبۆس لەگەشتی سێهەمیدا بەرەو جیهانی نوێ لەساڵی ١٤٩٨ ئەو ناوچەیەی دۆزیوەتەوە، ئیسپانییەکان دەستیان کردووە بە هەڵمەتە داگیرکارییەکانیان بۆ سەر کەنار وناوچە نزیکەکانی ڤەنزویلا. ئەو ئەوروپیانەی گەیشتنە باکووری رۆژئاوای ڤەنزویلا، چەند گوندێکی هیندییان لەسەر کەنارەکانی ئەو وڵاتە بەدی کرد وخانوەکانیان لەناو ئاوەکانی کەنداوی ڤەنزویلا ودەریاچەی ماراکیبۆ دروست کردبوو، دیارە ئەمەش بیری ناوچەی ڤینیسیای ئیتالی خستونەتەوە، بۆیە ناوچەکەیان ناو ناوە ڤەنزویلا کە بەزمانی ئیسپانی بەمانای ڤینیسیای بچوک دێت.

دەسەڵاتی ئیسپانی بەسەر ڤەنزویلا تا ٥ / ٧ / ١٨١١ ی خایاند، لەدوای ئەو بەروارە وڵات سەربەخۆیی خۆی راگەیاند لەگەڵ ئەوەی چەند هێزێکی ئیسپانی هێشتا لەناو وڵاتەکەدا مابوو. بۆیە تا ساڵی ١٨٢١ سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر نەبوو، لە ١٨٢١ شۆڕشگێڕی ڤەنزەویلی سیمۆن بۆلیڤار توانی لەشەڕی کارابۆبۆ ئیسپانەکان تێک بشکێنی و وڵاتەکەی ئازاد بکات وکۆماری ڤەنزویلا راگەیەنرا. لەبەرواری ٢٢ / ٩ / ١٨٣٠ دا ڤەنزویلا بەتەواوی لە کۆماری کۆلۆمبیای گەورە سەربەخۆ بوو، شایەنی باسە کۆماری کۆلۆمبیای گەورە لە ساڵی

١٨١٩ دامەزرا وهەر یەك لەم چوار ولاَتەی لەخۆ گرتبوو: ڤەنزویلا، كۆلۆمبیا، ئیكوادۆر، پەنەما.

یەكەم سەرۆكی ڤەنزویلا دوای سەربەخۆ بوون جەنەرال خۆزێ ئەنتۆنیۆ باییز بوو كەیەكێ بوو لەسەركردەكانی بزوتنەوەی ئازادای خوازی ئەو ولاَتە. لەو سەردەمەوە ڤەنزویلا چەندین شۆڕش وكودەتای سەربازی وراپەرینی گەورەی بەخۆوە بینییوە، لەناوەڕاستەكانی سەدەی بیستەمدا چەند دیكتاتۆرێك دەسەلاَتی ولاَتیان گرتۆتە دەست. لەسالَی ١٩٥٠ دا ماركۆس بیریز خیمینیز حاكمێكی دكتاتۆری ولاَت بووە، تا لە ١٩٥٨ دا شۆڕشێكی جەماوەری هەلَگیرساوەو توانیان ماركۆس لەدەسەلاَت دوور بخەنەوە. لەهەلَبژاردنە دیموكراسییەكاندا گەلی ڤەنزویلا رۆمۆلۆ بیتانكۆرتیان بەسەرۆكی كۆمار هەلَبژارد، ئەویش یەكێكە لەسەركردەكانی پارتی كرێكارانی دیموكراسی. لەدوای ئەو سەردەمەوە گەلی ڤەنزویلا سەرۆكی كۆمار بەهەلَبژاردن دیاری دەكەن. لەكۆتایی سالَی ١٩٩٨ دا بەرێژەی ٥٦ ٪ ی دەنگەكانی گەلی ئەو ولاَتە هۆگۆ شافیز فریاسیان بەسەرۆكی كۆمار هەلَبژارد. لە ٢ / ٢ / ١٩٩٩ لەبەردەم سەدان هەزار هاولاَتی كەلەشەقامەكانی كاراكاسدا كۆبوبوونەوە سوێندی دەستووری خوارد، شایەنی باسە شافیز دوای سەرۆك رافائیل كالدیرا رۆدیگز دەسەلاَتی گرتە دەست.

لە ٣١ / ٧ / ٢٠٠٠ دا سەرۆك هۆگۆ شافیز فریاس بەماوەیەكی دووەمی سەرۆكایەتی لەهەلَبژاردنە گشتییەكاندا لەبەردەم هاورێی خەباتی پێشووی فرانسیسكۆ ئەریاس سەركەوتنی بەدەست هێنایەوە. لە ١٩ / ٨ / ٢٠٠٠ دا سوێندی دەستووری خوارد وبووەوە بەسەرۆكی كۆمار. لەرێورەسمی سوێند خواردندا هۆگۆ بەلێنیدا هەولَی بنیات نانی ئابوورییەكی نموونەیی ولاَتەكەی بداتەوە وتەرخان كردنی شوێنی نیشتەجێ بوون بۆ هەژاران وبوژانەوەی ئاستی ژیانی هاولاَتیانی ولاَتەكەی.

لەبەرواری ١١ / ٤ / ٢٠٠٢ دا كارەبەدەستە سەربازییەكان سەرۆك شافیزیان ناچار كرد دەست لەكارەكانی بكیشێتەوە بەپاساوی خراپ بەكارهێنانی دەسەلاَتەكانی، گواستیانەوە بۆ دەرەوەی پایتەخت، بەلاَم هەولَی كودەتاكە هێندەی نەخایاند شكستی هێنا ودوای دوو رۆژ شافیز گەڕایەوە بۆ پایتەخت ودەسەلاَتەكانی گرتەوە دەست بەهۆی راپەرینێكی جەماوەرییەوە كە پشتگیری لە شافیز دەكرد.

ڤەنزویلا لە جەنگی جیهانیی یەكەم هەلَویستی بێلایەنی لەخۆی گرتوو لەجەنگی جیهانیی دووەمدا پەیوەندییەكانی لەگەلَ ولاَتانی میحوەر پچڕاند، لە ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندام لە نەتەوە یەكگرتوەكان.

لەهاوینی ۲۰۰۱ دا ڤەزەوێلا داوای ناوچەی رۆژهەڵاتی لە گۆیانای دراوسێی کردەوە کە سەردەمێکە کێشەی لەسەرە، گۆیاناش لەلایەن خۆیەوە داواکارییەکانی رەتکردەوە.

ڤەنزویلا یەکێ بوو لە ولاتە هەژارەکانی ئەمریکای باشوور، ئابووری ئەو ولاتە پشتی سەرەکی بە کشتوکاڵی بەستبوو، بەڵام دۆزینەوەی پیترۆل لە بیستەکانی سەدەی پێشوودا، یارمەتییەکی باشی ئەو ولاتەیدا لە جێبەجێ کردنی پلان وبەرنامە گەورەکانی گەشەپێدانی پیشەسازی.

ڤەنزویلا بەپلەی حەوتەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەدەرهێنانی پیترۆل وبەپلەی هەشتەم دێت لەدەرهێنانی بۆکسیت، بەپلەی دوانزدەیەم دێت لە ئاسن وبەپلەی پانزدەیەم دێت لە گاز، بەپلەی هەژدەیەم دێت لەبەخێو کردنی مانگا وقامیشی شەکر وبەپلەی نۆزدەیەم دێت لەچاندنی قاوە، بەپلەی بیستەم دێت لە دەرهێنانی ئاڵتون.

جەژنی نیشتیمانی: ٥ / ٧ / رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ۱۸۱۱

سروودی نیشتیمانی: ئەمری بۆ گەی ئەبەردمان.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٥٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٤٠ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۲,۷٦۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٦٦ .

## فینلەندا

ناوی باو: فینلەندا

ناوی فەرمی: کۆماری فینلەندا

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Finland.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: پەرلەمان ( ٢٠٠ ئەندام ).

رووبەر: ١٣٠,٥٢٩ میل دووجا، ٣٣٨,١٤٥ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٥,١٤٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ١٦,٩ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: فینلەندی، سویدی.

ئاین: مەسیحی (کڵێسەی ئینگیلی لۆتەری، کڵێسەی ئەرتۆدۆکس).

زمان: فینلەندی، سویدی.

پایتەخت: هێلسینکی.

شارە سەرەکییەکان: ئیسبۆ، تامبیری، تۆرۆکۆ، ڤانتا، ئۆلۆ.

دراو: مارك، لەدوای ١ / ١ / ٢٠٠٢ بوو بە یۆرۆ.

ئاو وهەوا: زستانی سارد وشەوی زۆر درێژە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا دەگاتە ٣٠ پلەی ژێر سفری سەدی. هاوینی گەرمە ورۆژی درێژ دەبێتەوە، نێوەندی پلەکانی گەرما دەگاتە ٣٠ پلەی سەدی، رێژەی ساڵانەی بارانەکانی لەباکوور دەگاتە ٤٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: شیر، گۆشت، جۆ، چەوەندەر، دارستانەکان.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئامێرەکان، کەشتی، کاغەز، ئامێری کارەبایی وئەلیکترۆنی، دروستکراوە پیترۆکیمیاییەکان، داروتەختە.

سامانی کانزایی: مس، زنك، نیکل.

تێڕوانینێکی گشتی:

فینلەندا، یان سۆمی بەزمانی فینلەندی، وڵاتیکە دەکەوێتە باکووری ئەورووپا، نەرویج دەکەوێتە باکووری، رووسیا دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، هەر یەك لە کەنداوی فینلەندا وکەنداوی بۆتنیا -- کە دوو قوڵی دەریای بەڵتیکن- سنوورە باشووری و رۆژئاواکانیان پێك هێناوە. سوید دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای. بەهەزاران دورگەی زۆر جوان بەدرێژایی کەنارەکانی بڵاوبونەتەوە وهەندێکیان نیشتەجێ نەکراون، هەندێکیان بەناوچەیەکی راوەماسی گرنگ دادەنرێت، گرنگترینیان دورگەکانی ئۆلەندە کە دەکەوێتە دەریای بەڵتیك لەنێوان سوید وفینلەندا، شایەنی باسە دورگەکانی ئۆلەند خاوەنی ماڤی ئۆتۆنۆمیە ولەپەرلەمانی فینلەندا

ئەندامێکی پێبەخشراوە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکێری هێڵی درێژی ٢٧ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٦٤ بەرەو باکوور.

دەشتەکانی بەدرێژایی کەنارەکانی سەر هەردوو کەنداوی بۆتنیا وفینلەندا بلاو دەبنەوە وزۆربەی چالاکییە کشتوکاڵییەکان لەو ناوچەیەدا ئەنجام دەدرێت، نزیکەی ١٨٨ هەزار دەریاچە، واتا بەرێژەی دەریاچەیەك بۆ هەر ٢٧ کەس نیوەی رووبەری وڵاتەکەیان داگیر کردووە. ناوی سوٚمی کەبەزمانی خەڵکی وڵات بەوڵاتەکە دەوترێت لە لێکدانی دوو وشەوە هاتووە، سۆ بەمانای زەوی دێت، می بەمانای دەریاچە دێت، کەواتە سوٚمی بەمانای خاکی دەریاچەکان دێت. گەورەترین دەریاچەشی دەریاچەی سایمایە کە دەکەوێتە بەشی باشووری رۆژهەڵاتی فینلەندا وورووبەرەکەی ٤,٤٠٠ کم٢ دەبێت. بەڵام باکووری وڵات هێندە سەرمایەکی سەختی لەخۆ گرتووە پێدەچێ نیشتەجێ نەکرابێ وهیچ جۆرە چالاکییەکی کشتوکاڵی تیائەنجام نادرێت، باکووری وڵات دەکەوێتە سەر بازنەی جەمسەری باکووری گۆی زەوی لەو ناوچەیەدا کەپێی دەوترێ خاکی خۆری نیوە شەو، لەوەرزی هاویندا نزیکەی ٢٤ کاتژمێر لەرۆژێکدا خۆرهەڵاتە، لەوەرزی زستاندا زیاتر لەدوو مانگ خۆر نابینرێت وهەر شەوە.

دراستانەکان نزیکەی ٧٠ ٪ ی زەوییەکانی فینلەندایان داپۆشیوە، زەوییە کشتوکاڵیەکانیش رێژەی ١٥ ٪ خاکی وڵات، ١٥ ٪ یشی بەبەفر وسەهۆڵ داپۆشراوە.

لاپییەکان گەلە سەرەتاییەکانی فینلەندا بوون کە بە راوەماسی دەژیان. لەسەدەی یانزدەیەمدا کێشە وململانێکان لەنێوان سوید وورووسیادا هەڵگیرساوە لەسەر دەست گرتن بەسەر فینلەندادا، سوید هەوڵی دەدا فینلەندا ملکەچی کڵێسەی کاسۆلیك بکات، رووسیا لەهەوڵی ئەوە دابوو ملکەچی کڵێسەی ئەرتۆدۆکسی بکات. لەگەڵ ئەوەی سوید زیاتر لە ٥٠٠ ساڵ دەسەڵاتی فینلەندای گرتۆتە دەست، بەڵام گەلی فینلەندا توانیویەتی پارێزگاری لەپێناسەی کەلتووری خۆی بکات. دوای تێکشکاندنی سوید لەبەردەم رووسیادا لە ساڵی ١٨٠٨ ، سەرکردایەتی فینلەندا لە سویدەوە کەوتۆتە دەست رووسیا، بەڵام گەلی فینلەندا هیچ نارەزاییەکیان لەم گۆڕانکارییە دەرنەبڕی بەتایبەتی کاتێ قەیسەری رووسیا ئەسکەندەری یەکەم بەڵێنی پێدان رێز لە یاسا ودەزگاکانیان بگیرێت.

بەڵام رووسیا پەیمان وبەڵێنەکانی شکان، بۆیە فینلەندییەکان لەدژیان راپەڕین و لێی یاخیبون، لە ٦ / ١٢ / ١٩١٧ دا فینلەندا سەربەخۆیی خۆی راگەیاند وورووسیاش لەلایەن خۆیەوە دانینا بەسەربەخۆیی ئەو وڵاتە، بەڵام رووسەکان سەر لەنوێ لە ١٩٣٩ دا داگیریان کردەوە فینلەندییەکان خۆیان نەدا بەدەستەوە، بەرەنگارییەکی وەها توندیان لەدژی رووسیا ئەنجام دا تەواوی وڵاتانی جیهانی دڵکەش کرد. فینلەندا لەشەڕی دژی رووسیا ١٢ ٪ ی دانیشتوانی لەدەست دا، جگە لە زەوییەکی زۆری وڵاتەکەیان، بەڵام هەر بەسەربەخۆیی مایەوە، دوای ئەوە فینلەندا بووە هاوپەیمانی هێزە نازییەکانی ئەڵمانیا تاکو پارێزگاری

ولاتەکەی مسۆگەر بکات، رێگایدا بەهێزە سەربازییە ئەڵمانیەکان لەولاتەکەی بمێننەوە.
دوای تێکشکانی ئەڵمانیا لەجەنگی جیهانیی دووەم، فینلەندا هەڵوێستی بێلایەنی بۆ خۆی هەڵبژارد، پەیوەندییەکانی لەگەڵ رۆژئاواو ویەکێتی سۆڤیەتدا قووڵ کردەوە، لە ساڵی ۱۹۵۵ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەمانگی سێی ۱۹۹٤، مارتی ئیهتیساری بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژێردرا، شایەنی باسە مارتی دەیەم سەرۆکی ئەو ولاتە بوو لەدوای سەربەخۆیی.

لە ۷ / ۲ / ۲۰۰۰ دا پاڵێوراوی پارتی سۆسیالیستی دیموکراسی خاتوو تاریا هالۆنێن ( ٥٦ ساڵ ) لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە پانزدەیەمین سەرۆکی ولات ویەکەم ژن پۆستی سەرۆکی کۆمار بگرێتە دەست لەفینلەندا.

سەرۆکی نوێ دەسەلاتەکانی زۆر دیاری کراوە، بەپێ ئەو دەستوورەی لەدوای ۱ / ۳ / ۲۰۰۰ دارێژراوە سەرۆك بۆی نییە دەستێوەردانی کاروباری سیاسەتی دەرەوەی ولات وناسایش بکات، دەسەلاتی فیعلی بەدەست خوودی سەرۆکی وەزیرانە. ئەمرۆ فینلەندا لەو هەوڵەدایە پارێزگاری لە پەیوەندییەکانی بکات لەگەڵ هەر یەك لە رووسیا وروژئاوا.

ئابووری فینلەندا لەپەنجاکانی سەدەی پێشوودا گەشەکردنێکی خێرا وبەرچاوی بەخۆوە بینیوە. فینلەندا ولاتیکی کشتوکاڵی بوو، بەلام بزوتنەوەی پیشەسازی توانی ولات بکاتە پێشەنگی ولاتە پێشکەوتوەکانەوە. ئابووری فینلەندا زیاتر بەدەست کەرتی تایبەتەوەیە وکەرتی حکومیش هەندێ کاروباری بازرگانی گەورەی بەدەستەوەیە. دارستانەکان بەگەورەترین سەرچاوەی داهاتی سروشتی ئەو ولاتە دادەنرێن، سامانی دارستانەکان ولاتیان کردۆتە یەکێك لەولاتە دەوڵەمەندەکان، بۆیە فینلەندییەکان دارستانەکانیان ناو ناوە ئاڵتونی سەوز.

فینلەندا بەپلەی شانزدەیەم دێت لە دەرهێنانی نیکل، بەپلەی نۆزدەیەم دێت لە بەرهەمی داروتەختە.

جەژنی نیشتیمانی: ٦ / ۱۲ ، رۆژی سەربەخۆیی ۱۹۱۷ .

سروودی نیشتیمانی: خاکی ولاتمان.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ۹٥,۸ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ۳۱ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۱۸,۸٥۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ۱۹ .

## ڤێتنام

**ناوی باو:** ڤێتنام.

**ناوی فەرمی:** کۆماری ڤێتنامی سۆسیالیست.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Socialist Republic of Vietnam

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری سۆسیالیستی، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٤٥٠ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٢٧,٨١٦ میل دووجا، ٣٣١,٠٤١ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧٥,١٢٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٢٢٦,٩ کەس/کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ڤێتنامی، تای، چینی، خەمیر، مۆنج، نۆنج.

**ئاین:** بوودی، مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك).

**زمان:** ڤێتنامی.

**پایتەخت:** هانۆی.

**شارە سەرەکییەکان:** هۆتشی منە، هایفۆنج، دالات، کۆن تۆم، نام دنە، هۆی، دانانج.

**دراو:** دۆنگ.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی لەگەڵ کاریگەری با وەرزییەکان بەدرێژایی ساڵ. نێوەندی پلەکانی گەرما لەپایتەختدا هاوین ٢٩ پلەی سەدی وزستان ١٧ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لەشاری هۆتشی منەی باشووری وڵات ٢٠٠ سم وزۆربەی لەوەرزی هاویندا دەبارێت. ناوچەکانی ناوەڕاستی وڵات باران کەمتر دەبارێت. لەناوچە شاخاوییەکاندا پلەکانی گەرما دادەبەزن وبارانەکان زیاتر دەبارێن.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** لاستیك، برنج، چا، دانەوێڵە، مەنیهۆت، قامیشی شەکر، گەنمەشامی، میوە وسەوزە، قاوە، بەخێوکردنی مانگا وبەراز، پەلەوەر، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، پەین، ئاسن، پۆڵا، کاغەز، چنین.

**سامانی کانزایی:** کرۆم، تەنەکە، خەڵووزی بەردین، پیترۆل، فۆسفات، خوێز

**تێڕوانینێکی گشتی:**

ڤێتنام وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، کەناری ڕۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی

هینـدی چینی داگیرکـردووه. چین دەکەوێتـە باکووری، دەریـای چینی باشـوور دەکەوێتـە ڕۆژهـەڵات وباشـووری، کـەمبۆدیا و لاوس دەکەونـە ڕۆژئـاوای، ناوەڕاسـتی دەکەوێتـە سـەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٨ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٦ بەرەو باکوور.

باکووری ڤێتنام بریتییە لە زنجیرە چیاییەك تا ناو چینی ولاوس درێـژ دەبێتـەوە، زنجیرە چیاکانی ئـەنامامێت لـەباکووری وڵاتـەوە تـا ڕۆژئـاوا درێـژ دەبێتـەوە لـە شـاری هۆتشی منـە کۆتاییان پێدێت وبەدارستانێکی زۆر داپۆشراوە.

ناوی ڤێتنام لە دوو بەش پێك هاتووە:

ڤێت: کەناوی ئەو کۆمەڵە خێڵەن لەمێژەوە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیادا ژیاون.

نام: بەزمانی ڤێتنامیەکان بەمانای باشووری ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا دێـت، بەم شێوەیە وشـەی ڤێتنام بەمانای: میللەتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دێت.

مێژووناسـەکان چەند ئاسـەوارێکیان لەناوچـەکەدا دۆزیوەتـەوە مێژووکـەی دەگەڕێتـەوە بـۆ نزیکەی ٤٠٠ هەزار ساڵ لەمەوبەر، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ڤێتنامییەکان لـەو مێـژووەوە لـەو ناچەیەدا ژیاون. لەساڵی ١١١ پ.ز چین باکووری ڤێتنامی داگیر کرد، دەسـەڵاتی چینییەکان نزیکـەی هـەزار سـاڵی لەناوچـەکەدا خایانـد، لـەو ماوەیـەدا بەلایـەنی کەمـەوە بـەدەیان جـار ڤێتنامییەکان لەدژی چینییەکان ڕاپـەڕیون، بـەڵام تـا سـاڵی ٩٣٩ نـەیانتوانیوە سـەربەخۆ بن، لەدوای ئەو بەروارە وڵاتیکی سەربەخۆیان لـەژێر نـاوی دای کۆفیـت، بەمانـای دەوڵـەتی مـەزن دێـت، دامەزرانـد. لەسـاڵی ١٤٠٤ دا سـەرلەنوێ چینییەکان ڤێتنامیـان داگیـر کـردەوە، بـەڵام دوای بیست ساڵ لەخەبات وتێکۆشان ڤێتنامییەکان توانیـان بیانکەنـە دەرەوەی وڵاتەکەیان، ئیمپراتۆرێتێکی بچوکیان بۆ خۆیان دامەزراند.

لەساڵی ١٨٥٨ دا فەرەنسییەکان ڤێتنامیان داگیر کرد وخستیانە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە، دەسـەڵاتەکانیان تـا سـاڵی ١٨٨٣ ی خایانـد، لـەماوەی حوکمیانـدا توانیـان حـاکمی ڤێتنـام ناچـار بکـەن واژۆ لەسـەر ڕێکەوتننامەیـەك بکـات، بـەپێی ڕێکەوتننامەکـە فەرەنـسا مـافی دەسـەڵات گرتنـە دەسـتی تـەواوی ڤێتنـامی پێبەخشرابوو. لەجـەنگی جیهـانیی دووەمـدا ( ١٩٤٠ – ١٩٤٥ ) یابانییەکان ڤێتنامیان داگیرکرد.

دوای تێکشکانی یابان لەجەنگی جیهانیی دووەمدا، شیوعییەکان دەسەڵاتی وڵاتیان گرتـە دەسـت ولـە بـەرواری ٢ / ٩ / ١٩٤٥ دا سـەربەخۆیی وڵاتەکـەیان لـەژێر نـاوی کۆمـاری دیموکراسـی ڤێتنام ڕاگەیانـد بەسـەرۆکایەتی سـەرکردەی شـیوعی هۆتـشی منـە ( بـەزمانی ڤێتنامی بەمانای ڕوناك کەرەوە دێت). بەڵام هێندەی نەخایاند هێزە فەرەنسییەکان پـەلاماری ڤێتنامیان دا، بۆیە شۆڕشێك لەدژیان هەڵگیرسا کەناوی شەڕی هیندی – چینی یـان جـەنگی

ڤێتنامی یەکەمی لێنراوە ( ١٩٤٦ - ١٩٥٤ ). جەنگەکە بەتێکشکانی فەرەنسا لە شەڕی دیان بیان فوو لە مانگی پێنجی ١٩٥٤ کۆتایی پێهات. لەهەمان ساڵدا کۆنگرەی جنێڤ ڤێتنامی کرد بە دوو بەشەوە: ڤێتنامی باکوور ( شیوعی ) و ڤێتنامی باشوور، وابڕیار بوو لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٦ دا هەردوو بەش لەژێر سایەی یەك حکومەتی هەڵبژێردراو ببنەوە بەیەك، بەڵام هەڵبژاردنەکان ئەنجام نەدران وهەردوو بەشی ڤێتنامیش نەبوونەوە بەیەك.

لەساڵی ١٩٥٧ دا شۆڕشی ڤیت کۆنگ بەسەرۆکایەتی سەرکردەی شۆڕشگێڕ هۆتشی منە لەدژی ڤێتنامی باشوور هەڵگیرسا، پرۆسە سەربازییەکان لەشەستەکانی سەدەی پێشوو گەشەی کرد وبووە جەنگی ڤێتنامی دووەم، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەجەنگەکەوە تێوەگلا، کاتێ هەڵسا بە ئاراستەکردنی هێزەکانی بۆ ڤێتنامی باشوور تاکو لەدژی هێزە شیوعییەکانی ڤێتنامی باکوور بەجەنگ بێن.

لە سەرەتای ١٩٧٣ دا هەر یەك لە شیوعی و ڤێتنامی و ویلایەتە یەکگرتوەکانی رێکەوتننامەی ئاگربەستیان واژۆ کرد، ویلایەتە یەکگرتوەکان تەواوی هێزەکانی لەڤێتنام کشانەوە. بەڵام شیوعییەکان هێندەی نەخایاند هێرشیان کردەوە سەر ڤێتنامییەکانی باشوور و سایگۆنی پایتەختی ڤێتنامی باشوور لە ٣٠ / ٧ / ١٩٧٥ کەوتە دەست شیوعییەکان، بەمەش تەواوی ڤێتنام کەوتە دەست شیوعییەکانەوە. بۆ ساڵی ١٩٧٦ شیوعییەکان هەردوو بەشی ڤێتنامیان کردەوە بەیەك ولەچوارچێوەی یەك حکومەت ناوی: کۆماری ڤێتنامی سۆسیالیست دانی پێنرا و لەساڵی ١٩٧٧ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

بەڵام ڤێتنام تا ئێستاش بەدەست ئاسەوارە دیارەکانی جەنگی ئەمریکا ڤێتنامەوە دەناڵێنێ، چەندین تۆپ وجبەخانە هێشتا نەتەقێنراونەتەوە هەندێ جار لەناکاو گرمەیان لێ هەڵدەسێ وزەرەر وزیانێکی گیانی وماددی زۆر دەگەیەنێ، ئەمە جگە لە سەدان هەزار مین وماددەی ژەهراوی کەبەشێوەیەکی نادیار چێنراون وتا ئێستاش نەخشەی تایبەت بۆ قەلاچۆکردنیان دانەرێژراوە.

شایەنی باسە ڤێتنامی لەو جەنگەدا نزیکەی ٢ ملیۆن هاوڵاتی لەدەست داوە، لەکاتێکدا هێزەکانی ئەمریکا ٥٨ هەزار سەربازیان لەدەست داوە.

ڤێتنام لەپێناوی دۆزینەوەی حکومەتێك لەکەمبۆدیا پشتگیری لێبکات لەبری حکومەتی خەمیرە سوورەکان، ناچار لەساڵی ١٩٧٨ پەلاماری دا وتاساڵی ١٩٨٩ لێی نەکشایەوە، چین لەپێناوی سزادانی ڤێتنام بۆ ئەو دەست درێژییەی لە ساڵی ١٩٧٩ دا هەندێ لەناوچە باکوورییەکانی ڤێتنامی داگیرکرد و ونزیکەی مانگێك لەناوچەکەدا مایەوە.

بەڵام تەواوی ئەو شەڕە یەك بەدواییەكانە ڤێتنام زیانێكی ئابووری زۆری لێكەوتەوە، بارودۆخی ئابووری ئەو وڵاتە هێندە ئاڵۆز بووە حكومەت بەردەوام شكست دەهێنێ لەدۆزینەوەی چارەسەرێكی گونجاو بۆ باشتر كردنی باری ئابووری وڵاتەكە، حكومەت لەهەوڵێكی نوێدا دەستی كرد بەنیشتەجێ كردنی زۆرە ملێ هەندێ لەهاوڵاتیەكانی لەگوندەكانیدا، بەڵام ئەمان بە بەلەمی بچوك لەرێی دەریای چینی باشوورەوە هەڵدەهاتن وڵاتەكەیان بەجێ دەهێشت وداوای ماف پەنابەری سیاسیان لەوڵاتە دراوسێكان دەكرد، شایەنی باسە نزیكەی یەك ملیۆن هاوڵاتی ڤێتنامی وەك پەنابەری سیاسی لەدەرەوەی وڵاتەكەیدا دەژین.

لەساڵی ٢٠٠١ دا ڤێتنام بۆ یادی ٢٥ ساڵەی سەركەوتنی لەشەڕی ڤێتنامیدا كەیەكێك بوو لەدڕندانەترین شەڕەكانی سەدەی بیستەم، ئاهەنگێكی گەورەی گێڕا، شایەنی باسە ساڵانە ڤێتنام لە ٣٠ / ٤ دا ئاهەنگی ئەم یادە دەگێڕین بەڵام لە ٢٠٠٠ دا بایەخێكی زۆر تایبەتی بەم بۆنەیەدا، دیارە ئەمە لەپێناوی وروژاندنی گیانی نیشتیمانی رۆڵەكانی ئەو وڵاتە بەتایبەتی نیوەی دانیشتوانی ڤێتنام لەدوای كۆتایی جەنگ لەدایك بوون، ئاهەنگەكان لەو هەرێمانەوە دەستی پێكرد كەسەرەتای كشانی شۆڕشگێڕەكانی ڤیت كۆنگ وهێزەكانی باكووری بەرەو سلیگۆنی پایتەختی ئەوسای ڤێتنامی باشووری بەخۆوە بینی.

لە بەرواری ١٣ / ٧ / ٢٠٠٠ دا سەرۆكی پێشووی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا بیل كلینتۆن رایگەیاند كە وڵاتەكەی وڤێتنام رێكەوتننامەیەكی بازرگانی مێژوویان واژۆ كردووە دوای ٢٥ ساڵ لەكۆتایی هاتنی جەنگی نێوانیان، ئەمە مژدە بەخشی دوارۆژێكی روون بوو بۆ رۆڵەكانی ڤێتنام. رێكەوتننامەكە دوای پێنج ساڵ لەگەڕانەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتەكانی نێوان ئەمریكا وڤێتنام دێت ودوای چوار ساڵ لە گفتوگۆكردن لەسەری.

لەبەرواری ١٦ / ١١ / ٢٠٠٠ دا سەرۆكی پێشووی ئەمریكا بیل كلینتۆن سەردانی ڤێتنامی كرد، ئەمە یەكەم سەردانی لەو جۆرە بوو، كە سەرۆكێكی ویلایەتە یەكگرتوەكان سەردانی ڤێتنامی تیا بكات. دیارە سەردانەكەی كلینتۆن لەپێناوی هەڵدانەوەی پەڕەیەكی نوێ بوو لەمێژووی خوێناوی ئەو دوو وڵاتە.

لە ٢٨ / ٧ / ١٩٩٧ دا هەڵبژاردنە گشتییەكانی ڤێتنام بەڕێوە چوو، لەئەنجامدا حیزبی شیوعی ڤێتنام بەكۆی ٨٥ ٪ دەنگەكان سەركەوتنی بەدەست هێنا. سەركردایەتی حیزبی شیوعی لە مەكتەبی سیاسی ئەو حیزبە پێك دێت كە پانزدە ئەندام پێك هاتووە. شایەنی باسە مەكتەبی سیاسی بەهێزترین دەزگا دەسەڵاتدارەكانی ڤێتنامە وخۆی لێپرسراوی داڕشتنی سیاسەتی وڵاتە.

لەساڵی ١٩٩٢ ئەنجومەنی نوێنەران تران دوك لوونگیان بەسەركردەی حیزبی شیوعی دەسەلآتدار هەڵبژارد، كەبەهێز ترین وبەتوانا ترین دەسەلآتی ئەو وڵاتەیە. دوای پێنج ساڵ لی خافیۆ ( ٦٨ ساڵ ) هەڵبژێردرا، وەكو باسی لێوە دەكەن لی خافیۆ كوڕی ناشەرعی سەركردەی ڤێتنام هۆتشی منەیە كە لە ( ١٩٦٩ دا كۆچی دوایی كرد).

لەساڵی ١٩٩٧ دا ئەنجومەنی نوێنەرانی ڤێتنام تران دوك لوونگ بەسەرۆكی وڵات هەڵبژاردەوە، لە ٢٤ / ٧ / ٢٠٠٢ دا سەرلەنوێ بەسەرۆكی وڵات هەڵبژێردرایەوە، لوونگ پسپۆری بواری جیۆلۆجیایە وبەیاوەرانی سیاسەتی چاكسازی ئابووری دادەنرێت.

لە ساڵی ٢٠٠٠ دا جەنەراڵ فوو فگوین ( كە بەپاڵەوانی سەربەخۆیی وڵات دادەنرێت ) رایگەیاند كە وڵاتەكەیان هێشتا وڵاتیكی پاشكەوتووە هەژاری ودواكەوتوویەكی زۆری تیا بەدی دەكرێت.

ڤێتنام بەپلەی پێنجەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی برنج، بەپلەی دەیەم دێت لەبەخێوكردنی بەراز وبەپلەی دوانزدەیەم دێت لە بەرهەمی چا.

* * *

**مار وپشیلە سفرەوخوانێكی تایبەتی ڤێتنامییەكانە**

**بەلآم بۆتە هۆی زیاد بوونی جرج ومشك**

ئەو جرج ومشكانەی بوونەتە هۆی لەدەست دانی بەشێكی زۆری بەرهەمە كشتوكاڵیەكانی ڤێتنام، بەتایبەتی برنج وگەنمە شامی پەتاتە،كێشەیەكی سەرەكی وبەردەوامیان بۆ وڵاتەكە ناوەتەوە، ساڵانە زیانێك دەگەیەنن بە ملیۆنەها دۆلاری ئەمریكی مەزەندە دەكرێت. لەساڵی ١٩٩٦ دا رووبەری ئەو زەوییەی كە جرج بەرهەمەكەی لەدەستداوە ٦٢٥هەزار دۆنم دەبوو، بۆ ساڵی ١٩٩٧ گەیشتە ٦٢٨ هەزار دۆنم. لەراپۆرتێكی وەزارەتی كشتوكاڵی ڤێتنامدا هاتبوو: ئەو زیانانەی مشك وجرجەكان لە ساڵی ١٩٩٩ دا گەیاندوویانە بەلانی كەمەوە بە ٥٠ ملیۆن دۆلار مەزەندە كراوە، هەروەها كارەبەدەستێكی هەمان وەزارەت ئاماژەی بەوەدا كە جوتیارەكان لەهەمان ساڵدا ٢٠٠ تەن دەرمانی قەلاچۆكردنی مشك وجرجیان بەكارهێناوە بۆ دەست بەسەرا گرتنی زیادبوونی خێرای ئەو گیانلەبەرە. هەروەها لە ئامارێكی حكومیدا ئاشكرا كراوە كە لەساڵی ١٩٩٨ دا نزیكەی ٥٥ ملیۆن جرجیان لەناو بردووە وبۆ ساڵی ١٩٩٩ ژمارەی جرجە لەناوبراوەكان گەیشتۆتە ١٧٩ ملیۆن جرج. بەلآم لەئامارێكی ئاشكرادا كاربەدەستانی ڤێتنام باسیان لەوە كرد هۆكاری ئەم دیاردە مەترسی دارە دەگەرێتەوە بۆ ناهاوسەنگی ژینگەی وڵاتەكەیان، ئەوەش لەكەم بوونی ژمارەی پشیلە ومارەوە خۆی دەبینێتەوە، بەڵێ پشیلە ومار یەكێكە لەخواردنی ڤێتنامییەكان وچەندین

چێشتخانەی تایبەتیان هەیە بۆ پێشكەش كردنی ئەو جۆرە خواردنانە. لە ساڵی ١٩٩٩ دا حكومەت بڕیاری داخستنی ئەو چێشتخانانەی دەركرد كە خواردنی مار وپشیلە وهەندێ لەباڵندەكان، دوژمنە سەرەكییەكانی جرج ومشك، پێشكەش دەكات. جوتیارێكی ڤێتنامی بەناوی فوو توو وتی: " بێ گومان باشتر وایە ئەوانەی لەوەو پێش پشیلە وماریان خواردووە لەمەوە دوا جرج ومشك بكەنە خۆراكییان... هەر نەبێ هاوسەنگییەك لەنێوان ژمارەیاندا دروست دەبێت".

جەژنی نیشتیمانی: ٢ / ٩ ی هەموو ساڵێك، رۆژی دامەزراندنی حوكمی سۆسیالیستی ساڵی ١٩٤٥ .

سروودی نیشتیمانی: كاروانی سوپا.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٣،٨ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٢ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١،٩٣٥ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٣ .

## فیجی

**ناوی باو:** فیجی.

**ناوی فەرمی:** کۆماری فیجی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Fiji.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٣٢ ئەندام )

ئەنجومەنی نوێنەران ( ٧١ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٧,٠٥٦ میل دووجا، ١٨,٢٧٤ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧٧٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٤٢,٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** فیجی ( ٥١ ٪ )، هیندی ٤٤ ٪ .

**ئاین:** مەسیحی، هیندۆس، موسڵمان، سیخ.

**زمان:** ئینگلیزی، فیجی.

**پایتەخت:** سۆڤا.

**شارە سەرەکییەکان:** لۆتۆکا، لامی، نادی، با.

**دراو:** دۆلاری فیجی.

**ئاو وهەوا:** بارانێکی زۆر بەدرێژایی ساڵ دەبارێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لەپایتەختدا دەگاتە ٣٠٠ سم، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا ٢٠ پلەی سەدی ولەهاویندا ٣٠ پلەی سەدی دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گوێزی هیندی، داروتەختە، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، جگەرە، شەکر.

**سامانی کانزایی:** ئاڵتون.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

فیجی وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای زەریای هێمن، نزیکەی ١٨٠٠ کم لەباکووری نیوزیلانداوە دوورە، هەروەها نزیکەی ٢٧٠٠ کم لە باکووری ڕۆژهەڵاتی سیدنی ئۆستورالیاوە دوورە. ژمارەی دورگەکانی ٨٤٤ دورگەیە، بواری

دەریاییەكەیان ۸۸۵,۰۰۰ كم² دەبێت. دوو لەسەر سێی دورگەكان بە بەردەوامی نیشتەجێ كراون.

دورگەی فیتی لیڤۆ گەورەترین دورگەیەتی، دوای ئەو دورگەی فانوا لیڤۆ دێت لەرووی رووبەرەوە، هەردوو دورگەكەش نزیكەی ۸۵ ٪ رووبەری تێكڕای دورگەكانیان پێك هێناوە ناوەڕاستی فیجی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ۱۷۹ بەرەو رۆژهەلات لەگەل هێڵی پانی ۱۷ بەرەو باشوور.

دورگەكانی فیجی سروشتێكی چیاییان پێوە دیارە و بەرەچەڵەك گڕكانیین، هەندێ لەدورگەكان بەهۆی كەڵەكە بوونی لم ولیتەو قوڕی روبارەكان پێك هاتووە.

بەر لە ۳۵۰۰ ساڵ دانیشتوانی فیجی ( بەرەچەڵەك میلانیزییەكان ) گەیشتونەتە دورگەكانی دراوسێی. لەساڵی ۱٦٤۳ دا دەریاوانی هۆڵەندی ئیبل تاسمان دورگە رۆژهەلاتییەكانی بەدی كردووە. لەساڵی ۱۷۷٤ دا دەریاوانی ئینگلیزی جیمس كوك سەردانی یەكێك لەدورگە باشوورییەكانی فیجی كردووە. لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمەوە ئەوروپییەكان دەستیان كردووە بەنیشتەجێ بوون لە دورگەكانیدا. شایەنی باسە زیاترینی هاتوانی دورگەكان لەئۆستورالییەكان بوون. لەبەرواری ۱۰ / ۱۰ / ۱۸۷٤ دا فیجی بۆتە داگیركراوەیەكی بەریتانی وسێر ئارسەر جۆردۆن دەسەلاتی دورگەكانی گرتۆتە دەست.

حاكمی بەریتانی هەوڵی داوە چەند چالاكییەكی ئابووری لە دورگەكەدا ئەنجام بدات لەرێی چاندنی قامیشی شەكرەوە، بۆ جێ بەجێ كردنی ئەم ئەركەشی پشتی بەو كرێكارانە بەستووە كە لە هیندەوە بۆ جوتیاری لەنێوان ساڵەكانی ۱۸۷۹ بۆ ۱۹۱٦ گەیشتونەتە ناوچەكە، دیارە ئەمەش بۆتە هۆی زیاد بوونی ژمارەی هیندەكان لەو ولاتە، چونكە هەندێ لەو جوتیارانەی كە ماوەی گرێبەستەكانیان تەواو دەبوو دەگەڕانەوە بۆ ولاتی خۆیان بەلام هەندێكیان دەمانەوە وژیانی فیجیان لە ولاتی خۆیان پێ باشتر بووە، ئەمەش بەهۆكاری سەرەتایی هەڵگیرسانی كێشە نەژادییەكانی فیجی دادەنرێت لەدواییدا.

لەبەرواری ۱۰ / ۱۰ / ۱۹۷۰ دا لەسەر دەستی سەركردەی فیجی راتوسیر كامیسیسی مارا فیجی سەربەخۆیی دەستگیر بووە. لەساڵی ۱۹۸۷ تیمۆسی بافاردا بۆتە سەرۆكی ولات، تیمۆسی لەلایەن هیندەكانەوە بەتەواوی كۆنترۆڵ كرابوو، بۆیە دەستی كرد بەدابەشكردنی وەزارەت ودەسەلاتەكان لەنێوان هیند وفیجییەكاندا، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی رق وكینەی دانیشتوانە سەرەكییەكانی ولات، لەئاكامی ئەو ململانێ ورقانەدا عەقید ستیڤینی رابۆكا هەڵسا بەئەنجام دانی كودەتایەكی سەربازی بەسەر حكومەتەكەی تیمۆسیدا دوای یەك مانگ لەدروست بوونی وخۆی دەسەلاتی ولاتی گرتە دەست ودەستووری داڕێژراوی

سالّی ۱۹۷۰ ی رەتكردەوە، كۆماری فیجی سەربەخۆی راگەیاند وهیچ پەیوەندییەكی بە تاجی بەریتانییەوە نەهێشت. ئەمەش بووە هۆی دەركردنی فیجی لە كۆمۆنوّلتی بەریتانی. لە سالّی ۱۹۹۰ دا دەستووری دووەمی ولاّتی فیجی دەركرا وبەپێی دەستووری نوێ فیجییەكان زیاترین كورسییەكانی پەرلەمانی ولاّتیان بەدەستهێنا، جگە لەوەی بریارێكی دەركرد بەوەی كە هیچ كەسێك بۆی نییە دەسەلاّتی ولاّت بگرێتە دەست بەرەچەلّەك فیجی نەبێت. بەهۆی بارودۆخی نوێوە زیاتر لە ۱۰۰ هەزار هیندی فیجیان بەجێ هێشت.

لەسالّی ۱۹۹۰ دا، بەپێی دەستووری نوێ، هەلّبژاردنەكان بەرێوە چوو. پارتە فیجییەكان سەركەوتنیان بەدەست هێنا ورابۆكا تا ۱۹۹۹ لە پۆستی سەرۆكی وەزیراندا مایەوە. لەسالّی ۱۹۹۷ دا بریارێك دەركرابوو رێگای بە هەموو كەسێك دابوو پۆستی سەرۆكی وەزیران بگرێتە دەست وقۆرغ كردنی پۆستی سەرۆك وەزیرانی بۆ فیجییەكان رەتكرابووەوە، ئەمەش بووە هۆی وەرگرتنەوەی فیجی لە كۆمۆنوّلتی بەریتانی.

لەسالّی ۱۹۹۹ دا هەلّبژاردنە گشتییەكان بەرێوە چوو، سەركردەی پارتی كرێكاران ماهیندرا شودهری ( ۵۷ سالّ ) ی بەرەچەلّەك هیندی بەپۆستی سەرۆك وەزیران سەركەوتنی بەدەست هێنا.

لەگەلّ ئەوەی هەلّبژاردنەكان زۆر شەرعی بوو، بەلاّم لەلایەن دانیشتوانە رەسەنەكانی ولاّت نارەزاییەكی زۆری لێ دەربرا، بەتایبەتی لەلایەن یاوەرانی سەرۆكی وەزیرانی پێشوو رابۆكا. لێكۆلّەرەوەكان پێشبینی ئەوەیان دەكرد كودەتایەكی سەربازی لەولاّتدا ئەنجام بدرێت، چونكە ئەنجامی هەلّبژاردنەكان كێشە وباسێكی زۆری لە شەقامی فیجیدا نابووەوە. هەرواش بوو، لە یەكەم سالّیادی گرتنە دەستی دەسەلاّتی شودهریدا لە ۱۹ / ۵ / ۲۰۰۰ دا كودەتایەكی سەربازی بەسەر حكومەتدا ئەنجام درا، كودەتاكە لەلایەن جۆرج سبایتی خاوەن كار و سەرمایەدارێكی بەرەچەلّەك فیجی رێكخرابوو وسەرۆكی پێشوو لەدەسەلاّت دوورخرایەوە. جۆرج سبایتی بەناوی دانیشتوانە رەسەنەكانی ولاّتەوە خۆی بەسەرۆكی وەزیران راگەیاند وداوای رەتكردنەوەی دەستووری سالّی ۱۹۹۷ كردەوە بەشێوەیەك یاسایەك دابرێژرێ مافی فیجییە رەسەنەكانی ولاّت لەوەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران بپارێزێ، چونكە بەرای ئەو تەواوی دانیشتوانی فیجی ئەوەیان دەوێت. بەلاّم فیجی بەم جۆرە كشانەوە خۆی خزانە ناو ئاژاوە سیاسییەكانەوە لەنێوان لایەنگر ونەیارانی حكومەتی نوێ، لەئاكامدا خۆپیشاندان وئاگر بارانكردنی خۆپیشاندەران زۆربەی شەقام وشارەكانی ئەو ولاّتەی گرتەوە وخەلّكێكی زۆریش دەستگیر كران، هێزەكانی سوپا سەرۆكی كودەتا جۆرج سبایتیان لە ۲٦ / ۷ / ۲۰۰۰ دا دەستگیر كرد. حكومەتێكی نوێ بەسەرۆكایەتی

لایسینا کاراشی پێك هێنرا، ٢٠ وەزیر لەناو کابینەی حکومەتی نوێدا دیاری کرابوو، تەواویان لەدانیشتوە رەسەنەکانی فیجی بوون لەگەڵ یەك نوێنەری هیندی، لەگەڵ دیاری کردنی کاتێك بۆ ئەنجام دانی هەڵبژاردنەکان، هەروەها راتۆ جۆزیفا کرایە سەرۆکی وڵات. سەرکردەی کودەتا جۆرج سبایت و١٢ لە پیاوەکانی تۆمەتی ناپاکی گەورەیان بەرامبەر بە وڵات خرایە پاڵ، کە سزاکەی دەگاتە لەسێدارەدان، بەڵام هەندێ جار بۆ زیندانی هەتا هەتایی دادەبەزێنرێ. لە ٢ / ١١ / ٢٠٠٠ دا لەلایەن چەند یاوەرێکی سەرۆکی کودەتای پێشو جۆرج سبایت هەوڵی ئەنجام دانی کودەتایەك شکستی هێنا.

لە١٨ / ٢ / ٢٠٠٢ دا دادگای سەربازی فیجی سزای لەسێدارەدانی بۆ جۆرج سبایت دەرکرد، دادوەر بەم شێوەیە بریارەکەی بۆ خوێندەوە: " سزای دادگا ئەوەی لەهۆڵچی دادگاوە دەبرێیتەوە بۆ زیندان ولەوێوە بەرەو شوێنی لەسێدارەدان بەرێ دەکرێت وسزاکەت جێ بەجێ دەکرێت... خوا لێت خۆش بێت".

بەڵام لەهەمان رۆژدا حکومەتی فیجی رایگەیاند کە سزای جۆرج لە خنکاندنەوە سووك کراوە بۆ زیندانی هەتاهەتایە. شایەنی باسە بەپێی دەستووری فیجی سەرۆك دەتوانێ سزای لەسێدارەدان سووك کات یان دەتوانێ لێشی ببورێ.

لە ساڵی ١٩٩٨ دا فیجی بریاری دا کە پەیرەوی کاتی هاوینە بکات بۆ یەکەم جار لەوڵاتەکەدا لەتەواوی دەزگا حکومییەکانی وەك هەوڵێکی بۆ زیادکردنی بەرهەمەکانی ئەمەش ئەگەری کاریگەری هەبێت بۆ گەشەپێدانی باری ئابووری وڵاتەکەی.

قامیشی شەکر سەرەکیترین بەرهەمەکانی فیجییە کەرەوانەی دەرەوەی وڵاتەکەی دەکات، شایەنی باسە هیندەکان ئەرکی چاندنی ئەم بەرهەمەیان گرتۆتە ئەستۆ، لەهەمان وڵاتدا لەکارگە تایبەتەکان پاك دەکرێتەوە ودەکرێت بەشەکر. دوای قامیشی شەکر فیجی پشتی بە گوێزی هیندی بەستووە کە زەیتی گوێزی هیندی لێ دەردێنێت، لەم دواییانەشدا بایەخی داوە بەچاندنی دار سنەوبەرێکی زۆر بۆ سوود وەرگرتن لەدارو تەختەکانی.

سروودی نیشتیمانی: خوایە فیجی پارێزراو بێت.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ١,٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,٣٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٤ .

## قوبرس

**ناوی باو:** قوبرس

**ناوی فەرمی:** کۆماری قوبرس

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Cyprus

**سیستەمی حوکمرانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥٦ ئەندام ).

**رووبەر:** ٣,٥٧٢ میل دووجا، ٩,٢٥١ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٨٦٦,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠١ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٩٢ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** یۆنانی، تورك، بەریتانی، موارنە، ئەرمەن.

**ئاین:** مەسیحی، موسڵمان ( ٢٧ ٪ ).

**زمان:** یۆنانی، تورکی.

**پایتەخت:** نیکۆسیا.

**شارە سەرەکییەکان:** لیماسۆل، لارنکا، فاما گۆستا.

**دراو:** جونەیهی قوبرسی.

**ئاو وهەوا:** بەدرێژایی ساڵ فێنکە. پلەکانی گەرما لەزستاندا مام ناوەندە ولەهاویندا هەرە بەرزەکەی دەگاتە ٣٨ پلەی سەدی. نێوەندی ساڵانەی بارانەکان لەنێوان ٣٠ سم بۆ ٤٠ سم دەبارێت وهەندێ جار لەهەندێ ناوچەدا دەگاتە ١٠٠ سم، بەفریش لەسەر لوتکەی چیاکان لەزستاندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، ترشەڵۆکییەکان، ترێ، زەیتون، پەتاتە، گەنم، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، جگەرە، زەیتی زەیتون، پیڵاو، چنین.

**سامانی کانزایی:** کرۆم.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

قوبرس وڵاتە دورگەیەکە دەکەوێتە کەرتی باکووری رۆژهەڵاتی دەریای سپی ناوەڕاست. نزیکەی ٦٤ کم لە باشووری تورکی سەر دەریای سپی ناوەڕاستەوە دوورە. هەروەها نزیکەی ١٠٠ کم لەکەناری باکووری رۆژئاوای سوورییەوە دوورە. لەگەڵ ئەوەی کەلتووری دانیشتوانی تا ئاستێکی زۆر لەکەلتووری دانیشتوانی باشووری رۆژهەڵاتی ئەوروپاوە

نزیکە و ئاستی ئابووریشی بەرزە بەلام بەناوچەیەکی ئاسیایی دادەنرێت. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣٤ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٥ بەرەو باکوور.

زنجیرە چیای کیرینا دەکەوێتە بەشی باکووری رۆژهەلاتی دورگەکە. زنجیرە چیای ترۆدۆسی بەرەچەلەك گرکانی دەکەوێتە بەشی رۆژئاوای کە بەرزترین لوتکەی دەگاتە ١٩٣٥ م، ئەم دوو زنجیرە چیایەش لەرۆژهەلاتی دورگەکەوە تا رۆژئاوای درێژ دەبنەوە ودەشتی میساوریا کەدەشتێکی پان وبەپیتە دەکەوێتە نێوان هەردوو زنجیرە چیاکە ونیکۆسیای پایتەختیشی تێدەکەوێت.

بەر لە ٦٠٠ ساڵ پ.ز میللەتە دێرینەکان لەقوبرسدا ژیاون. هەر یەك لە فینیکی وئاشووری ومیسری وفارس ونەغریق ورۆمانەکان بەدوای یەکدا داگیریان کردووە. ئەوسا پێی وتراوە ئالاسیا یان ئالاسهیا، ئەم ناوی ئێستاشی ( قوبرس ) لەناوی روەکێکە لێنراوە کە کیپیرۆسی پێدەوترێ، بۆنی ئەو رووەکە تایبەتمەندییەکی سەیری لەخۆی گرتبوو، هەندێ جاریش بۆ چارەسەری بەکارهاتووە، حەکیمەکان پێیان وتوە دەرمانی دژە مەرگ، ئەم روەکەش بەدرێژایی مێژووەوە تا ئێستاش پەیوەندییەکی لێك نەبڕاویان لەگەڵ قوبرسدا هەیە. هەندێ لەمێژووناسانیش دەڵێن ناوی قوبرس لە وشەیەکی لاتینی ئەغریقییەوە وەرگیراوە کە: کیپیریووسە وبەمانای مس دێت، چونکە قوبرس لە مسدا زۆر دەوڵەمەند بووە.

ئاینی مەسیحی لەساڵی ٤٥ ی ز گەیشتۆتە قوبرس. لەساڵی ٣٣٠ بۆتە بەشێکی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی. لەنێوان سەدەکانی حەوتەم ودەیەم عەرەبە ئیسلامەکان گەیشتونەتە قوبرس. لەنێوان ساڵەکانی ١٣٧٦ – ١٤٦٤ گەلی جنوا دەسەلاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. لەساڵی ١٤٨٩ رۆڵەکانی ڤینیسیا داگیریان کردووە. تورکە عوسمانییەکان لەساڵی ١٥٧١ داگیریان کردووە. لەساڵی ١٨٧٨ دا تورکیا دەستی لەقوبرس هەڵگرت بۆ بەریتانییەکان، ئەمیش لەلایەن خۆیەوە خستییە سەر خاوەندارییەکانی خۆی لەکاتی جەنگی جیهانیی یەکەمدا.

لە ١٦ / ٨ / ١٩٦٠ دا قوبرس سەربەخۆیی خۆی دەستگیر بوو، بەریتانیاش دەستی گرت بەسەر بەدوو بنکەی سەربازی لە کەناری باشووریدا. یەکەم سەرۆکی قوبرس ئەسقەف مەکاریۆس بوو، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، بۆ ساڵی دوایی بۆتە ئەندامی کۆمۆنۆلتی بەریتانی.

بەو پێیەی چوار لەسەر پێنجی دانیشتوانی ولات بەرەچەلەك یۆنانین وپەیرەوی ئاینی مەسیحی دەکەن و یەك لەسەر پێنجەکەی تریشی بەرەچەلەك تورکن وئاینی ئیسلام پەیرەو

دەکەن، قوبرس دووچاری ململانیٚ نیٚوان ئەم دوو گروپە بۆتەوە، کیٚشەکان بەرەو رووبەڕوو بونەوەی چەکداری گەشەی کرد، نەتەوە یەکگرتوەکان لەپیٚناوی چارەسەری کیٚشەی نیٚوانیان لە ١٩٦٤ دا هیٚزە ئاشتی پاریٚزە نیٚودەوڵەتیەکانی ئاراستەی وڵاتەکەیان کرد، نیکۆسیای کرد بە دوو بەشەوە وهیٚڵی سەوزی لەنیٚوانیاندا دیاری کرد. لە ٢٠ / ٧ / ١٩٧٤ هیٚزە تورکییەکان بۆ یارمەتی تورکە قوبرسییەکان لەوڵاتەکەدا دابەزین وبەشیٚکی گەورەی لەباکووری رۆژهەڵاتی قوبرس گرتە دەست، بەهەزاران قوبرسی بەرەچەڵەك یۆنانی بەرەو بەشی باشووری رۆژئاوای دورگەکە هەڵهاتن وبەهەزارانی دیکەش ئاوارە بوون.

لە ساڵی ١٩٨٣ دا قوبرسییە تورکەکان ناوچەی باکووری قوبرسیان بە کۆماری باکووری قوبرسی تورکی راگەیاند، شایەنی باسە ناوچەکە رووبەری ٣,٣٥٥ کم ٢ دەبیٚت وژمارەی دانیشتوانی ٨٧,٨٠٠ کەسە ودراوی لیرەی تورکییە، سەرۆکی کۆماریشی بە رەئووف دانکتاش دیاری کرا، بەڵام جگە لە تورکیا هیچ وڵاتیٚك دانی بەم کۆمارە نەناو هەندیٚکیان بەدەستدریٚژییەکی تورکیای کەمالیستیان داناوە. لە ٢٠ / ٤ / ٢٠٠٠ دا رەئووف دانکتاش بەسەرۆکی کۆماری ناوبراو هەڵبژیٚردرایەوە.

وڵاتانی جیهان، لەپیٚشەنگدان ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، هەوڵی چارەسەری کیٚشەی قوبرس بە دامەزراندنی یەکیٚتییەکی فیدراڵی بۆ دوو ناوچە دەدەن. بەڵام بەشی باکووری قوبرس بەناو کۆماری باکووری قوبرسی تورکی بەردەوام لەهەوڵی دان پیانانی نیٚودەوڵەتی بەکۆمارەکەی دەدات، داوای ئەوە دەکات کەچیتر قوبرسییەکان بەچاوی قوبرسی سەیریان نەکەن ودورگەکە بەیۆنانی نەزانن ورەئووف دانکتاشیش بەهیچ شیٚوەیەك قایل نابیٚت بۆ دانوستان وگفتوگۆ کردن تا مان بەکۆمارەکەی نەنریٚت. هەردوولا ( کە بە برا دوژمنەکان ناودەبریٚت ) لە کۆتاییەکانی ٢٠٠١ دا بەچاودیٚری نەتەوە یەکگرتوەکان بەمەبەستی کۆتایی هیٚنان بەکیٚشەکانی نیٚوانیان دانیشتن.

لە بەرواری ١٥ / ٥ / ٢٠٠٢ سکرتیٚری گشتی ئەوکاتەی نەتەوە یەکگرتوەکان کۆفی ئەنان سەردانی قوبرسی کرد، لەویٚ چاوی بەهەردوو سەرۆکی قوبرسی تورکی ویۆنانی کەوت بەهیوای گەیشت بەچارەسەری کیٚشەکانی نیٚوانیان، سەرۆکی کۆماری باکووری قوبرس هەڕەشەی ئەوەی کرد کە دابەش کردنی دورگەکە بیٚگومان دەبیٚت ئەگەر بیٚتو بەشی باشووری دورگەکە پەیوەندی بکات بە یەکیٚتی ئەورووپاوە.

لە ساڵی ١٩٧٧ دا ئەسقەف مەکاریۆس کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو سپایرۆس کیبریانۆی سەرۆکی ئەنجومەنی نویٚنەرانی قوبرس دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست، سپایرۆسیش لە ١٤ / ٣ / ٢٠٠٢ دا لەتەمەنی ٧٠ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد. لەساڵی ١٩٩٣

دا گلافکـۆس کلێریـدیس بەسـەرۆکی کۆمـار هەڵبـژێردرا ولەسـاڵی ١٩٩٨ دا سـەرلەنوێ بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرایەوە.

گەشـتوگوزار سەرچاوەی سـەرەکی داهـاتی دورگەکەیـە، سـاڵانە ٤ ملیـۆن گەشـتیار رووی تێـدەکات کـە داهـاتی ١,٦ ملیـار دۆلاریـان بـۆ وڵاتەکـە مـسۆگەر کـردووە. چـالاکییە گەشـتوگوزارییەکان لـەجوانی سروشـتی وڵات وئاسـەوارێکی زۆردا خـۆی دەبینێتـەوە، بەڵام دانیشتوانی وڵات کێشەی کەمی رێژەی ئاوی خواردنەوەیان هەیـە بەهۆی کـەمی بارانـەکانی لەهەندێ ساڵدا، وەك زۆربەی وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

سروودی نیشتیمانی: گۆرانی ئازادی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٧,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٦ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٨,٩٥٦ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٣٤ .

## قەتەر

ناوی باو: قەتەر.

ناوی فەرمی: وڵاتی قەتەر.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی: State of Qarat

سیستەمی حوكمڕانی: میر، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی شوورا ( ٣٠ ئەندام ).

ڕووبەر: ٤,٤١٦ میل دووجا، ١١,٤٣٦ كم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ٥٥٠,٠٠٠ كەس ( تا ٢٠٠٠ ).

چڕی دانیشتوان: ٤٨ كەس/كم$^2$

كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە: عەرەب، هیندی، پاكستانی، ئێرانی.

ئاین: موسڵمان، لەگەڵ ماڤی بیانییەكان لەپەیڕەوكردنی ئاینی خۆیان.

زمان: عەرەبی، ئینگلیزیش بەشێوەیەكی بەرفراوان بەكاردێت.

پایتەخت: دۆحە.

شارە سەرەكییەكان: ڕەییان، وەكرە، ئوم سەعید، خوور.

دراو: ریالی قەتەری.

ئاو وهەوا: بیابانی وشك، پلەكانی گەرما لەنێوان ١٨ پلەی سەدی لەزستاندا و ٣٥ پلەی سەدی لەهاویندا ولەهەندێ ناوچەدا دەگاتە ٤٢ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی بارانەكان دەگاتە ٨٠ ملم.

بەرهەمە كشتوكاڵیەكان: ئالیكی سەوز، شیرەمەنی، سەوزە ومیوە، ڕاوەماسی، پەلەوەر، لیمۆ، خورما.

بەرهەمە پیشەسازییەكان: پەینی كیمیایی، بەرهەمە نەوتییەكان، ئاسنی وپۆلا، چیمەنتۆ، پیترۆكیمیاییەكان، شلكردنەوەی گاز.

سامانی كانزایی: نەوتی خاو، گازی سروشتی، گاز.

تێڕوانینێكی گشتی:

قەتەر وڵاتێكی عەرەبی ئیسلامییە دەكەوێتە سەر كەناری ڕۆژئاوای كەنداوی عەرەبی لەڕۆژهەڵاتی نیمچە دورگەی عەرەب، لەباشووری ڕۆژئاوای ئاسیا. قەتەر لە نیمچە دورگەیەكە بەرەو باكووری نێو ئاوەكانی كەنداوی عەرەبی درێژ دەبێتەوە. سعودیە دەكەوێتە باشووری، دەریای سەلوا وكەنداوی بەحرەین دەكەونە ڕۆژئاوای، ئاوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٥١/١٠ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٠ /٢٥ بەرەو باكوور. بەشێوەیەكی گشتی خاكی قەتەر لەدەشتێكی تەخت پێك دێت، جگە لە هەندێ لەو بان وگردانەی

لەناوچەی دوخاندا بڵاوبوونەتەوە، بەرزییەکەیان دەگاتە ٤٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریا. بان وبەرزاییەکان دەکەونە لای رۆژئاوای وڵات، هەروەها ناوچەی چیای فوێرتی بەردەلانیش دەکەوێتە باکووری وڵات. ناوچەی باشووری وڵاتیش لەو بەرزاییە بەلم داپۆشراوانە پێک هاتووە کە دەشتی بیابانەکانیان داپۆشیوە. بەڵام کەناری وڵات تایبەتمەندی ئەوەی لەخۆ گرتووە کە کەنداوێکی زۆری تێدەکەوێت وحەوز ونزمایییەکی زۆری لەناوچەکانی باکوور وناوەراست تیا بڵاودەبێتەوە. زەوییەکانی باکوور وناوەڕاست بەناوچەیەکی بەپیت ولەبار دادەنرێت وچالاکییە کشتوکاڵییەکانی تیائەنجام دراوە، چەندین پرۆژەی چاکردنەوەی زەوییەکان وبەرفراوانکردنی ناوچەی کشتوکاڵی لەخۆ گرتووە کەلەم دواییانەدا لەلایەن هەردوو کەرتی گشتی وتایبەت ئەنجام دراوە، ئەمەش لەهەوڵێکی حکومەتی ئەو وڵاتە بۆ باشتر کردنی باری ئابووری وئاستی ژیانی هاوڵاتیانی.

بەپێی ئەو گەڕان ودۆزینەوانەی لەلایەن پسپۆرە بەریتانی وفەرەنسییەکانەوە لەو وڵاتەدا ئەنجام دراوە لەساڵەکانی ١٩٦٥ و ٧٣ و ٧٦، وڵاتی قەتەر لە هەزارەی چوارەمی پ.ز نیشتەجێ کراوە. مێژوونوسی ئەغریقی هیرۆدتس نوسیویەتی کە خێڵەکانی کەنعان لە سەدەی پێنجەمی پ.ز یەکەم دانیشتوانی ناوچەکە بوون ولەبواری کەشتیوانی وبازرگانیدا زۆر پسپۆڕ وشارەزا بوون. هەروەها ئەسترۆنۆمیناسی ئەغریقی بەتلیمۆس لە نەخشەکەیدا بەناوی قەتراوە ناوی ئەو وڵاتەی هێناوە.

لەسەدەی حەوتەمی زاییندا قەتەر لە سەردەمی شا مەنزیری کوڕی ساوی تەیمی چۆتە ئاینی ئیسلامەوە، بەپێ نوسراوە مێژوویەکانی ئیسلام وڵاتی قەتەر رۆڵێکی گەورەی بینییوە لە بەرفراوان بوونی ئاینی ئیسلام لەناوچەکانی دەورووبەر ونەوپەری ئاسیا، ئەمەش لەگواستنەوەی سوپاکانی ئیسلامدا لەرێی دەریاکانەوە بەهۆی کەشتییە قەتەرییەکان بەسەرکردایەتی ئەبی ئەلعەلائی حەزرەمی.

لەسایەی دەوڵەتی عەباسی قەتەر قۆناغێکی پتەوی ئابووری بەخۆوە بینیوە بەهۆی زیاد بوونی بەهای لیلۆ و مرواری لەلایەن خەلیفە عەباسییەکانی بەغدادەوە. لەسەدەی شانزەیەمی زایینی قەتەر بۆتە هاوپەیمانی عوسمانییەکان لەپێناوی دەرکردنی پۆرتۆگالییەکان لەناوچەکەدا. بۆ ماوەی چوار سەدە قەتەر لەنێو گەردوونی داگیر کەری عوسمانیدا بووە وشێخە عەرەبەکانی ئەو ناوچەیە نوێنەری دەسەڵاتی سوڵتانە عوسمانیەکان بوون لەوێدا.

جەنگی جیهانی یەکەم بووە هۆی لەناوبردنی حوکم ودەسەڵاتی تورکەکان لە وڵاتەکەدا، بۆیە قەتەر پەیماننامەی لەگەڵ بەریتانیادا لە ١٩١٦ دا واژۆ کردووە، لەپەیماننامەکەدا هاتووە بەریتانیا پارێزگاری لە وڵاتی قەتەر ودراوسێکانی بکات بەرامبەر بەچاودێری

بەریتانیا لە کاروباری کارگێڕی دانیشتوان ناوچەکە.

لەکۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا وابڕیار بوو قەتەڕ پەیوەندی بکات بە یەکێتی ئیماراتی عەرەبی یەکگرتووە، بەڵام بەهۆی چەند هۆیەکی تایبەت بەخۆیەوە، پەیوەندی پێوە نەکردن ولە ٣ / ٩ / ١٩٧١ دا سەربەخۆیی خۆی لە بەریتانیا راگەیاند، لەهەمان ساڵدا پەیوەندی کرد بەنەتەوە یەکگرتوەکانەوە ولە ١١ / ٩ ی هەمان ساڵ بەکۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەکانەوە. لەساڵ ١٩٨١ دا بەشداری کردووە لە دامەزراندی ئەنجومەنی هاوکاری وڵاتانی کەنداوی عەرەبییەوە.

لە بەرواری ٢٢ / ٢ / ١٩٧٢ شێخ خەلیفە کوڕی حەمەد ئال دووەم حوکمی وڵاتی گرتە دەست ولەبەرواری ٢٧ / ٦ / ١٩٩٥ کوڕەکەی شێخ حەمەدی کوڕی خەلیفەی دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست.

لە ٨ / ٣ / ١٩٩٩ دا یەکەم هەڵبژاردنی راستەوخۆ لەو وڵاتەدا ئەنجام دراوە بۆ هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی شارەوانی. ٢٢١ پاڵێوراوی پیاو و٦ پاڵێوراوی ژن بۆ بەدەست هێنانی ٢٩ کورسی بەشداری هەڵبژاردنەکانیان کرد. لەگەڵ ئەوەی هیچ کام لە ژنەکان هەڵنەبژێران بەڵام دیارە ئەمە وەك سەلماندنی تاقیکردنەوەیەکی دیموکراسی لەو وڵاتە ئەنجام دراوە.

لەرۆژەکانی ٩ – ١٣ / ١١ / ٢٠٠١ لەدۆحەی پایتەخت کۆنگرەی چوارەمی رێکخراوی بازرگانی جیهانی بەڕێوە چوو.

باری ئابووری قەتەڕ تا چلەکانی سەدەی پێشوو زۆر ئاسایی بوو، بەڵام دۆزینەوەی پیترۆل لەدوای ١٩٤٠ ورەوانەکردنی یەکەم باری ئەو ئاڵتوونە رەشە لە ١٩٤١ دا داهاتێکی هێجگار بەرزی بۆ ئەو وڵاتە مسۆگەر کرد ووڵاتی لە زۆربەی بوارەکاندا بەرەو پێش برد، خەرجی ساڵانەی تاکی قەتەڕی لە ساڵی ٢٠٠٠ دا بە بەرزترین خەرج دانرا لەنێو تەواوی وڵاتە عەرەبییەکاندا کە گەیشتە ٢١,٨ هەزار دۆلاری ئەمریکی.

جەژنی نیشتیمانی: ٣ / ٩ ی هەموو ساڵێك، جەژنە سەربەخۆیی ساڵی ١٩٧١ .

قەتەڕ بەپلەی سێهەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەیەدەگی گازی سروشتی دوای رووسیا وئێران و بەبڕی ٨٥٠٠ ملیار م$^3$ .

ئەو ژمارانەی خوارەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاماری ساڵی ١٩٩٦ بەهۆی نەبوونی ئاماری راستەقینەی ٢٠٠٧ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٧,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٤ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٤,٥٤٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢٣ .

## کامیرۆن

**ناوی باو:** کامیرۆن.

**ناوی فەرمی:** کۆماری کامیرۆن

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Republic of Cameron

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسا دانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٨٠ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٨٣,٥٦٩ میل دووجا، ٤٧٥,٤٤٢ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٤,٦٧٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣١,٦ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، کە لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێک هاتوون، فەڕەنسی.

**ئاین:** موسڵمان ٦٥ ٪ ، مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، ڕۆحانی ).

**زمان:** فەڕەنسی، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** یائۆندی.

**شارە سەرەکییەکان:** دوالا، کاروا، ماروا، بافۆسام.

**دراو:** فرانك.

**ئاو وهەوا:** باکووری وڵات گەرم و وشکە: پلەکانی گەرما لەنێوان ٢٨ پلەی سەدی بۆ ٤٩ پلەی سەدی دەبێت، بانی ناوەڕاست مام ناوەندە و نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٤ پلەی سەدی دەبێت، ناوچەی کەنار گەرم وشێدارە: نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی دەبێت و ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، کاکاو، فاسۆلیا، قاوە، بستە، لۆکە، زەیتی دارو خورما، لاستیك، دارو تەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئەلەمنیۆم، بیرە، کاکاو، پێڵاو، سابون، لێوەرگیراوەکانی نەوت.

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت، نەوت، ئاڵتون، تەنەکە.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کامیرۆن وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە سەر کەناری ڕۆژئاوای ئەفریقیا، نیجیریا دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای، چاد دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی، کۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست

دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی، کۆنگۆ وگابۆن وغینیای کەمەرەیی دەکەونە باشووری، کەنداوی غینیا ( زەریای ئەتڵەسی ) دەکەوێتە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٣ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥ بەرەو باکوور.

چیا وگردەکان بەدرێژای سنوورە باکوورییە ڕۆژئاواکانی سەر دەریاچەی چاد لە باکووری چیای کامیرۆن نزیک کەناری باشووری ئەو وڵاتە درێژ دەبنەوە. لەناوەڕاستی وڵاتیش بانێکی بەدراستان داپۆشراو دەکەوێتە نێوان دەشتێکی بەگژو گیای ساڤانا داپۆشراو لەباکووری زەوییە نزمەکان لەسەر کەناری کەنداوی غینیا لە باشوور تێدەکەوێت. سێ ڕووباری سەرەکی بەناو کامیرۆندا تێپەڕدەبێت: بینۆی، ووری، ساناجا.

زنجیرەیەك چیای گڕکانی چالاکی لەخۆ گرتووە، کەسەر بە زنجیرە چیا گڕکانیەکانی کەنداوی غینیان. لەساڵی ١٩٨٢ دا گڕکانی کامیرۆن ووڕژا وبەهۆی لێوە دەرچوونی گازە کوشندەکانەوە نزیکەی دوو هەزار کەس بوونە قوربانی.

لەسەردەمەکانی پێش مێژووەوە مرۆڤ لەناوچەکەدا ژیاون. لەسەدەی نۆیەمی زاییندا دەوڵەتی کانمی لێدامەزراوە. ئاینی ئیسلام لەڕێی چادی دراوسێوە لە سەدەکانی سیانزدەیەم وچواردەیەمدا گەیشتۆتە کامیرۆن.

پۆرتۆگالییەکان لەسەدەی پانزدەیەمدا گەیشتونەتە کەنارەکانی. لەنێوان سەدەکانی پانزدەیەم وشانزدەیەمدا ئەورووپییەکان بۆ بازرگانی کردن بەکۆیلەکانەوە گەیشتونەتە ناوچەکە. هەر یەك لەفەرەنسا وبەریتانیا وئەڵمانیا لەسەدەی نۆزدەیەمدا لەپێناوی دەسەڵات گرتنە دەستی کامیرۆن بەشەڕ هاتوون، تا لەساڵی ١٨٨٤ دا بۆتە پارێزراوەیەکی ئەڵمانی. لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا ١٩١٤ – ١٩١٨ ئەڵمانیا دەسەڵاتی ناوچەکەی لەدەست داوە وکەوتۆتە دەست فەرەنسا وبەریتانیا، بۆیە لە ١٩٢٢ دا لەنێوانیاندا دابەشیان کرد. لەساڵی ١٩٤٦ دا کەوتۆتە ژێر ڕاسپاردەیی نەتەوە یەکگرتوەکان وهەر یەك لەفەرەنسا وبەریتانیا بەڵێنی مافی ئۆتۆنۆمیان پێدا. لەساڵی ١٩٥٧ دا ئۆتۆنۆمی پێبەخشراوە.

لەبەرواری ١ / ١ / ١٩٦٠ دا کامیرۆنی فەرەنسی بۆتە کۆمارێکی سەربەخۆ ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەهەڵبژاردنەکانی مانگی ٢ / ١٩٦١ بەشی باکووری کامیرۆنی بەریتانی بەپێی ویستی دەنگدەران ئارەزووی ئەوەیان کرد بچنە سەر وڵاتی نیجیریای دراوسێ ولە ١ / ٦ / ١٩٦١ دا چووە سەر نێجیریا. بەڵام دەنگدەرانی بەشی باشوور دەنگیان بەچونە سەر کامیرۆن دا. بەم شێوەیە یەکێتییەك پێك هێنرا هەردوو دەوڵەتی کامیرۆنی ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوای لەخۆ گرتبوو. لەبەرواری ٢٠ / ٥ / ١٩٧٢ دەستووری نوێی وڵات هەردوو دەوڵەتی کامیرۆنی کردەوە بەیەك.

یەکەم سەرۆکی کامیرۆن دوای سەربەخۆیی: حاجی ئەحمادۆ ئەهیدجۆ بوو، دوای دەست لەکارکێشانەوەی ناوبراو لەساڵی ١٩٨٢ سەرۆك وەزیرانی وڵات بۆل بییا بۆتە سەرۆکی کامیرۆن وچەند جارێك هەڵبژێردراوەتەوە دوایین جاری لە ١٩٩٧ بوو.

هەر یەك لە نێجیریا و کامیرۆن، لەسەردەمی سەربەخۆییانەوە، لەسەر نیمچە دورگەی باکاسی لەکێشە وململانێدان بەرامبەر بەیەکتر وچەند جارێکیش رووبەڕووی چەکداری لەنێوانیاندا دروست بووە. شایەنی باسە نیمچە دورگەی باکاسی ناوچەیەکی پڕ لەزەلکاوە وڕووبەرەکەی ١٠٠٠ کم٢ دەبێت وباس لەوە دەکرێت چەند بیرێکی نەوتیشی لەخۆ گرتبێت. لەسەر داوای کامیرۆن کێشەکەی ڕەوانەی دادگای نێودەوڵەتی کراوە.

بەرهەمی نەوتی کێڵگە نەوتییەکانی غینیا لە حەفتاکانی سەدەی پێشوودا، کاریگەرییەکی باشی بۆسەر کامیرۆن هەبوو، بەهۆیەوە کامیرۆن توانی چەند ویستگەیەکی بەرهەمهێنانی وزە بەئەنجام بگەیەنێ.

وەکو باسی لێوە کراوە وشەی کامیرۆن لەوشەی کامیرۆی پۆرتۆگالییەوە هاتووە، کەجۆرێکی لە توێکڵە دارەکانی ئەو ناوچەیە.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٠ / ٥ ی هەموو ساڵێك، ڕۆژی یەکگرتنەوەی هەردوو کامیرۆنی ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوا لەساڵی ١٩٧٢ دا.

سرودی نیشتیمانی: کامیرۆن خاکی باپیرانمان.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٩,٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٠ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٨٠٥ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢٤ .

## کرواتیا

**ناوی باو:** کرواتیا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری کرواتیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Croatia.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی هەرێمەکان ( ٦٨ ئەندام ).

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٧٤ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٢١,٨٥٧ میل دووجا، ٥٦,٦١٠ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤,٧٧٤,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٨٦,٣ کەس/کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** کروات، سرپن بۆسنی، مەجەڕی، سلۆڤانی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، ئەرتۆدۆکسی ڕۆژهەڵاتی )، موسڵمان ٢ ٪.

**زمان:** کرواتی.

**پایتەخت:** زغرب.

**شارە سەرەکییەکان:** سبلیت، ریجیکا، ئۆزیك، زادار، دۆبرۆ فینیك.

**دراو:** کونا.

**ئاو وهەوا:** بەشێوەیەکی گشتی لەزستاندا مامناوەندە ولەهاویندا گەرم و وشکە. لەوەرزی بەهار وپایزدا بارانێکی زۆر دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمەشامی، پاقلە، پەتاتە، چەوەندەر، توتن، گەنم، میوە، زەیتون، بەخێوکردنی مەڕومالات، پەلەوەر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** درووستکراوە کیمیاییەکان، درووستکراوە پیترۆلییەکان، درووستکردنی کەشتی، چنین، پۆلا.

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت، خەڵووزی بەردین.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کرواتیا وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژھەڵاتی ئەورووپا، سلۆڤینیا ومەجەڕ دەکەونە باکووری، یۆگۆسلاڤیا دەکەوێتە ڕۆژھەڵاتی، بۆسنە وھەرسك دەکەوێتە باشووری، دەریای ئەدریاتیکیش دەکەوێتە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٦/٣٠ بەرەو ڕۆژھەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٠ /٤٥ بەرەو باکوور.

کرواتیا لەدوو ناوچەی سەرەکی پێکدێت:

١. ناوچەی دلماشیا: کەنارێکە لە نێوان دەریای ئەدریاتیکی و بۆسنە وھەرسك، سروشتی ناوچەکە بەردەڵانە وخاکێکی نالەباری لەخۆ گرتووە.

٢. ناوچەی دەشتەکانی بانۆنیای بەپیتە دەکەوێتە سەر سنوورەکانی مەجەڕ.

چیای ئەلبی دیناری دەکەوێتە ناوەڕاستی کرواتیا وچەند ڕوبارێکی تیا تێپەڕ دەبێت، گرنگترینیان ڕوباری درانا وسافا، کە دەڕژێنە ڕووباری دانوبەوە.

لەسەدەی حەوتەمی پ.ز ئەو خێڵە سلاڤیانە لەناوچەکەدا ژیاون کەپێیان وتراوە: هرڤاتسکا، کرواتەکانیش ئەم ناوەیان لەوڵاتەکەیان ناوە ولەدواییدا ناوەکە گۆڕاوە بۆ کرواتیا. لەنێوان ساڵەکانی ٩٠٠ بۆ ١٠٠٠ کرواتییەکان پەیڕەوی ئاینی مەسیحییان کردووە وشانشینێکیان پێکهێناوە، لەدواییدا کرواتیا ومەجەڕ یەکیان گرتووە وشانشینێکیان پێك هێناوە ماوەی هەشت سەدە پێکەوە ماونەتەوە، تا لەساڵی ١٥٢٦ تورکە عوسمانییەکان پەلاماری ناوچەکەیان داوە وشانشینەکەیان شکاندووە و ناوچەکەیان خستۆتە سەر خۆیان. دوای تێکشکانی تورکیا ومەجەڕ ونەمسا لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا هەر یەك لە کرواتیا وبۆسنە وچیای ڕەش وسربیا وسلۆڤینیا ومەگدۆنیا لەساڵی ١٩٢٩ دا یەك وڵاتیان پێك هێنا بەناوی یۆگۆسلافیا وپایتەختیشی بەلەگرا بوو. دوای جەنگی جیهانیی دووەم ناوی یۆگۆسلاڤیا لە ٣١ / ١ / ١٩٤٦ بووە: کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆسیالیستی یەکگرتوو، کرواتیاش یەکێك بوو لەو شەش کۆمارە یەکگرتوەی یۆگۆسلاڤیا. بەڵام سەرکردایەتی یۆگۆسلاڤیا بەدەست سربەکانەوە بوو، ئەمەش بووە هۆی پەیدا بوونی گرفتە سیاسییەکان و جیاوازی گەشە کردنی ئابووری لەنێوان کۆمارەکانی یەکێتی یۆگۆسلاڤیا.

کێشەو گرفتەکانی نێوان سرب وکرواتییەکان لە ١٩٨٠ دا بووە هۆی بچڕاندنی پەیوەندییەکانی نێوانیان. بۆیە لە ٢٥ / ٦ / ١٩٩١ دا کرواتیا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند، بەڵام سربیا ئەم ڕەوتەی ڕەتکردەوە، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لەنێوانیاندا وسربیا نزیکەی ٣٠ ٪ خاکی کرواتیای داگیر کرد ونزیکەی ١٠ هەزار کەسیش بوونە قوربانی. بۆ ساڵی دوایی هەردوولا ئاگربەستیان ڕاگەیاند. لە ٢٢ / ٥ / ١٩٩٢ دا کرواتیا

بووە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەمانگی ٥ / ١٩٩٠ دا فرانیۆ تۆدیمان بۆتە سەرۆکی کرواتیا، شیوعی نەبوونی فرانیۆ وڵاتی بەرەو سەربەخۆیی گەیاند لە ١٩٩١ دا. لەبەرواری ١١ / ٢ / ١٩٩٩ فرانیۆ تۆدیمان ( ٧٧ ساڵ ) کۆچی دوایی کرد ودەسەڵات کەوتە دەستی فلانکۆ بافلیتشی سەرۆکی پەرلەمان، وڵات خۆی بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئامادە کرد.

لە ٧ / ٢ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکانی کرواتیا بەڕێوە چوو، پاڵێوراوی نێوەندی شتبتی میسیتش ( ٦٥ ساڵ ) سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

ئابووری کرواتیا بەهۆی پێشکەوتنی هەردوو کەرتی کشتوکاڵی وگەشتوگوزارەوە تائاستێ بەرەو پێشکەوتن بوو، بەڵام بەهۆی شەڕ وجەنگەکانی ئەو وڵاتەوە ئابووری وڵاتەکەی بەرەو پاش هاتووە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٢,١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٤ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاک: ٥١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٤٣ .

## کەمبۆدیا

**ناوی باو:** کەمبۆدیا.

**ناوی فەرمی:** شانشینی کەمبۆدیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdam of Cambodia.

**سیستەمی حوکمرانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات: شایە، سەرۆکی حکومەت: سەرۆکی یەکەمی ئەنجومەنی وەزیرانە وسەرۆکی دووەمیش یارمەتی دەدات.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ٧٠,٢٣٨ میل دووجا، ١٨١,٩١٦ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,٣٨٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٥٧,١ کەس/کم٢

**کۆمەڵە ئەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** خەمیر، ڤێتنامی، چینی.

**ئاین:** بوودی، موسڵمان ٥٪ .

**زمان:** خەمیری.

**پایتەخت:** بنوم بنە.

**شارە سەرەکییەکان:** بادامبانگ، کمبۆنگ سوم، بۆرسات، ئەنگۆر.

**دراو:** ریل.

**ئاو وهەوا:** نێوەندی پلەکانی گەرما لەپایتەختدا بەدرێژایی ساڵ ٢٩ پلەی سەدی دەبێت. بارانەکانیش بەدرێژایی ساڵ دەبارێت، لە کەنارەکاندا نێوەندی دەگاتە ٥١٠ سم و لە پایتەختدا ١٥٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** برنج، لاستیك، پاقلە، بەخێوکردنی مانگا، راوەماسی، بەخێوکردنی کرمی ئاوریشم.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، کاغەز، چنین.

**سامانی کانزایی:** ئاسن، مس، مەنگەنیز، ئاڵتون.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کەمبۆدیا تا ساڵی ١٩٨٩ بە کەمبۆتشیا ناسراوە، وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ناوەڕاستی ئاسیا، تایلاند ولاوس دەکەونە باکووری، ڤێتنام دەکەوێتە رۆژهەڵات وباشووری، کەنداوی تایلاند دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٥ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٢/٣٠ بەرەو باکوور.

چیا نزمەکان چواردەوری وڵاتیان گرتووە جگە لە بەشی باشووری رۆژهەڵات وئەو

بەشانەی کە لەگەڵ کەنداوی تایلاند دا سنووورداره. دەشتە بەپیتەکانیش یەك لەسەر سێی رووبەری وڵات دادەپۆشن، دارستانەکانیش بەشەکانی دیکەی وڵاتیان گرتۆتەوە. روباری میکۆنج لەباکوورەوە بۆ باشوور تێپەڕ دەبێت وەڕژێتە دەریای چینی باشوورەوە پاش ئەوەی بە ڤێتنامیشدا تێپەڕ دەبێت.

لەسەدەی شەشەمی زاییندا ئیمپراتۆریەتی خەمیر لەناوچەکەدا سەری هەڵداوە کە لەنێوان سەدەکانی نۆیەم ودوانزدەیەمدا لەو پەڕی گەشەکردن وپێشکەوتندا بووە وچەند ناوچەیەکی باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیای داگیر کردووە وئەنگۆری کردۆتە پایتەختی خۆی، ئیمپراتۆری خەمیر چەندین پەرستگا وتەلاری لەبەرد درووست کردووە وناسەواری هەندێکیان تائێستاش دیارە. بەم بەهۆی لاوازی ئیمپراتۆریەتی خەمیرەوە هێزە تاییەکان لە ١٤٣١ دا ئەنگۆریان داگیر کردووە. لەساڵی ١٨٦٣ شانشینی خەمیر کەوتە ژێر دەسەڵاتی فەرەنساوە، لەهەمان کاتدا فەرەنسییەکان بەشی باشووری ڤێتنامیشیان داگیر کردبوو. لەساڵی ١٨٨٧ دا کەمبۆدیا بووە بەشێکی هیندی چینی فەرەنسی. یابانییەکان لەجەنگی جیهانیی دووەمدا داگیریان کردووە. دوای کۆتایی جەنگ بەرەو سەربەخۆیی هەوڵدراوە، لە ٩ / ١١ / ١٩٥٣ دا سەربەخۆ بووە ونۆردۆم سیهانۆك بۆتە شای وڵات وبۆ ساڵی ١٩٥٤ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەساڵی ١٩٥٥ دا شا دەستی لەتەختی پادشایی هەڵگرت ونازناوی بووە میر ودەسەڵاتی سەرۆکی وەزیرانی گرتە دەست ولەساڵی ١٩٦٠ دا بووە سەرۆکی وڵات. کەمبۆدیا لەشەست و حەفتاکانی سەدەی بیستەمەوە بەشەڕی ڤێتنامەوە تێوەگلا، شەڕ لەنێوان شیوعییەکان و هێزە حکومییەکان – کە ڤێتنامییەکانی باشوور وویلایەتە یەکگرتوەکان پشتیوانیان لێدەکردن – هەڵگیرسا.

لەساڵی ١٩٧٠ دا کودەتایەکی سەربازی لە کەمبۆدیا ئەنجام درا، ئەنجامدەران دوو لێپرسراوی حکومەتی سیهانۆك ئەنجامیان داوە لەکاتی گەشتێکی سەرۆك بۆ دەرەوەی وڵات و لە ٩ / ١٠ / ١٩٧٠ دا کۆماری کەمبۆدیا راگەیەنرا وناوی بووە: کۆماری خەمیر و لۆن نوول بووە سەرۆکی کۆمار.

لەساڵی ١٩٧٥ دا شیوعییەکانی خەمیرە سوورەکان بەسەرۆکایەتی بۆل بووت دەسەڵاتی حکومەتیان گرتە دەست و"ساڵی سفریان" راگەیاند: هاتووچۆیان قەدەغە کرد وتەواوی شار وشارۆچکەکانیان چۆڵ کرد ئاڵوگۆڕی پارە وکڕین وفرۆشتن سزای مەرگی هەبوو، سەدان هەزار کەمبۆدییان کوشتن لەنێوانیاندا فەرمانبەر وخەڵکانی رۆشنبیر وخوێندەوار، کوشتنەکان لەدەرەوەی پایتەختدا ئەنجام دا لەناوچەیەك پێی دەوترا کێڵگەی مەرگ، بەر لەکوشتنی هاوڵاتیان لەسەربازگەیەك لێپرسینەوەیان لەگەڵ دەکرا پێی دەوترا سەربازگەی

س – ٢١ و کەوتبۆوە ناوچەیەك بە تول سلینج ناودەبرا کەبەمانای گردی ژەهراوی دێت. ئەمە جگە لەوەی نەمانی بەرهەمە کشتوکاڵییەکان برسێتی وهەژاری ومردنی بەسەدان هەزاری دیکەشی لێکەوتەوە وهەزارانی دیکەش بەرەو وڵاتانی دراوسێ هەڵدەهاتن. شەڕی ناوخۆ تا ١٩٧٩ی خایاند، واتا تائەو کاتەی ڤێتنامی وشیوعییە کەمبۆدییەکان زۆربەی ناوچەکانی کەمبۆدیایان داگیر کردن وحکومەتە دیکتاتۆرەکەی خەمیرە سوورەکانیان روخان. بەڵام لەراستیدا ئەمانەش کۆتاییان بەکارەسات وکێشەو ناوخۆییەکان نەهێنا تا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی لەکۆتاییەکانی ١٩٩٠ لەپاریسی فەرەنسا کۆبوونەوە وکۆنگرەیەکی نێودەوڵەتیان لەسەر کەمبۆدیا بەست. لەبەهاری ١٩٩١ دا ئاگر بەست لەنێوانی تەواوی لایەنە بەشەڕ هاتوەکانی کەمبۆدیا واژۆ کرا.

لە ١٥ / ٤ / ١٩٩٨ دا سەرکردەی خەمیرە سوورەکان بۆل بووت کۆچی دوایی کرد، شایەنی باسە بۆل بە لێپرسراوی یەکەم دادەنرێ لەکوشتنی زیاتر لە یەك ملیۆن کەمبۆدی لەماوەی جەنگی ناوخۆدا. لەکۆتاییەکانی ١٩٩٨ دا هەردوو سەرکردەی خەمیرە سوورەکان: خیۆ سامڤان ونون تشیا کە یاریدەدەری بۆل بووت بوون لەماوەی دەسەڵاتەکانیدا خۆیان دا بەدەستەوە. بڕیار وابوو تەواوی تاوانبارانی خەمیرە سوورەکان لەدادگایەکی کەمبۆدیدا دادگایی بکرێن وسزای رەوای خۆیان لەئەنجامدانی تاوانەکانیان وەرگرن.

شای ئێستای وڵات: نۆردوم سیهانۆك – کە لەتاراوگەوە لەچینەوە لەبەرواری ٢٠ / ٩ / ١٩٩٣ گەڕایەوە بۆ کەمبۆدیا – خاوەنی هیچ دەسەڵاتێکی ئەوتۆ نییە، بەڵام لەلایەن گەلەوە کەسایەتییەکی بەڕێز وخۆشەویستە.

ئابووری کەمبۆدیا پشتی بەکشتوکاڵی وگەشتوگوزار بەستووە، سامانێکی گەشتیاری گەورەی لەخۆگرتووە، یەکێ لەناوچە گەشتیارییەکان ئەنگۆری باکووری وڵاتە کە چەندین ئاسەواری گەورەی هونەری تەلار سازی تێدەکەوێت. بەڵام شەڕی ناوخۆ کەمبۆدیای کردۆتە یەکێك لەوڵاتە هەژارەکانی جیهان وگەشە کردنی ئابووری بەشێوازێکی زۆر نالەبار گەڕاوەتە دواوە.

جەژنی نیشتیمانی: ٩ / ١١ ی هەموو ساڵێك، جەژنی سەربەخۆیی ١٩٥٣ .

سروودی نیشتیمانی: وڵاتی ئێمە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٠ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٩٣ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨٢ .

## کەنەدا

**ناوی باو:** کەنەدا.

**ناوی فەرمی:** کەنەدا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Canada

**سیستەمی حوکمڕانی:** پەرلەمانی یەککگرتوو، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیایە ودادوەری گشتی نوێنەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٩٨ ئەندام ).

ئەنجومەنی گشتی ( ٢٩٥ ئەندام ).

**رووبەر:** ٣,٨٤٩,٦٧٤ میل دووجا، ٩,٩٧٠,٦١٠ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣٠,٢٨٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣,٣ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** فەڕەنسی، بەریتانی، ئەڵمان، ئیتالی، چینی، ئەسکیمۆ، هیندی سوور، ئۆکرانی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت، ئەرتۆدۆکسی رۆژهەڵاتی)، جوولەکە، نزیکەی نیو ملیۆن موسڵمان، بوودی، هیندۆس.

**زمان:** ئینگلیزی، فەڕەنسی.

**پایتەخت:** ئۆتاوا.

**شارە سەرەکییەکان:** تۆرنتۆ، ئێدمنتۆن، مۆنتریال، ڤانکۆڤەر، هاملتۆن.

**دراو:** دۆلاری کەنەدی.

**ئاو وهەوا:** باکووری وڵات لەهاویندا تاناستێ سەرمایەکی پێوە دیارە وپلەکانی گەرما لەهاویندا ٤ پلەی سەدی دەبێت. پلەکانی گەرما لەباشووردا بەشی پێگەیشتنی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان دەکات ( ٢٠ پلەی سەدی ). نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا لە زیاتر لەدوو لەسەر سێی رووبەری وڵات ١٨ پلەی لەژێر سفری سەدیدایە، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەرۆژهەڵاتی وڵاتدا ٧٥ سم – ١٥٠ سم دەبارێت. لەرۆژئاوای وڵات دەگاتە ٢٥٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، سەوزە ومیوە، گەنمەشامی، پەتاتە، بەخێوکردنی بەراز، توتن، گۆشت، شیرەمەنی، راوەماسی، داروتەختە، جۆ.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئۆتۆمبێل، ئامێر، کاغەز، پاڵاوتنی نەوت، ئاسن وپۆڵا، دروست کراوە کیمیاییەکان، دروستکراوە خۆراکییەکان.

سامانی کانزایی: نەوت، گاز، ئاڵتون، مس، خەڵووز، زنک، یۆرانیۆم، کۆباڵت، نیکل، قورقوشم، زیو، ئاسن، لینیت.

تێڕوانینێکی گشتی:

کەنەدا دووەم گەورەترین وڵاتە لەجیهاندا لەرووی رووبەرەوە دوای رووسیا؛ بەڵام سێ لەسەر چواری رووبەری ئەو وڵاتە بۆ نیشتەجێ بوون لەبار نییە ونیشتەجێ نەکراوە. کەنەدا دەکەوێتە نیوەی باکووری کیشوەری ئەمریکای باکوور، ویلایەتی ئالاسکای ئەمریکی دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەکەوێتە باشووری، زەریای هێمن دەکەوێتە رۆژئاوای. باکووری کەنەدا دەڕوانێتە سەر بەستەڵەکی باکوور، هەروەها دورگەی گرینلاند دەکەوێتە نزیك کەناری باکووری رۆژهەڵاتی کەنەدا. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٠ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٦٠ بەرەو باکوور.

زنجیرەیەك چیای بەرز ناوچە رۆژئاواکانی کەنەدا دادەپۆشن وژمارەیەك دارستان ودەریاچەشی تێدەکەوێت. بەڵام ناوەڕاستی وڵات دەشتە کەنەدییەکانی تیا بڵاودەبنەوە کە گەنم وجۆی تیا دەچێنرێت. باکووری وڵاتیش ناوچەیەکە بەدرێژایی ساڵ بەستەڵەکە وهیچ سوودێکی لێوەرناگیرێ. لەبەر ئەوە تەواوی ئەو ناوچانەی کە نیشتەجێ کراون دەکەوێتە نزیك دەریاچە گەورەکان ورووباری لۆرانس لەباشووری وڵات. بەشێوەیەکی گشتی نزیکەی ٩٥ هەزار دەریاچە لەتەختی کەنەدا بڵاودەبێتەوە ولەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکاندا لەگەورەترین پێنج دەریاچەدا هاوبەشن.

کەنەدا لەرووی ئیدارییەوە لە دە ناوچە ودوو هەرێم پێك دێت.

دانیشتوانە سەرەکییەکانی کەنەدا ئەنیویتەکانن ( یان ئەسکیمۆ ) جگە لە هیندەکانی ئەمریکا، ئەمانیش لەو ناوچەی ئالاسکاوە گەیشتونەتە کەنەدا. لەنزیکەی ساڵەکانی ١٠٠٠ دا ڤایکنجەکان گەیشتونەتە کەنەدا، بەڵام لێی نیشتەجێ نەبوون.

لەساڵی ١٤٩٧ دا دەریاوانی بەرەچەڵەك ئیتالی جۆن کابوت دۆزیویەتییەوە، بەمەش بەیەکەم ئەورووپی دادەنرێت گەیشتبێتە کەنەدا. چەند دۆزەرەوەیەکی فەرەنسی لەساڵی ١٥٣٤ دا گەیشتونەتە کەنەدا ولەوێشدا ناوچەیەکی فەرەنسییان پێك هێناوە ئێستا پێی دەوترێ کیبك. دوای ئەوان بەریتانییەکان ناوچەی نیوفاونلاندیان لێ دامەزراندووە. بەڵام هێندەی نەخایان ململانێ لەنێوان بەریتانی وفەرەنسییەکاندا لەسەر دەسەڵات گرتنی

ناوچەکە دەستی پێکردووە، کێشەکان لەنێوانیاندا بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕ لە ١٧٥٤ تا ١٧٦٣ . شەڕەکە بە دەست هەڵگرتنی فەڕەنسا لە زەوییە کەندییەکان بۆ بەریتانیا بەپێی ڕێکەوتننامەی پاریسی ١٧٦٣ کۆتایی پێهات. دوای ئەوەی هێزە فەڕەنسییەکان لەکەنەدا کشانەوە، کەنەدا بووە ناوچەیەکی نیشتەجێی بەریتانییەکان.

لەساڵی ١٨٦٧ دا هەر یەك لەناوچە فەڕەنسی و بەریتانییەکان یەکیان گرت ویەکێتی کەنەدایان پێك هێنا، دوای ئەوە چەند ناوچەیەکی چووە سەر بەرفراوانیەکی گەورەی بەخۆوە بینی.

کەنەدا لەهەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ودووەم پەیڕەوی سیاسەتی بەریتانیای کردووە وسوپا وچەکێکی زۆری بۆ تەرخان کرد، کەنەدا تاساڵی ١٩٣١ سەربەخۆیی تەواوی بەخۆوە نەبینی، ئەو شێوە کۆنفیدراڵەی ئێستاشی لەساڵی ١٩٤٩ وەرگرتووە. لەساڵی ١٩٣١ دا پەیوەندی کردووە بەکۆمۆنۆلتی بەریتانی، لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

گەلی کەنەدا هەرگیز بیریان لەیەکێتی نەتەوەکەیان نەکردۆتەوە، کەنەدییە فەڕەنسییەکانی هەرێمی کیبك بەردەوام لەهەوڵی پاراستنی کەلتووری فەڕەنسی وبەڵکو هەندێکیان داوای جیابوونەوەیان لەکەنەدا ودامەزراندنی وڵاتێکی سەربەخۆ کردووە. هەندێکی کەش فرە نەتەوەیی وکەلتووری ئەو وڵاتە بەتاقیکردنەوەیەکی نمونەیی وبێ وێنە دەزانن، چونکە فرە کەلتووری ئەو کۆمەڵەی لە وڵاتێکی وەکو کەنەدا دەژین سەلماندیان کەمرۆڤەکان دەتوانن لەجیهانێکی پڕ لەئاشتی و ڕێز وخۆشەویستییەکی بەردەوامدا بژین.

لە بەرواری ٧ / ١٠ / ١٩٩٩ دا خاتوو ئیدریان کلارکسۆن ئەرکی دادوەری کەنەدای پێ سپێردرا. دوای ئەوەی ڕۆمیۆ لۆبلانسی دادوەری گشتی دەستی لەکار کێشایەوە. دامەزراندنی دادوەری کەنەدا لەڕێگای شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێتی دووەمەوە دیاری دەکرێت، ماوەی حوکمی دادوەریش پێنج ساڵ دەبێت، شایەنی باسە دادوەری گشتی دەسەڵاتێکی ئەوتۆی بەدەست نییە، دەسەڵاتی فیعلی بەدەست خوودی سەرۆك وەزیرانە بەو پێیە کە بەسەرکردەی پارتی زۆرینەی ئەنجومەنی نوێنەران دادەنرێت.

وشەی کەنەدا بەڕەچەڵەك وشەیەکی هیندیە. چەند مانایەکی لەخۆ گرتووە:

١. کۆمەڵ یان گوند: لێرەشەدا لە وشەی هیندی کاناتاوە وەرگیراوە.

٢. کانادا: بەواتا هیچ یان نییە دێت، ئەو وشەیەش لەلایەن هیندەسوورەکانەوە بەکارهاتووە بۆ وەڵام دانەوەی گەڕیدەکان کاتێ بەدوای کانزایەکدا گەڕاون لەناوچەکەدا.

كەنەدا بەدەوڵەمەندترین وڵات دادەنرێت لەجیهاندا لەرووی سەرچاوە سروشتییەكانەوە، چونكە كەنەدا بەپلەی یەك دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی كاغەز، هەروەها بەهۆی بوونی دارستانێكی زۆرەوە بەیەكێك لەوڵاتە بەرهەمهێنەرە گەورەكان دێت لەبەرهەمی داروتەختە، ئەمە جگە لەوەی بەپێتی رووبەرێكی زۆری زەوی ئەو وڵاتە بەرهەمێكی زۆری گەنم ودانەوێڵەی لەخۆ گرتووە، زۆری ئاو ورووبارەكانی كردویەتییە یەكێك لەوڵاتە هەرە پێشكەوتووەكان لەبەرهەمی ووزەی كارەبا، ئەمە جگە لەوەی سامانە كانزاییە زۆرەكانی كردویەتییە بە یەكێ لەوڵاتە پیشەسازییە گەورەكان. دەوڵەمەندی وڵاتەكەش هانی كۆچبەرانی داوە لەزۆربەی وڵاتانەوە رووی تێكەن، لەساڵی ١٩٩٩ دا پێشوازی لەزیاتر لە ١٧٥ هەزار كۆچبەر كردووە، حكومەتیش لەلایەن خۆیەوە بریاری وەرگرتنی زیاتر لە ٣٠٠ هەزار كۆچبەری كردووە لەساڵێكدا.

كەنەدا بەپلەی یەكەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەدەرهێنانی یۆرانیۆم وزنك وكۆبالت، بەپلەی دووەم دێت لەدەرهێنانی نیكل وچاندنی جۆ وبەپلەی سێهەم دێت لە گاز ومس، بەپلەی چوارەم دێت لە ئاڵتون وبەپلەی پێنجەم دێت لە قورقوشم وبەپلەی شەشەم دێت لەبەرهەمی گەنم وداروتەختە، بەپلەی حەوتەم دێت لەبەرهەمی زیو وبەپلەی هەشتەم دێت لەبەرهەمی ئاسن، بەپلەی دەیەم دێت لەبەرهەمی لینیت وبەپلەی یانزدەیەم لە گەنمەشامی وبە سیانزدەیەم لە پیترۆل وخەڵووز وبە پانزدەیەم لە پەتاتە، شانزدەیەم لە بەخێوكردنی بەراز، بە پلەی حەڤدەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە راوەماسی.

جەژنی نیشتیمانی: ١ / ٧ ی هەموو ساڵێك، رۆژی دامەزراندنی یەكێتی كەنەدا ساڵی ١٨٦٧.

سروودی نیشتیمانی: كەنەدا.

تێكرای داهاتی نەتەوەیی: ٥٦٩ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٩,٥٧٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٦ .

## کوبا

**ناوی باو:** کوبا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری کوبا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Cuba.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سۆسیالیستی، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نیشتیمانی دەسەڵاتی گەل ( ٦٠١ ).

**ڕووبەر:** ٤٢,٨٠٤ میل دووجا، ١١٠,٨٦١ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ١١,٥٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٤ کەس/کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تێکەڵ، ئەورووپی، ئەفریقی ڕەش.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، بێ باوەڕ.

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** هاڤانا.

**شارە سەرەکییەکان:** سانتیاگۆ دی کوبا، کامۆگۆی، سانتاکلارا، کاردیناس.

**دراو:** بیزۆی کوبی.

**ئاو وهەوا:** نیمچە خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان ٢١ و ٢٧ پلە سەدی دەبێت. بارانەکان لە وەرزی هاوینەدا دەبارێت ونێوەندی ساڵانەی دەگاتە ١٣٥ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** ترشەڵۆکییەکان، قاوە، قامیشی شەکر، توتن، سەوزە، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** شەکر، چیمەنتۆ، جگەرە، پەین، پاڵاوتنی نەوت.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، ئاسن، نیکل.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کوبا دورگە وڵاتێکە، گەورەترین دورگەکانی هیندی ڕۆژئاوایە لە دەریای کاریبی، نزیکەی ١٤٠ کم لە باشووری فلۆریدای ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە دوورە، کوبا لەیەك دورگەی گەورە و نزیکەی ١٦٠٠ دورگەی بچوك پێك دێت، گەورەترینیان دورگەی لاوانە کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای وڵات، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧٩ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٢٢ بەرەو باکوور.

چیا وگردەکان نزیکەی یەك لەسەر چواری ڕووبەری وڵات دادەپۆشن، بەشەکانی تریشی بریتییە لەو زەویانەی بەرزییەکی ناوەندیان هەیە وبەناوچەیەك بەپیت ولەبار بۆ چالاکییە کشتوکاڵیەکان دادەنرێت. زنجیرە چیاکان لە باکووری ڕۆژئاوا وناوەڕاستی وڵات وباشووری

رۆژهەلاتەوە درێژ دەبنەوە.

كریستۆف كۆلۆمبۆس كوبای لە ٢٨ / ١٠ / ١٤٩٢ دا دۆزیوەتەوە، كۆلۆمبۆس خاوەنداریێتی دورگەكەی بە ئیسپانیا بەخشیوە، نیشتەجێ بوون لە دورگەكەدا لە سالی ١٥١١ بەدواوە دەستی پێكردووە. زۆر بەخێرایی كوبا بۆتە دەولەمەندترین داگیركراوەكانی هیندی رۆژئاوا. لەماوەی سەدەی نۆزدەیەمدا چەند جارێك كوبییەكان دژی دەسەلاتی ئیسپانی لەولاتەكەیاندا راپەریون. لە سالی ١٨٩٨ دا ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا یارمەتی كوبییەكانی داوە لەجەنگی دژی بە ئیسپانییەكان، جەنگ بەتێكشكانی ئیسپانییەكان كۆتایی هات، حكومەتی ئەمریكی حكومەتێكی سەربازی لەكوبا دامەزراند. بەلام بەهۆی ئەو فشارە زۆرەی گەلی كوبا بەرامبەر بە هەر داگیركەرێك ئەنجامی ئەدا، هێزە ئەمریكییەكانیش لەكوبا لە ٢٠ / ٥ / ١٩٠٢ كشانەوە. سەر لەنوێ لەنێوان سالی ١٩٠٦ – ١٩٠٩ هێزەكانی ئەمریكا چونەوە كوبا. كوبا لەسالی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

لەسالی ١٩٠٢ دا كوبییەكان تۆماس ئەسترادا یان بەیەكەم سەرۆكی ولاتەكەیان هەلبژارد. لەنێوان سالەكانی ١٩٣٤ و ١٩٥٩ دا چەند سەرۆكیك لەولاتدا پۆستی سەرۆكایەتیان گرتۆتە دەست، تا كودەتاكەی فیدل كاسترۆ لە ١ / ١ / ١٩٥٩ بەسەر ڤۆلهینسیۆ باتیستا بەئەنجامی گەیاند ولەدوای ئەو بەروارەوە خۆی دەسەلاتی تەواوی ولاتی گرتۆتە دەست، نوێ كردنەوەی هەلبژاردنەوەی فیدل كاسترۆ لەلایەن پەرلەمانی كوباوە بەشێوەی خولی هەلبژاردن نوێ دەگرێتەوە، دواییان هەلبژاردنەكانی ٢٤ / ١٢ / ١٩٩٨ كە وەك سەرۆكی ولات وسەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران وسەرۆكی ئەنجومەنی ولات هەلبژێردراوەتەوە. لە ١٢ / ١٠ / ١٩٩٧ فیدل كاسترۆ رائوولی برای بەجێگری خۆی دامەزراند وداوای لێكرد پارێزگاری لەیەكێتی خاكی ولات وپاراستنی بنەماكانی حیزبی شیوعی لەولاتەكەدا بكات.

پەیوەندییەكانی نێوان كوبا وویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا بەرەو تێكچوون دەچوو دوای ئەوە فیدل كاسترۆ دەسەلاتی ولاتی گرتە دەست، لە ١٩٦٠ دا بەتەواوەتی پەیوەندییەكانیان بچراند و ویلایەتە یەكگرتوەكان گەمارۆی ئابووری خستە سەر كوبا، تا ئێستاش بەردەوامە، لەگەل ئەوەی كوبا داوای هەلگرتنی گەمارۆ دەكات. شایەنی باسە یەكێك لە هۆكارە سەرەكییەكانی پچرانی پەیوەندییەكانی نێوان كوبا وویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا ئەو بنكەی مووشەكانە بوو كە یەكێتی سۆڤیەت لە ٢٢ / ١٠ / ١٩٦٢ دا لەكوبا دایمەزراند وسەرۆكی پێشوو جۆن كەنەدی داوای لابردنی لەكوبا كرد، بەلام كوبا داواكارییەكانی رەتكردەوە. تا ئێستاش لە كوبا بنكەیەكی سەربازی ئەمریكی بەناوی ( گوانتەنامۆ ) وبنكەیەكی رووسی بەناوی لۆردیس لەخۆ گرتووە، رووسیا لەم دواییانەدا رایگەیاند بەم زووانە بنكە سەربازییەكەی لە كوبا دەكێشێتەوە.

حكومەتی كوبی بەشێوەیەكی گشتی چاودێری لەتەواوی چالاكییە ئابوورییەكانی ولات

دەکات، کە لەکشتوکاڵی وگەشتوگوزاردا خۆی دەبینێتەوە. بەهۆی سەرنەکەوتنی پلانە ئابووریەکانی کوبا، گەشە کردنی زۆر پاشکەوتووە.

لە ٥ / ١١ / ٢٠٠١ دا گەردەلوولی میشال لەوڵاتی کوبای داو کە خێراییەکەی ١٧٠ کم / کاتژمێرێکدا دەبوو وزیانێکی زۆر گەورەی بە وڵات گەیاند.

کوبا بەپلەی سێیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەبەرهەمی قامیشی شەکر، بەپلەش شەشەم دێت لە نیکلدا.

لە ١٣ / ٨ / ٢٠٠٢ دا فیدڵ کاسترۆ، ئەو سەرۆکەی بە بەهێزترین وڵاتی لەجیهاندا وتووە نا، ئاهەنگی جەژنی لەدایك بوونی ٧٦ ساڵەی گێڕا. بەم بۆنەوە کورتەیەك لەژیانی ئەو سەرۆکە باس دەکەین:

بەپێی نووسینەکانی خۆی، فیدڵ کاسترۆ لە ١٣ / ٨ / ١٩٢٦ دا لەدایك بووە، لەگەڵ ئەوەی هەندێ سەرچاوەی دیکە باس لەوە دەکەن کە ١٩٢٧ دا لەدایك بووە وکوڕی کۆچبەرێکی ئیسپانییە.

کاسترۆ لەگوندی بیرانی رۆژهەڵاتی کوبادا ژیانی منداڵی بەسەر بردووە، لەکۆلیجی جیزوەیت ( یەسوعییەکان ) دا لەشاری سانتیاگۆ دی کوبا خوێندوویەتی، دوایی بڕوانامەیەکی زانکۆی لە یاسادا بەدەست هێناوە، بەڵام هەرگیز کاری لەبواری پارێزەرییدا نەکردووە.

دواتر گەڕاوەتەوە بۆ سانتیاگۆ لە ١٩٥٣ دا، لەوێ یەکەم هەوڵی بۆ هەڵگیرسانی شۆڕشەکەی بەسەر رژێمی باتیستای دیکتاتۆر دەست پێکرد، دوای ئەوەی لاقاوێك خوێن لەپێناوی شۆڕشەکەدا رێژراوە، شکستی هێناوە ودەستگیر کراوە ودوو ساڵ لەزینداندا ماوەتەوە، بەلێبوردنی گشتی لەزیندان ئازاد کراوە ودوورخراوەتەوە بۆ مەکسیك.

لەکۆتاییەکانی ١٩٥٦ دا کاسترۆ گەڕاوەتەوە بۆ کوبا ولەگەڵ هاوڕێکانی ورانووڵی برای و پێشەوای فیکری شۆڕشگێری لاتینی ئیرنستۆ تشێ جیڤارا دەستیان داوەتە شەڕی پارتیزانی.

لە ١ / ١ / ١٩٥٩ دا، بەهەڵهاتنی باتیستا، کاسترۆ سەرکەوتنی شۆڕشەکەی راگەیاندووە.

بەپشتیوانی یەکێتی سۆڤیەتی ئەوسا، فیدڵ کاسترۆ توانیویەتی کوبا بکاتە وڵاتێکی سۆسیالیستی. کشتوکاڵی لەوڵاتدا کردۆتە هەرەوەزی، پیشەسازی خۆماڵی کردووە، هاوسەنگی لەنێوان چینە جیاوازەکانی کۆمەڵدا ئەنجام داوە، بەڵام لەسەر ئاستی مەدەنێت وپێشکەوتن، پێشکەوتن وخوێندەواری پێش خستتوە، بەڵام بەهۆی شکستی پلانە ئابوورییەکان، ئابووری وڵاتەکەی سەرکەوتنێکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینیوە.

دوای ئەوەی کوبا دەوڵەمەندترین وڵاتی ئەمریکی لاتینی بووە، ئێستا یەکێکە لەهەژارترینەکانی، ئەمەش بۆتە هۆی بەجێ هێشتنی زیاتر لە دوو ملیۆن کوبی و وڵاتی خۆیان بەجێ بێڵن و بەرەو ئەمریکا هەڵبێن.

دوای روخانی دیواری بەرلین ولەق بوونی سەرچاوەکانی فیکری شیوعی لەجیهاندا، شۆڕشی کاسترۆ دووچاری گەورەترین کێشەکانی بووەوە، لەئەنجامدا کاسترۆ، ناچار، لە ١٩٩٣د رێگای بەسازدانی چەند چاکسازییەکی ئابووری داوە، لەوانە ریگەدان بە بازاڕی ئازاد وهاتنی هەندێ لەبەرهەمهێنەرە بیانییەکان بۆ ناوەوەی وڵات، ئەمەش تا ئاستێ ئابووری کوبای جێگیر کردەوە. لەهەمان کاتدا کاسترۆ داواکارییەکانی پاپا پۆڵسی دووەمی بە بەخشینی ماف سیاسی زیاتر بەکوبییەکان رەتکردەوە لەکای سەردانە مێژوویەکەی پاپا بۆ کوبا لە ١٩٩٨ دا.

کاسترۆ بەردەوام جەخت لە بەردەوامی شۆڕشەکەی دەکات، لە وتارەکانیدا خۆی دەبینێتەوە کە جار جارە بیری گەلەکەی دەخاتەوە: "دوای نەمانی من فیکری چەپ ورەوتی شیوعێت لەوڵاتدا وەك خۆی دەمێنێتەوە، ئەوەیەکی شۆڕشگێڕی نوێ لەکوبادا بەرێوەیە".

بۆ جەخت کردنەوەش لە بەردەوامی سیاسەتەکانی، چەند گۆڕانکارییەکی لە دەستووری وڵاتدا ئەنجام داوە وگەلی کوباش لە ١٢ / ٦ / ٢٠٠٢ دا بەتەواوەتی پەسەندیان کردووە، لەگۆڕانکارییەکاندا هاتووەکە سیستەمی سۆسیالیستی ببێتە رژێمی سیاسی هەتا هەتایی لەکوبا وهیچ پاشگەز بوونەوەیەکی لەخۆ نەگرتووە، ئەمەی بە بەرژەوەندی گەل ونەتەوەکەی داناوە. بەڵام لە بەرواری ١٩ / ٢ / ٢٠٠٨ دا فیدڵ کاسترۆ دوای زیاتر لە ٥٠ ساڵ حوکم ودەسەڵات دەستی لەپۆستی سەرۆکی وڵات کێشایەوە، هەریەك لەئەمریکا وبەریتانیا خۆشحاڵی خۆیان لەم بڕیارەی کاسترۆ راگەیاندو باسیان لەوە کردووە کە کوبا دەبێتە وڵاتێکی دیموکراسی وباری ئابووری دوای کاسترۆ زۆر بەرەو باشتر دەڕوات. رائوول کاسترۆی برای فیدڵ کاسترۆ لە ٢٥ / ٢ / ٢٠٠٨ لەلایەن ئەنجومەنی نیشتیمانییەوە بەسەرۆکی وڵات هەڵبژێردرا ودەسەڵاتی گرتە دەست.

سروودی نیشتیمانی: ئەی دلێران، بەرە پێش بڕۆن.

رۆژی نیشتیمانی: رۆژی ١ / ١ ی هەموو ساڵێك، رۆژی کودەتای فیدڵ کاسترۆ بە سەر حکومەتی فۆلهینسیۆ باتیستا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢٠,٩ ملیار دۆری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٦٢ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٩٣٥ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٣ .

## کۆریای باشوور

ناوی باو: کۆریای باشوور.

ناوی فەرمی: کۆماری کۆریای باشوور.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Korea.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە وسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران یارمەتی دەدات. پلە وپایەی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران پلەیەکی رەمزییە بەلام لەکاتی بێ توانای سەرۆکی کۆمار سەرۆکی وەزیران دەسەلات دەگرێتە دەست.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٩٩ ئەندام ).

رووبەر: ٣٨,٣٣٠ میل دووجا، ٩٩,٢٧٤ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٤٦,١٢٥,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠٠ ).

چڕی دانیشتوان: ٤٥٩,٦ کەس/کم٢

کۆمەلە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: کۆری.

ئاین: بوودی، مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، کۆنفۆشی، بێ ئاین.

زمان: کۆری.

پایتەخت: سیئۆل.

شارە سەرەکییەکان: بۆسان، تیگۆ، ئینشۆن، کوانجۆ، سوان، ئۆلسان.

ئاو وهەوا: با وەرزییەکان لە باشوور وباشووری رۆژهەلاتەوە بەدرێژایی ساڵ هەلدەکات، هاوینی گەرم وشێدارە، زستانی سارد و وشکە، کەناری رۆژهەلات لە ناوچەکانی دیکەی گەرم ترە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەهاویندا لەنێوان ٢١ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت ولە زستاندا ٢ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەکان لە نێوان ٧٥ سم بۆ ١٥٠ سم دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: سێو، جۆ، پیاز، پەتاتە، راوەماسی، برنج، پاقلە، پەتاتەی شیرین، ئاوریشم.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: ئۆتۆمبێل وپێداویستییەکانی، دروستکراوە کیمیاییەکان، پۆشاك، ئامێری پیشەسازی، ئامێری کارەبایی وئەلیکترۆنی، داروتەختە، دروستکراوە خۆراکییەکان، دروستکردنی کەشتی، پێلاو، ئاسن وپۆلا، چنین.

سامانی کانزایی: خەلووزی بەردین، تەنگستن، زنك.

**تێڕوانینێكی گشتی:**

كۆریای باشوور وڵاتێكه دهكهوێته بهشی باشووری نیمچه دورگهی كۆریا كه دهكهوێته باكووری ڕۆژههڵاتی ئاسیا. بهڵام كۆریای باكوور دهكهوێته بهشی باكووری دورگهكه. كۆریای باكوور دهكهوێته باكووری ودهریای یابان دهكهوێته ڕۆژههڵاتی، تهنگهی كۆریا دهكهوێته باشووری ودهریای زهرد دهكهوێته ڕۆژئاوای. ناوهڕاستی دهكهوێته سهر یهكبڕی هێڵی درێژی ۱۲۷/۳۰ بهرهو ڕۆژههڵات لهگهڵ هێڵی پانی ۳۰ / ۳٦ بهرهو باكوور.

باشوور وباشووری ڕۆژئاوای وڵات بریتیه له دهشته كهناریهكان وبهدرێژایی كهناره باشووری و باشوورییه ڕۆژئاواكانی درێژ دهبنهوه وتهواویان بۆ كشتوكاڵی تهرخان كراون. بهڵام چیاكان دهكهونه ڕۆژههڵات و ناوهڕاستی وڵاتهوه ودارستانێكی زۆریان تێدهكهوێت.

نزیكهی ۳۰،۰۰۰ ساڵ لهمهوبهرهوه مرۆڤ لهناوچهكهدا نیشتهجێ بووه، مێژوویهكی كهم دهربارهی ئهو ماوهیه زانراوه. له سهدهی دوازدهیهمی پ.ز چین داگیركراوهیهكی له بهشی باكووری نیمچه دورگهكهدا پێكهێناوه، پاشان لهسهدهی حهوتهمی پ.ز دهسهڵاتی تهواوی نیمچه دورگهكهی گرتۆته دهست. مهغۆلهكان له ساڵهكانی ۱۲۳۱ – ۱۲٦۰ داگیریان كردووه. یابانییهكانیش لهسهدهی شانزدهیهمدا داگیریان كردووه، بهڵام له ۱٦۹۲ دا چۆڵیان كردووه. سهرلهنوێ چینییهكان لهنیوهی یهكهمی سهدهی حهڤدهیهمدا داگیریان كردۆتهوه ونزیكهی سێ سهده دهسهڵاتی ناوچهكهیان گرتۆته دهست. لهساڵی ۱۸۹۵ دا دوای تێكشكانی چینییهكان له شهڕی یابان – چین ( ۱۸۹٤ – ۱۸۹۵ ) سهربهخۆ بووه. یابانییهكان لهساڵی ۱۹۰۷ دا ئهركی پارێزگاری ناوچهكهیان گرتۆته خۆیان بههۆی كردنهوهی بهندهره بازرگانییهكانیان له نیمچه دورگهكهدا، له ۱۹۱۰ كردویانهته ناوچهیهكی سهر بهخۆیان. له ۱ / ۳ / ۱۹۱۹ دا كۆرییهكان لهدژی یابانییهكان ڕاپهڕیون. له ۱۹٤۵ دا، دوای تێكشكانی یابان لهجهنگی جیهانیی دووهمدا، كۆریا سهربهخۆ بووه وناوچهكه كراوه به دوو بهشهوه هێڵی پانی ۳۸ بهرهو باكوور كهوتۆته نێوانیان. یهكێتی سۆڤیهت دهسهڵاتی باكووری گرته دهست و ویلایهته یهكگرتووهكانی ئهمریكا دهسهڵاتی باشوور. له بهرواری ۱۵/ ۸ / ۱۹٤۸ دا كۆماری كۆریا دامهزراوه و سینگمان ری دهسهڵاتی گرتۆته دهست. ههروهها له بهرواری ۹ / ۹ / ۱۹٤۸ كۆماری كۆریای دیموكراسی میللی له باكوور دامهزراوه، ململانێی نێوان ههردوو كۆمار شهڕی كۆریا ۱۹۵۰ – ۱۹۵۳ ی ههڵگیرسان. تا ئێستاش ههر یهك لهو دوو كۆمار نوێنهرایهتی خۆی بۆ گهلی كۆریا بهڕهواتر دهزانێ.

سهركردهكانی كۆریای باكوور پشتیوانیان له یهك كردنهوهی ههردوو بهشی كۆریا كردووه لهژێر سایهی ڕژێمی شیوعی، لهماوهی حهفتا وههشتا ونهوهدهكانی سهدهی پێشوو،

نوێنــەرانی بــاکوور وباشــوور چــەند توێژینــەوە وگفتوگۆیــان لەســەر ئــەم بابەتــە کــردووە. گفتوگۆکان لەپێناوی یەکگرتنەوە هەردوو بەشی کۆریایە بەشێویەکی ئاشتیانە، بەلأم هیچ کام لەو دانیشتن وگفتوگۆیانە نەگەیشتۆتە ئەنجامێکی گونجاو، تا ئێستاش ٢٠٠٧ .

لەمانگی پێنجی ١٩٦١ دابارك شۆنگ هی پۆستی سەرۆك کۆماری گرتە دەست دوای ری. شۆنگ هـی لەدەسـەلأتدا مایـەوە تـا بـەرواری تـیرۆر کردنـی لـە ٢٦ / ١٠ / ١٩٧٩، دوای ئـەو تشوی کیۆها بەشێوەکی کاتی تا ١٩٨٠ دەسەلأتی گرتە دەست. جوای ئەو تشن لە ( ١٩٨٠ – ١٩٨٧ ) بووە سـەرۆکی ولأت. دوای ئـەو رووە تـای روو لـە ١٩٨٧ – ١٩٩٣ ئـەمیش یەکـەم سـەرۆکی هەڵبـژێردراو بـوو لەلایـەن گەلـەوە، پـێش چاککردنـەوەی دەسـتوور، دوای ئـەو کـیم یۆنگ سام ( ١٩٩٣ – ١٩٩٨ ). لەسـەرەتای ١٩٩٨ کـیم دای یـۆنگ سـەرۆکایەتی ولأتـی گرتـە دەست.

لە بەرواری ١٣ – ١٥ / ٦ / ٢٠٠٠ دا سەرۆکەکانی هەردوو کۆریا

- کیم دای یۆنگی سەرۆکی کۆریای باشوور.
- کیم جۆنگ ئیل سەرۆکی کۆریای باشوور.

لە بیۆنگ یانگی پایتەختی کۆریای باکوور کۆبوونەوە و ئەم بڕیارانەیان دەرکرد:

١. بــاش کردنــی هاوکــاری ئــابووری وکۆمەلأیــەتی لــەنێوان هــەردوولا و هەســتانی کۆمپانیاکانی کۆریای باشوور بە بەرهەمهێنان لە کۆریای باکوور.

٢. هــێمن کردنــەوەی کێــشەکانی نیمــچە دورگــەی بــاکوور کــە بەرەیــەکی ســنووری لەنێوانیاندایە بە چەکدارترین بەرە دادەنرێت لەتەواوی جیهاندا.

٣. هەنگاونان بۆ کۆکردنەوەی ئەو خێزانانەی کە لەوای جیاکردنەوەی سنوورەکان لە ١٩٥٠ – ١٩٥٣ لەیەك بوون.

٤. هەستان بەکردنەوەی دوو ئۆفیسی نوێنەرایەتی بۆ هەردوو ولأت لە هەردوو کۆریا.

٥. یەکگرتنەوەی هەردوو بەشی نیمچە دورگەکە لەکۆتاییدا.

بەلأم راگەیاندنی کۆتایی دانیشتنەکە ئاماژەی بە گەورەترین دوو کێشەی نێوانیان نەدا:

- بەرنامەی ئەتۆمی کۆریای باکوور.
- بوونی هێزە ئەمریکییەکان ( ٣٧ هـەزار سـەرباز ) لـە کۆریـای باشـوور، کـە بـەردەوام کۆریای باکوور داوای کشانەوەیان دەکات وەك بەشێك لە چارەسەری کێشەکانیان.

لە بەرواری ٣٠ / ٦ / ٢٠٠٠ دا نوێنـەرانی چـاخی سـوور لەهـەردوو ولأتـدا دوای چـوار رۆژ گفتوگۆکردن لـە ناوچـەی چیای کۆمکـانجی سـەر کـەناری رۆژهـەلأتی کۆریـای بـاکوور واژۆی دەست بەکاربوونی کرد لەسەر لەکۆکردنەوەی ئـەو خێزانانـەی کـە جەنگـە کۆرییـەکان بـەر لـە

٥٠ ساڵ لێکی کردوون، ئەمە وەك جێبەجێ کردنی یەکەم بەندی ڕێکەوتنەکانیان نێوان هەردوو کۆریا.

٤ / ٧ / ٢٠٠٠: وەزارەتی یەکێتی نیشتیمانی کۆریای باشوور رایدەگەیەنێ سەرکردەی کۆریای باکوور کیم جۆنگ ئیل سەردانی کۆریای باشوور دەکات، ئەمە وەك وەڵامدانەوەیەکی ئاشتیانەی دانیشتی بیۆنگ یانگ.

٧ / ٧ / ٢٠٠٠: کۆریای باکوور دەبێتە ئەندامی ژمارە ٢٣ ی ڕێکخراوی هەرێمی وڵاتانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، کە بەتاکە ڕێکخراوی ئاسایشی ناوچەی ئاسیا دادەنرێت.

٧ / ٧ / ٢٠٠٠: کۆریای باشوور هەڵدەستێ بەپاککردنەوەی کەرتێك لەناوچەی سنووری بەمین کێڵراوی نێوان هەردوو کۆریا بۆ کارئاسانی چاکردنەوەی هێڵی هاتوچۆی شەمەندەفەری نێوانیان.

١٣ / ٨ / ٢٠٠٠: راگەیاندنی هەردوو کۆری بڕیاری رەزامەندی لە راگرتنی شەڕی راگەیاندنی نێوانیان رادەگەیەنێ.

١٣ / ٨ / ٢٠٠٠: لێپرسراوێکی کۆمپانیای هیۆندای لە کۆریای باشوور رایدەگەیەنێ کە کۆریای باکوور لەو ناوچانەی لەمین پاککراونەتەوە هەڵدەستێ بە پێك هێنانی ناوچەیەکی تایبەت بۆ هاوکاری لەگەڵ کۆمپانیای ناوبراودا .

١٤ / ٨ / ٢٠٠٠ کردنەوەی ئۆفیسەکانی هەردوو وڵات لەهەردوو کۆریا.

١٤ / ٨ / ٢٠٠٠ کۆریای باشوور ئازادکردنی ٣٥٨٦ زیندان.

١٥ / ٨ / ٢٠٠٠ سەرەتای کۆبوونەوەی خێزانە لێکدابڕاوەکان.

١٩ / ٨ / ٢٠٠٠: سەرۆکی کۆریای باشوور کیم دای یۆنگ، وتەیەك پێشکەش دەکات: "بەهیوام تا لەژیاندا مابم هەردوو کۆریا یەکبگرنەوە، بەڵام بەگومانم لەمانەوەم بۆ ئەو کات".

٢٠ / ٨ /٢٠٠٠ ئۆرکسترایەکی مۆزیکی کۆریای باکوور ئاهەنگێك لەکۆریای باشوور دەگێڕێ، لەچوار چێوەی ئاشتبوونەوەی گشتیدا.

٢٠ / ٨ / ٢٠٠٠ کۆریای باشوور بەشداری لەمانۆڕێکی سەربازی هاوبەش لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا، کۆریای باکوور زۆر لەم کارە تووڕە دەبێت.

٢ / ٩ / ٢٠٠٠ کۆریای باشوور ٦٣ سیخوڕی کۆریای باکوور ئازاد دەکات، وەك هێمایەك بەنزیك بوونەوەی هەردوو کۆریا.

١٨ / ٩ / ٢٠٠٠ دەستبەکار بوون لە جێ بەجێ کردنی پرۆژەی هێڵێکی ئاسن لەنێوان هەردوو کۆریا.

مانگی ١٠ / ٢٠٠٠ سەرۆکی کۆریای باشوور کیم دای یۆنگ خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئاشتی

پێدەبەخشرێت، وەك ڕێزلێنانێك بۆ ئەو هەولانەی لەپێناوی ئاشتی ولاتەكەیدا پێشكەشی كردووە.

١٥ / ٣ / ٢٠٠١ ئالوگۆڕی پۆستەو گەیاندن لەنێوان هەردوو كۆریا پاش دابڕان لەیەكتر بۆ ماوەی ٥١ سالْ.

ناوی كۆریا لە وشەی كۆریۆ وە وەرگیراوە، كەناوی یەكێك بووە لە شانشینە بچوكەكانی ئەو ناوچەیە.

كۆریا بەپلەی دووەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە دروستكردنی كەشتی وبەپلەی پێنجەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە دروستكردنی ئۆتۆمبێل ودەرهێنانی زنك و ئاوریشم، بەپلەی دەیەم دێت لە ڕاوەماسی وپلەی دوانزدەیەم لە چاندنی برنج.

لەهاوینی ٢٠٠٢ دا كۆریای باشوور ڕایگەیاند كە لەسەرەتای سالی تازەدا هەلدەستێ بەدروستكردنی بینایەك لە ١١٢ نهۆم پێك هاتبێت وبەرزییەكشی ٥٥٥ مەتر بێت لە سیئۆلی پایتەختی ئەو ولات.

جەژنی نیشتیمانی: ١٥ /٨ ی هەموو سالێك، ڕۆژی دامەزراندنی كۆماری كۆریای باشوور، هەروەها ڕۆژی ١ / ٣ ی هەموو سالێك، ڕۆژی هەلگیرسانی شۆڕشی دژی یابان سالی ١٩١٩ .

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣٦٦,٥ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ڕیزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٣ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٨,٢٢٠ .

ڕیزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٣٦ .

## کۆریای باکوور

**ناوی باو:** کۆریای باکوور.

**ناوی فەرمی:** کۆماری میللی دیموکراسی کۆریای باکوور

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Democratic Peopels Republic of Koria

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، دەسەڵاتی سیاسی فیعلی بەدەست حیزبی شیوعی کۆریای باکوورە ( پارتی کرێکارانی کۆریا )، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی باڵای گەل ( ٦٨٧ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٤٧,٣٩٩ میل دووجا، ١٢٢,٧٦٢ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٤,٣١٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٩٨,١ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** کۆری، جگە لەژمارەیەکی دیارینەکراو لە چینییەکان.

**ئاین:** بێ ئاین، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، شۆدۆگیۆ، بوودی، مەسیحی.

**زمان:** کۆری.

**پایتەخت:** بیۆنگ یانگ.

**شارە سەرەکییەکان:** هام جۆنگ، شەنگین، نامبۆ، سۆنشۆن.

**دراو:** وون.

**ئاو وهەوا:** با وەرزییەکان لە باشوور وباشووری ڕۆژهەڵاتەوە بەدرێژایی ساڵ هەڵدەکات، هاوینی گەرم وشێدارە، زستانی سارد و وشکە، کەناری ڕۆژهەڵات لە ناوچەکانی دیکەی گەرم ترە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەهاویندا لەنێوان ٢١ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت ولە زستاندا ٢ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لە نێوان ٧٥ سم بۆ ١٥٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمەشامی، هەرزن، پەتاتە، برنج، گەنم، ئاوریشم، ڕاوەماسی، بەخێوکردنی مانگا.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە کیمیاییەکان، ئاسن، پۆڵا، ئامێر، دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** لینیت، خەڵووز، یۆرانیۆم، ئاسنی خاو، مەگنیزیۆم، تەنگستن، زنک، ئاڵتون، زیو، قوڕقوشم.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کۆریـای بـاکوور ( ناونـانی بـەیانیانی هێمنـە ) وڵاتێکـە دەکەوێتـە بەشـی بـاکوور نیمـچە دورگـەب کوریـا کـە دەکەوێتـە بـاکووری ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا. بـەڵام کۆریـای باشـوور بەشـی باشووری نیمچە دورگەکەی گرتۆتەوە. رووسیا دەکەوێتە باکووری، دەریای یابان دەکەوێتە ڕۆژهـەڵاتی، کۆریـای باشـوور دەکەوێتـە باشـووری ڕۆژهـەڵاتی، دەریـای زەرد دەکەوێتـە باشووری ڕۆژئاوای، چین دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٢٦/٤٠ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٠ بەرەو باکوور.

دەشـتە نزمـەکان کـەناری کۆریـای باکووریـان داپۆشـیوە، بـۆ چـالاکییە کـشتوکاڵ وپیـشەسازییەکان بەگـەڕ خـراوە. چـیاکانیش ناوچـەی ناوەڕاسـتی وڵاتیـان گرتۆتـەوە ودارسـتانێکی زۆر داپۆشـیوە وبەسەرچـاوەیەکی نایـابی کانزاکـان دادەنرێـت. هـەروەها باشووری کۆریای باکووریش چیا ودارستانێکی زۆری لەخۆ گرتووە.

ناوەڕاستی وڵاتەوە ودارستانێکی زۆریان تێدەکەوێت.

نزیکەی ٣٠,٠٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە مرۆڤ لەناوچەکەدا نیشتەجێ بووە، مێژوویـەکی کـەم دەربارەی ئەو ماوەیە زانراوە. لە سەدەی دوازدەیەمی پ.ز چین داگیرکراوەیەکی لە بەشی باکووری نیمچە دورگەکەدا پێکهێناوە، پاشان لەسەدەی حەوتەمی پ.ز دەسەڵاتی تەواوی نیمچە دورگەکەی گرتۆتە دەست. مەغۆلەکان لە ساڵەکانی ١٢٣١ – ١٢٦٠ داگیریان کردووە. یابانییەکانیش لەسەدەی شانزدەیەمدا داگیریان کردووە، بەڵام لە ١٦٩٢ دا چۆڵیان کردووە. سەرلەنوێ چینییەکان لەنیوەی یەکەمی سەدەی حەڤدەیەمدا داگیریان کردۆتەوە ونزیکەی سێ سـەدە دەسـەڵاتی ناوچـەکەیان گرتۆتـە دەسـت. لەسـاڵی ١٨٩٥ دا دوای تێکـشکانی چینییەکان لە شەڕی یابان – چین ( ١٨٩٤ – ١٨٩٥ ) سەربەخۆ بووە. یابانییەکان لەساڵی ١٩٠٧ دا ئـەرکی پارێزگـاری ناوچـەکەیان گرتۆتـە خۆیـان بـەهۆی کردنـەوەی بەنـدەرە بازرگانییـەکانیان لـە نیمـچە دورگەکـەدا، لـە ١٩١٠ کردویانەتـە ناوچـەیەکی سـەر بەخۆیان. دوای تێکشکانی یابان لەجەنگی جیهانیی دووەمدا یابانییەکان لە وڵاتدا کراونەتە دەرەوە کۆریا سەربەخۆ بووە وناوچەکە کراوە بە دوو بەشەوە هێڵی پانی ٣٨ بەرەو باکوور کەوتۆتە نێوانیـان. یـەکێتی سـۆڤیەت دەسـەڵاتی بـاکووری گرتـە دەسـت و ویلایەتـە یـەکگرتوەکانی ئـەمریکا دەسـەڵاتی باشـوور. لـە بـەرواری ١٥/ ٨ / ١٩٤٨ دا کۆمـاری کۆریـا دامـەزراوە و سینگمان ری دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. هەروەها لە بەرواری ٩ / ٩ / ١٩٤٨ کۆماری کۆریای دیموکراسی میللی لە باکوور دامەزراوە، ململانێی نێوان هـەردوو کۆمـار شـەڕی کۆریـا ١٩٥٠ – ١٩٥٣ ی هەڵگیرسـان. تـا ئێـستاش هـەر یـەك لـەو دوو کۆمـار نوێنـەرایـەتی خـۆی بـۆ گـەلی کۆریا بەڕەواتر دەزانێ.

سەرکردەکانی کۆریای باکوور داوای یەکگرتنەوەی هەردوو بەشی کۆریایان دەکرد لەژێر سایەی رژێمی شیوعیدا، لەماوەی حەفتاکان وهەشتاکان ونەوەدەکانی سەدەی پێشوو نوێنەرانی باکوور وباشوور چەندین گفتوگۆیان لەسەر یەکگرتنەوەی دورگەکە کردووە بەشێوەیەکی ئاشتیانە، بەلام تا سالی ۲۰۰۰ هیچ کام لەدانیشتن وگفتوگۆکان دەرئەنجامێکی ئەوتۆی نەبوو. بەلام لەدوای ۲۰۰۰ بەهۆی دانیشتن وگفتوگۆیەکی زۆرەوە جگە لەسەردانە مێژووییەکەی سەرۆکی کۆریای باشوور بۆ کۆریای باکوور لەهاوینی ئەو سالەدا زیاتر لێك نزیك بوونەوە ( بگەرێوە بۆ باسی کۆریای باشوور ).

کۆریای باکوور لە ۱۷ / ۹ / ۱۹۹۱ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

کیم ئیل سۆنگ ( ۱۹۱۲ – ۱۹۹٤ ) بە سەرکردەی دامەزرێنەری کۆریای باکوور دادەنرێت، ولاتەکەی خۆی بە تاکە فیردەوسی سەر رووی زەمین وەسف کردووە، دەسەلاتەکانی خۆی بەسەر میللەتدا لەتەواوی بوارەکاندا سەپاندبوو، کاروباری بەرێوەبردنی سوپا وئابووری وسیستەمی خوێندەواری وزۆربەی بوارەکانی گرتبۆوە دەست بەو پێیەی کە سەرۆکی ولاتە وسەرکردەی حیزبە. حکومەتی شیوعی کۆریای باکوور تەواوی زەوییە کشتوکالیەکانی لە دەولەمەندەکان سەندەوە وبەسەر هەژاراندا دابەشی کرد، هەروەها زۆربەی پیشەسازییەکانیشی گرتە دەست، ولات بەشێوەیەکی بێ وێنە گۆشەگیر بوو، تەواوی بەرهەمهێنەرە بیانییەکانی ولات کرانە دەرەوە، هاوکات حکومەت هەستا بە بنیات نانی یەکێك لەگەورەترین سوپاکانی جیهان وتەکنیکی سەربازی یەکێك لەولاتە هەرە پێشکەوتووەکانی لەخۆ گرتبوو، ئەمە جگە لەبەرنامەی ئەتۆمی ودروست کردنی چەکە ئەتۆمییەکان. ئەمەش بووە هۆی بێزاری کۆریای باشوور وترسێکی گەورەی لێنیشت، جگە لەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاش دژایەتییەکی ئاشکرای دەکرد، خستییە لیستی ولاتە دوژمنەکان، لەسالی ۲۰۰۲ دا ئەمریکا ناوی کۆریای باکووری خستە پال ولاتە تیرۆریستەکانی وەك ئێران وعێراقی ( ئەوسا ) وخستنیە پێشەنگی بەرنامەی شەری دژە تیرۆر و کۆریای بەوە تاوانبار کەچەکی ئەتۆمی هەیە.

لە سالی ۱۹۷۷ دا حکومەتی کیم جۆنگ رایگەیاند کە کوری گەورەی کیم جۆنگ ( ئیل سۆنگ ) دەبێتە جێگری باوکی ئەگەر بێت ودەست لەکار بکێشێتەوە یان کۆچی دوایی بکات، وئیل سۆنگ نازناوی سەرۆکی هەتایی و خۆشەویستی هەموو کۆرییەکان وخۆری سووری ئاوا نەبووی لەخۆ گرتووە.

کیم ئیل سۆنگ لە ۱۹۹٤ دا کۆچی دوایی کرد، ئەنجومەنی بالای گەل کیم جۆنگیان بەسەرۆکی لیژنەی بەرگری نیشتیمانی هەلبژارد، تەواوی ئەو دەسەلاتانەی باوکی

پێبەخشرا. شایەنی باسە ئەو پلەو پایەیە بەگەورەترین پلە دادەنرێت لەوڵاتدا، لە ٥ / ٩ / ١٩٩٨ بۆ ماوەی پێنجی سالی دیکە هەلبژێردرایەوە.

کۆریای باکوور بە پلەی سێیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا، دوای چین وهیند، لەبەرهەمی ئاوریشم وبەپلەی دەیەم دێت لە قورقوشم وبەپلەی دوانزدەیەم دێت لەبەرهەمی خەلوز، بەپلەی سیانزدەیەم دێت لەبەرهەمی زیو وبە چواردەیەم لە دەرهێنانی زنك وراوەماسی، حەڤدەیەم لە چاندنی برنج ودەرهێنانی لینیت.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٢٩,٧ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٦ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٢٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩٨ .

## کۆستاریکا

**ناوی باو:** کۆستاریکا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری کۆستاریکا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Costa Rica

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** کۆمەڵەی یاسادانان ( ٥٧ ئەندام ).

**رووبەر:** ١٩,٧٣٠ میل دووجا، ٥١,١٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣,٤٦٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٦٧,٩ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** میستیزۆ ( تێکەڵ )، ئیسپانی، هیندی ئەمریکا، ئەفریقی ڕەش.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیک، پرۆتستانت ).

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** سان هۆزێ.

**شارە سەرەکییەکان:** لیمۆن، ئالاگۆلا، سان ئایسیدرۆ، پۆرتۆ فیگۆ، دیسامبا رادۆس، کارتاگۆ.

**دراو:** کۆلۆن.

**ئاو وهەوا:** نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان ٢٤ پلەی سەدی بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٨٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، بەخێوکردنی مانگا، کاکاو، قاوە، گەنمەشامی، برنج، قامیشی شەکر، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، پۆشاک، کەلوپەلی ناوماڵ، دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** ئاڵتون، گۆگرد، ئاسن، بۆکسیت، مەنگەنیز.

### تێڕوانینێکی گشتی:

کۆستاریکا وڵاتێکی بچوکە لە ئەمریکای ناوەڕاست. نیکاراگوا دەکەوێتە باکووری،

دەریای کاریبی و پەنەما دەکەونە رۆژهەلاتی، زەریای هێمن دەکەوێتە باشوور ورۆژئاوای. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبری هێلی درێژی ٨٤ بەرەو رۆژئاوا لەگەلْ هێلی پانی ١٠ بەرەو باکوور.

زنجیرەیەك چیای سەخت بە ناوەراستی کۆستاریکا لەباکووری رۆژئاواوە تا باشووری رۆژهەلات تێپەر دەبێت هەندێکی لوتکەی گرکانی چالاکی لەخۆ گرتووە. بەهۆی ئەم زنجیرە چیایەوە ولات دابەش بووە بەسەر سێ ناوچەی سەرەکییەوە:

١. بەرزاییەکانی ناوەراست کە بریتییە لە سەرەکیترین ناوچەی کشتوکالی ولات.

٢. ناوچەی کەناری کاریبی کەشریتێکی دەغلْ وزەلکاوێکی زۆری تێدەکەوێت.

٣. کەناری زەریای هێمن زەوییە نزمەکان وهەندێ بەرزایی لەخۆ گرتووە.

هیندەکانی ئەمریکا یەکەم دانیشتوانی ناوچەکە بوون. لە ٥ / ١٠ / ١٥٠٢ کریستۆف کۆلۆمبۆس گەیشتۆتە ناوچەکە ولە کاریاری دابەزیوە کەدواتر بۆتە شاری لیمۆن. کاتێ کۆلۆمبۆس گەیشتۆتە کۆستاریکا لەبەر جوانی سروشتی کەنارەکانی رستەی کۆستا ریکا پێ وتوە کە بەزمانی ئیسپانی بەمانای کەناری دەولەمەند دێت، ئیتر لەو سەردەمەوە ئەو ناوەی بەسەر دابراوە.

پروپاگەندەکانی بوونی ئالتوونێکی زۆر لە کەنارەکانی کۆستاریکادا، بەسەدان ئیسپانی فریو داوە بەرەو خاکی نوێ بچن. بەلام بەدرێژایی رۆژگار ئیسپانییەکان لەوێدا بوونەتە جوتیار وسەرقالی کشتوکالی بوون. لەسالی ١٥٦٤ دا ئیسپانیا یەکەم شوێنی نیشتەجێ بوونی لەناوچەکەدا سازداوە وتابەرواری ١٥ / ٩ / ١٨٢١ لەژێر دەسەلاتی ئیسپاندا ماوەتەوە، واتا تا ئەو بەروارەی تەواوی داگیرکراوە ئیسپانییەکانی ئەمریکای ناوەراست ئازاد کران. لەسالی ١٨٢٢ دا کۆستاریکا چۆتە سەر ئیمپراتۆریەتی مەکسیکی. لەسالی ١٨٢٣ دا ولاتانی ئەمریکای ناوەراست لە ئیمپراتۆریەتی مەکسیکی جیابوونەتەوە وهەرێمی یەکگرتووی ئەمریکای ناوەراستیان پێك هێناوە. لە سالی ١٨٣٨ دا هەرێمی ناوبراو رووخاوە، ئەمە بووە هۆی راگەیاندنی سەربەخۆیی لەلایەن کۆستاریکاوە لە ١٢ / ١١ / ١٨٣٨ . لەسالی ١٩٤٥ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

یەکەم سەرۆکی ولات دوای سەربەخۆیی براولیۆ کاریلۆ بووە کە لە ١٨٤٢ دا فرانسیسکۆ مۆرازان کودەتای بەسەردا ئەنجام داوە وخۆی بۆتە سەرۆکی ولات. دوای ئەوە چەندین سەرۆکی بەخۆوە دیوە، هەندێکیان لەرێی کودەتاوە هەندێکیشیان لەرێی هەلبژاردنەوە

دەسەڵاتی گرتۆتە دەست.

کۆستاریکا ئێستا خاوەنی سیستەمێکی دیموکراسییە، لەساڵی ١٩٤٩ دا یەکەم دەستووری بۆ دارێژراوە. لەلایەن گەلەوە سەرۆکی وڵات بۆ ماوەی چوار ساڵ جارێك هەڵدەبژێردرێ، هیچ سەرۆکێك یان نوێنەرێك لە دوو جار زیاتر بۆی نییە خۆی هەڵبژێرێتەوە.

لەساڵی ١٩٨٧ دا ئۆسکار ئاریاس سانشیز کە ماوەی سەرۆکایەتی لەنێوان ١٩٨٦ _ ١٩٩٠ بوو خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئاشتی پێ بەخشرا، بەهۆی ئەو پلانەی لەپێناوی سەقامگیری ئاشتی هەرێمەکانی ئەمریکای ناوەڕاست پێشکەشی کرد ولەلایەن پێنج سەرۆکی وڵاتانی ئەمریکای ناوەڕاستەوە واژۆ کراوە وکۆتایی بەشەڕی ناوخۆ هێنراوە. لەساڵی ١٩٩٠ دا ڕەفائیل کالدیرۆن بۆتە سەرۆکی وڵات. لەدوای ١٩٩٤ خۆزێ ماریا فیگارز بۆتە سەرۆك وڵات. لە ٨ / ٥ / ١٩٩٨ میگێل ئەنگڵ رۆد ریجز بۆتە سەرۆك. لە ٨ / ٥ / ٢٠٠٢ دا ئەبیل باشکیۆ دەسەڵاتی گرتۆتە دەست.

لەنێوان ساڵەکانی ١٩٦٣ بۆ ١٩٦٥ گڕکانی ئیرازۆ ورووڕا وپایتەخت وناوچەکانی چوار دەوری بەخۆڵەمێش وپاشماوە گڕکانییەکان باراندووە، ئەمەش بووە هۆی لەدەست دانی بەرهەمێکی زۆری کشتوکاڵی لەناوچەکەدا بەتایبەتی بەرهەمەکانی قاوە، جگە لەزیانێکی ماددی زۆر وهەڵهاتنی بەهەزار کەسی دانیشتوانی ئەو ناوچانە.

باری ئابووری کۆستاریکا پشتی بەکشتوکاڵی بەستووە. چونکە زەوییەکانی گڕکانییەکانی زۆر بەپیتن وباشترین سەرچاوەی ئەو وڵاتەیان دابین کردووە. بەڵام کێشە ئابوورییە گەورەکانی وڵات لە بەرزی ڕێژەی بێکاریدا خۆی دەبینێتەوە، ویلایەتە یەکگرتوەکان ساڵانە بڕێ یارمەتی پێشکەش دەکات بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی ئابووری وڵاتەکە.

شایەنی باسە بەهۆی بەرز بوونەوەی ڕێژەی تاوانەکانی دزی وفڕاندن، چالاکییە گەشتوگوزارییەکانیش بەشێوەیەکی بەرچاو لەم ساڵانەی دوواوە بەرەو پاش هات.

جەژنی یشتیمانی: ١٥ / ٩ ی هەموو ساڵێك، جەژنی سەربەخۆیی ١٨٢١ .

سروودی نیشتیمانی: نیشتیمانی باوباپیران.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٧,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٣ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,٣٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٣ .

## کۆلۆمبیا

**ناوی باو:** کۆلۆمبیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری کۆلۆمبیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Colombia

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ١٠٢ ئەندام ).

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٦٣ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٤٤٠,٨٣١ میل دووجا، ١٤١,٧٤٨ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣٦,٢٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣١,٧ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** میستیزۆ ( تێکەڵەی هیند وئەورووپی)، ئەورووپی، هیندی ئەمریکا، مۆلاتۆ ( تێکەڵی ڕەش پێست وهیندی ئەمریکا)، ئەفریقی ڕەش.

**ئاین:** مەسیحی.

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** بۆگۆتا.

**شارە سەرەکییەکان:** کالی، میدیلین، بارانکیلا، کارتاگینا، ئەرمینیا.

**دراو:** بیزۆ.

**ئاو وهەوا:** جیاوازە لەنێوان ناوچە بەرز ونزمەکاندا، بەفرێکی بەردەوام لەلوتکەی چیاکان، بەرزاییەکانیش ناوچەیەکی سارد وزیاترین نیشتەجێبوونی لەخۆ گرتووە، گەرمە لەناوچەکانی دەریای کاریبی لەباکوور، کەمەرەیی لە ڕووباری ئەمازۆن لەباشوور، نێوەندی پلەکانی گەرما ١٤ پلەی سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، مەنیهۆت، قاوە، گەنمەشامی، کاکاو، پەتاتە، برنج، قامیشی شەکر، بەخێوکردنی مەڕومالات، ڕاوەماسی، چاندنی ماددە هۆشبەرەکان ( ماددە ناشەرعییەکان) ، گوڵ.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چنینی جلوبەرگ، درووستکراوە خۆراکییەکان، چیمەنتۆ، ماددە کیمیاییەکان، بەرهەمە کانزاییەکان.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، زومڕود، ئاڵتون، ئاسن، گاز، نەوت، نیکل.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کۆلۆمبیا وڵاتێکە دەکەوێتە بەشی باکووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئەمریکای باشوور.

ڤەنزەویلا دەکەوێتە رۆژهەلاتی، بەرازیل دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی، ئیکوادۆر دەکەوێتە باشووری، زەریای هێمن وپەنەما دەکەونە رۆژئاوای، دەریای کاریبی دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای، ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ۷۳ بەرەو رۆژئاوا لەگەلْ هێلی پانی ٤ بەرەو باکوور.

ناوچەکانی سەر دەریای کاریبی وزەریای هێمن بەدەشتێکی نزم دادەنرێت، سێ زنجیرە چیاش لە باکوورەوە بۆ باشووری کۆلۆمبیا درێژ دەبنەوە زیاتر لە سێ لەسەر چواری دانیشتوانی کۆلۆمبیا لەوناوچەیە نیشتەجێ بوون. بەلام دەشتەکانی رۆژهەلات نزیکەی ٦٠ ٪ ی رووبەری ولات دەگرێتەوە ورێژەی ۲ ٪ دانیشتوانی نیشتەجێی بوون، ئەمە بەهۆی بەرزی پلەکانی گەرما وبلاوبوونەوەی دارستانە کەمەرییەکان لەو ناوچەیەدا.

هیندەکانی ئەمریکا یەکەم دانیشتوانی ناوچەکە بوون.لەسەرەتای سەدەی شانزدەیەمەوە ئیسپانییەکان گەیشتونەتە کۆلۆمبیا، لە سالی ۱۵۲۵ یەکەم داگیرکراوەی هەمیشەیی ئیسپانی لەئەمەریکای باشوور دامەزرێندرا. لەسالی ۱۷۱۷ ئیسپانیا هەستا بە تێکەلْ کردنی ناوچە دراوسێکانی داگیرکراوەکانی تاکو رووبەریان بەرفراوان بکات وناوی نا ویلایەتی گرناتەی نوێ، کە هەر یەك لەکۆلۆمبیا وڤەنزەویلا وئیکوادۆر وپەنەمای لەخۆ گرتبوو. لەبەرواری ۲۰ / ۷ / ۱۸۱۰ زۆربەی بەشەکانی ویلایەتی گرناتە سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند، ۲۰ / ۷ یش بەجەژنی نیشتیمانی ئەو ولاتە دادەنرێت. لە ۷ / ۸ / ۱۸۱۹ جەنەرالی ڤەنزەویلی سیمۆن بۆلیڤار توانی هێزە ئیسپانییەکانی تێکشکاند وبووە یەکەم سەرۆکی کۆلۆمبیای مەزن کە تەواوی زەوییەکانی گرناتەی نوێی لەخۆ گرتبوو،ناوی کۆلۆمبیاش وەك رێزلێنانێك بۆ دۆزەرەوەی ئەمریکای کۆلۆمبوس هەلبژێردرا. لەسالی ۱۸۳۰ هەریەك لە ڤەنزەویلا وئیکوادۆر لەو ولاتە جیابوونەوە. لەسالی ۱۸٦٦ دەستووری کۆلۆمبیا کۆماری کۆلۆمبیای دامەزراند. لەسالی ۱۹۰۳ پەنەما لە کۆلۆمبیا دامالرا. لەسالی ۱۹٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

دوای سەربەخۆیی ولات دووچاری چەندین ململانێی سیاسی بۆتەوە. کێشەی سەرەکی لەنێوان دیاری کردنی دەسەلاتەکانی حکومەت ودەسەلاتەکانی کلێسەی کاسۆلیکی بوو، کێشەکان بوونە هۆی هەلگیرسانی شەڕی ناوخۆ، بەهەزاران کەس بوونە قوربانی شەڕی ناوخۆی ولاتە، شەڕ لەسەر دەسەلات بوو، جگە لەوەی چەند بالێکی جیاوازی هەبوو: لەنێوان بازرگانەکانی مادەە هۆشبەرەکان یان بەهۆی هەلگیرسانی شۆڕشە میللییەکان لەدژی حکومەت، یان لەنێوان کلێسە وحکومەت. دوایین شەڕی ناوخۆی ئەو ولاتە ئەو شەڕەی سالی ۱۹٦٤ لەنێوان هێزە حکومییەکان وچەند رێکخراوێکی چەپڕەو، کە رێکخراوێکی هێزی چەکداری مارکسی بەگەورەترین رێکرخراوەکانی کۆلۆمبیا دادەنرا، رێکخراوی ناوبراو داوای راگرتنی ئەو هەلمەتە سەربازییەی حکومەتی دەکرد بەهاوکاری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەدژی چاندنی مادەە هۆشبەرەکان دەستی پێکردبوو.

نزیکەی ١٣٥ هەزار کەس بوونە قوربانی ئەو شەڕە، شایەنی باسە تا ئێستاش ململانێی نێوان حکومەت وبازرگانە ناوبراوەکان بەردەوامە. شەڕە ناوخۆییەکان چەندین تاوانی فڕاندن ودزی وجەردەیی لێکەوتەوە، بەپێی ئامارێکی حکومی ساڵانە زیاتر لە ٣٠٠٠ پرۆسەی فڕاندنی کۆلۆمبی وبێگانە لەو وڵاتەدا تۆمار دەکرێت، کار گەیشتە ئەوەی کۆلۆمبیا نازناوی پایتەختی فڕاندنی جیهانی لەخۆ بگرێت.

لەبەرواری ٧ / ١٢ / ١٩٩٨ حکومەتی کۆلۆمبیا هەستا بە دامەزراندنی ناوچەیەکی داماڵراو لەچەك بەرووبەری ١٤,٠٠٠ کم[٢] ( هێندەی رووبەری سویسرا ) لەهەرێمی کاگوان وخستییە بەردەستی یاخی بووان: هێزە چەکدارە شۆڕشگێڕەکانی کۆلۆمبیا، کە بەکورتکراوەیی بە: فارك دەناسرێت وزیاتر لە ١٦,٥٠٠ چەکداری هەیە، ئەمە وەك دەربڕینێك لەحکومەتەوە بۆ ئاشتبوونەوەی گشتی. لەسەرەتاکانی ١٩٩٩ دەستکرا بە دانوستان لەنێوان حکومەت فارك بێ هیچ رێکەوتنێکی پێشوەخت بۆ ئاگر بەستی نێوانیان.

لە ٢٠ / ١ / ٢٠٠٠ دا حکومەتی کۆلۆمبی ویاخیبوان گەیشتنە رێکەوتنێك بۆ ئاگر بەستی نێوانیان، ئەمە دوای چەندین دانیشتن وگفتوگۆی چڕ، بۆ کۆتایی هێنان بە شەڕ وپێکدادان لەهەردوو لایەنەوە. بەڵام دوای یەك هەفتە لەو بەروارە سەر لەنوێ شەڕ وپێکدادان هەڵگیرسایەوە وشێوازێکی زۆر توندتری لەخۆ گرتەوە.

لە ٢٦ / ٥ / ٢٠٠٢ دا کۆلۆمبییەکان لە رێی هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتییەوە ئەلڤارۆ ئۆریبی ( ٤٩ ساڵ ) یان بەسەرۆکی وڵات هەڵبژارد. لە ٧ / ٨ / ٢٠٠٢ دا سوێندی دەستووری لەبەردەم پەرلەمانی کۆلۆمبیا خوارد ودەستی کرد بەجێبەجێ کردنی ئەرکەکانی، هاوکات هێزەکانی فارك دەستیان کرد بە بۆمباران کردنی چەند ناوچەیەکی جیاواز لەو وڵاتە وژمارەیەك کوشتار وبریندارێ زۆری لێکەوتەوە. ئەلڤارۆ لەکاتی سوێند خواردنی دەستووریدا، بەڵێنی دا بەدەستێکی ئاسنین سزای یاخی بووان بدات، حکومەت لە ١٢ / ٨ / ٢٠٠٢ دا حاڵەتی نائاسایی راگەیاند، باجێکی زۆری خستە سەر هاوڵاتیان بەئامانجی پشتیوانی کردنی هەڵمەتێکی سەربازی گەورە لەدژی فارك.

کۆلۆمبیا ئەمڕۆ دووچاری کێشەی ئابووری وکۆمەڵایەتی گەورە بۆتەوە، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ تەرخانکردنی سامان وداهاتی ئەو وڵاتە بۆ شەڕە ناوخۆییەکان، جگە لە قۆرغکردنی سیاسەت بەدەست کۆمەڵێ کاربەدستی دیاریکراوەوە. بەڵام ئەوەی لەو وڵاتەدا بەدی دەکرێت نەبوونی توندگیریی نەتەوەیی ئاینی وکۆمەڵایەتییە، ژن لە کۆلۆمبیا زۆر ئازادە بێگانە وەك هەر هاوڵاتیەکی دێت ودەچێت، هاوڵاتیان بەشێوەیەکی بەربڵاو بەکۆمەڵ دەژین، هێندە سوورەکان لەدارستانەکاندا ورەش پێستەکان لەناوچە گەرمەکان ونەوروپی وبەرەچەڵەك ئیسپانییەکان لەناوچە ساردەکاندا دەژین.

کۆلۆمبیا بەپلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا دوای بەرازیل لەبەرهەمی قاوە، بەپلەی نۆیەم دێت لە نیکل ومانگا وکاکاو وبەپلەی دەیەم دێت لەچاندنی قامیشی شەکر،

سیانزدەیەم لە دەرهێنانی ئاڵتوون، پانزدەیەم لە دەرهێنانی خەڵووزی بەردین.

کۆلۆمبیا بەپلەی یەکەم دێت لەجیهاندا لەبەرخەمی ماددەی هۆشبەری کۆکایین. حکومەت بەردەوام لەهەوڵی ژەهر رژێن کردنی ئەو کێڵگانەیە کە ئەو ماددەیەی تیا دەچێنرێت، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا هاوکارییەکی زۆری دەکات، سەرۆکی کۆلۆمبیا: ئەندریس باسترانا چاوەڕوانی ئەو بڕیارەی کۆنگرێسی ئەمریکی دەکات سەبارەت بە پێشکەش کردنی بڕی یەك ملیار و ٦٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی بۆ هاوکاری کردنی ژەهر رژێنەکانی کێڵگە ناوبراوەکان لەرێگای هەلیکۆپتەر وفرۆکەی تایبەتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو هەوڵانە، کۆلۆنێل ئۆرلاند باربرۆی بەڕێوەبەری بەرنامەی ژەهر رژێن کردنی کێڵگەکان دەڵێت: هەمان ئەو کێڵگانەی ئێمە ژەهر رژێنیان دەکەین بە رێژەی ٤٠ بۆ ٥٠ ٪ پاش ماوەیەکی کەم تەرخان دەکرێنە بۆ چاندنی کۆکاین. یەك لەسەر سێی رووبەرەکانی چاندنی کۆکایین دەکەوێتە ناوچەی بۆتۆمایای باشووری کە بافك دەستی بەسەردا گرتووە.

بەپێی توێژینەوەیەکی زانستی سەبارەت بەم کێشەیە کەلەلایەن زانای کۆمەڵناسی وپسپۆر لەبوارەکانی قەلاچۆکردندا ئاشکراکراوە کە ئەو ناوچەیەی ژەهر رژێن دەکرێ لەلایەن جوتیارەکانەوە چۆڵ دەکرێت و مافیاکانی کۆکایین ناوچەی تازە و ماددەی کیمیایی و فرۆکەخانەی نهێنی بۆ جوتیارەکان تەرخان دەکەن تاکو دەست بکەنەوە بە چاندنی کۆکایین.

بەڵام مەترسی هەرە گەورەی حکومەت لەوەدایە کە بەدەیان هەزار جوتیار کار لەم بوارەدا دەکەن، ئەگەر بێتو حکومەت بێکار وبێ کێڵگەیان بکات، ئەوا بێگومان پەیوەندی دەکەن بەیاخی بووانەوە وکێشەکان هێندەی تر ئاڵۆز دەبن.

لەساڵی ١٩٨٥ دا گڕکانی نیڤادۆ دل رویزی چیای ئەندیزی رۆژئاوای بۆگۆتای پایتەخت ورووژا وبووە هۆی کوشتنی زیاتر لە ٢٥,٠٠٠ کەس وبەدواییدا لافاوێکی گەورە وبوومەلەرزەیەك پەیدا بوو.

لە سەرەتای ١٩٩٩ دا بوومەلەرزەیەکی بەهێز لەشاری ئەرمینیای دا وبووە هۆی کوشتن وبریندار بوونی بەدەیان هاوڵاتی جگە لەزەرەوە وزیانێکی ماددی زۆر.

سروودی نیشتیمانی: سەروەریمان هەر دەمێنێ.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٥٨,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٤١ .

تێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٦٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩٢ .

## كۆنگۆ

**ناوی باو:** كۆنگۆ

**ناوی فەرمی:** كۆماری كۆنگۆ.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of The Congo

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی پیران ( ٦٠ ئەندام ).

ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٥ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٣٢,٠٤٧ میل دووجا، ٣٤٢,٠٠٠ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٥٨٣,٠٠٠ كەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٧,٦ كەس/كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش – كە دەچنەوە سەر چەند كۆمەڵەیەكی نەژادی، گرنگترینیان: كۆنگۆ، تیكی، مبۆشی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان كاسۆلیك، پرۆتستانت )، چەند بیروباوەڕێكی ناوخۆ.

**زمان:** فەڕەنسی.

**پایتەخت:** برازاڤیل.

**شارە سەرەكییەكان:** بوانت نوار، لۆبۆمۆ، نكای، مۆسیندجۆ.

**دراو:** فرانك.

**ئاو وهەوا:** گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەكانی گەرما بەدرێژایی ساڵ لەنێوان ٢٤ – ٢٦ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەكان دەگاتە ٢٥٠ سم وبەدرێژایی ساڵ دەبارێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** مۆز، مەنیهۆت، قاوە، زەیتی دارخورما، بستەی عەبید، لاستیك، برنج، قامیشی شەكر، پەتاتەی شیرین، كاكاو، داروتەختە، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** چیمەنتۆ، شەكر، سابوون، جگەرە، بیرە.

**سامانی كانزایی:** گازی سروشتی، قوڕقوشم، نەوت، پۆتاس، زنك، ئاڵتون.

**تێڕوانینێكی گشتی:**

كۆنگۆ، بەزمانی ناوخۆی وڵات بەمانای ڕوباری لەخووڕ دێت، هەندێ جاریش پێی دەڵێن كۆنگۆ برازاڤیل تاكو لەكۆنگۆی دیموكراسی دراوسێی جیا بكەنەوە كە پێی دەڵێن كۆنگۆ

كینشاسای، وڵاتێكە دەكەوێتە رۆژئاوای ناوەراستی ئەفریقیا، ئەفریقیای ناوەراست دەكەوێتە باكووری، كۆنگۆی دیموكراسی ( زائیری ئەوسا ) دەكەوێتە رۆژهەڵات ورۆژئاوای، زەریای ئەتڵەسی وگابۆن دەكەونە رۆژئاوای، هەروەها گابۆن لە باكووری رۆژئاواشەوە لەگەڵیدا سنووردارە. ناوەراستی دەكەوێتە سەر یەكێری هێڵی درێژی ١٦ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی كەمەرەیی ( هێڵی پانی سفر ).

زۆربەی خاكی كۆنگۆ بەدارستانە چرەكان داپۆشراوە. دەشتی كەناری سەر زەریای ئەتڵەسی بەماوەی ٦٤ كم بەرەو ناوخۆی وڵات درێژ دەبێتەوە وناوچەیەكی گەرم وچۆڵیشە. بانی باتیك دەكەوێتە ناوەراستی وڵاتەوە وبەگژو گیایەكی زۆر داپۆشراوە وزێیەكانی روباری كۆنگۆی تێدەكەوێت. بەڵام حەوزی روباری كۆنگۆ بریتییە لەو دەشتانەی ناوی لافاوەكان بەشی نزمەكانی داپۆشیوە وگژوگیای ساڤاناش بەشە بەرزەكانیان گرتۆتەوە.

وڵاتی كۆنگۆ بەشێكی بچوك بوو لە شانشینی كۆنگۆ كە لەسەدەكانی پانزدەیەم وشانزدەیەمدا بەشێوەیەكی بەرچاو گەشەی كردبوو. لە ساڵی ١٤٨٢ دا پورتوگالییەكان گەیشتونەتە كەنارەكانی. لەساڵی ١٨٧٥ دا گەریدەی فەرەنسی بییر ساڤۆرڤان برازا كۆنگۆی ناوخۆی دۆزیوەتەوە، لەساڵی ١٨٧٦ دا دۆزەرەوەی بەریتانی هێنری مۆرتن ستانلی لەسەرچاوەی روباری كۆنگۆوە گەشتی كردووە تا گەیشتۆتە زەریای ئەتڵەسی. لەساڵی ١٨٨٠ دا ناوچەی باكووری روباری كۆنگۆ كەوتۆتە ژێر پارێزگاری فەرەنساوە وناو نراوە كۆنگۆی فەرەنسی، لەساڵی ١٨٨٣ دا شاری برازا دامەزراوە. لەساڵی ١٩٠٣ دا ناوچەكە كراوەتە سەر ئەفریقیای كەمەرەیی فەرەنسی. لەساڵی ١٩١٠ دا ناونراوە كۆنگۆی ناوەراست. لەساڵی ١٩٥٨ دا مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشراوە ولەبەرواری ١٥ / ٨ / ١٩٦٠ دا بەتەواوی سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

یەكەم سەرۆك دوای سەربەخۆیی فۆلبرت یۆلۆ بووە، دوای ئەوە بەزۆرە ملی دەستی لەكار پێكێشرایەوە، ئەلفۆنس ماسیمبا دیباتی چەپرەو دەسەڵاتی گرتە دەست. كودەتایەكی سەربازی بەسەركردایەتی رائد ماریان نكوابی لە١٩٦٨ دا بەسەر دەكرێت ولەدەسەڵات دوور دەخرێتەوە. لەساڵی ١٩٧٠ دەستووری نوێی وڵات دەردەكرێت وكۆنگۆ دەكرێتە وڵاتێك خاوەنی یەك حیزبی سیاسی بێت لەژێر ناوی كۆماری كۆنگۆی میللی ونكوابیش بووە سەرۆكی وڵات.

لە ١٩٧٧ دا نكوابی تیرۆر كرا وعەقید گواكیم یونبی ئۆبانگۆ دەسەڵاتی گرتە دەست، دوای دوو ساڵ دنیس ساسۆ نگۆسۆ دەسەڵاتی گرتە دەست. لەساڵی ١٩٩٢ باسكال لیسۆبا لە هەڵبژاردنە گشتییەكاندا سەركەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆكی وڵات. بەڵام لەنێوان

یاوەرانی هەردوو سەرۆكی پێشوو شەڕ وپێكدادان روویدا وبووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ وزەرەر وزیانێكی گیانی وماددی زۆری بەوڵات گەیاند. لە بەرواری ١٥ / ١٠ / ١٩٩٧ دا دنیس ساسۆ دەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵام شەڕی ناوخۆ كۆتایی پێنەهات، نزیكەی ساڵێكی دیكەشی خایاند.

لەبەرواری ١٠ / ٣ / ٢٠٠٢ دا هەڵبژاردنەكانی سەرۆكایەتی بەڕێوە چوو، دنیس ساسۆ سەركەوتنی بەدەست هێنایەوە ودەسەڵاتی گرتەوە دەست.

زۆربەی زەوییەكانی كۆنگۆ بۆ چالاكییە كشتوكاڵییەكان لەبار نین، بەڵام سامانێكی سروشتی كانزایی زۆری لەخۆ گرتوو هەرچەندە تائێستا سوودێكی ئەوتۆی لێوەرنەگیراوە. كۆنگۆ بەسەنتەرێكی هاتووچۆی گرنگ دادەنرێ لەنێو وڵاتە دراوسێكانیدا، بەڵام هیچ رێگەیەكی سەرەكی بۆ سەر دەریاكان نییە.

سروودی نیشتیمانی: لەگەڵ نیشتمانی دلێران بن.

جەژنی نیشتیمانی: ١٥ / ٨ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٦٠.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی: ١,٦ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣٩.

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٦٤٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣٥ .

## كۆنگۆی دیموكراسی

ناوی باو: كۆنگۆی دیمەكراتی.

ناوی فەرمی: كۆماری كۆنگۆی دیموكراسی.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Democratic Republic of Congo

سیستەمی حوكمڕانی: كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی بالآ ( ٧٣٨ ئەندام ).

ڕووبەر: ٩٠٥,٣٥٤ میل دووجا، ٢,٣٤٤,٨٥٨ كم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٥٠,٠٠٠,٠٠٠ كەس ( تا ٢٠٠٢ ).

چڕی دانیشتوان: ٢٠ كەس/كم٢

كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی ڕەش لەچەند كۆمەڵەیەكی نەژادی پێك دێن، گرنگترینیان: لۆبا، كۆنگۆ، جگە لەچەند كۆمەڵەیەك لەكورتە باڵاكان، ژمارەیەك لە ئەوروپییەكان بەتایبەتی بەلجیكی، لەگەڵ كەمایەتییەكی عەرەب ( لوبنانی ).

ئاین: مەسیحی ( ڕۆمان كاسۆلیك، پرۆتستانت )، چەند بیروباوەڕێكی ناوخۆ، موسڵمان.

زمان: فەرەنسی، نزیكەی ٢٠٠ جۆر زمانی ناوخۆ.

پایتەخت: كینشاسا.

شارە سەرەكییەكان: لۆبۆمباشی، مۆبۆمای، كیزانكانی، كانانجا.

دراو: زائیری نوێ.

ئاو وهەوا: لەدارستانە كەمەرەییەكانی باكووری وڵات كەهێڵی كەمەرەیی پیا تێدەپەڕێت بەدرێژایی ساڵ گەرم وشێدارە ونێوەندی پلەكانی گەرما ٣٢ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەكان ٢٠٠ سم دەبارێت. لەباشووری وڵات كە گژوگیای سافانا لێی بڵاودەبێتەوە: نێوەندی پلەگانی گەرما ٢٤ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەكان ٩٥ سم دەبارێت. لەبان وچیاكانی ڕۆژهەڵاتی وباشووری ڕۆژهەڵاتی وڵات. نێوەندی پلەكانی گەرما ٢١ پلەی سەدی دەبێت وڕێژەی ساڵانەی بارانەكان ١٢٠ سم دەبارێت.

بەرهەمە كشتوكاڵیەكان: مۆز، منیهۆت، كاكاو، قاوە، لۆكە، گەنمەشامی، زەیتی دارخورما، پاقلە، برنج، لاستیك، چا، داروتەختە.

بەرهەمە پیشەسازییەكان: بیرە، چیمەنتۆ، دروستكراوە خۆراكییەكان، پۆڵا، چنین، دروستكردنی تایەی ئۆتۆمبێل.

سامانی كانزایی: زیو، تەنەكە، كادیۆم، زنك، تەنگستن، كۆبالت، مس، ئاڵتون، ئەڵماس، مەنگەنیز، یۆرانیۆم.

تێڕوانینێكی گشتی:

کۆنگۆ، کەبەزمانی ناوخۆی ولآت بەمانای روبارێکی لەخوور دێت، تا سالی ١٩٩٧ پێی وتراوە زائیر کەبەهەمان مانا دێت،هەندێ جاریش پێی دەوترێت کۆنگۆ کینشاسا، ولآتێکە دەکەوێتە باشووری ئەفریقیا، هەر یەك لە ئەفریقیای ناوەراست وسودان دەکەونە باکووری، ئۆگەندا وروانـدا وبۆرۆنـدی وتـەنزانیا دەکەونـە رۆژهـەلآتی، زامبیـا دەکەوێتـە باشـووری رۆژهەلآتی، ئەنگۆلاش دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای، زەریای ئەتلەسی و کۆماری کۆنگۆ دەکەونـە رۆژئـاوای، دەریاچـەی تـەنجانیکا سـنوورەکانی نێـوان کۆنگـۆی دیموکراسـی و تـەنزانیای لەرۆژهـەلآت پێك هێنـاوە. ناوەراسـتی دەکەوێتـە سـەر یـەکبری هێلـی درێـژی ٢٢ بەرەو رۆژهەلآت لەگەلْ هێلی پانی ٤ بەرەو پاشوور.

کۆنگۆی دیموکراسی سێیەم ولآتی ئەفریقیایە لەرووی رووبەرەوە دوای سودان وجەزائیر.

تەختی باکووری ولآت لەدارستانە زۆر چرەکان پێك هاتووە کە داروەوەنێکی زۆری لەخۆ گرتـووە وبەچرترین دارسـتانەکانی جیهـان دادەنرێـت، پێکهاتەیـەکی هەمـەجۆری بێوێنـەی لـەدار ودرەختـە دەگمەنـەکان لـێ بـەدی دەکرێـت. ژمارەیـەك ئـاژەلی وەك شـەمبازی وفیـل ومـەیموونی ئـەفریقی و گـۆرێلا وشـێردەرە زەبەلاحـەکانی لـەخۆ گرتـووە، هـەروەها چـەندین جـۆری داروەرەخـتی وەك مـاهۆنگی کـەدارەکانی زۆر پتـەو ودەگمـەنن لـەو ناوچـەیەدا تێدەکەوێت. زانـا ژێنگـە پارێزەکـان چـەندین پارێزراوەیـان لەوناوچـەیە سـازداوە واش بـۆی دەچـن کـەدێرین تـرین ناوچـەی دارسـتان بێـت لەسـەر گـۆی زەوی. گـژوگیای سـاڤانا چـەند بەشـێکی باشـووری ولآتـی داپۆشـیوە، هـەروەها چیـا وبانـەکانیش دەکەونـە سـەر سـنوورە رۆژهەلآتیەکانی و لوتکەی مارگرێتا بەرزترین خالی ولآتەکەیە کە بەرزییەکەی دەگاتە ٥,١٠٩ م.

روباری کۆنگـۆ، پێنجـەم درێـژترین رووبـار لەجیهاندا لەباشـووری رۆژهـەلآتی ولآتـەوە تـا رۆژئاوای تێپەر دەبێت ودەرژێتە نێو زەریای ئەتلەسییەوە.

لەچاخەکانی پێش مێژووەوە کورتـە بالآکان یەکەم دانیشتوانی ناوچەکە بـوون. نزیکـەی دوو هەزار سالْ لەمەوبـەرەوە لەچەند بەشـێکی ئەفریقاوە خـەلکی روویـان کردۆتـە ناوچـەکە. لەسـەدەی هەشـتەم دا چـەند شارسـتانێکی لـێ دامـەزراوە، لەسـەدەی پانزدەیەمـدا شانشـینی کۆنگۆ وچەند شانشینێکی دیکە لەناوچەکەدا دامـەزراوە. لەسـەدەی شـانزدەیەمدا بازرگـانی کـردن بەکۆیلەکانـەوە دەسـتی پێکـردووە، لەسـالی ١٨٧٤ دا گەرێـدەی بـەناوبانگی بـەریتانی هێنری ستانلی گەیشتۆتە ناوچەکەو وبەردی بناغەی ولآتـی کۆنگـۆی ئـازادی دامـەزراندووە، خاوەندارێتی پاشای بەلجیکی لیۆبۆلدی دووەمی بۆ ناوچەکە راگەیەندووە. لەسالی ١٨٨٥ دا بەشێوەیەکی نێودەولەتی دانی پیانراوە. لەسـالی ١٩٠٨ دا خرایـە سـەر خاوەنداریـەکانی بـەلجیکا ونـاوی بـووە کۆنگـۆی بـەلجیکی. لەپـەنجاکانی سـەدەی بیسـتەمدا دانیـشتوانە ئەفریقییەکانی کۆنگۆ داوای سەربەخۆییان دەکرد، لەبەروارای ٣٠ / ٦ / ١٩٦٠ دا بەتـەواوی سـەربەخۆ بـووە، لەهـەمان سـالدا بۆتـە ئەنـدامی نەتـەوە یـەکگرتووەکان ونـاوی بـووە کۆنگـۆ

لیوبۆدفیل، لەساڵی ١٩٦٧ دا ناوی بووە: کۆنگۆ کینشاسا.

دوای سەربەخۆیی وڵات بەچەند قۆناغێکی ناڵەبار وتوند تێپەڕی، چەند جارێك شەڕی ناوخۆ هەڵگیرساوە. لەساڵی ١٩٦٥ دا سەرۆکی سوپا دیزیریێ مۆبۆتۆ سەرۆکایەتی کۆماری گرتۆتە دەست، هەوڵێکی زۆری داوە وڵاتەکەی لەکێشەکان رزگار بکات، ناوی زۆربەی ئەو ناوچە سرووشتیانەی لەناوە ئەورووپییەکانە گۆڕی بۆ ناوی ئەفریقی، وەك پارێزگاری کردنێکی کەلتووری ئەفەریقیا، تەنانەت لەساڵی ١٩٧١ دا ناوی وڵاتی کۆنگۆوە گۆڕی بۆ زائی، هەروەها بۆ ساڵی دوایی ناوی خۆشی گۆڕی بۆ: مۆبۆتۆ سیسی سیکۆ. بەڵام بارودۆخی ئابووری وکۆمەڵایەتی زائیر تادەهات خراپتر دەبوو، ناچار لە ١٦ / ٥ / ١٩٩٧ دا مۆبۆتۆ سیسی سیکۆ دەستی لەدەسەڵات هەڵگرت و وڵاتەکەی بەجێ هێشت. دوای ئەو لۆران دیزێ کابیلا دەسەڵاتی گرتە دەست ولەبەرواری ٢٩ / ٥ / ١٩٩٧ دا ناوی وڵاتی گۆڕی بۆ: کۆماری کۆنگۆی دیموکراسی.

لەمانگی نۆی / ١٩٩٧ دا سەرۆکی پێشووی زائیر مۆبۆتۆ سیسی سیکۆ لە وڵاتی مەغریب کۆچی دوایی کرد و لەریباتی پایتەختی ئەو وڵاتە لەقەبرستانێکی ئەورووپی بەخاك سپێردا، تا لەساڵی ٢٠٠١ دا حکومەتی کۆنگۆی دیموکراسی رەزامەندی دەربڕی بەگواستنەوەی تەرمەکەی بەرەو وڵاتی خۆی.

شەڕی ناوخۆ وڵاتی کۆنگۆی دیموکراسی بەتەواوەتی تێك داوە، هەر یەك لەم وڵاتانە یارمەتی یاخی بووان دەدەن: ئۆگەندا، رواندا، بۆرۆندی، چەند وڵاتێکیش یارمەتی حکومەتی کۆنگۆی دیموکراسی دەدەن بۆ زاڵ بوون بەسەر هێزەکانی ئۆپۆزسیۆنەوە: ئەنگۆلا، زیمبابۆی، نامیبیا، مۆزەمبیق، زامبیا، کینیا. چەند جارێك وڵاتانی ئەفریقیا و وڵاتە گەورەکان رۆڵی ناوبژیوانیان لەنێوان هێزە حکومییەکان وهێزە یاخیبووەکانیان بینییوە بۆکۆتایی هێنان بەکێشەکانی نێوانیان، بەڵام زۆربەی هەوڵەکان شکستیان هێناوە.

لە بەرواری ٢٧ / ١ / ٢٠٠٠ دا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری بڵاوکردنەوەی هێزەکانی ئاشتی پارێز داوە لەوڵاتی کۆنگۆی دیموکراسی. لە ٢٦ / ٢ ی هەمان ساڵدا نزیکەی ٥٠٠ چاودێری سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان رەوانەی وڵات کراوە بۆ چاودێری جێبەجێکردنی رێکەوتننامەی لۆساکا کە لەنێوان لایەنە بەشەڕهاتووەکاندا واژۆ کرابوو بۆ ئاگربەست لەنێوانیاندا.

بەپێی راپۆرتێکی رێکخراوی فریاگوزاری نێو دەوڵەتی، لەماوەی دوو ساڵی رابردوو نزیکەی ١,٩ ملیۆن هاوڵاتی لەرۆژهەڵاتی کۆنگۆی دیموکراسیدا گیانیان لەدەست داوە بەهۆی شەڕی ناوخۆی ئەو وڵاتەوە، واتا بەرێژەی ٢٦٠٠ کەس لەرۆژێکدا.

لەبەرواری ١٦ / ١ / ٢٠٠١ دا کەسێك بەناوی رشێدی، جگە لەناوی خۆی کەسێك ناوی باوکی یان نازناوی نەزانیوە، گەیشتە نێو نووسینگەی تایبەتی سەرۆك لۆران دیزێ کابیلا وپێنج فیشەکی نا بەسەری ناوبراوەوە، بەپێی هەواڵەکان کەسێك نەیزانییوە هۆکاری ئەم

پرۆسەیە چی بووە، کاتێ رشیدی هەوڵی هاڵهاتنی داوە لە نووسینگەی کابیلا لەگەڵ پاسەوانە تایبەتەکانی سەرۆکدا دووچاری پێکدادان بووە وهەر لەوێدا گیانی لەدەست دا، لۆران بەر لەوەی بگەیەنرێتە نەخۆشخانە گیانی لەدەستدا.

بۆ رۆژی دوایی حکومەتی کۆنگۆ دانیشتنێکی نائاساییان بەست وبریار درا جۆزێف کابیلا ( ۳۲ ساڵ ) ی کوڕە گەورەکەی سەرۆکی تیرۆر کراو دەسەڵاتی سەرۆکایەتی حکومەت وسەرۆکی سوپا بگرێتە دەست. لە ۲٤ / ۱ / ۲۰۰۱ ئەنجومەنی بریاری گواستنەوەی دەسەڵاتە دەستوورییەکانی سەرۆکی کۆماری دا وبەمەش جۆزێف کابیلا بووە سەرۆکی کۆمار.

لە بەرواری ۳۱ / ۱ /۲۰۰۱ دا دادگای نێو دەوڵەتی لەلاهای رایگەیاند کە کۆنگۆی دیموکراسی هەڵساوە بەپاشگەز بوونەوە لەتەواوی ئەو سکاڵایانەی لەدژی هەر یەك لە بۆرۆندی وروانداا تۆماری کردووە، بەڵام سکاڵاکانی لەدژی ئۆگەندا وەك خۆی هێشتەوە.

لەبەرواری ۲۸ / ۲ / ۲۰۰۱ هەریەك لە رواندا وئۆگەندا رایانگەیاند کەدەستیان کردووە بەکێشانەوەی هێزەکانیان لەکۆنگۆی دیموکراسی بەپێی ئەو رێکەوتننامەیەی کەلە ۱۰ / ۹ / ۱۹۹۹ واژۆکراوە.

لەکۆتاییەکانی ۲۰۰۱ دا تەواوی لایەنە بەشەڕ هاتووەکان لەکۆنگۆی دیموکراسی: حکومەتی جۆزێف کابیلا، رێکخراوە یاخیبووەکان، پارتە ئۆپۆزسیۆنەکان، رێکخراو وسەندیکا مەدەنیی وخۆییەکان، دەستیان کرد بەگفتوگۆکردن لەپێناوی سەقامگیرکردنی ئاشتییەکی یەکجارەکی وهەتا هەتایی لەنێوانیاندا بۆ کۆتایی هێنان بەو شەڕەی هەندێ لایەن ناوی جەنگی ئەفریقی یەکەمیان لێنابوو.

لەبەرواری ۳۰ / ۷ / ۲۰۰۲ هەر یەك لە سەرۆکی کۆنگۆی دیموکراسی وروانداا رێکەوتننامەی ئاشتیان واژۆ کرد (بگەڕێوە بۆ باسی رواندا ).

کۆنگۆ وڵاتێکی هەژاری تازە پێگەشتووە، بەڵام خاوەنی سامانێکی کانزایی زۆر بەنرخە ئەگەرچی تا ئێستا بەتەواوی بەگەڕنەخراوە بەڵام واچاوەڕوان دەکرێت دوارۆژێکی باشی هەبێت.

سروودی نیشتیمانی: زائیرییەکان.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ۸٫۱ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۸۲ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۲۰۳ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱۷۹ .

## کوێت

**ناوی باو:** کوێت

**ناوی فەرمی:** دەوڵەتی کوێت.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

State of Kuwait

**سیستەمی حوکمڕانی:** میری دەستووری، میر، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نەتەوە ( ٥٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ٦,٨٨٠ میل دووجا، ١٧,٨١٨ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٣٠٩,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠١ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٢ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، ئاسیایی، ئەورووپی.

**ئاین:** موسڵمان.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** کوێت.

**شارە سەرەکییەکان:** سولەیمانی، جەهرا، حۆلی، ئەحمەدی، شوێخ.

**دراو:** دیناری کوێتی.

**ئاو وهەوا:** بیابانی گەرم، نێوەندی پلەکانی گەرما لە وەرزی هاویندا دەگاتە ٤٥ پلەی سەدی ولەزستاندا دەچێتە سفری سەدی، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٩ ملم ولەوەرزی زستاندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** تەماتە، پیاز، کاڵەک، خورما، پەلەوەر، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** درووستکراوەکانی نەوت، پلاستیک، پەین، کەرەستەی بیناسازی، چاپ وبڵاوکردنەوە.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گاز، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کوێت وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای ئاسیا لەبەشی باکووری کەنداوی عەرەبی، عێراق دەکەوێتە باکوور وباکووری رۆژئاوای، کەنداوی عەرەب دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، شانشینی عەرەبی سعودی دەکەوێتە باشووری رۆژئاوا وباشووری. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٤٧/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٩/٣٠ بەرەو

باکوور.

کویت خاوەنی نۆ دورگەیە دەکەونە سەر کەنارەکانی: فیلکە، بۆبیان، میسکان، وربە، عۆهە، ئوم ئەلمەرادم، ئەم ئەلنەمل، کبر وقورا، دورگەی بۆبیان بەگەورەترینیان دادەنرێت و رووبەرەکەی ٨٦٣ کم٢ دەبێت ولەرێی پردێکی ئاسنەوە بەخاکی کوێتەوە بەستراوەتەوە، هەروەها دورگەی فیلکەش بەچڕترین دورگە دادەنرێت لەرووی دانیشتوانەوە.

دەشتی بیابانی کوێت لەرۆژئاواوە تا رۆژهەلآت بەرەو کەناری کەنداوی عەرەبی بەرز دەبێتەوە وبەرزترین خالێشی دەگاتە ٣٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە. خاکی کوێت هیچ چیا وروبار ورێگریەکی سروشتی لەخۆ نەگرتووە، ئازادی هاتوچۆی خێڵە عەرەبییەکانیش بۆتە گرفتی دیاری کردنی سنوورەکانی ئەمەش هۆکاری سەرەکی کێشە سنوورییەکانیەتی. لە ٧ / ٧ / ١٩٦٥ کێشە سنوورییەکانی لەگەڵ شانشینی سعودی عەرەبی لەسەر ناوچەی بێلایەن کە رووبەرەکەی دەگاتە ٤،٦٠٠ کم٢ بەتەواوی چارەسەر کراوەوکوێت چاودێری بەشی باکووری ناوچەکە دەکات و سعودییەش بەشی باشووری ونەوتی ناوچەکەش لەنێوانیاندا بەیەکسانی دابەشکراوە.

لەسەرەتای سەدەی حەڤدەیەمدا کوێت بە قەرین دەناسرا، وشەی قەرین یان کوتیش لەزمانی عەرەبیدا بچوکراوەی قەرنە کەبەمانای گرد یان قەلآ دێت. مێژووناسەکانی نیمچە دورگەی عەرەب وشەکەیان بەکار هێناوە بۆ ئامارژە پێدانی کۆمەڵە قەلآیەك،ناوەکە لەمەوە هاتووە.

پێش ئاینی ئیسلام ودوای ئیسلامیش چەند خێڵێکی عەرەب لەناوچەکەدا ژیاون، ئاینی ئیسلام لەسەردەمی خەلیفە ئەبوبەکری سدیق لە ١٢ ك / ٦٣٣ ز گەیشتۆتە کوێت وچەند ئەندامێکی خێڵەکانی عەنزە لە ساڵی ١٧١٠ لەناوچەکانی نزیك کەناری باشووری کەنداوی کوێت نیشتەجێ بوون ولەساڵی ١٧٥٦ لەخێزانی ئال سوباح دا سەرکردەیەکیان بۆ خۆیان هەڵبژاردووە، ناوی: سوباحی یەکەمی لێنراوە.

لە ٢٣ / ١ / ١٨٩٩ شێخ موبارەك ئەلسوباح پەیماننامەیەکی لەگەڵ بەریتانییەکاندا واژۆ کردووە وبەپێی پەیماننامەکە کوێت بۆتە پارێزراوەیەکی بەریتانی بەرامبەر بەو مەرجەی کە کوێت بێ پرسی بەریتانیا هاوکاری هیچ لایەنێك نەکات. لەساڵی ١٩١٤ دا بەریتانیا دانی ناوە بە سەربەخۆیی دەوڵەتی کوێت لەژێر پارێزراوی خۆیدا. کوێت بەم شێوەیە مایەوە، تا لە بەرواری ١٩ / ٦ / ١٩٦١ بەتەواوی لە بەریتانیا سەربەخۆ بووە وشێخ عبدالله ئەلسوباح پەیماننامەکەی لەگەڵ بەریتانیادا پووچەڵ کردۆتەوە. لەبەرواری ١٠ / ٧ / ١٩٦١ دا بۆتە ئەندامی کۆمەڵەی ولآتە عەرەبییەکان ولە ١٤ / ٥ / ١٩٦٣ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە

یەکگرتوەکان. لەساڵی ١٩٨١ دا بەشداری کردووە لە دامەزراندنی ئەنجومەنی هاوکاری وڵاتانی کەنداوی عەرەبی.

لەبەرواری ٢ / ٨ / ١٩٩٠ عێراق پەلاماری کوێتی داوە وباسی لەوە دەکرد کە کوێت بۆتەوە بە پارێزگای نۆزدەمین، شایەنی باسە هێزە عێراقییەکان بەسەرکردایەتی دیکتاتۆری ئەوسای عێراق سەدام حسێن وئەندامانی پارتی بەد ناوی حیزبی بەعسی شۆفێنی چی داهاتی ئەو وڵاتە بوو لەنێوان ئەندامانی خێزانەکانیاندا بەشیان کرد و باسیان لەخاوەنداری خۆیان بۆ ناوچەکە دەکرد. لە ٢٦ / ٢ / ١٩٩١ دا عێراق لە کوێت کرایە دەرەوە پاش جەنگی گەردەلوولی بیابان بەسەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وهاوپەیمانەکانی.

خاڵی وەرگەڕان لەمێژووی نوێی کوێتدا دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی شێخ ئەحمەد جابر ئەلسوباح کە لەساڵی ١٩٢١ دا دەسەڵاتی وڵاتی گرتۆتە دەست، دوای شێخ سالمی کوڕی موبارەکی باوکی. لەسەردەمی شێخ ئەحمەد جابردا نەوت لە ١٩٣٨ دا دۆزراوەتەوە، بەدۆزینەوەی نەوتیش خاڵی وەرگەڕانی راستەقینەی وڵات بەرەو پێشەوە لەتەواوی بوارەکاندا دەستی پێکرد. لەساڵی ١٩٥٠ شێخ ئەحمەد کۆچی دوایی کرد و شێخ عبدالله کوڕی سالم ئەلسوباح دەسەڵاتی گرتە دەست. کوێت تادەهات دەوڵەمەندتر وسامانی نوێی لێ دەدۆزرایەوە. شێخ عبدالله لە ١٩٦٥ دا کۆچی دوایی کرد، شێخ سەباح سالح ئەلسوباح دەسەڵاتی گرتە دەست ولە ١٩٧٧ دا کۆچی دوایی کرد و شێخ جابر ئەحمەد ئەلسوباح بووە میری وڵات ودەسەڵاتی گرتە دەست.

کوێت بەپلەی چوارەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە یەدەگی گەنجینەی نەوت لەدوای سعودیە وعیراق و ئیمارات، بڕی ئەو یەدەگەشی دەگاتە ٩٦,٥ ملیار بەرمیل، واتا ٩,٣ ٪ ی یەدەگی جیهانی. هەروەها بەپلەی پانزدەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی پیترۆل.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٦ / ٢ ی هەموو ساڵێك جەژنی ئازاد بوون لە عێراق.

سروودی نیشتیمانی: کوێت ئەی نیشتیمانم هەر بمێنی بۆ سەروەری.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣١,٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٣ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٩,٠٤٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨ .

## کیرجستان

ناوی باو: کیرجستان.

ناوی فەرمی: کۆماری کیرجستان

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Kyrgyzstan

سیستەمی حوکمرانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە وسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران یارمەتی دەدات.

دەستەی یاسادانان: لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

ئەنجومەنی نوێنەرانی گەل ( ٧٠ ئەندام ).

ئەنجومەنی یاسادانان ( ٣٥ ئەندام ).

رووبەر: ٧٦،٦٠٠ میل دووجا، ١٩٨،٥٠٠ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٤،٥٩٥،٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ٢٣،١ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: کیرجیز ٤٨ ٪ ، رووس، ئوزبەك، ئوکرانی، ئەڵمان، تەتەر.

ئاین: موسڵمان ٧٠ ٪ ، مەسیحی.

زمان: کیرجی، رووسی، تورکی.

پایتەخت: بشیك، هەروەها فرۆنزیەشی پێدەوترێت.

شارە سەرەکییەکان: ئووش، جەلال ئاباد، توکمۆك، کاراکول.

دراو: سووم.

ئاو وهەوا: کیشوەری: هاوینی فێنکە لەدۆڵ ودەشتەکان: نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ١٦ بۆ ٢٤ پلەی سەدی دەبێت. لەناوچەی چیاکانیش زستانی سارده ونێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ٥ لەژێر سفری سەدی بۆ ٢٨ پلەی ژێر سفری سەدی دەبێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: لۆکە، سەوزەومیوە، گەنم، توتن، بەخێوکردنی مەڕومالات، چاندنی ماددەی خاشخاش ( ماددەیەکی قەدەغەکراوی ناشەرعیی وهۆشبەرە).

بەرهەمە پیشەسازییەکان: کەرەستەی بیناسازی، درووستکراوە خۆراکییەکان، ئامێر، چنین.

سامانی کانزایی: جیوە، خەڵووز، گاز، پیترۆل، ئاڵتون.

تێڕوانینێکی گشتی:

کیرجستان یان قیرغستان، بەزمانی کۆنی تورکی بەمانای ولاتی گەلی چیا دێت، کیر یان قیر بەمانای چیا دێت و غیز بەمانای گەل و ستانیش بەمانای ولات دێت، هەروەها بە قیرغیزیش دەناسرا، ولاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئاسیا، کازاخستان دەکەوێتە باکووری وچین دەکەوێتە رۆژهەلاتی، تاجیکستان دەکەوێتە باشووری وئۆزبەکستان دەکەوێتە رۆژئاوای، هیچ کەنارێکی نییە ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ٧٥ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێلی پانی ٤١ بەرەو باکوور.

چیاکانی تیان شان وئالای زۆربەی کیرجستانیان گرتۆتەوە ونزیکەی ٧٥ ٪ رووبەری ولاتیان بەرزکردۆتەوە بۆ ١٥٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریا. بەرزترین لوتکەش دەکەوێتە چیای تیان شان کە لوتکەی بۆبیدی ( ٧,٤٣٩ م ) دەبێت ودەکەوێتە سەر سنوورەکانی لەگەڵ ولاتی چیندا. نزیکەی ١٥ ٪ رووبەری ولاتیش لەدەشت ودۆڵەکان پێك دێت کە زۆرینەی دانیشتوانیشی لەخۆ گرتووە.

کۆچبەرەکانی باکووری ئاسیا لەپێش زایینەوە لەناوچەکەدا ژیاون، لەسەدەکانی شەشەم وحەوتەمدا خێڵە تورکەکان ناوچەکەیان داگیر کردووە. لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا سوپای ئیسلامەکان بەسەرکردایەتی قوتەیبەی کوڕی موسلیم گەیشتونەتە ناوچەکە وچەند شانشینێکیان والا کردووە، لەوانە فەرغانە وکاشغەر لە سالی ٩٤ ك / ٧١٢ ی ز. فەرغانە ئێستا شارێکە لە باشووری رۆژهەلاتی کیرجستان لەسەر سنوورەکانی لەگەڵ ئۆزبەکستاندا. لەسەدەی سیانزدەیەمدا مەغۆلەکان هێرشیان کردۆتە سەر . لەسالی ١٧٥٨ دا چینییەکان داگیریان کردووە. لەسالی ١٨٧٦ دا رووسیا دەسەلاتی خۆی گەیاندۆتە ناوچەکە وکردویەتییە هەرێمێکی رووسی. دوای دامەزراندنی یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٩٢ دا، کیرجستان بۆتە ناوچەیەکی سۆڤیەتی خاوەن ماف ئۆتۆنۆمی. لەسالی ١٩٣٦ دا هەرێمەکە بۆتە کۆمارێکی سۆڤیەتی لەژێر ناوی: کۆماری کیرجسیای سۆڤیەتی سۆسیالیستی.

لەسالی ١٩٩٠ دا کیرجستان کەوتە پەیڕەوکردنی یاسا تایبەتەکانی خۆی ویاسا سۆڤیەتییەکانی رەتکردەوە، ئەمە دوای بەرەو رمانی یەکێتی سۆڤیەت، لەبەرواری ٣١ / ٨ / ١٩٩١ کیرجستان سەربەخۆیی خۆی راگەیاند و عەسکەر ئەکادییڤ وەك سەرۆکی ولات دامەزرێنرا ولەهەمان سالدا پەیوەندی کردووە بە کۆمۆنۆلتی ولاتە سەربەخۆکان و بۆسالی دوایی بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، رۆژی ٣١ / ٨ ی هەموو سالێك جەژنی نیشتیمانی لە کیرجستان دەگێڕدرێت.

لە ٢٩ / ١٠ / ٢٠٠٠ دا هەلبژاردنە سەرۆکایەتییەکان لە کیرجستان بەڕێوە چوو، هەمان سەرۆکی پێشوو عەسکەر داییڤ سەرکەوتنی بەدەست هێنایەوە وبووەوە بەسەرۆکی کۆمار،

شایەنی باسە سەرۆکی لیژنەی هەڵبژاردنەکان بەو بۆنەوەیەوە وتبووی: عەسکەر دایڤ سەرۆك بوو بووە سەرۆکیش هەر بەسەرۆکیش دەمێنێتەوە گەل بڕیاری داوە.

کیرجستان دووچاری چەند کێشەیەکی ناوخۆ بۆتەوە، دانیشتوانی باشووری وڵات واهەست دەکەن کە باکوورییەکان دەسەڵاتی زۆربەی دەزگا حکومییەکانیان گرتۆتە دەست، عەسکەر دایڤییش بەردەوام لەهەوڵی نەهێشتنی ئەو دووبەرەکییەیە لەنێوان ریزەکانی گەلدا لەرێ دابەشکردنی دەسەڵاتەکان بەسەر دانیشتوانی باشوور وباکوور بەیەکسانی، چونکە نایەوێ وڵاتەکەی دووچاری ئەو شەڕە بێتەوە کەدوای سەربەخۆییەوە وڵات بەخۆوە بینیویەتی وبەسەدان هاوڵاتی بوونەتە قوربانی.

چالاکییە کشتوکاڵییەکان یەك لەسەر پێنجی داهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتەیان گرتۆتە خۆ، لەکاتێکدا پیشەسازی یەك لەسەر سێی ئەو داهاتەی گرتۆتە خۆ، بەلام مەڕومالات بەگرنگترین سەرچاوەی ئەو وڵاتە دادەنرێت. بەلام شکست هێنان لەجێبەجێ کردنی پلانە ئابوورییەکانی کیرجستان دانیشتوانی ئەو وڵاتەی کردۆتە هەژارترین گەلانی ئاسیای ناوەڕاست.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢,٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢٦ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٦١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣٨ .

## کیریباتی

**ناوی باو:** کیریباتی.

**ناوی فەرمی:** کۆماری کیریباتی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Kiribaty

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی یاسادانان ( ٤١ ئەندام ) .

**رووبەر:** ٣١٣ میل دووجا، ٨١١ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٨٢,٤٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١١٣,٥ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** نای کیرباتی ( گەلی کیرباتی )، تێکەڵە، گەلی تۆڤالۆ، ئەوروپی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت، مۆرمۆن ).

**زمان:** ئینگلیزی، جیلبەرتیزی.

**پایتەخت:** بیریکی ودەکەوێتە دورگەی تاراوا.

**شارە سەرەکییەکان:** تاراوا.

**دراو:** دۆلاری ئوسترالی.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما بەدرێژایی ساڵ ٢٧ پلە سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ٢٥٥ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** کۆبرا ( ناوکی گوێزی هیندی وشککراوە)، مۆز، بابای، قلقاس ، بەخێوکردنی بەراز، پەلەوەر، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** نییەتی.

**سامانی کانزایی:** فۆسفات، لەتەواو بووندایە.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

کیریباتی وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای زەریای هێمن بەرەو رۆژهەڵاتی وڵاتی بابوا غینیای نوێ. نزیکەی ٣٣ دورگە وڵاتیان پێك هێناوە ولەبوارێکی دەریاییدا بڵاوبونەتەوە بەرووبەری پێنج ملیۆن کم٢. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٧٤ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١ بەرەو باکوور.

دورگەکانیش ئەمانەن:

١. دورگەکانی جیلبرت ( ١٦ دورگە ).

٢. دورگەی بانابا.
٣. دورگەکانی لاین ( هەشت دورگە ).
٤. دورگەکانی فۆنێکس ( هەشت دورگە ).

تەواوی ئەو دورگانەش دەچنەوە سەر کۆمەڵە دورگەی میکرۆنیزیا.

زۆربەی دانیشتوانی دورگەکان دەچنەوە سەر ساموائییەکان کە لەسەدەی پانزەیەمدا دورگەکانیان داگیرکردووە. ئیسپانییەکانی لە سەدەی شانزەیەمدا دۆزیویانەتەوە. لەنەوەتەکانی سەدەی نۆزدەیەمدا، بەریتانیا دورگەکانی جیلبرت ودورگەکانی ئیلیسی دراوسێی داگیر کردووە. لەساڵی ١٩١٦ دا بەریتانییەکان ناویان ناوە داگیرکراوەی دورگەکانی جیلبرت وئیلیس ولەدواییدا چەند دورگەیەکی دیکەشی خستونەتە سەر. لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا هێزە یابانییەکان زۆربەی دورگەکانیان داگیر کردووە، بەڵام هێندەی نەخایاندووە هێزەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەیەکێك لەشەڕە خوێناوییەکاندا هێزە یابانییەکانیان تێك شکاندووە ودەسەڵاتی ناوچەکەی گرتۆتە دەست.

لەساڵی ١٩٧٥ دا دورگەکانی ئیلیس لە داگیرکراوەی دورگەکانی جیلبرت وئیلیس جیابۆتەوە وبەتەنها لەساڵی ١٩٧٨ دا بووە وڵاتی تۆڤالۆ.

لەبەرواری ١٢ / ٧ / ١٩٧٩ دا دورگەکانی دیکەش سەربەخۆ بوون وناو نراوە کیریباتی. لەساڵی ١٩٩٤ دا یەکەم هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی لەو وڵاتەدا ئەنجامدراوە. لە ٣٠ / ٦ / ١٩٩٩ دا پەیوەندی کردووە بەنەتەوە یەکگرتووەکانەوە.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وچین ویابان هەندێ لەدورگەکان بەکاردەهێنن وەك وێستگەیەك بۆ چاودێری هاویشتنی مووشەکە ئامانییەکان.

لەساڵی ١٩٥٧ دا بەریتانیا چەند تاقیکردنەوەیەکی ئەتۆمی لەناوچەکەدا ئەنجام داوە.

کیریباتی تا ئاستێ وڵاتێکی هەژارە، یارمەتی ئابووری لەهەر یەك لە ئوستورالیا وبەریتانیا ونیوزیلاندا وەردەگرێ، ئەمە جگە لە فرۆشتنی مافی راوەماسی بەهەر یەك لە یابان وکۆریای باشوور. فۆسفات یەکەم سەرچاوەی سروشتی دورگەی بانابا بوو، بەڵام لەم دواییانەدا خەریکە تەواو دەبێت وئەو سەرچاوەیەشی نامێنێت.

سروودی نیشتیمانی: هەستە ئەی کیریباتی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٥٦ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٨٩ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٧٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢٨.

## كینیا

**ناوی باو:** كینیا

**ناوی فەرمی:** كۆماری كینیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Kenya

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار خۆی سەرۆكی حكومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٠٢ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٢٢٤,٩٦١ میل دووجا، ٥٨٢,٦٤٦ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٨,٨٠٣,٠٠٠ كەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٤٩,٤ كەس/كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، هیندی ڕۆژهەڵاتی، ئەوروپی، عەرەب.

**ئـاین:** مەسـیحی ( ڕۆمـان كاسـۆلیك، پرۆتـستانت، ئەرتۆدۆكـسی ڕۆژهـەڵاتی)، چـەند بیروباوەڕێكی ناوخۆ، موسڵمان ٣٥ ٪ ی دانیشتوان.

**زمان:** سەواحیلی، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** نایرۆبی.

**شارە سەرەكییەكان:** مۆمباسا، كیسۆمۆ، ناكۆرۆ، ماشاكۆس.

**دراو:** شلنی كینی.

**ئاو وهەوا:** كەناری وڵات بەدرێژایی ساڵ گەرم وشێدارە وپلەكانی گەرما دەگەنە ٢٧ پلەی سەدی، ڕێـژەی سـاڵانەی بـاران دەگاتـە ١٠٠سم. ناوچەی دەشتەكانیش وشكە ونێوەندی پلەكانی گەرما ٢٧ پلەی سەدی دەبێت وبارانەكان كەمتر دەبنەوە ودەگاتە ٧٥ سم – ٢٥ سم. ناوچە ناوخۆییەكانیش زۆر بەپیتن، نێوەندی پلەكانی گەرما ١٩ پلە سەدی وڕێژەی ساڵانەی بارانەكان دەگاتە ١٠٠سم – ١٣٠ سم .

**بەرهەمــە كـشتوكاڵیەكان:** گـوێزی هینـدی، لۆكـە، قـاوە، چـا، دانەوێڵـە، داروتەختـە، گەنمەشامی، قامیشی شەكر، كونجی، بەخێوكردنی مەڕوماڵات، ڕاوەماسی، چاندنی قات ( ڕێی بەچاندنی گرتووە بەشێوەیەكی فەرمی).

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** چیمەنتۆ، پێڵاو، درووستكراوەكانی پێست.

**سامانی كانزایی:** مس، ئاڵتون، كاربۆناتی سۆدیۆم.

**تێڕوانینێكی گشتی:**

كینیـا وڵاتێكـە دەكەوێتـە سـەر كـەناری ڕۆژهـەڵاتی ئـەفریقیا، ئەسـیوپیا وسـودان دەكەونـە بـاكووری، سـۆماڵ وزەریـای هینـدی دەكەونـە ڕۆژهـەڵاتی، تـەنزانیا دەكەوێتـە باشـووری،

ئۆگەندا دەکەوێتە رۆژئاوای، کەنارێکی هەیە لەسەر دەریاچەی ڤیکتۆریا لە باشووری رۆژئاوا، لەباکووریش دەریاچەی تورکانا ( رۆدۆلف ) ی تێدەکەوێت. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣٨ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١ بەرەو باکوور.

دەشتە کەنارییە تەسکەکان بەدرێژایی کەناری زەریای هیندی درێژ دەبێتەوە و لەوانەوە زنجیرەیەك بانی بەرز بەرەو ناوخۆی وڵات دەکشێن ونزیکەی سێ لەسەر چواری رووبەری وڵاتیان گرتۆتەوە. بەڵام بەرزاییەکان دەکەونە باشووری رۆژئاوای وڵات وچیای کینیا ( بەرزترین چیای ئەو وڵاتەیە وبەرزییەکەی دەگاتە ٥١٩٩ م ) دەکەوێتە ئەو ناوچەیە ودووەم بەرزترین چیای ئەفریقیایە دوای چیای کلیمەنجرۆ لە تەنزانیا ( ٥٨٩٥ م )، هەردوو چیاش گڕکانین وبەفر وروباری بەستەڵەك دایپۆشیون.

لەسەدەی دەیەمی پ.ز مرۆڤ لەو ناوچەیەدا ژیاوە، ئاسەوارە مرۆییەکان لەو ناوچانەی دەوروبەری دەریاچەی ڤیکتۆریا دۆزراونەتەوە و مێژوویان دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی یەك ملیۆن ساڵ لەمەوبەر.

بازرگانە عەرەبەکان لەهەرێمە کەنارییەکانی لەسەدەی حەوتەمی زایینەوە ئاینی ئیسلامیان گەیاندۆتە ناوچەکە، دوای ئەوان بازرگانە هیندی وچینییەکان بەر لە گەیشتنی گەڕیدەی پۆرتۆگالی فاسکۆ دی گاما لە ساڵی ١٥٠٠ ز گەیشتونەتە هەرێمەکانی. لەناوەراستی سەدەی شانزدەیەمەوە پۆرتۆگالییەکان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا سەپاندووە ودوای ئەوان عەرەبەکان لەساڵی ١٧٤٠ دەسەڵاتی ناوچەکانیان گرتۆتەوە دەست. لەسەدەی نۆزدەیەمدا هەریەك لەبەریتانیا وئەڵمانیا لەسەر دەسەڵات گرتنە دەستی ناوچەکە بەشەڕ هاتوون، تا لەساڵی ١٨٩٥ دا بۆتە پارێزراوەیەکی بەریتانی. دوای جەنگی جیهانیی دووەم بزوتنەوەی ماو ماو لە وڵاتدا سەریهەڵداوە وداوای سەربەخۆیی وڵاتی کردووە.

لەبەرواری ١ / ٦ / ١٩٦٣ دا کینیا مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشرا ولە ١٢ / ١٢ / ١٩٦٣ دا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بوو و کۆمۆ کینیاتا بووە سەرۆکی وەزیرانی وڵات. لەبەرواری ١٢ / ١٢ / ١٩٦٤ دا کینیا بووە کۆمار و کینیاتا بووە سەرۆکی کۆمار. دوای ئەوەی لە ١٩٧٨ دا کۆچی دوایی کرد دانیال ئاراب مووی جێگری بووە سەرۆکی وڵات.

دوای سەربەخۆیی وڵات لە ١٩٦٣ دا، کێشە سنوورییەکان لەنێوان کینیا وسۆماڵ سەری هەڵدا وبەرەو شەڕێکی خوێناوی لەنێوانیاندا گەشەی کرد وتا ساڵی ١٩٦٧ ی خایاند.

کینیا کۆمەڵێ ئاژەڵی زۆری لەخۆ گرتووە، لەوانە جۆرەهای شێر وفیل وزەرافە وپڵنگ و وڵاخە کێوییەکان، حکومەت چەند پارێزراوەیەکی گەورەی لەوڵاتدا دروست کردووە بۆ پارێزگاری لێکردنیان، لەوانە ماسای مارا کەباشترین پارێزراوەی ئەو ئاژەڵانەیە لە کینیا

ورووبەرەکەی ١٦٧٢ کم$^2$ دەبێت، نزیکەی ٥٠٠ جۆر ئاژەڵ وباڵندەی بەهەموو جۆرەکانییەوە لەخۆ گرتووە، ئەمەش بۆتە هۆی راکێش کردنی ژمارەیەکی زۆری گەشتیاران بۆ ئەو وڵاتە وئەمەش خۆی لەخۆیدا داهاتێکی ئابووری باشی دابین کردووە، نزیکەی یەك لەسەر سێ داهاتی نەتەوەیی کینیای گرتۆتە خۆ.

ژمارەی دانیشتوانی کینیا بەرێژەی ٤ ٪ ساڵانە زیاد دەکات، ئەمەش بەبەرزترین رێژە دادەنرێت لەجیهاندا.

کینیا خاوەنی ئابوورییەکی زۆر لاوازە وتەواوی سەرچاوەکانیشی ماوەتەوە سەر کشتوکاڵی وگەشتوگوزار، بەڵام لەدوای ساڵی ١٩٩١ کۆمپانیا جیهانییەکانی نەوت دەستیان کردووە بەگەڕان بەدوای نەوتدا لەکینیا، لەساڵی ٢٠٠٢ دا نەوت لەو وڵاتەدا دۆزرایەوە ویەکەم کێڵگەی پترۆلی لە نایرۆبی پایتەختدا دەستی کرد بە بەرهەمی نەوت، واش چاوەروان دەکرێت ئابووری وڵات بەرەو باشتر بڕوات بەهۆی ئەم چالاکییانەی ئەم دواییانە.

بەپێی راپۆرتێکی وڵاتی کینیا ئاشکرا کراوە کە لەساڵی ٢٠٠١ دا چالاکیی باندەکانی مادده هۆشبەرەکان بەرەو زیاتر چووە، واش چاوەڕوان دەکرێ گەر بێت وحکومەت نەتوانێ ئاستێ بۆ بازرگانی کردن بەم ماددەیەوە دانێت ئەوا کینیا بێ گومان دەبێتە کۆلۆمبیای ئەفریقیا. لەنەوەتەکانی سەدەی پێشوودا رووبەری ئەو زەویانەی بۆ چاندنی مادده هۆشبەرەکانی وەك کۆکا وقەنب و خاشخاش تەرخان کراوە تا ئێستاش بەرەو زیاد بوون دەڕوات.

هۆکاری بڵاوبوونەوەی چاندنی ئەم ماددانە لە کینیا دەگەڕێتەوە بۆ بەرز بوونەوەی نرخی کاڵاو شتومەکەکان وبەرز بوونەوەی رێژەی بێکاری لەنێو ریزەکانی گەلی ئەو وڵاتەدا. بەپێی هەڵسەنگاندنی دەزگا داراییە نێودەوڵەتییەکان، کینیا بە پلەی دووەم دێت لە ئەفریقیا، دوای نێجیریا، لەرووی گەندەڵی نیدارییەوە.

کینیا بە پلەی چوارەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە چاندنی چا دوای هیند وچین وسریلانکا، بەپلەی پێنجەم دێت لە بەرهەمی قاوە وبەپلەی حەڤدەیەم دێت لە بەرهەمی داروتەختە.

سروودی نیشتیمانی: پەروەردگار، گەورەی هەموو گیانلەبەرانە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٦,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩١ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٦٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٧٠ .

## لاتڤیا

**ناوی باو:** لاتڤیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری لاتڤیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Latvia.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان ( ١٠٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ٢٤,٩٤٦ میل دووجا، ٦٤,٦١٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٤٧٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣٨,٣ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** لاتیڤی، رووس، رووسی سپی، پۆڵۆنی، ئۆکرانی، لیتوانی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، ئەرتۆدۆکسی رووسیا).

**زمان:** لاتیڤی.

**پایتەخت:** ریجا.

**شارە سەرەکییەکان:** دۆگافیبلس، لیباجا، جیلکافا، جۆرمالا.

**دراو:** لاتس.

**ئاو وهەوا:** نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ٧ پلەی ژێر سفری سەدی بۆ ٢ پلەی ژێر سفری سەدی. نێوەندی پلەکانی گەرما لەهاویندا لەنێوان ١٦ بۆ ١٨ پلەی سەدی دەبێت. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠ بۆ ٨٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، کەتان، شۆفان، پەتاتە، داروتەختە، چەوەندەر، بەخێوکردنی مانگا وبەراز.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئامێری کارەبایی، درووستکراوە خۆراکییەکان، درووستکردنی هۆیەکانی گواستنەوە.

**سامانی کانزایی:** ئاسن، دولۆمیت.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

لاتڤیا وڵاتێکە دەکەوێتە باکووری ئەورووپا لەسەر دەریای بەڵتیك، ئەستونیا دەکەوێتە باکووری، رووسیا دەکەوێتە رۆژهەلاتی، رووسیای سپی دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی، لیتوانیا دەکەوێتە باشووری، دەریای بەڵتیك دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر

یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٥ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥٥/٤٠ بەرەو باکوور.

لاتڤیا بە بەشێك لەو دەشتە کەنارییە گەورەیە دادەنرێت کە دەکەوێتە باکووری ئەورووپاوە. تەختی وڵات لە چەند بانێك پێك دێت کە بەرزاییەکانیان زۆر کەمن وچەند دەریاچە وزەلکاوێکی بچوکیشی لەخۆ گرتووە. گرنگترین ڕووباری ئەو وڵاتە ڕووباری دڤینایە وبەرزترین خاڵیشی دەگاتە ٨١٢ م .

لەنێوان سەدەکانی نۆیەم وهەشتەمی پ.ز خەڵکی لەناوچەکەدا نیشتەجێ بوون، لەدواییدا لەلایەن هەندێ لەداگیرکەرانەوە دەرکراونەتە دەرەوەی وڵات. ڤایکنجەکان لەسەدەی نۆیەمی زایینەوە داگیریان کردووە، ڕووسەکانیش چەند جارێك داگیریان کردۆتەوە ودەسەڵاتیان بەسەردا سەپاندووە. لەسەدەی سیانزدەیەمدا تیۆتۆنە ئەڵمانەکان داگیریان کردووە ولە سەدەی پانزدەیەمدا پۆڵۆنییەکان داگیریان کردووە. دوای ئەوە ڕووس وئەڵمانەکان هێرشیان کردۆتەوە سەر. یەکێتی سۆڤیەت لە ١٩٤٠ دا بەپێی ڕێکەوتنێکی نهێنی لەگەڵ هیتلەردا دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست، بەڵام دوای ئەوەی ئەڵمانیا جەنگی لەدژی سۆڤیەت ڕاگەیاند سەر لەنوێ داگیری کردەوە وڕووسەکانی کردە دەرەوەی وڵات. دوای کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم لە ١٩٤٥ دا، یەکێتی سۆڤیەت دەسەڵاتی خۆی بەسەر لاتڤیا سەپاندووە وکردویەتییە یەکێك لەکۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت.

لەسەرەتای ئەوەتەکانی سەدەی پێشوو ودوای ڕمانی یەکێتی سۆڤیەت، لاتڤیا لە ٢١ / ٨ / ١٩٩١ دا بەتەواوی سەربەخۆ بووە و لەبەرواری ١٧ / ٩ / ١٩٩١ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان. ئەندریس سکیکی لەساڵی ١٩٩٥ دا بۆتە سەرۆکی وڵات.

لە بەرواری ١٧ / ٦ / ١٩٩٩ دا ئەنجومەنی پەرلەمان خاتوو ڤیرافیکی ڤرایبیرگای بەسەرۆکی کۆمار هەڵبژاردووە، ئەمیش بەیەکەم ژن دادەنرێت لە ئەورووپای ڕۆژهەڵات پۆستی سەرۆك کۆمار بگرێتە دەست.

خاتوو ڤیرافیکی تەمەنی ٦١ ساڵە وخاوەنی بڕوانامەی دەروونناسییە وهەروەها ڕەگەزنامەی کەنەدیشی هەیە چونکە ماوەیەکی زۆر لەوڵاتی کەنەدا ژیاوە، هەڵبژاردنەوەی هەوڵێکە بۆ پەیوەندی کردنی وڵات بەیەکێتی ئەورووپا وهاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی.

بەپێی یاسای لاتڤیا، دەبێ تەواوی ئەوانەی بۆ پلەوپایەی سیاسی هەڵدەبژێردرێت زمانی لاتیڤی بزانن، بەڵام ئەمەش بۆتە هۆی دەربڕینی ناڕەزایی لەلایەن زۆربەی دانیشتوانەوە، چونکە بەبۆچوونی ئەوان پێشێل کردنی ماڧی ئەوانەیە کە زمانی ڕووسی دەزانن ونزیکەی یەك لەسەر سێی دانیشتوانی وڵاتیان پێك هێناوە.

لاتڤیا تەواوی سەرچاوەکانی ووزە لەوڵاتانی دراوسێوە دەکڕێ، جگە لە ووزەی کارەبا

نەبێت کە سەرچاوەکەی لەرووباری دڤیناوە دەستگیر دەبێت وچوار وێستگەی کارەبایی لەسەر درووست کردووە.

لاتڤیا هەمان ئەو کێشانەی وڵاتانی زووی یەکێتی سۆڤیەتی بەسەردا هاتووە لە هەڵگەڕانەوی ئابوورییەوە لە سیستەمی سۆسیالیستییەوە بۆ بازاڕی ئازاد.

گەلی لاتڤیا بە نووسینەوەی هۆنراوە بەناوبانگن لەنێو وڵاتانی ئەورووپادا، شیعر لەقۆناغە سەرەتاییەکانەوە دەخوێنرێ، لەسەر تەواوی ئەو کارتانەی بۆ ئاهەنگەکانی سەری ساڵ وجەژنە پیرۆزەکان ئاڵوگۆڕ دەکرێ نووسراوەتەوە، بە لاتڤییەکان دەوترێت نەتەوەی شیعر وهۆنراوە، خۆیان دەڵێن بۆ نووسین خوڵقاوین.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٥,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاک: ٢,٢٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٥ .

## لاوس

**ناوی باو:** لاوس.

**ناوی فەرمی:** کۆماری دیموکراسی گەلی لاوس

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Lao Peoples Democratic Republic (Laos).

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٨٥ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٩١,٤٢٩ میل دووجا، ٢٣٦,٨٠٠ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥,١١٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٢١,٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** لاو، خەمیری سوور، تای، لاوسۆنگ.

**ئاین:** بوودی، مەسیحی، موسڵمان.

**زمان:** لاو.

**پایتەخت:** ڤیانتیان

**شارە سەرەکییەکان:** ساڤانا خیت، لوانگ باربانج، لوانگ گرابانج، باکسی.

**دراو:** کیب.

**ئاو وهەوا:** بارانێکی زۆر لە وەرزی هاویندا مانگانە دەگاتە ٢٥ سم بەهۆی با وەرزییەکانی باشووری ڕۆژئاواوە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٨ پلەی سەدی دەبێت. لەوەرزی زستاندا ڕێژەی بارانەکان زۆر کەم دەبێتەوە ونێوەندی پلەکانی گەرما دەگاتە ٢١ پلەی سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** برنج، قاوە، گەنمەشامی، لۆکە، قامیشی شەکر، توتن، بەخێوکردنی مانگا، داروتەختە، هەروەها چاندنی ماددە هۆشبەرەکانیش وەك ئەفیون بەنهێنی ئەنجام دەدرێت.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** سیرامیك، ئاوریشم، دروستکراوەکانی پێست، دروستکراوەکانی زیو ومس، جگەرە.

**سامانی کانزایی:** تەنەکە، ئاڵتون، گەچ، قوڕقوشم، زیو، مس، ئاسن، یاقووتی شین، خەڵووز.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

لاوس وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا سەر بەو ناوچەیەی بە هیندی چینی

ناسـراوه، چـین دهكهوێتـه بـاكووری، ڤێتنـام دهكهوێتـه رۆژهـهڵاتی، كـهمبۆدیا دهكهوێتـه باشووری، تایلاند و بۆرما دهكهونه رۆژئاوای، هیچ كهنارێكی نییه، ناوهڕاستی دهكهوێته سهر یهكبڕی هێڵی درێژی ١٠٤ بهرهو رۆژههڵات لهگهڵ هێڵی پانی ١٩ بهرهو باكوور.

لاوس دهكهوێته سهر حهوزی روباری میكۆنگ، لهنێوان رووباری میكۆنگ وزنجیره چیای ئهنامیت لهباكوور. بهدرێژایی سنووره رۆژههڵاتییهكانی زنجیرهیهك بان وچیای سهخت درێژ دهبێتـهوه، بهرزییهكـهی لـهنێوان ١٥٠ – ١٢٠٠ م دهبێـت، بـهرزترین چـیا دهكهوێتـه ناوهڕاسـتیانهوه وبهرزییهكـهی دهگاتـه ٢٨١٧ م لهسـهر ئاسـتی رووی دهریـا، زهوییـه كشتوكاڵیهكانیش دهكهونه سهر رووباری میكۆنگ وزێیهكانی.

لهسـهدهی نۆیـهمی زایینـدا خـهڵكی گهیـشتونهته ناوچـهكه. لهسـاڵی ١٣٥٣ دا لـه یهكگرتنهوهی شانشینی: لان زانغ كه بهمانای ولاتی یهك ملیۆن فیل دێت لاوسی ئێستا دامـهزرێنرا. لهسـاڵی ١٧٠٠ دا سـێ شانـشینی جیـای لێكهوتـهوه. لهكۆتاییـهكانی سـهدهی نۆزدهیهمدا فهرهنسا كردییه یهكێك له پارێزراوهكانی و وهك بهشێك له هیندی چینی حوكمی كردووه.

دوای رووخانی فهرهنسا له سهرهتای جهنگی جیهانیی دووهم له ١٩٤٠ دا، یابانییـهكان لـهرووی حكومـهتی فیـشییهوه دهسـهڵاتی ناوچـهكهیان گرتـه دهسـت ولـه ئـازاری ١٩٤٥ دا سهربهخۆیی ناوچهكهیان راگهیاند. بهڵام پاش كۆتایی جهنگ و دۆڕانی یابان سهر لهنوێ فهرهنسا دهسهڵاتی ناوچهكهی گرتهوه دهست. لهساڵی ١٩٤٦ دا فهرهنسا دانینا به لاوسی یهكگرتوو لهژێر دهسهڵاتی شا لوانگ برابانگ و لهساڵی ١٩٤٩ دا دهستووری ولات راگهیهنرا وسهربهخۆییهكی دیاری كراو بهلاوس بهخشرا لهچوارچێوهی یهكێتی فهرهنسا.

له سهرهتاكانی ساڵی ١٩٥٠، لاوس شان بهشانی ڤێتنام جهنگی لهدژی فهرهنسا راگهیاند.

لهكۆنگرهی جنێڤی ساڵی ١٩٤٩، بڕیاردرا ولاتی لاوس دابمهزرێت بهو پێیهی ولاتێكی بێ لایهنه لهنێوان ڤێتنامی باكووری شیوعی وتایلاندی نا شیوعی. له ٢ / ١٢ / ١٩٥٤ دا ولاتی سهربهخۆی لاوس دامهزرا وبۆ ساڵی داهاتوو بووه ئهندام له نهتهوه یهكگرتوهكاندا، چهند حكومهتێك لهنێوان ساڵهكانی ١٩٥٤ و ١٩٦٠ دا بهدوای یهكدا هاتن.

بـهڵام شـهڕی نـاوخۆ لـهنێوان چـهند كۆمهڵهیـهكی یـاوهری رۆژئـاوا ویـاوهری شـیوعییهكان هەڵگیرسا. تا لهكۆنگرهی جنێڤی سـاڵی ١٩٦٢ بڕیـار بهدامهزراندنی حكومـهتێكی یـهكگرتوو لـه لاوس درا وتـهواوی هێـزه بیانییـهكان ولاتیـان بـهجێ هێـشت. بـهڵام سـهرلهنوێ شـهڕ هەڵگیرسایهوه، تا لهساڵی ١٩٧٣ تهواوی لایهنه بهشهڕ هاتوهكان ئاگر بهستیان راگهیاند.

دوای كۆتایی شهڕی ڤێتنام لهساڵی ١٩٧٥ دا وروخانی ڤێتنـامی باشووری وسـهركهوتنی

شیوعییەکان، لەهەمان کاتدا دەسەلاتی کەمبۆدیاشیان گرتە دەست، شای لاوس لە ١٩٧٥ دا دەستی لە دەسەلاتەکانی کێشایەوە وشیوعییەکان دەسەلاتی لاوسیان گرتە دەست. لاوس بووە ولاتێکی شیوعی لەژێر ناوی: کۆماری دیموکراسی گەلی لاوس و سۆڤانۆ فۆنگ ( میری سوور ) پۆستی سەرۆکی کۆماری گرتە دەست، بەلام نزیکەی ٥٠,٠٠٠ هاولاتی بەرەو تایلاند هەلهاتن ولەترسی ستەمی شیوعییەکان ولاتیان بەجێ هێشت.

لە سالی ١٩٩١ دا کایسۆن فۆمیڤان بووە سەرۆکی ولات، بەلام بۆ سالی دوایی کۆچی دوایی کرد و نۆهاك فۆمساڤان دەسەلاتی گرتە دەست، تا لەسالی ١٩٩٦ دا جەنەرالْ کامتای سیڤاندۆن بووە سەرۆکی ولات.

لاوس خاوەنی ئابوورییەکی پاشکەوتووە، هیچ گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە نەبینییوە، لەسالی ١٩٨٦ دا حکومەت دەستی کردووە بەرێکخستنەوەی پلانە ئابوورییەکانی بۆ باشتر کردنی ئابووری ولات، هەروەها دەستی کرد بە هاندانی چالاکییە گشتوگوزارییەکان بەهۆی بوونی ژمارەیەکی زۆری پەرستگای بوودی وئاسەوارە دێرینەکان.

جەژنی نیشتیمانی: ٢/ ١٢ ی هەموو سالێك، رۆژی سەربەخۆیی ولات لەسالی ١٩٥٤ .

سروودی نیشتیمانی: گەلی لاو پارێزگاری لەخاکی باو وباپیرانی دەکات.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ١,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٤٢ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٣٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٦٤

## لوبنان

ناوی باو: لوبنان

ناوی فەرمی: کۆماری لوبنان

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Lebanon

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نوێنەرایەتی ( ١٢٨ ئەندام ).

ڕووبەر: ٣,٩٥٠ میل دووجا، ١٠,٢٣٠ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٤,٠٠٥,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ٣٩١,٤ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: عەرەب، ئەرمەن، کورد.

ئاین: موسڵمان ٦٢ ٪ ، مەسیحی.

زمان: عەرەبی.

پایتەخت: بەیروت.

شارە سەرەکییەکان: تەرابلوس، سەیدا، سوور، بەعلەبەك، زەحلە، جبێل.

دراو: لیرەی لوبنانی.

ئاو وهەوا: زستانی مام ناوەند وکورتە، نێوەندی پلەکانی گەرما دەگاتە ١٣ پلەی سەدی وڕێژەی ساڵانەی بارانەکانیش ١٥٠ سم دەبارێت وبەفریش لە بەرزاییەکاندا دەبارێت، هاوینی فێنکە ودرێژە دەخایەنێت، نێوەندی پلەکانی گەرما دەگاتە ٢٩ پلەی سەدی دەبێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: میوە وسەوزە، زەیتون، گەنم، چەوەندەری شەکر، بستەی عەبید، جۆ.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: درووستکراوە خۆراکییەکان، بەرهەمەکانی داروتەختە، جگەرە، چیمەنتۆ، چاپ وبڵاوکردنەوە.

سامانی کانزایی: ئاسن، مس، ئیسفەلت، فۆسفات.

تێڕوانینێکی گشتی:

لوبنان وڵاتێکی عەرەبیە وئەندامە لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئاسیا، سوریا دەکەوێتە باکوور وڕۆژهەڵاتی، فەلەستین دەکەوێتە باشووری، دەریای سپی ناوەڕاست دەکەوێتە ڕۆژئاوای، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣٦ بەرەو

ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٣٤ بەرەو باکوور.

دەشتە کەنارییە تەسکەکانی لەشێوەی شریتێك بەدرێژایی دەریا لەنێوان چیا ڕۆژئاواکانی لوبنان ودەریای سپی ناوەڕاست درێژ دەبێتەوە وتەواوی ناوچەکەش بۆ کشتوکاڵی بەگەڕ خراوە. دوو زنجیرە چیاش دەکەونە ڕۆژهەڵاتی دەشتە کەنارییەکانەوە، ئەوانیش: زنجیرە چیا ڕۆژئاواکانی لوبنان وزنجیرە چیا ڕۆژهەڵاتییەکانی لوبنان. کۆمەڵە دەشتەکانی ناوەڕاستیش دەکەونە نێوان هەردوو زنجیرە چیای ناوبراوەوە و دەشتی بیقاعیش گرنگترینی ئەو دەشتانەیە وسەر بە زەوییە سورییەکانە. هەروەها ڕوباری لیتانیش لەباشووری ئەو دەشتانە تێپەڕ دەبێت ودەڕژێتە دەریای سپی ناوەڕاستەوە، هەروەها ڕوباری عاسیش بەرەو باکوور تێدەپەڕێت ودەچێتە ناو زەوییە سورییەکانەوە.

وشەی لوبنان بەڕەچەڵەك وشەیەکی فینیقییە وبەمانای سپیایی دێت بەهۆی بوونی بەفر لەسەر لوتکەی چیاکانی ئەو وڵاتە. هەندێکی کەش دەڵێن وشەی لوبنان وشەیەکی عەرەبییە وبەمانای بخوور دێت بەهۆی بوونی کۆمەڵێ داری بخوور لەچیاکانی ئەو وڵاتە، هەروەها لەکتێبە کۆنەکاندا لوبنان بە چیای بخوور ناوبراوە.

فینیقییەکان یەکەم دانیشتوانی ناوچەکە بوون، دوای ئەوەی لە دوورگەی عەرەبەوە بەرەو کەناری سوری کۆچیان کردووە. فارسەکان لەساڵی ٥٣٨ پ.ز والآیان کردووە، ئەسکەندەری مەگدۆنیش لەساڵی ٣٣٣ پ .ز والآی کردووە، ڕۆمانەکان لەساڵی ٦٤ پ.ز گەیشتونەتە ناوچەکە و والآیان کردووە. عەرەب وموسڵمانەکان لەساڵی ٦٣٥ ز ، تورکە عوسمانییەکان لەساڵی ١٥١٦ . لە سەردەمی فەخرەلدین مەعنی دووەمدا ١٥٩٠ – ١٦٣٤ سنوورەکانی لوبنان بەرفراوانییەکی گەورەی بەخۆوە بینیوە، دوای ڕوخانی میر بەشیر شەهابی دووەم وڵات دووچاری بەربەرکانییەکی تاییفی زۆر گەورە بووە لە ساڵی ١٨٦٠ دا گەیشتۆتە ئەو پەڕی، وڵاتە گەورەکان خۆیان تێهەڵقورتاندووە بۆ کۆتایی هێنان بەکێشەکان. لەساڵی ١٨٦٤ دا لەچوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی سەربەخۆیی ناوخۆی پێبەخشراوە.

١٩١٨ : کۆتایی هاتنی دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی لە لوبنان وگەیشتنی هێزە فەرەنسییەکان لەکۆتایی ئەو ساڵەدا.

١ / ٩ / ١٩٢٠ : جەنەراڵ گۆرۆ دەوڵەتی لوبنانی گەورە ڕادەگەیەنێ دوای ئەوەی بەیروت وسەیدا وسوور وتەرابلوس وبیقاع وبەعلەبەك وحاسیبا وراشیا ومەرجەعیۆنیشی دەخاتە سەر.

١٩٢١ : ڕاگەیاندنی ئینتیدابی فەرەنسی بەسەر لوبناندا.

٢٣ / ٥ / ١٩٢٦ لەژێر فشاری هێزی بەرەنگاری نیشتیمانی لە لوبنان وسوریا کۆماری

لوبنـــان راگەیـــەنرا وشـــارل دەبـــاس بەیەکـــەم ســـەرۆکی کۆمـــاری نـــوێ هەڵدەبـــژێردرێ، بەراگەیاندنی کۆماری ئینتیدابی فەرەنسی کۆتایی پێ دێت.

١٩٣٣: حەبیب پاشا ئەسعەد دەبێتە سەرۆکی وڵات.

١٩٣٦ : لوبنان وفەرەنسا رێکەوتننامەی هاوپەیمانی لەنێوانیاندا واژۆ دەکەن.

٢٧ / ٩ / ١٩٤١ راگەیاندنی سەربەخۆیی لوبنان وسوریا.

٢١ / ٩ / ١٩٤٣ هەڵبژاردنی شێخ بەشارە ئەلخووری بەسەرۆکی کۆماری لوبنان.

٢٢ / ١١ / ١٩٤٣ : ئـازاد کردنـی شـێخ بەشـارە ئـەلخووری، ( لـەوەو پـێش لەلایـەن فەرنسییەکانەوە دەستگیر کرابوو لەسـەر راگەیانـدنی راسـتکردنەوەی دەسـتووری وڵات )، پاش راپەرینێکی جەماوەری ودەستکردنەوە بە کارپێکردنی دەستووری نوێ، لوبنانییەکان لەم رۆژەدا ئاهەنگی جەژنی نیشتیمانی دەگێرن.

٣١ / ١٢ / ١٩٤٦ بەجێ هێشتنی دوایین سەربازی فەرەنسی بۆ خاکی لوبنـان پـاش هەشـت مانگ لەچۆڵ کردنی سوریا لەهێزە فەرەنسییەکان.

١٩٤٥ : لوبنان دەبێتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

١٩٤٨ : بەشداریِ کردنی هێزەکانی سوپای لوبنان لەجەنگی عەرەبی ئیسرائیلدا.

١٩٥٢ : کەمیل شەمعون دەبێتە سەرۆکی لوبنان، پاش ئەوەی بەشارە ئەلخووری دەست لەدەسەڵات دەکێشێتەوە، بەمەش شەمعون دەبێتە دووەم سەرۆکی وڵات دوای سەربەخۆیی.

١٩٥٨ : ئەلعیماد فوئاد شەهاب دەبێتە سەرۆکی لوبنـان، ئەویش یەکەم سەرۆکی سوپای لوبنانە.

١٩٦٤ : شارل ئەلحلوو دەبێتە سەرۆکی لوبنان.

١٩٧٠ : هەڵبژاردنی سولەیمان فەرەنجییە بەسەرۆکی وڵات.

١٣ / ٤ / ١٩٧٥ سەرەتای هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆی ئەو وڵاتە.

١٩٧٦ : ئیلیاس سەرکیس، لە دووەم ساڵی شەڕی ناوخۆ دەبێتـە سـەرۆکی لوبنـان، هاتنـە ناوەوەی سوپای سوریا بەناوی ناوبژیوانی شەرشی ناوخۆ.

١٩٧٨ : هێـرش کردنـی سـوپای ئیسرائیل بـۆ باشـووری لوبنـان وداگیر کردنـی بەشـێکی باشوور.

١٩٨٢ : هێرشـی دووەمـی سـوپای ئیسرائیل بـۆ لوبنـان و هەڵبـژاردنی بەشـیر ئەلجـەمیل بەسەرۆکی لوبنـان، تـیرۆر کردنـی بەشیر دوای سێ هەفتـە لەهەڵبـژاردنی وهەڵبـژاردنی برای گەورەی بەشیر، ئەمین ئەلجەمیل بەسەرۆکی وڵات.

١٩٨٨ : هەڵبـــژاردنی رێـــنێ موعـــەوەز بەســـەرۆکی وڵاتـــی لوبنـــان، تـــیرۆر کردنـــی بـــە

تەقاندنەوەی ئۆتۆمبێلێكی مین ڕێژكراو لە ئاهەنگی یادی سەربەخۆیی ولاتدا لە ٢٢ / ١١ / ١٩٨٨ .

١٩٨٨ : دوای دوو ڕۆژ لە تیرۆر كردنی موعەوەز، ئیلیاس ئەلهەڕاوی بەسەرۆكی ولات هەڵدەبژێردرێ.

٢٢ / ١٠ / ١٩٨٩ : زۆربەی لایەنە بەشەڕ هاتوەكانی لوبنان لە تائیفی شانشینی سعودییە واژۆی ڕێكەوتننامەیەك دەكەن بۆ كۆتایی هێنان بەشەڕی ناوخۆی لوبنان.

٣٠ / ١١ / ١٩٩١ : لوبنان بەشداری لە كۆنگرەی ئاشتی مەدرید دەكات، لەگەڵ ولاتە عەرەبییەكاندا بۆ تاوتوێ كردنی كێشەی نێوان عەرەب – ئیسرائیل.

١٩٩٣ : سێیەمین هێرشی ئیسرائیل بۆ سەر باشووری لوبنان.

١٩٩٥ : درێژكردنەوەی ماوەی سەرۆكایەتی ئەلیاس ئەلهەڕاوی بۆ سێ ساڵی دیكەش.

١٩٩٦ : چوارەم هێرشی هێزەكای ئیسرائیل بۆ سەر باشووری لوبنان.

١٥ / ١٠ / ١٩٩٨ : هەڵبژاردنی عیماد ئیمیل لەحوود، دووەم سەرۆكی سوپای لوبنانیە دەسەلاتی ولات بگرێتە دەست دوای فوئاد شەهاب.

٣ / ٦ / ١٩٩٩ كشانەوەی میلیشیاكانی ئیسرائیل لە لوبنان وگەڕانەوەی شارەكانی جزین وگوندەكانی چوار دەوری بۆ سەر لوبنان.

لوبنان خاوەنی هیچ سامانێكی كانزایی وپیشەسازییەكی سەرەكی نییە، بەلام چالاكییە گەشتوگوزارییەكان بە سەرچاوەیەكی دەوڵەمەندی ئەو ولاتە دادەنرێت، دەكرێت بڵێین لوبنان ولاتێكی گەشتوگوزارە بەهۆی جوانی سروشتی ناوچەكانی، تەنانەت بە پاریسی ڕۆژهەلات ناودەبرێ.

سروودی نیشتیمانی: هەموومان بۆ نیشتیمانین.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢,٩ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٢٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢,١٠٧ دۆلاریئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٨٠ .

## لیتوانیا

**ناوی باو:** لیتوانیا

**ناوی فەرمی:** كۆماری لیتوانیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Lithuania

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان ( ١٤١ ئەندام ).

**رووبەر:** ٢٥,٢١٣ میل دووجا، ٦٥,٣٠١ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣,٧٠٦,٠٠٠ كەس تا ( ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥٦,٨ كەس/كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** لیتوانی، رووس، پۆڵۆنی، رووسی سپی، ئۆكرانی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان كاسۆلیك، ئەرتۆدۆكسی رووس ).

**زمان:** لیتوانی.

**پایتەخت:** ڤیلنۆس.

**شارە سەرەكییەكان:** كۆناس، كلیبیدا.

**دراو:** لیتاس.

**ئاو وهەوا:** زستانی زۆر سارد وسەختە، مام ناوەندە لەهاویندا، رێژەی ساڵانەی بارانەكان لەنێوان ٣٥سم بۆ ٨٦ سم دەبارێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** شیرەمەنی، گۆشت، چەوەندەر، جۆ، داروتەختە، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** دروستكراوە كیمیاییەكان، ئامێری كارەبایی وئەلیكترۆنی، ئامێری كشتوكاڵی، چنین.

**سامانی كانزایی:** گەچ، لم، بەردی پیرۆز، بەردی كەهرەمان ( بەرزی كارەبا یان بەردی زەردویی ).

**تێڕوانینێكی گشتی:**

لیتوانیا وڵاتێكە دەكەوێتە باكووری رۆژهەڵاتی ئەوروپا لەسەر كەناری رۆژهەڵاتی دەریای بەڵتیك، لاتیڤیا دەكەوێتە باكووری، رووسیای سپی دەكەوێتە رۆژهەڵات و باشووری رۆژهەڵاتی، پۆڵۆنیا وناوچەی كالینینگرادی رووسی دەكەونە باشووری، دەریای بەڵتیكیش دەكەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر هێڵی درێژی ٢٣ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٥٦ بەرەو باكوور.

رووی ولأت تەختاییەکی بەشێوەیەکی گشتی پێوە دیارە، بەرزترین خاڵەکانی دەکەونە باشووری رۆژهەلأت، زەوییەکانیشی بەرەو رووی نزمایییەکانی ناوەڕاستی ولأت لێژ دەبنەوە وبەرەو رۆژئاواش تا ئاستێ بەرز دەبنەوە. بەدرێژایی کەناری سەر دەریای بەڵتیك چەند شریتێك لە بەرزاییەکی بەلم داپۆشراو ناوی دەریا لەناوی دەریاچە ناوخۆییەکان کە ژمارەیان دەگاتە سێ هەزار دەریاچە جیا دەکاتەوە. دارستانەکانیش نزیکەی یەك لەسەر چواری رووبەری ولأت دادەپۆشن. روباری تیمان کە لە رووسیای سپییەوە هەڵدەقوڵێت وبەنێو خاکی لیتوانیادا تێپەڕێت وزۆربەی سەرچاوەکانی ئاوی ئەو ولأتەی گرتۆتە خۆ ودەرژێتە ناو دەریای بەڵتیکەوە بەدرێژترین روبارەکانی لیتوانیا دادەنرێت.

وەکو زانراوە ناوی لیتوانیا لە رووباری لیتوانیا یان رووباری لیتۆکاوە هاتووە کەزێیەکی بچوکی رووباری نیریسە وبەدرێژایی ٢٥ کم بەناوشاری کیرناڤ بچوکدا تێپەڕ دەبێت، شایەنی باسە شاری کیرناڤ سەنتەرێکی گرنگی لیتوانیا بوو، هەروەها دەڵێن ناوی لیتوانیا بەزمانی لیتوانی کۆن بەمانای باران دێت وئەم ناوەی بەهۆی بارانە زۆرەکانی ئەو ولأتەوە لێنراوە.

بەر لەهەشت هەزار ساڵ لەمەو پێش مرۆڤ لەو ناوچەیەدا ژیاوە. لەسەدەی پانزدەیەمدا نەتەوەی لیتوانی لەناوچەکەدا یەکیان گرتەوە. لەماوەی سەدەی چواردەیەمدا سنوورەکانی لیتوانیا گەیشتە مۆسکۆ ورۆژهەلأتی دەریای رەش. لیتوانیا وپۆڵۆنیا لەساڵی ١٣٨٦ دا یەکیان گرت، ئەم یەکگرتنەیان زۆری نەخایاند، چونکە قەیسەری رووسیا لیتوانیای تاساڵی ١٧٩٥ خستە ژێر دەسەلأتی خۆیەوە. بەلأم گەلی لیتوانیا چەند راپەڕین وشۆڕشیان لەدژ هەڵگیرسان ولەساڵی ١٩٠٥ دا داوای ماڤی ئۆتۆنۆمیان کرد، بەلأم قەیسەر داواکارییەکانیانی رەتکردەوە. لیتوانیا دوای جەنگی جیهانیی یەکەم سەربەخۆ بوو، رووسەکان هەوڵی زۆریان دا بیگرنەوە دەست بەلأم نەیان توانی. پۆڵۆنیا لەساڵی ١٩٢٠ دا داگیری کرد. رێکەوتننەکانی نێوان رووس وئەڵمانەکان لەساڵی ١٩٣٩ داحوکمی رەهای بەتەواوی هەرێمەکانی سەر دەریای بەڵتیکی بەخشیبوو بە رووسیا، بۆیە لیتوانیا لەساڵی ١٩٤٠ دا بووە کۆمارێکی سۆڤیەتی، بەلأم ئەڵمانەکان لەجەنگی جیهانیی دووەمدا داگیریان کرد، دوای جەنگ لیتوانیا کەوتەوە دەست رووسیا.

وەك تەواوی کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت، لەکۆتاییەکانی ١٩٨٩ دا لیتوانیا داوای سەربەخۆییەکی تەواوی لەیەکێتی سۆڤیەت کرد. لەگەڵ ئەوەی یەکێتی سۆڤیەت فشارێکی ئابووری گەورەی خستە سەر لیتوانیا، بەلأم لەبەرواری ١١ / ٣ / ١٩٩٠ دا پەرلەمانی لیتوانیا سەربەخۆیی ولأتی راگەیاند وڤیتۆتاس لاندسبیرجیس بووە سەرۆکی ولأت، هێزە

سۆڤیەتییەکان بۆ سەرکووت کردنی بزوتنەوەی سەربەخۆیی لیتوانیا هێرشیان کردە سەر وڵاتی ناوبراو و لەبەرواری ١٣ / ١ / ١٩٩١ لەکاتی هێرشکردنە سەر وێستگەی تەلەفزیۆنی لیتوانیا پێکدادانێکی گەورە لەنێوان هێزە لیتوانی وسۆڤیەتییەکان رووی دا وژمارەیەك هاوڵاتی بوونە قوربانی، رۆژی ١٣ / ١ بە پشووی فەرمی دادەنرێت وەك رێزلێنانێکی یادی شەهیدانی رێگای رزگاری لیتوانیا. لە ١٦ / ٢ / ١٩٩١ زۆرینەی لیتوانییەکان دەنگیان بەسەربەخۆیی وڵاتەکەیان دا لەیەکێتی سۆڤیەت، لەمانگی نۆی ١٩٩١ دا یەکێتی سۆڤیەت دانی بە سەربەخۆیی لیتوانیا دا ولەهەمان ساڵدا بووە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەسەرەتاکانی ١٩٩٣ دوایین هێزەکانی رووسیا لیتوانیایان بەجێ هێشت، بەڵام وڵات دووچاری بێکاری وگرانییەکی زۆری نرخی کاڵاکان وکەمی جۆرەکانی ووزە بووەوە، تا لەساڵی ١٩٩٣ دا ئەلیگاردیس برازۆسکاس لەبری ڤیتۆتاس بووە سەرۆکی وڵات ودوای ئەو لەساڵی ١٩٩٧ دا فالداس ئادامۆکس پۆستی سەرۆکی وڵاتی گرتە دەست.

گەلی لیتوانیا بەر لەوەی وڵاتەکەیان بخرێتە سەر یەکێتی سۆڤیەت میللەتێکی کشتوکاڵی بوون، نزیکەی یەك لەسەر سێی میللەت لەنێو گوندەکاندا دەژیان، بەڵام دوای ئەوەی بوونە کۆمارێك لەیەکێتی سۆڤیەتدا، وڵات رووی کردە چالاکییە پیشەسازییەکان وخەڵکی لەگوندەکانەوە روویان کردە شار وشارۆچکەکان بەتایبەتی دوای ئەوەی حکومەت تەواوی زەوییە کشتوکاڵیەکانی کردە کێڵگەی حکومی ودەستی بەسەردا گرت.

سروودی نیشتیمانی: لیتوانی وڵاتی باپیران.

جەژنی نیشتیمانی: ١١ / ٣ ، ١٦ / ٢ ، یادی راگەیاندنی سەربەخۆیی وڵات لە ١٩٩٠ و ١٩٩١

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩٩ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٣٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩٩ .

## لختنشتاین

**ناوی باو:** لختنشتاین.

**ناوی فەرمی:** میرنشینی لختنشتاین.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Principality of Liechtenstein

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، میر ، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان ( ٢٥ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٦٢ میل دووجا، ١٦٠ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣١,٣٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٩٥,٧ کەس/کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەڵمان، ئیتالی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ).

**زمان:** ئەڵمانی.

**پایتەخت:** فادۆز.

**شارە سەرەکییەکان:** ئێستشن، تریسن.

**دراو:** فرانکی سویسری.

**ئاو وهەوا:** مام ناوەندی، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ٨ پلەی سەدی ولەهاویندا ٢٠ بۆ ٢٨ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٩٠ سم بۆ ١٢٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** بەخێوکردنی مەڕوماڵات، سەوزە ومیوە، گەنمەشامی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** سیرامیك، چنین، دروستکردنی شەراب ، کەلوپەلی ناوماڵ، دەرمان، دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

لختنشتاین وڵاتێکی بچوکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەورووپا، نەمسا دەکەوێتە رۆژهەلاتی، سویسراش لەهەموو لاکانی تریەوە لەگەڵیدا سنووردارە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٩/٣٥ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٧/٨ بەرەو باکوور.

رووباری راین بە سنوورە رۆژئاواکانی لختنشتاین تێپەڕ دەبێت وزەوییە بەپیتەکانیش دەکەونە ئەو ناوچەیە تەواوی کراوەتە ناوچەیەکی کشتوکاڵی، بەڵام چیا بەرزەکان دەکەونە ناوچەکانی رۆژهەلات وباشووری وڵات وبەدارستانێکی زۆر داپۆشراون وبەفر لووتکەکانی گرتۆتەوە.

لەکۆتاییەکانی سەدەی هەشتەمی زاییندا، شارلی شای ئەفرەنجەکان ناوچەکەی خستە ژێر دەسەلاتی خۆیەوە، دوای کۆچی دوایی شارل لەسەرەتای سەدەی نۆیەمدا، ناوچەکە کرا بە وڵاتی سەربەخۆوە: ڤادۆز و شیلنبێرگ کە لەدواییدا بوونە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی

رۆمانی پیرۆز. لەساڵی ١٦٩٩ دا میرێکی خەڵکی ڤیێنا بەناوی یۆهان ئادەم توانی دەسەڵاتی شیلنبێرگ بگرێتە دەست، لەساڵی ١٧١٢ دا ڤادۆزیشی داگیر کرد، تا ئێستاش نەوەکانی حوکمی میرنشینی لیختنشتاین دەکەن.

لیختنشتاین ساڵی ١٧١٩ بەدواوە وڵاتێکی سەربەخۆ بوو، جگە لەماوەیەکی کەم نەبێت لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەم نەبێت، کە ئیمپراتۆری فەرەنسا ناپلیۆن داگیری کرد. لەساڵی ١٨١٥ دا پەیوەندی کرد بە یەکێتی ئەڵمانیی ( یەکێتییەکی حاکمە ئەڵمانەکان بوو ) لەگەڵ پاراستنی سەروەری خۆی. بەڵام لەکۆتایی جەنگی حەوت هەفتەی ساڵی ١٨٦٦ یەکێتی ناوبراو هەڵوەشایەوە، ئەمەش دوایین جەنگی بوو میرنشینی لیختنشتاین بەشداری تیابکات ولەو سەردەمەوە پارێزگاری لە بێلایەنی خۆی دەکات چونکە سوپای نییە. لەساڵی ١٨٥٢ تا ساڵی ١٩١٨ لەگەڵ نەمسادا لەرووی ئابوورییەوە یەکیان گرت. لەساڵی ١٩٢٤ لەگەڵ سویسرادا رێکەوتننامەیەکی ئابوورییان واژۆ کردووە. لە بەرواری ١٨ / ٩ / ١٩٩٠ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان و ساڵی ١٩٩٥ دا پەیوەندی کردووە بە یەکێتی بازرگانی ئازادی ئەوروپییەوە.

لە دەستووری ساڵی ١٩٢١ ی لیختنشتایندا هاتووە: لیختنشتاین وڵاتێکی شانشینە لەسەر بنەمای دیموکراسی وپەرلەمانی ودەسەڵاتی وڵات بەدەست میری وڵاتە. میر خاوەنی دەسەڵاتێکی بەرفراوانە، میر خاوەنی یەکەم ودوایین وشەیە لەهەر یاسایەکدا بێت، ئەتوانێ پەرلەمان هەڵوەشێنێ وبانگهێشتی هەڵبژاردنی پێش وەخت بکات، بەڵام لەهەمان کاتدا بەکۆکردنەوەی ١٥٠٠ واژۆ گەلی لیختنشتاین دەتوانن هەڵبژاردن ئەنجام بدەن.

لەساڵی ١٩٣٨ دا میر فرانس جۆزێف دەسەڵاتی گرتە دەست، دوای کۆچی دوایی فرانس لە مانگی یانزدەی ١٩٨٩ دا میر هانز ئادەمی دووەمی کوڕە گەورەکەی دەسەڵاتی گرتە دەست. جەژنی نیشتیمانی وڵات لە رۆژی ١٥ / ٨ ی هەموو ساڵێکە، بەپێی دابونەریتی ئەو وڵاتە تەواوی میللەت لەنێو قەڵای میردا کۆدەبنەوە وئاهەنگێکی گەورە دەگێڕن.

لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، میرنشینی لیختشتاین لەوڵاتێکی کشتوکاڵییەوە بووە وڵاتێکی پیشەسازی، گەلی ئەو وڵاتەش خاوەنی ئاستی ژیانێکی زۆر بەرزن. دەوڵەمەندی ئەو وڵاتە دەگەڕێتەوە بۆ بەشداری کردنی ٥٧٪ ی هێزی کار لە کەرتی پیشەسازی وڵاتدا، لەچاو ئەو رووبەرە کەمەی ئەو وڵاتە نزیکەی ٧٠,٠٠٠ کۆمپانیای جۆراوجۆری لەخۆ گرتووە وباجەکانیشیان زۆر کەمە. ئەمە جگە لە چالاکییە گەشتوگوزارییەکان، ساڵانە زیاد لە ٦٢,٠٠٠ گەشتیار روودەکەنە ئەو وڵاتە بەهۆی جوانی سروشتی وڵات وئەو لوتکانەی تا کۆتایی وەرزی هاوینیش بەفر گرتوویەتی و یارییەکانی سەهۆڵی تیائەنجام دەدرێت.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٩٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاک: ٣١,٠٠٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٤ .

## لۆکسمبۆرگ

**ناوی باو:** لۆکسمبۆرگ

**ناوی فەرمی:** دۆکێی لۆکسمبۆرگی مەزن

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Grand Duchy of Luxembourg

**سیستەمی حوکمڕانی:** میرنشینێکی دەستوورییە، دۆکی مەزن، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران. .

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی وڵات ( ٢١ ئەندام )
- ئەنجومەنی نوێنەران. ( ٦٠ ئەندام )

**رووبەر:** ٩٩٩ میل دووجا، ٢٥٨٦ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤٤٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠١ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٦٢,٤ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** گەلی لۆکسمبۆرگ، پۆرتۆگالی، ئیتالی، فەرەنسی، بەلجیکی، ئەڵمان.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ).

**زمان:** لۆکسمبۆرگی، فەرەنسی، ئەڵمانی.

**پایتەخت:** لۆکسمبۆرگ.

**شارە سەرەکییەکان:** ئیش سۆ ئەلزێت، دیڤەر دانگ، دو دیلانگ، بیتانگ.

**دراو:** فرانکی لۆکسمبۆرگ، یۆرۆ لەدوای ١ / ١ / ٢٠٠٢ .

**ئاو وهەوا:** سارد وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرمای پایتەخت لە وەرزی زستاندا سفر پلەی سەدی و لەهاویندا ١٧ پلەی سەدی دەبێت. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٠٠ سم لەباشووری رۆژئاوای وڵات و ٣٠سم بۆ ٤٠ سم لە باشووری رۆژهەڵات. لەبەرزاییەکانی ئاردینز بەفر دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، پەتاتە، جۆ، مێو، بەخێوکردنی مەڕومالات.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** پۆلا، ئۆتۆمبێل، دروست کراوە کیمیاییەکان.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، ئاسنی خاو.

## تێڕوانینێکی گشتی:

لۆکسمبۆرگ، بەمانای تەلاری بچوك دێت، ولاَتێکی بچووکە دەکەوێتە باکووری ئەورووپا. بەلجیکا دەکەوێتە رۆژئاوا وباکووری، ئەلْمانیا دەکەوێتە رۆژهەلاَتی، فەرەنساش دەکەوێتە باشووری. هیچ کەنارێکی نییە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦/٥ بەرەو رۆژهەلاَت لەگەلْ هێڵی پانی ٤٩/٤٠ بەرەو باکوور.

تەختی ولاَت دابەش بووە بەدوو ناوچەی سەرەکییەوە:

ناوچەی ئاردینز کە یەك لەسەر سێی باکووری ولاَت دادەپۆشێ وبەشێکە لەو زنجیرە چیایەی لەخاکی راینی ئەلْمانیاوە درێژ دەبێتەوە تا دەگاتە لۆکسمبۆرگ وبەلجیکا. بەلاَم ناوچەی دووەم: ناوچەی بۆن بییزە وبەشەکانی دیکەی ولاَتی گرتۆتەوە.

لۆکسمبۆرگی جاران یەکێك بوو لەولاَتە هەرە گەورەکانی جیهان، سنوورەکانی هەر یەك لە ئەلْمانیا وهۆلەندا وبەشێکی بەلجیکا وفەرەنساشی گرتبۆوە، ولاَتەکە بوو بوو بە هێمای دەسەلاَتی، هەر کەسێ دەسەلاَتی ولاَتی بگرتایەتە دەست خاوەنی دەسەلاَتێکی جیهانی بوو.

لۆکسمبۆرگ وەك ولاَتێکی سەربەخۆ لەسالْی ٩٦٣ ز دامەزراوە، کاتێ کۆنت ئاردینز زیغفرید توانی دەسەلاَتی ناوچەکە بگرێتە دەست وقەلاَیەکی گەورەی لێ دامەزراند کە شاری لۆکسمبۆرگی ئێستایە.

١٣٠٨ : هێنری حەوتەمی کۆنتی لۆکسمبۆرگ بووە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی.

١٣٥٤ : تشارلزی چوارەمی کوڕەزای هێنری حەوتەم دۆکێی لۆکسمبۆرگی دامەزراند.

١٤٤٣ : فیلیپی خانەدان لە بیرگەندییەوە دەسەلاَتی لۆکسمبۆرگ دەگرێتە دەست.

١٥٥٥ : لۆکسمبۆرگ دەکەوێتە ژێر دەسەلاَتی ئیسپانیاوە.

١٦٨٤ – ١٦٩٧ : فەرەنسا دەسەلاَتی لۆکسمبۆرگ دەگرێتە دەست.

١٦٩٨: ئیسپانیا لۆکسمبۆرگ داگیر دەکات.

١٧١٤ : لۆکسمبۆرگ دەکەوێتە ژێر دەسەلاَتی نەمسا.

١٧٩٥ – ١٨١٤ : کۆنگرەی ڤیێنا لۆکسمبۆرگ دەکاتە دۆکێی مەزن وهۆلەندا بەشێوەیەکی فەرمی دەسەلاَتی ولاَت دەگرێتە دەست.

١٨٣٩ : لۆکسمبۆرگ خاوەنی مافی ئۆتۆنۆمییە وهێنری گەورە دەبێتە سەرۆك.

١٨٦٧ : کۆنگرەی لەندەن دان بەسەربەخۆیی وبێلایەنی لۆکسمبۆرگ دەنێت.

١٨٩٠ : فیلهلمینا دەبێتە شاژنی هۆلەندا، بۆیە لۆکسمبۆرگ لەهۆلەندا جیا دەبێتەوە بەو پێیە کەیاساکانی دۆکیێ رێ بەوە نادات ژن دەسەلاَت بگرێتە دەست.

١٩١٢ : ماری ئادیلید لەخێزانی ناساو دەبێتە دۆكێی گەورە، پاش ئەوەی یاساكانی دۆكێی دەگۆڕێت وژن بۆی دەبێت دەسەلات بگرێتە دەست.

١٩١٤ – ١٩١٨ : ئەڵمانیا لۆكسمبۆرگ داگیر دەكات.

١٩١٩ : دەكێی گەورە شارلۆت دەسەلاتی لۆكسمبۆرگ دەگرێتە دەست.

١٩٣٩ – ١٩٤٦ : لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەم ئەڵمانیا لۆكسمبۆرگ داگیر دەكاتەوە.

٧ / ١٠ / ٢٠٠٠ : دۆكـیٚ گـەورە جـان، دەسـت لەدەسـەلات هەڵـدەگرێت بـەهۆی بەسـالا چوونی ( ٧٩ سالٚ ) و وەلی عەهد میر هێنری كوڕە گەورەی دەسەلاتی ولات دەگرێتە دەست.

لۆكـسمبۆرگ لەسـالّی ١٩٤٥ بۆتـە ئەنـدامی نەتـەوە یـەكگرتوەكان، لەپاشـدا لەچـەند رێكخراوێكـی نێـو دەوڵەتیـدا دەبێتـە ئەنـدام، وەك یـەكێتی ئـەوروپا وهاوپـەیمانی باكووری ئەتڵەسی، ئەمە جگە لەوەی كە لۆكسمبۆرگ مەڵبەندی چەند رێكخراوێكی نێودەوڵەتییە.

لۆكسمبۆرگ دەكەوێتە ئەوناوچەیەی كە سیٚ كەلتووری جیاوازی لەخۆ گرتووە: ئەڵمانی وفەڕەنسی وفلمەندی بۆ دانیشتوانەكەی، زۆریش شانازی بەوەوە دەكەن، چەند زمانێك قسە دەكـەن. لۆكـسمبۆرگ بـۆ ولاتـانی دراوسـێی سـنوورەكانی والایـە لەكاتێكـدا تێكەڵیـشیان نابێتەوە.

پیشەسازی لـە لۆكسمبۆرگ زۆر پێشكەوتووە. چەندین جۆر پیشەسازی قورس وسووك وپیشە دەستییەكانیشی لـەخۆ گرتـووە، هـەروەها سـەنتەرێكی ئـەوروپی گرنگـە بـۆ نـمایش كردنی پۆشاك ومۆدێلـە نوێكان تـەواوی جیهان، هـەروەها نزیكـەی ٢٠٠ بانكی بەناوبانگی جیهانیـشی لـەخۆ گرتـووە، بۆیـە دەكـریٚ بڵـێین لـە بـواریی داراییـدا شانبەشـانی سویـسرا دەوەستێتەوە وبازرگانییەكی جیهانی بەرفراوانیش پەیڕەو دەكات.

سرووودی نیشتیمانی: ئەی نیشتیمان دەمانەویٚ وەك خۆمان بمێنینەوە

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٦ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٦٥ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٣٩,٨٥٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: یەكەم.

## لیبیا

**ناوی باو:** لیبیا.

**ناوی فەرمی:** جەماوەری عەرەبی میللی سۆسیالیستی لیبیای مەزن.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

The Great Socialist Peoples Libyan Arab Jamahiriy

**سیستەمی حوکمڕانی:** وڵاتێکی سۆسیالیستە، سەرۆکی وڵات، سکرتێری گشتی لیژنە میللییەکان.

**دەستەی یاسادانان:** کۆنگرەی میللی گشتی ( ١١١٢ ئەندام ).

**رووبەر:** ٦٧٨,٤٠٠ میل دووجا، ١,٧٥٧,٠٠٠ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥,٦٤٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣,٢ کەس/کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب، بەربەر، چادی.

**ئاین:** موسڵمان ١٠٠ ٪.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** تەرابلوس.

**شارە سەرەکییەکان:** بەنگازی، موسراتە، زاوییە، کەفرە، سرت.

**دراو:** دیناری لیبی.

**ئاو وهەوا:** گەرم و وشکە بەشێوەیەکی گشتی، زستانی مام ناوەندە وڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٢٠٠ ملم دەبارێت، هاوینی گەرم و وشکە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە رۆژدا ٣٨ پلەی سەدی دەبێت وبەشەو دادەبەزێت بۆ ١٠پلە سەدی.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، جۆ، سەوزە ومیوە، شیرەمەنی، گۆشت، خورما، زەیتون.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە پیترۆکیمیاییەکان، چیمەنتۆ، دروستکراوە خۆراکییەکان، ئاسن وپۆڵا.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گەچ، ئاسن، گۆگرد، گاز.

### تێڕوانینێکی گشتی:

لیبیا وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە باکووری ئەفریقیا، دەریای سپی ناوەڕاست دەکەوێتە باکووری، میسر دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، سودان دەکەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی، چاد ونەیجەر دەکەونە باشووری، جەزائیر دەکەوێتە رۆژئاوای، تونس دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٨ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٦ بەرەو باکوور.

بیابانەکان نزیکەی ٩٥٪ ی رووبەری لیبیا دادەپۆشێ. جگە لەهەندێ مێرگ نەبێ لەهەندێ

لەو ناوچانە، تەواوی ئەو ناوچانەی كە ئاوەدان كراونەتەوە وچالاكییە كشتوكاڵیەكانی لێ ئەنجام دەدرێت دەكەوێتە سەر كەناری دەریای سپی ناوەڕاست كە پانتاییەكەی ١٢٠ كم دەبێت، بەتایبەتی ناوچەی چیای سەوز لە باكووری رۆژهەلاتی ولات.

بەربەرەكان یەكەم دانیشتوانی ناوچەكە بوون. ئەغریقییەكان لەسەدەی حەوتەمی پ.ز لێی نیشتەجێ بوون، دوای ئەوان كەوتە ژێر دەستی بەتالیسەكان لە ٣٢٣ پ.ز ، لەساڵی ٩٦ پ.ز كەوتە ژێر دەستی رۆمانییەكان و بووە داگیركراوەیەكی رۆمانی. عەرەبە موسڵمانەكان لە سەدەی حەوتەمی زاییندا لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتاب گەیشتونەتە ناوچەكە وبۆتە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی. لەناوەڕاستی سەدەی دوانزدەیەمدا دووچاری هێرشی نۆرماندی لەسقلییەوە بۆتەوە. لەسەدەی شازدەیەمدا سوارەكانی قەدیس یوحەنا هێرشیان كردۆتە سەر لەنێوان ساڵەكانی ١٥٥١ تا ساڵی ١٩١١ لەژێر دەسەلاتی عوسمانییەكاندا بووە.

لەساڵی ١٩١١ هێزە ئیتالییەكان پەلاماریان داوە و گەلی لیبی بەرەنگارییەكی بێ وێنەیان كردووە ونزیكەی چارەكە سەدەیەكی خایاند. نزیكەی ٧٥٠ هەزار شەهیدیان لەپێناوی پاراستنی ولاتەكەیان بەخشیوە، عومەر ئەلموختار رابەری بزووتنەوەی ئازادیخوازی ئەو سەردەمە بووە، دەسەلاتدارە ئیتاڵیەكان بەسەركردایەتی جەنەراڵ گراسیانی پاش ئەوەی لەشەرێكی توندا دەستگیریان كرد لە بەرواری لە ١٦ / ٩ / ١٩٣١ دا لەسێدارەیان دا، لەسێدارەدانی عومەر ئەلموختار ( ٧٣ ساڵ ) كاریگەرییەكی گەورەی هەبوو بۆ گیانی تەواوی ئازادایخوازانی هەموو جیهان. لیبیا لەدژی ئیتالیا لە جەنگی جیهانی دووەمدا هاوپەیمانی لەگەڵ بەریتانیادا بەستووە، بەو پێیەی كە ئیتالیا دوژمنی هەردوو لایە. بۆیە لەساڵی ١٩٤٢ دا بەریتانیا ئیدارەیەكی سەربازی لە باكووری ولات دامەزراند، فەرەنساش دەسەلاتی ناوچەی فەزانی گرتە دەست.

لەبەرواری ٢٤ / ١٢ / ١٩٥١ دا نەتەوە یەكگرتوەكان دانی ناوە بەسەربەخۆیی لیبیا، شانشینی یەكگرتووی لیبیای دامەزرا ومحەمەد ئیدریس ئەلمەهدی سنۆسی بووە شای لیبیا. شانشینی لیبیا هەرسێ كەرتی برقە وتەرابلوس وفەزانی لەخۆ گرتبوو. لەساڵی ١٩٥٥ دا بووە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

لە مانگی ئەیلوولی /١٩٦٩ دا كۆمەڵێ ئەفسەرانی ئازادیخوازان بەسەركردایەتی عەقید موعەمەر ئەلقەزاف شۆرشێكیان هەڵگیرسان وسیستەمی پادشاییان روخان، پابەند بوونی خۆیان بە ئازادیخوازی راگەیاند. خاكی لیبیا لەتەواوی بنكە سەربازییە بەریتانی وئەمریكییەكان چۆلكرا وشۆڕشی میللی راگەیەنرا، ئیتر لەو سەردەمەوە لیبیا بەناوی كۆماری عەرەبی لیبیا ناسرا. لەبەرواری ٢ / ٣ / ١٩٧٧ دا لیبیا رایگەیاند كە دەیەوێ سەردەمی كۆماری تێپەڕێنی و دەسەلاتی جەماوەری راگەیاند وناوی ولاتی كردە: جەماوەری عەرەبی میللی سۆسیالیستی لیبیای مەزن.

لە ساڵی ١٩٨٨ دا ئیتالیا داوای لێبوردنێكی فەرمی پێشكەش بە لیبیا كرد لە ماوەی

داگیرکردنەی بۆ لیبیا.

لیبیا چەند رۆژێکی نیشتیمانی هەیە:

- ١٦ / ٩ : رۆژی ماتەمینی گشتییە، رۆژی لەسێدارەدانی پاڵەوانی نەتەوەییان عومەر ئەلموختار لەساڵی ١٩٣١ و پێی دەوترێ رۆژی دڵسۆزی.
- ١ / ٩ : رۆژی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوولی ١٩٦٩ .
- ٢٨ / ٣ : یادی دەرکردنی هێز وبنکە سەربازییە بەریتانییەکان لە لیبیا.
- ٢ / ٣ : یادی دامەزراندنی دەسەڵاتی گەل ساڵی ١٩٧٧ .

دەڵێن ئەغریقییەکان ناوی لیبیایان لەو وڵاتە ناوە، کە لەناوی یەکێك لە خێڵەکانەوە هاتووە کە لەو ناوچەیەدا ژیاون. هەروەها دەڵێن رۆمانەکان ئەم ناوەیان لێناوە کە بەمانای پیاوە سپییەکان دێت. ناوی لیبیا دوای داگیر کردنی وڵات لە ١٩١١ دا لەلایەن ئیتالییەکانەوە بەکار هاتووە ولەوە پێش بە تەرابلوس یان بەرقە ئاماژەی پێ دراوە.

لەساڵی ١٩٥٥ دا نەوت لە لیبیادا دۆزراوەتەوە، لیبیا لە وڵاتێکی هەژارەوە بووە یەکێك لەوڵاتە دەوڵەمەندەکانی جیهان. داهاتەکانی نەوت بۆ دامەزراندنی چەندین پرۆژەی ئابووری وکۆمەڵایەتی سوودی لێوەر گیرا، لەوانە پرۆژەی رووباری مەزن.

پرۆژەی رووباری مەزن بەیەکێك لە هەرە پرۆژە ئەندازیارییە شارستانیە گەورەکانی جیهان دادەنرێت.

لەبەرواری ٢٨ / ٨ / ١٩٨٤ دا سەرۆکی لیبیا موعەممەر ئەلقەزافی بەردی بناغەی ئەم پرۆژەیەی دانا و واچاوەڕوان دەکرێ لە سەرەتای ئەم ساڵەدا ( ٢٠٠٨ ) کۆتایی پێ بێت.

لەم ساڵانەی دواییدا لیبیا دەستی کردووە بە کردنەوەی ئابووری وڵاتەکەی بەرامبەر بە بەرهەمهێنەرە بیانییەکان بە سیستەمێکی سۆسیالیستی.

لە ١ / ٩ / ٢٠٠٢ دا بەبۆنەی ٣٢ ساڵیادی شۆڕشی لیبیا، موعەممەر ئەلقەزافی وتارێکی مێژوویی خوێندەوە، لەوتارەکەیدا ئاماژەیدا بە گۆڕانکارییەکی بنەڕەتی لە سیاسەتی دەرەوە وناوەوەی وڵاتەکەی وملکەچی وڵاتەکەی بۆ سیستەمی نوێ جیهان بە سەرکردایەتی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا راگەیاند، ئەمەش بە چوونە ناوەوەی لیبیا لە یەکێتی ئەفریقی کە لە تەمووزی ٢٠٠٢ دا دامەزراوە لە بری رێکخراوی یەکێتی ئەفریقی ئەوسا.

لیبیا بەپلەی نۆیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی زەیتون وبەپلەی دوانزدەیەم دێت لە یەدەگی پیترۆل وبەپلەی پێنجەم دێت لەدەرهێنانی پیترۆل.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢٩,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤,٧٥٥ .

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٠ .

## لیبریا

ناوی باو: لیبیریا.

ناوی فەرمی: کۆماری لیبیریا.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Liberia

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە وئەنجومەنی ویلایەتەکان یارمەتی دەدەن.

دەستەی یاسادانان: کۆمەڵەی یاسادانان ( ٣٥ ئەندام ).

ڕووبەر: ٣٨,٢٥٠ میل دووجا، ٩٩,٠٦٧ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٢,٦٠٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ٢٦,٦ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: ئەفریقی ڕەش، لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن، گرنگترینیان کەبلا وباسا.

ئاین: مەسیحی، موسڵمان ( ٣٣ ٪ )، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

زمان: ئینگلیزی.

پایتەخت: مۆنرۆفیا.

شارە سەرەکییەکان: هاربیل، کارانجا، بۆکانان، یبیکا.

دراو: دۆلاری لیبیری.

ئاو وهەوا: گەرم وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەکەنار ٢٧ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لەکەنار ٥١٠ سم دەبارێت، لەبەشە ناوخۆکانی وڵاتیش ٢٢٠ سم دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵییەکان: لاستیك، برنج، مۆز، مەنیهۆت، قاوە، توتن، لۆکە، ئەناناس، کاکاو، ترشەلۆکییەکان، مانگۆ، گوێزی کۆلا، زەیتی دارخورما.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: سابوون، کەرەستەی بیناسازی، کەلوپەلی ناوماڵ، پێڵاو.

سامانی کانزایی: ئاسن، ئاڵتون، ئەڵماس.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

لیبیریا ولاتێکه دەکەوێته سەر کەناری رۆژئاوای کیشوەری ئەفریقیا، سیرالیۆن وغینیا دەکەونە باکووری، کەناری عاج دەکەوێته رۆژهەلاتی، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێته باشووری رۆژئاوای، ناوەڕاستی دەکەوێته سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٩ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٦/٣٠ بەرەو باکوور.

ناوچەی کەناری لیبیریا بریتییە لە دەشتێکی تەسك بەرەو ناوخۆی ولات ووردە ووردە بەرز دەبێتەوە. بەلام ناوچە ناوخۆییەکان بریتییە لە بان وچیاکان وبە دارستانەکان داپۆشراون. کانالی گرنگترین روباری لیبیریایە وسنوورەکانی لەگەڵ کەناری عاج پێك هێناوە، هەروەها روباری سانت بۆلیش بەنێو بەرزاییەکانی باکووری ولات تێپەڕ دەبێت.

دانیشتوانی لیبیریا لە شانشینەکانی دەشتی سودانەوە لەنێوان سەدەکانی دوانزدەیەم وشانزدەیەمدا روویان کردۆتە ناوچەکە. پۆرتوگالییەکان لەسەدەی پانزدەیەمدا روویان تێکردووە، دوای ئەوان بازرگانە هۆڵەندی وفەڕەنسی وئینگلیزەکان لەساڵی ١٨٢٢ دا کۆمەڵێك لە کۆیلە ئەمەریکییە ئازاد کراوەکان لەکەناری لیبیریا دابەزیون. ئەمە بە سەرەتای تاقیکردنەوەی گەڕاندەوەی کۆیلەکان بۆ ولاتانی باوباپیرانیان دادەنرێت. لەساڵی ١٨٣٨ دا کۆمۆنوێلتی لیبیری بەهاوبەشی دانیشتوانی مۆنرۆفیا ودانیشتوانە رەسەنەکانی ناوچەکە دامەزراوە، ئیتر لەو سەردەمەوە ناوچەکە بەناوی لیبیریا ناسراوە کە بەمانای خاکی ئازاد دێت بەزمانی لاتینی.

لە ٢٦ / ٧ / ١٨٤٧ دا لیبیریا سەربەخۆ بووە وئەو شێوەیەی ئێستای لەخۆ گرتووە، بەمەش بەیەکەم ولاتی ئەفریقی دادەنرێت سەربەخۆ بووبێت، بەدووەم ولاتی رەش لەجیهاندا دادەنرێت سەربەخۆ بووبێت دوای هاییتی وسێهەم دەوڵەت لەجیهاندا دوای ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا وهاییتی سەربەخۆ بووبێت. یەکەم سەرۆکی لیبیریا دوای سەربەخۆیی جۆزیف جەنگیز رۆبرتس بووە، کە یەکێك بووە لە لیبیرییە ئەمەریکییەکان، دوای ئەو چەندین سەرۆك وحکومەتی جیاوازی بەخۆوە بینیوە.

لەساڵی ١٩٤٤ دا ولیام ف.س. تیبمان دەسەلاتی گرتە دەست، تیبمان هەوڵێکی زۆری داوە گەشە بەئابووری ولاتەکەی بدات وئەمەریکی ولیبیرییەکان بکات بەیەك لەچوارچێوەی ولاتێکدا، بەلام دەسەلاتەکانی لەدەستی لیبیری وئەمەریکییەکاندا هێشتووە. لەساڵی ١٩٤٥ دا لیبیریا بووە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. دوای کۆچی دوایی تیبمان لەساڵی ١٩٧١ دا، ولیەم تۆلبێرتی جێگری بووە سەرۆکی ولات، بەلام بەهۆی دابەزینی نرخی ئاسنی خاو و لاستیك لەبازاڕە جیهانییەکاندا وبەرز بوونەوەی نرخی برنج لەسەردەمی ئەمدا، بارودۆخی

ئابووری ولات زۆر خراپ بوو، جیاوازی لەنێو چینە هەژار ودەوڵەمەندەكان بەتەواوی بەرچاو كەوتبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەنجام دانی كودەتایەكی سەربازی بەسەر ولیەم تۆلبێرتی بەسەركردایەتی سەمۆئێل دوو لەساڵی ١٩٨٠ دا ودوای كوشتنی تۆلیبرێتی سەمۆئێل دوو دەسەلاتی گرتە دەست.

بەلام دوای دەرچوونی دەستووری نوێی ولات لەساڵی ١٩٨٤ دا وئەنجام دانی هەڵبژاردنە سەرۆكایەتییەكان وهەڵبژاردنەوەی سەمۆئێل، شەڕی ناوخۆ لە لیبیریا هەڵگیرسا. سەمۆئێل بەزۆرە ملێ خۆی لەهەڵبژاردنەكاندا دەرچواندبوو، خۆی بەحاكمی رەهای ولات دەزانی، گەل لەدژی راپەڕین ولەلایەن كۆمەڵێك لە ركابەرییەكانی دەستگیر كرا ولە ٩ / ٩ / ١٩٩٠ دا لەسێدارەیان دا، ئەمە دوو هێندەی تر ئەو شەڕە ناوخۆی توند كرد لەپێناوی دەسەلات گرتنە دەست، هێزەكانی رۆ ژئاوای ئەفریقیا بۆ راگرتنی شەڕی ناوخۆی ئەو ولاتە خۆیان تێهەڵقورتان. لەهاوینی ١٩٩٧ دا تشارلز تایلۆر لەهەڵبژاردنە سەرۆكایەتییەكاندا سەركەوتنی بەدەست هێنا. لەساڵی ١٩٩٨ دا تشارلز بوو بە ئیسلام و وتارێكی بەم بۆنەیەوە خوێندەوە، تیایدا هاتبوو: " من رێز لەبنەماكانی ئاینی ئیسلام دەگرم، دەمەوێ هەموو هاولاتییەك بەتەواوی لێی تێبگات".

بەلام لەسەرەتای ساڵی ٢٠٠٢ دا شەڕی ناوخۆ هەڵگیرسایەوە، بەهەزاران هاولاتی بەرەو ولاتانی دراوسێ هەڵهاتن.

لیبیریا ولاتێكی كشتوكاڵییە، نزیكەی سێ لەسەر چواری دانیشتوانی ولات سەرقاڵی كشتوكاڵین ونزیكەی ٢٠٪ كۆی بەرهەمی نەتەوەیی گرتۆتە خۆ.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٦ / ٧ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٨٤٧ .

سروودی نیشتیمانی: هەموو بڵێن بژی لیبیریا.

تێكرای داهاتی نەتەوەیی: ١,٢ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٥١ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤٣٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٥٢ .

## لیسۆتۆ

**ناوی باو:** لیسۆتۆ.

**ناوی فەرمی:** شانشینی لیسۆتۆ.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Lesotho.

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی پیران ( ٣٣ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٥ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١١,٧٢٠ میل دووجا، ٣٠,٣٥٥ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٠٠٨,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٦٦,٢ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش: سۆتۆ، زولو.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت)، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

**زمان:** سۆتۆ، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** ماسیرۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** مابۆتسۆ، تیاتیا نینگ، مانیتینگ، هلۆتسی.

**دراو:** لۆتی.

**ئاو وهەوا:** مام ناوەند وشێدارە، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان نزیکەی ٧٠ سم . نێوەندی پلەکانی گەرما لە دەشتە رۆژئاواکان لەزستاندا ٧ پلە لەژێر سفری سەدی ولەهاویندا ٣٢ پلەی سەدی، ناوچە بەرزەکانیش لەو ئاستە ساردترە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، جۆ، فاسۆلیا، بەزالیا، گەنمەشامی، بەخێوکردنی مەڕومالآت.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** مۆم، چنینی فەرش، کەلوپەلی ناومالْ، پەین.

**سامانی کانزایی:** ئەلْماس.

### تێڕوانینێکی گشتی:

لیسۆتۆ، بەزمانی دانیشتوانی ولآت بەمانای ولآتی سۆتۆ دێت، ولآتێکە دەکەوێتە باشووری ناوەڕاستی ئەفریقیا، کۆماری باشووری ئەفریقیا لەهەر چوارلاوە گرتوویەتی،

نزیکەی ۳۲۰ کم لە رۆژئاوای کەناری زەریای هیندییەوە دوورە. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۲۸/۳۰ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ۲۹/۳۰ بەرەو باشوور.

تەختی لیسۆتۆ سروشتێکی سەختی لەخۆ گرتووە، چیاکانی دراکنزبرج دەکەونە رۆژهەڵاتی، چیاکانی مالۆتیش دەکەونە ناوەراستی، دەشتەکانیش دەکەونە رۆژئاوای وڵات.

تا ساڵی ۱۸۰۰ ز ناوچەکە نیشتەجێ نەکرابوو. لەساڵی ۱۸۲٤ دا سەرکردەیەکی ئەفریقی بەناوی مۆشۆشۆ کۆمەڵێ خێڵی کرد بەیەك وناوی نان نەتەوەی باسۆتۆ، تا ئێستاش نەوەکانی مۆشۆشۆ حوکمی وڵات دەکەن.

لەساڵی ۱۸٦۱ دا مۆشۆشۆ داوای لە ئینگلتەرا کرد وڵاتەکەی بپارێزن، ئینگلتەراش لەلایەن خۆیەوە پارێزراوەی باسۆتۆ لاندی دامەزراند، لەساڵی ۱۸۷۱ دا ناوچەکە بووە داگیرکراوەی ( رائس ئەلرەجا ئەلساڵحی بەریتانی ) کە ئێستا بەشێکی باشووری ئەفریقیایە. لە ساڵی ۱۸۸٤ دا باسۆتۆ لاندی وەك دامەزراوەیەکی بەریتانی دامەزرایەوە ولەلایەن کارگێڕێکی بەریتانی حوکمی دەکرا. لەساڵی ۱۹۱۰ ئەنجومەنی باسۆتۆ لاند دامەزرا، کە بەدەزگای یاسادانانی وڵات دادەنرا.

باسۆتۆ لاند لە ٤ / ۱۰ / ۱۹٦٦ لەبەریتانیا سەربەخۆ بووە و ناوی بووە لیسۆتۆ ولەهەمان ساڵدا بووە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەبەرواری ۳۰ / ۱۰ / ۱۹۹۷ دا لیتسی سێیەم بووە شای لیسۆتۆ، دوای ئەوەی شا مۆشۆشۆی دووەمی باوکی بەرووداوێکی ئۆتۆمبێل کۆچی دوایی کرد.

لەمانگی ۷ / ۱۹۹۸ دا، وڵات دووچاری هەوڵی کودەتایەکی بووەوە، ئاژاوە وکێشەیەکی زۆری لە وڵاتدا نایەوە، ئەمەش باشووری ئەفریقیای ناچار کرد خۆی تێهەڵقورتێنی بۆ راگرتنی کێشەکانی ئەو وڵاتە وگەڕانەوی هێمنی، هێندەی نەخایاند بارودۆخی وڵات ئاسایی بووەوە.

لیسۆتۆ بە سویسرای باشووری ئەفریقیا ناودەبەرێت، بەهۆی جوانی سروشتی وڵاتەکە، بەڵام وڵاتێکی هەژارە، پیشەسازییەکانی زۆر لاوازن، نزیکەی ۳۸٪ ی هێزی کاری ئەو وڵاتە روو دەکەنە باشووری ئەفریقیا بۆ کارکردن، پشتی بە وڵاتە دراوسێکانی بەستووە لە داهاتە ئابوورییەکانی.

جەژنی نیشتیمانی: ٤ / ۱۰ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی لە ساڵی ۱۹٦٦ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ۱،٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱٤۳ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۷۰۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱۳۲ .

## مالتا

**ناوی باو:** مالتا

**ناوی فەرمی:** مالتا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Malta

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٥ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٢٢ میل دووجا، ٣١٦ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣٧٥,٠٠٠ کەس تا ساڵی ١٩٩٨ .

**چڕی دانیشتوان:** ١,١٨٧ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** مالتایی، ئینگلیز.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك).

**زمان:** مالتایی، ئینگلیزی، نزیکەی ٤٠٪ی دانیشتوان بەزمانی عەرەبی قسە دەکەن و ٦٠ ٪ بە زمانی ئیتالی وەك زمانی دووەمی وڵات.

**پایتەخت:** ڤالیتا ( دەکەوێتە دورگەی مالتا ).

**شارە سەرەکییەکان:** بیرکیکارا، کۆرمی، هامرۆن، سلیما، لۆزۆس، سان جوان، سان جولیان.

**دراو:** لیرەی مالتایی.

**ئاو وهەوا:** مام ناوەند وفێنکە، زستانی شێدار ومام ناوەندە، هاوینی گەرم و وشکە، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠ سم دەبارێت. نێوەندی پلەکانی گەرما لە وەرزی زستاندا ١٢ پلە سەدی ولەهاویندا ٢٦ پلەی سەدی دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** ترشەلۆکییەکان، پەتاتە، تەماتە، جۆ، بەخێوکردنی مەڕومالات، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چنین، دروستکردنی شەراب ومەی، دروستکردنی کەشتی.

**سامانی کانزایی:** بەردی کلس ، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

مالتا کۆمەڵ دورگە وڵاتێکە لەناوەڕاستی دەریای سپی ناوەڕاست لەنزیکترین خاڵی نێوان هەردوو کیشوەری ئەفریقیا وئەوروپا، نزیکەی ١٠٠ کم لە باشووری دورگەی سقلیەی ئیتالییەوە دوورە، هەروەها ٢٠٠ کم لە ڕۆژهەڵاتی کەناری باکووری ڕۆژهەڵاتی وڵاتی

تونسەوە دوورە. لەسیٚ دورگەی سەرەکی پێك دێت، مالتا، جۆزۆ، کۆمینۆ، هەروەها سیٚ دورگەی دیکەشی لەخۆ گرتووە بەلأم نیشتەجیٚ نەکراون: کۆمینۆتۆ، فیلفلا، سلمۆنیت. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ١٤/٢٥ بەرەو رۆژهەلأت لەگەلٚ هێلی پانی ٣٥/٥٥ بەرەو باکوور.

مالتا داگیرکراوەیەکی فینیکی بووە، لەسالٚی ٢١٨ پ.ز رۆمانەکان داگیریان کردووە، دوای ئەوان بیزەنتییەکان دەسەلأتی ولأتیان گرتە دەست وتا سالٚی ٨٧٠ ز ماونەتەوە، لەسەدەی نۆیەم عەرەبە ئیسلامەکان گەیشتونەتە ناوچەکە وتاسالٚی ١٢٥٠ ماونەتەوە، ئاسەواری زمانی عەرەبیش لەناوچەکەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو سەردەمە. سوارەکانی مالتا لەسەرەتای ١٥٣٠ بەدواوە حوکمی ولأتەکەیان کردووە، لەسالٚی ١٥٦٥ دا تورکە عوسمانییەکان هەولٚی داگیرکردنیان داوە، بەلأم شکستیان هێناوە. ناپلیۆن بونابێرت لە نێوان ١٧٩٨ – ١٨٠٠ دەسەلأتی مالتای گرتۆتە دەست، لەسالٚی ١٨٠٠ دا بەریتانییەکان داگیریان کردووە بنکەیەکی دەریاییان لیٚ دامەزراندووە و لەسالٚی ١٨٣٣ کردویانەتە داگیرکراوەیەکی تاجی بەریتانی. لەبەرواری ٢١ / ٩ / ١٩٦٤ دا بەتەواوی لە بەریتانیا سەربەخۆ بووە. بۆ سالٚی دوایی بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەبەرواری ١٣ / ١٢ / ١٩٧٤ دا بۆتە کۆمار. لە بەرواری ٣١ / ٣ / ١٩٧٩ دا کۆتایی هاتووە بەو رێکەوتنە سەربازییەی نێوان مالتا وبەریتانیا، بۆیە بەریتانیا تەواوی هێزەکانی لە مالتادا کشانۆتەوە وبنکە سەربازییەکەی چۆلٚ کردووە.

مالتا کۆمارێکی دیموکراسییە، سەرۆك کۆمار دەسەلأتەکانی زۆر دیاری کراون، دەسەلأتی فیعلی بەدەست سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە کە سەرۆکی پارتی زۆرینەی پەرلەمانی ئەو ولأتەیە. لەنێوان سالٚەکانی ١٩٧١ – ١٩٨٧ پارتی کار دەسەلأتدار بوو، کەتا سالٚی ١٩٨٤ دۆم منتۆف سەرۆکایەتی دەکرد ودوای ئەو مەفسۆد بوینسی دەسەلأتی گرتۆتە دەست. لەنێوان سالٚەکانی ١٩٨٧ – ١٩٩٦ پارتی نیشتیمانی بەسەرۆکایەتی ئیدوارد فینش ئادامی دەسەلأتی گرتۆتە دەست، دوای ئەوە دەسەلأت کەوتەوە دەست پارتی کار بە سەرۆکایەتی ئەلفێرد سانت.

مالتا بەرەچەلٚەك وشەیەکی فینیکییە وبەمانای: هەلٚهاتن یان رزگار بوون دێت، کە بەزمانی عیبرانی و سیریانیش هەمان مانا دەبەخشێت. بۆیە ئەم ناوەشی لێنراوە چونکە ئەو کەشتیانەی لەدەست چەتەکانی دەریا هەلٚدەهاتن روویان دەکردە دورگەی مالتا.

مالتا خاوەنی سامانێکی کانزایی ئەوتۆ نییە، زۆربەی دانیشتوانی ولأتیش سەرقالٚی دروستکردنی کەشتی وچاککردنەوەین. بەلأم جوانی سروشتی ئەو ولأتە سالأنە زیاد لە ١,٥

ملیۆن گەشتیار لەتەواوی جیهانەوە راکێش دەکات، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا داهاتێکی باشی بۆ ولآت دابین کردووە، شایەنی باسە یەکێ لە پەرستگا هەرە دێرینەکانی جیهان لەو ولآتە دروست کراوە کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ چاخی بەردینی نویێ( ٤٠٠٠ بۆ ٣٠٠٠ پ.ز ). هەروەها کۆمەڵێ پەرستگای دێرینی دیکەشی لەخۆ گرتووە، هەندێکیان بەقوڵایی ١٢ مەتر لەژێر زەویدا دروست کراون.

سالآنە لە رۆژی ٨ / ٩ ی هەموو ساڵێك کێبڕکێی بەلەمی جیهانی لەو ولآتەدا ئەنجام دەدرێت.

جەژنی نیشتیمانی: چەند رۆژێك بەجەژنی نیشتیمانی ئەو ولآتە دادەنرێت:

- ٢١ / ٩ : رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٦٤ .
- ١٣ / ١٢ : رۆژی بوون بەکۆمار لەساڵی ١٩٧٤ .
- ٣١ / ٣ : رۆژی کشانەوەی هێزە بەریتانییەکان.
- ٨ / ٩ : رۆژی سەرکەوتن بەسەر سوپای داگیرکەری عوسمانی ساڵی ١٥٦٥.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا: ١٢٨ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٧,٢٩٨ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا: ٤١ .

## مالی

**ناوی باو:** مالی.

**ناوی فەرمی:** کۆماری مالی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Mali

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ۱۲۹ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٤٨٢,٠٧٧ میل دووجا، ١,٢٤٨,٥٧٤ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٩,٩٤٥,٠٠٠ کەس ( تا ۱۹۹۸ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٨ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن، گرنگترینیان: دیۆلا، فۆلانی، دۆقۆن، تەواریق، عەرەب.

**ئاین:** موسڵمان ( ٩٤ ٪ )، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، مەسیحی.

**زمان:** فەڕەنسی.

**پایتەخت:** باماکۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** سیگۆن مۆبتی، سیکاسۆ، کاو، تمبکتۆ.

**دراو:** فرانك.

**ئاو وهەوا:** گەرمە، نێوەندی پلەکانی گەرما ٢٨ پلەی سەدی وهەندێ جار دەگاتە ٣٨ پلەی سەدی، لەناوچە بیابانییەکانیش دەگاتە ٤٣ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لەباشووری مالی دەگاتە ٨٩ سم. لەناوچە بیابانییەکان ٢٥ سم دەبارێت، بارانەکان لە وەرزی هاویندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مەنیهۆت، لۆکە، بەخێوکردنی مەڕومالآت، گەنمەشامی، هەرزن، بستەی عەبید، برنج، قامیشی شەکر.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان، دروستکراوەکانی پێست، چنین.

**سامانی کانزایی:** خوێ، ئاڵتون.

### تێڕوانینێکی گشتی:

مالی وڵاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە ڕۆژئاوای ئەفریقیا، جەزائیر دەکەوێتە باکووری، نەیجەر دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، بۆرکینا فاسۆ و کەناری عاج و غینیا دەکەونە باشووری،

سەنگال ومۆریتانیا دەکەونە رۆژئاوای. هیچ کەنارێکی نییە، ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٥ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٦ بەرەو باکوور.

بیابانە چۆڵەکان دەکەونە باکووری وڵات. دەشتە نیمچە بیابانییەکانیش دەکەونە ناوەراستی وڵاتەوە. بەڵام گژوگیاکان دەشتە تەختەکانی باشووری وڵات دادەپۆشن، چیای بەرزی زۆرکەمی لەخۆ گرتووە، بەرزترین لوتکەی دەگاتە ١١٥٥ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە، کە ئەویش لوتکەی چیای هەمبووریە لە باشووری مالی.

مالی خاوەنی مێژوویەکی دێرین وبەناوبانگە، لەخاکی ئێستای ئەو وڵاتە لەنێوان سەدەکانی چوارەم وپانزدەیەمی زاییندا سێ وڵاتی ئەفریقی دروست بووە وگەشەکردنێکی بەرچاویان بەخۆوە بینییوە بەهۆی زاڵ بوونی بەسەر رێگا بازرگانییە سەرەکییەکانی ئەو ناوچەیە:

١. ئیمپراتۆریەتی غانا لەنێوان سەدەکانی چوارەم ویانزدەیەمی زاییندا.

٢. ئیمپراتۆریەتی مالی لەنێوان ١٢٤٠ – ١٥٠٠ . ئاینی ئیسلامیش لەو سەردەمەدا لەناوچەکە بڵاوبۆتەوە، بەتایبەتی لەسەردەمی شا مانسا موسا ( ١٣١٢ – ١٣٣٧ )، کە کۆمەڵێ زانای ئاینی ئیسلامی هێناوەتە ناوچەکە. کۆمەڵەی مالینکییەکانیش دانیشتوانە رەسەنەکانی ناوچەکە بوون وکۆمەڵەی نەژادی زۆرینەی ئەو ئیمپراتۆریەتە بوون کە ناوچەکانی سەنگال وگامبیا و نەیجەری ئێستاشی گرتبووەوە، ناوی مالی ئێستاش لەو ئیمپراتۆریەتەوە هاتووە، کە بەزمانی ناوخۆی وڵات بەمانای ئەو شوێنە دێت کە شا لێی دەژی.

٣. دەوڵەتی سەنگی: کە پایتەختەکەی شاری کاو بووە لە وڵاتی مالی ئێستا، بەڵام لەساڵی ١٥٩١ دا ئەو دەوڵەتە نەماوە وچەند شانشینێکی بچوک جێیان گرتۆتەوە.

لە نیوەی سەدەی نۆزدەیەمدا فەرەنسا هەوڵی داوە ناوچەکە داگیر بکات، بەڵام تا ساڵی ١٨٩٥ نەیتوانی بەتەواوی ناوچەکە بگرێتە خۆی، لەدوای ئەو ساڵە فەرەنسا ناوچەکەی داگیر کرد وخستییە سەر ئەفریقیای رۆژئاوای فەرەنسی، لەساڵی ١٩٠٤ دا بە سودانی فەرەنسی ناوبراوە. لەساڵی ١٩٤٦ دا بۆتە ویلایەتێك لە یەکێتی فەرەنسادا، لەپاشدا بۆتە کۆمارێکی خاوەنی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی کۆمەڵەی فەرەنسیدا لەبەرواری ٢٤ / ١١ / ١٩٥٨ و بۆ ساڵی داهاتوو لەگەڵ وڵاتی سەنگالدا یەکیان گرت، بەڵام لە ٢٠ / ٨ / ١٩٦٠ دا یەکێتی نێوانیان هەڵوەشایەوە ولە بەرواری ٢٢ / ٩ / ١٩٦٠ دا بەتەواوەتی سەربەخۆ بووە وناوی بۆتە کۆماری مالی ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

یەکەم سەرۆکی وڵات دوای سەربەخۆیی: مۆدیبۆ کیتا بووە، لەساڵی ١٩٦٨ دا

کودەتایەکی سەربازی بەسەردا کراوە بەسەرکردایەتی موسا تروارێ، موسا لە دەسەڵاتدا مایەوە تا لەبەرواری ٢٦ / ٣ / ١٩٩١ کودەتایەکی سەربازی بەسەردا کرا و لەرێی هەڵبژاردنە گشتییەکانەوە ئەلفا عومەر کوناری بووە سەرۆکی کۆمار.

لەبەرواری ١٢ / ٥ / ٢٠٠٢ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە مالی بەڕێوە چوو، بەرێژەی ٦٤ ٪ ی دەنگەکان ئەمادۆ تۆمانی توری ( ٥٤ ساڵ ) سەرکەوتنی بەدەست هێنا ودەسەڵاتی گرتە دەست ولەلایەن خۆیەوە ئەحمەد محەمەد ئاغ حەمانی بەسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران دامەزراند، شایەنی باسە بەمەبەستی ئاشتبوونەوەی گشتی ونەهێشتنی تۆوی دوو بەرەکی وڵات ئەحمەد محەمەد هەڵبژارد چونکە بەرەگەز لە رۆڵەکانی تەواریقە، تەواریقەکان لەم ساڵانەی دواییدا داوایان دەکرد بایەخێکی سیاسیان لەوڵاتەکەدا پێبدرێ.

مالی وڵاتێکی هەژارە، پشتی بەکشتوکاڵی بەستووە، جارجار بۆ چەند ساڵێك دووچاری گەرما و وشکەساڵی دەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی مردنی بەدەیان ئاژەڵ وبڵاوبوونەوەی نەخۆشی لەنێوان خەڵکیشدا، ئەمەش خۆی لەخۆیدا باری ئابووری وڵاتەکەی هێندەی دیکە نالەبار کردووە.

مالی یەکێك بوو لەسەرچاوە هەرە گرنگەکانی ئاڵتون لەرۆژئاوای ئەفریقیا پلەی سێیەمی بەدەست هێنابوو لەبەرهەمی ئەو ماددەیە لەسەر ئاستی تەواوی ئەفریقیا، دوای باشووری ئەفریقیا وغانا لەساڵانی رابووردا، بەڵام بەهۆی چەند هۆیەکی سیاسی وئابوورییەوە دەرهێنانی ئاڵتون لەکانە تایبەتەکاندا بەرەو دواوە چووە. لەم دواییانەدا چەند کۆمپانیایەکی گەڕان بەدوای ئاڵتوندا هەستاوە بە دامەزراندنی چەند کانێکی نوێ لەدڵی بیابانی ئەو وڵاتەدا ولەساڵی ٢٠٠٠ دا توانیویانە نزیکەی ٨٠ کغم ئاڵتوون بە بەرهەم بێنن. بەڵام واچاوەڕوان دەکرێت رێژەی دەرهێنانی ئاڵتون زۆر لەوە زیاتر ببێت باری ئابووری وڵاتی پێ باش بکاتەوە.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٢ / ٩ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی وڵات لە ١٩٦٠ دا.

سروودی نیشتیمانی: بانگت دەکەین ئەی مالی، تۆ ئامانجمانی.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢,٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣١ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٧٢ .

## مالیزیا

**ناوی باو:** مالیزیا.

**ناوی فەرمی:** مالیزیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Malaysia

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، دادوەری مەزن، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی پیران ( ۷۰ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ۱۹۲ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ۱۲۷,۵۸٤ میل دووجا، ۳۳۰,٤٤۲ کم$^{۲}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ۲۳,۰۰۰,۰۰۰ کەس ( تا ساڵی ۲۰۰۰ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٦۷ کەس/کم$^{۲}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** مەلایۆنی ( ٦٥ ٪ )، چینی ( ۲٥ ٪ )، هیندی ئاسیا ( ۱۰ ٪ ).

**ئاین:** موسڵمان، بوودی، هیندۆس، سیخ، مەسیحی.

**زمان:** میلایۆنی ( باهاسای مالیزیا )، ئینگلیزی، چینی، تامیلی.

**پایتەخت:** کوالا لامبور ( پایتەختی سیاسی ).

بۆترا جایا ( پایتەختی ئیداری )

**شارە سەرەکییەکان:** کانگار، ئالور سیتاب، ئیبوە، شا ئالام، سیریمبان، ملقە، جەوهور بارو، کوانتان، کوالا تیرینجانۆ، کوتا بەهارۆ، کۆشینگ، کوتا کینابالۆ، لابوان.

**دراو:** رەنجیت.

**ئاو وهەوا:** کەمەرەیی گەرم وشێدارە بەدرێژایی ساڵ، نێوەندی پلەکانی گەرما لە کەنارەکاندا ۲٦ پلەی سەدی ونێوەندی پلەکانی گەرما لە بەرزاییەکاندا ۱۸ پلەی سەدی، بارانێکی وەرزی زۆری لێدەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** زەیتی دارخورما، لاستیك، داروتەختە، برنج، گوێزی هیندی، بیبەر، ئەناناس، کاکاو، چاندنی گوڵ.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئامێری ئەلیکترۆنی وکارەبایی وپێداویستییەکانی، ئامێری کشتوکاڵی، ئۆتۆمبێل، دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گازی سروشتی، بۆکسیت، ئاسن، تەنەکە.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

مالیزیا ولاتێکی ئیسلامییە دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی ئاسیا، لە دوو ناوچەی سەرەکی پێك دێت وماوەی نێوانیان ٦٥٠ کم ودەریای چینی باشوور لێکیان جیادەکاتەوە. دووناوچەکەش ئەمانەن:

١. نیمچە دورگەی مالیزیا، لەوەو پێش بەناوی رۆژئاوای مالیزیا ناسراوە، تایلاند دەکەوێتە باکووری ئەو ناوچەیە و سەنگافوورە دەکەوێتە باشووری، ناوەڕاستیشی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٢ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٣ بەرەو باکوور. کەناری رۆژئاوای ئەو بەشەش دەڕوانێتە سەر کەنداوی ملقە.

٢. ناوچەی سرواك وسەباح، ئەوساش بەناوچەی رۆژهەلاتی ئاسیا دەناسرا وبەشە باکوورییەکانی دورگەی بۆرینۆیە. برۆنای دەکەوێتە باکووری ئەو ناوچەیە، بەلام ئەندەنوسیا دەکەوێتە بەشی باشووری. ناوەڕاستی ناوچەکەش دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١١٥ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٣ بەرەو باکوور.

بەهۆی زنجیرە چیای باریسانەوە کە لە سنووری تایلاندییەکانەوە درێژ دەبنەوە تا نیوە درێژی نیمچە دورگەکەوە، نیمچە دورگەی مالیزیا بووە بەدوو بەشە، ئەمە جگە لەچەند زنجیرەیەك چیای نزمەوە لەهەردوو لای چیاکانی باریسانەوە. بەلام لە سرواك وسەباح زنجیرەیەك چیای بۆتە رێگرێکی سروشتی لەنێوان مالیزیا وپارێزگای کالیمنتانی ئەندەنووسی.

بەپێی دۆزینەوە مێژووییەکان، نیمچە دورگەی مالیزیا لەسەدەی سێیەمی پ.ز سەنتەرێکی شارستانی زۆر گەورە بووە. پۆرتۆگالییەکان لەساڵی ١٥١١ داگیریان کردووە، دوای ئەوان هۆڵەندییەکان لەساڵی ١٦٤١ دا، لەماوەی سەدەکانی هەژدەیەم ونۆزدەیەمدا ئینگلیزەکان داگیریان کردووە. لەساڵی ١٩٤٨ دا لەژێر حوکمی بەریتانیدا یەکێتی مەلایۆ دامەزراوە ولە بەرواری ٣١ / ٨ / ١٩٥٧ لەچوارچێوەی کۆمۆنوێلتی بەریتانی سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەو دەستوورەی کەلەو ساڵەدا دەرچووە، ئاینی ئیسلام بۆتە ئاینی فەرمی ولاتەکە.

دەوڵەتی مالیزیا لەساڵی ١٩٦٢ دا دامەزراوە، بەهۆی دامەزراندنی یەکێتییەك لەنێوان هەر یەك لە مەلایۆ وسەنگافورە وسرواك وسەباح، ئەو یەکێتییەش ناونرا بە یەکێتی مالیزیا.

مەلایۆ ولاتێکی سەربەخۆ بوو لەنێو نیمچە دورگەی مالیزیا، بەلام سرواك وسەباح دوو

داگیرکراوەی بەریتانی بوون. هەروەها سەنگافورەش کە دەکەوێتە باشووری مەلایۆ، داگیرکراوەیەکی بەریتانی بوو ( بەریتانی دەسەڵاتی بەسەر بەرگری و کاروباری ناوخۆی سەنگافورەی گرتبۆوە دەست). بەڵام بەو هۆیەوە کە یەکێتیەکە نەیتوانی ئەو ئامانجە ئابووریانە بپێکی کە چاوەڕوانی لێوە دەکرا، بۆیە سەنگافوره لە ٨ / ٨ / ١٩٦٥ لەو یەکێتییە کشایەوە.

مالیزیا لە ١٣ ویلایەت و دوو هەرێمی فیدرالی پێك دێت. سیستەمی حوکمڕانیی ئەو وڵاتە پادشایی دەستوورییە، بەڵام دەسەڵاتەکانی شا زۆر دیاری کراون لەگەڵ ئەوەی کە دەبێ ڕەزامەندی لەهەموو یاسایەکی پەرلەمان دەربڕێ، هەروەها شای وڵات بۆی هەیە لەسزای لەسێدارەدانی تاوانباران خۆش بۆی و بڕیاری لێبووردنی گشتی دەرکات. شای وڵات خاوەنی ئەم نازناوەیە بەزمانی مالیزی: یانگ دی برتوان ئەگۆنگ، مانای: ئەو پیاوەی کەبۆ گەورەیی خوڵقاوە. دەسەڵاتی فیعلی بەدەست سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە، کە خۆشی سەرکردەی زۆرینەیە لەنێو پەرلەماندا. لەساڵی ١٩٩٩ دا دکتۆر مەهاتیر محەمەد لە هەڵبژاردنە گشتییەکاندا سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

لەبەرواری ٢١ / ١١ / ٢٠٠١ دا شای وڵات لەتەمەنی ٧٥ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، مالیزیا تانکۆ سەید بوترا جەمال ئەلەیلیان ( ٥٨ ساڵ ) بەشای وڵات هەڵبژارد، میزان زەین ئەلدین ( ٣٩ ساڵ ) بەجێگری شای وڵات دیاری کرا.

لەبەرواری ٢١ / ٦ / ١٩٩٩ ، سەرۆکی وەزیرانی مالیزیا مەهاتیر محەمەد ، بوتراجایای بە پایتەختی ئیداری نوێ وڵات دیاری کرد، بوتراجایا نزیکەی ٤٠ کم لە باشووری پایتەختی سیاسی وڵاتەوە، کوالا لامبوورەوە دوورە ورووبەری نزیکەی ٤,٥٨٠ هێکتار دەبێت، زیاترین ماڵ و خانەکانی وەزیران وکاربەدەستانی وڵاتی گرتۆتە خۆ، نزیکەی ٢٢٠ هەزار فەرمانبەر لەو ناوچەیەدا نیشتەجێ بوون.

ناوی مالیزیا لەدوو برگە پێك هاتووە، مالایۆ: کە ناوی دانیشتوانە ڕەسەنەکانی ئەو وڵاتەن و نزیکەی ٦٥٪ ی ڕێژەی دانیشتوانی وڵات دەبن وتەواویان موسڵمانن وزمانیشیان بەهاسا مالیزیا کە زمانی فەرمی وڵاتە.

برگەی دووەم: ئیزیا: کە بەمانای کیشوەری ئاسیا دێت.

ئابووری مالیزیا بەیەکێك لە ئابوورییە هەرە بەهێزەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا دادەنرێت، دوای ئەوەی ئابووری ئەو وڵاتە پشتی بە فرۆشتنی تەختە ولاستیك وتەنەکە بەستبوو، لەم ساڵانەی دواییدا مالیزیا بووە یەکێك لەوڵاتە پیشەسازییە گەورەکان، مالیزیا ئەمڕۆ بەسێیەمین وڵات دێت لەجیهاندا لەبەرهەمی بابەتەکانی گواستنەوە، دوای ویلایەتە

یەکگرتوەکانی ئەمریکا ویابان، چەندین کۆمپانیای ئەمریکی ویابانی لەو ولاتەدا لەهەفتاکانی سەدەی پێشوو لەو ولاتە دامەزرێندراوە بەهۆی ئارامی سیاسی ئەو ولاتە وهەرزانی هێزی کار، ئەمەش بووە هۆی پێشخستنی مالیزیا لەزۆربەی بوارە جیاجیاکاندا.

گەشتوگوزار بە دووەم گەورەترین سەرچاوەی داهاتی دارایی مالیزیا دادەنرێت دوای پیشەسازی، سالانە نزیکەی ١٣ ملیۆن گەشتیار رووی تێدەکەن، زۆربەیان لە ولاتانی دراوسێ وئەورووپاوە سەردانی دەکەن. سەرچاوە گەشتوگوزارییەکانی مالیزیا خۆی لەکەنارە بە لم داپۆشراوەکان و دورگە زۆر جوانەکان دارستانە چڕەکاندا خۆی دەبینێتەوە، ئەمڕۆ بە مالیزیا دەوترێ یاقووتی سیحراوی.

مالیزیا بەپلەی یەکەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لە بەرهەمی زەیتی داروخورما وبەپلەی دووەم دێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی لاستیك وبەپلەی پێنجەم لەکاکاو وپلەی حەوتەم لەبەرهەمی تەنەکە.

سروودی نیشتیمانی: بەهەمووومان ئەی مالیزیا ئەتوانین بتکەینە ئەستێرەیەکی درەوشاوە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٦٨,٧ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٣٧ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٣,٥٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٥٧ .

## مەدغەشقەر

ناوی باو: مەدغەشقەر

ناوی فەرمی: کۆماری دیموکراسی مەدغەشقەر.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Democratic Republic of Madahascar

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٣٨ ئەندام ).

رووبەر: ٢٢٦,٦٥٨ میل دووجا، ٥٨٧,١٤١ کم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ١٤,٠٦٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ٢٤ کەس/کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو ولاتە: مالاغاسی، هیندی رۆژهەلاتی، پاکستانی، فەرەنسی، چینی، ئەندەنووسی.

ئاین: مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت)، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، موسڵمان ٢٥ ٪.

زمان: فەرەنسی، مالاغاسی.

پایتەخت: ئەنتاناناریڤۆ.

شارە سەرەکییەکان: تواماسینا، ئەنتسیراب، ماهاجانجا، ڤیانارانستوا.

دراو: فرانکی مالاغاسی.

ئاو وهەوا: کەناری رۆژهەلاتی ولات: نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ١٣ پلەی سەدی بۆ ٣٣ پلەی سەدی دەبێت، ساڵانە نزیکەی ٣ مەتر باران دەبارێت، لە بەرزاییەکاندا مام ناوەندە، نێوەندی پلەکانی گەرما ١٨ پلەی سەدی دەبێت، نێوەندی بارانەکان ١٢٠ سم . باشووری وڵات گەرم وزۆر وشکە.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: مەنیهۆت، گوڵ ورووەکە بۆندارەکان، قاوە، برنج، قامیشی شەکر، ڤانێلا، بەخێوکردنی مەڕ ومالات، راوەماسی، مۆز.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: دروستکراوە خۆراکییەکان.

سامانی کانزایی: بۆکسیت، کرۆم، خەڵووزی بەردین، گرانێت، بەردی پیرۆز.

تێڕوانینێکی گشتی:

مەدغەشقەر، یان مالاگاشی ( وەك جاران پێی دەوترا )، وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە لە زەریای هیندی، نزیکەی ٤٠٠ کم لە باشووری رۆژهەلاتی باشووری ئەفریقیاوە دوورە، بەرەو رووی مۆزامبیق کە کەناڵی مۆزامبیق لێکیان جیا دەکاتەوە.نزیکترین دورگە لێوەی دورگەکانی کۆمۆرە. مەدغەشقەر لەیەك دورگەی گەورە وچەند دورگەیەکی بچوکی دیکە پێك دێت. دورگەی مەدغەشقەر چوارەم دورگەیە لەجیهاندا لە رووی رووبەرەوە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٤٦ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ١٩ بەرەو باشوور.

بەشە باکوورییەکانی وڵات خاك وزەوییەکی بەپیتی لەخۆ گرتووە وبەهۆی زنجیرەیەك چیاوە لەبەشەکانی دیکەی وڵات جیابۆتەوە. ناوەڕاستی دورگەکەش بریتییە لە بانێکی بەرفراوان وچەند روبارێکی پیا تێپەڕ دەبێت، زیاترین ژمارەی دانیشتوانیش لەو بەشە نیشتەجێ بوون. بانەکان بەرەو رۆژئاوا لێژ دەبنەوە ودەشتێکی پان وبەرینیان پێك هێناوە. باشووری وڵاتیش لەچەند کەنارێکی بەرفراوان پێك هاتووە.

ئەندەنوسییەکان پ.ز بەرەو دورگەکە کۆچیان کردووە وتا سەدەی چواردەیەمی زاینی

بەرەو ناوچەکە هاتوون. کۆچبەرە ئەندەنوسییەکان زیاتر لە بەرزاییەکانی ناوەڕاستدا کۆبوونەتەوە، بەڵام کۆچبەرە ئەفریقی وعەرەبەکان لەناوچە کەنارییەکاندا نیشتەجێ بوون. لەسەدەی شانزدەیەمدا دەریاوانە ئینگلیز وفەرەنسی وپۆرتۆگالییەکان ڕوویان تێکردووە. لەساڵی ١٨٨٢ دا فەرەنسییەکان دەسەڵاتی خۆیان بەسەردا سەپاندووە. تا لەساڵی ١٨٩٦ دا خستویانەتە سەر داگیرکراوەکانیان. لەساڵی ١٩٤٦ دا بۆتە ئەندامی یەکێتی فەرەنسا. لەساڵی ١٩٥٨ دا مەدغەشقەر بەوڵاتێکی خاوەن ماف ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی کۆمەڵەی فەرەنسی ڕاگەیەنرا. لەبەرواری ٢٦ / ٦ / ١٩٦٠ بەتەواوەتی لەفەرەنسا سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان وناونرا کۆماری مالاگاشی. لەساڵی ١٩٧٥ دا ناوی وڵات لە مالاگاشی یەوە گۆڕا بۆ مەدغەشقەر

لەگەڵ ئەوەی لە فەرەنسا سەربەخۆ بووە، بەڵام دەسەڵاتی فەرەنسی هێزێکی پتەوی لەوڵاتدا مابووەوە.

یەکەم سەرۆکی وڵات دوای سەربەخۆیی: فیلیبەر تزیرا نانا بوو، دوای ئەو لە ساڵی ١٩٧٥ دا دیدی ڕاتسیراکا لەڕێی خۆپیشاندانێکی جەماوەری زۆرەوە وناچار کردنی دەست لەکار کێشانەوەی سەرۆکی پێشوو، دەسەڵاتی گرتە دەست. لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٣ دا ئەلبێرت زافی سەرکەوتنی بەدەست هێنا ودەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵام لەساڵی ١٩٩٦ دا ناچار کرا دەست لەکار بکێشێتەوە وسەرۆکی وەزیران نۆربێرت ڕاتسیرا هۆڤانا دەسەڵاتی گرتە دەست، بەڵام بۆ ساڵی دوایی دیدی ڕاتسیراکا دەسەڵاتی گرتەوە دەست.

لەبەرواری ١٦ / ١٢ / ٢٠٠١ دا هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکان بەڕێوە چوو، ململانێیەکی زۆر لەسەر ئەنجامەکانی هەڵبژاردن دروست بوو، سەرۆک دیدی ڕاتسیراکا هەوڵی دەدا ماوەی سەرۆکایەتی نوێ بکاتەوە، بەڵام ئەنجامەکانی خولی یەکەم هەڵبژاردنەکان بەو شێوەیە نەبوو بتوانێ بەرامبەر بە پاڵێوراوی ئۆپۆزسیۆن مارك ڕاڤالۆمانانا سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، بۆیە داوای دەکرد خولی دووەمی بۆ دابنرێتەوە وحکومەتی بەساختە کردن لەئەنجامەکاندا تاوانبار کرد، خۆی بەسەرکەوتوو دانا. بۆیە لەبەرواری ٢٢ / ٢ / ٢٠٠٢ دا خۆی بەسەرۆکی وڵات ڕاگەیاند وپشتی بە پشتگیری کردنی جەماوەر بەستبوو، شایەنی باسە خۆپیشاندانەکان هانی ئەم بڕیارەیان دابوو. وەخت بوو شەڕی ناوخۆ لەنێوان یاوەران ونەیارانی هەردوو سەرۆکدا هەڵگیرسێ. سەرلەنوێ دەنگەکان جیاکرانەوە، لە بەرواری ٢٩ / ٤ / ٢٠٠٢ دا دادگای باڵای مەدغەشقەر بڕیاری دا پۆستی سەرۆکی وڵات بە سەرۆکی ئۆپۆزسیۆن مارك ڕاڤالۆمانانا بسپێرێ، ئەویش لەلایەن خۆیەوە لە ٣ / ٥ /٢٠٠٢ دا سوێندی دەستووری خوارد ودەسەڵاتی

گرته دەست.

مەدغەشقەر بەیەکێك لەولاتە هەرە هەژارەکانی جیهان دادەنرێت، دیاردەکانی هەژاری لەهەموجێیەکی ئەو ولاتەدا دەردەکەوێت، نزیکەی ٨٠٪ ی دانیشتوانی ولات سەرقاڵی شوانی وبەخێوکردنی مەڕوماڵاتن، دانیشتوان پشتی تەواویان بە برنج وپەتاتە مۆز بەستووە لەژەمە خۆراکەکانیاندا، قاوەش بەسەرەکیترین بەرهەمی کشتوکاڵی دادەنرێت کەسوودی بۆ ئابووری ولات هەبێت، چونکە مەدغەشقەر بەشانزدەیەمین ولات دادەنرێت لەنێو ولاتانی جیهاندا لەبەرهەمی قاوە.

لەم ساڵانەی دواییدا لەناوچەی ئیلاکاکای باشووری رۆژهەڵاتی دورگەکە، بەردی سفێر دۆزراوەتەوە، کە جۆرێکە لە بەردی یاقووتی شین، لەگەڵ چەند جۆرێکی دیکەی بەردە پیرۆزەکان، بەڵام دەرهێنانی ئەو جۆرە بەردانە بەشێوازێکی زۆر سەرەتایی ودواکەوتووە. لە لێکۆڵینەوەیەکی حکومیدا ئاشکرا کراوە ئەو برە ئاڵتون وبەردە پیرۆزانەی باندەکانی مافیا بەشێوەیەکی قاچاغ رەوانەی دەرەوەی ولاتیان کردووە لەساڵی ٢٠٠٠ دا بایی ١٠٠ ملیۆن دۆلاری ئەمریکییە، هەروەها لە لێکۆڵینەوەکەدا هاتووە ئەگەر بێت ومەدغەشقەر سامانە کانزاییەکانی بەشێوەیەکی باش بەگەڕ بخات ئەوا دەبێتە ولاتێکی دەوڵەمەند وئەگەری ئەوەی هەیە هێندە دەوڵەمەند بێت حکومەت باج لەهاولاتیان وەرناگرێت.

**سروودی نیشتیمانی:** نیشتیمانی خۆشەویستمان.

**جەژنی نیشتیمانی:** ٢٦ / ٦، یادی سەربەخۆیی ولات لە ساڵی ١٩٦٠ .

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٣,٠٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا:** ١٢١ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٢٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا:** ١٧٥ .

## میسر

**ناوی باو:** میسر

**ناوی فەرمی:** کۆماری میسری عەرەبی

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Arab republic of Egypt

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی گەل ( ٤٥٤ ئەندام ).

**رووبەر:** ٣٨٥,٢٢٩ میل دووجا، ٩٩٧ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٧٥,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠٧ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٦٥ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** عەرەب.

**ئاین:** موسڵمان ( ٩٤ ٪ )، مەسیحی ( قیپتی ٦ ٪ ).

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** قاهیرە.

**شارە سەرەکییەکان:** ئەسکەندەرییە، گیزە، ئەسوان، بوور سەعید، فەیووم، دومیات، ئەسیووت، بەنی سوێف، لوقسوور، مەنسوورە.

**دراو:** جونەیهی میسری.

**ئاو وهەوا:** بەشێوەیەکی گشتی بەگەرم دادەنرێت، لەکەناری باکوور ودۆڵی نیل وباکووری نیمچە دورگەی سینا: مام ناوەندە، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٣ پلەی سەدی لە زستاندا و٢٦ پلە لەهاویندا، بارانەکانیش لە وەرزی زستاندا دەبارێت ونێوەندی ساڵانەی لەشاری ئەسکەندەرییە دەگاتە ٢٠٤ ملم. میسری ناوەڕاست نیمچە بیابانییە، پلەکانی گەرما لەزستاندا ٦ پلەی سەدی و لەهاویندا ٣٧ پلەی سەدی دەبێت، بارانەکان زۆر کەمن، لەبەشەکانی دیکەی وڵاتدا ئاووهەوا بیابانییە: نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا ٦ پلەی سەدی ولەهاویندا ٤١ پلەی سەدی دەبێت، بارانی زۆر بەدەگمەن لێدەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** ترشەڵۆکییەکان، لۆکە، گەنمەشامی، قامیشی شەکر، پەتاتە، تەماتە، گەنم، سەوزە ومیوە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروست کراوە کیمیاییەکان، چنین، دروست کراوە خۆراکییەکان، دەرمان، ئەلەمنیۆم، دروست کراوە کانزاییەکان.

**سامانی کانزایی:** نەوت، ئاسن، مەنگەنیز، فۆسفات، گاز.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

میسر وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە بەشی باکووری ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئەفریقیا، دەریای سپی ناوەڕاست دەکەوێتە باکووری، فەلەستین و کەنداوی عەقەبە ودەریای سوور دەکەونە ڕۆژهەڵاتی، سودان دەکەوێتە باشووری، لیبیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٣٠ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٦ بەرەو باکوور. ڕوباری نیل لە باشوورەوە بۆ باکوور پیا تێپەڕ دەبێت، بەڕەگی سەرەکی ژیانی میسر دادەنرێت.

میسر بەیەکەم وڵات دادەنرێت لەنێو وڵاتە عەرەبییەکاندا لەرووی ژمارەی دانیشتوانەوە و دووەم وڵاتی ئەفریقییە لە رووی ژمارەی دانیشتوانەوە دوای نەیجیریا، هەروەها قاهیرەی پایتەخت بەگەورەترین شار دادەنرێت لەنێو وڵاتە عەرەبی وئەفریقییەکاندا.

زەوییەکانی میسر بریتین لە دەشتێکی بیابانی بەرفراوان، چەند نزماییەکی وەکو سیوە و قەتارەی تێدەکەوێت. زنجیرەیەك چیاش دەکەونە سەر بەشێك لە سنوورەکانی: چیای کاترینا دەکەوێتە باشووری سینا، چیاکانی دەریای سوور دەکەونە سەر کەناری دەریای سوور. لەباشووری ڕۆژئاواش هەندێ بانی تێدەکەوێت تەواوی زەوییە کشتوکاڵییەکان دەکەونە سەر دۆڵی نیل کە نزیکەی ٥٠ ٪ ڕووبەری ئەو وڵاتە دەبێت.

بە میسر دەوترێت: دایکی نەتەوەکان چونکە لەو وڵاتەدا دێرین ترین شارستانیەت دامەزراوە، ئەویش شارستانێتی فیرعەونەکانە کە نزیکەی پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر لەسەر کەنارەکانی نیل دامەزراوە. ئەغریقی و فارس وڕۆمانەکان لەچەند ماوەیەکی جیاوازدا دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. عەرەبە ئیسلامەکان لەسەردەمی خەلیفەی ئیسلامدا عومەری کوڕی خەتاب لە ساڵی ٢٠ ك / ٦٤١ ز بەسەرۆکایەتی عومەری کوڕی عاس والأیان کردووە، بۆتە بەشێك لەدەوڵەتی ئیسلامی کە راشیدییەکان وئەمەوییەکان وعەباسییەکان بەدوای یەکدا حوکمیان کردووە. دوای عەباسییەکان کەوتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی فاتیمی لەپاشدا ئەیوبییەکان، لەدوای ئەوان مەمالیکەکان بەر لەوەی دەسەڵاتی هێزە عوسمانییەکان لەناوچەکەدا بسەپێنرێت لەساڵی ١٥١٧ ز . فەرەنسییەکان لەنێوان ساڵەکانی ١٧٩٨ فەرەنسییەکان دەسەڵاتی میسریان گرتە دەست. لەساڵی ١٨٨٢ هێزە بەریتانییەکان داگیریان کرد. بەریتانیا لەساڵی ١٩٢٢ دا دانی ناوە بەسەربەخۆی میسر. لە بەرواری ٢٣ / ٧ / ١٩٥٢ دا شۆڕشی میسر کودەتای بەسەر ڕژێمی پادشایی میسر کرد ودوای ئەوەی شا فاروقی شای میسر وڵاتی بەجێ هێشت لە ساڵی ١٩٥٣ دا میسر بە کۆمار ڕاگەیەنرا. جەمال

عەبدول ناسیر لەساڵی ١٩٥٤ دا دەسەڵاتی گرتە دەست وبووە سەرۆكی كۆمار. لەساڵی ١٩٥٦ یەكەم دەستووری نویٚ وڵات داڕێژرا وچۆنیەتی هەڵبژاردنی سەرۆكی كۆماری تیا دیاری كرابوو. سەرۆك عەبدول ناسیر لەهەر یەك لەم ساڵانە بەسەرۆكی كۆمار هەڵبژێردراوەتەوە: ١٩٥٦ و ١٩٥٨ و ١٩٦٥. پاش ئەوەی جەمال عەبدول ناسیر لەساڵی ١٩٥٨ دا كەناڵی سوێسی خۆماڵی كرد، میسر دووچاری شەڕی سێلایەنانەی فەرەنسا وبەریتانیاو ئیسرائیل بووەوە. لەساڵی ١٩٥٨ دا یەكێتی نێوان میسر وسوریا ڕاگەیەنرا ونزیكەی سیٚ ساڵی خایاند، ناوی یەكێتی نێوانیان بەهەرێمی باشووری كۆماری عەرەبی یەكگرتوو ناو نرابوو. دوای ئەوەی سوریا لێی جیا بۆوە میسر ناوی بووە: كۆماری عەرەبی یەكگرتوو، تا لەساڵی ١٩٧٠ ناوی بووە كۆماری میسری عەرەبی، ئەو ناوەی ئێستای.

لەبەرواری ٥ / ٦ / ١٩٦٨ دا جەنگی سێیەمی عەرەب ئیسرائیل هەڵگیرسا، لەشەڕەكەدا میسر نیمچە دورگەی سینای لەدەست دا. لەبەرواری ٦ / ١٠ / ١٩٧٣ شان بەشانی سوریا هێرشێكی توندیان كردە سەر ئیسرائیل و زیانێكی باشیان پیٚ گەیاند، لەئەنجامەكانی ئەو جەنگە ڕێكەوتننامەی نێوان میسر و ئیسرائیل بوو كە لە بەرواری ٢٦ / ٣ / ١٩٧٩ واژۆ كرا. بەپێی ڕێكەوتننامەكە ئیسرائیل لە ١٩٨٢ دا لە نیمچە دورگەی سینا كشایەوە.

دوای ئەوەی سەرۆك جەمال عەبدول ناسیر كۆچی دوایی كرت، محەمەد ئەنوەر ئەلساداتی جێگری بووە سەرۆكی وڵات، ئەنوەر ئەسادات لە ساڵانی ١٩٧٠ و ١٩٧٦ هەڵبژێردراوەتەوە. لەساڵی ١٩٨٢ دا لەكاتی نمایشێكی سەربازیدا محەمەد ئەنوەر ئەلسادات تیرۆر كرا و محەمەد حوسنی موبارەك دەسەڵاتی گرتە دەست. حوسنی موبارەكیش لەساڵەكانی ١٩٨١ و ١٩٨٧ و ١٩٩٣ و ١٩٩٩ هەڵبژێردراوەتەوە، ئێستاش هەر سەرۆكی كۆمارە ٢٠٠٨ .

میسر یەكێكە لەو حەوت وڵاتەی كۆمەڵەی وڵاتە عەرەبییەكانی دامەزراند لەساڵی ١٩٤٥ دا ، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

بەتەواوی مانای ناوی میسر نەزانراوە، بەڵام ئەوەی كە گومانی تێدا نییە ئەوەیە كە ئەم ناوەی لەسەردەمی پێش ئیسلامدا بەكار هاتووە ( سەدەی حەوتەمی زایینی )، بەو پێیە كە لەپێنجی ئایەتی قورئانی پیرۆزدا ناوی ئەو وڵاتە هاتووە، یەكێكیان لە ئایەتی ٥١ ی سورەتی زەخرف، ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم : ونادى فرعون في قومه قال يا قوم اليس لي ملك مصر﴾ .

یاقووتی حەمەوی دەڵێت ناوی میسر لەناوی میسری كوڕی میسرایمی كوڕی حامی كوڕی حەزرەتی نوحەوە هاتووە ( س ). بەڵام هەشە دەڵێت وشەی میسر بەرەچەڵەك وشەیەكی فیرعەونییە وبەلێكدانی سیٚ وشەوە هاتووە وبەمانای وڵاتی ڕۆڵەكانی خۆر دێت، سیٚ

وشەکەش:

ما: بەمانای جێ یان شوێن دێت.

سی: بەمانای ناو یان رۆڵە دێت.

ری: بەمانای خۆر دێت.

بەڵام ناوە ئینگلیزییەکەی ئیجیپت Egypt لەوشەی یۆنانی ئیجیپتۆسەوە هاتووە، کەلەسێ وشەی دێرینی میسرییەوە وەرگیراوە: هیك ئاپ تاه وەرگیراوە کەبەمانای خانەی رۆح دێت، ئەو ناوەش بە شێنی ممفیس دەوترا کە یەکەم پایتەختی میسر بووە ودەکەوێتە نزیك قاهیرەی پایتختی ئێستاوە.

میسر وڵاتێکی تازە پێگەشتووە، هەندێ کێشەی ئابووریشی هەیە، ئاسەواری سیاسەتەکانی ساڵانی حەفتاکانی سەدەی پێشوو زۆر بەرەو دواوەی بردووە، بەڵام لەم ساڵانەی دواییدا، تا ئاستێ گەشە کردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینییوە.

گەشتوگوزار بەشداری بەشێکی باشی لەداهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتەی کردووە، ساڵانە نزیکەی ٥ ملیۆن گەشتیار سەردانی ئەو وڵاتە دەکەن، داهاتەکانی گەشتوگوزار لەم ساڵانەی دواییدا گەیشتە چوار ملیار دۆلاری ئەمریکی.

میسر بە پلەی حەوتەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە چاندنی ترشەلۆکییەکان وبەپلەی هەشتەم دێت لە بەرهەمی لۆکە وبەپلەی سیانزدەیەم دێت لەبەرهەمی گەنمەشامی، بەپلەی چواردەیەم دێت لەبەرهەمی برنج وقامیشی شەکر وبەپلەی حەڤدەیەم دێت لەبەرهەمی پیترۆل، هەژدەیەم لە پەدەگی گازو نۆزدەیەم لە گەنم.

سروودی نیشتیمانی: وڵاتم وڵاتم وڵاتم، خۆشەویستی ودڵم بۆتۆیە.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٣ / ٧ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٥٢ .

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٤٠,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٤٨ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٧١٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣١ .

## مەغریب

**ناوی باو:** مەغریب

**ناوی فەرمی:** شانشینی مەغریب

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kigdom of Morocco

**سیستەمی حوکمرانی:** پادشایی دەستووری، شا خۆی سەرۆکی حکومەتەو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران یارمەتی دەدات.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان و لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٢٥ ئەندام )
- ئەنجومەنی راوێژكاران ( ٢٧٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ١٧٧,١١٧ میل دووجا، ٤٥٨,٨٣٠ كم$^2$ - ٢٦٦,٠٠٠ كم$^2$ لە رووبەری بیابانی رۆژئاوا.

**ژمارەی دانیشتوان:چڕی دانیشتوان:** ٩٠ كەس/كم$^2$

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** عەرەب ، بەربەر.

**ئاین:** موسڵمان.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** ریبات.

**شارە سەرەكییەكان:** دارولبەیزا ( پایتەختی ئابووری)، مەراكش، فاس، ئەگادیر، سەبتە، ملیلە، ئاسفی.

**دراو:** درهەمی مەغریبی.

**ئاو وهەوا:** لەناوچە كەنارییەكان: زستان مام ناوەندە وهاوین فێنكە. نێوەندی پلەكانی گەرما لە پایتەخت لەنێوان ١٩ پلەی سەدی لەزستانداو ٢٥ پلەی سەدی لەهاویندا، رێژەی ساڵانەی بارانەكان ٥٢٣ ملم. لەبەشە ناوخۆییەكان ٢٢٩ ملم وهەندێ جار دەگاتە ٨٠٠ ملم لەساڵێكدا.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** ترێ، زەیتون، ترشەڵۆكییەكان، خورما، سەوزە ومیوە، بەخێوكردنی مەڕوماڵات، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** چنین، چیمەنتۆ، دروستكراوەكانی پێست، كاغەز، دروستكراوە خۆراكییەكان، سیرامیك.

سامانی کانزایی: فۆسفات، ئاسن، نەوت، گاز، مەنگەنیز، قورقوشم، زنك، زیو، تەنەکە، خەڵوز، نیکل، گۆگرد، کۆبالت، مس.

تێڕوانینێکی گشتی:

مەغریب وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە گۆشەی باکووری رۆژئاوای ئەفریقیا، دەریای سپی ناوەڕاست دەکەوێتە باکووری، جەزائیر دەکەوێتە رۆژهەلات وباشووری، مۆریتانیا دەکەوێتە باشووری، زەریای ئەتڵەسیش دەکەوێتە رۆژئاوای. تەنگەی چیای تاریق کە ئەوپەڕی پانتاییەکەی ١٣ کم دەبێت لە کیشوەری ئەوروپای جیادەکاتەوە، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٣٢ بەرەو باکوور.

دەشتە کشتوکاڵیەکان دەکەونە سەر کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاست وزەریای ئەتڵەسی. چیاکانی ئەلریف یان ئەتڵەس بەتەنیشت دەریای سپی ناوەڕاستدا درێژ دەبێتەوە و لەناوەڕاستی وڵاتەوە لە باشووری رۆژئاواوە تا باکووری رۆژهەلات تێپەڕ دەبێت، بیابانە وشکو چۆڵەکانیش دەکەونە باشوور ورۆژهەلاتی زنجیرە چیای ئەتڵەس. بەلام لەنێوان زنجیرە چیاکانیشدا دەشت ودۆڵێکی بەپیت ولەباری بۆ کشتوکاڵی تێدەکەوێت.

لەسەدەی دووەمی پ.ز فینیقییەکان داگیرکراوە بازرگانییەکانیان لەناوچەکەدا پێك هێناوە. دوای ئەوان ناوچەکە کەوتە ژێر دەسەلاتی قەرتاجی ورۆمانەکانەوە. خێڵەکانی بەربەر لەسەرەتاکانی سەدەی شەشەمی زایین داگیریان کردووە. عەرەبە ئیسلامەکان لەسەر دەستی عەقبەی کوڕی نافیع لەساڵی ٦٢ ك / ٦٨١ ز چوونەتە ناوی ، بەلام ئاینی ئیسلام لەسەر دەستی موسای کوڕی نەسیر لە ساڵی ٨٧ ك / ٧٠٧ ز / بەتەواوی لە مەغریبدا بلاوبۆتەوە. چەند دەوڵەتێکی ئیسلامی لەوێدا دامەزراوە، وەك دەوڵەتی مورابتین و دەوڵەتی مووەحەدین. لە ٢٠ / ٣ / ١٩١٢ دا بۆتە پارێزراوەیەکی فەرەنسی، دوای زنجیرەیەك راپەڕین وشۆڕشەکان لە بەرواری ٢ / ٣ / ١٩٥٦ دا سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان، ئیسپانیاش لەلایەن خۆیەوە لەو زەویانەی لە باکووری مەغریبدا داگیری کردبوو کشایەوە جگە لەهەردوو شاری سەبتە و ملیلە و لەو دورگانەی سەر کەناری دەریای سپی ناوەڕاست نەبێ. لەسەردەمی شا محەمەدی پێنجەم کەلەساڵی ١٩٦١ دا کۆچی دوایی کرد، حسێنی دووەمی کوڕی شا محەمەد بۆتە سەرۆکی وەزیران.

لەبەرواری ٢٣ / ٧ / ١٩٩٩ دا شای مەغریب حسێنی دووەم کۆچی دوایی کرد، لەهەمان رۆژدا محەمەد کوڕی کرایە شای مەغریب. دوای دوو رۆژ لەو بەروارە وبەئامادە بوونی زیاتر

له ٤٠ سەرۆك ولات شا حسێنی دووەم بەخاك سپێردرا.

شا محەمەدی شەشەم نازناوی خاوەن شكۆی بە خۆی هەڵبژارد ورۆژی ٣٠ / ٧ ی كردە جەژنی نیشتیمانی ولات چونكە لە بەرواری ٣٠ / ٧ / ١٩٩٩ دا دەسەلاتی فیعلی گرتە دەست وچووە سەر تەختی پادشایی ولات وهەروەها داوای كرد كە لە ٣٠ / ٧ ی هەموو سالێك سەر لەنوێ مەراسیمی هەڵبژاردنەوەی بۆ بكرێت. شا محەمەدی شەشەم خۆی بە یەكێك لەنەوەكانی پێغەمبەری ئیسلام ( د ) دەزانێ. شایەنی باسە شا محەمەد ٢٢ هەمین شای دەوڵەتی عەلەوییە كە لەناوەراستی سەدەی حەڤدەیەمدا دامەزراوە.

لە بەرواری ٣٠ / ٧ / ٢٠٠٠ دا گەلی مەغریب لەبەردەم كۆشكی پادشایی لە ریباتدا كۆبوونەوە وشایان هەڵبژاردەوە، بەپێی ئەو دابونەریتانەی كە كرابووە باو بۆ هەڵبژاردنەوەی ناوبراو، شا محەمەد بەسواری ئەسپێكی سپییەوە هاتە نێو گورەپانی كۆشكەوە وبەسەدان كۆیلەی رەش پێست چوار دەوریان گرتبوو، لەبەردەمیشیدا بەسەدان وەزیر وكاربەدەستانی حكومەت بەعەبای سپییەوە سەریان دانەواند وبەدەم سەر دانەواندن وكرنووشەوە دەیان وت: خوایە شا بپارێزێت وتەمەنی درێژ كەیت، مەراسیمەكە زیاتر لە نیو كاتژمێری خایاند.

لە بەرواری ١٢ / ٧ / ٢٠٠٢ دا شا محەمەد سەلما ئەلبەنانی ( ٢٤ سالْ ) مارە كردوو وبووە شاژنی مەغریب. سەلما خەڵكی شاری فاسە وئەندازیاری زانیارییەكانی كۆمپیوتەر بوو لەكۆمپانیایەكی ئەو شارە. ئاهەنگی ژن هێنانی شای مەغریب نزیكەی هەفتەیەكی تەواوی خایاند.

لەدوای سەربەخۆیی ولاتەوە لە ١٩٥٦ ، مەغریب داوای گەرانەوەی هەردوو شاری سەبتە وملیلە لە ئیسپانیا دەكاتەوە، ئیسپانیا لەسەدەی شانزدەیەمەوە دەسەلاتی ئەو دوو شارەی گرتۆتە دەست، دوایین ئەو ناوچانەن كە ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا گرتبوونی، بەو هۆیەوە كە ئەو دوو شارە كەوتونەتە نێوان هەردوو كیشوەری ئەفریقیا وئەورووپاوە بۆتە ناوچەیەكی قاچاغچێتی باندەكانی مافیا بەهەموو جۆرەكانییەوە . مەغریب لەهەموو بۆنەیەكدا ئەم داواكاریانە پێشكەش دەكات بەلام ئیسپانیا بەردەوام جەخت لەسەر ئەوە دەكاتەوە كە ئەو دوو شارە بەشێكن لە زەوییەكانی خۆی.

ئابووری مەغریب ئابوورییەكی پاشكەوتووە، پشتی تەواوی بەكشتوكاڵی وكانزاكانی بەستووە. حكومەت كۆنترۆڵی تەواوی چالاكییە پیشەسازییەكان كردووە. رێژەی بێكاری وهەژاری لەو ولاتەدا بەرزە، هەندێ سالْ چالاكییە كشتوكاڵیەكانیش دووچاری كێشەی گەورە دەبنەوە بەهۆی بێ ئاوی و وشكە سالیەوە، بەلام گەشتوگوزاریش تا ئاستێكی كەم بەشداری لە تێكرای داهاتی نەتەوەیی ئەو ولاتە كردووە.

لەبەرواری ٢١ / ٨ / ٢٠٠٠ دا شای مەغریب محەمەدی شەشەم رایگەیاند کە وڵاتەکەی چەند بیرێکی نەوتی دۆزیوەتەوە لەناوچەی تالاسنت کە نزیکەی ٢٠٠ کم لە سنوورە مەغریبی جەزائیرییەکانەوە دوورە، ئەو بڕەی کە دۆزراوەتەوە بەنزیکەی ٢٠ ملیار بەرمیل نەوت مەزەندە دەکرێ.

لە راپۆرتێکدا کەلە ساڵی ٢٠٠٢ دا لەلایەن سەنتەری لێکۆڵینەوەی نیشتەجێ بوونەوە ئامادەکرابوو، باسی لەوە کردووە کە لەنێوان هەر پێنج مەغریبییەکدا یەك کەسی هەژار دەردەکەوێت، زیاترینی ئەو هەژارانەش لەناوچە گوندنشینەکاندا کۆبوونەتەوە، راپۆرتەکە بەوە کۆتایی هات کە پێویستە حکومەت هەوڵی باشتر بدات وپلانی باشتر دابرێژی بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە.

مەغریب بە پلەی شەشەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەچاندنی زەیتون وبەپلەی نۆیەم دێت لە قوڕقوشم و یانزدەیەم لە بەرهەمی ترشەڵوکییەکان و نۆزدەیەم لەبەخێوکردنی مەڕ، هەروەها بەپلەیەکی پێشکەوتوو دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی فۆسفات.

سروودی نیشتیمانی: پەروەردگار، نیشتیمان، شا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣٠,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٤ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,١٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١١٠

## مەگدۆنیا

**ناوی باو:** مەگدۆنیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری مەگدۆنیا

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Mecedonia

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی کۆمار ( ١٢٠ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٩,٩٢٨ میل دووجا، ٢٥,٧١٣ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ٧٧,٥ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** مەگدۆنی ( سلاڤی )، ئەلبانی، تورك، قەرەج، سرب.

**ئاین:** مەسیحی ( کڵێسەی ئەرتۆدۆکسی ڕۆژهەڵات، ڕۆمان کاسۆلیك)، موسڵمان، جوولەکە.

**زمان:** مەگدۆنی.

**پایتەخت:** سکۆبیا.

**شارە سەرەکییەکان:** بیتۆلا، بریلیب، کۆمانۆڤۆ، نیتۆڤۆ.

**دراو:** دیناری مەگدۆنی.

**ئاو وهەوا:** زستانی سارده وهاوینی فێنکە، نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا سفر پلەی سەدی و لەهاویندا ٢٥ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٥ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** سێو، ترێ، گەنمەشامی، لۆکە، گەنم، توتن، بەخێوکردنی بەروماڵات، پەلەوەر، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئاسن وپۆڵا، چیمەنتۆ، چنین.

**سامانی کانزایی:** کرۆم، ئاسن، مس، مەنگەنیز، یۆرانیۆم، قورقوشم، زنك.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

مەگدۆنیا وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا لەنیمچە دورگەی بەلقان. یۆگۆسلاڤیا دەکەوێتە باکووری، بولگاریا دەکەوێتە باکووری ڕۆژهەڵاتی، یۆنان دەکەوێتە باشووری، ئەلبانیا دەکەوێتە ڕۆژئاوای. هیچ کەنارێکی نییە، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٢ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤١/٣٠ بەرەو باکوور.

زۆربەی خاکی مەگدۆنیا بریتییە لە گرد و چیاکان. دارستانەکانی دار سنەوبەر وبەڕوو و

زان زۆربەی ناوچەکانی گرتۆتەوە بەتایبەتی لە بەشی رۆژئاوادا. روباری ڤاردار، گەورەترین روبارەکانی مەکەددگدۆنیا، لەبەرزاییەکانی باکووری رۆژئاواوە هەڵدەقوڵێ وبە ناوەڕاستی وڵات وباشووردا تێپەڕ دەبێت.

مەگدۆنیا لەرووی مێژووەوە وڵاتێکی زۆر دێرینە، دێرینترین ناوچەی نیشتەجێ بوون لەو وڵاتەدا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٦٢٠٠ پ.ز . لەنزیکەی ساڵی ٧٠٠ پ.ز گەلێکی نەناسراو بەناوی مەگدۆنەوە لەناوچەکەدا ژیاون وناوی وڵاتیش لەوانەوە هاتووە، وڵاتێکی زۆر بەهێز بوون بەتایبەتی کاتێ شای ئەو وڵاتە ( ئەسکەندەری مەگدۆنی ) یان ئەسکەندەری گەورە دەسەڵاتی وڵاتەکەی گرتۆتە دەست وبەرفراوانییەکی زۆری بەخۆوە بینییەوە، چەندین ناوچەی ئاسیاشی گرتۆتەوە، توانیویەتی کەلتووری مەگدۆنی وئەغریقی لەزۆربەی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتەکەیدا بڵاو بکاتەوە، بەڵام دوای کۆچی دوایی ئەسکەندەری مەگدۆنی لەساڵی ٣٢٣ پ.ز ، مەگدۆنیا روخاو وکەوتە ژێر دەسەڵاتی رۆمانەکانەوە لەساڵی ٢٤٠ پ.ز، وبەمەش بووە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانی.

لەسەرەتای سەدەی چواردەیەمی زایین، ناوچەکە کەوتە ژێر دەسەڵاتی سربەکان، لەپاشدا لەساڵی ١٣٧١ کەوتە ژێر دەسەڵاتی تورکە عوسمانییەکان، عوسمانییەکان نزیکەی پێنج سەد ساڵ دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. دوای روخانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هەریەك لە سربیا و یۆنان وبولگاریا لەدوای جەنگی بەلقانی دووەم لە ١٩١٣ دا خاکی مەگدۆنیایان لەنێوان خۆیاندا دابەش کرد. بەشە سربییەکانی ئەو وڵاتە لەساڵی ١٩٤٦ دا بووە یەکێك لەکۆمارەکانی یەکێتی یۆگۆسلاڤیا، بەم شێوەیە مایەوە تا لەساڵی ١٩٩١ سەربەخۆ بووە وهەر یەك لە کرواتیا وسلۆڤینیا لەیەکێتی یۆگۆسلاڤیا جیابوونەوە، مەگدۆنیا لەبەرواری ٨ / ٤ / ١٩٩٣ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

یەکەم سەرۆکی مەگدۆنیا دوای سەربەخۆیی کیرۆ جیلجۆرۆف بووە، کە بەباوکی روحی سەربەخۆیی وڵات دادەنرێت. جیلجۆرۆف تا خانە نشینی بوونی لە ١٩٩٩ دا لەتەمەنی ( ٨١ ساڵی ) لەدەسەڵاتدا مایەوە. لە بەرواری ١٤ / ١١ / ١٩٩٩ هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لەمەگدۆنیا بەڕێوە چووە و پاڵێوراوی زۆرینەی حکومەت بۆریس ترایسکۆفسکی ( ٤٣ ساڵ ) سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی کۆمار.

باکووری یۆنان ناوچەیەکی لەخۆ گرتووە بەناوی مەگدۆنیا، یۆنان ترسی ئەوەی هەیە کۆماری مەگدۆنیا لەچوارچێوەی پرۆژەی مەگدۆنیای گەورە بیخاتەوە سەر خۆی، بۆیە یۆنان ئابلۆوقەی ئابووری خستە سەر، بەڵام بەهۆی دانوستانەکانی نێوان هەردوو وڵات بەچاودێری نەتەوە یەکگرتوەکان و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەساڵی ١٩٩٥ هەردوولا

گەیشتنە ئەنجامێك بۆ ڕێز گرتن لە سەروەری یەكتر ودەست درێژی نەكردە سەر خاكی یەكتر، لەئاكامدا یۆنانیش ئابلووقەی لەسەر لابرد.

ئەلبانییەكانی مەگدۆنیا ٣٠ ٪ ی ڕێژەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە دەبن، بەڵام سلاڤییەكان زۆرینەی وڵاتیان پێك هیناوە، دەسەڵاتی حكومەت وپلە وپایە بەرزەكانی بەدەست سلاڤییەكانە، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕێكی ناوخۆ وتوند لەنێوان هێزە حكومییەكان وهێزەكانی سوپای ئازادی نیشتیمانی ئەلبانی مەگدۆنیا لە مانگی سێی ٢٠٠١ دا، سوپای نیشتیمانی ئەلبانی مەگدۆنیا لەسەر سنوورەكانی كۆسۆڤۆ خۆی ئامادە كردبوو وهەر لەوێشەوە مەشق وچەكێكی زۆری كەوتبووە دەست. شەڕەكە زیاتر ئەو ناوچانەی گرتبۆوە كە دانیشتوانە ئەلبانییەكانی لەخۆی گرتبوو، كە پێك دێت لە ناوچەی تانۆسیڤسی لەباكوور وشاری تیتۆڤۆ كە گەورەترین دووەم شاری ئەو وڵاتەیە دوای سكۆبیای پایتەخت. هێندەی نەخایاند گەلی ئەلبانیا سۆزێكی زۆریان بەرامبەر سوپای نیشتیمانی ئەلبانی دەربڕی و بەهەموو شێوەیەك یارمەتیان دەدان، داواكاریەكانی سوپای ناوبراو لە بەخشینی ماف زیاتر بە ئەلبانەكان و دان نان بەزمانی ئەلبانی ورێگەدان بەڕۆڵەكانی بە گرتنە دەستی پلە وپایە بەرزەكان وەك سلاڤییەكانی ئەو وڵاتە ڕۆڵێكی گەورەیان هەبێت لەنێو پۆلیسی مەگدۆنیادا خۆی دەبینێتەوە.

دوای نزیكەی شەش مانگ لەشەڕ وپێكدادان لەنێوان هێزە حكومییەكان وسوپای نیشتیمانی ئەلبانی وكوشت وبڕ وبریندار بوونی بەدەیان كەس لەهەردوولا و وێران كردنی دام ودەزگایەكی حكومی وئەهلی زۆر، ئاوارە بوونی ژمارەیەك هاوڵاتیان بەرەو وڵاتانی دراوسێ، حكومەتی مەگدۆنی ونوێنەرانی پارتە سیاسییەكانی ئەلبانییەكان لە بەرواری ١٣ / ٨ / ٢٠٠١ دا بەچاودێری خێزانی نێودەوڵەتی ڕێكەوتننامەیەكی یەكجارەكی ئاشتیان واژۆ كرد، ڕێكەوتننامەكە پێك هاتبوو لە:

١. دان نان بەزمانی ئەلبانی وەك زمانی دووەم لەو ناوچانەی كە ئەلبانییەكان نیشتەجێی بوون.

٢. زیاد كردنی ژمارەی ئەلبانییەكان لەنێو پۆلیسی ئەو شارانەی كە ئەلبانییەكان نیشتەجێ بوون.

٣. پشتیوانی حكومەتی مەگدۆنیا لەو فێرخوازانای بە زمانی ئەلبانی قسە دەكەن.

٤. زیاد كردنی بەندێك لە دەستووری ئەو وڵاتە تیایدا ئاینی ئیسلام لەگەڵ ئاینی مەسیحدا لەبەردەم یاسا یەكسان بن.

٥. لەدەستووردا ئاماژە بە (هاوڵاتیانی كۆماری مەگدۆنیا بدرێت) بێ ئەوەی باس لە

هیچ ڕەچەڵەکێکی نەژادی بکرێت.

٦. دەست بەجێ ڕاگرتنی شەڕ لەتەواوی ناوچەکاندا وچەك دانانی شۆڕشگێڕە ئەلبانییەکان.

٧. ناتۆ ( هاوپەیمانی باکووری ئەتڵەسی ) هەڵدەستێت بە بڵاوکردنەوەی ٣٥٠٠ ئەندام لە هێزەکانی ئاشتی پارێز بۆ مسۆگەر کردنی جێبەجێ کردنی بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە.

بەڵام بابەتی خۆشبوون ولێبوردن لە شۆڕشگێڕەکان تاوتوێ نەکرا، چونکە ئەگەرچی شەڕەوانان باوەڕیان بە ئاشتییەکی یەکجارەکی هەبوو بەڵام ئامادەی دانوستانەکان نەبوون. هەروەها لەڕێکەوتننامەکەدا هاتبوو کە پەرلەمانی مەگدۆنی پێویستە لەماوەی ٤٥ ڕۆژدا ڕەزامەندی خۆی لە بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە دەربڕێ. بەڵام سەرۆکی پەرلەمان بەر لە ڕەزامەندی ڕاگەیان کە پێویستە پێش هەموو شتێك شەڕەوانان چەك بکرێن وچەکەکانیان دانێن، شەڕەوانانیش لەلایەن خۆیانەوە ڕایانگەیاند تا بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە بەشێوەیەکی فیعلی جێ بەجێ نەکرێ چەك دانانێن.

لەبەرواری ١٧ / ٨ / ٢٠٠١ دا ناتۆ دەستی کرد بەبڵاوکردنەوەی هێزەکانی ئاشتی پارێز لە مەگدۆنیا، پرۆسەکە ناوی لێنرا: دوروێنەی سەرەکی ولەبەرواری ٢٠ / ٨ / ٢٠٠١ دا دەست کرا بە کۆکردنەوەی چەکەکانی شەڕەوانە ئەلبانییەکان. لەبەرواری ١٨ / ١١ / ٢٠٠١ ئەنجومەنی پەرلەمان بە زۆرینەی دەنگ ڕەزامەندی خۆی لە بەندەکانی ڕێکەوتننامەکە ڕاگەیاند.

مەگدۆنیا خاوەنی زۆربەی هۆیەکانی بەرهەم هێنانە، نزیکەی ٤٠ ٪ ی ڕێژەی دانیشتوان کاری پیشەسازی دەکەن و ١٠ ٪ ی ڕێژەی دانیشتوان سەرقاڵی کشتوکاڵین، ٥٠ ٪ یش لە کەرتی گشتیدا کار دەکەن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ڕواڵەتی هەژاری بەدانیشتوانی ئەو وڵاتەوە دیارە.

سروودی نیشتیمانی: خۆرێکی نوێ.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١,٧ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢٧ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٧٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢٦ .

## مەکسیك

**ناوی باو:** مەکسیك.

**ناوی فەرمی:** ویلایەتە یەکگرتوەکانی مەکسیك.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

United Maxican State.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆمماری یەکگرتوو، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی پیران ( ١٢٨ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥٠٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ٧٥٦,٠٦٦ میل دووجا، ١,٩٥٨,٢٠١ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠١ )

**چڕی دانیشتوان:** ٥٠ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** مەکسیکی ( بەرەچەڵەك دەچنەوە سەر هیندی ئەوروپی)، هیندی ئەمریکا.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت)، جوولەکە.

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** مەکسیکۆ سیتی.

**شارە سەرەکییەکان:** گوادالاگار، سیداد، مۆنتیری، بۆبێلا، گاریز.

**دراو:** بیزۆی مەکسیکی.

**ئاو وهەوا:** لەباکوور: نیوە وشکە، زستانی ساردە، هاوینی گەرمە، رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠٠ ملم. لەو بەشەی سەر دەریا: خولگەیی شێدارە، بارانێکی زۆر دەبارێت، پلەکانی گەرما زۆر بەرزن. لە بانی ناوەڕاست: بارانێکی زۆر لە هاویندا دەبارێت و لە وەرزەکانی دیکەدا وشکە وپلەکانی گەرما مام ناوەندە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمە شامی، بەخێوکردنی بەران، بەخێوکردنی مانگا، بەخێوکردنی مەڕومالآت، پەلەوەر، گەنم، قاوە، لۆکە، ترشەلۆکییەکان، قامیشی شەکر، کاکاو، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراییەکان، ئۆتۆمبێل، ئاسن، پۆڵا، پەین، کەرەستەی بیناسازی، ئامێری کارەبایی، کەلوپەلی ناومالّ.

**سامانی کانزایی:** گازی سروشتی، ئاسن، زیو، زنك، ئالّتون، یۆرانیۆم، فۆسفات، مس، قورقوشم، نەوت، گۆگرد، خەڵووز.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

مەکسیك وڵاتێکە دەکەوێتە ئەوپەڕی باکووری ئەمریکای لاتینی ( ئەمریکای لاتینی هەردوو ئەمریکای ناوەڕاست وباشووره پێکەوە)، ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دەکەوێتە باکووری، کەنداوی مەکسیك ودەریای کاریبی دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، بیلیز وگواتیمالا دەکەونە باشووری رۆژهەڵاتی، زەریای هێمن دەکەوێتە باشووری رۆژئاوا و رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٢ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ٢٣ بەرەو باکوور.

چیا رۆژئاوا و رۆژهەڵاتییەکانی سییرا مادری لە باکوورەوە بۆ باشووری وڵات درێژ دەبێتەوە، لەنێوان هەردوو زنجیرە چیای ناوبراودا چەند بانێکی مام ناوەندی تێدەکەوێت کەزۆرینەی دانیشتوانی لێ کۆبونەتەوە. زنجیرەیەك چیای گڕکانیش ( هەندێکیان چالاکن ) دەکەوێتە رۆژهەڵاتی وڵات. لەسەر کەناری زەریای هێمنیش دەشتێکی بەرفراوان دەکەوێتە رۆژئاوای وڵات و لەکەنداوی کالیفۆرنیا کۆتایی پێدێت.

چەند خێڵێکی هیندە سوورەکان لەناوچەکەدا ژیاون، لەوانە خێڵەکانی مەکسیکا، کەناوی وڵاتیش لەوانەوە هاتووە، چەند شارستانێتێکیان لەناوچەکەدا پێك هێناوە وەك شارستانێتی مایا و شارستانێتی ئەزتەك. ئیسپانییەکان بەسەرۆکایەتی گەڕیدەی ئیسپانی هێرناندۆ کۆرتیز لەنێوان ساڵەکانی ١٥١٩ – ١٥٢١ داگیریان کردووە. لەبەرواری ١٦ / ٩ / ١٨١٠ لەدژی ئیسپانیەکان راپەڕیون وچەند شۆڕشێکیان لەدژیان هەڵگیرساندووە، تا لەبەرواری ٢٧ / ٩ / ١٨٢١ دا سەربەخۆ بووە ولە ٣ / ١٠ / ١٨٢٤ دا بۆتە کۆمار. لەنێوان ساڵەکانی ١٨٤٦ – ١٨٤٧ دا جەنگێك لەنێوان مەکسیك و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکای دراوسێیدا هەڵگیرساوە بەناوی جەنگی مەکسیك. لەنێوان ساڵەکانی ١٨٥٨ – ١٨٦١ دا شەڕی ناوخۆ لەنێوان پارێزگاران وئازادیخوازاندا هەڵگیرساوە، بۆیە فەرەنسا خۆی تێهەڵقورتاند و فردیناند مەکسیمیانی بەزۆرە ملێ کردۆتە ئیمپراتۆری وڵاتەکە. بەڵام مەکسیکییەکان بەسەرکردایەتی سەرۆکی شەرعی وڵاتەکەیان بانیتۆ خواریس لەدژی ئیمپراتۆر راپەڕین و بەسەر هێزەکانی مەکسیمیاندا لە ١٨٦٧ دا سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. لەبەرواری ٢٠ / ١١ / ١٩١٠ فرانسیسکۆ مادۆر سەرۆکایەتی شۆڕشی گەلەکەی کردووە و دیازی دیکتاتۆریان لەدەسەڵات دوور خستۆتەوە. لەساڵی ١٩١٧ دا دەستووری نوێی وڵات دارێژراوە. لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەبەرواری ١٩ / ٩ / ١٩٨٥ دا بوومەلەرزەیەکی بەهێز بەگووری ٨،١ پلە بەپێوەری رێکختەرە لەشاری مەکسیکۆ سیتی پایتەختی وڵاتی داوە وژمارەیەکی زۆری هاوڵاتیان بوونەتە قوربانی وزەرەرێکی ماددی زۆریشی گەیاند.

لەساڵی ١٩٩٥ دا ئارنستۆ زیدیلۆ بۆنس دی لیۆن لەرێگای هەڵبژاردنە گشتییەکانەوە دەسەڵاتی وڵاتی گرتۆتە دەست. لەبەرواری ٢ / ٧ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بەڕێوە چووە، پاڵێوراوی پارتی کاری نیشتیمانی ڤیسنتی فۆکس سەرکەوتنی بەدەست هێناوە و دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، بەمەش کۆتایی هاتووە بە حوکمی زیاتر لە ٧١ ساڵ پارتی شۆڕشگێڕی مەکسیك کەلەساڵی ١٩٢٩ بەدواوە دەسەڵاتی وڵاتی گرتبووە دەست.

تا ناوەڕاستی هەفتاکانی سەدەی پێشوو، ئابووری مەکسیك پشتی بە کشتوکاڵی وپیشە سازی بەستبوو، لەگەڵ هەوڵی بەردەوام بۆ گەشە پێدانی باری ئابووری وڵات. بەڵام لەدوای هەفتاکاندا مەکسیك بووە یەکێك لەو وڵاتە سەرەکییانەی کەنەوتی ڕەوانەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا کردووە. داهاتەکانی نەوت بووە هۆی گەشەپێدانی باری ئابووری ئەو وڵاتە لەتەواوی بوارەکانی ژیاندا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پێشکەوتنە نەیتوانیوە هاوسەنگی لەنێوان ژمارەی زیاد بوونی نیشتەجێ بووانی وڵات وئاستی ژیانیان بێنێتە دی، بۆیە وڵات دووچاری چەندین کێشەی کۆمەڵایەتی وئابووری بۆتەوە کە ئەمەش بۆتە ئەوەی زیاتر لە یەك لەسەر سێی خەڵکی ئەو وڵاتە لەئاستێکی هەژاردا دەژین، حکومەت لەهەوڵی بەردەوامدایە بۆ دانانی پلانی گونجاو ولەبار بۆ چاکسازی ئابووری وباری ژیانی هاوڵاتیانی.

مەکسیك بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەدەرهێنانی زیو دا وبەپلەی چوارەم دێت لە بەرهەمی گەنمەشامی، بەپلەی پێنجەم دێت لە پیترۆل وترشەلۆکییەکان، بەپلەی شەشەم لەقامیشی شەکر وقوڕقوشم وقاوە وزنك وبەپلەی حەوتەم لەبەخێوکردنی مانگا، پلەی هەشتەم لەبەخێو کردنی بەراز وپلەی نۆیەم لە لۆکە وپلەی پانزدەیەم لە کاکاو ومس، بەپلەی سیانزدەیەم دێت لەبەهەمی گازی سروشتی وپلەی چواردەیەم لە بەرهەمی ئاسن، پلەی هەژدەیەم لە ڕاوە ماسی وئالتون وپلەی بیستەم لە لۆکە.

سروودی نیشتیمانی: ئەی مەکسیکییەکان هاواری جەنگ بکەن.

جەژنی نیشتیمانی: ١٦ / ٩ ی هەموو ساڵێك، ڕۆژی هەڵگیرسانی شۆڕشی دژ بە ئیسپانییەکان لە ١٨١٠ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣٦٨,٧ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٢ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤,١٠١ دۆلاری ئەمریکی.

ڕیزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٢ .

## مەلاوی

**ناوی باو:** مەلاوی.

**ناوی فەرمی:** كۆماری كەلاوی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Malawi.

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار خۆی سەرۆكی حكومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٧٧ ئەندام ).

**رووبەر:** ٤٥,٧٤٧ میل دووجا، ١١٨,٤٨٤ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٩,٦٠٩,٠٠٠ كەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٠,٣ كەس/كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش، دەچنەوە چەند كۆمەڵەیەكی نەژادی، گرنگترینیان: شیوا، لۆمۆی، یاو، جگە لەژمارەیەك ئینگلیز.

**ئاین:** چەند بیروباوەڕێكی ئەفریقی باو، مەسیحی، موسڵمان.

**زمان:** ئینگلیزی، شیشاوا.

**پایتەخت:** لیلۆنجۆی.

**شارە سەرەكییەكان:** بلانتیر، مزۆزۆ.

**دراو:** كواشای مەلاوی.

**ئاو وهەوا:** گەرم وشێدارە لەزەوییە نزمەكانی چوار دەوری دەریاچەی نیاسا، نێوەندی پلەكانی گەرما لەنێوان ٢٣ – ٢٦ پلەی سەدی دەبێت، لەبەرزاییەكان فێنكترە. رێژەی ساڵانەی بارانەكان ١٨٠ سم.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** لۆكە، گەنمەشامی، بستەی عەبید، توتن، بەخێوكردنی مەڕوماڵات، راوەماسی، چا.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** كەرەستەی بیناسازی، چنین، دروستكراوە خۆراكییەكان، دروستكراوەكانی پێست.

**سامانی كانزایی:** بۆكسیت، خەڵووزی بەردین، یۆرانیۆم، گرافیت.

### تێڕوانینێكی گشتی:

مەلاوی وڵاتێكە دەكەوێتە باشووری رۆژهەڵاتی ئەفریقیا لەسەر كەناری رۆژئاوای دەریاچەی نیاسا یان مەلاوی، كە سنوورەكانی لەگەڵ هەر یەك لەدراوسێكانی جیادەكاتەوە،

تەنزانیا دەکەوێتە باکوور و مۆزامبیق دەکەوێتە رۆژهەلات و باشووری، و زامبیا دەکەوێتە رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ٣٤ بەرەو رۆژهەلات لەگەل هێلی پانی ١٣ بەرەو باشوور.

لەباکوورەوە بۆ باشوور دۆلێکی بەردەلانی گەورە ولات دەبڕێت وناوەکانی دەریاچەی نیاسا زۆربەی زەوییەکانی ئەو دۆلە دادەپۆشێ، لەلای باشووری ئەو دەریاچەیە روباری شایر هەلدەقولێ کە دەڕژێتە روباری زامبیزییەوە، لەلای رۆژئاوای دەریاچەکەش زەوییەکان وردە وردە بەرز دەبنەوە تا بانێکی بەرز پێك دەهێنن، بەرزترین خالی دەگاتە ١٢٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە. زۆربەی خاکی ولات بەگژوگیای سافانا داپۆشراوە.

بەر لە دوو هەزار سال لەمەوبەرە ئەو هۆزانەی بەزمانی بانتۆ قسەیان دەکرد بەرەو ناوچەکە کۆچیان کردووە، لەو مێژووەوە چەند کۆمەلەیەکی تیا نیشتەجێ بووە وچەند شانشینێکی بچوکیان پێك هێناوە، لەوانە شانشینی مەلاوی کە دانیشتوان لەسەدەی پانزدەیەمدا دایان مەزراندووە.

لەسەدەکانی حەفدەیەم و هەژدەیەمدا گەڕیدە پۆرتوگالییەکان سەردانیان کردووە. لە سالی ١٨٥٩ دا مژدە بەخشی بەریتانی دیفید لیفنگستۆن گەیشتۆتە مەلاوی، دوای ئەو ئاینی مەسیحی لەناوچەکەدا بلاوبۆتەوە. لەسالی ١٨٨٩ دا بەریتانییەکان لەگەل سەرۆك هۆزە ناوخۆییەکانی ئەو ولاتە چەند رێکەوتننامەیەکیان واژۆ کردووەو دوای دوو سال بۆتە پارێزراوەیەکی بەریتانی. لەسالی ١٩٠٧ دا ناوی بۆتە نیاسالاند. لەسالی ١٩٥٣ دا بەریتانیا هەستاوە بە دامەزراندنی یەکێتییەکی فیدرالی لەنێوان نیاسالاند و رۆدیسیای باکوور وباشوور، بەلام لەلایەن دانیشتوانە رەش پێستەکانەوە ناڕەزاییەکی زۆر لەم یەکێتییە دەربڕا. لە سالی ١٩٥٨ دا بزوتنەوەیەك هەلگیرسا بۆ داواکاری سەربەخۆیی نیاسالاند. لە ٦ / ٧ / ١٩٦٤ دا لەچوارچێوەی کۆمۆنۆلتی بەریتانی سەربەخۆ بووە ولەهەمان سالدا پەیوەندی کردووە بە نەتەوە یەککرتوەکانەوە. لەسالی ١٩٦٦ دا دەستوورێکی نوێ بۆ ولات دارێژراوەو ناوی ولات بۆتە کۆماری مەلاوی.

یەکەم سەرۆکی ولات دوای سەربەخۆیی دکتۆر هاستینجز کامۆزۆ باندا بووە کە رابەرایەتی شۆڕشی سەربەخۆیی نیاسالاندی کردووە، کامۆزۆ باندا کەسێکی کورتە بالای لاواز بوو، هەمیشە کلاوەکەی لەسەردا بوو ، ملوانکەیەکی درێژی لەمل دەکرد، یەکێك بوو لەقەشەکانی کلێسەی سکۆتلاندا، کەسایەتییەکی زۆر سەیر بووە، هەمیشەی دانیشتوانی ولاتی بە رۆلەکانم بانگ دەکرد بەلام بەچنگێکی پۆلایین مامەلەی لەگەل دەکردن، هەڕەشەی لە نەیارانی بەوە دەکرد کە فرێیان دەداتە زەلکاوی تیمساحەکانەوە، جگە لەپارتەکەی خۆی،

پارتی کۆنگرەی مەلاوی، رێگەی بەهیچ پارتێك نەداوە لەولاتەکەیدا دەسەلات بگرێتە دەست، زیاتر لە ٩٨ ٪ ی بازرگانی ولاتەکەی بۆ خۆی قۆرغ کردبوو، گەلەکەی خۆی بەرانە مەر دەهاتە بەرچاو، بەلام لەدوای سالی ١٩٩٢ بەرهەلستکارانی داوایان لێدەکرد هەلبژاردنێکی گشتی لەولاتدا ئەنجام بدرێت وحکومەتێکی دیموکراسی پێك بهێنرێت. وەك هیوایەك بە چاکتر کردنی بارودۆخی ئابوری وسیاسی ولاتەکەیان. بۆیە لەهەلبژاردنەکانی ١٧ / ٥ / ١٩٩٤ دا پارتی کۆنگرەی مەلاوی کە باندا سەرۆکایەتی دەکرد شکستێکی گەورەی هێنا و باندا ناچار کرا ولات بەجێ بهێلێ باکیلی مۆلۆزۆی دەسەلاتی گرتۆتە دەست.

هاستینجز کامۆزۆ باندا لە یۆهانیبێرگ لەسالی ١٩٩٧ دا کۆچی دوایی کرد، وەکو باسی لێوە دەکرێ نزیکەی ١٠٠ سال تەمەنی بووە، بەلام هێشتا ئاسەواری ئەو دیکتاتۆرە بەسەر ئابووری نالەباری ئەو ولاتەوە دیارە.

مەلاوی یەکێکە لەو ولاتانەی گەشە کردنێکی ئابووری لاوازی هەیە، سامانە کانزاییەکانی ئەوتۆ نیین، ئابووری ولات بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بە کشتوکالی بەستووە لەگەل ئەوەی کە رێژەی ئەو زەویانەی بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراوە لە یەك لەسەر سێی رووبەری ولات تێناپەرێت، بۆیە مەلاوی بەیەکێك لە ولاتە زۆر هەژارەکانی جیهان دادەنرێت.

جەژنی نیشتیمانی: ٦ / ٧ ی هەموو سالێك، یادی سەربەخۆیی سالی ١٩٦٤ .

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ١,٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٣٨ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ١٤٠ .

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٨٦ .

## مەنگۆلیا

ناوی باو: مەنگۆلیا.

ناوی فەرمی: کۆماری مەنگۆلیا.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Mongolia.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی گەلی مەزن ( ٧٦ ئەندام ).

ڕووبەر: ٦٠٤,٨٠٠ میل دووجا، ١,٥٦٦,٥٠٠ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ٢,٣٧٠,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: یەك کەس ونیو بۆ هەر کم$^{٢}$، بەمەش بە یەکەم وڵات دادەنرێت لەجیهاندا لەرووی کەمی چڕی دانیشتوان دانیشتوانەوە.

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: مەنگۆلی، کازاك، رووس، چینی.

ئاین: لامی ( شێوەیەکە لە شێوەکانی ئاینی بوودی).

زمان: مەنگۆلی.

پایتەخت: ئۆلان باتۆر.

شارە سەرەکییەکان: دارکان، ئیردینیت، شویا بالسان.

دراو: تۆجرۆج.

ئاو وهەوا: هاوینی زۆر گەرمە ونێوەندی پلەکانی گەرما دەگاتە ٣٨ پلەی سەدی وزستانی زۆر ساردە ونێوەندی پلەکانی گەرما دەچێتە ٤٩ پلەی ژێر سفری سەدی، بەمەش بەیەکێك لەناوچە هەرە ساردەکانی جیهان دادەنرێت لە وەرزی زستاندا. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ٢٣ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: دانەوێڵە، پەتاتە، سەوزە، بەخێو کردنی مەڕو ماڵات وئەسپ.

بەرهەمــە پیــشەسازییەکان: کەرەستەی بیناسازی، چنین، دروستکراوە خۆراکییەکان، دروستکراوە کیمیاییەکان.

سامانی کانزایی: خەڵووزی بەردین، نەوت، مس.

### تێڕوانینێکی گشتی:

مەنگۆلیا وڵاتێکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، ڕوسیا دەکەوێتە باکووری، چین لەهەموو لاکانی ترەوە لەگەڵیدا سنووردارە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠٥

بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٧ بەرەو باکوور.

مەنگۆلیا بریتییە لە بانێکی بەرز، بەرزترین لوتکەی لە چیاکانی تای لە رۆژئاوای وڵاتدایە ودەگاتە ٤٣٠٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە. هەروەها چیاکانی هەنگینیش دەکەوێتە ناوەڕاستی وڵاتەوە دارستانە چڕەکان دایان پۆشیوە. لەنێوان هەردوو چیادا دەشتێکی بەرز وبەرفراوانی تێدەکەوێت .باشووری وڵاتیش دەشتێکی بەرفراوانی تێدەکەوێت کە بیابانێکی چۆڵ گرتویەتەوە.

لەسەردەمانێکی کۆنەوە چەندین هۆزی جیاواز لەناوچەکەدا ژیاون، بەڵام تا دەرکەوتنی جەنگیز خانی سەرکردەی هۆزە مەگۆلیەکان، کەناوی وڵاتیش لەوانەوە هاتووە، لەسەدەی سیانزدەیەمی زایینیدا هیچ مێژوویەکی ئەوتۆی بۆ تۆمار نەکراوە.

لەسەردەمی جەنگیز خاندا ( ١١٦٢ – ١٢٢٧ ) وڵات لە ساڵی ١٢٠٦ یەکی گرتۆتەوە. جەنگیز خان دەستی کرد بە بەرفراوان کردنی دەسەڵاتی مەگۆلیەکان. لەسایەی جەنگیز خاندا ئیمپراتۆریەتی مەگۆلی لەچینەوە لە رۆژهەڵات تا روباری دانوبی ئەورووپای رۆژهەڵاتی لە رۆژئاوا گرتەوە. دوای جەنگیز خان، پیاوەکانی تەیموری لەنگ ( ١٣٣٦ – ١٤٠٥ ) توانیان دەسەڵاتی تەواوی ئەو ناوچانەی لە مەنگۆلیا دەست پێ دەکات تا دەگاتە دەریای سپی ناوەڕاست بگرنە دەست. لەکۆتایی سەدەی حەڤدەیەمدا ( ١٦٩٧ ) مەنگۆلیا کەوتە ژێر دەسەڵاتی چینەوە، بەم شێوەیە مایەوە تا لە ساڵی ١٩٢٤ دا سەربەخۆیی دەستگیر بووە و بۆتە کۆمار. لەساڵی ١٩٣٦ دا رێکەوتننامەی هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەتدا واژۆ کردووە و لەساڵی ١٩٤٦ دا وڵاتی چین بەشێوەیەکی فەرمی دانی ناوە بەسەربەخۆیی مەنگۆلیا. لە بەرواری ٢٧ / ١٠ / ١٩٦١ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

لە ساڵی ١٩٩٠ دا مەنگۆلییەکان چەندین خۆپیشاندانیان کردووە لەپێناوی سەپاندنی دیموکراسی وئازادی تاك ومافەکانیان، دیارە گۆڕانکارییەکانی وڵاتە شیوعییەکان کاریگەری تەواوی تێکردبوون. بەو بۆنەیە حیزبی شیوعی مەنگۆلیا دەستی لەدەسەڵاتەکانی کێشایەوە وسیستەمی فرە حیزبی لەو وڵاتەدا راگەیەنرا، بەمەش مەگۆلیا بەیەکەم وڵاتی ئاسیا دادەنرێت دەستی لە شیوعێتی هەڵگرتبێ.

هەڵبژاردنە گشتییەکان لەهەمان ساڵدا بەئەنجام گەیەنرا، خەڵکێکی زۆر چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد حیزبی شیوعی بەزۆرینەی دەنگ سەرکەوتن بەدەست بهێنێ، نزیکەی ٧٠ ٪ ی دەنگەکانی بەدەست هێنابوو بەرامبەر بە رێژەی ٣٠ ٪ بۆ پارتەکانی تر. لەساڵی ١٩٩٣ دا بۆنسالماجین ئۆشیربات دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست. دوای ئەو لەساڵی ١٩٩٧ دا ناتساجین باجابانـدی ( ٤٧ ساڵ ) دەسەڵاتی گرتە دەست. ناتساجین ئەندازیاری

شارستانییه و لەساڵی ١٩٩٠ دا جێگری سەرۆكی شۆڕشگێڕی گەلی مەنگۆلیا بووە. لەبەرواری ٢١ / ٥ / ٢٠٠١ بەماوەیەكی دیكەی سەرۆكایەتی هەڵبژێردرایەوە.

بە مەنگۆلیا دەوترا مەنگۆلیای ناوخۆ، مەنگۆلیای دەرەوەش كەدەكەوێتە باشووری، بەشێكی وڵاتی چین بوو، ناوی فەرمی لەنێوان ساڵەكانی ١٩٢٤ – ١٩٩٠ كۆماری مەنگۆلیای میللی بوو، لەبەرواری ١٢ / ٢ / ١٩٩٢ ناوی فەرمی بووە كۆماری مەنگۆلیا.

لەساڵی ٢٠٠٠ دا توندترین سەرما لەمێژووی ئەو وڵاتە رووی تێكرد، بەهۆی مرداربوونەوەی مەڕوماڵاتێكی زۆر وڵات دووچاری برسێتی وهەژارییەكی بێ وێنە بووەوە،نزیكەی ٢٠ ٪ ی دانیشتوانی وڵات دووچاری نەخۆشی ومردن بوونەوە، حكومەت زۆر بەپەلە كەوتە ناردنی بارە ئالیك بۆ ئاژەڵەكان وخۆراك ودەرمان بۆ دانیشتوانی ئەو ناوچانەی كە شەپۆلە سەرماكان رووی تێكردبوون.

لەگەڵ بارودۆخی كەش وهەوای نالەباری ئەو وڵاتە، ئابووری مەنگۆلیا پشتی تەواوی بە كشتوكاڵی بەستووە. نزیكەی سێ لەسەر یەكی دانیشتوانی وڵات سەرقاڵی شوانی وجوتیارین، بەڵام زیاترین ناوبانگیان لەبەخێو كردنی ئەسپ وەرگرتووە، تەنانەت مەنگۆلیا بەتاكە وڵات دادەنرێ لەجیهاندا كە ژمارەی ئەسپ لەژمارەی دانیشتوانی زیاترە. لەم ساڵانەی دواییدا هەوڵەكانی دەرهێنانی ئاڵتون وسوودی لێوەرگرتنی دەستی پێكردووە بەتایبەتی لەناوچەی بیابانی چوبی، چونكە چەند بڕێكی باشی لەو مادەیە لێ دەرهێنراوە. زۆربەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە لەنێو چاردگەدا دەژین، ئێستاش وەك كۆچبەرییەكانی سەدەكانی ناوەڕاست ژیان بەسەر دەبەن.

لەهاوینی ٢٠٠١ دا زاناكان ئاسەواری ئەو جێیەیان دۆزیەوە كە جەنگیز خانی لێ نێژراوە. نزیكەی ٢٢٠ كم لە رۆژهەڵاتی باكووری ئۆلان باتۆرەوە دوورە، ناوچەكە زیاتر لە ٢٠ گڵكۆی لەخۆ گرتووە كە پێشبینی دەكرێت ئەندامانی خێزانی جەنگیز خان بن.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی: ٨٠١ ملیۆن دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٨ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣٤٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٦٠ .

## مۆریتانیا

**ناوی باو:** مۆریتانیا

**ناوی فەرمی:** کۆماری ئیسلامی مۆریتانیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Islamic Republic of Mouritania.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆك حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەنی پێك دێت:

- ئەنجومەنی پیران ( ٥٦ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٧٩ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٣٩٨,٠٠٠ میل دووجا، ١,٠٣٠,٧٠٠ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢,٥٤٨,١٥٧ کەس ( تا ٢٠٠١ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٢,٥ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** مەغاریبەکان ( عەرەب، بەربەر، سودانی) ، ئەفریقی رەش لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن.

**ئاین:** موسڵمان.

**زمان:** عەرەبی، جگە لەچەند زمانێکی ناوخۆ: بۆلاری، سەکنەنی، ولفی.

**پایتەخت:** نواکشوت.

**شارە سەرەکییەکان:** نوازیبۆ، شنقیت، ئەتار، نیعمە، کیهیدی، کیفە.

**دراو:** ئۆقیێ.

**ئاو وهەوا:** کاریگەری سێ جۆر کەش وهەوای لەسەر: دەریایی، بای ڕۆژهەڵاتی، بای سارد. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٦٠٠ ملم لەو پەڕی باشوور، ٥٠ ملم لە بیابانی باکوور. نێوەندی پلەکانی گەرما لە نواکشوتی پایتەخت لەنێوان ١٢ – ٣٣ پلەی سەدی دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** برنج، هەرزن، گەنمەشامی، دانەوێڵە، خورما، پەتاتە، کاڵەك، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ماسی قتوو،بەسوێرکردن ودەرهێنانی ڕۆنەکەی فرۆشتنەوەی، چیمەنتۆ.

**سامانی کانزایی:** ئاسن، مس، گەچ، گۆگرد، فۆسفات، خوێ، ئەڵماس، ئاڵتون، نەوت.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

مۆریتانیا وڵاتێکی عەرەبی ئیسلامییە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای کیشوەری ئەفریقیا. مەغریب وجەزائیر دەکەونە باکووری، مالی دەکەوێتە ڕۆژهەڵات وباشووری، سەنگال دەکەوێتە باشووری، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە ڕۆژئاوای. ڕۆباری سەنگال – تاکە ڕوباری وڵات – سنوورە باشوورییەکانی نێوان مۆریتانیا و سەنگال پێك دەهێنێت و مەرەزەکانی برنج دەکەونە سەر کەنارەکانی. ناوەڕاستی مۆریتانیا دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۱۰ بەرەو ڕۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ۲۰ بەرەو باکوور.

کەنارەکانی مۆریتانیا زۆر سەختە بۆیە چالاکییە دەریاوانیەکانی تیا ئەنجام نادرێت، تەنها دوو کەنداوی لەسەرە بۆ دامەزراندنی بەندەرەکان، ئەوانیش بەندەری لیفریێ وبەندەری داخلە. بانی مۆریتانی نزیکەی ۸۵ ٪ ی ڕووبەری وڵاتی گرتۆتەوە وبەبەشێکی بیابانی گەورەی باکووری وڵات دادەنرێت.

ناوی زووی مۆریتانیا شنقیت بووە، بەزمانی ناوخۆی وڵاتیش بەمانای ئەو کانیانە دێت کە ئەسپەکان ئاوی لێدەخۆنەوە، بەڵام ئەم ناوەی ئێستای: مۆریتانیا لەلایەن فەڕەنسییەکانەوە لەساڵی ۱۸۹۹ لێنراوە ولە دوو بەش پێك دێت:

مۆر: بەمانای مرۆڤی گەنم ڕەنگ ( ئەسمەر ) دێت.

تانیا: بەمانای خاك یان وڵات دێت. کەواتە مۆریتانیا بەمانای خاکی ئەسمەران دێت. فەڕەنساش ئەم ناوەی بۆیە لێناوە تاکو بیری دانیشتوان بخاتەوە کە لەمێژەوە ئەسمەرە فەڕەنجییەکان دانیشتوانی ناوچەکە بوون وماڤ ئەوانی پێوەیە. هەروەها دەڵێن ئەغریقییەکان پێیان وتووە مۆرۆسیا.

عەرەبەکان لەسەدەی چوارەمی زاییینەوە ڕوویان کردۆتە ناوچەکە، لەسەردەمی ئەمەوییەکاندا لەگەڵ گەیشتنی ئاینی ئیسلام بۆ کیشوەری ئەفریقیا لەسەدەی حەوتەمی زاییینەوە مۆریتانیا ئاینی ئیسلامی پەیڕەو کردووە، بۆتە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی ومێژووی لەگەڵ مێژووی وڵاتی مەغریبی دراوسێی بەسترایەوە.

پۆرتۆگالییەکان لەسەدەی پانزدەیەمدا گەیشتونەتە کەنارەکانی، لەساڵی ۱۸۱۷ دا کەوتە سەر ئەو ناوچەیە کە فەڕەنسییەکان دەسەڵاتیان گرتبۆوە دەست. لەساڵی ۱۹۰۳ دا بۆتە پارێزراوەیەکی فەڕەنسی. بۆ ساڵی دوایی مۆریتانیا خراوەتە سەر ئەفریقیای ڕۆژئاوای ئەفریقی. لەساڵی ۱۹۲۰ دا بۆتە داگیرکراوەیەکی فەڕەنسی. لەبەرواری ۲۸ / ۹ / ۱۹۵۸ دا بۆتە کۆمارێکی خاوەنی ماڤ ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی کۆمەڵەی فەڕەنسی وبۆ ساڵی دوایی بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەبەرواری ٢٨ / ١١ / ١٩٦٠ دا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بووە.

یەکەم سەرۆکی وڵات دوای سەربەخۆیی: موختار ولد دادە بووە وکودەتایەکی سەربازی لە مانگی حەوتی ١٩٧٨ دا بەسەر کراوە وسەربازییەکان دەسەڵاتی وڵاتیان گرتۆتە دەست. لەساڵی ١٩٨٤ دا کودەتایەك بەسەر سەربازییەکاندا کراوە ومعاویە ولد سیدی ئەحمەد ئەلتایع دەسەڵاتی گرتە دەست ولەبەرواری ١٣ / ١٢ / ١٩٩٧ دا سەر لەنویێ بەسەرۆکی مۆریتانیا هەڵبژێردرایەوە.

لەبەرواری ٢٨ / ١٠ / ١٩٩٩ دا پەیوەندی دیپلۆماتی لەنێوان مۆریتانیا وئیسرائیل پەیدا بووە، بەمەش مۆریتانیا بەیەکەم وڵاتی عەرەبی دادەنرێت باڵوێزخانە بۆ ئیسرائیل لە وڵاتەکەیدا بکاتەوە، جگە لەو وڵاتانەی کە رێکەوتننامەیان لەگەڵ ئیسرائیلدا واژۆ کردووە وباڵوێزخانەیان بۆ کردۆتەوە ( میسر و ئەردەن ).

مۆریتانیا وڵاتێکی هەژارە، ئابووری پشتی تەواوی بە کشتوکاڵی وراوەماسی بەستووە وزۆربەی دانیشتوانیش سەرقاڵی ئەو چالاکییانەن، جگە لەرێژەیەکی کەم نەبێت کەسەرقاڵی کەرتی پیشەسازین. سامانە کانزاییەکانیشی زیاتر خۆی لە کانە ئاسنەکانی خۆیدا دەبینێتەوە کە دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای وڵات. بەڵام ئابووری مۆریتانیا پشتی سەرەکی بەیارمەتییە دەرەکییەکان بەستووە بەتایبەتی لەوڵاتی فەرەنساوە.

مۆریتانیا دووچاری کێشەی بە بیابان بوونی زەوییەکانی بۆتەوە، لم بیابانەکان بەرەو رووبەرێکی زۆری زەوییە کشتوکاڵیەکانی ئەو وڵاتە دەکشێن بە هۆی بایەکانەوە، ساڵانە بەسەدان کم بەهۆی ئەم دیاردە سروشتییەوە لەدەست دەدات.

لەهاوینی ٢٠٠٢ دا حکومەتی مۆریتانیا رایگەیاند کە برێکی زۆری نەوت وگازی سروشتی لە سەر کەنارەکانی دۆزیوەتەوە، دوو کۆمپانیای ئۆستورالی کار بۆ دۆزینەوەی بڕی زیاتر دەکەن، دۆزینەوەی هەر بڕێکی نەوت خۆشحاڵی دەخاتە دڵی مۆریتانییەکانەوە وبەهیوان ئەمە ببێتە هۆی باشتر کردنی باری ژیان وگوزەرانیان.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٨ / ١١ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٦٠ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١,١ ملیار دۆلاری ئەمەریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٥٢ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٤٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٤٨ .

## مۆریشیۆس

**ناوی باو:** مۆریشیۆس

**ناوی فەرمی:** کۆماری مۆریشیۆس.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Mouritius.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٦٦ ئەندام ).

**رووبەر:** ٧٨٨ میل دووجا، ٢,٠٤٠ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١,١٤٣,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٥٦٠,٣ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** هیند، پاکستانی، ئەفریقی، کریۆل ( تێکەڵێکن لە توخمەکانی پێشوو)، چینی ئەورووپی.

**ئاین:** هیندۆس، مەسیحی، بوودی، موسڵمان ١٧ ٪.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** بۆرت لویس.

**شارە سەرەکییەکان:** فیۆنیکس، ماهیبۆرگ، روسبال، کربیب.

**دراو:** روپێی مۆریشیۆس.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما لەهاویندا ٢٦ پلەی سەدی ولە زستاندا ٢٢ پلەی سەدی دەبێت، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەنێوان ٨٥ سم بۆ ٥١٠ سم دەبارێت. لەوەرزی زستاندا زۆر جار دووچاری گەردەلوولە خولگەییەکان دەبێتەوە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** قامیشی شەکر، توتن، چا، بەخێوکردنی مەڕومالات.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** شەکر، جگەرە، شقارتە.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

مۆریشیۆس وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە لە باشووری رۆژئاوای زەریای هیندی، نزیکەی ٨٠٠ کم لە رۆژهەڵاتی مەدغەشقەرەوە دوورە و نزیکەی ٤٠٠٠ کم لە باشووری رۆژئاوای هیندەوە دوورە. لەشەش دورگەی گەورە پێك دێت، گەورەترینیان دورگەی مۆریشیۆسە کە ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٥٧/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٠/١٥ بەرەو باشوور.

دورگەی مۆریشیۆس بەهۆی چالاکییە گڕکانیەکانەوە دروست بووە، بۆتە هۆی دروست

بوونی بانێك له ناوەڕاستی دورگەكه وبەرەو دەریا لێژ دەبێتەوە.

پۆرتۆگالییەكان لەساڵی ١٥٠٥ دا دۆزیویانەتەوە وماوەیەك نیشتەجێی بوون، دوای ئەوان هۆڵەندییەكان لەساڵی ١٥٩٨ دا دۆزیانەوە وناویان ناووە مۆریشیۆس لەسەر ناوی میر مۆریسی میری نازاو ( یەكێك لەناوچەكانی هۆڵەندا )، بەڵام لەساڵی ١٧١٠ دا هۆڵەندییەكان دەستیان لێهەڵگرتووە. لەساڵی ١٧١٥ دا فەرەنسییەكان داگیریان كردووە وناویان ناوە دورگەی فەرەنسا. لەساڵی ١٨١٠ دا بەریتانییەكان داگیریان كردووە وناویان ناوە مۆریشیۆس.

لەپەنجاكانی سەدەی بیستەمدا ماف ئۆتۆنۆمی پێبەخشراوە ولەبەرواری ١٢ / ٣ / ١٩٦٨ دا لەچوارچێوەی كۆمۆنوێلتی بەریتانی سەربەخۆیی پێبەخشراوە، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان. دوای سەربەخۆیی پەیڕەوی سیستەمی پادشایی دەستووری لەو وڵاتەدا كراوە، دادوەرێكی گشتی لەلایەن شاژنی بەریتانیاوە بۆ دیاری كراوە.

لەساڵی ١٩٨٣ دا پارتەكانی مۆریشیۆس پێشنیاری رەتكردنەوەی سیسیتەمی پادشایی ودامەزراندنی كۆماریان كردووە، تا لەساڵی ١٩٩٢ دا مۆریشیۆس بووە كۆمار و كسام ئۆتیم بووە سەرۆكی وڵات، بەڵام دەسەڵاتی فیعلی بەدەست سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیرانە.

چاندنی قامیشی شەكر وپیشەسازی شەكر سەرەكی ترین بەرهەمەكانی ئەو وڵاتەیە كە ئابووری پشتی پێ بەستووە، هەروەها كەرتی گەشتوگوزاریش بەشدارییەكی بەرچاوی هەیە لە تێكڕای داهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتە.

دانیشتوانی مۆریشیۆس لەچەند كۆمەڵەیەكی نەژادی پێك دێن، زۆربەی ئەوانەی سەرقاڵی پیشەسازی شەكرن بە رەچەڵەك فەرەنسین، بەڵام ئەوانەی سەرقاڵی چاندنی قامیشی شەكرن بەرەچەڵەك هیندی وفەرەنسین، خاوەن كۆگا وپێشانگا بازرگانیەكان بەرەچەڵەك چینین، كرێكارانیش زیاتر هیندین، پیشەواران لەچەند گروپێكی ئەورووپی وهیندی وئەفریقی پێك دێن.

جەژنی نیشتیمانی: ١٢ / ٣ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی وڵات لەساڵی ١٩٦٣ .

سروودی نیشتیمانی: خاكی دایكمان.

تێكڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣,٥ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١١٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٣,١٨٠ دۆلاری ئەمریكی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٦١ .

## مۆزەمبیق

**ناوی باو:** مۆزەمبیق.

**ناوی فەرمی:** کۆماری مۆزەمبیق.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Mozambique.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی کۆمار ( ٢٥٠ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٣١٣,٦٦١ میل دووجا، ٨١٢,٣٧٩ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٨,١٦٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٢٢,٧ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش، لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێک دێن، گرنگترینیان: ماکاو، تسونگا، جگە لە ژمارەیەك پۆرتوگالی.

**ئاین:** چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، موسڵمان ٥٥ ٪، مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك).

**زمان:** پۆرتوگالی.

**پایتەخت:** مابۆتۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** بیرا، نامبۆلا، مۆکامبیق، کیلیمان.

**دراو:** میتیکالز

**ئاو وهەوا:** خولگەیی مام ناوەند، نێوەندی پلەکانی گەرما لە هاویندا ٢٧ پلەی سەدی و لە زستاندا ٢٠ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٤١ – ١٢٢ سم لە وەرزی زستاندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمە شامی، پەتاتەی شیرین، مەنیهۆت، لۆکە، چا، توتن، برنج، قامیشی شەکر، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان، پاڵاوتنی نەوت.

**سامانی کانزایی:** ئاڵتون، مس، گرانێت، بۆکسیت، ئەڵماس، مەنگەنیز، یۆرانیۆم، خەڵووزی بەردین، پیترۆل.

## تێڕوانینێكی گشتی:

وڵاتێكی ئیسلامییە دەكەوێتە سەر كەناری باشووری رۆژهەڵاتی ئەفریقیا، تەنزانیا دەكەوێتە باكووری، كەناڵی مۆزامبیق وزەریای هیندی دەكەونە رۆژهەڵاتی، سوازیلاند و باشووری ئەفریقیا دەكەونە باشووری رۆژئاوای، زمبابۆی و زامبیا ومەلاوی دەكەونە رۆژئاوای، دەریاچەی مەلاویش دەكەوێتە باكووری رۆژئاوای. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٣٦ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ١٨ بەرەو باشوور.

دەشتێكی تەخت نیوەی رووبەری مۆزامبیق دادەپۆشێ ولەپشت ئەو دەشتەوە كە لەكەنارەوە تا بەشی ناوخۆی وڵات درێژ دەبێتەوە، زەوییەكان بەرز دەبنەوە. زنجیرەیەك چیا وبانیش دەكەونە سەر سنوورە رۆژئاواكانی. دەشتە سەوز وناوچە كشتوكاڵیەكان ودارستانە كەمەرەیییەكان بەزۆربەی خاكی وڵاتەكەدا بڵاو دەبنەوە.

بەر لەچوار هەزار ساڵ لەمەو پێشەوە خەڵكی لەناوچەكەدا نیشتەجێ بوون. باتوەكان پێش سەدەی دووەمی زایین لەناوچەكەدا نیشتەجێ بوون. عەرەبەكان لەسەدەی نۆیەمی زایین گەیشتونەتە ناوچەكە وناوی وڵاتیش لە موسای كوڕی بیقەوە هاتووە، كەیەكەم گەڕیدەی عەرەب بووە لەناوچەكەدا دابەزێ. پۆرتوگالیەكان لەساڵی ١٤٩٧ دا گەیشتونەتە ناوچەكە، لەساڵی ١٥٠٥ دا سەنتەرێكی بازرگانی گرنگیان لێ دامەزراندووە، لەدواییدا ناوچەكە بۆتە سەنتەرێكی بازرگانی كردن بەكۆیلەكانەوە.

دوای دابەش كردنی ئەفریقیا لەنێوان هێزە ئەورووپییەكاندا لەساڵی ١٨٨٥ ، وەك داگیركراوەیەكی پۆرتۆگالی دان بە مۆزەمبیقدا نراوە وناویان ناوە ئەفریقیای پۆرتۆگالی رۆژهەڵات. دوای خەبات وتێكۆشانێكی زۆر لەسەرەتای شەستەكانی سەدەی پێشووەوە بەسەركردایەتی بەرەی ئازادی مۆزەمبیق كە بە" فریلیمۆ " ناسرابوو، مۆزەمبیق لە ٢٥ / ٦ / ١٩٧٥ دا سەربەخۆ بووە، لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككگرتوەكان. لەساڵی ١٩٩٠ دا ناوی كۆماری میللی مۆزامبیق گۆڕاوە بۆ كۆماری مۆزامبیق.

یەكەم سەرۆكی مۆزامبیق دوای سەربەخۆیی سەرۆكی بەرەی فریلیمۆ بوو: سامۆرا میشیل كە بەرووداوی كەوتنە خوارەوەی فڕۆكەكەی لەباشووری ئەفریقیا لە ٢٠ / ١٠ / ١٩٨٦ گیانی لەدەست دا ولەبری ئەو جیاكۆم ئەلبرتۆ شیسانۆ دەسەڵاتی گرتە دەست ولەساڵی ١٩٩٤ دا دوای چەند هەڵبژاردنێك دەسەڵاتی گرتەوە دەست.

لەساڵی ١٩٧٦ دا مۆزامبیق سنوورەكانی لەگەڵ ( رۆدیسیا ) زمبابۆی دراوسێیدا دەخست وەك نارەزایی دەبڕینێك لەوەی كە كەمایەتییە سپی پێستەكان دەسەڵاتی ئەو وڵاتەیان گرتۆتە دەست، شەڕ لەنێوان هەردوو وڵاتدا هەڵگیرسا، رۆدیسییە رەش پێستەكان بەرەو

ولاتی مۆزامبیق هەڵهاتن ولەوێ چەند بنکەیەکی سەربازییان دامەزراند وخۆیان ئامادە دەکرد بۆ شەڕ لەگەڵ هێزە رۆدیسییە سپی پێستەکان. شەڕ بە دەسەلات گرتنە دەستی رەش پێستەکانی رۆدیسیا کۆتایی پێهات وناوی ولاتەکەیان کردە زمبابۆی. لەساڵی ١٩٩٤ دا هەر یەك لە مۆزامبیق و باشووری ئەفریقیا ریکەوتننامەی پشتگیری نەکردنی هێرد ئۆپۆزسیۆنەکانی یەکتریان واژۆ کرد.

ئابووری مۆزامبیق ئابوورییەکی زۆر پاشکەتوو نییە، کشتوکاڵی چالاکیە ئابووری هێجگار نزم نییە، جگە لەوەی پیشەسازیش تا ئاستێ بەشداری لە داهاتی نەتەوەیی ئەو ولاتە دەکات، بەلام ئابووری ئەو ولاتە بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بەو برە داهاتە بەستووە کە لەولاتانی دراوسێی وەردەگرێ بەرامبەر بە بەکارهێنانی هێڵە ئاسنەکان وبەندەرەکانی.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٥ / ٦ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ولات لە ١٩٧٥ دا.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١,٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٤٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٩١ ( نزمترین ئاستی ژیانی تاکە لەنێو هەموو ولاتانی جیهاندا).

## مۆلدۆڤا

ناوی باو: مۆلدۆڤا.

ناوی فەرمی: کۆماری مۆلدۆڤا.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Moldova.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

دەستەی یاسادانان: پەرلەمان ( ١٠٤ ئەندام ).

رووبەر: ١٣,٠٠٠ میل دووجا، ٣٣,٧٠٠ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ٤,٥٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠٠ ).

چڕی دانیشتوان: ١٣٣ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: مۆلداڤی، ئۆکرانی، رووس، قۆقاز، بولگاری.

ئاین: مەسیحی ( ئەرتۆدۆکسی رۆژهەڵاتی)، جوولەکە.

زمان: رۆمانی، رووسی.

پایتەخت: کیشینیڤ ( بەرووسی )، تشیسینۆ ( بەرۆمانی ).

شارە سەرەکییەکان: تیراسبۆل، بالتی، تیجینا، رابینجا.

دراو: لیۆی مۆلداڤی.

ئاو وهەوا: زستانی ساردە وهاوینی مام ناوەندە. نێوەندی پلەکانی گەرما لە زستاندا ٤ پلەی ژێر سفری سەدی، لەهاویندا ٢١ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٥٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: دانەوێڵە، ترێ، چەوەندەری شەکر، شیرەمەنی، پەلەوەر، داروتەختە.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: کەرەستەی بیناسازی، ئامێری کارەبایی، ئامێری کشتوکاڵی، چنین، دروستکراوە خۆراکییەکان، ووزەی کارەبا.

سامانی کانزایی: نییەتی.

تێڕوانینێکی گشتی:

مۆلدۆڤا وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ناوەڕاستی ئەورووپا، ئۆکرانیا دەکەوێتە باکوور ورۆژهەڵات وباشووری، رۆمانیاش دەکەوێتە رۆژئاوای. هیچ کەنارێکی نییە لەسەر دەریاکان. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢٨/٣٠ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٧ بەرەو باکوور.

زۆربەی خاکی مۆلدۆڤا بریتییە لە گرد وچەند روبارێکی پیا تێپەڕ دەبێت. بەرزترین خاڵی ئەو وڵاتە دەگاتە ٢٤٩ م لەسەر ئاستی رووی دەریا. دارستان ودەوەنەکان زۆربەی باکوور ورۆژهەڵاتی داپۆشیوە. چەند روبارێك بەخاکی مۆلدۆڤا تێپەڕ دەبێت، بەڵام تەنها هەشت روباریان درێژییەکەی دەگاتە ٩٥ کم و بەناوبانگترینیان روباری دنستەرە.

مۆلدۆڤا بەشی رۆژهەڵاتی مۆلداڤیایە کە ناوچەیەکی مێژوویییە لە باشووری رۆژهەڵاتی رۆمانیا، بەڵام بەشی رۆژئاوای ئەو ناوچەیە دەکەوێتە خوودی رۆمانیا.

لەسەدەی هەشتەمی پ.ز تا سەدەی سێیەمی زایینەوە کۆمەڵێ ئاسیایی بەرەچەڵەك فارس حوکمی ناوچەکەیان کردووە، دوای ئەوان کۆمەڵێکی رۆژهەڵاتی ورۆژئاوایی تا سەدەی سیانزدەیەم دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. لەناوەڕاستی سەدەی چواردەیەمدا سەربەخۆیی تەواوی دەستگیر بووە.

لەسەرەتای سەدەی شانزدەیەمدا تورکە عوسمانیەکان حوکمی ناوچەکەیان کردووە، تا لە شەڕی قرمی ١٨٥٦ دا تێکشکان وناوچەکە بۆتە بەشێك لە رۆمانیا.

دوای جەنگی جیهانیی دووەم یەکێتی سۆڤیەت مۆلداڤیایان خستۆتە ژێر دەسەڵاتی خۆیان ولەرۆمانیایان جیاکردۆتەوە، بەمەش کۆماری مۆلداڤیای سۆسیالیتی سەربەخۆ دامەزراوە.

لەمانگی پێنجی ١٩٩٠ دا مۆلداڤییەکان سەروەری یاساکانیان بەسەر یاساکانی یەکێتی سۆڤیەت راگەیاند، ناوی وڵاتیان لە مۆلدۆڤاوە گۆڕی بۆ مۆلدۆڤیا. دوای هەڵوەشانەوەی کۆمارەکانی یەکێتی سۆڤیەت، لە بەرواری ٢٧ / ٨ / ١٩٩١ دا بەتەواوی سەبەخۆ بووە وپەیوەندی کردووە بە کۆمۆنوێلتی وڵاتە سەربەخۆکان. لەساڵی ١٩٩٢ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان.

یەکەم سەرۆکی وڵات دوای سەربەخۆیی میرسیا سینجۆر بووە، دوای ئەو لەرێی هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکانەوە بیترۆ لۆسینشی دەسەڵاتی گرتۆتە دەست ولەدوای ئەویش فلادیمێر ڤۆرۆنین دەسەڵاتی گرتە دەست.

مۆلدۆڤا پەیوەندییەکانی لەگەڵ رۆمانیادا ئاسایی کردەوە وسڵاوی نیشتیمانی رۆمانیای گرتە خۆی، بەڵام کێشە وململانێکان لەنێوان دانیشتوانە رۆمانییەکانی مۆلدۆڤیا وکەمایەتییە رووس و ئۆکرانییەکان لەساڵی ١٩٩٢ هەڵگیرسا، بەڵام توانیان لەرێی دانوستان وگفتوگۆوە کێشەکانیان چارەسەر بکەن.

مۆلدۆڤا وڵاتێکی کشتوکاڵیە، چونکە کشتوکاڵی بەسەرەکیترین چالاکی ئەو وڵاتە دادەنرێت، بەڵام بارودۆخی ئابووری ئەو وڵاتە بەشێوەیەکی بەرچاو بەرەو پاش دەهات،

تەنانەت بووە هەژارترین وڵاتی ئەورووپا. ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی ساڵی ٢٠٠١ بەڵگەیەکی دیاری ئارەزووی خەڵکی ئەو وڵاتە بوو بۆ گەڕانەوە بۆ سەردەمی شیوعێت وسیستەمی سۆسیالیستی، شیوعییەکان توانیان سەرکەوتنێکی بێ وێنە بەدەست بێنن لەو هەڵبژاردنەدا.

**جەژنی نیشتیمانی:** ٢٧ / ٨ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی وڵات لەساڵی ١٩٩١ .

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٣,٨ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١١٠ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٨٧٠ دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٢٢ .

* * *

**ناوچەی دنستەر ( بریدنیستڕۆڤیا )**

لەساڵی ١٩٩٠ دا ناوچەی دنستەر لە مۆلدۆڤا جیابۆوە، دنستەر ناوچەیەکی بچوکی سەر سنووری رۆژهەڵاتی مۆلدۆڤایە، دانیستوانی نزیکەی ٧٠٠ هەزار کەس دەبن، زۆربەیان لە سلاڤییەکانن وسەر بە رووسیان، زۆر لەوە دەترسن مۆلدۆڤا رووبکاتە رۆژئاوا ولەگەڵ رۆمانیادا یەك بگرێتەوە، وێستگەیەکی کارەبای گەورە وخاوەنی پیشەسازییەکی قورس وبە بەهایە.

ململانێکان لەسەر ئەو ناوچەیە گەیشتە شەڕێکی کەم خایەن لەساڵی ١٩٩٢ دا، بەڵام بنەبڕ نەبوو. مۆلدۆڤا پێشنیاری مافی ئۆتۆنۆمی خستە بەردەم، بەڵام ئیگۆر سەمیرنۆڤ سەرۆکی دنستەر ئەم پێشنیارەی رەتکردەوە. ئیگۆر لەساڵی ١٩٩١ دا هەڵبژێردراوە و لەکۆتاییەکانی ٢٠٠١ دا سەر لەنوێ هەڵبژێردراوەتەوە. ئارەزووی سەربەخۆییەکی تەواو دەکات، تەواوی بنەماکانی دەوڵەتێکی سەربەخۆی لەوڵاتەکەیدا بنیات ناوە، تەنانەت دراوی تایبەتیشی دیاری کردووە، جگە لە پەرلەمان و دەستوور وحکومەتی تایبەت، بەڵام تا ئێستا بەشێوەیەکی نێودەوڵەتی دانی پیانەنراوە. روسیا پاسپۆرتی وڵاتی خۆی بەدانیشتوانی دنستەر بەخشیوە تاکو ئاسنکاری هاتوچۆیان بۆ بکات.

* * *

## مۆناکۆ

ناوی باو: مۆناکۆ.

ناوی فەرمی: میرنشینی مۆناکۆ.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Principality of Monako.·

سیستەمی حوکمڕانی: میر، وەزیری دەوڵەتیش سەرۆکایەتی حکومەت دەکات.

دەستەی یاسادانان: ئەنجومەنی نەتەوەیی ( ١٨ ئەندام ).

رووبەر: ٠,٦٨ میل دووجا، ١,٥ کم$^{٢}$

ژمارەی دانیشتوان: ٣١,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ١٦,٣٥٩ کەس/کم$^{٢}$ (چڕترین جێ لەهەموو جیهاندا )

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: مۆنیگاسکی، فەرەنسی، بەلجیکی، ئیتالی، ئینگلیز، ئەمریکی.

ئاین: مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك ).

زمان: مۆنیگاسکی ( زمانێکی ناوخۆیە).

پایتەخت: شاری مۆناکۆ.

شارە سەرەکییەکان: مۆنتی کارلۆ.

دراو: فرانکی فەرەنسی، یۆرۆ لەدوای بەرواری ١ / ١ / ٢٠٠٢ .

ئاو وهەوا: زستانی مام ناوەندە، نێوەندی پلەکانی گەرما ١٠ پلەی سەدییە، هاوینیشی فێنکە، هۆکاری سەرەکی ئەم ئاو وهەوا فێنکەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی چیاکانی ئەلب رووی با ساردەکانی مسترالی لێگرتووە کە بەسەر دۆڵی رۆندا هەڵدەکات. رێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ٨٢ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵییەکان: نییەتی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: بیرە، بابەتە کیمیاییەکان، شیرەمەنی، شیرینی.

سامانی کانزایی: نییەتی.

تێڕوانینێکی گشتی:

مۆناکۆ، ناوی هۆزێکی لیجۆرییە، یان ناوێکی بەرەچەڵەك یۆنانییە بەمانای: ئەوەی تەنیا دەژی دێت، دووەم بچوکترین وڵاتە لەجیهاندا، دوای ڤاتیکان، هەروەها چڕترین وڵاتە لەجیهاندا لەرووی رێژەی دانیشتوانەوە،وڵاتێکی ئەورووپییە دەکەوێتە سەر کەناری رێڤێرای

فەرەنسی کە نزیکەی ٣,٥٠٠ م درێژ دەبێتەوە لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست لەباشووری ڕۆژهەڵاتی فەرەنسا، ناوچەی ئەلپی ماریتیمی شاخاوی فەرەنسی لەهەر چوار لاوە لەگەڵیدا سنووردارە، لەدامێنی چیای ئاگلێ کە نزیکەی ١,١٠٠ م بەرزە لەسەر ئاستی رووی دەریا، نزیکەی ١٤ کم لەرۆژهەڵاتی شاری نیسی فەرەنسییەوە دوورە و٢٠ کم لە سنوورە ئیتالیەکانەوە دوورە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧/٢٥ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٤/ ٤٣ بەرەو باکوور.

لەسەدەی دوانزدەیەمدا خەڵکی جێنوای باکووری ئیتالیا دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. لەساڵی ١٣٠٨ دا خەڵکی جێنوا حوکم ودەسەڵاتی ناوچەکەیان بەخشییە خێزانی گریماڵدی – کەهەمان خەڵکی جێنوا بوون – . سەرەتا ئەم خێزانە لەگەڵ فەرەنسییەکاندا هاوپەیمانێتیان بەست، لەسەدەی شانزدەیەمەوە تا سەدەی هەڤدەیەم هاوپەیمانێتیان لەگەڵ ئیسپانیادا بەست. لەساڵی ١٧٩٣ دا فەرەنسا دەستی بەسەرا گرت، بەڵام کۆنگرەی ڤیێنای ١٨١٤ دەسەڵاتی ناوچەکەی خستەوە دەست خێزانی گریماڵدی وشانشینی سردینیا کردە راسپاردەیان. لەساڵی ١٩٤٩ دا میر ڕینێی سیانزدەیەم بۆتە میری مۆناکۆ.

میرەکانی مۆناکۆ حوکمی رەهای ناوچەکەیان دەکرد. لەساڵی ١٩١١ دا دەستووری وڵاتیان ڕاگەیاندووە، لەساڵی ١٩٦٢ دا دەستووری نوێ دارێژراوە دەسەڵاتی رەهای میری رەتکردۆتەوە وماف ئەوەی بەژن بەخشیوە خۆی هەڵبژێری، جگە لەرەتکردنەوەی سزای لەسێدارەدانیش. بەپێی ڕێکەوتننامەی نێوان فەرەنسا و مۆناکۆی ١٩١٨ ، حوکمی میرنشینی مۆناکۆ دەگەڕێتەوە بۆ فەرەنسا ئەگەر بێتو میری مۆناکۆ کوڕێکی نەبێت دوای خۆی دەسەڵات بگرێتە دەست. لەبەرواری ٢٨ / ٥ / ١٩٩٣ مۆناکۆ بووە ئەندامی نەتەوە یەککگرتوەکان. بەپێی ڕێکەوتننامەکان، فەرەنسا بە چاودێری سیستەمی دارایی مۆناکۆ دەکات ودادوەر وفەرمانبەری پێ دەبەخشێت.

ئابووری ئەو وڵاتە پشتی تەواوی بەچالاکییەکانی گەشتوگوزار بەستووە، جگە لە پیشەسازی، ساڵانە نزیکەی شەش ملیۆن گەشتیار لە زۆربەی وڵاتانی جیهانەوە رووی تێدەکەن، هەندێکیان لە فەرەنسا وئیتالیاوە بۆ بەسەر بردنی ڕۆژەکانی پشوو دێنە مۆناکۆ، دیارە بەهۆی نزیکی سنوورەکانیانە لەگەڵ وڵاتی ناوبرا. مۆناکۆ خاوەنی گەورەترین گازینۆیە لەجیهاندا کەناوی مۆنتی کارلۆیە. بەڵام زیاترین ناوبانگی ئەو وڵاتە لە پێشبڕکێکانی ئۆتۆمبێلدایە، بەناوبانگترین خەڵاتەکانی ئەو پێشبڕکێیە خەڵاتی گەورەیە بۆ پاڵەوانێتی ئۆتۆمبێل.

بەڵام کەمی رووبەری ئەو وڵاتە کێشەی چڕی دانیشتوانی بۆ دروست کردون، لەهاوینی

۲۰۰۲ دا حکومەتی مۆناکۆ هەستا بە دروستکردنی گەورەترین بەندەری سەرئاو لەهەموو جیهاندا وزیاترین دەوڵەمەندانی هەموو جیهان روویان تێکردووە. درێژی ئەو بەندەرە دەگاتە ۳۵۰ م وکێشەکەی ۱٦۰ هەزار تۆن دەبێت ولەگەڵ بەندەری لا کۆندامین بەهۆی پەتە پۆڵایینەکانەوە بەستراونەتەوە کەزیاتر لە ۷۰۰ پارچە لەو پەتانەی لەخۆ گرتووە، جگە لەژمارەیەك ئوتێل ویانە وریستۆرانتی گەورەو پارکی زیاتر لە ٤۰۰ ئۆتۆمبێل. دروستکردنی بەندەرەکە بڕی ٦٦ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی تێچووە، وەکو پسپۆڕان خەمڵاندویانە نزیکەی ۱۰۰ ساڵێك بڕ دەکات، بەندەرەکە لە ئیسپانیا دروستکراوە ونزیکەی ۱۳ ڕۆژ بەڕێگاوە بووە تا گەیەنراوەتە مۆناکۆ.

جەژنی نیشتیمانی: جەژنی مۆناکۆ بەناوی جەژنی میرەوە ناودەبرێت ولە ۱۹ / ۱۱ ی هەموو ساڵێك ئەم بۆنە دەگێڕدرێت، بەبۆنەی دەسەڵات گرتنە دەستی خێزانی گریماڵدی لەدەسەڵاتی ئەو وڵاتە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٤۷٥ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۱٦۲ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۱۱,۰۰۰ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۳۰ .

## میانمار

ناوی باو: میانمار.

ناوی فەرمی: یەکێتی میانمار.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Uniion of Myanmar.

سیستەمی حوکمڕانی: حوکمی سەربازی، بەرزترین دەسەڵاتی لە وڵاتدا: ئەنجومەنی وڵاتە بۆ گەڕاندنەوەی یاسا کەپێی دەوترێت ( ئەنجومەنی گەشەپێدان و ڕێکخراوی )، سەرۆکی ئەنجومەنی ناوبراویش دەسەڵاتی وەك سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و وەزیری بەرگری و وەزیری دەرەوە و سەرۆکی ئەرکانی سوپا.

دەستەی یاسادانان: کۆمەڵەی دامەزرێنەر ( ٤٨٥ ئەندام ).

ڕووبەر: ٢٦٠,٢٢٨ میل دووجا، ٦٧٦,٥٧٧ کم$^2$

ژمارەی دانیشتوان: ٤٦,٨٢٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

چڕی دانیشتوان: ٦٩,٢ کەس/کم$^2$

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: بۆرمی، شان، کارین، ڕاخین، مون، شین، کاشین.

ئاین: بوودی، مەسیحی، موسڵمان، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ.

زمان: بۆرمی.

پایتەخت: یانجۆن ( ڕانجۆن ئەوسا ).

شارە سەرەکییەکان: ماندالای، مۆلین، باجۆ، باسین.

دراو: کیات.

ئاو وهەوا: خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما لە پایتەختدا زستان ٢٥ پلەی سەدی و هاوین ٢٧ پلەی سەدی دەبێت. بارانەکان بەپێی ناوچەکان جیاوازیان هەیە لەنێوان ٧٦ سم بۆ ٥١٠ سم و زیاتر لەوەرزی هاویندا دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵییەکان: برنج، قامیشی شەکر، کونجی، لۆکە، لاستیك، بەخێوکردنی مەڕومالات، سەوزە ومیوە، گەنمەشامی، گەنم، هەرزن، تووتن.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: پەین، دروستکراوە خۆراکییەکان.

سامانی کانزایی: قورقوشم، یاقووتی شین، کەهرەمان ( بەردی زەردویی )، گاز، تەنگەستن، نەوت، زنك، تەنەکە، نەوت، زیو، سفیر ( جۆرێکە لەبەردی پیرۆز ).

تێڕوانینێکی گشتی:

میانمار، جاران پێی وتراوە بۆرما، ولاتێكە دەكەوێتە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا لەسەر كەناری بەنگال، چین دەكەوێتە باكووری ڕۆژهەلاتی، لاوس وتایلاند دەكەونە ڕۆژهەلاتی، دەریای ئاندامان وكەنداوی بەنگال دەكەونە باشووری ڕۆژئاوای، ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبری هێڵی درێژی ٩٦ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٠ بەرەو باكوور.

میانمار لەهەر یەك لەچین ولاوس وتایلاند بەهۆی زنجیرە چیای ڕۆژهەلاتەوە جیا دەبێتەوە، بەلام زنجیرە چیای ڕۆژئاوا، كە زنجیرەیەك چیای سەختە وكۆمەڵێك دارستانی چڕی دانیشتوان لەخۆ گرتووە، لە ولاتی هیندی جیا دەكاتەوە، هەردوو ڕووباری ئێروادی و سیتانج بەناوەڕاستی هەردوو چیای ناوبراودا تێپەڕ دەبێت ودەڕژێنە نێو كەنداوی بەنگالەوە. بەرزترین چیا لەو ولاتەدا دەكەوێتە ئەوپەڕی باكوورەوە، كە لوتكەی هەكاكبۆ رازی یە وبەرزییەكەی دەگاتە ٥٨٨١ م لە ئاستی ڕووی دەریا.

بەر لە پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە گەلی مون لە ڕۆژهەلاتی ئاسیاوە گەیشتونەتە ناوچەكە، بەمەش بەیەكەم دانیشتوانی ئەو ناوچەیە دادەنرێن. دوای ئەوان چەند گەلێكی دیكەش ڕوویان تێكردووە، تەواوی ئەو گەلانە لەساڵی ١٠٤٤ یەكیان گرتۆتەوە وشانشینێكی بەهێزیان پێك هێناوە تەواوی ناوچەكانی دەوروبەری گرتۆتەوە. بەلام مەغۆلەكان لەساڵی ١٢٨٧ دا پەلاماری شانشینەكەیان داوە، لەگەڵ ئەوەی كە بۆرمییەكان دوای ماوەیەكی كەم توانیان مەغۆلەكان بكەنە دەرەوەی شانشینەكەیان، بەلام نەیان توانی یەك بگرنەوە تا ساڵی ١٦٠٥ . لەكۆتاییەكانی سەدەی هەژدەیەمدا بۆرمییەكان دەستیان كرد بە بەرفراوان كردنی ولاتەكەیان بە داگیر كردنی چەند ناوچەیەكی سیام ( تایلاندی ) دراوسێیان. هاوكات ڕووبەڕووی بەریتانیەكانی هیند بوونەوە، لەنێوان بۆرمی وبەریتانیەكاندا لەنێوان ساڵەكانی ١٨٢٤ بۆ ١٨٨٥ سێ جار بەجەنگ هاتوون، بە داگیر كردنی بەریتانیا بۆ تەواوی ناوچە بۆرمییەكان و خستنە سەر هیند لەساڵی ١٨٨٦ دا كۆتایی پێهاتووە. لەساڵی ١٩٣٧ بۆرما لەهیند جیاكراوەتەوە بەتەنها كراوەتە داگیركراوەیەكی بەریتانی. یابانییەكان لەجەنگی جیهانیی دووەمدا داگیریان كردووە. دوای تێكشكانی یابانییەكان لە جەنگی ناوبراودا، بەریتانیا داگیری كردەوە، لەبەرواری ٤ / ١ / ١٩٤٨ لەبەریتانیا سەربەخۆ بووە و لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان.

دوای سەربەخۆیی، ولات دووچاری چەندین ململانێی سیاسی لەنێوان حكومەت وشیوعییەكان وكۆمەڵە نەژادیەكان بۆتەوە، هێندەی نەمابوو بخزێتە نێو شەڕێكی گەورەی ناوخۆ و خوێناوییەوە. لەساڵی ١٩٥٠ دا شۆڕشێكی چەكداری لە بۆرمادا هەڕەشەی گەورەی كردە سەر یەكێتی خاكی ولات، بەلام سەرۆكی سوپا نی وین توانی لەناوی بەرێت. لەساڵی ١٩٦٢ دا نی وین دەسەلاتی ولاتی گرتە دەست پارتی بەرنامەی سۆسیالیستی بۆرمی دامەزراند وبووە حاكمی سەربازی و نزیكەی چارەكە سەدەیەك حوكمێكی دیكتاتۆری لەولاتەكەدا پەیڕەو

کردووە، هەژاری ونەداری وولاتی گەیاندە نزمترین ئاست لەنێو هەموو جیهاندا. لەساڵی ١٩٨١ دا دەستی لە پۆستی سەرۆکی کۆمار هەلگرت وبووە سکرتێری گشتی پارتی دەسەلاتدار. لەساڵی ١٩٨٨ دا بۆرما شۆرشێکی گەورەی میللی بەخۆوە بینی و لەدەسەلات وحکومەت راپەرین، نی وین ناچار کرا خانەنشین بێت ولێپرسراوێتی تاوانەکانی خستە ئەستۆی کاربەدەست وئەفسەرەکانی، ئەفسەرانیش لەلایەن خۆیانەوە ئەنجومەنی دەولەتیان بۆ یاسا ورێکخاری دامەزراند، کە دواتر ناوی ئەو ئەنجومەنش گۆرا بۆ ئەنجومەنی ئاشتی و گەشە پێدان ولەسەرەتای ساڵی ١٩٩٢ جەنەراڵ تان شوی بووە سەرۆکی ئەو ئەنجومەنە. بەلام لەگەڵ ئەو هەموو رووداوە نالەبارانە، میانمار خۆی دوور راگرت لەکیشەکانی ولاتانی دراوسێ وناوچەکە.

لەبەرواری ٦ / ٥ / ٢٠٠٢ ، دوای هەولێکی زۆری ناوبژیوانە نێودەولەتییەکان، سەرۆکی ئۆپۆزسیۆنی میانمار خاتوو ئۆنج سانی خاوەنی خەلاتی نۆبلی ئاشتی لەساڵی ١٩٩١ بەهۆی ئەو هەولە زۆرانەی کەلەپێناوی سەقامگیرکردنی ئاشتی لەو ولاتەدا داوێتی، لەشوێنی نیشتەجێ بوونی زۆرە ملێی ئازاد کرا، شایەنی باسە لەدوای ساڵی ١٩٨٩ چەند جارێك خاتوو ئۆنج لەلایەن حاکمی سەربازییەوە دەستگیر کراوە، دوای ئازاد کردنی چەندین خۆپیشاندان بۆ پێشوازی لێکردنی ئەنجام دراو، گەلی میانمار سلاوێکی شۆرشگێرانەیان لێکردووە.

ناوی کۆنی ولات بۆرما بووە، کە شێوە دەربرینێکی ئینگلیزی بووە، دوای ٢٥ / ٥ / ١٩٨٥ ناوی ولات گۆرا بۆ یەکێتی میانمار .

ئابووری میانمار پشتی بە کشتوکاڵی بەستووە وزیاتر لە یەك لەسەر سێی دانیشتوانی سەرقاڵی جوتیارین، بۆیە تا ئاستی بە ئابوورییەکی بە پاشکەوتوو دادەنرێ. زیاترین کێشە ئابوورییەکانی ئەو ولاتە بلاوبوونەوەی بێکاری وهەلئاوسان وخاوی گەشە کردنێتی، چاندنی ماددەی ئەفیونیش لەم سالانەی دواییدا کێشەی زۆری بۆ دروست کردووە.

سروودی نیشتیمانی: نیشتیمانی ئازاد.

جەژنی نیشتیمانی: ٤ / ١ ی هەموو ساڵێك، جەژنی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٤٨ .

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٢٧,٧ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٥١ .

نێوەندی خەرجی سالانەی تاك: ٨٦٣ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٢٣ .

## میکرۆنیزیا

**ناوی باو:** میکرۆنیزیا.

**ناوی فەرمی:** ویلایەتە فیدرالیەکانی میکرۆنیزیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Federated State of Micronezia

**سیستەمی حوکمرانی:** کۆمارێکی یەککگرتووی خاوەنی ماف ئۆتۆنۆمییە لەچوار چێوەی یەکێتییەکی ئازاد لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا. سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسا دانان:** کۆنگرێس ( ١٤ ئەندام ).

**رووبەر:** ٢٧١ میل دووجا، ٧٠٢ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠٩,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٥٠,٤ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** چەند کۆمەڵەیەکی نەژادی جیاواز لە دورگەکانی زەریای هێمن.

**ئاین:** مەسیحی ( پرۆتستانت، رۆمان کاسۆلیك)ز

**زمان:** ئینگلیزی، چەند زمانێکی ناوخۆ.

**پایتەخت:** بالیکیر.

**شارە سەرەکییەکان:** موان، تۆل، کۆلۆنیا.

**دراو:** دۆلاری ئەمریکی.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی مام ناوەند بەدرێژایی ساڵ، نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ٢٠ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت. بارانەکان زیاتر لەوەرزی هاویندا دەبارێن وئەو پەڕی دەگاتە ٥٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گوێزی هیندی، ئەناناس، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشە سازییەکان:** زەیتی گوێزی هیندی، سابوون، شەکر.

**سامانی کانزایی:** نییەتی.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

میکرۆنیزیا، بەمانای دورگە بچوکەکان دێت، وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکی بچوکی خاوەن ماف ئۆتۆنۆمییە لەچوارچێوەی یەکێتییەکی ئازاد لەگەڵ ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا.

دەکەوێتە سەر زەریای هێمن لەباکووری هێڵی یەکسانەوە بەرەو رۆژهەڵاتی فلیپین، دورگەکانی مارشاڵ دەکەونە رۆژهەڵاتی و دورگەکانی گوام دەکەونە باکووری رۆژئاوای، دورگەی بالاو دەکەوێتە رۆژئاوای ودورگەکانی سولەیمان دەکەونە باشووری، ناوەراستی میکرۆنیزیا دەکەوێتە سەر یەکێری هێڵی درێژی ١٥٠ بەرەو رۆژهەڵات وهێڵی پانی ١٠ بەرەو باکوور.

میکرۆنیزیا لە ٦٠٧ دورگە پێك دێت، لەرۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا بەماوەی ٢٨٠٠ کم درێژ بوونەتەوە ولەباکوورەوە بۆ باشوور بەماوەی ٩٦٥ کم دەبن، خاوەنی گەورەترین بواری دەریاییە لەنێو زەریای هێمن کە دەگاتە ٢,٩٧٨,٠٠٠ کم٢ ، بەلام رووبەری خوودی ولاتەکە لە ٧٠٢ کم٢ تێناپەرێت. گەورەترین دورگەی بوهنبی یە و رووبەرەکەی ٣٢٤ کم٢ دەبێت و بالیکیری پایتەختیشی تێدەکەوێت.

هەندێك لە دورگەکان بەرەچەڵەك گرکانین وهەندێکیان لە پاشماوە مەرجانییەکانەوە دروست بوون.

بەر لە ٣٥٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە خەڵکی لە دورگە دراوسێکان وباشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاوە گەیشتونەتە دورگەکانی. ئەورووپیەکان لەسەرەتای ١٥١٣ دا دۆزیویانەتەوە. لەساڵی ١٨٨٥ دا دورگەکان کەوتۆتە ژێر دەسەڵاتی ئیسپانیاوە. لەسەرەتای جەنگی جیهانی یەکەمدا یابان داگیری کردووە. هێزە ئەمریکییەکان لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمەوە ( ١٩٤٤ ) داگیریان کردووە. لەساڵی ١٩٤٧ دا کراوە بەسێ ناوچەوە و بۆتە بەشێکی ئەو ناوچانەی دورگەکانی زەریای هێمن کەسەر بەنەتەوە یەکگرتوەکانە بەلام لەلایەن ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە بەرێوە دەبرێت. لەساڵی ١٩٧٩ دا ماف ئۆتۆنۆمی پێبەخشرا. لەساڵی ١٩٨٢ دا ویلایەتە فیدرالیەکانی میکرۆنیزیا و ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا پەیماننامەی پێکەوە گرێدانی ئازادنیان واژۆ کردووە، لەساڵی ١٩٨٣ دا پەیماننامەکە پتەو کراوە، لەساڵی ١٩٨٥ دا یاسای ئەمریکی پەسەندی کردووە، لەپاشدا لەلایەن نەتەوە یەکگرتوەکانەوە کاری پێکراوە. زاراوەی پێکەوە گرێدانی ئازاد مەبەست لەوەیە کە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لێپرسراوی ئاسایشی ناوخۆ وبەرگری وپێشکەش کردنی دارایی میرکۆرنیزیا دەگرێتە خۆی بۆ ماوەی پانزدە ساڵ لەبەرواری ٣ / ١١ / ١٩٨٦ بەدواوە. بەپێی پەیماننامەکەشدوا بەدوای ئەو بەروارە رێگا بەسەربەخۆیی تەواوی ئەو دورگانە دەدات، یان ئەوەیە باری یاسایی خۆی لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا راست کاتەوە هەر کاتێك بیەوێ، بەمەرجێ رای زۆرینەی دانیشتوانی لەسەر بێت. لەبەرواری ١٧ / ٩ / ١٩٩١ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

ئابووری ئەو ولاتە بەشێوەیەکی سەرەکی پشتی بەو برە یارمەتیانە بەستووە کە لەویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا وەری دەگرێت، جگە لەوەی گەشتوگوزاریش بەشداریەکی بەرچاوی هەیە لە بەرهەمی نەتەوەیی، هەروەها بەرهەمی زەیتی گوێزی هیندی وگوێزی هیندیش تا ئاستێ توانیویانە ببنە سەرچاوەیەکی ئابووری ئەو ولاتە.

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٢٠٢ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ١٧٨ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٨٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا: ٨٦ .

## نامیبیا

**ناوی باو:** نامیبیا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری نامیبیا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Namibia.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٧٢ ئەندان ).
- ئەنجومەنی نیشتیمانی ( ٢٦ ئەندام ).

**رووبەر:** ٣١٨,٥٨٠ میل دووجا، ٨٢٥,١١٨ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١,٧٢٧,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٢,١ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقییە رەش پێستەکان ( لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێك دێن گرنگترینیان:( ئەفامبۆ، کافانگۆ)، کۆمەڵێ ئەوروپی.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، ئەنگلیکان ).

**زمان:** ئینگلیزی، بانتو، ئەفەریکان، ئەڵمانی.

**پایتەخت:** ویندهۆك.

**شارە سەرەکییەکان:** سواکۆ بمۆند، رۆندۆ، ریهۆبۆت، کیتمنشۆب.

**دراو:** دۆلاری نامیبی.

**ئاو وهەوا:** مام ناوەندە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا ٢٢ پلەی سەدی ولەهاویندا ٢٤ پلەی سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەناوچە باکوورییەکان ٥٠ سم ولەناوچە ناوخۆییەکان وناوەڕاست ٣٠ سم، لە ناوچە باشوورییەکان ١٠ سم.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنمەشامی، هەرزن، سەوزە، بەخێوکردنی مانگا، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ماسی قتوو، دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** مس، ئەڵماس، قورقوشم، یۆرانیۆم، زنك.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

نامیبیا وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای ئەفریقیا، ئەنگۆلا دەکەوێتە باکوور، بتسوانا دەکەوێتە رۆژهەلاتی، باشووری ئەفریقیا دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی، زەریای

ئەتڵەسی دەكەوێتە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ١٨ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٢ بەرەو باشوور.

بیابانی نامیبیا ئەو كەنارەی دادەپۆشێ كە دەكەوێتە سەر زەریای ئەتڵەسی، بەڵام بیابانی كەلهاری ناوچە ڕۆژهەڵاتییەكانی دادەپۆشێ، دەشتێكیش كە ١٢٠٠ م لەسەر ئاستی ڕووی دەریا بەرز دەبێتەوە ناوچە ناوییەكان وناوەڕاست دادەپۆشێ. شایەنی باسە دەشتەكە ناوچەیەكی كشتوكاڵی ولەوەڕی ئاژەڵان ودار ودەوەنێكی زۆری تێدەكەوێت.

لە سەردەمێكی زووەوە دانیشتوان لەباكوورەوە بەرەو ناوچەكە هاتوون. لەساڵی ١٨٦٨ دا ئەڵمانیا كەنارەكانی گرتۆتە دەست. لەساڵی ١٨٨٤ دا ئەڵمانیا ناوچەكەی بەموڵكی خۆی ڕاگەیاندووە وناوی ناوە باشووری ڕۆژئاوای ئەفریقیای ئەڵمانی. لەساڵی ١٩١٥ دا هێزەكانی باشووری ئەفریقیا هێرشێكی توندیان كردە سەر هێزە ئەڵمانییەكانی نامیبیا و تێكیان شكاندوون. لەوە بەدوا باشووری ئەفریقیا دەسەڵاتی خۆی بەسەر نامیبیا ڕاگەیاندووە. لەساڵی ١٩٢٠ دا یەكێتی نەتەوەكان ڕاسپاردەیی نامیبیای خستۆتە ژێر دەسەڵاتی ئەفریقیای باشوور، بەڵام لەساڵی ١٩٤٦ دا ئەفریقیای باشوور، لەگەڵ نارەزایی نەتەوە یەكگرتوەكان، ناوچەكەی خستۆتە سەر وڵاتی خۆی. لەساڵی ١٩٦٦ دا كۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەكگرتوەكان كۆتایی ڕاسپاردەیی باشووری ئەفریقیای لە نامیبیا ڕاگەیاند، بەڵام باشووری ئەفریقیا بڕیارەكەی بەناشەرعی داناوە ولەحوكمی نامیبیا بەردەوام بوو. لەساڵی ١٩٧١ دا دادگای نێودەوڵەتی ڕایگەیاند كە دەسەڵاتی باشووری ئەفریقیا لە نامیبیا نایاساییە.

لەساڵی ١٩٦٠ دا زۆرینەی ڕەش پێستەكانی نامیبیا ڕێكخراوی میللەتانی باشووری ئەفریقیایان ( سوابۆ ) دامەزراند، ڕێكخراوی ناوبرا هەوڵی دا باوەڕ بە حكومەتی بەباشووری ئەفریقیا بهێنێت دەست لە نامیبیا هەڵگرێ وسەربەخۆیی پێ ببەخشێت بەڵام داواكارییەكانی بەردەوام ڕەت دەكرانەوە، ناچار ( سوابۆ) دەستی دایە خەباتی چەكداری وشەڕی پارتیزانی لەگەڵ هێزە نایاساییەكانی باشووری ئەفریقیا تا لە ٢١ / ٣ / ١٩٩٠ دا سەربەخۆیی خۆی دەستگیر بوو وله ٢٣ / ٤ / ١٩٩٠ دا بووە ئەندامی نەتەوە یەكگرتوەكان. سام نگۆمای سەرۆكی ( سوابۆ ) بووە یەكەم سەرۆكی نامیبیا، بەو مەرجەی یەكەم هەڵبژێرداوی دوای ئەو ببێتە سەرۆكی وڵات.

لەساڵی ١٩٦٠ دا ئەو وڵاتە ناونراوە نامیبیا، بەوهۆیەوە كە بیابانی نامیب بەشێكی زۆری ڕووبەری ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە، نامیبیا بەزمانی ناوخۆی وڵات بەمانای: ئەو وڵاتەی خاوەنی نییە، یان وڵاتی بێ خاوەن یان ئەو لاتەی كە هیچی نییە دێت.

کانزاکـان وراوه ماسـی وکـشتوکاڵی لـه چـالاکییه ئابوورییـه سـەرەکییەکانی ئـەو وڵاتـه دادەنرێن، بەڵام ئەو وشکە ساڵیەی جار جارە رووی تێدەکات زیانێکی زۆر بە بەرهەمەکانی دەگەیەنێت و ئاسەوارێکی سلبی بە سامانی ئاژەڵی ئەو وڵاتە دەگەیەنێ.

جەژنی نیشتیمانی: ٢١ / ٣ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ١٩٩٠ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:١٢٣ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٩٠٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٨٤ .

## ناورو

ناوی باو: ناورو.

ناوی فەرمی: کۆماری ناورو.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Nauru.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

دەستەی یاسادانان: پەرلەمان ( ١٨ ئەندام ).

ڕووبەر: ٨,٢ میل دووجا، ٢١,٢ کم٢

ژمارەی دانیشتوان: ١٢,٠٠٠ کەس (تا ساڵی ٢٠٠٠ ).

چڕی دانیشتوان: ٤٩٠,٦ کەس/کم٢

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: بۆلینیزی، چینی، ئەورووپی.

ئاین: مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ).

زمان: ئینگلیزی، ناوروویی.

پایتەخت: یارین.

شارە سەرەکییەکان: نییەتی.

دراو: دۆلاری ئۆستورالی.

ئاو وهەوا: کەمەرەیی، بەهۆی با بازرگانیەکانەوە سارد دەبێت، نێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ٢٤ بۆ ٤٣ پلەی سەدی دەبێت. ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان دەگاتە ٢٠٠ سم.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: گوێزی هیندی، مۆز، ئەناناس، سەوزە، بەخێوکردنی بەراز، پەلەوەر، ڕاوەماسی.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: نییەتی.

سامانی کانزایی: فۆسفات.

تێڕوانینێکی گشتی:

ناورو وڵاتە دورگەیەکە دەکەوێتە باشووری ڕۆژئاوای زەریای هێمن، سێهەم بچوکترین وڵاتە لەجیهاندا دوای ڤاتیکان ومۆناکۆ، دەکەوێتە نیوەی ئەو ماوەیەی نێوان ئۆستورالیا وهاوای. نزیکەی ٣٩٠٠ کم لە باشووری ڕۆژئاوای دورگەکانی هاوایەوە دوورە، ٦٥ کم لەباشووری هێڵی کەمەرەییەوە دوورە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٦٦/٥٦ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٠/٣١ بەرەو باشوور.

دورگەی ناورو شێوە هێلکەیی وبەرەچەڵەك مەرجانییە، زۆربەی زەوییەکانی بریتییە لە بانێك ٦١ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوە بەرزە، لەنزیك ئەو بانەشەوە دەشتێکی بەپیتی تێدەکەوێت کە رووبەرەکەی زۆر کەمە، هەروەها لەچوار دەوری ئەو دەشتەش هەندێ زەوی بەپیتی تێدەکەوێت. لە زۆربەی دانیشتوان لەدەوروبەری کەنارەکەی کۆبوونەتەوە کە درێژییەکەی دەگاتە ١٩ کم .

وەك هەموو دورگەکانی دیکە، لە دورگەکانی دراوسێوە خەڵکی روویان تێکردووە. لەساڵی ١٧٩٨ دا دەریاوانی بەریتانی جۆن فێرن گەیشتۆتە دورگەکە وناوی ناوە دورگەی دڵکەش. ئەڵمانەکان لەساڵی ١٨٨٨ دا داگیریان کردووە وتا ساڵی ١٩١٤ بەدەستیەوە ماوەتەوە، لەدوای ئەو ئوستورالیا چۆتە ناوی. لەساڵی ١٩١٩ دا کۆمەڵەی نەتەوەکان دورگەکەی بەهەر یەك لەئوستورالیا ونیوزیلاندا وبەریتانیا سپاردووە. یابان لەماوەی جەنگی جیهانیی دووەمدا داگیری کردووە ودوای جەنگ ئوستورالیا داگیری کردۆتەوە. لەساڵی ١٩٤٧دا نەتەوە یەکگرتوەکان دانی ناوە بەدەسەڵاتی ئوستورالیا لە دورگەکە لەدوای ساڵی ١٩٦٤ دا ناورو داوای سەربەخۆیی لە ئوستورالیا کردووە، لە بەرواری ٣١ / ١ / ١٩٦٨ دا بەتەواوی سەربەخۆ بووە. لەساڵی ١٩٦٩ دا بۆتە ئەندامی کۆمۆنوێلتی بەریتانی ولەساڵی ١٩٩٩ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەهاوینی ٢٠٠١ دا ناورو رەزامەندی لە وەرگرتنی ٢٥٠ پەنابەری ئەفغانی کرد لەکۆی ٤٠٠ پەنابەر کەشتییەکی نەرویجی رزگاریی کردبوون و ئوستورالیا رێی پێنەدا بوون بچنە نێو وڵاتەکەیەوە، هەروەها نیوزیلانداش ئەوانی دیکەی وەك پەنابەر وەرگرت.

لەبەرواری ٢٣ / ٧ / ٢٠٠٢ دا تایوان پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی لەگەڵ ناورودا بچڕاند، ئەمە دووای دوو رۆژ لە ئەنجام دانی پەیوەندییەکانی ناورۆ لەگەڵ چیندا.

لەساڵی ١٩٠٧ دا جۆرێکی زۆر باشی فۆسفات لەلایەن کۆمپانیایەکی بەریتانی ونیوزیلاندی لەناورودا دەرهێنراوە، دوای سەربەخۆیی دەستبەجێ حکومەتی ناورو دەستی کردووە بەدەرهێنانی، بەڵام کێشەکەی لەوەدایە نزیك تەواو بوونی ئەو جۆرە فۆسفاتەیە لەنێو کانەکاندا، ناورو جگە لە فۆسفات هیچ جۆرە سەرچاوەیەکی کانزایی شك نابات، بۆیە ئابووری وڵاتەکەی بەرەو پاش دێت. دانیشتوانی رووبەرووی کێشەی بێکاری بونەتەوە ئەمەش بۆتە هۆی فشارێکی کۆمەڵایەتی، بۆیە ناچار ناورو خۆی خزانۆتە کێشەی شتنەوەی پارە ناشەرعییەکانی ئەو وڵاتانەی بەو کێشەیە تاوانبار کراون، وەزارەتی خەزێنەی ئەمریکا ئاشکرای کردووە لە ساڵی ١٩٩٨ دا زیاد لە ٧٠ ملیار دۆلار لە رووسیاوە بەرەو دورگەکە رەوانە کراوە، بۆیە ئەمریکا یاسای لەناوبردنی تاوانە داراییەکانی دەرکردووە، بەڵام ناورو

ملکەچی داواکارییەکانی ئەمریکا نابێت چونکە خۆی بەوڵاتێکی سەربەخۆ دەزانێت وسەروەری خۆی هەیە.

ناورو خاوەنی پرۆژەیەکی زۆرە لەهەر یەك لە ئوستورالیا ونیوزیلاندا وئێستا سەرقاڵی چەند پلانێکە بۆ بەکرێدانی سەرچاوەکانی لەپێناوی گەشەپێدانی ئابووری وباری کۆمەڵایەتی وڵاتەکەی.

جەژنی نیشتیمانی: ٣١ / ١ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٦٨ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٨٠ ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:١٨٨ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٨,٠٧٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٣٧ .

## نەرویج

**ناوی باو:** نەرویج.

**ناوی فەرمی:** شانشینی نەرویج.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Norway.

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، شا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمان ( ١٦٥ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٢٥,٠٥٠ میل دووجا، ٣٢٣,٨٧٨ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤,٤٠٥,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٣,٦ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** نەرویجی، دانیمارکی، بەریتانی، پاکستانی، ئەمریکی، یۆگۆسلاڤ، ئێرانی، سویدی.

**ئاین:** مەسیحی ( لۆتەری )، بێ باوەڕ.

**زمان:** نەرویجی.

**پایتەخت:** ئۆسلۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** بێرجین، ترۆندهایم، ستاڤانگەر، بۆرۆم.

**دراو:** کرۆنی نەرویجی.

**ئاو وهەوا:** زستانی سارده وپلەکانی گەرما لە پایتەختدا دەچێتە سفری سەدی وهەندێ جار لەوە زیاتر دادەبەزێ، لەهاویندا ١٧ پلەی سەدی. بارانەکان لەبەشە ناوخۆییەکان کەمتر دەبارێت وەك لەسەر کەنارەکان. ناوچە باکوورییەکان زۆر ساردن وبەفر دایپۆشیوە.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، بەخێوکردنی مەڕوماڵات، شیرەمەنی، شۆفان، پەتاتە، ڕاوەماسی، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئەلەمنیۆم، دروستکراوە کیمیاییەکان، دروستکراوە خۆراکییەکان، بەرهەمە نەوتییەکان.

**سامانی کانزایی:** ئیلمەنیت ( کانزایەکی ڕەشی قورسە لە ئاسن دەچێت )، ئاسن، قوڕقوشم، مۆلیبەدینیت، نەوت، گاز، بیرایت، زنك، مس.

### تێڕوانینێکی گشتی:

نەرویج، بەمانای ڕێگای باکوور دێت، وڵاتێکە دەکەوێتە باکووری ڕۆژئاوای ئەوروپا، بەشی ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی ئەسکەندەنافیای گرتۆتەوە. زەریای بەستەڵەکی باکوور دەکەوێتە

باکووری، روسیا وفینلەندا وسوید دەکەونە رۆژهەلاتی، دەریای باکوور دەکەوێتە باشووری، زەریای ئەتڵەسی دەکەوێتە رۆژئاوای. یەك لەسەر سێی باکووری وڵات دەکەوێتە سەر بازنەی جەمسەری باکوور، ئەویش ئەو ناوچەیەی کەبەخاکی خۆری نیوە شەو دەناسرێت، ماوەی ٢٤ کاتژمێر لەهاویندا رۆژە ولەزستاندا بەپێچەوانەوە ٢٤ کاتژمێر شەوە. ناوەراستی نەرویج دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٠ بەرەو رۆژهەلاتی لەگەڵ هێڵی پانی ٦٢ بەرەو باکوور.

نزیکە ١٥٠,٠٠٠ دورگە لەسەر کەنارەکانی نەرویج بڵاوبوونەتەوە، هەندێکی چۆڵە وکەسی لێناژی وهیچ بەرهەمێکی نییە، دورگەکانی لۆفۆتۆن و فسترالن گەورەترینی ئەو دورگانەن، هەروەها دورگەکانی جان ماین ودورگەکانی سڤالبارد لە زەریای بەستەڵەکی باکوور سەر بە نەرویجن، جگە لە دورگەی بۆفیت ( زەریای ئەتڵەسی ).

زۆربەی خاکی نەرویج بریتییە لە بانێکی بەردەڵان ونێوەندی بەرزییەکەی دەگاتە ٤٥٧ م لەسەر ئاستی رووی دەریا، رووبەرێکی کەمی ئەو وڵاتە بۆ چالاکییە کشتوکاڵیەکان لەبارە ودەکەوێتە ناوچە نزمەکانی باشووری رۆژهەلات ونزماییەکانی ترۆندهایم.

نزیکەی ١١,٠٠٠ ساڵ لەمەوبەرەوە خەڵکی لەکەنارە باکووری ورۆژئاواکانی نەرویجدا ژیاون. لەساڵی ٢٠٠٠ پ.ز هۆزە تاوانکارییەکان نیشتەجێی بوون ولە دەوروبەری ساڵی ١١٠٠ ز دا گەلی سامی کە ئێستا ژمارەیان ٤٠ هەزار دەبێ لەباکووردا جێگیر بوون. لەسەدەی نۆیەمی زایینیدا فایکنجەکان – لەهۆزە تاوانکارییەکانی لەوڵاتە ئەسکەندەنافیەکاندا ژیاون وپێیان دەوترا داگیرکەرانی باکوور – پەلاماریان داوە، لەساڵی ١٣٨٠ دا نەرویج ودانیمارك یەکیان گرتووە ولەساڵی ١٣٩٧ هەر یەك لە نەرویج ودانیمارك وسوید یەکێتی کالماریان دامەزراندووە. لەساڵی ١٥٢٣ دا سوید لەیەکێتی ناوبراو کشاوەتەوە، نەرویج ودانیمارك تا ساڵی ١٨١٤ بەیەکەوە مانەوە، بەڵام بۆ ساڵی دوایی هەر یەك لە سوید ونەرویج یەکیان گرتەوە. یەکێتی کالمار تا بەرواری ٧ / ٦ / ١٩٠٥ مایەوە، تا پەرلەمانی یەکێتی ناوبراو کۆتایی بە یەکگرتنی سوید هێنا، بۆیە لە ٢٧ / ١٠ / ١٩٠٥ سوید دانی نا بەسەربەخۆیی نەرویج و دوای دوو مانگ هاکۆنی حەوتەم بووە پادشای وڵات. دوای کۆچی دوایی هاکۆن لەساڵی ١٩٥٧ دا، ئۆلاف پێنجەم هاتە سەر تەختی پادشایی وبووە شای وڵات.

نەرویج لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا بێ لایەن بوو، بەڵام لەجەنگی جیهانیی دووەم ئەڵمانیا داگیری کرد، لە ساڵی ١٩٤٥ دا بووە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

پادشای نەرویج دەسەڵاتی بەرفراوانی نییە، دەسەڵاتی فیعلی بەدەست سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە. لەساڵی ١٩٩١ دا هارالدی پێنجەم هاتە سەر تەختی پادشایی و بووە شای نەرویج. لەم دواییانەدا کۆمەڵەیەك بەناوی رێکخراوی نیشتیمانی داوای بەکۆمار بوونی نەرویجیان کردووە وایان داناوە لەساڵی ٢٠١٤ دا سیستەمی پادشایی رەتبکرێتەوە و نەرویج ببێتە کۆماری نەرویج.

تا ساڵی ۱۹۹۰ دەستووری نەرویج ڕێگای بەژن نەداوە تەختی پادشایی وڵات بگرێتە دەست، بەڵام دوای ئەو بەڕواریە گۆڕانکاری لەدەستووردا ئەنجام دراو وبەپێی ئەو گۆڕانکاریانە ژن بۆی هەیە بگاتە تەختی پادشایی نەرویج، بەو پێیەش شازادە میت ماریت کرایە وەلی عەهدی نەرویج.

لەسەرەتای هەفتاکانەوە لەدەریای باکوور نەوت وگاز لەلایەن کۆمپانیایەکی ئەمەریکییەوە دەرهێنراوە، بەڵام دوای ئەوە نەرویجییەکان خۆیان توانیان دەرهێنانی نەوت وگاز بگرنە دەست وکۆمپانیای خۆماڵی بۆ ئەو مەبەستە دامەزرێنن، بۆیە ئێستا ئەندازیارانی نەرویج بە پسپۆری پلە یەك دادەنرێن لەجیهاندا لە بواری دەرهێنان ودۆزینەوەی نەوت لەنێو دەریاکاندا.

نەرویج خاوەنی نیوەی یەدەگی نەوتی ئەوروپایە، بەپلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا، دوای سعودیە، لەرەوانە کردنی نەوت بۆ دەرەوەی وڵات.

نەرویج بەپلەی چوارەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بەرهەمی کۆبالت وبەپلەی پانزدەیەم دێت لە راوەماسی. ئابووری نەورویج زۆر پێشکەوتووە، ئەو ڕووبارانەی لەچیاکانی نەرویجەوە هەڵدەقوڵێن وبەنێو دەشتەکاندا تێپەڕ دەبێت وزەیەکی کارەبایی زۆر هەرزانی بۆ وڵاتەکە دابینکردووە. پێشکەوتنی ئابووری ئەو وڵاتە دەگەڕێتەوە بۆ پێشکەوتنی پلانە ئابوورییەکانی حکومەت لەم بوارەدا بۆ هاندانی بەرهەمهێنەرە بیانییەکان، ئەمەش بۆتە هۆی دابەزاندنی ڕێژەی بێکاری لەو وڵاتەدا.

لەساڵی ۲۰۰۱ دا لە راپۆرتێکی نەتەوە یەکگرتوەکاندا هاتووە کە خەڵکی نەرویج خاوەنی بەرزترین ئاستی ژیانن لەنێو وڵاتانی جیهاندا، دوای ئەوەی کەنەدا وئوستورالیا ساڵەکانی لەوەو پێش لەو باشتر بوون لەم ڕوەوە.

**سروودی نیشتیمانی: بەڵێ ئێمە نیشتیمانی خۆمان خۆش دوێ.**

**جەژنی نیشتیمانی: ۱۷ / ٥ ی هەموو ساڵێك، یادی دەرچوونی دەستووری وڵات لەساڵی ۱۸۱٤.**

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ۱۱٤,۳ ملیار دۆلاری ئەمریکی.**

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ۳۰ .**

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ۲٦,٤۸۰ دۆلاری ئەمەریکی.**

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٦ .**

## نەمسا

ناوی باو: نەمسا.

ناوی فەرمی: کۆماری نەمسا.

ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:

Republic of Austria.

سیستەمی حوکمڕانی: کۆماری یەکگرتوو، سەرۆکی وڵات، راوێژکار.

دەستەی یاسادانان: لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی یەکگرتوو ( ٧٦ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نیشتیمانی ( ١٤٨ ئەندام ).

رووبەر: ٣٢,٣٧٨ میل دووجا، ٨٣,٨٥٩ کم²

ژمارەی دانیشتوان: ٨,١١٠,٠٠٠ کەس (تاساڵی ٢٠٠٠ ).

چڕی دانیشتوان: ٩٧ کەس/کم²

کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە: نەمسایی، یۆگۆسلاڤ، ئەڵمان، تورك.

ئاین: مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت )، موسڵمان.

زمان: ئەڵمانی.

پایتەخت: ڤیێنا.

شارە سەرەکییەکان: گراز، لینز، سالزبۆرگ، ئینسبرۆك.

دراو: شلنی نەمسایی، یۆرۆ لەدوای بەرواری ١ / ١ / ٢٠٠٢ .

ئاو وهەوا: مام ناوەندە، هەر چوار وەرزی ساڵ بەخۆوە دەبینێ، نێوەندی پلەکانی گەرما لەهاویندا ١٩ پلەی سەدی ولەزستاندا ٣ پلەی ژێر سفری سەدی. رێژەی ساڵانەی بارانەکان ٦٥ سم دەبارێت.

بەرهەمە کشتوکاڵیەکان: جۆ، بەخێوکردنی مانگا، گەنمەشامی، بەخێوکردنی بەراز، پەتاتە، چەوەندەری شەکر، گەنم.

بەرهەمە پیشەسازییەکان: چیمەنتۆ، دروستکراوە کیمیاییەکان، ئامێری کارەبایی وئەلیکترۆنی، دروستکراوە خۆراکییەکان، کەلوپەلی ناوماڵ، شووشە، ئاسن، ئامێر، چنین، ئۆتۆمبێل، ئامێری پزیشکی، کاغەز، داروتەختە.

سامانی کانزایی: خەڵووزی بەردین، مس، گرافیت، ئاسن، قوڕقوشم، مەنگەنیز، گاز، نەوت، خوێ، زنك.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

نەمسا وڵاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەوروپا، چیك و سلۆڤاکیا دەکەونە باکووری، مەجەڕ ( هەنگاریا ) دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، سلۆڤینیا وئیتالیا دەکەونە باشووری، سویسرا ولختنشتاین دەکەونە رۆژئاوای، ئەڵمانیا دەکەوێتە باکووری رۆژئاوا، هیچ کەنارێکی نییە بۆ سەر دەریاکان. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٤ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٧/٥٠ بەرەو باکوور.

وڵاتی نەمسا بەدیمەنی چیا وگردە زۆر جوانەکان بەناوبانگە، چیاکانی ئەلب وگردە نزمەکان بەنێو ناوچە رۆژئاوا وباشوورییەکانی وڵاتدا درێژ دەبێتەوە وچەند دارستانێکی چڕیش دایپۆشیوە، دۆڵ ودەشتێکی بەرفراوان وهەمیشە سەوز دەکەوێتە نێوان چیاکان، چەند دەریاچەیەکیش دەکەوێتە ئەو ناوچەیە، روباری دانوب بەنێو بەشی باکووری نەمسادا درێژ دەبێتەوە.

لەساڵی پانزدەی پ.ز رۆمانەکان ناوچەکەیان داگیر کردووە، پاشان وندالی و قووت و هۆنەکان لەسەدەی پێنجەمدا دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتۆتە دەست. ئال هابسبێرگ لەساڵی ١٢٧٨ تا ساڵی ١٩١٨ حوکمی ئەو وڵاتەیان کردووە. لەسەدەکانی شانزدەیەم وحەڤدەیەمدا تورکە عوسمانییەکان هەوڵی داگیر کردنی ناوچەکەیان داوە، بەڵام شکستیان هێناوە، دوایین جەنگی نێوان عوسمانی ونەمساییەکان ساڵی ١٦٨٣ بووە وناوی جەنگی کالینبێرگ بووە لە ڤیێنا، بە شکانی عوسمانیەکان وکشانەوەیان کۆتایی پێهاتووە. شکانی عوسمانیەکان لەو شەڕەدا ئیمپراتۆریەتی نەمساییەکانی زۆر بەهێز کرد و دەسەڵاتەکانیانی زۆر بەرفراوان کرد، تا لەساڵی ١٩١٨ دا تێکشکان.

لەساڵی ١٨٦٧ دا نەمسا بووە بەشێکی ئیمپراتۆریەتی نەمسا – مەجەڕ، بەڵام ئیمپراتۆریەتی ناوبراو لەجەنگی جیهانیی یەکەم ( ١٩١٨ ) تێکشکا، لەنێوان ١٩١٩ – ١٩٣٨ نەمسا بووە کۆمارێکی یەکگرتوو. لەساڵی ١٩٣٨ تا ساڵی ١٩٤٥ ئەڵمانیا خستیە سەر خۆی، دوای تێك شکانی ئەڵمانیا لەجەنگی جیهانیی دووەم، نەمسا لەنێوان هەر یەك لە ئەمریکا وبەریتانیا وفەڕەنسا و یەکێتی سۆڤیەت دابەشکرا. لەبەرواری ٢٦ / ١٠ / ١٩٥٥ کۆتایی هاتووە بەداگیرکاری هاوپەیمانان بۆ سەر نەمسا بەمەرجێك هەڵوێستی بێلایەنی لەخۆ بگرێت. لەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، لەساڵی ١٩٩٥ دا نەمسا بۆتە ئەندامی یەکێتی ئەورووپی.

سەرۆکی نەمسا بەسەرۆکی دەسەڵاتی وڵات دادەنرێت، بۆ ماوەی شەش ساڵ لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێت. سەرۆکی وڵات بۆی هەیە باڵوێزەکان دامەزرێنێت وسەرۆکی گشتی

هێزە چەکدارەکانە، بەڵام بۆی نییە جەنگ ڕاگەیەنێت، هەروەها ماف بەکارهێنانی ڤیتۆی بەرامبەر بەیاسا وبڕیارەکانی پەرلەمان پێنەبەخشراوە، بەڵام ڕاوێژکاری نەمسا: خۆی سەرۆکی وەزیرانە، سەرکردەی ئەو پارتەیە کەلەنێو ئەنجومەنی نیشتیمانیدا زۆرینەی دەنگ بەدەست دەهێنێت.

نەمسا خاوەنی ئابوورییەکی بەهێز وپتەوە، پشتی تەواوی بە پێشکەوتنە تەکنەلۆژییەکان بەستووە، زۆربەی خەڵکی وڵات لەنێو شارەکاندا دەژین. نەمساییەکان بەوە ناسراون کەزۆریان حەز لەخواردنی بەتام و وەرزش و هونەرە، شانازییەکی زۆر بەوە دەکەن کە وڵاتەکەیان سەنتەری یارییە وەرزشیە زستانەکان پێشەنگی کەلتوور وهونەری تەواوی وڵاتە ئەوروپییەکانە. بەپێی ئامارە نێودەوڵەتییەکان، نەمسا بە پلەی یەکەم دادەنرێت لەرووی داهاتی چالاکییە گەشتوگوزاریەکان لەنێو وڵاتانی جیهاندا بەبەراورد لەگەڵ ژمارەی دانیشتوانی ئەو وڵاتە.

نەمساییەکان بە وڵاتی خۆیان دەڵێن: ئۆستەرایش، واتا وڵاتی رۆژهەڵات، لەوشەی ئۆستمارکەوە وەرگیراوە کەبەمانای دەروازەی رۆژهەڵات دێت. دیارە ناوە ئینگلیزیەکەشی ( ئۆستریا ) لەو ناوەوە وەرگیراوە. بەڵام وشەی نەمسای عەرەبی وکوردی لەزمانی تورکییەوە وەرگیراوە، کاتێ سەربازە تورکەکان گەیشتونەتە دەروازەکانی ڤیێنا گێژ وخەواڵوو بوون بەهۆی جوانی دیمەنەکانی ئەو شارە وهەوا پاك وبێگەردەکەی، ناوی نەمسایان لێناوە کەبەمانای وڵاتی وەنەوس وخەواڵوو.

سروودی نیشتیمانی: وڵاتی چیاکان، وڵاتی روبارەکان.

جەژنی نیشتیمانی: ٢٦ / ١٠ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٤٥ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١٩٧,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢٢ .

تێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٤,٩٥٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٩ .

## نیپال

**ناوی باو:** نیپال.

**ناوی فەرمی:** شانشینی نیپال.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of Nepal.

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، پادشا، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی نیشتیمانی ( ٦٠ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٢٠٥ ئەندام ).

**رووبەر:** ٥٦,٨٢٧ میل دووجا، ١٤٧,١٨١ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٢٢,٨٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠٠ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٤٧ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** نیپالی، بیهارت، تارۆ، تامانج، نیوار.

**ئاین:** هیندۆس ( ٩٠٪ )، بوودی ( ٥ ٪ )، موسڵمان ( ٢,٧ ٪ )، مەسیحی، جین.

**زمان:** نیپالی.

**پایتەخت:** کاتماندۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** بیراناجار، لالیتپور، باکتپور، پۆکارا، بیرگانج، لۆمبینی.

**دراو:** روپێی نیپالی.

**ئاو وهەوا:** ناوچەی چیاکانی هیمالایا: زستانێکی سەخت ودوور ودرێژ. ناوچەی گرد ودۆڵەکان: زستانی سار و وشکە. لەوەرزی هاویندا بارانێکی زۆر دەبارێت. دەشتەکانی باشووری وڵات: گەرمە.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** برنج، گەنم، گەنمەشامی، قامیشی شەکر، توتن، سەوزە ومیوە، بەخێوکردنی مەڕومالات.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** شووشە، شەکر، شقارتە، چیمەنتۆ، بەرهەمە کیمیاییەکان.

**سامانی کانزایی:** مس، گرافیت، خەڵووزی بەردین.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

نیپال وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری ناوەڕاستی ئاسیا، چیاکانی هیمالای دەکەونە بەشی باشووری وڵات، چین ( ناوچەی تیبت ) دەکەوێتە باکووری، هیندیش لەلاکانی تریەوە

لەگەڵیدا سنووردارە. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٨٤ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٩ بەرەو باکوور. نیپال شێوەی لاکێشەیەکی لەخۆ گرتووە درێژیەکەی ٨٨٥ کم و پانیەکەیشی ١٩٣ کم .

چیاکانی هیمالایا، کەچیای ئیڤریستی تێدەکەوێت وبە بەرزترین چیا لەجیهاندا دادەنرێت وبەرزێکەی دەگاتە ٨٨٤٨ م لەسەر ئاستی رووی دەریا، گرد و دۆڵەکان ٨٠ ٪ ی رووبەری ئەو وڵاتەیان گرتۆتەوە. بەڵام دەشتی تاری تەخت وبەپیت، کەدەکەوێتە درێژی سنوورەکانی لەگەڵ هیند، بەشی دیکەی وڵاتیان گرتۆتەوە.

نیپال خاوەنی مێژوویەکی دوور ودرێژە، شارستانیەتی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ پ.ز . باپیرانی گەلی نیپال لەئاسیای ناوەڕاست وهیند وتیبەتەوە گەیشتونەتە ناوچەکە.

نیپال رۆڵێکی گەورەی بینیووە لە مێژووی ئاینی بوودی. چونکە لەشاری لۆمبینی ( لەباشووری وڵات ) بەر لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا فەیلەسووف مەزن گۆتاما بوودا لەدایك بووە، لەوێوە بوودایی بڵاوبۆتەوە بەرەو رۆژهەڵات وباشووری ئاسیا.

بەڵام نیپالی نوێ لەیەکگرتنەوەی چەند هەرێم وناوچە وشانشینێکی سەربەخۆ پێك هاتووە. شا بریتیڤی نارایان لەساڵی ١٧٦٨ دا تەواویانی لەیەك شانشیندا کۆکردۆتەوە و دەسەڵاتی خێزانی شاهی تیا راگەیاندووە، شای: بیریندەرا بیر بیکرام شاه دیڤا، لەنەوەی خێزانی بریتیڤی نارپانە ولە ٣١ / ١ / ١٩٧٢ چۆتە سەر تەختی پادشایی، دوای شا ماهیندرای باوکی. شا بیریندەرا بیر بیکرام شاه دیڤا لە ٢ / ٦ / ٢٠٠١ تیرۆ کرا (لەخوارەوە باسی لەسەر دەکەین).

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا نیپال لەدژی بەریتانیا بەجەنگ هاتووە، کاتێ بەریتانیا ویستویەتی سنوورەکانی بەرەو باکووری هیند بەرفراوان بکات، جەنگی نێوان بەریتانیا ونیپال لە ١٨١٦ دا بەتێکشکانی نیپال کۆتایی پێهاتووە، ناچار نیپال بۆتە هاوپەیمانی.

لەساڵی ١٩٥٠ دا شۆڕشێکی جەماوەری لەنیپالدا هەڵگیرساوە و بۆ ساڵی دوایی حکومەتێکی دیموکراسی لەو وڵاتەدا دامەزراوە، پەرلەمانێکی دیموکراسی فرە حیزب وباوەڕ بەدەنگی زۆرینە لەو وڵاتەدا دامەزراوە. لەساڵی ١٩٥٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەساڵی ١٩٦٢ دا شا ماهیندرای دووەم دەستوورێکی بەزۆر سەپاندووە بەسەر پەرلەماندا وفرەحیزبی تیا رەتکراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٩٠ دا ، دوای یاخی بوونێکی جەماوەری، پادشا رەزامەندی لەگەڕانەوەی یاسا فرە حیزبی دەربڕی.

لەساڵی ١٩٩٦ دا ماوییەکان ( خۆیان لەسەر ناوی سەرکردەی شیوعییەکانی چین ماو تسی تۆنگ ناونابوو ) شەرێکی جەماوەرییان بە پشتیوانی جوتیارەکان بۆ روخانی شای

ولآت هەڵگیرساندووە، بۆشبا کەمال داهال کە نازناوی: براشانده وئەندازیاری کشتوکاڵیە ودکتۆری ئەندازیار بابۆ رام بەتاری سەرکردایەتی بزوتنەوەکەیان کردووە. بزوتنەوەکەیان تادەهات لایەنگر وپشتیوانی زیاتری دەستگیر دەبوو، بەتایبەت لاوە گوندنشینە بێکارەکان. شەڕەکە بووە هۆی لەناوچوونی زیاتر لە ٢٠٠٠ کەس وبریندار بوونی ژمارەیەکی دیکەش.

لە ٢ / ٦ / ٢٠٠١ دا، وەلی عەهد میر دابیندرا بیر بیکرام لەیەکێك لەهۆڵەکانی تەلاری نارانیهیتی پادشایی لەکاتی نان خواردندا پانزدە ئەندامی خێزانی پادشایی خۆی گوولە باران کرد وهەر پانزدەیان گیانیان لەدەستدا، لەوانە شا بیریبدرای باوکی و شاژن ئیشواریای دایکی، فیشەکێکیشی نا بەخۆیەوە، دەست بەجێ بەرەو نەخۆشخانەی تایبەتی خێزانەکەیان بەرێکرا، لەگەڵ سەختی برینداریەکەی حکومەت بەشای ولآت رایگەیاند، بەلآم بەهۆی نالەباری باری تەندروستییەوە، میر جیانیندرای مامی کرایە وەلی عەهد. وەکو باسی لێوە کراوە میر بۆیە ئەم کارەی ئەنجام داوە چونکە دایکی رێگر بووە لەبەردەم بەیەك گەیشتنی بە دفیانی رانای خۆشەویستی کەسەردەمێك بووە پەیوەندی خۆشەویستیان هەبووە. شا وشاژن وئەندامانی خێزانی لەناوچوو دوای دوو رۆژ بەپێی ئاینی بوودی خرانە سەر دار سەندەلەکان وتەرمەکانیان سووتێنرا.

لە بەرواری ٤ / ٦ / ٢٠٠١ جیانیندرا بووە شای نیپال وکۆمالی خێزانی بەشاژنی ولآت راگەیەنرا.

سالآنە بەدەیان هەزار بوودی لەتەواوی ولآتانی جیهانەوە روودەکەنە نیپال بۆ سەردانی مەنزڵگا وپەرستگای بوودیەکانی نیپال، جگە لە بینی بەرزترین وبەناوبانگ ترین چیاکانی هەموو جیهان.

نیپال بەولآتێکی هەژار و دواکەوتوو دادەنرێت، تەواوی ئەو حکومەتانەی بەدوای یەکدا هاتوون هەوڵی چارەسەرکردنی کێشە ئابووریەکانی ئەو ولآتەیان داوە، بەلآم هەوڵەکانیان بێ سوود بووە. ئابووری پشتی تەواوی بەچالاکییە کشتوکاڵیەکان بەستووە، نزیکەی ٨٠٪ ی دانیشتوانی سەرقاڵی جوتیارین و ٤٠ ٪ ی تێکرای بەرهەمی ناوخۆی ولآتی گرتۆتە دەست. بەلآم گەشتوگوزار بەیەکەم سەرچاوەی داهاتی بیانی ئەو ولآتە دادەنرێت.

جەژنی نیشتیمانی: ٦ / ٧ ی هەموو ساڵێ، یادی لەدایك بوونی شا جیانیندرا.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٤,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا: ١٠٤ .

نێوەندی خەرجی سالآنەی تاك: ٢٠٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو ولآتانی جیهاندا: ١٨١ .

## نەیجەر

**ناوی باو:** نەیجەر

**ناوی فەرمی:** کۆماری نەیجەر.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Niger.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە وسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران یارمەتی دەدات.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ۸۳ ئەندام).

**ڕووبەر:** ٤٥٨,٠٧٥ میل دووجا، ١,١٨٦,٤٠٨ کم$^{2}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٩,٣٨٩,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٧,٤ کەس/کم$^{2}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی ڕەش ( لەچەند کۆمەڵەیەکی نەژادی پێک دێن گرنگترینیان: هۆسا، زریما)، ژمارەیەك عەرەب وفەڕەنسی.

**ئاین:** موسڵمان ( ٩٤ ٪ )، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، مەسیحی.

**زمان:** فەڕەنسی.

**پایتەخت:** نیامی.

**شارە سەرەکییەکان:** زیندەر، مارادی، تاهوا، ئاگادیز.

**دراو:** فرانك.

**ئاو وهەوا:** ناوچە باکوورییەکان وبەشی ناوەڕاستی وڵات: بیابانیی، وشك وگەرم، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ١٧٥ ملم، نێوەندی پلەکانی گەرما ٥٠ پلەی سەدی. ناوچە باشوورییەکانی وڵات گەرمە وبارانێکی زۆری لێدەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** فاسۆلیا، منیهۆت، لۆکە، هەرزن، بستەی عەبید، بەزالیا، برنج، گەنەشامی، بەخێوکردنی مەڕومالآت، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان، چنین.

**سامانی کانزایی:** یۆرانیۆم، فۆسفات، خوێ، تەنەکە، تەنگستن.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

نەیجەر، ناوی ولات لەناوی روباری نەیجەرەوە هاتووە كەبە بەشی باشووری رۆژئاوای ولات تێپەڕ دەبێت وبەزمانی ناوخۆی ولات بەمانای روباری مەزن یان روباری روبارەكان دێت ،هەروەها بەمانای كۆیلەی رەشیش دێت ، ولاتێكی ئیسلامییە دەكەوێتە ناوەڕاستی ئەفریقیا، جەزائیر ولیبیا دەكەونە باكووری، چاد دەكەوێتە رۆژهەلاتی، نێجیریا وبەنین دەكەونە باشووری، بۆركینا فاسۆ دەكەوێتە باشووری رۆژئاوای، مالی دەكەوێتە رۆژئاوای، كەناری نییە لەسەر دەریاكان، بەلام كەناری لەسەر دەریاچەی چاد دەكەوێتە باشووری رۆژهەلاتی. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێلی درێژی ١٠ بەرەو رۆژهەلات لەگەلٚ هێلی پانی ١٧ بەرەو باكوور.

بیابانێكی وشك وچۆلٚ و بەرزاییەكان زۆربەی ناوچە باكوورییەكانی نەیجەر دادەپۆشێ. زنجیر چیای ئیر لەناوەڕاستی ولاتداوٚدرێژ دەبێتەوە وكۆمەلێ دەشتی تەخت دەكەونە چوار دەوەری چیای ناوبراو. هەرێمی باشوورییش بەگژوگیای سافانا ودارو دەوەنێكی زۆر داپۆشراوە، بە بەپیتترین ناوچەكانی ولات دادەنرێ وچالاكییە كشتوكالیەكان وبەخێو كردن ولەوەڕی ماڕومالات دەكەوێتە ئەو ناوچەیە كە رووی رۆژهەلاتی دەریاچەی چادەوە تادەگاتە رووباری نەیجەری بەدرێژایی سنوورەكانی لەگەلٚ نێجریا گرتۆتەوە.

هۆزەكانی تەواریق لەسەدەی پانزدەیەمی زایینیدا بەرەو ناوچەكە كۆچیان كردووە وئیمپراتۆریەتێكی لە شاری ئاگادیز لێ دامەزرێندراوە، لەسەدەی پانزدەیەمیشدا ئیمپراتۆرێكی بەهێزی بەناوی ئیمپراتۆریەتی فاو كە دەكەوێتە ولاتی مالی ئێستا دامەزراوە. لەسەدەی شانزدەیەمدا ئیمپراتۆریەتی سنگی هێرشی كردۆتە سەر ئیمپراتۆریەتی تەواریقەكان وتوانی دەسەلاتی ناوەڕاست وڕۆژئاوای نەیجەر بگرێتە دەست. لەسالی ١٥٩٠ سوپاكانی مەغریب هێرشیان كردۆتە سەر شاری فاو وداگیریان كردووە، ئەمەش بووە هۆی روخانی ئیمپراتۆریەتی سنگی، هەر لەو ماوەیەدا ئیسلام گەیشتۆتە ناوچەكە.

لەكۆتاییەكانی سەدەی هەژدەیەمدا ئەورووپییەكان گەیشتونەتە ناوچەكە، لەكۆتاییەكانی سەدەی نۆزدەیەمدا نەیجەر بۆتە بەشێك لەو ناوچەیەی كەوتبووە ژێر دەسەلاتی فەرەنساوە. لەسالی ١٩٢٢ بووە بەشێك لەئەفریقیای رۆژئاوای فەرەنسی، تالە سالی ١٩٥٨ دا مافی ئۆتۆنۆمی پێبەخشرا لەچوارچێوەی كۆمەلەی فەرەنسی. لەبەرواری ٣ / ٨ / ١٩٦٠ بەتەواوی سەربەخۆ بووە ولەهەمان سالدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەككرتووەكان.

یەكەم سەرۆكی ولات دوای سەربەخۆیی سەركردەی پارتی پێشكەوتن خوازی نەیجەری

هامانی دیۆری بووە، لەساڵی ١٩٧٤ دا کودەتایەکی سەربازی بەسەرکردایەتی عەقید سینی کونتشی رێکخراوە وهامانی لەدەسەڵات لابراوە. لەساڵی ١٩٨٧ دا کۆنتشی کۆچی دوایی کردووە وعەقید عەلی سایبۆ دەسەڵاتی گرتۆتە دەست. لەساڵی ١٩٩٢ دا ماهان عوسمان بۆتە سەرۆکی وڵات ولە ٢٧ / ٦ / ١٩٩٦ کودەتایەکی سەربازی بەسەرکردایەتی جەنەراڵ ئیبراهیم باری موناسەرە بەسەردا کراوە وناوبراو دەسەلاتی گرتۆتە دەست.

لەبەرواری ٩ / ٤ / ١٩٩٩ دا چەند سەربازێکی چەکدار بۆسەیەکیان لە فرۆکەخانەی نیامی پایتەخت بۆ سەرۆکی نەیجەر ئیبراهیم باری موناسەرە نایەوە وتیرۆریان کرد، جەنەراڵ داوودا مالام وانکی سەرۆکی ئەنجومەنی ئاشتبوونەوەی گشتی لەنەیجەر بۆ ماوەی نۆ مانگ دەسەڵاتی وڵاتی گرتە دەست. لەبەرواری ٢٤ / ١١ / ١٩٩٩ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بەڕێوە چووە وعەقیدی خانەنشین مامادۆ تاندجا ( ٦١ ساڵ ) لەپارتی بزوتنەوەی پێشکەوتن وگەشەپێدانی نەیجەر سەرکەوتنی بەدەست هێناوە وپۆستی سەرۆکی وڵاتی گرتە دەست.

نەیجەر یەکێکە لەوڵاتە هەرە هەژارەکانی جیهان، رووبەری ئەو زەویانەی بۆ چالاکییە کشتوکاڵیەکان تەرخان کراون لە ٣ ٪ ی رووبەری وڵات زیاتر نییە، هەروەها سەرچاوە سروشتییەکانی زۆر لاوازن، لەشەستەکان وحەفتاکان وهەشتاکانی سەدەی پێشوودا نەیجەر دووچاری وشکە ساڵییەکی بێ وێنە بۆتەوە، بووە هۆی تێکشکاندنی ئابووری ئەو وڵاتەو دابەزاندنی بۆ ئاستێکی زۆر نزم، بەهۆی دابەزینی رێژەکانی سامانی ئاژەڵ وبەرهەمە کشتوکاڵیەکان، جگە لەدابەزینی نرخی یۆرانیۆم لەجیهاندا.

نەیجەر بەپلەی دووەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا دوای کەنەدا لەبەرهەمی یۆرانیۆم.

سروودی نیشتیمانی: نەیجەری مەزن ونەبەرد.

جەژنی نیشتیمانی: ٣ / ٨ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٦٠ .

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٣٣ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٧٦ .

## نیجیریا

**ناوی باو:** نێجیریا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری نێجیریای یەکگرتوو.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Federal Republic of Nigeria.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە وئەنجومەنی هەرێمەکان یارمەتی دەدات.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەنی پێك دێت:

- ئەنجومەنی پیران ( ١٠٩ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٦٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ٣٥٦,٦٦٩ میل دووجا، ٩٢٣,٧٦٨ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٢٥,٠٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ )

**چڕی دانیشتوان:** ١٣٠ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش ( زیاتر لە ٢٥٠ کۆمەڵەی نەژادی پێك دێن: گرنگترینیان هۆسا، یۆرۆبا، فولانی، ئینگلیز.

**ئاین:** موسڵمان ( ٦٥ ٪ )، مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت)، چەند بیروباوەڕێکی ناوخۆ، بێ باوەڕ.

**زمان:** ئینگلیزی.

**پایتەخت:** ئەبۆجا.

**شارە سەرەکییەکان:** لاگۆس، ئیبادان، کانو، ئۆگبۆموشو، ئیلۆرین، باداجری.

**دراو:** نیرا.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی شێدار، نێوەندی پلەکانی گەرما لە باکووردا دەگاتە ٤٠ پلەی سەدی، رێژەی ساڵانەی بارانەکان لەباشووری وڵات دەگاتە ٢٥٠ سم و ٢٠٠ سم لە باکوور.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** فاسۆلیا، گۆشتی مانگا، پێست، کاکاو، مەنیهۆت، لۆکە، گەنمەشامی، هەرزن، زەیتی دارخورما، بستەی عەبید، برنج، لاستیك، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چیمەنتۆ، دروستکراوە کیمیاییەکان، چنین، دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** نەوت، گاز، کۆلمبیت، گەچ، تەنەکە، خەڵووزی بەردین، یۆرانیۆم، ئاڵتون، بۆکسیت، چیمەنتۆ، ئاسن.

تێڕوانینێکی گشتی:

نێجیریا وڵاتێکی ئیسلامییە، گەورەترین وڵاتی ئەفریقیا لەرووی ژمارەی دانیشتوانەوە، دەکەوێتە سەر کەناری رۆژئاوای ئەفریقیا، نەیجەر دەکەوێتە باکووری، کامیرۆن دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، کەنداوی کینیا ( زەریای ئەتڵەسی ) دەکەوێتە باشووری، بەنین دەکەوێتە رۆژئاوای، کەنارێکی هەیە دەکەوێتە سەر دەریاچەی چاد لە باکووری رۆژهەڵاتی. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٨ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ١٠ بەرەو باکوور.

باشووری نێجیریا بریتییە لەدەشتە کەنارێکی بەرفراوان بەپانتایی ٨٠ کم وزەلکاوێکی زۆری تێدەکەوێت بەتایبەتی لە دۆڵی رووباری نەیجەر. بەڵام بەشە ناوخۆییەکانی وڵات بریتییە لەدارستانە چڕەکان، بەرەو باکووریش بانێکی مام ناوەندی تێدەکەوێت، بەڵام ئەو پەڕی باکووری وڵات بریتییە لەناوچەیەکی نیمچە بیابانی.

بەر لەچەند هەزار ساڵ لەمەو بەرەوە خەڵکی لەناوچەکەدا نیشتەجێ بوون. شارستانیەتی نوك لەنێوان سەدەکانی شەشەمی پ.ز وسەدەی سێیەمی زایین لەناوەڕاستی نێجیریادا گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینییوە. لەنێوان سەدەکانی یانزدەیەم وپانزدەیەمدا چەند شانشینێك لەچەند بەشێکی وڵات دامەزراوە. ئاینی ئیسلام لە سەردەمی مەرابیتەکاندا لەچادەوە گەیشتۆتە ناوچەکە. لەساڵی ١٤٧٢ دا پۆرتۆگالیەکان گەیشتونەتە نێجیریا ودڕاندانەترین جۆرەکانی بازرگانی کۆیلەکانیان پەیڕەو کردووە. لەسەدەی نۆزدەیەمدا هەر یەك لەدۆزەرەوە بەریتانی وفەرەنسی وهۆڵەندی وئەڵمانەکان گەیشتونەتە ناوچەکە. لەساڵی ١٨٥١ دا بەریتانیا دەستی گرتووە بەسەر بەندەری لاگۆس بۆ بەرفراوان کردنی دەسەڵاتەکانی لەناوچەکەدا، تا لەساڵی ١٨٦١ لاگۆس بۆتە داگیرکراوەیەکی بەریتانی. لەکۆتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا بەریتانیا چەند پارێزراوەیەکی لەچەند بەشێکی باشووری ئەو وڵات دامەزراندووە. لەساڵی ١٩٠٠ دا پاش ئەوەی سوپای بەریتانی هێرشی کردۆتە سەر باکووری نێجیریا وهێزەکانی میرانی فولانیان تێك شکاندووە، باکووریشی کردە پارێزراوەیەکی بەریتانی، ئیتر لەو بەروارەوە ناوچەکە ناوی نێجیریای لێنراوە. ناوەکە لەلایەن ژنی یەکەم مەندوبی بەریتانییەوە لەناوچەکە نراوە. لەساڵی ١٩١٤ دا بەریتانیا هەردوو بەشی باکوور وباشووری کردۆتە یەك وناوی ناوە پارێزراوەی یەکێتی نێجیریا. لەسەرەتای بیستەکانی سەدەی پێشوو، گەلی نێجیریا داوای نوێنەرایەتیان لەنێو حکومەتی بەریتانی وڵاتەکەیاندا کردووە، لەهەمان کاتدا رکابەرایەتی نێوان کۆمەڵە نەژادییەکاندا بۆتە هۆی ململانێ لەنێوان هاوڵاتیانی نێجیریا. لە بەرواری ١ / ١٠ / ١٩٦٠ دا نێجیریا

لەچوارچێوەی کۆمۆنۆلتی بەریتانی بەتەواوی لەبەریتانیا سەربەخۆ بووە ولەهەمان ساڵدا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان.

لەبەرواری ٣٠ / ٥ / ١٩٦٧ دا هەرێمی رۆژهەلات لە یەکێتی نێجیری جیابۆتەوە وبەناوی کۆماری بیافرا راگەیەنراوە، بەلام دوای ئەوە شەڕی ناوخۆ هەڵگیرساوە ولە سەرەتای ١٩٧٠ بەسەرکەوتنی هێزە حکومیەکان وخۆبەدەستەوەدانی بیافرا کۆتایی پێ هاتووە.

لەساڵی ١٩٥٧ دا سێر ئەبو بەکر تفاوا بلیوا – سەرکردەی باکوور – بۆتە یەکەم سەرۆك وەزیرانی یەکێتی نێجیریا وتا بەرواری تیرۆرکردنی لەساڵی ١٩٦٦ لەلایەن کۆمەڵێ ئەفسەرانەوە لەدەسەلاتدا مایەوە. چەند کودەتایەکی سەربازی لەولاتدا ئەنجام دراوە، تا لەساڵی ١٩٧٩ دا کۆتایی بەدەسەلاتی سەربازی ئەو ولاتە هێنراوە وحکومەتێکی مەدەنی دامەزرێنراوە و شێخۆ شاجاری بۆتە سەرۆکی ولات لە ١٩٨٣ دا سەر لەنوێ هەڵبژێردراوەتەوە. لەکۆتاکانی ١٩٨٣ دا کودەتایەکی سەربازی بەسەر حکومەتی مەدەنیدا کراوە فەریق محەمەد بەهاری دەسەلاتی حکومەتێکی سەربازی نوێی گرتۆتە دەست. بەلام کودەتایەکی سەربازی لەلایەن ئیبراهیم بابنجیدا بەسەر ئەویشدا ئەنجام دراوە، ئیبراهیم تا دەست لەکار کێشانەوەی لە ١٩٩٣ دەسەلاتی گرتۆتە دەست، پاشان ئارنست شونیکان بووە سەرۆکی ولات، بەلام لەهەمان ساڵدا دەستی لەکار کێشایەوە وجەنەراڵ سانی ئەباشا دەسەلاتی گرتە دەست وتەواوی دەزگا دیموکراسییەکانی هەڵوەشانەوە.

لەساڵی ١٩٩٨ دا سەرۆکی سانی ئەباشا کۆچی دوایی کرد عەبدول سەلام ئەبو بەکر دەسەلاتی گرتە دەست. لەبەرواری ٢٧ / ٢ / ١٩٩٩ جەنەراڵ ئۆلۆسیڤان ئۆباسانجۆ لەهەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی نێجیریا. ئۆباسانجۆ بەیەکێك لەو کەسایەتییە سیاسەتمەدارە کەمانە دادەنرێ کەلەنێوان زیاتر لە ٢٥٠ کۆمەڵەی نەژادی نێجیریا خاوەنی ناوبانگێکی باش ولەلایەن گەلەوە زۆر خۆشەویستە.

ئۆباسانجۆ لەکاتێکدا دەسەلاتی گرتە دەست، نێجیریا لەلوتکەی رمانی ئابووریدا بوو. بەهۆی دابەزینی نرخی پیترۆل لەساڵەکانی دواییدا وخەرجی بێ بەزەیانەی سەرۆك ووەزیران وکاربەدەستانی حکومەتی ولات وگەندەڵی ئیداری بەهەموو جۆرەکانییەوە. لەگەڵ ئەو بەرهەمە نەوتییە زۆرەی کەهەیەتی خاوەنی زیاترین بەرهەمی نەوتە لە ئەفریقا – بەلام نێجیریا بە پلەی ٤٢ دێت لەکۆی ١٧٤ ولات بەپێوەری گەشەپێدانی مرۆیی نەتەوە یەکگرتووەکان. یەك بەدوای یەکی سەرکردە سەربازییەکان بووە هۆی ئابڕووچونی نێجیریا لەرووی دەسەلات وحکومەتەوە، رێگاو بان وخوێندنگا وخزمەتگوزاریەکان لەخراپترین ئاستی خراپی دایە.

نەوت زیاتر لە ٩٠ ٪ ی داهاتی نەتەوەیی ئەو وڵاتەی گرتۆتە خۆی، واچاوەڕوان دەکرێت نێجیریا ببێتە گەورەترین بەرهەمهێنەری گازی سروشتی لەگەورەترین بەرهەمهێنەری نەوتەوە لە ئەفریقیا، بڕی یەدەگی گازی نێجیریا دەگاتە ١١٣ تریلیۆن مەتر سێجا، بەڵام بەرهەمی نەوت زیاتر لە ٣٦ ساڵێکی دیکە بڕ ناکات.

نێجیریا بەپلەی چوارەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەچاندنی بستەی عەبید وبەپلەی شەشەم دێت لە کاکاو، بەحەوتەم لە بەرهەمی لاستیک وبە هەشتەم لەداروتەختە، پانزدەیەم لە بەرهەمی برنج وشانزدەیەم لەبەخێوکردنی مانگا.

جەژنی نیشتیمانی: ١ / ١٠ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی لەبەریتانیا ساڵی ١٩٦٠

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ٣٠ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٥٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٦٨ .

## نیکاراگوا

**ناوی باو:** نیکاراگوا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری نیکاراگوا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Nicaragua

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٩٢ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٥٠,٨٩٣ میل دووجا، ١٣١,٨١٢ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٤,٦٣٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣٨,١ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تێکەڵ ( ئیسپان وهیندی ئەمریکی)، ئەورووپی، ئەفریقی ڕەش، هیندی ئەمریکی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیک ).

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** ماناگوا.

**شارە سەرەکییەکان:** لیۆن، شیڤاندیگا، ماسایا، گرانەدا، ئیستیلی.

**دراو:** کۆردوبا.

**ئاو وهەوا:**کەمەرەیی، پلەکانی گەرما لەنێوان ١٦ بۆ ٢٧ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان لەنێوان ٢٥٠ سم — ٤٢٠ سم لەوەرزی هاویندا دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** قاوە، لۆکە، گەنمەشامی، مۆز، فاسۆلیا، برنج، کونجی، قامیشی شەکر، بەخێوکردنی مانگا.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چنین، دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** ئاڵتون، زیو، قورقوشم، زنك، مس، تەنگستن، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

نیکاراگوا گەورەترین وڵاتی ئەمریکای ناوەڕاستە لەرووی رووبەرەوە، لەرۆژهەڵاتەوە لەدەریای کاریبییەوە تا زەریای هێمن لەرۆژئاواوە دەبێت. هیندۆراس دەکەوێتە باکووری، کۆستاریکا دەکەوێتە باشووری، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٨٥ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٢/٣٠ بەرەو باکوور.

كەناره دەشتێك لەسەر زەریای هێمن لەهیندۆراسەوه تا كۆستاریكا درێژ دەبێتەوه، هەروەها لەسەر كەناری دەریای كاریبی دەشتێكی بەرفراوان وتەختی تێدەكەوێت وچەند روبارێكی پیا تێپەڕ دەبێت وچەند بەرزاییەكیشی تێدەكەوێت. لەناوەڕاستی ولاتیشدا كەدەكەوێتە نێوان هەردوو كەنای ناوبراو هەندی چیا وبەرزایی درێژ دەبێتەوه، كەبەساردترین وبەرزترین ناوچەكانی نیكاراگوا دادەنرێت ودارستانێكی زۆریشی لەخۆ گرتووه. بەرزترین خالی ئەو ناوچەیه دەكەوێتە بەرزاییەكانی زنجیرەی چیای كۆردیرا ئیزابێلا كه دەگاتە ٢,٤٣٨ م لەسەر ئاستی رووی دەریاوه.

كاتێ كریستۆف كۆلۆمبۆس لەسالی ١٥٠٢ دا گەیشتۆتە ناوچەكە، هیندە سوورەكان نیشتەجێی بوون. ئیسپانەكان لەدوای سالی ١٥٢٣ بەرەو ناوچەكە هاتوون ونیشتەجێی بوون وهێندەی نەخایاندووه دەسەلاتی تەواویان گرتۆتە دەست وناویان ناوه نیكاراگوا، لەسەر ناوی سەرۆك هۆزێكی هیندی كەناوی نیكاراگوا بووه. لەبەرواری ١٥ / ٩ / ١٨٢١ دا نیكاراگوا سەربەخۆیی خۆی لە ئیسپانیا راگەیاند وبووه بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی مەكسیكی، بەلام له ١٨٢٣ دا لێی جیابۆتەوه، لەگەلْ ولاتانی ئەمریكای ناوەڕاست یەكێتی ناوچەكانی ئەمریكای ناوەڕاستیان پێك هێناوه، بەلام لەسالی ١٨٣٨ دا لەو یەكێتیەش كشاوەتەوه. نیكاراگوا لەسالی ١٩٤١ جەنگی لەدژی ولاتانی میحوەر راگەیاندووه ولەسالی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوه یەكگرتوەكان.

چەند سەركردەیەك دەسەلاتی نیكاراگوایان گرتۆتە دەست، تا لەسالی ١٩٣٧ دا ئەناستاسیۆ سۆمۆزا گارسیا دەسەلاتی گرتۆتە دەست وحوكمێكی دیكتاتۆری پەیرەو كردووه وهێزێكی سیاسی وئابووری پتەوی بۆ خۆی وخێزانەكەی بنیات ناوه. دوای تیرۆر كردنی لەسالی ١٩٥٦ دا كوڕه گەورەكەی لویس گارسیا دەسەلاتی گرتۆتە دەست ودوای ئەویش ئەناستاسیۆ سۆمۆزا دیبایلی لەسالی ١٩٦٧ دا دەسەلاتی گرتۆتە دەست.

لەناوەڕاستی حەفتاكانی سەدەی بیستەمدا شۆڕشێكی چەپ بەسەرۆكایەتی بەرەی ئازادی ئەلسانینیستای نیشتیمانی هەلگیرساوه، لە ١٩٧٩ دا شۆڕش توانی سۆمۆزا ناچار بكات دەست لەكار بكێشێتەوه وپەنا بەرێتە بەر ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا، لە١٩٨٠ دا لەولاتی پاراگوای تیرۆر كرا. بەلام شەڕی ناوخۆ لەنێوان لایەنە سیاسییە جیاوازەكانی ئەو ولاتە هەلگیرسا، لەسالی ١٩٨٤ دا دانیال ئۆرتیگا سانیۆرا هەلبژێردا، بەلام هەلبژاردنی سانیۆرا كۆتایی بەشەڕی ناوخۆی ولات نەهێنا، بەلكو ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكاشی تێوەگلاند بەهۆی یارمەتی دانی هەندێ لەلایەنە بەشەڕ هاتوەكان ( بەتایبەتی شۆڕشگێرانی كۆنترا ). لە ٢٥ / ٤ / ١٩٩٠ دا خاتوو ڤیۆلیتا شامۆرۆ لەهەلبژارنەكانی سەرۆكایەتیدا

سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی وڵات. بەمەش بەیەکەم ژن دادەنرێت لەنێو وڵاتانی ئەمەریکای لاتینی پۆستی سەرۆکی کۆمار بگرێتە دەست، ڤیۆلیتا توانی رێکەوتننامەی ئاشتی لەنێوان تەواوی لایەنە بەشەڕهاتووەکان واژۆ بکات ودیموکراسی وئاشتی سەقامگیر بکات ووڵات بگەڕێنێتەوە بۆ باری ئاسایی خۆی. لەهەڵبژاردنەکانی ١٩٩٦ دا دکتۆر ئارنۆڵدۆ ئەلیمان سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی وڵات.

لە بەرواری ٥ / ١١ / ٢٠٠١ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی بەڕێوە چوو، پاڵێوراوی پارتی لیبرالی ئینریك بۆلانۆس سەرکەوتنی بەدەست هێنا وبووە سەرۆکی وڵات.

ئابووری نیکاراگوا پشتی تەواوی بەچالاکییە کشتوکاڵیەکان بەستووە، لەگەڵ ئەوەی رووبەری زەوییە کشتوکاڵیەکان ١٠ ٪ ی رووبەری وڵات نابێت، جوتیارە هەژارەکانیش نزیکەی یەك لەسەر سێی دانیشتوانی وڵات دەبن وزیاتر لەناوچەکانی نزیك زەریای هێمن کۆبونەتەوە ولێی نیشتەجێ بوون.

**سروودی نیشتیمانی:** سڵاوت لێبێت ئەی نیکاراگوا.

**جەژنی نیشتیمانی:** ١٥ / ٩ ی هەموو ساڵێك، رۆژی سەربەخۆیی ساڵی ١٨٢١ .

**تێکرای داهاتی نەتەوەیی:** ١,٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٤٤ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٣٣٠ .

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٦١ .

## نیوزیلاندا

**ناوی باو:** نیوزیلاندا.

**ناوی فەرمی:** نیوزیلاندا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

New Zealand.

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، سەرۆکی وڵات شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێتی دووەمە ودادوەری گشتی نێونەرایەتی دەکات، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٠ ئەندام ).

**رووبەر:** ١٠٤,٥٤٥ میل دووجا، ٢٧٠,٥٣٤ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ٣,٩٠٠,٠٠٠ کەس ( تا ٢٠٠١ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٣,٥ کەس/کم٢.

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** نیوزیلاندی بەرەچەڵەك ئەوروپی ( ٨٨ ٪ )، ماووری ( ٩ ٪)، بۆلینیزی لەدورگەکانی زەریای هێمن.

**ئاین:** مەسیحی ( ئەنگلیکان بریسبیتیریان، رۆمان کاسۆلیك، میتۆدی )، بێ باوەڕ، موسڵمان ( نزیکەی ٢٥ هەزار کەسێك دەبن ).

**زمان:** ئینگلیزی، ماووری.

**پایتەخت:** ولنگتۆن.

**شارە سەرەکییەکان:** ئۆکلاند، کریستشرش، مانۆکۆ، نۆرت شوور.

**دراو:** دۆلاری نیوزیلاندی.

**ئاو وهەوا:** مام ناوەند وشێدارە، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا ٢ - ١٣ پلەی سەدی دەبێت ولەهاویندا ١٨ – ٢٩ پلەی سەدی دەبێت. باران بەدرێژایی ساڵ دەبارێت بەپێی ناوچەکان گۆڕانکارییان بەسەردا دێت ونێوەندی ساڵانەی لەنێوان ٢٥٠ سم – ٧٦٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** گەنم، گەنمەشامی، پەتاتە، پیاز، تووتن، میوە وسەوزە، بەخێوکردنی مەڕومالآت، راوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** بەرهەمەکانی شیرەمەنی، چنین، پێست، کاغەز، دروستکراوە خۆراکییەکان، جلوبەرگ، پێڵاو، پەین.

**سامانی کانزایی:** ئاڵتون، زیو، خەڵووزی بەردین، ئاسن، مەنگەنیز، مس، تەنەکە، پلاتین، گۆگرد، نەوت، گاز.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

نیوزیلاندا وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە دەکەوێتە باشووری رۆژئاوای زەریای هێمن، نزیکەی

١٦٠٠ کم لە باشووری رۆژهەلاتی ئوستورالیاوە دوورە ونزیکەی ١٠,٥٠٠ کم لەباشووری رۆژاوای ویلایەتی کالیفۆرنیای ئەمریکییەوە دوورە، ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ١٧٤ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٤١ بەرەو باشوور.

نیوزیلاندا لە دوو دورگەی سەرەکی پێك دێت: دورگەی باکوور و دورگەی باشوور، تەنگەی کوك کەپانتاییەکەی ٢٠ کم دەبێت دەکەوێتە نێوانیان.

هەروەها ئەم دورگانەش سەر بە نیوزیلاندان:

- دورگەی ستیوارت، کە نزیکەی ٣٠ کم لە باشووری دورگەی باشوورەوە دوورە.
- دورگەی تشاتام، کەنزیکەی ٨٥٠ کم لە رۆژهەلاتی دورگەی باشوورەوە دوورە.
- دورگەکانی: کوك، تۆکیلاو، باونتی، ئەنتیبۆدیس، نییوی.

تەواوی ئەم دورگانەش دەکەونە باشووری رۆژئاوای زەریای هێمن. دورگەی باکوور ( بچوکترە لەرووی رووبەرەوە ) لەباکوورەوە بەنیمچە دورگەیەکی بەدارستانە چڕەکان داپۆشراو دەست پێدەکات، بەرەو باشووریش ناوچە گڕکانیەکان وگردەکانی رۆژئاوای تێدەکەوێت. تایبەتمەندی ئەو ناوچەیە لەوەدایە کە چەند سەرچاوە وکانییەکی ئاوی کانزایی وگەرمەکانی لەخۆ گرتووە، بەلام گردە رۆژهەلاتیەکان بەشە رۆژهەلاتیەکانی دورگەکەیان گرتۆتەوە.

دورگەی باشووریش ( گەورەترە لەرووی رووبەرەوە ) چیاکانی ئەلبی باشووری تێدەکەوێت ودەشتەکانی کانتەربریش دەکەوێتە رۆژهەلات وباشووری، جگە لە بانی ئۆتاگۆ کەدەکەوێتە بەشی باشووری رۆژهەلاتی.

یەکەم دانیشتوانی دورگەکە ماورییەکان بوون ( ماووری بەمانای روناکی جیهان دێت ) وبەسەرۆکایەتی دەریاوانی بۆلینیزی کوپی لەدورگەکانی بۆلینیزیاوە لەساڵی ٩٥٠ روویان تێکردووە وناویان ناوە ئۆتیروا ( کە بەمانای خاکی هەوری هەمیشەیی سپی دێت )، کۆچیان بەرەو ناوچەکە تا ساڵی ١٣٥٠ ی خایاند ولەوێدا بەدانیشتوانە بنەڕەتییەکانی ناوچەکە تێکەڵ بوون.

دەریاوانی هۆڵەندی ئیبل تاسمان لەساڵی ١٦٤٢ گەیشتۆتە دورگەکەو وناوی ناوە نیوزیلاندا ( بەمانای زیلاندی نوێ ) لەسەر ناوی زیلاندی هۆڵەندی.

لەساڵی ١٧٦٩ دا کاپتن جیمس کوك توانی دەسەلاتی ناوچەکە بگرێتە دەست وبەر لەوەی بگەڕێتەوە بۆ ئوستورالیا خستییە سەر ناوچەکانی تاجی پادشایی بەریتانی، شایەنی باسە جیمس کوك باسێکی زۆری لە ئازایەتی ودلاوەری ماوورییەکان کردووە، لەوەوە کۆچبەرە سپی پێستەکان بەرەو ناوچەکە زیادی کردووە. لەساڵی ١٨٣٥ دا بەریتانیا دانی ناوە بەسەربەخۆیی ماوورییەکان وبەڵێنی پاراستنی پێداون. لەساڵی ١٨٤٠ دا بەریتانیا سەروەری خۆی لە دورگەکە راگەیاندووە. بەلام هێندەی نەخایاندووە شەڕ وپێکدادان لەنێوان کۆچبەران ودانیشتوانە سەرەکییەکانی دورگەکە دەستی پێکردووە، لەساڵی ١٨٦٠

دا ماوورییەکان تێکشکاون وسپی پێستەکان ( کە دانیشتوانی نیوزیلاندا پێیان وتون باکیها: بەمانای پیاوی سپی دێت ) سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. لەساڵی ١٨٥٢ بەریتانیا دەستووری بە نیوزیلاندا بەخشیوە، بەڵام بەدرێژایی رۆژگار گۆڕانکاریەکی زۆری بەسەردا هاتووە. لەکۆتاکانی سەدەی نۆزدەیەمدا بارودۆخەکان بەرەو ئارامی اگۆڕانکاریان بەسەردا هاتووە. دۆزینەوەی ئاڵتونیش بووە هۆی گەشە کردن و پێشکەوتنی باری ژیانی دانیشتوانی دورگەکە.

لەساڵی ١٩٠٧ دا نویزیلاندا لەچوارچێوەی ئیمپراتۆریەتی بەریتانی ماف ئۆتۆنۆمی پێ بەخشییوە وکاروباری ناوخۆ ودەرەوە کەوتۆتە دەست نیوزیلاندیەکان خۆیانەوە، لەبەرواری ١١ / ١٢ / ١٩٣١ دا سەربەخۆیی تەواوی لەبەریتانیا دەستگیر بووە لەچوار چێوەی کۆمۆنۆلتی بەریتانی.

نیوزیلاندا هەردوو جەنگی جیهانیی یەکەم ودووەمی لەپاڵ هاوپەیمانانندا راگەیاندووە. لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەساڵی ١٩٤٧ دا یاسای وێست مینستەری گرتۆتە خۆی ( یاسایەکی تایبەت بە وڵاتانی کۆمۆنۆلتی بەریتانییە).

نیوزیلاندا وڵاتێکی پادشایی دەستوورییە، شاژنی بەریتانیا ئەلیزابێتی دووەم شاژنی وڵاتە وهەڵدەستێت بەدامەزراندنی دادوەرێکی گشتی بۆ نوێنەرایەتی کردنی، بەڵام دەسەڵاتەکانی زۆر کەم ودیاری کراون. دەستەی جێبەجێ کردن وسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران دەسەڵاتی حکومەتیان گرتۆتە دەست، دادوەری ئێستای نیوزیلاندا مایکل هاردی بویزە وسەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانیش خاتوو هێلین کلارکە.

ئابووری نیوزیلاندا پشتی بە کشتوکاڵی وپیشەسازی وخزمەتگوزاریە پیشەسازیەکان بەستووە. بەهۆی دەوڵەمەندی سەرچاوە سروشتییەکانەوە گەشە کردنێکی ئابووری بەرچاوی بەخۆوە بینیوە.

نیوزیلاندا بەیەکەم دەوڵەت دادەنرێت ماف هەڵبژاردن وخۆپاڵاوتنی بەژن بەخشیوە، هەروەها یەکەم وڵاتە ماف بەتەواوی چینەکانی کۆمەڵ بەخشیبێت، خانوو وشوێنی نیشتنە جێ بوونی بە پیر وپەك کەوتوان ودابین کردنی چارەسەری تەندروستی بەخشیوە.

نیوزیلاندا بەپلەی سێیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا دوای ئوستورالیا وچین لەبەرهەمی خووری ومەڕدا.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ٤٦،٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٤٥ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١٣،١٩٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٢٨ .

## هاییتی

**ناوی باو:** هاییتی.

**ناوی فەرمی:** کۆماری هاییتی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Haiti.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی پیران ( ٢٧ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٨٣ ئەندام ).

**رووبەر:** ١٠,٦٩٥ میل دووجا، ٢٧,٧٠٠ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٦,٦١١,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٢٣٨,٧ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** ئەفریقی رەش، تێکەڵ.

**ئاین:** مەسیحی ( رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ).

**زمان:** کریۆل هاییتی، فەرەنسی.

**پایتەخت:** پۆرت ئۆ برنس.

**شارە سەرەکییەکان:** کاریفۆر، دیلماس، کاب هاییتان.

**دراو:** گوردە.

**ئاو وهەوا:** خولگەیی فێنك، پلەکانی گەرما لە کەنارەکاندا لەنێوان ٢١ بۆ ٢٥ پلەی سەدەی دەبێت، لەنێوان ١٠ بۆ ٢٤ پلەی سەدی لەناوچە شاخاویەکان. رێژەی ساڵانەی بارانەکان بەپێی ناوچەکان گۆڕانکاریان بەسەردا دێت ولەنێوان ١٠٠ سم بۆ ٢٠٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** قاوە، قامیشی شەکر، لۆکە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** دروستکراوە خۆراکییەکان.

**سامانی کانزایی:** مس، بۆکسیت.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

هاییتی، وشەیەکی بەرەچەڵەك هیندیە وبەمانای خاکی چیا بەرزەکان دێت، وڵاتە دورگەیەکە ویەکێکە لەدورگەکانی هیندی رۆژئاوا لەدەریای کاریبی، بەشی سێ یەکی رۆژئاوای دورگەی هیسپانیۆلای نێوان هەر یەك لە کوبا وپۆرتۆ ریکۆی گرتۆتەوە. ناوەراستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧٢/٥٠ بەرەو رۆژئاوا لەگەڵ هێڵی پانی ١٩ بەرەو باکوور.

زۆربەی دانیشتوانی هاییتی لەناوچەی کەنارەکاندا دەژین، چونکە دوو زنجیرە چیای سەخت نیمچە دورگەی بەشی رۆژئاوای دورگەی هیسپانیۆلایان پێك هێناوە.

کریستۆف کۆلۆمبۆس لەساڵی ١٤٩٢ دا دۆزیویەتییەوە. لەسەدەی حەڤدەیەمدا فەرەنسیەکان دەستیان کردووە بەنیشتەجێ بوون لەدورگەکەدا. لەساڵی ١٦٩٧ دا ئیسپانییەکان دەستیان لەناوچەکە هەڵگرتووە بۆ فەرەنسیەکان وئەمانیش لەلایەن خۆیانەوە ناویان ناوە سان دۆمینگۆ. لەماوەی سەدەی هەژدەیەمدا فەرەنسیەکان بەهەزاران ئەفریقی رەش پێستی هێناوەتە هاییتی وجوتیاری پێ کردوون، ئەفریقیەکانیش لەساڵی ١٧٩١ دا لێیان راپەڕیون، لەساڵی ١٨٠٣ دا شۆڕشیان لەدژیان هەڵگیرساندووە، لەبەرواری ١ / ١ / ١٨٠٤ دا بەتەواوی لەفەرەنسا سەربەخۆ بووە، بەمەش بەیەکەم کۆماری رەش دادەنرێت سەربەخۆیی دەستگیر بێت وبەدووەم وڵات دادەنرێت دوای ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سەربەخۆیی دەستگیر بێت. یەکەم سەرۆکی وڵات سەرکردەی شۆڕشگێڕان جان جاك دیسالین بووە، کەدوای دوو ساڵ تیرۆر کراوە بەهۆی ململانێ سیاسییەکانەوە. هێزە ئەمریکییەکان لەنێوان ساڵەکانی ١٩١٥ - ١٩٣٤ داگیری کردووە. لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەدوای ساڵی ١٩٤٦ هاییتی نائارامی سیاسی زۆری بەخۆوە بینییوە، چەند جارێك کودەتای سەربازی وهەڵبژاردنی تیا ئەنجام دراوە، دواییینیان هەڵبژاردنەکانی ١٩٩١ بووە، کە قەشە جان برتران ئیرتید بەسەرۆکی وڵات دوای سەرکەوتنی لەهەڵبژاردنەکاندا بۆتە سەرۆکی وڵات، بەڵام هێندەی نەخایاندووە لەلایەن سەربازیەکانەوە کودەتای بەسەردا کراوە ودەسەڵاتیان گرتە دەست. شەڕی ناوخۆ لەئەنجامدا هەڵگیرساوە، بەسەدان خێزان بەسواری بەلەمەوە وڵاتیان بەجێ هێشتووە، نەتەوە یەکگرتوەکان، وەك سزایەك لە ١٩٩٣ دا ئابڵوقەی ئابووی خستۆتە سەری وهێزەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانیش لە ١٩٩٤ هێرشیان کردە سەری وتاساڵی ١٩٩٦ سەربازەکان دەستیان لەدەسەڵات هەڵگرتووە وسەرۆکی شەرعی دەسەلاتی گرتۆتەوە دەست لە وڵاتدا ماونەتەوە. لەمانگی ١٢ / ٢٠٠٠ دا قەشە جان برتران ئیرستید لەهەڵبژاردنەکاندا بەزۆرینەی دەنگ سەرکەوتنی بەدەست هێناوە.

چڕی دانیشتوانی وڵاتی هاییتیی، لەچاو رووبەرەکەیدا، کردویەتییە وڵاتێکی هەژار ودواکەوتوو، چوار لەسەر پێنجی دانیشتوان نەخوێندەوارن وزۆربەیان سەرقاڵی جوتیارین، داهاتەکانیان بەشی بژێوی خێزانەکانیان ناکات، ئەمەش بۆتە هۆی بڵاوبوونەوەی نەخۆشیەکان، نێوەندی تەمەنی تاکی هاییتیی ناگاتە ٥٠ ساڵ.

سرووودی نیشتیمانی: گۆرانی دیسالین ( پاڵەوانانی زووی وڵاتن).

جەژنی نیشتیمانی: ١ / ١ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ساڵی ١٨٠٤ .

تێکڕای داهاتی نەتەوەیی: ١,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٤٠ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ٢٢٠ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٧٧ .

## هیند

**ناوی باو:** هیند.

**ناوی فەرمی:** کۆماری هیند.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of India.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری یەکگرتوو، سەرۆکی کۆمار، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی ویلایەتەکان ( ٢٤٥ ئەندام ).
- ئەنجومەنی گەل ( ٥٤٥ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١,٢٦٩,٢١٩ میل دووجا، ٣,٢٨٧,٢٦٣ کم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ملیارێك وسەد ملیۆن کەس ( تا ٢٠٠١ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣٣٥ کەس/کم٢

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** هیندە ئارییەکان، درافیدی، مەنگۆلی.

**ئاین:** هیندۆس، موسڵمان ( ٢٢ ٪ )، مەسیحی، سیخ، بوودی.

**زمان:** هیندی، ئینگلیزی.

**پایتەخت:** نیودەلهی.

**شارە سەرەکییەکان:** مۆمبای ( بۆمبای ئەوسا)، کۆلکاتا ( کالکوتا ئەوسا)، شینای ( مەدراسی ئەوسا)، حەیدەر ئاباد، ئەحمەد ئاباد، بانجالۆر، کانبۆر، ناجبۆر.

**دراو:** ڕوپێی هیندی.

**ئاو وهەوا:** زستان بەشێوەیەکی گشتی سارد ووشکە ونێوەندی پلەکانی گەرما لەنێوان ١٠ بۆ ١٥ پلەی سەدی دەبێت، هاوینیش گەرمە ونێوەندی پلەکانی گەرما ٤٠ پلەی سەدی دەبێت وبارانە وەرزییەکانی لەهاویندا زۆر دەبارێت، جیاوازی لەنێوان هاوین وزستاندا لەباشووری وڵات کەم دەردەکەوێت، لەشاری مەدراس ( شینای ئێستا )، بۆ نموونە، کە دەکەوێتە سەر کەناری باشووری ڕۆژهەڵات پلەکانی گەرما لە زستاندا ٢٤ پلەی سەدییە ولەهاویندا ٣٢ پلەی سەدی دەبێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** چا، قاوە، گەنم، جۆ، گەنمەشامی، گوێزی هیندی، مۆز، لاستیك، بەهارات، تووتن، لۆکە، برنج، قامیشی شەکر، بەخێوکردنی مەڕومالات، ڕاوەماسی، بەخێوکردنی مانگا، بستەی عەبید، ئاوریشم، داروتەختە، پەتاتە، بەخێوکردنی بەراز،

چاندنی ئەفیون ( ماددەیەکی هۆشبەری ناشەرعییە).

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چنین، شەکر، ئاسن وپۆلا، دروستکراوە کیمیاییەکان، فلمی سینەمایی، بەرنامەی کۆمپیوتەر.

**سامانی کانزایی:** مس، ئاسنی خاو، کۆرندۆم، کرۆمیت، مەنگەنیز، نەوت، خەڵووزی بەردین، مۆنازیت، بۆکسیت، لیگنیت.

**. تێڕوانینێکی گشتی:**

هیند، ئەم ناوەشی لەناوی روباری هیندۆسەوە وەرگیراوە کە ئێستا روباری سەرەکی وڵاتی پاکستانە بەزمانی هیندی پێی دەوترێ روباری بەهارات کەبەمانای یەکێتی هیندەوە دێت، وڵاتێکە دەکەوێتە باشووری کیشوەری ئاسیا، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٧٨ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٢٢ بەرەو باکوور، بەتەنیا ناوچەیەکی گرتۆتەوە بە نیمچە کیشوەری هیندی یان جیهانی هیندی دەناسرێت. چین ونیپال وبۆتان دەکەونە باکووری، میانمار وبەنگلادیش وکەنداوی بەنگال دەکەونە رۆژهەڵاتی، زەریای هیندیش دەکەوێتە باشووری، دەریای عەرەب دەکەوێتە رۆژئاوای، پاکستان دەکەوێتە باکووری رۆژئاوای، کۆمەڵە دورگەی لاکادیڤی سەر دەریای عەرەب و دورگەکانی ئاندامان و نیکۆباری سەر کەنداوی بەنگال سەر بە هیندن.

زنجیرە چیای هیمالایا بەدرێژایی ٢٤١٠ کم دەکەوێتە سەر سنوورەکانی هیندی باکوور، بەرەو باشووری چیای ناوبراویش، دەشتی گانجی بەپیت وبەرفراوانی تێدەکەوێت – چڕ ترین ناوچە لەجیهاندا لەرووی دانیشتوانەوە – وچەند روبارێکیشی وەك روباری گانج پیادا تێپەڕ دەبێت. بانی دکنیش زۆربەی ناوچەکانی باشووری گرتۆتەوە وبەرەو رۆژهەلاتی بانی دکنیش چیاکانی غاتی رۆژهەڵاتی تێدەکەوێت، روەو رۆژئاواش چیاکانی غاتی رۆژئاوا درێژ دەبێتەوە، ئەو دوو زنجیرە چیایەش لەو پەڕی رووی باشووری نیمچە دورگەکە یەك دەگرنەوە ودەگەنەوە بەچیاکانی نلقیری.

مێژووی شارستانی هیند دەگەڕێتەوە بۆ زیاتر لە پێنج هەزار ساڵ لەمەوبەر، لەساڵی ٣٥٠٠ پ.ز شارستانێتی هیند گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، هێرشی ئاریەکان بۆ سەر ناوچەکە لەدوای ساڵی ١٥٠٠پ.ز دەستی پێکردووە. ئاینی بوودی لە ساڵی ٥٠٠ پ.ز لەناوچەکەدا بڵاوبۆتەوە. ئەسکەندەری مەگدۆنی لەساڵی ٣٢٦ پ.ز گەیشتۆتە هیند، ئاینی ئیسلامیش لە سەرەتای ساڵی ٧١٢ ز دا گەیشتۆتە ناوچەکە. لەساڵی ١٤٩٨ گەڕیدەی پۆرتۆگالی فاسکۆ دی گاما گەیشتۆتە کەنارەکانی. لەساڵی ١٥٢٦ دا ئیمپراتۆریەتی مەغۆلەکان لەوێ دامەزراوە. لەساڵی ١٧٥٧ دا کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵاتی بەریتانی

بەنگالی داگیر کردووە، لەساڵی ١٨٥٨ دا کۆنگرەی نیشتیمانی هیندی دامەزراوە وجەختێکی زۆری کردووە بۆ گەیاندنی دەنگی گەلی هیندی بۆ حکومەتی بەریتانی. لەهەمان ساڵدا بەریتانیا دەسەڵاتی هیندیشی گرتۆتە دەست. لەساڵی ١٩٠٦ دا موسڵمانەکان یەکێتی ئیسلامییان دامەزراندووە بۆ بەرگری کردن لەبەرژەوەندییەکانیان لەژێ هیندۆسەکان، لەساڵی ١٩٢٠ دا ماهاتما گاندی سکرتارێتی پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی هیندۆسی گرتۆتە دەست، لەساڵی ١٩٣٥ دا بەریتانیا ڕەزامەندی خۆی دەبڕیوە لەو دەستوورە دانی بەمافەکانی گەلی هیند داناوە. لەساڵی ١٩٤٠ دا یەکێتی ئیسلامی داوای دامەزراندنی ولاتی سەربەخۆی پاکستانی کردووە، لەساڵی ١٩٤٣ پارتی کۆنگرەی نیشتیمانی ڕەزامەندی لەبڕیارێك دەرکرد بۆ سەربەخۆیی وڵاتەکەیان لەبەریتانیا. لەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لەبەرواری ١٥ / ٨ / ١٩٤٧ دا سەربەخۆیی تەواوی لەبەریتانیا دەستگیر بووە، جەواهیر لال نەهرۆ بۆتە یەکەم سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی هیندی سەربەخۆ وهاوکات هیند بووە دوو وڵاتی سەربەخۆ: هیند وپاکستان. لە تشرینی دووەمی ١٩٤٨ دا کۆمەڵەی جێبەجێ کردن دەستووری نوێی وڵاتی داڕشتووە، بەپێی ئەو دەستوورەش هیند بووە کۆمارێکی دیموکراسی سەربەخۆ. لەبەرواری ٢٦ / ١ / ١٩٥٠ دامەزراندنی کۆماری هیند ڕاگەیەنرا.

لە ١١ / ٥ / ١٩٩٨ دا هیند هەستا بەئەنجام دانی سێ تاقیکردنەوەی ئەتۆمی لەژێر زەویدا وموشەکێکی کورت هاوێژی لەناوچەی بۆخران لە ڕاجستانی باکووری ڕۆژئاوای هیند هاویشتووە، دوای دوو ڕۆژ لەو بەرواره دوو موشەکی دیکەشی، بەمەبەستی تاقیکردنەوە هاویشتووە. تاقیکردنەوەکان بوونە هۆی دەربڕینی ناڕەزاییەکی زۆر لەلایەن کۆمەڵگای نێودەوڵەتی ولەئاکامدا ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا سزای ئابلۆقەی ئابووری خستۆتە سەر. لە ٢١ / ٩ / ٢٠٠١ دا بەهۆی هەڵویستی هیند بەرامبەر ئەمریکا وپشتیوانی لێکردنی لەجەنگی دژە تیرۆر، ئەمریکا سزاکانی لەسەر هیند لابردووە.

هیند کۆمارێکی دیموکراسییە، گەورەترین سیستەمی دیموکراسی لەجیهاندا پەیڕەو دەکات، هیند لە بیست وپێنج ویلایەت وحەوت ناوچە پێك دێت، سەرۆکی وڵاتی هەیە بەڵام پۆستێکی ڕەمزییە ودەسەڵاتەکانی دیاری کراون، بەڵام بەسەرۆکی هێزە چەکدارەکان و پارێزەری یەکێتی خاکی هیند دادەنرێت، بەڵام دەسەڵاتی فیعلی بەدەست ئەنجومەنی وەزیرانە وئەرکی کاروباری بەڕێوەبردنی وڵاتی گرتۆتە ئەستۆ.

لەبەرواری ١٦ / ٧ / ١٩٩٧ دا کۆشیرل ڕامان نارایان بۆتە دەیەم سەرۆکی وڵات. لە ١٥ / ٧ / ٢٠٠٢ دا نوێنەرانی گەلی هیند وئەندامانی ئەنجومەنی ویلایەتەکان زانا لەبوارە

ئەتۆمییەکان وموشەکە دوور هاوێژەکان دکتۆر زین ئەلعابدین عەبدول کەلامیان بەسەرۆکی وڵات هەڵبـژاردووە، لەئاهـەنگی ڕێـوڕەسمی سـوێند خـواردنی دەسـتووریدا عەبـدول کـەلام بەڵێنی دا هەوڵی جددی بخاتە گەڕ بۆ لەناوبردنی هەژاری ونەداری گەل ونەتەوەکەی.

لـە ٢٦ / ١ / ٢٠٠٠ دا بوومەلەرزەیـەك بـەگوێری ٧،٩ پلـە بـەپێوەری ڕێختـەر لـە ویلایـەتی جۆجراتی ڕۆژئـاوای هینـدی داوە کە بەشـادەماری ئـابووری وڵات دادەنرێت، بوومەلەرزەکە ٦٠ چرکەی خایاندووە، سەنتەرەکەشی لەشاری بهۆج بووە کەچیتر لەسـەر نەخشەی هیند دیار نەما، شاری ئەحمەد ئابادیش ( کە بە پایتەختی ئابووری هیند دادەنرێت ودانیشتوانی نزیکـەی ٥ ملیـۆن کـەس دەبـن زیـاترین شـارەکانی ئـەو ناوچـەیە بـوون زیـان وزەرەری لێکەوتبێتەوە، تەواوی هیندی هەستیان بە گۆڕی بوومەلەرزەکە کردووە جگە لە هـەر یـەك لـە نیپـال وباشـووری پاکسـتانیش، زیـاتر لـە ٢٠٠ هـەزار کـەس بوونـە قوربـانی ئـەم ڕووداوە سروشـتییە وزیـاتر لـە ١٠٠ هـەزار بریـنـدار وئـاوارەبوونی نزیکـەی یـەك ملیـۆنی دیکـەش لێکەوتەوە.

لەناوەڕاسـتی سـاڵی ٢٠٠٠ دا شـەپۆلێکی تونـدی گـەرما و وشـك لـە بـاکوور وڕۆژئـاوای هینـدی داوە، نێوەنـدی پلـەکانی شـەو وڕۆژ گەیشتۆتە زیـاتر لـە ٤٩ پلـەی سـەدی، زیـاترینی چەم وبیرەکانی وشك کردۆتەوە، ئەمەش بەگەرمترین شەپۆل دادەنرێت بەدرێژایی سـەد سـاڵ لەو وڵاتەی دابێت.

هینـد بەیـەکێك لەوڵاتـە دەوڵەمەنـدەکان دانانرێـت، لەگـەڵ ئـەوەی سەرچـاوەیەکی کـانزایی وسروشتی زۆری هەیە، کەچی ئاستی زانیـاری گـەلی هینـد بەدەیم دادەنرێت لـەنێو وڵاتـانی جیهانـدا. هـەژاری بەشـێوەیەکی گشتی زۆر بـەربڵاوە، لەکاتێکـدا نیـوە زیـاتری گـەلی هینـد لەئاستێکی بەرزدا دەژین، بەڵام ژمارەی زۆری دانیشتوانی ئەو وڵاتە نێوەندی خـەرجی تـاکی زۆر دابەزانـدووە، واچـاوەڕوان دەکرێـت لەسـاڵی ٢٠٣٠ دا ژمـارەی دانیـشتوانی هینـد لـە ژمارەی دانیشتوانی چین تێپەڕ بکات.

هینـد بەپلـەی یەکـەم دێـت لـەنێو وڵاتـانی جیهانـدا لەبەرهـەمی چـا وبـەخێوکردنی مانگـا وبستەی عەبید وبەپلەی دووەم دێت لە بەرهەمی ئاوریشم وقامیشی شـەکر وبرنج، بە پلەی سێیەم دێت لـە بەرهـەمی گـەنم وبـە چوارەم دێت لـە بەرهـەمی لۆکـە ولاستیك وداروتەختـە، بەپلـەی شەشـەم دێـت لەبەرهـەمی پەتاتـە وئاسـن وبۆکسیت وبـەخێو کردنـی مـەڕ، بەپلـەی حەوتەم دێت لە گەنمەشامی ورۆوەماسی وبەپلەی نۆیەم دێت لەبەرهەمی قاوە، سیازدەیەم لە لینیت، پانزدەیەم لە بەخێوکردنی بەراز وهەژدەیەم لە بەرهەمی جۆ.

**جەژنی نیشتیمانی:** ١٥ / ٨ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ساڵی ١٩٤٧ .

**تێكڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٢٧٩ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٦ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٣١٠ دۆلاری ئەمریكی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٦٥ .

* * *

**گەورەترین رووداوی شەمەندەفەر لەجیهاندا**

دوای ئەو رووداوە ترسناكەی بەهۆی پێكدانی دوو شەمەنەفەری خێراوە لە مانگی حەوتی ١٩٩٩ و بووە هۆی كوشتنی زیاتر لە ٥٠٠ كەس وبریندار بوونی بەسەدان هاوڵاتی، وەزیری هێڵە ئاسنەكانی هیند دەست لەكاركێشانەوەی پێشكەش بە ئاتال بیهاری فاجبای كرد. دوای رووداوەكە لێپرسراوانی هێڵە ئاسنەكانی وڵات دەستیان كرد بە لێكۆڵینەوە كردن لەسەر چۆنیەتی روودانی ئەو رووداوە، چاو خشاندنەوە بە تۆڕی هاتووچۆی شەمەنەفدەرەكان كەزیاتر لە ١١ هەزار شەمەنەفدەری زەبەلاحی لەخۆ گرتووە وبەدرێژایی بیست وچوار كاتژمێر زیاتر ١٢ ملیۆن گەشتیار سوودی لێ دەبینن.

شایەنی باسە شەمەنەفدەرەكان زیاترین هۆیەكانی گواستنەوەی وڵاتی هیندن، درێژی تۆڕی هێڵە ئاسنەكان نزیكەی ٦٢،٩١٠ كم دەبێت وزیاترینی شار وشارۆچكەكانی وڵاتی پێكەوە بەستۆتەوە. ئەمە جگە لەوەی زۆربەی ئامێر وكەلوپەل وبەرهەمە كشتوكاڵیەكانیش لەرێی شەمەنەفدەرەوە دەگوێزرێنەوە. بەپێی ئامێرە حكومییەكان زیاتر لە یەك ملیۆن كەس كار لەو تۆڕەدا دەكەن.

دوای رمانی یەكێتی سۆڤیەتی پێشوو، تۆڕی هێڵە ئاسنەكانی هیند بەدرێژترین تۆڕ دادەنرێت لەهەموو جیهاندا. دروستكردنی تۆڕەكە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ساڵی ١٨٥٣ لەلایەن داگیركەری بەریتانییەوە بۆ ئاسانكاری هاتووچۆی سەربازەكانی لەنێو ئەو وڵاتەدا.شایەنی باسە لە ساڵی ١٩٨٠ شدا رووداوێكی شەمەنەفدەر بووە هۆی كوشتنی زیاتر لە ٨٠٠ كەس، بەڵام ئەو رووداوەیان بەهۆی گەردەلوولێكەوە بوو نەك بەهۆی هەڵەی مرۆییەوە.

## هۆندۆراس

**ناوی باو:** هۆندۆراس.

**ناوی فەرمی:** کۆماری هۆندۆراس.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Hondoras.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری، سەرۆکی کۆمار خۆی سەرۆکی حکومەتە.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٢٨ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٤٣,٢٧٧ میل دووجا، ١١٢,٠٨٨ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ٥,٦٦٦,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٥٠,٤ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** تێکەڵ، هیندی ئەمریکا، ئەفریقی ڕەش، ئەورووپی.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت ).

**زمان:** ئیسپانی.

**پایتەخت:** تیگۆسیگالبا.

**شارە سەرەکییەکان:** سان پیدرۆ سۆلا، لاسیبا، ئیل برۆگریسۆ، شۆلۆتیکا.

**دراو:** لیمبرا. ( لیمبرا ناوی شۆرشگێڕێکی هۆزی ئینکایەو ڕووبەڕووی هێزە ئیسپانیەکان بۆتەوە وچەند هێرشێکی توندی کردۆتە سەریان، لەساڵی ١٥٣٩ دا هێزە ئیسپانیەکان داوایان لێکرد گفتوگۆی لەگەڵدا بکەن بەڵام لەکاتی ئامادە بووندا شەهیدیان کرد، بۆیە هۆندۆراس وەك ڕێزلێنانێك ناوی دراوی وڵاتەکەیان لەسەر ناوی ئەو ناوە).

**ئاو وهەوا:** خولگەیی، نێوەندی پلەکانی گەرما لە پایتەختدا لەنێوان ١٠ بۆ ٢٣ پلەی سەدی دەبێت ولەکەنارە دەشتەکانیش دەگاتە ٣١ پلەی سەدی، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان بەپێی ناوچەکان گۆڕانکاریان بەسەردا دێت، بەشێوەیەکی گشتی لەنێوان ٧٥ سم بۆ ٢٥٠ سم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** مۆز، فاسۆلیا، گۆشت، بەخێوکردنی مانگا، قاوە، قامیشی شەکر، تووتن.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** چنین، جلوبەرگ، دروستکراوە خۆراکییەکان، داروتەختە.

**سامانی کانزایی:** زیو، ئاڵتون، زنك، قوڕقوشم.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

هۆندۆراس ولاتێکە دەکەوێتە ئەمریکای ناوەڕاستەوە، نیکاراگوا دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی، ئیلسلڤادۆر دەکەیۆتە باشووری، گواتیمالا دەکەوێتە رۆژئاوای، لەباکووریش کەنارێکی کورتی هەیە لەسەر دەریای کاریبی، جگە لەکەنارێکی کورتی دیکەش لەسەر زەریای هێمن لەباشووری ولات. هەردوو دورگەی سوان کە دەکەونە دەریای کاریبی ونزیکەی ١٥٦ کم لە نیشتیمانی دایکەوە دوورن، سەر بە هۆندۆراسن، رووبەری هەردوو دورگەکە ٨ کم$^2$ دەبێت وچەند بنکەیەکی دەریایی وپەیوەندی تێدەکەوێت بەپێی رێکەوتننامەی هۆندۆراس ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا بەڕێوەیان دەبات. ناوەڕاستی هۆندۆراس دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێلی درێژی ٨٧ بەرەو رۆژئاوا لەگەلّ هێلی پانی ١٥ بەرەو باکوور.

ئەو چیایانەی بەدارستانە چڕەکان داپۆشراون نزیکەی ٦٠ ٪ ی رووبەری ولاتیان گرتۆتەوە وزیاتر کەوتونەتە بەشە ناوخۆییەکان، هەندێکیان بۆ کشتوکالی بەگەڕخراون وهەندێکیان گژوگیا داپۆشیون. بەندەری سەرەکی ولات بەندەری ئامابالایە ودەکەوێتە سەر دورگەیەك لەکەنداوی فۆنسیکا لەزەریای هێمن.

هیندە ئەمریکییەکان بەر لەگەیشتنی ئیسپانەکان لەناوچەکەدا ژیاون وشارستانێتی ئینکا وئەلمایای هیندی گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیووە لەو سەردەمەدا. لەسالی ١٥٠٢ دا کریسۆڤێر کۆلۆمبۆس گەیشتۆتە ناوچەکە وخستویەتییە سەر خاوەندارێەکانی ئیسپانیا وناوی هۆندۆراسی لێناوە کەوشەیەکی ئیسپانییە وبەمانای قولایی دێت، بەهۆی قولایی ئاوەکانی دەریای کاریبی لەکەناری باکووری ناوچەکە. لەبەرواری ١٥ / ٩ / ١٨٢١ دا هەر یەك لە هۆندۆراس وچوار دەولەتی ئەمریکای ناوەڕاست سەربەخۆیی خۆیان لە ئیسپانیا راگەیاند وبوونە بەشێك لە ئیمپراتۆریەتی مەکسیکی. بەلام لەسالی ١٨٢٣ دا هەر چوار دەولەتەکە لێی جیا بوونەوە ویەکێتی ناوچەی کارگێڕی ئەمریکای ناوەڕاستیان دامەزراند. هۆندۆراسیش لەسالی ١٨٣٨ دا بەهۆی جیابوونەوەی ئەو ولاتانەوە لەئیمپراتۆریەتی مەکسیك جیابۆتەوە.

هۆندۆراس وەك زۆربەی ولاتانی ئەمریکای ناوەڕاست دووچاری چەندین ململانێی سیاسی و حوکمی دیکتاتۆری ونائارامی بۆتەوە، بارودۆخە ناهەموارەکان تاسەدەی بیستەمی خایاندووە. لەسالی ١٩٥٦ دا دوای کودەتایەکی سەربازی ئەنجومەنێکی سیاسی بۆ حوکمی ولات دامەزرێنراوە، ئەنجومەنی سیاسیش لەلایەن خۆیەوە لەسالی ١٩٥٧ دا ئەنجومەنی جێبەجێ کردنی دامەزراندووە وکاندیدی پارتی لیبرالی دکتۆر فیلیدا مۆرالیسی بەسەرۆکی ولات دامەزراندووە، هۆندۆراس لەسەردەمی فیلیدا چەند هەنگاوێکی چاکسازی ودەستووری لیبرالی ناوە، بەلام سەربازەکان لەسالی ١٩٦٣ دا کودەتایەکی خوێناویان

بەسەردا كرد، لەرێی پارتی نیشتیمانییەوە، سەربازییەكان دەسەڵاتی وڵاتیان گرتە دەست.
دوای ئەوەی جیمی كارتەر لە ١٩٧٧ تا ١٩٨١ سەرۆكایەتی ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكای گرتۆتە دەست، ویلایەتە یەكگرتوەكان هانی هۆندۆراسی داوە بگەڕێتەوە بۆ سەردەم بەحوكمی مەدەنی و وەك ناوبژیوانێك دەستی كردووە بەچارەسەری كێشە سنوورییەكانی نێوان هۆندۆراس وسلڤادۆری دراوسێی. دوای ئەوە لەساڵی ١٩٨٠ ئەنجومەنێكی دەستووری دامەزراوە، لە١٩٨٢ دا هەڵبژاردە دیموكراتیەكان بەڕێوە چووە و كاندیدی پارتی لیبرالی رۆبرتۆ سوازۆ كۆردۆڤا سەركەوتنی بەدەست هێناوە وبۆتە سەرۆكی وڵات. لەساڵی ١٩٨٦ خۆسێ ئەزكۆنا خۆیۆ بۆتە سەرۆكی وڵات. لەساڵی ١٩٩٠ دا لیۆناردۆ كالیگاس دەسەڵاتی گرتۆتە دەست، دوای ئەو لە ١٩٩٣ دا كارلۆس رۆبرتۆریا لەپارتی لیبرالی ئۆپۆزسیۆن سەركەوتنی بەدەست هێناوە ودەسەڵاتی گرتۆتە دەست. لەساڵی ١٩٨٨ دا كارلۆس فلۆریس فاكۆسی بۆتە سەرۆكی وڵات. لەكۆتایەكانی ٢٠٠١ دا ریكاردۆ مادۆرا لە پارتی نیشتیمانی بەهەڵبژاردنی راستەوخۆ لەلایەن گەلەوە بۆتە سەرۆكی وڵات.

لەهەشتاكانی سەدەی بیستەمدا، هۆندۆراس بۆتە سەرشانۆی ململانێكانی نێوان هێزە حكومییەكانی نیكاراگوای ساندینیسی وشۆڕشگێڕەكانی نیكاراگوا كەپێیان دەوترا: كۆنترا، شایەنی باسە كۆنترا هەوڵی روخانی حكومەتی نیكاراگوایان دەدا وچەند بنكەیەكی سەربازیان لەنێو خاكی هۆندۆراس دامەزراند ولێوەی هێرشەكانیان بەرەو نیكاراگوا كردووە. هێزە حكومییەكانی نیكاراگوا خۆیان دەخزانە نێو خاكی هۆندۆراسەوە بۆ لێدانی شۆڕشگێڕەكان. ئەم بارودۆخە تا ئازاری ١٩٨٨ ی خایاند، دوای ئەوەی هەردوو لایەنی بەشەڕ هاتوو ئاگر بەستیان راگەیاند.

سەرچاوە سروشتییەكانی هۆندۆراس زۆر كەمن وپلانە ئابوورییەكانیشی یەكێكن لەپلانە زۆر دواكەوتوەكان لەنێو ولاتانی ئەمریكای لاتینی. كشتوكاڵی سەرەكیترین چالاكییە ئابوورییەكانە،داهاتی نەتەوەییش پشتی تەواوی بەفرۆشتنەوەی مۆز وقاوە بەستووە تەنانەت بە كۆماری مۆز ناودەبرێت، جگە لەو پارەتیانەی لەكۆمپانیا ئەمەریكەكانەوە دێتە دەستی.

**سروودی نیشتیمانی:** هۆندۆراس.

**جەژنی نیشتیمانی:** ١٥ / ٩ / ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی ساڵی ١٨٢١.

**تێكڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٣,٢ ملیار دۆلاری ئەمریكی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٢٠ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٥٨٠ دۆلاری ئەمریكی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٤٠ .

## هەنگاریا ( مەجەر )

**ناوی باو:** هەنگاریا.

**ناوی فەرمی:** كۆماری هەنگاریا.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Hungary.

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٨٦ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٣٥,٩٢٠ میل دووجا، ٩٣,٠٣٣ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,١٥٧,٠٠٠ كەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٩,٢ كەس/كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** مەجەری، هەنگار، قەرەج، ئەڵمان، سلۆڤاك، سلاڤی باشووری.

**ئاین:** مەسیحی ( ڕۆمان كاسۆلیك، پرۆتستانت)، بێ باوەڕ.

**زمان:** هەنگاری.

**پایتەخت:** بۆداپست.

**شارە سەرەكییەكان:** دیبریسین، میكۆلك، تسیجید، بیتش، گیۆر.

**دراو:** فرنت.

**ئاو وهەوا:** مام ناوەند، زستانی سارده وهاوینی گەرمە، نێوەندی پلەكانی گەرما لەوەرزی زستاندا ٢ پلەی ژێر سفری سەدی ونێوەندی پلەكانی گەرما لەهاویندا ٢١ پلەی سەدی. ڕێژەی ساڵانەی باران وبەفر ٦٠ سم.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** گەنم، گەنمەشامی، بەخێوكردنی بەراز، شیر، لاستیك، ترێ، پەلەوەر، قامیشی شەكر.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** پۆڵا، كەلوپەلی هێڵی ئاسن، ئۆتۆمبێل، ئامێری كارەبایی وئەلیكترۆنی، دروستكراوە خۆراكییەكان، ئامێری زانستی، چنین.

**سامانی كانزایی:** بۆكسیت، خەڵووزی بەردین، مەنگەنیز، نەوت، گاز، لینیت.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

هەنگاریا یان مەجەڕ ولاتێکە دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەورووپا، سلۆڤاکیا دەکەوێتە باکووری، ئۆکرانیا ورۆمانیا دەکەونە رۆژهەلاتی، یۆگۆسلافیا وکرواتیا دەکەونە باشووری، سلۆڤینیا ونەمسا دەکەونە رۆژئاوای، هیچ کەنارێکی نییە بۆ سەر دەریاکان. ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۲۰ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٧ بەرەو باکوور.

زۆربەی زەوییەکانی هەنگاریا تەختن، ناوچەکانی رۆژهەلات بریتییە لەدەشتەکان، بەلام چەند چیایەك دەکەونە ناوچەکانی باکوور ورۆژئاوا. دەریاچەی بالاتۆن دەکەوێتە رووی رۆژئاوای ولات وبەگەورەترین دەریاچەکانی ئەورووپای ناوەڕاست دادەنرێت، رووباری دانوب لە باکووری رۆژئاواوە تا رۆژهەلات وبەدابڕستی پایتەختیشدا تێدەپەڕێت وبەبابەتێکی گواستنەوەی بازرگانی نێودەوڵەتی وناوخۆی ولات دادەنرێت.

لەنێوان ساڵەکانی ٥٠٠ — ٩٠٠ زایین ئەو هۆزانە لەناوچەکەدا ژیاون کەولاتیان بەناوی: مەجەر، هۆن، هەنگار، ناو ناوە.

۸۱۰ : سوپاکانی شارلمان مەجەڕ داگیر دەکەن ودەسەلاتی ناوچەکە دەگرنە دەست.

۱۰۰۱ : ئشت ڤانی یەکەن دەبێتە پادشای مەجەڕ وشاری بۆدا دەکرێتە پایتەخت، بەمەش یەکەمین ولاتی رۆژهەلات وناوەڕاستی ئەورووپا دادەمەزرێت.

۱۱٥۰ : گیزای دووەم دەسەلاتی مەجەڕ دەگرێتە دەست ونەڵمانە ساکسۆنییەکانی لەرۆژهەلاتی شانشینەکەی جێنشین کرد، تاکو ولاتەکەی لەهێرشی مەغۆل و وتەتەر وورووسەکان بپارێزێت.

۱۲٤۱ : مەغۆلەکان پەلاماری مەجەڕیاندا.

۱٥۲٦ : تورکە عوسمانییەکان لەشەڕی مۆهاکسدا سەرکەوتنیان بەسەر مەجەڕییەکاندا هێناوە وروژهەلات وناوەڕاستی ولاتیان داگیر کردووە.

کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەیەم: خێزانی هابسبێرگی نەمسایی بەسەر تورکەکاندا سەردەکەون ودەسەلاتی تەواوی خاکی مەجەڕ دەگرنە دەست.

٤ / ٤ / ۱۸٤۹ : دوای شۆڕشێکی خوێناوی هەنگاریا سەربەخۆیی خۆی لەنەمساییەکان بەدەست دەهێنێت. بەلام پاش پێنج مانگ نەمساییەکان داگیریان کردەوە.

۱۸٦۷ : دوای ململانێیەکی خوێناوی، شانشینە دووانەکی نەمسا ومەجەڕ دادەمەزرێت، بەشێوەیەك هەردوو ولات خاوەنی سەربەخۆیی وسەروەری خۆی بێت، ئیمپراتۆری نەمسا

فرانسیس یوسف دەبێتە ئیمپراتۆری شانشینی نوێ.

١٨٧٣ : یەکەم تونێل ( میترۆ ) لە بۆداپست دەکرێتەوە، بەمەش بەیەکەم تونێل لەناوچەی رۆژهەلات وناوەراستی ئەورووپا دەکرێتەوە.

١٩١٤ – ١٩١٨ : نەمسا ومەجەڕ لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا تێك دەشکێنرێن.

١٦ / ١١ / ١٩١٨ : مەجەڕ بووە کۆمارێکی سەربەخۆ.

١٩١٩ : بلاکن یەکەم حکومەتی شیوعی دادەمەزرێنێت.

١٩١٩ – ١٩٤٤ : مەجەڕ بەسەرۆکایەتی ئەدمیراڵ نیکۆلا هۆرتی دەبێتە شانشینێکی بێ پادشا.

٤ / ٦ / ١٩٢٠ : بەپێی رێکەوتننامەی تریانۆن، مەجەڕ زیاتر لەیەك لەسەر سێی خاکی ولاتی لەدەست دەچێ بۆ هەر یەك لە چیکۆسلۆفاکیا ورۆمانیا ونەمسا ویۆگۆسلافیا.

١٩٣٩ – ١٩٤٥ : جەنگی جیهانی دووەم، مەجەڕ دەبێتە هاوپەیمانی ئەڵمانیا، پاش دۆڕانی هەردوولا هێزە سۆفێتییەکان ولاتی داگیردەکەن.

١٩٤٦ : مەجەڕ سەر لەنوێ دەبێتە کۆمار.

١٩٤٦ : لەسایەی هێزە سۆفیەتییەکان، شیوعییەکان دەسەلاتی ولات دەگرنە دەست وحکومەت دادەمەزرێنن، مەجەڕ دەبێتە نمونەیەکی دەوڵەتی رووسی.

١٩٥٥ : مەجەڕ دەبێتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

١٣ / ١٠ / ١٩٥٦ : سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشێکی میللی دژی سۆفیەت، بەلام هێزە سۆفیەتییەکان سەرکوتی دەکەن.

١٩٥٧ – ١٩٨٨ : سەرۆکی کۆچ کردوو، یانۆش کادار دەسەلات دەگرێتە دەست وناوبانگێکی باشی دەبێت لەرووی بەرەو پێش بردنی ولات.

١٩٨٨ : حیزبی شیوعی رێ بەحیزبەکانی دیکە دەدات کاری سیاسی خۆیان ئەنجام بدەن وکارۆلی گرۆز دەسەلات دەگرێتە دەست.

١٩٨٩ : کۆتایی هاتنی ٤٠ ساڵ لەدەسەلاتی حیزبی شیوعی وماتیاس سۆرس دەبێتە سەرۆکی ولات ومیلیشیاکانی کرێکاران هەڵدەوەشێنێتەوە.

١٩٩٠ : هەڵبژاردنە ئازادەکان بەبەشداری تەواوی پارتە سیاسییەکان، پارتی دیموکراسی مەجەڕی سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت ئاریاد جۆنز ( ٦٧ ساڵ ) دەسەلاتی ولات دەگرێتە دەست، دوای ئەو فرانك مادڵ دەبێتە سەرۆکی ولات.

۱۲ / ۳ / ۱۹۹۹ : هەنگاریا پەیوەندی دەکات بە ناتۆوە.

ئابووری هەنگاری پشتی تەواوی بە کشتوکاڵی وپیشەسازی بەستووە، بەپێتی زەوییەکانی لەباری ئاو وهەوای وڵات بەباشترین سەرچاوە سروشتییەکانی ئەو وڵاتە دادەنرێت، رووبەری زەوییە کشتوکاڵیەکان زیاتر لە ۷۵٪ ی رووبەری وڵاتی گرتۆتەوە، پلانە پیشەسازییەکانی شیوعییەکان لە کۆتایی چلەکانی سەدەی پێشوو، هەنگاریای کردە یەکێك لەوڵاتە پێشکەوتوەکان.

هەنگاریا بەپلەی پانزدەیەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە بۆکسیت وبەپلەی دوانزدەیەم دێت لەبەرهەمی شەراب وبەپلەی شانزدەیەم دێت لە لینیت وگەنمەشامی.

هەنگارییەکان بایەخێکی بێ وێنە بەزمانی خۆیان دەدەن، لەبەر ئەوەی کە زمانێکی زۆر سەربەخۆیە وپەیوەندی بەهیچ کام لەزمانە ئەورووپییەکانەوە نییە.

**جەژنی نیشتیمانی:** ٤ / ٤ ی هەموو ساڵێك، یادی سەربەخۆیی لەنەمسا ساڵی ۱۸٤۹ .

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ۳۹ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ٤۹ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ۳,۸٤۰ دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ٥۳ .

## هۆڵەندا

**ناوی باو:** هۆڵەندا.

**ناوی فەرمی:** شانشینی زەوییە نزمەکان، شانشینی نەدەرلاند.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Kingdom of The Netherland.

**سیستەمی حوکمڕانی:** پادشایی دەستووری، شا یان شاژن، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی گەل ( پەرلەمان ) کە لەدوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی پیران ( ٧٥ ئەندام ).
- ئەنجومەنی نوێنەران ( ١٥٠ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ١٦,١٦٣ میل دووجا، ٤١,٨٦٣ کم²

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٥,٦١٩,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٤٦٠,٩ کەس/کم²

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** هۆڵەندی، تورك، عەرەب، کورد، ئەڵمان.

**ئاین:** مەسیحی ( کاسۆلیك، پرۆتستانت ) موسڵمان نزیکەی یەك ملیۆن.

**زمان:** هۆڵەندی، فریزی ( زمانێکی ناوخۆیە لە پارێزگای فریزلاند بەکاردەهێنرێت).

**پایتەخت:** ئەمستەردام.

**شارە سەرەکییەکان:** لاهای، ڕۆتەردام، ئۆترێخت، ئالمیر، داهاگ.

**دراو:** گیلدەر، یۆرۆ لەدوای ١ / ١ / ٢٠٠٢ .

**ئاو وهەوا:** دەریایی مام ناوەند، نێوەندی پلەکانی گەرما لەزستاندا ١ پلەی سەدی ولەهاویندا ١٧ – ٢٠ پلەی سەدی دەبێت، ڕێژەی ساڵانەی بارانەکان ٧٠٠ ملم دەبارێت.

**بەرهەمە کشتوکاڵیەکان:** جۆ، گەنمەشامی، بەخێوکردنی بەراز، بەخێوکردنی مەڕومالآت ومانگا، بەرهەمهێنانی گوڵ، چەوەندەری شەکر، پەتاتە، ڕاوەماسی.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئاسن وپۆڵا، دروستکردنی کەشتی، دروستکراوە کیمیاییەکان، بەرهەمە نەوتییەکان، ئامێری کارەبایی وئەلیکترۆنی، بەرهەمەکانی شیرەمەنی.

**سامانی کانزایی:** خەڵووزی بەردین، نەوت، گازی سروشتی، خوێ.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

هۆڵەندا وڵاتێکە دەکەوێتە بەشی باکووری ڕۆژئاوای ئەورووپا، دەریای باکوور دەکەوێتە باکووری، ئەڵمانیا دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی، بەلجیکا دەکەوێتە ڕۆژئاوای، ناوەڕاستی دەکەوێتە

سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٦ بەرەو رۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ٥٢/١٥ بەرەو باکوور.

وشەی هۆڵەندا کەبەمانای زەوییە نزمەکان دێت، ئاماژە بەتەنها بەشێکی ولات دەدات، بەشەکانی دیکەشی ئەمانەن:

١. دورگەی ئارۆبا.

٢. دورگەکانی ئەنتلی هۆلەندی ( کەژمارەیان چوار دورگەیە).

تەواویان دەکەونە دەریای کاریبی سەر بە دورگەکانی هیند رۆژئاوا.

نزیکەی نیوەی رووبەری هۆڵەندا دەکەوێتە ژێر ئاستی دەریا وروبارەکانەوە، بەنداوەکان پارێزگاری لە خاکی هۆڵەندا دەکەن لەنوقم بوونی بەئاوی دەریا وبارانەکان، بۆیە چەندین بزوێنەری زەبەلاح شەو ورۆژ لەکاردان بۆ فرێدانەوەی ئاوی زیادەی هۆڵەندا بۆ ناو دەریا.

لەباشووری ولات هەندێ بەرزایی درێژ دەبێتەوە کەهەرە بەرزییەکەی دەگاتە ٣٢١ م لەسەر ئاستی رووی دەریا وناوچەکە چالاکییە کشتوکاڵەکانی لێ ئەنجام دەدرێت، هەروەها روباری راین لەهۆڵەندا کۆتایی پێ دێت ودەڕژێتە دەریای باکوورەوە.

لەسەدەکانی ناوەڕاستدا ناوچەکە لەچەند دۆقێیەکی سەربەخۆ پێك هاتبوو کەتەواویان لەشانشینی بەلجیکا ولۆکسمبۆرگ لەژێر ناوی زەوییە نزمەکان بەسەرۆکایەتی کارلی پێنجەم ( ١٥٠٠ – ١٥٥٨ ) یەکیان گرتبۆوە، ئەوکاتیش بەشێك بوو لەشانشینی بۆرگندی – هابسبێرگی. بەلام دامەزراندنی ولاتی سەربەخۆ لە سالی ١٥٦٨ دا دەستی پێکرد، کاتێ خەڵکی هەندێ لەناوچەکانی باکووری هۆڵەندا لەدژی فیلیپی دووەمی شای ئیسپانیا وحاکمی شانشینی بۆرگەندی – هابسبێرگی راپەڕین، شۆڕشەکە بەسەرۆکایەتی میر ولیام ئۆف ئۆرانج بوو کەلەمێژووی هۆڵەندا بەدامەزرێنەری ولات دادەنرێت، ئەمە سەرەتای جەنگی سەربەخۆیی بوو کەنزیکەی هەشت ساڵێکی خایاند. لەکۆنگرەی ئاشتی سالی ١٦٤٨ ی شاری مۆنستەر ، وەك ولاتێکی سەربەخۆ دانیان ناوە بە حەوت ناوچەی هۆڵەندی. لەسەدەی حەڤدەیەمدا بازرگانە هۆڵەندییەکان چەند سەنتەرێکی بازرگانیان لەزۆربەی ناوچەکانی جیهاندا دامەزراندووە. دوای سەربەخۆیی باشووری زەوییە نزمەکان ( بەلجیکا ) لەساڵی ١٨٣٩ ، سنوورەکانی هۆڵەندا ئەو شێوەیەی ئێستای لەخۆ گرتووە.

هۆڵەندا لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا بێ لایەن بوو، لەجەنگی جیهانی دووەمدا ئەڵمانیا داگیری کرد ولەساڵی ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان.

لە ٣٠ / ٤ / ١٩٨٠ دا خاتوو بیاترکس ( شاژنی ئێستای هۆڵەندا ) هاتۆتە سەر تەختی پادشایی، دوای ئەوەی جۆلیانای شاژنی دایکی خانەنشین بوو.

دەسەلاتەکانی شاژنی هۆڵەندا زۆر دیاری کراوە، بەلام لێپرسراوانی حکومەت هەڵدەبژێرێ

وواژۆ لەسەر بڕیارەکانی پەرلەمان دەکات. لەدوای ساڵی ١٨٩٠ تەختی پادشایی هۆڵەندا بەدەست شاژنەوەیە، بەڵام واچاوەڕوان دەکرێت دوای ئەوەی ولیام ئەلکساندەری میری هۆڵەندا تەختی پادشایی دەگرێتە دەست، تەختی پادشایی بکەوێتە دەست شاوە لەبری شاژن.

هۆڵەندا خاوەنی ئابوورییەکی پیشەسازی وکشتوکاڵی زۆر پێشکەوتووە، ستایلە هونەرییە کشتوکاڵیە پێشکەوتوەکان لەو رووبەرەو کەمەدا بەرهەمێکی بەرز وبەتوانای لەخۆ گرتووە.

لەلێکۆڵینەوەیەکی یەکێتی لێکۆڵینەوەی بەختەوەری نێو دەوڵەتیدا، ئاشکرا کراوە کەگەلی هۆڵەندا بەبەختەوەرترین گەل دادەنرێن لەنێو تەواوی گەلانی جیهاندا، هەروەها گەلی هۆڵەندا هەست بەهیچ جۆرە تاوان وپەشیمانییەك ناکەن چونکە بەدرێژایی مێژوو ( وەکو خۆیان باسی لێوەدەکەن ) خۆیان بەخاوەن وئەنجامدەری هیچ تاوانێکی مرۆیی دادانێن ، شایەنی باسە هەمان یەکێتی ناوبراو ئاشکرای کردووە کە گەلی بەریتانیش یەکێکن لەگەلە بەختەوەرەکان بەڵام بەردەوام هەست بەتاوان وپەشیمانی دەکەن. هەروەها ئاشکرا کراوە کە گەلی ئەڵمانیا هەست بەخۆشحاڵییەکی ئەوتۆ ناکەن بەهۆی هەست بەتاوان وپەشیمانییەکی زۆریان لە رابردووەکانیان.

هۆڵەندا بەپلەی چوارەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لە دەرهێنانی گازی سروشتی، بەپلەی دەیەم دێت لەچاندنی پەتاتە وپلەی یانزدەیەم دێت لەبەخێو کردنی بەراز.

**سروودی نیشتیمانی:** ولیام ئاساو.

**جەژنی نیشتیمانی:** ٣٠ / ٤ ی هەموو ساڵێك، پێی دەوترێت جەژنی شاژن.

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٣٣٨,١ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٤ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٢١,٩٧٠ دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ١٥ .

## یابان

**ناوی باو:** یابان.

**ناوی فەرمی:** یابان.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:** Japan

**سیستەمی حوکمڕانی:** ئیمپراتۆری دەستووری، ئیمپراتۆر، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** پەرلەمانی نەتەوەیی ( دایت ) و لە دوو ئەنجومەن پێك دێت:

- ئەنجومەنی نوێنەران ( ٥١٢ ئەندام ).
- ئەنجومەنی شورا ( ٢٥٢ ئەندام ).

**رووبەر:** ١٤٥,٨٨٣ میل دووجا، ٣٧٧,٨١٥ کم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٢٦,٩٣٠,٠٠٠ کەس ( تا ساڵی ٢٠٠٢ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣٣٥ کەس/کم$^2$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** یابانی، کۆری، چینی.

**ئاین:** شنتۆ ( شێوە ئاینێکە لەشێوەکانی ئاینی بوودی )، بوودی، جگە لە ژمارەیەك مەسیحی وموسڵمان.

**زمان:** یابانی.

**پایتەخت:** تۆکیۆ.

**شارە سەرەکییەکان:** یۆکۆهاما، ئۆساکا، ناگۆیا، سابۆرۆ، کیۆتۆ، کۆبی، هیرۆشیما، ناگازاکی.

**دراو:** یەن.

**ئاو وهەوا:** بەشێوەیەکی گشتی مام ناوەندە، بەڵام لەجێیەکەوە بۆ جێیەکی دیکە گۆڕانکارییەکی زۆر بەرچاوی بەسەردا دێت، لەباشوور وناوەڕاستی وڵاتدا: هاوینی گەرمە وبارانێکی مام ناوەند، نێوەندی پلەکانی گەرما لە هاویندا ٣٠ پلەی سەدی ولەزستاندا ٨ پلەی سەدی. باکوور: هاوینی فێنکە وزستانی ساردترە لەناوچەکانی دیکە. ناوچەی شاخاوییەکانی ناوخۆی وڵات یەکێکە لەناوچە بەستەڵەکەکانی جیهان، تۆکیۆی پایتەخت زستانی مام ناوەندە ورێژەی شێ نزمە، بەپێچەوانەی وەرزی هاوین کەرێژەی شێ بەرزە وپلەکانی گەرما بەرز دەبێتەوە.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** برنج، شیر، بەخێوکردنی بەراز، پەلەوەر، ئاوریشم، بەخێوکردنی مانگا، پەتاتە، ترشەڵۆکییەکان، چا، راوەماسی، داروتەختە.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئامێری کارەبایی وئەلیکترۆنی بەهەموو جۆرەکانییەوە،

ئۆتۆمبێل، فرۆکە، کەشتی، ئامێری کشتوکاڵی، بەرهەمەکانی ئاسن وپۆڵا، دروستکراوە کیمیاییەکان، ئامێری کۆمپیوتەر وبەرنامەکانی.

**سامانی کانزایی:** ئاسن، قورقوشم، مس، خەڵووزی بەردین، زنك، ئاڵتون، زیو، گۆگرد.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

یابان وڵاتی کۆمەڵە دورگەیەکە لەباکووری رۆژئاوای زەریای هێمن، بەرەو رووی کەناری باکووری رۆژهەڵاتی ئاسیا، بەرامبەر بە هەردوو کۆریا و روسیا وچین. دەریای ئەخۆتسك دەکەوێتە باکووری، زەریای هێمن دەکەوێتە رۆژهەڵاتی، دەریای چینی رۆژهەڵات دەکەوێتە باشووری ودەریای یابان دەکەێتە رۆژئاوای.

دورگەکانی یابان لەشێوەی کەوانێکی تەسك بەدرێژایی ۳۸۰۰ کم لەباکوورەوە تا باشوور درێژ دەبێتەوە، بەشێوەیەکی گشتی لەچوار دورگەی سەرەکی پێك دێت، لەگەورەوە تابچوك:

- هۆنشۆ ( نزیکەی ٦۰٪ ی رووبەری دورگەکان پێك دێنێت).
- هۆکایدۆ.
- کیۆشۆ.
- شیکۆکۆ.

لەگەڵ نزیکەی ۳,۹۰۰ دورگەی بچوك، ناوەڕاستی دورگەکان دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ۱٤۰ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ۳۷ بەرەو باکوور.

دورگە یابانییەکان زنجیرەیەك چیای درێژ پێك دێنن لەو چیایانەی کەلە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیاوە تا ئالاسکا درێژ دەبنەوە. هێڵە کەنارێکی درێژ وبەردەڵان وچەند بەندەرێکیان بەدەوردا دێت. چیاکان نزیکەی ۷۱ ٪ ی رووبەری تەواوی یابان پێك دێنێت، بەرزی زۆربەیان ۲۰۰۰ م دەبێت، بەرزترینیان چیای فوجی یە ( ۳۷۷٦ م ) کەگڕکانێکی خامۆشەو لەساڵی ۱۷۰۷ بەدواوە نەوروژاوە، فوجی بەزمانی یابان بەمانای بێ وێنە دێت.

یابان ۷۷ گڕکانی چالاکی لەخۆ گرتووە، جاربەجاریٚ دووچاری بوومەلەرزەی گەورە دەبێتەوە، بەرفراوانترین دەشتەکانیشی دەشتی کانتۆیە، کەدەکەوێتە دورگەی هۆنشۆ وتۆکیۆی پایتەختی تێدەکەوێت.

نزیکەی ۱۰۰ هەزار ساڵ لەمەوبەرەوە خەڵکی لەدورگەکاندا ژیاون، ئەو کات هێشتا بەشێك بوو لە زەوییەکانی کیشوەری ئاسیا وبە راو دەژیان، کشتوکاڵی لەنزیکەی ساڵی ۳۰۰ پ.ز لەکیشوەری ئاسیاوە گەیشتۆتە یابان، چەند وڵاتۆچکەیەك لەزۆربەی ناوچەکانیدا دامەزراوە وپاشان یەکیان گرتۆتەوە. لەسەرەتای سەدەی چوارەمی زایین، دەسەڵاتێکی سیاسی بەهێز لەناوچەی یامۆتۆ ( پارێزگای نارای ئێستا ) پەیدا بووە. لەساڵی ۷۹٤ دا پایتەختێکی نویٚ

له كیۆتۆ دامەزراوه ونزیكەی هەزار ساڵ مەڵبەندی پادشایی بووه. كەلتووری چین لەرێی كۆریاوه كاریگەریەكی تەواوی كردۆتە سەر یابان، نووسینی چینی وئاینی بوودی ( كەبەرەو شنتۆیی گەشەی كرد ) لێوه وەرگرتوه.

بازرگانییە پۆرتۆگالیەكان یەكەمینی ئەو ئەوروپیانه بوون له ١٥٤٢ دا بگەنه ناوچەكە، لەسەدەی شانزدەیەمدا ململانێ لەنێوان میره دەرەبەگەكان وبوودییەكاندا پەیدا بووه، بەلام لەساڵی ١٨٧١ دا دەرەبەگایەتی رەتكراوەتەوه و دارشتنی دەستووری ساڵی ١٨٨٩ كۆتایی پێهاتووه. لەنێوان ساڵەكانی ١٨٩٤ – ١٨٩٥ جەنگی یەكەمی یابان – چین هەڵگیرساوه، لەنێوان ساڵەكانی ١٩٠٤ – ١٩٠٥ جەنگی رووسیا – یابان هەڵگیرساوه، یابانییەكان لەهەردوو جەنگدا سەركەوتنیان بەدەست هێناوه. لەجەنگی جیهانی یەكەمدا چۆتە پاڵ هاوپەیمانان. لەساڵی ١٩٣١ دا جەنگی دووەمی یابان – چین هەڵگیرساوه. لەجەنگی جیهانی دووەمدا چۆتە پاڵ وڵاتانی میحوەر بەسەرۆكایەتی ئەڵمانیا وبەتێكشكاندنی له ١٩٤٥ دا كۆتایی پێهاتووه.

لەبەرواری ١٨ / ١٢ / ١٩٥٦ دا بۆتە ئەندامی نەتەوه یەكگرتوەكان.

دەستووری ئێستای یابان له ٧ / ١٠ / ١٩٤٦ دا لەلایەن هاوپەیمانه سەركەوتوەكانی جەنگی جیهانی دووەم دارێژراوه و له ٣ / ٥ / ١٩٤٧ دا جێبەجێكراوه. ئەم دەستووره پەیكەری حكومەتی یابانی لەبنەرەتەوه گۆری، دەستووری خودی یابانی ١٨٨٩ دەسەلاتی رەهای بە ئیمپراتۆر بەخشیبوو، بەلام دەستووری ١٩٤٧ دەسەلاتی له ئیمپراتۆرەوه گواستۆته بۆ گەلی یابان وئیمپراتۆر هێمایەكی یەكێتی گەلی وڵاته وئەركەكانی لەچوار چێوەی رێورەسمه نەتەوەییەكان وبۆنه وئاهەنگەكاندا ماوەتەوه.

لەكۆتاكانی ١٩٢٦ ئیمپراتۆر هیرۆهیتۆ دوای كۆچی دوایی ئیمپراتۆر یۆشیهۆتۆی باوكی دەسەلاتی گرتۆته دەست. لەبەرواری ٧ / ١ / ١٩٨٩ هیرۆهیتۆ كۆچی دوایی كرد وئەكیهیتۆی كوری دەبێته سەد وبیست وپێنج هەمین ئیمپراتۆری یابان، شایانی باسه خێزانی ئیمپراتۆری ئێستای یابان یەكێكن له دێرین ترین خێزانه دەسەلاتدارەكانی جیهان.

دەسەلاتی فیعلی یابان لەدەستی سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیراندایه كەخۆی سەرۆكی پارتی زۆرینەی پەرلەمانی وڵاته.

یابانییەكان بەوڵاتی خۆیان دەڵێن نیبۆن یان نیهۆن، بەمانای وڵاتی خۆرهەلات دێت یان وڵاتی سەرچاوەی خۆر . بەلام رۆژئاواییەكان ( ئینگلیز ) به جاپانی ناودەبەن كەلەناوه یابانییەكەوه نابۆن هاتووه.

له ساڵی ٢٠٠٢ دا راپۆرتێكی حكومی ئاشكرای كردووه كه بەهۆی دابەزینی رێژەی

لەدایك بوانەوە، گەلی یابان هەڕەشەی نەمان قرتێکەوتتنیان دەکەوێتە سەر، هەروەها لەراپۆرتەکەدا هاتووە کەژمارەی دانیشتوانی ئێستا ١٢٧ ملیۆن لەساڵی ٢١٠٠ دا دادەبەزێ بۆ نیوە ئەو ژمارەیە گەر وابڕوات، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ نەخۆشی نەزۆکی لەنێوان ژنانی ئەو وڵاتە.

دوای تێکشکانی لەجەنگی جیهانیی دووەمدا ولەناوبردنی بنکە پیشەسازییەکانی، یابان نەك توانی بنکە پیشەسازییەکانی دامەزرێنێتەوە، بەڵکو توانی ببێتە پێشەنگی وڵاتە پیشەسازییە گەورەکانی جیهان. یابان ئەمڕۆ خاوەنی بەهێزترین پەیکەری ئابوورییە لەجیهاندا.

یابان بەپلەی یەکەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەدروستکردنی ئۆتۆمبێل وکەشتی، بەپلەی دووەم دێت لەراوەماسی وبەپلەی سێیەم دێت لەبەرهەمی وزەی کارەبا و وزەی ئەتۆمی وبەپلەی چوارەم دێت لەبەرهەمی ئاوریشم، پلەی حەوتەم لە بەرهەمی چا وپلەی هەشتەم لە ترشەڵۆکییەکان، پلەی نۆیەم لە بەرهەمی برنج، چواردەیەم لەپەتاتە وبەخێوکردنی بەراز، بەپلەی پانزدەیەم لە زنك وشانزدەیەم لە زیو ونۆزدەیەم لە ئاڵتون، بیستەم لەدارو تەختە.

**سروودی نیشتیمانی:** بژی ئیمپراتۆرمان.

**جەژنی نیشتیمانی:** ٢٢ / ١٢ ی هەموو ساڵێك، رۆژی لەدایك بوونی ئیمپراتۆر لە ساڵی ١٩٢٣ .

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٤٣٢١,٤ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ٢ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٣٤,٦٣٠ دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ٣ .

* * *

**کامیکازەکان نەیانتوانی یابان لەتێکشکانی رزگار بکەن**

لەگەڵ ئەوەی نزیکەی ٦٣ ساڵ بەسەر تێکشکانی یابان لەجەنگی جیهانی یەکەمی و وبەرز کردنەوەی ئاڵای خۆبەدەستەوەدانی لە ١٠ / ٨ / ١٩٤٥ دا، بە رۆژێك دوای ئەوەی ئەمریکا بۆمبی ئەتۆمی نا بەشاری ناکازاکی وپێش چوار رۆژ لە کێشانی بۆمبی ئەتۆمی بەشاری هیرۆشیماوە، بەڵام جەنگ لەوێڕدانی کامیکازەکاندا هێشتا کۆتایی پێ نەهاتووە. کامیکازەکان داهێنەری پرۆسە خۆکوژییەکان بوون بۆ گەیاندنی زیاترین زیان بەدوژمنەکەیان، زیندووەکانیان هێشتا هەست بەپەشیمانی وبێ ئومێدی دەکەن لەوەی

کەنەیانتوانی ڕێبازی هاوڕێکانیان تەواو بکەن وئەرکەکانیان بەجێ بهێنن. حکومەتی یابان بەسەدان فرۆکەوانی لە کامیکازەکان بەرەو کەشتی دوژمنەکانیان ڕەوانە دەکرد ودوای بۆردومان کردنی، کاتێ بێ ئومێد دەبوون فرۆکەکانیان دەکێشا بەکەشتی گەلەکانەوە وگیانی خۆیانیان لەم پێناوەدا لەدەست دەدا. ئەوان هیوایەکی گەورەیان بەسەرکەوتنی ولاتەکەیان هەبوو، نەیاندەویست ئالای ولاتیان دابەزێنرێت وخۆیان بدەن بەدەستەوە. بەلام کێشانی دوو بۆمبی ئەتۆمی بەسەر هەر یەك لەهیرۆشیما وناکازاکی وترسی گەورەی یابان لەبەردەوام بوونی کێشانی ئەو چەکە نوێیە بەزۆربەی شارەکاندا، ناچاری کردن چەك دانێن وخۆیان بدەن بەدەستەوە، چارەنوسیان وابوو یەکەم گەل بن قوربانی ئەو چەکە کۆکوژە بن. یابانییەکان لە یادی ئەو کارەساتە هەموو ساڵێك مەراسیمی تایبەت دەگێڕن و نوێژی بەکۆمەڵ دەکەن بۆ گیانی کوژراوە بێ تاوانەکانی ئەو کارەساتە. زیاتر لە ٢,٥ ملیۆن یابانی بوونە قوربانی جەنگی جیهانی دووەم، بەساڵاچوان بەردەوام پەشیمانی خۆیان لەداگیرکاریەکانی ولاتەکەیان بۆ ولاتانی ئاسیا دەردەبڕن، کارەساتی هیرۆشیما وناکازاکی بەسزای یەزدان دەزانن بۆ تاوانەکانی خودی خۆیان.

شایەنی باسە وشەی کامیکاز بەزمانی یابانی بەمانای بای پەروەردگار دێت و وشەکە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیانزدەیەم، کاتێ یابانییەکان گیانی خۆیان دەبەخشی لەپێناوی پاراستنی خاکی ولاتیان لە داگیرکەرە مەغۆلەکان.

كەنەیانتوانی رێبازی هاورێكانیان تەواو بكەن وئەركەكانیان بەجێ بهێنن. حكومەتی یابان بەسەدان فرۆكەوانی لە كامیكازەكان بەرەو كەشتی دوژمنەكانیان رەوانە دەكرد ودوای بۆردومان كردنی، كاتێ بێ ئومێد دەبوون فرۆكەكانیان دەكێشا بەكەشتی گەلەكانەوە وگیانی خۆیانیان لەم پێناوەدا لەدەست دەدا. ئەوان هیوایەكی گەورەیان بەسەركەوتنی وڵاتەكەیان هەبوو، نەیاندەویست ئاڵای وڵاتیان دابەزێنرێت وخۆیان بدەن بەدەستەوە. بەڵام كێشانی دوو بۆمبی ئەتۆمی بەسەر هەر یەك لەهیرۆشیما وناكازاكی وترسی گەورەی یابان لەبەردەوام بوونی كێشانی ئەو چەكە نوێیە بەزۆربەی شارەكاندا، ناچاری كردن چەك دانێن وخۆیان بدەن بەدەستەوە، چارەنوسیان وابوو یەكەم گەل بن قوربانی ئەو چەكە كۆكوژە بن. یابانییەكان لە یادی ئەو كارەساتە هەموو ساڵێك مەراسیمی تایبەت دەگێرن و نوێژی بەكۆمەڵ دەكەن بۆ گیانی كوژراوە بێ تاوانەكانی ئەو كارەساتە. زیاتر لە ٢,٥ ملیۆن یابانی بوونە قوربانی جەنگی جیهانی دووەم، بەساڵاچوان بەردەوام پەشیمانی خۆیان لەداگیركاریەكانی وڵاتەكەیان بۆ وڵاتانی ئاسیا دەردەبڕن، كارەساتی هیرۆشیما وناكازاكی بەسزای یەزدان دەزانن بۆ تاوانەكانی خودی خۆیان.

شایەنی باسە وشەی كامیكاز بەزمانی یابانی بەمانای بای پەروەردگار دێت و وشەكە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سیانزدەیەم، كاتێ یابانییەكان گیانی خۆیان دەبەخشی لەپێناوی پاراستنی خاكی وڵاتیان لە داگیركەرە مەغۆلەكان.

## یەمەن

**ناوی باو:** یەمەن.

**ناوی فەرمی:** كۆماری عەرەبی یەمەن.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Republic of Yemen.

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٠١ ئەندام).

**ڕووبەر:** ١٨٢,٢٧٨ میل دووجا، ٤٧٢,٠٩٩ كم$^2$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٧,٦٠٠,٠٠٠ كەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٣٠ كەس/كم$^2$

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** عەرەب.

**ئاین:** موسڵمان.

**زمان:** عەرەبی.

**پایتەخت:** سەنعا.

**شارە سەرەكییەكان:** عەدەن، تەعز، حەدیدە، مەكلا، حەزرەمەوت، مەخا.

**دراو:** ریالی یەمەنی.

**ئاو وهەوا:** كەنارەكانی ڕۆژئاوای وڵات گەرم وشێدارە، لەچیاكانی ڕۆژئاوا پلەكانی گەرما مام ناوەندن، ناوچە بیابانییەكانی ڕۆژهەلات وشكە وپلەكانی گەرما بەرزن. بەشێوەیەكی گشتی نێوەندی پلەكانی گەرما ٢٩ پلەی سەدییە.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** دانەوێڵە، سەوزە ومیوە، قاوە، قات، هەنگوین.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** ئیشی دەست، كەرەستەی بیناسازی، دروستكراوە كانزاییەكان، دروستكراوەكانی نەوت وگاز.

**سامانی كانزایی:** گرانێت، ئاسن، مس، خوێ، نەوت.

**تێڕوانینێكی گشتی:**

یەمەن وڵاتێكی عەرەبی ئیسلامی دەكەوێتە باشووری ڕۆژئاوای كیشوەری ئاسیا لەوپەڕی باشووری ڕۆژئاوای نیمچە دورگەی عەرەب، سعودیە دەكەوێتە باكووری، عومان دەكەوێتە ڕۆژهەلاتی، دەریای عەرەب وكەنداوی عەدەن دەكەونە باشووری، دەریای سووریش دەكەوێتە ڕۆژئاوای. تەنگەی باب ئەلمەندەب دەكەوێتە باشووری ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكبڕی هێڵی درێژی ٤٨ بەرەو ڕۆژهەلات لەگەڵ هێڵی پانی ١٥ بەرەو باكوور.

دورگەی سوقتری، کەدەکەوێتە سەر دەریای عەرەب وگەورەترین دورگەیە لەنێو وڵاتە عەرەبییەکاندا، سەر بە وڵاتی یەمەنە جگە لە ١١٢ دورگەی دیکەش لەسەر دەریای سوور، لەوانە دورگەی حەنیش کە ئەریتیریا لەساڵی ١٩٩٦ دا داگیری کردووە، کێشەکە ڕەوانەی دادگای نێو دەوڵەتی کراوە، دادگاش لەلایەن خۆیەوە لەساڵی ١٩٩٨ بڕیاری بەگەڕانەوەی بۆ یەمەن دەرکرد.

چیای نەبی شوعەیب بەرزترین چیای ئەو وڵاتەیە وبەرزییەکەی دەگاتە ٣٧٢٠ م لەسەر ئاستی رووی دەریا، هەروەها بەرزترین چیای نیمچە دورگەی عەرەب و وڵاتانی شامیشە.

لەسەردەمە دێرینەکانەوە شارستانیەتی موعین وشارستانیەتی سەبەئ وحیمییەڕ لەو ناوچەیەدا گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە، بەر لەهاتنی ئیسلام هەریەك لەفارس وحەبەشییەکان پەلاماریان داوە، لەسەرەتای ئیسلامەوە لەسەدەی حەوتەمی زایین، ناوچەکە پەیڕەوی ئاینی ئیسلامی کردووە، چەندین حاکم وچەند ئیمامێك دەسەڵاتی ناوچەکەیان گردۆتە دەست. عوسمانییەکان لەساڵی ١٥٣٨ دا داگیریان کردووە، بەڵام لەساڵی ١٦٣٥ دا هۆزە عەرەبییەکانی ئەو ناوچەیە لەدژیان راپەڕیون لەوڵاتەکەیاندا کردویاننەتە دەرەوە. بەڵام لەسەدەی نۆزدەیەمدا عوسمانیەکان گەڕاونەتەوە بۆ یەمەن، بەڵام بەهۆی سەختی چیاکانی یەمەن وبەرەنگاری دانیشتوانەکەیەوە نەیانتوانییوە بەتەواوی داگیری بکەن وتەنها لەچەند ناوچەیەکیدا ماوەنەتەوە. لە٢٣ / ٧ / ١٩٢٣، بەپێی رێکەوتننامەی لۆزان تورکەکان دانیان ناوە بەسەربەخۆیی یەمەن. لە ٢٦ / ٩ / ١٩٦٢ عبدالله سەلال کودەتای بەسەر ئیمام محەمەد ئەلبەدردا کردووە، دوایین ئیمامی یەمەن وکۆماری عەرەبی یەمەنی دامەزراندووە.

لەساڵی ١٧٩٩ دا هێزە بەریتانییەکان دورگەی بریمیان داگیر کردووە، لەساڵی ١٨٣٩ دا عەدەنیشیان داگیرکرد. ململانێی نێوان یەمەن وبەریتانیا شێوازێکی توندی وەرگرتووە بەهۆی قایل نەبوونی یەمەن بە پارێزگاری بەریتانییەوە بۆ باشووری وڵاتەکەیان، تا لە رێکەوتننامەی ساڵی ١٩٣٤ بەریتانیا دانی ناوە بە سەربەخۆیی یەمەنی باکوور بەر لەیەکگرتنەوەی هەردوو بەشی وڵاتەکە. لە ١٤ / ١٠ / ١٩٦٣ دا شۆڕشێکی چەکداری لەیەمەن لەدژی بەریتانیا هەڵگیرساوە، بۆیە هێزە بەریتانیەکان باشووری وڵاتیان چۆڵ کردووە ویەمەنییە باشوورییەکان کۆماری دیموکراسی میللیان راگەیاندووە وعەدەنیش بووە بەپایتەختی.

لەبەرواری ٢٢ / ٥ / ١٩٩٠ دا هەردوو بەشی یەمەن بوونەتە یەك وڵات، بەڵام لە ٢٠ / ٥ / ١٩٩٤ دا یەمەنی باشوور داوای جیابونەوەیان کردووە، ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ ، پاش مانگێك لەشەڕ وپێکدادان کێشەکە بە بەرژەوەندی یەمەنی باکوور

شکاوەتەوە وولات گەڕایەوە باری ئاسایی خۆی.

یەمەنی باکوور لە سالّی ١٩٤٧ بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان، بەلام یەمەنی باشوور لە ١٩٦٧ دا بۆتە ئەندامی ئەو رێکخراوە، دوای یەکگرتنەوەی هەردوو بەشی ولات لەسالّی ١٩٩٠ ولاتی یەمەن یەك نوێنەری لەنێو نەتەوە یەکگرتوەکاندا مایەوە.

لەبەرواری ١٧ / ٧ / ١٩٧٨ عەلی عبد الله سالح پۆستی سەرۆك كۆمار وسەرۆکایەتی هێزە چەکدارەکانی گرتۆتە دەست، ئەمە دوای کۆمەلێك كودەتای سەربازی کەبەدوایدا کۆماری عەرەبی یەمەن دامەزراوە لەسالّی ١٩٦٢ دا. لە٢٠ / ٨ / ١٩٨٠ دا عەلی عبدالله سالح بۆتە سکرتێری کۆنگرەی میللی گشتی ولەبەرواری ٢٣ / ٥ / ١٩٨٢ لەلایەن ئەنجومەنی نوێنەرانەوە سەرلەنوێ بەسەرۆکی ولات وهێزە چەکدارەکان هەلبژێردراوەتەوە، لەپاشدا بۆتە سەرۆکی هەردوو بەشی باکوور وباشوور.

لە ٢٣ / ٩ / ١٩٩٩ دا یەمەنییەکان بەرەو سندوقەکانی دەنگدان بەڕێکەوتن، پاش ئەو گۆڕانکارییە دەستووریانەی کە ماف هەلبژاردنی لە ئەنجومەنی نوێنەرانەوە بەگەلی ولات سپاردووە بۆ هەلبژاردنی سەرۆك. ئەنجامەکانی هەلبژاردن بەسەرکەوتنی عەلی عبدالله سالح بە رێژەی ٩٦,٣ ٪ ی دەنگەکان بەرامبەر بە ٣,٧ ٪ بۆ نەجیب قەحتان ئەلشەعبی كۆتایی پێهاتووە.

لەچوارچێوەی ئەو هەلمەتەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دژ بەتیرۆر، لە ١٣ / ١٢ / ٢٠٠١ دا هێزە حکومیەکانی یەمەن هەلمەتێکی بەرفراوانیان کردە سەر ئەو ناوچانەی گومانی بوونی سەرانی ئەلقاعیدەیان لێدەکرد. ئابووری یەمەن پشتی بە چالاکییە کشتوکالّیەکان وگەشتوگوزار بەستووە، لەگەلّ ئەو برە پارانەی یەمەنییەکانی دەرەوە رەوانەی ولاتەکەیانی دەکەن. لەسالّی ١٩٨٣ دا دەستکراوە بەدەرهێنانی نەوت ویەکەم پالاوگەی نەوتیان لەشاری مەئرەب دروستکردووە، جگە لەهەردوو پالاوگەی عەدەن وسلێف.

**جەژنی نیشتیمانی:** ٢٢ / ٥ ی هەموو سالێك، یادی یەکگرتنەوەی هەردوو بەشی یەمەن لە ١٩٩٠ .

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٣,٩ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا:** ١٠٩ .

**نێوەندی خەرجی سالانەی تاك:** ٢٨٠ دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو ولاتانی جیهاندا:** ١٦٧ .

## یۆگۆسلاڤیا

**ناوی باو:** یۆگۆسلاڤیا.

**ناوی فەرمی:** کۆماری یۆگۆسلاڤیای یەککگرتوو ( یەکێتی سربیا وچیای رەش ).

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Federal Republic of Yogoslavia.

**سیستەمی حوکمڕانی:** کۆماری یەککگرتوو، سەرۆکی یەککگرتوو، سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** لەدوو ئەنجومەنی پێك دێت:

- ئەنجومەنی کۆمارییەکان ( ٤٠ ئەندام ).
- ئەنجومەنی هاولاتیان ( ١٣٨ ئەندام ).

**رووبەر:** ٣٩,٤٤٩ میل دووجا، ١٠٢,١٧٣ کم$^{٢}$

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,٦٣٢,٠٠٠ کەس ( تا ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ١٠٤,١ کەس/کم$^{٢}$

**کۆمەڵە نەژادییەکانی ئەو وڵاتە:** سرب، گەلی چیای رەش، ئەلبانی، مەجەڕی، قەرەج، کرواتی.

**ئاین:** مەسیحی ( ئەرتۆدۆکس، رۆمان کاسۆلیك، پرۆتستانت)، بێ ئاین، موسڵمان ( نزیکەی سێ ملیۆن کەس ).

**زمان:** سربی.

**پایتەخت:** بەلگراد.

**شارە سەرەکییەکان:** نوڤی ساد، نیس، کراگۆگیفاك، سۆبۆتیکا.

**دراو:** دیناری نوێی یۆگۆسلافیا.

**ئاو وهەوا:** ناوچەی کەنار: زستانی فێنکە وهاوینی گەرم و وشکە، بەرزاییەکانی ناوخۆی وڵات: زستانی ساردە وسەرەتای هاوین بارانێکی زۆری لێدەبارێت. لەچیاکان: هاوینی ساردە ودۆڵەکانی فێنکن، دەشتە باکوورییەکان: زستانی ساردە وبارانێکی زۆری لێدەبارێت، هاوینشی گەرم و وشکە.

**بەرهەمە کشتوکاڵییەکان:** بەخێوکردنی بەراز ومانگا ومەڕ، میوە وسەوزە، گەنمەشامی، زەیتون، پەتاتە، توون، گەنم.

**بەرهەمە پیشەسازییەکان:** ئەلەمنیۆم، ئۆتۆمبێل، چیمەنتۆ، ئاسن وپۆڵا، کاغەز، چنین، کەلوپەلی ناوماڵ.

**سامانی کانزایی:** بۆکسیت، خەڵووزی بەردین، مس، قورقوشم، زنك.

**تێڕوانینێکی گشتی:**

یۆگۆسلاڤیا، وەکو وشە بەمانای خاکی سلاڤییە باشوورییەکان دێت، پاشماوەی وڵاتێکی یەکگرتووی گەورە بوو، ناوی: کۆماری یۆگۆسلاڤیای سۆسیالیستی یەکگرتوو بووە ولەشەش کۆمار پێك هاتبوو: بۆسنە وهەرسك، کرواتیا، مەگدۆنیا، سلۆڤینیا، سربیا، چیای رەش، دوای سەربەخۆیی هەر چوار دەوڵەت لەنێوان ١٩٩١ بۆ ١٩٩٥ تەنها دوو کۆمار لەیەکێتی یۆگۆسلاڤیا مانەوە: سربیا و چیای رەش. ( لەبەشێکی تایبەت باس لەکۆماری نوێی سربیاش دەکەین ) . یۆگۆسلاڤیا دەکەوێتە باشووری رۆژهەلاتی ئەورووپا لەو ناوچەیەی پێی دەوترێ بەلقان. هەنگاریا دەکەوێتە باکووری، رۆمانیا وبولگاریا دەکەونە رۆژهەڵاتی، مەگدۆنیا وئەلبانیا دەکەونە باشووری، دەریای ئەدریاتیکی وبۆسنە وهەرسك وکرواتیا دەکەونە رۆژئاوای، ناوەڕاستی دەکەوێتە سەر یەکبڕی هێڵی درێژی ٢١ بەرەو رۆژهەڵات لەگەڵ هێڵی پانی ٤٤ بەرەو باکوور.

تەختی یۆگۆسلاڤیا بریتییە لە دەشتە کەنارە تەسکەکان بەدرێژایی دەریای ئەدریاتیکی، چیاکانی ئەلپی دیناری بەدرێژایی کەنارەکان تێپەڕ دەبێت، بەڵام چیاکانی بەلقان دەکەونە سەر سنووره رۆژهەڵاتییەکانی. دەشتە بانونییەکانیش دەکەونە باکووری وڵات وبەناوچەیەکی کشتوکاڵی سەرەکی ئەو وڵاتە دادەنرێن، گرنگترین روبارەکانی یۆگۆسلاڤیا روباری دانووبە کە لەوڵاتی هەنگاریاوە دەگاتە یۆگۆسلاڤیا وپاشان بەنێو دەشتە بانوونییەکاندا تێپەڕ دەبێت ولەرێی دەربەندێکەوە کە پێی دەوترێت دەروازەی ئاسن دەگاتە وڵاتی رۆمانیا.

لەسەدەی شەشەمی زاییندا سلاڤییەکانی باشووری پۆڵۆنیا وروسیا گەیشتونەتە ناوچەکە وبەسلاڤییە باشوورییەکان ناسران. هەر کۆمەڵێك لەو سلاڤیانە وڵاتێکی سەربەخۆیان دامەزراند، کرواتییەکان کرواتیایان دامەزراند، سربەکانیش سربیا. بەڵام تەواوی ناوچەکە کەوتە ژێر دەسەڵاتی بیانییەکانەوە، لەساڵی ١٤٠٠ نەمسا دەسەڵاتی سلۆڤینیای گرتۆتە دەست ومەجەرییەکان کرواتیا وتورکە عوسمانییەکان حوکمی سربیا وبۆسنە وهەرسکیان کردووە.

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا بزوتنەوەی یەکێتی سلاڤیەکان سەری هەڵداوە، دوای جەنگی جیهانیی یەکەم لە ١ / ١٢ / ١٩١٨ دا توانیان یەکەم وڵاتی نوێ دامەزرێنن لەژێر ناوی شانشینی سرب وکروات وسلاڤییەکان، شانشینی ناوبراو لەشەش کۆمار پێك هاتبوو: بۆسنە وهەرسك، سربیا، کرواتیا، مەگدۆنیا، سلۆڤینیا، چیای رەش. پیتەری یەکەمی

پادشای سربیا بووە شای وڵاتی نوێ، دوای ئەو شا ئەسکەندەری یەکەم دەسەلاتی گرتە دەست ولەساڵی ١٩٢٩ دا وڵاتی ناوناوە یۆگۆسلاڤیا.

لەجەنگی جیهانی دووەمدا هێزەکانی میحوەر یۆگۆسلاڤیایان داگیر کردووە، هێزی بەرەنگاری یۆگۆسلاڤی جەنگی پارتیزانی لەدژی داگیرکەران هەڵگیرساندووە. لە ٢٤ / ١٠ / ١٩٤٥ دا بۆتە ئەندامی نەتەوە یەکگرتوەکان. لەبەرواری ٢٩ / ١١ / ١٩٤٥ دا پادشایی رەتکراوەتەوە وناوی یۆگۆسلاڤیا بووە: کۆماری یۆگۆسلاڤیای میللی یەکگرتوو بەسەرۆکایەتی مارشاڵ جۆزێف تیتۆ. لەساڵی ١٩٤٨ دا پەیوەندییەکانی نێوان یۆگۆسلاڤیا ویەکێتی سۆڤیەت بەرەو خراپ دەچوو، بۆیە سیاسەتێکی شیوعێتی زۆر سەربەخۆی پەیڕەو دەکرد، یۆگۆسلاڤیا بووە یەکێك لەهێزە زۆر دیارەکانی جیهانی سێیەم. لەساڵی ١٩٦٣ دا ناوی فەرمی بووە کۆماری یەکرگۆتووی سۆسیالیستی یۆگۆسلاڤیا. لەساڵی ١٩٧٤ دا تیتۆ بووە سەرۆکی هەتا هەتایی وڵات.

لەبەرواری ٤ / ٥ / ١٩٨٠ دا تیتۆ کۆچی دوایی کردو ئابووری یۆگۆسلافیا بەرەو خوار دەهات و ولات دووچاری هەڵئاوسانێکی بەرچاو بووەوە. کەلێنی ئابووری وکۆمەڵایەتی گەورە کەوتە نێوان کۆمارەکانی یەکێتی یۆگۆسلاڤیا، دەسەلات گرتنە دەستی سلۆبۆدان میلۆسیڤیتشی سەرکردەی نەتەوەیی سربیا بۆ سەرۆکایەتی پارتی یەکگرتووی شیوعی لە ٢٤ / ٤ / ١٩٨٧ ، کاریگەرییەکی گەورەی کردە سەر چوار کۆماری یەکێتی یۆگۆسلاڤی ( بۆسنە وهەرسك، کرواتیا، سلۆڤینیا، مەگدۆنیا) بۆ راگەیاندنی سەربەخۆییان لە نێوان ساڵەکانی ١٩٩١ – ١٩٩٢ . ئەمە بووە هۆی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان سربەکان وکۆمەڵە نەژادییەکانی دیکەی وڵاتەکە لەنێوان ١٩٩١ – ١٩٩٥ ، جەنگەکە بەراگەیاندنی سەربەخۆیی کۆمارە دابڕاوەکان کۆتایی پێهات، جگە لە لەناوبردنی ژێرخانی ئابووری وڵاتەکە. لە ٢٧ / ٤ / ١٩٩٤ هەردوو کۆماری سربیا ومۆنتینیگرۆ ( چیای رەش ٩ کۆماری یۆگۆسلاڤیای یەکگرتوویان پێکهێنا).

لەساڵی ١٩٩٠ سلۆبۆدان میلۆسیڤیتش بووە سەرۆکی سربیا، لەساڵی ١٩٩٧ دا بەسەرۆکی یۆگۆسلاڤیا لەلایەن پەرلەمانی یەکگرتووەوە بۆ ماوەی چوار ساڵ هەڵبژێردرا.

لە ٢٤ / ٩ / ٢٠٠٠ دا هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی لە یۆگۆسلاڤیا بەڕێوە چوو، کاندیدی ئۆپۆزسیۆن ڤۆیسلاڤ کۆستۆنیتشا سەرکەوتنی بەدەس هێنا، بەڵام سەرۆك سلۆبۆدان دانی نەنا بەئەنجامەکانی هەڵبژاردنەکە وسەرکەوتنی ناوبراو وداوای ئەنجام دانەوەی هەڵبژاردنەکانی کردەوە. لەئاکامدا خۆپیشاندنەکان لەدژی سلۆبۆدان لەزۆربەی شارەکانی یۆگۆسلاڤیا دەستی پێکرد وداوایان لێدەکرد دەست لەدەسەلات هەڵگرێت. لە ٥ / ١٠ /

۲۰۰۰ دا خۆپیشاندەران دەستیان کرد بە مانگرتن لەنێو شەقامەکاندا و ئاگریان بەردایە تەلاری پەرلەمان وسووتاندیان، بۆ رۆژی دوایی سەرۆك سلۆبۆدان ناچار بوو دەست لەدەسەلات بکێشێتەوە، لە ۷ / ۱۰ / ۲۰۰۰ دا سەرۆکی هەڵبژێردراو فۆیسلاڤ کۆستۆنیتشا لەبەردەم ئەنجومەنی پیران ونوێنەراندا سوێندی دەستووری خوارد وبەڵێنی دا رێز لە دەستووری وڵات ویاسا فیدراڵیەکان بگرێت ویەکێتی خاکی وڵاتەکەی بپارێزێت.

لەبەرواری ۳۱ / ۱۰ / ۲۰۰۰ دا ئەنجومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی رەزامەندی لەدووبارە پەیوەندی کردنی یۆگۆسلاڤیای بەنەتەوە یەکگرتووەکان راگەیاند، دوای ئەوەی بۆ ماوەی هەشت ساڵ ئەندامێتی راگیرابوو، بەهۆی دوژمنکارییەکانی یۆگۆسلاڤیا بەرامبەر بە کۆمارەکانی، هەروەها لە ۱۵ / ۱۱ / ۲۰۰۰ دا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەیوەندییە دیپلۆماتەکانی لەگەڵ یۆگۆسلاڤیادا گەڕانەوە، دوای پەیوەندییەکان لەکاتی هێرشەکانی هێزەکانی ناتۆ لەهاوینی ۱۹۹۹ دا راگیرابوو.

لەبەرواری ۱ / ٤ / ۲۰۰۱ دا دەسەلاتدارانی سربیا – بەهاوکاری ئەمریکییەکان – سلۆبۆدان میلۆسیڤیتشیان دەستگیر کرد، بەتاوانی گەندەڵی ئیداری وجینۆساید وبەد بەکارهێنانی دەسەڵاتەکانی لەبەرواری ۲۸ / ٦ / ۲۰۰۱ دا دایانە دەست دادگای تاوانی جەنگی نێودەوڵەتی. یۆگۆسلاڤیا نزیکەی یەك ملیار دۆلاری وەك یارمەتی وەرگرت لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وهاوپەیمانەکانی بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵات. لەبەرواری ۳ / ۷ / ۲۰۰۱ دا دەست کرا بەدادگایی کردنی، بەڵام سلۆبۆدان دانی بەشەرعێتی دادگای ناوبراو و ئەو تاوانانەی کەخرابوونە پاڵی نەناوە.

لە ۲۲ / ٤ / ۲۰۰۱ دا هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکانی کۆماری مۆنتینیگرۆ ( چیای رەش )، یەکێك لەو دوو کۆمارەی یەکێتی یۆگۆسلاڤیا بەڕێوە چوو، لەئەنجامەکاندا سەرۆکی وڵات میلۆ دیوکانۆڤیتشی لایەنگری سەربەخۆیی لە یۆگۆسلاڤیا بە ٤٤ کورسی سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەرامبەر بە ۳۷ کورسی بۆ سەرۆکی کوتلەی ئۆپۆزسیۆن کەنەیاری جیابوونەوەیە لە یۆگۆسلاڤیا لەژێر ناوی : پێکەوە لەپێناوی یۆگۆسلاڤیا.

لەبەرواری ١٤ / ۳ / ۲۰۰۲ دا لەبەلگراد واژۆ لەسەر پێکهێنانی یەکێتییەکی نوێ لەنێوان کۆماری سربیا وچیای رەش کرا، ئەمەش مانای ئەوەی چیای رەش دەستی لەداواکارییەکانی لەجیابوونەوە لە یۆگۆسلاڤیا رەت دەکاتەوە. یەکێتی نوێ بۆ ماوەی سێ ساڵ دیاری کرا لەنێوان هەردوو کۆماری ناوبراو بەشێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ ولە سیاسەتی دەرەوە وبەرگریدا هاوبەش دەبن لەگەڵ پارێزگاری لە خزمەتگوزاری ودارایییەکانی بەشێوەیەکی سەربەخۆ لەهەمان کاتدا، بەڵام لەنەتەوە یەکگرتووەکاندا خاوەنی یەك کورسی

دەبن.

لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازی یۆگۆسلاڤیا، بەڵام چالاکییە کشتوکاڵیەکان ژمارەیەکی زۆری لەیۆگۆسلاڤییەکان سەرقاڵ کردووە. ئابووری یۆگۆسلاڤیا بەهۆی ئەو سزایانەی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە دووچاری ئاستەنگی و گرفتی زۆر بۆتەوە، بەڵام لابردنی سزاکان و واژۆکردن لەسەر رێکەوتننامەی ئاشتی لەبۆسنەو هەرسک تائاستێ ئابووری ئەو وڵاتەی بوژاندۆتەوە.

سروودی نیشتیمانی: ئەی سلاڤییەکان.

تێکرای داهاتی نەتەوەیی: ١٣,٥ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ٧٠ .

نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك: ١,٢٩٨ دۆلاری ئەمریکی.

ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا: ١٠٢ .

* * *

## کۆماری سربیا

## Serbia

کۆماری سربیا یەکێکە لەو دوو کۆمارەی یەکێتی سربیا وچیای رەشیان پێکهێناوە. سربیا دەکەوێتە باکووری رۆژهەلاتی چیای رەش، هەریەك لە کۆمارەکانی بۆسنەو هەرسك، کرواتیا، مەجەر، رۆمانیا، بۆلگاریا، مەگدۆنیا لەگەلیدا سنووردارن. هیچ کەنارێکی نییە لەسەر دەریاکان. رووبەری ٨٨,٣٦١ کم$^{2}$ دەبێت. دەشتەکانی بانۆنیا دەکەونە باکووری. چەند گرد وچیایەك لەناوچەکانی بلاو دەبنەوە. گرنگترین روبارەکانی روباری دانوبە، دوو زێشی لیّ دەبێتەوە: روباری مۆرافا وروباری سافا. زستانی ساردە، پلەکانی گەرما لەپایتەختدا دادەبەزیت بۆ سفری سەدی. وەرزی هاوینی فێنکە وپلەکانی گەرما دەگاتە ٢٢ پلەی سەدی، بەلام لە بەلەگرادی پایتەخت هەندیّ جار دەگاتە ٣٨ پلەی سەدی. بارانەکانی لەشێوەی بەفر دەبارێن. دراوی ولاتەکە دیناری نوێی یۆگۆسلاڤیایە.

دانیشتوانی نزیکەی دە ملیۆن کەس دەبن وزۆربەیان لەسربەکانن، پەیرەوی ئاینی مەسیحی ( ئەرتۆدۆکس، لۆتەری ) دەکەن. بەلام دانیشتوانی هەرێمی کۆسۆڤۆ موسلمانن، زمانی فەرمیشیان سربی کرواتییە. سەرۆکی هەلبژێرداو دەسەلاتی گرتۆتە دەست وئەنجومەنی نیشتیمانی لە ٢٥٠ ئەندام پێك دێت. گەورەترین شارەکانی بەلگرادی پایتەختە ودانیشتوانەکەی دەگەنە ١,٥ ملیۆن کەس شاری نۆڤی ساد بەپایتەختی ناوچەی ڤۆیڤۆدینا دادەنرێت کەدەکەوێتە بەشی باکووری سربیا وزۆربەی دانیشتوانەکانی مەجەرییەکانن.

بەشێوەیەکی گشتی سربیا خاوەنی ئابوورییەکی بەهێزە، بەلام بارودۆخی یۆگۆسلاڤیا وهەلوەشانەوەی کۆمارەکانی لەدوای ١٩٩١ بەرەو پاشی بردووە، بەلام ئەوەی هێندەی دیکە بارودۆخی ئابووری سربیای خراپ کردووە جەنگی یۆگۆسلاڤیا لەگەلّ ناتۆ ( هاوپەیمانی باکووری ئەتلەسی ) ولەناوبردنی ژێرخانی ئابووری ولاتەکە. سامانە کانزاییەکانی سربیا بریتین لە خەلووزی بەردین ومس وقورقوشم وزنك، بەرهەمە پیشەسازییەکانیشی چیمەنتۆ وئۆتۆمبێل وپلاستیك وچنینە. بەرهەمە کشتوکالّیەکانیشی پێك دێت لەپەتاتە وگەنم وگەنمەشامی وبەخێوکردنی مانگا ومەرومالات وبەراز.

لەسەدەی دوازدەیەمدا هەر یەك لەکۆمەلە سلاڤییەکان یەکیان گرتووە و ولاتی سربیایان پێك هێناوە، لەسالّی ١٣٨٩ دا تورکە عوسمانییەکان داگیریان کردووە. دوای تێکشکانی تورکەکان لەبەردەم هێزە رووسەکان لەسالّی ١٨٧٨، دەسەلاتی عوسمانیەکان لەتەواوی ناوچەکانی بەلقان بەرەو پاش چووە. لەسالّی ١٩١٨ شاشنشینی سرب وکروات وسلاڤییەکان دامەزراوە. لەسالّی ١٩٢٩ دا شانشینی ناوبراو بۆتە کۆماری یۆگۆسلاڤیای

میللی سۆسیالیست وهێزەکانی ئەڵمانیا لەجەنگی جیهانیی دووەمدا داگیریان کردووە، بەلام بەهۆی فشاری هێزی بەرەنگاری یۆگۆسلاڤیا بەسەرۆکایەتی جۆزێف تیتۆ کراونەتە دەرەوە.
دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆگۆسلاڤیا لەساڵی ۱۹۹۱ دا، هەریەك لەسربیا وکۆماری چیای رەش لەچوارچێوەی کۆماری یۆگۆسلاڤیادا مانەوە. لەبەرواری ١٤ / ٣ / ٢٠٠٢ دا بۆتە بەشێك لەیەکێتی سربیا وچیای رەش. لەدوای ئەو بەروارەوە نیازەکانی جیابوونەوەی لە چیای رەش ودابڕان لەیەکێتی یۆگۆسلاڤیا هاتۆتە ئاراوە. لە سەرەتای ٢٠٠٨ هەر یەك لە ویلایەتە یەکگرتوەکان وبەریتانیا وزۆربەی ولاتانی ئەوروپا خۆشحاڵی خۆیان لە سەربەخۆیی سربیا دەربڕی، بەلام رووسیا بەردەوام جەخت لەمانەوەی سربیا لەیەکێتی یۆگۆسلاڤیا دەکات، لەبەرواری ١٧ / ٢ / ٢٠٠٨ دا سربیا سەربەخۆیی خۆی لە یەکێتی یۆگۆسلاڤیا راگەیاند، خۆپیشاندان وناهەنگەکان تەواوی ئەو ولاتەی گرتەوە، هەر یەك لەولاتانی ئەوروپا و ویلایەتە یەکگرتوەکان ونەتەوە یەکگرتوەکان دانیان بەسەربەخۆیی ئەو ولاتە ناوە.

## یۆنان

**ناوی باو:** یۆنان.

**ناوی فەرمی:** كۆماری هیلینی.

**ناوی فەرمی بە ئینگلیزی:**

Hellenic Republic ( Greece ).

**سیستەمی حوكمڕانی:** كۆماری، سەرۆكی كۆمار، سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران.

**دەستەی یاسادانان:** ئەنجومەنی نوێنەران ( ٣٠٠ ئەندام ).

**ڕووبەر:** ٥٠,٩٤٩ میل دووجا، ١٣١,٩٥٧ كم٢

**ژمارەی دانیشتوان:** ١٠,٥٤١,٠٠٠ كەس ( تا ساڵی ١٩٩٨ ).

**چڕی دانیشتوان:** ٧٩,٩ كەس/كم٢

**كۆمەڵە نەژادییەكانی ئەو وڵاتە:** یۆنانی، مەكدۆنی، تورك، ئەلبان.

**ئاین:** مەسیحی ( ئەرتۆدۆكس، كاسۆلیك، پرۆتستانت )، موسڵمان.

**زمان:** یۆنانی.

**پایتەخت:** ئەسینا.

**شارە سەرەكییەكان:** سالۆنیك، پاتراس، هركلیۆم، میسۆلۆنگی، میكینس، ئیبید فارۆس.

**دراو:** دراخما، یۆرۆ لەدوای بەرواری ١ / ١ / ٢٠٠٢ .

**ئاو وهەوا:** ئاو وهەوای دەریای سپی ناوەڕاستە: زستانی سارد وبارانی لێ دەبارێت، نێوەندی پلەكانی گەرما ٤ پلەی سەدی دەبێت، هاوینی گەرم و وشەكە، نێوەندی پلەكانی گەرما ٢٤ پلەی سەدی دەبێت.

**بەرهەمە كشتوكاڵیەكان:** لۆكە، ترێ، مێووژ، گەنمەشامی، زەیتون، پەلەوەر، قامیشی شەكر، تووتن.

**بەرهەمە پیشەسازییەكان:** چیمەنتۆ، دروستكراوە كیمیاییەكان، جگەرە، جلوبەرگ، پیترۆكیمیاییەكان، دروستكراوە خۆراكییەكان، چنین.

**سامانی كانزایی:** بۆكسیت، كرۆمیت، ئاسن، خەڵووزی بەردین، مەگنیزیۆم، نیكل، لینیت.

**تێڕوانینێكی گشتی:**

یۆنان، دەكەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا، بەشی باشووری نیمچە دورگەی بەلقانی گرتۆتەوە، مەكدۆنیا وبولگاریا دەكەونە باكووری، توركیا دەكەوێتە ڕۆژهەڵاتی، دەریای ئیجە ودەریای سپی ناوەڕاست دەكەونە باشووری، دەریای ئەیۆنی وئەلبانیا دەكەونە ڕۆژئاوای. ناوەڕاستی دەكەوێتە سەر یەكێری هێڵی درێژی ٢٢/٣٠ بەرەو ڕۆژهەڵات لەگەڵ

هێڵی پانی ٣٩ بەرەو باکوور.

نزیکەی ٢٠٠٠ دورگە سەر بە وڵاتی یۆنانن، دورگەکان بەسەر دوو کۆمەڵەدا دابەش دەبن: کۆمەڵەی دورگە ئەیۆنییەکان کەدەکەونە ڕۆژئاوای زەوییە سەرەکییەکانی یۆنان لەدەریای ئەیۆنی وکۆمەڵەی دورگەکانی ئیجە کەدەکەونە سەر دەریای ئیجە لەنێوان تورکیا ویۆناندا. لەنێو تەواوی دورگەکاندا تەنها ١٦٩ دانەیان نیشتەجێ کراون، گەورەترینیان دورگەی کریتە کە دەکەوێتە باشووری ڕۆژهەڵاتی یۆنان لە دەریای سپی ناوەڕاست.

چیاکانی بیندۆس لەباشوورەوە بۆ باکووری یۆنان درێژ دەبێتەوە و وڵاتی کردووە بەدوو کەرتەوە: ڕۆژهەڵات وڕۆژئاوا. ناوچەی دەشتەکانیش دەکەونە سەر کەنار ونیمچە دورگەکان، نزیکەی ٧٥ ٪ ی ڕووبەری یۆنان بەردەڵان وچیایی یە، بۆیە چالاکییە کشتوکاڵیەکان لەو ناوچەیەدا ئەنجام نادرێت.

شارستانێتی ئەغریقی ئەو شارستانێتە مەزنە بوو کە لە سەردەمە دێرینەکاندا لەیۆنان دامەزراوە وکاریگەرییەکی بێ وێنەی لە ئایدیای مرۆڤایەتیدا بەجێ هێشتووە، لەساڵەکانی ١٤٠٠ – ١١٠٠ پ.ز شارستانێتی ئەغریقی گەیشتۆتە لوتکەی گەشەکردنی. لەپاشدا شارە ئەغریقییەکان دامەزرێنراوە وسەربەخۆ بووە ولەنێوان خۆیاندا بەجەنگ هاتوون. لەنێوان ساڵەکانی ٥٤٦ – ٤٤٨ پ.ز فارس ویۆنانییەکان چەند جارێك بەشەڕ هاتوون. کێبەڕکێی نێوان شارە یۆنانییەکاندا بۆتە هۆی لاواز کردنیان، بۆیە لەساڵی ٣٣٨ پ.ز دا لەسەردەمی شا فیلیپی یەکەمدا مەگدۆنیا داگیری کردووە. پاشان لە سەردەمی ئەسکەندەری مەگدۆنی کوڕی شا فیلیپ سەر لەنوێ داگیری کردۆتەوە. لەساڵی ١٤٦ پ.ز دا یۆنان بۆتە ناوچەیەکی ڕۆمانی. تورکە عوسمانییەکان لەساڵی ١٤٦٦ دا داگیریان کردووە و تا سەرکەوتنی لەجەنگی سەربەخۆییدا کە نۆ ساڵی خایاندووە لەبەرواری ٢٥ / ١٢ / ١٨٢١ تا بەرواری ٣ / ٢ / ١٨٣٠ لەژێر دەسەڵاتی تورکەکاندا ماوەتەوە، لەپاشدا بەپێی پرۆتۆکۆلی لەندەن سەربەخۆیی ڕاگەیەنراوە ولە ١٨٣٢ دا بۆتە شانشین.

لەجەنگی جیهانیی یەکەمدا یۆنان چۆتە پاڵ هاوپەیمانان، بەڵام لەجەنگی جیهانیی دووەمدا، لەگەڵ ئەوەی کە بێلایەنی خۆی ڕاگەیاند، هێزە ئیتاڵی وئەڵمانەکان داگیریان کردووە، لەپێناوی ئازاد کردنی وڵاتەکەیان، یۆنانییەکان شەڕی پارتیزانیان ئەنجامداوە و لەکۆتایی جەنگدا هێزە بەریتانییەکان ئازادیان کردووە.

دوای کۆتایی جەنگی جیهانیی دووەم لە ١٩٤٥ دا، یۆنانییەکان هەوڵی دامەزراندنی حکومەتێکی دیموکراسیان داوە، سەرکەوتنی شۆڕشگێڕە شیوعیەکانی ئەورووپا، هەلی بۆ شیوعییەکانی یۆنان ڕەخسان لە ١٩٤٦ دا بزوتنەوەیەکی یاخیگەرایانە ڕاگەیەنن لەو

پێناوەی دەسەلآتی ولآتەکە بگرنە دەست، بەلآم پاش ئەوەی یۆگۆسلاڤیا لە کۆمەڵەی ولآتە شیوعییەکانی ئەورووپا کشایەوە وسنوورەکانی لەرووی شیوعییەکانی یۆنان داخست و رێی نەدا سۆڤیەت پشتیوانیان لێبکات، بزوتنەوەکە لە ١٩٤٩ دا کۆتایی پێهات.

ویلایەتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا ئەرکی ئاوەدانکردنەوەی یۆنانی گرتە ئەستۆ، دەزگای هەوالگری ئەمریکاش بەپاساوی ئاوەدانکردنەوە لەیۆناندا دەستی کرد بەرێگرتن لەشیوعییەکان لەدەستگیر بوونی هەر جۆرە دەسەلآتێکی حکومەتی نوێی ئەو ولآتە.

تا ئەو کات حوکم لەیۆناندا بریتی بوو لەپادشایی دەستووری، حکومەتەکان زۆر بەخێرایی دەگۆڕان، شا گۆستەنتین لەتواناکانی پەرلەمان لەسەقامگیری ئاشتی وئارامی بێ ئومێد بوو، بۆیە پەنای بردە بەر دەرەوەی پەرلەمان بۆ گەڕان بەدوای ئارامی ولآتەکەدا. لەکۆتاکانی ١٩٦٦ دا شا گۆستەنتین داوای لە حکومەتێکی دەرەوەی پەرلەمان کرد دەسەلآتی ولآتەکە بگرنە دەست تا کاتی ئەنجام دانی هەڵبژاردنەکان. بەلآم بارودۆخەکان بەوە شێوەیە نەبوو کەپادشا ئارەزووی دەکرد، چونکە لەساڵی ١٩٦٧ دا بەر لەئەنجامدانی هەڵبژاردنەکان دەسەلآتی ولآتەکەیان گرتە دەست، ئەنجام دەرانی کودەتا، سەرەتا بەناوی پادشاوە حوکمی ولآتیان دەکرد، بەلآم دوای هەوڵەکانی پادشا بۆ ئەنجام دانی کودەتایەك بەسەر سەربازییەکاندا وشکست هێنانی، سەربازەکان پشتیان تێکرد.

ئەنجومەنی کودەتای سەربازییەکان بەسەرۆکایەتی کۆلۆنێل بابادۆپۆلیۆس توانی بارودۆخی سیاسی ولآتەکە ئارام کاتەوە ولەهەمان کاتدا رەوشی ئابووریش گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە بینی، بەلآم پێشێل کارییەکی تەواویان لەمافەکانی مرۆڤ وئازادییە شارستانییەکاندا کردووە. ئەمەش بووە هۆی هەڵگیرسانی بزوتنەوەیەکی ئۆپۆزسیۆنی بەرفراوان، بەتایبەت لەنێو ریزی قوتابیان وهەندێ لەسەربازییەکان. چالاکییەکانی بزوتنەوەکە، بابادۆپۆلۆسی ناچار کرد بەڵێن بەبەخشینی هەندێ لەچاکسازییە سیاسیەکان وسەپاندنی مافەکانی مرۆڤ، جگە لەبەڵێنی بەئەنجامدانی هەڵبژاردنێکی دیموکراسی. بەر لەهاتنی کاتی هەڵبژاردنە چاوەڕوانکراوەکە، جەنەراڵێکی دیکەی سوپا بەناوی لاونیدس هەستا بەکودەتایەکی سەربازی لە ١٩٧٣ .

دوای ساڵێك بزوتنەوەی قوتابیان زیاتر بەرفراوان دەبوو، چالاکییەکانی لەخۆپیشاندان ومانگرتن پەرەی دەسەند، داواکاریەکانی دیموکراسی بووە هۆی راگەیاندنی کۆماری یۆنانی نوێ وخۆئامادەکردن بۆ دارشتنی دەستوورێکی نوێ. ئیتر لەو کاتەوە بارودۆخی ولآت گەیشتە قۆناغی ئاشتی وئارامی، تا ئێستاش.

بەلآم لەساڵی ١٩٧٥ دا کۆمەڵێ تیرۆریست بەناوی : ١٧ ی نۆڤەمبەر چەند کردەوەیەکی

تیرۆریستیان بەئەنجام گەیاند. لەکۆی ئەو کردەوانە ٢٣ کەس کوژراون جگە لەئەنجام دانی هەندێ تەقینەوە لەچەند دەزگایەکی حکومی وشارستانی ئەو وڵاتە، لەنێو کوژراواندا چوار ئەمریکی وبەریتانییەك، زیاترینی قوربانیان لەگەورە سەرمایەدار ودەوڵەمەندەکان بوون.

لەساڵی ٢٠٠٢ دا دەسەڵاتدارانی یۆنان توانیان کۆمەڵێکی زۆری ئەو گروپە تیرۆریستە دەستگیر بکەن ورەوانەی دادگایان بکەن.

یۆنانییەکان بەوڵاتی خۆیان دەڵێن کۆماری هیلینی، ئەم ناوەش دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەهۆزەکانی یۆنان کەناویان هیلوی بووە، بۆیە یۆنانیەکان ئەم ناوەیان بۆشارستانیەت و وڵاتەکەیان هەڵبژاردووە.

بەڵام ناوی ئەغریقی دەگەڕێتەوە بۆ هۆزەکانی: غزوای یان غرایکۆی، کەهەندێکیان بەرەو ئیتالیا کۆچیان کردووە، بۆیە ناوەکە لەنێو ئیتاڵیەکاندا بۆتە باو و وشەی غریس یان غریلیان لێ وەرگرتووە، لەدواییدا ئەو ناوە بەسەر یۆنانییەکاندا دابڕاوە، ناوەکە لەسەردەمی رۆمانەکاندا بەرەو نەتەوەکانی ئەوروپا بڵاوبۆتەوە. دیارە ناوی گریکش لەناوی کریسەوە هاتووە کە ئینگلیز وعەرەب وکورد وهەندێ لەیۆنانیەکانیش بەکاری دێنن.

گەشتوگوزار گرنگترین سەرچاوەی داهاتی نەتەوەیی یۆنانە، بۆیە لەپەنجاکانی سەدەی پێشووەوە حکومەتی یۆنانی هەستاوە بە بنیات نانی چەندین ئوتێل وئەو خزمەتگوزاریانەی ئەو بوارە، زیاترینی ئەو ناوچانەی گەشتیاران رووی تێدەکەن پەرستگای ئەکرۆبۆلسە کە دەکەوێتە ئەسینای پایتەخت.

یۆنان بەپلەی حەوتەم دێت لەنێو وڵاتانی جیهاندا لەدەرهێنانی لینیت، بەپلەی دەیەم دێت لەبەرهەمی شەراب وبۆکسیت وبەپلەی یانزدەیەم دێت لەبەرهەمی لۆکە وبەپلەی دوانزدەیەم دێت لەبەرهەمی نیکل.

**سروودی نیشتیمانی:** گۆرانی ئازادی.

**جەژنی نیشتیمانی:** ٢٥ / ٣ ی هەموو ساڵێك، یادی هەڵگیرسانی شۆرشی دژ بە عوسمانییە داگیرکەرەکان.

**تێکڕای داهاتی نەتەوەیی:** ٨٠,٢ ملیار دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ٣٥ .

**نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك:** ٧,٧١٠ دۆلاری ئەمریکی.

**ریزبەندی لەنێو وڵاتانی جیهاندا:** ٣٩ .

**خشتەی ریزبەدنی ولاتانی جیهان بە پێی تێکرای داهاتی نەتەوەیی.**

| زنجیرە | ناوی ولات | ملیار دۆلاری ئەمریکی |
|---|---|---|
| ١ | ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ٦٧٣٧,٤ |
| ٢٠ | یابان | ٤٣٢١,١٤ |
| ٣ | ئەلمانیا | ٢٠٧٥ |
| ٤ | فەرنسا | ١٣٥٥ |
| ٥ | ئیتالیا | ١١٠١ |
| ٦ | بەریتانیا | ١٠٦٩ |
| ٧ | چین | ٦٣٠ |
| ٨ | کەنەدا | ٥٦٩,٩ |
| ٩ | بەرازیل | ٥٣٦,٣ |
| ١٠ | ئیسپانیا | ٥٢٥,٣ |
| ١١ | رووسیا | ٣٩٢,٥ |
| ١٢ | مەکسیك | ٣٦٨,٧ |
| ١٣ | کۆریای باشوور | ٣٦٦,٥ |
| ١٤ | هۆلەندا | ٣٣٨,١ |
| ١٥ | ئۆستورالیا | ٣٢٠,٧ |
| ١٦ | هیند | ٢٧٩ |
| ١٧ | ئەرجەنتین | ٢٧٥,٦ |
| ١٨ | سویسرا | ٢٦٥ |
| ١٩ | بەلجیکا | ٢٣١ |
| ٢٠ | تایوان | ٢١٨,١ |
| ٢١ | سوید | ٢٠٦,٤ |
| ٢٢ | نەمسا | ١٩٧,٥ |
| ٢٣ | ئەندەنوسیا | ١٦٧,٧ |
| ٢٤ | تورکیا | ١٤٩ |
| ٢٥ | دانیمارك | ١٤٥ |
| ٢٦ | تایلاند | ١٢٩,٩ |
| ٢٧ | سعودیە | ١٢٦,٦ |

| ٢٨ | باشووری ئەفەریقیا | ١٢٥,٢ |
|---|---|---|
| ٢٩ | ئێران | ١٢٥ |
| ٣٠ | نەرویج | ١١٤,٣ |
| ٣١ | فینلەندا | ٩٥,٨ |
| ٣٢ | پۆڵۆنیا | ٩٤,٦ |
| ٣٣ | پۆرتوگال | ٩٢,١ |
| ٣٤ | ئۆکرانیا | ٨٠,٩ |
| ٣٥ | یۆنان | ٨٠,٢ |
| ٣٦ | فەلەستین | ٨٠,٢ |
| ٣٧ | مالیزیا | ٦٨,٧ |
| ٣٨ | سەنگافورە | ٦٥,٨ |
| ٣٩ | فلیپین | ٦٣,٣ |
| ٤٠ | فەنزەویلا | ٥٩ |
| ٤١ | کۆلۆمبیا | ٥٨,٩ |
| ٤٢ | پاکستان | ٥٥,٦ |
| ٤٣ | چیلی | ٥٠,١ |
| ٤٤ | ئێرلەندا | ٤٨,٣ |
| ٤٥ | نیوزیلاندا | ٤٦,٦ |
| ٤٦ | جەزائیر | ٤٦,١ |
| ٤٧ | پیرۆ | ٤٤,١ |
| ٤٨ | میسر | ٤٠,٩ |
| ٤٩ | هەنگاریا | ٣٩ |
| ٥٠ | ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو | ٣٨,٧ |
| ٥١ | میانمار | ٣٧,٧ |
| ٥٢ | چیك | ٣٣ |
| ٥٣ | کوێت | ٣١,٤ |
| ٥٤ | مەغریب | ٣٠,٣ |
| ٥٥ | نێجیریا | ٣٠ |
| ٥٦ | کۆریای باکوور | ٢٩,٧ |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٧ | لیبیا | ٢٩,٢ |
| ٥٨ | رۆمانیا | ٢٧,٩ |
| ٥٩ | بەنگلادیش | ٢٦,٦ |
| ٦٠ | روسیای سپی | ٢١,٩ |
| ٦١ | ئۆزبەکستان | ٢١,١ |
| ٦٢ | کوبا | ٢٠,٩ |
| ٦٣ | عیراق | ٢٠ |
| ٦٤ | کازاخستان | ١٨,٩ |
| ٦٥ | لۆکسمبۆرگ | ١٦ |
| ٦٦ | تونس | ١٥,٩ |
| ٦٧ | سوریا | ١٥,٨ |
| ٦٨ | ئۆرۆگوای | ١٤,٧ |
| ٦٩ | ئیکوادۆر | ١٤ |
| ٧٠ | یۆگۆسلاڤیا | ١٣,٥ |
| ٧١ | سلۆڤینیا | ١٤,٢ |
| ٧٢ | ڤێتنام | ١٣,٨ |
| ٧٣ | گواتیمالا | ١٢,٢ |
| ٧٤ | کرواتیا | ١٢,١ |
| ٧٥ | سلۆڤاکیا | ١١,٩ |
| ٧٦ | سریلانکا | ١١,٦ |
| ٧٧ | عومان | ١٠,٨ |
| ٧٨ | بولگاریا | ١٠,٣ |
| ٧٩ | دۆمینیکان | ١٠,١ |
| ٨٠ | کامیرۆن | ٩,٨ |
| ٨١ | سیلڤادۆر | ٨,٤ |
| ٨٢ | کۆنگۆی دیموکراسی | ٨,١ |
| ٨٣ | کۆستاریکا | ٧,٩ |
| ٨٤ | قەتەر | ٧,٨ |
| ٨٥ | باراگوای | ٧,٦ |

| ٨٦ | قوبروس | ٧,٥ |
|---|---|---|
| ٨٧ | گانا | ٧,٣ |
| ٨٨ | کەناری عاج | ٧,١ |
| ٨٩ | ئیسیوپیا | ٦,٩ |
| ٩٠ | پەنەما | ٦,٩ |
| ٩١ | کینیا | ٦,٦ |
| ٩٢ | ئایسلاندا | ٦,٥ |
| ٩٣ | تورك مانستان | ٦,٤ |
| ٩٤ | سودان | ٦,٤ |
| ٩٥ | لاتیڤیا | ٥,٩ |
| ٩٦ | ئەردەن | ٥,٨ |
| ٩٧ | بۆلیڤیا | ٥,٦ |
| ٩٨ | زیمبابۆی | ٥,٤ |
| ٩٩ | لیتوانیا | ٥ |
| ١٠٠ | سەنگال | ٤,٩٥ |
| ١٠١ | بابوا گینیای نوێ | ٤,٩ |
| ١٠٢ | ترینداد وتۆباگۆ | ٤,٨ |
| ١٠٣ | ئیستونیا | ٤,٤ |
| ١٠٤ | نیپال | ٤,٢ |
| ١٠٥ | بەحرەین | ٤,١ |
| ١٠٦ | بتسوانا | ٤ |
| ١٠٧ | برۆنای | ٤ |
| ١٠٨ | بۆسنە وهەرسك | ٤ |
| ١٠٩ | یەمەن | ٣,٩ |
| ١١٠ | مۆلدۆڤا | ٣,٨ |
| ١١١ | ئازەربێجان | ٣,٧ |
| ١١٢ | ئۆگەندا | ٣,٧ |
| ١١٣ | گابۆن | ٣,٧ |
| ١١٤ | جامایکا | ٣,٦ |

| | | |
|---|---|---|
| ١١٥ | مۆریشیۆس | ٣,٥ |
| ١١٦ | ئەنگۆلا | ٣,٥ |
| ١١٧ | غینیا | ٣,٣ |
| ١١٨ | دورگەکانی بەهاما | ٣,٢ |
| ١١٩ | زامبیا | ٣,٢ |
| ١٢٠ | هینۆراس | ٣,٢ |
| ١٢١ | مەدغەشقەر | ٣,٠٦ |
| ١٢٢ | بۆرکینا فاسۆ | ٣ |
| ١٢٣ | نامیبیا | ٣ |
| ١٢٤ | جۆرجیا | ٣ |
| ١٢٥ | لوبنان | ٢,٩ |
| ١٢٦ | کیرجستان | ٢,٨ |
| ١٢٧ | ئەفغانستان | ٢,٧ |
| ١٢٨ | مالتا | ٢,٦ |
| ١٢٩ | ئەرمینیا | ٢,٥ |
| ١٣٠ | تەنزانیا | ٢,٥ |
| ١٣١ | مالی | ٢,٤ |
| ١٣٢ | تاجیکستان | ٢,١ |
| ١٣٣ | نەیجەر | ٢ |
| ١٣٤ | بەنین | ٢ |
| ١٣٥ | ڤیجی | ١,٨ |
| ١٣٦ | باربادۆس | ١,٧ |
| ١٣٧ | مەگدۆنیا | ١,٧ |
| ١٣٨ | مەلاوی | ١,٦ |
| ١٣٩ | کۆنگۆ | ١,٦ |
| ١٤٠ | هاییتی | ١,٥ |
| ١٤١ | رواندا | ١,٥ |
| ١٤٢ | لاوس | ١,٥ |
| ١٤٣ | لیسۆتۆ | ١,٤ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٤٤ | نیکاراگوا | ١,٤ |
| ١٤٥ | مۆزەمبیق | ١,٣ |
| ١٤٦ | تۆگۆ | ١,٣ |
| ١٤٧ | ئەلبانیا | ١,٢ |
| ١٤٨ | ئەفەریقیای ناوەڕاست | ١,٢ |
| ١٤٩ | تشاد | ١,٢ |
| ١٥٠ | کەمبۆدیا | ١,٢ |
| ١٥١ | لیبیریا | ١,٢ |
| ١٥٢ | مۆریتانیا | ١,١ |
| ١٥٣ | سوازیلاند | ١ |
| ١٥٤ | بۆرۆندی | ٩٠٤ |
| | | ملیۆن دۆلار ئەمریکی |
| ١٥٥ | لختنشتاین | ٩٠٠ |
| ١٥٦ | ئەندۆرا | ٨٩٥ |
| ١٥٧ | سۆماڵ | ٨٣٥ |
| ١٥٨ | مەنگۆلیا | ٨٠١ |
| ١٥٩ | سیرالیۆن | ٦٩٨ |
| ١٦٠ | بیلیز | ٥٣٥ |
| ١٦١ | سانت لوسیا | ٥٠١ |
| ١٦٢ | مۆناکۆ | ٤٧٥ |
| ١٦٣ | ئەنتیگوا وباربۆدا | ٤٥٣ |
| ١٦٤ | جیبۆتی | ٤٤٨ |
| ١٦٥ | دورگەکانی سیشیل | ٤٣٥ |
| ١٦٦ | گۆیانا | ٤٣٤ |
| ١٦٧ | ئەریتیریا | ٣٩٣ |
| ١٦٨ | گامبیا | ٣٨٤ |
| ١٦٩ | سۆرینام | ٣٦٤ |
| ١٧٠ | دورگەکانی سەری سەوز | ٣٤٦ |
| ١٧١ | دورگەکانی سولەیمان | ٢٩١ |

| ١٧٢ | بۆتان | ٢٧٢ |
|---|---|---|
| ١٧٣ | دورگەکانی کۆمۆر | ٢٤٩ |
| ١٧٤ | گرینادا | ٢٤١ |
| ١٧٥ | گینیا وبیساو | ٢٣٥ |
| ١٧٦ | سانت ڤیسنت وگریناديئز | ٢٣٥ |
| ١٧٧ | دورگەکانی مالدیڤ | ٢٢١ |
| ١٧٨ | میکرۆنیزیا | ٢٠٢ |
| ١٧٩ | دۆمینیکا | ٢٠١ |
| ١٨٠ | سانت کریستۆڤەر ونیڤیس | ١٩٥ |
| ١٨١ | ڤانواتۆ | ١٨٩ |
| ١٨٢ | سانت مارینۆ | ١٨٨ |
| ١٨٣ | گینیای کەمەرەیی | ١٦٧ |
| ١٨٤ | ساموا | ١٦٣ |
| ١٨٥ | تۆنگا | ١٦٠ |
| ١٨٦ | دورگەکانی مارشاڵ | ٨٨ |
| ١٨٧ | بالاو | ٨١,٨ |
| ١٨٨ | ناورۆ | ٨٠ |
| ١٨٩ | کیریباتی | ٥٦ |
| ١٩٠ | ساوتۆمی وپرنسیب | ٣١ |
| ١٩١ | تۆڤالۆ | ٣ |
| ١٩٢ | ڤاتیکان | نەزانراوە |
| ١٩٣ | سرپیا | نەزانراوە |

**خشتەی ریزبەندی وڵاتانی جیهان بە پێی نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك**

| ریزبەندی | وڵات | نێوەندی خەرجی ساڵانەی تاك بە دۆلاری ئەمریکی |
|---|---|---|
| ١ | لۆکسمبۆرگ | ٣٩,٨٥٠ |
| ٢ | سویسرا | ٣٧,١٨٠ |
| ٣ | یابان | ٣٤,٦٣٠ |
| ٤ | لختنشتاین | ٣١,٠٠٠ |
| ٥ | دانیمارك | ٢٨,١١٠ |
| ٦ | نەرویج | ٢٦,٤٨٠ |
| ٧ | ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا | ٢٥,٨٦٠ |
| ٨ | ئەڵمانیا | ٢٥,٥٨٠ |
| ٩ | نەمسا | ٢٤,٩٥٠ |
| ١٠ | ئایسلاندا | ٢٤,٥٩٠ |
| ١١ | سوید | ٢٣,٦٣٠ |
| ١٢ | فەرەنسا | ٢٣,٤٧٠ |
| ١٣ | سەنگافورە | ٢٣,٣٦٠ |
| ١٤ | بەلجیکا | ٢٢,٩٢٠ |
| ١٥ | هۆڵەندا | ٢١,٩٧٠ |
| ١٦ | کەنەدا | ١٩,٥٧٠ |
| ١٧ | ئیتالیا | ١٩,٢٧٠ |
| ١٨ | کوێت | ١٩,٠٤٠ |
| ١٩ | فنلەندا | ١٨,٨٥٠ |
| ٢٠ | بەریتانیا | ١٨,٨٥٠ |
| ٢١ | ئوستورالیا | ١٧,٩٨٠ |
| ٢٢ | ئیماراتی عەرەبی یەکگرتوو | ١٧,٥٠٠ |
| ٢٣ | قەتەر | ١٤,٥٤٠ |
| ٢٤ | فەلەستین | ١٤,٤١٠ |
| ٢٥ | برۆنای | ١٤,٢٤٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٦ | ئێرلەندا | ١٣،٦٣٠ |
| ٢٧ | ئیسپانیا | ١٣،٢٨٠ |
| ٢٨ | نیوزیلاندا | ١٣،١٩٠ |
| ٢٩ | دورگەکانی بەهاما | ١١،٧٩٠ |
| ٣٠ | مۆناکۆ | ١١،٠٠٠ |
| ٣١ | تایوان | ١٠،٤٧٩ |
| ٣٢ | پۆرتوگال | ٩،٣٧٠ |
| ٣٣ | ئاندۆرا | ٨،٩٥٦ |
| ٣٤ | قوبروس | ٨،٩٥٦ |
| ٣٥ | سان مارینۆ | ٨،٥٤٥ |
| ٣٦ | کۆریای باشوور | ٨،٢٢٠ |
| ٣٧ | ناورۆ | ٨،٠٧٠ |
| ٣٨ | ئەرجەنتین | ٨،٠٦٠ |
| ٣٩ | یۆنان | ٧،٧١٠ |
| ٤٠ | بەحرەین | ٧،٥٠٠ |
| ٤١ | مالتا | ٧،٢٩٨ |
| ٤٢ | سعودیە | ٧،٢٤٠ |
| ٤٣ | سلۆڤینیا | ٧،١٤٠ |
| ٤٤ | ئەنتیگوا وباربۆدا | ٦،٩٧٠ |
| ٤٥ | باربادۆس | ٦،٥٣٠ |
| ٤٦ | دورگەکانی سیشل | ٦،٢١٠ |
| ٤٧ | عومان | ٥،٢٠٠ |
| ٤٨ | بالاو | ٥،٠٠٠ |
| ٤٩ | سانت کریستۆۆ ونیڤس | ٤،٧٦٠ |
| ٥٠ | لیبیا | ٤،٧٥٥ |
| ٥١ | ئۆرۆگوای | ٤،٦٥٠ |
| ٥٢ | مەکسیک | ٤،١٠١ |
| ٥٣ | هەنگاریا | ٣،٨٤٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٤ | تریندادو وتۆباگۆ | ٣,٧٤٠ |
| ٥٥ | چیلی | ٣,٥٦٠ |
| ٥٦ | گابۆن | ٣,٥٥٠ |
| ٥٧ | مالیزیا | ٣,٥٢٠ |
| ٥٨ | سانت لوسیا | ٣,٤٥٠ |
| ٥٩ | بەرازیل | ٣,٣٧٠ |
| ٦٠ | چیك | ٣,٢١٠ |
| ٦١ | مۆریشیۆس | ٣,١٨٠ |
| ٦٢ | باشووری ئەفریقیا | ٣,١٠١ |
| ٦٣ | دۆمینیکا | ٢,٨٣٠ |
| ٦٤ | ئیستۆنیا | ٢,٨٢٠ |
| ٦٥ | بتسوانا | ٢,٨٠٠ |
| ٦٦ | فەنزەویلا | ٢,٧٦٠ |
| ٦٧ | پەنەما | ٢,٦٧٠ |
| ٦٨ | رووسیا | ٢,٦٥٠ |
| ٦٩ | گرینادا | ٢,٦٢٠ |
| ٧٠ | بیلیز | ٢,٥٥٠ |
| ٧١ | پۆلۆنیا | ٢,٤٧٠ |
| ٧٢ | تورکیا | ٢,٤٥٠ |
| ٧٣ | کۆستاریکا | ٢,٣٨٠ |
| ٧٤ | نەیجەر | ٢,٣٢٠ |
| ٧٥ | لاتڤیا | ٢,٢٩٠ |
| ٧٦ | سلۆڤاکیا | ٢,٢٣٠ |
| ٧٧ | تایلاند | ٢,٢١٠ |
| ٧٨ | رووسیای سپی | ٢,١٦٠ |
| ٧٩ | سانت ڤینست وگریندادینز | ٢,١٢٠ |
| ٨٠ | لوبنان | ٢,١٠٧ |
| ٨١ | ئێران | ٢,٠٦٨ |

| | | |
|---|---|---|
| ٨٢ | کوبا | ١,٩٣٥ |
| ٨٣ | ڤێتنام | ١,٩٣٥ |
| ٨٤ | نامیبیا | ١,٩٠٠ |
| ٨٥ | پیرۆ | ١,٨٩٠ |
| ٨٦ | میکرۆنیزیا | ١,٨٩٠ |
| ٨٧ | تونس | ١,٨٠٠ |
| ٨٨ | جەزائیر | ١,٦٩٠ |
| ٨٩ | دورگەکانی مارشاڵ | ١,٦٨٠ |
| ٩٠ | تورك مانستان | ١,٦٥٠ |
| ٩١ | تۆنگا | ١,٦٤٠ |
| ٩٢ | کۆلۆمبیا | ١,٦٢٠ |
| ٩٣ | ئۆکرانیا | ١,٥٧٠ |
| ٩٤ | باراگوای | ١,٥٧٠ |
| ٩٥ | سیلڤادۆر | ١,٤٨٠ |
| ٩٦ | جامایکا | ١,٤٢٠ |
| ٩٧ | ئەردەن | ١,٣٩٠ |
| ٩٨ | کۆریای باکوور | ١,٣٩٠ |
| ٩٩ | لیتوانیا | ١,٣٥٠ |
| ١٠٠ | دۆمەنیکان | ١,٣٢٠ |
| ١٠١ | ئیکوادۆر | ١,٣١٠ |
| ١٠٢ | یۆگۆسلاڤیا | ١,٢٩٨ |
| ١٠٣ | رۆمانیا | ١,٢٣٠ |
| ١٠٤ | سوریا | ١,٢١٨ |
| ١٠٥ | گواتیمالا | ١,١٩٠ |
| ١٠٦ | بولگاریا | ١,١٦٠ |
| ١٠٧ | بابوا گینیای نوێ | ١,١٦٠ |
| ١٠٨ | سوازیلاند | ١,١٦٠ |
| ١٠٩ | ڤانواتۆ | ١,١٥٠ |

| ١,١٥٠ | مەغریب | ١١٠ |
|---|---|---|
| ١,١٤٣ | بۆسنە وهەرسك | ١١١ |
| ١,١١٠ | كازاخستان | ١١٢ |
| ١,٠٣٦ | عیراق | ١١٣ |
| ٩٧٠ | ساموا | ١١٤ |
| ٩٦٠ | جیبۆتی | ١١٥ |
| ٩٦٠ | فلیپین | ١١٦ |
| ٩٥٠ | ئۆزبەكستان | ١١٧ |
| ٩١٠ | دورگەكانی سەری سەوز | ١١٨ |
| ٩٠٠ | دورگەكانی مالدیڤ | ١١٩ |
| ٨٨٠ | ئەندەنوسیا | ١٢٠ |
| ٨٧٠ | سۆرینام | ١٢١ |
| ٨٧٠ | مۆلدۆڤا | ١٢٢ |
| ٨٦٣ | میانمار | ١٢٣ |
| ٨٠٥ | كامیرۆن | ١٢٤ |
| ٨٠٠ | دورگەكانی سولەیمان | ١٢٥ |
| ٧٩٠ | مەكدۆنیا | ١٢٦ |
| ٧٧٠ | بۆلیڤیا | ١٢٧ |
| ٧٣٠ | كیریباتی | ١٢٨ |
| ٧٢٦ | ئەنگۆلا | ١٢٩ |
| ٧٢٥ | جۆرجیا | ١٣٠ |
| ٧١٠ | میسر | ١٣١ |
| ٧٠٠ | لیسۆتۆ | ١٣٢ |
| ٦٩٥ | ئەفغانستان | ١٣٣ |
| ٦٧٠ | ئەرمینیا | ١٣٤ |
| ٦٤٠ | كۆنگۆ | ١٣٥ |
| ٦٤٠ | سریلانكا | ١٣٦ |
| ٦٣٠ | كەناری عاج | ١٣٧ |

